# ڕووناکی(رَبِّ الْعالَمِين)

## ڕوونکردنەوەی

# ﴿مِنْهَاج الطّالِبين﴾

للإمام النواوي

### لە تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام

### لە سەر ڕاڕەوی ئیمامی(الشافعی)

## بەرگی پێنجەم


دانانی

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی



چاپی پوختەکراو

دانەر بەخۆی پیێدا چۆتەوەو چەند مەسەلەیەکی تێدا زیاد کردون

محرم (1430)ی کۆچی

بەفرانبار (2708)ی کوردی

کانونیدووەم (2009)ی زایینی

ژمارەی سپاردنی (194) ساڵی (2001)ز، لە کتێبخانەیگشتی هەولێر، دراوەتێ

## ناسنامە:

ناوی کیتاب: ڕووناکی (رب العالمين) ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبين).

بابەت: شەریعەتی ئیسلام.

دانەر: عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی.

نۆبەتی چاپ: دوایین چاپی پوختەکراو و زێدەکراو.

بڵاوکراوەی: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی، لە هەولێر.

چاپخانە: دار المعرفة-بيروت

---

## شارەزاکردن:

### ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر کاتێك دانەر دەڵێ:

* رواه الشيخان، مەبەستی ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.

* رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود و النسائي و الترمذي)ن.

* هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، یان ڕوون کراوەتەوە، مەبەستی ئەم چوار کتێبەنە:

1 –(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).

2 –(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانراوی (الإمام إبن حجرالهيتمي).

3 –(نهايةالمحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).

4 –(مغنىالمحتاج : شرح المنهاج) دانراوی (الإمام محمد الخطيب الشربيني).

جا ئەگەر یەکێك لەو چوارانە لە گەڵدا نەبێ، ئەو کاتە دەڵێ: هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا...

---

### ئەی قوتابی خۆشەویست و ڕێزدار، تکایە:

1- پێشەکیەکەلە بەرگی یەکەمدا بە بیرلێکردنەوەیەکی ورد بخوێنەوە.

2- بۆ تێگەیشتنی ئەم کتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستیخۆت، بەڵکو لە لای مامۆستای ئایینی بیخوێنە، چونکە چەند پێناسەو زاراوەیەکی شەرعی هەنە، لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.

# (كِتَابُ الْجِرَاحِ)

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

اَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ والصَّلاَةُ والسَّلاَمُ عَلىسَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصحْبِهِ أَجْمَعِين.

ئەمەیە بەرگی پێنجەمو كۆتایی ﴿ ڕوونـاكی(رَبِّ الْعَالَمِين) ڕوونكردنەوەی (مِنْهاج الطّالِبِينَ)﴾، خوای گەورە یارمەتیم بدا بۆ تەواوكردنی، آمین.

ئیمامی (النواوی) دەفەرمویٚ:

﴿ كِتابُ الْجِراحِ: **ئەمەیە پەڕتوكی برینداركردنەكان** ﴾

واتە: تاوانەكانی برینداركردنو كوشتن، جا لە بەر ئەوەی زۆرتر برینداركردنەكان دەبنە هۆی كوشتنو جۆرەكانیشی زۆرن، بۆییٚ سەردێڕەكەی بە برینداركردنەكان داناوە.

ئینجا بزانە: كوشتنی بە ناهەق—لە دوای كافربوون— لە گشت گوناهە گەورەكان گەورەترە، هەرچەند كوژراوەكەش كافری پەیمان لەئەستۆ، یان دڵنیاكراویێ، بەڵام گوناهی كوشتنی موسوڵمان—بە ناهەق— لە هەموانیان گەورەترە، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)و حاشیەكانیاندا ڕوون كراوەتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: ﴿أَكْبَرُالْكَبَائِرِ اَلإِشْراكُ بِاللهِ وَقَتْلُ النَّفْسِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وَقَوْلُ الزُّورِ﴾ رواه الشيخان، گەورەترینی گوناهە گەورەكان: هاوبەش دانانە بۆ خوای گەورەو كوشتنی ئادەمیزادە بە ناهەقو ئازاردانی دایكو باوكەو شاهیدیی بە درۆیە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: ﴿لَزَوالُ الدُّنْيا أَهْوَنُ عَلَىاللهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، لاچونی دونیا سوكترە لە سەر خوای گەورە لە كوشتنی موسوڵمانێك بە ناهەق.

دیسان بزانە: لە كوشتنی بە ناهەقدا جیاوازی نیە: كەسێكیتر بكوژیٚ، یان خودیخۆی بكوژیٚ، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ عُذِّبَ بِهِ فِي نَارِجَهَنَّمَ﴾ رواه الشيخان، هەر كەسێك بە شتێك خۆی بكوژیٚ، بەو شتە سزا دەدریٚ لە ئاگریدۆزەخدا.

بەڵام لە بڕیاری ئەو حەدیسە ئەم جۆرە حاڵەتە جیا كراوەتەوە: (ئەگەر كەوتە ناو ئاگرێكی كوشندە، لە ئاگرەكەش ڕزگاری نەدەبو تەنها بە ئاوێكی خنكێنەر نەبیٚ، خنكانی ئاوەكەشی لە سەر سوكتر بوو لە سوتانی ئاگرەكە)، ئەوە—بە فەرموودەی ڕاستتر—بۆی دروستە: خۆی بهاوێتە ناو ئاوەكە، هەروەك لە (الأشباه والنظائر)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەگەر مرۆڤكوژەكە تۆبە بكا، خوای گەورە تۆبەی قبوڵ دەكا، هەرچەند بە قەسدیش كوشتنەكەی كردبیٚ، ئەمە مەزهەبی (أهْل السنة)یە، كەواتە: كە خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا﴾ هەر كەسێك ئیمانداریك بە قەسدی بكوژیٚ سزایەكەی دۆزەخەو هەتا هەتایی تیٚیدا دەمێنێتەوە. مەبەست ئەو

کەسەیە کە کوشتنی موسوڵمان–بە ناهەق– بە حەڵاڵ دابنێ، یان ئەگەر بە بێتۆبەکردن مردبێ، ئەوە سزایەکەی دۆزەخە هەتا هەتایی، بەڵام خوای گەورە لە گەورەیی خۆی هەتا هەتایی سزای نادا، هەروەك لە (شرح مسلم)و (إرشادالسارى)دا ڕوون کراوەتەوەو لە پێشەکیی (پەرتوکی زینا)دا بەڵگەی بۆ دێنین، إن شاء الله تعالى.

﴿ئاگاداری﴾: مرۆڤکوژەکە سێ مافی دەکەوتە سەر: مافی خوای گەورە، مافی میراتگرەکانی کوژراوەکە، مافی کوژراوەکە. جا ئەگەر مرۆڤکوژەکە تۆبەی کردو بە خۆشی خۆی‌و بە پەشیمانیەوە لە ترسی خوای گەورە خۆی تەسلیمی میراتگری کوژراوەکە کرد، ئینجا میراتگرەکەش لەتۆڵە کوشتیەوە، یان بە ماڵ سولحی لەگەڵ کرد، یان بە خۆڕایی عەفوی کرد، ئەوە مافی خوای گەورە بە تۆبەکردنەکە لادەچێ، مافی میراتگرەکانیش بە کوشتنەوە، یان بە سولحەکە، یان بە عەفوکردنەکە لادەچێ، مافی کوژراوەکەشی بۆ قیامەت لە سەر دەمێنێ، جا ئەگەر مرۆکوژەکە تۆبەیەکی بێگەردی کردبێ، ئەوە خوای گەورە لە جیاتی وی کوژراوەکە ڕازی دەکاو سولحیان پێدەکا.

جا بزانە: تەنها خۆ تەسلیمکردن بۆ کوشتنەوە سودی نیە لە تۆبەکردندا، بەڵکو مەرجە: بە دڵیش پەشیمان ببێتەوەو بڕیاری ناو دڵیش بدا جارێکیتر کوشتنی بە ناهەق نەکا، هەروەك لە (نهایة)و حاشیەکانیدا ڕوون کراوەتەوە، هەروەها مەرجە: (کَفّارة)ی کوشتنەکەش بدا، والله أعلم.

(اَلْفِعْلُ الْمُزْهِقُ ثَلاَثَةٌ) ئەو کردارەی مرۆڤ دەکوژێ سێنە: (عَمْدٌ وَخَطَأٌ وَشِبْهُ عَمْدٍ) بە قەسدییە، بە هەڵەیە، وێنەی بە قەسدییە. (وَلاَ قِصَاصَ إلاَّ فِي الْعَمْدِ) کوشتنەوەی مرۆڤکوژەکە–لەتۆڵە– تەنها لە کوشتنی بە قەسدیدا دروستە بە (إجماع) زانایانیئیسلام، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِالْقَتْلَى﴾ کوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر ئێوە واجب کراوە لە کوژراوەکاندا.

واتە: بەڵام لە کوشتنی بە هەڵەو لە کوشتنی وێنەی بە قەسدیدا دروست نیە مرۆڤکوژەکە لەتۆڵە بکوشترێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىأَهْلِهِ﴾ هەر کەسێك ئیمانداریکی بە هەڵە کوشت، ئەوە ئازادکردنی کۆیلەیەکی (کفّارة) لە سەرە، هەم واجبە: خوێنیش تەسلیمی خزمەکانی کوژراوەکە بکا. واتە: کوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سەر نیە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿عَقْلُ شِبْهِ الْعَمْدِ مُغَلَّظٌ مِثْلُ عَقْلِ الْعَمْدِ وَلاَ يُقْتَلُ صَاحِبُهُ﴾ رواه أحمد وأبوداود بسند صالح، خوێنی کوشتنی وێنەی بە قەسدی خوێنێکی ئەستورکراوە وەك خوێنی بە قەسدی، بەڵام مرۆڤکوژەکەی لەتۆڵە ناکوژرێ.

وَهُـــوَ قَصْـــدُ الْفِعْـــلِ وَالشَّـــخْصِ بِمَـــا يَقْتُـــلُ غَالِبًـــا: جَـــارِحٍ أَوْ مُثَقَّـــلٍ، فَـــإِنْ فُقِـــدَ قَصْـــدُ أَحَـــدِهِمَا بِـــأَنْ وَقَـــعَ عَلَيْـــهِ فَمَـــاتَ، أَوْ رَمَـــى شَـــجَرَةً فَأَصَـــابَهُ فَخَطَـــأٌ، وَإِنْ قَصَـــدَهُمَا بِمَـــا لاَ يَقْتُـــلُ غَالِبًـــا فَشِـــبْهُ عَمْـــدٍ، وَمِنْـــهُ الضَّـــرْبُ بِسَوْطٍ أَوْ عَصًا، فَلَوْ غَرَزَ إِبْرَةً بِمَقْتَلٍ فَعَمْدٌ وَكَذَا بِغَيْرِهِ إِنْ تَوَرَّمَ وَتَأَلَّمَ حَتَّى مَاتَ،

---

(وَهُوَ) كوشتنى به قەسدى ئەمەيە: (قَصْدُ الْفِعْلِ وَالشَّخْصِ بِمَا يَقْتُلُ غَالِبًا) مرۆڤكوژەكە مەبەستى كوشتنى خودى مرۆڤەكە بێ، بە شتێكى وەها: كە بە ئەغلەبى بكوژێ، جا شتەكەش (جَارِحٍ) بریندارکەر بێ: وەك تیغو ڕمو تفەنگ...هتد (أَوْ مُثَقَّلٍ) یان گران بێ: وەك بەردو شتە گرانەكانىتر، یان شتێكىتر بێ: وەك كوشتنى بە سیحرو شاهیدىی بە درۆو خنكاندنو سوتاندنو برسىكردنو ئەو جۆرە شتانە.

كەوابو: ئەگەر تفەنگێكى هاویشت بۆ كۆمەڵێك بە مەبەستى ئەوەى بە هەر یەكێكیان بكەوێ بیكوژێ، ئەوەش بە كوشتنى بە قەسدى دادەندرێ، بەڵام ئەگەر بۆ یەكێكى دیاركراوى هاویشتو بە یەكێكىتر كەوت كە مەبەستى نەبو، ئەو كاتە بە كوشتنى بە هەڵە دادەندرێ، هەروەك لە زۆربەى سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ فُقِدَ قَصْدُ أَحَدِهِمَا) جا ئەگەر مرۆڤكوژەكە كوشتنەكەى مەبەست نەبو، یان مرۆڤەكەى مەبەست نەبو: (بِأَنْ وَقَعَ عَلَيْهِ فَمَاتَ) وەك بە سەر كەسێكدا كەوتو كەسەكەش مرد (أَوْ رَمَى شَجَرَةً فَأَصَابَهُ) یان تفەنگەكەى بۆ درەختێك، یان بۆ ئاژەڵێك هاویشتو بە ئادەمیزادێك كەوتو كوشتى، یان تفەنگەكەى بۆ مرۆڤێك هاویشت كە وایتێگەیشتبو درەختە، ئینجا ئاشكرابو ئادەمیزادەو مرد، یان بۆ (ئازاد)ى هاویشتو بە (نەوزاد) كەوتو كوشتى، ئەوە (فَخَطَأٌ) لە گشت ئەو وێنانەدا كوشتنى بە هەڵەیە.

(وَإِنْ قَصَدَهُمَا بِمَا لاَ يَقْتُلُ غَالِبًا) ئەگەر كردارەكەو مرۆڤەكەى هەردووك مەبەست بون بە شتێكى وەها: كە بە زۆرى نەیدەكوشت، ئەوە (فَشِبْهُ عَمْدٍ) كوشتنى وێنەى بە قەسدیە (وَمِنْهُ) لە جۆرى كوشتنى وێنەى بە قەسدیە (اَلضَّرْبُ بِسَوْطٍ أَوْ عَصًا) لێدانى بە شوڕكەدار و دارعەساو گۆچانو بۆكز و ئەو جۆرە شتانە، بەو مەرجەى لێدانەكە سوك بێو بە دواى یەكتردا نەبێو لە شوێنە كوشندەكان نەبێ، چونكە ئەگەر یەكێك لەوانە هەبێ، ئەوەش دەبێتە كوشتنى بە قەسدى، هەروەك لە زۆربەى سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

كەوابو: (فَلَوْ غَرَزَ إِبْرَةً بِمَقْتَلٍ) ئەگەر دەرزییێكى دەناو شوێنێكى كوشندە ڕاكرد: وەك چاوو گەروو و میزدانەو مێشكو سینگو گونو كەلەكە، جا بە تێراكردنى دەرزیەكە مرد، ئەوە (فَعَمْدٌ) كوشتنى بە قەسدیە (وَكَذَا بِغَيْرِهِ) هەروەها شوێنەكانىترى لاشەش: وەك ڕانو لاقینگ، ئەوەش هەر كوشتنى بە قەسدیە (إِنْ تَوَرَّمَ وَتَأَلَّمَ حَتَّى مَاتَ) بەو مەرجەى شوێنەكە هەڵبئاوسىو ژان بكا تا دەمرێ.

فَـإِنْ لَـمْ يَظْهَـرْ أَثَـرٌ وَمَـاتَ فِـي الْحَـالِ فَشِـبْهُ عَمْـدٍ، وَقِيـلَ عَمْـدٌ، وَقِيـلَ لاَ شَـيْءَ، وَلَـوْ غَـرَزَ فِيمَـا لاَ يُـؤْلِمُ كَجِلْـدَةِ عَقِـبٍ فَـلاَ شَـيْءَ بِحَـالٍ، وَلَـوْ حَبَسَـهُ وَمَنَعَـهُ الطَّعَـامَ وَالشَّـرَابَ وَالطَّلَـبَ حَتَّـى مَـاتَ: فَـإِنْ مَضَـتْ مُـدَّةٌ يَمُـوتُ مِثْلُـهُ فِيهَـا غَالِبًـا جُوعًـا أَوْ عَطَشًـا فَعَمْـدٌ وَإِلاَّ: فَـإِنْ لَـمْ يَكُـنْ بِـهِ جُـوعٌ وَعَطَشٌ سَابِقٌ فَشِبْهُ عَمْدٍ، وَإِنْ كَانَ بَعْضُ جُوعٍ وَعَطَشٍ وَعَلِمَ الْحَابِسُ الْحَالَ فَعَمْدٌ،

---

بەلاَم (فَإِنْ لَمْ يَظْهَرْ أَثَرٌ وَمَاتَ فِيالْحَالِ) ئەگەر تێڕاکردنی دەرزیەکە هیچ ئاسەوارێکی نەبو و هەر ئەو دەمیش مرۆڤەکە مرد، ئەوە (فَشِبْهُ عَمْدٍ) کوشتنی وێنەی بـە قەسـدیـیە (وَقِيـلَ عَمْدٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بە قەسدییە (وَقِيلَ لاَشَيْءَ) لە بێهێزێکیتردا: هیچ نیە.
(وَلَوْ غَرَزَ فِيمَا لاَ يُؤْلِمُ) ئەگەر دەرزیەکەی دەشـوێنێکی وەهـا ڕاکـرد کـە ژانـی نـەدەکرد: (كَجِلْدَةِ عَقِبٍ) وەك پیستەی پاشنەیپێ، جا مرۆڤەکە مرد، ئەوە (فَلاَ شَيْءَ بِحَالٍ) بە هێچ جۆرێك هیچی لە سەر نیە، چونکە بێگومان بەو دەرزیە نەمردوە، بەلاَم ئەگەر هێـز بداتـە دەرزیەکەو بێگەینێتە ناو گوشتەکە، ئەو کاتە کوشتنی بە قەسدییە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
(وَلَوْ حَبَسَهُ) ئەگەر یەکێکی بەند کرد: وەك دەرگای لە سەر کلیل بدا، یان پەلبەستی بکا (وَمَنَعَهُ الطَّعَامَ وَالشَّرَابَ) هەم قەدەغەشی کرد لە خواردن‌و خواردنەوە، یان لە شـوێنێکی سارد ڕووتی کردەوەو قەدەغەی کرد جلەکانی دەبەر بکاتەوە، هەم (وَالطَّلَبَ) قەدەغەشی کرد داوای خواردن‌و خواردنەوەو جلو بەرگ بکا (حَتَّى مَاتَ) تا بە هـۆی برسـیەتی، یـان تێنووەتی، یان سەرما مرد، یان ڕێگای نەدا برینەکەی بپێچێتەوەو بە هۆی خوێن لێـڕژان مرد، یان لە شوێنێکی پڕ دوکەڵدا بەندی کردو بە دوکەڵەکە نەفەسی تـەنگ بـوو و مـرد، ئەوە تەماشا دەکەین:
(فَإِنْ مَضَتْ مُدَّةٌ) ئەگەر ماوەیەکی وەها بە سەر ئەو کارەدا ڕۆیشت کە (يَمُوتُ مِثْلُهُ فِيهَـا غَالِبًا) وێنەی ئەو مرۆڤە بـە ئەغلـەبی لـەو ماوەیـەدا دەمـرد (جُوعًـا أَوْ عَطَشًـا) بـە هـۆی برسیەتی، یان تێنووەتی، یان سەرما، یـان خـوێن ڕژان، یـان نەفـەس تـەنگبوون، ئـەوە (فَعَمْدٌ) کوشتنی بە قەسدییە.
(وَإِلاَّ) بەلاَم ئەگەر ئەو ماوەیە نەڕۆیشت‌و مرد، ئەو کاتە (فَـإِنْ لَـمْ يَكُـنْ بِـهِ جُـوعٌ وَعَطَـشٌ سَابِقٌ) ئەگەر برسیەتی، یان تێنـووەتیڕابردووی نـەبوبێ، ئـەوە (فَشِـبْهُ عَمْـدٍ) کوشـتنی وێنەی بە قەسدییە، چونکی بە ئەغلەبی ئەو کردارە مرۆڤ ناکوژێ، بەلاَم (وَإِنْ كَانَ بَعْضُ جُوعٍ وَعَطَشٍ) ئەگەر هەندێك برسیەتی، یان تێنووەتیی هەبوبێ‌و (وَعَلِمَ الْحَـابِسُ الْحَـالَ) بەندکەرەکەش زانی برسیەتی، یان تێنووەتیی هەیە، ئەوە (فَعَمْدٌ) کوشتنی بە قەسدییە،

وَإِلاَّ فَلاَ فِي الأظْهَرِ، وَيَجِبُ الْقِصَاصُ بِالسَّبَبِ: فَلَوْ شَهِدَا بِقِصَاصٍ فَقُتِلَ ثُمَّ رَجَعَا وَقَالاَ تَعَمَّدْنَا لَزِمَهُمَاالْقِصَاصُ إِلاَّ أَنْ يَعْتَرِفَ الْوَلِيُّ بِعِلْمِهِ بِكَذِبِهِمَا، وَلَوْ ضَيَّفَ بِمَسْمُومٍ صَبِيًّا أَوْ مَجْنُونًا فَمَاتَ وَجَبَ الْقِصَاصُ، أَوْ بَالِغًا عَاقِلاً وَلَمْ يَعْلَمْ حَالَ الطَّعَامِ فَدِيَةٌ،

---

چونكە مەبەستی كوشتن بووە بە كردارێك كە بە ئەغڵەبی دەكوژێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بەندكەرەكە نەیزانیبێ برسیەتی، یان تێنـووەتیپرابردووی هەیـە، ئـەوە (فَلاَ فِيالأظْهَرِ) كوشتنی بە قەسدی نیە، چونكە مەبەستی كوشتن نەبوە، بەڵكو وێنـەی بـە قەسـدیيەو نیوەی خوێنی واجب دەبێ؟ چونكە بە دوو هۆكار مردوە.

جا بزانە: ئەگەر لە بەندیخانەدا بانەكەی بە سەردا ڕوخا، یان بەندكراوەكە مانی گرتو خواردنی نەخوارد، یان بەخۆی داوای خواردنی نەكرد هەرچەند بە دەرۆزەش بێ، ئەو كاتە نە خوێنو نە تۆڵە لە سەر بەندكەرەكە واجب نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيَجِبُ الْقِصَاصُ بِالسَّبَبِ) كوشتنەوەی لەتۆڵە بە بوونە هۆكاریش واجب دەبێ، هەروەك بەكوشتنی ڕاستەوخۆش واجب دەبو، بۆ وێنە: (فَلَوْ شَهِدَا بِقِصَاصٍ) ئەگەر دوو كەس شاهیدیی بە درۆیان لە سەر كەسێك دا: كە فەلانكەسی كوشتوە، یان دزیی كردوە (فَقُتِلَ) ئینجا بەو شاهیدییە پیاوەكە لەتۆڵەی كوژراوەكە كوشتراوە، یان بە تۆمەتی دزیەكە دەستی لێكراوە (ثُمَّ رَجَعَا وَقَالاَ تَعَمَّدْنَا) ئینجا شاهیدەكان پەشیمان بونەوەو گوتیان: بە قەسدی درۆمان كرد. ئەوە (لَزِمَهُمَاالْقِصَاصُ) كوشتنەوەو دەست لێكردنەوەی لەتۆڵە دەكەوێتە سەر هەردوو شاهیدەكان، جا ئەگەر لەتۆڵەكردنەوەكە عەفو كران، ئەو كاتە واجبە: هەردوو شاهیدەكان وێكڕا خوێنی كوژراوەكەو دەستەكە بدەن، هەروەك لە پەڕتوكی شاهیدیەكاندا بە بەڵگەوە ڕوونی دەكەینەوە، إن شاءالله تعالى.

(إِلاَّ أَنْ يَعْتَرِفَ الْوَلِيُّ بِعِلْمِهِ بِكَذِبِهِمَا) مەگەر میراتگریكوژراوەكە دان بهێنێ كە لە كاتی كوشتنەكەدا زانیويەتی ئەو شاهیدانە درۆ دەكەن، ئەو كاتە كوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر میراتگرەكەیە، جا ئەگەر عەفو كرا، واجبە: بە تەنها خوێنی كوژراوەكە بدا.

(وَلَوْ ضَيَّفَ بِمَسْمُومٍ صَبِيًّا أَوْ مَجْنُونًا) ئەگەر بە خواردنێكی ژەهرتێكراو میوانداری منداڵێك، یان شێتێكی كرد (فَمَاتَ) ئینجا شێتەكە، یان منداڵەكە بەو خواردنە مرد، ئەوە (وَجَبَ الْقِصَاصُ) كوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سەر واجب دەبێ (أَوْ بَالِغًا عَاقِلاً) یان ئەگەر میوانداری مرۆڤێكی بالغو عاقڵی كرد (وَلَمْ يَعْلَمْ حَالَ الطَّعَامِ) میوانەكەش نەیزانی خواردنەكە ژەهری تێكراوە، ئەو كاتە (فَدِيَةٌ) خوێنی كوشتنی وێنەی بە قەسدی واجب دەبێ، چونكە ئەو فریوی‌داوە، بەڵام لەتۆڵە ناكوشترێتەوە، چونكە میوانەكە بە خۆشی

وَفِي قَوْلٍ قِصَاصٌ، وَفِي قَوْلٍ لاَ شَيْءَ، وَلَوْ دَسَّ سُمًّا فِي طَعَامِ شَخْصٍ الْغَالِبُ أَكْلُهُ مِنْهُ فَأَكَلَهُ جَاهِلاً فَعَلَىالأقْوَالِ، وَلَوْ تَرَكَ الْمَجْرُوحُ عِلاَجَ جُرْحٍ مُهْلِكٍ فَمَاتَ وَجَبَ الْقِصَاصُ، وَلَوْ أَلْقَاهُ فِي مَاءٍ لاَ يُعَدُّ مُغْرِقًا كَمُنْبَسِطٍ فَمَكَثَ فِيهِ مُضْطَجِعًا حَتَّى هَلَكَ فَهَدَرٌ، أَوْ مُغْرِقٍ لاَ يَخْلُصُ مِنْهُ إلاَّ بِسِبَاحَةٍ فَإِنْ لَمْ يُحْسِنْهَا أَوْ كَانَ مَكْتُوفًا أَوْ زَمِنًا

---

خۆی خواردویەتی، کەوابو: ئەگەر میوانەکە بزانێ خواردنەکە ژەهری تێکراوەو خواردی، ئەو کاتە خوێنیشی واجب نابێ، چونکە بەخۆی خۆی کوشتوە (وَفِي قَوْلٍ قِصَاصٌ) لە فەرموودەیەکدا: کوشتنەوەی لەتۆڵە واجب دەبێ، چونکە فریوی داوە (وَفِي قَوْلٍ لاَ شَيْءَ) لە فەرموودەیەکیتردا: هیچی لە سەر نیە.

(وَلَوْ دَسَّ سُمًّا فِي طَعَامِ شَخْصٍ)ئەگەر ژەهری دەناو خواردەمەنیی کەسێك کرد: کە (الْغَالِبُ أَكْلُهُ مِنْهُ) بە ئەغڵەبی کەسەکە لەو خواردەمەنیەی دەخوارد (فَأَكَلَهُ جَاهِلاً) ئینجا کەسەکەش نەیزانی ژەهری تێکراوەو خورادیو مرد، ئەوەش (فَعَلَىالأقْوَالِ) لە سەر هەرسێك فەرموودەکەیڕابردووە، بەهێزترەکەیان: خوێنی وێنەی بە قەسدی واجب دەبێ؟ چونکە ئەو فریوی داوە، لەتۆڵەش ناکوشترێتەوە؟ چونکە بەخۆشی خۆی خواردویەتی، بەڵام ئەگەر ژەهرەکەی دەناو خواردەمەنیی‌خۆی کردبو یەکێکیتر لەخۆیەوە هات خواردی، یان دەیزانی ژەهری تێکراوەو خواردی، ئەو کاتە خوێنی بە فیڕۆ دەڕواو هیچ تۆڵەی نیە، چونکە فریو نەدراوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ تَرَكَ الْمَجْرُوحُ عِلاَجَ جُرْحٍ مُهْلِكٍ) ئەگەر برینداركراوەكە برینە كوشندەكەی خۆی دەرمان نەكرد (فَمَاتَ) جا بەو برینە مرد، ئەو كاتەش (وَجَبَ الْقِصَاصُ) كوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر بریندارکەرەکە واجبە، چونکە چارەسەریی‌تاوان لە سەر تاوانلێکراو واجبە نیەو چاکبوونەوەش بە دەرمانکردن مسۆگەر نیە.

(وَلَوْ أَلْقَاهُ فِي مَاءٍ) ئەگەر مرۆڤێکی فڕێدا ناو ئاوێکی وەها: کە (لاَ يُعَدُّ مُغْرِقًا كَمُنْبَسِطٍ) ئاوەکە بە خنکێنەر دانەدەندرا وەك گۆماوێکی وها: کە دەگونجا خۆی لێ ڕزگار بکا، بەڵام (فَمَكَثَ فِيهِ مُضْطَجِعًا) مرۆڤەکەش بە پاڵدانەوە بە خۆشی خۆی لە ناو ئاوەکەدا مایەوە (حَتَّى هَلَكَ) تا مرد، ئەوە (فَهَدَرٌ) بە فیڕۆ دەڕواو هیچ تۆڵەو خوێنی نیە، بەڵام ئەگەر نەگونجێ خۆی ڕزگار بکا: وەك بە پەلبەستکراوی فڕێی بداتە ناو گۆماوەکە، ئەو کاتە دەبێتە کوشتنی بە قەسدیو فڕێدەرەکە لەتۆڵە دەکوشترێتەوە.

(أَوْ مُغْرِقٍ) یان فڕێیدا ناو ئاوێکی خنکێنەر: کە (لاَ يَخْلُصُ مِنْهُ إلاَّ بِسِبَاحَةٍ) لەو ئاوە ڕزگار نەدەبو تەنها بە مەلەکردن نەبێ، ئەوە تەماشا دەکەین: (فَإِنْ لَمْ يُحْسِنْهَا) ئەگەر فڕێدراوەکە مەلەی نەدەزانی (أَوْ كَانَ مَكْتُوفًا أَوْ زَمِنًا) یان پەلبەستکراو بوو، یان

فَعَمْدٌ، وَإِنْ مَنَعَ مِنْها عَارِضٌ كَرِيحٍ وَمَوْجٍ فَشِبْهُ عَمْدٍ، وَإِنْ أَمْكَنَتْهُ فَتَرَكَهَا فَلاَ دِيَةَ فِالأظْهَرِ، أَوْ فِي نَارٍ يُمْكِنُ الْخَلاَصُ مِنْهَا فَمَكَثَ فِيهَا فَفِالدِّيَةِ اَلْقَوْلاَنِ وَلاَ قِصَاصَ فِالصُّورَتَيْنِ، وَفِالنَّارِ وَجْهٌ، وَلَوْ أَمْسَكَهُ فَقَتَلَهُ آخرُ أَوْ حَفرَ بِئْرًا فَرَدَّاهُ فِيهَا آخرُ أَوْ أَلْقَاهُ مِنْ شَاهِقٍ فَتَلَقَّاهُ آخرُ فَقَدَّهُ، فَالْقِصَاصُ عَلَى الْقَاتِلِ وَالْمُرْدِي وَالْقَادِّ فَقَطْ،

---

پەککەوتوو، یان بچوك بوو، ئەوە (فَعَمْدٌ) کوشتنی بە قەسدیەو فریدەرەکە لەتۆڵە دەکوشترێتەوە (وَإِنْ مَنَعَ مِنْها عَارِضٌ كَرِيحٍ وَمَوْجٍ) وە ئەگەر دەگونجا فڕێدراوەکە خۆی لێ ڕزگار بکا، بەڵام ڕوداوێکی وەکو با، یان شەپۆل ڕێگای نەدا مەلە بکا، ئەوە (فَشِبْهُ عَمْدٍ) کوشتنی وێنەی بە قەسدیەو خوێنی واجب دەبێ.

(وَإِنْ أَمْكَنَتْهُ) ئەگەر فڕێدراوەکە بۆی گونجا مەلە بکا، یان بە ڕێگایەکیتر خۆی لێ ڕزگار بکا، بەڵام (فَتَرَكَهَا) بە قەسدی مەلەی نەکرد، یان بە ڕێگا گونجاوەکە خۆی ڕزگار نەکردو خنکا، ئەو کاتە (فَلاَ دِيَةَ فِيالأظْهَرِ) هیچ خوێنێك‌و هیچ کەففارەتێك لە سەر فڕێدەرەکە نیە لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە فڕێدراوەکە بەخۆی خۆی بەهیلاك داوە، کەوابو: کەففارەت لە سەر خۆیەتی.

(أَوْ فِي نَارٍ يُمْكِنُ الْخَلاَصُ مِنْهَا) یان ئەگەر فڕێیدا ناو ئاگرێکی وەها: کە دەگونجا فڕێدراوەکە خۆی لێ ڕزگار بکا، بەڵام (فَمَكَثَ فِيهَا) بە قەسدی لە ناو ئاگرەکدا مایەوەو مرد، ئەوەش (فَفِيالدِّيَةِ اَلْقَوْلاَنِ) لەبارەی خوێنەکە دوو فەرموودەکەی‌پابردوو هەنە، بەهێزترەکەیان: نە خوێن‌و نە کەففارەت لە سەر فڕێدەرەکە نیە، کەوابو: (وَلاَ قِصَاصَ فِي الصُّورَتَيْنِ) کوشتنەوەی لەتۆڵەش لە سەر فڕێدەرەکە نیە لە وێنەی ئاوەکەو ئاگرەکەدا (وَفِيالنَّارِ وَجْهٌ) لەبارەی وێنەی ئاگرەکەدا فەرموودەیەکی بێهێز هەیە: کە کوشتنەوەی لەتۆڵە واجب بێ.

جا بزانە: ئەگەر نەگونجا فڕێدراوەکە خۆی لە ئاگرەکە ڕزگار بکا: وەك ئاگرەکە گەورە بێ، یان فڕێدراوەکە پەلبەستکراو بێ، یان پەککەوتوو، یان بچوك بێ، ئەو کاتە کوشتنی بە قەسدیەو فریدەرەکە لە تۆڵە دەکوشترێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ أَمْسَكَهُ) ئەگەر یەکێك یەکێکی گرت تاکو بیکوژێ، بەڵام (فَقَتَلَهُ آخَرُ) یەکێکیتر گیراوەکەی کوشت (أَوْ حَفَرَ بِئْرًا) یان یەکێك بیرێکی بە دوژمنکاری هەڵکەند (فَرَدَّاهُ فِيهَا آخَرُ) ئینجا یەکێکیتر مرۆڤێکی فڕێدا ناو بیرەکەو مرد (أَوْ أَلْقَاهُ مِنْ شَاهِقٍ) یان یەکێك مرۆڤێکی لە شوێنێکی بەرزایی فڕێدا خوارەوە (فَتَلَقَّاهُ آخَرُ فَقَدَّهُ) ئینجا یەکێك خۆی گەیاندێ‌و لە هەوادا کردیە دوو لەت، یان بە شێوەیەکیتر لە هەوادا کوشتی، واتە: پێش

بكاته سەر زەمین، ئەوە (فَالْقِصَاصُ عَلَى الْقَاتِلِ وَالْمُرْدِي وَالْقَادُّ فَقَطْ) کوشتنەوەی لەتۆڵە
وَلَــوْ أَلْقَــاهُ فِــى مَــاءٍ مُغْــرِقٍ فَالْتَقَمَــهُ حُــوتٌ وَجَــبَ الْقِصَــاصُ فِــى الأظْهَــرِ،
أَوْ غَيْــرِ مُغْــرِقٍ فَــلاَ، وَلَــوْ أَكْرَهَــهُ عَلَــى قَتْــلٍ فَعَلَيْــهِ الْقِصَــاصُ
وَكَذَا عَلَىالْمُكْرَهِ فِىالأظْهَرِ، فَإِنْ وَجَبَتِ الدِّيَةُ وُزِّعَتْ، فَإِنْ كَافَأَهُ أَحَدُهُمَا فَقَطْ،

---

—تــەنها— لــە ســەر بكوژەكــەی مەســەلەیيەكەم و فڕێدەرەكــەی مەســەلەیدووەم و لەتكەرەكەی مەسەلەیسێیەم واجبە، واتە: ئەوەی گرتویەتی و ئەوەی بیری هەڵكەندووە و ئەوەی لە بەرزایی فڕێیداوە: نە تۆڵە و نەخوێنی لــە ســەر نیــە، بــەڵكو تــەمبێ دەكــرێ، پێغەمبــەرﷺ دەفــەرموێ: ﴿إِذا أَمْسَكَ الرَّجُلُ الرَّجُلَ وَقَتَلَهُ الآخَرُ يُقْتَلُ الَّذِى قَتَلَ وَيُحْبَسُ الَّذِى أَمْسَكَ﴾ صـححه ابـن القطـان ورجالـه ثقـات، هــەر كاتێك پیاوێك پیـاوێكی گـرت و یەكێكیتر هات كوشتی، ئەوەی كوشتویەتی لەتۆڵـە دەكوشـترێتەوە و ئـەوەی گرتویـەتی بەند دەكرێ.

(وَلَوْ أَلْقَاهُ فِى مَاءٍ مُغْرِقٍ) ئەگەر یەكێكی فڕێدا ناو ئاوێكی خنكێنەر، ئینجا (فَالْتَقَمَهُ حُوتٌ) ماسی فڕێدراوەكەی قوتدا، ئەوە (وَجَبَ الْقِصَاصُ) كوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر فڕێدەرەكە واجبە (فِىالأظْهَرِ) لە فەرمودەی بەهێزتردا (أَوْ غَيْرِ مُغْرِقٍ) بەڵام ئەگەر ئاوەكـە خنكێنـەر نەبێ، ئەوكاتە (فَلاَ) كوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سەر نیە، بەڵكو خوێنی كوشتنی وێنەی بە قەسدی واجب دەبێ، هەروەها ئەگەر بە سوكی یـەكێكی پـاڵ داو بـە سـەر شـتێكیتیژدا كەوت و مرد، ئەو كاتەش خوێنی وێنەی بە قەسدیی واجب دەبێ، بەو مەرجەی نەیزانیبێ شتە تیژەكە لەوێیە.

**﴿ زۆرلێكردن بۆ كوشتن ﴾**

(وَلَوْ أَكْرَهَهُ عَلَى قَتْلٍ) ئەگەر زۆری لێكرد—بـە ناهـەق— مرۆڤێك بكـوژێ، یـان ئەنـدامێكی لێبكاتــەوە، ئینجــا زۆرلێكراوەكــەش مرۆڤەكــەی كوشــت، ئــەوە (فَعَلَيْــهِ الْقِصَــاصُ) كوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر زۆردارەكە واجب دەبێ و (وَكَذَا عَلَىالْمُكْرَهِ) هەروەها لە سـەر زۆرلێكراوەكەش واجب دەبێ (فِىالأظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە بۆ ڕزگاركردنی گیانیخۆی گیانێكیتری بە ناهەق كوشتوە.

(فَإِنْ وَجَبَتِ الدِّيَةُ) جا ئەگەر لە حاڵەتیزۆرلێكردندا خوێنی كوژراوەكـە واجـب ببـێ: وەك میراتگرەكە لە كوشتن عەفویان بكا، ئەو كاتە (وُزِّعَتْ) خـوێنی كوژراوەكـە بـە یەكسـانی بەسـەر زۆردارەكـەو زۆرلێكراوەكـەدا بـەش دەكـرێ، كـەوابو: بـۆ میراتگرەكـە دروسـتە: یەكێكیان لە تۆڵە بكوژێتەوە و نیوەی خوێنەكەش لە ئەوەكەیتر وەربگـرێ، هـەروەك لـە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

بەلام (فَإِنْ كَافَأَهُ أَحَدُهُمَا فَقَطْ) ئەگەر لە زۆردارەكەو لـە زۆرلێكراوەكـە تـەنها يـەكێكيان هاوچەشنی كوژراوەكە بوو: وەك كوژراوەكە كافرێكی پـەيمان لەئەسـتۆ بـێ، يـان كۆيلـە فَالْقِصَــاصُ عَلَيْــهِ، وَلَــوْ أَكْــرَهَ بَــالِغٌ مُرَاهِقًــا فَعَلَــى الْبَــالِغِ اَلْقِصَــاصُ إنْ قُلْنَــا: عَمْدُالصَّــبِيِّ عَمْــدٌ، وَهُــوَ الأظْهَــرُ، وَلَــوْ أَكْــرَهَ عَلَــى رَمْــيِ شَــاخِصٍ عَلِمَ الْمُكْرِهُ أَنَّهُ رَجُلٌ وَظَنَّهُ الْمُكْرَهُ صَيْدًا فَالأَصَحُّ وُجُوبُ الْقِصَاصِ عَلَى الْمُكْرِهِ،

---

بێ‌و زۆردارەكەش، يان زۆلێكراوەكەش موسولمانێكی ئازادابێ، ئەو كاتە (فَالْقِصَاصُ عَلَيْهِ) كوشتنەوەی لەتۆڵە تەنها لە سەر هاوچەشنەكە واجب دەبێ‌و ئەوەكەی‌تریش نیوە خوێنی كوژراوەكەی لە سەر واجب دەبێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە مەسەلەی زۆرلێكردن بۆ كوشتن: زۆرلێكردنەكە تەنها بەوە دەبێ: كـە هەڕەشەی كوشتن، يان لێكردنەوەی ئەندامێكی لێبكا، يان بە لێدانێكی وەها كە مەترسی مردنی لێبكرێ، هەروەك لە زۆربـەی سەرچـاوەكاندا فەرموويانـە، واتـە: هەڕەشـەی لـەو سێيانە بەرەو خوارتر نابێتە زۆرلێكردن. ئينجا بزانە: ئەگەر زۆری لێكـرد مـاڵی كەسـێك بفـەوتێنێ، ئەوكاتـەش بـۆ خاوەنەكـە دروسـتە تۆڵـە لـە زۆردارەكـەو لـە زۆرلێكراوەكـە وەربگرێ، بەلام لە كۆتايیدا تۆڵە–تەنها– لە سەر زۆردارەكە جێگیر دەبێ، جا بزانە: بۆ خاوەن ماڵەكە دروست نيە زۆرلێكراوەكە بكوژێ، بەڵكو واجبە: بە لەناوبردنی ماڵی خۆی گيانی زۆرلێكراوەكە بپارێزێ، هەروەها لە سەر زۆرلێكراوەكەش واجبە: بە لەناوبردنی ماڵی كەسێكی‌تر گيانی خۆی بپارێزێ، واتە: بەلام واجبە: تۆڵەی ماڵەكە بدرێ، هەروەك ڕابراو، لە (مغنى)و (الشروانى)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ أَكْرَهَ بَالِغٌ مُرَاهِقًا) ئەگەر مرۆڤێكی بالغ زۆری لە منداڵێك، يان لە شێتێك كرد: كەسێك بكوژێ، ئەويش كوشتی، يان بە پێچـەوانەوە، ئـەوە (فَعَلَىالْبَـالِغِ الْقِصَـاصُ) كوشـتنەوی لەتۆڵە تەنها لە سەر بالغەكە واجب دەبێ: جا زۆردار بێ، يان زۆرلێكراوبێ (إنْ قُلْنَا: عَمْدُ الصَّبِيِّ عَمْدٌ) ئەگەر بڵێين: كوشـتنی بـە قەسـدی منـداڵ‌و شـێت، بريـاری كوشـتنی بـە قەسدی بۆ دەدرێ (وَهُوَ الأَظْهَرُ) ئەوەش فەرموودەكەی بەهێزترە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بە هيچ جۆرێك شێت‌و منداڵ لەتۆڵە ناكوشترێنەوە، بەڵكو لەم مەسەلەيەدا نيـوە خـوێنی كوشتنی بە قەسدی لە سەر شێتەكەو منداڵەكە–لە ماڵی‌خۆيان– واجب دەبێ، هەروك لـە (نهاية)و (الشبراملسى)دا فەرموويانە.

(وَلَوْ أَكْرَهَ عَلَى رَمْيِ شَاخِصٍ) ئەگەر زۆری لە مرۆڤێك كرد تفەنگێك بهاوێ بۆ لاشەيەك: كە (عَلِمَ الْمُكْرِهُ أَنَّهُ رَجُلٌ) زۆردارەكە دەيزانی ئەو لاشەيە پياوێكە، بەلام (وَظَنَّهُ الْمُكْرَهُ صَيْدًا) زۆرلێكراوەكە وای‌تێگەيشت نێچيرێكە (فَرَمَاهُ) جا زۆرلێكراوەكەش تفەنگەكەی هاوێشتی‌و

کوشتی، ئەوە (فَالأصَحُّ وُجُوبُ الْقِصَاصِ عَلَى الْمُكْرِهِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: کوشتنەوەی لەتۆڵە تەنها لە سەر زۆردارەکە واجب دەبێ، چونکە بە قەسدی کوشتنەکەی کردوە،

أَوْ عَلَى رَمْيِ صَيْدٍ فَأَصَابَ رَجُلاً فَلاَ قِصَاصَ عَلَى أَحَدٍ، أَوْ عَلَى صُعُودِ شَجَرَةٍ فَزَلَقَ فَمَاتَ فَشِبْهُ عَمْدٍ وَقِيلَ عَمْدٌ، أَوْ عَلَى قَتْلِ نَفْسِهِ فَلاَ قِصَاصَ فِي الأظْهَرِ، وَلَوْ قَالَ: اُقْتُلْنِي وَإِلاَّ قَتَلْتُكَ. فَقَتَلَهُ، فَالْمَذْهَبُ لاَ قِصَاصَ،

---

هەروەها نیوە خوێنی کوژراوەکەش لە سەر خزمەکانی زۆرلێکراوەکە واجب دەبێ، چونکە بە هەڵە کوشتنەکەی کردوە.

(أَوْ عَلَى رَمْيِ صَيْدٍ) یان ئەگەر زۆری لێکرد تفەنگێك بۆ نێچیرێك بهاوێ (فَأَصَابَ رَجُلاً) ئینجا تفەنگەکە بە پیاوێك کەوتو مرد، ئەوە (فَلاَ قِصَاصَ عَلَى أَحَدٍ) کوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر هیچێکیان نیە، چونکە هەردووکیان بە هەڵەدا چوونە، کەوابو: تەواوی خوێنی کوژراوەکە لە سەر خزمەکانی زۆردارەکەو خزمەکانی زۆرلێکراوەکەیە بە نیوەیی.

(أَوْ عَلَى صُعُودِ شَجَرَةٍ) یان ئەگەر زۆری لێکرد بە درەختێکدا سەرکەوێ، یان بە بیرێکدا بڕواتە خوارەوە (فَزَلَقَ فَمَاتَ) ئینجا زۆرلێکراوەکەش خلیسکی بردو کەوتە خوارەوەو مرد، ئەوە (فَشِبْهُ عَمْدٍ) کوشتنی وێنەی بە قەسدییە، کەوابو: خوێنی هەڵخلیسکاوەکەش لە سەر خزمەکانی زۆردارەکەیە (وَقِيلَ عَمْدٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: کوشتنی بە قەسدییە.

جا بزانە: ئەگەر فەرمانیدا منداڵێك: ئاوی بۆ بێنێ، جا منداڵەکەش کەوتە ناو ئاوەکەو خنکا، ئەوە تەماشا دەکەین: ئەگەر منداڵەکە ئەوەندە فامیدە بوبێ کە بۆ ئەو جۆرە کارانە بەکار بێ، ئەوە بە فیڕۆ دەڕواو هیچ خوێنی واجب نابێ، بەڵام ئەگەر فامیدە نەبوبێ، ئەو کاتە خوێنەکەی لە سەر خزمەکانی فەرمانکەرەکە واجب دەبێ، هەروەك لە (الشبراملسی) و (الشروانی) دا فەرموویانە.

(أَوْ عَلَى قَتْلِ نَفْسِهِ) یان زۆری لێکرد خۆی بکوژێ، وەك بڵێ: خۆت بکوژە، یان ئەم ژەهرە بخۆوە، ئەگەر نا: من دەتکوژم، ئینجا زۆرلێکراوەکەش خۆی کوشت، ئەوە (فَلاَ قِصَاصَ فِي الأظْهَرِ) نە کوشتنەوەی لەتۆڵەو نە خوێنو نە (کَفّارة) لە سەر زۆرلێکراوەکە واجب نیە، لە فەرموودەی بەهێزتردا؟ چونکە فەرمان پێکراوەکەو هەڕەشە پێکراوەکە هەر یەکنو وای لێدێ زۆرلێکراوەکە لای خۆکوشتنی هەڵبژاردوەو نابێتە زۆرلێکردن.

بەڵام ئەگەر بڵێ: ئەندامێکیخۆت لێبکەوە، ئەگەر نا: دەتکوژم، یان بڵێ: خۆت بکوژە، ئەگەر نا: بە ئاگر دەتسوتێنم، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا دەبێتە زۆرلێکردن، چونکە هەڕەشەکە لە فەرمان پێکراوەکە بەهێزترە، کەوابو: زۆردارەکە هەمان ئەندامی لێدەکرێتەوەو، هەم لە هەڕەشەی بە سوتاندنیش لەتۆڵە دەکوشترێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ قَالَ: اُقْتُلْنِي وَإِلاَّ قَتَلْتُك) ئەگەر گوتی: من بکوژە، ئەگینا: من دەتکوژم (فَقَتَلَهُ) ئینجا زۆرلێکراوەکەش فەرمانىی بەجێ هێناو کوشتی، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ لاَ قِصَاصَ وَالأَظْهَرُ لاَ دِيَةَ، وَلَوْ قَالَ: اُقْتُلْ زَيْدًا أَوْ عَمْرًا. فَلَيْسَ بِإِكْرَاهٍ. (فَصْلٌ) وُجِدَ مِنْ شَخْصَيْنِ مَعًا فِعْلاَنِ مُزْهِقَانِ مُذَفِّفَانِ كَحَزٍّ وَقَدٍّ، أَوْ لاَ: كَقَطْعِ عُضْوَيْنِ فَقَاتِلاَنِ،

---

بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: کوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر بکوژەکە واجب نابێ، هەم (وَالأَظْهَرُ لاَدِيَةَ) بە فەرموودەی بەهێزتر: خوێنی کوژراوەکەش واجب نابێ، چونکە بەخۆی ئیزنی کوشتنی خۆی داوە، بەڵام بکوژەکە بەو کوشتنە گوناهبار دەبێ، کەوابو: کەففارەتیکوشتنی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)دا فەرموویانە.

هەروەها ئەگەر بڵێ: ئەم ئەندامەم لێبکەوە. فەرمان پێکراوەکەش ئەندامەکەی لێکردەوە، ئەو کاتەش هیچ تۆڵەو خوێنی واجب نابێ، هەر چەند بەو ئەندام لێکردنەوەیەش بمرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ قَالَ: اُقْتُلْ زَيْدًا أَوْ عَمْرًا) ئەگەر گوتی: یان (زەید)، یان (عەمر) بکوژە، ئەگەر نا: دەتکوژم. ئەوە (فَلَيْسَ بِإِكْرَاهٍ) نابێتە زۆرلێکردن، کەواتە: هەر کامەیان بکوژێ لەتۆڵەیی دەکوشترێتەوەو زۆردارەکەش تەنها گوناهبار دەبێو هیچیتری لە سەر نیە.

جا بزانە: ئەگەر بە قەسدی مارێکی بە کەسێك وەناو پێیەوەداو مرد، یان دڕندەیەکی وەهای تێبەرداو کوشتی: کە نەگونجا لە دڕندەکە خۆی دەرباز بکا؟ لە بەر بەهێزیی دڕندەکە، یان تەسکایی شوێنەکە، ئەوەش کوشتنی بە قەسدییەو لە تۆڵە دەکوشترێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

### ﴿ فَصْلٌ: لە باسی کۆبونەوەی دوو تاوان لە دوو کەسەوە ﴾

(وُجِدَ مِنْ شَخْصَيْنِ مَعًا فِعْلاَنِ) هەر کاتێك لە دوو کەسانەوە دوو کردار وێکڕا ڕویان دا: کە (مُزْهِقَانِ) هەردوو کردارەکان تەنها تەنها گیانیان لە لاشە دەبردە دەرەوە، هەم (مُذَفِّفَانِ) هەردوو کردارەکانیش بە پەلە مرۆڤیان دەکوشت (كَحَزٍّ وَقَدٍّ) وەك یەکێکیان گەردەنی ببڕێو ئەوەکەیتریش بیکاتە دوو لەت (أَوْ لاَ) یان هەردوو کردارەکان بە پەلە مرۆڤیان نەدەکوشت (كَقَطْعِ عُضْوَيْنِ) وەك هەردووکیان وێکڕا دوو ئەندامی مرۆڤەکە لێبکەنەوەو بەو لێکردنەوەیە بمرێ، یان وێکڕا چەند شوێنێکی بریندار بکەنو بە هەردوو برینەکان بمرێ، ئەوە (فَقَاتِلاَنِ) لەو مەسەلانەدا هەردووکیان بکوژنو هەردووکیان لەتۆڵەی ئەوکوژراوە دەکوشترێنەوە.

بەڵام ئەگەر یەکێکیان بە پەلە دەیکوشتو ئەوەکەیتر بە پەلە نەیدەکوشت ئەو کاتە

خـاوەنی بــە پەلەكــە بكــوژەو تــەنها ئــەویان لەتۆڵــە دەكوشــترێتەوە، ئەوەكــەیتر ناكوشترێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

وَإِنْ أَنْهَاهُ رَجُلٌ إِلَى حَرَكَةِ مَذْبُوحٍ: بِأَنْ لَمْ يَبْقَ إِبْصَارٌ وَنُطْقٌ وَحَرَكَةُ اخْتِيَارٍ، ثُمَّ جَنَى آخَرُ فَالأَوَّلُ قَاتِلٌ وَيُعَزَّرُ الثَّانِي، وَإِنْ جَنَالثَّانِي قَبْلَ الإِنْهَاءِ إِلَيْهَا فَإِنْ ذَفَّفَ كَحَزٍّ بَعْدَ جُرْحٍ فَالثَّانِي قَاتِلٌ وَعَلَى الأَوَّلِ قِصَاصُ الْعُضْوِ أَوْ مَالٌ بِحَسَبِ الْحَالِ، وَإِلاَّ فَقَاتِلاَنِ، وَلَوْ قَتَلَ مَرِيضًا فِالنَّزْعِ وَعَيْشُهُ عَيْشُ مَذْبُوحٍ وَجَبَ الْقِصَاصُ.

---

(وَإِنْ أَنْهَاهُ رَجُلٌ إِلَى حَرَكَةِ مَذْبُوحٍ) ئەگەر پیاوێك مرۆڤێكی بریندار كرد، یان لێیدا بە شێوەیەكی وەها: كەیاندیە حاڵەتی جولەی سەربڕاو: (بِأَنْ لَمْ يَبْقَ إِبْصَارٌ وَنُطْقٌ وَحَرَكَةُ اخْتِيَارٍ) وەك دیتنو گوفتارو جولەی سەربەخۆی نەمابێ (ثُمَّ جَنَى آخَرُ) ئینجا لەو حاڵەتەدا یەكێكیتریش تاوانێكی كوشندەی كردە سەر مرۆڤەكە: وەك سەربڕین، یان دوولەتكردن، ئەو كاتە (فَالأَوَّلُ قَاتِلٌ) تەنها یەكەمەكە بكوژەو لەتۆڵەیی دەكوشترێتەوە؟ چونكە ئەو گەیاندویەتیە حاڵەتی مردن، بەڵام (وَيُعَزَّرُالثَّانِي) دووەمەكەش تەمبێ دەكرێ؟ چونكە رێزی مردووێكی شكاندوە.

(وَ) هەر لەم وێنەیڕابردوودا (إِنْ جَنَىالثَّانِي) ئەگەر دووەمەكە تاوانێكی كوشتندەی كردە سەر مرۆڤەكە (قَبْلَ الإِنْهَاءِ إِلَيْهَا) پێش ئەوەی یەكەمەكە بیگەیەنێتە حاڵەتی سەربڕاو، ئەوە تەماشا دەكەین:

(فَإِنْ ذَفَّفَ) ئەگەر تاوانەكەیدووەمەكە بە پەلە مرۆڤەكەی دەكوشت (كَحَزٍّ بَعْدَ جُرْحٍ) وەك لە دوای بریندارکردنەكەییەكەمەكە ئەویش گەردەنی ببڕێ، ئەوكاتە (فَالثَّانِي قَاتِلٌ) دووەمەكە بكوژەو لەتۆڵەیی دەكوشترێتەوە، هەم (وَعَلَى الأَوَّلِ قِصَاصُ الْعُضْوِ) یەكەمەكەش هەمان ئەندامی لەتۆڵە لێدەكرێتەوە(أَوْ مَالٌ) یان ماڵی لێوەردەگیرێ (بِحَسَبِ الْحَالِ) بەگوێرەی حاڵەتی تاوانەكە.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر تاوانەكەیدووەمەكەش بە پەلە مرۆڤەكەی نەدەكوشت: وەك یەكەمەكە لەپەدەستی لێبكاتەوە، ئینجا دووەمەكەش لە ئەنیشكەوە لێی بكاتەوە، ئینجا بە پێداچوونی هەردوو تاوانەكان مرۆڤەكە مرد، ئەوە (فَقَاتِلاَنِ) هەردووكیان بكوژنو هەردووكیان لە تۆڵەیی دەكوشترێنەوە.

بەڵام (وَلَوْ قَتَلَ مَرِيضًا فِيالنَّزْعِ) ئەگەر نەخۆشێكی لە حاڵەتی دواگیاندا كوشت (وَعَيْشُهُ عَيْشُ مَذْبُوحٍ) ژیانی نەخۆشەكە وەك ژیانی سەربڕاو بوو، ئەو كاتەش (وَجَبَ الْقِصَاصُ) كوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر بكوژەكەواجب دەبێ؟ چونكە نەخۆشو بریندار لێك جیاوازن: لەبەر ئەوەی وادەبێ نەخۆشەكە دەژیێ، هەم هیچ هۆیەكی كوشتنیش نیە.

بەڵام ئیسلامبوون‌و کافربوون‌و هیچ دەسکاریەکی نەخۆش لە حاڵەتی دواگیاندا دروست نابن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَصْلٌ) قَتَلَ مُسْلِمًا ظَنَّ كُفْرَهُ بِدَارِالْحَرْبِ لاَ قِصَاصَ وَكَذَا لاَ دِيَةَ فِالأظْهَرِ، أَوْ بِدَارِ الإسْلاَمِ وَجَبَا، وَفِالْقِصَاصِ قَوْلٌ، أَوْ مَنْ عَهِدَهُ مُرْتَدًّا أَوْ ذِمِّيًّا أَوْ عَبْدًا أَوْ ظَنَّهُ قَاتِلَ أَبِيهِ فَبَانَ خِلاَفُهُ فَالْمَذْهَبُ وُجُوبُ الْقِصَاصِ،

---

جا بزانە: ئەگەر برینەکەی چاك بۆوە، بەڵام هەتا مرد هەر تادار بوو، ئەوە ئەگەر دوو پزیشکی دادەپەروەر بڵێن: تاداریەکەی بە هۆی برینەکەیە، ئەو کاتەش تاوانکارەکە لەتۆڵە دەکوشترێتەوە، ئەگینا: ناکوشترێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەکانی کوشتنەوەی لەتۆڵە ﴾**

یەکەم: مەرجە کوشتنەکە بە قەسدی‌و بە ناهەق بێ، کەواتە: لە کوشتنی وێنەی بە قەسدی‌و بە هەڵەدا کوشتنەوەی لەتۆڵە دروست نیە.

جا (قَتَلَ مُسْلِمًا ظَنَّ كُفْرَهُ) هەرکاتێك موسوڵمانێکی کوشت کە وایتێگەیشتبو موسوڵمانەکە کافرێکی جەنگیە، واتە: جەنگ لە دژی موسوڵمانان دەکا (بِدَارِالْحَرْبِ) کوژراوەکەش لە (دَارُالْكُفْرِ)دا بوو: وەك بیبینێ جلی کافرەکانی لەبەردایە، یان رێز لە پەرستراوەکانی کافرەکان دەنێ، ئەوە لەو حاڵەتەدا (لاَ قِصَاصَ) کوشتنەوەی لەتۆڵە ناکەوێتە سەر بکوژەکە؟ چونکە عوزری بە دەستە (وَكَذَا لاَ دِيَةَ فِيالأظْهَرِ) هەروەها خوێنیکوژراوەکەشی ناکەوێتە سەر، لە فەرموودەی بەهێزتردا؟ چونکە بە هۆی نیشتەجێبوونی لە (دَارُالْكُفْرِ)دا پێزداریی خۆی نەهێشتوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَنَا بَرِيءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِالْمُشْرِكِينَ﴾ رواه أبوداود وغيره بإسناد صحيح، من بەریمە لە گشت موسوڵمانێك کە لە نێوان کافرەکاندا نیشتەجێ ببێ. بەڵام لەم حاڵەتەدا (كَفَّارَة)ی کوشتنەکە لە سەر بکوژەکە واجب دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(أَوْ بِدَارِالإسْلاَمِ) یان لە (دَارِالإسْلاَم)دا موسوڵمانێکی کوشت کە وایتێگەیشتبو کافرێکی جەنگییە، ئەو کاتە (وَجَبَا) یان کوشتنەوەی لەتۆڵە، یان خوێن لە سەر بکوژەکە واجب دەبێ؟ چونکە لە ئاشکراییدا هەرکەسێك لە (دارُالإسْلام)دا بێ، گیان‌و ماڵی پارێزراوە (وَفِي الْقِصَاصِ قَوْلٌ) لەبارەی کوشتنەوی لەتۆڵە فەرموودەیەك هەیە: کە واجب نابێ.

جا بزانە: ئەگەر موسوڵمانەکە لە جەنگدا لە بەرەی‌کافرەکاندا بێ‌و بکوژرێ، ئەو کاتە نە کوشتنەوەی لەتۆڵەو نە خوێنی واجب نابێ، هەر چەند لە (دارالاسلامِ)شدا بێ، هەروەك لە زۆربەی سەچاوەکاندا فەرموویانەو لە پەرتوکی(جهاد)دا بەڵگەی بۆ دێنین،إن شاء الله تعالى.

(أَوْ مَنْ عَهِدَهُ مُرْتَدًّا أَوْ ذِمِّيًّا أَوْ عَبْدًا) یان کەسێکی کوشت کە پێشتر دیتبوی: موسوڵمانێکی کافربووە، یان کافرێکی پەیمان لەئەستۆیە، یان کۆیلەیە (أَوْ ظَنَّهُ قَاتِلَ أَبِيهِ) یان

وایتێگەیشت بکوژیباوکیەتی (فَبَانَ خِلافُهُ) جا ئاشکرابو: وا نیە، واتە: کوژراوەکە موسولمان بوو، ئازاد بوو، بکوژیباوکی نەبو، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ وُجُوبُ الْقِصَاص)
وَلَوْ ضَرَبَ مَرِيضًا جَهِلَ مَرَضَهُ ضَرْبًا يَقْتُلُ الْمَرِيضَ وَجَبَ الْقِصَاصُ، وَقِيلَ لاَ.
وَيُشْتَرَطُ لِوُجُوبِ الْقِصَاصِ فِالْقَتِيلِ: إِسْلاَمٌ أَوْ أَمَانٌ، فَيُهْدَرُ الْحَرْبِيُّ وَالْمُرْتَدُّ، وَمَنْ عَلَيْهِ قِصَاصٌ كَغَيْرِهِ، وَالزَّانِالْمُحْصَنُ إِنْ قَتَلَهُ ذِمِّيٌّ قُتِلَ بِهِ

---

بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب کوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سەر واجب دەبێ؟ چونکە بە قەسدیو بە ناهەق کوشتنەکەی کردوە، تێگەیشتنە هەڵەکەشی نابێتە عوزر.
(وَلَوْ ضَرَبَ مَرِيضًا) ئەگەر یەکێك لە مرۆڤێکی نەخۆشیدا: کە (جَهِلَ مَرَضَهُ) نەیزانی نەخۆشە (ضَرْبًا يَقْتُلُ الْمَرِيضَ) لێدانێکی وەها: کە مرۆڤی نەخۆشی دەکوشت، بەڵام ساغی نەدەکوشت، ئینجا نەخۆشەکەش بەو لێدانە مرد، ئەوە (وَجَبَ الْقِصَاصُ) کوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سەر واجب دەبێ؟ چونکە بە هۆی نەزانین ئەو لێدانەی بۆ دروست نیە (وَقِيلَ لاَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: کوشتنەوەکە واجب نابێ، بەڵکو خوێنی کوژراوەکەی لە سەر واجب دەبێ، بەڵام ئەگەر ئەو جۆرە لێدانە مرۆڤی ساغیشی دەکوشت، ئەو کاتە بە گشت فەرموودەکان کوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
دووەم مەرجەکانی کوشتنەوەی لەتۆڵە: (وَيُشْتَرَطُ لِوُجُوبِ الْقِصَاصِ) بە مەرج دادەندرێ بۆ واجببوونی کوشتنەوەی لەتۆڵە (فِيالْقَتِيلِ) لە کوژراوەکەدا: (إِسْلاَمٌ) کوژراوەکە موسولمان بێ، جیاوازی بالغو نەبالغو عاقڵو شێت نیە (أَوْ أَمَانٌ) یان کافرێکی دڵنیاکراوبێ بە بەستنی سەرانە، یان بە جەنگ وەستاندن، یان بە پاراستنی موسوڵمانێك.
کەوابو: (فَيُهْدَرُ الْحَرْبِيُّ) کافری جەنگی–کە جەنگ لە دژیئیسلام بکا– خوێنەکەی بە فیڕۆ دەدرێ، واتە: نە کوشتنەوەی لەتۆڵەو نە خوێنی لە سەر بکوژەکەی واجب نابێ، هەرچەند ژن، یان منداڵیش بێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَاقْتُلُواالْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ کافرەکان بکوژن لە هەر شوێنێك دەستتان کەوتن.
(وَالْمُرْتَدُّ) هەم موسوڵمانیکافربووش خوێنی بە فیڕۆ دەدرێ: نە خوێنو نە کوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر بکوژەکەی نیە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ﴾ رواه البخاری، هەر کەسێك ئایینی خۆی گۆڕی بیکوژن.
(وَمَنْ عَلَيْهِ قِصَاصٌ) ئەو بکوژەی کوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سەرە (كَغَيْرِهِ) وەکو موسوڵمانەکانیتر خوێنی پارێزراوەو جگە لە میراتگرەکانی کوژراوەکە بۆ هیچ کەسێکیتر دروست نیە بیکوژێ، واتە: جگە لە میراتگرەکانی کوژراوەکە، هەر کەسێك بکوژەکە بکوژێ، ئەو کەسە لەتۆڵەی بکوژەکە دەکوشترێتەوە.

(وَالزَّانِيالْمُحْصَنُ)ئەو زیناکەرەی موحسەنە، واتە پێش زیناکردن جیماعێکی بە مارەبڕین کردبێ (إِنْ قَتَلَهُ ذِمِّيٌّ) ئەگەر کافرێکی پەیمان لەئەستۆ بیکوژێ، ئەوە (قُتِلَ بِهِ) کافرەکە أَوْ مُسْلِمٌ فَلاَ فِىالأَصَحِّ، وَفِى الْقَاتِلِ: بُلُوغٌ وَعَقْلٌ،

---

لەتۆڵەی زیناکەرەکە دەکوشترێتەوە (أَوْ مُسْلِمٌ) بەڵام ئەگەر مسوڵمانێکی داوێنپاك زیناکەرێکی موحسەنی کوشت، ئەوە (فَلاَ) موسوڵمانەکە لەتۆڵەی زیناکەرەکە ناکوشترێتەوە (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەوەیڕابردوو لەو حاڵەتەدا بوو: کە بە شاهیدیی چوار پیاو، یان بە دانپێداهێنانیخۆی زینایەکەی ئاشکرا بوبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەڵام ئەگەر لەم حاڵەتەدا بێئیزنی کاربەدەست کوشتبێتی، ئەو کاتە پێویستە تەمبێ بکرێ.

جا بزانە: ئەگەر بکوژەکەش وەکو وی زیناکەرێکی موحسەن بوو، یان زیناکەرەکە زیناکەرێکی کوڕ، یان کچ بوو، ئەو کاتە بکوژەکەی لەتۆڵە دەکوشترێتەوە.

دیسان بزانە: ئەگەر دیتی پیاوێکیموحسەن زینا لەگەڵ ژنی وی، یان لەگەڵ خزمێکیوی دەکا، ئەوە بۆی دروستە: بە پەنهانی– لە حاڵەتی زیناکردنەکەدا– زیناکەرەکە بکوژێو هەم ئافرەتەکەش بکوژێ ئەگەر موحسەن بێو زۆرلێکراو نەبێ، جا لەگەڵ ئەوەشدا بەگوێرەی بڕیارەکانی ئاشکرای شەریعەت بە بێشاهید بکوژەکە باوەڕی پێناکرێو لە تۆڵە دەکوشترێەوە، بەڵام ئەگەر چوار شاهیدی زینای هەبن، یان سوێندی گەڕاندرایەوە بخوا، ئەو کاتە باوەڕی پێدەکرێو لە تۆڵە ناکوشترێتەوە، هەم دروست نیە تەمبێش بکرێ، چونکە غیرەتو ناموس هانیداوە زیناکەرەکە بکوژێ، هەروەك لە (تحفة)دا لێرەو لە (کتاب الصیال) دا، هەم لە (فتح الباری)شدا لە شەرحی ئەم حەدیسەدا ڕوون کراوەتەوە:

﴿قال سَعْدُ بن عبادةﷺ لَوْ رَأَيْتُ رَجُلاً مَعَ امْرَأَتِي لَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ. فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: أَتَعْجَبُونَ مِنْ غَيْرَةِ سَعْدٍ؟ لأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ وَاللهُ أَغْيَرُ مِنِّى﴾ رواه الشیخان،(سعد) گوتی: ئەگەر پیاوێك لەگەڵ ژنی خۆمدا ببینم بە شمشێر لێی دەدەم.پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایا لە غیرەتی (سعد) سەرسوڕ دەمێنن؟ من لەوی بەغیرەتترمو خوداش لە من بەغیرەتترە.

جا بزانە لەو حاڵەتەدا هەرچەندە بۆی دروستە: بە پەنهانی زیناکەرەکە بکوژێ، بەڵام وا باشترە ئەو عەیبە داپۆشێ، جا ئەگەر دڵیشی لە سەر ژنەکەی لاچوبێ با تەڵاقی بدا، هەروەك لەپەڕتوکی (اللعان)دا ڕابرا.

سێیەم لە مەرجەکانی کوشتنەوەی لەتۆڵە: (وَ) هەروەها بە مەرج دادەنرێ بۆ واجیبوونی کوشتنەوی لەتۆڵە (فِى الْقَاتِلِ) لە بکوژەکەدا: (بُلُوغٌ وَعَقْلٌ) بکوژەکە بلۆغی بوبێو عەقڵی هەبێ، واتە: منداڵو شێت لەتۆڵە ناکوشترێنەوە، بەو مەرجەی لە حاڵەتی

کوشتنەکەدا شێتی هەبێ، بەڵکو خوێنی کوژراوەکەیان لێوەردەگیرێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَالْمَذْهَبُ وُجُوبُهُ عَلَى السَّكْرَانِ، وَلَوْ قَالَ: كُنْت يَوْمَ الْقَتْلِ صَبِيًّا أَوْ مَجْنُونًا صُدِّقَ بِيَمِينِهِ إنْ أَمْكَنَ الصِّبَا وَعُهِدَ الْجُنُونُ، وَلَوْ قَالَ: أَنَا صَبِيٌّ فَلاَ قِصَاصَ وَلاَ يُحَلَّفُ، وَلاَ قِصَاصَ عَلَى حَرْبِيٍّ، وَيَجِبُ عَلَى الْمَعْصُومِ وَالْمُرْتَدِّ، وَمُكَافَأَةٌ فَلاَ يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِذِمِّيٍّ،

---

وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ﴾ حديث صحيح رواه أصحاب السنن، نوسینی تاوان لە سەر سێ کەسان هەڵگیراوە: لە سەر خەوتوو تا هەشیار دەبێتەوە، لە سەر منداڵ تا بلۆغی دەبێ، لە سەر شێت تا عاقڵ دەبێتەوە.

(وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (وُجُوبُهُ عَلَىالسَّكْرَانِ) کوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر ئەو بکوژە سەرخۆشەش واجبە کە بە قەسدیو بە خۆشی خۆی شەڕابی خواردۆتەوە، یان دەرمانێکی عەقڵبەری خواردۆتەوە، بەڵام ئەگەر بە زۆرلێکردن خواردبویەوە، یان نەیزانیبو هۆشی لادەبا، ئەو کاتە ناکوشترێتەوە، بەڵکو خوێنی کوژراوەکەی لێوەردەگیرێ، هەروەك لە (الشبراملسی)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر بکوژەکە گوتی (كُنْت يَوْمَ الْقَتْلِ صَبِيًّا) من لە کاتیکوشتنەکەدا منداڵ بووم (أَوْ) یان گوتی (مَجْنُونًا) لە کاتی کوشتنەکەدا شێت بووم. ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ (إنْ أَمْكَنَ الصِّبَا وَعُهِدَ الْجُنُونُ) ئەگەر بگونجێ لە کاتی کوشتنەکەدا منداڵ بوبێو پێش کوشتنەکەش شێتی هەبوبێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر بکوژەکە گوتی (أَنَا صَبِيٌّ) من ئێستا منداڵم. دەشگونجا تا ئێستا بلۆغی نەبوبێ، ئەوە (فَلاَ قِصَاصَ) لەتۆڵە ناکوشترێتەوە، هەم (وَلاَ يُحَلَّفُ) سوێندیش نادرێ، چونکە سوێندی منداڵ بەتاڵە، کەواتە: خوێنی کوژراوەکەی لێوەردەگیرێ.

(وَ) هەروەها مەرجە: بکوژەکە پابەندی بڕیارەکانی ئیسلام بوبێ، کەوابو: (لاَ قِصَاصَ عَلَى حَرْبِيٍّ) نە کوشتنەوەی لەتۆڵەو نە خوێن لە سەر ئەو بکوژە واجب نیە کە لە کاتی کوشتنەکەدا کافرێکی جەنگی بوبێ، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەو جۆرە کافرانەی لەتۆڵە نەدەکوشتنەوە: وەك (وَحْشِي)ی بکوژی ئیمامی(حَمْزَةﷺ).

بەڵام (وَيَجِبُ عَلَىالْمَعْصُومِ) کوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر ئەو بکوژە کافرە واجبە کە گیانی پارێزراوە: بە جەنگ وەستاندن، یان بە سەرانە، یان بە دڵنیاکردن، هەم (وَالْمُرْتَدِّ) لە سەر ئەو بکوژەش واجبە کە بۆتە کافر.

(وَ) هەروەها بە مەرج دادەنرێ: (مُكَافَأَةٌ) بکوژەکەو کوژراوەکە هاوچەشن–واتە: یەکسان– بن، کەوابو: (فَلاَ يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِذِمِّيٍّ) مرۆڤی موسوڵمان نە لە تۆڵەی کافرێکی

پەیمان لەئەستۆو نە لە تۆڵەی هیچ کافرێکیتر ناکوشترێتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لا يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ﴾ رواه البخاري، نابێ موسوڵمان لەتۆڵەی کافر بکوشترێتەوە.

وَيُقْتَلُ ذِمِّيٌّ بِهِ وَبِذِمِّيٍّ وَإِنْ اخْتَلَفَتْ مِلَّتُهُمَا، فَلَوْ أَسْلَمَ الْقَاتِلُ لَمْ يَسْقُطْ الْقِصَاصُ، وَلَوْ جَرَحَ ذِمِّيٌّ ذِمِّيًّا وَأَسْلَمَ الْجَارِحُ ثُمَّ مَاتَ الْمَجْرُوحُ فَكَذَا فِالأَصَحِّ، وَفِي الصُّورَتَيْنِ إنَّمَا يَقْتَصُّ الإِمَامُ بِطَلَبِ الْوَارِثِ، وَالأَظْهَرُ قَتْلُ مُرْتَدٍّ بِذِمِّيٍّ وَبِمُرْتَدٍّ، لاَ ذِمِّيٍّ بِمُرْتَدٍّ، وَلاَ يُقْتَلُ حُرٌّ بِمَنْ فِيهِ رِقٌّ، وَيُقْتَلُ قِنٌّ وَمُدَبَّرٌ وَمُكَاتَبٌ وَأُمُّ وَلَدٍ بَعْضُهُمْ بِبَعْضٍ،

---

بەڵام (وَيُقْتَلُ ذِمِّيٌّ بِهِ) کافری پەیمان لەئەستۆ لەتۆڵەی موسوڵمان دەکوشترێتەوەو، هەم (وَبِذِمِّيٍّ وَإِنْ اخْتَلَفَتْ مِلَّتُهُمَا) لەتۆڵەی کافرێکی پەیمان لەئەستۆش دەکوشترێتەوە، هەرچەند ئایینەکەشیان جیاواز بێ: وەك جولەکەو دیان.

(فَلَوْ أَسْلَمَ الْقَاتِلُ) جا ئەگەر بکوژێکی پەیمان لەئەستۆ –لە دوای کوشتنەکە– بووە موسوڵمان (لَمْ يَسْقُطِ الْقِصَاصُ) کوشتنەوەکەی لە سەر لاناکەوێ، چونکە لە کاتی کوشتنەکەدا یەکسان بووە (وَ) هەروەها (لَوْ جَرَحَ ذِمِّيٌّ ذِمِّيًّا) ئەگەر کافرێکی پەیمان لەئەستۆ کافرێکی پەیمان لەئەستۆی بریندار کرد، ئینجا (وَأَسْلَمَ الْجَارِحُ) بریندارکەرەکە بووە موسوڵمان (ثُمَّ مَاتَ الْمَجْرُوحُ) ئینجا کافرە بریندارکراوەکەش بەو برینە مرد (فَكَذَا فِيالأَصَحِّ) ئەوەش کوشتنەوەکەی لە سەر لاناکەوێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا (وَفِيالصُّورَتَيْنِ) لە هەردوو وێنەیڕابردوودا (إِنَّمَا يَقْتَصُّ الإِمَامُ بِطَلَبِ الْوَارِثِ) تەنها پێشەوای موسوڵمانان بکوژەکە لەتۆڵەی کوژراوەکە دەکوژێتەوە بە داواکردنی میراتگری کوژراوەکە (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (قَتْلُ مُرْتَدٍّ بِذِمِّيٍّ) موسوڵمانیکافربوو لە تۆڵەی کافری پەیمان لەئەستۆ دەکوشترێتەوە، هەم (وَبِمُرْتَدٍّ) لە تۆڵەی موسوڵمانێکی کافربووش دەکوشترێتەوە (لاَ ذِمِّيٌّ بِمُرْتَدٍّ) بەڵام کافری پەیمان لەئەستۆ لەتۆڵەی موسوڵمانیکافربوو ناکوشترێتەوە؟ چونکە ئەو بە هۆی سەرانە گیانی دەپارێزرێ، کافربووش خوێنی بە فیڕۆ دراوە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الرَّجُلَ يُقْتَلُ بِالْمَرْأَةِ﴾ رواه أصحاب السنن وصححه الحاكم وابن حبان، پیاو لە تۆڵەی ئافرەت دەکوشترێتەوە.

هەروەها ئافرەتیش لە تۆڵەی پیاو دەکوشترێتەوە، هەروەها نێرامووك لە تۆڵەی پیاو و ئافرەت دەکوشترێتەوەو ئەوانیش لە تۆڵەی نێراموك دەکوشترێنەوە، هەروەها زاناو دەوڵەمەندو خاوەن پلەوپایەش لە تۆڵەی نەزانو هەژارو ناکەس بەچە دەکوشترێنەوە، هەم گەنج لە تۆڵەی پیر، پیر لە تۆڵەی گەنج دەکوشترێنەوە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

بەڵام (وَلاَ يُقْتَلُ حُرٌّ بِمَنْ فِيهِ رِقٌّ) مرۆڤی ئازاد لە تۆڵەی مرۆڤی کۆیلە ناکوشترێتەوە، هەرچەند هەمووشی کۆیلە نەبێ (وَيُقْتَلُ قِنٌّ وَمُدَبَّرٌ وَمُكَاتَبٌ وَأُمُّ وَلَدٍ بَعْضُهُمْ بِبَعْضٍ)

کۆیلەی تەواو و کۆیلەی لە دوای مردن ئازادیی دراوەتێو کۆیلەی نوسراوپێدراو و کۆیلەی دایکە منداڵ هەر یەکەیان لەتۆڵەی ئەویتر دەکوشترێتەوە.

وَلَوْ قَتَلَ عَبْدٌ عَبْدًا ثُمَّ عَتَقَ الْقَاتِلُ أَوْ عَتَقَ بَيْنَ الْجُرْحِ فَكَحُدُوثِ الإِسْلاَمِ، وَمَنْ بَعْضُهُ حُرٌّ لَوْ قَتَلَ مِثْلَهُ لاَ قِصَاصَ، وَقِيلَ إِنْ لَمْ تَزِدْ حُرِّيَّةُ الْقَاتِلِ وَجَبَ، وَلاَ قِصَاصَ بَيْنَ عَبْدٍ مُسْلِمٍ وَحُرٍّ ذِمِّيٍّ، وَلاَ بِقَتْلِ وَلَدٍ وَإِنْ سَفَلَ، وَلاَ لَهُ، وَيُقْتَلُ بِوَالِدَيْهِ، وَلَوْ تَدَاعَيَا مَجْهُولاً فَقَتَلَهُ أَحَدُهُمَا، فَإِنْ أَلْحَقَهُ الْقَائِفُ بِالآخَرِ اِقْتَصَّ وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ قَتَلَ أَحَدُ أَخَوَيْنِ الأَبَ وَالآخَرُ الأُمَّ مَعًا

---

(وَلَوْ قَتَلَ عَبْدٌ عَبْدًا) ئەگەر کۆیلەیەك کۆیلەیەکی کوشت (ثُمَّ عَتَقَ الْقَاتِلُ) ئینجا بکوژەکە ئازاد بوو (أَوْ عَتَقَ بَيْنَ الْجَرْحِ وَالْمَوت) یان لە نێوان بریندارکردنو مردندا ئازاد بوو، ئەوەش (فَكَحُدُوث الإِسْلاَمِ) وەك موسوڵمان بوونە، واتە: کوشتنەوەی لەتۆڵەی لەسەر لاناچێ.

(وَمَنْ بَعْضُهُ حُرٌّ) ئەو مرۆڤەی بەشێکی کۆیلەیەو بەشێکیشی ئازادە (لَوْ قَتَلَ مِثْلَهُ) ئەگەر مرۆڤێکی وەکو خۆی بکوژێ (لاَ قِصَاص) نابێ لەتۆڵەی بکوشترێتەوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (إِنْ لَمْ تَزِدْ حُرِّيَّةُ الْقَاتِل) ئەگەر ئازادیەکەی بکوژەکە زۆرتر نەبێ (وَجَبَ) کوشتنەوەی لەتۆڵە واجب دەبێ (وَلاَ قِصَاصَ بَيْنَ عَبْدٍ مُسْلِمٍ وَحُرّ ذِمِّيّ) کوشتنەوەی لەتۆڵە لە نێوان کۆیلەیەکی موسوڵمانو کافرێکی ئازادی پەیمان لەئەستۆدا نیە، چونکە موسوڵمان لەتۆڵەی کافر ناکوشترێتەوە، ئازادیش لەتۆڵەی کۆیلە ناکوشترێتەوە.

(وَلاَ بِقَتْلِ وَلَدٍ وَإِنْ سَفَلَ) کوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر باوكو باپیرەو دایكو داپیرە نیە ئەگەر منداڵی خۆیان بکوژن، هەرچەند منداڵەکەش بەرەو خوار بێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ يُقَادُ الْوَالِدُ بِالْوَلَدِ﴾ رواه أحمد وصححه إبن الجارود والبيهقي، باوك لەتۆڵەی منداڵەکەی ناکوشترێتەوە.

(وَلاَ لَهُ) هەروەها بۆ منداڵەکەشی لەتۆڵەی کوژراوێکیتر ناکوشترێتەوە: وەك ژنی کوڕەکەی، یان دایکیکوڕەکەی بکوژێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ يُقَادُ لِلإِبْنِ مِنْ أَبِيهِ﴾ صححه الحاكم والبيهقي، نابێ باوك بۆ کوڕەکەی لەتۆڵە بکوشترێتەوە.

بەڵام (وَيُقْتَلُ بِوَالِدَيْهِ) کوڕو کیژ لەتۆڵەی دایكو باوكو داپیرەو باپیرەکانیان دەکوشترێنەوە، هەروەها گشت خزمەکانیتریش لەتۆڵەییەکتری دەکوشترێنەوە، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ تَدَاعَيَا مَجْهُولاً) ئەگەر دوو پیاو داوای نەژادی مرۆڤێکی نەناسراویان کرد (فَقَتَلَهُ أَحَدُهُمَا) ئینجا پێش ڕۆنبوونەوە یەکێك نەناسراوەکەی کوشت، ئەوە (فَإِنْ أَلْحَقَهُ الْقَائِفُ بِالآخَرِ) ئەگەر دروشمناس نەناسراوەکەی کردە منداڵی ئەوەکەیتر، ئەوە (اُقْتُصَّ) بکوژەکە لەتۆڵەی دەکوشترێتەوە (وَإِلاّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر نەیکردە منداڵی وی، ئەوە (فَلاَ) لەتۆڵەی ناکوشترێتەوە.

(وَلَوْ قَتَلَ أحَدُ أخَـوَيْنِ الأبَ) ئەگـەر يـەكێك لـە دوو برايـان بـاوكی كوشـتو (وَالآخَـرُ الأمَّ) برايەكەیتریش دايكی كوشت (مَعًا) كوشتنەكەشيان لەگـەڵ يەكتریدابو، واتـە: وێكـڕا فَلِكُـلٍّ قِصَـاصٌ، وَيُقَـدَّمُ بِقُرْعَـةٍ، فَـإِنْ اِقْـتَصَّ بِهَـا أَوْ مُبَـادِرًا فَلِـوَارِثِ الْمُقْـتَصِّ مِنْـهُ قَتْـلُ الْمُقْـتَصِّ إنْ لَـمْ نُـوَرِّثْ قَـاتِلاً بِحَـقٍّ، وَكَـذَا إنْ قَـتَلاَ مُرَتَّبًـا وَلاَ زَوْجِيَّـةَ، وَإِلاَّ فَعَلَىالثَّانِي فَقَطْ، وَيُقْتَلُ الْجَمْعُ بِوَاحِدٍ، وَلِلْوَلِيِّ اَلْعَفْوُ عَنْ بَعْضِهِمْ عَلَى حِصَّتِهِ مِنَ

---

گيانيان دەرچوو، ئەوە (فَلِكُلٍّ قِصَاصٌ) هەريەكەيان مافی كوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سـەر ئەویتر هەيە (وَيُقَدَّمُ بِقُرْعَةٍ) بە پشكەكردن برايەكيان بۆ كوشتنەوەكە وەپێش ئەوەكەیتر دێخرێ (فَإِنْ اقْتَصَّ بِهَا) جا ئەگەر بە پشكەكردن برايەك برايەكەیتری لەتۆڵـە كوشـتەوە (أَوْ مُبَادِرًا) يان بە بێپشكەكردن پەلەی كردو كوشتيەوە، ئەو كاتە (فَلِوَارِثِ الْمُقْتَصِّ مِنْهُ قَتْلُ الْمُقْتَصِّ) بۆ ميراتگری برا كوشتراوەكە دروستە برا بكوژەكە لەتۆڵەی دايككـە، يـان باوككـە بكوژێتـەوە (إنْ لَـمْ نُـوَرِّثْ قَـاتِلاً بِحَـقٍّ) ئەگـەر بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر بڵـێين: مرۆڤكوژی بە هەق ميرات لە كوژراوەكەی ناگرێ.

(وَكَذَا إنْ قَتَلاَ مُرَتَّبًا وَلاَ زَوْجِيَّةَ) هەروەها ئەگەر دوو برايەكان دايكو باوكيان يەك لـە دوای يەكتريش بكـوژن هـەر يەكـەيان مـافی كوشـتنەوەی ئـەویتری هەيـە لـەو حاڵەتـەی ژنو ميردايەتی لە نێوان دايكو باوكەياندا نەمابێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ژنو مێردايەتی لە نێوانياندا بەردەوام بێ، ئەوكاتە (فَعَلَىالثَّانِي فَقَطْ) كوشتنەوەی لەتۆڵە تەنها لە سەر دووەمەكەيان واجب دەبێو لە سەر يەكەمەكەيان واجب نابێ؟ چونكە بەشێكی تۆڵەی كوژراوەكەیخۆی بە ميرات گرتۆتەوە لە كوژراوەكەیدووەم، كـەوابو: ئـەو بەشـە تۆڵـەی مـاوە لـە سـەری لادەچێو خوێنی لە جياتی لێوەردەگيرێ.

## ﴿ هاوبەشی لە كوشتندا ﴾

(وَيُقْتَـلُ الْجَمْـعُ بِوَاحِـدٍ) كۆمـەڵێك لەتۆڵـەی يـەك كـەس دەكوشـترێنەوەو هەريەكەشـيان كەففارەتێكی لە سەرە: وەك وێكڕا فڕێیبدەنە نـاو ئـاو، يـان لـە بـەرزايی فڕێیبدەنـە خوارەوە، يان برينداری بكەنو برينی هەريەكەشيان كاری لە گياندەرچوونەكە كردبێ، يان بە هەر شـێوەيەكیتر بيكـوژن ﴿عن ابن عُمَر، وابن الْمُسَيِّب رضى الله عنهم: أَنَّ عُمَرَ ﷺ قَتَلَ خَمْسَةً أَوْ سِتَّةً بِرَجُلٍ قَتَلُوهُ غِيلَةً، وَقالَ: لَوْ تَمَالَأَ عَلَيْهِ أَهْلُ صَنْعَاءَ لَقَتَلْتُهُمْ بِهِ﴾ أخرجه مالـك والبخاری، ئيمامی (عمرﷺ) پێنج، يان شەش كەسی لەتۆڵەی پياوێك كوشتنەوە كـە بـە فێڵ كوشتبويان، هەم فەرمووی: ئەگەر دانيشتووانی شاری (صـنعا) لـە سـەر كوشـتنی پياوەكە كۆ بوبانەوە گشتيانم لە تۆڵەی دەكوشتنەوە.

بەڵام ئەوەی برينەكەی كاری نەكردوە بۆ گياندەرچـوون، ئـەويان ناكوشـترێتەوە، بـەڵكو تۆڵەی برينەكەی لێوەردەگيرێ، هەروەك (الشبراملسي) فەرموويەتی.

(وَلِلْوَلِيِّ) بۆ میراتگری کوژراوەکە دروستە (اَلْعَفْوُ عَنْ بَعْضِهِمْ) هەندێك لە بکوژەکان لە کوشتنەوە عەفو بکاو هەندێکیشیان لەتۆڵە بکوژێتەوە، جا عەفوەکەش (عَلَى حِصَّتِهِ مِنَ الدِّيَةِ بِاعْتِبَارِالرُّءُوسِ، وَلاَ يُقْتَلُ شَرِيكُ مُخْطِئٍ وَشِبْهِ عَمْدٍ، وَيُقْتَلُ شَرِيكُ الأبِ وَعَبْدٌ شَارَكَ حُرًّا فِي عَبْدٍ وَذِمِّيٌّ شَارَكَ مُسْلِمًا فِي ذِمِّيٍّ، وَكَذَا شَرِيكُ حَرْبِيٍّ وَقَاطِعٍ قِصَاصًا أَوْ حَدًّا وَشَرِيكُ النَّفْسِ وَدَافِعِ الصَّائِلِ فِالأظْهَرِ، وَلَوْ جَرَحَهُ جُرْحَيْنِ عَمْدًا وَخَطأً وَمَاتَ بِهِمَا، أَوْ جَرَحَ حَرْبِيًّا

---

الدِّيَةِ) لە سەر ئەوە بێ: کە بەشەخوێنەکەیی لێوەربگرێ، جا بەشەکەش (بِاعْتِبَارِ الرُّءُوسِ) بەگوێرەی ژمارەی سەری بکوژەکانە، بۆ وێنە: ئەگەر بکوژەکان پێنج کەس بن، پێنجێکی خوێنەکەی لێوەربگرێ، هەروەهاش دروستە گشتیان لە کوشتن عەفو بکاو خوێنی کوژراوەکەی بە تێکڕایی لە گشتیان وەربگرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.
(وَلاَ يُقْتَلُ شَرِيكُ مُخْطِئٍ وَشِبْهِ عَمْدٍ) هەر بکوژێك لە کوشتنەکەدا هاوبەشی بکوژێکی بەهەڵەداچوو، یان وێنەی بە قەسدی بێ، نابێ لەتۆڵە بکوشترێتەوە، چونکە کوشتنەکە بە دوو کردار بووە: لەو دوو کردارانەش یەکێکیان کوشتنەوە واجب دەکاو ئەوەکەیتر قەدەغەی دەکا، کەوابو: هاوبەشەکە نیوەی خوێنی کوژراوەکەی لێوەردەگیرێو نیوەکەیتریش لە خزمەکانی ئەویتر وەردەگیرێ.
بەڵام (وَيُقْتَلُ شَرِيكُ الأبِ) ئەو بکوژەی لە کوشتنەکەدا هاوبەشی باوکیکوژراوەکەیە، ئەو دەکوشترێتەوە، هەم (وَعَبْدٌ شَارَكَ حُرًّا فِيعَبْدٍ) ئەوکۆیلەی لە کوشتنی کۆیلەیەکدا هاوبەشیی ئازادێکی کردوەو هەم (وَذِمِّيٌّ شَارَكَ مُسْلِمًا فِي ذِمِّيٍّ) ئەو کافرەی پەیمان لەئەستۆیەو لە کوشتنی کافرێکی پەیمان لەئەستۆدا هاوبەشیی موسوڵمانێکی کردوە، ئەویش دەکوشترێتەوە.
(وَكَذَا شَرِيكُ حَرْبِيٍّ) هەروەها هاوبەشی کافریجەنگی لە کوشتنی موسوڵمانێکدا، هەم (وَقَاطِعٍ قِصَاصًا أَوْ حَدًّا) هاوبەشی ئەو کەسەی کە لەتۆڵە، یان بۆ سزادان دەستی کەسێکیتری لێکردۆتەوەو بەم دەست لێکردنەوەیەش مردوە، هەم (وَشَرِيكُ النَّفْسِ) ئەوەی هاوبەشی بکوژەکەیە لە کوشتنی خودیخۆیدا، هەم (وَدَافِعِ الصَّائِلِ) هەم ئەو کەسەی هاوبەشی ئەو کەسەیە کە بەرگری زۆرداری هێرشکەر لەخۆی دەکا (فِيالأظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، هەم هاوبەشی منداڵو شێت لە کوشتنی کەسێکدا، واتە: ئەو هاوبەشانە گشتیان لەتۆڵەی کوژراوەکە دەکوشترێنەوە، چونکە کرداری هەردوو هاوبەشەکان بە قەسدییەو کوشتنەوەی لەتۆڵە واجب دەکا، بەڵام لە بەر هۆیەکیدەرەکی هاوبەشەکانیتر لەتۆڵە ناکوشترێنەوەو ئەو هۆیەش لەم هاوبەشەدا نیە، بۆیێ لەتۆڵە دەکوشترێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ جَرَحَهُ جُرْحَيْنِ عَمْدًا وَخَطَأً) ئەگەر یەکێکی بە دوو برینان بریندار کرد: برینێکیان بە قەسدیو برێنێکیش بە هەڵە، ئینجا (وَمَاتَ بِهِمَا) بە هەردوو برینەکان مرد (أَوْ جَرَحَ حَرْبِيًّا أَوْ مُرْتَدًّا ثُمَّ أَسْلَمَ وَجَرَحَهُ ثَانِيًا فَمَاتَ لَمْ يُقْتَلْ، وَلَوْ دَاوَى جُرْحَهُ بِسُمٍّ مُذَفِّفٍ فَلاَ قِصَاصَ عَلَى جَارِحِهِ، وَإِنْ لَمْ يَقْتُلْ السُّمُّ غَالِبًا فَشِبْهُ عَمْدٍ، وَإِنْ قَتَلَ غَالِبًا وَعَلِمَ حَالَهُ فَشَرِيكُ جَارِحِ نَفْسِهِ، وَقِيلَ شَرِيكُ مُخْطِئٍ، وَلَوْ ضَرَبُوهُ بِسِيَاطٍ فَقَتَلُوهُ وَضَرْبُ كُلِّ وَاحِدٍ غَيْرُ قَاتِلٍ فَفِي الْقِصَاصِ عَلَيْهِمْ أَوْجُهٌ: أَصَحُّهَا يَجِبُ إنْ تَوَاطَئُوا، وَمَنْ قَتَلَ جَمْعًا مُرَتَّبًا قُتِلَ بِأَوَّلِهِمْ،

---

أَوْ مُرْتَدًّا) یان کافرێکی جەنگی، یان موسوڵمانێکی کافربووی بریندار کرد (ثُمَّ أَسْلَمَ وَجَرَحَهُ ثَانِيًا) ئینجا بریندارکراوەکە بووە موسوڵمانو دووبارەش برینداری کردەوە (فَمَاتَ) ئینجا بە هەردوو برینەکەی کافریو ئیسلامەتی مرد، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (لَمْ يُقْتَلْ) بریندارکەرەکە لەتۆڵە ناکوشترێتەوە، بەڵکو لە مەسەلەیەکەمدا خوێنی کوژراوەکەو تۆڵەی برینـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــە

بە قەسدییەکە واجب دەبێ، لە دووەمەکەشدا تەنها تۆڵەی برینی ئیسلامەتی واجب دەبێ.

(وَلَوْ دَاوَى جُرْحَهُ بِسُمٍّ مُذَفِّفٍ) ئەگەر بریندارەکە برینەکەی خۆی بە ژەهرێکی کوشندە دەرمان کردو بەو دەرمانکردنە مرد، ئەوە (فَلاَ قِصَاصَ عَلَى جَارِحِهِ) نە کوشتنەوەی لەتۆڵەو نە خوێن لە سەر بریندارکەرەکەی واجب نابێ، چونکە بەخۆی خۆی کوشتوە، کەوابو: تەنها تۆڵەی برینەکە لە سەر بریندارکەرەکە واجب دەبێ.

بەڵام (وَإِنْ لَمْ يَقْتُلِ السُّمُّ غَالِبًا) ئەگەر ژەهرەکە بە ئەغلەبی نەیدەکوشت، ئەو کاتە (فَشِبْهُ عَمْدٍ) دەرمانکردنەکە کوشتنی وێنەی بە قەسدییە، کەواتە: لێرەشدا بریندارکەرەکە لە تۆڵە ناکوشترێتەوە، بەڵام نیوەی خوێنی کوژراوەکەو تۆڵەی برینەکەی لێوەردەگیرێ.

(وَإِنْ قَتَلَ غَالِبًا) ئەگەر ژەهرەکە بە ئەغلەبی دەیکوشتو (وَعَلِمَ حَالَهُ) بریندارەکەش دەیزانی بە ئەغلەبی دەکوژێو خۆی پێ دەرمان کردو مرد، ئەو کاتە (فَشَرِيكُ جَارِحِ نَفْسِهِ) بریندارکەرەکە وەك هاوبەشی کەسێکە کە خودیخۆی بریندار بکاو بمرێ، واتە: لە تۆڵە دەکوشترێتەوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (هُوَ شَرِيكُ مُخْطِئٍ) هاوبەشی بکوژێکی بە هەڵەیە، واتە: لە تۆڵە ناکوشترێتەوە.

(وَلَوْ ضَرَبُوهُ بِسِيَاطٍ) ئەگەر کۆمەڵێك بە شوڕکەدار لە مرۆڤێکیان دا (فَقَتَلُوهُ) جا بەو لێدانە کوشتیان (وَضَرْبُ كُلِّ وَاحِدٍ غَيْرُ قَاتِلٍ) لێدانی هەر یەکێکیان بە تەنها کوشندە نەبو، ئەوە (فَفِي الْقِصَاصِ عَلَيْهِمْ أَوْجُهٌ) لەبارەی کوشتنەوەی گشتیان لەتۆڵە، سێ فەرموودە هەنە: (أَصَحُّهَا يَجِبُ إنْ تَوَاطَئُوا) ڕاسترەکەیان: کوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر گشتیان واجبە، ئەگەر گشتیان لە سەر لێدانەکەی ڕێك کەوتبنو لێدانی هەریەکەشیان کاری لە

گیاندەرچوونەکە کردبێ.

(وَمَنْ قَتَلَ جَمْعًا مُرَتَّبًا) هەر کەسێك کۆمەڵە مرۆڤێك-یەك لە دوای یەك- بکوژێ، ئەوە (قُتِلَ بِأَوَّلِهِمْ) لە تۆڵەی یەکەمەکەیان دەکوشترێتەوەو خوێنی ئەوانیتریش لە میراتەکەی

أَوْ مَعًا فَبِالْقُرْعَةِ، وَلِلْبَاقِينَ اَلدِّيَاتُ، قُلْتُ: فَلَوْ قَتَلَهُ غَيْرُالأَوَّلِ عَصَى وَوَقَعَ قِصَاصًا، وَلِلأَوَّلِ دِيَةٌ وَاللهُ أَعْلَمُ.

(فَصْلٌ) جَرَحَ حَرْبِيًّا أَوْ مُرْتَدًّا أَوْ عَبْدَ نَفْسِهِ فَأَسْلَمَ وَعَتَقَ ثُمَّ مَاتَ بِالْجُرْحِ فَلاَ ضَمَانَ، وَقِيلَ: تَجِبُ دِيَةٌ، وَلَوْ رَمَاهُمَا فَأَسْلَمَ وَعَتَقَ فَلاَ قِصَاصَ،

---

وەردەگیرێ (أَوْ مَعًا) یان کۆمەڵێکی وێکڕا کوشتن: وەك خانوویێك بە سەریاندا برووخێنێ، یان بۆمبێك بتەقێنێ، ئەو کاتە (فَبِالْقُرْعَةِ) بە پشکەکردن لە تۆڵەی یەکێکیان دەکوشترێتەوەو (وَلِلْبَاقِينَ اَلدِّيَاتُ) بۆ ئەوانیتریش خوێن لە میراتەکەی وەردەگیرێ، جا لەو دوو حاڵەتەدا ئەگەر میراتەکەی بەرووەستی خوێنی گشتیانی نەدەکرد، ئەو کاتە بە گوێرەی مافی خۆیان میراتەکە لە نێوانیاندا بەش دەکرێ، جا ئەگەر خاوەن مافەکەی یەکەم لە کوشتن عەفوی کرد ئەو کاتە ئەوەکەیتر لە تۆڵەی کوژراویخۆی دەیکوژێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی) دا فەرمویانە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (فَلَوْ قَتَلَهُ غَيْرُ الأَوَّلِ) ئەگەر جگە لە خاوەن مافەکەی یەکەم، یان جگە لە خاوەن پشکەکە یەکێکیان بکوژەکەی لە تۆڵەی کوژراوەکەیخۆی کوشتەوە، ئەوە (عَصَى وَوَقَعَ قِصَاصًا) گوناهبار دەبێ، بەڵام بە بەر کوشتنەوەی لەتۆڵەیخۆی دەکەوێ، کەوابو: (وَلِلأَوَّلِ دِيَةٌ) خاوەن مافەکەی یەکەم، یان خاوەن پشکەکە خوێنی کوژراوەکەی لە میراتی بکوژەکە دەدرێتێ (وَاللهُ أَعْلَمُ).

جا ئەگەر گشتیان وێکڕا لەتۆڵە کوشتیانەوە، ئەو کاتەش پاشماوەی بەشەخوێنەکەیان هەر دەمێنێ، بۆ وێنە ئەگەر سێ خاوەن ماف وێکڕا لەتۆڵە بیکوژنەوە، ئەو کاتەش هەریەکەیان دوو سێیەکی خوێنی کوژراوەکەی لە میراتی بکوژەکە وەردەگرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

### ﴿ فَصْلٌ: لە باسی گۆڕانی حاڵی بریندارکراوەکە ﴾

(جَرَحَ حَرْبِيًّا أَوْ مُرْتَدًّا أَوْ عَبْدَ نَفْسِهِ) هەر کاتێك کافرێکیجەنگی، یان موسوڵمانێکی کافربوو، یان کۆیلەکەیخۆی بریندار کرد (فَأَسْلَمَ وَعَتَقَ) ئینجا بریندارکراوەکافرەکە بووە موسوڵمان، کۆیلەکەش ئازاد بوو (ثُمَّ مَاتَ بِالْجُرْحِ) ئینجا بریندارکراوەکە بەو برینە مرد، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ) هیچ زامینبوونێك-نە بە کوشتنەوەی لەتۆڵەو نە بەخوێن- نیە، چونکە لە کاتی بریندارکردنەکەدا تۆڵەی نەبوە (وَقِيلَ: تَجِبُ دِيَةٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: خوێنی لە سەر واجب دەبێ.

(وَلَوْ رَمَاهُمَا) ئەگەر چەكێكی هاویشت بۆ كافرەكەو بۆ كۆیلەكە (فَأَسْلَمَ وَعَتَقَ) جا لە دوای هاویشتن كافرەكە بووە موسوڵمانو كۆیلەكەش ئازاد بوو، ئینجا چەكەكەیان وێكەوتو كوشتنی، ئەوەش (فَلاَ قِصَاصَ) كوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سەر نیە، چونكە لە كاتی

وَالْمَذْهَبُ وُجُوبُ دِيَةِ مُسْلِمٍ مُخَفَّفَةً عَلَىالْعَاقِلَةِ، وَلَوْ اِرْتَدَّ الْمَجْرُوحُ وَمَاتَ بِالسِّرَايَةِ فَالنَّفْسُ هَدَرٌ، وَيَجِبُ قِصَاصُ الْجُرْحِ فِي الأَظْهَرِ يَسْتَوْفِيهِ قَرِيبُهُ الْمُسْلِمُ وَقِيلَ الإِمَامُ، فَإِنْ اِقْتَضَىالْجُرْحُ مَالاً وَجَبَ أَقَلُّ الأَمْرَيْنِ: مِنْ أَرْشِهِ وَدِيَةٍ، وَقِيلَ أَرْشُهُ، وَقِيلَ هَدَرٌ، وَلَوْ اِرْتَدَّ ثُمَّ أَسْلَمَ فَمَاتَ بِالسِّرَايَةِ فَلاَ قِصَاصَ، وَقِيلَ إِنْ قَصُرَتِ الرِّدَّةُ وَجَبَ، وَتَجِبُ الدِّيَةُ وَفِي قَوْلٍ نِصْفُهَا، وَلَوْ جَرَحَ مُسْلِمٌ ذِمِّيًّا فَأَسْلَمَ أَوْ حُرٌّ عَبْدًا فَعَتَقَ

---

هاویشتن تۆڵەی نیە، بەڵام (وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (وُجُوبُ دِيَةِ مُسْلِمٍ مُخَفَّفَةً) خوێنێكیسووككراوی موسوڵمانێك واجب دەبێ (عَلَىالْعَاقِلَةِ) لە سەر خزمەكانی بكوژەكە، چونكە لە كاتی وێكەوتندا كوژراوەكە موسوڵمانێكی ئازاد بووە.

(وَلَوْ اِرْتَدَّالْمَجْرُوحُ) ئەگەر بریندارکراوەكە بووە كافر، ئینجا (وَمَاتَ بِالسِّرَايَةِ) بە پێداڕۆیشتنی برینەكە بە كافری مرد، ئەوە (فَالنَّفْسُ هَدَرٌ) گیانەكەی بە فیڕۆ دەدرێ: نەخوێنو نە تۆڵەو نە كەففارەتی نیە، چونكە بە كافربوویی مردوە، بەڵام (وَيَجِبُ قِصَاصُ الْجُرْحِ فِيالأَظْهَرِ) تۆڵەی برینەكەی واجب دەبێ، لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە لە حاڵەتی ئیسلامەتیدا جێگیر بووە، كەوابو: (يَسْتَوْفِيهِ قَرِيبُهُ الْمُسْلِمُ) خزمێكی موسوڵمانی كافربووەكە بریندارکەرەكە—لەتۆڵە— بریندار دەكاتەوە (وَقِيلَ الإِمَامُ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: پێشەوای موسوڵمانان لەتۆڵە بریندار دەكاتەوە.

بەڵام (فَإِنْ اِقْتَضَىالْجُرْحُ مَالاً) ئەگەر برینیكافربووەكە ماڵی واجب دەكردو تۆڵەكردنەوەی نەبو، ئەو كاتە (وَجَبَ أَقَلُّ الأَمْرَيْنِ: مِنْ أَرْشِهِ وَدِيَةٍ) لە خوێنی برینەكەیو لە خوێنی گیانەكەی كامەیان كەمترە، ئەویان واجبە بدرێتە (بيت المال)، واتە: هیچی نادرێتە میراتگرەكانی (وَقِيلَ أَرْشُهُ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: خوێنی برینەكە واجبە (وَقِيلَ هَدَرٌ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بە فیڕۆ دەدرێ.

(وَلَوْ اِرْتَدَّ) ئەگەر بریندارکراوەكە بووە كافر (ثُمَّ أَسْلَمَ) ئینجا هەر بە برینداری بۆوە موسوڵمان (فَمَاتَ بِالسِّرَايَةِ) ئنجا بە پێداڕۆیشتنی برینەكە بە موسوڵمانی مرد، ئەو كاتەش (فَلاَ قِصَاصَ) كوشتنەوەی لەتۆڵە واجب نیە، چونكە كافربوون كەوتۆتە نێوان برینەكەو مردنەكە (وَقِيلَ إِنْ قَصُرَتِ الرِّدَّةُ وَجَبَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: ئەگەر ماوەی كافربوونەكە كورت بێ كوشتنەوەی لەتۆڵە واجب دەبێ، بەڵام (وَتَجِبُ الدِّيَةُ) لە سەر فەرموودەی ڕاست: خوێنی مردووەكە بە تەواوی لە سەر بریندارکەرەكەی واجب دەبێ، چونكە بریندارکردنو پێمردنەكەی لە حاڵەتی ئیسلامەتیدا بووە (وَفِي قَوْلٍ

نِصْفُهَا) له فەرمودەیەكدا: نیوەی خوێنی واجب دەبێ.
(وَلَوْ جَرَحَ مُسْلِمٌ ذِمِّيًّا) ئەگەر موسوڵمانێك گاورێكی، یان جولەكەیەكی پەیمان لەئەستۆی بریندار كرد (فَأَسْلَمَ) ئینجا لە دوای بریندارکردنەکە بوە موسوڵمان (أَوْ حُرٌّ عَبْدًا فَعَتَقَ) وَمَاتَ بِالسِّرَايَةِ فَلاَ قِصَاصَ، وَتَجِبُ دِيَةُ مُسْلِمٍ وَهِيَ لِسَيِّدِالْعَبْدِ، فَإِنْ زَادَتْ عَلَى قِيمَتِهِ فَالزِّيَادَةُ لِوَرَثَتِهِ، وَلَوْ قَطَعَ يَدَ عَبْدٍ فَعَتَقَ ثُمَّ مَاتَ بِسِرَايَةٍ فَلِلسَّيِّدِ الأَقَلُّ مِن الدِّيَةِالْوَاجِبَةِ وَنِصْفِ قِيمَتِهِ، وَفِي قَوْلٍ الأَقَلُّ مِن الدِّيَةِ وَقِيمَتِهِ، وَلَوْ قَطَعَ يَدَهُ فَعَتَقَ فَجَرَحَهُ آخَرَانِ وَمَاتَ بِسِرَايَتِهِمْ فَلاَ قِصَاصَ عَلَىالأَوَّلِ إنْ كَانَ حُرًّا وَيَجِبُ عَلَىالآخَرَيْنِ.
(فَصْلٌ) يُشْتَرَطُ لِقِصَاصِ الطَّرَفِ وَالْجُرْحِ مَا شُرِطَ لِلنَّفْسِ،

---

یان ئازادێك كۆیلەیەكی بریندار كرد، ئینجا كۆیلەكە ئازاد بوو، ئینجا (وَمَاتَ بِالسِّرَايَةِ) بریندارکراوەکە بە پێداڕۆیشتنی برینەكە مرد، ئەوە (فَلاَ قِصَاصَ) لە هەردوو مەسەلەكەدا كوشتنەوی لەتۆڵە واجب نابێ، چونكە لە كاتی بریندارکردنەكەدا هاوچەشن نەبون، بەڵام (وَتَجِبُ دِيَةُ مُسْلِمٍ) لە هەردوو مەسەلەكەدا خوێنی موسوڵمانێكی ئازاد لە سەر بریندارکەرەكە واجب دەبێ (وَهِيَ لِسَيِّدِ الْعَبْدِ) لە مەسەلەی دووەمدا خوێنەكە بۆ گەورەی كۆیلەكەیە (فَإِنْ زَادَتْ عَلَى قِيمَتِهِ) جا ئەگەر خوێنەكە لە نرخی كۆیلەكە زیاتر بوو، ئەو كاتە (فَالزِّيَادَةُ لِوَرَثَتِهِ) زیادەكە بۆ میراتگرەكانی كۆیلەكەیە.
(وَلَوْ قَطَعَ يَدَ عَبْدٍ فَعَتَقَ) ئەگەر دەستی كۆیلەیەكی لێكردەوە، ئینجا كۆیلەكە ئازاد بوو (ثُمَّ مَاتَ بِسِرَايَةٍ) ئینجا بە پێداڕۆشتنی برینەكە مرد، ئەوە (فَلِلسَّيِّدِ الأَقَلُّ) گەورەكەی مافی كەمترەكەی هەیە: (مِنَ الدِّيَةِ الْوَاجِبَةِ وَنِصْفِ قِيمَتِهِ) لە تەواوی خوێنەكەیو لە نیوەی نرخەكەی (وَفِي قَوْلٍ الأَقَلُّ مِنَ الدِّيَةِ وَقِيمَتِهِ) لە فەرموودەیەكدا: كەمترەكەی هەیە: لە خوێنەكەیو لە هەموو نرخەكەی.
(وَلَوْ قَطَعَ يَدَهُ فَعَتَقَ) ئەگەر دەستی كۆیلەیەكی لێكردەوە، ئینجا كۆیلەكە ئازاد بوو (فَجَرَحَهُ آخَرَانِ) جا دووكەسیتریش كۆیلەكەیان بریندار كرد (وَمَاتَ بِسِرَايَتِهِمْ) ئینجا بە پێداڕۆشتنی هەرسێك برینەكان مرد، ئەوە (فَلاَ قِصَاصَ عَلَى الأَوَّلِ إِنْ كَانَ حُرًّا) كوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر یەكەمەكە واجب نیە ئەگەر ئازاد بێ، بەڵام (وَيَجِبُ عَلَىالآخَرَيْنِ) لە سەر دووەكانیتر واجبە؟ چونكە لەگەڵ كۆیلەكە یەكسانن.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەكانی تۆڵەكردنەوەی ئەندامەكانو برینەكان ﴾

(يُشْتَرَطُ لِقِصَاصِ الطَّرَفِ وَالْجُرْحِ) بە مەرج دادەندرێ بۆ تۆڵەكردنەوی ئەندامو برین: (مَا شُرِطَ لِلنَّفْسِ) ئەوەی بۆ تۆڵەی گیان بە مەرج داندرا بوو و لە مەرجەكانی كوشتنەوی لەتۆڵەدا ڕوونمان كردەوە، واتە: تاوانكارەكە شێتو منداڵ نەبێو پابەندی بڕیارەكانی

شەریعەت بوبێ‌و دایك‌و باوكی بریندارکراوەکە نەبێ.
هەروەها بریندارکراوەکەش خوێنی پارێزراو بێ: بە ئیسلامەتی، یان بە دڵنیاکردن، هەم لەگەڵ تاوانکەرەکە یەکسان بێ، هەروەها تاوانەکەش بە قەسدی بێ.
وَلَوْ وَضَعُوا سَيْفًا عَلَى يَدِهِ وَتَحَامَلُوا عَلَيْهِ دَفْعَةً فَأَبَانُوهَا قُطِعُوا، وَشِجَاجُ الرَّأْسِ وَالْوَجْهِ عَشْرٌ: حَارِصَةٌ وَهِيَ مَا شَقَّ الْجِلْدَ قَلِيلاً، وَدَامِيَةٌ تُدْمِيهِ، وَبَاضِعَةٌ تَقْطَعُ اللَّحْمَ، وَمُتَلاَحِمَةٌ تَغُوصُ فِيهِ، وَسِمْحَاقٌ تَبْلُغُ الْجِلْدَةَ الَّتِى بَيْنَ اللَّحْمِ وَالْعَظْمِ، وَمُوضِحَةٌ تُوضِحُ الْعَظْمَ، وَهَاشِمَةٌ تَهْشِمُهُ، وَمُنَقِّلَةٌ تَنْقُلُهُ، وَمَأْمُومَةٌ تَبْلُغُ خَرِيطَةَ الدِّمَاغِ، وَدَامِغَةٌ تَخْرِقُهَا، وَيَجِبُ الْقِصَاصُ فِي الْمُوضِحَةِ فَقَطْ، وَقِيلَ وَفِيمَا قَبْلَهَا سِوَىالْحَارِصَةِ، وَلَوْ أَوْضَحَ فِي بَاقِىالْبَدَنِ أَوْ قَطَعَ بَعْضَ مَارِنٍ أَوْ أُذُنٍ

---

(وَلَوْ وَضَعُوا سَيْفًا عَلَى يَدِهِ) ئەگەر كۆمەڵێك شمشێرێكیان لە سەر دەستیكەسێك داناو (وَتَحَامَلُوا عَلَيْهِ دَفْعَةً) وێکڕا گرانایی‌خۆیان خستە سەر دەستەکەو (فَأَبَانُوهَا) دەستەکەیان لێکردەوە، ئەوە (قُطِعُوا) گشتیان دەستیان لێدەکرێتەوە، هەروەك ئەگەر وێکڕا مرۆڤەکەیان كوشتبا گشتیان لەتۆڵە دەكوشترانەوە، لە باسی هاوبەشی کوشتندا ڕوونمان کردەوە.
(وَشِجَاجُ الرَّأْسِ وَالْوَجْهِ عَشْرٌ) برینەکانی سەر و ڕوو دە برینن: یەکەم: (حَارِصَةٌ)ی پێدەگوترێ (وَهِيَ مَا شَقَّ الْجِلْدَ قَلِيلاً) کە کەمێك پێستەی بریندار کردبێ. (وَ) دووەم: (دَامِيَةٌ) کە (تُدْمِيه) خوێنی لێبێنێ. (وَ) سێیەم: (بَاضِعَةٌ) کە (تَقْطَعُ اللَّحْمَ) گۆشتەکەش ببڕێ. (وَ) چوارەم: (مُتَلاَحِمَةٌ) کە (تَغُوصُ فيه) بە گۆشتەکەدا ڕۆچوبێ. (وَ) پێنجەم: (سِمْحَاقٌ) کە (تَبْلُغُ الْجِلْدَةَ الَّتِى بَيْنَ اللَّحْمِ وَالْعَظْمِ) بگاتە پێستەکەی نێوان گۆشتەکەو ئێسقانەکە. (وَ) شەشەم: (مُوضِحَةٌ) ئاشکراکەرە: کە (تُوضِحُ الْعَظْمَ) ئێسقانەکە لە ناو برینەکەدا بە دەر بخا. (وَ) حەفتەم: (هَاشِمَةٌ) شکێنەرە: کە (تَهْشِمُهُ) ئێسقانەکە بشکێنێ، هەرچەند لە برینەکەشدا ئاشکرای نەکا. (وَ) هەشتەم: (مُنَقِّلَةٌ) کە (تَنْقُلُهُ) ئێسقانەکە لە شوێنیخۆی لابداتە شوێنێکیتر، هەرچەند ئێسقانەکەشی نەشکاندبێ‌و ئاشکراشی نەکردبێ. (وَ) نۆیەم: (مَأْمُومَةٌ) کە (تَبْلُغُ خَرِيطَةَ الدِّمَاغِ) برینەکە بگاتە پێستەی مێشك. (وَ) دەیەم: (دَامِغَةٌ)کە (تَخْرِقُهَا) پێستەیمێشك ببڕێ‌و بگاتە مێشك، کە بە ئەغڵەبی مرۆڤ دەکوژێ.
ئینجا (وَيَجِبُ الْقِصَاصُ فِىالْمُوضِحَةِ فَقَطْ) بریندارکردنەوەی لەتۆڵە تەنها لە ئاشکراکەرەکەدا واجبەو لە نۆیەکانیتردا دروست نیە، چونکە لە گشت برین‌و شکستەکانیتری سەرو لاشەدا: یان خوێن، یان (حُكُومَة)، واتە: نرخیبرینەکەو شکستەکە واجب دەبێ‌و دادوەر دیاری دەکا، هەروەك لەباسی (خوێنی برین‌و ئەندامەکاندا) ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى.

(وَقِيلَ): له فەرموودەیەکی بێهێزدا (وَفِيمَا قَبْلَهَا سِوَى الْحَارِصَةِ) لـه برینـەکانیتری پـێش ئاشکراکەرەکەش-جگە لە یەکەمەکە- بریندارکردنەوەی لەتۆڵە واجب دەبێ.

(وَلَوْ أَوْضَحَ فِي بَاقِيالْبَدَنِ)ئەگەر-جگە لە سەر- لە شوێنەکانیتری لاشەدا ئێسقانەکەی لە برینەکەدا بە دەر خست (أَوْ قَطَعَ بَعْضَ مَارِنٍ) یان بەشێکی نەرمە لووتی بڕی (أَوْ أُذُنٍ) یان

وَلَمْ يُبِنْهُ وَجَبَ الْقِصَاصُ فِالأَصَحِّ، وَيَجِبُ فِالْقَطْعِ مِنْ مَفْصِلٍ حَتَّى فِي أَصْلِ فَخِذٍ وَمَنْكِبٍ إِنْ أَمْكَنَ بِلاَ إِجَافَةٍ، وَإِلاَّ فَلاَ عَلَالصَّحِيحِ، وَيَجِبُ فِي فَقْءِ عَيْنٍ وَقَطْعِ أُذُنٍ وَجَفْنٍ وَمَارِنٍ وَشَفَةٍ وَلِسَانٍ وَذَكَرٍ وَأُنْثَيَيْنِ، وَكَذَا أَلْيَانِ وَشُفْرَانِ فِالأَصَحِّ، وَلاَ قِصَاصَ فِي كَسْرِالْعِظَامِ، وَلَهُ قَطْعُ أَقْرَبِ مَفْصِلٍ إِلَى مَوْضِعِ الْكَسْرِ وَحُكُومَةُ الْبَاقِي،

---

بەشێکی گوێی بڕی (وَلَمْ يُبِنْهُ) بەشەکەشی لێنەکردەوە، بەڵکو بە پارچە پێستەیەکەوە مابۆوە، ئەوە (وَجَبَ الْقِصَاصُ) لە هەر سێکیاندا تۆڵەکردنەوە واجب دەبێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾ تۆڵەی برینەکان بریندارکردنەوەی لەتۆڵەیە. جا بزانە: بۆیێ لە برینەکانیتردا بریندارکردنەوەی لەتۆڵە دروست نیە، چونکە هاووێنەیی ناگونجێ.

(وَيَجِبُ فِيالْقَطْعِ مِنْ مَفْصِلٍ) لێکردنەوی لەتۆڵە واجب دەبێ لەتۆڵەی لێکردنەوەی ئەندامێك لە جومگەیەوە: وەك ئەژنۆ و ئەنیشك (حَتَّى فِي أَصْلِ فَخِذٍ وَمَنْكِبٍ) تا لە بنچینەی ڕانو شانیشدا واجب دەبێ (إِنْ أَمْكَنَ بِلاَ إِجَافَةٍ) ئەگەر لێکردنەوەکە بێ دووبەدەرکردنی برینەکە بگونجێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نەگونجا، بەڵکو برینەکە بۆ ناو لاشەی دووبەدەر دەبوو، ئەو کاتە (فَلاَ عَلَىالصَّحِيحِ) تۆڵەکردنەوە دروست نیە، لە سەر فەرموودەی ڕاست، بەڵکو خوێنی ئەندامەکەی وەردەگیرێ.

(وَيَجِبُ فِي فَقْءِ عَيْنٍ) تۆڵەکردنەوە واجب دەبێ لە چاو دەرهێنان، هەم (وَقَطْعِ أُذُنٍ) لە لێکردنەوەی گوێو (وَجَفْنٍ) لە لێکردنەوی پێڵوو و (وَمَارِنٍ) لە لێکردەوەی هەموو نەرمە لوتو (وَشَفَةٍ) لە لێکردنەوەی لێو و (وَلِسَانٍ) لە لێکردنەوەی زوبانو (وَذَكَرٍ) لە لێکردنەوەی ئەندامی جیماعکردنی پیاو و (وَأُنْثَيَيْنِ) لە لێکردنەوەی هەردوو گونەکانیو (وَكَذَا أَلْيَانِ) هەروەها لە لێکردنەوەی هەردوو لاقینگەکانو (وَشُفْرَانِ) لە لێکردنەوەی هەردوو لێوی (فَرج)ی ئافرەت (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَ قِصَاصَ فِي كَسْرِالْعِظَامِ) تۆڵەکردنەوە دروست نیە: لە شکاندنی ئێسقانەکاندا ئەگەر ئەندامەکەی لێنەکرابێتەوە، چونکە هاووێنەیی ناگونجێ، کەواتە: نرخی شکستەکە واجب دەبێ، هەروەك لە باسی (خوێنی برینو ئەندامەکاندا) ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى.

بەڵام (وَلَهُ) ئەو کەسەی ئەندامێکی لێکراوەتەوە بۆی دروستە: (قَطْعُ أَقْرَبِ مَفْصِلٍ إِلَى مَوْضِعِ الْكَسْرِ) لە نزیکترین جومگەوە بە لای شوێنی شکاندنەکەوە هەمان ئەندامی

تاوانکارەکە لێبکاتەوەو هەم (وَحُكُومَةُ الْبَاقِي) نرخی ئەو بەشەش کە لە جومگەکـە بـەو لاوەیە وەربگرێ، چونکە شکاندنەوەی ئێسقان لەتۆڵە دروست نیە:

بۆ وێنە: ئەگەر لە ناوەندی باسکیەوە دستی لێکرابێوە، ئەوە لەپەدەستی تاوانکارەکە لە جومگەوە لێدەکاتەوەو نرخـی ئێسـقانەکەیتریش-تـا دەگاتـە ناوەنـدی باسـکەکە-

وَلَــوْ أَوْضَــحَهُ وَهَشَــمَ أَوْضَــحَ وَأَخَــذَ خَمْسَــةَ أَبْعِــرَةٍ، وَلَــوْ أَوْضَــحَ وَنَقَـلَ أَوْضَـحَ وَلَـهُ عَشَـرَةُ أَبْعِـرَةٍ، وَلَـوْ قَطَعَـهُ مِـنَ الْكُـوعِ فَلَـيْسَ لَـهُ اِلْتِقَـاطُ أَصَـابِعِهِ، فَـإِنْ فَعَلَـهُ عُـزِّرَ وَلاَ غُـرْمَ، وَالأَصَـحُّ أَنَّ لَـهُ قَطْـعَ الْكَـفِّ بَعْـدَهُ، وَلَـوْ كَسَـرَ عَضُـدَهُ وَأَبَانَـهُ قُطِـعَ مِـنَ الْمِرْفَـقِ وَلَـهُ حُكُومَـةُ الْبَـاقِي، فَلَـوْ طَلَـبَ الْكُـوعَ مُكِّـنَ فِالأَصَـحِّ، وَلَوْ أَوْضَحَهُ فَذَهَبَ ضَوْئُهُ أَوْضَحَهُ فَإِنْ ذَهَبَ الضَّوْءُ وَإِلاَّ أَذْهَبَهُ بِأَخَفِّ مُمْكِنٍ:

---

وەردەگرێ، هەروەهاش بۆی دروستە لە تۆڵەکردنەوە عەفوی بکاو خوێنی دەستەکەی بە تەواوی لێوەربگرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ أَوْضَحَهُ وَهَشَمَ) ئەگەر ئێسقانەکەی لە برینەکەدا بە دەر خستو شکاندیشی، ئەو کاتە (أَوْضَحَ) بە برینێکیئاشکراکەر تاوانکارەکە لەتۆڵە بریندار دەکاتەوەو هەم (وَأَخَذَ خَمْسَةَ أَبْعِرَةٍ) پێـنج ووشـتریش خـوێنی شـکاندنەکەی لێـوەردەگرێ (وَلَـوْ أَوْضَـحَ وَنَقَـلَ) ئەگـەر ئێسقانەکەی لە برینەکەدا بە دەر خستو لە شوێنیخۆیشی لایدا شوێنێکیتر، ئەو کاتەش (أَوْضَحَ) بە برینێکی ئاشکراکەر تاوانکارەکە لەتۆڵە بینـدار دەکاتـەوەو هـەم (وَلَـهُ عَشَـرَةُ أَبْعِرَةٍ) مافی دە ووشتریشی هەیە لێی وەربگرێ لە خوێنی لادانی ئێسقانەکە.

(وَلَوْ قَطَعَهُ مِنَ الْكُوعِ) ئەگەر دەستەکەی لە جومگەی بازنەوە لێکردەوە، ئەوە (فَلَيْسَ لَهُ الْتِقَاطُ أَصَابِعِهِ) بۆی دروست نیە پەنجەکانی تاوانکارەکە لێبکاتەوە (فَإِنْ فَعَلَهُ) جا ئەگەر پەنجەکانی تاوانکارەکەی لێکردنەوە، ئەو کاتە (عُزِّرَ) تـەمبێ دەکـرێ، هەرچـەند تـەنها پەنجەیەکیش بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (وَلاَ غُرْمَ) تۆڵەی پەنجەکانی ناکەوێتە سەر، هەم (وَالأَصَـحُّ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر (أَنَّ لَـهُ قَطْـعَ الْكَـفِّ بَعْـدَهُ) لـە دوای لێکردنـەوەی پەنجەکانیش بۆی دروستە: لەپەدەستەکەش-لە تۆڵە- لێبکاتەوە.

(وَلَوْ كَسَرَ عَضُدَهُ وَأَبَانَهُ) ئەگەر قۆڵی شکاندو لێیکردەوە، ئەوە (قُطِعَ مِنَ الْمِرْفَقِ) لـە ئەنیشکەوە دەستی تاوانکارەکە لێدەکاتەوە، هەم (وَلَهُ حُكُومَةُ الْبَاقِي) مافی هەیە نرخی ئێسقانەکەیتریش-تا دەگاتە شوێنی لێکردنەوە- لێی وەربگرێ (فَلَوْ طَلَبَ الْكُوعَ) ئەگەر داوای کرد لە جومگەی بازنەوە لێی بکاتەوە، ئـەوە (مُكِّنَ فِيالأَصَحِّ) لـە فـەرموودەی ڕاسـتتردا: ڕێگـەی دەدرێتـێو هـەم نرخـی ئێسـقانەکەیتریش-تـا دەگاتـە شـوێنی لێکردنەوەکە- وەربگرێ.

(وَلَـوْ أَوْضَـحَهُ فَـذَهَبَ ضَـوْءُهُ) ئەگـەر بـە برینێکیئاشـکراکەر برینـداری کـردو بینینـی چاوەکانی ڕۆیشتو کوێر بوو، ئەوە (أَوْضَحَهُ) برینێکی ئاشـکراکەری تێدەکاتـەوە (فَـإِنْ ذَهَـبَ الضَّـوْءُ) جـا ئەگـەر بینینـی چـاوەکانی تاوانکارەکـەش ڕۆیشـت، ئـەوە دەبێتـە تۆڵەکردنەوە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بینینەکەی نەڕۆیشـت، ئـەو کاتـە (أَذْهَبَـهُ بِـأَخَفِّ مُمْكِـنٍ) كَتَقْرِيــبِ حَدِيــدَةٍ مُحْمَــاةٍ مِــنْ حَدَقَتِــهِ، وَلَــوْ لَطَمَــهُ لَطْمَــةً تُــذْهِبُ ضَــوْءَهُ غَالِبًـــا فَـــذَهَبَ لَطَمَـــهُ مِثْلَهَـــا فَـــإِنْ لَـــمْ يَـــذْهَبْ أُذْهِـــبَ، وَالسَّـــمْعُ كَالْبَصَــرِ يَجِــبُ الْقِصَــاصُ فِيــهِ بِالسِّــرَايَةِ، وَكَــذَا الْــبَطْشُ وَالــذَّوْقُ وَالشَّــمُّ فِــي الأَصَــحِّ، وَلَــوْ قَطَــعَ أُصْــبُعًا فَتَأَكَّــلَ غَيْرُهَــا فَــلاَ قِصَــاصَ فِــي الْمُتَأَكِّــلِ.

(بَابُ كَيْفِيَّةِ الْقِصَاصِ وَمُسْتَوْفِيهِ وَالإِخْتِلاَفُ فِيهِ)

لاَ تُقْطَعُ يَسَارٌ بِيَمِينٍ، وَلاَ شَفَةٌ سُفْلَى بِعُلْيَا وَعَكْسُهُ، وَلاَ أُنْمُلَةٌ بِأُخْرَى،

---

بە سوکترینی گونجان دەیڕۆێنێ: (كَتَقْرِيبِ حَدِيدَةٍ مُحْمَاةٍ مِنْ حَدَقَتِهِ) وەك نزیککردنـەوەی ئاسنێکی سورکراوە لە گلێنەی چاوەکانی تا کوێر دەبێ.

(وَلَوْ لَطَمَهُ لَطْمَةً تُذْهِبُ ضَوْءَهُ غَالِبًا) ئەگەر لەپەدەستێکی وەهای لەدەمو چاویدا: کە بە ئەغڵەبی بینینی چاوەکانی لادەبرد (فَذَهَبَ) ئینجا بینینەکەی بـەو لەپەدەسـتە ڕۆیشـتو کوێر بوو، ئەوەش (لَطَمَهُ مِثْلَهَا) لەپەدەستێکی وێنەی وی لێدەداتەوە (فَإِنْ لَمْ يَذْهَبْ) جا ئەگەر بینینی چاوی تاوانکارەکە نەڕۆیشتو کوێر نەبو، ئەو کاتە (أُذْهِبَ) بە هەر ڕێگایەکی سوکتر بگونجێ دەڕۆێندرێ، بەڵام لە هەر دوومەسەلەدا مەرجە گلێنەکەی بمێنێ، ئەگەرنا: خوێنی لێوەردەگیرێ.

(وَالسَّمْعُ كَالْبَصَرِ) لابردنی گوێلێبوون وەك لابردنی دیتن بڕیاری بۆ دەدرێ، واتـە: (يَجِـبُ الْقِصَاصُ فِيهِ بِالسِّرَايَةِ) تۆڵەکردنـەوەی تـێدا واجبـە بـە هـۆی پێداڕۆیشـتنی تاوانەکـە: تاوانکارەکە لە تۆڵەی کەڕکردن کەڕ دەکرێتەوە (وَكَذَا الْـبَطْشُ) هـەروەها لابردنـی هێـزی دەستو پێ، هەم (وَالذَّوْقُ وَالشَّمُّ) لابردنی تامکردنو بۆنکردن، ئەوانیش تۆڵەکردنەوەیان تێدا واجبە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ قَطَعَ أُصْبُعًا) ئەگەر پەنجەیەکی لێکردەوە (فَتَأَكَّلَ غَيْرُهَا) ئینجـا پەنجەیـەکیتریش خۆرکی گرتو لەناو چوو، ئەوە (فَلاَ قِصَاصَ فِي الْمُتَأَكِّلِ) لە خۆرکگرەکەدا تۆڵەکردنەوە نیە، بەڵکو خوێنەکەی لە تاوانکارەکە وەردەگیرێ.

﴿ بَابُ كَيْفِيَّةِالْقِصَاصِ: **باسی چۆنیەتی تۆڵەکردنەوەو** (وَمُسْتَوْفِيهِ) **ئەو کەسەی تۆڵە دەکاتەوەو** (وَالإِخْتِلاَفُ فِيهِ) **کێشە لە تۆڵەکردنەوەدا** ﴾

(لاَ تُقْطَعُ يَسَارٌ بِيَمِينٍ) دروست نیەو نابێ ئەنـدامێکی چـەپە لەتۆڵـەی ئەنـدامێکی ڕاسـتە

لێبکرێتەوەو بە پێچەوانەش دروست نیە، هەم (وَلاَ شَفَةٌ سُفْلَى بِعُلْيَا وَعَكْسُهُ) دروست نیە لێوی خوارەوەش لەتۆڵەی لێوی سەرەوە لێبکرێتەوە، بە پێچەوانەش دروست نیە، واتە: هیچێکیان بەر تۆڵەکردنەوە ناکەوێ، هەرچەندەش هەر دوو لا ڕازی بن، چونکە یەکسانی نیە (وَ) هەروەها (لاَ أُنْمُلَةٌ بِأُخْرَى) دروست نیە سەرە پەنجەیەك، یان پەنجەیەك لە جیاتی

وَلاَ زَائِدٌ بِزَائِدٍ فِي مَحَلٍّ آخرَ، وَلاَ يَضُرُّ تَفَاوُتُ كِبَرٍ وَطُولٍ وَقُوَّةِ بَطْشٍ فِي أَصْلِيٍّ، وَكَذَا زَائِدٌ فِي الأَصَحِّ، وَيُعْتَبَرُ قَدْرُالْمُوضِحَةِ طُولاً وَعَرْضًا، وَلاَ يَضُرُّ تَفَاوُتُ غِلَظِ لَحْمٍ وَجِلْدٍ، وَلَوْ أَوْضَحَ كُلَّ رَأْسِهِ وَرَأْسُ الشَّاجِّ أَصْغَرُ اِسْتَوْعَبْنَاهُ وَلاَ نُتَمِّمُهُ مِن الْوَجْهِ وَالْقَفَا بَلْ يُؤْخَذُ قِسْطُ الْبَاقِي مِنْ أَرْشِ الْمُوضِحَةِ لَوْ وُزِّعَ عَلَى جَمِيعِهَا، وَإِنْ كَانَ رَأْسُ الشَّاجِّ أَكْبَرَ أُخِذَ قَدْرُ رَأْسِ الْمَشْجُوجِ فَقَطْ، وَالصَّحِيحُ أَنَّ الإِخْتِيَارَ فِي مَوْضِعِهِ إِلَى الْجَانِي،

---

یەکێکیتر لێبکرێتەوە، هەم (وَلاَ زَائِدٌ بِزَائِدٍ فِي مَحَلٍّ آخَرَ) دروست نیە: ئەندامێکی زیاد لەتۆڵەی ئەندامێکی زیاد لە شوێنێکیتردا لێبکرێتەوە.

(وَلاَ يَضُرُّ) لە تۆڵەکردنەوەدا زیانی نیە (تَفَاوُتُ كِبَرٍ وَطُولٍ وَقُوَّةِ بَطْشٍ فِيأَصْلِيٍّ) جیاوازی گەورەیی‌و درێژی‌و بەهێزیی ئەندامەکەی تاوانکارو تاوانکراوەسەر–کە ئەندامەکە بنچینەیی بێ– (وَكَذَا زَائِدٌ فِيالأَصَحِّ) هەروەها ئەگەر ئەندامەکە زیادیش بێ، ئەو جیاوازیانە زیانی نیە، لە فەرموودەیڕاستتردا، چونکە خوایگەورە–بێجیاوازی– فەرموویەتی: ﴿وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنْفَ بِالأَنْفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ﴾ چاو لەتۆڵەی چاو، لوت لەتۆڵەی لوت، گوێ لەتۆڵەی گوێ، ددان لەتۆڵەی ددان.

(وَيُعْتَبَرُ قَدْرُ الْمُوضِحَةِ طُولاً وَعَرْضًا) بۆ تۆڵەکردنەوە ئەندازەی برینە ئاشکراکەرەکە ڕەچاو دەکرێ: لە ڕووی درێژی‌و بەرینی (وَلاَ يَضُرُّ تَفَاوُتُ غِلَظِ لَحْمٍ وَجِلْدٍ) زیانی نیە جیاوازی ئەستووری گۆشت‌و پێستەی سەری تاوانکارو تاوانکراوەسەر.

(وَلَوْ أَوْضَحَ كُلَّ رَأْسِهِ) ئەگەر هەموو سەری بریندار کردو هەموو ئێسقانەکەشی ئاشکرا کرد (وَرَأْسُ الشَّاجِّ أَصْغَرُ) سەری بریندارکەرەکەش بچوکتر بوو لە سەری بریندارکراوەکە، ئەو کاتە (اِسْتَوْعَبْنَاهُ) هەموو سەری تاوانکارەکە بە ئاشکراکەر لەتۆڵە بریندار دەکەینەوە، بەڵام (وَلاَ نُتَمِّمُهُ مِنَ الْوَجْهِ وَالْقَفَا) دروست نیە ئەو ئەندازەی ماوە، لە ڕوو و پشت مل تەواوی بکەین (بَلْ يُؤْخَذُ قِسْطُ الْبَاقِي مِنْ أَرْشِ الْمُوضِحَةِ) بەڵکو بەشە خوێنی ئەو بەشەی ماوە لە خوێنی هەموو برینەکە وەردەگیرێ (لَوْ وُزِّعَ عَلَى جَمِيعِهَا) ئەگەر خوێنەکە بە سەر هەموویدا بەش بکرێ، بۆ وێنە: ئەگەر سەریبریندارکراوەکە دوو هەندی سەری تاوانکارەکە بوو، ئەوە هەموو سەری تاوانکارەکە لەتۆڵە بریندار دەکرێتەوەو نیوەی خوێنی برینەکەشی لێوەردەگیرێ.

بەلاَم (وَإِنْ كَانَ رَأْسُ الشَّاجِّ أَكْبَرَ) ئەگەر –لەم مەسەلەیەدا– سەری بریندارکەرەکە گەورەتر بوو، ئەو کاتە (أُخِذَ قَدْرُ رَأْسِ الْمَشْجُوجِ فَقَطْ) تەنها بە ئەندازەی هەموو سەری بریندارکراوەکە لە سەری تاوانکارەکە بریندار دەکرێتەوە، نەك زیاتر، ئینجا (وَالصَّحِيحُ) بە فەرموودەی ڕاست (أَنَّ الإِخْتِيَارَ فِي مَوْضِعِهِ إِلَى الْجَانِي) سەرپشکی لە دیاریکردنی

وَلَوْ أَوْضَحَ نَاصِيَةً وَنَاصِيَتُهُ أَصْغَرُ تُمِّمَ مِنْ بَاقِي الرَّأْسِ، وَلَوْ زَادَ الْمُقْتَصُّ فِي مُوضِحَةٍ عَلَى حَقِّهِ لَزِمَهُ قِصَاصُ الزِّيَادَةِ، فَإِنْ كَانَ خَطَأً أَوْ عَفَا عَلَى مَالٍ وَجَبَ أَرْشٌ كَامِلٌ، وَقِيلَ قِسْطٌ، وَلَوْ أَوْضَحَهُ جَمْعٌ أَوْضَحَ مِنْ كُلٍّ وَاحِدٍ مِثْلَهَا، وَقِيلَ قِسْطُهُ، وَلاَ تُقْطَعُ صَحِيحَةٌ بِشَلاَّءَ وَإِنْ رَضِيَ الْجَانِي، فَلَوْ فَعَلَ لَمْ يَقَعْ قِصَاصًا بَلْ عَلَيْهِ دِيَتُهَا، فَلَوْ سَرَى فَعَلَيْهِ قِصَاصُ النَّفْسِ،

---

شوێنی بریندارکردنەوەدا بۆ تاوانکارەکەیە، هەر لایەکی سەری‌خۆی دیاری بکا، ئەو لایە لەتۆڵە بریندار دەکرێتەوە.

(وَلَوْ أَوْضَحَ نَاصِيَةً) ئەگەر ئێسقانی پێشەسەری لە برینەکەدا ئاشکرا کرد (وَنَاصِيَتُهُ أَصْغَرُ) پێشەسەری تاوانکارەکەش بچوکتر بوو، ئەو کاتە (تُمِّمَ مِنْ بَاقِيالرَّأْسِ) ئەندازەی برینەکە لە شوێنێکی‌تری سەری تاوانکارەکە تەواو دەکرێ، ئینجا (وَلَوْ زَادَ الْمُقْتَصُّ فِي مُوضِحَةٍ عَلَى حَقِّهِ) ئەگەر تۆڵەوەرگرەکە –لە ئاشکراکەرەکەدا– بە قەسدی لە مافی خۆی زیاتر برینداری کردەوە، ئەو کاتە (لَزِمَهُ قِصَاصُ الزِّيَادَةِ) ئەویش بریندارکردنەوەی لەتۆڵەی ئەندازەی زیادەکەی دەکەوێتەوە سەر (فَإِنْ كَانَ خَطَأً أَوْ عَفَا عَلَى مَالٍ) جا ئەگەر زیادکردنەکە بە هەڵە بوو، یان لە سەر وەرگرتنی خوێن عەفوی کرد، ئەو کاتە (وَجَبَ أَرْشٌ كَامِلٌ) خوێنێکی تەواوی ئاشکراکەرێك واجب دەبێ (وَقِيلَ قِسْطٌ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: بەشە خوێنێك واجب دەبێ.

(وَلَوْ أَوْضَحَهُ جَمْعٌ) ئەگەر کۆمەڵێك  وێکڕا ئێسقانەکەیان لە برینەکەدا ئاشکرا کرد، ئەو کاتە (أَوْضَحَ مِنْ كُلٍّ وَاحِدٍ مِثْلَهَا) لە هەر یەکەیان وێنەی برینەکەی‌خۆی لەتۆڵە بریندار دەکاتەوە (وَقِيلَ قِسْطُهُ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: بە ئەندازەی بەشی خۆی لە هەموو برینەکە برینداری دەکاتەوە.

(وَلاَ تُقْطَعُ صَحِيحَةٌ بِشَلاَّءَ) دروست نیە: ئەندامێکی ساغ لەتۆڵەی ئەندامێکی لەکارکەوتوو لێ‌بکرێتەوە (وَإِنْ رَضِيَ الْجَانِي) هەرچەند تاوانکارەکەش ڕازی بێ، کەوابو: (فَإِنْ فَعَلَ) ئەگەر خاوەنی لەکارکەوتووەکە ئەندامە ساغەکەی تاوانکارەکەی –بێ‌ئیزن– لەتۆڵە لێ‌کردەوە (لَمْ يَقَعْ قِصَاصًا) بەر تۆڵەکردنەوە ناکەوێ (بَلْ عَلَيْهِ دِيَتُهَا) بەڵکو خوێنی ئەندامە ساغەکەی لە سەر  واجبە بیداتە تاوانکارەکەو ئەویش نرخی لەکارکەوتووەکەی

خۆی لە تاوانكارەكە وەردەگرێ (فَلَوْ سَرَى) جا ئەگەر لێكردنەوەی ساغەكە پێداڕۆیشتو تاوانكارەكە بەو لێكردنەوەیە مرد، ئەوكاتە (فَعَلَيْهِ قِصَاصُ النَّفْسِ) كوشتنەوەی لەتۆڵەشی لە سەرە، چونكە بە ناهەق كوشتنەكەی كردوە، بەڵام ئەگەر بە ئیزنی تاوانكارەكە ئەندامە ساغەكەی لەتۆڵە لێكردەوە، ئەو كاتە لەتۆڵە ناكوشترێتەوە، بەڵكو

وَتُقْطَعُ الشَّلاَّءُ بِالصَّحِيحَةِ إلاَّ أَنْ يَقُولَ أَهْلُ الْخِبْرَةِ لاَ يَنْقَطِعُ الدَّمُ وَيَقْنَعُ بِهَا مُسْتَوْفِيهَا، وَيُقْطَعُ سَلِيمٌ بِأَعْسَمَ وَأَعْرَجَ، وَلاَ أَثَرَ لِخُضْرَةِ أَظْفَارٍ وَسَوَادِهَا، وَالصَّحِيحُ قَطْعُ ذَاهِبَةِالأَظْفَارِ بِسَلِيمَتِهَا دُونَ عَكْسِهِ، وَالذَّكَرُ صِحَّةً وَشَلَلاً كَالْيَدِ، وَالأَشَلُّ: مُنْقَبِضٌ لاَ يَنْبَسِطُ أَوْ عَكْسُهُ، وَلاَ أَثَرَ لِلإِنْتِشَارِ وَعَدَمِهِ، فَيُقْطَعُ فَحْلٌ بِخَصِيٍّ وَعِنِّينٍ، وَأَنْفٌ صَحِيحٌ بِأَخْشَمَ، وَأُذُنُ سَمِيعٍ بِأَصَمَّ لاَ عَيْنٌ صَحِيحَةٌ بِحَدَقَةٍ عَمْيَاءَ، وَلاَ لِسَانٌ نَاطِقٌ بِأَخْرَسَ،

---

خوێنی ئەندامە ساغەكەی لە سەر واجب دەبێ و ئەویش نرخی لەكاركەوتووەكەی خۆی وەردەگرێ، هەروەك ڕابرا.

(وَتُقْطَعُ الشَّلاَّءُ بِالصَّحِيحَةِ) ئەندامێكی لەكاركەوتوو لەتۆڵەی ئەندامێكی ساغ لێدەكرێتەوە (إلاَّ أَنْ يَقُولَ أَهْلُ الْخِبْرَةِ لاَ يَنْقَطِعُ الدَّمُ) تەنها ئەگەر دوو دادپەروەری شارەزا بڵێن: خوێنەكەی ناوەستێ، ئەو كاتە نابێ لێبكرێتەوە، بەڵكو خوێنی ساغەكە دەدرێتەوە خاوەنەكەی (وَ) لەو حاڵەتەشدا دروستە لێبكرێتەوە: كە (يَقْنَعُ بِهَا مُسْتَوْفِيهَا) تۆڵەوەرگرەكە قەناعەت بە لەكاركەوتووەكە بكاو داوای نرخی ناتەواویەكە نەكا.

(وَيُقْطَعُ سَلِيمٌ بِأَعْسَمَ) دەستێكیساغ لەتۆڵەی دەستێكی خوارو ڕەق لێدەكرێتەوە، هەم (وَأَعْرَجَ) پێیەكی ساغ لەتۆڵەی پێیەكی شەلە لێدەكرێتەوە (وَلاَ أَثَرَ لِخُضْرَةِ أَظْفَارِ وَسَوَادِهَا) هیچ كارێك لەتۆڵەكردنەوە ناكا سەوزیو ڕەشبوونی نینۆكەكان (وَالصَّحِيحُ) بە فەرموودەی ڕاست: (قَطْعُ ذَاهِبَةِ الأَظْفَارِ بِسَلِيمَتِهَا) ئەو دەستو پێیەی نینۆكەكانی نەماون لەتۆڵەی دەستو پێی ساغ لێدەكرێتەوە (دُونَ عَكْسِهِ) بەڵام بە پێچەوانەوە نابێ.

(وَالذَّكَرُ) ئەندامی جیماعكردنی پیاو (صِحَّةً وَشَلَلاً كَالْيَدِ) لە ڕووی ساغیو لەكاركەوتنەوە وەكو دەستی ساغو لەكاركەوتووە لە گشت بڕیارەكانیڕابردوودا (وَالأَشَلُّ) مەبەست بە (ذكر)ی شەلەپەتە=لەكاركەوتوو: (مُنْقَبِضٌ لاَ يَنْبَسِطُ) ئەو (ذكر)ەیە: وێك هاتبێتەوەو شۆڕ نەبێتەوە (أَوْ عَكْسُهُ) یان بە پێچەوانەكەی، واتە: شۆڕ بوبێو وێك نەیەتەوە، بەڵام (وَلاَ أَثَرَ لِلإِنْتِشَارِ وَعَدَمِهِ) كار لە تۆڵەكردنەوە ناكا ڕەپبوونو ڕەپنەبوونی (ذكر)ی پیاو، كەوابو: (فَيُقْطَعُ فَحْلٌ بِخَصِيٍّ وَعِنِّينٍ) پیاوی بە توانا بۆ جیماكردن، (ذكر)ەكەی لێدەكرێتەوە لەتۆڵەی (ذكر)ی پیاوی خەسێنداراو و نەمێرد كە توانای جیماعی نیە، ئیتر جیاوازی بالغو نەبالغو سوننەتكراو و سوننەتنەكراو نیە، هەروەك (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَأَنْفٌ صَحِيحٌ بِأَخْشَمَ) لوتێکی ساغی بۆنکەر لەتۆڵەی لوتێکی بۆننەکەر لێدەکرێتەوە، هەم (وَأُذُنٌ سَمِيعٍ بِأَصَمٍّ) گوێی بیسەر لەتۆڵەی گوێی کەڕ لێدەکرێتەوە، (لاَ عَيْنٌ صَحِيحَةٌ بِحَدَقَةٍ عَمْيَاءَ) بەڵام چاوێکی ساغ لەتۆڵەی گلێنەیەکی کوێر لێناکرێتەوە، هەم (وَلاَ لِسَانٌ نَاطِقٌ بِأَخْرَسَ) زوبانێکی قسەکەر لەتۆڵەی زوبانێکی لاڵی قسەنەکەر لێناکرێتەوە.

**منهاج- بەرگیپێنجەم-3**

وَفِي قَلْعِ السِّنِّ قِصَاصٌ، لاَ فِكَسْرِهَا، وَلَوْ قَلَعَ سِ
فَإِنْ جَاءَ وَقْتُ نَبَاتِهَا بِأَنْ سَقَطَتِ الْبَوَاقِي وَعُدْنَ
وَجَبَ الْقِصَاصُ وَلاَ يُسْتَوْفَى لَهُ فِي صِغَرِهِ، وَلَوْ قَلَعَ سِنَّ مَثْغُورٍ فَنَبَتَتْ لَمْ يَسْقُطِ الْقِصَاصُ فِالأَظْهَرِ، وَلَوْ نَقَصَتْ يَدُهُ أُصْبُعًا فقَطَعَ كَامِلَةً قُطِعَ وَعَلَيْهِ أَرْشُ أُصْبُعٍ،

---

(وَفِي قَلْعِ السِّنِّ قِصَاصٌ) لە هەڵکەندنی دداندا هەڵکەندنەوەی لەتۆڵە هەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ﴾ ددان لەتۆڵەی ددان. (لاَ فِيكَسْرِهَا) بەڵام لە شکاندنی دداندا شکاندنەوەی لەتۆڵە نیە، مەگەر بگونجێ بە ئەندازەی شکاندراوەکە-بێ زیادە- بشکێندرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، چونکە لە ڕوداوێکی لەم بابەتەدا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿كِتَابُ اللهِ اَلْقِصَاصُ﴾ رواه الشيخان، بڕیاری خوا لە شکاندنی دداندا تۆڵەکردنەوەیە.
(وَلَوْ قَلَعَ سِنَّ صَغِيرٍ لَمْ يُثْغَرْ) ئەگەر ددانێکی شیریی منداڵێکی هەڵکەند: کە هێشتا ددانە شیریەکانی نەکەوتبون، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ فِيالْحَالِ) ئێستا نە تۆڵەو نە خوێنی واجب نیە (فَإِنْ جَاءَ وَقْتُ نَبَاتِهَا) جا ئەگەر ددانەکان کاتی هاتنەوەیان هات (بِأَنْ سَقَطَتِ الْبَوَاقِي وَعُدْنَ) وەك ددانەکانیتریش بکەونو بێنەوە (دُونَهَا) بەڵام هەڵکەندراوەکە نەهاتەوەو (وَقَالَ أَهْلُ الْبَصَرِ: فَسَدَ الْمَنْبَتُ) دوو کەسی خاوەن زانستیش گوتیان: شوێنی ددانەکە تێك چووەو ددانەکە نایەتەوە. ئەو کاتە (وَجَبَ الْقِصَاصُ) هەڵکەندنەوەی لەتۆڵە واجب دەبێ، بەڵام (وَلاَ يُسْتَوْفَى لَهُ فِي صِغَرِهِ) لە تەمەنی منداڵیدا تۆڵەی بۆ ناکرێتەوە، بەڵکو هەر کاتێك بلۆغی بوو-ئەگەر عەفوی نەکرد- ئەو کاتە تۆڵەی لێدەکاتەوە، بەڵام ئەگەر هەڵکەندراوەکەی بە ساغی هاتەوە، ئەو کاتە نە تۆڵەو نە خوێنی واجب نیە، جا ئەگەر بە ڕەشی، یان بە خواری، یان درێژتر، یان بە جووتە هاتەوە، ئەو کاتە نرخەکەی واجب دەبێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.
(وَلَوْ قَلَعَ سِنَّ مَثْغُورٍ) ئەگەر ددانی کەسێکی وەهای هەڵکەند کە ددانی شیریی کەوتبون (فَنَبَتَتْ) ئێنجا ددانە هەڵکەندراوەکە هاتەوە، ئەوە (لَمْ يَسْقُطِ الْقِصَاصُ فِيالأَظْهَرِ) هەڵکەندنەوی لەتۆڵەی لە سەر لاناچێ، لە فەرموودەی بەهێزتردا، هەروەك ئەگەر برینێکی ئاشکراکەریش چاك ببێتەوە، تۆڵەی لە سەر لاناچێ.

(وَلَوْ نَقَصَتْ يَدُهُ أُصْبُعًا) ئەگەر دەستەکەی پەنجەیەکی ناتەواو بوو (فَقَطَعَ كَامِلَةً) ئینجا دەستێکی تەواوی کەسێکیتری لێکردەوە، ئەوە (قُطِع) لەتۆڵەی دەستە تەواوەکە دەستەکەی لێدەکرێتەوەو هەم (وَعَلَيْهِ أَرْشُ أُصْبُعٍ) خوێنی پەنجەیەکیشی لە سەرە بیداتە خاوەنی تەواوەکە.

وَلَوْ قَطَعَ كَامِلٌ نَاقِصَةً فَإِنْ شَاءَ الْمَقْطُوعُ أَخَذَ دِيَةَ أَصَابِعِهِ الأَرْبَعِ، وَإِنْ شَاءَ لَقَطَهَا، وَالأَصَحُّ أَنَّ حُكُومَةَ مَنَابِتِهِنَّ تَجِبُ إِنْ لَقَطَ، لاَ إِنْ أَخَذَ دِيَتَهُنَّ، وَأَنَّهُ يَجِبُ فِي الْحَالَيْنِ حُكُومَةُ خُمُسِ الْكَفِّ، وَلَوْ قَطَعَ كَفًّا بِلاَ أَصَابِعَ فَلاَ قِصَاصَ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ كَفُّهُ مِثْلَهَا، وَلَوْ قَطَعَ فَاقِدُالأَصَابِعِ كَامِلَهَا قَطَعَ كَفَّهُ وَأَخَذَ دِيَةَ الأَصَابِعِ، وَلَوْ شَلَّتْ أُصْبُعَاهُ فَقَطَعَ يَدًا كَامِلَةً، فَإِنْ شَاءَ لَقَطَ الثَّلاَثَ السَّلِيمَةَ وَأَخَذَ دِيَةَ أُصْبُعَيْنِ، وَإِنْ شَاءَ قَطَعَ يَدَهُ وَقَنَعَ بِهَا.

---

بەلاَم (وَلَوْ قَطَعَ كَامِلٌ نَاقِصَةً) ئەگەر بە پێچەوانەوە: خاوەنی دەستێکی تەواو دەستێکی ناتەواوی لێکردەوە، ئەو کاتە دروست نیە دەستە تەواوەکەی لەتۆڵە لێبکرێتەوە، کەواتبو: (فَإِنْ شَاءَ الْمَقْطُوعُ أَخَذَ دِيَةَ أَصَابِعِهِ الأَرْبَعِ) ئەگەر دەستبڕاوەکە حەزی کرد: خوێنی چوار پەنجەکەی خۆی لە تاوانکارەکە وەردەگرێ، هەم (وَإِنْ شَاءَ لَقَطَهَا) ئەگەر حەزیش دەکا چوار پەنجەی تاوانکارەکە لەتۆڵە لێدەکاتەوە، ئینجا (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ حُكُومَةَ مَنَابِتِهِنَّ تَجِبُ إِنْ لَقَطَ) نرخی شوێنی لێڕوانی چوار پەنجەکانیش لە سەر تاوانکارەکە واجبە بیداتێ ئەگەر لەتۆڵە لێیکردنەوە (لاَ إِنْ أَخَذَ دِيَتَهُنَّ) بەلاَم ئەگەر خوێنەکەیان وەربگرێ نرخەکە واجب نابێ (وَ أَنَّهُ يَجِبُ فِيالْحَالَيْنِ حُكُومَةُ خُمُسِ الْكَفِّ) هەر بەفەرموودەی ڕاستتر: لە هەر دوو حاڵەتدا نرخی پێنجێکی لەپەدەستەکەشی –کە شوێنی پەنجەیەکە– لە سەر تاوانکارەکە واجبە بیداتێ، چونکە لە هەردوو حاڵەتدا هیچ شتێك لە بەرامبەری وەرنەگیراوە.

(وَلَوْ قَطَعَ كَفًا بِلاَ أَصَابِعَ) ئەگەر لەپەدەستێکی بێپەنجەی لێکردەوە، ئەوە (فَلاَ قِصَاصَ) لێکردنەوەی لەتۆڵە دروست نیە، چونکە یەکسان نین (إِلاَّ أَنْ تَكُونَ كَفُّهُ مِثْلَهَا) مەگەر لەپەدەستەکەی تاوانکارەکەش وەکو لەپەدەستەکەیتر بێ، ئەو کاتە لەتۆڵە لێدەکرێتەوە، چونکە یەکسانن.

(وَلَوْ قَطَعَ فَاقِدُ الأَصَابِعِ كَامِلَهَا) ئەگەر خاوەن دەستێکی بێپەنجە دەستێکی بە پەنجەی تەواوی لێکردەوە، ئەوە (قَطَعَ كَفَّهُ) خاوەنی تەواوەکە لەپەدەستی تاوانکارەکە لەتۆڵە لێدەکاتەوەو هەم (وَأَخَذَ دِيَةَ الأَصَابِعِ) خوێنی پێنج پەنجەکانیشی لێوەردەگرێ.

(وَلَوْ شَلَّتْ أُصْبُعَاهُ) ئەگەر دوو پەنجەی لەکار کەوتبون (فَقَطَعَ يَدًا كَامِلَةً) ئینجا دەستێکی تەواوی لێکردەوە، ئەوە (فَإِنْ شَاءَ لَقَطَ الثَّلاَثَ السَّلِيمَةَ) ئەگەر خاوەنی

تەواوەکە حەزی کرد: سێ پەنجە ساغەکەی تاوانکارەکە لەتۆڵە لێدەکاتەوەو هەم (وَأَخَذَ دِيَةَ أُصْبُعَيْنِ) خوێنی دوو پەنجەشی لێوەردەگرێ (وَإِنْ شَاءَ قَطَعَ يَدَهُ وَقَنَعَ بِهَا) ئەگەر حەزیش دەکا دەستەکەی لە تۆڵە لێدەکاتەوەو قەناعەتی پێدەکا، واتە: نابێ داوای خوێنی دوو پەنجە بکا.

(فَصْلٌ) قَدَّ مَلْفُوفًا وَزَعَمَ مَوْتَهُ صُدِّقَ الْوَلِيُّ بِيَمِينِهِ فِي الْأَظْهَرِ، وَلَوْ قَطَعَ طَرَفًا وَزَعَمَ نَقْصَهُ فَالْمَذْهَبُ تَصْدِيقُهُ إِنْ أَنْكَرَ أَصْلَ السَّلَامَةِ فِي عُضْوٍ ظَاهِرٍ، وَإِلاَّ فَلاَ، أَوْ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ فَمَاتَ وَزَعَمَ سِرَايَةً وَالْوَلِيُّ انْدِمَالاً مُمْكِنًا أَوْ سَبَبًا فَالأَصَحُّ تَصْدِيقُ الْوَلِيِّ، وَكَذَا لَوْ قَطَعَ يَدَهُ وَزَعَمَ سَبَبًا وَالْوَلِيُّ سِرَايَةً،

---

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی کێشەی تاوانکارو خاوەن ماف ﴾

(قَدَّ مَلْفُوفًا) هەر کاتێك مرۆڤێکی پێچراوی لە ناو جلێکدا کردە دوو لەت، یان دیوارێکی بە سەردا ڕووخاند (وَزَعَمَ مَوْتَهُ) لەتکەرەکەش گوتی: لە کاتیلەتکردنەکەدا، یان لە کاتی ڕووخاندنەکەدا مردوو بوو. خزمەکەشی گوتی: زیندوو بوو. ئەوە (صُدِّقَ الْوَلِيُّ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە خزمیمردووەکە دەکرێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

بەڵام (وَلَوْ قَطَعَ طَرَفًا) ئەگەر تاوانکارەکە ئەندامێکی کەسێکی لێکردەوەو (وَزَعَمَ نَقْصَهُ) گوتی: ئەندامەکە ناتەواو بوو، خاوەن ئەندامەکەش گوتی: ئەندامەکەم تەواو بوو. ئەوە (فَالْمَذْهَبُ تَصْدِيقُهُ) بە فەرموودەیڕاستی مەزهەب: باوەڕ بە تاوانکارەکە دەکرێ (إِنْ أَنْكَرَ أَصْلَ السَّلَامَةِ فِي عُضْوٍظَاهِرٍ) ئەگەر لەبارەی ئەندامێکیئاشکرا بڵێ: لە بنچینەدا ئەندامەکە ناتەواو بوو: وەك دەستو پێو چاو (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر لەبارەی ئەندامێکی شاردراوە بڵێ: نا تەواو بوو. وەك ڕان، یان بڵێ: ناتەواوییەکەی لە بنچینەدا نەبو، بەڵکو پەیدا بووە، ئەو کاتە (فَلاَ) باوەڕی پێناکرێ، بەڵکو بە سوێندخواردن باوەڕ بە خاوەنی ئەندامەکە دەکرێ، چونکە شاهیدهێنان بۆ ئەندامێکی ئاشکرا ئاسانەو بۆ شاراوە ئاسان نیە.

(أَوْ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ) یان تاوانکارەکە هەردوو دەستو هەردوو پێی لێکردنەوە (فَمَاتَ) ئینجا خاوەن دەستو پێیەکە مرد (وَزَعَمَ سِرَايَةً) تاوانکارەکەش گوتی: بە پێداڕۆیشتنی لێکردنەوەکان مردوەو تەنها یەك خوێن واجب دەبێ (وَالْوَلِيُّ انْدِمَالاً مُمْكِنًا) خزمەکەشی گوتی: برینەکانی چاك بونەوە ئینجا مرد. دەشگونجا چاك بوبێتەوە (أَوْ سَبَبًا) یان هۆیەکیتری بۆ مردنەکەی گوت: وەك ژەهر خواردن، ئەوە (فَالأَصَحُّ تَصْدِيقُ الْوَلِيِّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: بە سوێندخواردن باوەڕ بە خزمەکەی دەکرێ کە دەڵێ: پێش مردن برینەکەی چاك بۆتەوە. کەوابو: تاوانکارەکە دوو خوێنی لە سەر واجب دەبن: یەکێکی دەستەکان، یەکێکی پێیەکان.

(وَكَذَا) هەروەها (لَوْ قَطَعَ يَدَهُ وَزَعَمَ سَبَبًا) ئەگەر تاوانکارەکە تەنها دەستێکی

لێکردبێتەوەو مردبێ و بڵێ: بە هۆیەکی‌تری جگە لە لێکردنەوە مردوەو تەنها نیوەی خوێنم لەسەرە، یان دەستەکەم لەتۆڵە لێبکەوە (وَالْوَلِيُّ سِرَايَةً) خزمەکەشی گوتی: بە پێداڕۆیشتنی لێکردنەوەکە مردوەو دەبی خوێنێکی‌تەواوم بدەیتێ، یان لەتۆڵە دەتکوژم. لەم مەسەلەیەشدا بە سوێندخواردن باوەڕ بەخزمەکەی دەکرێ.

وَلَوْ أَوْضَحَهُ مُوضِحَتَيْنِ وَرَفَعَ الْحَاجِزَ وَزَعَمَهُ قَبْلَ انْدِمَالِهِ صُدِّقَ إِنْ أَمْكَنَ، وَإِلاَّ حَلَفَ الْجَرِيحُ وَثَبَتَ أَرْشَانِ، قِيلَ: وَثَالِثٌ. (فَصْلٌ) اَلصَّحِيحُ ثُبُوتُهُ لِكُلِّ وَارِثٍ، وَيُنْتَظَرُ غَائِبُهُمْ

---

(وَلَوْ أَوْضَحَهُ مُوضِحَتَيْنِ وَرَفَعَ الْحَاجِزَ) ئەگەر تاوانکارەکە بە دوو برینی ئاشکراکەر بریندار کردو نێوانی هەردوو برینەکانیشی لابردو (وَزَعَمَهُ قَبْلَ انْدِمَالِه) گوتیشی: پێش چاکبوونەوە نێوانەکەیانم لابردوەو بە یەك برین دەژمێردرێ. بریندارکراوەکەش گوتی: دوای چاکبوونەوە نێوانەکەیانت لابردوەو بە سێ برین دەژمێردرێن. ئەو کاتە (صُدِّقَ إِنْ أَمْكَنَ) بە سوێندخواردن باوەر بە تاوانکارەکە دەکرێ و بە یەك برین دەژمێردرێ ئەگە بگونجێ برینەکان چاك نەبوبنەوە: وەك ماوەکەی کورت بێ (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر نەگونجێ: وەك ماوەیەکی درێژ ڕابردبێ، ئەو کاتە(حَلَفَ الْجَرِيحُ) بریندارەکە سوێند دەخوا: کە تاوانکارەکە لە دوای چاکبوونەوە نێوانەکەی لاداوە، ئینجا (وَثَبَتَ أَرْشَانِ) دوو خوێنی هەر دوو برینەکانی لە سەر تاوانکارەکە واجب دەبێ (قِيلَ: وَثَالِثٌ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا خوێنێکی سێیەمیش بۆ لابردنی نێوانەکە واجب دەبێ.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو کەسەی مافی تۆڵەکردنەوەی هەیە ﴾**

**پێشەکی** بزانە: بۆ بریندارەکە دروست نیە پێش چاکبونەوەی برینەکە تاوانکارەکە لە تۆڵەلێکردنەوە عەفو بکا لە سەر وەرگرتنی خوێن، نەوەك بەو برینە بمرێ، بەلام بۆی دروستە: بە خۆڕایی عەفوی بکا، هەر چەند برینەکەش چاك نەبوبێتەوە، جا ئەگەر تاوانکارەکەی عەفو نەکرد، ئەو کاتەش وەها سوننەتە: برینەکەی چاك ببێتەوە ئینجا تاوانکارەکە لەتۆڵە بریندار بکاتەوە، یان ئەندامەکەی لێبکاتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا فەرموویانە.

جا ئەگەر بریندارکراوەکە بەو برینە مرد، یان هەر لە سەرەتاوە کوژرا، ئەو کاتە (اَلصَّحِيحُ) بە فەرموودەی ڕاست (ثُبُوتُهُ لِكُلِّ وَارِثٍ) تۆڵەکردنەوەکە بۆ گشت میراتگرێکی کوژراوەکە جێگیر دەبێ، هەر چەند خزمایەتیشی دوور بێ، وەك (ذوي‌الأرحام) ئەگەر میرات بگرێ، جا هەر کەسەیان بەگوێرەی بەشە میراتی‌خۆی مافی تۆڵەکردنەوی هەیە، بۆ وێنە: ئەگەر کوژراوەکە ژنێك و کوڕێکی لەپاش بەجێمان، ئەوە هەشتێکی تۆڵەکردنەوەکە بۆ ژنەکەیەو

حەفت بەشەکەیتریش بۆ کوڕەکەیە، کەواتە: هەر خزمێك لە کاتی کوشتنەکەدا میراتگری کوژراوەکە نەبێ، ئەوە هیچ مافی تۆڵەکردنەوەو خوێن وەرگرتنی نیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر تەنها یەك میراتگر تاوانکارەکە لەتۆڵە لێکردنەوە عەفو بکا، ئەو کاتە خوێنی لێوەردەگرێ و بۆ ئەوانیتر دروست نیە لەتۆڵە بیکوژنەوە، کەوابو: (وَيُنْتَظَرُ غَائِبُهُمْ) چاوەڕوانی میراتگرە نادیارەکەیان دەکرێ تا ئامادە دەبێ، یان ئیزنی وەردەگیرێ وَكَمَالُ صَبِيِّهِمْ وَمَجْنُونِهِمْ، وَيُحْبَسُ الْقَاتِلُ وَلاَ يُخَلَّى بِكَفِيلٍ، وَلْيَتَّفِقُوا عَلَى مُسْتَوْفٍ، وَإِلاَّ فَقُرْعَةٌ يَدْخُلُهَا الْعَاجِزُ وَيَسْتَنِيبُ، وَقِيلَ: لاَ يَدْخُلُ، وَلَوْ بَدَرَ أَحَدُهُمْ فَقَتَلَهُ فَالأَظْهَرُ لاَ قِصَاصَ وَلِلْبَاقِينَ قِسْطُ الدِّيَةِ مِنْ تَرِكَتِهِ،

---

(وَكَمَالُ صَبِيِّهِمْ) هەم چاوەڕوانی کامڵبوونی منداڵەکەیان دەکرێ تا بالغو عاقڵ دەبێ، هەم (وَمَجْنُونِهِمْ) تا شێتەکەیان چاك دەبێتەوە.

جا ئەگەر پزیشکەکان گوتیان: شێتەکە ئومێدی چاکبونەوەی نیە. ئەو کاتە دەگونجێ سەرپەرشتکارەکەی لەجیاتی وی تاوانکارەکە لەتۆڵە بکوژێتەوەو دەشکونجێ کوشتنەوەی لەتۆڵە دروست نەبێ، کەواتە: بۆ سەرپەرشتکارەکە دروستە خوێنی کوژراوەکە بۆ شێتەکە وەربگرێ، بەڵام ئەگەر شێتەکە هەژار بێ و ماڵی نەبێ، ئەو کاتە دور نیە واجب بێ: سەرپەرشتکارەکە بکوژەکە لە سەر وەرگرتنیخوێن عەفو بکاو بەو خوێنە شێتەکە بەخێو بکا، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُحْبَسُ الْقَاتِلُ) واجبە: مرۆڤکوژەکە بەند بکرێ، تا نادیارەکە ئامادە دەبێ و منداڵەکەو شێتەکە کامڵ دەبن، بەڵام ئەگەر منداڵەکە لە حاڵەتیمنداڵیدا بکوژەکەی لە تۆڵە کوشتەوە، ئەو کاتە پێویستە تۆڵەکردنەوەکە بە دروستبوویی دابندرێ، هەروەك لە (الشبراملسی)دا فەرموویەتی.

(وَلاَ يُخَلَّى بِكَفِيلٍ) نابێ بە کەفیلیش مرۆڤکوژەکە لە بەندیخانە ئازاد بکرێ، نەوەك ڕابکاو خۆی بشارێتەوە، ئینجا ئەرکی بەندیخانەش هەر لە سەر بەندکراوەکەیە ئەگەر هەبوویی بێ، بەڵام ئەگەر هیچی نەبو، ئەو کاتە لە (بَيْتُ الْمَالِ) دەدرێ، جا ئەگەر (بَيْتُ الْمَالِ) نەبو، ئەو کاتە لە سەر دەوڵەمەندە موسوڵمانەکانە، هەروەك لە (الشبراملسی)دا فەرموویەتی.

(وَلْيَتَّفِقُوا عَلَى مُسْتَوْفٍ) با میراتگرەکان لە سەر یەکێکان ڕێك بکەون تاکو بکوژەکە لە جیاتی گشتیان لەتۆڵە بکوژێتەوە، چونکە دروست نیە گشتیان وێکڕا بیکوژن، مەگەر تۆڵەکردنەوەکە بە شتێکی وەك نقومکردن بێ، ئەو کاتە دروستە: وێکڕا نقومی ناو ئاوی بکەنەوە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ڕێك نەکەوتن، ئەو کاتە (فَقُرْعَةٌ) پشکەکردن واجبە، جا ئەم پشکەیەش (يَدْخُلُهَا الْعَاجِزُ) میراتگری بێتواناش بەشداریی دەکا: وەك پیرو ئافرەت، جا ئەگەر ناوی دەرچو، ئەو کاتە (وَيَسْتَنِيبُ) جێگرێك بۆ خۆی دادەنێ تاکو بکوژەکەی لەتۆڵە

بۆ بكوژێ (وَقِيلَ لاَ يَدْخُلُ) له فەرموودەیەكی بێهێزدا: بێتوانا بەشداری ناكا.
(وَلَوْ بَدَرَ أَحَدُهُمْ فَقَتَلَهُ) ئەگەر یەكێك لە میراتگرەكان پەلەی كردو بێئیزنی ئەوانیتر بكوژەكەی لەتۆڵە كوشتەوە، ئەوە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (لاَ قِصَاصَ) كوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر پەلەكەرەكە نیە، بەو مەرجەی ئەوانیتر بكوژەكەیان عەفو نەكردبێ، كەوابو: (وَلِلْبَاقِينَ قِسْطُ الدِّيَةِ مِنْ تَرِكَتِه) میراتگرەكانیتر بەشە خوێنیان هەیە لە

وَفِــي قَــوْلٍ مِــنَ الْمُبَــادِرِ، وَإِنْ بَــادَرَ بَعْــدَ عَفْــوِ غَيْــرِهِ لَزِمَــهُ الْقِصَــاصُ، وَقِيــلَ لاَ إِنْ لَــمْ يَعْلَــمْ وَيَحْكُــمْ قَــاضٍ بِــهِ، وَلاَ يُسْــتَوْفَى قِصَــاصٌ إلاَّ بِإِذْنِ الإِمَامِ، فَإِنْ اِسْتَقَلَّ عُزِّرَ، وَيَأْذَنُ لأَهْلٍ فِي نَفْسٍ، لاَ فِي طَرَفٍ فِي الأَصَحِّ،

---

میراتی تاوانكارە كوژراوەكە (وَفِي قَوْلٍ مِن الْمُبَادِرِ) لە فەرموودەیەكدا: بەشە خوێنەكەیان لە پەلەكەرەكە دەستێنن، چونكە ئەو مافی ئەوانی فەوتاندوە.
بەڵام (وَإِنْ بَادَرَ بَعْدَ عَفْوِ غَيْرِهِ) ئەگەرمیراتگرێك لە دوای عەفوكردنی میراتگرێكیتر پەلەی كردو بكوژەكەی لەتۆڵە كوشتەوە، ئەو كاتە (لَزِمَهُ الْقِصَاصُ) كوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سەر واجب دەبێ، هەرچەند نەشیزانیبێ بكوژەكە عەفو كراوە، چونكە بە عەفوكردنی تەنها یەكێكیان تۆڵە لێكردنەوە لە سەر بكوژەكە لادەچێو خوێنی لە سەر واجب دەبێ (وَقِيلَ: لاَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: كوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر پەلەكەرەكە واجب نابێ (إِنْ لَمْ يَعْلَمْ وَيَحْكُمْ قَاضٍ بِهِ) بەو مەرجەی نەیزانیبێ بكوژەكە عەفو كراوە، یان قازی بڕیاری تۆڵە نەكردنەوەی نەدابێ.
﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەگەر بێگانەیەك، یان خزمێكیتر–كە میراتگر نەبێ– بێئیزن پەلەی كردو تاوانكارەكەی لەتۆڵە كوشتەوە، ئەوە كوشتنی بە ناهەقو بە تۆڵەكردنەوە دانانرێ، كەوابو: میراتگرەكانی تاوانكارەكوژراوەكە مافیان هەیە بكوژەكە لەتۆڵەی تاوانكارەكە بكوژنەوە، یان خوێنی لێوەربگرن، بەڵام میراتگرەكانی كوژراوەكە هیچ مافێكیان لە سەر ئەم بكوژە نیە، بەڵكو خوێنی كوژراوەكەی خۆیان لە میراتی تاوانكارەكوژراوەكە وەردەگرن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەكانیاندا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ كوشتنی لە تۆڵە دەبی بە ئیزنی كاربەدەست بێ ﴾

(وَلاَ يُسْتَوْفَى قِصَاصٌ) دروست نیەو نابێ هیچ تۆڵەیەك بكرێتەوە (إلاَّ بِإِذْنِ الإِمَامِ) تەنها بە ئیزنی كاربەدەست نەبێ، جیاوازی تۆڵەی كوشتنو ئەندامەكان نیە (فَإِنْ اسْتَقَلَّ) جا ئەگەر خاوەن مافەكە سەربەخۆ–بێ ئیزنیكاربەدەست– تۆڵەی كردوە، واتە: مرۆڤكوژەكەی لەتۆڵە كوشتنەوە، یان ئەندامی تاوانكارەكەی لە تۆڵە لێكردەوە، ئەوە (عُزِّرَ) تەمبێ دەكرێ، بەڵام تۆڵەكردنەوەكەش دروست دەبێ.
جا ئەگەر كاربەدەست تۆڵەی بۆ نەكردەوە، یان نەیدەتوانی مافی تۆڵەكردنەوەی ئاشكرا

بكا، یان له شوێنێكی دوور له كاربەدەست بوو، ئەو كاتە-ئەگەر هیچ كەسێك نەیبنێ- بۆی دروستە بە پەنهانی تۆڵە لە بكوژەكە بكاتەوە، هەروك لە (تحفة)و (نهایة)و حاشیەكانیاندا لێرەو لە (كتاب الدعوى)دا ڕوون كراوەتەوە.
(وَيَأْذَنُ لأهْلٍ فِی نَفْسٍ) ئەو جۆرە خاوەن مافەی شیاوی تۆڵەكردنەوەیە، كاربەدەست ئیزنی دەدا بەخۆی مرۆڤكوژەكە لە تۆڵە بكوژێتەوە (لاَ فِی طَرَفٍ فِی الأصَحِّ) بەڵام لە
فَإِنْ أَذِنَ فِي ضَرْبِ رَقَبَةٍ فَأَصَابَ غَيْرَهَا عَمْدًا عُزِّرَ وَلَمْ يَعْزِلْهُ، وَلَوْ قَالَ: أَخْطَأْتُ. وَأَمْكَنَ عَزَلَهُ لَمْ يُعَزَّرْ، وَأُجْرَةُ الْجَلاَّدِ عَلَى الْجَانِي عَلَىالصَّحِيحِ، وَيُقْتَصُّ عَلَىالْفَوْرِ وَفِىالْحَرَمِ وَالْحَرِّ وَالْبَرْدِ وَالْمَرَضِ، وَتُحْبَسُ الْحَامِلُ فِي قِصَاصِ النَّفْسِ أَوِ الطَّرَفِ حَتَّى تُرْضِعَهُ اللِّبَأَ وَيَسْتَغْنِيَ بِغَيْرِهَا أَوْ فِطَامِ حَوْلَيْنِ، وَالصَّحِيحُ تَصْدِيقُهَا فِي حَمْلِهَا بِغَيْرِ مَخِيلَةٍ،

---

بریندارکردنەوەو لێکردنەوەی ئەندامێك لەتۆڵەی ئەندامێك ئیزنی نادا، لە فەرموودەی ڕاستتردا، نەوەك ستەم بكا، بەڵكو وەكیلێك دەگرێ، هەروەها ئەگەر خاوەن ماف بەخۆی شیاوی تۆڵەكردنەوە نەبو: وەك پیرو ئافرەت، ئەو كاتەش وەكیلێك دەگرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فرموویانە.
ئینجا پێش كوشتنەوەی لەتۆڵە فەرمان دەدرێتە مرۆڤكوژەكە: تۆبە بكاو وەسێت بكاو بە هێواشی دەیهێننە شوێنی كوشتنو عەورەتی دادەپۆشرێو چاویشی دەبەسترێ، هەروەك لە (مغنى)دا فەرموویەتی.
(فَإِنْ أَذِنَ فِی ضَرْبِ رَقَبَةٍ) جا ئەگەر كاربەدەست ئیزنیدا لە گەردەنی بداو بیكوژێ (فَأَصَابَ غَيْرَهَا عَمْدًا) تۆڵەكەرەوەكەش بە قەسدی لە شوێنێكیتریدا، ئەوە (عُزِّرَ) تەمبێ دەكرێ، چونكە لە فەرمان دەرچووە، بەڵام (وَلَمْ يَعْزِلْهُ) نابێ لە كارەكەی لایبدا، بەڵكو فەرمانی دەداتێ: ئەمجارە لە گەردەنی بدا (وَلَوْ قَالَ: أَخْطَأْتُ) ئەگەر تۆڵەكەرەوەكە گوتی: بەهەڵەدا چووم بۆیێ لە گەردەنیم نەدا (وَأَمْكَنَ) دەشگونجا هەڵەی كردبێ، ئەو كاتە (عَزَلَهُ) لە كارەكەی لایدەداو یەكێكیتری لە جێ دادەنێ، بەڵام (لَمْ يُعَزَّرْ) نابێ تەمبێ بكرێ، چونكە لە فەرمان دەرنەچوە.
(وَأُجْرَةُ الْجَلاَّدِ عَلَىالْجَانِي) كرێی لێدەرەكەی تۆڵەكردنەوە لە سەر تاوانكارەكەیە ئەگەر لە (بيت المال) موچەی نەدرێتێ (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەیڕاست (وَيُقْتَصُّ عَلَىالْفَوْرِ) دروستە بە پەلە-بێدواخستن- تۆڵەی گیانو ئەندامەكان بكرێتەوە، هەم (وَفِى الْحَرَمِ) لە (حرم)ی(مكّة)داو (وَفِى الْحَرِّ وَالْبَرْدِ وَالْمَرَضِ) لە حاڵەتی گەرماو سەرماو نەخۆشیدا.
بەڵام (وَتُحْبَسُ الْحَامِلُ) واجبە: ئافرەتیئاوس بەند بكرێ (فِی قِصَاصِ النَّفْسِ أَوِ الطَّرَفِ) لەو كاتەی تۆڵەی گیان، یان ئەندامی لە سەرە (حَتَّى تُرْضِعَهُ اللِّبَأَ) تا كۆرپەكەی ناو زگی

دادەنیٚ و فرچکی دەداتیٚ و هەم (وَيَسْتَغْنِيَ بِغَيْرِهَا) تا کۆرپەکەش بە شیردەریٚکیتر پێویستیی بە دایکەکەی نامێنیٚ (أَوْ فِطَامِ حَوْلَيْنِ) یان تا بە تەواوبوونی دوو ساڵ لە شیرخواردن دەپچڕیٚ (وَالصَّحِيحُ تَصْدِيقُهَا فِي حَمْلِهَا) بە فەرموودەی ڕاست: ئافرەتەکە–بە سوێند– باوەڕی پیٚدەکریٚ لەبارەی زگەکەی (بِغَيْرِ مَخِيلَةٍ) هەرچەند نیشانەیەکی ئاشکرای ئاوسیشی نەبیٚ، بەڵام ئەگەر نیشانەیەك هەبیٚ، ئەو کاتە بیٚسوێند باوەڕی پیٚ دەکریٚ.

وَمَنْ قَتَلَ بِمُحَدَّدٍ أَوْ خَنِقٍ أَوْ تَجْوِيعٍ وَنَحْوِهِ اُقْتُصَّ بِهِ، أَوْ بِسِحْرٍ فَبِسَيْفٍ وَكَذَا خَمْرٌ وَلِوَاطٌ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ جُوِّعَ كَتَجْوِيعِهِ فَلَمْ يَمُتْ زِيدَ، وَفِي قَوْلٍ السَّيْفُ، وَمَنْ عَدَلَ إِلَى سَيْفٍ فَلَهُ، وَلَوْ قَطَعَ فَسَرَى فَلِلْوَلِيِّ حَزُّ رَقَبَتِهِ، وَلَهُ الْقَطْعُ ثُمَّ الْحَزُّ، وَإِنْ شَاءَ اِنْتَظَرَ السِّرَايَةَ، وَلَوْ مَاتَ بِجَائِفَةٍ أَوْ كَسْرِ عَضُدٍ فَالْحَزُّ، وَفِي قَوْلٍ كَفِعْلِهِ،

---

(وَمَنْ قَتَلَ بِمُحَدَّدٍ) هەر کەسێك کوشتنەکەی بە شتێکی تیژ کردبیٚ (أَوْ خَنِقٍ) یان بە خنکاندن (أَوْ تَجْوِيعٍ) یان بە برسیکردن (وَنَحْوِهِ) یان بەشتێکی وەها: وەك سوتاندن، یان فڕێدانە خوار، یان بە سەرداڕوخاندن، ئەوە (اُقْتُصَّ بِهِ) دروستە هەر بەو شتە لە تۆڵە بکوشترێتەوە، خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ هەرکەسێك دەستدرێژیی کردنە سەر، ئێوەش بە وێنەی دەستدرێژیەکەی تۆڵەی لیٚبکەنەوە. هەم چەند ئایەتێکیترو چەند حەدیسێکیش لەم بارەیەوە هاتون.

(أَوْ بِسِحْرٍ) یان ئەگەر بە سیحرکردن کوشتنەکەی کردبیٚ، ئەو کاتە (فَبِسَيْفٍ) بە شمشێر لە تۆڵە دەکوشترێتەوە (وَكَذَا خَمْرٌ وَلِوَاطٌ) هەروەها ئەگەر بە شەڕاب و نێربازی کوشتنەکەی کردبیٚ، ئەو کاتەش هەر بە شمشێر لەتۆڵە دەکوشترێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەو جۆرە کردارانە حەرامن.

(وَلَوْ جُوِّعَ كَتَجْوِيعِهِ فَلَمْ يَمُتْ) ئەگەر بکوژەکە وەك برسیکردنەکەی کوژراوەکە برسی کراوە بەڵام نەمرد، یان وەك سوتاندنەکەی سوتێندراوە بەڵام نەمرد، ئەو کاتە (زِيدَ حَتَّى يَمُوتَ) کردارە کوشندەکەی زیاد دەکریٚ تا دەمریٚ (وَفِي قَوْلٍ السَّيْفُ) لە فەرموودەیەکدا بە شمشێر دەکوژریٚ و کردارەکە زیاد ناکریٚ (وَمَنْ عَدَلَ إِلَى سَيْفٍ) هەر خاوەن مافێك–لە سەرەتاوە– لە کردارە کوشندەکە لایدا بۆ کوشتنی بە شمشێر، ئەوە (فَلَهُ) بۆی دروستە بە شمشێر تۆڵەی لیٚبکاتەوە، چونکە ئاسانترە.

(وَلَوْ قَطَعَ) ئەگەر تاوانکارەکە ئەندامی یەکێکی لیٚکردەوە، یان بریندار کرد (فَسَرَى) ئینجا برینەکە پێدا ڕۆیشتە سەر مردنی بریندارکراوەکە، واتە: بەو لێکردنەوەیە، یان بەو برینە مرد، ئەوە (فَلِلْوَلِيِّ حَزُّ رَقَبَتِهِ) میراتگرەکە مافی هەیە لە سەرەتاوە بە شمشێر گەردەنی تاوانکارەکە لەتۆڵە ببڕیٚ و بیکوژیٚ، هەم (وَلَهُ الْقَطْعُ ثُمَّ الْحَزُّ) بۆیشی دروستە:

ئەندامەکەی لێبکاتەوە، ئینجا گەردەنی ببڕێو بیکوژێ (وَإِنْ شَاءَ اِنْتَظَرَ السِّرَايَةَ) ئەگەر حەزیش دەکا با ئەندامەکەی لێبکاتەوەو چاوەڕوانی پێداڕۆیشتنی برینەکە بکا.
(وَلَوْ مَاتَ بِجَائِفَةٍ أَوْ كَسْرِ عَضُدٍ) ئەگەر بریندارکراوەکە بە هۆی برینێکی دوودەر مرد، یان بە هۆی شکاندنی قۆڵەکەی مرد، ئەوە (فَالْحَزُّ) تەنها بە شمشێر گەردەنی دەبڕدرێ، بەڵام (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا –کە بە ڕاستتر دانـدراوە–: (كَفِعْلِهِ) تاوانکارەکە وەك فَإِنْ لَمْ يَمُتْ لَمْ تُزَدِ الْجَوَائِفُ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ اِقْتَصَّ مَقْطُوعٌ ثُمَّ مَاتَ سِرَايَةً فَلِوَلِيِّهِ حَزٌّ وَلَهُ عَفْوٌ بِنِصْفِ دِيَةٍ، وَلَوْ قُطِعَتْ يَدَاهُ فَاقْتَصَّ ثُمَّ مَاتَ فَلِوَلِيِّهِ الْحَزُّ، فَإِنْ عَفَا فَلاَ شَيْءَ لَهُ، وَلَوْ مَاتَ جَانٍ مِنْ قَطْعِ قِصَاصٍ فَهَدَرٌ، وَإِنْ مَاتَا سِرَايَةً مَعًا أَوْ سَبَقَ الْمَجْنِيُّ عَلَيْهِ فَقَدْ اِقْتَصَّ،

---

تاوانەکەیخۆی لێدەکرێ (فَإِنْ لَمْ يَمُتْ) جا ئەگەر نەمرد (لَمْ تُزَدِ الْجَوَائِفُ) برینە دوودەرەکانی زیاد ناکرێن، بەڵکو بە شمشێر گەردەنی دەبڕدرێو دەکوژرێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.
(وَلَوْ اِقْتَصَّ مَقْطُوعٌ) ئەگەر دەست لێکراوەیەك، یان پێ لێکراوەیەك دەستی تاوانکارەکەی، یان پێی تاوانکارەکەی لەتۆڵە لێکردەوە (ثُمَّ مَاتَ سِرَايَةً) ئینجا تۆڵەکەرەوەکە بە پێداڕۆیشتنی لێکردنەوەکە مرد، بەڵام تاوانکارەکە نەمرد، ئەو کاتە (فَلِوَلِيِّهِ حَزٌّ) بۆ میراتگری تۆڵەکەرەوەکە دروستە–لەتۆڵەی مردووەکەیخۆی– گەردەنی تاوانکارەکە ببڕێو بیکوژێ، هەم (وَلَهُ عَفْوٌ بِنِصْفِ دِيَةٍ) بۆیشی دروستە لە سەر وەرگرتنی نیوەی خوێن لە کوشتن عەفوی بکا، چونکە لەجیاتی نیوە خوێنەکەیتریش دەستێکی لێکراوەتەوە.
کەوابو: (وَلَوْ قُطِعَتْ يَدَاهُ) ئەگەر هەردوو دەستەکانی لێکرانەوە (فَاقْتَصَّ) ئینجا ئەویش هەردوو دەستەکانی تاوانکارەکەی لێکردەونەوە (ثُمَّ مَاتَ) ئینجا تۆڵەکەرەوەکە بە پێداڕویشتنی لێکردنەوەکە مرد، بەڵام تاوانکارەکە نەمرد، ئەوەش (فَلِوَلِيِّهِ الْحَزُّ) بۆ میراتگری تۆڵەکەرەوەکە دروستە–لەتۆڵەی مردووەکەیخۆی– گەردەنی تاوانکارەکە ببڕێو بیکوژێ، بەڵام (فَإِنْ عَفَا) ئەگەر لە کوشتن عەفوی کرد، ئەو کاتە (فَلاَ شَيْءَ لَهُ) مافی هیچ خوێنێکی نیە، چونکە لێکردنەوەی هەردوو دەستەکانی تاوانکارەکە لە بەرامبەر خوێنێکی تەواوە.
(وَلَوْ مَاتَ جَانٍ مِنْ قَطْعِ قِصَاصٍ) ئەگەر تاوانکارێك بە هۆی ئەندام لێکردنەوەیەکی لەتۆڵە مرد، ئەوە (فَهَدَرٌ) گیانەکەی بە فیڕۆیەو هیچ تۆڵەو خوێنی نیە، چونکە بە هەق کوژراوە ﴿عن عمر وعليّ رضالله عنهما: مَنْ مَاتَ فِي حَدٍّ أَوْ قِصَاصٍ فَلاَ دِيَةَ لَهُ﴾ رواه البيهقي وَرَوَى

البخاريُّ بعضه فيالحدود عن عليﷺ، هەر کەسێك لە سزادانی تاوانێك، یان لە تۆڵەکردنەوەدا مرد، ئەوە هیچ خوێنی بۆ نیە.

(وَإِنْ مَاتَا سِرَايَةً) ئەگەر تاوانکارەکە بە پێداڕۆیشتنی لێکردنەوەی لەتۆڵە مرد، تۆڵەکەرەوەکەش بە پێداڕۆیشتنی تاوان لێکردنەکە مرد (مَعًا) مردنەکەشیان وێکڕا بوو (أَوْ سَبَقَ الْمَجْنِيُّ عَلَيْهِ) یان تاوان لێکراوەکە پێشتر مرد، ئەوە (فَقَدْ اقْتَصَّ) تۆڵەی خۆی کردۆتەوە، تاوانکەرە مردووەکە هیچیتری لە سەر نیە، بەلام

وَإِنْ تَأَخَّرَ فَلَهُ نِصْفُ الدِّيَةِ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ قَالَ مُسْتَحِقُّ يَمِينٍ أَخْرِجْهَا فَأَخْرَجَ يَسَارَهُ وَقَصَدَ إبَاحَتَهَا فَمُهْدَرَةٌ، وَإِنْ قَالَ: جَعَلْتُهَا عَنِ الْيَمِينِ وَظَنَنْتُ إجْزَاءَهَا فَكَذَّبَهُ فَالأَصَحُّ لاَ قِصَاصَ فِالْيَسَارِ وَتَجِبُ دِيَةٌ، وَيَبْقَى قِصَاصُ الْيَمِينِ، وَكَذَا لَوْ قَالَ دُهِشْتُ فَظَنَنْتُهَا الْيَمِينَ وَقَالَ الْقَاطِعُ ظَنَنْتُهَا الْيَمِينَ.

(فَصْلٌ) مُوجَبُ الْعَمْدِ اَلْقَوَدُ،

---

(وَإِنْ تَأَخَّرَ) ئەگەر تاوان لێکراوەکە دوای تاوانکارەکە مرد، ئەو کاتە (فَلَهُ نِصْفُ الدِّيَةِ) تاوان لێکراوەکە مافی نیوەی خوێنی لە میراتیتاوانکارەکە هەیە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە نابێ تۆڵەکردنەوە بکەوێتە پێش تاوانەکە، واتە: لێرەدا کوشتنی تاوانکارەکە کەوتۆتە پێش کوشتنی تاوانکراوەسەرەکە.

(وَلَوْ قَالَ مُسْتَحِقُّ يَمِينٍ) ئەگەر خاوەن مافی لێکردنەوەی ئەندامێکیڕاستە گوتی: (أَخْرِجْهَا) ڕاستەکەت بێنە دەرەوە تاکو لەتۆڵە لێتی بکەمەوە (فَأَخْرَجَ يَسَارَهُ) تاوانکارەکەش چەپەی هێنا دەرەوە (وَقَصَدَ إبَاحَتَهَا) مەبەستیشتی حەلاڵکردنی لێکردنەوەی چەپەکە بوو، خاوەن مافەکەش لێیکردەوە، ئەوە (فَمُهْدَرَةٌ) ئەندامە چەپەکە بە فیڕۆدراوەو هیچ تۆڵەو خوێنینیە.

بەلام (وَإِنْ قَالَ: جَعَلْتُهَا عَنِ الْيَمِينِ) ئەگەر تاوانکارەکە گوتی: لەجیاتی ڕاستەکەم هێنابومە دەرەوەو (وَظَنَنْتُ إجْزَاءَهَا) واتێگەیشتبوم دروست دەبێ (فَكَذَّبَهُ) خاوەن مافەکەش گوتی: درۆ دەکەی. ئەوە (فَالأَصَحُّ لاَ قِصَاصَ فِيالْيَسَارِ) بە فەرموودەی ڕاستتر تۆڵەکردنەوە لە چەپەکەدا واجب نابێ، بەڵکو (وَتَجِبُ دِيَةٌ) خوێنی چەپەکە لە سەر لێکەرەوەکە واجب دەبێ‌و (وَيَبْقَى قِصَاصُ الْيَمِينِ) تۆڵەی ڕاستەکەش لە سەر تاوانکارەکە هەر دەمێنێ.

(وَكَذَا لَوْ قَالَ دُهِشْتُ) هەروەها ئەگەر تاوانکارەکە گوتی سەرم لێشێواو (فَظَنَنْتُهَا الْيَمِينَ) واتێگەیشتم ڕاستەیەو (وَقَالَ الْقَاطِعُ: ظَنَنْتُهَا الْيَمِينَ) لێکەرەوەکە گوتی منیش وایتێگەیشتم ڕاستە بوو، ئەو کاتەش خوێنی چەپەکە لە سەر لێکەرەوەکە واجب دەبێ، تۆڵەی ڕاستەکەش لە سەر تاوانکارەکە هەر دەمێنێ.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی واجیبوونی تۆڵەی کوشتنی به قەسدیو عەفوکردن ﴾

(مُوجَبُ الْعَمْدِ) ئەو سزایەی تاوانی به قەسدی واجبی دەکا (اَلْقَوَدُ) تۆڵـه لێکردنەوەیـەکی وەکو خۆیەتی: کوشتن به کوشتن، ئەندام به ئەندام. خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِـالْقَتْلَى﴾ تۆڵەکردنەوە له سەر ئێوە واجب کراوە له کوژراوەکاندا. هـەم چەند ئایەتێکیتریش، هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ قُتِلَ عَمْداً فَهُوَ قَوَدٌ﴾ رواه أبوداود وغيره بإسناد صحيح، هەرکەسێك به قەسدی کوژرابێ، تۆڵەی وی کوشتنەوەیە.

وَالدِّيَـــــةُ بَــــدَلٌ عِنْــــدَ سُـــــقُوطِهِ، وَفِـــــى قَـــــوْلٍ أَحَــــدُهُمَا مُبْهَمًـــــا، وَعَلَـــى الْقَـــوْلَيْنِ لِلْـــوَلِيِّ عَفْـــوٌ عَلَىالدِّيَـــةِ بِغَيْـــرِ رِضَـــاالْجَانِي، وَعَلَــــىالأَوَّلِ لَوْ أَطْلَقَ الْعَفْوَ فَالْمَذْهَبُ لاَ دِيَةَ، وَلَوْ عَفَا عَنِ الدِّيَةِ لَغَا وَلَهُ الْعَفْوُ بَعْدَهُ عَلَيْهَا،

---

ئینجا بزانـه: عـەفوکردنی تاوانکارەکـە–هـەر چـەند لـه سـەر وەرگرتنـی خـوێنیش بـێ–سـوننەتێکی زۆر بـەخێرە، بـەڵام عـەفوکردن بـێوەرگرتنیخوێن خێرتـرە، هـەروەك لـه (تحفه)دا فەرموویەتی، خوایگەورە دەفـەرموێ: ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَىاللهِ﴾ هـەر کەسێك تاوانکارەکە عەفو بکاو پێك بێ، ئەوە پاداشتی وی له سەر خوایە.

(وَالدِّيَـةُ) خوێنیکوژراوەکـە، یـان خوێنیئەندامەکـە، کـە وەردەگـیرێ (بَـدَلٌ) لـەجیاتی تۆڵەکردنەویە (عِنْدَ سُقُوطِهِ) لەو کاتەی تۆڵەکردنەوە لادەکەوێ: به هۆی عەفوکردن، یان به هۆی مردنیتاوانکارەکە پێش تۆڵە لێکردنەوە (وَفِىقَوْلٍ) له فەرموودەیەکدا: (أَحَـدُهُمَا مُبْهَمًا) له تۆڵە لێکردنەوەو له خوێن یەکێکیان به دیارنەکراوی واجب دەبێ.

ئینجا (وَعَلَىالْقَوْلَيْنِ) له سەر فەرموودەکەی بەهێزو بێهێز: (لِلْوَلِيِّ عَفْوٌ عَلَىالدِّيَةِ) بۆ خاوەن مافەکـە دروسـتـە: تاوانکارەکـە لـە تۆڵەلێکردنـەوە عـەفو بکـا لـە سـەر وەرگرتنـی هـەموو خوێنەکە، یان بەشێکیخوێنەکە (بِغَيْرِرِضَاالْجَانِي) بێئەوەی تاوانکارەکە ڕازی ببێ، کەواتە: خوێنی کوژراوەکە له سەر تاوانکارەکە واجب دەبێو دروست نیە لەتۆڵە بکوشترێتەوە.

هەروەها ئەگەر یەکێکیش له خاوەن مافەکان تاوانکارەکە لەتۆڵە لێکردنەوە عـەفو بکـا لـه سەر وەرگرتنیخوێن، ئەو کاتەش تاوانکارەکە خوێنی لـە سـەر واجـب دەبـێو بـۆ خـاوەن مافەکانیتر دروست نیە لەتۆڵە بیکوژنەوە، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانـە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ﴾ هەر کەسێك له لایەن برایخۆی له تۆڵەلێکردنەوە عەفو کرا، با خـاوەن مافەکـە بـەگوێرەی شەرع خوێنی لێوەربگرێو خوێندەرەکەش به چاکی بێدواخستن خوێنەکەی بداتێ.

(وَعَلَىالأَوَّلِ) له سەر فەرموودەییەکەمی بەهێزتر: (لَوْ أَطْلَقَ الْعَفْوَ) ئەگەر خاوەن مافەکە بێ باسکردنیخوێن تاوانکارەکەی عەفو کـرد، ئـەوە (فَالْمَـذْهَبُ: لاَ دِيَـةَ) بـە فـەرموودەی

ڕاستیمەزهەب: هیچ خوێن لە سەر تاوانکارەکە واجب نابێ، چونکە کوشتنیبەقەسدی تۆڵەکردنەوە واجب دەکا، نەك خوێن، کەواتە: (وَلَوْ عَفَا عَنِ الدِّيَةِ) ئەگەر لە سەرەتاوە خاوەن مافەکە تاوانکارەکەی لە خوێن لێوەرگرتن عەفو کرد (لَغَا) ئەو عەفوکردنە پوچەڵ دەبێو دانامەزرێ، چونکە هێشتا خوێنەکە واجب نەبوە، کەوابو: (وَلَهُ الْعَفْوُ بَعْدَهُ عَلَيْهَا) بۆ خاوەن مافەکە دروستە: لە دوای ئەو عەفوە دانەمەزراوە، تاوانکارەکە لە سەر وەرگرتنی خوێن عەفو بکا لە تۆڵە لێکردنەوە، چونکە عەفوەکەیتر دانەمەزراو بوو.

وَلَوْ عَفَا عَلَى غَيْرِ جِنْسِ الدِّيَةِ ثَبَتَ إنْ قَبِلَ الْجَانِي، وَإلاَّ فَلاَ، وَلاَ يَسْقُطُ الْقَوَدُ فِالأَصَحِّ، وَلَيْسَ لِمَحْجُورِ فَلَسٍ عَفْوٌ عَنْ مَالٍ إنْ أَوْجَبْنَا أَحَدَهُما، وَإلاَّ فَإنْ عَفَا عَلَالدِّيَةِ ثَبَتَتْ، وَإنْ أَطْلَقَ فَكَمَا سَبَقَ، وَإنْ عَفَا عَلَى أَنْ لاَ مَالَ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَ يَجِبُ شَيْءٌ، وَالْمُبَذِّرُ فِالدِّيَةِ كَمُفْلِسٍ وَقِيلَ كَصَبِيٍّ، وَلَوْ تَصَالَحَا عَنِ الْقَوَدِ عَلَى مِائَتَيْ بَعِيرٍ لَغَا إنْ أَوْجَبْنَا أَحَدَهُمَا،

---

(وَلَوْ عَفَا عَلَى غَيْرِ جِنْسِ الدِّيَةِ) ئەگەر خاوەن مافەکە تاوانکارەکەی لە تۆڵەلێکردنەوە عەفو کرد لە سەر وەرگرتنی شتێکیتری جگە لە ڕەگەزیخوێن: وەك پارەو زەویو خانوو، ئەوە (ثَبَتَ إنْ قَبِلَ الْجَانِي) شتەکە جێگیر دەبێ—هەر چەند لە ئەندازەیخوێنەکەش زیاتر بێ— ئەگەر تاوانکارەکە قبوڵ بکا، کەواتە: تۆڵەلێکردنەوەی لە سەر لادەچێ (وَإلاَّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر تاوانکارەکە قبوڵ نەکا، ئەوە شتەکە جێگیر نابێو هەم (وَلاَ يَسْقُطُ الْقَوَدُ) تۆڵە لێکردنەوەشی لە سەر لاناچێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَيْسَ لِمَحْجُورِ فَلَسٍ) ئەو کەسەی بە هۆی قەرزداری قەدەغەی لە سەر داندراوە بۆی دروست نیە (عَفْوٌ عَنْ مَالٍ إنْ أَوْجَبْنَا أَحَدَهُما) تاوانکارەکە لە خوێن لێوەرگرتن عەفو بکا، ئەگەر بە فەرموودەی بێهێز: لە خوێنو لە تۆڵەکردنەوە یەکێکیان واجب بکەین (وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر بە فەرموودەی بەهێزتر تۆڵەکردنەوە واجب بکەین، ئەو کاتە (فَإنْ عَفَا عَلَى الدِّيَةِ) ئەگەر قەدەغەکراوەکە تاوانکارەکەی عەفو کرد لە سەر وەرگرتنی خوێن، ئەوە (ثَبَتَتْ) خوێنەکە جێگیر دەبێ، وەك عەفوکردنی خاوەن مافیڕابردوو، بەڵام (وَإنْ أَطْلَقَ) ئەگەر بێ باسکردنیخوێن تاوانکارەکەی عەفو کرد، ئەوەش (فَكَمَا سَبَقَ) وەك ڕابرا: خوێنەکە لە سەر تاوانکارەکە واجب نابێ.

(وَ) هەروەها (إنْ عَفَا عَلَى أنْ لاَ مَالَ) ئەگەر قەدغەکراوەکە تاوانکارەکەی عەفو کرد لە سەر ئەوەی هیچی لێوەرنەگرێ، ئەوەش (فَالْمَذْهَبُ أنَّهُ لاَ يَجِبُ شَيْءٌ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: هیچ خوێن لە سەر تاوانکارەکە واجب نابێ (وَالْمُبَذِّرُ) قەدەغەکراوی ماڵ بەفیڕۆدەر (فِيالدِّيَةِ) لەبارەی عەفوکردنی تاوانکارەکە لە خوێن لێوەرگرتن (كَمُفْلِسٍ) وەك

قەرزدارە لە گشت بڕیارەكانیڕابردوودا (وَقِيلَ كَصَبِيٍّ) لە فەرموودەیەكی بێهێزیشدا: وەك منداڵە، واتە: عەفوكردنی تاوانكارەكە لە خوێن لێوەرگرتن دروست نابێ.
(وَلَوْ تَصَالَحَا) ئەگەر خاوەن مافەكەو تاوانكارەكە وەها پێكهاتن (عَنِ الْقَوَدِ عَلَى مِأْتَيْ بَعِيرٍ) كە تاوانكارەكە لەتۆڵە نەكوشترێتەوە بەو مەرجەی دوو سەد ووشتر لە خوێن بدا، ئەوە (لَغَا إِنْ أَوْجَبْنَا أَحَدَهُمَا) پێكهاتنەكە دروست نابێ، ئەگەر بە فەرموودەی بێهێز لە تۆڵەكردنەوەو لە خوێن یەكێكیان بە دیارنەكراوی واجب بكەین، چونكە لە واجبیشەرعی
وَإِلاَّ فَالأَصَحُّ الصِّحَّةُ، وَلَوْ قَالَ رَشِيدٌ: اِقْطَعْنِي فَفَعَلَ فَهَدَرٌ، فَإِنْ سَرَى أَوْ قَالَ: أُقْتُلْنِي فَهَدَرٌ وَفِي قَوْلٍ تَجِبُ دِيَةٌ، وَلَوْ قُطِعَ فَعَفَا عَنْ قَوَدِهِ وَأَرْشِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْرِ فَلاَ شَيْءَ، وَإِنْ سَرَى فَلاَ قِصَاصَ، وَأَمَّا أَرْشُ الْعُضْوِ فَإِنْ جَرَى لَفْظُ وَصِيَّةٍ كَأَوْصَيْتُ لَهُ بِأَرْشِ هَذِهِ الْجِنَايَةِ فَوَصِيَّةٌ لِقَاتِلٍ، أَوْ لَفْظُ إِبْرَاءٍ أَوْ إِسْقَاطٍ أَوْ عَفْوٍ سَقَطَ، وَقِيلَ وَصِيَّةٌ،

---

زیاترە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە فەرموودەی بەهێزتر: تۆڵەكردنەوە واجب بكەین و خوێنەكە لەجیاتی تۆڵەكردنەوەكە بێ، ئەو كاتە (فَالأَصَحُّ الصِّحَّةُ) بە فەرموودەی ڕاستتر پێكهاتنەكە دروست دەبێ و دوو سەد ووشترەكەش لە سەر تاوانكارەكە جێگیر دەبێ، هەروەها دروستە لە سەر كەمتریش لە سەد ووشتر پێك بێن، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.
(وَلَوْ قَالَ رَشِيدٌ: اِقْطَعْنِي) ئەگەر یەكێكی بالغو عاقڵ بەخۆشیخۆی گوتیە مرۆڤێك: دەستەكەم لێبكەوە (فَفَعَلَ) مرۆڤەكەش دەستەكەی لێكردەوە، ئەوە (فَهَدَرٌ) دەستەكەی بە فیڕۆیە: نە تۆڵەو نە خوێنی نیە (فَإِنْ سَرَى) جا ئەگەر لێكردنەوەكە پێیدا ڕۆشت و بە برینەكە مرد (أَوْ قَالَ: اُقْتُلْنِي) یان لە سەرەتاوە گوتی: بمكوژە. ئەو كاتەش (فَهَدَرٌ) لە هەردوو مەسەلەدا بە فیڕۆیە: نە تۆڵەو نە خوێنی واجب نابێ، چونكە ئیزنی داوە، بەڵام لە هەردوو مەسەلەدا كەففارەتی كوشتن لە سەر بكوژەكە واجب دەبێ و هەم تەمبێ دەكرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە (وَفِي قَوْلٍ تَجِبُ دِيَةٌ) لەفەرموودەیەكدا: خوێن واجب دەبێ.
(وَلَوْ قُطِعَ) ئەگەر مرۆڤێك بە قەسدی ئەندامێكی لێكراوە (فَعَفَا عَنْ قَوَدِهِ وَأَرْشِهِ) ئینجا خاوەن ئەندامەكە لە تۆڵەو لە خوێنی ئەندامەكە تاوانكارەكەی عەفو كرد، ئەوە (فَإِنْ لَمْ يَسْرِ فَلاَ شَيْءَ) ئەگەر لێكردنەوەكە پێدا نەڕواو برینەكەی چاك ببێتەوە، هیچ تۆڵەو خوێنی نیە، چونكە بەخۆی مافیخۆی لەدەست داوە.
بەڵام (وَإِنْ سَرَى) ئەگەر لە دوای عەفوكردنەكە برینەكەی چاك نەبۆوەو پێدا ڕۆیشت و مرد، ئەو كاتەش (فَلاَ قِصَاصَ) مرۆڤەكە هیچ تۆڵەی ئەندامەكەو گیانەكەی نیە (وَأَمَّا أَرْشُ الْعُضْوِ) بەڵام خوێنی ئەندامەكەی تەماشا دەكرێ: (فَإِنْ جَرَى لَفْظُ وَصِيَّةٍ) ئەگەر لە

عەفوکردنەکەدا وشەی وەسێتی بەکار هێنا: (كَأَوْصَيْتُ لَهُ بِأَرْشِ هَذِهِ الْجِنَايَـةِ) وەك بڵـێ: خوێنی ئەم تاوانەم کردە وەسێت بۆ تاوانکارەکە. ئەوە (فَوَصِيَّةٌ لِقَاتِلٍ) دەبێتە وەسێت بۆ بکوژەکەو بە فەرموودەی ڕاستتر: دروست دەبێ‌و لە ئەندازەی سێیەکی مـاڵ جێبـەجێ دەبـێ (أَوْ لَفْـظُ إِبْـرَاءٍ أَوْ إِسْـقَاطٍ) یـان وشـەی گـەردەن ئـازادکردن، یـان وشـەی لادانـی بە کـار هێنـا (أَوْ عَفْـوٍ) یـان گـوتی عـەفوم کـرد. ئـەو کاتـەش (سَـقَطَ) لـە هەرسـێکیاندا خـوێنی ئەندامەکـە لـە سـەر تاوانکارەکـە لادەکـەوێ (وَقِيـلَ وَصِـيَّةٌ) لـە فەرموودەیـەکی بێهێزدا: ئەوانەش وەسێتن.

وَتَجِـــبُ الزِّيَـــادَةُ عَلَيْـــهِ إِلَـــى تَمَـــامِ الدِّيَـــةِ، وَفِـــي قَـــوْلٍ إِنْ تَعَـــرَّضَ فِـــي عَفْـــوِهِ لِمَـــا يَحْـــدُثُ مِنْهَـــا سَـــقَطَتْ، فَلَـــوْ سَـــرَى إِلَـــى عُضْـــوٍ آخَـــرَ فَانْـــدَمَلَ ضَـــمِنَ دِيَةَالسِّـــرَايَةِ فِالأَصَـــحِّ، وَمَـــنْ لَـــهُ قِصَـــاصُ نَفْـــسٍ بِسِـــرَايَةِ طَـــرَفٍ لَـــوْ عَفَـــا عَـــنِ الـــنَّفْسِ فَـــلاَ قَطْـــعَ لَـــهُ، أَوْ عَـــنِ الطَّـــرَفِ فَلَـــهُ حَـــزُّ الرَّقَبَـــةِ فِالأَصَـــحِّ، وَلَوْ قَطَعَهُ ثُمَّ عَفَا عَنِ النَّفْسِ مَجَّانًا: فَإِنْ سَرَى الْقَطْعُ بَانَ بُطْلاَنُ الْعَفْوِ، وَإِلاَّ فَيَصِحُّ،

---

(وَ) لەو حاڵەتەی لە خوێنی‌ئەندامەکە تاوانکارەکە عەفو دەبێ (تَجِبُ الزِّيَادَةُ عَلَيْهِ إِلَى تَمَامِ الدِّيَةِ) ئەو ئەندازەی لە خوێنی ئەندامەکە زیاترە—تا تەواوی خوێنی‌مرۆڤەکە— هەمووی لە سەر تاوانکارەکە واجب دەبێ، چونکە عەفوکردنەکە زێدەکەی نەگرتۆتەوە (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (إِنْ تَعَرَّضَ فِي عَفْوِهِ لِمَا يَحْدُثُ مِنْهَا) ئەگەر خاوەن ئەندامەکە لە عەفوکردنەکـەدا گـوتبی: لـەم تاوانـەو لـەوەی لەمـەودواش لـەم تاوانـە پەیـدا دەبـێ، تاوانکارەکەم عەفو کرد. ئەو کاتە (سَقَطَتْ) زێدەییەکەی لە سەر لادەچێ.

(فَلَوْ سَرَى إِلى عُضْوٍ آخَرَ) جا ئەگەر لە دوای‌عەفوکردن برینی‌لێکردنەوەکە پێدا ڕۆیشت بۆ ئەندامێکی‌تر (فَانْدَمَلَ) ئینجا چاك بۆوە: وەك پەنجەیەکی لێکردەوەو لەپەدەستەکەشـی بەو لێکردنەوەیە خۆرکی گرت، ئینجا چاك بۆوە، ئەوە (ضَمِنَ دِيَةَ السِّرَايَةِ) تاوانکارەکـە دەبێتە زامینی تەنها خوێنی پێداڕۆیشتنەکە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَمَنْ لَهُ قِصَاصُ نَفْسٍ بِسِرَايَةِ طَرَفٍ) هەر میراتگرێك مافی کوشتنەوەی لە تۆڵەی هەبێ بە هۆی پێداڕۆیشتنی لێکردنەوەی ئەندامێك: وەك کوژراوەکە دەستی لێکرابێتەوەو بە پێداڕۆیشـتنی لێکردنەوەکە مردبێ (لَوْ عَفَا عَنِ النَّفْسِ) ئەگەر تاوانکارەکـەی لـە کوشـتنەوەی لەتۆڵـە عـەفو کردبێ (فَلاَ قَطْعَ لَهُ) بۆی دروست نیە: ئەندامەکەی تاوانکارەکە لێبکاتـەوە (أَوْ عَـنِ الطَّـرَفِ) بەڵام ئەگەر تاوانکارەکەی تەنها لە لێکردنەوی ئەندامەکە عەفو کرد، ئەو کاتە (فَلَهُ حَزُّ الرَّقَبَةِ) بۆی دروستە گەردەنی ببڕێ‌و لەتۆڵە بیکوژێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَ) هەر لەم مەسەلەیەدا (لَوْ قَطَعَهُ) ئەگەر میراتگرەکە ئەندامەکەی تاوانکارەکەی لەتۆڵە

لێکردەوە (ثُمَّ عَفَا عَنِ النَّفْسِ مَجَّانًا) ئینجا بە خۆڕایی، یان بە پارە لە کوشتنەوەی لەتۆڵە تاوانکارەکەی عەفو کرد، ئەوە (فَإِنْ سَرَىٰالْقَطْعُ) ئەگەر لێکردنەوەی تاوانکارەکەش پێدا ڕۆیشتو بە برینەکە مرد، ئەو کاتە (بَانَ بُطْلَانُ الْعَفْوِ) ئاشکرا دەبێ عەفوکردنەکە بەتاڵەو پێداڕۆیشتنەکەش دەبێتە تۆڵەکردنەوە، کەواتە: پارە ناوبراوەکە –لە حاڵەتی دووەم– واجب نابێ (وَإِلاَّ) بەلاّم ئەگەر پێدا نەڕۆیشتو برینیتاوانکارەکە چاك بۆوە، ئەو کاتە (فَيَصِحُّ) عەفوکردنەکە دروست دەبێ، پارە ناوبراوەکەش–لە حاڵەتیدووەم– لە سەر تاوانکارەکە جێگیر دەبێو واجبە بیداتە عەفوکەرەکە.

وَلَوْ وَكَّلَ ثُمَّ عَفَا فَاقْتَصَّ الْوَكِيلُ جَاهِلاً فَلاَ قِصَاصَ عَلَيْهِ، وَالأَظْهَرُ وُجُوبُ دِيَةٍ وَأَنَّهَا عَلَيْهِ لاَ عَلَى عَاقِلَتِهِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَرْجِعُ بِهَا عَلَىالْعَافِي، وَلَوْ وَجَبَ قِصَاصٌ عَلَيْهَا فَنَكَحَهَا عَلَيْهِ جَازَ وَسَقَطَ، فَإِنْ فَارَقَ قَبْلَ الْوَطْءِ رَجَعَ بِنِصْفِ الأَرْشِ، وَفِي قَوْلٍ بِنِصْفِ مَهْرِمِثْلٍ.

## (كِتَابُ الدِّيَاتِ)

---

(وَلَوْ وَكَّلَ) ئەگەر خاوەن مافەکە یەکێکی کردە وەکیلی خۆی بۆ تۆڵەکردنەوە (ثُمَّ عَفَا) ئینجا لە دوای وەکیلگرتنەکە تاوانکارەکەی عەفو کرد (فَاقْتَصَّ الْوَكِيلُ جَاهِلاً) ئینجا وەکیلەکەش تاوانکارەکەی لەتۆڵە کوشتەوەو نەشیزانیبو عەفو کراوە، ئەوە (فَلاَ قِصَاصَ عَلَيْهِ) کوشتنەوەی لەتۆڵە لە سەر وەکیلەکە واجب نابێ، چونکە عوزری هەیە.

بەلاّم (وَالأَظْهَرُ وُجُوبُ دِيَةٍ) بە فەرموودەیبەهێزتر: خوێنیکوژراوەکەی لە سەر واجب دەبێ (وَ) هەر بەفەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهَا عَلَيْهِ لاَ عَلَىعَاقِلَتِه) هەموو خوێنەکە لە سەر وەکیلەکە واجبە بیدا، هیچی لە سەر خزمەکانی نیە، چونکە بە قەسدی کوشتنەکەی کردوە (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَ يَرْجِعُ بِهَا عَلَىالْعَافِي) وەکیلەکە مافی نیە بگەڕێتەوە سەر عەفوکەرەکەو خوێنەکەی لێبستێنێتەوە، چونکە عەفوکەرەکە کارێکی چاکی کردوە: کە عەفوکردنە.

بەلاّم ئەگەر وەکیلەکە دەیزانی عەفو کراوە ئینجا کوشتی، ئەو کاتە وەکیلەکەش لەتۆڵەی تاوانکارەکە دەکوشترێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ وَجَبَ قِصَاصٌ عَلَيْهَا) ئەگەر ئافرەتێك تۆڵەکردنەوەیەکی گیانی، یان ئەندامی لە سەر واجب بوو (فَنَكَحَهَا عَلَيْهِ) ئینجا خاوەن مافەکەش ئافرەتەکەی لە سەر تۆڵەکردنەوەکە لە خۆی مارەکرد، واتە: تۆڵەکردنەوەکەی کردە مارەییئافرەتەکە، ئەوە (جَازَ) دروستە، واتە: مارەبرینەکەو مارەییەکە هەردووکی دروست دەبن (وَسَقَطَ) تۆڵەش لە سەر ئافرەتەکە لادەکەوێ (فَإِنْ فَارَقَ قَبْلَ الْوَطْءِ) جا ئەگەر پێش جیماعکردن لە ژنەکە جیابۆوە: وەك تەلاّقی بدا، ئەو کاتە (رَجَعَ بِنِصْفِ الأَرْشِ) مێردەکە دەگەڕێتەوە سەر

ئافرەتەكەو نیوەی خوێنی‌تاوانەكەی لێ‌وەردەگیرێتەوە (وَفِى قَوْلٍ بِنِصْـفِ مَهْـرِ مِثْـلٍ) لـە فەرمودەیەكدا: نیوەی مارەیی هاوێنە لە ئافرەتەكە وەردەگیرێتەوە.

## ﴿ كِتَابُ الدِّيَاتِ: **پەرتوكی خوێنەكان** ﴾

خوێن: ئەو ماڵەیە بە هۆی كوشتن، یان بریندارکردن، یان لێكردنەوەی ئەندام واجب دەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً خَطأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ﴾ هەر كەسێك بە هەڵە موسوڵمانێكی كوشت، واجبە: كۆیلەیەكی موسوڵمان لە كـەففارەتی كوشتنەكە ئازاد بكاو خوێنی‌كوژراوەكەش تەسلیمی میراتگرەكانی كوژراوەكە بكا.

فِـــى قَتْـــلِ الْحُرِّالْمُسْـــلِمِ مِـــأَةُ بَعِيـــرٍ مُثَلَّثَـــةٌ فِالْعَمْـــدِ: ثَلاَثُـــونَ حِقَّـــةً وَثَلاَثُـــونَ جَذَعَـــةً وَأَرْبَعُـــونَ خَلِفَـــةً أَيْ حَـــامِلاً، وَمُخَمَّسَـــةٌ فِالْخَطَـــأِ: عِشْـرُونَ بِنْـتَ مَخَـاضٍ وَكَـذَا بَنَـاتُ لَبُـونٍ وَبَنُـو لَبُـونٍ وَحِقَـاقٌ وَجِـذَاعٌ، فَـإِنْ قَتَـلَ خَطَـأً فِـى حَـرَمِ مَكَّـةَ أَوِ الأَشْـهُرِالْحُرُمِ-ذِالْقَعْـدَةِ وَذِالْحِجَّـةِ وَالْمُحَرَّمِ وَرَجَب- أَوْ مَحْرَمًا ذَارَحِمٍ فَمُثَلَّثَةٌ، وَالْخَطأُ وَإِنْ تَثَلَّثَ فَعَلَى الْعَاقِلَةِ مُؤَجَّلَةٌ،

---

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْعَقْلُ مِيراثٌ بَيْنَ وَرَثَةِ الْقَتِيلِ عَلَى قَرابَتِهِمْ، فَمَا بَقِيَ فَلِلْعَصَبَةِ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، خوێنی‌كوژراوەكە لە نێوان میراتگرەكانیدا بەش دەكرێ بەگوێرەی بەشە میراتەكانیان، جا ئەوەی لە پاش خاوەن بەشەكان ماوەتەوە، بۆ میراتگرەكانی پشتێیە.

﴿فِى قَتْلِ الْحُرِّ الْمُسْلِمِ مِأَةُ بَعِيرٍ﴾ رواه أصحاب السنن بمعناه وصححه البيهقي، لە كوشتنی نێرێكی ئازادی موسوڵماندا سەد ووشتر خوێنی كوژراوەكە واجب دەبێ.

جیاوازی نیە كوژراوەكە پیاوێكی عاقڵ بێ، یان منداڵو شێت بێ، هەروەها جیاوازی نیە كوشتنەكە بە قەسدی بێ، یان بە هەڵە بێ، بەڵام سەد وشترەكە:

(مُثَلَّثَةٌ فِىالْعَمْدِ) لە كوشتنی بە قەسدیدا ئەستور دەكرێو دەكرێتە سێ بەش: ﴿ثَلاَثُونَ حِقَّةً وَثَلاَثُونَ جَذَعَةً وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً: أَيْ حَامِلاً﴾ رواه الترمذي بسند حسن، سی ووشتری مێی سێ ساڵە، سی ووشتری مێی چوار ساڵە، چل ووشتری ئاوس.

(وَمُخَمَّسَةٌ فِىالْخَطَأِ) لە كوشتنی بە هەڵەدا سوك دەكرێو دەكرێتە پێنج بەش: ﴿عِشْرُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ وَكَذَا بَنَاتُ لَبُونٍ وَبَنُو لَبُونٍ وَحِقَاقٌ وَجِذَاعٌ﴾ رواه الدارقطني بسند قويّ، بیست ووشتری مێی یەك ساڵە، بیست ووشتری مێی دوو ساڵە، بیست ووشتری نێری دوو ساڵە، بیست ووشتری مێی سێ ساڵە، بیست ووشتری مێی چوار ساڵە.

(فَإِنْ قَتَلَ خَطَأً فِى حَرَمِ مَكَّةَ) جا ئەگەر لە (حَرَم)ی (مَكّة)دا بە هەڵە مرۆڤێكی كوشت (أَوِ الأَشْهُرِالْحُرُمِ) یان لە یەكێك لە مانگەكانی حەرامدا بە هەڵە مرۆڤێكی كوشت: كە (ذِىالْقَعْدَةِ

وَذِی‌الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمِ وَرَجَب)ن، (أَوْ مَحْرَمًا ذَا رَحِمٍ) یان خزمێكی خاوەن ڕەحمی خۆی بە هەڵە كوشت: وەك دایكو باوكو خوشكو برا، ئەو كاتە (فَمُثَلَّثَةٌ) خوێنەكە-وەك كوشتنی بە قەسدی- ئەستور دەكریۆ دەكرێتە سێ بەش.

ئینجا (وَالْخَطَأُ) خوێنی كوشتنی بە هەڵەو تاوانەكانی‌تری بە هەڵە: وەك بریندارکردن‌و لێكردنەوەی ئەندامەكان‌و لابردنی سودەكان (وَإِنْ تَثَلَّثَ) هەرچەند بشكرێتە سێ بەش (فَعَلَى الْعَاقِلَةِ) هەمووی لە سەر خزمەكانی تاوانكارەكەیەو (مُؤَجَّلَةٌ) ماوەی بۆ دادەندرێ: بە سێ ساڵان بیدەن.

وَالْعَمْدُ عَلَى‌الْجَانِي مُعَجَّلَةٌ، وَشِبْهُ الْعَ[illegible]
وَلاَ يُقْبَلُ مَعِيبٌ وَمَرِيضٌ إلاَّ بِرِضَاهُ، وَيَثْبُـ[illegible]
وَالأَصَحُّ إجْزَاؤُهَا قَبْلَ خَمْسِ سِنِينَ، وَمَنْ لَزِمَتْهُ وَلَهُ إبِلٌ فَمِنْهَا، وَقِيلَ مِنْ غَالِبِ إبِلِ بَلَدِهِ، وَإِلاَّ فَغَالِبِ إبِلِ بَلَدِهِ أَوْقَبِيلَةِ بَدَوِيٍّ، وَإِلاَّ فَأَقْرَبِ بِلاَدٍ، وَلاَ يَعْدِلُ إلَى نَوْعٍ وَقِيمَةٍ إلاَّ بِتَرَاضٍ، وَلَوْ عُدِمَتْ فَالْقَدِيمُ أَلْفُ دِينَارٍ أَوْ اِثْنَاعَشَرَ أَلْفَ دِرْهَمٍ،

---

(وَالْعَمْدُ) خوێنی كوشتن‌و تاوانەكانی‌تری بەقەسدی (عَلَى‌الْجَانِي) هەمووی لە سەر تاوانكارەكەیەو (مُعَجَّلَةٌ) دەبی بە پەلە-بێ دواخستن- بیدا.

(وَشِبْهُ الْعَمْدِ) خوێنی كوشتن‌و تاوانەكانی‌تری وێنەی بە قەسدی (مُثَلَّثَةٌ عَلَى‌الْعَاقِلَةِ) سێ‌بەشەو هەمووی لە سەر خزمەكانی تاوانكارەكەیەو (مُؤَجَّلَةٌ) ماوەی بۆ دادەندرێ بە سێ ساڵان بیدەن، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿عَقْلُ شِبْهِ الْعَمْدِ مُغَلَّظٌ مِثْلُ عَقْلِ الْعَمْدِ وَلاَ يُقْتَلُ صَاحِبُهُ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، خوێنی كوشتنی وێنەی بەقەسدی وەك خوێنی كوشتنی بەقەسدی ئەستوركراوە، بەڵام بكوژەكەی لەتۆڵە ناكوژرێ.

(وَلاَ يُقْبَلُ مَعِيبٌ وَمَرِيضٌ) لە خوێنی كوژراوەكەدا ووشتری عەیبدار قبوڵ ناكرێو نەخۆشیش قبوڵ ناكرێ (إلاَّ بِرِضَاهُ) تەنها بە ڕەزامەندی خاوەن مافەكە نەبێ (وَيَثْبُتُ حَمْلُ الْخَلِفَةِ بِأَهْلِ خِبْرَةٍ) ئاوسی‌ی ووشترەكە بە دووكەسی لێزانی دادپەروەر ئاشكرا دەبێ (وَالأَصَحُّ إجْزَاؤُهَا قَبْلَ خَمْسِ سِنِينَ) بە فەرموودەی ڕاستتر: ووشترە ئاوسەكەی پێش تەمەنی پێنج ساڵیش دروستە لە خوێن بدرێ.

(وَمَنْ لَزِمَتْهُ) هەر كەسێك خوێنی‌كوژراوێكی لە سەر واجب بوو (وَلَهُ إبِلٌ) بە خۆیشی ووشتری هەبون، ئەوە (فَمِنْهَا) هەر لە ووشترەكانی‌خۆی خوێنەكەی لی‌ۆەردەگیرێ (وَقِيلَ مِنْ غَالِبِ إبِلِ بَلَدِهِ) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: لە ووشترە غاڵبەكانی شارەكەی خۆی لی‌ێ وەردەگیرێ (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر بەخۆی وشتری نەبون، ئەو كاتە (فَغَالِبِ إبِلِ بَلْدَةِ أو قَبِيلَةِ بَدَوِيٍّ) لە ووشترە غاڵبەكانی شارەكەی‌خۆی، یان هۆزە ڕەشماڵنیشەكەی‌خۆی وەردەگیرێ (وَإِلاَّ) ئەگەر لەو شارەو هۆزەدا ووشتر نەبون، ئەو كاتە (فَأَقْرَبِ بِلاَدٍ) لە ووشترە

غاڵبەکانی نزیکترین شار، یان نزیکترین هۆز وەردەگیرێ (وَلاَ يَعْدِلُ إِلَى نَوْعٍ وَقِيمَةٍ) نابێ لەو جۆرە ووشترەی واجب بووە لابدرێ بۆ جۆرێکیتر، یان بۆ نرخی جۆرەکە (إِلاَّ بِتَرَاضٍ) تەنها بەڕازیبونی خوێندەرەکەو خوێنوەرگرەکە دروستە لا بدرێ.

(وَلَوْ عُدِمَتْ) ئەگەر لە شوێنی خوێندانەکەدا ووشتر نەبون، یان هەبون بەلام لە نرخی وێنەی خۆیان گرانتر بون، ئەو کاتە (فَالْقَدِيمُ أَلْفُ دِينَارٍ) بە فەرموودەی کۆنی ئیمامی (الشافعی) هەزار میسقالی زێڕ واجبە لە خوێنی نێرێکی کوژراو بدرێ (أَوْ اثْنَاعَشَرَ أَلْفَ دِرْهَمٍ) یان دوانزە هەزار دیرهەمی زیو بدرێ ﴿عن عمربن حزم: قال النَّبِيُّ ﷺ

وَالْجَدِيدُ قِيمَتُهَا بِنَقْدِ بَلَدِهِ، وَإِنْ وُجِدَ بَعْضٌ أُخِذَ وَقِيمَةُ الْبَاقِي، وَالْمَرْأَةُ وَالْخُنْثَى كَنِصْفِ رَجُلٍ نَفْسًا وَجُرْحًا، وَيَهُودِيٌّ وَنَصْرَانِيٌّ ثُلُثُ مُسْلِمٍ، وَمَجُوسِيٌّ ثُلُثَاعُشْرِ مُسْلِمٍ، وَكَذَا وَثَنِيٌّ لَهُ أَمَانٌ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّ مَنْ لَمْ يَبْلُغْهُ الإِسْلاَمُ إِنْ تَمَسَّكَ بِدِينٍ لَمْ يُبَدَّلْ فَدِيَةُ دِينِهِ، وَإِلاَّ فَكَمَجُوسِيٍّ.

---

-فِي دِيَةِ الرَّجُلِ-: وَعَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَلْفُ دِينَارٍ﴾. وعن إبن عباس رضي‌الله عنهما: ﴿جَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ دِيَةَ رَجُلٍ إِثْنَيْ عَشَرَ أَلْفاً، أَيْ دِرْهَماً﴾ رواهما أبوداود والنسائی بسندين صالحين، پێغەمبەر ﷺ خوێنی پیاوێکی کوژراوی: لە سەر خاوەن زێڕەکان هەزار میسقالی زێڕی داناوە. هەروەها دوانزە هەزار دیرهەمی زیویشی داناوە.

(وَالْجَدِيدُ قِيمَتُهَا بِنَقْدِ بَلَدِهِ) بەلام بە فەرموودەی نوێ: نرخی ووشترەکان واجب دەبێ بە پارەی شاری واجبوونی خوێنەکە، هەرچەند زۆریش بێ، چونکە حەدیسێکی (صحيح)ش لە بارەی نرخی ووشترەکان (أبوداود والنسائی) گێڕاویانەتەوە. کەوابو: (وَإِنْ وُجِدَ بَعْضٌ) ئەگەر لە ووشترەکانی خوێن تەنها هەنێکیان هەبون، ئەو کاتە (أُخِذَ وَقِيمَةُ الْبَاقِي) هەبووەکە لەگەڵ نرخی نەبووەکان وەردەگیرێ تا خوێنەکە تەواو دەبێ.

(وَالْمَرْأَةُ وَالْخُنْثَى) خوێنی ئافرەتو نێرامۆکی ئازاد: هەر یەکەیان (كَنِصْفِ رَجُلٍ نَفْسًا وَجُرْحًا) وەکو نیوەی خوێنی پیاوێکە لە گیانو لە برینەکانیەوە، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام، جیاوازی ئافرەتی گەورەو عاقڵو منداڵو شێت نیە.

(وَيَهُودِيٌّ وَنَصْرَانِيٌّ) خوێنی جولەکەو دیانی پەیمان لەئەستۆ (ثُلُثُ مُسْلِمٍ) سێیەکی خوێنی موسوڵمانێکە: لە گیانو لە برینەکانیەوە (وَمَجُوسِيٌّ) خوێنی مەگوشێك، واتە: ئاگرپەرستێك (ثُلُثَا عُشْرِ مُسْلِمٍ) دوو سێیەکی دەیەکی خوێنی موسوڵمانێکە ﴿عن ابن المسيب: أَنَّ عُمَرَ قَضَى فِي دِيَةِ الْيَهُودِيِّ وَالنَّصْرَانِيِّ بِأَرْبَعَةِ آلاَفٍ، وَفِي دِيَةِ الْمَجُوسِيِّ بِثَمَانِمِأَةٍ﴾ رواه الشافعی، واتە: ئیمامی (عمر) ئەوها بڕیاری داوە.

(وَكَذَا وَثَنِيٌّ لَهُ أَمَانٌ) هەروەها خوێنی بتپەرستیش ئەگەر دڵنیاکراوبێ: دوو سێیەکی دەیەکی خوێنی موسوڵمانێکە، هەروەها خوێنی ژنەکانی ئەو کافرانەی‌ڕابردووش:

وەكو نیوە خوێنی پیاوەكانیانە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.
(وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (أَنَّ مَنْ لَمْ يَبْلُغْهُ الإِسْلاَمُ) ئەو كەسەی بانگەوازی ئایینیئیسلامی نەگەیوەتێ (إِنْ تَمَسَّكَ بِدِينٍ لَمْ يُبَدَّلْ) ئەگەر دەستی بە ئایینێكی وەهاوە گرتبێ كە نەگۆڕدرابێ، ئەوە (فَدِيَةُ دِينِهِ) خوێنەكەی خوێنی ئایینەكەیەتی: جا جولەكە بێ، یان دیان (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر دەستی بە هیچ ئاینێكەوە نەگرتبێ، ئەوە (فَكَمَجُوسِيٍّ) خوێنەكەی وەك خوێنی مەگوشێكە، واتە: ئاگرپەرستێك.
(فَصْلٌ) فِي مُوضِحَةِ الرَّأْسِ أَوِ الْوَجْهِ لِحُرٍّ مُسْلِمٍ خَمْسَةُ أَبْعِرَةٍ، وَهَاشِمَةٍ مَعَ إِيضَاحٍ عَشَرَةٌ، وَدُونَهُ خَمْسَةٌ، وَقِيلَ حُكُومَةٌ، وَمُنَقِّلَةٍ خَمْسَةَعَشَرَ، وَمَأْمُومَةٍ ثُلُثُ الدِّيَةِ، وَلَوْ أَوْضَحَ فَهَشَمَ آخَرُ وَنَقَّلَ ثَالِثٌ وَأَمَّ رَابِعٌ فَعَلَى كُلٍّ مِنَ الثَّلاَثَةِ خَمْسَةٌ وَالرَّابِعِ تَمَامُ الثُّلُثِ، وَالشِّجَاجُ قَبْلَ الْمُوضِحَةِ إِنْ عُرِفَتْ نِسْبَتُهَا مِنْهَا وَجَبَ قِسْطٌ مِنْ أَرْشِهَا، وَإِلاَّ فَحُكُومَةٌ كَجُرْحِ سَائِرِ الْبَدَنِ،

---

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی خوێنی برین و لابردنی ئەندامەكان ﴾

﴿فِي مُوضِحَةِ الرَّأْسِ أَوِ الْوَجْهِ﴾ لەو برینەدا كە ئێسقانی سەر، یان ڕووی ئاشكرا كردووە (لِحُرٍّ مُسْلِمٍ) بریندارکراوەكەش پیاوێكی ئازادو موسوڵمانە ﴿خَمْسَةُ أَبْعِرَةٍ﴾ رواه اصحاب السنن بمعناه وصححه البيهقي، پێنج ووشتر خوێنەكەی واجب دەبێ.
﴿وَهَاشِمَةٍ مَعَ إِيضَاحٍ عَشَرَةٌ﴾ رواه البيهقي، وە لەو برینەشدا كە ئێسقانی سەر، یان ڕووی شكاندووەو ئاشكراشی كردوە، دە ووشتر خوێنەكەی واجب دەبێ.
(وَدُونَهُ خَمْسَةٌ) ئەگەر شكاندنی ئێسقانەكە بێئاشكراكردن بوو، ئەو كاتە پێنج ووشتر واجب دەبن (وَقِيلَ حُكُومَةٌ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: نرخی شكاندنەكە واجب دەبێ.
﴿وَمُنَقِّلَةٍ خَمْسَةَعَشَرَ﴾ رواه أصحاب السنن وصححه البيهقي، لەو برینەشدا كە ئێسقانی سەر، یان ڕووی گواستۆتەوەو هەم شكاندویەتیو ئاشكراشی كردوە: پانزە ووشتر خوێنەكەی واجب دەبێ.
﴿وَمَأْمُومَةٍ ثُلُثُ الدِّيَةِ﴾ رواه النسائي وصححه البيهقي، لەو برینەشدا كە گەیوەتە پیستەی مێشك: سێیەكیخوێن واجب دەبێ.
(وَلَوْ أَوْضَحَ) ئەگەر یەكێك ئێسقانەكەی لە برینەكەدا ئاشكرا كرد (فَهَشَمَ آخَرُ) ئینجا یەكێكیتریدووەمیش ئێسقانەكەی ورد كردو (وَنَقَّلَ ثَالِثٌ) یەكێكیتری سێیەمیش ئێسقانەكەی گواستەوەو (وَأَمَّ رَابِعٌ) یەكێكیتری چوارەمیش برینەكی گەیاندە پیستەی مێشك، ئەوە (فَعَلَى كُلِّ مِنَ الثَّلاَثَةِ خَمْسَةٌ) لە سەر هەر یەكێك لە سێ كەسەكان پێنج ووشتر خوێنی برینەكە واجب دەبێو (وَالرَّابِعِ تَمَامُ الثُّلُثِ) لە سەر چوارەمەكەش تەواوكەری سێیەكی خوێنەكە واجب دەبێ: كە هەژدە ووشترو سێیەكە ووشترێكە.

(وَالشِّجَاجُ قَبْلَ الْمُوضِحَةِ) ئەو پێنج برینانەی پێش ئاشكراكەرەكە-كە لە باسی تۆڵەكردنەوەی ئەندام و برینەكاندا ڕابران-(إِنْ عُرِفَتْ نِسْبَتُهَا مِنْهَا) ئەگەر نیسبەتی برینەكە لە ئاشكراكەرەكە زاندرا، ئەوە (وَجَبَ قِسْطٌ مِنْ أَرْشِهَا) بەشێك لە خوێنی ئاشكراكەرەكە بۆ برینەكە واجب دەبێ (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر نیسبەتەكە نەزاندرا، ئەو كاتە (فَحُكُومَةٌ) نرخی برینەكە واجب دەبێ (كَجُرْحِ سَائِرِ الْبَدَنِ) وەك برینەكانیتری لاشە، واتە:-جگە لە سەر و ڕوو- لە گشت برینەكانی لاشەدا نرخیبرینەكە واجب دەبێ-نەك

وَفِي جَائِفَةٍ ثُلُثُ دِيَةٍ وَهِيَ جُرْحٌ يَنْفُذُ إِلَى جَوْفٍ كَبَطْنٍ وَصَدْرٍ وَثُغْرَةِ نَحْرٍ وَجَبِينٍ وَخَاصِرَةٍ، وَ لاَ يَخْتَلِفُ أَرْشُ مُوضِحَةٍ بِكِبَرِهَا، وَلَوْ أَوْضَحَ مَوْضِعَيْنِ بَيْنَهُمَا لَحْمٌ وَجِلْدٌ قِيلَ أَوْ أَحَدُهُمَا فَمُوضِحَتَانِ، وَلَوْ انْقَسَمَتْ مُوضِحَتُهُ عَمْدًا وَخَطَأً أَوْ شَمِلَتْ رَأْسًا وَوَجْهًا فَمُوضِحَتَانِ، وَقِيلَ مُوضِحَةٌ، وَلَوْ وَسَّعَ مُوضِحَتَهُ فَوَاحِدَةٌ عَلَىالصَّحِيحِ، أَوْ غَيْرُهُ فَثِنْتَانِ، وَالْجَائِفَةُ كَمُوضِحَةٍ فِالتَّعَدُّدِ، وَلَوْ نَفَذَتْ فِي بَطْنٍ وَخَرَجَتْ مِنْ ظَهْرٍ

---

خوێن- هەرچەند ئێسقانەكەش لە برینەكەدا ئاشكرا كرابێ، یان شكێندرابێ، یان گواسترابێتەوە، یان بێبریندارکردن ئێسقانەكە شكێندرابێ، چونكە ئەو بریندارکردنو شكاندنانەی لاشە-جگە لە سەرو ڕوو- هیچێكیان بەڵگە لە سەر خوێنەكەیان نەهاتوە، بەڵكو-جگە لە برینی ئاشكراكەر- هیچێكیان تۆڵەكردنەوەشیان دروست نیە، هەروەك لە (باسی تۆڵەكردنەوەی برین ئەندامەكان)دا ڕابرا، كەوابو: دادوەر نرخی ئەو برینو شكستانە دیاری دەكا، هەروەك لەباسی (حُكُومَة)دا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى.

﴿وَفِي جَائِفَةٍ ثُلُثُ دِيَةٍ﴾ رواه اصحاب السنن وصححه البيهقي، لە برینی دوودەردا: سێیەكی خوێن واجب دەبێ. (وَهِيَ) برینی دوودەر: (جُرْحٌ يَنْفُذُ إِلَى جَوْفٍ) برینێكە دەگاتە ناو كلۆرایی لاشە (كَبَطْنٍ وَصَدْرٍ وَثُغْرَةِ نَحْرٍ وَجَبِينٍ وَخَاصِرَةٍ) وەك ناو زگو ناو سینەو ناو نەویایی سەروەیسینەو ناو تەوێڵەو ناو كەلەكە.

(وَ لاَ يَخْتَلِفُ أَرْشُ مُوضِحَةٍ بِكِبَرِهَا) خوێنی برینی ئاشكراكەر بە گەورەو بچوكیی برینەكە لێك جیاواز نابێ (وَلَوْ أَوْضَحَ مَوْضِعَيْنِ) ئەگەر دوو شوێنی بریندار كردنو ئێسقانەكەشی ئاشكرا كردن، كە (بَيْنَهُمَا لَحْمٌ وَجِلْدٌ) لە نێوان هەردوو شوێنەكاندا گۆشتو پێستە هەبوو (قِيلَ أَوْ أَحَدُهُمَا) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: یان تەنها یەكێكیان لە نێواندا هەبوو، ئەوە (فَمُوضِحَتَانِ) بە دوو ئاشكراكەر دەژمێردرێن.

(وَلَوْ انْقَسَمَتْ مُوضِحَتُهُ عَمْدًا وَخَطَأً) ئەگەر برینە ئاشكراكەرەكەی بەشێكی بە قەسدیو بە شێكی بە هەڵە بوو (أَوْ شَمِلَتْ رَأْسًا وَوَجْهًا) یان ئاشكراكەرەكەی سەرو ڕووی داگرتەوە، ئەوە (فَمُوضِحَتَانِ) لە هەردوو مەسەلەدا بە دوو ئاشكراكەر دەژمێردرێن (وَقِيلَ مُوضِحَةٌ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: یەك ئاشكراكەرە (وَلَوْ وَسَّعَ مُوضِحَتَهُ) ئەگەر تاوانكارەكە برینە

ئاشكراكەرەكەی خۆی فراوان كرد، ئەوە (فَوَاحِدَةٌ عَلَىالصَّحِيحِ) بە یەك ئاشكراكەر دادەندرێ (أَوْ غَيْرُهُ) یان كەسێكیتر ئاشكراكەرەكەی وی فراوان كرد، ئەوە (فَثِنْتَانِ) بە دوو ئاشكراكەر دەژمێردرێن‌و هەر یەكەیان بڕیای خۆی بۆ دەدرێ.
(وَالْجَائِفَةُ كَمُوضِحَةٍ فِيالتَّعَدُّدِ) برینی دوودەر وەكو برینی ئاشكراكەرە: لە ڕووی ژمارەو تاك‌و فراوانكردنی‌ڕابردوودا (وَلَوْ نَفَذَتْ فِي بَطْنٍ) ئەگەر شتێكی لیێدا، شتەكەش گەیشتە ناو زگی‌و (وَخَرَجَتْ مِنْ ظَهْرٍ) لە پشتیەوە دەرچو: وەك گوللەی تفەنگ، یان بە پێچەوانەوە:
فَجَائِفَتَانِ فِيالأَصَحِّ، وَلَوْ أَوْصَلَ جَوْفَهُ سِنَانًا لَهُ طَرَفَانِ فَثِنْتَانِ، وَلاَ يَسْقُطُ أَرْشٌ بِالْتِحَامِ مُوضِحَةٍ وَجَائِفَةٍ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّ فِيالأُذُنَيْنِ دِيَةً لاَ حُكُومَةً، وَبَعْضٌ بِقِسْطِهِ، وَلَوْ أَيْبَسَهُمَا فَدِيَةٌ، وَفِي قَوْلٍ حُكُومَةٌ، وَلَوْ قَطَعَ يَابِسَتَيْنِ فَحُكُومَةٌ، وَفِي قَوْلٍ دِيَةٌ، وَفِي كُلِّ عَيْنٍ نِصْفُ دِيَةٍ وَلَوْ عَيْنُ أَحْوَلَ وَأَعْمَشَ

---

لە پشتی دا لە زگیەو دەرچو، یان لە تەنیشتێكی دا لە تەنیشتەكەی‌ترەوە دەرچو، ئەوە (فَجَائِفَتَانِ) لە هەر سێك مەسەلەكاندا بە دوو برینی دوودەر دەژمێردرێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی‌ڕاستتردا، كەوابو: دووسێیەكی‌خوێن لە سەر بریندارکەرەكە واجب دەبێ، چونكە ئیمامی(أبوبكرﷺ) ئەوها بڕیاری داوە، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.
(وَلَوْ أَوْصَلَ جَوْفَهُ سِنَانًا لَهُ طَرَفَانِ) ئەگەر سەرە ڕمێكی دوو سەری لیێداو هەردوو سەرەكانی گەیاندە ناو كلۆرایيەكی لێدراوەكە، یان دوو گوللەی لێدان‌و گەیشتنە ناو كلۆرایی، ئەوەش (فَثِنْتَانِ) دوو برینی دوودەرن، كەوابو: ئەگەر هەردوو سەرەكان، یان هەردوو گوللەكان لە پشتیەوە دەرچون، ئەو كاتە دەبنە چوار برینی دوودەر، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.
(وَلاَ يَسْقُطُ أَرْشٌ) خوێنی برینەكە لە سەر بریندارەكە لاناكەوێ (بِالْتِحَامِ مُوضِحَةٍ وَجَائِفَةٍ) بە چاكبوونەوەو یەكگرتنەوەی برینی ئاشكراكەرو دوودەر، چونكە خوێنەكە لە بەرامبەر ئازارەكەیە.
(وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (أَنَّ فِيالأُذُنَيْنِ دِيَةً) لە لێكردنەوەی هەردوو گوێ‌دا خوێنێكی‌تەواو–واتە: سەد ووشتر– واجب دەبێ (لاَ حُكُومَةً) نەك نرخی گوێیەكان ﴿عن الزهريﷺ: أَنَّهُ قَرَأَ فِي كِتَابِ عَمْرِو بن حزم– أيْ عَنِ النَّبِيِّﷺ–: وَفِيالأُذُنِ خَمْسُونَ مِنَ الإِبِلِ﴾ رواه البیهقی، لە لێكردنەوەی یەك گوێ‌دا پەنجا ووشتر واجب دەبێ.
(وَبَعْضٌ بِقِسْطِهِ) لە لێكردنەوەی بەشە گوێیەكدا، یان بەشێكی هەردووكیاندا (بِقِسْطِهِ) بەگوێرەی بەشە لێكراوەكە لە خوێنەكە واجب دەبێ (وَلَوْ أَيْبَسَهُمَا) ئەگەر بە هۆی تاوانێك هەردوو گوێی ووشك كردن، واتە: نەدەجولان، ئەوە (فَدِيَةٌ) خوێنێكی تەواو واجب دەبێ (وَفِي قَوْلٍ حُكُومَةٌ) لە فەرموودەیەكدا نرخەكەیان واجب دەبێ (وَلَوْ قَطَعَ يَابِسَتَيْنِ) ئەگەر

دوو گوێیووشکبووی لێکردنەوە (فَحُكُومَةٌ) نرخەکەیان واجب دەبێ (وَفِی قَوْلٍ دِیَةٌ) لە فەرموودەیەکدا خوێنەکەیان واجب دەبێ.
(وَفِی كُلِّ عَيْنٍ نِصْفُ دِيَةٍ) لە لابردنی هەر چاوێکی ساغدا نیوەی خوێن –پەنجا ووشتر– واجب دەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿وَفِىالْعَيْنَيْنِ اَلدِّيةُ﴾ رواه أصحاب السنن وصححه البيهقي، لە لابردنی هەردوو چاوەکاندا خوێنێکی تەواو–سەد ووشتر– واجب دەبێ. (وَلَوْ عَيْنُ أَحْوَلَ) هەرچەند چاوی خێل بێ (وَأَعْمَشَ) یان چاوی فرمێسك ڕێژ و بێهێز بێ، یان
وَأَعْوَرَ، وَكَذَا مَنْ بِعَيْنِهِ بَيَاضٌ لاَ يَنْقُصُ الضَّوْءَ، فَإِنْ نَقَصَ فَقِسْطٌ، فَإِنْ لَمْ يَنْضَبِطْ فَحُكُومَةٌ، وَفِي كُلِّ جَفْنٍ رُبُعُ دِيَةٍ وَلَوْ لأَعْمَى، وَمَارِنٍ دِيَةٌ، وَفِي كُلٍّ مِنْ طَرَفَيْهِ وَالْحَاجِزِ ثُلُثٌ، وَقِيلَ فِالْحَاجِزِ حُكُومَةٌ وَفِيهِمَا دِيَةٌ، وَفِي كُلِّ شَفَةٍ نِصْفُ دِيَةٍ، وَلِسَانٍ وَلَوْ لأَلْكَنَ وَأَرَتَّ وَأَلْثَغَ وَطِفْلٍ دِيَةٌ، وَقِيلَ شَرْطُ الطِّفْلِ ظُهُورُ أَثَرِ نُطْقٍ بِتَحْرِيكِهِ لِبُكَاءٍ وَمَصٍّ، وَلأَخْرَسَ حُكُومَةٌ.

---

چاوی شەوکوێر بێ (وَأَعْوَرَ) یان چاوە ساغەکەی مرۆڤی یەکچاو بێ، بەلام لە مەزهەبی ئیمام (مالك)و ئیمام ( أحمد)دا لە چاوە ساغەکەی مرۆڤی یەکچاودا خوێنێکی تەواو واجب دەبێ، چونکە چاوەساغەکەی لە جێی دوو چاوە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.
(وَكَذَا مَنْ بِعَيْنِهِ بَيَاضٌ لاَ يَنْقُصُ الضَّوْءَ) هەروەها چاوی ئەو کەسەش کە سپیایی لە سەر چاوەکەیەتی بەلام دیتنی کەم نەکردۆتەوە، ئەویش نیوەی خوێنی تێدا واجبە (فَإِنْ نَقَصَ) جا ئەگەر دیتنەکەی کەم کردبۆوە، ئەو کاتە (فَقِسْطٌ) بەگوێرەی کەمکردنەوەکە بەشە خوێنی واجب دەبێ (فَإِنْ لَمْ يَنْضَبِطْ) جا ئەگەر کەمکردنەوەکە بە ڕێکی دیار نەدەکرا، ئەو کاتە (فَحُكُومَةٌ) نرخەکەی واجب دەبێ.
(وَفِی كُلِّ جَفْنٍ رُبُعُ دِيَةٍ) لە لێکردنەوە هەر پێلوێکیچاوێکدا چوارێکی خوێن واجب دەبێ (وَلَوْ لأَعْمَى) هەرچەند پێلوی مرۆڤی کوێریش بێ، چونکە هەر پێلوێك جوانیو سودێکی هەیە.
﴿وَمَارِنٍ دِيَةٌ﴾ رواه الشافعي بسند صحيح، لە لێکردنەوەی نەرمە لوتدا خوێنێکیتەواو –سەد ووشتر– واجب دەبێ. هەروەها ئەگەر لە بنەبڕیشەوە لێکراوە، هەر خوێنێکی تەواو واجب دەبێ (وَفِی كُلٍّ مِنْ طَرَفَيْهِ وَالْحَاجِزِ ثُلُثٌ) لە لێکردنەوەی هەر لایەکی لوتداو لە لابردنی نێوانی هەردوو کونە لووتەکاندا، هەریەکەو سێیەکی خوێن واجب دەبێ (وَقِيلَ فِی الْحَاجِزِ حُكُومَةٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لە لابردنی نێوانەکەدا نرخەکەی واجب دەبێو (وَفِيهِمَا دِيَةٌ) لە هەردوو لایەکانیشدا خوێنێکی تەواو واجب دەبێ.
(وَفِی كُلِّ شَفَةٍ نِصْفُ دِيَةٍ) لە لێکردنەوەی هەر لێوێکدا نیوەی خوێن–پەنجا ووشتر– واجب دەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿وَفِىالشَّفَتَيْنِ اَلدِّيةُ﴾ رواه أصحاب السنن وصححه البيهقي، لە لێکردنەوەی هەردوو لێوەکاندا خوێنێکی تەواو–سەد ووشتر– واجب دەبێ.

﴿وَلِسَانٍ–وَلَوْ لأَلْكَنَ وَأَرَتَّ وَأَلْثَغَ وَطِفْلٍ– دِيَةٌ﴾ رواه اصحاب السنن بمعناه وصححه البيهقى، له لێكردنەوەی زوباندا خوێنێكی تەواو–سەد ووشتر– واجب دەبێ، هەر چەند زوبانەكەش هي ناڕەوان بێ، یان هی پیتگر بێ، یان هی پێتكۆڕ بێ، یان هی منداڵ بێ (وَقِيلَ: شَرْطُ الطِّفْلِ) له فەرموودەیەكی بێهێزدا: مەرجی خوێنی زوبانی منداڵ ئەمەیە: (ظُهُورُ أَثَرِ نُطْقٍ بِتَحْرِيكِهِ لِبُكَاءٍ وَمَصٍّ) ئاسەواری قسەكردنی ئاشكرا بێ بە جوولاندنی بۆ گریان و مەمك مژین (وَلأَخْرَسَ حُكُومَةٌ) له زوبانی لاڵ–كە قسەی پێناكرێ– نرخی زوبانەكە واجبە، نەك خوێن.

وَكُلِّ سِنٍّ لِذَكَرٍ حُرٍّ مُسْلِمٍ خَمْسَةُ أَبْعِرَةٍ سَوَاءٌ أَكَسَرَ الظَّاهِرَ مِنْهَا دُونَ السِّنْخِ أَوْ قَلَعَهَا بِهِ، وَفِي سِنٍّ زَائِدَةٍ حُكُومَةٌ، وَحَرَكَةُ السِّنِّ إنْ قَلَّتْ فَكَصَحِيحَةٍ، وَإِنْ بَطَلَتْ الْمَنْفَعَةُ فَحُكُومَةٌ، أَوْ نَقَصَتْ فَالأَصَحُّ كَصَحِيحَةٍ، وَلَوْ قَلَعَ سِنَّ صَغِيرٍ لَمْ يُثْغِرْ فَلَمْ تَعُدْ وَبَانَ فَسَادُ الْمَنْبَتِ وَجَبَ الأَرْشُ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لَوْ مَاتَ قَبْلَ الْبَيَانِ فَلاَ شَيْءَ، وَأَنَّهُ لَوْ قَلَعَ سِنَّ مَثْغُورٍ فَعَادَتْ لاَ يَسْقُطُ الأَرْشُ، وَلَوْ قُلِعَتِ الأَسْنَانُ فَبِحِسَابِهِ،

---

﴿وَكُلِّ سِنٍّ–لِذَكَرٍ حُرٍّ مُسْلِمٍ–خَمْسَةُ أَبْعِرَةٍ﴾ رواه اصحاب السنن بمعناه وصححه البيهقى، له هەڵكەندنی هەر ددانێكی نێرینەی ئازادی موسوڵماندا پێنج ووشتر خوێنەكەی واجب دەبێ. (سَوَاءٌ أَكَسَرَ الظَّاهِرَ مِنْهَا دُونَ السِّنْخِ) یەكسانە و جیاوازی نیە: لای دەرەوەی ددانەكەی شكاند بێ و ڕەگەكەی مابێتەوە (أَوْ قَلَعَهَا بِهِ) یان بە ڕەگەوە هەڵیكەندبێ، له هەردوو حاڵەتدا پێنج ووشتر واجب دەبن (وَفِي سِنٍّ زَائِدَةٍ حُكُومَةٌ) له هەڵكەندنی ددانێكی زیاد، یان زۆر بچوكدا نرخەكەی واجب دەبێ، نەك خوێن.

(وَحَرَكَةُ السِّنِّ) جولەی ددان بە هۆی پیری، یان نەخۆشی (إنْ قَلَّتْ) ئەگەر جولانەكەی كەم بێ، ئەوە (فَكَصَحِيحَةٍ) وەك ددانێكی ساغە: له تۆڵە و له خوێندا، بەڵام (وَإِنْ بَطَلَتْ الْمَنْفَعَةُ) ئەگەر ددانەكە سودی نەمابێ، ئەو كاتە (فَحُكُومَةٌ) نرخەكەی واجب دەبێ (أَوْ نَقَصَتْ) یان ئەگەر سودەكەی كەم بوبێ، ئەوەش (فَالأَصَحُّ كَصَحِيحَةٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: وەكو ددانی ساغە: له تۆڵە و له خوێندا.

(وَلَوْ قَلَعَ سِنَّ صَغِيرٍ لَمْ يُثْغِرْ) ئەگەر ددانێكی شیریی منداڵێكی هەڵكەند كە هێشتا ددانە شیریەكانی نەكەوتبون (فَلَمْ تَعُدْ) ئینجا له كاتی‌خۆیدا ددانەكەشی نەهاتەوە و (وَبَانَ فَسَادُ الْمَنْبَتِ) ئاشكراش بوو: شوێنی لێڕوانی ددانەكەی تێك چووە، ئەوە (وَجَبَ الأَرْشُ) خوێنی ددانەكە واجب دەبێ، بەڵام ئەگەر ددانەكە بە ساغی هاتەوە، ئەو كاتە هیچ تۆڵە و خوێن واجب نیە، جا ئەگەر بە ناشیرنی هاتەوە، ئەو كاتە نرخی ناشیرنیەكە واجب دەبێ، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهُ لَوْ مَاتَ قَبْلَ الْبَيَانِ) ئەگەر منداڵەكە مرد پێش ئەوەی ڕۆن ببێتەوە ددانەكەی دێتەوە، یان نا، ئەوە (فَلاَ شَيْءَ) هیچ شتێك له سەر

تاوانکارەکە واجب نابێ (وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی بەهێزتر: (لَوْ قَلَعَ سِنَّ مَثْغُورٍ) ئەگەر ددانی کەسێکی وەهای هەڵکەند کە ددانی شیریی کەوتبون (فَعَادَتْ) ئینجا ددانە هەڵکەندراوەکە هاتەوە، ئەوە (لاَ يَسْقُطُ الأَرْشُ) خوێنی ددانەکەی لاناکەوێو هەر واجبە بدرێ، چونکە هاتنەوەی ئەو ددانە نیعمەتێکی نوێیە.
(وَلَوْ قُلِعَتْ الأَسْنَانُ) ئەگەر هەموو ددانەکان هەڵکەندران، ئەو کاتەش (فَبِحِسَابِهِ) بە حیسابی هەڵکەندراوەکە خوێن واجب دەبێ، واتە: ددانی عادەتی بە ئەغلەبی سیو دوو
وَفِي قَوْلٍ لاَ يَزِيدُ عَلَى دِيَةٍ إنْ اِتَّحَدَ جَانٍ وَجِنَايَةٌ، وَكُلِّ لَحْيٍ نِصْفُ دِيَةٍ، وَلاَ يَدْخُلُ أَرْشُ الأَسْنَانِ فِي دِيَةِ اللَّحْيَيْنِ فِالأَصَحِّ، وَكُلِّ يَدٍ نِصْفُ دِيَةٍ إنْ قُطِعَ مِنْ كَفٍّ، فَإِنْ قُطِعَ مِنْ فَوْقِهِ فَحُكُومَةٌ أَيْضًا، وَفِي كُلِّ أُصْبُعٍ عَشَرَةُ أَبْعِرَةٍ، وَأُنْمُلَةٍ ثُلُثُ الْعَشَرَةِ، وَأُنْمُلَةِ الإِبْهَامِ نِصْفُهَا، وَالرِّجْلاَنِ كَالْيَدَيْنِ،

---

ددانن، کەوابو: سەدوشەست ووشتر لە خوێنی هەمووانداا واجب دەبێ، چونکە خوێنی هەر ددانێك پێنج ووشترن (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: (لاَ يَزِيدُ عَلَى دِيَةٍ إنْ اتَّحَدَ جَانٍ وَجِنَايَةٌ) نابێ خوێنی هەمووددانەکان لە خوێنێکی تەواو زیاتر بێ، ئەگەر تاوانکارو تاوانەکە یەك بن.
(وَكُلِّ لَحْيٍ نِصْفُ دِيَةٍ) لە هەر شەویلێکدا—کە ددانەکانی خوارەوی لە سەر ڕواوە—نیوەی خوێن— پەنجا ووشتر— واجبە، لە هەردووکیاندا خوێنێکی تەواو واجبە، بەڵام (وَلاَ يَدْخُلُ أَرْشُ الأَسْنَانِ فِي دِيَةِ اللَّحْيَيْنِ) خوێنی ددانەکانی خوارەوە ناچێتە ناو خوێنی هەردوو شەویلەکان لەو حاڵەتەی شەویلێك، یان هەردووشەویلەکان لێدەکرێنەوە (فِيالأَصَحِّ) لەفەرموودەی ڕاستتردا، بەڵکو خوێنی هەردوو شەویلەکان سەربەخۆیەو خوێنی هەر ددانێکیش سەربەخۆیە.
﴿وَكُلِّ يَدٍ نِصْفُ دِيَةٍ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، لە هەر دەستێکدا نیوەی خوێن—پەنجا ووشتر— واجب دەبێ. کەواتە: لە هەردوو دەستەکاندا سەد ووشتر واجب دەبێ (إنْ قُطِعَ مِنْ كَفٍّ) ئەگەر لەپەدەستەکەی لە جومگەی بازنەوە لێکرابێتەوە، بەڵام (فَإِنْ قُطِعَ مِنْ فَوْقِهِ) ئەگەر لە سەرەوەی جومگەی لەپەدەستەوە لێکراوە، ئەو کاتە (فَحُكُومَةٌ أَيْضًا) لەگەڵ خوێنی لەپەدەستەکە نرخی باسکو بە سەرەوەتریش واجب دەبێ.
﴿وَفِي كُلِّ أُصْبُعٍ عَشَرَةُ أَبْعِرَةٍ﴾ رواه اصحاب السنن وصححه البيهقي، لە لێکردنەوەی هەر پەنجەیەکی دەست، یان پێ دە ووشتر خوێنەکەی واجب دەبێ. بەڵام پەنجەی زیاد نرخەکەی واجب دەبێ (وَأُنْمُلَةٍ ثُلُثُ الْعَشَرَةِ) لە لێکردنەوی هەر سەرە پەنجەیەکدا سێیەکی دە ووشترەکە واجب دەبێ، بەڵام (وَأُنْمُلَةِ الإِبْهَامِ نِصْفُهَا) لە لێکردنەوی سەرە پەنجەکەی گەورەدا نیوەی دە ووشترەکە واجب دەبێ، چونکە ئەمە دوو جومگەیە.

(وَالرِّجْلاَنِ كَالْيَدَيْنِ) هەردوو پێیەکانیش -ئەگەر لە گوزینگەوە لێکرانەوە- وەکو هەردوو دەستەکانن، واتە: خوێنێکی تەواو -سەد ووشتر- لە لێکردنەوەی هەردوو پێیەکاندا واجب دەبێ، هەرچەند شەلەش بێ، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿وَفِالرِّجْلِ الْوَاحِدَةِ نِصْفُ الدِّيَةِ﴾ رواه أصحاب السنن وصححه البيهقي، لە لێکردنەوەی یەك پێدا نیوەی خوێن واجب دەبێ.

کەواتە: ئەگەر پێیەکە لە سەرەوەی گوزینگەوە لێکراوە، ئەو کاتە -لەگەڵ خوێنی پێیەکە- نرخی لولە قاچەکەو بە سەروەتریش واجب دەبێ، هەروەك (مغني) ئاماژەی بۆ کردوە.

وَفِي حَلَمَتَيْهَا دِيَتُهَا، وَحَلَمَتَيْهِ حُكُومَةٌ، وَفِي قَوْلٍ دِيَتُهُ، وَفِي أُنْثَيَيْنِ دِيَةٌ، وَكَذَا ذَكَرٌ وَلَوْ لِصَغِيرٍ وَشَيْخٍ وَعِنِّينٍ، وَحَشَفَةٌ كَذَكَرٍ، وَبَعْضُهَا بِقِسْطِهِ مِنْهَا وَقِيلَ مِنَ الذَّكَرِ، وَكَذَا حُكْمُ بَعْضِ مَارِنٍ وَحَلَمَةٍ، وَفِالأَلْيَتَيْنِ الدِّيَةُ وَكَذَا شُفْرَاهَا، وَكَذَا سَلْخُ جِلْدٍ إِنْ بَقِيَ حَيَاةٌ مُسْتَقِرَّةٌ وَحَزَّ غَيْرُالسَّالِخِ رَقَبَتَهُ.

---

(وَفِي حَلَمَتَيْهَا دِيَتُهَا) لە لێکردنەوەی گۆی هەردوو مەمکی ئافرەتدا خوێنی ئافرەتەکە -پەنجا ووشتر- واجب دەبێو لەگۆی یەك مەمکدا بیستو پێنج ووشتر واجب دەبن، جیاوازی نیە مەمکەکانی لە بنەوەڕا لێکردبێتەوە، یان تەنها گۆیەکەی لێکردبێتەوە (وَحَلَمَتَيْهِ حُكُومَةٌ) لە لێکردنەوەی گۆی هەردوو مەمکەکانی پیاو و نێراموکدا نرخەکەیان واجب دەبێ (وَفِي قَوْلٍ دِيَتُهُ) لە فەرموودەیەکدا: خوێنی خاوەنەکەی واجب دەبێ.

﴿وَفِي أُنْثَيَيْنِ دِيَةٌ وَكَذَا ذَكَرٌ﴾ رواه اصحاب السنن بمعناه وصححه البيهقي، لە هەردوو هێلکە گونەکاندا خوێنێکی تەواو -سەد ووشتر- واجبە، کەواتە: لە یەك هێلکە گوندا نیوەی خوێن واجبە، هەروەها لە لێکردنەوەی (ذَکَر) خوێنێکی تەواو -سەد ووشتر- واجبە (وَلَوْ لِصَغِيرٍ وَشَيْخٍ وَعِنِّينٍ) هەرچەند (ذَکَر)ی منداڵ، یان پیر، یان نەمێردیش بێ.

(وَحَشَفَةٌ كَذَكَرٍ) گۆی (ذَکَر) -کە پێی دەگوترێ ساپل- وەکو (ذَکَر)ە، واتە: بە تەنها لێکردنەوەی ساپل خوێنێکی تەواو واجب دەبێ (وَبَعْضُهَا بِقِسْطِهِ مِنْهَا) بە لێکردنەوەی بەشێکی ساپل بەگوێرەی خۆی لە ساپلەکە بەشە خوێنی واجب دەبێ (وَقِيلَ مِنَ الذَّكَرِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بەشەکە لە هەموو (ذَکَر) ڕەچاو دەکرێ (وَكَذَا حُكْمُ بَعْضِ مَارِنٍ وَحَلَمَةٍ) هەروەها بە لێکردنەوەی بەشێکی نەرمە لوتو بەشێکی گۆی مەمکی ئافرەت بەشە خوێن واجب دەبێ.

(وَفِيالأَلْيَتَيْنِ الدِّيَةُ) لە لێکردنەوەی هەردوو لاقینگەکاندا خوێنێکی تەواوی مرۆڤەکە واجبە (وَكَذَا شُفْرَاهَا) هەروەها لە لێکردنەوەی هەردو لێوی (فَرْج)ی ئافرەتدا خوێنێکی تەواوی ئافرەتەکە واجب دەبێ (وَكَذَا سَلْخُ جِلْدٍ) هەروەها بە گرواندنی پێستەی مرۆڤیش

خوێنێکی تەواوی مرۆڤەکە واجب دەبێ (إِنْ بَقِيَ حَيَاةٌ مُسْتَقِرَّةٌ) ئەگەر لە دوای گرواندنەکە گیانی جێگیربووی تێدا مابێو (وَحَزَّ غَيْرُ السَّالِخِ رَقَبَتَهُ) جگە لە گروێنەرەکەش یەکێکی‌تر کوشتبێتی، یان بە هۆیەکی‌تر مردبێ، بەڵام ئەگەر بە گرواندنەکە مرد، ئەو کاتەش هەر خوێنی مرۆڤەکە واجب دەبێ.

﴿ فَرْعٌ: لقێك لە باسی خوێنی لابردنی سودی ئەندامەکان ﴾

پێشەکی بزانە: ژمارەی سودەکانی ئەندمەکان سێزدەنە، جا هەر یەکێك لەو سودانە—لە دوای لابردن— خوێنی وەرگیرا، ئینجا سودەکە گەڕاوە، واجبە خوێنەکەش بۆ تاوانکارەکە

(فَرْعٌ) فِي الْعَقْلِ دِيَةٌ فَإِنْ زَالَ بِجُرْحٍ لَهُ أَرْشٌ أَوْ حُكُومَةٌ وَجَبَا، وَفِي قَوْلٍ يَدْخُلُ الأَقَلُّ فِالأَكْثَرِ، وَلَوْ ادَّعَى زَوَالَهُ فَإِنْ لَمْ يَنْتَظِمْ قَوْلُهُ وَفِعْلُهُ فِي خَلَوَاتِهِ فَلَهُ دِيَةٌ بِلاَ يَمِينٍ، وَفِي السَّمْعِ دِيَةٌ، وَمِنْ أُذُنٍ نِصْفٌ، وَقِيلَ قِسْطُ النَّقْصِ، وَلَوْ أَزَالَ أُذُنَيْهِ وَسَمْعَهُ فَدِيَتَانِ، وَلَوْ ادَّعَى زَوَالَهُ وَانْزَعَجَ لِلصِّيَاحِ فِي نَوْمٍ وَغَفْلَةٍ فَكَاذِبٌ، وَإِلاَّ حُلِّفَ وَأَخَذَ دِيَةً،

---

بگەڕێندرێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية) دا فەرمویانە، واتە: بەڵام نرخی تاوانەکە واجب دەبێ، هەروەك لە باسی (حُكُومَة)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى.

(فِي الْعَقْلِ دِيَةٌ) بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام لە لابردنی عەقڵدا خوێنێکی تەواو— سەد ووشتر— واجب دەبێ (فَإِنْ زَالَ بِجُرْحٍ لَهُ أَرْشٌ أَوْ حُكُومَةٌ) جا ئەگەر عەقڵەکە بە بریندارکردنێکی وەها لاچو: کە خوێن یان نرخی هەبوو، ئەو کاتە (وَجَبَا) خوێنی عەقڵو خوێنی برینەکەش، یان نرخەکەشی واجب دەبن (وَفِي قَوْلٍ: يَدْخُلُ الأَقَلُّ فِيالأَكْثَرِ) لە فەرموودەیەکدا کەمترەکە دەچێتە ناو زۆرترەکە.

(وَلَوْ ادَّعَى زَوَالَهُ) ئەگەر سەرپەرشتکاری شێتەکە داوای لاچوونی‌عەقڵی لە تاوانکارەکە کرد، ئەویش گوتی: ڕاست نیە. ئەو کاتە شێتەکە تاقی دەکرێتەوە: (فَإِنْ لَمْ يَنْتَظِمْ قَوْلُهُ وَفِعْلُهُ فِي خَلَوَاتِهِ) جا ئەگەر گوفتارو کرداری شێتەکە لە حاڵەتی بە تەنهایی‌دا ڕێك نەبو، ئەوە (فَلَهُ دِيَةٌ بِلاَ يَمِينٍ) شێتەکە—بێ‌سوێندخواردن— مافی خوێنی لاچوونی‌عەقڵەکەی هەیە.

بەڵام ئەگەر داواکارەکە بڵێ: عەقڵی کەم کردومەوە، ئەو کاتە داواکارەکە سوێند دەدرێ، جا لەو حاڵەتەی بەشێکی‌عەقڵ لادەبردرێو ئەندازەی بەشەکەش بە ڕێکی بزاندرێ: وەك ڕۆژێك نا ڕۆژێك شێت ببێ، ئەوە بەشە خوێن واجب دەبێ، ئەگەر نەزاندرێ، ئەو کاتە نرخی بەشەکە واجب دەبێ ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَفِيالسَّمْعِ دِيَةٌ) لە لابردنی بیستن لە هەردوو گوێدا خوێنێکی تەواو—سەد ووشتر— واجب دەبێ، بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام (وَ) هەروەها (مِنْ أُذُنٍ نِصْفٌ) بە لابردنی بیستن لە گوێیەك نیوەی خوێن واجب دەبێ (وَقِيلَ قِسْطُ النَّقْصِ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: بەشی کەمکردنەوەی بیستن لە خوێنەکە واجب دەبێ (وَلَوْ أَزَالَ أُذُنَيْهِ وَسَمْعَهُ) ئەگەر هەردوو

گوێیەکانی لێکردنەوەو بیستنەکەشی لابرد، ئەو کاتە (فَدِيَّتَانِ) دوو خوێنی تەواو واجب دەبن: خوێنێکی گوێیەکان و خوێنێکی بیستن.

(وَلَوْ ادَّعَى زَوَالَهُ) ئەگەر داواکارەکە گوتی: بەو تاوانە بیستنم لاچوە، تاوانکارەکەش گوتی: ڕاست ناکا (وَانْزَعَجَ لِلصِّيَاحِ فِي نَوْمٍ وَغَفْلَةٍ) داواکارەکەش بە هۆی لێقیڕاندن لە خەوداو لە نائاگاییدا تێك چو، ئەوە (فَكَاذِبٌ) دیارە داواکارەکە درۆزنە (وَإِلَّا) بەلام ئەگەر بە هۆی لێقیڕاندن تێك نەچو، ئەو کاتە (حُلِّفَ وَأَخَذَ دِيَةً) داوا کارەکە سوێند دەدرێ‌و خوێنێکی تەواو وەردەگرێ.

وَإِنْ نَقَصَ فَقِسْطُهُ إِنْ عُرِفَ وَإِلاَّ فَحُكُومَةٌ بِاجْتِهَادِ قَاضٍ، وَقِيلَ يُعْتَبَرُ سَمْعُ قَرْنِهِ فِي صِحَّتِهِ وَيُضْبَطُ التَّفَاوُتُ، وَإِنْ نَقَصَ مِنْ أُذُنٍ سُدَّتْ وَضُبِطَ مُنْتَهَى سَمَاعِ الأُخْرَى ثُمَّ عُكِسَ وَوَجَبَ قِسْطُ التَّفَاوُتِ، وَفِي ضَوْءِ كُلِّ عَيْنٍ نِصْفُ دِيَةٍ، فَلَوْ فَقَأَهَا لَمْ يُزَدْ، وَإِنْ ادَّعَى زَوَالَهُ سُئِلَ أَهْلُ الْخِبْرَةِ أَوْ يُمْتَحَنُ بِتَقْرِيبِ عَقْرَبٍ أَوْ حَدِيدَةٍ مِنْ عَيْنِهِ بَغْتَةً وَنُظِرَ هَلْ يَنْزَعِجُ؟ وَإِنْ نَقَصَ فَكَالسَّمْعِ، وَفِي الشَّمِّ دِيَةٌ عَلَى الصَّحِيحِ،

---

بەلام (وَإِنْ نَقَصَ) ئەگەر بیستنەکەی لە هەردوو گوێ کەم بوەوە، ئەو کاتە (فَقِسْطُهُ إِنْ عُرِفَ) بەشی کەمکردنەوەکە لە خوێنەکە وەردەگرێ ئەگەر ئەندازەی کەمکردنەوەکە بزاندرێ (وَإِلَّا) بەلام ئەگەر نەزاندرێ، ئەو کاتە (فَحُكُومَةٌ بِاجْتِهَادِ قَاضٍ) نرخی کەمکردنەوەکە وەردەگرێ بەگوێرەی دانانی قازی (وَقِيلَ يُعْتَبَرُ سَمْعُ قَرْنِهِ فِي صِحَّتِهِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بیستنی هاوتەمەنی خۆی ڕەچاو دەکرێ لە حالەتی ساغیدا، ئینجا (وَيُضْبَطُ التَّفَاوُتُ) جیاوازی نێوان بیستنی خۆی‌و هاوتەمەنەکەی بە ڕێکی دیاری دەکرێ‌و نیسبەتەکەی لە خوێنەکە وەردەگرێ.

(وَ) هەروەها (إِنْ نَقَصَ مِنْ أُذُنٍ) ئەگەر بیستنەکە لە یەك گوێ کەم بوەوە، ئەو کاتە (سُدَّتْ) ناتەواوەکە دەگیرێندرێ‌و (وَضُبِطَ مُنْتَهَى سَمَاعِ الأُخْرَى) بیستنی گوێیەکەی ساغیش دیاری دەکرێ (ثُمَّ عُكِسَ) ئینجا بە پێچەوانەش ساغەکە دەگیرێندرێ‌و بیستنەکەی ناتەواوەکەش دیاری دەکرێ‌و (وَوَجَبَ قِسْطُ التَّفَاوُتِ) بەشی جیاوازی بیستنەکە لە خوێنەکە واجب دەبێ.

(وَفِي ضَوْءِ كُلِّ عَيْنٍ نِصْفُ دِيَةٍ) لە لابردنی دیتنی هەر چاوێکدا نیوەی خوێن–پەنجا وشتر– واجب دەبێ‌و لە دیتنی هەردوو چاوەکاندا خوێنێکی تەواو واجب دەبێ، هەرچەند شەوکوێریش بێ (فَلَوْ فَقَأَهَا) جا ئەگەر چاوەکەشی دەرهێنا (لَمْ يُزَدْ) لە نیوە خوێنەکە هیچ زیاد ناکرێ (وَإِنْ ادَّعَى زَوَالَهُ) ئەگەر داواکارەکە گوتی: دیتنم بەو تاوانە لاچوە. تاوانکارەکەش گوتی ڕاست نیە. ئەو کاتە (سُئِلَ أَهْلُ الْخِبْرَةِ) پرسیار لە دوو دادپەروەری لێزانی چاو دەکرێ (أَوْ يُمْتَحَنُ) یان داواکارەکە تاقی دەکرێتەوە: (بِتَقْرِيبِ عَقْرَبٍ أَوْ حَدِيدَةٍ

مِنْ عَيْنِه بَغْتَةً) بەوەی لە ناكاودا دوپشكێك، یان ئاسنێك لە چاوەكانی نزیك دەكرێتـەوەو (وَنُظِرَ هَلْ يَنْزَعِجُ) تەماشا دەكرێ: ئایا تێك دەچێ، یان نا (وَإِنْ نَقَصَ) ئەگەر دیتنەكەی لە چاوێك، یان لە دوو چاو كەم بۆوە، ئەوەش (فَكَالسَّمْعِ) وەك كەمبوونەوەی بیستن بڕیاری بۆ دەدرێ لە ڕوونكردنەوەكەیڕابردوودا.

(وَفِي الشَّمِّ دِيَةٌ) لە لابردنی بۆنكردندا خوێنێكی تەواو–سەد ووشتر– واجب دەبـێ (عَلَـى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، بەڵام لە فەرموودەی بێهێزدا: نرخی لابردنی بۆنەكە واجب دەبێ، هەروەك لە (نهاية) و (مغنى)دا فەرموویانە.

وَفِـي الْكَـلاَمِ الدِّيَـةُ، وَفِـي بَعْـضِ الْحُـرُوفِ قِسْـطُهُ، وَالْمُـوَزَّعُ عَلَيْهَـا ثَمَانِيَـةٌ وَعِشْـرُونَ حَرْفًـا فِـي لُغَـةِ الْعَـرَبِ، وَقِيـلَ لاَ يُـوَزَّعُ عَلَـى الشَّـفَهِيَّةِ وَالْحَلْقِيَّـةِ، وَلَـوْ عَجَـزَ عَـنْ بَعْضِـهَا خِلْقَـةً أَوْ بِآفَـةٍ سَـمَاوِيَّةٍ فَدِيَـةٌ، وَقِيـلَ قِسْـطٌ أَوْ بِجِنَايَـةٍ فَالْمَـذْهَبُ لاَ تَكْمُلُ دِيَـةٌ، وَلَـوْ قَطَـعَ نِصْـفَ لِسَـانِهِ فَـذَهَبَ رُبُـعُ كَلاَمِـهِ أَوْ عَكْـسٌ فَنِصْـفُ دِيَـةٍ، وَفِـي الصَّوْتِ دِيَةٌ، فَإِنْ أَبْطَلَ مَعَهُ حَرَكَةَ لِسَانٍ فَعَجَزَ عَنِ التَّقْطِيعِ وَالتَّرْدِيدِ فَدِيَتَانِ وَقِيلَ دِيَةٌ،

---

(وَفِي الْكَلاَمِ الدِّيَةُ) لە نەهێشتنی قسەكردنداخوێنێكیتەواو–سەد ووشتر– واجب دەبـێ (وَفِي بَعْضِ الْحُرُوفِ قِسْطُهُ) لە نەهێشتنی بەشێكی پیتەكانـدا بـەگوێرەی بەشـەكە لـە خوێنەكە واجب دەبێ (وَالْمُوَزَّعُ عَلَيْهَا) ئەو پیتانەی خوێنەكەیان بە سەردا بەش دەكرێ (ثَمَانِيَةٌ وَعِشْرُونَ حَرْفًا فِي لُغَةِ الْعَرَبِ) بیستو هەشت پیتن لە زمانی عەرەبیـدا، بـەڵام ئەگەر ستەم لێكراوەكـە بـە زمـانێكیتر قسـەی دەكـرد، ئـەو كاتـە خوێنەكـە بـە سـەر پیتەكانی زمانی خۆیدا بەش دەكرێ، هەروەك لە زۆربـەی سەرچـاوەكاندا فەرموویانـە (وَقِيلَ لاَ يُوَزَّعُ عَلَىالشَّفَهِيَّةِ وَالْحَلْقِيَّةِ) لە فەرموودەیـەكی بـێهێزدا: خوێنەكـە بـە سـەر پیتەكانی لێویو گەروییدا بەش ناكرێ.

(وَلَوْ عَجَزَ عَنْ بَعْضِهَا خِلْقَةً) ئەگەر ستەم لێكراوەكە لە زگماكدا نەیتوانی هەندێك پیت بڵێ (أَوْ بِآفَةٍ سَمَاوِيَّةٍ) یان بە هۆی بەڵایەكی ئاسمانی نەیتوانی هەنـدێكیان بڵـێ، ئـەو كاتـەش (فَدِيَةٌ) خوێنێكی تەواو واجب دەبێ (وَقِيلَ قِسْطٌ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بەشە خوێن واجب دەبێ، بەڵام (أَوْ بِجِنَايَةٍ) ئەگـەر بـە هـۆی دەسـتدرێژیی تاوانكـارێكیتر نـەیتوانی هەندێك پیت بڵێ، ئەو كاتە (فَالْمَـذْهَبُ لاَ تَكْمُـلُ دِيَـةٌ) بـە فـەرموودەی ڕاسـتی مەزهـەب: خوێنێكی تەواو لە تاوانكارەكەیدووەم وەرناگیرێ، چونكە واجبە: تاوانكارەكەییەكەمیش بەشە خوێنی پیتە لەناوبراوەكانیخۆی بدا.

(وَلَوْ قَطَعَ نِصْـفَ لِسَـانِه) ئەگـەر نیـوەی زوبانەكـەی لێكـردەوەو (فَـذَهَبَ رُبْـعُ كَلاَمِـه) چوارێكی پیتەكانی قسەكردنی نەمان (أَوْ عَكْسٌ) یان بە پێچەوانەوە: چوارێكی زوبـانی

لێکردەوەو نیوە پیتەکانی قسەکردنی نەمان، ئەوە (فَنِصْفُ دِيَةٍ) لە هەردوو مەسەلەدا نیوەی خوێن واجب دەبێ.
(وَفِيالصَّوْتِ دِيَةٌ) لە نەهێشتنی دەنگدا خوێنێکی تەواو-سەد ووشتر- واجب دەبێ (فَإِنْ أَبْطَلَ مَعَهُ حَرَكَةَلسَانِ) جا ئەگەر لەگەڵ نەهێشتنیدەنگەکەش جولەیزوبانەکەشی نەهێشتو (فَعَجَزَ عَنِ التَّقْطِيعِ وَالتَّرْدِيدِ) تواناى نەما پیتەکان لە شوێنیخۆیان دەربخاو دووبارەیان بکاتەوە، ئەو کاتە (فَدِيَتَانِ) دوو خوێنی تەواو واجب دەبن: یەکێکی بۆ دەنگ، یەکێکیش بۆ زوبان (وَقِيلَ دِيَةٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: یەك خوێن واجب دەبێ.
وَفِي الذَّوْقِ دِيَةٌ، وَيُدْرَكُ بِهِ حَلاَوَةٌ وَحُمُوضَةٌ وَمَرَارَةٌ وَمُلُوحَةٌ وَعُذُوبَةٌ، وَتُوَزَّعُ عَلَيْهِنَّ، فَإِنْ نَقَصَ فَحُكُومَةٌ، وَتَجِبُ الدِّيَةُ فِالْمَضْغِ وَقُوَّةِ إِمْنَاءٍ بِكَسْرِ صُلْبٍ وَقُوَّةِ حَبَلٍ وَذَهَابِ جِمَاعٍ، وَفِي إِفْضَائِهَا مِنَ الزَّوْجِ وَغَيْرِهِ دِيَةٌ وَهُوَ رَفْعُ مَا بَيْنَ مَدْخَلِ ذَكَرٍ وَدُبُرٍ، وَقِيلَ ذَكَرٍ وَبَوْلٍ، فَإِنْ لَمْ يُمْكِنْ الْوَطْءُ إِلاَّ بِإِفْضَاءٍ فَلَيْسَ لِلزَّوْجِ، وَمَنْ لاَ يَسْتَحِقُّ افْتِضَاضَهَا فَأَزَالَ الْبَكَارَةَ بِغَيْرِ ذَكَرٍ فَأَرْشُهَا، أَوْ بِذَكَرٍ لِشُبْهَةٍ أَوْ مُكْرَهَةً فَمَهْرُمِثْلٍ ثَيِّبًا وَأَرْشُ الْبَكَارَةِ.

---

(وَفِي الذَّوْقِ دِيَةٌ) لە نەهێشتنی تامکردندا خوێنێکی تەواو-سەد ووشتر- واجب دەبێ (وَيُدْرَكُ بِهِ) بە هۆی تامکردن دەزاندرێ: (حَلاَوَةٌ وَحُمُوضَةٌ وَمَرَارَةٌ وَمُلُوحَةٌ وَعُذُوبَةٌ) شیرنیو ترشیو تاڵیو سوێریو ئاوی شیرنو خۆش (وَتُوَزَّعُ عَلَيْهِنَّ) خوینەکە بە سەر ئەو پێنج تامانەدا بەش دەکرێ (فَإِنْ نَقَصَ) جا ئەگەر تامکردنەکە کەم بۆوە، ئەو کاتە (فَحُكُومَةٌ) نرخی کەمکردنەکە واجب دەبێ.
(وَتَجِبُ الدِّيَةُ فِيالْمَضْغِ) خوێنێکی تەواو-سەد ووشتر- واجب دەبێ: لە نەهێشتنی شت جویندا، هەم (وَقُوَّةِ إِمْنَاءٍ بِكَسْرِ صُلْبٍ) لە نەهێشتنی هیزی (مَنی)هاتن بە هۆی پشت شکاندن، هەم (وَقُوَّةِ حَبَلٍ) لە نەهێشتنی هێزی ئاوسبوونی ژن، یان ئاوسکردنی پیاو، هەم (وَذَهَابِ جِمَاعٍ) لە نەمانی جیماعکردنی پیاو.
(وَفِي إِفْضَائِهَا مِنَ الزَّوْجِ وَغَيْرِهِ) لە لەتکردنی دامێنیئافرەتدا بە هۆی جیماعکردن، یان بە هۆیەکیتر، جا لە لایەن مێردەکەیەوە، یان لە لایەن کەسێکیترەوە: وەك زینا (دِيَةٌ) خوێنێکی تەواوی ئافرەتەکە-پەنجا ووشتر- واجب دەبێ (وَهُوَ) لەتکردنی دامێن: (رَفْعُ مَا بَيْنَ مَدْخَلِ ذَكَرٍ وَدُبُرٍ) لابردنی گۆشتەکەی نێوان کونی جیماعکردنو کونی پیسایيکردنە (وَقِيلَ: ذَكَرٍ وَبَوْلٍ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لابردنی نێوان کونی جیماعکردنو میز کردنە (فَإِنْ لَمْ يُمْكِنِ الْوَطْءُ إِلاَّ بِإِفْضَاءٍ) جا ئەگەر جیماعکردن نەدەگونجا تەنها بە تێکدانی شوێنەکە نەبێ: وەك ئەندامەکەی زۆر گەورە بێ، یان (فَرْجِ)ی ئافرەتەکە زۆر تەسك بێ،

ئەو كاتە (فَلَيْسَ لِلزَّوْجِ) مێردەكە بۆی دروست نیە جیماعی لەگەڵ بكا.
(وَمَنْ لاَ يَسْتَحِقُّ اِفْتِضَاضَهَا) هەر كەسێك مافی نەبێ كچێنیی ئافرەتێك لاببا (فَأَزَالَ الْبَكَارَةَ بِغَيْرِ ذَكَرٍ) جا بە بێ تێنانی (ذَكَر) كچێنیەكەی لابرد: وەك بە پەنجە، یان بە پارچە دارێك، ئەوە (فَأَرْشُهَا) نرخی كچێنیەكەی لە سەر واجب دەبێ، بەڵام (أَوْ بِذَكَرٍ) ئەگەر بە تێنانی (ذَكَر)، واتە: بە جیماع كچێنیەكەی لابرد: وەك (لِشُبْهَةٍ أَوْ مُكْرَهَةً) جیماعەكە بە هەڵە بێ، یان زینا بێ و كچەكە زۆرلێكراو بێ، ئەو كاتە (فَمَهْرُمِثْلِ ثَيِّبًا وَأَرْشُ الْبَكَارَةِ) مارەیی هاوێنەی ئافرەتەكە لە حاڵەتی بێوەژنیداو هەم نرخی كچێنیەكەشی هەردووكی لە سەر
وَقِيلَ مَهْرُ بِكْرٍ، وَمُسْتَحِقُّهُ لاَ شَيْءَ عَلَيْهِ، وَقِيلَ إِنْ أَزَالَ بِغَيْرِذَكَرٍ فَأَرْشٌ، وَفِى الْبَطْشِ دِيَةٌ وَكَذَاالْمَشْيُ وَنَقْصِهِمَا حُكُومَةٌ، وَلَوْ كَسَرَ صُلْبَهُ فَذَهَبَ مَشْيُهُ وَجِمَاعُهُ أَوْ وَمَنِيُّهُ فَدِيَتَانِ، وَقِيلَ دِيَةٌ. (فَرْعٌ) أَزَالَ أَطْرَافًا وَلَطَائِفَ تَقْتَضِي دِيَاتٍ فَمَاتَ سِرَايَةً فَدِيَةٌ، وَكَذَا لَوْ حَزَّهُ الْجَانِي قَبْلَ اِنْدِمَالِهِ فِي الأَصَحِّ،

---

جیماعكەرەكە واجب دەبن (وَقِيلَ مَهْرُ بِكْرٍ) لە فەرموودەیەكیبێهێزدا: مارەیی كچێك واجب دەبێ، بەڵام ئەگەر زینایەكە بە ڕەزامەندیكچەكە بێ، ئەو كاتە نە مارەیی و نە نرخی كچێنیەكە واجب نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.
(وَمُسْتَحِقُّهُ) ئەو كەسەی مافی لابردنی كچێنیەكەی هەیە–كە مێردی كچەكەیە– ئەگەر كچێنیەكەی لابرد (لاَ شَيْءَ عَلَيْهِ) هیچی لە سەر نیە، هەرچەند بە بێجیماعیش لایبردبێ، چونكە شەرع ئیزنیداوەو لادانیش لە ڕێگەی لابردن زیانی نیە (وَقِيلَ إِنْ أَزَالَ بِغَيْرِ ذَكَرٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا، ئەگەر بە بێجیماع لایبرد، ئەوە (فَأَرْشٌ) نرخی كچێنیەكە واجب دەبێ.
(وَفِىالْبَطْشِ دِيَةٌ) لە لەكارخستنی هەردوو دەستەكاندا خوێنێكی تەواو–سەد ووشتر– واجب دەبێ (وَكَذَا الْمَشْيُ) هەروەها ڕۆیشتنیش، واتە: ئەگەر هەردوو پێی لە ڕۆیشتن خستن خوێنێكی تەواو–سەد ووشتر– واجب دەبێ، هەروەها بە لەكارخستنی یەك دەست، یان یەك پێ، نیوەی خوێن واجب دەبێ (وَنَقْصِهِمَا) بە كەمكردنەوەی هێزی دەست، یان كەمكردنەوەی ڕۆیشتن (حُكُومَةٌ) نرخی كەمكردنەوەكە واجب دەبێ.
(وَلَوْ كَسَرَ صُلْبَهُ) ئەگەر پشتی شكاند (فَذَهَبَ مَشْيُهُ وَجِمَاعُهُ) جا بەو شكاندنە ڕۆیشتنی نەماو جیماعیشی نەما (أَوْ وَمَنِيُّهُ) یا ڕۆیشتن و (مَنِي)ی نەمان، ئەوكاتە (فَدِيَتَانِ) دوو خوێنی تەواو–دووسەد ووشتر– واجب دەبن: یەكێك بۆ ڕۆیشتن و یەكێك بۆ جیماع (وَقِيلَ دِيَةٌ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: خوێنێك واجب دەبێ.
﴿ فَرْعٌ: لقێك لە باسی كۆبوونەوەی چەند تاوانێك ﴾

(أَزَالَ أَطْرَافًا) هەرکاتێك چەند ئەندامێکی لێکردنەوە: وەك دەستو پێو گوێ، هەم (وَلَطَائِفَ) چەند سودێکیشی لەناو بردن: وەك گوێ لێبوونو دیتنو تامکردن، کە (تَقْتَضِي دِيَاتٍ) ئەندامەکانو سودەکان گشتیان خوێنێکی سەربەخۆیان واجب دەکرد (فَمَاتَ سِرَايَةً) ئینجا تاوان لێکراوەکە بە پێدارۆیشتنی ئەو برینانە مرد، ئەوە (فَدِيَةٌ) تەنها یەك خوێن واجب دەبێ لە بەرامبەر گیانەکە (وَكَذَا لَوْ حَزَّهُ الْجَانِي قَبْلَ انْدِمَالِهِ) هەروەها ئەگەر تاوانکارەکە تاوان لێکراوەکەی پێش چاکبوونەوە کوشت، ئەو کاتەش هەر یەك خوێن واجب دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

فَإِنْ حَزَّ عَمْدًا وَالْجِنَايَاتُ خَطَأٌ أَوْ عَكْسُهُ فَلاَ تَدَاخُلَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ حَزَّ غَيْرُهُ تَعَدَّدَتْ. (فَصْلٌ) تَجِبُ الْحُكُومَةُ فِيمَا لاَ مُقَدَّرَ فِيهِ: وَهِيَ جُزْءٌ نِسْبَتُهُ إلَى دِيَةِ النَّفْسِ–وَقِيلَ إلَى عُضْوِالْجِنَايَةِ– نِسْبَةُ نَقْصِهَا مِنْ قِيمَتِهِ لَوْ كَانَ رَقِيقًا بِصِفَاتِهِ، فَإِنْ كَانَتْ بِطَرَفٍ لَهُ مُقَدَّرٌ اُشْتُرِطَ أَنْ لاَ تَبْلُغَ مُقَدَّرَهُ، فَإِنْ بَلَغَتْهُ نَقَّصَ الْقَاضِي شَيْئًا بِاجْتِهَادِهِ، أَوْ لاَ تَقْدِيرَ فِيهِ كَفَخِذٍ فَأَنْ لاَ تَبْلُغَ دِيَةَ نَفْسٍ،

---

بەڵام (فَإِنْ حَزَّ عَمْدًا) ئەگەر تاوانکارەکە بە قەسدی تاوان لێکراوەکەی کوشتو (وَالْجِنَايَاتُ خَطَأٌ) تاوانەکانی لەناوبردنی ئەندامو سودەکانیش بە هەڵە بون (أَوْ عَكْسُهُ) یان بە پێچەوانەوە: لەناوبردنی ئەندامو سودەکان بە قەسدی بونو کوشتنەکە بە هەڵە بوو، ئەو کاتە (فَلاَ تَدَاخُلَ) خوێنەکان ناچنە ناو یەکتر، بەڵکو خوێنی ئەندامەکانو خوێنی سودەکانو خوێنی گیانەکە گشتی واجب دەبن (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَ) هەروەها (لَوْ حَزَّ غَيْرُهُ) ئەگەر جگە لە تاوانکارەکە یەکێکیتر تاوان لێکراوەکەی کوشت، ئەو کاتەش (تَعَدَّدَتْ) خوێنەکان بەگوێرەی تاوانەکان دەژمێرێن، واتە: خوێنەکانی ئەندامەکانو سودەکان لە سەر تاوانکارەکەییەکەمەو خوێنی گیانەکەشی لە سەر بکوژەکەیە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (حُكُومَة): نرخی تاوانەکان ﴾

(تَجِبُ الْحُكُومَةُ) نرخ، واتە: هەندێك ماڵ واجب دەبێ (فِيمَا لاَ مُقَدَّرَ فِيهِ) لەو جۆرە بریندارکردنو شکاندنانەی ئەندازە خوێنێکی دیارکراویان نیە، ئینجا مەرجە: دادوەر، یان (اَلْمُحَكَّم) ئەو نرخە دیاری بکا (وَهِيَ جُزْءٌ) مەبەست بە نرخ: بەشێکە لە خوێن (نِسْبَتُهُ إلَى دِيَةِالنَّفْسِ) نیسبەتەکەی بۆ خوێنی گیان–(وَقِيلَ إلَى عُضْوِالْجِنَايَةِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: نیسبەتەکەی بۆ ئەندامی تاوانەکە– (نِسْبَةُ نَقْصِهَا مِنْ قِيمَتِهِ لَوْ كَانَ رَقِيقًا بِصِفَاتِهِ) وەك نیسبەتی کەمکردنەوەیەتی لە نرخەکەی ئەگەر کۆیلەکی بەو سیفەتانە بووایە.

(فَإِنْ كَانَتْ بِطَرَفٍ لَهُ مُقَدَّرٌ) جا ئەگەر نرخەکە بە هۆی تاوانکردنە سەر ئەندامێکی وەها بوو: کە ئەندامەکە خوێنێکی دیارکراوی هەبوو: وەك دەست شکاندنو پێ شکاندن،

ئەوە (اُشْتُرِطَ أَنْ لاَ تَبْلُغَ مُقَدَّرَهُ) بە مەرج داندراوە: نرخەکە نەگاتە خوێنی ئەندامەکە، بۆ وێنە: نابێ نرخی شکاندنی دەستێك بگاتە خوێنی لێکردنەوەی دەستەکە (فَإِنْ بَلَغَتْهُ) جا ئەگەر نرخەکە گەیشتە خوێنی ئەندامەکە، ئەو کاتە (نَقَّصَ الْقَاضِي شَيْئًا بِاجْتِهَادِهِ) قازی بە بۆچوونی خۆی شتێکی لێ کەم دەکاتەوە (أَوْ لاَ تَقْدِيرَ فِيهِ) یان نرخەکە بە هۆی تاوانکردنە سەر ئەندامێکی وەها بوو: کە ئەندامەکە خوێنێکی دیارکراوی نەبو: (كَفَخِذٍ) وەك شکاندنی ڕان، یان باسك و پشتو شان، ئەوە (فَأَنْ لاَ تَبْلُغَ دِيَةَ نَفْسٍ) مەرجە: نرخەکە نەگاتە خوێنی گیان، واتە کوشتن.

وَيُقَوَّمُ بَعْدَ انْدِمَالِهِ فَإِنْ لَمْ يَبْقَ نَقْصٌ أُعْتُبِرَ أَقْرَبُ نَقْصٍ إِلَى الإِنْدِمَالِ، وَقِيلَ يُقَدِّرُهُ قَاضٍ بِاجْتِهَادِهِ، وَقِيلَ لاَ غُرْمَ، وَالْجُرْحُ الْمُقَدَّرُ كَمُوضِحَةٍ يَتْبَعُهُ الشَّيْنُ حَوَالَيْهِ، وَمَا لاَ يَتَقَدَّرُ يُفْرَدُ بِحُكُومَةٍ فِالأَصَحِّ، وَفِي نَفْسِ الرَّقِيقِ قِيمَتُهُ، وَفِي غَيْرِهَا مَا نَقَصَ مِنْ قِيمَتِهِ إِنْ لَمْ يَتَقَدَّرْ فِالْحُرِّ، وَإِلاَّ فَنِسْبَتُهُ مِنْ قِيمَتِهِ، وَفِي قَوْلٍ مَا نَقَصَ، وَلَوْ قَطَعَ ذَكَرَهُ وَأُنْثَيَاهُ فَفِي الأَظْهَرِ قِيمَتَانِ، وَالثَّانِي

---

(وَيُقَوَّمُ بَعْدَ انْدِمَالِهِ) تاوان لێکراوەکە لە دوای چاکبوونەوەی دەقرسێندرێ تاکو بزاندرێ نرخی تاوانەکە چەندە (فَإِنْ لَمْ يَبْقَ نَقْصٌ) جا ئەگەر لە دوایچاکبوونەوە هیچ ناتەواویەك نەمابو، ئەو کاتە (أُعْتُبِرَ أَقْرَبُ نَقْصٍ إِلَىالإِنْدِمَالِ) بۆ قرساندنەکە نزیکترین ناتەواوی لە کاتی چاکبوونەوەکە ڕەچاو دەکرێ (وَقِيلَ: يُقَدِّرُهُ قَاضٍ بِاجْتِهَادِهِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: قازی بە بۆچوونی خۆی ئەندازەی نرخەکە دادەنێ (وَقِيلَ: لاَ غُرْمَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: هیچ نرخێك واجب نیە.

(وَالْجُرْحُ الْمُقَدَّرُ كَمُوضِحَةٍ) ئەو برینەی ئەندازە خوێنێکی دیارکراوی هەیە: وەك برینی ئاشکراکەر (يَتْبَعُهُ الشَّيْنُ حَوَالَيْهِ) ناشیرنبوونەکەی دەوروبەری شوێن خۆی دەکەوێو نرخی ناشیرنیەکە داناندرێ، بەڵام (وَمَا لاَ يَتَقَدَّرُ) ئەو برینەی ئەندازە خوێنێکی دیارکراوی نیە (يُفْرَدُ بِحُكُومَةٍ) ناشیرنیەکەی دەوروبەری-جگە لە نرخی برینەکە- نرخێکی سەربەخۆی بۆ دادەندرێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

جا بزانە: ئەگەر لە پەدەستێکی لێداو شوێنەکەی ڕەش و شین کرد، یان مووەکانی سەرو ڕووی لە ناو بردن و شوێنی لێوانەکەشی تێك دا، ئەو کاتەش نرخی واجب دەبێ، بەڵام ئەگەر ڕەش و شین نەبو و هیچ شوێنێکی نەشکاند، یان شوێنی لێوانی مووەکانی تێك نەدا، ئەو کاتە نرخ واجب نابێ، بەڵکو تاوانکارەکە تەمبێ دەکرێ، هەروەك لە (مغنی)و(الشروانی)دا فەرموویانە.

(وَفِي نَفْسِ الرَّقِيقِ قِيمَتُهُ) لە کوشتنی کۆیلەدا نرخی کۆیلەکە واجب دەبێ (وَفِي غَيْرِهَا)

جگە لە کوشتنیش لە ئەندامو سودەکانی کۆیلەدا (مَا نَقَصَ مِنْ قِيمَتِهِ) ئەو ئەندازەی لـە نرخەکەی کەم کردۆتەوە واجب دەبێ (إِنْ لَمْ يَتَقَدَّرْ فِيالْحُرِّ) ئەگەر ئەندامو سودەکان لـە مرۆڤی ئازاددا ئەندازەی خوێنی نەبێ (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر لە ئازاددا ئەندازەی خوێنی هەبوو: وەك لێکردنـەوەی دەسـتو پـێ، ئـەو کاتـە (فَنِسْبَتُهُ مِنْ قِيمَتِهِ) وەك نیسبەتی بەشـە خوێنەکە بەشە نرخی کۆیلەکە واجب دەبێ (وَفِي قَوْلٍ مَا نَقَصَ) لە فەرموودەیەکدا: چەند لە نرخەکەی کەم کردۆتەوە، ئەوەندە واجب دەبێ.

(وَلَوْ قَطَعَ ذَكَرَهُ وَأُنْثَيَاهُ) ئەگەر (ذکر)و هەردوو گونەکانی کۆیلەکـەی لێکردنـەوە، ئـەوە (فَفِي الْأَظْهَرِ قِيمَتَانِ) لە فەرموودەی بەهێزدا: دوو نرخی کۆیلەکـە واجـب دەبـن (وَالثَّـانِي مَـــــا نَقَـــــصَ، فَـــــإِنْ لَــــــ



(بَابُ مُوجِبَاتِ الدِّيَةِ وَالْعَ

صَاحَ عَلَى صَبِيٍّ لَا يُمَيِّزُ عَلَى طَرَفِ سَطْحٍ فَوَقَعَ بِذَلِكَ فَمَاتَ فَدِيَةٌ مُغَلَّظَةٌ عَلَىالْعَاقِلَةِ، وَفِي قَوْلٍ قِصَاصٌ، وَلَوْ كَانَ بِأَرْضٍ أَوْ صَاحَ عَلَى بَالِغٍ بِطَرَفِ سَطْحٍ فَلَا دِيَةَ فِالأَصَحِّ، وَشَهْرُ سِلَاحٍ كَصِيَاحٍ، وَمُرَاهِقٌ مُتَيَقِّظٌ كَبَالِغٍ،

---

مَا نَقَصَ) بە فەرموودەی دووەمی بێهێز: چەند لە نرخەکەی کەم بۆتەوە ئەوەندە واجب دەبێ (فَإِنْ لَمْ يَنْقُصْ فَلَا شَيْءَ) ئەگەر هیچی کەم نەکردبێتەوە، ئەو کاتە هیچ واجب نابێ.

﴿ بَابُ مُوجِبَاتِ الدِّيَةِ: **باسی ئەو کردارانەی لە سەرەتاوە خوێن واجب دەکەنو**
(وَالْعَاقِلَةِ) **باسی خزمەکانی بکوژەکەو** (وَالْكَفَّارَةِ) **باسی کەفارەتی کوشتن** ﴾

(صَاحَ عَلَى صَبِيٍّ لَا يُمَيِّزُ) هـەر کاتێك بـە سـەر منداڵێکینەفامیـدا قیڕانـد، یـان بـە سـەر خەوتوویێکدا، یان بە سەر گێلەکەیەکدا: کە لێقیڕاوەکەش (عَلَى طَرَفِ سَطْحٍ) لـە سـەر لێـوی سەربانێك بوو، یان لە سەر لێوی بیرێك، یان ڕووبارێك بوو (فَوَقَعَ بِذَلِكَ فَمَاتَ) ئینجا بە هۆی ئەو بەسەرداقیڕاندنە لێقیڕاوەکە ڕاچەنیو کەوتە خوارەوەو مرد، ئەوە (فَدِيَةٌ مُغَلَّظَةٌ عَلَى الْعَاقِلَةِ) خـوێنێکی ئەسـتوورکراو لـە سـەر خزمـەکانی بکوژەکـە واجـب دەبـێ، جیـاوازی نیـە بەسەرداقیڕاندنەکەشی بە دەنگی خۆی بێ، یان بـە هـۆی ئـامێرێکی بەردەسـتی خـۆی بـێ، هەروەها ئەگەر لێقیڕاوەکە نەشمرێ، بـەڵام ئەنـدامێك، یـان سـودێکی لـە دەسـت چـوو، ئـەو کاتەش خوێنی ئەندامەکەو سودەکە هەر لە سەر خزمەکانی تاوانکارەکەیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوە کاندا فەرموویانە (وَفِي قَوْلٍ: قِصَاصٌ) لە فەرموودەیەکدا: تۆڵەکردنەوە واجب دەبێ.

(وَلَوْ كَانَ بِأَرْضٍ) ئەگەر لێقیڕاوەکە لە سەر زەمین بوو و بە هۆی بەسەرداقیڕاندنەکە مـرد (أَوْ صَاحَ عَلَى بَالِغٍ بِطَرَفِ سَطْحٍ) یان بە سەر مرۆڤێکی بالغو عاقڵدا قیڕاندی: کە لە سـەر لێوی سەربانێك بوو، ئینجا کەوتە خوارەوەو مرد (فَلَا دِيَةَ فِي الْأَصَحِّ) لە هەردوو مەسەلەدا

هیچ خوێنێك و هیچ كەففارەتێك واجب نابێ، لە فەرمودەی ڕاستتردا، بەڵام ئەگەر لە مەسەلەیەكەمدا منداڵەكە بە هۆی بەسەرداقیڕاندنەكە شێت ببێ، ئەو كاتە خوێنی لابردنی عەقڵەكەی واجب دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و(مغنی)دا فەرموویانە.

(وَشَهْرُ سِلاَحٍ كَصِيَاحٍ) دەرهێنانو ڕاكێشانی چەك ڕووبەڕووی چاوساغێك وەك بەسەرداقیڕاندنەو گشت بڕیارەكانیڕابردووی بۆ دەدرێن، هەم (وَمُرَاهِقٌ مُتَيَقِّظٌ كَبَالِغٍ) منداڵێكی هەشیار–كە نزیكی بلۆغبوون بێ– ئەویش وەك مرۆڤی بالغەو خوێنی واجب نابێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لە ولاغی كەسێكی قیڕاند، یان بە هۆیەكیتر ڕەواندیەوە، ئینجا وولاغەكە كەوتە ناو ئاوێك، یان ناو قۆرتێك، ئەوە تاوانكارەكە بەخۆی دەبێتە زامینی

وَلَوْ صَاحَ عَلَى صَيْدٍ فَاضْطَرَبَ صَبِيٌّ وَسَقَطَ فَدِيَةٌ مُخَفَّفَةٌ عَلَى الْعَاقِلَةِ، وَلَوْ طَلَبَ سُلْطَانٌ مَنْ ذُكِرَتْ بِسُوءٍ فَأَجْهَضَتْ ضُمِنَ الْجَنِينُ، وَلَوْ وَضَعَ صَبِيًّا فِي مَسْبَعَةٍ فَأَكَلَهُ سَبُعٌ فَلاَ ضَمَانَ، وَقِيلَ إنْ لَمْ يُمْكِنْهُ انْتِقَالٌ ضَمِنَ،

---

ولاغەكە، بەڵام ئەگەر مرۆڤێك لە سەر پشتی وولاغەكە بێو یەكسەر بە هۆی ڕەواندنەوە بكەوێتە خوارەوەو بمرێ، ئەو كاتە خوێنی مرۆڤەكە لە سەر خزمەكانی تاوانكارەكە واجب دەبێ، هەروەك لە (تحفه)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَ) هەروەها (لَوْ صَاحَ عَلَى صَيْدٍ) ئەگەر كەسێك بە سەر نێچیرێكدا، یان بە سەر شتێكیتریدا قیڕاند (فَاضْطَرَبَ صَبِيٌّ وَسَقَطَ) ئینجا بەو قیڕاندنە منداڵێك ڕاچەنیو لە سەر بانەكە، یان لە سەر بیرەكە كەوتە خوارەوەو مرد، ئەوە (فَدِيَةٌ مُخَفَّفَةٌ عَلَىالْعَاقِلَة) خوێنێكی سووككراو لە سەر خزمەكانی بكوژەكە واجب دەبێ، چونكە لەم مەسەلەیەدا مەبەستی لێقیڕاندنیمردووەكە نەبووەو كوشتنەكەی بە هەڵەیە، جا ئەگەر لەم مەسەلەیەدا منداڵەكە شێت ببێ، ئەو كاتەش خوێنی عەقڵەكەی لە سەر خزمەكانی تاوانكارەكەیە، هەرچەند لە سەر زەمینیش بێ، وەك مەسەلەكەیڕابردوو، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ طَلَبَ سُلْطَانٌ مَنْ ذُكِرَتْ بِسُوءٍ) ئەگەر كاربەدەستێك داوای ئامادەبوونی ئافرەتێكی كرد كە بە خراپە باسی كرابو (فَأَجْهَضَتْ) ئافرەتەكەش لە ترسان بەری هاوێشت، واتە: كۆرپەی ناو زگی لەبار چو، ئەوە (ضُمِنَ الْجَنِينُ) زامینیی كۆرپەكە لە سەر خزمەكانی كاربەدەستەكە –كۆیلەیەك، یان پێنج ووشتر– واجب دەبێ.

هەروەها ئەگەر كەسێكیتریش ئافرەتێكی ئاوس–بە هەر جۆرێك– بترسێنێو ئافرەتەكەش بەو ترسە بەر باوێ، ئەوەش خزمەكانیترسێنەرەكە دەبنە زامینیكۆرپەكە، چونكە ئیمامی(عمر) بە فەرمانی ئیمامی (علي)رضي الله عنهما خوێنی ئەو جۆرە كۆرپەیەی داوەو (البيهقي) گێڕاویەتیەوە.

جا ئەگەر ئافرەتەکە بەو بەرهاوێشتنە بمرێ، ئەو کاتە خوێنی ئافرەتەکەش لە سەر خزمەکانی ترسێنەرەکە واجب دەبێ، بەلام ئەگەر ئافرەتە ئاوسەکە بە هۆی‌ترسەکە بمرێ–نەك بە هۆی بەرهاوێشتن– ئەو کاتە هیچ زامینیی واجب نابێ، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەوکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ وَضَعَ صَبِيًّا فِي مَسْبَعَةٍ) ئەگەر منداڵێکی لە شوێنێکی دڕندەکان دانا (فَأَكَلَهُ سَبُعٌ) ئینجا دڕندەیەك منداڵەکەی خوارد، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ) هیچ زامینیی لە سەر نیە، چونکە خودی دانانەکە بەهیلاکی نەداوە (وَقِيلَ إِنْ لَمْ يُمْكِنْهُ اِنْتِقَالٌ ضَمِنَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: ئەگەر منداڵەکە بۆی نەگونجێ بڕواتە شوێنێکی‌تر، ئەو کاتە دەبێتە زامین.

وَلَوْ تَبِعَ بِسَيْفٍ هَارِبًا مِنْهُ فَرَمَى نَفْسَهُ بِمَاءٍ أَوْ نَارٍ أَوْ مِنْ سَطْحٍ فَلاَ ضَمَانَ، فَلَوْ وَقَعَ جَاهِلاً لِعَمًى أَوْ ظُلْمَةٍ ضَمِنَ، وَكَذَا لَوْ اِنْخَسَفَ بِهِ سَقْفٌ فِي هَرَبِهِ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ سُلِّمَ صَبِيٌّ إِلَى سَبَّاحٍ لِيُعَلِّمَهُ فَغَرِقَ وَجَبَتْ دِيَتُهُ، وَيَضْمَنُ بِحَفْرِ بِئْرٍ عُدْوَانٍ لاَ فِي مِلْكِهِ وَمَوَاتٍ،

---

(وَلَوْ تَبِعَ بِسَيْفٍ هَارِبًا مِنْهُ) ئەگەر بە شمشێرێکەوە، یان بە هەر چەکێکی‌ترەوە شوێن هەلاتوویێکی لە خۆی کەوت (فَرَمَى نَفْسَهُ بِمَاءٍ أَوْ نَارٍ أَوْ مِنْ سَطْحٍ) ئینجا هەلاتووەکەش خۆی فڕێ‌دا ناو ئاوێك، یان ئاگرێك، یان لە سەر بانێك خۆی فڕێ‌دا خوارەوەو بەو خۆفڕێدانە مرد، یان کەسێکی‌تر کوشتی، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ) هیچ زامینیی لە سەر شوێنکەوتەکە نیە، چونکە هەلاتووەکە بەخۆی خۆی بەهیلاك داوە، بەلام ئەگەر هەلاتووەکە منداڵ، یان شێت بێ، ئەو کاتە شوێنکەوتەکە دەبێتە زامین، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(فَلَوْ وَقَعَ جَاهِلاً) جا ئەگەر هەلاتووەکە بە نەزانی کەوتە ناو ئەو شتانەی‌پابردوو (لِعَمًى أَوْ ظُلْمَةٍ) بە هۆی کوێری، یان تاریکی، یان سەرلێشێوان، یان سەری بەهیلاکدەرەکە داپۆشراو بوو–وەك بیرێکی‌داپۆشراو، یان مینێکی ژێر خاك– ئەو کاتە (ضَمِنَ) خزمەکانی شوێنکەوتەکە دەبنە زامینی هەلاتووەکەو واجبە خوێنەکەی بدەن (وَكَذَا لَوْ اِنْخَسَفَ بِهِ سَقْفٌ فِي هَرَبِهِ) هەروەها ئەگەر بانێك لە بن هەلاتووەکەدا لە حاڵەتی هەلاتندا بڕمێ‌و هەلاتووەکە بمرێ، ئەو کاتەش دەبنە زامینی خوێنەکەی (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە لەو مەسەلانەدا شوێنکەوتەکە هەلاتووەکەی تووشی هەلاتنێکی کوشندە کردوە.

(وَلَوْ سُلِّمَ صَبِيٌّ إِلَى سَبَّاحٍ لِيُعَلِّمَهُ) ئەگەر منداڵێك تەسلیمی مەلەوانێك کرا، تاکو فێرە مەلەوانیی بکا (فَغَرِقَ) ئینجا منداڵەکەش نقومی ناو ئاو بوو و خنکا، ئەوە (وَجَبَتْ دِيَتُهُ) خوێنی منداڵەکە لە سەر خزمەکانی مەلەوانەکە واجب دەبێ، بەلام ئەگەر نقومبووەکە بالغو عاقڵ بێ، ئەوە هیچ خوێن‌و تۆڵەی واجب نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَضْمَنُ بِحَفْرِ بِئْرٍ عُدْوَانٍ) مرۆڤ دەبێتە زامین بە هۆی هەڵکەندنی بیرێکی دوژمنکاری: وەك لە ملکی کەسێکیتردا بە بێئیزن بیرەکەی هەڵکەندبێ، یان لە ڕێگەیەکی تەسك، یان بەرین بۆ بەرژەوەندی خۆی بە بێئیزنیکاربەدەست بیرەکەی هەڵکەندبێ.

جا بزانە: مەبەست بە زامینی لێرەو لە گشت مەسەلەکانیداهاتوودا ئەمەیە: ئەگەر ئادەمیزادێك بکەوێتە ناو بیرەکەو بمرێ، یان بە یەکێك لە هۆیەکانیتری داهاتوو بمرێ، واجبە: خزمەکانی خاوەن هۆیەکە خوێنەکەی بدەن، بەڵام ئەگەر ئاژەڵێك، یان ماڵێك بەو هۆیە بفەوتێ، ئەو کاتە خودی خاوەن هۆیەکە دەبێتە زامنی.

(لاَ فِي مِلْكِهِ وَمَوَاتٍ) بەڵام نابێتە زامینی ئەو بیرەی لە ملکیخۆیدا، یان لە زەمینێکی مردووی بێخاوەندا هەڵیکەندوە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْبِئْرُ جُبَارٌ﴾ رواه الشيخان، بەهیلاکچووی بیر بە فیڕۆیەو زامیینیی نیە.

وَلَوْ حَفَرَ بِدِهْلِيزِهِ بِئْرًا وَدَعَا رَجُلاً فَسَقَطَ فَالأَظْهَرُ ضَمَانُهُ، أَوْ بِمِلْكِ غَيْرِهِ أَوْ مُشْتَرَكٍ بِلاَ إِذْنٍ فَمَضْمُونٌ، أَوْ بِطَرِيقٍ ضَيِّقٍ يَضُرُّ الْمَارَّةَ فَكَذَا، أَوْ لاَ يَضُرُّ وَأَذِنَ الإِمَامُ فَلاَ ضَمَانَ، وَإِلاَّ: فَإِنْ حَفَرَ لِمَصْلَحَتِهِ فَالضَّمَانُ أَوْ لِمَصْلَحَةٍ عَامَّةٍ فَلاَ فِالأَظْهَرِ، وَمَسْجِدٌ كَطَرِيقٍ،

---

(وَلَوْ حَفَرَ بِدِهْلِيزِهِ بِئْرًا) ئەگەر لە ناودالانی خانووەکەیدا بیرێکی هەڵکەندو (وَدَعَا رَجُلاً فَسَقَطَ) ئینجا پیاوێکی بانگ کرد بێتە ناو خانووەکە، پیاوەکەش کەوتە ناو بیرەکەو مرد، ئەوە (فَالأَظْهَرُ ضَمَانُهُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: دەبێتە زامینیو واجبە: خزمەکانی هەڵکەنەکە خوێنی پیاوەکە بدەن.

بەڵام ئەگەر ئەو بانگی نەکردبێ، یان ئاگاداری کردبێتەوە: کە بیرەکە لە وێ هەیە، یان سەگێکی خاوەن ماڵە کە بیگرێ، یان یەکێکی بە کرێ گرت بۆ میوەڕنین، یان بۆ بیر هەڵکەندن، یان بۆ دیوار کردن، یان داوای لێکرد بە خۆڕایی ئەو کارانەی بۆ بکا، ئینجا کرێکارەکە کەوتە خوارەوە، یان بیرو دیوارەکەی بە سەردا ڕما، ئەوە لەو مەسەلانەدا خاوەنەکە نابێتە زامین، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراونەوە.

(أَوْ بِمِلْكِ غَيْرِهِ) یان لە ملکی کەسێکیتر –بێئیزن– بیرەکەی هەڵکەند (أَوْ مُشْتَرَكٍ بِلاَ إِذْنٍ) یان لە ملکێکی هاوبەشی خۆیو کەسێکیتر –بێئیزن– بیرەکەی هەڵکەند، ئەوە (فَمَضْمُونٌ) لە هەردو مەسەلەدا هەڵکەندنەکە زامینیی هەیەو هەر شتێکی بەو بیرە بفەوتێ، بەو شێوەیڕابردوو واجبە: خوێنی بدرێ.

(أَوْ بِطَرِيقٍ ضَيِّقٍ) یان لە ڕێگەیەکی تەسکدا بیرەکەی هەڵکەند، کە (يَضُرُّ الْمَارَّةَ) زیانی لە ڕێبواران دەدا، ئەو کاتەش (فَكَذَا) وەك مەسەلەکەیڕابردوو زامینیی واجب دەبێ، هەرچەند کاربەدەستیش ئیزنیدابێ (أَوْ لاَ يَضُرُّ وَأَذِنَ الإِمَامُ) یان بیرەکە زیانی لە ڕێبواران نەدەداو بە

ئیزنی کاریەدەستیش بیرەکەی هەڵکەند، ئەو کاتە (فَلاَ ضَمَانَ) هیچ زامینیی واجب نابێ.
(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر کارەبەدەست ئیزنی نەدابێ و بیرەکەش زیانی نەبێ، تەماشا دەکەین:
(فَإِنْ حَفَرَ لِمَصْلَحَتِهِ) ئەگەر بۆ بەرژەوەندی خۆی بیرەکەی لە ڕێگەکەدا هەڵکەندبێ، ئەوە
(فَالضَّمَانُ) دبێتە زامینی هەرشتێکی بەو بیرە بفەوتێ (أَوْ لِمَصْلَحَةٍ عَامَّةٍ) بەڵام ئەگەر بۆ
بەرژەوەندی گشتی بیرەکەی هەڵکەندبێ، ئەوە (فَلاَ) نابێتە زامین (فِيالأَظْهَرِ) لە
فەرموودەی بەهێزتردا.
کەوابو: ئەو قۆرت و خەندەقانەی بۆ چاککردنەوەی بەرژەوەندییە گشتیەکان لە ڕێگەو
کۆڵانەکاندا هەڵدەکەندرێن، ئەویش زامینیی نیە، هەروەك (الشبراملسی) فەرموویەتی
(وَمَسْجِدٌ كَطَرِيقٍ) هەڵکەندنی بیر لە ناو مزگەوتدا وەکو بیری ڕێگەیە: لە گشت
ڕوونکردنەوەو بڕیارەکانیڕابردوودا.
وَمَا تَوَلَّدَ مِنْ جَنَاحٍ إِلَى شَارِعٍ فَمَضْمُونٌ، وَيَحِلُّ إِخْرَاجُ الْمَيَازِيبِ إِلَى شَارِعٍ، وَالتَّالِفُ بِهَا مَضْمُونٌ فِالْجَدِيدِ، فَإِنْ كَانَ بَعْضُهُ فِالْجِدَارِ فَسَقَطَ الْخَارِجُ فَكُلُّ الضَّمَانِ، وَإِنْ سَقَطَ كُلُّهُ فَنِصْفُهُ فِالأَصَحِّ، وَإِنْ بَنَى جِدَارَهُ مَائِلاً إِلَى شَارِعٍ فَكَجَنَاحٍ، أَوْ مُسْتَوِيًا فَمَالَ وَسَقَطَ فَلاَ ضَمَانَ، وَقِيلَ إِنْ أَمْكَنَهُ هَدْمُهُ وَإِصْلاَحُهُ ضَمِنَ، وَلَوْ سَقَطَ بِالطَّرِيقِ فَعَثَرَ بِهِ شَخْصٌ أَوْ تَلِفَ مَالٌ

---

(وَمَا تَوَلَّدَ مِنْ جَنَاحٍ) هەر ڕووداوێك لە زێدەبانی خانووێك پەیدا ببێ –کە (إِلَى شَارِعٍ) زێدەبانەکە
بۆ لای کۆڵان و ڕێگە هاتبێتە دەرەوە– ئەگەر زێدەبانەکە بکەوێ (فَمَضْمُونٌ) زامینیی
ڕووداوەکە واجب دەبێ لە سەر خاوەن خانووەکە، هەرچەند کاریەدەستیش ئیزنی دابێ.
(وَيَحِلُّ إِخْرَاجُ الْمَيَازِيبِ إِلَى شَارِعٍ) حەڵاڵە سولکەکانی ئاو لە سەر بانەکەیەوە بەرەو کۆڵان
دەربێنێ، بەڵام (وَالتَّالِفُ بِهَا مَضْمُونٌ) هەر شتێك بەو سولکەیە، یان بە ئاوی سولکەکە
بفەوتێ، خاوەنەکەی دەبێتە زامین (فِيالْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا.
(فَإِنْ كَانَ بَعْضُهُ فِي الْجِدَارِ) جا ئەگەر بەشێکی سولکەکە لە ناو دیوارەکەدا بوو
(فَسَقَطَ الْخَارِجُ) ئینجا بەشەکەی لای دەرەوی کەوتە خوارەوەو شتێکی فەوتاند،
ئەوە (فَكُلُّ الضَّمَانِ) هەموو زامینیی لە سەر خاوەنەکەی واجب دەبێ، بەڵام (وَإِنْ سَقَطَ
كُلُّهُ) ئەگەر هەموو سولکەکە کەوتە خوارەوە، ئەو کاتە (فَنِصْفُهُ فِيالأَصَحِّ) نیوەی زامینی
لە سەر خاوەنەکەی واجب دەبێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە بەشەکەی ناو
دیوار زامینیی نیە.
(وَإِنْ بَنَى جِدَارَهُ مَائِلاً إِلَى شَارِعٍ) ئەگەر دیوارەکەی بە خواری بەرەو کۆڵان، یان بەرەو
مڵکی کەسێکیتر دروست کردبێ، ئەوەش (فَكَجَنَاحٍ) وەکو زێدەبانە: ئەگەر دیوارە

خوارەكە بڕوخێ‌و شتێك بفەوتێنێ زامینیی واجب دەبێ، جا لەو حاڵەتەدا كاربەدەستو ڕێبوارەكان‌و خاوەن ملكەكە گشتیان مافیان هەیە داوا لە خاوەن دیوارەكە بكەن: تاكو دیوارەكەی هەڵبوەشێنێ، یان چاكی بكاتەوە، جا ئەگەر خاوەنەكە هیچیانی نەكرد، ئەو كاتە خاوەن ملكەكە دروستە بیڕوخێنێ، هەروەك لە (نهایە)و (الشبراملسی)دا فەرموویانە.

(أَوْ مُسْتَوِيًا) بەڵام ئەگەر دیوارەكەی بە ڕاستی دروست كردبو (فَمَالَ وَسَقَطَ) ئینجا خوار بۆوەو ڕوخاو شتێكی فەوتاند، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ) هیچ زامینی واجب نابێ، چونكە بە كرداری خاوەنەكەی خوار نەبۆتەوە (وَقِيلَ: إِنْ أَمْكَنَهُ هَدْمُهُ وَإِصْلاَحُهُ) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: ئەگەر بۆی گونجابو بیڕوخێنێ‌و چاكی بكاتەوە (ضَمِنَ) دەبێتە زامین.

(وَلَوْ سَقَطَ بِالطَّرِيقِ) ئەگەر دیوارە ڕاستەكە خوار بۆوەو بە سەر ڕێگەدا ڕوخا (فَعَثَرَ بِهِ شَخْصٌ) ئینجا مرۆڤێك بەو دیوارە ڕوخاوە خلیسكی بردو مرد (أَوْ تَلِفَ مَالٌ) یان بە هۆی

فَلاَ ضَمَانَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ طَرَحَ قُمَامَاتٍ وَقُشُورَ بِطِّيخٍ بِطَرِيقٍ فَمَضْمُونٌ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ تَعَاقَبَ سَبَبَا هَلاَكٍ فَعَلَى الأَوَّلِ: بِأَنْ حَفَرَ وَوَضَعَ آخَرُ حَجَرًا عُدْوَانًا فَعُثِرَ بِهِ وَوَقَعَ الْعَاثِرُ بِهَا فَعَلَى الْوَاضِعِ الضَّمَانُ، فَإِنْ لَمْ يَتَعَدَّ الْوَاضِعُ فَالْمَنْقُولُ تَضْمِينُ الْحَافِرِ، وَلَوْ وَضَعَ حَجَرًا وَآخَرَانِ حَجَرًا فَعُثِرَ بِهِمَا فَالضَّمَانُ أَثْلاَثٌ، وَقِيلَ نِصْفَانِ، وَلَوْ وَضَعَ حَجَرًا فَعَثَرَ بِهِ رَجُلٌ فَدَحْرَجَهُ فَعَثَرَ بِهِ آخَرُ

---

دیوارەكە ماڵێك لەناو چو، ئەوەش (فَلاَ ضَمَانَ فِي الأَصَحِّ) هیچ زامینی واجب نابێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە بە كرداری وی نەڕوخاوە.

(وَلَوْ طَرَحَ قُمَامَاتٍ وَقُشُورَ بِطِّيخٍ بِطَرِيقٍ) ئەگەر كەسێك خڵت‌و خاڵ‌و توێكڵی كاڵەك‌و شفتی‌و مۆزی فڕێدا سەر ڕێگەیەك، ئەوەش (فَمَضْمُونٌ) هەر شتێكی بەو فڕێدراوە بفەوتێ، زامینیی واجب دەبێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، بەڵام ئەگەر ئەو شتانە فڕێ بداتە ملكی خۆی، یان زەویەكی مردووی بێ‌خاوەن، یان زبڵخانە، ئەو كاتە نابێتە زامین، هەروەك لەسەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ تَعَاقَبَ سَبَبَا هَلاَكٍ) ئەگەر دوو هۆكاری بەهیلاكدان بە دوای یەكترا هاتن (فَعَلَى الأَوَّلِ) زامینی بەهیلاكچوونەكە لە سەر هۆكاری یەكەمە: (بِأَنْ حَفَرَ وَوَضَعَ آخَرُ حَجَرًا عُدْوَانًا) وەك یەكێك بیرێكی بە دوژمنكاری هەڵكەنێ‌و یەكێكی‌تریش بەردێك بە دوژمنكاری لە سەر لێوی بیرەكە دابنێ (فَعُثِرَ بِهِ وَوَقَعَ الْعَاثِرُ بِهَا) ئینجا بەو بەردە خلیسك بردرا، خلیسكبەرەكەش كەوتە ناو بیرەكەو مرد، ئەوە (فَعَلَى الْوَاضِعِ الضَّمَانُ) زامینیی مردووەكە لە سەر خزمەكانی دانەری بەردەكەیە، چونكە یەكەمجار بە هۆی خلیسك بردنەكە كەوتۆتە ناو بیرەكە (فَإِنْ لَمْ يَتَعَدَّ الْوَاضِعُ) جا ئەگەر دانەری بەردەكە دوژمنكاریی نەكردبێ: وەك لە

ملکی‌خۆی، یان بۆ بەرژەوەندی‌گشتی بەردەکەی دانابێ، ئەو کاتە (فَالْمَنْقُولُ: تَضْمِينُ الْحَافِرِ) بە فەرموودەی گێڕدراوە: بیر هەڵکەنەکە دەبێتە زامین.

(وَلَوْ وَضَعَ حَجَرًا) ئەگەر یەکێك بەردێکی بە دوژمنکاری دانا (وَآخَرَانِ حَجَرًا) دوو کەسی‌تریش بەردێکی‌تریان بە دوژمنکاری دانا (فَعُثِرَ بِهِمَا) ئینجا بە یەکێك لەو دوو بەردانە خلیسکی بردو مرد، ئەوە (فَالضَّمَانُ أَثْلاَثٌ) زامینی‌ی خلیسکبەرەکە بە سێ بەش لە سەر هەرسێکیان واجبە (وَقِيلَ نِصْفَانِ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: نیوەی لە سەر یەکەمەکەیە، نیوەشی لە سەر دوەکانی‌ترە.

(وَلَوْ وَضَعَ حَجَرًا) ئەگەر یەکێك بەردێکی بە دوژمنکاری دانا (فَعَثَرَ بِهِ رَجُلٌ) ئینجا پیاوێك لەو بەردە خلیسکی برد (فَدَحْرَجَهُ) ئینجا خلیسکبەرەکەش بەردەکەی غلۆر کردە شوێنێکی‌تر (فَعَثَرَ بِهِ آخَرُ) ئینجا یەکێکی‌تریش لەو بەردە خلێسکی بردو مرد، ئەوە ضَمِنَهُ الْمُدَحْرِجُ، وَلَوْ عَثَرَ بِقَاعِدٍ أَوْ نَائِمٍ أَوْ وَاقِفٍ بِالطَّرِيقِ وَمَاتَا أَوْ أَحَدُهُمَا فَلاَ ضَمَانَ إِنْ اتَّسَعَ الطَّرِيقُ، وَإِلاَّ فَالْمَذْهَبُ إِهْدَارُ قَاعِدٍ وَنَائِمٍ، لاَ عَاثِرٍ بِهِمَا، وَضَمَانُ وَاقِفٍ لاَ عَاثِرٍ بِهِ.

(فَصْلٌ) اِصْطَدَمَا بِلاَ قَصْدٍ فَعَلَى عَاقِلَةِ كُلٍّ نِصْفُ دِيَةٍ مُخَفَّفَةٍ، وَإِنْ قَصَدَا فَنِصْفُهَا مُغَلَّظَةٌ، أَوْ أَحَدُهُمَا فَلِكُلٍّ حُكْمُهُ،

---

(ضَمِنَهُ الْمُدَحْرِجُ) غلۆرکەرەوەکە دەبێتە زامینی مردووەکە، چونکە بە کرداری وی بەردەکە گەیوەتە شوێنەکەی‌تر.

(وَلَوْ عَثَرَ بِقَاعِدٍ أَوْ نَائِمٍ أَوْ وَاقِفٍ بِالطَّرِيقِ) ئەگەر پیادەیەك خلیسکی برد: لە دانیشتووێکی سەر ڕێگە، یان لە خەوتووێکی سەر ڕێگە، یان لە ڕاوەستاوێکی سەر ڕێگە، ئینجا (وَمَاتَا) خلیسکبەرەکەو لێهەڵخیسکاوەکە هەردووکیان مردن (أَوْ أَحَدُهُمَا) یان تەنها یەکێکیان مرد، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ إِنْ اتَّسَعَ الطَّرِيقُ) زامینی‌خلیسکبەرەکە لە سەر لێهەڵخلیسکاوەکان نیە ئەگەر ڕێگەکە بەرین بێ، بەڵکو خزمەکانی خلێسکبەرەکە دەبنە زامینی لێهەڵخلیسکاوەکان.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ڕێگەکە بەرین نەبێ، ئەوکاتە (فَالْمَذْهَبُ: إِهْدَارُ قَاعِدٍ وَنَائِمٍ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: خوێنی دانیشتووەکەو خەوتووەکە بە فیڕۆ دەدرێ، چونکە بە هۆی دانیشتن‌و خەوتنی سەر ڕێگەکە کەمتەرخەمییان کردوە (لاَ عَاثِرٍ بِهِمَا) بەڵام ئەوەی خلیسکی لەو دووانە بردوە بە فیڕۆ نادرێ‌و واجبە: خزمەکانی دانیشتووەکەو خەوتووەکە خوێنی بدەن، هەم (وَضَمَانُ وَاقِفٍ) ڕاوەستاوەکەش زامینی‌ی واجبە، چونکە خەڵك پێویستی‌ی بە ڕاوەستانی سەر ڕێگە دەبێ (لاَ عَاثِرٍ بِهِ) بەڵام ئەوەی خلیسکی لەو

ڕاوەستاوە بردوە هیچ زامینیی نیە، چونکە بە هۆی جولەو ڕۆیشتنیخۆی بەهیلاك چوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی خۆ لێکدانی ئادەمیزادو کەشتیو ئۆتۆمبیل ﴾

(اصْطَدَمَا بِلاَ قَصْدٍ) هەر کاتێك دوو پیادە، یان دوو سوار–بێ ویستن– خۆیان لێك دا و بە هۆی خۆلێکدانەکە هەردووکیان مردن، ئەوە (فَعَلَى عَاقِلَةِ كُلٍّ نِصْفُ دِيَةٍ مُخَفَّفَةٍ) لە سەر خزمەکانی هەر یەکێکیان نیوە خوێنێکی سوککراوی ئەوەکەیتر واجب دەبێ، چونکە هەر یەکەیان بە کرداری خۆیو بە کرداری ئەویتر مردوە، کەواتە: نیوەکەی خۆی بە فیڕۆ دەدرێ (وَ) هەروەها (إِنْ قَصَدَا) ئەگەر هەردووکیان بە قەسدی خۆیان لێك داو هەردووکیان مردن، ئەوەش (فَنِصْفُهَا مُغَلَّظَةٌ) لە سەر خزمەکانی هەریەکەیان نیوە خوێنێکی ئەستوورکراوی ئەوەکەیتر واجب دەبێ (أَوْ أَحَدُهُمَا) یان یەکێکیان بە قەسدیو ئەویتریش بێویستن خۆیان لێك دا، ئەو کاتەش (فَلِكُلٍّ حُكْمُهُ) هەر یەکەیان بڕیاری خۆی هەیە، واتە:

وَالصَّحِيحُ أَنَّ عَلَى كُلٍّ كَفَّارَتَيْنِ، وَإِنْ مَاتَا مَعَ مَرْكُوبَيْهِمَا فَكَذَلِكَ وَفِي تَرِكَةِ كُلٍّ نِصْفُ قِيمَةِ دَابَّةِ الآخَرِ، وَصَبِيَّانِ أَوْ مَجْنُونَانِ كَكَامِلَيْنِ، وَقِيلَ إِنْ أَرْكَبَهُمَا الْوَلِيُّ تَعَلَّقَ بِهِ الضَّمَانُ، وَلَوْ أَرْكَبَهُمَا أَجْنَبِيٌّ ضَمِنَهُمَا وَدَابَّتَيْهِمَا،

---

نیوە خوێنێکی ئەستوورکراو لە سەر خزمەکانی بەقەسدییەکە واجب دەبێ، هەم نیوە خوێنێکی سوککراویش لە سەر خزمەکانی ئەویتر واجب دەبێ.

(وَالصَّحِيحُ أَنَّ عَلَى كُلٍّ كَفَّارَتَيْنِ) بە فەرموودەی ڕاست: هەر یەکێك لە خۆلێکدەرەکان دوو کەففارەتی کوشتن لە–میراتەکەیدا– لە سەری واجب دەبن: یەکێکی کوشتنیخۆی، یەکێکی کوشتنیبەرامبەرەکەی (وَإِنْ مَاتَا مَعَ مَرْكُوبَيْهِمَا) وە ئەگەر بەو خۆلێکدانە هەردوو سوارەکان لەگەڵ وولاغەکانیان مردن، ئەوەش (فَكَذَلِكَ) وەك مەسەلەکانیڕابردوو نیوەخوێنو دوو کەففارەتی کوشتن واجب دەبن، هەم (وَفِي تَرِكَةِ كُلٍّ) لە میراتی هەر یەکەشیان واجبە: (نِصْفُ قِيمَةِ دَابَّةِ الآخَرِ) نیوە نرخی وولاغەکەی ئەویترو هەم نیوەی نرخی کەلوپەلی سەر وولاغەکەشی واجبە بدرێ.

**جا بزانە**: لەو مەسەلانەی خۆلێکداندا جیاوازی نیە: خۆلێکدەرەکان ڕووبەڕووی یەکتری بڕۆن، یان پشتەو پشت، هەروەها جیاوازی نیە وولاغەکان وەکو یەکتری بن، یان یەکێکیان لەویتر بەهێزتر بێ: وەکو هێسترو کەر، یان یەکێکیان بڕواو ئەوەکەیتریش غار بدا، بەڵام ئەگەر یەکێك لە پیادەکان، یان لە وولاغەکان زۆر بێهێز بێ بە شێوەیەکی وەها: ڕۆیشتنی بێهێزەکە هیچ کاری نەدەکرد لەگەڵ ڕۆیشتنی بەهێزەکە، ئەو کاتە خوێنی بەهێزەکە بە فیڕۆ دەدرێو هەم واجبە: خزمەکانی بەهێزەکە خوێنی بێهێزەکە بە تەواوی بدەن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَصَبِيَّانِ أَوْ مَجْنُونَانِ) دوو منداڵ ، یان دوو شێت، یان منداڵێك و شێتێك ئەگەر–بە سواری، یان بە پیادەیی– خۆیان لێك دا و هەردووكیان مردن، ئەوانیش (كَكَامِلَيْنِ) وەكو دوو كەسی بالغ و عاقڵن: لە گشت بڕیارەكانیڕابردوودا، كەواتە: لە سەر خزمەكانی هەریەكەیان نیوە خوێنی ئەوەكەیتر واجب دەبێ، جیاوازی نیە: بە خۆیان سوار بوبن، یان سەرپەرشتكارەكەیان سواری كردبن (وَقِيلَ: إنْ أَرْكَبَهُمَا الْوَلِيُّ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: ئەگەر سەرپەرشتكارەكەیان سواری وولاغی كردبن، ئەو كاتە (تَعَلَّقَ بِهِ الضَّمَانُ) سەرپەرشتكارەكە دبێتە زامین، بەلام لە فەرموودەی ڕاستتر: ئەگەر بۆ بەرژەوەندی ئەوان سەرپەرشتكارەكە سواری وولاغەكەی كردبن، نابێتە زامین.

(وَلَوْ أَرْكَبَهُمَا أَجْنَبِيٌّ) ئەگەر بێگانەیەك –بێ ئیزنی سەرپەرشتكار– منداڵەكانی سواری وولاغەكان كردن، ئەوە (ضَمِنَهُمَا وَدَابَّتَيْهِمَا) بێگانەكە دەبێتە زامینی منداڵەكان و

أَوْ حَامِلاَنِ وَأَسْقَطَتَا فَالدِّيَةُ كَمَا سَبَقَ وَعَلَى كُلٍّ أَرْبَعُ كَفَّارَاتٍ عَلَى الصَّحِيحِ، وَعَلَى عَاقِلَةِ كُلٍّ نِصْفُ غُرَّتَيْ جَنِينَيْهِمَا، أَوْ عَبْدَانِ فَهَدَرٌ، أَوْ سَفِينَتَانِ فَكَدَابَّتَيْنِ وَالْمَلاَّحَانِ كَرَاكِبَيْنِ إنْ كَانَتَا لَهُمَا، فَإِنْ كَانَ فِيهِمَا مَالُ أَجْنَبِيٍّ لَزِمَ كُلاًّ نِصْفُ ضَمَانِهِ، وَإِنْ كَانَتَا لأَجْنَبِيٍّ لَزِمَ كُلاًّ نِصْفُ قِيمَتِهِمَا،

---

وولاغەكانیان، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام، هەرچەند بۆ بەرژەوەندی ئەوانیش سواری كردبن، كەواتە: خوێنی منداڵەكان لە سەر خزمەكانی بێگانەكەیە، نرخی وولاغەكانیش لە سەر خودی بێگانەكەیە.

(أَوْ حَامِلاَنِ وَأَسْقَطَتَا) یان دوو ئافرەتی ئاوس خۆیان لێك دا و هەر دووكیان بەریان هاوێشت و مردن، ئەوەش (فَالدِّيَةُ كَمَا سَبَقَ) نیوە خوێنی هەر یەكەیان–وەك ڕابرا– لە سەر خزمەكانیانە، هەم (وَعَلَى كُلٍّ أَرْبَعُ كَفَّارَاتٍ) هەر ئافرەتێكیش چوار كەففارەتی كوشتن لە میراتەكەیدا لە سەری واجب دەبێ: بۆ كوشتنیخۆیو بۆ كۆرپەكەیخۆی، بۆ بەرامبەرەكەیو بۆ كۆرپەكەشی (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، هەم (وَعَلَى عَاقِلَةِ كُلٍّ نِصْفُ غُرَّتَيْ جَنِينَيْهِمَا) لە سەر خزمەكانی هەر یەكەشیان نیوە خوێنەكانی هەردوو كۆرپەكان واجب دەبێ بیدەنە میراتگرەكانی كۆرپەكە (أَوْ عَبْدَانِ) یان دوو كۆیلە خۆیان لێك داو مردن (فَهَدَرٌ) هەردووكیان بەفیڕۆنەو هیچیان لە سەر هیچ كەسێك واجب نابێ.

(أَوْ سَفِينَتَانِ) یان دوو كەشتی، یان دوو ئۆتۆمبیل خۆیان لێك دا و هەردووكیان نقوم بون، یان خراپ بون، ئەوانەش (فَكَدَابَّتَيْنِ) وەك دوو وولاغن: لە بڕیاریڕابردوودا، هەم (وَالْمَلاَّحَانِ كَرَاكِبَيْنِ) هەردوو شوفێرەكانیش–ئەگەر مردن– وەكو هەردوو سوار وولاغەكانن (إنْ كَانَتَا لَهُمَا) ئەگەر كەشتیەكان، یان ئۆتۆمبیلەكان هی خۆیان بن، واتە: لە سەر خزمەكانی

هەریەکەیان نیوەخوێنیئەوەکەیتر واجب دەبێو هەر شوفێرێکیش دوو کەففارەتی کوشتن–لە میراتەکەیدا– لە سەری واجب دەبن، هەم لەمیراتی هەریەکەشیان واجبە: نیوەی نرخی ئۆتۆمبیلەکەی ئەویتر بدرێو هەم نیوەی نرخی کەلوپەلی سەر ئۆتۆمبیلەکەش واجبە بدرێ.

(فَإِنْ كَانَ فِيهِمَا مَالُ أَجْنَبِيٍّ) جا ئەگەر ماڵی کەسێکی بێگانە لە ناو ئۆتۆمبیلەکانو کەشتیەکاندا بوو، ئەو کاتەش (لَزِمَ كُلًّا نِصْفُ ضَمَانِهِ) لە سەر هەر یەکێك لە شوفێرەکان نیوەی زامینی–واتە: نیوەی نرخی کەلوپەلەکە –واجب دەبێ.

(وَ) هەروەها (إِنْ كَانَتَا لأَجْنَبِيٍّ) ئەگەر کەشتیەکانیش، یان ئۆتۆمبیلەکانیش هی بێگانەیەك بون، ئەو کاتەش (لَزِمَ كُلًّا نِصْفُ قِيمَتِهِمَا) لە سەر هەر یەکێك لە شوفێرەکان نیوی نرخی هەردوو ئۆتۆمبیلەکان، یان کەشتیەکان واجب دەبێ بۆ خاوەنەکانیان.

وَلَوْ أَشْرَفَتْ سَفِينَةٌ عَلَى غَرَقٍ جَازَ طَرْحُ مَتَاعِهَا، وَيَجِبُ لِرَجَاءِ نَجَاةِ الرَّاكِبِ، فَإِنْ طَرَحَ مَالَ غَيْرِهِ بِلاَ إِذْنٍ ضَمِنَهُ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ قَالَ: أَلْقِ مَتَاعَك وَعَلَيَّ ضَمَانُهُ أَوْ عَلَى أَنِّي ضَامِنٌ ضَمِنَهُ، وَلَوْ اِقْتَصَرَ عَلَى أَلْقِ فَلاَ عَلَى الْمَذْهَبِ،

---

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر کەشتیەکان، یان ئۆتۆمبیلەکان–جگە لە شوفێرەکان– خەڵکیتریشیان تێدابو و مردن، ئەوە تەماشا دەکەین: ئەگەر بە قەسدی خۆیان لێك دابێ، ئەوە هەردوو شوفێرەکان لە تۆڵەی یەکێکیان–بە پشکەکردن–بە دەکوشترێنەوەو لە میراتی هەریەکەشیان نیوە خوێنی ئەوانیتر واجب دەبێ، بەڵام ئەگەر خودی شوفێرەکانیش مردن، ئەو کاتە لە میراتی هەر یەکێکیان نیوە خوێنی ئەوانیتر واجب دەبێ، جا ئەگەر خۆلێکدانەکە بە ئەغڵەبی نەیدەکوشت–واتە: یان خۆلێکدانەکە بە ویستیخۆیان نەبو– ئەو کاتە لە سەر خزمەکانی هەر شوفێرێك نیوە خوێنی کوژراوەکانی هەردوو لا واجب دەبێ، جیاوازی نیە شوفێرەکانیش مردبن، یان نا.

ئینجا لە هەموو حاڵەتێکدا بە ئەندازەی مردووەکان کەففارەتی کوشتن لە سەر شوفێرەکان–لە میراتەکەیان– واجب دەبێ، هەروەها لێرەشدا –وەك مەسەلەی پیادەو سوار وولاغەکان– ئەگەر یەکێك لە کەشتیەکان، یان لە ئۆتۆمبیلەکان زۆر بێهێزبێ بە شێوەیەکی وەها: ڕۆیشتنی بێهێزەکە هیچ کاری نەدەکرد لەگەڵ ڕۆیشتنی بەهێزەکە، ئەو کاتە خوێنی بەهێزەکە بەفیڕۆ دەدرێو هەم واجبە: خزمەکانی بەهێزەکە خوێنی بێهێزەکەو سەرنیشنەکانی بدەن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکانو لە (القليوبي)دا ڕوون کراوەتەوە، ئیتر لە پێش (کتاب السير)دا باسی فەوتاوەکانی ئوتومبیلو ئاژەڵەکان زیاتر ڕوون دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(وَلَوْ أَشْرَفَتْ سَفِينَةٌ عَلَى غَرَقٍ) ئەگەر کەشتیەك لە نقومبوون نزیك بۆوە (جَازَ طَرْحُ

مَتَاعِهَا) دروسته: كەلوپەلەكەی ناوی فڕێ بدرێتە ناو دەریا، بەڵكو (وَيَجِبُ لِرَجَاءِ نَجَاةِ الرَّاكِبِ) واجبە: كەلوپەلەكەی فڕێ بدرێ بۆ ڕزگاربوونی سەرنيشينەكەی، ئينجا (فَإِنْ طَرَحَ مَالَ غَيْرِهِ بِلاَ إِذْنٍ) جا ئەگەر يەكێك–بۆ ڕزگاربوون– ماڵی كەسێكیتری بێئيزنی خاوەنەكەی فڕێدا، ئەوە (ضَمِنَهُ) دەبێتە زامينی ماڵەكە (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر بەخۆی ماڵیخۆی فڕێدا، يان ماڵی كەسێكیتری بە ئيزنداني وی فڕێدا، ئەو كاتە (فَلاَ) نابێتە زامين.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر كەسێك بە سەرنيشينێكی كەشتيەكەی گوت: (أَلْقِ مَتَاعَكَ وَعَلَيَّ ضَمَانُهُ أَوْ عَلَى أَنِّي ضَامِنٌ) كەلو پەلەكەت فڕێ بدە ناو دەريا زامينیی لە سەر من بێ، يان من زامينم. خاوەنەكەشی فڕێیدا، ئەوە (ضَمِنَهُ) كەسەكە دەبێتە زامين، بەڵام (وَلَوْ اقْتَصَرَ عَلَى أَلْقِ) ئەگەر تەنها گوتی: كەلوپەلەكەت فڕێ بدە. واتە: نەيگوت من زامينم (فَلاَ) كەسەكە نابێتە زامين (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

وَإِنَّمَا يَضْمَنُ مُلْتَمِسٌ لِخَوْفِ غَرَقٍ وَلَمْ يَخْتَصَّ نَفْعُ الإِلْقَاءِ بِالْمُلْقِي،وَلَوْ عَادَ حَجَرُ مَنْجَنِيقٍ فَقَتَلَ أَحَدَ رُمَاتِهِ هُدِرَ قِسْطُهُ وَعَلَى عَاقِلَةِ الْبَاقِينَ اَلْبَاقِي، أَوْ غَيْرَهُمْ وَلَمْ يَقْصِدُوهُ فَخَطَأٌ أَوْ قَصَدُوهُ فَعَمْدٌ فِالأَصَحِّ إِنْ غَلَبَتِ الإِصَابَةُ

(فَصْلٌ) دِيَةُ الْخَطَإِ وَشِبْهِ الْعَمْدِ تَلْزَمُ الْعَاقِلَةَ:

---

(وَ) لەو مەسەلەیڕابردوودا (إِنَّمَا يَضْمَنُ مُلْتَمِسٌ لِخَوْفِ غَرَقٍ) تەنها لەو حاڵەتەدا كەسەكە دەبێتە زامين: كە لە ترسی نقومبوون داوای فڕێدانی كەلوپەلەكە بكا، واتە: ئەگەر لە حاڵەتی ئەمينیدا بڵێ: فڕێی بدە، ئەوە نابێتە زامين، هەم (وَلَمْ يَخْتَصَّ نَفْعُ الإِلْقَاءِ بِالْمُلْقِي) سودی فڕێدانەكەش تايبەت نەبێ بە خاوەنە فڕێدەرەكە، بەڵكو كەسێكیتريش سود لە فڕێدانەكە وەربگرێ.

(وَلَوْ عَادَ حَجَرُ مَنْجَنِيقٍ) ئەگەر بەردی مەنجەنيق، يان بۆمبێكی هاوێشتراو گەڕاوەو (فَقَتَلَ أَحَدَ رُمَاتِهِ) يەكێكی لە هاوێژەكانی كوشت، ئەوە (هُدِرَ قِسْطُهُ) كوژراوەكە بەشە خوێنەكەی خۆی بەفیڕۆ دەدرێ، بۆ وێنە: ئەگەر هاوێژەرەكان چوار كەس بن: چوارێكی خوێنی كوژراوەكە بەفیڕۆ دەدرێو (وَعَلَى عَاقِلَةِ الْبَاقِينَ الْبَاقِي) ئەو بەشە خوێنەش كە ماوە–تا خوێنەكەی تەواو دەبێ– لە سەر خزمەكانی هاوێژەرەكانیترە (أَوْ غَيْرَهُمْ) يان بومبەكەو مەنجەنيقەكە كەسێكیتری جگە لە هاوێژەرەكانی كوشتو (وَلَمْ يَقْصِدُوهُ) هاوێژەرەكانيش مەبەستيان كوژراوەكە نەبو، ئەوە (فَخَطَأٌ) كوشتنی بە هەڵەيەو خوێنەكەی لە سەر خزمەكانی هاوێژەرەكانە (أَوْ قَصَدُوهُ) يان بە قەسدی مەنجەنيقو بۆمبەكەيان بۆ هاويشت، ئەو كاتە (فَعَمْدٌ فِيالأَصَحِّ) كوشتنی بە قەسدیيە–لە

فەرموودەی ڕاستتردا– (إِنْ غَلَبَتْ الإِصَابَةُ) ئەگەر بـە ئەغڵەبی هاوێشـتراوەکە وێبکـەوێ، کەواتە: گشتیان لە تۆڵە دەکوشترێنەوە، جا ئەگەر عەفو کران، واجبە: بەخۆیان خـوێنی کوژراوەکە بدەن.

جـا بزانـە: زامینـی تایبەتـە بـە وانـەی گوریسـەکە ڕادەکێشـن و وێکـڕا بەردەکـەو بۆمبەکـە دەهاوێن، واتە: ئەوەی بەردەکەو بۆمبەکە دادەنێ نابێتە زامێن، بەڵام ئەگەر دەسـتیان لـە هاوێشتنەکەدا هەبێ، ئەوانیش دەبنە زامین، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (اَلْعاقِلَة): خزمەکانی بکوژەکە ﴾

(دِيَةُ الْخَطَإِ وَشِبْهِ الْعَمْدِ) خوێنی کوشتنی بـە هەڵـەو کوشـتنی وێنـەی بـە قەسـدیو هـەم خوێنی تاوانەکانیتری بە هەڵەو وێنەی بە قەسدی: وەك لێکردنەوەی ئەندامەکانو لابردنی سودەکان، هەم نرخی شکاندنو بریندارکردنەکان، گشتی (تَلْزَمُ الْعَاقِلَةَ) دەکەوێتـە سـەر خزمەکانیتاوانکارەکە، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام ﴿عن أبىهريرةﷺ: أَنَّ إِمْرَأَةً رَمَتْ إِمْرَأَةً بِحَجَـــرٍ فَقَتَلَتْهَـــا وَمَـــا فِـــي بَطْنِهَـــا، فَقَضَـــالنَّبِيُّﷺ بِغُـــرَّةِ الْجَنِـــينِ وَبِدِيَـــةِ الْمَـــرْأَةِ

وَهُـــمْ عَصَـــبَتُهُ إِلاَّ الأَصْـــلَ وَالْفَـــرْعَ، وَقِيـــلَ يَعْقِـــلُ اِبْـــنٌ هُـــوَ اِبْـــنُ اِبْـــنِ عَمِّهَـــا، وَيُقَـــدَّمُ الأَقْـــرَبُ فَـــإِنْ بَقِـــيَ شَـــيْءٌ فَمَـــنْ يَلِيـــهِ، وَمُـــدْلٍ بِـــأَبَوَيْنِ، وَالْقَـــدِيمُ اَلتَّسْـــوِيَةُ، ثُـــمَّ مُعْتِـــقٌ ثُـــمَّ عَصَـــبَتُهُ ثُـــمَّ مُعْتِقُـــهُ ثُـــمَّ عَصَـــبَتُهُ وَإِلاَّ فَمُعْتِـــقُ أَبِالْجَـــانِي ثُـــمَّ عَصَـــبَتُهُ ثُـمَّ مُعْتِـقُ مُعْتِـقِ الأَبِ وَعَصَـبَتُهُ وَكَـذَا أَبَـدًا، وَعَتِيقُهَـا يَعْقِلُـهُ عَاقِلَتُهَـا، وَمُعْتِقُـونَ كَمُعْتِـقٍ، وَكُلُّ شَخْصٍ مِنْ عَصَبَةِ كُلِّ مُعْتِقٍ يَحْمِلُ مَا كَانَ يَحْمِلُهُ ذَلِكَ الْمُعْتِقُ،

---

عَلَى عَاقِلَةِ الْجَانِيةِ﴾...الحـديث رواه الشـيخان وأصـحاب السـنن، ئافرەتێـك بـەردێکی لـە ئافرەتێکیتر دا، جا ئافرەتەکەو کۆرپەکەی ناو زگیشی کوشتن، جا پێغەمبەرﷺ بڕیاریدا: خوێنی ئافرەتە کوژراوەکەو خوێنی کۆرپەکەی لە سەر خزمـەکانی ئافرەتـە تاوانکارەکـە بێ.

(وَهُمْ) خزمەکانی کوژراوەکە: (عَصَبَتُهُ إِلاَّ الأَصْلَ وَالْفَرْعَ) میراتگرەکانی پشتێیەتی جگە لە باوكو باپیرەیو کوڕو کوڕیکوڕی (وَقِيلَ يَعْقِلُ ابْنٌ هُوَ ابْنُ ابْنِ عَمِّهَا) لـە فەرموودەیـەکی بێهێزدا: ئەو کوڕەی کە کوڕی کوڕە مامی ئافرەتە بکوژەکەیە، خوێنی کوژراوەکە دەدا: بە کوڕە مامایەتی.

(وَيُقَدَّمُ الأَقْرَبُ) بۆ خوێندانەکە خزمە نزیکترەکە وەپێش دێخرێ وەکو میراتگـرتن، ئینجا (فَإِنْ بَقِيَ شَيْءٌ) ئەگەر شتێك لە خوێنەکە ماوەو نزیکترەکە دەسەڵاتی نەبو بیدا، ئەو کاتە (فَمَنْ يَلِيهِ) ئەو خزمانەی پلەیان لە دوای نزیکترەکەیە ئەوان پاشماوەکە دەدەن... بـەو جۆرە (وَ) هەروەها (مُدْلٍ بِأَبَوَيْنِ) خزمی لـەدایکیوباوکی وەپـێش خزمـی تـەنها لـەباوکی

دێخرێ، بەڵام (وَٱلْقَدِيمُ ٱلتَّسْوِيَةُ) بەفەرموودەی کۆن: هەردووکیان یەکسانن‌و واجبە بە هاوبەشی خوێنەکە بدەن.
(ثُمَّ مُعْتِقٌ) ئینجا لە دوای میراتگرەکانی پشتێ ئازادکەری کۆیلەکە خوێنەکە دەدا (ثُمَّ عَصَبَتُهُ) ئینجا میراتگرەکانی ئازادکەرەکە (ثُمَّ مُعْتِقُهُ) ئینجا ئازادکەریئازادکەرەکە (ثُمَّ عَصَبَتُهُ) ئینجا میراتگرەکانیئەویش (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ئازادکەرو خزمەکانی ئازادکەرەکەش نەبون (فَمُعْتِقُ أَبِيالْجَانِي ثُمَّ عَصَبَتُهُ) ئازاد کەری باوکی تاوانکارەکە، ئینجا خزمەکانی وی خوێنەکە دەدەن (ثُمَّ مُعْتِقُ مُعْتِقِ الأَبِ وَعَصَبَتُهُ) ئینجا ئازادکەری ئازادکەری باوکی تاوانکارەکەو خزمەکانی (وَكَذَا أَبَدًا) ئینجا ئازادکەری باپیرەی تاوانکارەکە...بەو جۆرە (وَعَتِيقُهَا يَعْقِلُهُ عَاقِلَتُهَا) ئازادکراوی ئافرەتێك—ئەگەر کەسێکی کوشت— خزمەکانی ئافرەتەکە خوێنی کوژراوەکەی دەدەن (وَمُعْتَقُونَ كَمُعْتِقٍ) زۆر ئازادکەر—وێکڕا— بە قەد ئازادکەرێك خوێنەکە دەدەن.
هەم (وَكُلُّ شَخْصٍ مِنْ عَصَبَةِ كُلِّ مُعْتِقٍ) هەر پیاوێکیش لە میراتگرەکانی هەر ئازادکەرێك (يَحْمِلُ مَا كَانَ يَحْمِلُهُ ذَلِكَ الْمُعْتِقُ) ئەو ئەندازە خوێنەی لە سەر دادەندرێ

وَلاَ يَعْقِلُ عَتِيقٌ فِي الأَظْهَرِ، فَإِنْ فُقِدَ الْعَاقِلُ أَوْ لَمْ يَفِ عَقَلَ بَيْتُ الْمَالِ عَنِ الْمُسْلِمِ، فَإِنْ فُقِدَ فَكُلُّهُ عَلَى الْجَانِي فِي الأَظْهَرِ، وَتُؤَجَّلُ عَلَى الْعَاقِلَةِ دِيَةُ نَفْسٍ كَامِلَةٍ ثَلاَثَ سِنِينَ فِي كُلِّ سَنَةٍ ثُلُثٌ، وَذِمِّيٍّ سَنَةً، وَقِيلَ ثَلاَثًا، وَامْرَأَةٍ سَنَتَيْنِ فِي الأُولَى ثُلُثٌ وَقِيلَ ثَلاَثًا، وَتَحْمِلُ الْعَاقِلَةُ الْعَبْدَ فِي الأَظْهَرِ، فَفِي كُلِّ سَنَةٍ قَدْرُ ثُلُثِ دِيَةٍ وَقِيلَ فِي ثَلاَثٍ،

---

کە ئەو ئازادکەرە لەحاڵەتی زیندووەتیدا دەیدا (وَلاَ يَعْقِلُ عَتِيقٌ فِيالأَظْهَرِ) نابێ ئازادکراو لەجیاتی ئازادکەرەکە خوێن بدا، هەروەك میراتیش ناگرێ.
(فَإِنْ فُقِدَ الْعَاقِلُ) جا ئەگەر ئەو خوێندەرانەیڕابردوو نەبون (أَوْ لَمْ يَفِ) یان خوێندەرەکە نەیتوانی خوێنە واجبەکەی بە تەواوی بدا، ئەو کاتە (عَقَلَ بَيْتُ الْمَالِ عَنِ الْمُسْلِمِ) واجبە: (بَيْتُ الْمَالِ) هەموو خوێنەکە، یان پاشماوەکە لەجیاتی تاوانکارە موسوڵمانەکە بدا، هەروەك میراتیشی لێدەگرێ، کەواتە: لە جیاتی کافر نایدا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَنَا وارِثُ مَنْ لاَوَارِثَ لَهُ: أَعْقِلُ عَنْهُ وَأَرِثُهُ﴾ حديث صحيح رواه أبوداود وغيره، من میراتگری ئەو کەسەم کە هیچ میراتگرێکی نیە: خوێنی لەجیاتی دەدەم‌و میراتیشی لێدەگرم.
(فَإِنْ فُقِدَ) جا ئەگەر (بيت المال) نەبو، یان سەرپەرشتکارەکەی ستەمکار بوو و خوێنەکەی لەجیاتی نەدا، ئەو کاتە (فَكُلُّهُ عَلَى الْجَانِي) هەموو خوێنەکە، یان پاشماوەکەی لە سەر خودی تاوانکارەکەیە (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَتُؤَجَّلُ عَلَىالْعَاقِلَةِ دِيَةُ نَفْسٍ كَامِلَةٍ) خوێنی گیانێكی تەواو، واتـە: پیـاوێكی موسـوڵمانو ئازاد ماوەی بۆدادەندرێ: لە سەر خزمەكانی بكوژەكە، یان لە سەر (بیت المال)، یان لـە سەر خودی بكوژەكە (ثَلاَثَ سِنِينَ) كە بە ماوەی سێ ساڵان بیدەن (فِي كُلِّ سَنَةٍ ثُلُثٌ) رواه البيهقي عن عمر وعلي رضیالله عنهما، لە كۆتایی هەر ساڵێكدا سێیەكێكی بدەن.

هەم (وَذِمِّيٍّ سَنَةً) خوێنی جولەكەو گاورو مەگوش بە ماوەی ساڵێك بدەن (وَقِيلَ ثَلاَثًا) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بە ماوەی سێ ساڵان بیدەن (وَامْرَأَةٍ سَنَتَيْنِ) خوێنی ئافرەتێكی موسوڵمانیش بە مـاوەی دوو سـاڵان بـدەن: (فِيالأُولَى ثُلُثٌ) لـە كۆتـایی سـاڵیەكەمدا سـێیەكی خوێنەكـەو پاشماوەكەشـی لـە كۆتایی‌دووەمەكـەدا بـدەن (وَقِيـلَ ثَلاَثًـا) لـە فەرموودەیەكی بێهێزدا : بە ماوەی سێ ساڵان بیدەن.

(وَتَحْمِلُ الْعَاقِلَةُ الْعَبْدَ) خزمەكانی تاوانكارەكـە نرخـی كۆیلـەی كـوژراویش هەڵـدەگرنو واجبە نرخەكەی بدەن (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (فَفِي كُلِّ سَنَةٍ قَدْرُ ثُلُثِ دِيَةٍ) لە هەر ساڵێكدا بە ئەندازەی سێیەكە خوێنێك لە نرخی كۆیلەكە وەردەگیرێ تا نرخەكەی تەواو دەبێ (وَقِيلَ فِي ثَلاَثٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: هەموو نرخەكـەی لـە مـاوەی سێ ساڵاندا وەردەگیرێ.

وَلَـوْ قَتَـلَ رَجُلَـيْنِ فَفِـي ثَـلاَثٍ وَقِيـلَ سِـتٌّ، وَالأَطْـرَافُ فِـي كُـلِّ سَـنَةٍ قَـدْرُ ثُلُـثِ دِيَـةٍ، وَقِيـلَ كُلُّهَـا فِـي سَـنَةٍ، وَأَجَـلُ الـنَّفْسِ مِـنَ الزُّهُـوقِ، وَغَيْرِهَـا مِـن الْجِنَايَـةِ، وَمَـنْ مَـاتَ فِـي بَعْـضِ سَـنَةٍ سَـقَطَ، وَلاَ يَعْقِـلُ فَقِيـرٌ وَرَقِيـقٌ وَصَـبِيٌّ وَمَجْنُـونٌ وَمُسْـلِمٌ عَـنْ كَـافِرٍ وَعَكْسِـهِ، وَيَعْقِـلُ يَهُـودِيٌّ عَـنْ نَصْـرَانِيٍّ وَعَكْسُـهُ فِـالأَظْهَرِ، وَعَلَـى الْغَنِـيِّ نِصْـفُ دِينَـارٍ، وَالْمُتَوَسِّطِ رُبُعٌ كُلَّ سَنَةٍ مِن الثَّلاَثِ، وَقِيلَ هُوَ وَاجِبُ الثَّلاَثِ،

---

(وَلَوْ قَتَلَ رَجُلَيْنِ) ئەگەر تاوانكارەكە–بە هەڵە– دوو پیاوی كوشتن، ئەوە (فَفِي ثَلاَثٍ) لـە ماوەی سێ سـاڵاندا خـوێنی هـەردووكیان وەردەگـیرێ (وَقِيـلَ سِـتٌّ) لـە فەرموودەیـەكی بێهێزدا: بە ماوەی شەش ساڵان خوێنەكەیان وەردەگیرێ.

(وَالأَطْـرَافُ) خـوێنی لێكردنەوەی‌ئەندامـەكانو لابردنی‌سـودەكانو نرخی‌شـكاندنو بریندارکردنەكانیش گشتیان ماوەیان بۆ دادەندرێ: كە (فِي كُلِّ سَنَةٍ قَدْرُ ثُلُثِ دِيَةٍ) لە هەر ساڵێكدا ئەندازەی سێیەكە خوێنێكی تـەواو لـە خـوێنی تاوانەكـە وەربگـیرێ تـا خـوێنی تاوانەكە تەواو دەبێ (وَقِيلَ كُلُّهَا فِي سَنَةٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: گشتی لـە مـاوەی ساڵێكدا وەردەگیرێ.

(وَأَجَلُ النَّفْسِ مِنَ الزُّهُوقِ) ماوەی دانانی خوێنی كوشتن لە دەرچوونی گیانەوە دادەندرێو (وَغَيْرِهَا مِن الْجِنَايَةِ) ماوەی خوێنی تاوانەكانی‌تری جگە لە كوشتن لە كاتی تاوانكردنەكەوە

دادەندرێ (وَمَنْ مَاتَ فِي بَعْضِ سَنَةٍ) هەر خزمێك لە ناو ساڵێكدا بمرێ (سَقَطَ) خوێنی ئەو ساڵەی لە سەر لادەكەوێ و نابێ لە میراتگرەكەی وەربگیرێ، بەڵام ئەگەر لە دوای تەواوبوونی ساڵەكە بمرێ، ئەو كاتە لە میراتەكەی وەردەگیرێ.

(وَلاَ يَعْقِلُ فَقِيرٌ وَرَقِيقٌ وَصَبِيٌّ وَمَجْنُونٌ) نابێ خزمێكی هەژار، یان كۆیلە، یان منداڵ، یان شێت، یان ئافرەت لەجیاتی خزمەكەی خوێنەكە بدا، چونكە ئەوانە دەسەڵاتی یارمەتیدانیان نیە (وَ) هەروەها (مُسْلِمٌ عَنْ كَافِرٍ وَعَكْسِهِ) نابێ موسوڵمانیش لە جیاتی خزمە كافرەكەی خوێنەكە بدا، بە پێچەوانەش: نابێ كافر لەجیاتی خزمە موسوڵمانەكەی خوێن بدا، چونكە میرات لە یەكتری ناگرن.

بەڵام (وَيَعْقِلُ يَهُودِيٌّ عَنْ نَصْرَانِيٍّ وَعَكْسُهُ) دەبێ جولەكە لەجیاتی خزمە گاورەكەی خوێن بدا، بە پێچەوانەش دەبێ گاور لەجیاتی خزمە جوەكەی خوێن بدا (فِيالأظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە ئەوانە میرات لە یەكتری دەگرن.

(وَعَلَىالْغَنِيِّ نِصْفُ دِينَارٍ) لە سەر هەر خزمێكیدەوڵەمەند لە گشت ساڵێكدا ئەندازەی نیو میسقالی زێڕ واجبە (وَالْمُتَوَسِّطِ رُبُعٌ كُلَّ سَنَةٍ مِنَ الثَّلاَثِ) لە سەر ناوەنجیش ئەندازەی چوارێكە میسقالێك واجبە لە گشت ساڵێكدا (وَقِيلَ هُوَ وَاجِبُ الثَّلاَثِ) لە فەرموودەیەكی وَيُعْتَبَرَانِ آخِرَ الْحَوْلِ، وَمَنْ أَعْسَرَ فِيهِ سَقَطَ.

(فَصْلٌ) مَالُ جِنَايَةِ الْعَبْدِ يَتَعَلَّقُ بِرَقَبَتِهِ، وَلِسَيِّدِهِ بَيْعُهُ لَهَا، وَفِدَاؤُهُ بِالأَقَلِّ مِنْ قِيمَتِهِ وَأَرْشِهَا وَفِالْقَدِيمِ بِأَرْشِهَا، وَلاَ يَتَعَلَّقُ بِذِمَّتِهِ مَعَ رَقَبَتِهِ فِالأَظْهَرِ، وَلَوْ فَدَاهُ ثُمَّ جَنَى سَلَّمَهُ لِلْبَيْعِ أَوْ فَدَاهُ، وَلَوْ جَنَى ثَانِيًا قَبْلَ الْفِدَاءِ بَاعَهُ فِيهِمَا أَوْ فَدَاهُ بِالأَقَلِّ مِنْ قِيمَتِهِ وَالأَرْشَيْنِ، وَفِي الْقَدِيمِ بِالأَرْشَيْنِ، وَلَوْ أَعْتَقَهُ أَوْ بَاعَهُ وَصَحَّحْنَاهُمَا أَوْ قَتَلَهُ فَدَاهُ بِالأَقَلِّ، وَقِيلَ الْقَوْلاَنِ، وَلَوْ هَرَبَ أَوْ مَاتَ

---

بێهێزدا: نیوەكەو چوارێكەكە واجبی هەر سێك ساڵەكانە (وَيُعْتَبَرَانِ آخِرَ الْحَوْلِ) دەوڵەمەندیو ناوەنجیەتی لە كۆتاییساڵێدا ڕەچاو دەكرێن، كەوابو: (وَمَنْ أَعْسَرَ فِيهِ) هەر خزمێك لە كۆتایی ساڵێدا نەبوویی بێ (سَقَطَ) خوێنی ئەو ساڵەی لە سەر لادەكەوێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی تاوانكردنی كۆیلە ﴾

(مَالُ جِنَايَةِ الْعَبْدِ) ئەو ماڵەی بە هۆی تاوانی كۆیلە واجب دەبێ (يَتَعَلَّقُ بِرَقَبَتِهِ) بە گەردنیەوە دەبەسترێ، واتە: كۆیلەكە دەفرۆشرێو پارەكەی لە خوێنی تاوانەكە سەرف دەكرێ، كەوابو: (وَلِسَيِّدِهِ بَيْعُهُ لَهَا) بۆ گەورەكەی دروستە كۆیلەكە –بە ئیزنی خاوەن مافەكە– بۆ خوێنی تاوانەكە بفرۆشێ، هەم (وَفِدَاؤُهُ بِالأَقَلِّ مِنْ قِيمَتِهِ وَأَرْشِهَا) بۆیشی دروستە: كۆیلەكە ڕزگار بكا، واتە: بۆ خۆی بیهێڵێتەوە بە پارە كەمترەكە: لە نرخەكەیو

له خوێنی تاوانەکە (وَفِيالقَدِيمِ بِأَرْشِهَا) لە فەرموودەی کۆندا: بە خوێنی تاوانەکە کۆیلەکە ڕزگار دەکا (وَلاَ يَتَعَلَّقُ بِذِمَّتِهِ مَعَ رَقَبَتِهِ فِيالأَظْهَرِ) خوێنی تاوانەکە وێکڕا بە ئەستۆو بە گەردەنی کۆیلەکەوە نابەسترێ (وَلَوْ فَدَاهُ ثُمَّ جَنَى) ئەگەر گەورەکە کۆیلەکەی ڕزگار کردو بۆ خۆی بە پارە هێشتیەوە، ئینجا دووبارە تاوانێکیتری کرد، ئەم جارەش (سَلَّمَهُ لِلْبَيْعِ أَوْ فَدَاهُ) وەك جاری یەکەم یان دەیفرۆشێ، یان ڕزگاری دەکا (وَ) هەروەها (لَوْ جَنَى ثَانِيًا قَبْلَ الْفِدَاءِ) ئەگەر کۆیلەکە پێش ڕزگارکردن دووبارە تاوانێکیتری کرد، ئەو کاتەش (بَاعَهُ فِيهِمَا) یان بۆ خوێنی هەر دوو تاوانەکان دەیفرۆشێ (أَوْ فَدَاهُ بِالأَقَلِّ مِنْ قِيمَتِهِ وَالأَرْشَيْنِ) یان ڕزگاری دەکا بە پارە کەمترەکە: لە نرخەکەو لە خوێنی هەردوو تاوانەکان (وَفِيالْقَدِيمِ بِالأَرْشَيْنِ) لە فەرموودەی کۆندا: بە خوێنی هەردوو تاوانەکان ڕزگاری دەکا.

(وَلَوْ أَعْتَقَهُ أَوْ بَاعَهُ وَصَحَّحْنَاهُمَا) ئەگەر گەورەکە کۆیلە تاوانکارەکەی ئازاد کرد، یان فرۆشتی، ئازادکردنو فرۆشتنەکەشمان بەدروستبوویی دانان (أَوْ قَتَلَهُ) یان گەورەکە کۆیلەکەی کوشت، لە هەرسێك حاڵەتدا (فَدَاهُ بِالأَقَلِّ) واجبە ڕزگاری بکا بە پارە کەمترەکە: لە نرخەکەیو لە خوێنی تاوانەکە (وَقِيلَ الْقَوْلاَنِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: هەردوو فەرموودەکەی کۆنو نوێ لێرەشدا دێنە جێ (وَلَوْ هَرَبَ أَوْ مَاتَ) ئەگەر کۆیلە

بَرِئَ سَيِّدُهُ، إِلاَّ إِذَا طُلِبَ فَمَنَعَهُ، وَلَوْ اخْتَارَ الْفِدَاءَ فَالأَصَحُّ أَنَّ لَهُ الرُّجُوعَ وَتَسْلِيمَهُ وَيَفْدِي أُمَّ وَلَدِهِ بِالأَقَلِّ، وَقِيلَ الْقَوْلاَنِ، وَجِنَايَاتُهَا كَوَاحِدَةٍ فِي الأَظْهَرِ.

(فَصْلٌ) فِي الْجَنِينِ غُرَّةٌ إِنْ انْفَصَلَ مَيِّتًا بِجِنَايَةٍ فِي حَيَاتِهَا أَوْ مَوْتِهَا وَكَذَا إِنْ ظَهَرَ بِلاَ انْفِصَالٍ فِي الأَصَحِّ، وَإِلاَّ فَلاَ، أَوْ حَيًّا وَبَقِيَ زَمَانًا بِلاَ أَلَمٍ ثُمَّ مَاتَ فَلاَ ضَمَانَ.

---

تاوانکارەکە هەڵات، یان بەخۆی مرد، ئەو کاتە (بَرِئَ سَيِّدُهُ) گەورەکەی لە بەرپرسیاریەتی ئازاد دەبێ (إِلاَّ إِذَا طُلِبَ فَمَنَعَهُ) تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێ: کە بۆ فرۆشتن داوای کۆیلەکەی لێکرابێو ئەویش تەسلیمی نەکردبێ (وَلَوْ اخْتَارَ الْفِدَاءَ) ئەگەر گەورەکە ڕزگارکردنی کۆیلەکەی هەڵبژارد، ئەوە (فَالأَصَحُّ أَنَّ لَهُ الرُّجُوعَ وَتَسْلِيمَهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: بۆی هەیە پەشیمان ببێتەوەو تەسلیمی بکا بۆ فرۆشتن (وَيَفْدِي أُمَّ وَلَدِهِ بِالأَقَلِّ) واجبە: گەورەکە دایکە منداڵەکەی ڕزگار بکا بە پارە کەمترەکە: لە نرخەکەیو لە خوێنی تاوانەکە چونکە نابێ دایکە منداڵ بفرۆشرێ (وَقِيلَ الْقَوْلاَنِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: هەردوو فەرموودەی کۆنو نوێ لێرەشدا دێنە جێ (وَجِنَايَاتُهَا كَوَاحِدَةٍ فِيالأَظْهَرِ) تاوانەکانی دایکە منداڵ هەموویان وەك یەك تاوانن، واتە: گەورەکە بۆ گشتیان یەك ڕزگارکردنی لەسەر واجبە.

**﴿فَصْلٌ: لە باسی خوێنی کۆرپەی ناو زگ﴾**

(فِي الْجَنِينِ غُرَّةٌ) لە کوشتنی کۆرپەی ناو زگدا بەشێکی خوێن واجب دەبێ، جیاوازی نیە: کۆرپەکە: نێر بێ، یان مێ بێ، هەرچەند کۆرپەکەش لە زینا بێ ﴿عن أبیهریرة ﷺ:

قَضَى رَسُولُ اللهِﷺ فِالْجَنِينِ بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لەبارەی کۆرپەی ناو زگ بڕیاری داوە: بەشە خوێنێك-کۆیلەیەکی نێر، یان مێ- بدرێ.

(إِنْ انْفَصَلَ مَيِّتًا بِجِنَايَةٍ) ئەگەر کۆرپەکە بە مردوویی لە دایکی جیا ببێتەوە بە هۆی تاوانکردنە سەر دایکەکەی: وەك لێدان، برسیکردن، هەڕشە لێکردن، ترساندن، دەرخواردانی دەرمان و هەر هۆیەکیتر: کە کار لە بەرهاوێشتن بکا، جیاوازی نیە جیابوونەوەی کۆرپەکە: (فِي حَيَاتِهَا أَوْ مَوْتِهَا) لە ژیانی دایکیدابێ، یان لە دوای مردنی دایکی بێ (وَكَذَا إِنْ ظَهَرَ بِلاَ انْفِصَالٍ) هەروەها ئەگەر بەشێکی کۆرپەکەش بە مردوویی بێتە دەرەوە بەڵام لە دایکی جیا نەبێتەوە: وەك تەنها سەری بە مردوویی بێتە دەرەوە، ئەو کاتەش خوێنەکەی واجب دەبێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر کۆرپەکە بە مردوویی لە دایکی جیا نەبێتەوەو بەشێکیشی نەیەتە دەرەوە، ئەو کاتە (فَلاَ) هیچ خوێنی واجب نابێ، هەرچەند جوڵەی زگیشی نەمێنێ.

(أَوْ حَيًّا) یان ئەگەر کۆرپەکە بە زیندوویی لە دایکی جیا بۆوە بە هۆی تاوانکردنە سەر دایکەکەیو (وَبَقِيَ زَمَانًا بِلاَ أَلَمٍ ثُمَّ مَاتَ) لە دوای جیابوونەوەشی ماوەیەك بێ ئازار مایەوە، ئینجا مرد، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ) هیچ زامینیی لە سەر تاوانکارەکە نیە، چونکە وا دیارە

وَإِنْ مَاتَ حِينَ خَرَجَ أَوْ دَامَ أَلَمُهُ وَمَاتَ فَدِيَةُ نَفْس



فغُرَّةٌ، وَكَذَا لَحْمٌ قَالَ الْقَوَابِلُ فِيهِ صُورَةٌ خَفِيَّةٌ، قِيلَ

---

بە هۆیەکیتر مردبێ، بەڵام (وَإِنْ مَاتَ حِينَ خَرَجَ) ئەگەر کۆرپەکە بە تەواوی هاتە دەروەو لەو کاتدا مرد (أَوْ دَامَ أَلَمُهُ وَمَاتَ) یان ئازارەکەی بەردەوام بوو و بە ئازارەکە مرد، ئەو کاتە (فَدِيَةُ نَفْسٍ) خوێنی گیانێکی تەواوی کۆرپەکە-سەد ووشتر- واجب دەبێ، چونکە لەو دوو مەسەلەیەدا بێگومان ئادەمیزادێکی زیندووە.

(وَلَوْ أَلْقَتْ جَنِينَيْنِ) ئەگەر ئافرەتەکە-بە هۆی تاوانەکە- دوو کۆرپەی مردووی لە بار هاویشتن، ئەوە (فَغُرَّتَانِ) دوو بەشە خوێن واجب دەبن، هەم لە سێ کۆرپەدا سێ بەشە خوێن واجب دەبن...هتد.

(أَوْ يَدًا) یان ئەگەر تەنها دەستێك، یان پێیەکی هاویشتو دایکەکەش مرد، ئەوە (فَغُرَّةٌ) یەك بەشە خوێن واجب دەبێ، بەڵام ئەگەر دایکەکە نەمرێو جگە لە دەستەکەش، یان پێیەکەش کۆرپەکە لە بار نەهاوێ، ئەو کاتە نیوەی بەشە خوێن بۆ دەستەکە، یان پێیەکە واجب دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَكَذَا لَحْمٌ) هەروەها ئەگەر ئافرەتەکە پارچە گۆشتێکیش لە بار باوێ: کە (قَالَ الْقَوَابِلُ فِيهِ صُورَةٌ خَفِيَّةٌ) چوار مامان بڵێن: وێنەیەکی نهێنیی ئادەمیزادی تێدایە، ئەو کاتەش بەشە خوێنێکی کۆرپەکە واجب دەبێ (قِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ هێزدا: (أَوْ قُلْنَ لَوْ بَقِيَ

لَتَصَوَّرَ) یان مامانەکان بڵێن: گۆشتەکە وێنەی ئادەمیزادی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر لە زگدا بمابا وە، وێنەی دروست دەبو.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: ئەگەر دایکەکە بەخۆی کۆرپەکەی لە بار ببا، ئەویش خوێنی کۆرپەکەی لە سەر خزمەکانی واجب دەبێ، هەر چەند لە باربردنەکەشی بە هۆی خۆ برسیکردن بێ، یان بە هۆی بەڕۆژووبوونێکی واجب بێ، ئەگەر ڕۆژووەکە مەترسی بەرهاوێشتنی لێبکرێ، بەڵام ئەگەر دایکەکە لە بەر ناچاری کۆرپەکەی لە بار برد-وەك مەترسی مردن، یان فەوتانیئەندامێکی هەبێ- ئەو کاتە دایکەکە نابێتە زامینی کۆرپەکە، هەروەك ئیمامی(الزركشي) فەرموویەتیو، لە (مغني)و (الاقناع)دا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر مەترسی نەبێ-بە فەرموودەی ڕێنتر-حەرامە: ئافرەت بەرهاویشتی بکرێ، هەرچەند کۆرپەکەش لە حاڵەتی (مَني)و خوێنیەکەدابێ، بەڵام ئیمام (أبوإسحاق) ڕێگای داوە: تەنها لە حاڵەتی(مَني)و خوێنیەکەدا لە بار ببردرێ، نەك لە حاڵەتی پارچە گۆشتیەکەو بەولاوەتر، واتە: چونکە لە حاڵەتی پارچە گۆشتیەکەو بەولاوەتر-ئەگەر لە بار ببردرێ- هەم کەففارەتو هەم خوێنی کۆرپەکەش واجب دەبێ، هەروەك لە پێش ئەم ئاگاداریەدا ڕابرا.

وَهِيَ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ مُمَيِّزٌ سَلِيمٌ مِنْ عَيْبِ مَبِيعٍ، وَالأَصَحُّ قَبُولُ كَبِيرٍ لَمْ يَعْجِزْ بِهَرَمٍ، وَيُشْتَرَطُ بُلُوغُهَا نِصْفَ عُشْرِ دِيَةٍ، فَإِنْ فُقِدَتْ فَخَمْسَةُ أَبْعِرَةٍ، وَقِيلَ لاَ يُشْتَرَطُ فَلِلْفَقْدِ قِيمَتُهَا، وَهِيَ لِوَرَثَةِالْجَنِينِ وَعَلَى عَاقِلَةِ الْجَانِي، وَقِيلَ إنْ تَعَمَّدَ فَعَلَيْهِ، وَالْجَنِينُ الْيَهُودِيُّ أَوِ النَّصْرَانِيُّ قِيلَ كَمُسْلِمٍ، وَقِيلَ هَدَرٌ،

---

ئینجا بزانە: حەرامە شتێکی وەها بەکار بێنێ: کە بە یەکجاری ڕێگای ئاوسی-واتە: منداڵبوون- بگرێ، بەڵام ئەگەر بە یەکجاری نەبێو تەنها ماوەیەك ئاوسی دوا بێخێ، ئەو کاتە دروستە، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ناوەڕۆکی ئەم ئاگاداریە- لێرەو لە سەرەتای (نکاح)و لە (عدة)دا- ڕوون کراوەتەوە.

(وَهِيَ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ) بەشە خوێنی کۆرپەکە: یەك کۆیلەی نێر، یان مێیە (مُمَيِّزٌ سَلِيمٌ مِنْ عَيْبِ مَبِيعٍ) کۆیلەکە فامیدە بێو سەلامەت بێ: لە عەیبەکانی فرۆشراو (وَالأصَحُّ قَبُولُ كَبِيرٍ لَمْ يَعْجَزْ بِهَرَمٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: کۆرپەی بە تەمەنیش وەردەگیرێ کە بە هۆی پیری لەکار نەکەوتبێ (وَيُشْتَرَطُ بُلُوغُهَا نِصْفَ عُشْرِ دِيَةٍ) بە مەرج دادەندرێ نرخی کۆیلەکە بکاتە نیوەی دەیەکی خوێنی باوکەکەی، جا ئەگەر بێ باوك بوو-وەك کۆرپەی زینا- ئەو کاتە مەرجە نرخەکەی بکاتە دەیەکی نرخی دایکەکەی.

(فَإِنْ فُقِدَتْ) جا ئەگەر کۆیلەکە دەست نەکەوت، ئەو کاتە (فَخَمْسَةُ أَبْعِرَةٍ) واجبە: پێنج ووشتر لە خوێنی کۆرپەکە بدرێن، جا ئەگەر ووشتریش دەست نەکەوتن، ئەو کاتە واجبە:

نرخی پێنج ووشتر لە خوێنی کۆرپەکە بدرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَقِيلَ لاَ يُشْتَرَطُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: مەرج نیە نرخی کۆیلەکە بکاتە نیوەی دەیەکەکە (فَلِلْفَقْدِ قِيمَتُهَا) کەوابو: بە فەرموودەی بێهێز: ئەگەر کۆیلەکە نەبو، نرخەکەی واجب دەبێ.

(وَهِيَ لِوَرَثَةِ الْجَنِينِ) خوێنەکە بۆ میراتگرەکانی کۆرپەکەیەو (وَعَلَى عَاقِلَةِالْجَانِي) لە سەر خزمەکانیتاوانکارەکەیە، واتە: هیچی لە سەر تاوانکارەکە نیە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو لە سەرەتای (باسیخزمەکانیمرۆڤکوژەکە)دا (وَقِيلَ: إِنْ تَعَمَّدَ فَعَلَيْهِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر بە قەسدی تاوانەکەی کردبێ، ئەو کاتە لە سەر تاوانکارەکەیە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر دایکەکە بەخۆی ببێتە هۆی بەرهاوێشتن، ئەوە هیچی لە خوێنی کۆرپەکەی بە میرات نادرێتێ، چونکە بکوژ میرات لە کوژراوەکەی ناگرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دافەرموویانە.

(وَالْجَنِينُ الْيَهُودِيُّ أَوِ النَّصْرَانِيُّ) کۆرپەی جولەکە، یان گاوری پەیمان لەئەستۆ (قِيلَ كَمُسْلِمٍ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: وەك کۆرپەی موسوڵمانە (وَقِيلَ هَدَرٌ) لە بێهێزێکیتردا:

وَالأَصَحُّ غُرَّةٌ كَثُلُثِ غُرَّةِمُسْلِمٍ، وَالرَّقِيقُ عُشْرُ قِيمَةِأُمِّهِ يَوْمَ الْجِنَايَةِ–وَقِيلَ الإِجْهَاضِ–لِسَيِّدِهَا، فَإِنْ كَانَتْ مَقْطُوعَةً وَالْجَنِينُ سَلِيمٌ قُوِّمَتْ سَلِيمَةً فِالأَصَحِّ، وَتَحْمِلُهُ الْعَاقِلَةُ فِالأَظْهَرِ.

(فَصْلٌ) يَجِبُ بِالْقَتْلِ كَفَّارَةٌ وَإِنْ كَانَ الْقَاتِلُ صَبِيًّا أَوْ مَجْنُونًا، أَوْ عَبْدًا أَوْ ذِمِّيًّا وَعَامِدًا وَمُخْطِئًا وَمُتَسَبِّبًا بِقَتْلِ مُسْلِمٍ–وَلَوْ بِدَارِ حَرْبٍ–وَذِمِّيٍّ وَجَنِينٍ وَعَبْدِ نَفْسِهِ وَنَفْسِهِ، وَفِي نَفْسِهِ وَجْهٌ، لاَ امْرَأَةٍ وَصَبِيٍّ حَرْبِيَّيْنِ وَبَاغٍ

---

بە فیڕۆ دەدرێ، بەڵام (وَالأَصَحُّ: غُرَّةٌ كَثُلُثِ غُرَّةِ مُسْلِمٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: بەشە خوێنێکی بە ئەندازەی سێیەکی بەشە خوێنی کۆرپەیەکی موسوڵمان واجب دەبێ.

(وَالرَّقِيقُ عُشْرُ قِيمَةِ أُمِّهِ يَوْمَ الْجِنَايَةِ) خوێنی کۆرپەی کۆیلەکەش دەیەکی نرخی دایکیەتی لە ڕۆژی تاوانەکەدا (وَقِيلَ الإِجْهَاضِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: نرخی ڕۆژی لەباربردنی کۆرپەکە (لِسَيِّدِهَا) خوێنەکەش بۆ گەورەی جاریە ئاوسەکەیە (فَإِنْ كَانَتْ مَقْطُوعَةً وَالْجَنِينُ سَلِيمٌ) جا ئەگەر دایکەکە ئەندامێکی نەبو، کۆرپەکەش سەلامەت بوو، ئەو کاتە (قُوِّمَتْ سَلِيمَةً فِيالأَصَحِّ) جاریەکە لە حاڵەتی سەلامەتیدا دەقرسێندرێ (وَتَحْمِلُهُ الْعَاقِلَةُ فِيالأَظْهَرِ) خوێنی کۆرپەی کۆیلەش هەر خزمەکانی تاوانکارەکە دەیدەن، لە فەرموودەی بەهێزتردا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی کەففارەتی کوشتن ﴾

(يَجِبُ بِالْقَتْلِ كَفَّارَةٌ) بە هۆی کوشتن کەففارەت لە سەر بکوژەکە واجب دەبێ (وَإِنْ كَانَ الْقَاتِلُ

صَبِيًّا أَوْ مَجْنُونًا) هەرچەند بكوژەكەش مندالّ، یان شێت بێ (أَوْ عَبْدًا أَوْ ذِمِّيًّا) یـان كۆیلـە، یان جولەكەو گاوری پەیمان لەئەستۆ بێ (وَ) هەروەها جیاوازی نیە بكوژەكە: (عَامِدًا وَمُخْطِئًا وَمُتَسَبِّبًا) ڕاسـتەوخۆ بـە قەسـدی، یـان بـە هەڵـە كوشـتنەكەی كردبـێ، یـان بوبێتـە هـۆی كوشتنەكە: وەك بە شاهیدیی بە درۆ، یان بە زۆرلێكردن كوشتنەكە بە كەسێكیتر بكا.

ئینجا كەففارەتەكەش واجب دەبێ: (بِقَتْلِ مُسْلِمٍ وَلَوْ بِدَارِ حَرْبٍ) بە كوشتنی موسـڵمانێك، هەرچەند موسوڵمانەكەش لە خانەی جەنگدا بێ، هەم (وَذِمِّيٍّ) بە كوشتنی كافرێكی پەیمان لەئەستۆو كافری دڵنیاكراو، هەم (وَجَنِينٍ) بە كوشتنی كۆرپەی ناو زگ، هەم (وَعَبْدِ نَفْسِه) بە كوشتنی كۆیلەی خۆی، هەم (وَنَفْسِه) بـە كوشـتنی خودیخـۆی، كەواتـە: واجبـە: لـە میراتەكەی كەففارەتەكەی بدرێ (وَفِي نَفْسِهِ وَجْهٌ) لەبارەی كوشـتنیخۆی فەرموودەیـەك هەیە: كە كەففارەتی لە سەر واجب نیە.

جا بزانە: لە كوشتنی بە قەسدیو لە وێنەی بە قەسدیدا واجبە: بە پەلە كەففارەتەكە بدا، بەڵام لە كوشتنی بە هەڵەدا پەلەكردن واجب نیە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(لاَ امْرَأَةٍ وَصَبِيٍّ حَرْبِيَّيْنِ) بەڵام بە كوشتنی ئـافرەتو منـداڵی كـافری جـەنگی كـەففارەت واجب نابێ، هەم (وَبَاغٍ) بە كوشتنی موسوڵمانی یاخیبوو كەففارەت واجب نابـێ ئەگـەر

وَصَـائِلٍ وَمُقْتَـصٍّ مِنْـهُ، وَعَلَـى كُـلٍّ مِـنَ الشُّـرَكَاءِ كَفَّـارَةٌ فِالأَصَـحِّ، وَهِـيَ كَظِهَـارٍ لَكِنْ لاَ إِطْعَامَ فِي الأَظْهَرِ.

---

بە فەرمانی پێشەوای موسوڵمانان كوشتبێتی، هەم (وَصَائِلٍ) بە كوشتنی زۆرداریهێرشكەر كەففارەت واجب نابێ ئەگەر هێرش بۆكراوەكە بیكوژێ، هەم (وَمُقْتَصٍّ مِنْهُ) بە كوشـتنی تۆڵەلێكراوەكە، واتە: بە كوشـتنەوەی لەتۆڵـەش كـەففارەت واجـب نابـێ ئەگـەر خـاوەن مافەكە بیكوژێ، هەم بە كوشتنی ڕێگرو نوێژنەكەرو زیناكـەری موحسـەنیش كـەففارەت واجب نابێ ئەگەر نوێژنەكەرەكە فەرمانی نوێژكردنی پێكرابێ.

(وَ) ئەگەر كۆمەڵێك یەك كەس بكوژن، ئەوە (عَلَى كُلٍّ مِن الشُّرَكَاءِ كَفَّارَةٌ) هەر هاوبەشـێك كەففارەتێكی لە سەر واجبە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەروەك ئەگەر یـەكێك چەند كەسێك بكوژێ ئەوەندە كەففارەتانەی لە سـەر واجـب دەبـن، هـەروەك لـە (باسـی خۆلێكداندا) ڕوون كراوە.

(وَهِيَ كَظِهَارٍ) كەففارەتی كوشتنیش وەكو كەففارەتی زیهارە، واتە: ئەگەر كۆیلەی دەست نەكەوت، واجبە: دوو مانگ بە دوای یەكتردا—بێنێوان— بەڕۆژوو ببێ (لَكِنْ لاَ إِطْعَامَ) بەڵام كەففارەتیكوشـتن دەرخـواردانی خواردەمـەنیی تـێدا نیـە، هەرچـەند توانـای بەڕۆژووبوونیشی نەبێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە خوای گەورە باسـی

نەكردوە كە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللهِ وَكَانَ اللهُ عَلِيماً حَكِيماً﴾ هەر كەسێك موسوڵمانێك بە هەڵە بكوژێ، واجبە: كۆیلەیەكی موسوڵمان ئازاد بكاو خوێنیشی بداتە خزمەكانی، مەگەر خزمەكانی عەفوی بكەنو خوێنی لێوەرنەگرن، جا ئەگەر كوژراوەكە موسوڵمان بوو و خزمەكانیشی كافر بونو جەنگیان لەگەڵ موسوڵمانان دەكرد، ئەوە تەنها كەففارەتی كوشتنەكە واجبە، بەڵام ئەگەر خزمەكانی كوژراوەكە كافری پەیمان لەگەڵكراو بون، واجبە: خوێنی كوژراوەكەیان بدرێتێو هەم بكوژەكە كەففارەتیش بدا، جا ئەگەر كۆیلە دەست نەكەوت، واجبە بكوژەكە دوو مانگ بەدوای یەكتردا بەڕۆژوو ببێ، ئەوە تۆبەكردنەو لە لای خواوەیە، خوا زاناو كارلەجێیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر بكوژەكە پێش بەڕۆژووبوون مرد، ئەو كاتە واجبە: لە میراتەكەی (فِدْيَة)ی ڕۆژووەكانی بۆ بدرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانەو لە (فِدْيَة)ی ڕۆژوودا ڕوون كراوە.

## (كِتَابُ دَعْوَى الدَّمِ وَالْقَسَامَةِ)

يُشْتَرَطُ أَنْ يُفَصِّلَ مَا يَدَّعِيهِ مِنْ عَمْدٍ وَخَطَإٍ وَانْفِرَادٍ وَشَرِكَةٍ، فَإِنْ أَطْلَقَ إِسْتَفْصَلَهُ الْقَاضِي وَقِيلَ يُعْرِضُ عَنْهُ، وَأَنْ يُعَيِّنَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ، فَلَوْ قَالَ قَتَلَهُ أَحَدُهُمْ لاَ يُحَلِّفُهُمْ الْقَاضِي فِي الأَصَحِّ، وَيَجْرِيَانِ فِي دَعْوَى غَصْبٍ وَسَرِقَةٍ وَإِتْلاَفٍ، وَإِنَّمَا تُسْمَعُ مِنْ مُكَلَّفٍ مُلْتَزِمٍ عَلَى مِثْلِهِ،

---

﴿ كِتَابُ دَعْوَىالدَّمِ: ئەم پەرتوكە باسی داواكردنی خوێنی كوشتن دەكاو (وَالْقَسَامَةِ) باسی سوێندخواردنی كوشتن دەكا ﴾

(يُشْتَرَطُ) بۆ گشت داواكردنێك شەش مەرج دادەندرێن، یەكەم: (أَنْ يُفَصِّلَ مَا يَدَّعِيه) دەبی داواكارەكە بە درێژی ئەو شتە ڕوون بكاتەوە كە داوای دەكا: (مِنْ عَمْدٍ وَخَطَإٍ) لە كوشتنی بە قەسدیو بە هەڵە، هەم (وَانْفِرَادٍ وَشَرِكَةٍ) لە بە تەنهاییو هاوبەشی لە كوشتنەكەداو هەم ژمارەی هاوبەشەكانیش، كەوابو: (فَإِنْ أَطْلَقَ) ئەگەر بێڕوونكردنەوە داوای كوشتنەكەی كرد: وەك ئەمە باوكمی كوشت. ئەو كاتە (إِسْتَفْصَلَهُ الْقَاضِي) قازی داوای ڕوونكردنەوی داوایەكەی لێدەكا (وَقِيلَ يُعْرِضُ عَنْهُ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: وازی لێدێنێ.

دووەم: (وَأَنْ يُعَيِّنَ الْمُدَّعَىعَلَيْه) دەبی داواكارەكە داوالێكراوەكە دیاری بكا (فَلَوْ قَالَ: قَتَلَهُ أَحَدُهُمْ) ئەگەر داواكارەكە گوتی: ئەوانە یەكێكیان باوكمی كوشت. ئەوانیش

گوتیان: ڕاست ناكا. داواكارەكەش داوای سوێنددانی كشتیانی كرد، ئەوە (لاَ يُحَلِّفُهُمْ الْقَاضِي) نابێ قازی سوێندیان بدا (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام لە فەرموودەی بێهێزدا: قازی فەرمان دەدا گشتیان سوێند بخۆن، بەڵكی یەكێكیان دان بە كوشتنەكەدا بێنێو مافەكەی لێوەربگیرێ، داوالێكراوەكانیش بە سوێندی ڕاست زیانیان ناگاتێ، هەروەك لە (المحلی) و (نهایة)دا فەرموویانە.

(وَيَجْرِيَانِ) ئەو دوو فەرموودە بەهێزو بێهێزە دێنە جێ: (فِي دَعْوَى غَصْبٍ وَسَرِقَةٍ وَإِتْلاَفٍ) لە داواكردنی زەوتكردنو دزیو فەوتاندنی شتێك، كەواتە: بە فەرموودەی بێهێز داوا لێكراوەكان سوێند دەدرێن.

سێیەم: داواكارەكە شیاوی داواكردن بێ، كەوابو: (وَإِنَّمَا تُسْمَعُ مِنْ مُكَلَّفٍ مُلْتَزِمٍ) داواكردنەكە تەنها لەو كەسە وەردەگیرێ: كە بالغو عاقڵ بێو پابەندی بڕیارەكانیئیسلام بێ، واتە: موسوڵمان بێ، یان كافری پەیمان لەئەستۆ بێ، نەك كافریجەنگی.

چوارەم: داوا لێكراوەكەش شیاوی داوالێكردن بێ، كەوابو: مەرجە: داواكارەكە داوایەكە بكا (عَلَى مِثْلِهِ) لە سەر داوالێكراوێكی وەكو خۆی، واتە: بالغو عاقڵو پابەندی بڕیارەكانیئیسلام بێ، كەواتە: داواكردنو داوالێكردنی منداڵو شێت دروست نابێ، بەڵكو سەرپەرشتكارەكەیان داوایان بۆ دەكاو هەم داواش لە سەرپەرشتكارەكەیان دەكرێ.

وَلَوْ ادَّعَى انْفِرَادَهُ بِالْقَتْلِ ثُمَّ ادَّعَى عَلَى آخَرَ لَمْ تُسْمَعِ الثَّانِيَةُ، أَوْ عَمْدًا وَوَصَفَهُ بِغَيْرِهِ لَمْ يَبْطُلْ أَصْلُ الدَّعْوَى فِالأَظْهَرِ، وَتَثْبُتُ الْقَسَامَةُ فِالْقَتْلِ بِمَحَلِّ لَوْثٍ: وَهُوَ قَرِينَةٌ لِصِدْقِ الْمُدَّعِي: بِأَنْ وُجِدَ قَتِيلٌ فِي مَحَلَّةٍ أَوْ قَرْيَةٍ صَغِيرَةٍ لأَعْدَائِهِ أَوْ تَفَرَّقَ عَنْهُ جَمْعٌ، وَلَوْ تَقَابَلَ صَفَّانِ لِقِتَالٍ وَانْكَشَفُوا عَنْ قَتِيلٍ: فَإِنْ الْتَحَمَ قِتَالٌ فَلَوْثٌ فِي حَقِّ الصَّفِّ الآخَرِ، وَإِلاَّ

---

جا ئەگەر سەرپەرشتكار نەبو، بەڵام داواكارەكە شاهیدی هەبون ئەو كاتە داوایەكی لە سەر شێتو منداڵ دروست دەبێ، بەو مەرجەی لە دوای شاهیدیدانەكە داواكارەكە سوێندی ئاشكراكردنیش بخوا: كە ئەو مافەی لە سەر شێتو منداڵەكە هەیە، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

پێنجەم: نابێ داوایەكەی دژی داوایەكیتری بێ، كەوابو: (وَلَوْ ادَّعَى انْفِرَادَهُ بِالْقَتْلِ) ئەگەر داوای كرد: فڵانەكەس بە تەنها باوكمی كوشتوە (ثُمَّ ادَّعَى عَلَى آخَرَ) ئینجا داوای لە سەر یەكێكیتریش كرد: ئەوە باوكمی كوشتوە. یان هاوبەشی لە كوشتنەكەدا كردوە. ئەو كاتە (لَمْ تُسْمَعِ الثَّانِيَةُ) داوایەكەیدووەم گوێی نادرێتێ، چونكە داوایەكەییەكەمی بە درۆ خستۆتەوە (أَوْ عَمْدًا) یان داوای كرد: فڵانكەس بە قەسدی باوكمی كوشتوە. بەڵام (وَوَصَفَهُ بِغَيْرِهِ) كوشنەكەی بە سیفەتی كوشتنی بە هەڵە باس كرد، ئەوە (لَمْ يَبْطُلْ أَصْلُ الدَّعْوَى) بنچینەی داوایەكە بەتاڵ نابێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵكو

بەگوێرەی ڕوونکردنەوەکەی بڕیاری بۆ دەدرێ.
شەشەم: دەبی داوایەکە سەپێنەر بێ، کەواتە: ئەگەر داوای بەخشینی شتێکی کرد، مەرجە بڵێ: شتەکەم بە ئیزنی بەخشەرەکە وەرگرتوە.
(وَتَثْبُتُ الْقَسَامَةُ فِيالْقَتْلِ) سوێندخواردن تەنها لەبارەی کوشتن دەبێ، بەو مەرجەی (بِمَحَلِّ لَوْثٍ) کوشتنەکە لە شوێنی نیشانەیەکی بەهێزدا بێ و نە بە شاهیدو نە بە دانپێداهێنانیش بکوژەکە نەزاندرێ.
(وَهُوَ) مەبەست بە نیشانە: (قَرِينَةٌ لِصِدْقِ الْمُدَّعِي) بەڵگەیەکە بۆ ڕاستگۆیی داواکارەکە (بِأَنْ وُجِدَ قَتِيلٌ فِي مَحَلَّةٍ أَوْ قَرْيَةٍ صَغِيرَةٍ لأَعْدَائِه) وەك کوژراوێك، یان ئەندامێکی کوژراوەکە بدێترێتەوە لە گەڕەکێك، یان لە گوندێکی بچوکی دوژمنەکانی (أَوْ تَفَرَّقَ عَنْهُ جَمْعٌ) یان کۆمەڵێك لە دەورەی کوژراوەکە پەرت ببن.
(وَلَوْ تَقَابَلَ صَفَّانِ لِقِتَالٍ) ئەگەر دوو کۆمەڵ بۆ جەنگ ڕووبەڕووی یەکتر بونەوەو (وَانْكَشَفُوا عَنْ قَتِيلٍ) کوژراوێك لە نێوانیاندا دەرکەوت، ئەوە (فَإِنْ الْتَحَمَ قِتَالٌ) ئەگەر جەنگەکە تێکەڵ بوبێ، یان چەکی هەر ڕیزێك دەگەیشتە ڕیزەکەیتر، ئەو کاتە (فَلَوْثٌ فِي حَقِّ الصَّفِّ الآخَرِ) دەبێتە نیشانە دەرهەق ڕیزەکەیتر: کە دوژمنەکەیەتی (وَإِلاَّ) بەڵام فَفِي حَقِّ صَفِّهِ، وَشَهَادَةُ الْعَدْلِ لَوْثٌ، وَكَذَا عَبِيدٌ أَوْ نِسَاءٌ، وَقِيلَ يُشْتَرَطُ تَفَرُّقُهُمْ، وَقَوْلُ فَسَقَةٍ وَصِبْيَانٍ وَكُفَّارٍ لَوْثٌ فِالأَصَحِّ ، وَلَوْ ظَهَرَ لَوْثٌ فَقَالَ أَحَدُ ابْنَيْهِ: قَتَلَهُ فُلاَنٌ وَكَذَّبَهُ الآخَرُ بَطَلَ اللَّوْثُ، وَفِي قَوْلٍ لاَ، وَقِيلَ لاَ يَبْطُلُ بِتَكْذِيبِ فَاسِقٍ، وَلَوْ قَالَ أَحَدُهُمَا: قَتَلَهُ زَيْدٌ وَمَجْهُولٌ، وَقَالَ الآخَرُ عَمْرٌو وَمَجْهُولٌ حَلَفَ كُلٌّ عَلَى مَنْ عَيَّنَهُ وَلَهُ رُبُعُ الدِّيَةِ، وَلَوْ أَنْكَرَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ اَللَّوْثَ فِي حَقِّهِ فَقَالَ: لَمْ أَكُنْ مَعَ الْمُتَفَرِّقِينَ عَنْهُ،

---

ئەگەر جەنگ تێکەڵ نەبوبێ و چەکی هیچ ڕیزێکیش نەدەگەیشتە ڕیزەکەیتر، ئەو کاتە (فَفِي حَقِّ صَفِّه) دەبێتە نیشانە دەرهەق ڕیزەکەیخۆی.
(وَشَهَادَةُ الْعَدْلِ لَوْثٌ) شاهیدیی یەك دادپەروەر کە بڵێ: (فلانەکەس کوشتی). دەبێتە نیشانە، جا بزانە: ئەگەر بریندارەکە—پێش مردن—گوتی: (فلانەکەس کوشتمی). ئەوە نابێتە نیشانە، بەڵام لە مەزهەبی ئیمام (مالك)دا: گوتەکەی بریندارەکەش دەبێتە نیشانەو کاری پێدەکرێ، هەروەك لە (مغنی)و (البجيرمی)دا فەرموویانە.
(وَكَذَا عَبِيدٌ أَوْ نِسَاءٌ) هەروەها شاهیدیی کۆیلەو ئافرەتانیش کە بڵێن: (فلانکەس کوشتی). دەبێتە نیشانە (وَقِيلَ يُشْتَرَطُ تَفَرُّقُهُمْ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: مەرجە جیا جیا شاهیدیەکە بدەن (وَقَوْلُ فَسَقَةٍ وَصِبْيَانٍ وَكُفَّارٍ لَوْثٌ) قسەی فاسقەکانو منداڵانو کافرانیش نیشانەیە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودی ڕاستتردا.

(وَلَوْ ظَهَرَ لَوْثٌ) ئەگەر لە کوژراوێکدا نیشانەیەك ئاشکرابو (فَقَالَ أَحَدُ ابْنَيْهِ: قَتَلَهُ فُلاَنٌ) ئینجا یەکێك لە دوو کوڕەکانی گوتی: فلاَنکەس باوکمانی کوشت (وَكَذَّبَهُ الآخَرُ) کوڕەکەیتریش وەدرۆی خستنەوەو گوتی: فلاَنکەس نەیکوشتوە. ئەوە (بَطَلَ اللَّوْثُ) نیشانەکە پوچەڵ دەبێو نابێ داواکارەکە سوێند بخوا، بەلاَم لەو حاڵەتەدا بۆی دروستە داوالێکراوەکە سوێند بدا، هەروەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی (وَفِي قَوْلٍ: لاَ) لە فەرموودەیەکدا: نیشانەکە پوچەڵ نابێ (وَقِيلَ: لاَ يَبْطُلُ بِتَكْذِيبِ فَاسِقٍ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بە وەدرۆخستنەوەی فاسق نیشانەکە پوچەڵ نابێ.

(وَلَوْ قَالَ أَحَدُهُمَا: قَتَلَهُ زَيْدٌ وَمَجْهُولٌ) ئەگەر لەگەڵ هەبوونی نیشانەدا کوڕێکیان گوتی: (زەید)و نەناسراوێك باوکمانی کوشت (وَقَالَ الآخَرُ: عَمْرٌو وَمَجْهُولٌ) کوڕەکەیتریش گوتی: (عەمر)و نەناسراوێك باوکمانی کوشت. ئەو کاتە (حَلَفَ كُلٌّ عَلَى مَنْ عَيَّنَهُ) هەر یەکەیان پەنجا سوێند لە سەر ئەو بکوژە دەخوا کە دیاریی کردوە، ئینجا (وَلَهُ رُبُعُ الدِّيَةِ) هەر یەکەشیان چوارێکی خوێنی باوکی هەیە، چونکە واجبی سەر دیارکراوەکەی خۆی نیوەی خوێنەکەیەو بەشی سوێندخۆرەکەش لەو نیوە خوێنە: نیوەیە.

(وَلَوْ أَنْكَرَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ اَللَّوْثَ فِي حَقِّهِ) ئەگەر داوالێکراوەکە نەیسەلماند نیشانەکە دەرهەقی وی بێو (فَقَالَ: لَمْ أَكُنْ مَعَ الْمُتَفَرِّقِينَ عَنْهُ) گوتی: من لەگەڵ پەرتبووەکانی صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، وَلَوْ ظَهَرَ لَوْثٌ بِأَصْلِ قَتْلٍ دُونَ عَمْدٍ وَخَطإٍ فَلاَ قَسَامَةَ فِالأَصَحِّ، وَلاَ يُقْسِمُ فِي طَرَفٍ وَإِتْلاَفِ مَالٍ إلاَّ فِي عَبْدٍ فِي الأَظْهَرِ، وَهِيَ أَنْ يَحْلِفَ الْمُدَّعِي عَلَى قَتْلٍ ادَّعَاهُ خَمْسِينَ يَمِينًا،

---

دەورەی کوژراوەکەدا نەبوم. ئەوە ئەگەر شاهید نەبێ (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ: کە لە گەڵیاندا نەبوە.

(وَلَوْ ظَهَرَ لَوْثٌ بِأَصْلِ قَتْلٍ) ئەگەر نیشانەیەك بۆ بنچینەی کوشتن هەبو، بەلاَم (دُونَ عَمْدٍ وَخَطَإٍ) دیاری نەکرا کوشتنەکە: بە قەسدییە، یان بە هەڵەیە، ئەوە (فَلاَ قَسَامَةَ فِيالأَصَحِّ) لەو حاڵەتەدا سوێندخواردنی کوشتن نابێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە نازانرێ: داوای خوێنەکە لە بکوژەکەی بکرێ، یان لە خزمەکانی، بەلاَم بە فەرموودەی بێهێز: لەو حاڵەتەشدا داواکارەکە سوێندی کوشتن دەخواو، کوشتنەکەش بە هەڵە دادەنرێو خوێنەکەش لە بکوژەکە وەردەگیرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَلاَ يُقْسِمُ فِي طَرَفٍ وَإِتْلاَفِ مَالٍ) نابێ داواکار سوێند بخوا لەبارەی لێکردنەوەی ئەندامو بریندارکردنو فەوتاندنی ماڵ، بەڵکو لەبارەی بریندارکردنو لابردنی ئەندامو سودەکان –ئەگەر داواکارەکە شاهیدی نەبێ– بە پەنجا سوێند باوەڕ بە داوالێکراوەکە دەکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە (إلاَّ فِي عَبْدٍ فِيالأَظْهَرِ) تەنها لەبارەی کوشتنی

کۆیلە گەورەکەی سوێند دەخواو نرخەکەی لە خزمەکانی بکوژەکە وەردەگرێ.

## ﴿ چۆنیەتی سوێندخواردنی کوشتن ﴾

(وَهِيَ) سوێندخواردنی کوشتن–ئەگەر دوو شاهیدی کوشتنەکە نەبن– ئەمەیە: (أَنْ يَحْلِفَ الْمُدَّعِي) لە سەرەتاوە–لەگەڵ هەبوونی نیشانەیەکدا– داواکارەکە سوێند بخوا (عَلَى قَتْلٍ ادَّعَاهُ) لە سەر کوشتنێك کە داوای کردوە (خَمْسِينَ يَمِينًا) پەنجا سوێند بخوا: کە (فلانکەس فلانی کوشتوە). واتە: سودی نیشانەکە هەر ئەوەندەیە: لە سەرەتاوە داواکارەکە پەنجا سوێندەکە دەخوا، بەڵام ئەگەر بکوژەکە دان بە کوشتنەکەدا بێنێ، یان دوو شاهیدی کوشتن هەبن، ئەو کاتە کوشتنەکە ئاشکرا دەبێ و پێویست بەو پەنجا سوێندە ناکا، هەروەك لە دوای ئەم باسە ڕوون کراوەتەوە.

﴿عن سهل ﷺ: أنَّ عبدَاللهِ بن سَهْل وَمُحَيَّصَة بن مَسْعُود أتَيَا خَيْبَرَ، فَقُتِلَ عَبْدُاللهِ وَاتَّهَمُوا الْيَهُودَ، فَقالَتِ الْيَهُودُ: وَاللهِ مَا قَتَلْنَاهُ. فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ–أيْ لأخيهِ وابنَيْ عَمِّهِ–: أَتَسْتَحِقُّونَ قَتِيلَكُمْ بِأَيْمانِ خَمْسِينَ مِنْكُمْ؟ قالُوا: أَمْرٌ لَمْ نَرَهُ. فقال النَّبِيُّ ﷺ: فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ بِأَيْمانِ خَمْسِينَ مِنْهُمْ؟ قالُوا: قَوْمٌ كُفَّارٌ. فَوَدَاهُ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ قِبَلِهِ﴾ رواه الشيخان، وفي رواية للبخاري: ﴿ تَأْتُونَ بِالْبَيِّنَةِ عَلَى مَنْ قَتَلَهُ؟ قالُوا: مَا لَنا بَيِّنَةٌ. قَالَ: أَتَحْلِفُونَ...﴾ الحديث، (عبدالله) لەگەڵ (مُحَيِّصَة) چونە (خيبر)، ئینجا (عبدالله) کوژرا، جوەکانیان تۆمەتبار کردن، جوەکانیش

وَلاَ يُشْتَرَطُ مُوَالاَتُهَا عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ تَخَلَّلَهَا جُنُونٌ أَوْ إِغْمَاءٌ بَنَى، وَلَوْ مَاتَ لَمْ يَبْنِ وَارِثُهُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ كَانَ لِلْقَتِيلِ وَرَثَةٌ وُزِّعَتْ بِحَسَبِ الإِرْثِ وَجُبِرَالْمُنْكَسِرُ، وَفِي قَوْلٍ يَحْلِفُ كُلٌّ خَمْسِينَ، وَلَوْ نَكَلَ أَحَدُهُمَا حَلَفَ الآخَرُ خَمْسِينَ، وَلَوْ غَابَ حَلَفَ الآخَرُ خَمْسِينَ وَأَخَذَ حِصَّتَهُ،

---

گوتیان: ئێمە نەمانکوشتوە. جا پێغەمبەر ﷺ بە براو ماموزایەکانی کوژراوەکەی فەرموو: ئایا شاهیدتتان هەیە کێ کوشتویەتی؟ گوتیان: شاهیدمان نیە. فەرمووی: ئایا ئێوە پەنجا سوێند دەخۆن تاکو مافی خوێنیکوژراوەکەتان هەبێ؟ گوتیان: ئەوە کارێکە بە چاو نەماندیتوە چۆن سوێند دەخۆین. فەرمووی: ئایا جوەکان پەنجا سوێندتان بۆ بخۆن؟ گوتیان: ئەوان کافرن چۆن باوەڕ بە سوێندەکانیان بکەین. جا پێغەمبەر ﷺ لە لای خۆیەوە خوێنی کوژراوەکەی دا، تا خوێنی بە فیڕۆ نەچێ.

(وَلاَ يُشْتَرَطُ مُوَالاَتُهَا) بە مەرج دانانرێ پەنجا سوێندەکان بە دوای یەکتردا بخورێن، بەڵکو دروستە لە پەنجا ڕۆژدا بخورێن (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، کەوابو: (وَلَوْ تَخَلَّلَهَا جُنُونٌ أَوْ إِغْمَاءٌ) ئەگەر شێتی، یان بێهۆشی کەوتە نێوان پەنجا سوێندەکان، ئەوە هەر کاتێك سوێندخۆرەکە چاك بۆوە (بَنَى) لە سەر ڕابردوو سوێندەکان تەواو دەکا، بەڵام (وَلَوْ مَاتَ) ئەگەر سوێندخۆرەکە–پێش

تەواوكردنی پەنجا سوێندەكان– مرد، ئەو كاتە (لَمْ يَبْنِ وَارِثُهُ) نابێ میراتگرەكەی لە سەر سوێندەكانی وی تەواویان بكا، بەڵكو دەبی لە سەرەتاوە دەست بە پەنجا سوێندەكان بكاتـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــەوە

(عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَلَوْ كَانَ لِلْقَتِيلِ وَرَثَةٌ) ئەگەر كوژراوەكە چەند میراتگرێكی هەبون، ئەو كاتە (وُزِّعَتْ بِحَسَبِ الإِرْثِ) پەنجا سوێندەكان بە سەر میراتگرەكانیدا بەش دەكرێن: بەگوێرەی بەشە میراتەكەیان (وَجُبِرَ الْمُنْكَسِرُ) سوێندی شكاویش پڕ دەكرێتەوە:

بۆ وێنە: ئەگەر سێ كوڕ بون هەر یەكەیان حەڤدە سوێندان دەخوا، ئەگەر چلوتۆ كوڕ بن هەریەكەیان دوو سوێندان دەخوا (وَفِي قَوْلٍ: يَحْلِفُ كُلٌّ خَمْسِينَ) لە فەرموودەیەكدا: هەر میراتگرێك پەنجا سوێند دەخوا.

(وَلَوْ نَكَلَ أَحَدُهُمَا) ئەگەر میراتگرێك بەشە سوێندەكانیخۆی نەخواردن، ئەو كاتە (حَلَفَ الآخَرُ خَمْسِينَ) پێویستە میراتگرەكەیتر–بە تەنهایی– پەنجا سوێند بخوا، ئینجا بەشە خوێنی خۆی وەردەگرێ.

(وَ) هەروەها (لَوْ غَابَ) ئەگەر میراتگرێك ئامادە نەبو، یان منداڵ، یان شێت بوو، ئەو كاتەش (حَلَفَ الآخَرُ خَمْسِينَ وَأَخَذَ حِصَّتَهُ) میراتگرە حازرەكە–بە تەنهایی– پەنجا

وَإِلاَّ صَبَرَ لِلْغَائِبِ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّ يَمِينَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ بِلاَ لَوْثٍ، وَالْمَرْدُودَةَ عَلَىالْمُدَّعِي أَوْ عَلَى الْمُدَّعَىعَلَيْهِ مَعَ لَوْثٍ وَالْيَمِينَ مَعَ شَاهِدٍ خَمْسُونَ، وَيَجِبُ بِالْقَسَامَةِ فِي قَتْلِ الْخَطَإِ أَوْ شِبْهِ الْعَمْدِ دِيَةٌ عَلَىالْعَاقِلَةِ، وَفِيالْعَمْدِ عَلَىالْمُقْسَمِ عَلَيْهِ، وَفِيالْقَدِيمِ قِصَاصٌ، وَلَوْ ادَّعَى عَمْدًا بِلَوْثٍ عَلَى ثَلاَثَةٍ حَضَرَ أَحَدُهُمْ أَقْسَمَ عَلَيْهِ خَمْسِينَ

---

سوێند دەخواو هەر ئەودەم بەشە خوێنەكەیخۆی وەردەگرێ، جا هەر كاتێكیش ئەوانیتر حازر بون، ئەوانیش بەشە سوێندەكانی خۆیان دەخۆن، كەواتە: ئەگەر كوڕێكی كوژراوەكە پەنجا سوێندی خواردنو بەشە خوێنەكەیخۆی وەرگرت، ئینجا كوڕێكیتریش هاتەوە، یان بلۆغی بوو، ئەوەش بیستو پێنج سوێندان دەخواو بەشە خوێنەكەیخۆی وەردەگرێ، جا ئەگەر سێیەمەكەش هاتەوە، یان بلۆغی بوو، ئەویش حەڤدە سوێندان دەخواو بەشە خوێنەكەی خۆی وەردەگرێ.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر میراتگرە حازرەكە–بە تەنهایی–پەنجا سوێندی نەخواردن، ئەو كاتە (صَبَرَ لِلْغَائِبِ) با چاوەڕوان بكا، تا نادیارەكە دێتەوەو منداڵەكە بلۆغی دەبیو شێتەكە چاك دەبێتەوەو لەگەڵ ئەوان بەشە سوێندەكانی خۆی بخوا.

(وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (أَنَّ يَمِينَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ بِلاَ لَوْثٍ)

سـوێندی داوالێکـراوی کوشـتنی بێنیشـانەو هـەم سـوێندی داوالێکـراوی برینـدارکردنو لابردنـی ئەنـدامو سـودەکانو هـەم (وَالْمَـرْدُودَةَ عَلَىالْمُـدَّعِي) ئـەو سـوێندەی لـە لایـەن داوالێکراوەکەوە دەگەڕێندرێتەوە بۆ سەر داواکاری کوشتنەکە (أَوْ عَلَـى الْمُدَّعَىعَلَيْـهِ مَـعَ لَوْثٍ) یان لە داواکارەکەوە دەگەڕێندرێتەوە بۆ سەر داوالێکراوی کوشتنی لەگەڵ نیشانەو هەم (وَالْيَمِينَ مَعَ شَاهِدٍ) سوێندی داواکاریش لەگەڵ هەبوونی شاهیدێکی کوشتن، لـە هـەر چوار حاڵەتدا (خَمْسُونَ) پەنجا سوێندن.

بەڵام لێرەدا ئەگەر داوا لێکراوەکانی کوشتن لە یەك زیاتر بـون، ئـەو کاتـەش دەبـی هـەر یەکـەو پـەنجا سـوێند بخـۆن، واتـە: بـە سـەریاندا بـەش نـاکرێن، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَجِبُ بِالْقَسَامَةِ فِي قَتْلِ الْخَطَإِ أَوْ شِبْهِ الْعَمْدِ) بە هۆی پەنجا سوێندەکان لە کوشتنی بە هەڵەو وێنەی بە قەسدیدا واجب دەبێ: (دِيَـةٌ عَلَىالْعَاقِلَـةِ) خـوێنی کوژراوەکـە لـە سـەر خزمـەکانی بکوژەکە. هەم (وَفِيالْعَمْدِ عَلَىالْمُقْسَمِ عَلَيْهِ) لە کوشتنی بە قەسدیشدا خوێنەکە لە سەر بکوژە سوێند لە سەرخوراوەکە واجب دەبێ—نەك تۆڵەکردنەوە— بـە بەڵگـەی حەدیسـەکەیڕابردوو، بەڵام (وَفِيالْقَدِيمِ قِصَاصٌ) لە فەرموودەی کۆندا: تۆڵەکردنەوە واجب دەبێ.

(وَلَوْ ادَّعَى عَمْدًا بِلَوْثٍ عَلَى ثَلَاثَةٍ) ئەگەر داوای کوشتنی بە قەسدیی بە نیشانەی کـرد لـە سەر سێ کەسان: کە (حَضَرَ أَحَدُهُمْ) تەنها یەکێکیان حازر بوو، ئەوە (أَقْسَمَ عَلَيْهِ خَمْسِينَ) وَأَخَذَ ثُلُثَ الدِّيَةِ، فَإِنْ حَضَرَ آخَرُ أَقْسَمَ عَلَيْهِ خَمْسِينَ، وَفِي قَوْلٍ خَمْسًا وَعِشْرِينَ إِنْ لَمْ يَكُنْ ذَكَرَهُ فِىالأَيْمَانِ، وَإِلاَّ فَيَنْبَغِىالاكْتِفَاءُ بِهَا بِنَاءً عَلَى صِحَّةِالْقَسَامَةِ فِي غَيْبَةِ الْمُدَّعىعَلَيْهِ وَهُوَ الأَصَحُّ، وَمَنْ اِسْتَحَقَّ بَدَلَ الدَّمِ أَقْسَمَ وَلَوْ مُكَاتَبًا لِقَتْلِ عَبْدِهِ، وَمَنْ اِرْتَدَّ فَالأَفْضَلُ تَأْخِيرُ أَقْسَامِهِ لِيُسْلِمَ، فَإِنْ أَقْسَمَ فِىالرِّدَّةِ صَحَّ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَمَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ لاَ قَسَامَةَ فِيهِ.

---

پـەنجا سـوێند لـە سـەر حازرەکـە دەخـواو (وَأَخَـذَ ثُلُـثَ الدِّيَـةِ) سـێیەکی خوێنەکـەی لێوەردەگرێ (فَإِنْ حَضَرَ آخَرُ) جا ئەگەر دووەمەکەش حازر بـوو، ئـەوەش (أَقْسَـمَ عَلَيْـهِ خَمْسِينَ) پەنجا سوێندیتری لە سەر دەخواو سێیەکێکیتری خوێنەکەش لەوی وەردەگرێ، سێیەمەکەش هەر بەو جۆرەیە (وَفِي قَوْلٍ: خَمْسًا وَعِشْرِينَ) لـە فەرموودەیەکدا: بیسـتو پێنج سوێند لە سەر دووەمەکە دەخوا.

جا بەو مەرجە سوێند لە سەر دووەمەکەش دەخوا: (إِنْ لَمْ يَكُنْ ذَكَرَهُ فِيالأَيْمَانِ) ئەگەر لە پەنجا سوێندەکاندا ناوی دووەمەکەی نەهێنابێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لە سوێندەکاندا نـاوی دووەمەکـەو سـێیەمەکەی هێنابـێ، ئـەو کاتـە (فَيَنْبَغِيالاكْتِفَـاءُ بِهَـا) پێویسـتە پـەنجا سوێندەکان بۆ هەرسێکیان بەس بنو دووبارە سوێند نەخواتەوە (بِنَاءً عَلَى صِحَّةِ الْقَسَامَةِ

فِي غَيْبَةِ الْمُدَّعَى‌عَلَيْهِ) لە سەر ئەو فەرموودەیەی سوێندخواردنەکە لە حاڵەتی دیارنەبوونی داوالێکراوەکەش دروست دەکا (وَهُوَ الأَصَحُّ) ئەو فەرموودەیەش ڕاسترە.

(وَمَنْ اسْتَحَقَّ بَدَلَ الدَّمِ أَقْسَمَ) هەر کەسێك مافی خوێن وەرگرتنی هەبێ ئەو سوێندەکان دەخوا، هەر چەند کافریش بێ، هەم (وَلَوْ مُكَاتَبًا لِقَتْلِ عَبْدِهِ) هەر چەند خاوەن مافەکەش نوسراوپێدراوێك بێ بۆ کوشتنی کۆیلەکەی خۆی سوێند دەخوا.

(وَمَنْ إِرْتَدَّ) ئەگەر میراتێك لە دوای کوژرانی خزمەکەی کافر ببێ، ئەوە (فَالأَفْضَلُ تَأْخِيرُ أَقْسَامِهِ لِيُسْلِمَ) وەها باشترە سوێندەکانی دوا بێخرێن تا دەبێتەوە موسوڵمان (فَإِنْ أَقْسَمَ فِي‌الرِّدَّةِ) جا ئەگەر لەحاڵەتی کافربووندا سوێندەکانی خواردن (صَحَّ عَلَى‌الْمَذْهَبِ) سوێندەکانی دورست دەبن‌و خوێنی کوژراوەکەی وەردەگرێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە لە حەدیسەکەی‌ڕابردوودا پێغەمبەرﷺ سوێندەکانی جولەکەکانی بە دروستبوو دانان.

(وَمَنْ لا وَارِثَ لَهُ) ئەگەر کوژراوێك هیچ میراتگرێکی نەبێ (لاَقَسَامَةَ فِيهِ) سوێندخواردنەکانیش لە کوشتنەکەی‌دا نیە، هەرچەند نیشانەش هەبێ، چونکە ناکرێ (بیت المال) سوێند بخوا، کەوابو: قازی داواکارێك دادەنێ تاکو داوالێکراوەکە سوێند بدا، جا ئەگەر داوالێکراوەکە سوێندی نەخوارد، ئەو کاتە بەند دەکرێ تا سوێند دەخوا، یان دان بە کوشتنەکەدا دێنێ، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَصْلٌ) إِنَّمَا يَثْبُتُ مُوجِبُ الْقِصَاصِ بِإِقْرَارٍ أَوْ عَدْلَيْنِ، وَالْمَالِ بِذَلِكَ أَوْ بِرَجُلٍ وَامْرَأَتَيْنِ أَوْ وَيَمِينٍ، وَلَوْ عَفَا عَنِ الْقِصَاصِ لِيُقْبَلَ لِلْمَالِ رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ لَمْ يُقْبَلْ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ شَهِدَ هُوَ وَهُمَا بِهَاشِمَةٍ قَبْلَهَا إِيضَاحٌ لَمْ يَجِبْ أَرْشُهَا عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلْيُصَرِّحِ الشَّاهِدُ بِالْمُدَّعَى، فَلَوْ قَالَ: ضَرَبَهُ بِسَيْفٍ فَجَرَحَهُ فَمَاتَ، لَمْ يَثْبُتْ حَتَّى يَقُولَ فَمَاتَ مِنْهُ أَوْ فَقَتَلَهُ، وَلَوْ قَالَ ضَرَبَ رَأْسَهُ فَأَدْمَاهُ أَوْ فَأَسَالَ دَمَهُ ثَبَتَتْ دَامِيَةٌ،

---

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئاشکراکردنی کوشتن‌و تاوانەکانی‌تر ﴾

(إِنَّمَا يَثْبُتُ مُوجِبُ الْقِصَاصِ) ئەو تاوانەی تۆڵەکردنەوە واجب دەکا: وەك کوشتنی بە قەسدی‌و بریندارکردن‌و لابردنی ئەندام‌و سودەکان بە قەسدی، گشتی ئاشکرا دەبێ: (بِإِقْرَارٍ أَوْ عَدْلَيْنِ) بە دانپێداهێنانی تاوانکارەکە، یان بە شاهیدی دوو پیاوی‌دادپەروەر.

(وَالْمَالِ) ئەو تاوانەش کە خوێن واجب دەکا: وەك کوشتنی بە هەڵە‌و وێنەی بە قەسدی‌و تاوانەکانی‌تری بە هەڵە، ئەوەش ئاشکرا دەبێ: (بِذَلِكَ) بە دانپێداهێنانی تاوانکارەکە، یان بە شاهیدی دوو پیاوی‌دادپەروەر (أَوْ بِرَجُلٍ وَامْرَأَتَيْنِ) یان بە شاهیدی پیاوێك‌و دوو ئافرەت (أَوْ وَيَمِينٍ) یان بە شاهیدی پیاوێك‌و پەنجا سوێندی داواکار.

(وَلَوْ عَفَا عَنِ الْقِصَاصِ) ئەگەر خاوەن مافەکە تاوانکارەکەی لە تۆڵەکردنەوە عەفو کرد (لِيُقْبَلَ لِلْمَالِ رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ) تاکو بۆ خوێن واجببوون شاهیدیی پیاوێكو دوو ئافرەت قبول بکرێ، ئەوە (لَمْ يُقْبَلْ فِيالأَصَحِّ) لێی قبول ناکرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەوابو: (وَلَوْ شَهِدَ هُوَ وَهُمَا) ئەگەر پیاوێكو دوو ئافرەت شاهیدییان دا (بِهَاشِمَةٍ قَبْلَهَا إِيضَاحٌ) بە برینێکی ئێسقانشکێن کە برینێکی ئاشکراکەری لە پێشدا بێ (لَمْ يَجِبْ أَرْشُهَا) خوێنی ئێسقانشکێنەکە واجب نابێ (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە ئاشکراکەرەکە تۆڵە واجب دەکاو بە پیاوێكو دوو ئافرەت ئاشکرا نابێ، تاوانی هەردوو برینەکەش یەك تاوانە.

(وَلْيُصَرِّحِ الشَّاهِدُ بِالْمُدَّعَى) واجبە شاهیدەکە بە ئاشکرایی تاوانە داواکراوکە بڵێ، کەواتە: (فَلَوْ قَالَ) ئەگەر شاهیدەکە گوتی: (ضَرَبَهُ بِسَيْفٍ فَجَرَحَهُ فَمَاتَ) شاهیدی دەدەم: (تاوانکارەکە بە شمشێر لێیداو بریندارى کردو مرد). ئەوە (لَمْ يَثْبُتْ) کوشتنەکە بەو شاهیدیە ئاشکرا نابێ (حَتَّى يَقُولَ: فَمَاتَ مِنْهُ أَوْ فَقَتَلَهُ) تا شاهیدەکە دەڵێ: (بەو برینە مرد). یان دەڵێ: (لێیداو کوشتی). یان دەڵێ: (شاهیدی دەدەم ئەو تاوانکارە کوشتی).

(وَلَوْ قَالَ: ضَرَبَ رَأْسَهُ فَأَدْمَاهُ أَوْ فَأَسَالَ دَمَهُ) ئەگەر شاهیدەکە گوتی: (لە سەریدا و خوێنی لێهێنا). یان: (خوێنی لێڕژاند). ئەو کاتە (ثَبَتَتْ دَامِيَةٌ) برینێکی خوێنڕژاو ئاشکرا دەبێ.

وَيُشْتَرَطُ لِمُوضِحَةٍ: ضَرَبَهُ فَأَوْضَحَ عَظْمَ رَأْسِهِ. وَقِيلَ يَكْفِي فَأَوْضَحَ رَأْسَهُ، وَيَجِبُ بَيَانُ مَحَلِّهَا وَقَدْرِهَا لِيُمْكِنَ الْقِصَاصُ، وَيَثْبُتُ الْقَتْلُ بِالسِّحْرِ بِإِقْرَارٍ بِهِ، لاَ بِبَيِّنَةٍ، وَلَوْ شَهِدَ لِمُوَرِّثِهِ بِجُرْحٍ قَبْلَ الإِنْدِمَالِ لَمْ تُقْبَلْ، وَبَعْدَهُ يُقْبَلُ وَكَذَا بِمَالٍ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ فِالأَصَحِّ، وَلاَ تُقْبَلُ شَهَادَةُ الْعَاقِلَةِ بِفِسْقِ شُهُودِ قَتْلٍ يَحْمِلُونَهُ، وَلَوْ شَهِدَ اِثْنَانِ عَلَى اِثْنَيْنِ بِقَتْلِهِ فَشَهِدَا عَلَى الأَوَّلَيْنِ بِقَتْلِهِ فَإِنْ صَدَّقَ الْوَلِيُّ الأَوَّلَيْنِ حُكِمَ بِهِمَا،

---

(وَيُشْتَرَطُ لِمُوضِحَةٍ) بە مەرج دادەندرێ بۆ ئاشکراکردنی برینێکی ئاشکراکەر بڵێ: (ضَرَبَهُ فَأَوْضَحَ عَظْمَ رَأْسِهِ) تاوانکارە کە لێیداو بریندارى کردو ئێسقانی سەری ئاشکرا کرد (وَقِيلَ: يَكْفِي فَأَوْضَحَ رَأْسَهُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا بەسە بڵێ: برینێکی ئاشکراکەری لە سەری کرد (وَيَجِبُ بَيَانُ مَحَلِّهَا وَقَدْرِهَا) واجبە شوێنی برینەکەو ئەندازەکەشی ڕوون بکاتەوە (لِيُمْكِنَ الْقِصَاصُ) تاکو تۆڵەکردنەوەکە بگونجێ (وَيَثْبُتُ الْقَتْلُ بِالسِّحْرِ) کوشتنی بە هۆی سیحرلێکردن ئاشکرا دەبێ: (بِإِقْرَارٍ بِهِ) بە دانپێداهێنانی سیحربازەکە (لاَ بِبَيِّنَةٍ) نەك بە شاهید، چونکە شاهیدەکە مەبەستی سیحربازکە نابینێ.

(وَلَوْ شَهِدَ لِمُوَرِّثِهِ) ئەگەر میراتگرێك شـاهیدیی بـۆ میراتدەرەکـەی خۆیدا: (بِجُـرْحٍ قَبْـلَ الإِنْدِمَالِ) بە برینێك پێش چاکبوونەوەی برینەکە، ئـەوە (لَـمْ تُقْبَـلْ) شـاهیدیەکەی قبـوڵ نـاکرێ، چـونکە تۆمـەتی ئـەوەی لێـدەکرێ: ئەگـەر میراتدەرەکـە بـەو برینـە بمـرێ، خوێنەکـەی—بـە مـیرات— بـۆ شـاهیدەکە دەمێنێتـەوە، بـەلام (وَبَعْـدَهُ يُقْبَـلُ) لـە دوای چاکبوونەوەی برینەکە شاهیدیەکەی قبوڵ دەکرێ، چونکە ئەو تۆمەتەی لێناکرێ.

(وَكَذَا) هەروەها شاهیدی میراتگرەکە قبوڵ دەکرێ (بِمَالٍ فِى مَرَضِ مَوْتِـهِ) بـە ماڵێـك بـۆ میراتدەرەکەی لە نەخۆشیی مردنیدا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە هـەر ئێستا نەخۆشەکە دەتوانی دەستکاری ماڵەکەی بکا.

(وَلاَ تُقْبَلُ شَهَادَةُ الْعَاقِلَةِ) شاهیدیی خزمەکان بکوژەکە قبوڵ ناکرێ: (بِفِسْـقِ شُـهُودِ قَتْـلٍ يَحْمِلُونَهُ) کە بڵێن: شاهیدەکانی کوشتن فاسقن. لەو حاڵەتەی خوێنی کوشتنەکە لە سـەر خزمەکان بێ، چونکە تۆمەتی ئەوەی لێدەکرێ: خوێنەکە لە سەر خۆیان لابدەن.

(وَلَوْ شَهِدَ اثْنَانِ عَلَى اثْنَيْنِ بِقَتْلِهِ) ئەگەر دوو پیاو شاهیدییان دا لە سەر دوو پیاویتر: ئەو دووانە فلانکەسیان کوشتوە (فَشَهِدَا عَلَى الأَوَّلَيْنِ بِقَتْلِهِ) ئینجا دوو پیاوەکەش شاهیدییان دا لـە سـەر دوو شـاهیدەکەیەکەم: ئـەو دوو شـاهیدانە فلانکەسـەیان کوشـتوە. یـان شاهیدییاندا: کەسێکیتر کوشتویەتی. ئەوە (فَإِنْ صَدَّقَ الْوَلِيُّ الأَوَّلَيْنِ) ئەگـەر میراتگـری کوژراوەکـە هـەر دوو شـاهیدەکانییەکەمی بـە ڕاسـتگۆ دانـان، ئـەو کاتـە (حُكِمَ بِهِمَـا) بە شاهیدەکانییەکەم بڕیـار دەدرێ، چونکە شـاهیدیەکەیان تۆمـەتی تـێدا نیـە، بـەلام

أَوِ الآخَرَيْنِ أَوِ الْجَمِيعَ أَوْ كَذَّبَ الْجَمِيعَ بَطَلَتَا، وَلَوْ أَقَرَّ بَعْضُ الْوَرَثَةِ بِعَفْوِ بَعْضٍ سَقَطَ الْقِصَاصُ، وَلَوْ اِخْتَلَفَ شَاهِدَانِ فِي زَمَانٍ أَوْ مَكَانٍ أَوْ آلَةٍ أَوْ هَيْئَةٍ لَغَتْ، وَقِيلَ لَوْثٌ.

## (كِتَابُ الْبُغَاةِ)

هُمْ مُخَالِفُو الإِمَامِ بِخُرُوجٍ عَلَيْهِ وَتَرْكِ الإِنْقِيَادِ أَوْ مَنْعِ حَقٍّ تَوَجَّهَ عَلَيْهِمْ بِشَرْطِ شَوْكَةٍ لَهُمْ وَتَأْوِيلٍ وَمُطَاعٍ فِيهِمْ، قِيلَ وَإِمَامٌ مَنْصُوبٌ،

---

(أَوْ الآخَرَيْنِ أَوِ الْجَمِيعَ) ئەگەر شاهیدەکانیدووەمی بە ڕاستگۆ دانان، یان یەکەمو دووەمی بە ڕاستگۆ دانان (أَوْ كَذَّبَ الْجَمِيعَ) یان گشتیان بـە درۆزن دانـان، ئـەو کاتـە (بَطَلَتَـا) لـە هەرسێك مەسەلەدا شاهیدیەکەی گشتیان بەتاڵ دەبێتەوە.

(وَلَوْ أَقَرَّ بَعْضُ الْوَرَثَةِ بِعَفْوِ بَعْضٍ) ئەگەر میراتگرێك دان بێنێ بە عەفوکردنی بکوژەکە لە تۆڵەکردنەوە (سَقَطَ الْقِصَاصُ) تۆڵەکردنەوە لە سەر بکوژەکە لادەکەوێو خوێنی لە سەر واجب دەبێ (وَلَوْ اخْتَلَفَ شَاهِدَانِ) ئەگەر دوو شاهیدەکان جیاوازییان بوو: (فِـى زَمَـانٍ أَوْ مَكَانٍ أَوْ آلَةٍ أَوْ هَيْئَةٍ) لە کاتی تاوانەکە، یان لە شوێنەکەی، یان لە کەرەستەکەی، یان لە چـۆنیەتیەکەی (لَغَـتْ) شـاهیدی هەردووکیان پوچەڵ دەبێ (وَقِيـلَ لَـوْثٌ) لـە

فەرموودەیەکی بێهێزدا: شاهیدیەکەیان دەبێتە نیشانەی کوشتنو میراتگرەکە پەنجا سوێند دەخوا.

﴿ كِتَابُ الْبُغَاةِ: **پەرتوکی یاخیبووەکان** ﴾

واتە: لەفەرماندەرچووەکان (هُمْ) یاخیبووەکان: کۆمەڵە موسوڵمانێکن ملکەچی شەریعەتی ئیسلامن، بەڵام (مُخَالِفُوالإِمَامِ) دژ بە پێشەوای موسوڵمانانن (بِخُرُوجٍ عَلَيْهِ) بەوەی لە دژی پێشەوایەکە ڕاپەڕنو (وَتَرْكِ الإِنْقِيَادِ لَهُ) واز لە گوێڕایەڵی بۆ پێشەوایەکە بێنن، هەرچەند پێشەوایەکەش ستەمکار بێ (أَوْ مَنْعِ حَقٍّ تَوَجَّهَ عَلَيْهِمْ) یان مافێکی شەرعیان لە سەر بێو لە پێشەوایەکە قەدەغەی بکەنو نەیدەنێ: وەکو زەکاتو تۆڵە لێکردنەوەو سزای تاوانەکان.

جا ئەو دژانەش کە بە یاخیبوو دادەندرێن (بِشَرْطِ شَوْكَةٍ لَهُمْ) بەو مەرجەی هێزو توانایەکی وەهایان هەبێ: نەگونجێ بە ئاسانی بگەڕێندرێنەوە ژێر گوێڕایەڵی پێشەوای موسوڵمانان، هەم (وَتَأْوِيلٍ) بەو مەرجەش بەڵگەیەکی گونجاویان هەبێ: کە بە هۆی ئەو بەڵگەیە باوەڕیان وابێ: یاخیبوونەکەیان دروستە، هەم (وَمُطَاعٍ فِيهِمْ) بەو مەرجەش سەرکردەیەکیشیان هەبێو بە فەرمانی وی بجولێنەوە (قِيلَ: وَإِمَامٌ مَنْصُوبٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا مەرجە: سەرکردەکەیان پێشەوایەکی داندراوی خۆیان بێ.

جا بزانە: بڕیارەکانی ئەم باسە لە بارەی موسوڵمانەکانی یاخیبووە، نەك کافرەکان، چونکە ئەگەر کۆمەڵێك کافر ببنو لە دژی پێشەوای موسوڵمانان ڕاپەڕن، ئەوان لە گشت حاڵەتێکدا دەکوژرێنو داوای تۆبەشیان لێناکرێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

وَلَوْ أَظْهَرَ قَوْمٌ رَأْيَ الْخَوَارِجِ كَتَرْكِ الْجَمَاعَاتِ وَتَكْفِيرِ ذِي كَبِيرَةٍ وَلَمْ يُقَاتِلُوا تُرِكُوا،

---

﴿ **باسی** (خَوارِج) ﴾

(خَوارِج) گروهێکن لە (أَهْلِ الْبِدْعَةِ وَالضَّلاَلَةِ)، لە سەردەمی ئیمامی(علیﷺ) لە کۆمەڵی (أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ) دەرچوونو لە دژی ئیمامی(علیﷺ) جەنگیان دەکردو جگە لە خۆیشیان گشت موسوڵمانەکانیتریان بە کافر دادانو دروشمی (لاَ حُكْمَ إلاَّ لِلَّهِ)یان بەرز کردەوە، واتە: بڕیاردان تەنها بۆ خودایە. جا ئیمامی(عليﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی: (كَلِمَةُ حَقٍّ أُرِيدَ بِهَا بَاطِلٌ) دروشمەکە ووشەیەکی ڕاستەو مەبەست بەو ووشەیە کارێکی ناڕەوایە. ئینجا ئیمامی (علی) فەرمووی: ﴿لَكُمْ عَلَيْنَا ثَلاَثٌ: لاَ نَمْنَعُكُمْ مَسَاجِدَاللهِ أَنْ تَذْكُرُوهُ فِيها، وَلاَ نَمْنَعُكُمُ الْفَيْءَ مَا دامَتْ أَيْدِيكُمْ مَعَنَا، وَلاَ نَبْدَأُكُمْ بِقِتَالٍ﴾ سێ مافتان لە سەر ئێمەیە: لە مزگەوتەکانی خوا قەدەغەتان ناکەین خواپەرستیو زیکری خوای تێدا بکەن، لە دەستکەوتووی کافرانیش قەدەغەتان ناکەین تا ئێوە لەگەڵ ئێمەدا بن، ئێمە دەست بە جەنگی ئێوە ناکەین تا ئێوە دەست پێدەکەن. هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا گێڕدراوەتەوە. جا لە ئەنجامدا (خَوارِج) دەستیان بە جەنگ کردو ئیمامی (علی) بە دەستی ئەوان شەهید کرا.

جا بزانە: ئێستاش چەند گرۆهێكی (أَهْلِ الْبِدعَـة) لـە نـاو موسـوڵمانانـدا هەنـە، بـيرو ڕای (خَوارِج) ئاشكرا دەكەن: وەكو (وَهابِي)و (سَلَفِي)و (لاَمَذْهَبِي)، منيش لـە ڕوونكردنـەوەی (العقيـدة الطحاويـة)و لـە (گـوڵزاری ئيسـلام)دا نيشـانەكانی (خـوارج)م ڕوون كردونـەوە، بيانخوێنەوە، تاكو بيانناسی.

ئينجا (وَلَوْ أَظْهَرَ قَوْمٌ رَأْيَ الْخَوَارِجِ) ئەگەر كۆمەڵێك بيروڕای (خوارج)ەكانيان ئاشكرا كرد: (كَتَرْكِ الْجَمَاعَاتِ) وەكو وازهێنان لە نوێژكردنی بە جەماعەت؟ چونكە بە بۆچونی ئەوان: بە هۆی ئاشكراكردنی گوناهەكان، (دارُالإسْلام) بووەتە (دارُالْكُفر)و پێشەوايەكانيش كـافرن‌و نوێژيان لە دوا ناكەن، هەم (وَتَكْفِيرِ ذِی كَبِيرَةٍ) وەكو بە كافردانانی خاوەن گوناهی گەورەو بە گومراداناني زانايـانی (أَهْلِ السُّـنَّة)و...چـەند بيروبۆچـونێكیتری پوچـەڵ (وَ) لەگـەڵ ئەوەشدا (لَمْ يُقَاتِلُوا) جەنگيان نەدەكردو هەر لە بەر دەستی (أهل السُّنَة)شدا بون، ئەوانە (تُرِكُـوا) وازيـان لێدەهێنـدرێ‌و ڕووبـەڕوويان نابينـەوە، بـە بەڵگـەی فەرموودەكـەی ئيمامی(علي)ی‌ڕابردوو.

جا ئەگەر كۆمەڵەكە جەنگيان نـەدەكرد، بـەڵام زەرەريـان هـەبوو–وەكـو پەرتـەوازەيی‌و ملمڵانـەی نـاو مزگەوتـەكان‌و گومـان خسـتنە نـاو دڵـی خـەڵك– ئـەو كاتـە ڕووبـەڕوويان دەبينەوە، هەر چەند بە كوشتنيش بێ، هەروەها ئەگەر جنێويان دەدا هەنـدێك پێشـەواو زانايـانی (أهـل السـنة)، ئـەو كاتـە تـەمبێ دەكـرێن، هـەروەك لـە (تحفـة)و (نهايـة)و حاشيەكانياندا فەرموويانە.

وَإِلاَّ فَقُطَّاعُ طَرِيـقٍ، وَتُقْبَـلُ شَـهَادَةُ الْبُغَـاةِ وَقَضَـاءُ قَاضِـيهِمْ فِيمَـا يُقْبَـلُ قَضَـاءُ قَاضِـينَا إلاَّ أَنْ يَسْـتَحِلَّ دِمَاءَنَـا، وَيَنْفُذُ كِتَابُـهُ بِـالْحُكْمِ وَيُحْكَـمُ بِكِتَابِـهِ بِسَـمَاعِ الْبَيِّنَـةِ فِـالأَصَـحِّ، وَلَوْ أَقَامُوا حَـدًّا وَأَخَـذُوا زَكَـاةً وَخَرَاجًا وَجِزْيَةً وَفَرَّقُوا سَـهْمَ الْمُرْتَزِقَةِ عَلَى جُنْدِهِمْ صَـحَّ، وَفِـالأَخِيرِ وَجْـهٌ، وَمَـا أَتْلَفَـهُ بَـاغٍ عَلَـى عَـادِلٍ وَعَكْسُـهُ إنْ لَـمْ يَكُـنْ فِـي قِتَـالٍ ضَـمِنَ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَفِي قَوْلٍ يَضْمَنُ الْبَاغِي،

---

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر جەنگيان دەكرد، يان لە بەردەستی (أهل السنة)دا نەبون، ئەو كاتە بە ياخیبوو دادەندرێن، بەڵكو (فَقُطَّاعُ طَرِيـقٍ) وەكـو ڕێگرەكـان بڕياريـان لـە سـەر دەدرێ‌و لەتۆڵەی كوژراوەكانی (أهل السنه) دەكوشترێنەوە.

(وَتُقْبَلُ شَهَادَةُ الْبُغَاةِ) شاهيدیی ياخیبووەكان قبوڵ دەكرێ، چونكە فاسق نين (وَقَضَاءُ قَاضِيهِمْ) هەم بڕياری قازيشيان قبوڵ دەكرێ (فِيمَا يُقْبَلُ قَضَاءُ قَاضِينَا) لەو بڕيارانەدا كە بڕياری قازیی ئێمەی تـێدا قبـوڵ دەكـرێ، كـە واتـە: ئەگـەر بڕيارەكـەی دژ بـە دەققـی قورئان، يان حەديس، يان (إجماع)ی‌زانايان، يان (قياس)ێكی ئاشكرا بوو، ئەو كاتە قبوڵ

ناكرێ (إِلاَّ أَنْ يَسْتَحِلَّ دِمَاءَنَا) تەنها ئەگەر شاهیدەکە، یان قازیەکە خوێن‌و ماڵی ئێمە–بە ناهەق– بە حەڵاڵ بزانێ، ئەو کاتە شاهیدی‌و بڕیارەکانی قبوڵ ناکرێ.

(وَيَنْفُذُ كِتَابُهُ بِالْحُكْمِ) نووسراوی قازیی یاخیبووەکان کە بڕیـاری تێدابـێ، جـێ بـەجێ دەکرێ، هەم (وَيُحْكَمُ بِكِتَابِهِ بِسَمَاعِ الْبَيِّنَةِ) بڕیاریش بە نووسراوەکەی قازییان دەدرێ کە گوێ‌لێبوونی شاهیدەکانی تێدابێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ أَقَامُوا حَدًّا) ئەگەر یاخیبووەکان سزای تاوانێکیان دابـو: وەك دارکـاریی زیناکـەرو لێکردنەوەی دەستی دز، هەم (وَأَخَذُوا زَكَاةً وَخَرَاجًا وَجِزْيَةً) زەکات‌و خەرجیەو سەرانەشیان وەرگرتبـو، هـەم (وَفَرَّقُـوا سَـهْمَ الْمُرْتَزِقَـةِ عَلَـى جُنْـدِهِمْ) لـە (بیـت المـال) موچـەیان بـە سـەر سـەربازەکانی خۆیانـدا بـەش کردبـو، ئەوانـە گشـتی(صَـحَّ) دروسـت بـووەو هەڵناوەشێندرێتەوە (وَفِيالأَخِيرِ وَجْهٌ) لەبارەی بەشکردنی موچەکە فەرموودەیەکی بێ‌هێز هەیە: کە دروست نەبوبێ.

(وَمَا أَتْلَفَهُ بَاغٍ عَلَى عَادِلٍ وَعَكْسُـهُ) هـەر شـتێك یاخیبووێك بیفـەوتێنێ لـە گیـان‌و مـاڵی مرۆڤێکی گوێڕایەڵی پێشەوا، یان بە پێچەوانەوە: گوێڕایەڵێك گیان‌و مـاڵێکی یاخیبووێك بفەوتێنێ، ئەوە (إِنْ لَمْ يَكُنْ فِي قِتَالٍ) ئەگەر فەوتاندنەکە لە حاڵەتی جەنگدا نەبێ (ضَمِنَ) فەوتێنەرەکە دەبێتە زامین لە هەردوو مەسەلەدا (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر فەوتاندنەکە لە حاڵەتی جەنگدا بێ (فَلاَ) هیچ زامینی واجب نابێ (وَفِي قَوْلٍ: يَضْمَنُ الْبَاغِي) لـە فەرموودەیەکـدا: یاخیبووەکە دەبێتە زامین.

منهاج– بەرگی‌پێنجەم–7

وَالْمُتَـــأَوِّلُ بِـــلاَ شَـــوْكَةٍ يَضْـــمَنُ، وَعَكْ
حَتَّـــى يَبْعَـــثَ إِلَـــيْهِمْ أَمِينًـــا فَطِنًـــا نَا [illegible]
فَإِنْ ذَكَرُوا مَظْلِمَةً أَوْ شُبْهَةً أَزَالَهَا، فَإِنْ أَصَرُّوا نَصَحَهُمْ ثُمَّ آذَنَهُمْ بِالْقِتَالِ،

---

(وَالْمُتَأَوِّلُ بِلاَ شَوْكَةٍ) ئەو موسوڵمانە یاخیبووەی بەڵگەیەکی هەیە بەڵام بەخۆی هێزو تواناى نیە، ئەمە وەکو یاخیبووەکان بڕیاری بۆ نـادرێ، کـەوابو (يَضْـمَنُ) دەبێتـە زامینـی گشـت گیان‌و ماڵێکی کە دەیفەوتێنێ (وَعَكْسُهُ كَبَاغٍ) ئەو موسوڵمانەش کە بـە پێچـەوانەوە هێـزی هەیەو بێ‌بەڵگەیە، وەکو یاخیبووەکان بڕیاری بۆ دەدرێ‌و لە حاڵەتی جەنگدا نابێتە زامین.

بەڵام ئەگەر کۆمەڵێك کافر بن‌و هێزو تواناشیان هـەبێ، ئەوانـە وەکـو ڕێگرەکـان دەبنـە زامینی هەر گیان‌و ماڵێکی بیفەوتێنن، هەر چەند تۆبەش بکەن‌و ببنەوە موسوڵمان، چونکە تاوانیـان کردۆتـە سـەر ئایینی‌ئیسـلام، هـەروەك–بـە پێچـەوانەی (نهايـة)– لـە (تحفـة)و (مغنى)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: بە (إجماع)ی (صحابة)ی پێغەمبەرﷺ لە سەر پێشەواو موسـوڵمانان واجبـە:

جەنگ لە دژی یاخیبووەکانو لە دژی ئەو کەسانەش بکەن کە ڕەفتار بە شەریعەتی ئیسلام ناکەن: وەکو زەکات نەدەرەکان، هەروەك ئیمامی(أبوبكر)و ئیمامی(علي)و (صحابة)کانیتری پێغەمبەرﷺ جەنگیان لە دژ کردون رضيالله عنهم.

بەڵام (وَلاَ يُقَاتِلُ الْبُغَاةَ) نابێ پێشەوا جەنگ لە دژی یاخیبووەکان بکا (حَتَّى يَبْعَثَ إِلَيْهِمْ أَمِينًا فَطِنًا نَاصِحًا) تا پیاوێکی دادپەروەری زیرەکی ئامۆژگاریکەر دەنێرێتە لایان (يَسْأَلُهُمْ مَا يَنْقِمُونَ) لێیان بپرسێ ئایا چ ڕەخنەیەکیان لە پێشەوایەکە هەیە؟ چونکە ئیمامی(علی)ﷺ (إبن عباس)ی رضيالله عنهما ناردە لای (خَوَارِج)ەکانو ئامۆژگاریی کردنو هەندێکیان گەڕانەوە ژێر گوێڕایەڵیی ئیمامی(علی)ﷺ).

ئینجا (فَإِنْ ذَكَرُوا مَظْلِمَةً أَوْ شُبْهَةً) ئەگەر یاخیبووەکان باسی ستەمێك، یان گومانێکیان کرد (أَزَالَهَا) واجبە: پێشەوا ستەمەکەو گومانەکە لاببا (فَإِنْ أَصَرُّوا) جا ئەگەر لە دوای لادانەکەش یاخیبووەکان هەر سووڕ بون لە سەر یاخیبوونەکەیان (نَصَحَهُمْ) سوننەتە نێردراوەکە ئامۆژگارییان بکا (ثُمَّ) ئینجا ئەگەر لە دوای ئامۆژگارییەکەش هەر سووڕ بون، ئەو کاتە (آذَنَهُمْ بِالْقِتَالِ) ئاگادریان دەکاتەوە بۆ جەنگکردن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِاللهِ﴾ ئەگەر دوو کۆمەڵ لە ئیمانداران جەنگیان لە دژی یەکتری کرد، ئاشتیان بکەنەوە، جا ئەگەر یەکێکیان هەر سووڕ بوو و دەستدرێژیی لە سنور دەرچو، ئێوە جەنگی لە دژ بکەن تا دەگەڕێتەوە ژێر فەرمانی خوا.

فَإِنْ اِسْتَمْهَلُوا اِجْتَهَدَ وَفَعَلَ مَا رَآهُ صَوابًا، وَلاَ يُقَاتِلُ مُدْبِرَهُمْ وَلاَ مُثْخَنَهُمْ وَأَسِيرَهُمْ، وَلاَ يُطْلَقُ وَإِنْ كَانَ صَبِيًّا وَاِمْرَأَةً حَتَّى تَنْقَضِيَ الْحَرْبُ وَيَتَفَرَّقَ جَمْعُهُمْ إلاَّ أَنْ يُطِيعَ بِاِخْتِيَارِهِ،

---

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر یاخیبووەکان ڕەخنەیان ئەوە بوو: پێشەوایەکە ڕەفتار بە شەریعەتی ئیسلام ناکاو (بِدْعَة)و تاوانەکان ئاشکرا دەکا، پێشەوایەکەش ڕەخنەکانی لانەبردن، ئەو کاتە دورست نیە یارمەتیی بدرێ، بەڵکو واجبە: پیاوماقوڵان ڕێك بکەونو یەك بگرنو پێشەوایەکە لە سەر کار لابدەن، هەروەك ئیمامی (النواوي) لە (شرح صحيح مسلم)دا ڕوونی کردۆتەوە.

بەڵام ئیمامی (القرطبي) لە سەرەتای تەفسیر (سورة البقرة)دا فەرموویەتی: ئەگەر پێشەوایەکە فاسق بوو و پیاوێکیش لە دژی ڕاپەڕیو بە دادپەروەر خۆی ئەهێنا بەرچاو، ئەوە پێویست ناکا خەڵکەکە پەلە بکا بۆ یارمەتیدانی ڕاپەڕیوەکە، تا کاروباری دادپەروەریەکەی ڕۆن دەبێتەوە، یان تا خەڵکەکە قسەیان دەکەنە یەكو فاسقەکە لادەدەن.

جا ئێمەش لە باسەکەی دوای ئێرەدا ئەم مەسەلەیە درێژتر ڕوون دەکەینەوە، إن شاء الله تعالی.

(فَإِنْ اِسْتَمْهَلُوا) جا ئەگەر یاخیبووەکان داوای مۆڵەتیان کرد (اِجْتَهَدَ وَفَعَلَ مَا رَآهُ

صَوَابًا) پێشەوا بیری لێدەکاتەوەو چۆنی پێ باش بێ وا دەکا.
(وَ) هەر کاتێك جەنگ دەستی پێکرا (لاَ يُقَاتِـلُ مُـدْبِرَهُمْ) نابـێ هەڵاتووەکـەیان بکـوژێ، هەم نابێ ئـەو کەسـەش بکـوژێ کـە وازی لـە جـەنگ هێنـاوە، هـەم (وَلاَ مُثْخَنَهُمْ) نابـێ بریندارەکەشیان بکوژێ.
هەم (وَأَسِيرَهُمْ) نابێ دیلەکەشیان بکوژێ، چونکە ئیمـامی(علیﷺ) ئـەوها بڕیـاری داوەو (ابن أبیشیبه والبیهقی بسند حسن) گێڕاویەتیانەوە (وَلاَ يُطْلَقُ وَإِنْ كَانَ صَبِيًّا وَامْرَأَةً) نابێ دیلەکەیان ئازاد بکرێ، هەرچەند دیلەکەش منداڵ ، یان ئافرەت بێ (حَتَّى تَنْقَضِيَ الْحَرْبُ وَيَتَفَرَّقَ جَمْعُهُمْ) تا کۆتایی جەنگەکە دێو کۆمەڵی یاخیبووەکان پەرت دەبێ، ئـەو کاتـە دیلەکە ئازاد دەکرێ (إلاَّ أَنْ يُطِيعَ بِاخْتِيَارِهِ) مەگەر دیلەکە بـە خۆشـی خـۆی گوێڕایـەڵی پێشەوا ببێو لە یاخیبوونەکەی تۆبە بکا، ئەویش ئازاد دەکرێ.
﴿ **ئاگاداری** ﴾: واجبە کوژراوەکانی هەردوو لا بشورێنو نوێژیان لە سـەر بکـرێو بـەرەو قیبلە بنێژرێن، هەروەك لە (باسی نوێژی مردوو)دا ڕابرا.
جـا بزانـە: لـە مەزهـەبی ئیمـامی (حنفـی)دا: دروسـتە هـەڵاتووەکانییاخیبووەکانو بریندارەکانیشـیان بکـوژرێن ئەگـەر کۆمـەڵێکیتریان مابـێو هـەڵاتووەکانو برینـدارەکان بچنەوە ڕیزی ئەوان، هەم لەبارەی دیلەکانیشیان پێشەوا سەرپشکە: یان بیانکوژێ نەوەك بەرهەڵ بنو بچنەوە ڕیزی یاخیبووەکان، یان بەندیان بکـا، هـەروەك لـە (شـرح الكنـز)و (شرح الملتقى)دا فەرموویانە.
وَيَــرُدُّ سِــلاَحَهُمْ وَخَــيْلَهُمْ إلَــيْهِمْ إذَا انْقَضَــتِ الْحَــرْبُ وَأُمِنَــتْ غَــائِلَتُهُمْ، وَلاَ يُسْــتَعْمَلُ فِــي قِتَــالٍ إلاَّ لِضَــرُورَةٍ، وَلاَ يُقَــاتَلُونَ بِعَظِــيمٍ كَنَــارٍ وَمَنْجَنِيــقٍ إلاَّ لِضَــرُورَةٍ كَــأَنْ قَــاتَلُوا بِــهِ أَوْ أَحَــاطُوا بِنَــا، وَلاَ يُسْــتَعَانُ عَلَــيْهِمْ بِكَــافِرٍ وَلاَ بِمَـنْ يَـرَى قَـتْلَهُمْ مُـدْبِرِينَ، وَلَـوْ اِسْـتَعَانُوا عَلَيْنَـا بِأَهْلِ حَـرْبٍ وَآمَنُـوهُمْ لَـمْ يَنْفُـذْ أَمَانُهُمْ عَلَيْنَا، وَنَفَذَ عَلَيْهِمْ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ أَعَانَهُمْ أَهْلُ الذِّمَّةِ عَالِمِينَ بِتَحْرِيمِ قِتَالِنَا

---

ئینجا بزانە: نابێ ماڵی یاخیبووەکان بە تاڵان بگـیرێ، کـەوابو: (وَيَـرُدُّ سِـلاَحَهُمْ وَخَـيْلَهُمْ إلَيْهِمْ) چەكو وواڵاغو ئۆتۆمبیلو شتیتری یاخیبووەکان پێشەوا بۆیان دەگەڕێنێتەوە (إذَا انْقَضَتِ الْحَرْبُ وَأُمِنَتْ غَائِلَتُهُمْ) هەر کاتێك جەنگ کۆتایی هاتو لە خراپەکەیان ئەمین بوین (وَلاَ يُسْتَعْمَلُ فِي قِتَالٍ إلاَّ لِضَرُورَةٍ) نابێ چەكو ئۆتۆمبیل شتەکانیتریان لە جەنگدا بەکار بهێندرێ تەنها لە بەر ناچاری نەبێ: وەك مەترسی بەزینو شکستی لەشکری ئێمە، واتـە: لەو حاڵەتەدا تا جەنگ بەردەوام بێ، دروستە: چەكو شتەکانیتریان بە کار بهێندرێ.
(وَلاَ يُقَاتَلُونَ بِعَظِيمٍ) نابێ یاخیبووەکان بە چەکی گەورەو کۆمەڵکوژ جەنگیان لە دژ بکرێ

(كَنَارٍ وَمَنْجَنِيقٍ) وەكو ئاگرو مەنجەنیق و ئاو بەردانە سەرو بومبی گەورەو وێرانكەر (إلاَّ لِضَرُورَةٍ: كَأَنْ قَاتَلُوا بِهِ) تەنها لەبەر ناچاری نەبێ: وەك ئەوان بە چەكی كۆمەڵكوژ جەنگ بكەن (أَوْ أَحَاطُوا بِنَا) یان دەورەیان لە ئێمە دابێ، ئەو كاتە دروستە: چەكی گەورەو كومەڵكوژ بە كار بهێندرێ.

هەروەها دروست نیە: گەمارۆی خواردن و خواردنەوەیان لە سەر دابندرێ، هەم (وَلاَ يُسْتَعَانُ عَلَيْهِمْ بِكَافِرٍ) نابێ بە مرۆڤی كافر جەنگیان لە دژ بكەین، هەم (وَلاَ بِمَنْ يَرَى قَتْلَهُمْ مُدْبِرِينَ) نابێ بەو كەسەش جەنگیان لە دژ بكەین كە باوەڕی وایە: كوشتنی یاخیبووەكان لە حاڵەتی هەڵاتن و دیلیدا دروستە، بەڵام لە حاڵەتی پێویستدا دروستە بە ئەوانەش جەنگ بكەین.

(وَلَوْ اِسْتَعَانُوا عَلَيْنَا بِأَهْلِ حَرْبٍ وَآمَنُوهُمْ) ئەگەر بە یارمەتی كافرەكانی جەنگی یاخیبووەكان لە دژی ئێمە جەنگیان كردو پەیمانی دڵنیابوونیشیان دابوە ئەو كافرانە (لَمْ يَنْفُذْ أَمَانُهُمْ عَلَيْنَا) ئەو پەیماندانەی ئەوان لە سەر ئێمە جێبەجێ نابێ و هەر وەكو كافری جەنگی ڕەفتاریان لەگەڵ دەكەین، بەڵام (وَنَفَذَ عَلَيْهِمْ) ئەو پایماندانەی یاخیبووەكان لە سەر خۆیان جێبەجێ دەبێ و نابێ ئەوان دەستدرێژییان بكەنەسەر (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ أَعَانَهُمْ أَهْلُ الذِّمَّةِ) ئەگەر كافرەكانی پەیمان لەئەستۆ بەخۆشی خۆیان یارمەتی یاخیبووەكانیان دا (عَالِمِينَ بِتَحْرِيمِ قِتَالِنَا) دەشیانزانی: حەرامە جەنگ لە دژی ئێمە

انْتَقَضَ عَهْدُهُمْ، أَوْ مُكْرَهِينَ فَلاَ، وَكَذَا إِنْ قَالُوا ظَنَنَّا جَوَازَهُ أَوْ أَنَّهُمْ مُحِقُّونَ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَيُقَاتَلُونَ كَبُغَاةٍ.

(فَصْلٌ) شَرْطُ الإِمَامِ كَوْنُهُ مُسْلِمًا

---

بكرێ، ئەوە (انْتَقَضَ عَهْدُهُمْ) پەیمانەكەیان هەڵدەوەشێتەوەو وەكو كافری جەنگی ڕەفتاریان لەگەڵ دەكرێ، بەڵام (أَوْ مُكْرَهِينَ) ئەگەر بە زۆرلێكردن یارمەتییان دابون، ئەوكاتە (فَلاَ) پەیمانەكەیان هەڵناوەشێتەوە (وَكَذَا إِنْ قَالُوا: ظَنَنَّا جَوَازَهُ) هەروەها ئەگەر كافرەكان گوتیان: واتێگەیشتین یارمەتیدانەكەمان دروستە (أَوْ) یان واتێگەیشتین (أَنَّهُمْ مُحِقُّونَ) یاخیبووەكان ڕاستن، ئەو كاتەش پەیمانەكەیان هەڵناوەشێتەوە (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، كەوابو: (وَيُقَاتَلُونَ كَبُغَاةٍ) لەو سێ حاڵەتانەدا وەكو یاخیبووەكان جەنگ لەگەڵ ئەو جۆرە پەیمان لەئەستۆیانە دەكرێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی پێشەوای موسوڵمان ﴾

بە (إِجْمَاع)ی (أَهل السّنة والْجَماعة) لە سەر موسوڵمانان بە (فَرْض الْكِفَايَة) واجبە:

پێشەوایەك دابنێن، تاكو بە یاسای قورئانو حەدیس خەڵك بەڕێوە بباو بەرگری لە ئایینی ئیسلام بكاو مافی خاوەن ماف لە ستەمكار وەربگرێ، هەروەك لە (الاحكام السلطانية)و لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(شَرْطُ الإِمامِ) مەرجەكانی پێشەوای موسوڵمانان، یەكەم: (كَوْنُهُ مُسْلِمًا) دەبی پێشەوایەكە موسوڵمان بێ، واتە: بە هیچ جۆرێك دروست نابێ: كافر بكرێتە كاربەدەستی موسوڵمانان، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَنْ يَجْعَلَ اللهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَىالْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ خوای گەورە هیچ ڕێگایەك ناداتە كافرەكان فەرمانڕەوایی بە سەر موسوڵماناندا بكەن.

ئیمامی (النواوی) لە (شرح صحیح مسلم)دا لە (القاضی عیاض) دەگێڕێتەوەو فەرموویەتی: **(بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام نابێ كافر بكرێتە پێشەوای موسوڵمانان، جا ئەگەر پێشەوا بووە كافر، یان وازی لە ئەنجامدانی نوێژ هێناو بانگەوازی خەڵكی نەدەكرد بۆ نوێژكردن، یان (بِدْعة)ی بڵاو دەكردەوە، یان گۆڕانكاریی هێنا سەر شەریعەتیئیسلام، بە یەكێك لەو تاوانانە لە پێشەوایەتی دەكەوێ و واجبە: موسوڵمانان لە دژی ڕاپەڕنو پێشەوایەكیتری دادپەروەر لە جێی دابنێن).**

ئەمەش بەڵگەكانی فەرموودەی ئیمامی(النواوی)یە:

1- بەڵگەی كافربوون: ﴿عن عبادة ﷺ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللهِﷺ عَلَىالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنا وَعُسْرِنا وَيُسْرِنا وَأَثَرَةٍ عَلَيْنا، وَأَلاَّ نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ، قال: إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْراً بَواحاً عِنْدَكُمْ مِنَ اللهِ فِيهِ بُرْهانٌ﴾ رواه الشیخان، پەیمانمان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەست: كە مُكَلَّفًا حُرًّا ذَكَرًا قُرَشِيًّا مُجْتَهِدًا شُجَاعًا ذَا رَأْيٍ وَسَمْعٍ وَبَصَرٍ وَنُطْقٍ،

---

گوێڕایەڵی فەرمانڕەواكانمان بین لە حاڵەتی چوستیو پێناخۆشیو سەختیو ئاسانیو لە حاڵەتی جیاوازیكردنیان لە نێوانماندا، هەم لە دژی فەرمانڕەواكانمان ڕانەپەرین... فەرمووی: مەگەر كافربوونێكی ئاشكرا ببینن كە لە لای خوا بەڵگەیەكتان بە دەستەوە بێ. واتە: ئەو كاتە لە دژیان ڕاپەڕنو لایاندەن.

2- بەڵگەی ئەنجام نەدانی نوێژ: لەبارەی فەرمانڕەواكانی خراپ (صحابة) پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ كرد: ﴿يا رَسُولَ اللهِ أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ بِالسَّيْفِ؟ فَقالَ: لاَ، مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ﴾ رواه مسلم، ئەی پێغەمبەری خوا ئایا بە هێزی چەك فەرمانڕەوایەكانی خراپ لانەدەین؟ فەرمووی: نا، تا ئەوان لە ناو ئێوەدا نوێژ ئەنجام بدەن، لایانمەدەن. واتە: ئەگەر نوێژیان ئەنجام نەدا لایاندەن.

3- بەڵگەی بڵاوكردنەوەی (بِدْعَة)و گوناهەكان: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿فَإِذا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طاعَةَ﴾ رواه الشیخان، هەر كاتێك مرۆڤ فەرمانی خراپەی پێكرا، گوێڕایەڵی دروست نیە.

4-بەڵگەی گۆڕانکاری سەر شەریعەتی‌ئیسلام: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إِنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ مُجَدَّعٌ أَسْوَدُ يَقُوْدُكُمْ بِكِتَابِ اللهِ فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا﴾ رواه مسلم، ئەگەر قوله ڕەشێكی لوتبڕاو كرایە كاربەدەستتان‌و بە قورئانی پیرۆز ئێوەی بەڕێوە دەبرد، ئێوەش گوێڕایەڵی بن. واتە: ئەگەر بە یاسای قورئان بەڕێوەی نەبردن گوێڕایەڵی نەبن.

دووەم: (مُكَلَّفًا) دەبی پێشەوا بالغ‌و عاقلّ بێ. سێیەم: (حُرًّا) ئازاد بێ، چونكە منداڵ‌و شێت‌و كۆیلە سەربەخۆ نین، كەواتە: ئەگەر پێشەوا شێت ببێ، لە كار لادەكەوێ.

چوارەم: (ذَكَرًا) نێرینەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ إِمْرَأَةً﴾ رواه البخاري، ئەو گەلە بەختەوەر نابێ كە كاری‌خۆیان بدەنە دەست ئافرەت.

پێنجەم: (قُرَشِيًّا) ئەگەر بگونجێ لە هۆزی قورەیشی بێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿اَلأَئِمَّةُ مِنْ قُرَيْشٍ﴾ رواه النسائي باسناد جيد، پێشەوایەكان لە هۆزی قورەیشین. جا ئەگەر نەگونجا دروستە لەگەلەكانی‌تر بێ. شەشەم: (مُجْتَهِدًا) زانایەكی (مُجْتَهِد)بێ، تاكو بڕیارەكانی‌شەریعەت بزانێ. حەفتەم: (شُجَاعًا) نەترس بێ، تاكو بەخۆی غەزا بكاو كاروباری سوپا بەڕێوە ببا. هەشتەم: (ذَا رَأْيٍ) خاوەن بیروڕا بێ، تاكو خەڵكی پێ بەڕێوە بباو پلەوپایەی گشت كەسێك بناسێ.

نۆیەم: (وَسَمْعٍ وَبَصَرٍ وَنُطْقٍ) بیستن‌و دیتن‌و قسەی هەبێ، كەواتە: ئەگەر پێشەوا هەردوو گوێی كەڕ بێن‌و ببستنی نەمێنێ، یان هەردوو چاوی كوێر بێن‌و دیتنی نەمێنێ، یان لاڵ ببێ‌و قسەی نەمێنێ، ئەوە لە كار لادەكەوێ، هەروەها ئەگەر هەردوو دەستی نەمێنن، یـــــــــــــــــــــان

وَتَنْعَقِدُ الإِمَامَةُ بِالْبَيْعَةِ، وَالأَصَحُّ

---

هەردوو پێی نەمێنن، یان توانای هەڵسان‌و دانیشتن‌و جولانی بە پەلەی نەمێنێ: وەكو شەلەپەتەیی، ئەوەش لە كار لادەكەوێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون كراوەتەوە.

دەیەم: مەرجە پێشەوا دادپەروەر بێ، بەڵام ئەگەر لە دوای كار گرتنەدەست بووە فاسق، ئەو كاتە لە كار لاناكەوێ، هەروەك لە (باسی سەروەسێت)دا ڕابرا. كەواتە: فاسقبوونی پێشەوا لە خۆیدا مەسەلەیەكەو لە كار لایناداو، بەڵام بڵاوكردنەوەی فسق‌و گوناهەكان‌و فەرمان بە خراپە مەسەلەیەكی‌ترەو دروست نیە گوێڕایەڵی بین‌و تا بگونجێ واجبە: لە كار لابدرێ، هەروەك لە پێش ئێرەدا ڕابرا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر پێشەوا بە دەستی كافرەكان بە دیل گیرا، ئەوە لە سەر موسوڵمانان بە گشتی واجبە: ڕزگاری بكەن، ئینجا تا ئومێدی ڕزگاربوونی هەبێ هەر لە سەر پێشەوایەتی دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر لە ڕزگاربوونی بێ‌ئومێد بوین، ئەو كاتە لە كار لادەكەوێ، واتە: بڕیارەكانی جێبەجێ نابن، كەواتە: لە سەر پیاوماقوڵان واجبە:

پێشەوایەکیتر دابنێن، بەڵام ئەگەر پێشەوا لە حاڵەتی دیلیدا یەکێکیتری کردبوە پێشەوا: ئەوە ئەگەر لە پێش بێئومێدبوونەکە دایبنابێ، دانانەکەی دروست دەبێ، بەڵام ئەگەر لە دوای بێئومێدی دایبنابێ دانانەکەی دروست نابێو بەتاڵە، جا ئەگەر لە دوای بێئومێدی لە دیلی ئازاد بوو، ئەوە نابێتەوە پێشەوا، بەڵام ئەگەر پێش بێئومێدی ئازاد ببێ، ئەوە هەر لە سەر پێشەوایەتی بەردەوامەو ئەوەکەیتر نابێتە پێشەوا.

هەروەها ئەگەر بە دەستی موسوڵمانانی یاخیبوو بە دیل گیرا، ئەوە تەماشا دەکەین: ئەگەر یاخیبووەکان پێشەوایەکیان بۆ خۆیان دانابێو لە ئازادکردنیشی بێئومێد بوین، ئەو کاتەش لە پێشەوایەتی لادەکەوێو واجبە: پیاوماقوڵان پێشەوایەکیتر دابنێن، بەڵام ئەگەر یاخیبووەکان پێشەوایان دانەنابێ، ئەو کاتە هەر لە سەر پێشەوایەتی بەردەوامە هەرچەند لە ڕزگارکردنیشی بێئومێد ببین، کەوابو: واجبە بەخۆی، یان پیاوماقوڵان جێگرێکی بۆ دابنێن، هەروەها ئەگەر پێشەوا بێهێز بوو و دارودەستەکەی، یان خزمەکانی زاڵ بون بە سەر کاروباری وڵاتدا، ئەوە ئەگەر بڕیارەکانیان بەگوێرەی شەریعەتیئیسلام بێ، ئەوە جێبەجێ دەکرێن، ئەگەرنا: جێبەجێ ناکرێنو واجبە: پێشەوا داوای هێزو یارمەتی بکا، تاکو لە دەستیان بێتە دەرەوە، هەروەك لە (تحفة)و (مغني)و لە (الاحكام السلطانية)ی ئیمامی (الماوردی)دا ناوەڕۆکی ئەم ئاگاداریە ڕوون کراوەتەوە.

(وَتَنْعَقِدُ الإِمَامَةُ) پێشەوایەتی دادەمەزرێ بە یەکێك لەم سێ ڕێگایە: یەکەم: (بِالْبَيْعَةِ) بە بەیعەت، واتە: پەیمانبەستنیموسوڵمانانو ئەوان بیکەنە پێشەوا، ئینجا (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: پێویست ناکا گشت موسوڵمانەکان ئامادە بن، بَيْعَةُ أَهْلِ الْحَلِّ وَالْعَقْدِ مِنَ الْعُلَمَاءِ وَالرُّؤَسَاءِ وَوُجُوهِ النَّاسِ الَّذِينَ يَتَيَسَّرُ اِجْتِمَاعُهُمْ، وَشَرْطُهُمْ صِفَةُ الشُّهُودِ، وَبِاسْتِخْلاَفِ الإِمَامِ، فَلَوْ جَعَلَ الأَمْرَ شُورَى بَيْنَ جَمْعٍ فَكَاسْتِخْلاَفٍ فَيَرْتَضُونَ أَحَدَهُمْ،

---

بەڵکو (بَيْعَةُ أَهْلِ الْحَلِّ وَالْعَقْدِ) پەیمانبەستنی ئەو کەسانە ڕەچاو دەکرێ: کە دەتوانن کاروبار هەڵبوەشێننو پێکیەوە ببەستن: (مِنَ الْعُلَمَاءِ وَالرُّؤَسَاءِ وَوُجُوهِ النَّاسِ) لە زانایانی ئایینیو سەرۆك هۆزەکانو پیاوماقوڵانی موسوڵمانان (الَّذِينَ يَتَيَسَّرُ اِجْتِمَاعُهُمْ) ئەوانەی–لە کاتی پەیمانبەستنەکەدا– کۆبوونەوەیان ئاسان دەبێو زەحمەت نیە، چونکە خەڵکیتر شوێن ئەوان دەکەوێ، کەواتە: پێویست نیە پیاوماقوڵانی هەموو شارەکان کۆ ببنەوە، بەڵکو هەر کاتێك هەواڵی پەیمانبەستنەکە گەیشتە شوێنەکانیتر، واجبە: ڕازی ببن، چونکە تەنها پێنج (صحابة) بۆ پەیمانبەستنی ئیمامی(أبوبکرﷺ) کۆ بونەوەو کردیانە جێنیشی پێغەمبەرﷺو چاوەڕوانی کەسیتریان نەکرد، خەڵکیتریش شوێن ئەوان کەوت، هەروەك لە (الاحكام السلطانية)دا فەرمویەتی.

(وَشَرْطُهُمْ صِفَةُ الشُّهُودِ) مـەرجی پەیمانبەستەکانیش ئەمەیە: سیفەتی شاهیدەکانیان تێدا بێ: وەك دادپەروەریی و بیروڕاو لێزانینێکی تەواو بۆ هەڵبژاردنی ئەو کەسەی بۆ خزمەتی موسولمانانو بۆ بەرژەوەندییەکانیان لێهاتووترە، کەوابو: هەڵبژاردنو پەیمانبەستنی فاسقەکانو خەڵکیتری جگە لە پیاوماقوڵان ڕەچاو ناکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

دووەم: (وَبِاسْتِخْلاَفِ الإِمَامِ) پێشەوایەتی دادەمەزرێ بە دانانی پێشەوا: کە جێنیشێك بۆ دوای خۆی دابنێ، هەروەك ئیمامی(أبوبكر) ئیمامی(عمر)ی کردە جێنیشی دوای خۆی رضىالله عنهما (فَلَوْ جَعَلَ الأَمْرَ شُورَى بَيْنَ جَمْعٍ) جا ئەگەر پێشەوا کاروباری پێشەوایەتی دوای خۆی کردە ڕاوێژ لە نێوان کۆمەڵێکدا، ئەوەش (فَكَاسْتِخْلاَفٍ) وەکو دانانی جێنیشەکەی دوای خۆیەتیو واجبە: ڕەفتاری پێبکرێ، کەوابو: (فَيَرْتَضُونَ أَحَدَهُمْ) لە دوای مردنی پێشەوایەکە ئەو کۆمەڵە یەکێکیان هەڵدەبژێرن بۆ پێشەوایەتی، هەروەك ئیمامی(عمرﷺ) کاری پێشەوایەتی دوای مردنی کردە ڕاوێژ لە نێوان شەش (صحابة)ی پێغەمبەرداﷺ، ئەوانیش ئیمامی (عثمان)یان هەڵبژاردﷺ.

هەروەها دروستە دوو کەس، یان زیاتر-یەك لە دوای یەك- بۆ پێشەوایەتی دوای خۆی دابنێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ سێ سەرکردەی بۆ غەزای (مُؤتة) دانانو هەرسێکیشیان شەهید بونو (صحابة)کانیش حەزرەتی (خالد)یان کردە سەرکردەی لەشکرەکەو لە جەنگەکەدا سەر کەوتن. جا ئەگەر یەکێکیان- لە دوای مردنی پێشەوا- بووە پێشەوا، ئەوە بۆی دروستە: ئەوانیتر لابداو یەکێکیتر بۆ دوای خۆی دابنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَبِاسْتِيلاَءِ جَامِعِ الشُّرُوطِ، وَكَذَا فَاسِقٌ وَجَاهِلٌ فِالأَصَحِّ، قُلْتُ: لَوْ ادَّعَى دَفْعَ زَكَاةٍ إِلَى الْبُغَاةِ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، أَوْ جِزْيَةٍ فَلاَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَكَذَا خَرَاجٌ فِالأَصَحِّ، وَيُصَدَّقُ فِي حَدٍّ إِلاَّ أَنْ يَثْبُتَ بِبَيِّنَةٍ وَلاَ أَثَرَ لَهُ فِالْبَدَنِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

## (كِتَابُ الرِّدَّةِ)

---

سێیەم: پێشەوایەتی دادەمەزرێ (وَبِاسْتِيلاَءِ جَامِعِ الشُّرُوطِ) بە دەست بەسەردا گرتنو زاڵبوونی کەسێك کە مەرجەکانیبرابردووی تێدا کۆ بوبێتەوە (وَكَذَا فَاسِقٌ وَجَاهِلٌ) هەروەها بە زاڵبوونی فاسقو نەزانیش پێشەوایەتی دادەمەزرێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، نەوەك فیتنەو پەرتەوازەیی ڕوو بدا، جا ئەوەش لە حاڵەتێکدا بوو: کە پێشەوایەکەیتر مردبێ، یان ئەویش وەکو ئەمە بە زاڵبوون بوبێتە پێشەواو ئەمەش لایبدا، بەڵام ئەگەر ئەوەکەیتر بە هەڵبژاردنو پەیمانبەستن، یان بە دانانی پێشەوا بوبێتە پێشەوا، ئەو کاتە پێشەوایەتی ئەم زاڵبووە دانامەزرێ، هەروەك لە (مغنى)و (الشروانى)دا

فەرموویانە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرمویەتی (لَوْ اِدَّعَى دَفْعَ زَكَاةٍ إِلَىالْبُغَاةِ) ئەگەر موسولمانێك گوتی: زەكاتەكەم داوەتە یاخیبووەكان (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردنەكەی باوەڕی پێدەكرێ (أَوْ جِزْيَةٍ) بەلام ئەگەر كافرێك گوتی: سەرانەم داوەتە یاخیبووەكان. ئەوە (فَلاَ عَلَىالصَّحِيحِ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێناكرێ، لە سەر فەرموودەی ڕاست (وَكَذَا خَرَاجٍ فِيالأَصَحِّ) هەروەها لەبارەی خەرجیەی زەویش موسولمانەكە باوەڕی پێناكرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَيُصَدَّقُ فِي حَدٍّ) لەبارەی سزای تاوان بێسوێندخواردن باوەڕی پێدەكرێ: كە بڵێ: سزا دراوم (إِلاَّ أَنْ يَثْبُتَ بِبَيِّنَةٍ) تەنها ئەگەر سزای تاوانەكە بە دوو شاهید لە سەری ئاشكرا بوبێ و (وَلاَ أَثَرَ لَهُ فِيالْبَدَنِ) هیچ ئاسەواری سزایەكەش لە لاشەیدا نەبێ، ئەوە باوەڕی پێناكرێ (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ كِتَابُ الرِّدَّةِ: پەڕتوكی پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام ﴾

واتە: كافربوونی موسولمان. جا بزانە: كافربوون لە هەموو گوناهە گەورەكان گەورەترە، پاشگەزبوونەوەش لە ئیسلام لە هەموو جۆرە كوفرێك ناشیرنترەو بڕیارەكەی توندو تیژترە، چونكە ئەو كەسەی لە ئیسلامەتیەوە دەبێتە كافر، هیچ دەستكاریەكی لە ماڵو ماڵیخۆیدا دروست نابێ و هەم نابێ بە (جِزْيَة) وازی لێبهێندرێ و نابێ دڵنیا بكرێ و نابێ جەنگی لەگەڵ بوەستێندرێ، بەڵكو ئەگەر نەبێتەوە موسولمان یەكسەر دەكوژرێ، بەلام ئەگەر بۆوە موسولمان ئەو كاتە وازی لێدەهێندرێ.

جا بزانە: ئەگەر ژنو مێرد هەردووكیان، یان یەكێكیان پاشگەز ببێتەوە: ئەوە ئەگەر كوفرەكە پێش جیماعكردن بێ، یەكسەر مارەبڕینەكەیان هەڵدەوەشێتەوە، بەلام ئەگەر كوفرەكە لە دوای جیماعكردن بێ، ئەو كاتە چاوەڕوان دەكرێ: ئەگەر لە (عِدَّة)دا

هِيَ قَطْعُ الإِسْلاَمِ بِنِيَّةٍ أَوْ قَوْلِ كُفْرٍ أَوْ فِعْلٍ، سَوَاءٌ قَالَهُ اِسْتِهْزَاءً أَوْ عِنَادًا أَوْ اِعْتِقَادًا،

---

پاشگەزبووەكە بۆوە موسولمان، ئەوە مارەبڕینەكەیان بەردەوام دەبێ، ئەگەر نا: بڕیار دەدرێ لە كاتی كافربوونەكەوە مارەبڕینەكەیان هەڵوەشاوەتەوە، هەروەك لە (باسی كافربوونی ژنو مێرد)دا ڕابرا.

دیسان بزانە: بەو كافربوونە خێری كردەوەكانی پێش كافربوونی لەدەست دەچێ، بەلام واجب نیە قەزایان بكاتەوە، بەڵكو تەنها قەزاكردنەوەی كاتی كافربوونی لە سەر واجبە، بەلام ئەگەر بە كافربوویی مرد، یان كوژرا، ئەو كاتە خێری كردەوكانیو خودی كردەوەكانیشی لەدەست دەچێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەكانیاندا ڕوون كراوەتەوە.

كەواتە: بە یەكجاری لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِالدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ هەر كەسێك لە ئێوە لە ئیسلام پاشگەز ببێتەوە بۆ كافربوون و بە

کافربوویش بمرێ، ئەوانە کردەوەکانیان هەڵئەوەرێن و لەدەستیان دەچن لە دونیاو لە قیامەتدا، هەم ئەوانە خاوەنی ئاگری دۆزەخن و هەتا هەتایی تێیدا دەمێننەوە.

(هِيَ قَطْعُ الإِسْلَامِ) پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام: پچڕاندنی ئیسلامەتییە (بِنِيَّةٍ) بەوەی نیەتی وابێ کافر ببێ، ئەوە یەکسەر کافر دەبێ، هەرچەند بە زوبان و کردەوەش کوفرەکەی نەکردبێ (أَوْ قَوْلِ كُفْرٍ) یان بە زوبان قسەیەکی کوفر بکا، کوفرەکەشی بە خۆشی خۆی و بە ویستی خۆی بێ، ئەوەش یەکسەر کافر دەبێ، هەروەها ئەگەر داوای کافربوونیش لە یەکێکیتر بکاو بڵێ: کافر ببە. ئەو کاتەش یەکسەر کافر دەبێ، هەروەك لە (تحفة)دا لە پێش (کافربوونی ژن و مێرد)دا فەرموویەتی (أَوْ فِعْلٍ) یان بە کردار کوفرێك بکا، کردارەکەش بە ویست و خۆشی خۆی بێ.

بەڵام ئەگەر بە زۆرلێکردن کوفرێکی کرد، یان زوبانەکەی پێشبڕکەی لێکرد، یان ووشەی کوفری کەسێکیتری گێڕاوە، ئەوە لەو حاڵەتانەدا کافر نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(سَوَاءٌ) بۆ بڕیاری کافربوون یەکسانە: (قَالَهُ اِسْتِهْزَاءً) کوفرەکەی بە گاڵتە گوتبێ (أَوْ عِنَادًا) یان بە ڕقەکاری (أَوْ اِعْتِقَادًا) یان بە بیرو باوەڕەوە، وەك پێی بڵێن: نینۆکت بقرتێنە چونکە سوننەتە. ئەویش گاڵتە بە سوننەتەکە بکاو بڵێ: سوننەتیش بێ نایقرتێنم. یان بۆ شەراب خواردنەوەو زیناکردن و گوناهەکانیتر (بِسْمِ اللهِ) بڵێ، یان بڵێ: ئەگەر خواو پێغەمبەریش فەرمانم پێبکەن ئەم کارە ناکەم. یان ئەگەر قیبلە بێتە ئێرە نوێژی بەرەو لا ناکەم. یان ئەگەر خوا فلانکەس بکاتە پێغەمبەر باوەڕی پێناکەم. یان بڵێ: لەو فەرمانەدا خوا ستەمی کردوە. یان بە کافرێکی گوت: بوەستە تا دەمێکیتر

فَمَنْ نَفَى الصَّانِعَ أَوِ الرُّسُلَ أَوْ كَذَّبَ رَسُولاً أَوْ حَلَّلَ مُحَرَّمًا بِالإِجْمَاعِ كَالزِّنَا وَعَكْسَهُ، أَوْ نَفَى وُجُوبَ مُجْمَعٍ عَلَيْهِ أَوْ عَكْسَهُ،

---

مەبە موسوڵمان. یان بە بانگدەری گوت: درۆ دەکا. یان بڵێ: خۆزگە من کافر بوبام. یان بڵێ: جولەکەو گاور لە موسوڵمانان باشترن. بەو قسانە کافر دەبێ، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا چەندیتریش روون کراونەوە.

ئینجا بزانە: هەر کەسێك باوەڕی بە ڕوکنێکی ئیمان نەبێ، یان باوەڕی بە واجببوونی ڕوکنێکی ئیسلام نەبێ، ئەوە کافرە، کەوابو: (فَمَنْ نَفَى الصَّانِعَ) هەر کەسێك بڵێ: خوا نیە –وەك (طَبِيعِي)و (دَهْرِي)و (مَارکسِي)یەکانی ئەم سەردەمە– یان بڵێ: قورئان فەرمودەی خوا نیە. یان باوەڕی بە تەنها ئایەتێکی قورئان نەبێ، ئەوە کافرە.

(أَوِ الرُّسُلَ)علیهم الصلاة والسلام، یان بڵێ: پێغەمبەرەکان خودا نەیناردون. یان بڵێ: پێغەمبەرەکان ڕاست نینە. یان جنێو       بە پێغەمبەرێك بدا.

(أَوْ كَذَّبَ رَسُولاً) یان تەنها پێغەمبەرێك بە درۆ بخاتەوەو بڵێ: پێغەمبەر نیە. یان بڵێ: ڕاست ناكا. هەروەك جولەكەو دیانەكان باوەڕیان بە پێغەمبەری ئیسلامﷺ نیەو كافرن.
(أَوْ حَلَّلَ مُحَرَّمًا بِالإِجْمَاعِ: كَالزِّنَا) یان حەرامێك حەڵاڵ بكا: كە بە (إجماع) حەرام بێ: وەك زیناو نێربازیو شەراب‌و گومرك، ئەوە كافرە (وَعَكْسَهُ) بە پێچەوانەش ئەگەر حەڵاڵێك حەرام بكا: كە بە (إجماع) حەڵاڵ بێ: وەك كڕین‌و فرشتن، ئەوە كافرە (أَوْ نَفَى وُجُوبَ مُجْمَعٍ عَلَيْهِ) یان شتێك بە (إجماع) واجب بێ‌و ئەویش بڵێ: واجب نیە. وەك ڕەكعەتێكی نوێژێكی واجب (أَوْ عَكْسَهُ) یان بە پێچەوانەوە: بە (إجماع) شتێك واجب نەبێ‌و ئەویش بڵێ: واجبە: وەك نوێژێك، یان ڕۆژوێك لە ئیسلام زیاد بكاو بڵێ: واجبە. ئەوەش كافرە.
﴿ ئاگاداری ﴾: مەرجە بزانرێ ئەو حەرام‌و حەڵاڵەو واجبانە بەشێكن لە ئیسلام بە ناچاری، چونكە ئەگەر باوەڕی بە خودی (إجماع) نەبێ، وەك بڵێ: (إجماع) بەڵگەیەكی شەرعی نیە. یان بڵێ: دروستە دژ بە (إجماع) ڕەفتار بكرێ. ئەوە كافر نابێ، بەڵكو بە (أَهْلُ الْبِدْعَةِ والضَّلاَلة) ناو دەبردێ، هەروەك لە (مغنى)دا فەرموویەتی.
جا بزانە: كوفرەكان تەنها هەر ئەوەندە نین: كە لێرەدا باس كراون، هەروەها لەم سەردەمەشدا چەند جۆرە كوفرێكیتر هەنە باوەڕیان بە شەریعەتی‌ئیسلام نیە: وەك (دیمقراطي)و (إشتراكی)و (علمانی)و (ماسونی)و (ماركسی)، جا ئەو موسوڵمانانەی بە بیرو باوەڕەوە دەبنە ئەندامێكی ئەو سیستەمانەو باوەڕیان وایە: ئەو سیستەمانە لە ئیسلام باشترن، ئەوانەش كافرن، هەروەك لە (ڕوونكردنەوەی العقیدةالطحاویة)دا بە بەڵگەوە ئەو كوفرانەم ڕوون كردونەوە، بیخوێنەوە سودی لێوەردەگری.
أَوْ عَزَمَ عَلَىالْكُفْرِ غَدًا أَوْ تَرَدَّدَ فِيهِ كَفَرَ، وَالْفِعْلُ الْمُكَفِّرُ مَا تَعَمَّدَهُ اِسْتِهْزَاءً صَرِيحًا بِالدِّينِ أَوْ جُحُودًا لَهُ كَإِلْقَاءِ مُصْحَفٍ بِقَاذُورَةٍ وَسُجُودٍ لِصَنَمٍ أَوْ شَمْسٍ، وَلاَ تَصِحُّ رِدَّةُ صَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ وَمُكْرَهٍ،

---

هەروەها هەر كەسێكیش باوەڕی بەو یاسا دەستكردە هەبێ: كە كاریەدەستەكان –بە پێچەوانەی شەریعەتی‌ئیسلام–دایدەنێن، ئەویش كافر دەبێ، هەروەك لە (بغیةالمسترشدین)دا ڕوون كراوەتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَكْفُرْ بِالإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ هەر كەسێك كوفر بە شەریعەتی‌ئیسلام بكا –واتە: باوەڕی پێی نەبێ‌و ڕەفتاری پێ‌نەكا– بەڕاستی كردەوەكانی لەدەست دەچن‌و لە ڕۆژی دواییشدا لە زەرەرمەندەكانە.
(أَوْ عَزَمَ عَلَىالْكُفْرِ غَدًا) یان بڕیاری بە دڵ بدا سبەینێ كافر ببێ (أَوْ تَرَدَّدَ فِيهِ) یان دوو دڵ ببێ: ئایا كافر ببێ، یان نا، یان بڵێ: ئەگەر ئەو كارە ئەوها بێ، یان ببێ، من كافر دەبم.

به وانه گشتی (كَفَرَ) كافر دەبێو له ئیسلام دەردەچێ، هەروەها ئەگەر ئەوكەسانەش به كافر دانەنێ كه جگه له ئیسلام ئاییـنێكیتریـان هەیـه: وەك جولەكـەو گاور=دیـان، یـان گومانی له كافربوونیان هەبێ، ئەویش كافر دەبـێ، هەروەك له (مغنى)دا فەرموویەتی.
(وَالْفِعْلُ الْمُكَفِّرُ) ئەو كردارەی مرۆڤ كافر دەكا (مَا تَعَمَّدَهُ اِسْتِهْزَاءً صَرِيحًا بِالدِّينِ) ئەوەیه به قەسدی بیكا به مەبستی گاڵتەكردن بـه ئـایین (أَوْ جُحُـودًا لَـهُ) یـان بـه مەبەسـتی بـاوەڕ پێنەبوون (كَإِلْقَاءِ مُصْحَفٍ بِقَاذُورَةٍ) وەك به مەبەستی سوكایەتی پێكردن قورئانی پیرۆز، یان كتێبێكی حەدیس، یان شەرع فڕێبداته ناو چڵكنێك، یان چڵكنێكی پێدا بكا.
(أَوْ سُجُودٍ لِصَنَمٍ أَوْ شَمْسٍ) یان سوجدە ببا: بۆ بت، یان بۆ ڕۆژ، یان بۆ دروستكراوێكیتر، یان به مەبەستی سوكایەتی به ئیسلام، (صَلِيب)=خاچ له مل بكا، ئەوە كافر دەبێ، بەڵام ئەگەر مەبەستی سوكایەتی پێكردن نەبێ: وەك له ترسی كافرێك قورئانەكە فڕێ بدا، یان دیلێك سوجدەكە ببا، ئەو كاتە كافر نابێ، هەروەك له (تحفة)دا فەرموویەتی.
(وَلاَ تَصِحُّ رِدَّةُ صَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ وَمُكْرَهٍ) كافربوونی، واته: پاشگەزبوونەوەی منداڵو شـێتو زۆرلێكراو دروست نابێ، واته: دانامەزرێ، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبُرَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ﴾ حـديث صـحيح رواه أبـوداود وغـيره، نوسـینی تـاوان لـه سـێ كەسـان لادراوە: لـه خـەوتوو تـا هەشـیار دەبێتەوە، له منداڵ تا بلۆغی دەبێ، له شێت تا چاك دەبێتەوە.
هەم خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾ جگـه لـەو كەسـەی زۆری لێكراوە كافر ببێو دڵیشی پر له ئیمانه. واته: له سەر كوفرەكەی سزا نادرێ.
وَلَـوْ اِرْتَـدَّ فَجُـنَّ لَـمْ يُقْتَـلْ فِـي جُنُونِـهِ، وَالْمَـذْهَبُ صِـحَّةُ رِدَّةِ السَّـكْرَانِ وَإِسْـلاَمِهِ، وَتُقْبَلُ الشَّهَادَةُ بِالرِّدَّةِ مُطْلَقًا، وَقِيلَ يَجِبُ التَّفْصِيلُ، فَعَلَىالأَوَّلِ لَوْ شَهِدُوا بِرِدَّةٍ فَأَنْكَرَ حُكِمَ بِالشَّـهَادَةِ، فَلَـوْ قَـالَ: كُنْـتُ مُكْرَهًـا وَاقْتَضَـتْهُ قَرِينَـةٌ كَأَسْـرِ كُفَّـارٍ صُـدِّقَ بِيَمِينِـهِ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ قَالاَ: لَفَظَ لَفْظَ كُفْرٍ فَادَّعَى إِكْرَاهًا صُدِّقَ مُطْلَقًا،

---

جا بزانه: به فەرموودەی كۆمەڵێكی زانایان: موسوڵمانبوونی منداڵی فامیدە—سەربەخۆ— دروست دەبێ، هەروەك له (كتاب اللقيط)دا ڕوونمان كردەوە.
(وَلَوْ اِرْتَدَّ فَجُنَّ) ئەگەر مرۆڤێك كافر بوو، ئینجا شێت بوو، ئەوە(لَمْ يُقْتَـلْ فِـي جُنُونِـهِ) لـه حاڵەتی شێتیدا ناكوژرێ، بەڵكو دوا دێخرێ تا چاك دەبێتەوەو داوای تۆبـەی لێـدەكرێ بەڵكی ببێتەوە موسوڵمان.
(وَالْمَذْهَبُ) به فەرموودەی ڕاستیمەزهەب (صِحَّةُ رِدَّةِالسَّكْرَانِ وَإِسْلاَمِهِ) پاشگەزبوونەوەی سەرخۆشێكی تاوانبارو هـەم موسوڵمانبوونەوەشـی هـەردووكی دروسـت دەبـن، هـەروەك

تەلاقدان‌و دەستکاریەکانی‌تریشی دروست دەبون، بەلام ئەگەر سەرخۆشەکە تاوانبار نەبێ: وەك بە زۆرلێکردن، یان بە نەزانی شەڕابی خواردبێتـەوە، ئـەوە کافربوونەکـەی دروسـت نابێ، واتە: دانامەزرێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَتُقْبَلُ الشَّهَادَةُ بِالرِّدَّةِ مُطْلَقًا) شاهیدی پاشگەزبوونەوەی کەسێك وەردەگیرێ‌و قبولْ دەکرێ بێ ئەوەی شاهیدەکە کوفرەکە ڕوون بکاتەوە (وَقِيلَ يَجِبُ التَّفْصِيلُ) لـە فەرموودەیـەکی بـێهێزدا واجبـە: شـاهیدەکە کوفرەکـە ڕوون بکاتـەوە، زۆر لـەزانایانیش ئـەم فـەرموودە بێهێزەیان بە فەرموودەیەکی ڕاستی مەزهەب داناوە، کەواتە: ڕەفتاری پێ دەکرێ.

(فَعَلَىالأَوَّلِ) جا لە سەر فەرموودەییەکەم (لَوْ شَهِدُوا بِرِدَّةٍ) ئەگەر شاهیدەکان شاهیدییان دا: فلانەکەس پاشگەز بۆتەوە لە ئیسلام (فَأَنْكَرَ) فلانکەسەکەش گوتی: شاهیدەکان ڕاست ناکەن. ئەوە (حُكِمَ بِالشَّهَادَةِ) بە هۆی شاهیدیەکە بڕیاری کافربوونی لە سەر دەدرێ (فَلَوْ قَالَ: كُنْتُ مُكْرَهًا) جا ئەگـەر فلانکەسـەکە گـوتی: زۆرلێکـراو بـوم بۆیـێ کوفرەکـەم کـرد (وَاقْتَضَتْهُ قَرِينَةٌ كَأَسْرِ كُفَّارٍ) نیشانەیەکی زۆرلێکردنیش هـەبوو: وەك کافرەکـان بـە دیـل گرتبێتیان، ئەو کاتە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سـوێندخواردن بـاوەڕی پـێ دەکـرێ (وَإِلاَّ) بـەلام ئەگـەر هـیچ نیشـانەیەکی زۆرلێکـردن نـەبێ، ئـەوە (فَـلاَ) بـاوەڕی پـێ نـاکرێ‌و داوای شادەهێنانەوەی لێدەکرێ، جا ئەگەر شادەی نەهێناوە، ئەو کاتە دەکوژرێ.

(وَلَوْ قَالاَ: لَفَظَ لَفْظَ كُفْرٍ) ئەگەر شاهیدەکان گوتیـان: فلانەکـەس قسـەیەکی کـوفری کـرد (فَادَّعَى إِكْرَاهًا) فلانکەسەکەش لە وەلامـدا گـوتی: زۆرلێکـراو بـوم. ئـەوە لێـرەدا (صُـدِّقَ مُطْلَقًا) بە سوێندخواردن باوەڕی پـێدەکرێ، جیـاوازی نیـە: نیشـانە هـەبێ، یـان نـەبێ، چونکە لێرەدا شاهیدەکانی بە درۆ نەخستونەوە.

وَلَـوْ مَـاتَ مَعْـرُوفٌ بِالإِسْـلاَمِ عَـنْ إِبْنَـيْنِ مُسْـلِمَيْنِ فَقَـالَ أَحَـدُهُمَا: اِرْتَـدَّ فَمَـاتَ كَـافِرًا، فَـإِنْ بَـيَّنَ سَـبَبَ كُفْـرِهِ لَـمْ يَرِثْـهُ وَنَصِـيبُهُ فَـيْءٌ وَكَـذَا إِنْ أَطْلَـقَ فِـالأَظْهَرِ، وَتَجِـبُ اِسْـتِتَابَةُ الْمُرْتَـدِّ وَالْمُرْتَـدَّةِ، وَفِـي قَـوْلٍ تُسْـتَحَبُّ كَالْكَـافِرِ، وَهِـيَ فِـي الْحَـالِ، وَفِي قَوْلٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنْ أَصَرَّا قُتِلاَ،

---

﴿ ئاگاداری ﴾: مرۆڤی پاشگەزبوو—ئەگەر مرد، یان کوژرا— میراتـی لێنـاگیرێ، کـەوابو: (وَلَوْ مَاتَ مَعْرُوفٌ بِالإِسْلاَمِ) ئەگەر یەکێك مرد کە بـە موسـولْمان ناسـراو بـوو (عَـنْ إِبْنَـيْنِ مُسْلِمَيْنِ) دوو کوڕی موسولْمانیشی لە پاش بەجێمان (فَقَالَ أَحَدُهُمَا: اِرْتَـدَّ فَمَـاتَ كَـافِرًا) ئینجا کوڕێکیان گوتی: باوکمان پاشگەز بۆوەو بە کافریش مـرد. ئـەوە (فَـإِنْ بَـيَّنَ سَـبَبَ كُفْرِهِ) ئەگەر کوڕەکە هۆی کافربوونەکەی ڕوون کردەوە، وەك بڵێ: ئەو قسە کوفرەی کرد. ئەوە (لَمْ يَرِثْهُ وَنَصِيبُهُ فَيْءٌ) ئەم کوڕە میراتی لێناگرێ‌و بەشـی وی دەبێتـە (فَـيْء) بـۆ (بَيْتُ الْمَالِ)، چونکە پاشگەزبوو میراتی لێنـاگیرێ (وَكَـذَا إِنْ أَطْلَـقَ فِـیـالأَظْهَرِ)

هەروەها ئەگەر کوڕەکە هۆی کافربوونەکەش نەڵێ، میراتی لێناگرێ، لەفەرموودەی بەهێزتردا، چونکە بە دانپێداهێنانیخۆی ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ.
(وَتَجِبُ اِسْتِتَابَةُ الْمُرْتَدِّ وَالْمُرْتَدَّةِ) واجبە: پیاو و ئافرەتی پاشگەزبووەوە داوای تۆبەیان لێبکرێ، تاکو ببنەوە موسوڵمان، هەروەك (أبوداود بسند صالح) گێڕاویەتیەوە.
بەڵام (وَفِي قَوْلٍ تُسْتَحَبُّ كَالْكَافِرِ) لە فەرموودەیەکی ئیمامی(شافعی)و لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: داوالێکردنی تۆبە واجب نیە، بەڵکو سوننەتە، وەك کافری بنەڕەتی.
(وَهِيَ فِي الْحَالِ) داوالێکردنی تۆبە، دەمودەستە (وَفِي قَوْلٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ) لە فەرموودەیەکدا: تا ماوەی سێ ڕۆژان داوای تۆبەیان لێدەکرێ (فَإِنْ أَصَرَّا) جا ئەگەر پیاوە کافربووەکەو ئافرەتە کافربووەکە دەمودەست تۆبەیان نەکردو نەبونەوە موسوڵمان (قُتِلاَ) واجبە: یەکسەر بکوژرێن، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ﴾ رواه البخاری، هەر کەسێك ئاینیخۆی گۆڕی ئێوە بیکوژن.
جا بزانە: هەرکاتێك پاشگەزبووەکە کوژرا، یان مرد، نابێ نوێژی (جَنَازَة)ی لە سەر بکرێو نابێ لە گۆڕستانی موسوڵمانان بنێژرێ.
هەروەها بزانە: پێشەوای موسوڵمانان، یان جێگرەکەی مافی کوشتنی پاشگەزبووەکانی هەیە، کەواتە: هەر یەکێك بێئیزنی کاربەدەست پاشگەزبووەکە بکوژێ، پێویستە تەمبێ بکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: بەڵام بکوژەکە -جگە لە تەمبێکردن- نە خوێنو نە کەففارەتی لە سەر نیە، هەرچەند پێش داوالێکردنی تۆبەش کوشتبێتی، هەروەك لە (الشبراملسی)دا فەرمویەتی.
دیسان بزانە: ئەگەر پاشگەزبووەکە جەنگی لە دژی موسوڵمانان دەکرد، ئەو کاتە داوای
وَإِنْ أَسْلَمَ صَحَّ وَتُرِكَ، وَقِيلَ لاَ يُقْبَلُ إِسْلاَمُهُ إِنْ إِرْتَدَّ إِلَى كُفْرٍ خَفِيٍّ كَزَنَادِقَةٍ وَبَاطِنِيَّةٍ، وَوَلَدُ الْمُرْتَدِّ إِنْ اِنْعَقَدَ قَبْلَهَا أَوْ بَعْدَهَا وَأَحَدُ أَبَوَيْهِ مُسْلِمٌ

---

تۆبەی لێناکرێو هەم بۆ گشت کەسێکیش دروستە بێئیزنی کاربەدەست بیکوژێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.
(وَإِنْ أَسْلَمَ) ئەگەر پاشکەزبووەکە تۆبەی کردو بۆوە موسوڵمان(صَحَّ) ئیسلامبوونەوەکەی دروست دەبێو (وَتُرِكَ) وازی لێدەهێندرێ، بەو مەرجەی بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ اللهِ)، هەم بڵێ: پەشیمانمو بەریمە لەو کوفرەی کردم. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، فَإِذَا قَالُوها عَصَمُوا مِنِّي دِمَائَهُمْ وَأَمْوالَهُم إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ﴾ رواه الشیخان، فەرمانم پێکراوە: خەڵکی بکوژم تا شادە دەهێنن، جا هەر کاتێك شادەیان هێنا، خوێنو ماڵیان لە من دەپارێزن تەنها بە مافی ئیسلام نەبێ.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزداو لە فەرموودەی ئیمام (مالـك)دا: (لاَ يُقْبَـلُ إِسْـلاَمُهُ إِنْ إِرْتَدَّ إِلَى كُفْرٍ خَفِيٍّ) ئیسلامبوونەوەكەی قبولْ ناكرێ ئەگەر پاشگەز ببێتەوە بۆ كوفرێكی شاراوە (كَزَنَادِقَةٍ) وەكو بێدینەكان، واتە: ئەو كەسانەی هیچ دینێك ناپەرستن: وەك گرۆهە (علمانیە)كانی ئەم سەردەمە، هەم (وَبَاطِنِيَّةٍ) وەك ئەو كەسانەی باوەڕیان وایە: قورئـان واتەیەكی پەنهانیی هەیەو تەنها ئەو مەبەستەو ئاشكرایەكەی مەبەست نیە.

﴿ ئاگـاداری ﴾: بـە (إِجْمَـاع)ی زانایانیئیسـلام: (هــەر موسـوڵمانێك سـوكایەتی بــە پێغەمبەرﷺ بكا، یان جنێوی پێبدا، واجبە: بكوژرێ). بەڵكو لە (المبسوط)ی (مـالكی)دا فەرموویەتی: (لە سێدارە دەدرێو داوای تۆبەی لێناكرێ). هەروەك ئیمامی(السُّبْكي) لـە (السيف المسلول على من سب الرسولﷺ)دا ڕوونی كردۆتەوە.

بەڵكو لە لای چەند زانایەكیئاییینی ئەو فەرموودەیە هەڵبژاردراوە: كە واجبە ئـەو كەسـە بكوژرێ: كە جنێوی داوەتە پێغەمبەریخۆمانﷺ، یان پێغەمبەرێكیتر، هەرچەند تۆبەش بكاو ببێتەوە موسوڵمان، هەروەك لە (تحفة)دافەرموویەتی ﴿عن عليّ وابن عباس رضىالله عنهم: أَنَّ رَجُلاً قَتَلَ أُمَّ وَلَدٍ لَهُ كَانَتْ تَشْتُمُ النَّبِيَّﷺ فَأَهْدَرَالنَّبِيُّﷺ دَمَهَا. وَأَنَّ رَجُلاً قَتَلَ يَهُودِيَّةً كَانَتْ تَشْتُمُ النَّبِيَّﷺ فَأَبْطَلَ النَّبِيُّﷺ دَمَهَا﴾ رواهما أبوداود بسندين صالحين، پیاوێـك (جاریـة)كـی خۆی كوشت، چونكە جنێوی دەدا پێغەمبەرﷺ. هەم پیاوێك ئافرەتێكی جولەكەی كوشت، چونكە جنێوی دەدا پێغەمبەرﷺ، ئینجا پێغەمبەرﷺ خوێنی هەردووكیانی بە فیڕۆ دا.

## ﴿ باسی منداڵو ماڵی پاشگەزبووەكان ﴾

(وَوَلَدُ الْمُرْتَدِّ) منداڵی مرۆڤی پاشگەزبوو: (إِنْ انْعَقَدَ قَبْلَهَا) ئەگەر پیش كافربوونەكە ئاوی پیاوەكە–لە منداڵدانەدا–جێگیر ببێ (أَوْ بَعْدَهَا وَأَحَدُ أَبَوَيْهِ مُسْلِمٌ) یان پاش كافربوونەكە فَمُسْلِمٌ، أَوْ مُرْتَدَّانِ فَمُسْلِمٌ، وَفِي قَوْلٍ مُرْتَدٌّ، وَفِي قَوْلٍ كَافِرٌ أَصْلِيٌّ، قُلْتُ: اَلأَظْهَرُ مُرْتَدٌّ وَنَقَلَ الْعِرَاقِيُّونَ الإِتِّفَاقَ عَلَى كُفْرِهِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَفِي زَوَالِ مِلْكِهِ عَنْ مَالِهِ بِهَا أَقْوَالٌ: أَظْهَرُهَا إِنْ هَلَكَ مُرْتَدًّا بَانَ زَوَالُهُ بِهَا، وَإِنْ أَسْلَمَ بَانَ أَنَّهُ لَمْ يَزُلْ،

---

ئاوەكـەی جـێگیر ببـێ، بـەڵام لـە نـەژادی لای دایكیـەوە، یـان لای باوكیـەوە دایكێكـی موسوڵمان، یان باوكێكی موسوڵمان هەبێ، ئەوە (فَمُسْلِمٌ) لە هەردوو مەسەلەدا منداڵەكـە موسـوڵمانە بـە پابەنـدی موسـوڵمانەكە، هەرچـەند دایكـە موسـوڵمانەكە، یـان باوكـە موسوڵمانەكە بەرەو سەرەوەش بێو پێش جێگیربوونی ئاوەكەش مردبێ.

(أَوْ مُرْتَدَّانِ) یان ئەگەر دایكو باوكەكەی هەردووكیان پاشگەز ببنەوەو ئاوەكەش لە دوای كافربوونەكەیان لە منداڵدانەدا جێگیر ببێ، ئەوەش (فَمُسْلِمٌ) بە فەرموودەی بێهێز: وەك دوو مەسـەلەكەیڕابردوو موسـوڵمانە (وَفِـي قَـوْلٍ مُرْتَـدٌّ) لـە فەرموودەیەكـدا: منداڵەكـەش

پاشگەزبووەوەیە (وَفِی قَوْلٍ كَافِرٌ أَصْلِيٌّ) لە فەرموودەیەكدا كافرێكی بنەڕەتییە.
(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) فەرموویەتی (اَلأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (مُرْتَدٌّ) ئەو منداڵەی لە دوای پاشگەزبوونەوەی دایكو باوكی لە منداڵدانەدا جێگیر بووەو لە نەژادیشدا هیچ دایكێكو باوكێكی موسوڵمانی نیە، ئەویش بە پاشگەزبووەوە دادەندرێ، كەواتە: لە دوای بلۆغبوون داوای موسوڵمانبوونەوەی لێدەكرێو ئەگەر نەبۆوە موسوڵمان دەكوژرێ (وَنَقَلَ الْعِرَاقِيُّونَ الاتِّفَاقَ عَلَى كُفْرِهِ) زانایانی عێراق یەكدەنگی مەزهەبیان گێڕاوەتەوە: كە ئەو منداڵە كافرە (وَاللهُ أَعْلَمُ).
بەڵام ئەگەر لە نەژادیمنداڵەكەدا دایكێكی، یان باوكێكی موسوڵمان هەبێ، ئەو كاتە–بە پابەندی موسوڵمانەكە– منداڵەكەش موسوڵمانە، هەرچەند موسوڵمانەكەش بەرەو سەرەوە بێ، جا ئەو بڕیارانە لەبارەی دونیا بون، چونكە لەبارەی قیامەت: منداڵە نەبالغەكانی كافرەكانی بنەڕەتیو پاشگەزبووەكان دەچنە بەهەشت، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة) دافەرموویانە.
(وَفِی زَوَالِ مِلْكِهِ عَنْ مَالِهِ بِهَا أَقْوَالٌ) لەبارەی لاچوونی خاوەنایەتی پاشگەزبووەكە لە ملكو ماڵی خۆی–بە هۆیپاشگەزبوون– سێ فەرموودە هەنە: (أَظْهَرُهَا) بەهێزترەكەیان: ملكو ماڵەكەی دەوەستێندرێو چاوەڕوانی دەكەین: (إِنْ هَلَكَ مُرْتَدًّا بَانَ زَوَالُهُ بِهَا) ئەگەر بە پاشگەزبوویی بكوژرێ، یان بمرێ، ئەوە دەردەكەوێ: هەر بە كافربوونەكەی لە خاوەنایەتی ملكو ماڵەكەی لاچووەو گشتی بە (فَيْء) دەدرێتە (بَيْتُ الْمَالِ)و هیچی نادرێتە میراتگرەكانی، بەڵام (وَإِنْ أَسْلَمَ) ئەگەر بۆوە موسوڵمان، ئەو كاتە (بَانَ أَنَّهُ لَمْ يَزُلْ) دەردەكەوێ: لە خاوەنایەتیی لانەچووەو گشت ملكو ماڵەكەی بۆ دەگەڕێندرێتەوە.

وَعَلَى الأَقْوَالِ يُقْضَى مِنْهُ دَيْنٌ لَزِمَهُ قَبْلَهَا، وَيُنْفَقُ عَلَيْهِ مِنْهُ، وَالأَصَحُّ يَلْزَمُهُ غُرْمُ إِتْلاَفِهِ فِيهَا وَنَفَقَةُ زَوْجَاتٍ وُقِفَ نِكَاحُهُنَّ وَقَرِيبٍ، وَإِذَا وَقَفْنَا مِلْكَهُ فَتَصَرُّفُهُ–إِنْ احْتَمَلَ الْوَقْفَ كَعِتْقٍ وَتَدْبِيرٍ وَوَصِيَّةٍ– مَوْقُوفٌ: إِنْ أَسْلَمَ نَفَذَ وَإِلاَّ فَلاَ، وَبَيْعُهُ وَهِبَتُهُ وَرَهْنُهُ وَكِتَابَتُهُ بَاطِلَةٌ، وَفِىالْقَدِيمِ مَوْقُوفَةٌ، وَعَلَىالأَقْوَالِ يُجْعَلُ مَالُهُ مَعَ عَدْلٍ وَأَمَتُهُ عِنْدَ امْرَأَةٍ ثِقَةٍ، وَيُؤْجَرُ مَالُهُ، وَيُؤَدِّى مُكَاتَبُهُ النُّجُومَ إِلَى الْقَاضِي.

---

(وَعَلَى الأَقْوَالِ) لە سەر هەرسێك فەرموودەكان (يُقْضَى مِنْهُ دَيْنٌ لَزِمَهُ قَبْلَهَا) لە ماڵی پاشگەزبووەكە ئەو قەرزە دەدرێتەوە: كە پێش كافربوونەكەی لە سەری واجب بووە، هەم (وَيُنْفَقُ عَلَيْهِ مِنْهُ) پاشگەزبووەكە بە ماڵەكەیخۆی بەخێو دەكرێ لە ماوەی داوالێكردنی تۆبەدا.

هەم (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (يَلْزَمُهُ غُرْمُ إِتْلاَفِهِ فِيهَا) تۆڵەی ئەو شتانەش لە سەر پاشگەزبووەکە واجب دەبێ، کە لە حاڵەتی پاشگەزبوونیدا فەوتاندویەتی، هەم (وَنَفَقَةُ زَوْجَاتٍ) بژێوی ئەو ژنانەشی لە سەر واجب دەبێ: کە (وُقِفَ نِكَاحُهُنَّ) هەڵوەشانەوەی مارەبڕینەکەیان وەستێندراوە تا (عِدّة)یان تەواو دەبێ، هەم (وَقَرِيبٍ) بژێوی دایکو باوکو منداڵەکانیشی لە سەرە، کەواتە: ئەو مەسەرەفانەیڕابردوو گشتی لە ماڵی پاشگەزبووەکە دەدرێن.

(وَإِذَا وَقَفْنَا مِلْكَهُ) هەر کاتێ بە فەرموودەی بەهێزتر: ملکەکەی بوەستێنین (فَتَصَرُّفُهُ) ئەو دەسکاریانەی لە حاڵەتی پاشگەزبوونەکەدا کردونی، تەماشا دەکەین: (إِنْ احْتَمَلَ الْوَقْفَ) ئەگەر قبوڵی وەستاندنیان دەکرد (كَعِتْقٍ وَتَدْبِيرٍ) وەك کۆیلە ئازادکردنو (وَوَصِيَّةٍ) وەسێتکردنو وەقفکردنی شتێك، ئەوە (مَوْقُوفٌ) گشتی وەستێندراوە: (إِنْ أَسْلَمَ) ئەگەر بۆوە موسوڵمان (نَفَذَ) دەستکاریەکەی جێبەجێ دەبێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نەبۆوە موسوڵمانو بەکافری مرد (فَلاَ) جێبەجێ نابێ.

(وَبَيْعُهُ وَهِبَتُهُ وَرَهْنُهُ وَكِتَابَتُهُ) کڕینو فرۆشتنیو بەخشینو ڕەهنکردنیو نوسراوپێدانی کۆیلەیو مارەبڕینی گشتیان (بَاطِلَةٌ) بەتاڵو دانامەزرێن (وَفِيالْقَدِيمِ مَوْقُوفَةٌ) لە فەرموودەی کۆندا: ئەوانەش وەستێندراون: ئەگەر بۆوە موسوڵمان دروست دەبن، ئەگەر نا: نا.

(وَعَلَىالأَقْوَالِ) لە سەر فەرموودەکانیڕابردوو: (يُجْعَلُ مَالُهُ مَعَ عَدْلٍ) ماڵی پاشگەزبووەکە لە لای دادپەروەرێك دادەندرێو (وَأَمَتُهُ عِنْدَ امْرَأَةٍ ثِقَةٍ) جاریەکەشی لە لای ئافرەتێکی باوەڕپێکراو دادەندرێ (وَيُؤْجَرُ مَالُهُ) زەمینو خانوو و ئاژەڵەکانیشی بەکرێ دەدرێو (وَيُؤَدِّي مُكَاتَبُهُ النُّجُومَ إِلَىالْقَاضِي) نوسراوپێدراوەکەشی پارەی ئازادکردنەکەی دەداتە دەست قازیو ئازاد دەبێ.



(كِتَابُ الزِّنَا)

## ﴿ كِتَابُ الزِّنَا: **پەرتوکی زینا** ﴾

**پێشەکی** بزانە: بۆ پارستنی ئاینو گیانو نەژادو عەقڵو ماڵو ئابڕوو، خوای گەورە چەند سزایەکی داناوە بۆ چەند تاوانێك: وەکو کوشتنی مرۆڤی پاشگەزبوو، کوشتنی لەتۆڵەی کوشتن، سزادانی زیناکەر، سزادانی شەڕابخۆر، لێکردنەوەی دەستی دز، سزادانی بوختانکەری زینا.

**بۆ وێنە**: ئەگەر مرۆڤکوژەکە بزانێ لەتۆڵەی کوشتنەکە دەکوشترێتەوە، ئەوە کوشتنەکە ناکاو گیانی خۆیو کوژراوەکە دەپارێزرێ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَكُمْ فِىالْقِصَاصِ حَيَاةٌ﴾ بۆ ئێوە لە کوشتنەوەی لەتۆڵەدا ژیانێکی گەورە هەیە.

هەروەها بە کوشتنی کافربووەکە ئایین دەپارێزرێ، بە سزای زینا نەژادو ئابڕووی زیناکارەکەو خەڵکی دەپارێزرێ، بە سزای شەڕابخۆر عەقڵ دەپارێزرێ، بە سزای دز ماڵی خەڵك دەپارێزرێ، بە سزای بوختانکەر ئابڕووی خەڵك دەپارێزرێ.

ئینجا بزانە: هەر موسوڵمانێك تاوانێکی لەو تاوانانە کردو سزا درا، ئەوە بەو سزادانە –جگە لە کافربوون– گوناهکارەکە دەکەوێتە بەر حەزکردنی خوایگەورە، ئەگەر خوا حەز بکا: عەفوی دەکا، ئەگەر حەزیش بکا: لە دۆزەخ سزای دەدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکانداو لە (شرح مسلم) لە شەرحی ئەم حەدیسەدا ڕوون کراوەتەوە:

﴿عن عبادةﷺ: قال النَّبِيُّﷺ: تُبَايِعُونِی عَلَی أَلاَّ تُشْرِكُوا بِاللهِ شَيْئاً وَلاَ تَزْنُوا وَلاَ تَسْرِقُوا وَلاَ تَقْتُلُواالنَّفْسَ الَّتِی حَرَّمَ اللهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، فَمَنْ وَفَّی مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَىاللهِ وَمَنْ أَصَابَ شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ فَعُوقِبَ بِهِ فِىالدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ فَسَتَرَهُ اللهُ عَلَيْهِ فَأَمْرُهُ إِلَى اللهِ: إِنْ شَاءَ عَفا عَنْهُ وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ﴾ رواه الشيخان، پەیمانم بدەنێ: کە هاوبەش بۆ خوا دانەنێن و زینا نەکەن و دزی نەکەن و کوشتنی بە ناهەق نەکەن، جا هەر کەسێك ئەم پەیمانەی بەجێ هێنا، ئەوە پاداشتی لە سەر خودا یە، هەر کەسێکیش لەو تاوانانە تاوانێکی کردو لە دونیا لە سەر تاوانەکە سزا درا، ئەوە سزایەکە گوناهەکەی لادەبا، وە ئەگەر گوناهەکەی کردو خوایگەورە لێی ئاشکرا نەکرد، ئەوە کارەکەی بۆلای خوایە: ئەگەر خوا حەز بکا عەفوی دەکا، ئەگەر حەزیش بکا سزای دەدا.

جا بزانە: تاوانی کافربوون –تەنها– بە تۆبە: بە موسوڵمانبوونەوە لادەکەوێ، واتە: بە کوشتنیش لاناکەوێ، هەروەك لە (باسی پاشگەزبوون)دا ڕوون کراوە.

ئینجا بزانە: زیناکردن –لە دوای کوشتن– لە هەموو گوناهە گەورەکان گەورەترەو لە هیچ ئایینێکدا حەڵاڵ نەکراوە، چونکە تاوانکردنێکە بۆ سەر نەژاد و ئابڕوو.

إِيلاَجُ الذَّكَرِ بِفَرْجٍ مُحَرَّمٍ لِعَيْنِهِ خَالٍ عَنِ الشُّبْهَةِ مُشْتَهًى يُوجِبُ الْحَدَّ، وَدُبُرُ ذَكَرٍ وَأُنْثَى كَقُبُلٍ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَلاَ حَدَّ بِمُفَاخَذَةٍ وَوَطْءِ زَوْجَتِهِ وَأَمَتِهِ فِي حَيْضٍ وَصَوْمٍ وَإِحْرَامٍ، وَكَذَا أَمَتِهِ الْمُزَوَّجَةِ وَالْمُعْتَدَّةِ، وَكَذَا مَمْلُوكَتِهِ الْمَحْرَمِ وَمُكْرَهٍ فِي الأَظْهَرِ،

---

ئینجا مەبەست بە زیناکردن ئەمەیە: (إِيلاَجُ الذَّكَرِ بِفَرْجٍ مُحَرَّمٍ) تێنانی سەری (ذَکَر)ی نێرینەیە دەناو (فَرْج)ێکی حەرام، کە (لِعَيْنِه) لە بەر خودیتێنانەکە حەرام بێ، هەم (خَالٍ عَنِ الشُّبْهَة) هیچ شوبهەشی تێدا نەبێو (مُشْتَهًى) حەزیشی لێبکرێ، جا ئەگەر تێنانەکە ئەو ناتۆرانەی لێهاتنە جێ، ئەو کاتە (يُوجِبُ الْحَدَّ) سزای زینا واجب دەکا: کە دارکاریو دوورخستنەوەی کوڕو کچو، بەردبارانکردنی (مُحْصَن)یداهاتووە.

(وَدُبُرُ ذَكَرٍ وَأُنْثَى كَقُبُلٍ) تێنانی کونی پشتەوەی نێر، یان مێ وەکو تێنانی کونی پێشەوەی ئافرەتی بێگانەیەو زینایە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، کەواتە:

ئەگەر قونگێیەکە کوڕ بێ، سزایەکەی دارکاریو دوورخستنەوەیە، ئەگەر (محصن)بێ، سزایەکەی بەردبارانکردنە، بەڵام سزای قوندەرەکە: دارکاریو دوورخستنەوەیە، هەرچەند (مُحْصَن)ش بێ، جیاوازی پیاو و ئافرەتیش نیە، جا ئەگەر منداڵ، یان شێت، یان زۆرلێکراو بێ، ئەو کاتە هیچ سزای زینای لە سەر نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
(وَلاَ حَدَّ بِمُفَاخَذَةٍ) سزای زینا واجب نابێ: بە هۆی پێداهێنانی ڕانو شوێنەکانیتر، هەم بە پێداهێنانی (فَرْج)ی‌ئافرەت بە (فَرْج)ی‌ئافرەت، هەم بە ئاوهێنانی بە دەستی‌خۆی، چونکە ئەوانە تێنانی (فَرْج)ی حەرام نیە، بەڵام بە هۆی ئەو ڕەفتارانە تەمبێ دەکرێن.
(وَ) هەروەها سزای زینا واجب نابێ: بە (وَطْءِ زَوْجَتِهِ وَأَمَتِـهِ فِـي حَـيْضٍ وَصَـوْمٍ وَإِحْـرَامٍ) جیماعکردنی لەگەڵ ژنو (جاریە)ی‌خۆی لە حاڵەتی حەیزو نیفاسو ڕۆژوو و ئیحڕامدا، چونکە حەرامیەکەی لە بەر خودی‌تێنانەکە نیە، بەڵکو لە بەر چڵکنی‌و تێکدانی خواپەرستی‌یە (وَكَذَا أَمَتِـهِ الْمُزَوَّجَـةِ وَالْمُعْتَـدَّةِ) هەروەها سزای زینا واجب نابێ: بە جیماعکردنی لەگەڵ (جاریە)کەی‌خۆی کە لە کەسێکی‌تر مارە کرابێ، یان لە (عِـدَّة)دابێ (وَكَذَا مَمْلُوكَتِهِ الْمَحْرَمِ) هەروەها لەگەڵ ئەو (جاریە)شی کە مەحرەمی خۆیەتی، چونکە لەوانەدا شوبهەی مڵکایەتی هەیە.
(وَ) هەوەرها (مُكْرَهٍ) سزای زینا لە سەر زۆرلێکراویش نیە، جا زۆرلێکراوەکە: پیاوەکە بێ، یان ئافرەتەکە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، هەروەها ئەگەر بەهەڵەشدا بچێو واتێبگا: ژنی‌خۆیەتی، یان مێردی‌خۆیەتی، سزای زینای لە سەر نیە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿رُفِعَ عَنْ أُمَّتِي اَلْخَطَأُ وَ النِّسْيَانُ وَمَااسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ﴾ حديث حسن رواه ابن ماجه، خوای گەورە لایداوە لە سەر ئوممەتی من: تاوانی هەڵەو لەبیرچوونو ئەو کارەی بە زۆرلێکردن پێیان کراوە.
وَكَذَا كُلُّ جِهَةٍ أَبَاحَهَا عَالِمٌ كَنِكَاحٍ بِلاَ شُهُودٍ عَلَىالصَّحِيحِ، وَلاَ بِوَطْءِ مَيِّتَةٍ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ بَهِيمَةٍ فِالأَظْهَرِ، وَيُحَدُّ فِي مُسْتَأْجَرَةٍ وَمُبِيحَةٍ وَمَحْرَمٍ وَإِنْ كَانَ تَزَوَّجَهَا،

---

(وَكَذَا كُلُّ جِهَةٍ أَبَاحَهَا عَالِمٌ) هەروەها هەر ڕوویێکی جیماعێك كە زانایەکی (مُجْتَهِد) فەرموبێتی: حەڵاڵە. ئەویش سزای زینا واجب ناکا، چونکە شوبهەی جیاوازی فەرموودەکانی زانایانی تێدایە (كَنِكَاحٍ بِلاَ شُهُودٍ) وەك مارەبڕینێکی بێ‌شاهید (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە لە مەزهەبی ئیمام (مالك)دا دروست دەبێ، یان بە بێ (وَلِي)، چونکە لە مەزهەبی ئیمامی (حنفي)دا دروست دەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِدْرَءُواالْحُدُودَ بِالشُّبُهَاتِ مَااسْتَطَعْتُمْ﴾ رواه الحاكم والبيهقى بسند صحيح، هەتا دەتوانن سزای تاوانەکان بە هۆی شوبهەکان لابدەن.
(وَلاَ بِوَطْءِ مَيِّتَةٍ) هەروەها بە جیماعکردن لەگەڵ ئافرەتێکی مردوو سزای زینا واجب نابێ،

بەڵكو تەمبێ دەكرێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەم (وَلاَ بَهِيمَةٍ) بە جیماعكردن لەگەڵ ئاژەڵیش سزای زینا واجب نابێ، بەڵكو تەمبێ دەكرێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فـەرموودەی بەهێزتردا، چونكە مردوو و ئاژەڵ حەزیان لێناكرێ لە لایـەن خـاوەن تەبیعـەتێكی پـاك، بەڵام لە فەرموودەكانیتردا: ئەو دوو زیناكارانەش سزای زینایان لە سەر واجب دەبێ.

جا بزانە: دروست نیە ئاژەڵەكە بكوژرێ، بەڵام ئەگەر ئاژەڵەكە گۆشتی بخورێ، ئەوە بـە سەربڕین گۆشتەكەی حەڵاڵە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها (يُحَدُّ فِي مُسْتَأْجَرَةٍ) سزای زینا دەدرێ ئەگەر زینا لەگەڵ ئەو ئافرەتە بكا: كە بۆ زینا بە كرێ گیراوە، هەم (وَمُبِيحَةٍ) لەگەڵ ئەو ئافرەتـەش كـە (فَـرْج)ی خـۆی حـەڵاڵ كردوە، كەواتە: ئافرەتەكەش—لە هەردوو مەسەلەكەدا— سزای زینا دەدرێ، چونكە نە بە كرێو نە بە حەڵاڵكردن زینا حەڵاڵ نابێ.

هەم (وَمَحْرَمٍ) بە زینـاكردن لەگـەڵ مـەحرەمێكیخۆی سـزای زینـا دەدرێ، جیـاوازی نیـە مەحرەمیەكە: بە هۆی نەژاد بێ، یان بە شیرخواردن، یـان بـە زاواوخەزورایـەتی—كـە لـە (پـەڕتوكی ژن مـارەكردن)دا هەرسـێكیان ڕوون كرانـەوە— (وَإِنْ كَـانَ تَزَوَّجَهَـا) هەرچـەند مەحرەمەكەشی لە خۆی مارە كردبێ، سزای زینای هەر دەدرێ، بەڵكو لە مەزهەبی ئیمام (أحمد)دا واجبە: بكوژرێو مڵكو ماڵەكەشی بۆ (بَيْتُ الْمَالِ) لێبستێندرێ ﴿عن البراء عن عَمِّهِ رضىالله عنهما: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِﷺ إِلي رَجُلٍ نَكَحَ اِمْرَأَةَ أَبِيهِ فَأَمَرَنِي أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ وَآخُذَ مَالَهُ﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، پێغەمبەرﷺ ناردمیە لای پیاوێك: كە ژنـی بـاوكی خۆی لە خۆی مارە كردبۆوە، فەرمانی پێكردم: بیكوژمو ماڵەكەشی وەربگرم.

هەروەها ئەگەر ژنیخۆی سێبەسێ تەڵاق دابێو جیماعی لەگەڵ بكا، یان ژنێكـی خـاوەن مێرد، یان ژنێكی لە (عِدَّة)ی كەسێكیتردا لەخۆی مارە بكاو جیماعی لەگەڵ بكا، یان چوار

وَشَرْطُهُ اَلتَّكْلِيفُ إِلاَّ السَّكْرَانَ، وَعِلْمُ تَحْرِيمِهِ، وَحَدُّ الْمُحْصَنِ: اَلرَّجْمُ،

---

ژنی هەبێو ژنێكیپێنجەمیش مارە بكاو جیماعی لەگەڵ بكا، یـان خوشـكیژنەكەی، یـان پووریژنەكەی بە سەر ژنەكەیدا مارە بكاو جیماعی لەگەڵ بكا، یان ئافرەتێكی كـافربوو، یان بت پەرست لەخۆی مارە بكاو جیماعی لەگەڵ بكا، یان ئافرەتێكیموسوڵمان شوو بە كافرێك بكاو جیماعی لەگەڵ بكا، ئەوە لەو هەموو مەسەلانەدا سزای زینا لە سەر گشتیان واجب دەبێ، چونكە مـارەبڕینی نادروسـت لێـرەدا ڕەچـاو نـاكرێ، هـەروەك لـە (تحفة)و (مغني)دا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

## ﴿ مەرجەكانی سزای زیناكەر ﴾

(وَشَرْطُهُ) مەرجی واجببوونی سزای زینا ئەمەیە: (اَلتَّكْلِيفُ) زیناكارەكە بالغو عاقڵ بـێ، جیاوازی تێنەرو تێنراو نیە، واتە: منداڵو شێت سزای زینایان لە سەر نیە، بەڵكو تـەمبێ

دەكرێن، جیاوازی نیە تێنەرو تێنراوەكە: هەردووكیان مندالْ، یان شێت بن، یان تەنها یەكێكیان، بە بەلْگەی حەدیسەكەی ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ﴾ی‌رابردوو لە باسی پاشگەزبوونەوەدا (إلاّ السَّكْرَانَ) بەلاّم سزای زینا لە سەر زیناكەری سەرخۆش واجب دەبێ: جا تێنەر بێ، یان تێنراو، بەو مەرجەی بە قەسدی سەرخۆشكەرەكەی خواردبێتەوەو زانیبێتی سەرخۆشكەرە، هەروەك لە (پەرتوكی‌تەلاّق)دا رابرا.

(وَ) هەروەها مەرجە: (عِلْمُ تَحْرِيمِهِ) زیناكەرەكە بزانێ زینا حەرامە، واتە: ئەگەر زیناكەرێك نەیزانیبێ زینا حەرامە؟ چونكە تازە موسولْمان بوو، یان لە موسولْمانان دوور بوو، ئەوە سزای زینای لە سەر نیە، بەلاّم ئەگەر زیناكەرەكە بلْێ: دەمزانی زینا حەرامەو نەمدەزانی سزای هەیە، ئەو كاتە سزای زینایەكەی لە سەر واجب دەبێ، هەروەها مەرجە: زینایەكە بە خۆشی‌خۆی بێ، هەروەك رابرا.

هەروەها ئەگەر ژنێك بلْێ: هەوالْی مردنی‌مێردەكەم گەیشتێ‌و منیش (عِدَّة)م تەواو بوو و شووم كردەوە، ئەوەش سزای زینای لە سەر نیە، هەروەك (الشبراملسی) گێراویەتیەوە.

(وَحَدُّ الْمُحْصَنِ الرَّجْمُ) سزای زیناكەری(مُحْصَن): بەردبارانكردنە تا دەمرێ–بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام–جیاوازی پیاو و ئافرەت نیە ﴿عن ابن عباس رضی‌الله عنهما: قال عُمَرُ ﷺ وَهُوَ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: كَانَ مِمَّا أُنْزِلَ آيَةُ الرَّجْمِ قَرَأْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا، فَرَجَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: مَا نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللهِ فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللهُ تَعَالَى، وَإِنَّ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أَحْصَنَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ أَوْ كَانَ الْحَبَلُ أَوِ الإِعْتِرَافُ﴾ رواه الشیخان وأصحاب السنن، ئیمامی (عمرﷺ) لە سەر مینبەری پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایەتی بەردبارانكردنی زیناكەر –واتە: ئایەتی﴿اَلشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ﴾– یەكێك بوو لەو ئایەتانەی لە

وَهُوَ مُكَلَّفٌ حُرٌّ وَلَوْ ذِمِّيٌّ غَيَّبَ حَشَفَتَهُ بِقُبُلٍ فِي نِكَاحٍ صَحِيحٍ، لاَ فَاسِدٍ فِي الأَظْهَرِ، وَالأَصَحُّ اشْتِرَاطُ التَّغْيِيبِ حَالَ حُرِّيَّتِهِ وَتَكْلِيفِهِ، وَأَنَّ الْكَامِلَ الزَّانِيَ بِنَاقِصٍ مُحْصَنٌ، وَالْبِكْرِ الْحُرِّ: مِأَةُ جَلْدَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ إِلَى مَسَافَةِ قَصْرٍ

---

قورئان بۆ پێغەمبەرﷺ هاتبونە خوارەوە، ئێمەش ئایەتەكەمان خوێندو لەبەرمان كردو لێیشی تێگەیشتین، پێغەمبەریشﷺ زیناكەری بەردباران كردو ئێمەش لە دوای وی بەردبارانمان كرد، جا دەترسم یەكێك بلْێ: بەردبارانی زیناكەر لە قورئاندا نیەو گومڕا بن بە هۆی نەكردنی واجبێك كە خوا ناردویەتیە خوارەوە، بە راستی بەردبارانكردن لە قورئاندا واجبە: لە سەر ئەو كەسەی زینای كردوە بەو مەرجەی (مُحْصَن) بێ: لە پیاوان‌و لە ئافرەتان، هەر كاتێك شاهیدەكانی زینا هەبن، یان ئاوسی، یان دانپێداهێنان.

واتە: بڕیاری ئایەتەكە هەر بەردەوامەو تەنها خوێندنەوەی (نَسْخ) بۆتەوە، ئایەتەكەش لە

سورەتی(الأحزاب) بوو، هەروەك (النسائی) گێڕاویەتەوە.
(وَهُوَ مُكَلَّفٌ حُرٌّ) مەبەست بە (مُحْصَن): مرۆڤێكی بالغو عاقڵو ئازادە-(وَلَوْ ذِمِّيٌّ) هەرچەند كافری پەیمان لە ئەستۆش بێ- كە پێش زیناكردن (غَيَّبَ حَشَفَتَهُ بِقُبُلٍ) پیاوەكە سەری (ذَكَر)ی خۆی تێنابێتە ناو پێشەوەی ئافرەتێك، یان ئافرەتەكە سەری (ذكر)ێكی تێندرابێ، واتە: ژنەكە، یان پیاوەكە تەنها جارێك جیماعێكیان كردبێ (فِي نِكَاحٍ صَحِيحٍ) لە مارەبڕینێكی دروستبوودا، هەرچەند ئافرەتەكەش لە حەیزدا بوبێ (لاَ فَاسِدٍ فِيالأَظْهَرِ) نەك لە مارەبڕینێكی نادروستدا، لە فەرموودەی بەهێزتردا.
(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (اِشْتِرَاطُ التَّغْيِيبِ حَالَ حُرِّيَّتِهِ وَتَكْلِيفِهِ) مەرجە تێنانەكە -واتە: جیماعەكە- لە حاڵەتی بالغیو عاقڵیو ئازادیدا بوبێ، كەواتە: ئەگەر منداڵێك، یان شێتێك، یان كۆیلەیەك لە مارەبڕینێكی دروستبوودا جیماع لەگەڵ ژنی خۆیان، یان لەگەڵ مێردی خۆیان بكەن، نابنە (مُحْصَن)، بەڵام (وَأَنَّ الْكَامِلَ الزَّانِيَ بِنَاقِصٍ) ئەو زیناكەرە بالغو عاقڵەی بە هۆی نەبالغێك، یان شێتێك كامڵ بوە، واتە:-پێش زیناكردن-لە مارەبڕینێكی دروستبوودا جیماعی لەگەڵ ژنێكی منداڵ، یان شێت كردوە، ئەویش بە (مُحْصَنٌ) دادەندرێ، جیاوازی نیە جیماعكەرەكە: پیاو بێ، یان ئافرەت.
هەروەها لەو مەسەلانەدا جیاوازی موسوڵمانو كافری پەیمان لەئەستۆ نیە ﴿عن ابن عمر رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ بِرَجْمِ يَهُودِيٍّ وَيَهُودِيَّةٍ قَدْ زَنَيَا﴾ رواه الشيخان، پیاوێكی جولەكەو ئافرەتێكیجولەكە زینایان كرد، پێغەمبەرﷺ فەرمانیدا: بەردباران بكرێن.
(وَالْبِكْرِ) سزای كوڕو كچی زیناكەر-كە (مُحْصَن) نەبێ، واتە: لە مارەبڕینێكیدروستبوودا جیماعی نەكردبێو- (الْحُرِّ) ئازادیش بێ: (مِأَةُ جَلْدَةٍ) لێدانی سەد شوڕكەدارە، هەم (وَتَغْرِيبُ عَامٍ) دوورخستنەوەیشی ماوەی ساڵێك: لە شوێنی خۆیەوە (إِلَى مَسَافَةِ قَصْرٍ فَمَا فَوْقَهَا، وَإِذَا عَيَّنَ الإِمَامُ جِهَةً فَلَيْسَ لَهُ طَلَبُ غَيْرِهَا فِالأَصَحِّ، وَيُغَرَّبُ غَرِيبٌ مِنْ بَلَدِ الزِّنَا إِلَى غَيْرِ بَلَدِهِ، فَإِنْ عَادَ إِلَى بَلَدِهِ مُنِعَ فِالأَصَحِّ، وَلاَ تُغَرَّبُ اِمْرَأَةٌ وَحْدَهَا فِالأَصَحِّ بَلْ مَعَ زَوْجٍ أَوْ مَحْرَمٍ وَلَوْ بِأُجْرَةٍ، فَإِنْ اِمْتَنَعَ بِأُجْرَةٍ لَمْ يُجْبَرْ فِالأَصَحِّ، وَالْعَبْدِ: خَمْسُونَ وَيُغَرَّبُ نِصْفَ سَنَةٍ،

---

فَمَا فَوْقَهَا) بۆ شوێنێكیتر كە بە ئەندازەی كورتكردنەوەی نوێژو بە سەرەوەتر دوور بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِأَةَ جَلْدَةٍ﴾ ئافرەتی زیناكەرو پیاوی زیناكەر هەر یەكەیان سەد شوڕەكە داریان لێبدەن.
هەم پێغەمبەریشﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِأَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ﴾ رواه مسلم، سزای زینای كوڕو كچ لێدانی سەد شوڕكەدارەو هەم دوورخستنەوەی ساڵێكە.
(وَإِذَا عَيَّنَ الإِمَامُ جِهَةً) هەر كاتێك كاربەدەست شوێنێكی بۆ دوورخستنەوەكە

دیاری کرد (فَلَيْسَ لَهُ طَلَبُ غَيْرِهَا فِي‌الأَصَحِّ) زیناکەرەکە مافی نیە داوای شوێنێکی‌تر بکا، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە مەبەست لە دوورخستنەوەکە: خەفەتبارکردنیەتی (وَيُغَرَّبُ غَرِيبٌ مِنْ بَلَدِ الزِّنَا) زیناکەرێك کە خەڵکی شوێنی زینایەکە نەبێ، لە شوێنی زینایەکەوە دوور دەخسرێتەوە (إِلَى غَيْرِ بَلَدِهِ) بۆ شوێنێکی‌تری جگە لە وولاتەکەی خۆی.

جابزانە: واجبە زیناکەری دوورخراوە ساڵێکی تەواو–بە دوای یەکدا– لە شوێنەکە بمێنێتەوە، کەوابو: (فَإِنْ عَادَ إِلَى بَلَدِهِ) ئەگەر دوورخراوەکە گەڕاوە بۆ شوێنەکەی خۆی (مُنِعَ فِي الأَصَحِّ) قەدەغە دەکرێ‌و پێویستە سەر لەنوێ دەست بە ساڵەکە بکاتەوە، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَا تُغَرَّبُ امْرَأَةٌ وَحْدَهَا فِي‌الأَصَحِّ) نابێ ئافرەتی زیناکەر بە تەنها دوور بخرێتەوە، لە فەرموودەی ڕاستتردا (بَلْ مَعَ زَوْجٍ أَوْ مَحْرَمٍ) بەڵکو دەبی مێردەکەی، یان مەحرەمێکی لەگەڵدا بێ (وَلَوْ بِأُجْرَةٍ) هەرچەند لەگەڵدابوونی مێردەکەو مەحرەمەکەش بە کرێ بێ (فَإِنْ امْتَنَعَ بِأُجْرَةٍ) جا ئەگەر مێردەکەی، یان مەحرەمەکەی بە کرێش لەگەڵی نەچو (لَمْ يُجْبَرْ فِي‌الأَصَحِّ) زۆری لێناکرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەو تاوانی نیە.

(وَالْعَبْدِ خَمْسُونَ) سزای کۆیلەی زیناکەر لێدانی پەنجا شۆڕکە دارە، هەم (وَيُغَرَّبُ نِصْفَ سَنَةٍ) ماوەی نیو ساڵیش دوور دەخرێتەوە، واتە: کۆیلەی زیناکەر–پیاو بێ، یان ئافرەت– بەردباران ناکرێ، هەرچەند لە مارەبڕینێکی‌دروستبووشدا جیماعی کردبێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ هەر کاتێك جاریەکانتان بوونە (مُحْصَن) ئەگەر زینایان کرد، نیوەی ئافرەتانی‌ئازاد سزای زینایان لە سەر واجب دەبێ. واتە: نیوەی دارکاریەکە، وَفِي قَوْلٍ سَنَةً، وَفِي قَوْلٍ لَا يُغَرَّبُ، وَيَثْبُتُ بِبَيِّنَةٍ أَوْ إِقْرَارٍ مَرَّةً، وَلَوْ أَقَرَّ ثُمَّ رَجَعَ سَقَطَ،

---

چونکە بەردبارانکردن نابێتە نیوە (وَفِي قَوْلٍ سَنَةً) لەفەرموودەیەکدا: ماوەی ساڵێك دوور دەخرێتەوە (وَفِي قَوْلٍ لَا يُغَرَّبُ) لە فەرموودەیەکدا دوور ناخرێتەوە.

### ﴿ ئاشکرابوونی زینا ﴾

(وَيَثْبُتُ) زیناکردن ئاشکرا دەبێ بە دوو ڕێگا، یەکەم: (بِبَيِّنَةٍ) بە شاهیدی چوار پیاو، کە بڵێن: (شاهیدی دەدەم فلانکەس سەری (ذَکَر)ی خۆی بە زینا بردە ناو (فَرْج)ی فلانە ئافرەتە لە فلانە شوێنەو لە فلانە کاتەدا).

خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ﴾ چوار شاهیدی لە خۆتان–واتە: لە موسوڵمانان– داوا بکەن لە سەر ئەو ئافرەتانەی زینایان کردوە.

جا بزانە: نابێ مێردی ژنەکە یەکێك بێ لەو چوار شاهیدانە، هەروەك لە باسەکەی داهاتوودا

له (تحفه)دا فەرموویەتی، هەروەها سوننەتە: شاهیدەکان ئەو گوناهە داپۆشن‌و شاهیدیی له سەر نەدەن ئەگەر بەرژەوەندیی تێدابێ، بەڵام ئەگەر بە هۆی شاهیدی‌نەدانەکە زیان بە کەسێکی‌تر دەگەیشت، ئەو کاتە واجبە: شاهیدیەکە بدا، ئەگینا: گوناهبار دەبێ، هەروەك له (مغنی)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

دووەم: (أَوْ إِقْرَارٍ مَرَّةً) زینایەکە ئاشکرا دەبێ: بە دانپێداهێنانی زیناکەرەکە تەنها یەك جار، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ئیمامی (عمر)ی‌ڕابردوو، هەم پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أُغْدُ يا أُنَيْسُ إلَى اِمْرَأَةِ هذا، فَإِنْ إِعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا ﴾ رواه الشيخان، ئەی (أُنَيْس) برۆ لای ژنی ئەم پیاوە، ئەگەر دانی بە زینادا هێنا بەردبارانی بکە.

جا بزانە: بۆ زیناکەرەکەو بۆ گشت گوناهکارێك وەها سوننەتە: گوناهەکەیان داپۆشن‌و لە لای کاربەدەست ئاشکرای نەکەن‌و لە نێوان خۆیان‌و خوای‌گەورەدا تۆبە بکەن.

هەروەها حەرامە: بۆ گاڵتە لە لای خەڵك گوناهەکە باس بکەن، چونکە چەند حەدیسێکی (صحیح) لەم بارەیەوە هاتون –کە ئەم جۆرە گوناهبارە عەفو ناکرێ– هەم لە (مغنی)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ أَقَرَّ) ئەگەر زیناکەرەکە دانی بە زینایەکەدا هێنا (ثُمَّ رَجَعَ) ئینجا پەشیمان بۆوەو گوتی: درۆم کرد زینام نەکردوە. ئەوە (سَقَطَ) سزای زینای لە سەر لادەکەوێ، چونکە پیاوێك دانی بە زینادا هێناو (صحابة)کان بەردبارانیان کرد، ئەویش لە بەر ئازاری بەردبارانەکە هەڵاتو (صحابة)کانیش وازیان لێنەهێنا تا کوشتیان، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿هَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ لَعَلَّهُ يَتُوبُ﴾ رواه أبوداود وأصله فی‌الصحيحين، خۆزگە وازتان لێهێنابا بەڵکی تۆبەی دەکرد، واتە: پەشیمان دەبۆوە.

وَلَوْ قَالَ لاَ تَحُدُّونِي أَوْ هَرَبَ فَلاَ فِـالأَصَحِّ، وَلَوْ شَهِدَ أَرْبَعَةٌ بِزِنَاهَا وَأَرْبَعُ نِسْوَةٍ أَنَّهَا عَذْرَاءُ لَمْ تُحَدَّ هِيَ وَلاَ قَاذِفُهَا،

---

جا بزانە: ئەگەر لە دانپێداهێنانەکەدا ناوی ئەوکەسەی هێنابو: کە زینای لەگەڵ کردوە، زینا لەگەڵکراوەکەش گوتی: ڕاست ناکا. ئەو کاتە سزای بوختانەکەشی لە سەر واجب دەبێ‌و بەو پەشیمانبوونەوەیە لە سەری لاناکەوێ ﴿عن سهلﷺ: أَنَّ رَجُلاً بِكْراً إِعْتَرَفَ أَنَّهُ زَنَى بِامْرَأَةٍ سَمَّاهَا، فَجَلَدَهُ النَّبِيُّﷺ مِأةً وَسَأَلَهُ الْبَيِّنَةَ عَلَىالْمَرْأَةِ فَعَجَزَ وَكَذَّبَتْهُ فَجَلَدَهُ حَدَّ الْفِرْيَةِ ثَمَانِينَ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، کورێك گوتی: زینام لەگەڵ فلانە ئافرەتە کردوە. ئینجا پێغەمبەرﷺ سەد شورکەداری سزای زینای لێداو داوای لێکرد شاهیدیش لە سەر زینای ئافرەتەکە بێنێ، جا شاهیدیشی نەبون‌و ئافرەتەکەش گوتی: درۆ دەکا زینای لەگەڵ من نەکردوە. ئینجا پێغەمبەرﷺ هەشتا شۆرکەی‌تریشی لێدا لە سزای بوختانەکەی.

بەڵام ئەگەر زینا لەگەڵکراوەکەش دان بە زینایەکەدا بێنێ، ئەو کاتە سزای بوختانەکەی لە سەر لادەکەوێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر زینایەکە بە چوار شاهید ئاشکرا ببێ، ئەو کاتە پەشیمانیو تۆبە لە دونیادا سودی نیەو واجبە: لە سەر زینایەکەی سزا بدرێ، بەڵام ئەگەر کافرێکی زیناکەر موسوڵمان ببێ، ئەو کاتە سزای زینایەکەی لە سەر لادەکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر زیناکەرەکە لە دوای دانپێداهێنانەکە گوتی: (لاَ تَحُدُّونِي) سزای زینام لێمەدەن (أَوْ هَرَبَ) یان هەڵات، یان گوتی: وازم لێبێنن. ئەوە (فَلاَ فِيالأَصَحِّ) سزای زینای لە سەر لاناکەوێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام واجبە: وازی لێبهێندرێ، بەڵکی لە دانپێداهێنانەکەی پەشیمان ببێتەوە، جا ئەگەر پەشیمان نەبۆوە، ئەو کاتە دووبارە سزا دەدرێتەوە، جا ئەگەر وازیان لێنەهێناو بە سزادانەکەش مرد، ئەوە هیچ زامینی نیە، هەروەك ـ بە بەڵگەی حەدیسەکەی(هَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ)یڕابردوو ـ لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ شَهِدَ أَرْبَعَةٌ بِزِنَاهَا) ئەگەر چوار پیاو شاهیدییان دا: ئەو ئافرەتە زینای کردوە (وَأَرْبَعُ نِسْوَةٍ: أَنَّهَا عَذْرَاءُ) چوار ئافرەتیش شاهیدییان دا: ئافرەتەکە کچە. ئەوە (لَمْ تُحَدَّ هِيَ) ئافرەتەکە سزای زینای لێنادرێ، لە بەر شوبهەی کچینیەکەی، کەوابو: هەر لە بەر ئەو شوبهەیەش ئەو پیاوەی زیناشی لەگەڵ ئافرەتەکە کردوە، ئەویش سزا نادرێ، هەم (وَلاَ قَاذِفُهَا) ئەوەی بوختانی زیناشی بە ژنەکە کردوە سزای بوختانەکەی لێنادرێ، چونکە چوار شاهید هەنەو دەشگونجێ کچینیەکەی گەڕابێتەوە.

وَلَوْ عَيَّنَ شَاهِدٌ زَاوِيَةً لِزِنَاهُ وَالْبَاقُونَ غَيْرَهَا لَمْ يَثْبُتْ، وَيَسْتَوْفِيهِ الإِمَامُ أَوْ نَائِبُهُ مِنْ حُرٍّ وَمُبَعَّضٍ، وَيُسْتَحَبُّ حُضُورُ الإِمَامِ وَشُهُودِهِ، وَيَحُدُّ الرَّقِيقَ سَيِّدُهُ أَوِ الإِمَامُ، فَإِنْ تَنَازَعَا فَالأَصَحُّ الإِمَامُ، وَأَنَّ السَّيِّدَ يُغَرِّبُهُ، وَأَنَّ الْمُكَاتَبَ كَحُرٍّ، وَأَنَّ الْفَاسِقَ وَالْكَافِرَ وَالْمُكَاتَبَ يَحُدُّونَ عَبِيدَهُمْ.

---

(وَلَوْ عَيَّنَ شَاهِدٌ زَاوِيَةً لِزِنَاهُ) ئەگەر شاهیدێك قوژنەیەك، یان کاتێکی دیاری کرد بۆ زیناکردنی زیناکەرەکەو (وَالْبَاقُونَ غَيْرَهَا) سێ شاهیدەکانیتریش قوژنەیەك، یان کاتێکیتری جگە لەو قوژنەو کاتەیان دیاری کرد، ئەوە (لَمْ يَثْبُتْ) زینایەکە بەو شاهیدانە ئاشکرا نابێو واجبە: هەر چواریان سزای بوختانیان لێبدرێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر ـ پێش سزادان ـ سەد جاریش زینای کردبێو زینایەکەش لە یەك ڕەگەز بێ، ئەوە تەنها یەك سزادان بۆ هەموو زینایەکان بەسە، بەڵام ئەگەر سزا درابو،

ئینجا له دوای سزادان جاریکیتریش زینای کرد، ئەو کاتە دووبارە سزا دەدریتەوە... هەر بەو جۆرە، هەروەك (الشبراملسی) فەرمویەتی.
(وَيَسْتَوْفِيهِ الإِمَامُ أَوْ نَائِبُهُ) واجبە: پیشەوای موسولمانان، یان جیگرەکەی سزای زینا وەربگری (مِنْ حُرٍّ وَمُبَعَّضٍ) له زیناکەری ئازادو له کۆیلەی بەشکراو، کەواتە: ئەگەر یەکیك-بێئیزنی پیشەواو جیگرەکەی- زیناکەریکی کوڕ، یان کچ دارکاری بکا، ئەوە بە بەر سزادانیشەرعی ناکەویو هەم سزادەرەکەش دەبیتە زامن، هەروەك له (مغنی)دا فەرموویەتی، بەلام ئەگەر زیناکەرەکە (مُحْصَن)بیو یەکیك بێئیزنی پیشەواو جیگرەکەی لە بەر زینایەکە بیکوژێ، ئەو کاتە بە بەر سزادانی شەرعی دەکەوێ، هەروك له (تحفه)دا لە کۆتایی سزای بوختاندا فەرموویەتی.
(وَيُسْتَحَبُّ حُضُورُ الإِمَامِ وَشُهُودِهِ) سوننەتە لەکاتی سزادانی زینا پیشەواو شاهیدەکانی زینا ئامادە بن، هەم کۆمەڵە موسولمانیکیتریش ئامادە بن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ با کۆمەڵە ئیمانداریك ئامادەی سزادانی هەردوو زیناکەرەکان بن. هەروەها سوننەتە: شاهیدەکان پیشتر بەردبارانەکە دەست پیبکەن.
(وَيَحُدُّ الرَّقِيقَ سَيِّدُهُ أَوْ الإِمَامُ) سزای زیناو شەڕابخواردنەوەو سزایەکانیتریش گەورەکە له کۆیلەکەی دەدا، یان پیشەوا لێیدەدا (فَإِنْ تَنَازَعَا) جا ئەگەر بووە کیشەیان (فَالأَصَحُّ الإِمَامُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: پیشەوا لێیدەدا، هەم (وَأَنَّ السَّيِّدَ يُغَرِّبُهُ) گەورەکە کۆیلە زیناکەرەکە دوور دەخاتەوە، هەم (وَأَنَّ الْمُكَاتَبَ كَحُرٍّ) کۆیلەی نوسراو پیدراو-ئەگەر زینای کرد- وەکو ئازادە، واتە: پیشەوا سزای دەدا، نەك گەورەکەی.
هەم (وَأَنَّ الْفَاسِقَ وَالْكَافِرَ وَالْمُكَاتَبَ يَحُدُّونَ عَبِيدَهُمْ) گەورە فاسقەکە، یان کافرەکە، یان نووسراو پیدراوەکە گشتیان سزای تاوانەکان له کۆیلەکانیان دەدەن.
وَأَنَّ السَّيِّدَ يُعَزِّرُ وَيَسْمَعُ الْبَيِّنَةَ بِالْعُقُوبَةِ، وَالرَّجْمُ بِمَدَرٍ وَحِجَارَةٍ مُعْتَدِلَةٍ، وَلاَ يُحْفَرُ لِلرَّجُلِ، وَالأَصَحُّ اِسْتِحْبَابُهُ لِلْمَرْأَةِ إِنْ ثَبَتَ بِبَيِّنَةٍ، وَلاَ يُؤَخَّرُ لِمَرَضٍ وَحَرٍّ وَبَرْدٍ مُفْرِطَيْنِ، وَقِيلَ يُؤَخَّرُ إِنْ ثَبَتَ بِإِقْرَارٍ وَيُؤَخَّرُ الْجَلْدُ لِمَرَضٍ، فَإِنْ لَمْ يُرْجَ بُرْؤُهُ جُلِدَ لاَ بِسَوْطٍ بَلْ بِعِثْكَالٍ عَلَيْهِ مِأَةُ غُصْنٍ، فَإِنْ كَانَ خَمْسُونَ ضُرِبَ بِهِ مَرَّتَيْنِ،

---

هەم (وَأَنَّ السَّيِّدَ يُعَزِّرُ) گەورەکە کۆیلەکەی خۆی تەمبێ دەکاو هەم (وَيَسْمَعُ الْبَيِّنَةَ بِالْعُقُوبَةِ) گوێ له شاهیدەکانیش دەگرێ بۆ سزادانی کۆیلەکەی.
(وَالرَّجْمُ بِمَدَرٍ وَحِجَارَةٍ مُعْتَدِلَةٍ) بەردبارانکردنی زیناکەرەکە بە کلۆەتو بەردی مامناوەنجییە، واتە: پڕ لەپەدەست، بەلام نابێ بەردەکان له دەمو چاوی بدرینو نابێ پەلبەست بکرێ، هەم (وَلاَ يُحْفَرُ لِلرَّجُلِ) سوننەت نیە-له کاتی بەردبارانەکەدا- قۆرتیك بۆ پیاوە زیناکەرەکە لێبدرێ، بەلام (وَالأَصَحُّ اِسْتِحْبَابُهُ لِلْمَرْأَةِ) بە فەرموودەی

ڕاستتر: سوننەتە: بۆ ئافرەتە زیناکەرەکە قۆرتێك لێبدرێ تا دەگاتە سینگی (إِنْ ثَبَتَ بِبَيِّنَةٍ) ئەگەر زینایەکەی بە چوار شاهید ئاشکرا بوبێ، واتە: ئەگەر بە دانپێداهێنانی خۆی ئاشکرا بوبێ، ئەو کاتە قۆرتی بۆ لێنادرێ، تاکو ڕێگای هەڵاتنی هەبێ.

جا بزانە: پێش بەردبارانکردنەکە هەردوو زیناکەرەکان داوای تۆبەیان لێدەکرێ، ئەگەر کاتی نوێژ هاتبێ فەرمانیان دەدرێتێ نوێژەکە بکەن، هەم ڕێگایان دەدرێتێ دوو ڕەکعەت سوننەتی کوشتن بکەن‌و ڕێگایان دەدرێتێ ئاو بخۆنەوە–نەك خواردن–، هەم عەورەتی پیاوەکەو هەموو لاشەی ئافرەتەکە دادەپۆشرێ، ئینجا لە دوای مردن دەشۆرێن‌و نوێژیان لە سەر دەکرێ‌و لە گۆڕستانی موسوڵمانان دەنێژرێن، جا ئەگەر لەجیاتی بەردبارانەکە بە شمشێر کوژران، ئەوە بە بەر سزادانەکە دەکەوێ، بەڵام واجبەکە لە دەست دەچێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکان ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَلاَ يُـؤَخَّرُ) نابێ بەردبارانی زیناکەر دوا بخرێ (لِمَـرَضٍ وَحَـرٍّ وَبَـرْدٍ مُفْـرِطَيْنِ) لە بەر نەخۆشیی زیناکەرەکە، یان گەرماو سەرمایەکی بەهێز (وَقِيلَ يُؤَخَّرُ إِنْ ثَبَتَ بِإِقْرَارٍ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بەردبارانەکە دوا دێخرێ ئەگەر بە دانپێداهێنانی خۆی ئاشکرا بوبێ.

بەڵام (وَيُؤَخَّرُ الْجَلْدُ لِمَرَضٍ) دارکاریکردنی زیناکەر لە بەر نەخۆشیی زیناکەرەکە دوا دێخرێ تا چاك دەبێتەوە (فَـإِنْ لَـمْ يُـرْجَ بُـرْؤُهُ) جا ئەگەر زیناکەرەکە چاوەڕوانی چاکبوونەوەی نەدەکرا، ئەو کاتە (جُلِدَ لاَ بِسَوْطٍ) دارکاری دەکرێ بەڵام نەك بە شوڕکەدار (بَلْ بِعِثْكَالٍ عَلَيْهِ مِأَةُ غُصْنٍ) بەڵکو بە هێشوێکی خورما کە سەد لکی پێوە بێ (فَإِنْ كَانَ خَمْسُونَ) جا ئەگەر پەنجا لکی پێوە بوو، ئەو کاتە (ضُرِبَ بِهِ مَرَّتَيْنِ) دوو جار هێشوەکە وَتَمَسُّهُ الأَغْصَانُ أَوْ يَنْكَبِسُ بَعْضُهَا عَلَى بَعْضٍ لِيَنَالَهُ بَعْضُ الأَلَمِ، فَإِنْ بَرَأَ أَجْزَأَهُ، وَلاَ جَلْدَ فِي حَرٍّ وَبَرْدٍ مُفْرِطَيْنِ، وَإِذَا جَلَدَ الإِمَامُ فِي مَرَضٍ أَوْ حَرٍّ وَبَرْدٍ فَلاَ ضَمَانَ عَلَى النَّصِّ فَيَقْتَضِي أَنَّ التَّأْخِيرَ مُسْتَحَبٌّ.

---

لە زیناکەرەکە دەدرێ...بەو جۆرە (وَتَمَسُّهُ الأَغْصَانُ) واجبە: هەموو لکەکانی وێبکەوێ (أَوْ يَنْكَبِسُ بَعْضُهَا عَلَى بَعْضٍ) یان دەبی هەندێکی لکەکان بە سەر هەندێکیانەوە نوسابن (لِيَنَالَهُ بَعْضُ الأَلَمِ) تاکو زیناکەرەکە هەندێك ئازاری بگاتێ.

(فَإِنْ بَرَأَ) جا ئەگەر زیناکەرەکە لە دوای لێدانی هێشوەکە لە نەخۆشیەکەی چاك بۆوە (أَجْزَأَهُ) لێدانی هێشوەکە بە بەر سزای زینایەکەی دەکەوێ‌و دووبارە سزا نادرێتەوە ﴿عن سعيدﷺ: أَنَّ رُوَيْجِلاً ضَعِيفاً خَبَثَ بِأَمَةٍ فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: إِضْرِبُوهُ حَدَّهُ. فَقَالُوا: إِنَّهُ أَضْعَفُ مِنْ ذَلِكَ. فَقالَ النَّبِيُّﷺ: خُذُوا عِثْكَالاً فِيهِ مِأَةُ شَمْراخٍ ثُمَّ اضْرِبُوهُ ضَرْبَةً. فَفَعَلُوا﴾ رواه ابن ماجه بسند حسن، پیاوێکی بچکۆڵەی بێهێز زینای کرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

سزای زینای لێبدەن. گوتیان: زۆر لەوە بێهێزترەو باری دارکاریەکە ناگرێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: یەك جار بە هێشوێکی خورما-سەد لکی پێوەبێ- لێی بدەن. ئینجا بە هێشوەکە لێیان دا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر زیناکەرێك پێش سزادانی زینایەکە شێت ببێ، ئەوە ئەگەر بە دانپێداهێنانی خۆی زینایەکەی ئاشکرا بوبێ، دروست نیە لە حاڵەتی شێتیدا سزا بدرێ، بەڵکو دوا دێخرێ تا چاك دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر بە چوار شاهید زینایەکەی ئاشکرا بوبێ، ئەو کاتە لە حاڵەتی شێتیدا بەردباران دەکرێ.

هەروەها دروست نیە ئافرەتی ئاوس سزای زینا بدرێ، هەر چەند لە زیناش ئاوس بوبێ، بەڵکو دوا دێخرێ تا زگەکەی دادەنێ، ئینجا تا منداڵەکەشی لە شیرخواردن دەپچڕێ نابێ بەردباران بکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرمویانە، چونکە لە (حدیث صحیح)دا گێردراوەتەوە: (ئافرەتێك لە زینا ئاوس بوو، پێغەمبەرﷺ بەردبارانکردنەکەیی دوا خست تا منداڵەکەی لێبو و دەستی بە نان خواردن کرد).

(وَلاَ جَلْدَ فِي حَرٍّ وَبَرْدٍ مُفْرِطَيْنِ) نابێ زیناکەرەکە دارکاری بکرێ لە حاڵەتی نەخۆشیو سەرماو گەرمای بەهێز، نەوەك بمرێ، بەڵام (وَإِذَا جَلَدَ الإِمَامُ فِي مَرَضٍ أَوْ حَرٍّ وَبَرْدٍ) ئەگەر پێشەوا زیناکەرەکەی دارکاری کرد لە حاڵەتی نەخۆشی، یان گەرما، یان سەرمادا، ئینجا زیناکەرەکە بەو دارکارییە مرد (فَلاَ ضَمَانَ عَلَى النَّصِّ) پێشەوا نابێتە زامینن، لە سەر دەقی فەرمودەی ئیمامی شافعی (فَيَقْتَضِي أَنَّ التَّأْخِيرَ مُسْتَحَبٌّ) کەوابو: ئەو فەرموودەیە وادەگەیەنێ: دواخستنی دارکاریکردنەکە سوننەتە، بەڵام بە فەرموودەی ڕاستتر: دواخستنی دارکاریەکە لەو حاڵەتانەدا واجبە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## (كِتَابُ حَدِّ الْقَذْفِ)

شَرْطُ حَدِّ الْقَاذِفِ: اَلتَّكْلِيفُ إِلاَّ السَّكْرَانَ، والإِخْتِيَارُ، وَيُعَزَّرُ الْمُمَيِّزُ، وَلاَ يُحَدُّ بِقَذْفِ الْوَلَدِ وَإِنْ سَفَلَ، فَالْحُرُّ ثَمَانُونَ، وَالرَّقِيقُ أَرْبَعُونَ، وَالْمَقْذُوفِ: اَلإِحْصَانُ وَسَبَقَ فِي اللِّعَانِ،

---

### ﴿ كِتَابُ حَدِّ الْقَذْفِ: پەڕتوکی سزای بوختانی زینا ﴾

واتە: بە مەبەستی ئابڕوو بردن-نەك شاهیدی- بڵێتە پیاوێك، یان ئافرەتێك: زینای کردوە. جا بزانە: بوختان پێکردنی زینا یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، هەروەك لە حەدیسی (صحیح)دا هاتوە، هەم ووشەکانی جنێودانی زیناش لە (باسی لەعنەت لێککردنی ژنو مێرد)دا ڕابرا.

(شَرْطُ حَدِّ الْقَاذِفِ) مەرجی واجببوونی سزای بوختانکەرەکە (اَلتَّكْلِيفُ) ئەوەیە: بالغو عاقڵ بێ، واتە: منداڵو شێت سزای بوختانی زینایان لە سەر واجب نابێ، بە بەڵگەی

حەدیسەکەی ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ﴾ی ڕابردوو لە (باسی کافربوون)دا (إلاَّ السَّكْرَانَ) بەڵام سزای بوختان لە سەر بوختانکەری سەرخۆش واجب دەبێ.

(وَ) هەروەها (الإِخْتِيَارُ) مەرجە بوختانکەرەکە بە خۆشی خۆی بوختانەکەی کردبێ، واتە: زۆرلێکراو سزای بوختانەکەی لە سەر نیە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو لە سەرەتای (زینا)دا، هەروەها زۆرلێکەرەکەش سزای لە سەر نیە، بەڵام تەمبێ دەکرێ

(وَ) هەروەها (يُعَزَّرُ الْمُمَيِّزُ) منداڵی فامیدەو شێتی فامیدە لە سەر بوختانی زینا تەمبێ دەکرێن بەڵام سزا نادرێن.

(وَلاَ يُحَدُّ بِقَذْفِ الْوَلَدِ) باوك و دایك -ئەگەر بوختانی زینا بە منداڵەکەیان بکەن- سزا نادرێن (وَإِنْ سَفَلَ) هەر چەند منداڵەکەش بەرەوخوارەوەش بێ، بەڵام تەمبێ دەکرێن.

ئینجا بزانە: سزای بوختانەکە بە یەکێك لەو چوار شتانە لە سەر بوختانکەرەکە لادەچێ: بە هێنانی چوار شاهیدی زینا، یان بە دانپێداهێنانی بوختان پێکراوەکە، یان بە لێبوردنی بوختان پێکراوەکە، یان بە لەعنەت لێککردنی ژن و مێرد: بەو شێوەی لە (اللعان)دا ڕابرا.

جا هەر کاتێك سزای بوختانەکە واجب ببێ، ئەوە (فَالْحُرُّ ثَمَانُونَ) بوختانکەری ئازاد هەشتا شوڕکەداری لێدەدرێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾ ئەوانەی بوختانی زینا بە ئافرەتانی داوێنپاك دەکەن و چوار شاهیدیش ناهێنن، هەشتا شوڕکەداریان لێبدەن. (وَالرَّقِيقُ أَرْبَعُونَ) بوختانکەری کۆیلەش چل شوڕکەداری لێدەدرێ.

(وَالْمَقْذُوفِ) مەرجی بوختان پێکراوەکەش: (الإِحْصَانُ) ئەوەیە (مُحْصَن) بێ (وَسَبَقَ فِي اللِّعَانِ) پێناسەی (مُحْصَن) لە باسی (لەعنەت لێککردنی ژن و مێردا) ڕابرا: کە بالغ و عاقڵ و ئازاد و موسوڵمان و داوێنپاك بێ. واتە: ئەگەر بوختان پێکراوەکە یەکێکی لەو

وَلَوْ شَهِدَ دُونَ أَرْبَعَةٍ بِزِنًا حُدُّوا فِي الأَظْهَرِ، وَكَذَا أَرْبَعُ نِسْوَةٍ و عَبِيدٍ وَكَفَرَةٍ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ شَهِدَ وَاحِدٌ عَلَى إِقْرَارِهِ فَلاَ، وَلَوْ تَقَاذَفَا فَلَيْسَ تَقَاصًّا، وَلَوْ اِسْتَقَلَّ الْمَقْذُوفُ بِالإِسْتِيفَاءِ لَمْ يَقَعِ الْمَوْقِعَ.

---

مەرجانە لێنەهاتە جێ، ئەو کاتە بوختانکەرەکە سزا نادرێ، بەڵکو تەمبێ دەکرێ.

(وَلَوْ شَهِدَ دُونَ أَرْبَعَةٍ بِزِنًا) ئەگەر لە چوار شاهید کەمتر شاهیدی زینایان لە سەر یەکێك دا، ئەوە (حُدُّوا فِيالأَظْهَرِ) گشتیان سزای بوختانیان لێدەدرێ، لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە ئایەتەکە داوای چوار شاهیدی کردوە، بۆیێ ئیمامی(عمرﷺ) سزای بوختانی لە سێ شاهیدی زینا داوە، هەروەك (البخاري) گێڕاویەتیەوە.

هەروەها ئەگەر مێردی ژنەکەش یەکێك بێ لە چوار شاهیدەکان، ئەو کاتەش مێردەکەو شاهیدەکانیش سزای بوختانیان لێدەدرێ، چونکە شاهیدیی مێردەکە -لە سەر

ژنەکەی– وەرناگیرێ.

جا بزانە: لەو حاڵەتانەدا شاهیدەکان مافیان هەیە: داوای سوێندی بوختانپێکراوەکە بکەن: کە زینای نەکردوە، جا ئەگەر ئەو سوێندی نەخوارد، ئەو کاتە ئەوان سوێند دەخۆن و سزا نادرێن، بەڵام ئەگەر ئەو سوێند بخوا، یان ئەوان سوێند نەخۆن، ئەو کاتە ئەوان سزا دەدرێن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَكَذَا أَرْبَعُ نِسْوَةٍ وعَبِيدٍ وكَفَرَةٍ) هەروەها ئەگەر چوار ئافرەت، یان چوار کۆیلە، یان چوار کافر شاهیدیی زینایەکە بدەن، گشتیان سزای بوختانیان لێدەدرێ (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە ئەوانە نابنە شاهیدی زینا، بەڵام (وَلَوْ شَهِدَ وَاحِدٌ عَلَى إِقْرَارِهِ) ئەگەر تەنها یەك کەس شاهیدیی دا: لە سەر دانپێداهێنانی زیناکەرەکە بە زینا، ئەو کاتە (فَلاَ) شاهیدەکە سزا نادرێ، چونکە قسەی ئەوی گێڕاوەتەوە.

(وَلَوْ تَقَاذَفَا) ئەگەر دوو کەس جنێوی زینایان بە یەکتریدا (فَلَيْسَ تَقَاصًّا) ئەوە تۆڵەکردنەوە نیەو سزای بوختانی هیچێکیان لە سەر ئەویتر لاناکەوێ و هەر یەکەیان مافی سزادانی ئەویتری هەیە، بەڵام ئەگەر–جگە لە زینا– بە جنێوێکیتر جنێوی پێدرا، ئەو کاتە بۆی دروستە هەمان جنێوی پێبداتەوە، بەو مەرجەی جنێوەکە درۆو بوختان نەبێ، بەڵام دروست نیە جنێو بە دایكو باوکی جنێودەرەکە بداتەوە، هەروەها بۆ ستەم لێکراویش دروستە دوعا لە ستەمکارەکەی بکا، جا هەر کاتێك جنێوەکەی بە جنێودەرەکە داوە، ئەوە مافی خۆی لێوەرگرتەوەو تەنها گوناهی دەست پێشخەریەکە لە سەر جنێودەرەکەیەکەم دەمێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ اسْتَقَلَّ الْمَقْذُوفُ بِالإِسْتِيفَاءِ) ئەگەر بوختان پێکراوەکەی سەربەخۆ سزای بوختانەکەی لە بوختانکەرەکە دا (لَمْ يَقَعِ الْمَوْقِعَ) سزایەکە شوێنی سزای شەرعی ناگرێتەوەو سزایەکەی

## (كِتَابُ قَطْعِ السَّرِقَةِ)

يُشْتَرَطُ لِوُجُوبِهِ فِالْمَسْرُوقِ أُمُورٌ: كَوْنُهُ رُبُعَ دِينَارٍ خَالِصًا أَوْ قِيمَتَهُ، وَلَوْ سَرَقَ رُبُعًا سَبِيكَةً لاَ يُسَاوِى رُبُعًا مَضْرُوبًا فَلاَ قَطْعَ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ سَرَقَ دَنَانِيرَ ظَنَّهَا فُلُوسًا لاَ تُسَاوِى رُبُعًا قُطِعَ، وَكَذَا ثَوْبٌ رَثٌّ فِى جَيْبِهِ تَمَامُ رُبُعٍ جَهِلَهُ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ أَخْرَجَ نِصَابًا مِنْ حِرْزٍ مَرَّتَيْنِ

---

هەر لە سەر دەمێنێ، جا ئەگەر سزادراوەکەش ئیزنی نەدابێ و بەو سزایە مرد، ئەو کاتە سزادەرەکە لە تۆڵەیی دەکوشترێتەوە، چونکە مەرجە: کاربەدەستی موسوڵمان سزای تاوانەکان بدا، ئەگینا: سزادانەکە دروست نابێ، بەڵام ئەگەر شوێنێك کاربەدەستی لێنەبو و نەدەگونجا داوایەکەی بۆ کاربەدەستێك بەرز بکاتەوە، ئەو کاتە دروستە سەربەخۆ بە

سنوری شەرع بوختانکەرەکە سزا بدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ كِتَابُ قَطْعِ السَّرِقَةِ: **پەرتوکی سزای دزیکردن** ﴾

خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا﴾ پیـاوی دزو ئـافرەتی دز دەستەکانیان ببڕن. (يُشْتَرَطُ لِوُجُوبِهِ) بە مەرج دادەندرێ بۆ واجببونی بڕینی دەسـتی دز (فِيالْمَسْرُوقِ أُمُورٌ) لە ماڵە دزراوەکەدا چەند مەرجێك بێنەجێ:

مەرجیێیەکەم: ماڵە دزراوەکە بگاتـە ڕادەیـەکی دەسـت بـڕین، واتـە: (كَوْنُـهُ رُبُـعَ دِينَـارٍ خَالِصًا) دزراوەکە چـوارێکە میسـقاڵێکی زێـڕی پوختـە بـێ (أَوْ قِيمَتَـهُ) یـان شـتێکی بـە ئەندازەی نرخی چوارێکە میسقاڵەکە بێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ إِلاَّ فِي رُبُعِ دِينارٍ فَصَاعِداً﴾ رواه الشيخان، دەستی دز نابڕدرێ تەنها لـە دزینـی ئەنـدازەی چوارێکە میسقاڵێکی زێرو بە سەرەوەتر نەبێ.

(وَلَوْ سَرَقَ رُبُعًا سَبِيكَةً) ئەگەر چوارێکە میسقاڵێکی زێڕێکیداڕژاوی دزی: کـە (لاَ يُسَـاوِي رُبُعًا مَضْرُوبًا) نرخەکەی نەدەگەیشتە چوارێکە میسقاڵێکیزێڕی سکەلێدراو، ئەوە (فَلاَ قَطْعَ فِيالأَصَحِّ) بەو دزینە دەستی نابڕدرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵکو تەمبێ دەکرێ.

(وَلَوْ سَرَقَ دَنَانِيرَ) ئەگەر چەند دینارێکیزێڕی دزیـن، کـە (ظَنَّهَـا فُلُوسًـا لاَ تُسَـاوِي رُبُعًـا) وایانتێگەیشتبو فلوسن‌و ناگەنـە نرخـی چـوارێکە میسـقاڵێکیزێر، ئـەوە (قُطِـعَ) دەسـتی دەبڕدرێ (وَكَذَا ثَوْبٌ رَثٌّ) هەروەها دزەکە دەستی دەبڕدرێ ئەگەر جلێکیکۆن بدزێ: کە نرخەکەی نەگاتە چوارێکە میسقاڵێك، بەڵام (فِي جَيْبِـهِ تَمَـامُ رُبُـعِ جَهِلَـهُ) بـەرکی جلەکـە تەواوکـەری چـوارێکە میسـقاڵێکی زێـڕی تێدابـێ‌و دزەکـەش نـەیزانیبێ (فِيالأَصَـحِّ) لـە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە لە هەردوو مەسەلەدا ڕادەی دەست بڕینی دزیوە.

(وَلَوْ أَخْرَجَ نِصَابًا مِنْ حِرْزٍ) ئەگەر ڕادەیەکی دەست بڕینی لە شوێنی پاراستن هێنا دەرەوە (مَرَّتَيْنِ) بە دوو جار، واتە: جاریێیەکەم بەشێکیدزی، ئینجا جاریدووەمیش بەشەکەیتری

فَإِنْ تَخَلَّلَ عِلْمُ الْمَالِكِ وَإِعَادَةُ الْحِرْزِ فَالإِخْرَاجُ الثَّانِي سَرِقَةٌ أُخْرَى، وَإِلاَّ قُطِعَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ نَقَبَ وِعَاءَ حِنْطَةٍ وَنَحْوِهَا فَانْصَبَّ نِصَابٌ قُطِعَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ اشْتَرَكَا فِي إِخْرَاجِ نِصَابَيْنِ قُطِعَا، وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ سَرَقَ خَمْرًا وَخِنْزِيرًا وَكَلْبًا وَجِلْدَ مَيْتَةٍ بِلا دَبْغٍ فَلاَ قَطْعَ، فَإِنْ بَلَغَ إِنَاءُ الْخَمْرِ نِصَابًا قُطِعَ عَلَىالصَّحِيحِ، وَلاَ قَطْعَ فِي طُنْبُورٍ وَنَحْوِهِ، وَقِيلَ:

---

دزیو بـە هـەردوو جـار گەیشـتە ڕادەیـەکی دەسـت بـڕین، ئـەوە تـەماشا دەکـرێ: (فَإِنْ تَخَلَّلَ عِلْمُ الْمَالِكِ وَإِعَـادَةُ الْحِـرْزِ) ئەگـەر پێزانینـی خاوەنەکـەو چاککردنەوەی شـوێنی پاراستنەکە کەوتە نێوان هەردوو جارەکان، ئـەوە (فَـالإِخْرَاجُ الثَّـانِي سَـرِقَةٌ أُخْـرَى) هێنانە دەرەوەی جاریدووەم دزیێکیترەو بە هیچ جارێکیان دەستی نابڕدرێ، بەڵکو تەمبێ دەکرێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگـەر خاوەنەکـە بـە دزیەکەییەکـەمی نـەزانی‌و شـوێنی پاراسـتنەکەش چـاك نەکراوە تا جـاری دووەمـیش دزیەکـەی کـرد، ئـەو کاتـە (قُطِـعَ فِيالأَصَـحِّ) دەسـتی

دەبڕدرێ لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ڕادەیەکی دەست بڕینی لە شوێنی پارستنیدا دزیوە.

(وَلَوْ نَقَبَ وِعَاءَ حِنْطَةٍ وَنَحْوِهَا) ئەگەر کیسە گەنمێك، یان شتێکی لەو جۆرەی کون کرد: وەك مەشکەی ڕۆن و کیسەی پارە (فَانْصَبَّ نِصَابٌ) ئینجا بەو کونکردنە ڕادەیەکی دەست بڕین ڕژا دەرەوە، ئەوە (قُطِعَ فِي الأَصَحِّ) دەستی دەبڕدرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ اشْتَرَكَا فِي إِخْرَاجِ نِصَابَيْنِ) ئەگەر دوو دزی بالغ و عاقڵ بە هاوبەشی دوو ڕادەی دەست بڕینیان لە شوێنی پاراستن هێنانە دەرەوە (قُطِعَا) هەردووکیان دەستیان دەبڕدرێ، چونکە هەر یەکەیان ڕادەیەکی دزیوە (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر ماڵە دزراوەکە نەگەیشتە دوو ڕادەی دەست بڕین (فَلَا) هیچێکیان دەستیان نابڕدرێ، چونکە هەر یەکەیان ڕادەیەکی نەدزیوە، کەوابو: هەردووکیان تەمبێ دەکرێن.

بەڵام ئەگەر دزێکیان بالغ و عاقڵ بوو، دزەکەی‌تریش منداڵێکی‌نەفام، یان شێتێکی نەفام بوو، ئەو کاتە تەنها بالغ و عاقڵەکە دەستی دەبڕدرێ ئەگەر دزراوەکەی بگاتە ڕادەیەکی دەست بڕین، هەروەها ئەگەر دزیەکەیان لێك جیا بوو، ئەو کاتەش ئەو دزەی دزراوەکەی گەیوەتە ڕادەیەکی دەست بڕین دەستی دەبڕدرێ، ئەوەی نەیگەیوەتێ دەستی نابڕدرێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ سَرَقَ خَمْرًا وَخِنْزِيرًا وَكَلْبًا وَجِلْدَ مَيْتَةٍ بِلاَ دَبْغٍ) ئەگەر شەڕاب و بەرازو سەگ و پێستەی مرداری دەباغنەکراوی دزین (فَلاَ قَطْعَ) دەستی نابڕدرێ، چونکە ئەو پیسانە ماڵ نین، بەڵام (فَإِنْ بَلَغَ إِنَاءُ الْخَمْرِ نِصَابًا) ئەگەر قاپی شەڕابەکە گەیشتە ڕادەی دەست بڕین، ئەوکاتە (قُطِعَ عَلَى الصَّحِيحِ) بە دزینی قاپەکە دەستی دەبڕدرێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستتر.

(وَلاَ قَطْعَ فِي طُنْبُورٍ وَنَحْوِهِ) دەستی دزەکە نابڕدرێ ئەگەر ئامێری موسیقاو زوڕناو ئەو جۆرە شتانە بدزێ: وەکو بت و (صليب)و هەر شتێکی بەکارهێنانی حەڕام بێ (وَقِيلَ: إِنْ بَلَغَ مُكَسَّرُهُ نِصَابًا قُطِعَ، قُلْتُ: اَلثَّانِي أَصَحُّ وَاللهُ أَعْلَمُ. اَلثَّانِي: كَوْنُهُ مِلْكًا لِغَيْرِهِ، فَلَوْ مَلَكَهُ بِإِرْثٍ وَغَيْرِهِ قَبْلَ إِخْرَاجِهِ مِنَ الْحِرْزِ أَوْ نَقَصَ فِيهِ عَنْ نِصَابٍ بِأَكْلٍ وَغَيْرِهِ لَمْ يُقْطَعْ، وَكَذَا إِنْ إِدَّعَى مِلْكَهُ عَلَى النَّصِّ، وَلَوْ سَرَقَا وَادَّعَاهُ أَحَدُهُمَا لَهُ أَوْ لَهُمَا فَكَذَّبَهُ الآخَرُ لَمْ يُقْطَعِ الْمُدَّعِي وَقُطِعَ الآخَرُ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ سَرَقَ مِنْ حِرْزِ شَرِيكِهِ مُشْتَرَكًا فَلاَ قَطْعَ فِي الأَظْهَرِ وَإِنْ قَلَّ نَصِيبُهُ. اَلثَّالِثُ: عَدَمُ شُبْهَةٍ فِيهِ،

---

إِنْ بَلَغَ مُكَسَّرُهُ نِصَابًا) لە فەرموودەیەکدا: ئەگەر کەلوپەلە شکاوەکەی ئەو شتانە بگاتە ڕادەی دەست بڕین، ئەو کاتە (قُطِعَ) دەستی دزەکە دەبڕدرێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (اَلثَّانِي أَصَحُّ) ئەم فەرموودە دووەمە ڕاستترە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(اَلثَّانِي) مەرجیدووەمی ماڵە دزراوەكە: (كَوْنُهُ مِلْكًا لِغَيْرِهِ) دزراوەكە–كشتی– ملكی كەسێكیتر بێ، واتە: بە دزینی ماڵیخۆی دەستی نابڕدرێ، كەوابو: (فَلَوْ مَلَكَهُ بِإِرْثٍ وَغَيْرِهِ قَبْلَ إِخْرَاجِهِ مِنَ الْحِرْزِ) ئەگەر دزەكە بووە خاوەنی ماڵە دزراوەكە–بە هۆی میراتگرتن، یان پێبەخشین– پێش ئەوەی لە شوێنی پاراستن بیهێنێتە دەرەوە (أَوْ نَقَصَ فِيهِ عَنْ نِصَابٍ بِأَكْلٍ وَغَيْرِهِ) یان هەر لە شوێنی پارستنیدا لە ڕادەیەكی دەست بڕین كەم بۆوە: بە هۆی خواردن، یان سوتاندن، ئەوە (لَمْ يُقْطَعْ) لە هەردوو مەسەلەدا دەستی دزەكە نابڕدرێ، چونكە لە یەكەمەكەدا ملكیخۆی دزیوە، لە دووەمەكەشدا لە ڕادەی دەست بڕین كەمتری هێناوەتە دەرەوە.

(وَكَذَا إِنْ إِدَّعَى مِلْكَهُ) هەروەها دزەكە دەستی نابڕدرێ ئەگەر داوا بكا: ماڵە دزراوەكە ملكی خۆیەتی (عَلَىالنَّصِّ) لە سەر دەققی فەرموودەی ئیمامی(الشافعی)، كەوابو: (وَلَوْ سَرَقَا) ئەگەر دوو كەس وێكڕا دوو ڕادەی دەست بڕینیان دزینو (وَادَّعَاهُ أَحَدُهُمَا لَهُ أَوْ لَهُمَا فَكَذَّبَهُ الآخَرُ) تەنها یەكێكیان بۆ خۆی داوای ماڵە دزراوەكەی كرد، یان بۆ هەردووكیان داوای كرد، بەلاّم ئەوەكەیتر وەدرۆی خستەوەو گوتی: درۆدەكا. ئەوە (لَمْ يُقْطَعِ الْمُدَّعِي) داواكارەكە دەستی نابڕدرێو (وَقُطِعَ الآخَرُ فِيالأَصَحِّ) ئەوەكەیتریش دەستی دەبڕدرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلاّم ئەگەر بڵێ: ڕاست دەكا. یان ئەویش داوای ماڵە دزراوەكە بكا، ئەو كاتە ئەویش دەستی نابڕدرێ.

(وَإِنْ سَرَقَ مِنْ حِرْزِ شَرِيكِهِ مُشْتَرَكًا) ئەگەر لە شوێنی پاراستنی هاوبەشەكەی ماڵێكی هاوبەشیخۆی دزی (فَلاَ قَطْعَ فِيالأَظْهَرِ) دەستی نابردرێ، لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَإِنْ قَلَّ نَصِيبُهُ) هەرچەند بەشەكەی خۆیشی لەو هاوبەشە زۆر كەم بێ، چونكە لە گشت پارچەیەكی دزراوەكەدا بەشێكیخۆی تێدایە، كەوابو: تەمبێ دەكرێ.

(اَلثَّالِثُ) مەرجیسێیەمی دزراوەكە ئەمەیە: (عَدَمُ شُبْهَةٍ فِيهِ) هیچ شوبهەی مافی دزەكە لە ماڵە دزراوەكەدا نەبێ، چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِدْرَءُوا الْحُدُودَ بِالشُّبُهَاتِ

فَلاَ قَطْعَ بِسَرِقَةِ مَالِ أَصْلٍ وَفَرْعٍ وَسَيِّدٍ، **منهاج– بەرگیپێنجەم–9**
وَمَنْ سَرَقَ مَالَ بَيْتِ الْمَالِ: إِنْ فُرِزَ لِطَائِفَةٍ لَيْسَ [illegible]
لَهُ حَقٌّ فِالْمَسْرُوقِ كَمَالِ مَصَالِحَ وَكَصَدَقَةٍ وَهُوَ فَقِيرٌ فَلاَ، وَإِلاَّ قُطِعَ، وَالْمَذْهَبُ قَطْعُهُ بِبَابِ مَسْجِدٍ وَجِذْعِهِ لاَ حُصْرِهِ وَقَنَادِيلَ تُسْرَجُ،

---

مَااسْتَطَعْتُمْ﴾ رواه الحاكم والبيهقي بسند صحيح، هەتا دەتوانن سزای تاوانەكان بە هۆی شوبهەكان لابدەن. كەوابو: (فَلاَ قَطْعَ) دەستی دزەكە نابڕدرێ (بِسَرِقَةِ مَالِ أَصْلٍ وَفَرْعٍ) ئەگەر ماڵی دایكو باوكیو داپیرەو باپیرەیو كوڕو كیژو نەوێیەكانی بدزێ، هەم (وَسَيِّدٍ) ئەگەر كۆیلە ماڵی گەورەكەی خۆی بدزێ، چونكە شوبهەی مافی بەخێوكردنیان لە

ماڵەکەدا هەیە، کەوابو: بە دزینی ماڵی خزمەکانیتر دەستی دەبڕدرێ.
هەم (وَالأظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (قَطْعُ أَحَدِ زَوْجَيْنِ بِالآخَرِ) ئەگەر ژنو مێرد ماڵی یەکتری بدزن دەستیان دەبڕدرێ.
بەڵام ئەگەر مێردەکە بژێو و جلو بەرگی ژنەکەی نەداو ژنەکەش بە مەبەستی وەرگرتنی مافیخۆی ماڵیمێردەکەی دزی، یان قەرزادارەکە قەرزەکەی نەداوە، خاوەن قەرزەکەش بە مەبەستی وەرگرتنەوەیقەرزەکەی ماڵی قەرزدارەکەی دزی، یان ئەگەر لە کاتی قاتیو نەبوونیدا خواردەمەنیی بە پارە دەست نەکەوتو لە برسان خواردەمەنیی دزی، ئەوە لەو سێ مەسەلانەدا دەستی دزەکە نابڕدرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: چونکە شەرع ئیزنی داونو بە مەبەستی مافیخۆیان ماڵەکەیان بردوە، بۆیێ ئیمامی(عمر)ش ﷺ لە ساڵی گرانیدا دەستی دزەکانی خواردەمەنیی نەدەبڕی.
(وَمَنْ سَرَقَ مَالَ بَيْتِ الْمَالِ) ئەگەر موسوڵمانێك ماڵی (بَيْتُ الْمَالِ) بدزێ، ئەوە (إنْ فُرِزَ لِطَائِفَةٍ لَيْسَ هُوَ مِنْهُمْ) ئەگەر ماڵە دزراوەکە بۆ چینە موسوڵمانێك داندرابێو ئەویش لەو چینە نەبێ (قُطِعَ) دەستی دەبڕدرێ (وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر بۆ چینێکی دیارکراو دانەندرابێ، ئەوە (فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إنْ كَانَ لَهُ حَقٌّ فِيالْمَسْرُوقِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەگەر دزەکە مافی لە ماڵە دزراوەکەدا هەبێ: (كَمَالِ مَصَالِحَ) وەکو ماڵی بەرژەوەندیەکان، هەم (وَكَصَدَقَةٍ وَهُوَ فَقِيرٌ) وەکو زەکات، دزەکەش هەژار بوو، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (فَلاَ) دەستی نابڕدرێ بەڵکو تەمبێ دەکرێ (وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر هیچ مافی لە ماڵی (بَيْتُ الْمَالِ)دا نەبێ: وەك دەوڵەمەندێك زەکاتەکەی ناو (بَيْتُ الْمَالِ) بدزێ، ئەوە (قُطِعَ) دەستی دەبڕدرێ.
(وَالْمَذْهَبُ) بە فەرمودەی ڕاستی مەزهەب: (قَطْعُهُ بِبَابِ مَسْجِدٍ وَجِذْعِهِ) دەستی دەبڕدرێ ئەگەر دەرگەی مزگەوتو کاریتەو شەقڵەکانی مزگەوت بدزێ (لاَ حُصْرِهِ وَقَنَادِيلَ تُسْرَجُ) نەك بە دزینی حەسیرەکانو ئەو چرایانەی بۆ ڕۆناککردنەوە دادەگیرسێندرێن، بەڵکو
وَالأَصَحُّ قَطْعُهُ بِمَوْقُوفٍ وَأُمِّ وَلَدٍ سَرَقَهَا نَائِمَةً أَوْ مَجْنُونَةً. اَلرَّابِعُ: كَوْنُهُ مُحْرَزًا بِمُلاَحَظَةٍ أَوْ حَصَانَةِ مَوْضِعِهِ، فَإِنْ كَانَ بِصَحْرَاءَ أَوْ مَسْجِدٍ اُشْتُرِطَ دَوَامُ لِحَاظٍ، وَإِنْ كَانَ بِحِصْنٍ كَفَى لِحَاظٌ مُعْتَادٌ، وَإِصْطَبْلٌ حِرْزُ دَوَابَّ، لاَ آنِيَةٍ وَثِيَابٍ، وَعَرْصَةُ دَارٍ وَصُفَّتُهَا حِرْزُ آنِيَةٍ وَثِيَابِ بِذْلَةٍ، لاَ حُلِيٍّ وَنَقْدٍ، وَلَوْ نَامَ بِصَحْرَاءَ أَوْ مَسْجِدٍ عَلَى ثَوْبٍ أَوْ تَوَسَّدَ مَتَاعًا فَمُحْرَزٌ، فَلَوْ إنْقَلَبَ فَزَالَ عَنْهُ فَلاَ، وَثَوْبٌ وَمَتَاعٌ وَضَعَهُ بِقُرْبِهِ بِصَحْرَاءَ إنْ لاَحَظَهُ مُحْرَزٌ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَشَرْطُ الْمُلاَحِظِ قُدْرَتُهُ عَلَى مَنْعٍ

---

تەمبێ دەکرێ (وَالأَصَحُّ قَطْعُهُ بِمَوْقُوفٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: دەستی دەبڕدرێ ئەگەر ماڵێکی وەقفکراو بۆ سەر کەسێکیتر بدزێ، هەم (وَأُمِّ وَلَدٍ سَرَقَهَا نَائِمَةً أَوْ مَجْنُونَةً)

دەستی دەبڕدرێ ئەگەر كۆیلەیەكی دایكە مندالّ بدزێ كە خەوتوو بێ، یان شێت بێ.
(اَلرَّابِعُ) مەرجیچوارەمی دزراوەكە: (كَوْنُهُ مُحْرَزًا) بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام: دەبی ماڵە دزراوەكە پارێزراو بێ: (بِمُلاَحَظَةِ أَوْ حَصَانَةِ مَوْضِعِهِ) بە ئاگالێبونی مرۆڤێكیهەشیار، یان بە قایمیشوێنەكەی: بەگوێرەی لێوەشانەوەیماڵەكەو عادەتیشوێنەكە، كەوابو: (فَإنْ كَانَ بِصَحْرَاءَ أَوْ مَسْجِدٍ) ئەگەر ماڵەكە لە بیابان، یان لە مزگەوتدا بێ، ئەوە (اُشْتُرِطَ دَوَامُ لِحَاظٍ) بۆ پاراستنەكەی بە مەرج دانراوە: بەردەوام پارێزەرەكە ئاگای لێبێ (وَإنْ كَانَ بِحِصْنٍ) ئەگەر لەخانوو و دوكاندا بێ (كَفَى لِحَاظٌ مُعْتَادٌ) ئاگالێبوونێكیعادەتی بەسە.
(وَإصْطَبْلٌ حِرْزُ دَوَابٍّ) خانەی وولاغەكان شوێنی پاراستنیوولاغەكانو كەلوپەلی سواریو بارو ئالیكو ئاودانیانە (لاَ آنِيَةٍ وَثِيَابٍ) بەلاّم شوێنی پاراستنی قاپی چێشتو جلو بەرگ نیە (وَعَرْصَةُ دَارٍ وَصُفَّتُهَا) حەوشەو بەرهەیوانی خانوو (حِرْزُ آنِيَةٍ وَثِيَابِ بِذْلَةٍ) شوێنی پاراستنی قاپو جلی كاركردنو كۆنە بەپەو ئەو جۆرە شتانەیە (لاَ حُلِيٍّ وَنَقْدٍ) بەلاّم شوێنی پاراستنی خشلّو پارەو جلو قاپی بە نرخ نیە.
(وَلَوْ نَامَ بِصَحْرَاءَ أَوْ مَسْجِدٍ عَلَى ثَوْبٍ) ئەگەر لە بیابان، یان لە مزگەوتدا لە سەر جلێك خەوت (أَوْ تَوَسَّدَ مَتَاعًا) یان كەلوپەلێكی لە ژێر سەریخۆی دانا، یان پاڵی وێدا (فَمُحْرَزٌ) ئەوەش پارێزراوەو دزەكەی دەستی دەبڕدرێ (فَلَوْ انْقَلَبَ فَزَالَ عَنْهُ) جا ئەگەر خەوتووەكە لە جلەكە، یان لە كەلوپەلەكە لاكەوت، ئینجا دزەكە بردی، ئەو كاتە (فَلاَ) دەستی نابڕدرێ، چونكە لە كاتی دزینەكەدا پارێزراو نەبوە، كەوابو: تەمبێ دەكرێ.
(وَثَوْبٌ وَمَتَاعٌ وَضَعَهُ بِقُرْبِهِ بِصَحْرَاءَ) جلو كەلوپەلێك كە لە نزیكیخۆی داینابێ لە بیاباندا، یان لە مزگەوتدا (إنْ لاَحَظَهُ مُحْرَزٌ) ئەگەر بەردەوام ئاگای لێبێ، ئەوە پارێزراوە (وَإلاَّ) بەلاّم ئەگەر ئاگای لێنەبێ (فَلاَ) پارێزراو نیەو دزەكەی دەستی نابڕدرێ، بەڵكو تەمبێ دەكرێ (وَشَرْطُ الْمُلاَحِظِ) مەرجی ئاگالێبووەكەی ماڵەكە ئەمەیە: (قُدْرَتُهُ عَلَى مَنْعِ سَارِقٍ بِقُوَّةٍ أَوْ اِسْتِغَاثَةٍ، وَدَارٌ مُنْفَصِلَةٌ عَنِ الْعِمَارَةِ إنْ كَانَ بِهَا قَوِيٌّ يَقْظَانُ حِرْزٌ مَعَ فَتْحِ الْبَابِ وَإغْلاَقِهِ، وَإلاَّ فَلاَ، وَمُتَّصِلَةٌ حِرْزٌ مَعَ إغْلاَقِهِ وَحَافِظٍ وَلَوْ نَائِمٌ، وَمَعَ فَتْحِهِ وَنَوْمِهِ غَيْرُ حِرْزٍ لَيْلاً وَكَذَا نَهَارًا فِالأَصَحِّ، وَكَذَا يَقْظَانُ تَغَفَّلَهُ سَارِقٌ فِالأَصَحِّ، فَإنْ خَلَتْ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهَا حِرْزٌ نَهَارًا زَمَنَ أَمْنٍ وَإغْلاَقِهِ، فَإنْ فُقِدَ شَرْطٌ فَلاَ، وَخَيْمَةٌ بِصَحْرَاءَ إنْ لَمْ تُشَدَّ أَطْنَابُهَا وَتُرْخَى أَذْيَالُهَا فَهِيَ وَمَافِيهَا كَمَتَاعٍ

---

سَارِقٍ) توانای هەبێ دزەكە لە بردنی ماڵەكە قەدەغە بكا (بِقُوَّةٍ أَوْ اِسْتِغَاثَةٍ) بە هێزی خۆی، یان بە هاواركردن.
(وَدَارٌ مُنْفَصِلَةٌ عَنِ الْعِمَارَةِ) ئەو خانووەی لە ئاوەدانی جیا بۆتەوە: وەك لە ناو كێڵگەو

باغەکاندا بێ، ئەوە (إِنْ كَانَ بِهَا قَوِيٌّ يَقْظَانُ) ئەگەر مرۆڤێکی بە هێزو هەشیاری تێدا بێ (حِرْزٌ مَعَ فَتْحِ الْبَابِ وَإِغْلاَقِهِ) خانووەکە شوێنی پاراستنی ئەو شتەیە کە تێیدایە، جا دەرگاکەی کراوەبێ، یان کلیل بدرێ، شەو بێ، یان ڕۆژ بێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر خانووەکە هیچ کەسێکی تێدا نەبێ، یان کەسێکی بێهێزی تێدا بێ، یان بەهێز بێو خەوتوو بێو دەرگەشی کراوەبێ، ئەوە (فَلاَ) لەو حاڵەتانەدا نابێتە شوێنی پاراستنی ئەو شتەی تێیدایە، بەڵام ئەگەر بەهێزەکە خەوتوو بێو دەرگەشی کلیل دابێ، ئەو کاتە دەبێتە شوێنی پاراستن.

(وَمُتَّصِلَةٌ) ئەو خانووەی بە ئاوەدانیەوەیە (حِرْزٌ مَعَ إِغْلاَقِهِ وَحَافِظٍ) شوێنی پاراستنی ئەو شتەیە کە تێیدایە ئەگەر دەرگەی کلیل بدرێو پارێزەرێکیشی تێدابێ (وَلَوْ نَائِمٌ) هەرچەند خەوتووش بێ، جا شەو بێ، یان ڕۆژ بێ، بەڵام (وَمَعَ فَتْحِهِ وَنَوْمِهِ) ئەگەر دەرگەی کراوەبێو پارێزەرەکەش خەوتوو بێ (غَيْرُ حِرْزٍ لَيْلاً وَكَذَا نَهَارًا فِيالأَصَحِّ) شوێنی پاراستن نیە: نە بە شەو، نە بە ڕۆژ (وَكَذَا يَقْظَانُ تَغَفَّلَهُ سَارِقٌ) هەروەها ئەگەر پارێزەرێکی هەشیاریشی تێدابێو دزێك لە چاودێریەکە غافڵی بکا، ئەو کاتەش شوێنی پاراستن نیە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(فَإِنْ خَلَتْ) جا ئەگەر خانووەکەی ناو ئاوەدانی هیچ چاودێرێکی تێدا نەبو، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (أَنَّهَا حِرْزٌ نَهَارًا زَمَنَ أَمْنٍ وَإِغْلاَقِهِ) خانووەکە شوێنی پاراستنە بە ڕۆژ لە کاتیئەمینیو لە حاڵەتیکلیلدانیدا، بەڵام (فَإِنْ فُقِدَ شَرْطٌ) ئەگەر یەکێك لەو سێ مەرجانە نەبو: واتە: دەرگەی کراوە بوو، یان شەو بوو، یان کاتی ترسو تاڵان بوو، لەو حاڵەتانەدا (فَلاَ) خانووەکە-بێچاودێر- شوێنی پاراستن نیە.

(وَخَيْمَةٌ بِصَحْرَاءَ) خێمەیەك کە لە بیاباندا بێ (إِنْ لَمْ تُشَدَّ أَطْنَابُهَا وَتُرْخَى أَذْيَالُهَا) ئەگەر گوریسەکانی نە بەسترا بێو دامێنەکانیشی شۆڕ نەکرابنەوە (فَهِيَ وَمَا فِيهَا كَمَتَاعٍ بِصَحْرَاءَ، وَإِلاَّ فَحِرْزٌ بِشَرْطِ حَافِظٍ قَوِيٍّ فِيهَا وَلَوْ نَائِمٌ، وَمَاشِيَةٌ بِأَبْنِيَةٍ مُغْلَقَةٍ مُتَّصِلَةٍ بِالْعِمَارَةِ مُحْرَزَةٌ بِلاَ حَافِظٍ، وَبِبَرِّيَّةٍ يُشْتَرَطُ حَافِظٌ وَلَوْ نَائِمٌ، وَإِبِلٌ بِصَحْرَاءَ مُحْرَزَةٌ بِحَافِظٍ يَرَاهَا، وَمَقْطُورَةٌ يُشْتَرَطُ الْتِفَاتُ قَائِدِهَا إِلَيْهَا كُلَّ سَاعَةٍ بِحَيْثُ يَرَاهَا، وَأَنْ لاَ يَزِيدَ قِطَارٌ عَلَى تِسْعَةٍ، وَغَيْرُ مَقْطُورَةٍ لَيْسَتْ مُحْرَزَةً فِيالأَصَحِّ، وَكَفَنٌ فِي قَبْرٍ بِبَيْتٍ مُحْرَزٍ مُحْرَزٌ، وَكَذَا بِمَقْبَرَةٍ بِطَرَفِ الْعِمَارَةِ فِيالأَصَحِّ لاَ بِمَضْيَعَةٍ فِيالأَصَحِّ.

---

بِصَحْرَاءَ) ئەوە خێمەکەو ئەوەی لە ناو خێمەکەشدایە وەکو کەلوپەلێکی لە بیابانە، واتە: بۆ پاراستنەکە مەرجە بەردەوام پارێزەرێك ئاگای لێبێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر گوریسەکانی بەسترا بونو دامێنەکانیشی شۆڕکرابونەوە، ئەو کاتە (فَحِرْزٌ بِشَرْطِ حَافِظٍ قَوِيٍّ فِيهَا)

خێمەکە شوێنی پاراستنی ئەو شتەیە کە تێ‌دایە، بەو مەرجەی پارێزەرێکی بەهێز لە ناو خێمەکەدا، یان لە نزیك خێمەکە بێ (وَلَوْ نَائِمٌ) هەرچەند خەوتووش بێ.

(وَمَاشِيَةٌ بِأَبْنِيَةٍ مُغْلَقَةٍ) ئاژەڵەکان ئەگەر لە ناو خانووەکانی کلیلدراودا بن‌و (مُتَّصِلَةٍ بِالْعِمَارَةِ) خانووەکانیش بە ئاوەدانیەوە بن، ئەوانیش (مُحْرَزَةٌ بِلاَ حَافِظٍ) بەو شوێنە پارێزراون، هەرچەند هیچ پارێزەرێکیشیان نەبێ، بەڵام (وَبِبَرِّيَّةٍ) ئەگەر ئاژەڵەکان لە شوێنێکی چۆڵدا لە ناو خانوێکی کلیلدراودا بن، ئەو کاتە (يُشْتَرَطُ حَافِظٌ وَلَوْ نَائِمٌ) بە مەرج دادەندرێ پارێزەرێکیان هەبێ، هەرچەند خەوتووش بێ.

(وَإِبِلٌ بِصَحْرَاءَ) ووشترو ئاژەڵەکانی‌تر: کە لە بیاباندا بلەوەڕێن (مُحْرَزَةٌ بِحَافِظٍ يَرَاهَا) بە پارێزەرێکی وەها پارێزراون: کە گشتیان ببینێ، بەڵام ئەگەر لەوەڕگاکە ڕێگەی هاتوچۆی خەڵکی بوو، ئەو کاتە بە چاولێکردنی خەڵکەکە پارێزراون‌و پێویست بە پارێزەر نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَمَقْطُورَةٌ) ئەو ووشترانەی بە دوای یەکتردا لێك بەستراون (يُشْتَرَطُ الْتِفَاتُ قَائِدِهَا إِلَيْهَا كُلَّ سَاعَةٍ) بۆ پاراستن بە مەرج دادەندرێ: ڕاکێشەرەکەیان لەگشت کاتێکدا ئاوڕ بداتەوە لایان (بِحَيْثُ يَرَاهَا) بە شێوەیەکی وەها گشتیان ببینێ، هەم (وَأَنْ لاَ يَزِيدَ قِطَارٌ عَلَى تِسْعَةٍ) مەرجە لێکبەستراوەکانیش لە نۆ ووشتر زیاتر نەبن (وَغَيْرُ مَقْطُورَةٍ) ئەو ووشترانەی لێك نەبەستراون (لَيْسَتْ مُحْرَزَةً فِي الأَصَحِّ) پارێزراو نین، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَكَفَنٌ) کفنی بەر مردوویێك کە (فِي قَبْرٍ بِبَيْتٍ مُحْرَزٍ) لە ناو گۆڕدابێ‌و گۆڕەکەش لە ناو خانوێکی پارێزراودا بێ (مُحْرَزٌ) کفنەکە پارێزراوە (وَكَذَا بِمَقْبَرَةٍ بِطَرَفِ الْعِمَارَةِ) هەروەها ئەگەر گۆڕەکە لە گۆڕستانێکی تەنیشت ئاوەدانیدا بێ، ئەویش پارێزراوەو کفندزەکە دەستی دەبڕدرێ (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (لاَ بِمَضْيَعَةٍ) نەك ئەو گۆڕەی لە زەمینێکی بێ بایەخ‌و بێ خاوەندایە، واتە: دەستی ئەم کفندزە نابڕدرێ (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵکو تەمبێ دەکرێ.

(فَصْلٌ) يُقْطَعُ مُؤَجِّرُالْحِرْزِ وَكَذَا مُعِيرُهُ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ غَصَبَ حِرْزًا لَمْ يُقْطَعْ مَالِكُهُ وَكَذَا أَجْنَبِيٌّ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ غَصَبَ مَالاً وَأَحْرَزَهُ بِحِرْزِهِ فَسَرَقَ الْمَالِكُ مِنْهُ مَالَ الْغَاصِبِ أَوْ أَجْنَبِيٌّ الْمَغْصُوبَ فَلاَ قَطْعَ فِالأَصَحِّ، وَلاَ يُقْطَعُ مُخْتَلِسٌ وَمُنْتَهِبٌ وَجَاحِدٌ وَدِيعَةً،

---

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی‌چەند لقێکی دزی ﴾**

(يُقْطَعُ مُؤَجِّرُ الْحِرْزِ) ئەو بەکرێدەرەی شوێنی پاراستنی بەکرێ داوە–ئەگەر لەو شوێنە ماڵێکی بەکرێگرەکە بدزێ– دەستی دەبڕدرێ (وَكَذَا مُعِيرُهُ) هەروەها ئەو کەسەش کە شوێنەکەی بە خواستن داوە–ئەگەر لەو شوێنە ماڵێکی شوێنخوازەکەی بدزێ– ئەویش دەستی دەبڕدرێ (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە لە هەر دوومەسەلەدا مافی

سودی شوێنەکە بۆ خاوەن ماڵەکە گواستراوەتەوەو هیچ شوبهەی دزەکە لە شوێنەکەدا نەماوە (وَلَوْ غَصَبَ حِرْزًا) ئەگەر زەوتکەرێك شوێنێکی پاراستنی زەوت کردو ماڵێکی خۆی تێدا دانا (لَمْ يُقْطَعْ مَالِكُهُ) خاونی شوێنەکە دەستی نابڕدرێ ئەگەر ماڵێکی زەوتکەرەکە لەو شوێنە زەوتکراوە بدزێ (وَكَذَا أَجْنَبِيٌّ) هەروەها ئەگەر بیگانەیەکیش ماڵێکی زەوتکەرەکە لەو شوێنە زەوتکراوە بدزێ دەستی نابڕدرێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە زەوتکەرەکە مافی سود لێوەرگرتنی شوێنەکەی نیە.

(وَلَوْ غَصَبَ مَالاً) ئەگەر زەوتکەرێك ماڵێکی زەوت کرد، یان دزێك ماڵێکی دزی (وَأَحْرَزَهُ بِحِرْزِهِ) ماڵەکەشی لە شوێنێکی خۆیدا پاراست (فَسَرَقَ الْمَالِكُ مِنْهُ مَالَ الْغَاصِبِ) جا خاوەن ماڵەکەش لەو شوێنە ماڵێکیتری زەوتکەرەکەی، یان ماڵێکیتری دزەکەی دزی (أَوْ أَجْنَبِيٌّ اَلْمَغْصُوبَ) یان بێگانەیەك هەمان ماڵە زەوتکراوەکەی، یان دزراوەکەی لەو شوێنە دزی، ئەوە (فَلاَ قَطْعَ) لە هەردوو مەسەلەدا هیچێکیان دەستی نابڕدرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە خاوەنی ماڵە زەوتکراوەکە مافی هەیە بۆ وەرگرتنەوەی ماڵەکەیخۆی بچێتە شوێنەکەو شوێنەکە لەوی پارێزراو نیە، لەمەسەلەی بێگانەشدا ماڵەکە بە ڕەزامەندی خاوەنەکەی نەپارێزراوە.

ئینجا بزانە: مەبەست بە دزین ئەوەیە: ماڵەکە لە پەنهانیدا ببا، کەوابو: (وَلاَ يُقْطَعُ مُخْتَلِسٌ) ئەو کەسەی –لە بەرچاوی کەخڵك– لە دەرفەتێکدا ماڵ دەرفێنێو ڕادەکا، دەستی نابڕدرێ، هەم (وَمُنْتَهِبٌ) فەرهودکەر، واتە: ئەو کەسەی کە بە هێزو توانای خۆی –لە بەرچاوی خەڵك– ماڵەکە دەبا، ئەویش دەستی نابڕدرێ، هەم (وَجَاحِدٌ وَدِيعَةً) ئەو کەسەش کە دان بە ماڵی ئەمانەتو خواستراودا ناهێنێ، ئەویش دەستی نابڕدرێ، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿لَيْسَ عَلَىالْمُخْتَلِسِ وَالْمُنْتَهِبِ وَالْخائِنِ قَطْعٌ﴾ صححه الترمذي، ماڵڕفێنو فەرهودکەرو خائین دەست بڕینیان لە سەر نیە.

وَلَوْ نَقَبَ وَعَادَ فِي لَيْلَةٍ أُخْرَى فَسَرَقَ قُطِعَ فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: هَذَا إِذَا لَمْ يَعْلَمِ الْمَالِكُ اَلنَّقْبَ وَلَمْ يَظْهَرْ لِلطَّارِقِينَ، وَإِلاَّ فَلاَ يُقْطَعُ قَطْعًا وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ نَقَبَ وَأَخْرَجَ غَيْرُهُ فَلاَ قَطْعَ، وَلَوْ تَعَاوَنَا فِالنَّقْبِ وَانْفَرَدَ أَحَدُهُمَا بِالإِخْرَاجِ أَوْ وَضَعَهُ نَاقِبٌ بِقُرْبِ النَّقْبِ فَأَخْرَجَهُ آخَرُ قُطِعَ الْمُخْرِجُ، وَلَوْ وَضَعَهُ بِوَسَطِ نَقْبِهِ فَأَخَذَهُ خَارِجٌ وَهُوَ يُسَاوِي نِصَابَيْنِ لَمْ يُقْطَعَا فِالأَظْهَرِ، وَلَوْ رَمَاهُ إِلَى خَارِجِ حِرْزٍ أَوْ وَضَعَهُ بِمَاءٍ جَارٍ

---

(وَلَوْ نَقَبَ) ئەگەر لە شەوێکدا شوێنەکەی کون کرد (وَعَادَ فِي لَيْلَةٍ أُخْرَى فَسَرَقَ) ئینجا لە شەوێکیتردا گەڕاوەو لەو کونەوە ماڵێکی دزی (قُطِعَ فِيالأَصَحِّ) دەستی دزەکە دەبڕدرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (هَذَا إِذَا لَمْ يَعْلَمِ الْمَالِكُ النَّقْبَ)

ئەو دەست برینە لەو حاڵەتەدایە: ئەگەر خاوەنەکە بە کونکردنەی نەزانیبێ‌و (وَلَمْ يَظْهَرْ لِلطَّارِقِينَ) کونەکەش بۆ هاتوچۆکەرەکان دەرنەکەوتبێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر خاوەنەکە بە کونکردنەکەی زانیبێ، یان کونەکە ئاشکرا بوبێ، ئەو کاتە (فَلاَ يُقْطَعُ قَطْعًا) دەستی دزەکە نابڕدرێ، بە فەرموودەیەکی براوە (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە شوێنەکە بێ ڕێزلێنان ماوەتەوە، کەوابو: دزەکە تەمبێ دەکرێ.

(وَ) هەروەها (لَوْ نَقَبَ) ئەگەر یەکێك شوێنەکەی کون کردو (وَأَخْرَجَ غَيْرُهُ) یەکێکیتر لەو کونەوە ماڵەکەی دزی‌و هێنایە دەرەوە (فَلاَ قَطْعَ) هیچێکیان دەستی نابڕدرێ، چونکە کونکەرەکە نەیدزیوە، دزەکەش لە شوێنی پاراستن نەیهێناوەتە دەرەوە، کەوابو: هەردووکیان تەمبێ دەکرێن، بەڵام ئەگەر کونکەرەکە فەرمانی‌دا منداڵێکی نەفام‌و منداڵەکەش بە فەرمانی وی ڕادەیەکی دەست بڕینی هێنا دەرەوە، ئەو کاتە فەرمانکەرەکە دەستی دەبڕدرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ تَعَاوَنَا فِيالنَّقْبِ) ئەگەر دوو دز –بە یارمەتیدانیی‌یەکتری– شوێنەکەیان کون کرد، بەڵام (وَانْفَرَدَ أَحَدُهُمَا بِالإِخْرَاجِ) تەنها یەکێکیان ماڵەکەی هێنا دەرەوە (أَوْ وَضَعَهُ نَاقِبٌ بِقُرْبِ النَّقْبِ فَأَخْرَجَهُ آخَرُ) یان کونکەرێکیان ماڵەکەی لە نزیك کونەکە دانا، ئینجا کونکەرەکەیتر هێنایە دەرەوە، ئەوە (قُطِعَ الْمُخْرِجُ) لە هەردوو مەسەلەدا دەرهێنەرەکە دەستی دەبڕدرێ، چونکە ئەویان دزە، بەڵام (وَلَوْ وَضَعَهُ بِوَسَطِ نَقْبِهِ) ئەگەر کونکەرێکیان ماڵەکەی لە ناو کونەکەی دانا (فَأَخَذَهُ خَارِجٌ) ئینجا ئەوەکەی‌تریش لە لای دەرەوە دەستی دایە ماڵەکەو بردی (وَهُوَ يُسَاوِي نِصَابَيْنِ) شتەکەش بە ئەندازەی دوو ڕادەی دەست بڕین دەبو (لَمْ يُقْطَعَا فِيالأَظْهَرِ) هیچێکیان دەستیان نابڕدرێ، لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە هیچێکیان لە تەواوی شوێنی پاراستنەکە نەیهێناوەتە دەرەوە.

(وَلَوْ رَمَاهُ إِلَى خَارِجِ حِرْزٍ) ئەگەر کەسێك ماڵێکی پارێزراوی فڕێ‌دا دەرەوەی شوێنی پاراستنەکەی (أَوْ وَضَعَهُ بِمَاءٍ جَارٍ) یان لە ناو ئاوێکی ڕەوانی داناو ئاوەکە بردیە دەروە

أَوْ ظَهْرِ دَابَّةٍ سَائِرَةٍ أَوْ عَرَّضَهُ لِرِيحٍ هَابَّةٍ فَأَخْرَجَتْهُ قُطِعَ، أَوْ وَاقِفَةٍ فَمَشَتْ بِوَضْعِهِ فَلاَ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يُضْمَنُ حُرٌّ بِيَدٍ وَلاَ يُقْطَعُ سَارِقُهُ، وَلَوْ سَرَقَ صَغِيرًا بِقِلاَدَةٍ فَكَذَا فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ نَامَ عَبْدٌ عَلَى بَعِيرٍ فَقَادَهُ وَأَخْرَجَهُ عَنِ الْقَافِلَةِ قُطِعَ، أَوْ حُرٌّ فَلاَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ نَقَلَ مِنْ بَيْتٍ مُغْلَقٍ إِلَى صَحْنِ دَارٍ بَابُهَا مَفْتُوحٌ قُطِعَ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَقِيلَ إِنْ كَانَا مُغْلَقَيْنِ قُطِعَ،

---

(أَوْ ظَهْرِ دَابَّةٍ سَائِرَةٍ) یان لە سەر پشتی وولاغێکی ڕۆیندەی داناو وولاغەکە بردیە دەرەوە (أَوْ عَرَّضَهُ لِرِيحٍ هَابَّةٍ فَأَخْرَجَتْهُ) یان لە بەر بایەکی هەڵبووی داناو بایەکە بردیە دەرەوە، ئەوە (قُطِعَ) لەو مەسەلانەدا دەستی دەبڕدرێ، چونکە بە کرداری وی بردراوەتە دەرەوە.

(أَوْ وَاقِفَةٍ) بەڵام ئەگەر لە سەر پشتیووڵاغێکی وەستاوی دانا (فَمَشَتْ بِوَضْعِهِ) ئینجا ووڵاغەکە بە هۆی دانانەکە ڕۆیشتو ماڵەکەی بردە دەرەوە (فَلاَ فِي الأَصَحِّ) دەستی نابڕدرێ لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ووڵاغەکە بە خۆشیخۆی ڕۆیشتوە.

(وَلاَ يُضْمَنُ حُرٌّ بِيَدٍ) مرۆڤی ئازاد بە هۆی دەست بەسەرداگرتن زامینی نیە، هەروەك ئەگەر سەرپەرشتکارێك منداڵێکی نەبالغ بە کرێ لە لای وەستایەك دابنێو منداڵەکەش لە لای وی ڕابکا، وەستایەکە نابێتە زامین، کەوابو: (وَلاَ يُقْطَعُ سَارِقُهُ) ئەو دزەی ئازادێکی دزیوە دەستی نابڕدرێ هەرچەند ئازادەکەش منداڵ بێ؟ چونکە مرۆڤی ئازاد ماڵ نیە.

(وَلَوْ سَرَقَ صَغِيرًا بِقِلاَدَةٍ) ئەگەر دزەکە منداڵێکی ئازادی دزی کە گەردانەیەکی لە ملدا بوو، یان خشڵێکیتری پێوە بوو (فَكَذَا فِي الأَصَحِّ) ئەوەش دەستی نابڕدرێ لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ماڵەکە هەر لە ژێر دەستی ئازادەکەدایە.

(وَلَوْ نَامَ عَبْدٌ عَلَى بَعِيرٍ) ئەگەر کۆیلەیەك لە سەر پشتی ووشترێك خەوتبو (فَقَادَهُ وَأَخْرَجَهُ عَنِ الْقَافِلَةِ) ئینجا دزەکەش ووشترەکەی ڕاکێشاو لە کاروانەکەی بردیە دەرەوە (قُطِعَ) دزەکە دەستی دەبڕدرێ، چونکە هەردووکیان ماڵنو لە شوێنی پاراستنیان بردراونە دەروە (أَوْ حُرٌّ) یان ئەگەر ئازادێك لە سەر پشتی ووشترەکە خەوتبو، ئینجا ووشترەکەی لە کاروانەکەی بردیە دەروە (فَلاَ فِي الأَصَحِّ) دەستی نابڕدرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ووشترەکە لە ژێر دەستی ئازادەکەدایە.

(وَلَوْ نَقَلَ مِنْ بَيْتٍ مُغْلَقٍ) ئەگەر ماڵێکی لە ژوورێکی کلیلدراوەوە گواستەوە (إِلَى صَحْنِ دَارٍ بَابُهَا مَفْتُوحٌ) بۆ حەوشەی خانوویێك کە دەرگەی کراوە بوو (قُطِعَ) دەستی دەبڕدرێ، چونکە لە شوێنی پاراستنیەوە هێناویەتیە شوێنێکی نەپارێزراو (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر هەردووك دەرگاکان کلیلدراو بون، یان هەردووکیان کراوە بون (فَلاَ) دەستی نابڕدرێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (إِنْ كَانَا مُغْلَقَيْنِ قُطِعَ) ئەگەر هەردوو دەرگەکان

وَبَيْتُ خَانٍ وَصَحْنُهُ كَبَيْتٍ، وَ دَارٍ فِي الأَصَحِّ.

(فَصْلٌ) لاَ يُقْطَعُ صَبِيٌّ وَمَجْنُونٌ وَمُكْرَهٌ، وَيُقْطَعُ مُسْلِمٌ وَذِمِّيٌّ بِمَالِ مُسْلِمٍ وَذِمِّيٍّ، وَفِي مُعَاهِدٍ أَقْوَالٌ: أَحْسَنُهَا إِنْ شُرِطَ قَطْعُهُ بِسَرِقَةٍ قُطِعَ وَإِلاَّ فَلاَ. قُلْتُ: اَلأَظْهَرُ عِنْدَ الْجُمْهُورِ لاَ قَطْعَ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَتَثْبُتُ السَّرِقَةُ بِيَمِينِ الْمُدَّعِي الْمَرْدُودَةِ فِي الأَصَحِّ،

---

کلیلدراو بن، دەستی دەبڕدرێ (وَبَيْتُ خَانٍ وَصَحْنُهُ) ژووری خانەو حەوشەکەیو ژووری قوتابخانەو حەوشەکەی (كَبَيْتٍ وَ دَارٍ) وەکو ژوورەکەو حەوشەکەی خانووە: لەو ڕوونکردنەوەیڕابردوودا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەکانی دز و ئاشکراکردنی دزی ﴾

(لاَ يُقْطَعُ صَبِيٌّ وَمَجْنُونٌ) منداڵو شێت–ئەگەر دزی بکەن– دەستیان نابڕدرێ، بەڵکو –ئەگەر فامیدە بن– تەمبێ دەکرێن، هەروەها ئەو دزانەش کە بە هۆی شوبهەیەك دەست بڕینیان لە سەر لاکەوتوە، ئەوانیش تەمبێ دەکرێن، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتیو لە چەند مەسەلەیەکدا ڕابرا (وَمُكْرَهٌ) هەروەها زۆرلێکراویش ئەگەر–بە زۆرلێکردن– ماڵێك بدزێ دەستی نابڕدرێو هەم زۆرلێکەرەکەشی دەستی نابڕدرێ، بەڵام ئەگەر زۆرلێکراوەکە منداڵێکی، یان شێتێکی نەفام بێ، ئەو کاتە زۆرلێکەرەکەی دەستی دەبڕدرێ، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا فەرمویانە.

(وَيُقْطَعُ مُسْلِمٌ وَذِمِّيٌّ بِمَالِ مُسْلِمٍ وَذِمِّيّ) موسوڵمانو کافری پەیمان لەئەستۆ هەردووکیان بە دزینی ماڵی موسوڵمانو ماڵی کافری پەیمان لەئەستۆ دەستیان دەبڕدرێ، بەڵام (وَفِي مُعَاهَدٍ أَقْوَالٌ) لەبارەی کافری پەیمان لەگەڵکراو وکافری دڵنیاکراو–ئەگەر دزی بکەن– چەند فەرموودەیەك هەنە: (أَحْسَنُهَا إِنْ شُرِطَ قَطْعُهُ بِسَرِقَةٍ) جوانترەکەیان: ئەگەر کافرەکە مەرجی لە سەر داندرابێ: بە هۆی دزی دەستی ببڕدرێ، ئەوە (قُطِعَ) دەستی دەبڕدرێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ئەو مەرجەی لە سەر دانەندرابێ (فَلاَ) دەستی نابڕدرێ (قُلْت) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (الأَظْهَرُ عِنْدَ الْجُمْهُورِ: لاَ قَطْعَ) بە فەرموودەی بەهێزتر لە لای کۆمەڵە زۆرەکەی زانایان: کافری پەیمان لەگەڵکراو ودڵنیاکراو بە هۆی دزیکردن دەستیان نابڕدرێ، بەڵام ئەوانیش–وەك دزەکانیتر– واجبە ماڵە دزراوکە، یان نرخەکەی بۆ خاوەنەکەی بگەڕێننەوە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَتَثْبُتُ السَّرِقَةُ) دزی ئاشکرا دەبێ: (بِيَمِينِ الْمُدَّعِي اَلْمَرْدُودَةِ) بەوەی داواکارەکە سوێندی گەڕاندراوە بخوا، وەك لە سەر کەسێك داوا بکاو بڵێ: ماڵی منت دزیوە. شاهیدیشی نەبێ، داوالێکراوەکەش سوێند نەخوا، ئینجا سوێندەکە بگەڕێندرێتەوە سەر داواکارەکە، ئینجا ئەویش سوێندە گەڕاندراوەکە بخوا (فِیالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام بە فەرموودەی بەهێزتر–بەم سوێندە گەڕاندراوەیە– دەستی دزەکە نابڕدرێ، بەڵکو تەنها

أَوْ بِإِقْرَارِ السَّارِقِ، وَالْمَذْهَبُ قَبُولُ رُجُوعِهِ، وَمَنْ أَقَرَّ بِعُقُوبَةٍ لِلَّهِ تَعَالَى فَالصَّحِيحُ أَنَّ لِلْقَاضِي أَنْ يُعَرِّضَ لَهُ بِالرُّجُوعِ، وَلاَ يَقُولُ: اِرْجِعْ، وَلَوْ أَقَرَّ بِلاَ دَعْوَى أَنَّهُ سَرَقَ مَالَ زَيْدٍ الْغَائِبِ لَمْ يُقْطَعْ فِالْحَالِ بَلْ يُنْتَظَرُ حُضُورُهُ فِالأَصَحِّ، أَوْ أَنَّهُ أَكْرَهَ أَمَةَ غَائِبٍ عَلَى زِنًا حُدَّ فِالْحَالِ فِالأَصَحِّ، وَتَثْبُتُ بِشَهَادَةِ رَجُلَيْنِ، فَلَوْ شَهِدَ رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ

---

ماڵە دزراوەکە ئاشکرا دەبێو واجبە: ماڵەکە بداتەوە خاوەنەکەی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(أَوْ بِإِقْرَارِ السَّارِقِ) هەروەها دزی ئاشکرا دەبێ: بە دانپێداهێنانیدزەکە، پاش ئەوەی داوای لێدەکرێ–نەك پێش داوالێکردن– چونکە ئەگەر خاوەن ماڵەکە، یان

سەرپەرشتکارەکەی داوای ماڵەکە نەکا، دەستی دزەکە نابڕدرێ (وَالْمَذْهَبُ قَبُولُ رُجُوعِهِ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: ئەگەر دزەکە لە دانهێنانەکەی پەشیمان بۆوە، لێی قبولّ دەکرێ‌و دەستی نابڕدرێ؟ چونکە مافیخودایە، بەڵام لەبارەی ماڵەکە لێی قبولّ ناکرێ؟ چونکە مافی ئادەمیزادە، کەوابو: واجبە ماڵە دزراوەکە، یان نرخەکەی بداتەوە خاوەنەکەی.

(وَمَنْ أَقَرَّ بِعُقُوبَةٍ لِلَّهِ تَعَالَى) هەر کەسێك دانی هێنابێ بە تاوانێك کە سزایەکی بۆ خوای گەورە لە سەر واجب بکا: وەك زیناو شەڕابخواردنەوەو دزی....هتد، ئەوە (فَالصَّحِيحُ أَنَّ لِلْقَاضِي أَنْ يُعَرِّضَ لَهُ بِالرُّجُوعِ) بە فەرموودەی ڕاست بۆ قازی دروستە: پێچ‌و پەنای پەشیمانبوونەوەی بۆ بکا: وەك بە زیناکەرەکە بڵێ: لەوانەیە ڕان بەڕانت لەگەڵ ئافرەتەکە کردبێ‌و ماچت کردبێ. بە شەڕابخۆرەکە بڵێ: لەوانەیە نەتزانیبێ سەرخۆشکەرە. بە دزەکە بڵێ: وا تێناگەم دزیت کردبێ. چونکە گشتی لە (حديث صحيح)دا بەڵگەی لە سەرە، بەڵام (وَلاَ يَقُولُ: اِرْجِعْ) نابێ پێی بڵێ: پەشیمان ببەوە.

(وَلَوْ أَقَرَّ بِلاَ دَعْوَى) ئەگەر دزەکە بێداوالێکردن دانیهێنا: کە (أَنَّهُ سَرَقَ مَالَ زَيْدٍالْغَائِبِ) ماڵی فلانکەسی دزیوە، فلانکەسەکەش نادیار بوو، ئەوە (لَمْ يُقْطَعْ فِيالْحَالِ) ئێستا دەستی نابڕدرێ (بَلْ يُنْتَظَرُ حُضُورُهُ فِيالأَصَحِّ) بەڵكو دزەکە بەند دەکرێ‌و چاوەڕوانی ئامادەبوونی نادیارەکە دەکرێ، جا ئەگەر داوای ماڵەکەی کرد، ئەو کاتە دەستی دەبڕدرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: ئەگەر داوای ماڵەکەش نەکا، دەستی نابڕدرێ.

(أَوْ أَنَّهُ أَكْرَهَ أَمَةَ غَائِبٍ عَلَى زِنًا) یان ئەگەر دانیهێنا: کە زۆری لە (جارية)ی فلانکەس کردووەو زینای لەگەڵ کردوە، ئەو کاتە (حُدَّ فِيالْحَالِ) هەر ئێستا سزای زینایەکەی لێدەدرێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە سزای زینا داواکردنی ناوێ.

(وَ) هەروەها (تَثْبُتُ بِشَهَادَةِ رَجُلَيْنِ) دزی ئاشکرا دەبێ: بە شاهیدیی دوو پیاو، کەوابو: (فَلَوْ شَهِدَ رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ) ئەگەر خاوەنەکە داوای ماڵە دزراوەکەی کرد، ئینجا پیاوێك‌و دوو ئافرەت شاهیدییان دا، یان تەنها پیاوێك شاهیدیی داو لەگەڵ شاهیدیەکەش داواکارەکە

ثَبَتَ الْمَالُ وَلاَ قَطْعَ، وَيُشْتَرَطُ ذِكْرُ الشَّاهِدِ شُرُوطَ السَّرِقَةِ، وَلَوْ اِخْتَلَفَ شَاهِدَانِ كَقَوْلِهِ: سَرَقَ بُكْرَةً، وَالآخَرِ: عَشِيَّةً، فَبَاطِلَةٌ، وَعَلَىالسَّارِقِ رَدُّ مَا سَرَقَ، فَإِنْ تَلِفَ ضَمِنَهُ، وَتُقْطَعُ يَمِينُهُ، فَإِنْ سَرَقَ ثَانِيًا بَعْدَ قَطْعِهَا فَرِجْلُهُ الْيُسْرَى، وَثَالِثًا يَدُهُ الْيُسْرَى، وَرَابِعًا رِجْلُهُ الْيُمْنَى،

---

سوێندی خوارد، ئەوە (ثَبَتَ الْمَالُ وَلاَ قَطْعَ) لە هەردوو مەسەلەدا ماڵە دزراوەکە ئاشکرا دەبێ‌و واجبە بیدرێتەوە، بەڵام دەستی دزەکە نابڕدرێ، جا ئەگەر خاوەنەکە داوای ماڵە دزراوەکەی نەکردبێ، ئەو کاتە شاهیدیی پیاوێك‌و دوو ئافرەت وەرناگیرێ.

(وَيُشْتَرَطُ ذِكْرُ الشَّاهِدِ شُرُوطُ السَّرِقَة) بۆ دەست بڕینەکە بە مەرج دادەنرێ: هەردوو شاهیدەکان مەرجەکانی دزیەکە بڵێن: وەك فلانکەس فلانە ماڵەی فلانکەسی لە شوێنی پاراستنی دزیوەو نەمانزانیوە هیچ شوبهەشی لە ماڵەکەدا هەبێ (وَلَوْ اِخْتَلَفَ شَاهِدَان) ئەگەر دوو شاهید لە شاهیدیدا لێك جیاواز بون (كَقَوْلِه: سَرَقَ بُكْرَةً) وەك یەكێكیان بڵێ: پێش نیوەڕۆ ماڵەکەی دزی (وَالآخَرِ عَشِيَّةً) ئەوەکەیتریش بڵێ: دوای نیوەڕۆ دزی (فَبَاطِلَةٌ) ئەو شاهیدیە بەتاڵەو دەستی دزەکە نابڕدرێ، بەلام ئەگەر خاوەنەکە لەگەڵ شاهیدیی یەکێکیان سوێند بخوا، ئەو کاتە ماڵەکەی لە دزەکە وەردەگرێتەوە.

(وَعَلَىالسَّارِقِ رَدُّ مَا سَرَقَ) لە سەر دزەکە واجبە: ئەو شتەی دزیویەتی بۆ خاوەنەکەی بیگەڕێنێتەوە، جیاوازی نیە دزەکە: دەستی بڕدرابێ، یان نەبڕدرابێ، هەرچەند ماڵە دزراوەکەش نەگەیشتبێتە ڕادەیەکی دەست بڕین، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿عَلَىالْيَدِ مَا أَخَذَتْ حَتَّى تُؤَدِّيَهُ﴾ حديث صحيح رواه اصحاب السنن، لە سەر خاوەن دەست واجبە: ئەو شتەی وەریگرتوە بیپارێزێ تا دەیداتەوە خاوەنەکەی. (فَإِنْ تَلِفَ ضَمِنَهُ) جا ئەگەر ماڵە دزراوەکە فەوتابو، ئەو کاتە دزەکە دەبێتە زامینیو واجبە تۆڵەی بژمێرێ.

جا بزانە: ئەگەر-پێش ئەوەی هەواڵی دزیەکە بگاتە لای قازی- خاوەنەکە ماڵەکەی لە دزەکە وەربگرێتەوە، ئەو کاتە دەست بڕینو زامینی لە سەر دزەکە لادەکەوێ، هەروەك لە (الشبراملسى)دا ڕوون کراوەتەوە.

دیسان بزانە دەبێ پێشەوای موسوڵمانان، یان کاربەدەستێکی جێگریپێشەوا دەستی دزەکە ببڕێ، ئینجا (وَتُقْطَعُ يَمِينُهُ) جارییەکەم دەستە ڕاستەکەی دزەکە دەبڕدرێ، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام (فَإِنْ سَرَقَ ثَانِيًا بَعْدَ قَطْعِهَا) جا ئەگەر-لە دوای دەست بڕینەکە- دووەم جار دزیی کرد، ئەو کاتە (فَرِجْلُهُ الْيُسْرَى) پێی چەپەی دەبڕدرێ (وَثَالِثًا يَدُهُ الْيُسْرَى) ئەگەر جاریسێیەمیش دزیی کرد، دەستە چەپەکەی دەبڕدرێو (وَرَابِعًا رِجْلُهُ الْيُمْنَى) ئەگەر جاریچوارەمیش دزیی کرد، پێیڕاستەی دەبڕدرێ.

وَبَعْدَ ذَلِكَ يُعَزَّرُ، وَيُغْمَسُ مَحَلُّ الْقَطْعِ بِزَيْتٍ أَوْ دُهْنٍ مُغْلًى، قِيلَ: هُوَ تَتِمَّةٌ لِلْحَدِّ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ حَقٌّ لِلْمَقْطُوعِ فَمُؤْنَتُهُ عَلَيْهِ وَلِلإِمَامِ إِهْمَالُهُ، وَتُقْطَعُ الْيَدُ مِنَ الْكُوعِ وَالرِّجْلُ مِنْ مَفْصِلِ الْقَدَمِ، وَمَنْ سَرَقَ مِرَارًا بِلاَ قَطْعٍ كَفَتْ يَمِينُهُ وَإِنْ نَقَصَتْ أَرْبَعَ أَصَابِعَ، قُلْتُ: وَكَذَا لَوْ ذَهَبَتِ الْخَمْسُ فِي الأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَتُقْطَعُ يَدٌ زَائِدَةٌ أُصْبُعًا فِي الأَصَحِّ،

---

(وَبَعْدَ ذَلِكَ يُعَزَّرُ) ئینجا لە دوای لێکردنەوەی هەردوو دەستو پێیەکانی ئەگەر دیسان دزیی کرد، تەمبێ دەکرێ.

(وَيُغْمَسُ مَحَلُّ الْقَطْعِ بِزَيْتٍ أَوْ دُهْنٍ مُغْلًى) لە دوای لێکردنەوەی دەستو پێیەکە سوننەتە:

شـوێنی بڕینەکـە بـە ڕونێکـی کـوڵاو داغ بکـرێ، تـاکو خوێنەکـەی بوەسـتێ، چـونکە پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿إِذْهَبُوا بِهِ فَاقْطَعُوهُ ثُمَّ احْسِمُوهُ﴾ رواە الحـاكم والبـزار باسـناد صحيح، دزەکە ببەن دەستی ببڕن، ئینجا برینەکەشی داغ بکەن.

(قِيلَ: هُوَ تَتِمَّةٌ لِلْحَدِّ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەو داغکردنە تەواوکـەری سـزایەکەیەو واجبە بکرێ، بەڵام (وَالأَصَحُّ أَنَّهُ حَقٌّ لِلْمَقْطُوعِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: داغکردنەکە مافی دەستبڕاوەکەیە، چونکە دەرمانی خوێن ڕاگرتنەو بەهیلاکچونی لە سـەر لادەبـا، کەواتـە: دزەکەش مافی هەیە: هەر دەرمانێکی خوێنەکە ڕابگرێ بە کاری بێنـێ، کـەوابو: (فَمُؤْنَتُـهُ عَلَيْهِ) ئەرکی داغکردنەکەو دەرمانکردنەکە لە سەر دەستبڕاوەکەیە، هەم (وَلِلإِمَامِ إِهْمَالُهُ) بۆ کاربەدەستەکەش دروستە: داغکردنەکە نەکا، بەو مەرجەیترسی مردنی دەستبڕاوەکەی نەبێ، ئەگینا: واجبە بیکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتُقْطَعُ الْيَدُ مِنَ الْكُوعِ) دەستی دزەکە لە جومگەی بازنەوە لێدەکرێتەوەو (وَالرِّجْلُ مِـنْ مَفْصِلِ الْقَدَمِ) پێیەکەشی لـە گۆزینگـەوە لێدەکرێتـەوە، چـونکە پێغەمبـەرﷺو ئیمـامی (عمر) وەهایان کردوە، ئینجا سوننەتە: ئەندامە لێکراوەکەش بە ئەستۆیەوە هەڵبواسـرێ ﴿عن فضـالةﷺ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِﷺ بِسَارِقٍ فَقُطِعَتْ يَدُهُ ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَعُلِّقَتْ فِي عُنُقِهِ﴾ رواە اصحاب السنن بسند حسـن، دزێکیـان هێنـا لای پێغەمبـەرﷺ جـا دەسـتەکەی لێ کـراوەو فەرمانیدا: دەستەکەی بە ئەستۆیەوە هەڵواسرا.

(وَمَنْ سَرَقَ مِرَارًا بِلاَ قَطْعٍ) ئەگەر دزێك چەند جارێك دزیـی کـردو دەسـتیشی نـەبڕدرابو، ئەوە (كَفَتْ يَمِينُـهُ) بـۆ هـەموو دزیـەکان بڕینـی دەسـتە ڕاسـتەکەی بەسـە (وَإِنْ نَقَصَـتْ أَرْبَـعَ أَصَـابِعَ) هـەر چـەند ڕاستەکەشـی چـوار پەنجـەی نـەبێ (قُلْـتُ) ئیمـامی (النـواوی) دەفەرموێ (وَكَذَا لَوْ ذَهَبَتْ الْخَمْسُ فِيالأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ) هەروەها ئەگەر ڕاسـتەکەی پێـنج پەنجەشی نەمابێ، هەر دروست دەبێو بەر سزای دزیەکە دەکەوێ (وَتُقْطَعُ يَدٌ زَائِدَةٌ أُصْبُعًا فِي الأَصَحِّ) ئەو دەستەی، یان ئەو پێیەی پەنجەیەکی زیادە لە سزای دزیەکە دەبڕدرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَلَـوْ سَـرَقَ فَسَـقَطَتْ يَمِينُـهُ بِآفَـةٍ سَـقَطَ الْقَطْـعُ، أَوْ يَسَـارُهُ فَـلاَ عَلَـى الْمَـذْهَبِ.

(بَابُ قَاطِعِ الطَّرِيقِ)

هُوَ مُسْلِمٌ مُكَلَّفٌ لَهُ شَوْكَةٌ، لاَ مُخْتَلِسُونَ يَتَعَرَّضُونَ لآخِرِ قَافِلَةٍ يَعْتَمِدُونَ الْهَرَبَ، وَالَّذِينَ يَغْلِبُونَ شِرْذِمَةً بِقُوَّتِهِمْ قُطَّاعٌ فِي حَقِّهِمْ، لاَ لِقَافِلَةٍ عَظِيمَةٍ،

---

(وَلَوْ سَرَقَ) ئەگەر دزەکە ماڵێکی دزی (فَسَقَطَتْ يَمِينُهُ بِآفَةٍ) ئینجا لە دوای دزیەکە دەستە ڕاستەکەی لێبۆوە: بە هۆی ڕوداوێك، یان بە هـۆی ستەمێك، یـان بـە هۆیـەکیتر، ئـەوە

(سَقَطَ الْقَطْعُ) بڕینی دەستە ڕاستەکەی لە سەر لادەکەوێو نابێ بۆ سزای ئەم دزیە پێی چەپەی لێبکرێتەوە، بەڵام ئەگەر لە کاتی دزیەکە دەستی ڕاستەی نەبو، ئەو کاتە پێی چەپەی دەبڕدرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(أَوْ يَسَارُهُ) یان لە دوای دزیەکە دەستی چەپەی لێبۆوە (فَلاَ عَلَىالْمَذْهَبِ) بڕینی دەستە ڕاستەکەی لە سەر لاناکەوێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە شوێنی بڕینەکە بە ساغی ماوەتەوە، جا بزانە: پێی دزەکە هەمان بڕیاری دەستەکەی بۆ دەدرێ، هەروەك لە (مغنى)دا فەرموویەتی.

﴿ بَابُ قَاطِعِ الطَّرِيقِ: **باسی سزای ڕێگر** ﴾

**پێناسە**: (هُوَ) ڕێگر: (مُسْلِمٌ مُكَلَّفٌ) موسوڵمانێکی بالغو عاقڵە، یان کافرێکی پەیمان لەئەستۆی بالغو عاقڵە: کە (لَهُ شَوْكَةٌ) هێزو توانایەکی هەبێو بە سەر ڕێبوارەکاندا زاڵ ببێو بە ئاشکرایی ماڵیان لێبستێنێ، یان گیانیان بخاتە مەترسی، جیاوازی نیە ڕێگرەکە: چەکدار بێ، یان نا، یەك کەس بێ، یان زیاتر.

(لاَ مُخْتَلِسُونَ) نەك ئەو ماڵڕفێنانەی کە (يَتَعَرَّضُونَ لآخِرِ قَافِلَةٍ) لە دەرفەتێکدا خۆیان دەگەیەننە کۆتایی کاروانێكو (يَعْتَمِدُونَ الْهَرَبَ) پشت بە هەڵاتنەکەیان دەبەستن–نەك بە هێزو توانایەکەیان– واتە: ئەوانە سزای ڕێگریان لە سەر جێبەجێ ناکرێ، بەڵکو تەمبێ دەکرێنو هەم دەبنە زامینی ماڵو گیانی ڕێوارەکان.

بەڵام (وَالَّذِينَ يَغْلِبُونَ شِرْذِمَةً بِقُوَّتِهِمْ) ئەو ڕێگرانەی بە هێزو توانای خۆیان بە سەر کۆمەڵە ڕێبوارێکی کەمدا زاڵ دەبن، ئەوانە (قُطَّاعٌ فِي حَقِّهِمْ) دەرهەق ئەو کۆمەڵە ڕێبوارە بە ڕێگر دادەندرێن، هەرچەند ڕێبوارەکانیش لە ترسی ئەوان ڕابکەنو ماڵەکەیان لە بەر بێهێزی خۆیان بەجێ بهێڵن.

(لاَ لِقَافِلَةٍ عَظِيمَةٍ) نەك ئەگەر ڕێ لە کاروانێکی گەورە بگرنو ماڵیان لێبستێنن، واتە: ئەوانە دەرهەق ئەو کاروانە گەورەیە بە ڕێگر دانادندرێن، بەڵکو ماڵڕفێنن، چونکە توانای ئەو کاروانە گەورەیان نیە، کەوابو: ئەگەر کاروانەکە توانای بەرگرییان هەبوو، بەڵام

وَحَيْثُ يَلْحَقُ غَوْثٌ لَيْسَ بِقُطَّاعٍ، وَفَقْدُ الْغَوْثِ يَكُونُ لِلْبُعْدِ أَوْ لِضَعْفٍ وَقَدْ يَغْلِبُونَ وَالْحَالَةُ هَذِهِ فِي بَلَدٍ فَهُمْ قُطَّاعٌ، وَلَوْ عَلِمَ الإِمَامُ قَوْمًا يُخِيفُونَ الطَّرِيقَ وَلَمْ يَأْخُذُوا مَالاً وَلاَ نَفْسًا عَزَّرَهُمْ بِحَبْسٍ وَغَيْرِهِ،

---

خۆیان تەسلیمی ڕێگرەکان کرد تا گرتنیان، ئەوە بە کەمتەرخەمی دادەندرێو ڕێگرەکان بە فەرهودکەر ناو دەبرێن، واتە: سزای ڕێگرەکانیان لە سەر جێبەجێ ناکرێ، بەڵکو تەمبێ دەکرێنو دەبنە زامنی گیانو ماڵی ڕێبوارەکان.

بەڵام ئەگەر کاروانەکە کۆمەڵێکی کەم بون–واتە: یان چەکدار نەبون بۆیێ توانای

بەرگرییان نەبو– ئینجا ڕێگرەكان بـەماڵـەوە بـەرەو شـوێنیخۆیان بردنیـان، ئـەو كاتـە دەرەهەق ئەوانە بە ڕێگر دادەندرێن، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَحَيْثُ يَلْحَقُ غَوْثٌ) لە هەر شوێنێك هاوار بكرێو فریاكەوتنێك بگاتە هاواركەرەكە، ئـەوە (لَيْسَ بِقُطَّاعٍ) ڕێگرەكان بە ڕێگر داناندرێنو سزای ڕێگریان لە سەر جێبەجێ ناكرێ، بەڵكو بە فەرهودكەر ناو دەبرێنو تەمبێ دەكرێنو دەبنە زامین.

(وَفَقْدُ الْغَوْثِ) نەبوونی فریاكەوتن (يَكُونُ لِلْبُعْدِ) یان بە هۆی دووری لە ئاوەدانیو خاوەن دەسەڵات دەبێ (أَوْ لِضَعْفٍ) یان بە هۆی بێهێزیی كاربەدەست، یان بێهێزیی خەڵكەكە دەبێ: وەك كۆمەڵێك بچنە ماڵێكو چەك دەر بهێننو ڕێگا نەدەنە دانیشتووانی ماڵەكە هاوار بكەن، یان دانیشتووانی ماڵەكە دەیانزانی ئەگەر هاوار بكەن دزەكان دەیانكوژن، ئەوانـە لەو حاڵەتەدا دەرهەق دانیشتووانی ئەو ماڵە ڕێگرنو سـزای ڕێگریـان لـە سـەر جێبـەجێ دەكرێ، هەرچەند كاربەدەست لە شوێنەكەشدا هەبێو بەهێزیش بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَقَدْ يَغْلِبُونَ وَالْحَالَةُ هَذِهِ فِي بَلَدٍ) هەندێ جار خاوەن هێزەكـان لـە ئاوەدانیـدا بـە سـەر خەڵكیدا زاڵ دەبن لەو حاڵەتەی كاربەدەست بێهێزە، یان كاربەدەستو یارمەتیدەرەكانی لە ئاوەدانیەكە دوورن، لەو حاڵەتەشدا (فَهُمْ قُطَّاعٌ) ئەو زاڵبووانە ڕێگرنو سزای ڕێگریان لە سەر جێبەجێ دەكرێ.

(وَلَوْ عَلِمَ الإِمَامُ قَوْمًا يُخِيفُونَ الطَّرِيقَ) ئەگەر پێشەوای موسـوڵمانان زانـی كۆمـەڵێك–یـان تەنها كەسێك– ڕێبوارەكان لە ڕێگەدا دەخەنە مەترسی، بەڵام (وَلَمْ يَأْخُذُوا مَالاً وَلاَ نَفْسًا) هیچ ماڵێكیان لە ڕێبوارەكان نەسەندبو، نەشیان كوشتبون، ئەوە (عَزَّرَهُمْ بِحَبْسٍ وَغَيْرِهِ) واجبـە: ئـەو جـۆرە كەسـانە تـەمبێ بكـا: بـە بەنـدكردنو سـزایتریش: وەكـو لێـدانو دوورخستنەوە، جا وا باشترە لـە بەندیخانـەدا بیانهێڵێتـەوە تـا تۆبـەیان ئاشـكرا دەبـێ، بەڵام لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: لە ساڵێك شتێك كەمتر لە بەندیخانـەدا دەهێڵدرێنـەوە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

وَإِذَا أَخَذَ الْقَاطِعُ نِصَابَ السَّرِقَةِ قَطَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى وَرِجْلَهُ الْيُسْرَى، فَإِنْ عَادَ فَيُسْرَاهُ وَيُمْنَاهُ، وَإِنْ قَتَلَ قُتِلَ حَتْمًا، وَإِنْ قَتَلَ وَأَخَذَ مَالاً قُتِلَ ثُمَّ صُلِبَ ثَلاَثًا ثُمَّ يُنَزَّلُ، وَقِيلَ يَبْقَى حَتَّى يَسِيلَ صَدِيدُهُ، وَفِي قَوْلٍ يُصْلَبُ قَلِيلاً ثُمَّ يُنَزَّلُ فَيُقْتَلُ،

---

(وَإِذَا أَخَذَ الْقَاطِعُ نِصَابَ السَّرِقَةِ) هەر كاتێك ڕێگرەكە ئەندازەی ڕادەیەكی دەست بڕین، یان زیاتری برد–كە ئەندازەی چوارێكە میسقاڵێكی زێڕە– خاوەنەكەش داوای ماڵەكەی كـرد، ئەو كاتە (قَطَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى وَرِجْلَهُ الْيُسْرَى) كاربەدەسـتەكە دەستیڕاسـتەو پێیچـەپەی ڕێگرەكە لێدەكاتەوە، واتە: لێكردنەوەی هەردوو ئەندامەكە–تەنها– یەك سزادانە، كەوابو:

(فَـإِنْ عَـادَ) ئەگـەر لـە دوای لێکردنـەوەی هـەردوو ئەندامـەکان دیسـان ڕێگریـی کـردو ئەندازەیەکیتری دەست بڕینی برد، ئەو کاتەش (فَيُسْرَاهُ وَيُمْنَاهُ) دەسـتی چـەپەو پـێی ڕاستەی لێدەکاتەوە، جابزانە: ئەگەر خاوەنەکەی داوای ماڵەکەی نەکرد، ئەوە دەسـتو پێی ڕێگرەکە نابڕدرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِنْ قَتَلَ) ئەگەر ڕێگرەکە بە قەسدی ڕێبـوارێکی کوشـتو کوشـتنەکەش تۆڵەکردنـەوەی واجب دەکرد، بەڵام هیچ ماڵی نەبرد، ئەو کاتە (قُتِـلَ حَتْمًا) بـە واجبـی دەبـی ڕێگرەکـە بکوژرێ، واتە: بە لێبوردنی میراتگرەکانی کوژراوەکە کوشتنەکەی لە سەر لاناکەوێ.

(وَإِنْ قَتَلَ وَأَخَذَ مَالاً) ئەگەر ڕێگرەکـە بـە قەسـدی ڕێبـوارێکی کوشـتو ماڵەکەشـی بـرد، کوشتنەکەش تۆڵەکردنەوەی واجب دەکرد، ئەو کاتە (قُتِلَ ثُمَّ صُلِبَ ثَلاَثًا) بە واجبی دەبی بکوژرێ، ئینجا ماوەی سێ ڕۆژان لە بەرچاوی خەڵك بە سێدارەوە هەڵبواسرێ (ثُمَّ يُنَـزَّلُ) ئینجا دادەبەزێندرێ، بەڵام دەبی پێش هەڵواسینەکە بشۆرێو کفن بکرێو نوێژی لە سەر بکرێ، جا ئەگەر لە بەر گەرما مەترسی گۆڕانی لێدەکرا، ئەو کاتـە پـێش سـێ ڕۆژەکـان دادەبەزێندرێ.

(وَقِيلَ: يَبْقَى حَتَّى يَسِيلَ صَدِيدُهُ) لە فەرموودەیەکیبێهێزدا: بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە تا کێمو خێزاوکی لێدێ (وَفِي قَوْلٍ: يُصْـلَبُ قَلِـيلاً ثُـمَّ يُنَـزَّلُ فَيُقْتَـلُ) لـە فەرموودەیەکدا: بە زیندوویی ماوەیەکی کەم هەڵدەواسرێ، ئینا دادەبەزێندرێو دەکوژرێ.

ئینجـا بزانـە: لـە مەزهـەبی ئیمـامی(حنفی)دا: ڕێگرەکـە بـە زینـدوویی بـە سـێدارەوە هەڵدەواسرێو ڕمێکی تێرا دەکرێ تا دەمرێ، هەروەك لە کتێبەکانی خۆیاندا فەرموویانە.

دیسان بزانە: پێشەوای موسوڵمانان ئەو سزایانە جێبەجێ دەکا، هەروەها خودی ڕێگرتن بە شاهیدیی دوو پیاو، یان بە دانپێداهێنانی ڕێگرەکە ئاشکرا دەبێ، واتە بە شـاهیدیی پیاوێكو دوو ئافرەت، یان شاهیدیی پیاوێكو سوێندی ڕێلێگراوەکە تەنها ماڵەکە ئاشکرا دەبێ، هەروەك لە (باسی دزی)دا ڕابرا، لە (تحفة)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

وَمَنْ أَعَانَهُمْ وَكَثَّرَ جَمْعَهُمْ عُزِّرَ بِحَبْسٍ وَتَغْرِيبٍ وَغَيْرِهِمَا، وَقِيلَ يَتَعَيَّنُ التَّغْرِيبُ إِلَى حَيْثُ يَـرَاهُ، وَقَتْـلُ الْقَـاطِعِ يُغَلَّـبُ فِيـهِ مَعْنَـى الْقِصَـاصِ، وَفِـي قَـوْلٍ الْحَـدِّ، فَعَلَـىالأَوَّلِ لاَ يُقْتَلُ بِوَلَدِهِ وَ ذِمِّيٍّ،

---

کەوابو: واجبە ماڵە بردراوەکە بدرێتەوە خاوەنەکەی، هەرچەند ڕێگرەکەش دەستو پێی ببڕدرێن، جا ئەمەش بەڵگەی سزای ڕێگرە:

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِـالأَرْضِ فَسَاداً أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ

﴿فِالدُّنْيَا وَلَهُمْ فِالآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ سزای ئەو کەسانەی جەنگی خواو پێغەمبەر ﷺ دەکەن، واتە: ڕێگری دەکەن و هەوڵی تێکدان و وێرانکاری دەدەن، هەر ئەوەیە: کە بکوژرێن، یان لە سێدارە بدرێن، یان دەستو پێیان لە ڕاستەو چەپە ببڕدرێن، یان لە شوێنیخۆیان دوور بخرێنەوەو بەند بکرێن، ئەو سزایە سەرشۆڕیە بۆ ئەوان لە دونیادا، لە ڕۆژی دواییشدا سزایەکی گەورەیان هەیە.

جا بزانە: بەو چوار سزایانەی ڕوون کراونەوە، (ابن عباس)رضیالله عنهما تەفسیری ئایەتەکەی کردوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَمَنْ أَعَانَهُمْ وَكَثَّرَ جَمْعَهُمْ) هەر کەسێك یارمەتی ڕێگرەکانی دابێو کۆمەڵەکەیانی زۆر کردبێ، بەڵام ماڵی نەبردبێو کەسیشی نەکوشتبێ، ئەوە (عُزِّرَ) تەمبێ دەکرێ: (بِحَبْسٍ وَتَغْرِيبٍ وَغَيْرِهِمَا) بە بەندکردنو دوورخستنەوەو جگە لەوانەش: وەکو لێدانو ئازاردان (وَقِيلَ: يَتَعَيَّنُ التَّغْرِيبُ إِلَى حَيْثُ يَرَاهُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: تەنها دەبێ دوور بخرێتەوە بۆ ئەو شوێنەی پێشەوا بە بەرژەوەندی دەبینێ.

بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: ئەگەر لە ڕێگرەکان-تەنها- هەندێکیان ماڵەکە ببەن، یان کوشتنەکە بکەن، ئەوە سزایەکە لە سەر هەموانیان جێبەجێ دەکرێ، چونکە ڕێگرتنەکە بەوەش دێتەجێ: کە هەندێکیان پاڵپشتو یارمەتیدەری ئەوانیتر بن، هەروەك لە (مجمع الانهر)و (الهداية)دا فەرموویانە.

(وَقَتْلُ الْقَاطِعِ) کوشتنی ڕێگرەکە-بە واجبی- لەو حاڵەتەی ڕێبوارێك دەکوژێ (يُغَلَّبُ فِيهِ مَعْنَى الْقِصَاصِ) واتەی تۆڵەکردنەوەی تێدا زاڵ دەکرێ: کە مافی ئادەمیزادە (وَفِي قَوْلٍ الْحَدُّ) لە فەرموودەیەکدا: سزای ڕێگرتنی تێدا زاڵ دەکرێ: کە مافی خوای گەورەیەو بە لێبوردنی میراتگریکوژراوەکە لاناکەوێ:

(فَعَلَى الأَوَّلِ) جا لە سەر فەرموودەکەی یەکەمی بەهێزتر: (لاَ يُقْتَلُ بِوَلَدِهِ) ڕیگرەکە بە هۆی کوشتنی کوڕو کیژەکانی خۆی ناکوژرێ-کە لە ڕێگرتنەکەدا کوشتویەتی- هەم (وَذِمِّيٍّ) بە هۆی کوشتنی کافری پەیمان لەئەستۆش ناکوژرێ

وَلَوْ مَاتَ فَدِيَةٌ، وَلَوْ قَتَلَ جَمْعًا قُتِلَ بِوَاحِدٍ وَلِلْبَاقِينَ دِيَاتٌ، وَلَوْ عَفَا وَلِيُّهُ بِمَالٍ وَجَبَ وَسَقَطَ الْقِصَاصُ وَيُقْتَلُ حَدًّا، وَلَوْ قَتَلَ بِمُثَقَّلٍ أَوْ بِقَطْعِ عُضْوٍ فُعِلَ بِهِ مِثْلُهُ، وَلَوْ جَرَحَ فَانْدَمَلَ لَمْ يَتَحَتَّمْ قِصَاصٌ فِالأَظْهَرِ، وَتَسْقُطُ عُقُوبَاتٌ تَخُصُّ الْقَاطِعَ بِتَوْبَتِهِ قَبْلَ الْقُدْرَةِ عَلَيْهِ، لاَ بَعْدَهَا عَلَى الْمَذْهَبِ،

---

(وَ) هەر بە فەرموودەی بەهێزتر (لَوْ مَاتَ) ئەگەر ڕێگرەکە-بێکوشتن- بەخۆی مرد (فَدِيَةٌ) خوێنی کوژراوەکان لە میراتەکەیدا واجب دەبێ.

(وَ) هەروەها (لَوْ قَتَلَ جَمْعًا) ئەگەر ڕێگرەکە کۆمەڵێکی وێکڕا کوشتن، ئەو کاتە (قُتِلَ بِوَاحِدٍ)

لەتۆڵەی یەکێکیان دەکوشترێو (وَلِلْبَاقِينَ دِيَاتٌ) کوژراوەکانیتریش خوێنیان بۆ دادەندرێ، بەڵام ئەگەر یەك لە دوایەیك کوشتنی، ئەو کاتە لەتۆڵەی یەکەمەکە دەکوشترێ (وَلَوْ عَفَا وَلِيُّهُ بِمَالٍ) ئەگەر میراتگریکوژراوەکە ڕێگرەکەی لە کوشتن عەفو کرد لە سەر وەرگرتنی ماڵێك، ئەوە (وَجَبَ وَسَقَطَ الْقِصَاصُ) ماڵەکە لە سەر ڕێگرەکە واجب دەبێو کوشتنی لەتۆڵەشی لە سەر لادەکەوێ، بەڵام (وَيُقْتَلُ حَدًّا) لە سزای ڕێگرتنەکە هەر واجبە بکوژرێ.

(وَلَوْ قَتَلَ بِمُثَقَّلٍ أَوْ بِقَطْعِ عُضْوٍ) ئەگەر ڕێگرەکە بە شتێکی گران ڕێبوارەکەی کوشت، یان بە لێکردنەوەی ئەندامێك کوشتی، ئەوە (فُعِلَ بِهِ مِثْلُهُ) لە کاتی کوشتنیدا هەمان ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ، بەڵام (وَلَوْ جَرَحَ) ئەگەر ڕێگرەکە ڕێبوارێکی بریندار کرد (فَانْدَمَلَ) ئینجا برینەکەشی چاك بۆوە، ئەوە (لَمْ يَتَحَتَّمْ قِصَاصٌ) بریندارکردنەوەی لەتۆڵە واجب نیە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵکو بریندارەکە سەرپشکە: لە نێوان تۆڵەکردنەوەو خوێن وەرگرتن، بەڵام ئەگەر بەو برینە مرد، ئەو کاتە بە واجبی دەبێ ڕێگرەکە بکوژرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَسْقُطُ عُقُوبَاتٌ تَخُصُّ الْقَاطِعَ) ئەو سزایانەی تایبەتی ڕێگرەکەنەو مافی خوایگەورەنە –وەك کوشتنو لە سێدارەدانو دەستو پێ بڕین– لە سەر ڕێگرەکە لادەکەون (بِتَوْبَتِهِ قَبْلَ الْقُدْرَةِ عَلَيْهِ) بە تۆبەکردنی پێش ئەوەی بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی کاربەدەست (لاَ بَعْدَهَا) نەك دوای کەوتنە ژێردەسەڵات، واتە: هەر کاتێك ڕێگرەکە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی کاربەدەست، بە تۆبەکردن سزای ڕێگرتنی لە سە لاناکەوێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ تەنها ئەو ڕێگرانەی تۆبەیان کردوە پێش ئەوەی دەسەڵاتتان بکەوێتە سەریان، بزانن خوای گەورە لە مافی خۆی خۆش ئەبێو ڕەحم ئەکا.

جا بزانە: ئەو سزایانەی تایبەتی ڕێگرەکە نینو مافی ئادەمیزادن: وەك کوشتنی لەتۆڵەی کوشتنو سزای بوختانی زیناو زامینیی ئەو ماڵەی بردویەتی، یان مافی خوایگەورەن:

وَلاَ تَسْقُطُ سَائِرُ الْحُدُودِ بِهَا



(فَصْلٌ) مَنْ لَزِمَهُ قِصَاصٌ وَقَطْعٌ وَحَدُّ قَذْفٍ وَطَالَبُوهُ

---

وەکو سزای زیناو شەڕابو...هتد، ئەوانە بە تۆبەکردنی پێش کەوتنە ژێر دەسەڵاتیش لە سەر ڕێگرەکە لاناکەون، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**﴿ بە تۆبەکردن سزای تاوانەکان لە دونیادا لاناکەوێ ﴾**

(وَلاَ تَسْقُطُ سَائِرُ الْحُدُودِ بِهَا) جگە لە ڕێگرتن سزایەکانیتری تایبەت بە خوای گەورە: وەکو سزای زیناو شەڕابخواردنەوەو دزی، هیچێکیان بە تۆبەکردن لە دونیادا لاناکەون، جیاوازی نیە ئەو تاوانانە: ڕێگرێك کردبێ، یان تاوانبارێکی وەکو نوێژنەکەر، یان

کەسێکیتر، هەم جیاوازی نیە کاریەدەست بە تاوانەکەی زانیبێ، یان نەیزانیبێ (فِی الأَظْهَرِ) لەفەرموودەی بەهێزتردا ، بە بەڵگەی:

﴿عن عمرانﷺ: أَنَّ اِمْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّﷺ وَهِيَ حُبْلَى مِنَ الزِّنَا، فَقَالَتْ أَصَبْتُ حَدّاً فَأَقِمْهُ عَلَيَّ. فَقَالَ النَّبِيُّﷺ لِوَلِيِّهَا: أَحْسِنْ إِلَيْهَا فَإِذَا وَضَعَتْ فَأْتِنِي بِهَا. فَفَعَلَ، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَرُجِمَتْ، ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا، فَقَالَ عُمَرُ: أَتُصَلِّي عَلَيْهَا وَقَدْ زَنَتْ! فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ﴾ رواه مسلم واصحاب السنن، ئافرەتێك لە زینا ئاوس بوو، هاتە لای پێغەمبەرﷺ، گوتی: سزای زینام بدە. جا پێغەمبەرﷺ بە سەرپەرشتکاری ئافرەتەکەی فەرموو: بیبەوەو چاکەی لەگەڵ بکەو هەر کاتێك زگەکەی دانا بیهێنەوە لای من. ئینجا کە ئافرەتەکە زگەکەی دانا، پێغەمبەرﷺ فەرمانیدا: بەردباران کرا، ئینجا نوێژی لە سەر کرد، جا ئیمامی(عمرﷺ) فەرمووی: چۆن نوێژی لە سەر دەکەی، خۆ زینای کردوە ! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو ئافرەتە تۆبەیەکی وەهای کرد، ئەگەر لە نێوان حەفتا کەس لە خەڵکی (مدینة)دا بەش کرابایە بەشی هەمووانی دەکرد. واتە: ئافرەتەکە تۆبەی کردبو، بەڵام بە تۆبەکردن بەردبارانەکەی لە سەر لانەکەوتبو.

ئینجا بزانە: سزای نوێژنەکەرو پاشگەزبوو، بە تۆبەکردن لادەکەوێ، هەرچەند بەرزیش کرابنەوە بۆ لای کاربەدەست، هەروەها تاوانەکانیتری مافی خوای گەورە: ئەگەر ئاشکرا نەبن و لە نێوان خۆیو خوایگەورەدا تۆبە بکا، سزای ئەوانیش بە تۆبەکردن لە قیامەتدا لە سەری لادەکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانەو لە پێشەکیی (پەرتوکی زینا)دا بەڵگەمان بۆ هێناوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی کۆبوونەوەی چەند سزایەك لە سەر تاوانبارێك ﴾

(مَنْ لَزِمَهُ قِصَاصٌ وَقَطْعٌ وَحَدُّ قَذْفٍ) هەر کەسێك کوشتنی لەتۆڵەی کوشتن و دەست بڕینی لەتۆڵەی دەست بڕین و سزای بوختانی زینای لە سەر واجب بوبێ: بۆ سێ کەسان (وَطَالَبُوهُ) هەر سێکیانیش داوای مافی خۆیان لە تاوانبارەکە کرد، ئەوە (جُلِدَ) یەکەمجار ثُمَّ قُطِعَ ثُمَّ قُتِلَ، وَيُبَادَرُ بِقَتْلِهِ بَعْدَ قَطْعِهِ، لاَ قَطْعِهِ بَعْدَ جَلْدِهِ إِنْ غَابَ مُسْتَحِقُّ قَتْلِهِ، وَكَذَا إِنْ حَضَرَ وَقَالَ عَجِّلُوا الْقَطْعَ فِالأَصَحِّ، وَإِذَا أَخَّرَ مُسْتَحِقُّ النَّفْسِ حَقَّهُ جُلِدَ فَإِذَا بَرِئَ قُطِعَ، وَلَوْ أَخَّرَ مُسْتَحِقُّ طَرَفٍ جُلِدَ، وَعَلَى مُسْتَحِقِّ النَّفْسِ الصَّبْرُ حَتَّى يُسْتَوْفَالطَّرَفُ، فَإِنْ بَادَرَ فَقَتَلَ فَلِمُسْتَحِقِّ الطَّرَفِ دِيَةٌ، وَلَوْ أَخَّرَ مُسْتَحِقُّ الْجَلْدِ حَقَّهُ فَالْقِيَاسُ صَبْرُ الآخَرِيْنِ، وَلَوْ اِجْتَمَعَ حُدُودٌ لِلَّهِ تَعَالَى قُدِّمَ

---

لە سزای بوختانەکە دارکاری دەکرێ (ثُمَّ قُطِعَ) ئینجا لەتۆڵەی دەستەکە دەستی لێدەکرێتەوە (ثُمَّ قُتِلَ) ئینجا لەتۆڵەی کوشتنەکە دەکوشترێو (وَيُبَادَرُ بِقَتْلِهِ بَعْدَ قَطْعِهِ) لە دوای دست بڕینەکە واجبە: پەلە لە کوشتنەکەی بکرێ (لاَ قَطْعِهِ بَعْدَ جَلْدِهِ) بەڵام

بۆ دەست بڕینەكە لە دوای داركاریەكە دروست نیە پەلە بكرێ (إِنْ غَابَ مُسْتَحِقُّ قَتْلِهِ) ئەگەر خاوەن مافی كوشتنی لەتۆڵە ئامادە نەبێ (وَكَذَا إِنْ حَضَرَ وَقَالَ عَجِّلُوا الْقَطْعَ) هەروەها ئەگەر خاوەن مافەكەش ئامادە بێ و بڵێ: بە پەلە دەستی ببڕن، تاكو منیش لە دوای دەست بڕینەكە بە پەلە بیكوژم، ئەو كاتەش پەلەكردنی دەست بڕین دروست نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، نەوەك بە هۆی بەدواداهێنانی دەست بڕینەكە بمرێ و تۆڵەكردنەوەكە بفەوتێ.

بەڵام ئەگەر ئەو سێ سزایانە مافی تەنها یەك كەس بوون، ئەو كاتە ئەو ڕیزەی ڕابردوو بە شەرع واجب نیە، بەڵكو بە ویستی خاوەن مافەكەیە، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

(وَإِذَا أَخَّرَ مُسْتَحِقُّ النَّفْسِ حَقَّهُ) هەر كاتێك خاوەن مافی كوشتنەكە مافەكەی خۆی دواخست و ئەوانیتریش داوای مافیخۆیان كرد، ئەو كاتە (جُلِدَ) لە سزای بوختانەكە داركاری دەكرێ (فَإِذَا بَرِئَ قُطِعَ) جا هەركاتێك چاك بۆوە دەستی دەبڕدرێ.

(وَ) هەروەها (لَوْ أَخَّرَ مُسْتَحِقُّ طَرَفٍ) ئەگەر خاوەن مافی دەست بڕینەكە مافەكەی خۆی دواخست، ئەو كاتەش (جُلِدَ) داركاری دەكرێ، بەڵام (وَعَلَى مُسْتَحِقِّ النَّفْسِ الصَّبْرُ حَتَّى يُسْتَوْفَى الطَّرَفُ) لە سەر خاوەن مافی كوشتنەكە واجبە: خۆی ڕابگرێ تا دەستەكەی لێدەكرێتەوە، بەڵام (فَإِنْ بَادَرَ فَقَتَلَ) ئەگەر پەلەی كردو تاوانكارەكەی لەتۆڵە كوشت، ئەوە دەبێتە تۆڵەكردنەوە، كەوابو: (فَلِمُسْتَحِقِّ الطَّرَفِ دِيَةٌ) خاوەن مافی دەستەكەش مافی خوێنی دەستەكەی لە میراتی تاوانكارەكەدا هەیە، چونكە شوێنی تۆڵەكردنەوەكەی نەماوە (وَلَوْ أَخَّرَ مُسْتَحِقُّ الْجَلْدِ حَقَّهُ) ئەگەر خاوەن مافیداركاریەكە مافیخۆی دوا خست، ئەو كاتەش (فَالْقِيَاسُ صَبْرُ الآخَرَيْنِ) بەگوێرەی (قیاس) واجبە: دووەكانیتریش خۆ ڕابگرن تا داركاری دەكرێ.

(وَلَوْ اجْتَمَعَ حُدُودٌ لِلَّهِ تَعَالَى) ئەگەر چەند سزایەكی خوای گەورە كۆبونەوە: وەك كوڕێك زینای كردبێ و دزیی كردبێ و شەڕابی خواردبێتەوەو كوفریشی كردبێ، ئەو كاتە (قُدِّمَ الأَخَفُّ فَالأَخَفُّ، أَوْ عُقُوبَاتٌ لِلَّهِ تَعَالَى وَالآدَمِيِّينَ قُدِّمَ حَدُّ قَذْفٍ عَلَى زِنًا، وَالأَصَحُّ تَقْدِيمُهُ عَلَى حَدِّ شُرْبٍ، وَأَنَّ الْقِصَاصَ قَتْلاً وَقَطْعًا يُقَدَّمُ عَلَى الزِّنَا.

## (كِتَابُ الأَشْرِبَةِ)

كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ كَثِيرُهُ حَرُمَ قَلِيلُهُ،

---

الأَخَفُّ فَالأَخَفُّ) سزا سوكترەكە جا سوكترەكە وەپێش دێخرێ: وەك سزای شەڕاب، ئینجا زینا، ئینجا دەست بڕینی دزی، ئینجا ئەگەر نەبۆوە موسوڵمان یەكسەر دەكوژرێ.

(أَوْ عُقُوبَاتٌ لِلَّهِ تَعَالَى وَالآدَمِيِّينَ) یان چەند سزایەكی خوایگەورەو ئادەمیزادان كۆبونەوە: وەك سزای بوختانی زیناو كوشتن و شەڕاب و زیناو كافربوون، ئەو كاتە مافی ئادەمیزادان

وەپێش دێخرێ، کەواتە: (قُدِّمَ حَدُّ قَذْفٍ عَلَى زِنًا) سزای بوختان وەپێش سزای زینا دێخرێ، هەم (وَالأَصَحُّ تَقْدِيمُهُ عَلَى حَدِّ شُرْبٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر سزای بوختان وەپێش سزای شەڕابیش دێخرێ (وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ الْقِصَاصَ قَتْلاً وَقَطْعًا) تۆڵەکردنەوە: کوشتن بێ، یان لێکردنەوەی ئەندامێك بێ (يُقَدَّمُ عَلَىالزِّنَا) وەپێش بەردبارانکردنی زینا دێخرێ، چونکە مافی ئادەمیزادان بەرتەنگترە، بەڵام ئەگەر سزای زینا دارکاری بوو، ئەو کاتە وەپێش کوشتنەکە دێخرێ.

## ﴿ كِتَابُ الأَشْرِبَةِ: **پەڕتوکی شەڕابەکان** ﴾

**پێشەکی** بزانە: شەڕابخواردنەوە بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام حەرامەو لە گوناهە گەورەکانە، مەبەستیش بە شەڕاب ئەو جۆرە شلەیە: کە بنۆشەکەی–واتە: خۆرەوەکەی–سەرخۆش بکا، بە بەڵگەی: ﴿خَطَبَ عُمَرُ﷜ عَلَى مِنْبَرِالنَّبِيِّﷺ فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ وَهِيَ مِنْ خَمْسَةِ أَشْيَاءَ: اَلْعِنَبِ وَالتَّمْرِ وَالْحِنْطَةِ والشَّعِيرِ وَالْعَسَلِ، وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَالْعَقْلَ﴾ رواه الشيخان واصحاب السنن، ئیمامی(عمر)﷜ لە سەر مینبەری پێغەمبەرﷺ ووتاری داو فەرمووی: لەو حاڵەتەی حەرامکردنی شەڕاب هاتە خوارەوە، شەڕاب لە پێنج شت دروست دەکرا: لە ترێ و قەسپ و گەنم و جۆ و هەنگوین، مەبەستیش بە شەڕاب: ئەو شلەیە هۆشی مرۆڤ داپۆشێ و سەرخۆشی بکا.

کەواتە: مەرج نیە شەڕاب هەر لەو پێنج شتانە دروست بکرێ، بۆیێ پێویستە زۆر ئاگادار بین: بەو ناوانەی ئێستا بۆ شەڕاب دەگوترێن فێڵ لە موسوڵمانان نەکرێ؟ چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَيَشْرَبَنَّ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ إِسْمِهَا﴾ رواه أبوداود وصححه ابن حبان، کەسانێك لە ئوممەتی من شەڕاب دەخۆنەوە–جگە لە ناوی خۆی– ناوی‌تری لێدەنێن.

جا بزانە: لە حەرامیی شەڕاب جیاوازی کەم و زۆر نیە، هەروەك دەفەرموێ: ﴿كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ كَثِيرُهُ حَرُمَ قَلِيلُهُ﴾ كما رواه اصحاب السنن بسند حسن، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: وَحُدَّ شَارِبُهُ إلاَّ صَبِيًّا وَمَجْنُونًا وَحَرْبِيًّا وَذِمِّيًّا وَمُوجَرًا وَكَذَا مُكْرَهٌ عَلَى شُرْبِهِ عَلَالْمَذْهَبِ، وَمَنْ جَهِلَ كَوْنَهَا خَمْرًا لَمْ يُحَدَّ، وَلَوْ قَرُبَ إِسْلاَمُهُ فَقَالَ: جَهِلْتُ تَحْرِيمَهَا لَمْ يُحَدَّ، أَوْ جَهِلْتُ الْحَدَّ حُدَّ، وَيُحَدُّ بِدُرْدِيِّ خَمْرٍ، لاَ بِخُبْزٍ عُجِنَ دَقِيقُهُ بِهَا

---

هەر شەڕابێك زۆرەکەی سەرخۆش بکا، کەمەکەشی حەرامە. واتە: هەرچەند کەمەکەش سەرخۆشی نەکا. (وَحُدَّ شَارِبُهُ) شەڕابخۆرەوەکە سزا دەدرێ بە بەڵگەی حەدیسەکەی داهاتوو، هەرچەند سەرخۆشیش نەبوبێ.

(إلاَّ صَبِيًّا وَمَجْنُونًا) تەنها منداڵ و شێت لە سەر شەڕابخواردنەوە سزا نادرێن، چونکە نووسینیان لە سەر هەڵگیراوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو لە (باسی

پاشگەزبوونەوە)دا، بەڵام ئەگەر منداڵو شێتەکە فامیدە بن، ئەو کاتە تەمبێ دەکرێن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَ) هەروەها (حَرْبِيًّا وَذِمِّيًّا) کافری جەنگیو کافری پەیمان لەئەستۆش بە هۆی شەڕابخۆاردنەوە سزا نادرێن، چونکە باوەڕی بە حەرامیی نیەو نەیخستۆتە ئەستۆی‌خۆی خۆی لێ بپارێزێ (وَ) هەروەها (مُوجَرًا) ئەوەی بە زۆرلێکردن شەڕابەکەی دەناو گەرووی کراوە سزا نادرێ (وَكَذَا مُكْرَهٌ عَلَى شُرْبِهِ) هەروەها زۆرلێکراویش بۆ شەڕابخواردنەوە سزا نادرێ (عَلَى‌الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی‌ڕاستی مەزهەب، چونکە زۆرلێکراویش تاوانی لە سەر لادراوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌ڕابردوو لە (زینا)دا.

جا بزانە:–جگە لە شلە– ووشکە سەرخۆشکەرەکانی‌تریش حەرامن: وەکو بەنگو تریاكو حەشیشەو ئەو جۆرە شتانە، بەڵام سزایان بۆ دیاری نەکراوە، بەڵکو بەکارهێنەرەکەیان تەمبێ دەکرێ.

دیسان بزانە: هەر کەسێك بە زۆرلێکردن، یان بە خۆشی‌خۆی شەڕاب بخواتەوە، یان حەرامێکی‌تر بخواو بخواتەوە، ئەوە لە سەری واجبە: خۆی بڕشێنێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو دوو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَمَنْ جَهِلَ كَوْنَهَا خَمْرًا) هەر کەسێك نەیزانیبێ شلەکە شەڕابە، وای‌تێگەیشت شلەیەکی حەلاڵەو خواردیەوە، ئەوە (لَمْ يُحَدَّ) سزا نادرێ، چونکە عوزری هەیە (وَ) هەروەها (لَوْ قَرُبَ إسْلَامُهُ) ئەگەر تازە موسوڵمان بوبێو شەڕاب بخواتەوە (فَقَالَ: جَهِلْتُ تَحْرِيمَهَا) ئینجا بڵێ: نەمزانیوە شەڕاب حەرامە. ئەوەش (لَمْ يُحَدَّ) سزا نادرێ، چونکە بەو شوبهەیە سزا لادەدرێ (أَوْ جَهِلْتُ الْحَدَّ) یان ئەگەر بڵێ: دەمزانی حەرامە، بەڵام نەمزانی سزای هەیە. ئەو کاتە (حُدَّ) سزا دەدرێ، چونکە واجبە: خۆی لە حەرام بپارێزێ.

(وَيُحَدُّ بِدُرْدِيِّ خَمْرٍ) بە هۆی خواردنەوەی خڵتی بنەوەی قاپی شەڕابەکە سزا دەدرێ (لَا بِخُبْزٍ عُجِنَ دَقِيقُهُ بِهَا) بەڵام بە هۆی خواردنی ئەو نانەی ئاردەکەی بە شەڕاب شێلدراوە وَمَعْجُونٍ هِيَ فِيهِ، وَكَذَا حُقْنَةٌ وَسَعُوطٌ فِىالأَصَحِّ، وَمَنْ غَصَّ بِلُقْمَةٍ أَسَاغَهَا بِخَمْرٍ إنْ لَمْ يَجِدْ غَيْرَهَا، وَالأَصَحُّ تَحْرِيمُهَا لِدَوَاءٍ وَعَطَشٍ، وَحَدُّ الْحُرِّ أَرْبَعُونَ وَرَقِيقٍ عِشْرُونَ بِسَوْطٍ أَوْ أَيْدٍ أَوْ نِعَالٍ أَوْ أَطْرَافِ ثِيَابٍ، وَقِيلَ يَتَعَيَّنُ سَوْطٌ،

---

سزا نادرێ، هەم (وَمَعْجُونٍ هِيَ فِيهِ) بە هۆی خواردنی ئەو شێلدراوەش کە شەڕابی تێدایە، سزا نادرێ (وَكَذَا حُقْنَةٌ وَسَعُوطٌ) هەروەها ئەگەر شەڕابەکە لە قینگیو لە کونە لوتی بکا، سزا نادرێ (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَمَنْ غَصَّ بِلُقْمَةٍ) هەر کەسێك پاروویێکی لە گەروی‌دا ماوەو ترسی خنکانی هەبوو (أَسَاغَهَا بِخَمْرٍ) واجبە: بە خواردنەوەی شەڕاب بیباتە خوارەوە، نەوەك بمرێ (إنْ لَمْ يَجِدْ غَيْرَهَا)

بەو مەرجەی–جگە لە شەڕاب– هیچیتری دەست نەکەوێ، کەواتە سزا نادرێ.

## ﴿ دەرمانکردن بە شەڕاب ﴾

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (تَحْرِيمُهَا لِدَوَاءٍ) حەرامە: شەڕاب بخورێتەوە بۆ دەرمانکردنی نەخۆشی ﴿عن طارق الجُعْفِيِ‌ﷺ أَنَّهُ سَئَلَ النَّبِيَّ‌ﷺ عَنِ الْخَمْرِ يَصْنَعُهَا لِلدَّواءِ؟ فَنَهَاهُ فَقَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ بِدَوَاءٍ وَلَكِنَّهُ دَاءٌ﴾ رواه مسلم، (طارق) پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کرد: لەبارەی شەڕاب کە بۆ دەرمان دروستی دەکا؟ پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردو فەرمووی: شەڕاب دەرمان نیە بەڵکو دەردە.

جا بزانە: ئەگەر شەڕابەکە تێکەڵی دەرمانێك کراو ئاسەواری نەمابو، ئەو کاتە دروستە بۆ دەرمانکردن بخورێ، هەروەك خواردنی دەرمانە پیسەکانیتریش دروستە، بەو مەرجەی پزیشکێکیموسوڵمانی دادپەروەر ئەو دەرمانەی دانابێ و هیچ دەرمانێکیپاکیش بۆ ئەو نەخۆشیە نەبێ، هەروەها ئەگەر بۆ لێکردنەوەیئەندامێك، یان بۆ نەشتەرگەریەکیتر پێویستیی بە بێهۆشبوون هەبوو، ئەو کاتەش دروستە–جگە لە شەڕاب–بێهۆشکەرەکانیتر بە کار بێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَعَطَشٍ) هەم حەرامە: شەڕاب بخورێتەوە بۆ تێنووەتی، چونکە تێنووەتی زیاد دەکا، بەڵام (صاحب الإستقصاء) فەرموویەتی: دروستە شەڕاب دەرخواردی ئاژەڵان بدرێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنى)دا گێڕاویانەتەوە.

(وَحَدُّ الْحُرِّ أَرْبَعُونَ) سزای شەڕابخۆری ئازاد: لێدانی چل شوڕکەدارە (وَرَقِيقٍ عِشْرُونَ) سزای کۆیلەش بیستە، چونکە کۆیلە نیوەی ئازادە

(بِسَوْطٍ أَوْ أَيْدٍ أَوْ نِعَالٍ أَوْ أَطْرَافِ ثِيَابٍ) كما رواه البخارى وغيره، سزایەکەش–هەروەك پێغەمبەرﷺ دایناوە–: بە لێدانی شوڕکەو دەستو پێڵاو و جلی لولدراوە. (وَقِيلَ يَتَعَيَّنُ سَوْطٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: تەنها شوڕکە دیاری دەکرێ.

وَلَوْ رَأَى الإِمَامُ بُلُوغَهُ ثَمَانِينَ جَازَ فِالأَصَحِّ، وَالزِّيَادَةُ تَعْزِيرَاتٌ، وَقِيلَ حَدٌّ، وَيُحَدُّ بِإِقْرَارِهِ أَوْ شَهَادَةِ رَجُلَيْنِ، لاَ بِرِيحِ خَمْرٍ وَسُكْرٍ وَقَيْءٍ، وَيَكْفِي فِي إِقْرَارٍ وَشَهَادَةٍ: شَرِبَ خَمْرًا. وَقِيلَ يُشْتَرَطُ: وَهُوَ عَالِمٌ بِهِ مُخْتَارٌ. وَلاَ يُحَدُّ حَالَ سُكْرِهِ، وَسَوْطُ الْحُدُودِ بَيْنَ قَضِيبٍ وَعَصًا وَرَطْبٍ وَيَابِسٍ، وَيُفَرِّقُهُ عَلَى الأَعْضَاءِ

---

جا بزانە ئەگەر کەسێك–پێش سزادان– چەند جارێك شەڕابی خواردبێتەوە، ئەوە بۆ هەموو جارەکان ئەو سزایەیڕابردوو بەسە، بەڵام ئەگەر لە دوای سزادان دیسان شەڕاب بخواتەوە، ئەو کاتە دووبارە سزا دەدرێتەوە، هەروەك لە (مغنى)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ رَأَىالإِمَامُ بُلُوغَهُ ثَمَانِينَ) ئەگەر پێشەوایەکە بە باشی زانی سزایەکە بگەیێنێتە لێدانی

هەشتا شوڕکە، ئەوە (جَازَ فِيالأَصَحِّ) دروستە، لە فـەرموودەی ڕاسـتتردا ﴿عن عليّ﷛: جَلَدَ النَّبِيُّﷺ أَرْبَعِينَ وَجلَدَ أبوبَكْرٍ أَرْبَعِينَ وَجَلَدَ عُمَرُ ثَمَانِينَ، وَكُلٌّ سُنَّةٌ، وَهَذَا أَحَبُّ إِلَيَّ﴾ رواه مسـلم، ئیمـامی(علی)﷛ فـەرمووی: پێغەمبـەرﷺ چـل شـوڕکەی لـە شـەڕابخۆر داوە، ئیمامی(أبوبکر)ش چل شوڕکەی لێداوە، ئیمامی(عمر) هەشتا شوڕکەی لێـداوە، گشـتی ڕێبازی پێغەمبەرەوﷺ ئەو هەشتایە لە لای من خۆشەویسترە.

(وَالزِّيَادَةُ) زیاتر لە چل شوڕکەکە (تَعْزِيـرَاتٌ) تـەمبێکردنن، چـونکە دروسـتە زیاترەکـەی لێنەدا (وَقِيلَ حَدٌّ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: زیادەکەش سزادانە.

(وَيُحَدُّ) شەڕابخۆرەکە سزای لێدەدرێ: (بِإِقْرَارِهِ) بە دانپێدا هێنانی خۆی، کە بڵێ: شەڕابم خواردەوە (أَوْ شَهَادَةِ رَجُلَيْنِ) یان بە شاهیدیی دوو پیـاو، کـە بڵـێن: فلانکـەس شـەڕابی خواردەوە (لاَ بِرِيحِ خَمْرٍ وَسُكْرٍ وَقَيْءٍ) بەڵام بە بۆنی شەڕابو بە سەرخۆشیو بە ڕشانەوە –کە شەڕابی لێبێتەدەرەوە–و بە شاهیدیی پیاوێكو دوو ئافرەت، بە هێچێکیان سـزای لێنادرێ (وَيَكْفِي فِي إِقْرَارٍ وَشَهَادَةٍ) لە دانپێداهێنانو لە شاهیدیدا ئەوەندە بەسە: (شَرِبَ خَمْرًا) فلانكەس شەڕابی خواردەوە. یان شەڕابم خواردەوە (وَقِيلَ يُشْـتَرَطُ وَهُـوَ عَـالِمٌ بِـهِ مُخْتَارٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بە مەرج دادەنـدرێ بڵـێن: لـە حاڵـەتی خواردنـەوەدا دەیزانی شەڕابەو بە خۆشی خۆی خواردیەوە.

(وَلاَ يُحَدُّ حَالَ سُكْرِهِ) نابێ لە حاڵەتی سەرخۆشیدا سزایەکەی لێبدرێ، بەڵکو واجبە دوا بخرێ تا دێتەوە هۆش، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر لە حاڵەتی سەرخۆشیشدا سزایەکەی لێدرا، بە بەردەکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

جـا بزانـە: تێکـدانو کـاولکردنی شـەڕابخانەکان لـە پـەڕتوکی (غصـب)دا ڕابـرا.

(وَسَوْطُ الْحُدُودِ) شوڕکەی گشت سزادانەکانو تەمبێکردنەکان (بَيْنَ قَضِيبٍ وَعَصًا) دەبی لە نێوان لکەدارێکی باریكو عەسادا بێ، هەم (وَرَطْبٍ وَيَابِسٍ) لە نێوان دارێکی تەڕ و وشکدا بێ (وَيُفَرِّقُهُ عَلَـى الأَعْضَـاءِ) واجبـە: لێدانی شـوڕکەکە بـە سـەر ئەندامەکانـدا بـەش بکا

إِلاَّ الْمَقَاتِـلَ وَالْوَجْـهَ، قِيـلَ: وَالـرَّأْسَ، وَلاَ تُشَـدُّ يَـدُهُ، وَلاَ تُجَـرَّدُ ثِيَابُـهُ، وَيُوَالِالضَّـرْبَ بِحَيْـثُ يَحْصُـلُ زَجْـرٌ وَتَنْكِيـلٌ.

(فَصْلٌ) يُعَزَّرُ فِي كُلِّ مَعْصِيَةٍ لاَ حَدَّ لَهَا وَلاَ كَفَّارَةَ، بِحَبْسٍ أَوْ ضَرْبٍ أَوْ صَفْعٍ أَوْ تَوْبِيخٍ،

---

(إِلاَّ الْمَقَاتِلَ وَالْوَجْهَ) تەنها شوێنە کوشندەکانو ڕوو نەبێ، واتە: حەرامە لەو شوێنانە بدا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِذَا ضَرَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَّقِ الْوَجْهَ﴾ رواه الشـيخان، هـەر کاتێـك یەکێکتان سزای لە تاوانبارێك دا، با خۆی بپارێزێ لە دەمو چاوی نەدا. (قِيلَ: وَالرَّأْسَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: حەرامە لە سەری سزادراوەکەش بدا.

(وَلاَ تُشَدُّ يَدُهُ) لە کاتی لێدانەکە دەستی سزادراوەکە نابەسترێو لـە سـەر زەویـش درێـژ

ناکرێ، بەڵکو پیاو بە پێوە، ئافرەتیش بە دانیشتوویی سزادەدرێن، هەم (وَلاَ تُجَرَّدُ ثِيَابُهُ) جله تەنکەکانیشی لێناکرێنەوە، بەلاَم جلە ئەستورەکانی-وەك قاپوتو قەمسەڵە- لێیدەکرێنەوە، ئینجا ئافرەت جلەکانی لێدەبەسترێن، نەوەك ڕووت ببێ.

(وَيُوَالِي الضَّرْبَ) بە دوای یەکتردا شوڕکەکەی لێدەدرێ (بِحَيْثُ يَحْصُلُ زَجْرٌ وَتَنْكِيلٌ) بە شێوەیەکی وەها قەدەغەکردنی و ترساندنی لە گوناهەکە بیتە جێ، ئینجا پیاوماقوڵەکان لە شوێنێکی چۆلدا سزادەدرێن و ئەوانەی بە زۆری گوناهان دەکەن لە بەرچاوی خەڵك سزا دەدرێن.

جا بزانە: نابێ ئافرەتی ئاوس-تا زگەکەی دادەنێ- نە سزا بدرێ و نە تەمبێ بکرێ، هەروەك لە حەدیسی (مسلم وأصحاب السنن)دا گێڕدراوەتەوەو لە کۆتایی (ڕێگر)دا ڕابرا، هەروەها ﴿نَهَى رَسُولُ اللهِﷺ أَنْ يُسْتَقَادَ فِالْمَسْجِدِ وَأَنْ تُقَامَ فِيهِ الْحُدُودُ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: تۆڵەکردنەوەو سزای تاوانەکان لە مزگەوتدا ئەنجام بدرێن.

﴿فَصْلٌ: لە باسی (تَعْزِير) تەمبێکردن﴾

(يُعَزَّرُ فِي كُلِّ مَعْصِيَةٍ) تاوانکارەکە تەمبێ دەکرێ لە گشت تاوانێکی بەرامبەر بە خوای گەورە، یان ئادەمیزاد، کە تاوانەکە (لاَ حَدَّ لَهَا وَلاَ كَفَّارَةَ) لە شەرعدا: نە سزاو نە کەففارەتی بۆ دانەندرابێ: وەك دەستبازیەکانی جگە لە زینا، دزینی ئەو شتەی دەست بڕینی تێدا نیە، جنێودانەکانی جگە لە بوختان، شاهیدیو سوێندی بە درۆ، کەسابەت بە شتی حەڕام، خۆ وێچواندنی ئافرەتان، ئەنجامدانی جەژنی کافرەکان، دووزمانی...هتد.

جا تەمبێکردنەکەش: (بِحَبْسٍ) بە بەندکردنی کەمتر لە ساڵێك (أَوْ ضَرْبٍ) یان بە لێدان (أَوْ صَفْعٍ) یان بە شەق و شاپ لێدان (أَوْ تَوْبِيخٍ) یان بە لۆمەکردن خۆ لێتوڕەکردن، یان بە سەرتاشین-نەك ڕیش تاشین-، یان بە ڕوو ڕەشکردن، یان پێشەوپاش سواری ولاغ وَيَجْتَهِدُ الإِمَامُ فِي جِنْسِهِ وَقَدْرِهِ، وَقِيلَ إِنْ تَعَلَّقَ بِآدَمِيٍّ لَمْ يَكْفِ تَوْبِيخٌ، فَإِنْ جَلَدَ وَجَبَ أَنْ يَنْقُصَ فِي عَبْدٍ عَنْ عِشْرِينَ جَلْدَةً وَحُرٍّ عَنْ أَرْبَعِينَ، وَقِيلَ عِشْرِينَ، وَيَسْتَوِي فِي هَذَا جَمِيعُ الْمَعَاصِي فِي الأَصَحِّ،

---

بکرێ، یان ماوەی سێ ڕۆژان لە سێدارە بدرێ بە شێوەیەکی وەها: کە نەمرێ و نوێژو خواردنو خواردنەوەشی لێقەدەغە نەکرێ.

ئیتر (وَيَجْتَهِدُ الإِمَامُ فِي جِنْسِهِ وَقَدْرِهِ) پێشەوایەکە (إجتهاد) دەکاو بە بۆچونی خۆیو لێوەشانەوەی تاوانکارەکەو بەگوێرەی تاوانەکە ڕەگەزو ئەندازەی تەمبێکردنەکە دادەنێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ سَرَقَ دُونَ ذَلِكَ فَعَلَيْهِ غَرَامَةٌ وَالْعُقُوبَةُ﴾ رواه

أبوداود بسند صالح، هەر کەسێك لە ڕادەیەکی دەست بڕین کەمتر بدزێ، ئەوە تۆڵەی دزراوەکەو تەمبێکردنی لە سەر واجب دەبێ. (وَقِيلَ إِنْ تَعَلَّقَ بِآدَمِيٍّ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر تەمبێکردنەکە پەیوەندیی بە ئادەمیزادەوە هەبێ (لَمْ يَكْفِ تَوْبِيخٌ) لۆمەکردنی تاوانکارەکە بەس نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: دروست نیە بۆ تەمبێکردن ماڵ لە تاوانکارەکە وەربگیرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ لە (حَجَّةُ الْوَدَاع)دا فەرمویی: ﴿إِنَّ دِمَائَكُمْ وَ أَمْوالَكُمْ حَرامٌ عَلَيْكُمْ﴾ رواه مسلم، خوێنتان‌و ماڵتان لە یەکتری حەرامە. کەواتە: ئاشکرایە ماڵیموسوڵمان وەکو خوێنەکەی حەرامە، تا بەڵگەیەکی بەهێزیش نەبێ هیچێکیان حەلاڵ نابن، ئیمامی(النواوی)ش فەرموویەتی: بە هیچ بەڵگەیەك ئاشکرا نەبوە کە سزای ماڵی لە ئیسلامدا هەبوبێ، هەروەك لە (المجموع) لە سەرەتای زەکاتدا ڕوونی کردۆتەوە.

دووەم: واجبە: تا مردن ئەو جۆرە کەسانە بەند بکرێن: کە چاوێنی لە خەڵکی دەدەن، یان زۆر بێناموسی لەگەڵ ئافرەتان‌و منداڵان دەکەن، یان زۆر تاوان دەکەن، یان ڕەووشتی خەڵکی تێك دەدەن، جا لە بەندیخانەشدا لە سەر ئەرکی خۆی بەخێو دەکرێ، جا ئەگەر هیچی نەبو، ئەو کاتە لە (بيت المال)، یان لە سەر ئەرکی موسوڵمانانی دەوڵەمەند بەخێو دەکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ جَلَدَ) جا ئەگەر پێشەوا بە دارکاریکردن تاوانکارەکەی تەمبێ کرد (وَجَبَ أَنْ يَنْقُصَ فِي عَبْدٍ عَنْ عِشْرِينَ جَلْدَةً) لە تەمبێکردنی کۆیلەدا لە بیست شوڕکە واجبە: کەمتری لێبدا (وَحُرٍّ عَنْ أَرْبَعِينَ) لە تەمبێکردنی تاوانکاری ئازادیش لە چل شوڕکە واجبە: کەمتری لێبدا، هەروەها لە ساڵێکیش کەمتر بەندی بکا، واتە: نابێ تەمبێکردنەکە بگاتە کەمترین سزای تەمبێکراوەکە (وَقِيلَ عِشْرِينَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لە بیست شوڕکە واجبە: کەمتر بێ (وَيَسْتَوِي فِي هَذَا جَمِيعُ الْمَعَاصِي) لە واجبی ئەو کەمکردنەوەیەدا گشت تاوانەکان یەکسانن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَلَوْ عَفَا مُسْتَحِقُّ حَدٍّ فَلاَ تَعْزِيرَ لِلإِمَامِ فِالأَصَحِّ، أَوْ تَعْزِيرٍ فَلَهُ فِالأَصَحِّ.

(كِتَابُ الصِّيَالِ وَضَمَانِ الْوُلاَةِ)

لَهُ دَفْعُ كُلِّ صَائِلٍ عَلَى نَفْسٍ أَوْ طَرَفٍ أَوْ بُضْعٍ أَوْ مَالٍ،

---

(وَلَوْ عَفَا مُسْتَحِقُّ حَدٍّ) ئەگەر خاوەن مافی سزادانێك–وەك بوختان پێکراو– تاوانکارەکەی عەفو کرد، ئەوە (فَلاَ تَعْزِيرَ لِلإِمَامِ) بۆ پێشەوا دروست نیە تاوانکارەکە تەمبێ بکا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (أَوْ تَعْزِيرٍ) بەلام ئەگەر خاوەن مافی تەمبێکردنەکە تاوانکارەکەی عەفو کرد، ئەو کاتە (فَلَهُ فِيالأَصَحِّ) بۆ پێشەوا دروستە: تاواکارەکە تەمبێ

بکا، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ پاشکۆ ﴾: بۆ پێشەوا دروست نیەو حەڕامە: تاوانکارەکە لە سزادان عـەفو بکـا، بـەڵام دروستە لە تەمبێ‌کردن عەفوی بکا، بەڵکو ئەگەر تاوانکارەکـە مرۆڤێکـی ئـایین پـەروەرو ڕێزدار بوو و یەکەمجاری بوو، سوننەتە لە تەمبێ‌کردن عەفوی بکا، چـونکە پێغەمبـەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَقِيلُوا ذَوِيالْهَيْئَاتِ عَثَرَاتِهِمْ إِلاَّالْحُدُودَ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، چاوپۆشی لە خلیسکبردنەکانی خاوەن ڕێزەکان بکەن، تەنها لە سزایەکانی شەرعی عەفویان مەکەن.

هەروەها تکاکردن لە لای کاربەدەستەکان‌و خاوەن مافەکان سوننەتە، بـەو مەرجـەی لـە سزاکاندا نەبێ، چونکە هەر کاتێك تاوانەکە بۆ لای کاربەدەست بەرز کراوە، حەڕامە: تکا بۆ تاوانکارەکە بکرێ تاکو سزا نەدرێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ حَالَتْ شَفَاعَتُهُ دُونَ حَدٍّ مِنْ حُدُودِاللهِ فَقَدْ ضادَّ اللهَ فِي أَمْرِهِ﴾ أخرجـه أبـوداود وصـححه الـحاكم، هـەر کەسـێك تکاکردنەکەی بێتە هۆی سزانەدانێك لە سزایەکانی خوا، بەڕاستی دژایەتی خوای گەورەی کردوە لە فەرمانەکەیدا.

﴿ كِتَابُ الصِّيَالِ: **پەڕتوکی هێرشکردنی زۆرداری‌و**

(وَضَمَانِ الْوُلاَةِ) **زامینی سەرپەرشتکارەکان** ﴾

(لَهُ) بۆ مرۆڤ دروستە (دَفْعُ كُلِّ صَائِلٍ) گشت هێرشکەرێکی زۆردار بگەڕێنێتەوە: کە (عَلَى نَفْسٍ) هێرش دەکاتە سەر گیانێکی پارێزراو (أَوْ طَرَفٍ) یان ئەندامێکی پارێزراو (أَوْ بُضْعٍ) یان ناموسێکی پارێزراو، هەرچەند تەنها ماچکردنێکی حەڕامیش بێ (أَوْ مَالٍ) یان ماڵێکی پارێزراو، هەرچەند کەمیش بێ، یان تایبەتمەندیەکی پیس بێ: وەکو زبڵ.

ئینجا جیاوازی نیە هێرشکەرەکە: کافر بێ، یان موسوڵمان، عاقڵ بێ، یان شێت، خزم بێ، یان بێگانە، بالغ بێ، یان منداڵ، ئادەمیزاد بێ، یـان ئـاژەڵ، پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿مَـنْ قُتِـلَ دُونَ دِينِـهِ فَهُـوَ شَـهِيدٌ، وَمَـنْ قُتِـلَ دُونَ دَمِـهِ فَهُـوَ شَـهِيدٌ، وَمَـنْ قُتِـلَ دُونَ مَالِـهِ فَهُـوَ شَـهِيدٌ، وَمَـنْ قُتِـلَ دُونَ أَهْلِـهِ فَهُـوَ شَـهِيدٌ﴾ رواه أبــوداود وصـــححه الترمـــذي، هەر کەسێك بە هۆی بەرگری‌کردن لە ئایینەکەی، یان لە خوێنەکەی، یان لە ماڵەکەی، یان لە ناموسی خزم‌و کەسەکەی بکوژرێ، ئەوە شەهیدە. واتە: بـۆی دروسـتە: جـەنگ بکـاو هێرشکەرەکەش بکوژێ.

فَإِنْ قَتَلَهُ فَلاَ ضَمَانَ، وَلاَ يَجِبُ الدَّفْعُ عَنْ مَال وَيَجِبُ عَنْ بُضْعٍ

---

کەواتە: (فَإِنْ قَتَلَهُ) ئەگەر بەرگریکەرەکە هێرشکەرەکەی کوشت، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ) هـیچ زامینی نیە، واتە: نە تۆڵەو نە خـوێن‌و نـە کـەففارەت‌و نـە گونـاهی کوشـتنی لـە سـەر بکوژەکە نیە، چونکە بە فەرمانی شەرع بەرگری کردوە.

کەوابو: ئەگەر ئافرەتێکی ئاوس هێرشی زۆرداریی کردە سەر مرۆڤێك، ئەویش بەرگریی کردو ئافرەتەکەش کۆرپەکەی ناوزگی بە مردوویی لەبار هاوێشت، ئەوە بەرگریکەرەکە نابێتە زامینی کۆرپەکەش، هەروەك لە (مغني)و (الشبراملسي)دا فەرموویانە.

(وَلاَ يَجِبُ الدَّفْعُ عَنْ مَالٍ) بەرگریکردن لەماڵێکی بێگیان واجب نیە، بەڵکو دروستە، بەڵام ئەگەر هێرشکەرەکە برسییێکی ناچار بوو و هێرشی کردە سەر خواردەمەنیو ئاوەکەی، یان زۆرلێکراو بوو بۆ لەناوبردنی ماڵێك، ئەوە لەو دوو حاڵەتەدا بەرگریکردن حەرامەو واجبە: گیانی هێرشکەرەکە بپارێزرێ، بەڵام دروستە نرخی خواردەمەنیو ماڵەکەی لێبستێندرێ.

جا بزانە: ئەگەر ماڵەکە گیانلەبەر بوو و یەکێك دەیویست بیفەوتێنێ، ئەو کاتە بەرگریی واجبە، هەرچەند ملکیفەوتێنەرەکەش بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

جا هەر کەسێك بەرگریی لە ماڵیخۆی نەکردو ماڵەکەی فەوتێندرا، ئەو کاتە مافی هەیە تۆڵەی ماڵەکەی لە فەوتێنەرەکە بستێنێ، هەر چەند توانای بەرگریشی هەبوبێو بە قەسدیش بێدەنگ بوبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا لە (باسی پەشیمانبوونەوە لە شاهیدی)دا فەرموویانە.

(وَيَجِبُ عَنْ بُضْعٍ) واجبە: بەرگری لە ناموس بکا، هەرچەند ناموسی بێگانەو ئاژەڵیش بێ، بەو مەرجەی ترسی لەناوچوونی گیانیخۆی نەبێ.

بەڵام ئەگەر ئافرەت بۆ زینا هێرشی کرایە سەر، یان بڕیاری مارەبڕینێکی نادروستی لە سەر درابو، یان دەیزانی مێردەکەی تەڵاقی کەوتوەو وازی لێنەدەهێناو نەشکوێنجا خۆی ڕزگار بکا، لەو سێ حاڵەتانەشدا واجبە بەرگری بکا، هەرچەند بە کوشتنی مێردەکەشی بێ، واتە: حەرامە خۆی تەسلیم بکا هەرچەند بشکوژرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا –لێرەو لە (باسی ڕەوشتەکانی دادکردن)دا– ڕوون کراوەتەوە.

وَكَذَا نَفْسٍ قَصَدَهَا كَافِرٌ أَوْ بَهِيمَةٌ، لاَ مُسْلِمٌ فِي الأَظْهَرِ، وَالدَّفْعُ عَنْ غَيْرِهِ كَهُوَ عَنْ نَفْسِهِ، وَقِيلَ يَجِبُ قَطْعًا، وَلَوْ سَقَطَتْ جَرَّةٌ وَلَمْ تَنْدَفِعْ عَنْهُ إِلاَّ بِكَسْرِهَا ضَمِنَهَا فِي الأَصَحِّ،

---

(وَكَذَا نَفْسٍ قَصَدَهَا كَافِرٌ أَوْ بَهِيمَةٌ) هەروەها واجبە بەرگری لە گیانیخۆی بکا، ئەگەر کافرێك، یان ئاژەڵێك هێرشی کردەسەر، چونکە خۆ تەسلیمکردنی بە کافرەکە سەرشۆڕیی ئایینییە، ئاژەڵیش بە قوربانی ئادەمیزاد دەکرێ.

(لاَ مُسْلِمٌ) بەڵام ئەگەر موسوڵمانێك هێرشی کردە سەر، ئەو کاتە بەرگریی واجب نیە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵکو سوننەتە: خۆی تەسلیم بکا، پێغەمبەرﷺ لە حەدیسەکەی (اَلْفِتْنَة)دا فەموویەتی: ﴿كُنْ كَخَيْرِ اِبْنَيْ آدَمَ﴾ أخرجه الترمذي بسند صحيح،

له کاتی فیتنەدا تۆ وەك چاکترینی هەردوو کوڕەکانی باب ئادەم–هابیل– ڕەفتار بکە: کە خۆی تەسلیمی (قابیل) کرد.

(وَالدَّفْعُ عَنْ غَيْرِهِ) بەرگریکردن لە گیان و ماڵ و ناموسی کەسێکیتر (كَهُوَ عَنْ نَفْسِهِ) وەکو بەرگریکردنە لە خودیخۆی، واتە: لە هەر حاڵەتێکدا بەرگری لە خۆی دروست بێ، یان واجب بێ، لە بێگانەش دروستە، یان واجبە، بەو مەرجەی بەخۆی بە هیلاك نەچێ، چونکە واجب نیە خۆی بە قوربانی کەسێکیتر بکا (وَقِيلَ يَجِبُ قَطْعًا) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بەرگریکردن لە بێگانە لە گشت حاڵەتێکدا واجبە، بەو مەرجەی ترسی لەناوچوونی خۆی نەبێ.

(وَلَوْ سَقَطَتْ جَرَّةٌ) ئەگەر گۆزەیەکی بە سەردا بەر بۆوەو (وَلَمْ تَنْدَفِعْ عَنْهُ إلاَّ بِكَسْرِهَا) گۆزەکەشی لێنەدەگەڕاوە تەنها بە شکاندنی نەبێ، جا ئەگەر شکاندی (ضَمِنَهَا فِيالأَصَحِّ) دەبێتە زامنی گۆزەکە لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە گۆزە–وەکو ئادەمیزادو ئاژەڵ– سەربەخۆیی هێرشکردنی نیە.

**﴿ ئاگاداری: لەبارەی کوشتنی ستەمکار و بێئەخلاقەکان ﴾**

ئیمام (المحب الطبري) فەرموویەتی: دروستە ئەو جۆرە کارمەندانەی دەوڵەت بکوژرێن: کە خۆیان بە سەر خەڵکیدا سەپاندووە ستەم لە خەڵکی دەکەن.

هەروەها ئیمامی(الإسنوی) لە ئیمام (ابن عبدالسلام)ی گێڕاوەتەوە: ئەو کەسەی توانای هەیە بۆی دروستە بە پەنهانی ستەمکارەکان و گومرگ وەرگرەکان بکوژێ، تاکو خەڵك لە ستەمەکەیان بحەسێتەوە. هەروەك لە (بغية المسترشدين)دا گێڕاویەتیەوە.

هەروەها ئەگەر دەیزانی لە ماڵێکدا حەرام و بێشەرعی دەکرێ، ئەو کاتەش بۆی دروستە: هێرش بکاتە سەر ماڵەکەو بێشەرعیەکە لاببا، هەرچەند جەنگ و کوشتنیش لە نێوانیاندا ڕوو بدا، بەو مەرجەی ترسی فیتنەو سزادانی کاربەدەستە ستەمکارەکانی نەبێ، ئەگینا: نابێ خۆی، یان کەسێکیتر تووشی سزای ستەمکارەکان بکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

وَيُدْفَعُ الصَّائِلُ بِالأَخَفِّ، فَإِنْ أَمْكَنَ بِكَلاَمٍ وَاسْتِغَاثَةٍ حَرُمَ الضَّرْبُ، أَوْ بِضَرْبٍ بِيَدٍ حَرُمَ سَوْطٌ، أَوْ بِسَوْطٍ حَرُمَ عَصًا، أَوْ بِقَطْعِ عُضْوٍ حَرُمَ قَتْلٌ، فَإِنْ أَمْكَنَ هَرَبٌ فَالْمَذْهَبُ وُجُوبُهُ وَتَحْرِيمُ قِتَالٍ، وَلَوْ عُضَّتْ يَدُهُ خَلَّصَهَا بِالأَسْهَلِ مِنْ فَكِّ لَحْيَيْهِ وَضَرْبِ شِدْقَيْهِ فَإِنْ عَجَزَ فَسَلَّهَا فَنَدَرَتْ أَسْنَانُهُ فَهَدَرٌ، وَمَنْ نُظِرَ إلَى حُرَمِهِ فِي دَارِهِ مِنْ كَوَّةٍ أَوْ ثَقْبٍ عَمْدًا

---

هەروەها دروستە: ئەو جۆرە خرابکارانە سەرکوت بکرێن کە خەڵکی توشی بێئەخلاقیو فەسادی ئەکەن، جا ئەگەر تاوانکارەکە بەرگریی لە فاسقیو تاوانەکەی کرد، ئەو کاتە دروستە بکوژرێ، هەروەك لە (إحياء العلوم)دا فەرموویەتی.

هەروەها ئەگەر دیتی پیاوێك بە زینا (ذَکَر)یخۆی دەناو (فَرْج)یئافرەتێك ناوە،

ئەوە لەو حاڵەتەدا دروستە: پیاوەکە بکوژێ، هەروەك ئیمام (الماوردي)و (الرویاني) فەرموویانە، بەڵام لە (الأمّ)دا فەرموویەتی: کامەیان (مُحْصَن) بێ، ئەویان دەکوژرێ بە پەنهانی، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُدْفَعُ الصَّائِلُ بِالأَخَفِّ) هێرشکەری زۆردار بە ڕێگایەکیسوکتری هەرە سوکتر دەگەڕێندرێتەوە، کەوابو: (فَإِنْ أَمْكَنَ بِكَلاَمٍ وَاسْتِغَاثَةٍ) ئەگەر دەگونجا بە قسەی تورە، یان بە هاوارکردنە خەڵك بیگەڕێنێتەوە (حَرُمَ الضَّرْبُ) حەرامە لێیبدا (أَوْ بِضَرْبٍ بِيَدٍ) یان ئەگەر لە لێدانی بە دەست دەگەڕاوە (حَرُمَ سَوْطٌ) حەرامە بە شوڕکە لێیبدا (أَوْ بِسَوْطٍ حَرُمَ عَصًا) ئەگەر بە شوڕکە دەگەڕاوە، حەرامە بە عەسا لێیبدا (أَوْ بِقَطْعِ عُضْوٍ حَرُمَ قَتْلٌ) یان ئەگەر بە لێکردنەوەی ئەندامێکی دەگەڕاوە، حەرامە بیکوژێ.

(فَإِنْ أَمْكَنَ هَرَبٌ) جا ئەگەر دەگونجا ڕابکا، یان پەنا بباتە بەر خانوویێك، یان کۆمەڵە خەڵکێك، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ وُجُوبُهُ وَتَحْرِيمُ قِتَالٍ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: واجبە ڕابکاو پەنا بباتە بەر شوێنێك‌و حەرامە جەنگ لەگەڵ هێرشکەرەکە بکا، چونکە فەرمانی پێکراوە خۆی ڕزگار بکا، بەڵام لە فەرموودەکەیتردا: واجب نیە ڕابکا، چونکە مانەوەی لەو شوێنەدا دروستە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ عُضَّتْ يَدُهُ) ئەگەر دەستی گەسترا (خَلَّصَهَا بِالأَسْهَلِ) بە ئاسانترین ڕێگا دەستەکەی ڕزگار دەکا: (مِنْ فَكِّ لَحْيَيْهِ) بە لێککردنەوەی شەویلەکانی‌و (وَضَرْبِ شِدْقَيْهِ) بە لێدانی هەردوو لای دەمی (فَإِنْ عَجَزَ) جا ئەگەر ئەوانەی پێنەکرانو (فَسَلَّهَا فَنَدَرَتْ أَسْنَانُهُ) دەستەکەیخۆی ڕاکێشا دەرەوەو ددانەکانی زۆردارەکە دەرهاتن، ئەو کاتە (فَهَدَرٌ) ددانەکانی بە فیڕۆ دەدرێن‌و پێغەمبەریشﷺ فەرموویەتی: (هیچ خوێنی نیە). هەروەك لە حەدیسی (بخاری‌و مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

(وَمَنْ نُظِرَ إِلَى حُرَمِهِ فِي دَارِهِ) هەر کەسێك تەماشا کرا ژن‌و دایك‌و خوشك‌و مەحرەمەکانیتری، ئەوانەش لە ناو خانووەکەیدا بوون (مِنْ كَوَّةٍ أَوْ ثَقْبٍ عَمْدًا فَرَمَاهُ بِخَفِيفٍ كَحَصَاةٍ فَأَعْمَاهُ أَوْ أَصَابَ قُرْبَ عَيْنِهِ فَجَرَحَهُ فَمَاتَ فَهَدَرٌ، بِشَرْطِ عَدَمِ مَحْرَمٍ وَزَوْجَةٍ لِلنَّاظِرِ، قِيلَ وَاسْتِتَارِ الْحُرَمِ، قِيلَ وَإِنْذَارٍ قَبْلَ رَمْيِهِ، وَلَوْ عَزَّرَ وَلِيٌّ وَوَالٍ وَزَوْجٌ وَمُعَلِّمٌ فَمَضْمُونٌ، وَلَوْ حَدَّ مُقَدَّرًا فَلاَ ضَمَانَ،

---

تەماشاکەرەکەش لە کولانکەوە، یان لە کونێکەوە بە قەسدی تەماشای کردن (فَرَمَاهُ بِخَفِيفٍ كَحَصَاةٍ) خاوەن مەحرەمەکەش شتێکی سوکی بۆ هاویشت: وەکو بەردێکی بچوك (فَأَعْمَاهُ) تەماشاکەرەکەی کوێر کرد (أَوْ أَصَابَ قُرْبَ عَيْنِهِ فَجَرَحَهُ فَمَاتَ) یان بەردەکەی لە نزیکی چاوەکەی داو برینداری کردو بەو برینە مرد، ئەوە (فَهَدَرٌ) بە فیڕۆ دەدرێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَوْ أَنَّ امْرَأً إِطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ فَحَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ

فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، فَلاَ قَوَدَ وَلاَ دِيَةَ﴾ رواه الشيخان والنسائى، ئەگەر لە ماڵەكەتدا بوی‌و پیاوێك بێ‌ئیزن تەماشای كردی، تۆش بەردێكی بچوكت بۆ هاویشت‌و چاوت دەرهێنا، هیچ تۆڵە‌و هیچ خوێنت لە سەر نیە.

جا ئەو بە فیرۆدانەش (بِشَرْطِ عَدَمِ مَحْرَمٍ وَزَوْجَةٍ لِلنَّاظِرِ) بەو مەرجەی هیچ ژنێك‌و هیچ مەحرەمێكی تەماشاكەرەكە لەو شوێنەدا نەبێ (قِيلَ وَاسْتِتَارِ الْحُرَمِ) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: مەرجە: ئافرەتەكانیش دانەپۆشراو بن (قِيلَ وَإِنْذَارٍ قَبْلَ رَمْيِهِ) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: مەرجە پێش هاویشتنەكە هەڕەشەی لە تەماشاكەرەكە كرابێ.

## ﴿ باسی زامینی سەرپەرشتكارو كاربەدەستەكان ﴾

(وَلَوْ عَزَّرَ وَلِيٌّ) ئەگەر سەرپەرشتكار، یان بەخێوكەری منداڵێك منداڵەكەی تەمبێ كرد (وَوَالٍ) یان كاربەدەست تاوانكارێكی تەمبێ كرد (وَزَوْجٌ) یان مێرد ژنەكەی تەمبێ كرد (وَمُعَلِّمٌ) یان مامۆستایەك قوتابی=شاگردەكەی تەمبێ كرد، ئەوە (فَمَضْمُونٌ) تەمبێكردنەكە زامینكراوە، واتە: خوێنی وێنەی بە قەسدی لە سەر خزمەكانی تەمبێكەرەكە واجب دەبێ، ئەگەر تەمبێكردنەكە كارێكی لە مردنی، یان لە فەوتاندنی ئەندامێكی تەمبێكراوەكەدا كردبێ، بەڵام ئەگەر تەمبێكردنەكە هیچ كارێكی لە مردن‌و فەوتاندندا نەكردبێ: وەك شەقەو شاپێكی سوك، یان خۆ تورەكردن، یان بەندكردن، ئەو كاتە هیچ زامینی نیە، بەڵكو ئەگەر كەسێك مافێكی لە سەر بوو، دروستە بەند بكرێ تا مافەكە دەدا، یان تادەمرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

بەڵام (وَلَوْ حَدًّا مُقَدَّرًا) ئەگەر كاربەدەست، یان جێگرەكەی سزای تاوانكارێكی دا: بەو سزایەی لە شەرعدا داندراوە‌و سزادراوەكەش مرد، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ) هیچ زامینی نیە، بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام ﴿عن عُمَر وعَلِي رضالله عنهما: مَنْ مَاتَ فِي حَدٍّ أَوْ قِصَاصٍ فَلاَ دِيَةَ لَهُ﴾ رواه البيهقي، ورواه الشيخان عن علي في شارب الخمر، هەركەسێك بە هۆی سزادان، یان تۆڵە لێكردنەوە بمرێ، هیچ خوێنی نیە.

وَلَوْ ضُرِبَ شَارِبٌ بِنِعَالٍ وَثِيَابٍ فَلاَ ضَمَانَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَكَذَا أَرْبَعُونَ سَوْطًا عَلَى الْمَشْهُورِ، أَوْ أَكْثَرُ وَجَبَ قِسْطُهُ بِالْعَدَدِ، وَفِي قَوْلٍ نِصْفُ دِيَةٍ، وَيَجْرِيَانِ فِي قَاذِفٍ جُلِدَ أَحَدًا وَثَمَانِينَ، وَلِمُسْتَقِلٍّ قَطْعُ سِلْعَةٍ إلاَّ مَخُوفَةً لاَ خَطَرَ فِي تَرْكِهَا أَوِ الْخَطَرُ فِي قَطْعِهَا أَكْثَرُ،

---

(وَلَوْ ضُرِبَ شَارِبٌ بِنِعَالٍ وَثِيَابٍ) ئەگەر شەڕابخۆرێك بە لێدانی پێڵاو و جلەكان سزادراو بەو سزایە مرد (فَلاَ ضَمَانَ عَلَىالصَّحِيحِ) هیچ زامینی نیە، لە سەر فەرموودەی ڕاست (وَكَذَا أَرْبَعُونَ سَوْطًا) هەروەها ئەگەر چل شوركەشی لێبدرێ‌و بمرێ، زامینی نیە (عَلَى الْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب (أَوْ أَكْثَرُ) بەڵام ئەگەر شەڕابخۆرەكە

له چل شوپکه زیاتری لێدراو مرد، ئەوکاتە (وَجَبَ قِسْطُهُ بِالْعَدَدِ) به فەرموودەی بەهێزتر: بەشی زیاترەکە بەگوێرەی ژمارەکە زامینیی واجب دەبێ، بۆ وێنە: ئەگەر چل شوپکەی زیاتر لێدراو مرد، نیوەی خوێنەکەی واجب دەبێ، ئەگەر دە شوپکەی زیاتر لێدراو مرد پێنجیێکی خوێنەکەی واجب دەبێ (وَفِي قَوْلٍ: نِصْفُ دِيَةٍ) لە فەرموودەیەکدا: بە گشت جۆرە زێدەییەك نیوەی خوێنی واجب دەبێ.

(وَيَجْرِيَانِ) ئەو دووفەرموودە بەهێزو بێهێزە دێنەجێ (فِي قَاذِفٍ جُلِدَ أَحَدًا وَثَمَانِينَ) لەبارەی بوختانکەرێك کە هەشتاو یەك شوپکەی لێدرابێ و بمرێ، واتە: بە فەرموودەی بەهێزتر: لە هەشتاو یەك بەش: بەشە خوێنێك واجب دەبێ، بە فەرموودەی بێهێز: نیوەی خوێنی واجب دەبێ.

## ﴿ باسی برینی قونێرو لێکردنەوەی ئەندامەکان ﴾

(وَلِمُسْتَقِلٍّ) بۆ مرۆڤێکی سەربەخۆی بالغو عاقڵ دروستە: (قَطْعُ سَلْعَةٍ) لووێك، یان قونێرێك، یان هەر جۆرە ناشیرنیەکی لەو جۆرە لە لاشەیخۆی ببڕێو لایببا: بە دەستی خۆی، یان بە دەستی ئیزنداوێکیخۆی (إِلَّا مَخُوفَةً لَا خَطَرَ فِي تَرْكِهَا) تەنها ئەگەر برینەکەی مەترسی لێبکرێو هیچ ترسیش لە هێشتنەوەیدا نەبێ (أَوِ الْخَطَرُ فِي قَطْعِهَا أَكْثَرُ) یان ترسەکە لە برینەکەیدا زۆرتر بێ، ئەو کاتە لەو دوو حاڵەتەدا حەرامە بیبرێ، بەڵام ئەگەر مەترسی هێشتنەوەکەی لە برینەکەی زۆرتر بوو، یان هەردووکیان یەکسان بون، ئەوکاتە دروستە لە لاشەیخۆی ببڕێ، بەڵکو ئەگەر پزیشکێکی دادپەروەر بڵێ: هێشتنەوەی ئەو لووە دەبێتە هۆی بەهیلاکچوون، ئەو کاتە واجبە هەم لەخۆیو هەم لە منداڵەکەی بیبڕێ.

جا بزانە: ئەو بڕیارانەیڕابردوو و داهاتوو–گشتی– دەربارەی ئەندامێکی خۆرکدار و لەکارکەوتووش دێنەجێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەڵام حەرامە لە بەر ئێشو ئازار پەلەی مردن بکاو خۆی بکوژێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

وَلِأَبٍ وَجَدٍّ قَطْعُهَا مِنْ صَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ مَعَ الْخَطَرِ إِنْ زَادَ خَطَرُ التَّرْكِ، لَا لِسُلْطَانٍ، وَلَهُ وَلِسُلْطَانٍ قَطْعُهَا بِلَا خَطَرٍ وَفَصْدٌ وَحِجَامَةٌ، فَلَوْ مَاتَ بِجَائِزٍ مِنْ هَذَا فَلَا ضَمَانَ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ فَعَلَ سُلْطَانٌ بِصَبِيٍّ مَا مُنِعَ فَدِيَةٌ مُغَلَّظَةٌ فِي مَالِهِ، وَمَا وَجَبَ بِخَطَأِ إِمَامٍ فِي حَدٍّ أَوْ حُكْمٍ فَعَلَى عَاقِلَتِهِ، وَفِي قَوْلٍ فِي بَيْتِ الْمَالِ، وَلَوْ حَدَّهُ بِشَاهِدَيْنِ فَبَانَا عَبْدَيْنِ أَوْ ذِمِّيَّيْنِ أَوْ مُرَاهِقَيْنِ فَإِنْ قَصَّرَ فِي اخْتِبَارِهِمَا

---

(وَلِأَبٍ وَجَدٍّ) بۆ باوكو باپیرە دروستە (قَطْعُهَا مِنْ صَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ مَعَ الْخَطَرِ) لووەکە، یان ئەندامە خۆرکدارەکە، لە لاشەی منداڵو شێت ببڕێ، لەو حاڵەتەی مەترسی لە بڕینو لە هێشتنەوەیدا هەیە، بەڵام (إِنْ زَادَ خَطَرُ التَّرْكِ) بەو مەرجەی ترسی هێشتنەوەکەی زیاتر

بێ (لاَ لِسُلْطَانٍ) بەڵام بۆ کاربەدەستو خەڵکیتر دروست نیە، چونکە ئەوان وەکو باوكو باپیرە میهرەبان نین، هەروەها ئەگەر ترسی برینەکەو هێشتنەوەکەشی یەکسان بێ، ئەو کاتە بۆ باوكو باپیرەش دروست نیە لە لاشەی منداڵو شێت بیبڕێ.

بەڵام (وَلَهُ وَلِسُلْطَانٍ قَطْعُهَا بِلاَ خَطَرٍ) بۆ باوكو باپیرەو کاربەدەست دروستە: لووەکەو ئەندامەکە لە لاشەی منداڵو شێت ببڕن ئەگەر مەترسی لە لێکردنەوەیدا نەبێ، بەڵام بە هیچ جۆرێگ بۆ بێگانە دروست نیە، هەم (وَفَصْدٌ وَحِجَامَةٌ) خوێن لێگرتنو گشت چارەسەریەکی بێترسی منداڵو شێتەکەیان بۆ دروستە بە ئاماژەی پزیشك.

(فَلَوْ مَاتَ بِجَائِزٍ مِنْ هَذَا) جا ئەگەر منداڵەکە، یان شێتەکە بە چارەسەریەکی دروستی لەوانەیڕابردوو مرد، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ) هیچ زامینیو کەففارەت واجب نابێ (فِیالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام (وَلَوْ فَعَلَ سُلْطَانٌ بِصَبِيٍّ مَا مُنِعَ) ئەگەر کاربەدەستو جێگرەکەی، یان باوكو باپیرە چارەسەریەکی قەدەغەکراوی منداڵو شێتەکەیان کردو بەو چارەسەریە مرد، ئەو کاتە (فَدِيَةٌ مُغَلَّظَةٌ فِی مَالِهِ) خوێنێکی ئەستوورکراو لە ماڵی خۆی واجب دەبێ: بۆ میراتگرەکانی منداڵو شێتەکە، چونکە لە سنوری شەرع لایداوە، بەڵام لە تۆڵە ناکوشترێ، چونکە مەبەستی چاکسازی بووە.

جا بزانە: دروستە گوێی کیژۆڵەکان کون بکرێ بۆ گوارە پێهەڵواسین، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا ڕوون کراوتەوە.

(وَمَا وَجَبَ بِخَطَأِ إِمَامٍ) هەر خوێنێك بە هۆی هەڵەی پێشەوا، یان جێگرەکەی واجب بوبێ، (فِی حَدٍّ أَوْ حُكْمٍ) لە سزادانو تەمبێکردنو بڕیارداندا، ئەوە (فَعَلَیعَاقِلَتِهِ) خوێنەکە لە سەر خزمەکانیەتی (وَفِیقَوْلٍ فِی بَیْتِ الْمَالِ) لە فەرموودەیەکدا: لە (بیت المال) خوێنەکە دەدرێ.

(وَلَوْ حَدَّهُ بِشَاهِدَیْنِ) ئەگەر پێشەوا بە شاهیدی دوو پیاو مرۆڤێکی سزا داو بەو سزادانە مرد (فَبَانَا عَبْدَیْنِ أَوْ ذِمِّیَّیْنِ أَوْ مُرَاهِقَیْنِ) ئینجا ئاشکرا بوو: شاهیدەکان کۆیلە بون، یان کافر بون، یان نەبالغ بون، ئەوە (فَإِنْ قَصَّرَ فِی اخْتِبَارِهِمَا) ئەگەر پێشەوایەکە فَالضَّمَانُ عَلَیْهِ، وَإِلاَّ فَالْقَوْلاَنِ، فَإِنْ ضَمَّنَّا عَاقِلَةً أَوْ بَیْتَ مَالٍ فَلاَ رُجُوعَ عَلَی الذِّمِّیَّیْنِ وَالْعَبْدَیْنِ فِی الأَصَحِّ، وَمَنْ حَجَمَ أَوْ فَصَدَ بِإِذْنٍ لَمْ یَضْمَنْ، وَقَتْلُ جَلاَّدٍ وَضَرْبُهُ بِأَمْرِ الإِمَامِ کَمُبَاشَرَةِ الإِمَامِ إِنْ جَهِلَ ظُلْمَهُ وَخَطَأَهُ،

---

کەمتەرخەمیی کردبێ لە باسو لێکۆڵینەوەی شاهیدەکاندا (فَالضَّمَانُ عَلَیْهِ) زامینیی سزادراوەکە لە سەر خۆیەتی، واتە: ئەگەر بە قەسدی کوشتبێتی لەتۆڵەیی دەکوشترێتەوە، جائەگەر عەفو کرا، خوێنەکەشی لە سەر خۆیەتی، ئەگەر بە هەڵەش کوشتبێتی خوێنەکە لە سەر خزمەکانیەتی.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر کەمتەرخەمیی نەکردبو، ئەو کاتە (فَالْقَوْلاَنِ) دوو فەرموودەکەیڕابردوو

دێنە جێ، بەهێزترەکەیان: خوێنەکەی لە سەر خزمەکانیەتی (فَإِنْ ضَمَّنَّا عَاقِلَةً أوْ بَيْتَ مَالٍ) جا ئەگەر خزمەکانی، یان (بیت المال) بکەینە زامنی خوێنەکە (فَلاَ رُجُوعَ عَلَى الذِّمِّيَّيْنِ وَالْعَبْدَيْنِ) هیچیکیان مافی ئەوەی نیە بگەڕێتەوە سەر شاهیدە کافرەکانو کۆیلەکان تاکو خوێنەکەیان لێوەبگرێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەوان وا تێدەگەن ڕاستییان گوتوە.

## ﴿ باسی زامینی پزیشكو لێدەری سزاكان ﴾

(وَمَنْ حَجَمَ أوْ فَصَدَ بِإِذْنٍ) هەرکەسێك بە ئیزنی بالغو عاقڵێك خوێنی لێبگرێو بەو خوێن لێگرتنەش فەوتانێك ڕوو بدا (لَمْ يَضْمَنْ) خوێنگرەکە نابێتە زامین.

هەروەها ئەگەر پزیشکێکی لێزان بە دەرمانێك، یان بە نەشتەرگەری چارەی نەخۆشێکی کردو هیچ کەمتەرخەمیشی نەکردو نەخۆشەکە مرد، ئەویش نابێتە زامین، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام، بەڵام ئەگەر پزیشکەکە لە چارەسەریەکەیدا هەڵەی کردبێ، یان لە سنوری پزیشکی دەرچوبێ، یان شارەزایی لەو نەخۆشییە نەبوبێ، ئەو کاتە خوێنی مردووەکە لە سەر خزمەکانی واجب دەبێ، بەڵام ئەگەر نەخۆشەکە بە خۆی دەرمانەکە دیاری بکا، ئەو کاتە نابێتەزامین.

جا بزانە: ئەگەر بە دوژمنکاری، واتە: بە قەسدی نەخۆشەکەی کوشتبێ، ئەو کاتە کوشتنەوەی لەتۆڵەی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ تَطَبَّبَ وَلَمْ يَكُنْ بِالطِّبِّ مَعْرُوفاً فَأَصَابَ نَفْساً فَمَا دُونَهَا فَهُوَ ضَامِنٌ﴾رواه أصحاب السنن وصححه الحاكم، هەر کەسێك خۆی بکاتە پزیشكو پزیشکیش نەبێ، ئەگەر گیانێك، یان ئەندامێك بفەوتێنێ دەبێتە زامین.

(وَقَتْلُ جَلاَّدٍ وَضَرْبُهُ بِأَمْرِ الإِمَامِ) کوشتنی لێدەری سزاکانو لێدانەکەی بە ئیزنی پێشەوا (كَمُبَاشَرَةِ الإِمَامِ) وەکو ڕاستەوخۆی پێشەوایەکەیە (إِنْ جَهِلَ ظُلْمَهُ وَخَطَأَهُ) بەو مەرجەی نەزانێ پێشەوایەکە لەو بڕیارەیدا ستەمکارە، یان بەهەڵەدا چووە، واتە: پێشەوایەکە

وَإِلاَّ فَالْقِصَاصُ وَالضَّمَانُ عَلَى الْجَلاَّدِ إِنْ لَمْ يَكُنْ اللَّحْمَةِ بِأَعْلَى الْفَرْجِ، وَالرَّجُلِ بِقَطْعِ مَا تُغَطِّى حَشَفَتَهُ



دەبێتە زامینی کوژراوەکە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لێدەری سزاکان دەیزانی: پێشەوایەکە ستەمکارە، یان بەهەڵەداچووە، ئەو کاتە (فَالْقِصَاصُ وَالضَّمَانُ عَلَىالْجَلاَّدِ) کوشتنی لەتۆڵەو زامینی تەنها لە سەر لێدەرەکەیە (إِنْ لَمْ يَكُنْ إِكْرَاهٌ) بەو مەرجەی زۆری لێنەکرابێ، واتە: ئەگەر لێدەرەکە زۆری لێکرابێ، ئەو کاتە کوشتنەوەی لەتۆڵە–لە حاڵەتی ستەمکاریدا– یان خوێنەکەی لە سەر هەردووکیان واجب دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

# ﴿ باسی سوننەتکردنی ئافرەتو پیاو ﴾

(وَيَجِبُ خِتَانُ الْمَرْأَةِ) سوننەتکردنی ئافرەت واجبە: (بِجُـزْءٍ مِـن اللَّحْمَـةِ بِـأَعْلَى الْفَـرْجِ) بـە لێکردنەوەی بەشێکیکەم لەو پڕپیتە گۆشتەی لە نێوان هەردوو لێوی (فَرْج)ی ئافرەت بە لای سەرەوەیە، هەم (وَالرَّجُلِ) سوننەتکردنی پیاویش واجبە (بِقَطْعِ مَا تُغَطِّى حَشَفَتَهُ) بە لێکردنەوەی هـەموو ئـەو پیسـتەیەی سـەری (ذکـر)ی داپۆشـیوە، ئینجا سـوننەتکردنی ئافرەتو پیاو (بَعْدَالْبُلُوغِ) لە دوای بلۆغبوونیان واجبە، واتە ئەگەر بلۆغی بوو و سوننەت نەکرابو، ئەو کاتە کاربەدەستی موسوڵمانان زۆری لێدەکا: خۆی سوننەت بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً﴾ ئینجا وەحیمان بـۆ تۆ نارد–ئەی محمـدﷺ– شـوێن ئـایینی (إبـراهیم پێغەمبـەر)ﷺ بکـەوە. پێغەمبـەریشﷺ فەرموویـەتی: ﴿إِخْتَتَنَ إِبْرَاهِيمُ النَّبِيُّﷺ وَهُوَ اِبْنُ ثَمَانِينَ سَنَةً﴾ رواه الشـيخان، (إبـراهیم پێغەمبەر)ﷺ خۆی سوننەت کرد تەمەنی هەشتا ساڵ بـوو. واتـە: سـوننەتکردن بەشـێکە لەئایینی (إبراهیم پێغەمبەر)ﷺ، کەوابو: واجبە: ئەنجامی بدەین.

جا بزانە: ئەگەر یەکێك بە سوننەتنەکراوی مرد، نابیٚ بە مردوویی سوننەت بکریٚ، هەرچەند بلۆغیشی بوبیٚ، هەروەها ئەگەر بە سوننەتکراوی لە دایك بوبیٚ، ئـەوە سـوننەتکردنی لـە سەر لادەکەویٚ، دیسان بزانـە: لـە فەرموودەیـەکی بـیٚهێزدا–کـە فـەرموودەی زۆرتـرینی زانایەنە–: تەنها سوننەتکردنی پیاوان واجبە، واتـە: سـوننەتکردنی ئـافرەت واجـب نیـە بەڵکو سوننەتە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنى)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَيُنْدَبُ تَعْجِيلُهُ فِى سَابِعِه) سوننەتە: سـوننەتکردنی منداڵەکـە لـە ڕۆژی حەفتـەمینی لـە دایکبوونیدا بکریٚ ﴿عن عائشة رضى الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّﷺ خَتَنَ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ رضى الله عنهما يَوْمَ سَابِعِهِمَا﴾ رواه البيهقى وصححه الحاكم، پێغەمبەرﷺ لـە ڕۆژی حەفتـەمینی لەدایکبوونـدا (حسن)و (حسين)ی سوننەت کردن.

فَـإِنْ ضَـعُفَ عَـنْ اِحْتِمَالِـهِ أُخِّـرَ، وَمَـنْ خَتَنَـهُ فِـي سِـنٍّ لاَ يَحْتَمِلُـهُ لَزِمَـهُ قِصَـاصٌ إِلاَّ وَالِـدًا، فَـإِنْ اِحْتَمَلَـهُ وَخَتَنَـهُ وَلِـيٌّ فَـلاَ ضَـمَانَ فِـى الأَصَـحِّ، وَأُجْرَتُـهُ فِـى مَـالِ الْمَخْتُـونِ.

(فَصْلٌ) مَنْ كَانَ مَعَ دَابَّةٍ أَوْ دَوَابَّ ضَمِنَ إِتْلاَفَهَا نَفْسًا وَمَالاً لَيْلاً وَنَهَارًا،

---

(فَإِنْ ضَعُفَ عَنْ اِحْتِمَالِه) جا ئەگەر منداڵەکە بیٚهێز بوو و باری سوننەتکردنی نەدەگرت، ئەو کاتە (أُخِّرَ) واجبە دوا بخریٚ، کەوابو: (وَمَنْ خَتَنَهُ فِى سِنٍّ لاَ يَحْتَمِلُهُ) هەر کەسـێك لـە تەمەنێکی وەهادا منداڵەکەی سوننەت کرد: کە باری نەدەگرتو بەو سـوننەتکردنە مـرد، ئەوە (لَزِمَهُ قِصَاصٌ) سوننەتکەرەکە کوشتنی لەتۆڵەی لـە سـەر واجـب دەبـیٚ (إِلاَّ وَالِـدًا) تـەنها بـاوكو بـاپیرەو دایـكو داپـیرە نەبیٚ، واتە: ئەوان خوێنێکی ئەستوورکراویان

له سەر واجب دەبێ. بەڵام (فَإِنْ اِحْتَمَلَهُ وَخَتَنَهُ وَلِيٌّ) ئەگەر منداڵەكە باری سوننەتكردنی دەگرتو سەرپەرشتكارەكەی سوننەتی كردو بەو سوننەتكردنە مرد، ئەو كاتە (فَلاَ ضَمَانَ فِی الأَصَحِّ) هیچ زامینێی لە سەر نیە، لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەروەها ئەگەر بێگانەیەكیش یەكێكی بالغو عاقڵ بە ئیزنی وی سوننەت بكاو بمرێ، ئەویش نابێتە زامین، بەڵام ئەگەر بێگانەكە منداڵێك سوننەت بكاو منداڵەكە بمرێ، ئەو كاتە دەبێتە زامین، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

(وَأُجْرَتُهُ فِی مَالِ الْمَخْتُونِ) كرێی سوننەتكردنەكە لە ماڵێ سوننەتكراوەكە دەدرێ، جا ئەگەر هیچ ماڵی نەبو، ئەو كاتە كرێیەكەی لە سەر ئەو كەسەیە كە واجبە بەخێوی بكا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی شت فەوتاندنی منداڵ و ئاژەڵەكانو ئۆتۆمبیل ﴾

پێشەكی بزانە: ئەگەر منداڵ بەخۆی تاوانێك ئەنجام بدا، ئەوە تۆڵەی تاوانەكە لە ماڵی منداڵەكە واجب دەبێ، بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام، هەروەك لە(مغنی ابن قدامة)دا فەرموویەتی.

هەروەها شێت هەمان بڕیاری منداڵی بۆ دەدرێ، كەوابو: (مَنْ كَانَ مَعَ دَابَّةٍ أَوْ دَوَابٍّ) هەر كەسێك لەگەڵ ئاژەڵێك، یان لەگەڵ چەند ئاژەڵێكدا بێ، ئەوە (ضَمِنَ إِتْلاَفَهَا نَفْسًا وَمَالاً) كەسەكە دەبێتە زامینی هەر گیانێكو هەر ماڵێكی كە ئاژەڵەكە-یان ئەو بێچوەیی كە بە دواوەیەتی- بیفەوتێنێ (لَيْلاً وَنَهَارًا) بە شەو و بە ڕۆژ، جیاوازی نیە ئاژەڵەكە: ملكی خۆی بێ، یان بەكرێگیراو بێ، یان خواستراو بێ، یان ئەمانەت بێ، یان زەوتكراو بێ، هەروەها جیاوازی نیە كەسەكە: بالغو عاقڵ بێ، یان شێت، یان منداڵ بێ، بە خۆشی خۆی، یان بە زۆرلێكردن سواری ئاژەڵەكە بوبێ، یان ڕاییكێشێ، یان لێی بوخوڕێ.

جا ئەگەر دوو كەس سواری وواڵغەكە بوبن، ئەوە هەریەكەو نیوەی زامینییان لە سەرە، هەروەها ئەگەر یەكێك لێی بوخوڕێو یەكێكیش ڕاییكێشێ، ئەو كاتەش هەر یەكەو نیوەیە، بەڵام ئەگەر سوارێك لە سەر پشتی ووڵاغەكە بێ، ئەو كاتە تەنها سوارەكە زامینە، واتە: لێخوڕەكەو ڕاكێشەرەكە نابنە زامین، كەوابو: ئەگەر ووڵاغەكە بێچووەكەی بە دوادا بێو

...........................................................................................

بێچووەكە شتێك بفەوتێنێ، ئەو كاتەش سوارەكە دەبێتە زامین. بەڵام ئەگەر بێگانەیەك -بێئیزنی سەرپەرشتكار- منداڵێك، یان شێتێكی سواری ووڵاغێك كرد، ئەو كاتە بێگانەكە دەبێتە زامینی ئەو شتەی ووڵاغەكە دەیفەوتێنێ، جا ئەگەر منداڵەكە بەخۆی -بێئیزن- سواری ووڵاغەكە ببێ، ئەو كاتە منداڵەكە دەبێتە زامین، هەروەها ئەگەر سەرپەرشتكارەكەشی بۆ بەرژەوەندی منداڵەكە سواری ووڵاغەكەی بكاو

منداڵەکـەش دەیتـوانی وولاغەکـە ڕابگـرێ، ئـەو کاتـەش منداڵەکـە دەبێتـە زامـین، ئەگـەر نـا: سەرپەرشـتکارەکەی دەبێتـە زامـین، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچـاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾ یەکەم: مەبەست بە زامینیی‌کەسەکە لـەم باسـەدا: ئەگـەر فەوتێنـدراوی ئاژەڵەکە گیان بێ–واتە: ئادەمیزاد بێ– ئەوە زامینیـی لـە سـەرخزمەکانی کەسـەکەیە، ئەگەر ماڵ بێ ئەوە لە سەر خۆیەتی، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەوابو: ئەگەر شوفێری ئوتومبیلێك بە ئۆتۆمبیلەکەی گیانێك–بە هەڵە– بفەوتێنی، ئەوە زامینیی گیانەکە لە سەر خزمەکانیەتی، ئەگەر ماڵێك بفەوتێنێ تۆڵـەی ماڵەکـە لـە سـەر خۆیەتی، جا لە هەردوو حاڵەتدا جیاوازی نیە ئۆتۆمبیلەکە: ملکی خۆی بێ، یان نا–وەکو مەسەلەی ئاژەڵەکە– چونکە شوفێرەکە: هەم سوارو هەم لێخوڕی ئۆتۆمبیلەکەیە، هەروەك لە باسی (خۆ لێکدانی کەشتیو ئۆتۆمبیل)دا درێژتر ڕوونمان کردەوە.

دووەم: ئەگەر یەکێك–بێئیزن–نەقیزەیەکی لە وولاغێك دا، یان لێی قیڕاند، یان ترساندی، ئینجا وولاغەکەش ڕەویەوەو شتێکی فەوتاند، یان سوارەکەی کەوتە خوارەوەو مرد، یـان– بێئیزنی شوفێرەکە– یەکێك ئوتومبیلەکەی سوڕاندو لە ڕێگە لایدا، ئـەوە لـەو حاڵەتانـەدا نەقیزەچیو قیڕێنەرەکەو ترسێنەرەکەو سوڕێنەرەکە دەبنە زامین، بەڵام ئەگـەر بـە ئیزنـی سوارەکە، یان ڕاکێشەرەکە، یان شوفێرەکە وایکردبێ، ئەو کاتە ئیزندەرەکە دەبێتە زامین.

جا لە هەر حاڵەتێکدا وولاغێك ڕەویەوەو یەکێکی‌تر–بێئیزن– گەڕاندیەوە، ئەوە هەر شتێك لە حاڵەتی ڕۆیشتنەکەی گەڕاندنەوەکەدا بفەوتێنێ، ئەو کەسەی گەڕاندویەتیەوە دەبێتـە زامـین، بـەڵام ئەگـەر بـە ئیزنـی ئـەو کەسـە بـێ کـە لەگـەڵ وولاغەکەدایـە، ئـەو کاتـەش ئیزندەرەکە دەبێتە زامین.

سـێیەم: ئەگەر سوار وولاغەکە–واتە: یان سوار ئۆتۆمبیلەکە– دەیتوانی وولاغەکە، یـان ئۆتۆمبیلەکە ڕابگرێو بە سـەریدا زاڵ ببـێ، بـەڵام وا ڕێـك کـەوت لـە دەسـتی دەرچـو و نەیتوانی بە سەریدا زاڵ ببێ؟ بە هۆی بچڕانی جڵەوی‌وولاغەکە، یان ڕاگری‌ئۆتۆمبیلەکە، ئینجا شتێکی فەوتاند، ئـەو کاتـەش سـوارەکەو شـوفێرەکە دەبنـە زامـین، بـەڵام ئەگـەر

وَلَـوْ بَالَـتْ أَوْ رَاثَـتْ بِطَرِيـقٍ فَتَلِـفَ بِـهِ نَفْـسٌ أَوْ مَـالٌ فَـلاَ ضَـمَانَ، وَيَحْتَـرِزُ عَمَّـا لاَ يُعْتَـادُ كَرَكْضٍ شَـدِيدٍ فِـي وَحْـلٍ، فَإِنْ خَـالَفَ ضَـمِنَ مَـا تَوَلَّـدَ مِنْـهُ، وَمَنْ حَمَـلَ حَطَبًـا عَلَى ظَهْرِهِ أَوْ بَهِيمَةٍ فَحَكَّ بِنَاءً فَسَقَطَ ضَمِنَهُ، وَإِنْ دَخَلَ سُوقًا فَتَلِفَ بِهِ نَفْسٌ أَوْ مَالٌ ضَمِنَ إنْ كَانَ زِحَامٌ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ وَتَمَزَّقَ ثَوْبٌ فَلاَ، إلاَّ ثَوْبَ أَعْمَى وَمُسْتَدْبِرِ الْبَهِيمَةِ

---

وولاغێك لە دەستی ڕابکاو شتێك بفەوتێنێ، یان بە توندی بـە سـتبویەوەو بەرهـەڵ بـوو و شتێکی فەوتانـد، یـان بـە هـۆی تـۆزو ڕەشەباو دەنگی هەورو ئەو شتانە ئاژەڵەکان

ڕەوینەوەو کشتوکاڵێکیان فەوتاند، ئەوە لەو سێ مەسەلەیەدا نابێتە زامین، بەڵام ئەگەر بە هۆی خەوتنی شوانەکە پەرت بن، ئەو کاتە شوانەکە دەبێتە زامین، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ناوەڕۆکی ئەم سێ ئاگاداریانە ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ بَالَتْ أَوْ رَاثَتْ بِطَرِيقٍ) ئەگەر وولاغەکە لە ڕێگایەکدا میزی کرد، یان ڕیخی کرد (فَتَلَفَ بِهِ نَفْسٌ أَوْ مَالٌ) ئینجا بەو میزو ڕیخە گیانێك، یان ماڵێك فەوتا، ئەوە (فَلاَ ضَمَانَ) فەوتاوەکە هیچ زامێنیی نیە (وَيَحْتَرِزُ عَمَّا لاَ يُعْتَادُ) واجبە: سوار وولاغ–واتە: هەم شوفێری ئۆتۆمبل– خۆی بپارێزێ لەو کردارەی عادەت نیە (كَرَكْضٍ شَدِيدٍ فِي وَحْلٍ) وەکو غاردانێکی بەهێز لە شوێنێکی قوڕ، یان بە بەرد، یان لە شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکدا، کەوابو: (فَإِنْ خَالَفَ) ئەگەر سوار وولاغەکە، یان شوفێرەکە بە دژی ئەم واجبە ڕەفتاری کرد (ضَمِنَ مَا تَوَلَّدَ مِنْهُ) دەبێتە زامینی هەر فەوتانێکی لەو ناعادەتیە ڕوو بدا.

بەڵام لە سەر فەرموودەی کۆمەڵە زۆرەکەی زانایان: ئەگەر بەگوێرەی عادەتیش بڕواو بەردێك لە ژێر پێی وولاغەکەی، یان ئۆتۆمبیلەکەی دەربپەڕێ و زیانێك بگەیەنێ، ئەو کاتەش دەبێتە زامین، هەروەك لە (تحفة)و(مغنی)دافەرمویانە.

(وَمَنْ حَمَلَ حَطَبًا عَلَى ظَهْرِهِ أَوْ بَهِيمَةٍ) هەر کەسێك داری لە پشتیخۆی، یان لە پشتی وولاغەکە بار کردبو (فَحَكَّ بِنَاءً فَسَقَطَ) جا لە ڕۆیشتنەکەیدا دارەکەی بە دیوارێکەوە خشاندو دیوارەکە کەوت، ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا (ضَمِنَهُ) دارهەڵگرەکە دەبێتە زامین، جیاوازی نیە: بە خۆیشی سواری وولاغەکە بوبێ، یان لێی بوخوڕێ، یان ڕایبکێشێ، هەر دەبێتەزامین؟ چونکە یان بە باری خۆی، یان بە باری وولاغەکەی فەوتانەکە ڕوویداوە.

(وَإِنْ دَخَلَ سُوقًا) ئەگەر دار هەڵگرەکە بەخۆی، یان بە وولاغەکەیەوە، یان بە ئۆتۆمبیلەکەیەوە چووە بازاڕێك (فَتَلَفَ بِهِ نَفْسٌ أَوْ مَالٌ) جا بەو دارە گیانێك، یان ماڵێك فەوتا، ئەوە (ضَمِنَ إِنْ كَانَ زِحَامٌ) دەبێتە زامینی فەوتاوەکە ئەگەر پاڵەپەستەو قەرەباڵغی لە بازارەکەدا هەبێ، بەڵام (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ) ئەگەر لە بازارەکەدا پاڵەپەستە نەبێ و (وَتَمَزَّقَ ثَوْبٌ)جلێك، یان شتێکیتر بە دارەکە فەوتا (فَلاَ) نابێتە زامین (إِلاَّ ثَوْبَ أَعْمَى وَمُسْتَدْبِرِ الْبَهِيمَةِ) تەنها دەبێتە زامینی جلو کەلوپەلو گیانی کوێرو ئەو کەسەی فَيَجِبُ تَنْبِيهُهُ، وَإِنَّمَا يَضْمَنُهُ إِذَا لَمْ يُقَصِّرْ صَاحِبُ الْمَالِ، فَإِنْ قَصَّرَ بِأَنْ وَضَعَهُ بِطَرِيقٍ أَوْ عَرَّضَهُ لِلدَّابَّةِ فَلاَ، وَإِنْ كَانَتِ الدَّابَّةُ وَحْدَهَا فَأَتْلَفَتْ زَرْعًا أَوْ غَيْرَهُ نَهَارًا لَمْ يَضْمَنْ صَاحِبُهَا، أَوْ لَيْلاً ضَمِنَ،

---

پشتی لە وولاغەکەیە، ئەگەر ئاگاداری نەکردبێتەوە، یان کەڕ بێ و گوێی لێنەبوبێ، کەوابو: (فَيَجِبُ تَنْبِيهُهُ) واجبە ئاگاداری بکاتەوە، جا ئەگەر ئاگاداری کردەوەو خۆی نەپاراست، ئەو کاتە زامینیی لە سەر نیە.

(وَإِنَّمَا يَضْمَنُهُ) تەنها لەو حاڵەتەدا دارهەڵگرەكەو شوفێرەكە دەبنە زامینــی فەوتانــدراوی وولاغەكەو ئۆتۆمبیلەكە (إِذَا لَمْ يُقَصِّرْ صَاحِبُ الْمَالِ) ئەگەر خاوەن ماڵەكە كەمتەرخەمیی نەكردبێ، چونكە (فَإِنْ قَصَّرَ) ئەگـەر كەمتەرخـەمیی كردبـێ: (بِـأَنْ وَضَـعَهُ بِطَرِيـقٍ) وەك ماڵەكەی لـە سـەر ڕێگەیـەك دانابـێ (أَوْ عَرَّضَـهُ لِلدَّابَّـةِ) یـان هێنابێتیـە پـێش وولاغەكـەو ئۆتۆمبیلەكە، ئەو كاتە (فَلَا) نابێتە زامین.

كەوابو: ئەو كەسانەی كەلوپەل لە پێش دوكانـەكانیان لـە سـەر ڕێگـەدا دادەنـێن ئەگـەر وولاغێـك كەلوپەلەكـە بفـەوتێنێ، مـافی هـیچ تۆڵـەیان نیـە، چـونكە كەمتەرخـەمی لـە خۆیانەوەیە، هەروەك (الشبراملسی) فەرموویەتی.

هەوەرها ئەگەر بەخۆی بە لای وولاغە باركراوەكەدا ڕابـڕێ و خۆی لێبداو جلّی بدڕێ، ئەو كاتەش مافی هیچ زامینیی نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

جا بزانە: تا ئێستا باس لەوە بوو: كە ئاژەڵەكان كەسێكیان لەگەڵدابێ، بەڵام (وَإِنْ كَانَـتْ الدَّابَّةُ وَحْدَهَا) ئەگەر ئاژەڵەكە بە تەنها بوو (فَأَتْلَفَتْ زَرْعًا أَوْ غَيْرَهُ نَهَارًا) جا ئاژەڵەكـە لـە ڕۆژێدا كشتوكاڵێكی، یان شتێكیتری فەوتاند، ئەوە (لَـمْ يَضْـمَنْ صَـاحِبُهَا) خاوەنەكـەی نابێتە زامین، بەو مەرجەی بەرەڵلای بیابانی كردبێ، هەروەها بەكرێگرو ئاژەڵخۆازەكەش –بەو مەرجە– نابنە زامین.

(أَوْ لَيْلًا) بەڵام ئەگەر لە شەوێدا ئاژەڵەكەی شتێك بفەوتێنێ، ئەو كاتـە (ضَـمِنَ) دەبێتـە زامین، پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿وَعَلَى أَهْلِ الْمَاشِيَةِ مَا أَصَابَتْ مَاشِيَتُهُمْ بِاللَّيْلِ﴾ رواه أبوداود وصححه ابن حبان، لە سەر خاوەن ئاژەڵەكان واجبە: تۆڵەی ئەو شتە بـدەن كـە ئاژەڵەكانیان لە شەوێدا لە ناوی بردوە. واتە: چونكە عادەت ئەوهایە بـە ڕۆژ كشـتوكاڵ دەپارێزری، بە شەویش ئاژەڵ دەبەسترێنەوە، جا ئەگەر عادەتی شوێنێك بەپێچـەوانەوە بوو، ئەو كاتە بڕیارەكەش بە پێچەوانەوەیە.

هەروەها ئەگەر عادەت بوو بە شەو و بە ڕۆژ ئاژەڵەكان دەبەسترانەوە، واتە: لە بەرەڵڵاكردن دپارێزران، ئەو كاتە بە شەو و بە ڕۆژ خاوەن ئاژەڵەكە دەبێتـە زامـین، هـەروەها ئەگـەر عادەت بوو بە شەو و بە ڕۆژ ئاژەڵەكان بەرەڵلا دەكران، ئەو كاتە نە بە شەو و نە بە ڕۆژ

إِلاَّ أَنْ لاَيُفَـرِّطَ فِـي رَبْطِهَـا أَوْ حَضَـرَ صَـاحِبُ الـزَّرْعِ وَتَهَـاوَنَ فِـي دَفْعِهَـا، وَكَـذَا إِنْ كَـانَ الـزَّرْعُ فِـي مَحُـوطٍ لَـهُ بَـابٌ تَرَكَـهُ مَفْتُوحًـا فِالأَصَـحِّ، وَهِـرَّةٌ تُتْلِـفُ طَيْـرًا أَوْ طَعَامًا إِنْ عُهِدَ ذَلِكَ مِنْهَا ضَمِنَ مَالِكُهَا فِي الأَصَحِّ لَيْلاً أَوْ نَهَارًا، وَإِلاَّ فَلاَ فِالأَصَحِّ.

(كِتَابُ السِّيَرِ)

---

نابێتە زامین، بەڵام ئەگەر ئاژەڵەكەی بەرەڵلای ناو شار كردبێ، ئەو كاتە بە شەو و بە ڕۆژ دەبێتـە زامـین، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

(إِلاّ أَنْ لأَيُفَـرِّطَ فِـي رَبْطِهَـا) مەگـەر خـاوەن ئاژەڵەكـە كەمتەرخـەمیی نـەكردبێ لـە بەستنەوەیدا: وەك بە توندی بەستبێتیەوە، یان دەرگەی لـە سـەر كلیـل دابـێ، ئینجـا ئاژەڵەكە بەخۆی بەرەڵا بوو، یان كەسێك بەرییەڵداو بە شەوێ شتێكی فەوتاند، ئەو كاتە خاوەنەكەی نابێتە زامین.

(أَوْ حَضَرَ صَاحِبُ الزَّرْعِ وَتَهَاوَنَ فِي دَفْعِهَا) یان خاوەن كشتوكاڵەكە لەوێ ئامادە بوو، بەڵام كەمتەرخـەمیی كـردو ئاژەڵەكـەی لـە كشـتوكاڵەكە نەگەڕانـدەوە، ئـەو كاتـەش خـاوەن ئاژەڵەكە نابێتە زامین، بەڵام ئەگەر ئاژەڵەكان زۆر بـوون و خـاوەن كشـتوكاڵەكە نـەیتوانی بیانگەڕێنێتەوە، یـان دەیتـوانی بیانگەڕێنێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر لـە كشـتوكاڵەكەی خـۆی دەریكردبان یەكسەر دەكەوتنە ناو كشتوكاڵی دراوسێیەكەی-ئەمەش دروست نیەو تۆڵەی كشتوكاڵی دراوسێیەكەی لە سەر واجب دەبێ- ئەوە لەو دوو مەسەلەیەدا خاوەن ئاژەڵەكە بە شەو و بە ڕۆژ دەبێتە زامین.

(وَكَذَا) هەروەها خاوەن ئاژەڵەكە نابێتە زامین (إِنْ كَـانَ الـزَّرْعُ فِـي مَحُـوطٍ لَـهُ بَـابٌ تَرَكَـهُ مَفْتُوحًا) ئەگەر كشتوكاڵەكە پەرژین كرابێ و دەرگەی هەبێ و خاوەنەكەی بە كراوەیی وازی لێهێنابێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَهِرَّةٌ تُتْلِفُ طَيْرًا أَوْ طَعَامًا) كتك=پشیلە: كە باڵندەیەك، یان خواردەمەنیەك دەفەوتێنێ، ئەوە (إِنْ عُهِدَ ذَلِكَ مِنْهَا) ئەگەر دوو جار، یان سێ جار ئەو ڕەفتـارەی لێدیترابێ (ضَـمِنَ مَالِكُهَا فِيالأَصَحِّ) خاوەنەكەی دەبێتە زامینی فەوتێنراوەكەی، لە فەرمودەی ڕاستتردا (لَيْلاً أَوْ نَهَارًا) بە شەو و بە ڕۆژ (وَإِلاّ) بەڵام ئەگەر ئەو ڕەفتارەی لێنەدیترابێ (فَلاَ فِي الأَصَحِّ) خاوەنەكەی نابێتە زامین، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

جا بزانە: لـە حاڵـەتی هێرشـكردندا ئەگـەر نـەگونجا پشـیلەكە بگەڕێندرێتـەوە، دروسـتە بكوژرێ هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

﴿ كِتَابُ السِّيَرِ: **پەڕتوكی** (جِهَاد)و **ڕێبازەكانیتری پێغەمبەرﷺ** ﴾

**پێشەكی**: (جیهـاد)، واتـە: تێكۆشـان بـە گیـان و بـە مـاڵ و بـە زوبـان، بـۆ بەرزكردنـەوەو چەسپاندنی حوكمیخودا، تاكو بەندەكانیخودا لە بەندایەتی بەندە ڕزگار بكرێن و بكرێنە

........................................................................................................

بەنـدەی ڕاسـتەقینەی خـودا. پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ﴾ رواه أحمد والنسائي وصححه الحاكم، جیهـاد لـە دژی كافرەكـان بكەن: بە ماڵتان و بە گیانتان و بە زوبانتان.

جا بزانە: تێكۆشانی چەكدارانە-كە پـێی دەگـوترێ: غـەزا- لـە بەشـەكانیتری (جیهـاد) گەورەترە، چونكە گیانیخۆی فرۆشتۆتە خوایگەورە.

(ابن حجر) له (تحفة)دا فەرموویەتی: (إبن أبیعصرون) له چەند حەدیسێكی (صحیح)ی وەرگرتوە: كه (جهاد) له هەموو كردەوەكانی مرۆڤ گەورەتره له دوای ئیمان.
ئیمامی(الاذرعي)ش ئەم رایەی هەڵبژاردوە، واته: چونكه پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێكرا: ﴿یارَسُولَ اللهِ مَا یَعْدِلُ الْجِهَادَ فِی سَبِیلِ اللهِ تَعَالَی؟ قَالَ لاَ تَسْتَطِیعُونَهُ. فَأَعَادُوا عَلَیْهِ مَرَّتَیْنِ أَوْ ثَلاَثاً؟ كُلَّ ذَلِكَ یَقُولُ: لاَ تَسْتَطِیعُونَهُ. وَقَال فِالثَّالِثَة: مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِی سَبِیلِ اللهِ كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْقَانِتِ بِآیَاتِ اللهِ لاَ یَفْتُرُ مِنْ صَلاَةٍ وَلاَ صِیَامٍ حَتَّی یَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ فِی سَبِیلِ اللهِ﴾ رواه الشیخان، ئەی پێغەمبەری خواﷺ كام كردەوە بە قەد (جهاد) خێری هەیە؟ فەرمووی: ناتوانن ئەو كردەوەیە بكەن. جا دوو جار، یان سێ جار پرسیارەكەیان كردەوەو هەر دەیفەرموو: ناتوانن. ئینجا له جاری سێیەمدا فەرمووی: خێری (مُجَاهِد)ی رێگەیخوا وەكو خێری ئەو كەسەیە: كه بەردەوام بەرۆژوو بێو شەونوێژ بكاو قورئان بخوێنێو هیچ كاتێك له نوێژو رۆژوو نەوەستێ تا (مُجَاهِد)ەكه له غەزا دەگەڕێتەوە.
ئینجا بزانه: پێش كۆچكردنیپێغەمبەرﷺ، (جهاد)ی چەكدارانه قەدەغه بوو؟ چونكه له قۆناغیيەكەمدا پێغەمبەرﷺ تا ماوەی سێ ساڵان به نهێنی بانگەوازیی دەكرد بۆ ئایینی ئیسلام، به فەرمانی ئایەتی﴿یَا أَیُّهَاالْمُدَّثِّر قُمْ فَأَنْذِرْ﴾ ئەی ئەو پێغەمبەرەی خۆی به جلەكانی پۆشیوە، هەڵسه خەڵك بترسێنه له عەزابی خوا.
ئینجا له دوای سێ ساڵەكه ئایەتی﴿فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ﴾ هاته خوارەوە، واته: ئاشكرا بكه ئەوەی فەرمانت پێكراوە. بۆیێ–هەر له(مكة)دا– پێغەمبەرﷺ قۆناغێكیتریدووەمی دەست پێكردو بانگەوازیی ئاشكرا كرد.
ئینجا له دوای كۆچكردن خوای گەورە ئیزنیدا: جەنگ لەگەڵ ئەو كافرانه بكا: كه جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان دەكەن، ئەم قۆناغه سێیەمەش به ئایەتی﴿وَقَاتِلُوا فِی سَبِیلِ اللهِ الَّذِینَ یُقَاتِلُونَكُم﴾ دەستی پێكرا، واته: له رێگەی خوا جەنگ لەگەڵ ئەو كەسانه بكەن كه جەنگتان لەگەڵ دەكەن.
ئینجا دوای (فَتْحِ) رزگاركردنی (مَكَّة) قۆناغیچوارەمو كۆتاییی (جهاد) دەستی پێكرا، به هاتنی (آیَةُ السَّیْف): ئایەتی شمشێر، كه ئەم دوو ئایەتەنه: ﴿وَقَاتِلُواالْمُشْرِكِینَ كَافَّةً﴾
كَانَ الْجِهَادُ فِی عَهْدِ رَسُولِ اللهِﷺ فَرْضَ كِفَایَةٍ، وَقِیلَ عَیْنٍ، وَأَمَّا بَعْدَهُ فَلِلْكُفَّارِ حَالاَنِ، أَحَدُهُمَا: یَكُونُونَ بِبِلاَدِهِمْ فَفَرْضُ كِفَایَةٍ إِذَا فَعَلَهُ مَنْ فِیهِمْ كِفَایَةٌ سَقَطَ الْحَرَجُ

---

جەنگ لەگەڵ كافرەكان بكەن به گشتی له گشت كاتو شوێنێكدا. ﴿إِنْفِرُوا خِفَافاً وَثِقَالاً وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ فِی سَبِیلِ اللهِ﴾ راپەڕن به سوكیو به گرانی له رێگەیخوا (جهاد) بكەن به ماڵو به گیانتان. هەروەك له زۆربەی سەرچاوەكانو له (السیرةالحلبیة)دا ئەو قۆناغانه روون كراونەوە.

ئینجا لەم قۆناغەیچوارەمدا بڕیاری شەریعەتیئیسلام لەبارەی (جِهاد) جێگیر بوو لە دژی ئەو کەسانەی باوەڕیان بە ئیسلام نیە، یان دەبنە کۆسپ لە ڕێگای (حُکْمُ)و بانگەوازی ئیسلام، تا دونیاش وێران دەبێ بڕیاری ئەم قۆناغە هەر بەردەوامە، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْجِهَادُ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَنِىَاللّٰهُ تَعَالَى إلي أَنْ يُقَاتِلَ آخِرُ هَذِهِ الأُمَّةِ اَلدَّجَّالَ، لاَ يُبْطِلُهُ جَوْرُ جَائِرٍ وَلاَ عَدْلُ عَادِلٍ﴾ رواه أبـوداود بسـند صـحيح، (جهـاد) هـەر واجـبو بەردەوامە لەو ڕۆژەوە کە خوا منی ناردوە بە پێغەمبەر تا ئەو ڕۆژەی ئوممەتی من جەنگ لە دژی (دَجَّال) دەکا، بڕیاری واجبوونی(جهاد) ستەمی هیچ ستەمکارێكو دادپەروەری هیچ دادپەروەرێك بەتاڵی ناکاتەوە.

واتە: جیاوازی نیە فەرمانڕەواکانمان ستەمکار بن، یان دادپەروەر بن، واجبە: (جهاد) لـە ژێر سەرکردایەتی ئەواندا هەر بکرێ، چونکە (جهاد) واجبێکـی گەورەیـەو نابـێ بـە هـۆی تاوانباریی چەند کەسێکی کاربەدەست ئەم واجبە گەورەیە دوا بخرێ، هەروەك لە (فـتح الباری)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: پێغەمبەرﷺ بەخۆی لە بیستو حەفت غەزادا بەشداریی کردوە، چلو حەفت (سَرِيَّة)شی نـاردون بـۆ غـەزا، واتـە: بـەخۆی لەگەڵیانـدا نەچـوە، هـەروەك لـە (تحفـة)دا فەرمویەتی، چونکە (كَانَ الْجِهَادُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللّٰهِﷺ فَرْضَ كِفَايَةٍ) غەزاکردن لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ (فَرْض الْكِفَايَة) بوو، واتە: ئەگـەر کۆمـەڵێکی (صـحابة)کـان ڕۆیشـتبان بـۆ غەزاکردن، تاوانی نەکردنی غەزا لە سەر ئەوانیتر لادەکەوت (وَقِيلَ عَيْنٍ) لە فەرمودەیەکی بێهێزدا: (فرض العين) بوو، واتە هەر کەسێك لە غەزا دواکەوتبا، گوناهبار دەبو.

(وَأَمَّا بَعْدَهُ) بەڵام لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ (فَلِلْكُفَّارِ حَالاَنِ) ئەو کافرانەی جەنگ لـە دژی ئیسلام دەکەن دوو حاڵەتیان هەنە:

(أَحَـدُهُمَا: يَكُونُـونَ بِـبِلاَدِهِمْ) حاڵەتییەکـەمیان: کافرەکـان لـە شـارەکانی خۆیـانن‌و مەبەستیان نیە بێنە ناو شارەکانی موسوڵمانان (فَفَرْضُ كِفَايَةٍ) لەو حاڵەتەدا–بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام– غەزاکردن (فرض الْكفاية)یە، واتە: (إذَا فَعَلَهُ مَنْ فِيهِمْ كِفَايَـةٌ) هـەرکاتێك کۆمـەڵێکی وەهـا غـەزا بکـەن: کـە بەروەسـتی کافرەکـان بکـەن (سَـقَطَ الْحَـرَجُ عَـنِ الْبَـاقِينَ، وَمِـنْ فُـرُوضِ الْكِفَايَـةِ: اَلْقِيَـامُ بِإِقَامَـةِ الْحُجَـجِ وَحَـلِّ الْمُشْـكِلاَتِ فِـي الـدِّينِ، وَبِعُلُـومِ الشَّـرْعِ كَتَفْسِـيرٍ وَحَـدِيثٍ، وَالْفُـرُوعِ بِحَيْـثُ يَصْـلُحُ لِلْقَضَـاءِ، وَالأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ،

---

عَنِ الْبَاقِينَ) گوناهی نەکردن لە سەر ئەوانیتر لادەکـەوێ، بـە بەڵگـەی ئایـەتی ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ﴾یداهاتوو، هەم ڕەفتاری (الخلفا الراشدين)ش ئەوها بووە.

ئینجا غەزاکردنەکەش بەوە دێتە جێ: کە سنورەکانی(دارالإسلام)و شوێنە مەترسیدارەکان

پڕ چەكو جەنگاوەر بكرێن، یان لە گشت ساڵێكدا لایەنی كەم جارێك هێرش بكرێتە ناو (دارالكُفْر)و جەنگیان لەگەڵ بكرێ، جا ئەگەر لە جارێك زیاتر بكرێ ئەوە خێرترە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَوَلا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ﴾ ئایا نابینن ئەوان لە گشت ساڵێكدا جارێك، یان دوو جار بە غەزاكردن تاقی دەكرێنەوە.

## ﴿چەند بەشێكی (فَرْض الْكفايَة)كان﴾

(ومِنْ فُرُوضِ الْكِفَايَةِ) هەندێك لە (فَرْض الْكِفاية)كان: (اَلْقِيَامُ بِإِقَامَةِ الْحُجَجِ) هەڵسانی چینە زانایەكە بە بەڵگە هێنانەوە: لە سەر هەبوونی خواو سیفەتەكانی خواو هەبوونی پێغەمبەرەكانو ڕاستی ئەو شەرعو هەواڵانەی ڕۆژی دوایی كە پێغەمبەرﷺ ڕایگەیاندوە، هەم (وَحَلِّ الْمُشْكِلاَتِ فِي الدِّينِ) هەڵسان بە چارەسەركردنو نەهێشتنی گومانو ئاژاوە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا.

(وَ) هەڵسان (بِعُلُومِ الشَّرْعِ) بە خوێندنی زانستە شەرعیەكان: (كَتَفْسِيرٍ وَحَدِيثٍ وَالْفُرُوعِ) وەكو تەفسیری قورئانو حەدیسەكانی پێغەمبەرﷺ لقەكانی شەریعەت (بِحَيْثُ يَصْلُحُ لِلْقَضَاءِ) بە شێوەیەكی وەها ئەو زانستانە بخوێندرێن كە زانایەكان بۆ دادكردنو فتوادان بە كەڵك بێن، جا لە گشت شوێنێكی (دارالإسلام)دا بە ئەندازەی پێویستی خەڵك واجبە: ئەو زانایانە هەبن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ﴾ نەبووە ئیمانداران هەموویان ڕاپەڕن، بەڵكو دەبوا لە هەر هۆزێكی موسوڵمانان –كە كۆمەڵێك ڕادەپەڕین بۆ غەزا– كۆمەڵێكیش ڕاپەڕیبان بۆ خوێندن تاكو لە شەریعەتیئیسلام تێبگەن.

جا بزانە: لە سەر كاربەدەست واجبە: بە زۆرلێكردن ئەو زانستانە بە خەڵكی گشت شوێنێك بخوێنێ ئەگەر وازیان لە خوێندنیان هێنابێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

## ﴿ فەرمان بە چاكەو ڕێگرتن لە خراپە ﴾

(وَ) بەشێكیتری (فرض الكفاية)كان: (الأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ) فەرمان بە چاكەو قەدەغەكردنیخراپەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ دەبی كۆمەڵێك لە وَإِحْيَاءُ الْكَعْبَةِ كُلَّ سَنَةٍ بِالزِّيَارَةِ، وَدَفْعُ ضَرَرِ الْمُسْلِمِينَ: كَكِسْوَةِ عَارٍ وَإِطْعَامِ جَائِعٍ إِذَا لَمْ يَنْدَفِعْ بِزَكَاةٍ وَبَيْتِ مَالٍ،

---

ئێوە هەبن بانگەوازی بۆ چاكە بكەنو فەرمان بە چاكە بكەنو قەدەغەی خراپە بكەن، ئەوانە بەختەوەرن.

جا بزانە: بەو مەرجە فەرمان بە چاكەو قەدەغەكردنی خراپە واجب دەبێ: كە دڵنیابێ زیان ناگاتە گیانیخۆیو خەڵكیترو ماڵیخۆیو خەڵكیترو ناموسیخۆیو خەڵكیتر، جا ئەگەر

ئەو زیانانە توشی خەڵکیتر دەبون و خراپەی زیانەکەش لە خراپەی بێشەرعیەکە زۆرتر بوو، ئەو کاتە فەرمانەکەو قەدەغەکردنەکە واجب نیە، بەڵکو حەڕامن، هەروەها ئەگەر زیانەکان تەنها توشی خۆی دەبون، ئەو کاتەش واجب نیە بەڵام سوننەتە، واتە: تاکو بە پلەی شەهیدی بگا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و (بغيةالمسترشدين)دا ڕوون کراوەتەوە.
جا ئەگەر قەدەغەکردنی خراپەکە دەبووە هۆی جەنگو چەك ڕاکێشان ئەو کاتە پێویستە کاربەدەست ئەم واجبە ئەنجام بدا، جا ئەگەر کاربەدەست ستەمکار بوو–واتە: خراپەکەی قەدەغە نەدەکرد– ئەو کاتە واجبە: پیاوماقوڵان ڕێك بکەون و لە سەر کار لایبەدەن هەرچەند بە هێزی چەکیش بێ و جەنگیش ڕوو بدا، بەڵام بەو مەرجەی خراپەیەکی گەورەتر لەم خراپەیە ڕوو نەدا، هەروەك ئیمامی (النـواوي) لە (شـرح صـحيح مسلم) دا ڕوونی کردۆتەوە.
(وَ) بەشێکیتری (فرض الكفاية)کان: (إِحْيَاءُ الْكَعْبَةِ كُلَّ سَنَةٍ بِالزِّيَارَةِ ) زیندووکردنەوەی (كَعْبَة)ی ماڵیخوایە بە زیارەتی حەج و عومرە لە گشت ساڵێکدا، لە لایەن کۆمەڵە موسوڵمانێکی وەها: کە دروشمی حەج و عومرەیان پێ ئاشکرا ببێ.
(وَ) بەشێکیتری (فرض الكفاية)کان: (دَفْعُ ضَرَرِ الْمُسْلِمِينَ) لادانی زیانی موسوڵمانانە (كَكِسْوَةِ عَارٍ) وەکو بەرگکردنی مرۆڤی ڕووت و (وَإِطْعَامِ جَائِعٍ) خواردەمەنیدانی برسی و کرێی پزیشك و دەرمان و زیانەکانیتر، جا لادانی ئەو زیانانەش لە سەر ئەو کەسانە واجبە: کە بەشی مەسرەفی ساڵێك زیاتریان هەیە (إِذَا لَمْ يَنْدَفِعْ بِزَكَاةٍ وَبَيْتِ مَالٍ) هەرکاتێك ئەو زیانانە بە زەکات و (بَيْتُ المَال) لانەدرێن: وەك (بَيْتُ المَال) هیچی تێدا نەبێ، یان سەرپەرشتکارەکەی ستەمکار بێ.
جا ئەگەر دەوڵەمەندەکان ئەو زیانانەیان لانەدان، ئەو کاتە بۆ کاربەدەست دروستە بە زۆرلێکردن بە ئەندازەی مەسرەفی ئەو زیانانە لێیان وەربگرێ و سەرفی بکا، هەروەك لە (بغيةالمسترشدين)دا فەرموویەتی.
جا لەو حاڵەتەی (بيت المال) هیچی تێدا نیە، دەگونجێ–بە ئیزنیکاربەدەست– بە قەرزی سەر (بَيْتِ المال) ئەو مەسرەفانە بدرێن، هەروەك لە (ابن قاسم)دا فەرموویەتی.

وَتَحَمُّلُ الشَّهَادَةِ وَأَدَاؤُهَا، وَالْحِرَفُ وَالصَّنَائِعُ وَمَا تَتِمُّ بِهِ الْمَعَايِشُ، وَ جَوَابُ سَلاَمٍ عَلَى جَمَاعَةٍ، وَيُسَنُّ اِبْتِداؤُهُ، لاَ عَلَى قَاضِى حَاجَةٍ وَآكِلٍ وَفِى حَمَّامٍ، وَلاَ جَوَابَ عَلَيْهِمْ.

---

(وَ) بەشێکیتری (فرض الكفاية)کان: (تَحَمُّلُ الشَّهَادَةِ، وَأَدَاؤُهَا) هەڵگرتنی شاهیدی و شاهیدیدانە، هەم (وَالْحِرَفُ وَالصَّنَائِعُ) کاسبی و پیشەسازی و (وَمَا تَتِمُّ بِهِ الْمَعَايِشُ) ئەوەی بەڕێوەچوونی خەڵکی پێ تەواو دەبێ: وەك بازرگانی و بەرگدروین و پزیشکی و ئەو جۆرە شتانە.

(وَ) هەروەها (جَوَابُ سَلَامٍ عَلَى جَمَاعَةٍ) وەڵامدانەوەی سەلام لە سەر کۆمەڵێك بە (فَرْضُ الْكِفَايَةِ)واجبە، واتە: ئەگەر یەکێکیان وەڵامی سەلامەکەی داوە، خێرەکە بۆ خۆیەتی و گوناهەکەش لە سەر ئەوانیتر لادەکەوێ بەڵام ئەگەر هەموویان وەڵام بدەنەوە گشتیان خێرەکەیان دەگاتێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿يُجْزِئُ عَنِ الْجَمَاعَةِ إِذا مَرُّوا أَنْ يُسَلِّمَ أَحَدُهُمْ، وَيَجْزِئُ عَنِ الْجُلُوسِ أَنْ يَرُدَّ أَحَدُهُمْ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، ئەگەر لە کۆمەڵێك یەکێکیان سەلام بکا لەجیاتی کۆمەڵەکە دروست دەبێ، ئەگەر لە دانیشتووەکانیش یەکێکیان وەڵامی سەلامەکە بداتەوە لەجیاتییان دروست دەبێ.

جا بزانە: ئەگەر سەلام لێکراوەکە یەك کەس بوو، ئەو کاتە وەڵامدانەوەی بە (فَرْضُ الْعَيْنِ) لە سەر واجبە (وَيُسَنُّ ابْتِدَاؤُهُ) سوننەتە مرۆڤی موسوڵمان لە سەرەتای هاتن ڕۆیشتن سەلام بکا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِذاانْتَهَى أَحَدُكُمْ إِلىالْمَجْلِسِ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِذا أَرادَ أَنْ يَقُومَ فَلْيُسَلِّمْ، فَلَيْسَتِ الأُولَى بِأَحَقَّ مِنَ الآخِرَةِ﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، هەر کاتێك یەکێکتان گەیشتە دانیشگە با سەلام بکا، هەرکاتێك ویستی بڕوا با سەلام بکا، چونکە سەلامەکەیەکەم لە سەلامەکەیتر خێرتر نیە.

(لاَ عَلَى قَاضِيحَاجَةٍ) بەڵام سەلامکردن لەو کەسە سوننەت نیە: کە میزو پیسایی دەکاو (وَآكِلٍ) یان ئاو و خواردەمەنی دەخوا، هەم (وَفِي حَمَّامٍ) لەوەی لە گەرماویشدایە سوننەت نیە، کەوابو: (وَلاَ جَوَابَ عَلَيْهِمْ) ئەوانەیڕابردوو وەڵامدانەوەی سەلامیان لە سەر نیە.

جا بزانە: ئەگەر ئافرەتێك حەزی لێبکرێ و بە تەنها بێ، حەرامە: سەلام لە پیاوی بێگانە بکا، یان وەڵامی سەلامەکەی بداتەوە، هەروەها ناپەسندە پیاویش سەلام لە ئافرەتی بێگانـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــەی

بە تەنها بکاو وەڵامیسەلامەکەی بداتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ پاشکۆ ﴾: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تُسَلِّمُوا عَلَى مَنْ يَشْرَبُ الْخَمْرَ وَلاَ تَعُودُوهُمْ إِذا مَرِضُوا وَلاَ تُصَلُّوا عَلَيْهِمْ إِذا مَاتُوا﴾ رواه البخاري فيالادب، سەلام لەو کەسانە مەکەن کە شەڕاب دەخۆنەوەو ئەگەر نەخۆش بون سەردانیان مەکەن و هەر کاتێك مردن نوێژیان لە سەر مەکەن. کەواتە: گشت فاسقێکی بە ئاشکراو گشت خاوەن گوناهێکیگەورە–ئەگەر

.......................................................................................

تۆبەی نەکردبێ و– گشت بیدعەکارێك وەکو شەڕابخۆرەکان سوننەتە سەلامیان لێنەکرێ، هەم واجب نیە وەڵامی سەلامەکەشیان بدرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرمویانە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿لاَ تَبْدَأُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى بِالسَّلاَمِ﴾ وقال: ﴿إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمُ الْيَهُودُ فَقُلْ وَعَلَيْكَ﴾ رواهما مسلم، ئێوە سەلام لە

جولەکـەو دیانـەکان مەکـەن، واتـە: سـەلام لێکردنیـان حەرامـە. هـەروەها فـەرمووی: هەرکاتێك جولەکەو دیانەکان سەلامیان لە ئێوە کرد، لەوەڵامدانەوەیاندا واجبـە تـەنها بڵێی: (وَعَلَيْكُمْ). واتە: دروست نیە ووشەی (السَّلاَمُ) بڵێی.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلىالْمَاشِي وَالْمَاشى عَلىالْقاعِدِ وَالْقَلِيلُ عَلىالْكَثِيرِ﴾ وفي رواية: ﴿وَالصَّغِيرُ عَلىالْكَبِيرِ﴾ رواه الشيخان، مرۆڤی سوار سەلام لە پیادە دەکا، پیادە سەلام لە دانیشتوو دەکا، کەم سەلام لە زۆر دەکا، بچوك سـەلام لـە گـەورە دەکا. ﴿وعن أنسؓ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ مَرَّ بِصِبْيانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ بە لای چەند منداڵێکدا ڕابرد، جا سەلامی لێکردن.

﴿وَعَنْ أسماء بنت يزيدرضیالله عنها: مَرَّ عَلَيْنَا النَّبِيُّﷺ وَعُصْبَةٌ مِّنَ النِّسَاءِ قُعُودٌ فَأَلْوَى بِيَدِهِ بِالتَّسْلِيمِ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، پێغەمبەرﷺ بە لای کۆمەڵێکی ئافرەتانـدا ڕابـرد، جـا بـە دەسـتی پـیرۆزی ئامـاژەی بـە سـەلامکردن کـرد. کەواتـە: سـەلامکردن و وەڵامدانەوەشی بە ئاماژەو بە زوبان وێکڕا سوننەتە، بەڵکو بۆ وەڵامدانـەوەی سـەلامی مرۆڤی کەڕ هەردووکیان واجبن.

هەروەها ﴿عَنْ أنسؓ: قال لِىالنَّبِيُّﷺ: إذا دَخَلْتَ عَلى أَهْلِكَ فَسَلِّمْ يَكُنْ بَرَكَةً عَلَيْكَ وَعَلَى أَهْلِكَ﴾ رواه الترمـذي بسـند حسـن، هـەرکاتێك چـویتەوە ماڵـەوە سـەلام لـە خێـزان و منداڵەکانت بکە، سەلامەکەت دەبێتە بەرەکەت بۆ تۆو بۆ ئەوانیش.

ئینجا بزانە: ووشەی وەڵامدانەوەی سەلام-کە واجبەکەی لە سەر لابکەوێ- ئەمەیە بڵێ: (وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ)، یان (وَعَلَيْكُمُ السَّلام)، واتـە: (وَرَحْمَـةُ الله وَبَرَكَاتُـهُ) سـوننەتەو خێرتـرە، کەوابو: بە (أَهْلاً وَسَهْلاً)، یان بـە (سەرچاوم)، یـان بـە (بـەخێر بـێی) وەڵامدانەوەکـەی نایەتەجێ و گوناهبار دەبێ، بەڵام نابێ واز لە سەلامکردن بێنێ لە ترسی ئـەوەی وەڵامـی سەلامەکەی نەدرێتەوە.

جـا ئەگـەر یـەکێك لـە لایـەن کەسـێکەوە سـەلامی بـۆ هێنـابو، ئـەوەش واجبـە وەڵامـی سەلامەکەی بداتەوە، جا وەها سوننەتە لە وەڵامدا بڵێ: (عَلَيْكَ وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ) سەلام لە تۆو لـە ئـەویش بـێ ﴿عن غالبؓ: أَتَى رَجلٌ إلىالنَّبِيِّﷺ فَقَالَ: إنَّ أَبِى يُقْرِئُكَ السَّلاَمَ. فَقَالَ: عَلَيْكَ وَعَلَى أَبِيكَ السَّلاَمُ﴾ رواه أبوداود، وفـي الصـحيحين نحـوه عـن عائشـة رضیالله عنها،

وَلاَ جِهَـادَ عَلَـى صَـبِيٍّ وَمَجْنُـونٍ وَامْـرَأَةٍ وَمَـرِيضٍ وَذِىعَـرَجٍ بَـيِّنٍ وَأَقْطَـعَ وَأَشَـلَّ وَعَبْـدٍ وَعَادِمِ أُهْبَةِ قِتَالٍ،

---

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەروﷺ گوتی: باوکم سەلامت لێدەکا. ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: سەلام لە خۆت و لە باوکت بێ.

جا بزانە: هەر کەسێك لە کەسێکەوە سـەلامی بـۆ کەسـێکیتر هـەڵگرتبێ، ئـەوە دەبێتـە ئەمانەت و واجبە بیگەیەنێتـە کەسـەکە، بـــەڵام ئەگـــەر هەڵێنـــەگرتبێ: وەك ڕەدی

بكاتەوەو بلێ: ناتوانم. یان بێدەنگ بوبێ، ئەو كاتە واجب نیە. دیسان بزانە: پێویستە لە سەلامكردنو لە وەڵامدانەوەیدا ئەوەندە دەنگ بەرز بكاتەوە: كە گوێی لێبێ.
هەروەها بزانە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِذا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: اَلْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حالٍ. وَلْيَقُلِ الَّذِى يَرُدُّ عَلَيْهِ: يَرْحَمُكَ اللهُ. وَلْيَقُلْ هُوَ: يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصلِحُ بَالَكُمْ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي، هەركاتێك یەكێكتان پژمی با بلێ: (اَلْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حالٍ). ئەوەی وڵامیشی دەداتەوە با بلێ: (يَرْحَمُكَ اللهُ). ئەویش وەڵامی ئەو بداتەوەو بلێ: (يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصلِحُ بَالَكُمْ). جا ئەگەر سێ جاریش بە دوای یەكتردا بپژمێ وەڵامدانەوەكەی هەر سونەتە، بەڵام لە دوای سێ جارەكە با دوعای شیفای بۆ بكا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ناوەڕۆكی ئەم پاشكۆیە ڕوون كراوەتەوە، باسی تۆقەو دەست ماچكردنو لەبەر هەڵسانیش لە پاشكۆی جەژندا ڕابرا.

## ﴿ ئەو كەسانەی غەزایان لە سەر واجب نیە ﴾

(وَلاَ جِهَادَ عَلَى صَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ) غەزاكردن لە سەر منداڵو شێت واجب نیە، چونكە داواكاری شەرع نایانگرێتەوە (وَامْرَأَةٍ) لە سەر ئافرەتیش واجب نیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَاالنَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَىالْقِتَالِ﴾ ئەی پێغەمبەر پیاوانی ئیماندار هان بدە بۆ جەنگكردن لە دژی كافرەكان. (وَمَرِيضٍ) لە سەر نەخۆشو (وَذِى عَرَجٍ بَيِّنٍ) لە سەر خاوەن شەلینی ئاشكراو (وَأَقْطَعَ) هەم لە سەر یەك دەستو هەم (وَأَشَلَّ) لە سەر خاوەن دەستی لەكاركەوتووش غەزاكردن واجب نیە، چونكە ئەوانە هێزی هەڵمەتو زیان لێدانیان نیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَىالأَعْمَى حَرَجٌ وَلا عَلَىالأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ﴾ كوێرو شەلەو نەخۆش گوناهی غەزانەكردنیان لە سەر نیە.
(وَعَبْدٍ) لە سەر كۆیلەو (وَعَادِمِ أُهْبَةِ قِتَالٍ) لە سەر ئەو كەسەش واجب نیە كە پێویستیەكانی جەنگی پێ دابین ناكرێن: وەك چەك، یان بژێوی ڕۆیشتنو گەڕانەوەی نەبێو لە (بيت المال)ش نەیدرێتێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَىالضُّعَفَاءِ وَلا عَلَى الْمَرْضَى وَلا عَلَى الَّذِينَ لا يَجِدُونَ مَا يُنْفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بێهێزەكانو نەخۆشەكانو ئەو كەسانەی كەرستەو بژێویان دەست ناكەوێ، هیچ گوناهی غەزانەكردنیان لە سەر نیە، بەو مەرجەی ئامۆژگاری خەڵك بكەن بۆ ڕێگەی خواو پێغەمبەرﷺ.
وَكُلُّ عُذْرٍ مَنَعَ وُجُوبَ الْحَجِّ مَنَعَ الْجِهَادَ إِلاَّ خَوْفَ طَرِيقٍ مِنْ كُفَّارٍ، وَكَذَا مِنْ لُصُوصِ الْمُسْلِمِينَ عَلَىالصَّحِيحِ، وَالدَّيْنُ الْحَالُّ يُحَرِّمُ سَفَرَ جِهَادٍ وَغَيْرِهِ إِلاَّ بِإِذْنِ غَرِيمِهِ، وَالْمُؤَجَّلُ لاَ، وَقِيلَ يَمْنَعُ سَفَرًا مَخُوفًا، وَيَحْرُمُ جِهَادٌ إِلاَّ بِإِذْنِ أَبَوَيْهِ إِنْ كَانَا مُسْلِمَيْنِ، لاَ سَفَرُ تَعَلُّمِ فَرْضِ عَيْنٍ وَكَذَا كِفَايَةٍ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَكُلُّ عُذْرٍ مَنَعَ وُجُوبَ الْحَجِّ) هەر عوزرێك واجببوونی حەج قەدەغە بكا (مَنَعَ الْجِهَادَ) واجببوونی غەزاش قەدەغە دەكا (إِلاَّ خَوْفَ طَرِيقٍ مِنْ كُفَّارٍ) تەنها ترسی ڕێگە لە

کافرەکان واجببوونی غەزا قەدەغە ناکا، بەڵام واجببوونی حەج قەدەغە دەکا (وَكَذَا مِنْ لُصُوصِ الْمُسْلِمِينَ عَلَى الصَّحِيحِ) هەروەها ترسانیش لە دزە موسوڵمانەکان واجببوونی غەزا قەدەغە ناکا، لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە غەزاکردن بە ترسترە.
(وَالدَّيْنُ الْحَالُّ) ئەو قەرزەی کاتی دانەوەی هاتوە (يُحَرِّمُ سَفَرَ جِهَادٍ وَغَيْرِهِ) سەفەری غەزاو سەفەرەکانیتری وەکو حەج، حەرام دەکا، کەواتە: کورتکردنەوەی نوێژیش لەو جۆرە سەفەرەدا دروست نابێ، چونکە لە حەدیسی (صحیح)دا فەرموویەتی: ﴿يُغْفَرُ لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنْبٍ إِلاَّ الدَّيْنَ﴾ رواه مسلم، لە گشت گوناهەکانی شەهید دەبوردرێ تەنها قەرز نەبێ.
(إِلاَّ بِإِذْنِ غَرِيمِهِ) تەنها بە ئیزنی خاوەن قەرزەکە نەبێ، واتە: ئەگەر خاوەن قەرزەکە ئیزنی بدا، سەفەرەکە حەرام نیە، کەوابو: بۆ خاوەن قەرزەکە دروستە: ڕێگای نەدا بڕواتە هیچ سەفەرێك، بەڵام (وَالْمُؤَجَّلُ لاَ) ئەو قەرزەی کاتی دانەوەی نەهاتوە، هیچ سەفەرێك حەرام ناکا، هەر چەند خاوەن قەرزەکەش ئیزنی نەدا (وَقِيلَ: يَمْنَعُ سَفَرًا مَخُوفًا) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەو قەرزەش سەفەری بە ترس قەدەغە دەکا.
(وَ) هەروەها لەو حاڵەتەی غەزاکردن (فرض الكفاية)یە (يَحْرُمُ جِهَادٌ إِلاَّ بِإِذْنِ أَبَوَيْهِ) لە سەر ئافرەتو پیاو حەرامە: غەزا بکا، تەنها بە ئیزنی دایكو باوکی نەبێ، هەرچەند سەفەریش نەبێ (إِنْ كَانَا مُسْلِمَيْنِ) بەو مەرجەی دایكو باوکەکەی موسوڵمان بن ﴿عن ابن عمر رضي الله عنهما: جَاءَ رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ فِي الْجِهَادِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: أَحَيٌّ والِدَاكَ؟ قالَ نَعَمْ. قال فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ﴾ رواه الشيخان، پیاوێك هات ئیزن وەربگرێ بۆ غەزا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا دایكو باوکت زیندوون؟ گوتی: بەڵێ. فەرمووی: لەڕێی خزمەتکردنی دایكو باوکتدا جیهاد بکە. جا ئەگەر تەنها یەکێکیان زیندوو بوو، ئەو کاتەش بێئیزنی وی دروست نیە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.
(لاَ سَفَرُ تَعَلُّمٍ فَرْضِ عَيْنٍ) بەڵام سەفەری خوێندنێکی (فرض العين) بێئیزنی دایكو باوك حەرام نیە (وَكَذَا كِفَايَةٍ فِي الأَصَحِّ) هەروەها سەفەری خوێندنی (فرض الكفاية)ش بێئیزنی دایكو باوك حەرام نیە، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە سەفەری خوێندن وەکو سەفەری
فَإِنْ أَذِنَ أَبَوَاهُ وَالْغَرِيمُ ثُمَّ رَجَعُوا وَجَبَ الرُّجُوعُ إِنْ لَمْ يَحْضُرِ الصَّفَّ، فَإِنْ شَرَعَ فِي قِتَالٍ حَرُمَ الإِنْصِرَافُ فِي الأَظْهَرِ. الثَّانِي: يَدْخُلُونَ بَلْدَةً لَنَا فَيَلْزَمُ أَهْلَهَا الدَّفْعُ بِالْمُمْكِنِ، فَإِنْ أَمْكَنَ تَأَهُّبٌ لِقِتَالٍ وَجَبَ الْمُمْكِنُ حَتَّى عَلَى فَقِيرٍ وَوَلَدٍ وَمَدِينٍ وَعَبْدٍ بِلاَ إِذْنٍ،

---

غەزا بە ترس نیە، جا بزانە: جگە لە سەفەری غەزا سەفەرەکورتەکانیتر بێئیزنی دایكو باوك دروستن، بەڵام سەفەرەدرێژەکان تەنها لە حاڵەتی ئەمینیدا دروستن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ أَذِنَ أَبَوَاهُ وَالْغَرِيمُ) جا ئەگەر دايكو باوكەكەىو خاوەن قەرزەكان ئيزنيان دا غەزا بكا (ثُمَّ رَجَعُوا) ئينجا لە دواى ڕۆيشتنەكەى ئيزندەرەكان پەشيمان بونەوە، ئەو كاتەش (وَجَبَ الرُّجُوعُ إِنْ لَمْ يَحْضُرِ الصَّفَّ) واجبە لە غەزا بگەڕێتەوە بەو مەرجەى نەگەيشتبێتە ناو ڕيزى جەنگ، چونكە (فَإِنْ شَرَعَ فِي قِتَالٍ) ئەگەر لەگەڵ دوژمن ڕووبەڕوو بونو دەستى بە جەنگ كرد، ئەو كاتە (حَرُمَ الإِنْصِرَافُ) حەرامە: بڕواو ڕيزەكە بەجێ بهێڵێ، هەر چەند ئيزندەرەكانيش پەشيمان بوبنەوە (فِي الأَظْهَرِ) لەفەرموودەى بەهێزتردا.

بەڵكو ئەگەر بێئيزنى دايكو باوكو خاوەن قەرزەكەش ڕۆيشتبێو دەستى بە جەنگ كردبێ، ئەو كاتەش حەرامە: بگەڕێتەوە، هەروەك لە (مغنى)دا فەرموويەتى، خواى گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوااللّهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ هۆ ئەو كەسانەى باوەڕتان هێناوە هەر كاتێك گەيشتنە كۆمەڵێكى كافران ئێوە خۆ ڕابگرنو زۆر زيكرى خوا بكەن بەڵكى بەختەوەر دەبنو سەر دەكەون. واتە: چونكە بە هۆى گەڕانەوە دڵى جەنگاوەرەكان تێك دەچێو ورەيان دەڕوخێ.

**﴿ ئەو حاڵەتەى غەزا بە** (فَرْض الْعَيْن) **واجب دەبێ ﴾**

(اَلثَّانِي) حاڵەتىدووەمى كافرەكان ئەمەيە: (يَدْخُلُونَ بَلْدَةً لَنَا) كافرەكان بێنە ناو شوێنێكى (دارالاسلام): وەك شارێك، يان چيايەك، يان دورگەيەك، يان بە ئەندازەى كەمتر لە دوو قۆناغ لە شارێكىئيسلام نزيك بكەونەوە، لەم حاڵەتەدا (جهاد) دەبێتە (فَرْضُ الْعَيْنِ)، چونكە هاتنى كافرەكان بۆ ناو (دارالإسلام) كارێكى گەورەيە، كەواتە (فَيَلْزَمُ أَهْلَهَا الدَّفْعُ بِالْمُمْكِنِ) لە سەر نيشتەجێيەكانى شوێنەكە بە (فَرْضُ الْعَيْنِ) واجب دەبێ: بەرگرى بكەن بە هەر گونجاوێكى لە تواناياندا بێ:

كەوابو: (فَإِنْ أَمْكَنَ تَأَهُّبٌ لِقِتَالٍ) ئەگەر گونجا نيشتەجێيەكان خۆيان بۆ جەنگ ئامادە بكەن، ئەو كاتە (وَجَبَ الْمُمْكِنُ) بەرگرىى گونجاو واجبە: لە سەر هەموو نيشتەجێيەكان، هەرچەند (جهاد)ى (فرض الْكفاية)شيان لە سەر نەبێ، چونكە لەم حاڵەتەدا (اَلنَّفِيرُالْعَامّ)= ڕاپەڕينىگشتى واجب دەبێ: (حَتَّى عَلَى فَقِيرٍ وَوَلَدٍ وَمَدِينٍ وَعَبْدٍ بِلاَ إِذْنٍ) تا لە سەر گەدا و

وَقِيلَ: إِنْ حَصَلَتْ مُقَاوَمَةٌ بِأَحْرَارٍ أُشْتُرِطَ إِذْنُ سَيِّدِهِ، وَإِلاَّ فَمَنْ قُصِدَ دَفَعَ عَنْ نَفْسِهِ بِالْمُمْكِنِ إِنْ عَلِمَ أَنَّهُ إِنْ أُخِذَ قُتِلَ، وَإِنْ جَوَّزَ الأَسْرَ فَلَهُ أَنْ يَسْتَسْلِمَ، وَمَنْ هُوَ دُونَ مَسَافَةِ قَصْرٍ مِنَ الْبَلْدَةِ كَأَهْلِهَا، وَمَن عَلَى الْمَسَافَةِ يَلْزَمُهُمُ الْمُوَافَقَةُ بِقَدْرِالْكِفَايَةِ إِنْ لَمْ يَكْفِ أَهْلُهَا وَمَنْ يَلِيهِمْ،

---

هەژارو لە سەر كوڕو كيژ بێئيزنى دايكو باوكو لە سەر قەرزدار بێئيزنى خاوەن قەرزو لە سەر كۆيلە بێئيزنى گەورەكەىو لە سەر ژن بێئيزنى مێردەكەى ئەگەر تواناى جەنگكردنى

هەبێ، واتە: لە سەر گشتیان واجبە: بە گشتی ڕاپەڕنو بەرگری بکەن، هەرچەند ئیزنیش نەدرێن؟ چونکە کار لە کار ترازاوە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (إنْ حَصَلَتْ مُقَاوَمَةٌ بِأَحْرَارٍ) ئەگەر بە پیاوانی ئازاد بەرگری دەکرا (اُشْتُرِطَ إِذْنُ سَيِّدِهِ) بە مەرج داندراوە: کۆیلەکە گەورەکەی ئیزنی بدا.

(وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر نەگونجا نیشتەجێیەکانیشوێنەکە خۆیان ئامادە بکەن، چونکە لە ناکاودا دوژمن هێرشی کرد، ئەو کاتە (فَمَنْ قُصِدَ) هەر کەسێك ڕووی تێکراو دوژمن بەرەو لای هات (دَفَعَ عَنْ نَفْسه بِالْمُمْكِن) واجبە: بەرگری لە خۆی بکا بە هەر گونجاوێکی لە توانایدابێ (إنْ عَلِمَ أَنَّهُ إنْ أُخِذَ قُتِلَ) ئەگەر دەیزانی: ئەگەر بگیرێ دەکوژرێ، چونکە حەرامە: بۆ کوشتن خۆی تەسلیمی کافر بکا، بەڵام (وَإِنْ جَوَّزَ الأَسْرَ) ئەگەر ڕووتێکراوەکە گومانی بەدیلگیرانو گومانی کوشتنی هەبو، ئەو کاتە (فَلَهُ أَنْ يَسْتَسْلِمَ) بۆی دروستە: تەسلیم ببێو هەم دروستیشە بەرگری بکا، بەڵام ئەگەر بزانێ: ئەگەر خۆی تەسلیم نەکا ناکوژرێو ڕزگاری دەبێ، ئەو کاتە حەرامە خۆی تەسلیم بکا، چونکە سەرشۆڕیەکی بێترسی تێدایە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَمَنْ هُوَ دُونَ مَسَافَةِ قَصْرٍ مِنَ الْبَلْدَةِ) ئەو کەسەی ئەندازەی کورتکردنەوەی نوێژ نزیکترە لەو شوێنەی کافرەکان داگیریان کردوە، ئەویش (كَأَهْلِهَا) وەك نیشتەجێیەکانی شوێنەکەیەو بە (فرض العین) لە سەری واجبە: بڕواتە شوێنەکەو غەزا بکا، هەرچەند دایكو باوكو خاوەن قەرزیش ئیزنی نەدەن، بەڵام بەو مەرجەی مەسرەفی ڕێگەو خواردەمەنیی دەست بکەوێ.

(وَمَنْ عَلَىالْمَسَافَةِ) ئەو کەسانەش کە ئەندازەی کورتکردنەوەی نوێژ–واتە: دوو قۆناغ، یان زیاتر– دوورن لە شوێنەکە، ئەوان (يَلْزَمُهُمُ الْمُوافَقَةُ بِقَدْرِ الْكِفَايَةِ) بە (فرض الكفاية) لە سەریان واجبە: بڕۆنە شوێنەکەو لەگەڵ نیشتەجێیەکانی شوێنەکە ڕێك بکەون بۆ بەرگریکردنو بە ئەندازەی بەرەوستکردنی دوژمنەکە یارمەتییان بدەن (إنْ لَمْ يَكْفِ أَهْلُهَا وَمَنْ يَلِيهِمْ) ئەگەر نیشتەجێیەکانی شوێنەکەو دەوروبەرەکەیان بەرەوستی دوژمنەکە نەکەن، بەڵام بەو مەرجەی چەكو مەسرەفی ڕێگەو خواردەمەنییان دەست بکەوێ

قِيلَ: وَإِنْ كَفَوْا، وَلَوْ أَسَرُوا مُسْلِمًا فَالأَصَحُّ وُجو 

(فَصْلٌ):

---

(قِيلَ: وَإِنْ كَفَوْا) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر بەرەوستیش بکەن هەر واجبە بڕۆن یارمەتییان بدەن.

﴿ ئاگاداری ﴾: شتێکی ئاشکرایە تا ئێستا کافرەکانی ئەوروپاو ئەمریکاو ڕوسیا چەند وڵاتێکی (دارالاسلام)یان داگیر کردوەو لە چەند وڵاتێکیداگیرکراویش لەشکری خۆیان

کشاندۆتەوە، بەڵام چەند سیخوڕو کاربەدەستێکی نۆکەری خۆیان لەو وولاتانەدا داناوەو لە ڕێگـای ئـەو نۆکەرانـەوە–بـە یاسایدەسـتکرد– بەرنامـەی کـوفر بـڵاو دەکەنـەوەو شەریعەتیئیسلام قەدەغە دەکەنو شانازی بە یاساو ڕەووشتی کافرەکان دەکەن–واتـە: ئەو وولاتانەش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە لایەن کافرەکان داگیرکراون– کەوابو: ئێستا لە گشت ئەو جۆرە وولاتانەی (دارالاسلام)دا (جهاد) واجبە بە (فَرْض الْعَيْن): لە سەر گشت موسوڵمانێك تا دادپەوایی خوای گەورە جێگیر دەکرێو ڕەفتـار بـە شـەریعەتی ئیسـلام دەکرێو یاسای دەستکردو نۆکەرانی کوفر لە ڕەگو ڕیشەوە بنەبڕ دەکرێن، ئەگینا: گشت دانیشتووانی (دارالاسلام) گوناهبارن، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَا تَرَكَ قَوْمٌ اَلْجِهَادَ إِلاَّ عَمَّهُمُ اللهُ بِعَذَابٍ﴾ رواه الطبراني فيالأوسط بسند حسن، هەر گەلێك واز لە (جهاد) بێنێ، خوای گەورە بە تێکڕایی عەزابیان دەدا.

جا داخی گرانم هاوار بەماڵم ئێستا–لە لای زۆربەیموسوڵمانان– غەزاکردن شتێکی نامۆو ناڕەوایەو کە کافرەکان دێن خاکیئیسلام داگـیر دەکـەنو بـەرووبومی ئیسـلام بـۆ خۆیـان دەبەن، موسوڵمانان بەخێرهاتنیان لێدەکەنو سوپاسیان دەکەن!.

(وَلَوْ أَسَرُوا مُسْلِمًا) ئەگەر کافرەکان موسوڵمانێکیان بە دیل گرت، ئەو کاتـەش (فَالأَصَحُّ وُجُوبُ النُّهُوض إِلَيْهِمْ لِخَلاَصِهِ) بە فـەرموودەی ڕاسـتتر لـە سـەر گشـت کەسـێکی توانـای هـەبێ بـە (فـرض العـین) واجبـە: هەڵسـێو بـە پەلـە بـەرەو کافرەکـان ڕاپـەڕێ بـۆ ڕزگارکردنی دیلەکە (إِنْ تَوَقَّعْنَاه) ئەگـەر بۆمـان دەگونجا ڕزگـاری بکـەین، بـەڵام ئەگـەر نەدەگونجا ڕزگار بکرێ، ئەو کاتە واجب نیە، بەڵکو چاوەڕوانی گونجانێك دەکەین، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چۆنیەتی غەزاکردن ﴾

**پێشەکی** بزانە: پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بِهِ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفاقٍ﴾ رواه مسـلم، هـەر کەسـێك مردبـێو غـەزای نـەکردبێو بـە دڵیشـیدا نەهاتبێ غەزا بکا، ئـەوە لـە سـەر بەشـێکی (نفـاق) دەمـرێ. کـەوابو: ئەگـەر پیـاو بـۆی نەگونجابێ غەزا بکا، واجبە بە دڵ بیەوێ غەزا بکا هەر کاتێك گونجا.

يُكْـرَهُ غَـزْوٌ بِغَيْـرِ إِذْنِ الإِمَـامِ أَوْ نَائِبِـهِ، وَيُسَـنُّ إذا بَعَـثَ سَـرِيَّةً أَنْ يُـؤَمِّرَ عَلَـيْهِمْ وَيَأْخُذَ الْبَيْعَةَ بِالثَّبَاتِ،

---

بەڵام (يُكْرَهُ غَزْوٌ بِغَيْرِ إِذْنِ الإِمَامِ أَوْ نَائِبِهِ) ناپەسـندە: بـێئیزنی پێشـەوای موسـوڵمانانو جێگرەکەی: پیـاو غـەزا بکـا، چـونکە ئـەوان لێـزانترن بـۆ پێویسـتیو بەرژەوەندیـەکانی (جهاد)، بەڵام ئەگـەر گومـانی بـەهێز بـوو: کـە پێشـەوایەکە ئیزنـی نـادا، یـان پێشـەواو کاربەدەستەکان وازیان لە (جهاد) هێنـابو، ئـەو کاتـە غـەزاکردن بـێئیزن ناپەسـند نیـە،

هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
(وَيُسَنُّ إذا بَعَثَ سَرِيَّةً) بۆ پێشەواو جێگرەکەی سوننەتە هەر کاتێك لەشکرێکی ناردە شوێنێك بۆ غەزاکردن: (أَنْ يُؤَمِّرَ عَلَيْهِمْ) باوەڕپێکراوێك بکاتە ئەمیر لە سەر لەشکرەکەو (وَيَأْخُذَ الْبَيْعَةَ بِالثَّبَاتِ) بەیعەتیش لە کشتیان وەربگرێ بۆ خۆڕاگرتنو هەڵنەهاتنو گوێڕایەڵی بۆ ئەمیرەکەیان، چونکە هۆی شکستیی موسوڵمانان لە غەزای (أُحُد) ئەوە بوو: کۆمەڵێکی(صحابة)کان ئامۆژگاریی پێغەمبەریانﷺ بەجێ نەهێناو لە فەرمانی ئەمیرەکەیان دەرچون.
هەروەها سوننەتە: بەیداخەکانیش بۆ تیپەکانی لەشکرەکە ببەستێ، چونکە پێغەمبەرﷺ هەرچوار خەلیفەکانیش بەو شێوەیانەیڕابردوو لەشکرەکانیان دەناردن، هەم ﴿عَنْ ابن عباس رضاللە عنهما: كَانَتْ رَايةُ النَّبِيِّﷺ سَوْداءَ وَلِواؤُهُ أَبْيَضَ﴾ رواه الترمذي والنسائي بسند حسن، وزاد الحَلَبِي ڤ سيرته: ﴿مَكْتُوبٌ فِيهِ: لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ﴾، بەیداخی پێغەمبەرﷺ ڕەش بوو–ناوی (الْعُقَاب)بوو– ئاڵا گەورەکەشی سپی بوو لە سەری نوسرابو: (لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ مُحَمَّدٌ رَسولُ اللهِ)، واتە: بە نوسینێکی ڕەش.
ئینجا بزانە: مەبەست بە (لواء): ئەو ئاڵا گەورەیەیە لەگەڵ ئەمیرو لەشکری گەورەدایە، مەبەستیش بە (راية)=بەیداخ: ئەو ئاڵا بچوکانەی لەگەڵ سەرتیپەکانی لەشکردانە، هەروەك لە (شرح تاج الاصول)دا ڕوون کراوتەوە.
ئیمامی (الشافعي) فەرموویەتی: پێویستە ئەمیرەکە باوەڕپێکراو بێ لە ئایینەکەیدا، بە غیرەتو نەترس بێو بەخۆیدا بێتەوەو لە کاروباری جەنگدا شارەزا بێو لە کاتی بەزینی لەشکرەکەدا خۆڕاگر بێو لە کاتی هێرشدا بەرەو پێش بڕواو خاوەن بیرو ڕا بێ بۆ بەڕێوەبردنی لەشکرەکەو هەل لەدەست نەداو لە بڕیارەکانی (جهاد) خاوەن (إجتهاد)و شارەزابێ.
ئینجا بزانە: دروستە چەند ئەمیرێك–بە ڕیز– یەك لە دوای یەك لە سەر لەشکرەکە دابنێ، هەروەك لە غەزای (مُؤْتَة)دا پێغەمبەرﷺ وایکرد، (البخاري) گێراویەتیەوە، بەڵام نابێ ڕێگا بدا ئەم جۆرە کەسانە لەگەڵ لەشکرەکەدا بن: ئەو کەسەی جەنگاوەران دەترسێنێو
وَلَهُ الإسْتِعَانَةُ بِكُفَّارٍ تُؤْمَنُ خِيَانَتُهُمْ وَيَكُونُونَ بِحَيْثُ لَوْ اِنْضَمَّتْ فِرْقَتَاالْكُفْرِ قَاوَمْنَاهُمْ،

---

ورەیان دادەبەزێنێ، ئەو کەسەی بە زۆری هەواڵە ترسناکەکان بڵاو دەکاتەوە، ئەو کەسەی خیانەت دەکاو نهێنییەکانی لەشکرەکە دەگەیێنێتە دوژمن.
هەروەها سوننەتە لە پێش لەشکرەکەدا چەند کەسێکی هەواڵگر بنێرێ تاکو جموجۆڵو هەواڵەکانی دوژمن بزانێ، هەروەك لە (مغني)و (الشرواني)دا فەرموویانە ﴿عن جابرﷺ: قَالَ النَّبِيُّﷺ يَوْمَ الأَحْزَابِ: مَنْ يَأْتِينَا بِخَبَرِالْقَوْمِ؟ فَقَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا﴾

رواه الشيخان، له غەزای (أحزاب)دا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کێ هەواڵی دوژمنمان بۆ دێنێ؟ حەزرەتی (زبیر) فەرمووی: من بۆت دێنم.
هەروەها بزانە: سوننەتە گشت تیپێکی لەشکرەکە دروشمێکی هەبێ بۆ یەکتر ناسین لە حاڵەتی جەنگدا، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا ئەم باسانە ڕوون کراونەوە ﴿عن المهلبﷺ: أَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ النَّبِيَّﷺ يَقُولُ: إِنْ بُيِّتُّمْ فَلْيَكُنْ شِعَارُكُمْ: حم، لاَيَنْصُرُون﴾ رواه أصحاب السنن بسند صالح، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر لە شەوێدا هێرشتان کرایە سەر–واتە: توشی جەنگ بون– با دروشمی ئێوە (حم) بێ، ئەوان سەر ناکەون.
هەم لە حەدیسێکیتردا (صحابە)یەك فەرمووی: ﴿كَانَ شِعَارُنَا: أَمِتْ أَمِتْ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، دروشمەکەمان لە غەزایەکەدا: (بمرێنە بمرێنە) بوو.
هەروەها پێویستە گشت چەکدارەکان ڕابهێندرێن: تاکو چەکەکەیان بەفیڕۆ نەهاوێن و تا دوژمن لێیان نزیك نەبێتەوە چەکی تێنەگرن، تاکو ئامانجەکەیان بە باشی بپێکن، هەم بەشێکی چەکەکەیان بۆ پارێزگاری هەڵبگرن و هەمووی سەرف نەکەن، چونکە پێغەمبەرﷺ لە غەزای (بَدْر) بە (صحابة)کانی فەرموو: ﴿إِذا أَكْثَبُوكُمْ فَارْمُوهُمْ وَاسْتَبْقُوا نَبْلَكُمْ﴾ رواه البخاری، هەر کاتێك کافرەکان لێتان نزیك بونەوە چەکیان تێبگرن و بەشێکی تیرەکانتان بۆ کاتی تەنگانە بهێڵنەوە.
(وَلَهُ الإِسْتِعَانَةُ بِكُفَّارٍ) بۆ پێشەواو جێگرەکەی دروستە: داوای یارمەتی جەنگ لە کافرەکان بکا، واتە: لەگەڵ خۆیا بیانباتە غەزا، بەو مەرجەی (تُؤْمَنُ خِيَانَتُهُمْ) لە خیانەتەکەیان ئەمین ببێ، هەم بەو مەرجەش (وَيَكُونُونَ بِحَيْثُ لَوْ انْضَمَّتْ فِرْقَتَاالْكُفْرِ) کافرەکانیش هەر بەو ئەندازەیە بن: ئەگەر هەردوو کۆمەڵەکەی کافرەکان–واتە: یارمەتیدەرەکەو دوژمنەکە– ببنە یەك و لە دژی ئێمە جەنگ بکەن، ئەو کاتەش (قَاوَمْنَاهُمْ) بەروەستی هەموانیان بکەین، هەروەك پێغەمبەرﷺ (إبن سلول)و (منافقە)کانیتری لەگەڵ خۆیا دەبردنە غەزا، واتە: بەڵام ئەگەر کۆی هەردوو کۆمەڵەکە وێکڕا لە دوو هەندی ئێمە زیاتر بێ، ئەو کاتە دروست نیە لەگەڵ خۆمان بیانبەینە غەزا.
وَبِعَبِيدٍ بِإِذْنِ السَّادَةِ وَمُرَاهِقِينَ أَقْوِيَاءَ، وَلَهُ بَذْلُ الأُهْبَةِ وَالسِّلاَحِ مِنْ بَيْتِ الْمَالِ وَمِنْ مَالِهِ، وَلاَ يَصِحُّ اسْتِئْجَارُ مُسْلِمٍ لِجِهَادٍ، وَيَصِحُّ اسْتِئْجَارُ ذِمِّيٍّ لِلإِمَامِ، قِيلَ: وَلِغَيْرِهِ، وَيُكْرَهُ لِغَازٍ قَتْلُ قَرِيبٍ وَمَحْرَمٍ أَشَدُّ،

---

(وَبِعَبِيدٍ بِإِذْنِ السَّادَةِ) هەم دروستە کۆیلەکانیش بە ئیزنی گەورەکانیان لەگەڵ خۆیا ببا، هەم (وَمُرَاهِقِينَ أَقْوِيَاءَ) ئەو کوڕانەی نزیکی بلۆغبوونن–ئەوانیش بە ئیزنی سەرپەرشتکارەکانیان– هەم ئافرەتانیش بە ئیزنی مێردەکانیان دروستە لەگەڵ خۆیا

بيانبـا بـۆ غـەزا ﴿عن أُمِّ عَطِيَّةَ رضىالله عنها: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِﷺ سَبْعَ غَزَوَاتٍ أَخْلُفُهُمْ فِي رِحَالِهِمْ: فَأَصْنَعُ لَهُمُ الطَّعَامَ وَأُداوِيالْجَرْحَى وَأَقُومُ عَلَىالْمَرْضَى﴾ رواه مسـلم، والبخـارى نحـوه عن الربيع رضىالله عنها، دايكى(عَطِية) فەرمووى: لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ حەفت غەزام كردون، لە بارخانەی جەنگاوەراندا دەمامەوە: خواردنم بۆ دروست دەكـردن‌و برینـدارەكانم دەرمـان دەكردن‌و سەرپەرشتى نەخۆشەكانم دەكرد.

(وَلَهُ) بۆ پێشەواو جێگرەكەى دروستە (بَذْلُ الأُهْبَةِ وَالسِّلَاحِ مِنْ بَيْتِ الْمَالِ) مەسـرەفى سەفەرو چەك لە (بيت المال) بداتە جەنگاوەران، هەم (وَمِنْ مَالِه) بۆى دروسـتە لـە مـاڵى خۆيشى مەسرەفەكە بدا، هەم بۆ گشت موسوڵمانەكانى‌تریش خێرە مەسرەفەكە لە مـاڵى خۆيان بدەن، پێغەمبەرﷺ فەرموويەتى: ﴿مَنْ جَهَّزَ غَازِياً فِي سَبِيلِ اللهِ فَقَدْ غَزا وَمَنْ خَلَفَ غَازِياً فِي سَبِيلِ اللهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزا﴾ رواه الشـيخان، هـەر كەسـێك مەسـرەفى وەرێكردنـى (مُجَاهِد)ێك بدا، ئەويش خێرى غەزاى بۆ دەنووسرێ‌و هەركەسێك ئاگادارى مـاڵ‌و منـداڵى (مُجَاهِد)ێك بێ بە چاكە تا لە غەزا دەگەڕێتەوە، ئەويش خێرى غەزاى بۆ دەنوسرێ. واتە: خێرى يارمەتيدانەكە، چونكە خێـرى خـودى غەزايەكـە بـۆ غەزاكەرەكەيـە، هـەروەك لـە زۆربەى سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

(وَلاَ يَصِحُّ اسْتِئْجَارُ مُسْلِمٍ لِجِهَادٍ) دروست نيە موسوڵمان بـە كـرێ بگـيرێ بـۆ غـەزاكردن؟ چـونكە خێـرى غەزايەكـە بـۆ خۆيـەتى، كەواتـە: ئـەو موچـەيەى لـە (بيـت المـال) دەدرێتـە جـەنگاوەرەكان، كـرێى غـەزا نيـە، بـەڵكو يارمەتيدانـە، هـەروەك لـە زۆربـەى سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

(وَيَصِحُّ اسْتِئْجَارُ ذِمِّيٍّ لِلإِمَامِ) بۆ پێشەوا دروستە كافرى پەيمان لەئەستۆ بە كرێ بگرێ بۆ غەزاكردن، چونكە كافرەكە خێرى غەزايەكەى ناگاتێ (قِيـلَ: وَلِغَيْـرِهِ) لـە فەرمودەيـەكى بێ‌هێزدا: بۆ موسوڵمانەكانى‌تريش دروستە: كافرى پەيمان لەئەستۆ بە كرێ بگرن بۆ غەزا، بەڵام لە بەر بێ‌هێزى ڕەفتارى پێ‌ناكرێ.

(وَيُكْرَهُ لِغَازٍ قَتْلُ قَرِيبٍ) بۆ غەزاكەرەكـە ناپەسـندە: خزمى‌خـۆى بكـوژێ، چـونكە جـۆرە بچـڕاندنێكى ڕەحمـى تێدايـە، كـەوابو: (وَ مَحْـرَمٍ أَشَـدُّ) كوشـتنى خزمێكى‌مـەحرەم

قُلْـتُ: إِلاَّ أَنْ يَسْـمَعَهُ يَسُـبُّ اللهَ أَوْ رَسُـولَهُﷺ وَاللهُ أَعْلَـمُ. وَيَحْـرُمُ عَلَيْـهِ قَتْـلُ صَـبِيٍّ وَمَجْنُـونٍ وَامْـرَأَةٍ وَخُنْثَـى مُشْـكِلٍ، وَيَحِـلُّ قَتْـلُ رَاهِـبٍ وَأَجِيـرٍ وَشَـيْخٍ وَأَعْمَـى وَزَمِـنٍ لاَقِتَـالَ فِـيهِمْ وَلاَرَأْيَ فِـالأَظْهَرِ، فَيُسْـتَرَقُّونَ، وَتُسْـبَى نِسَـاؤُهُمْ وَأَمْـوَالُهُمْ، وَيَجُوزُ حِصَارُ الْكُفَّارِ فِالْبِلَادِ وَالْقِلاَعِ وَإِرْسَالُ الْمَاءِ عَلَيْهِمْ

---

ناپەسنديەكەى بەهێزترە، بەڵام (قُلْتُ) ئيمامى (النواوى) دەفەرموێ (إِلاَّ أَنْ يَسْمَعَهُ يَسُبُّ اللهَ أَوْ رَسُولَهُﷺ) مەگەر گوێى لێبێ خزمەكەى جنێو دەداتە خوا، يان پێغەمبەرﷺ، ئەو

کاتە ناپەسند نیە، چونکە مافی خواو پێغەمبەرﷺ لەپێشترە (وَاللهُ أَعْلَمُ).
هەروەها ئەگەر خزمەکەی دەیویست بیکوژێ ئەو کاتەش ناپەسند نیە بەرگری لەخۆی بکاو بیکوژێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، چونکە(ابوعبیدة) لە غەزای (بدر) باوکی خۆی کوشت، (الحلبی) گێڕاویەتیەوە.
(وَيَحْرُمُ عَلَيْهِ قَتْلُ صَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ وَامْرَأَةٍ وَخُنْثَى مُشْكِلٍ) حەرامە: کوشتنی منداڵو شێتو ئافرەتو نێرامۆکی نائاشکرا ﴿عن ابن عمررضالله عنهما: نَهَى النَّبِيُّﷺ عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە غەزادا قەدەغەی کرد ئافرەتو منداڵەکان بکوژرێن. بەڵام ئەگەر ئەوانەش جەنگ بکەن، یان کافرەکان بیانکەنە قەڵغانی خۆیان، ئەو کاتە دروستە ئەوانەش بکوژرێن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
﴿ ئاگاداری ﴾: بە هیچ جۆرێك دروست نیە لاشەی کوژراوەکانی دوژمن هەتك بکرێ: وەك سوتاندنو دەمو لووت بڕینو ئەو جۆرە ڕەفتارانە ﴿عن عبدالله بن يزيدﷺ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ نَهَى عَنِ النُّهْبَى وَالْمُثْلَةِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە فەرهودو هەتککردن.
(وَيَحِلُّ قَتْلُ رَاهِبٍ) لە حاڵەتی جەنگدا حەڵاڵە: کوشتنی قەشەو مالمی جولەکەو دیانەکانی جەنگی، هەم کاسبکارو بێچەکەکانیش، هەم (وَأَجِيرٍ) بەکرێگیراویش بۆ خزمەتو سود لێوەرگرتن، هەم (وَشَيْخٍ وَأَعْمَى وَزَمِنٍ) پیرو کوێرو پەککەوتووش، هەرچەند (لاَ قِتَالَ فِيهِمْ وَلاَ رَأْيَ) خاوەن جەنگو بیرو ڕاش نەبن (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە خوای گەورە –بێ جیاکردنەوە– لە ئایەتەکەیداھاتوودا دەفەرموێ: ﴿فَاقْتُلُواالْمُشْرِكِينَ﴾ کافرەکان بکوژن.
کەوابو: (فَيُسْتَرَقُّونَ) دروستە پێشەوا ئەو شەش جۆرە کەسانە نەکوژێو بیانکاتە کۆیلە، بەڵام (وَتُسْبَى نِسَاؤُهُمْ) ژنو منداڵەکانیان بەخودی بەدیلگرتنەکە دبنە کۆیلەو هەم (وَأَمْوَالُهُمْ)ماڵەکەشیان دەبێتە تالان.
## ﴿ بەکارهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ ﴾
(وَيَجُوزُ حِصَارُ الْكُفَّارِ فِيالْبِلاَدِ وَالْقِلاَعِ) دروستە: کافرەکانی جەنگی گەمارۆ بدەین لە شارەکانو قەڵاکانو شوێنەکانیتردا، هەم (وَإِرْسَالُ الْمَاءِ عَلَيْهِمْ) دروستە: ئاو بەر بدەینە وَرَمْيُهُمْ بِنَارٍ وَمَنْجَنِيقٍ، وَتَبْيِيتُهُمْ فِي غَفْلَةٍ، فَإِنْ كَانَ فِيهِمْ مُسْلِمٌ أَسِيرٌ أَوْ تَاجِرٌ جَازَ ذَلِكَ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَلَوْ الْتَحَمَ حَرْبٌ فَتَتَرَّسُوا بِنِسَاءٍ وَصِبْيَانٍ جَازَ رَمْيُهُمْ، وَإِنْ دَفَعُوا بِهِمْ عَنْ

---

سەر کافرەکانو هەم ئاویان لە سەر ببڕین، هەم (وَرَمْيُهُمْ بِنَارٍ وَمَنْجَنِيقٍ) بە ئاگرو مەنجەنیق، واتە: بە چەکی کۆمەڵکوژ لێیان بدەینو خانووەکانیان بە سەردا بڕوخێنین هەرچەند لاشەکەشیان بسوتێو پارچە پارچە ببێ.
هەم (وَتَبْيِيتُهُمْ فِي غَفْلَةٍ) دروستە بێئاگاداری لە ناکاودا بە شەو هێرشیان بکەینە سەر،

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ﴾ کافرەکان بکوژن لە هەر شوێنێك دەستتان کەوتن و بیانگرن و گەمارۆیان بدەن و لە گشت ڕێگەو حەشارگەیەکدا بۆیان دانیشن.

﴿عَنْ عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما: حَاصَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَهْلَ الطَّائِفِ﴾ رواه الشيخان، زاد البيهقي: ﴿وَرَمَاهُمْ بِالْمَنْجِيقِ﴾، پێغەمبەر ﷺ دانیشتووانی شاری (طائف)ی گەمارۆ دان و بە مەنجەنیق لێیانیدا.

جا بزانە: لە گشت ئەو حاڵەتانەی ڕابردوودا جیاوازی نیە: کافرەکان ئافرەت و منداڵەکانیان لەگەڵدا بن، یان نا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن الصعب ﷺ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الدَّارِ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يُبَيَّتُونَ فَيُصِيبُونَ مِنْ نِسَائِهِم وَذَرارِيِّهِمْ؟ فَقَالَ: هُمْ مِنْهُمْ﴾ رواه الشيخان، لەبارەی کافرەکانی (دارالكُفْر) پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا: کە بە شەو هێرشیان دەکرێتەسەر، جا لەو هێرشەدا ئافرەت و منداڵەکانیشیان دەکوژرێن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوانیش لەوانن.

(فَإِنْ كَانَ فِيهِمْ مُسْلِمٌ أَسِيرٌ أَوْ تَاجِرٌ) جا ئەگەر لەگەڵ کافرەکاندا چەند موسوڵمانێکی بەدیلگیراو، یان چەند بازرگانێکی موسوڵمان هەبون، ئەو کاتەش (جَازَ ذَلِكَ) بەکارهێنانی چەکی کۆمەڵکوژو گشت شێوەهێرشەکانی ڕابردووش دروستن (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، ئەوەك کافرەکان بە بارمتەگرتنی موسوڵمانان (جهاد) بە ئێمە ڕابگرن، بەڵام واجبە: بەگوێرەی توانا خۆمان لە کوشتنی موسوڵمانەکان بپارێزین، جا ئەگەر لە یەکێك لەو جۆرە هێرشانەدا موسوڵمانەکە کوژرا، ئەوە نە خوێن و نە تۆڵەی واجب نیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

بەڵام ئەگەر موسوڵمانەکانی ناو کافرەکان زۆر بون، ئەو کاتە دروست نیە بکوژرێن، هەروەك لە (مغنى)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ الْتَحَمَ حَرْبٌ) ئەگەر جەنگ تێکەڵ بوو (فَتَتَرَّسُوا بِنِسَاءٍ وَصِبْيَانٍ) جا کافرەکان ژن و منداڵی خۆیان کردنە قەڵغانی خۆیان، ئەو کاتەش (جَازَ رَمْيُهُمْ) دروستە: چەکیان بهاوێژین، بەڵام بەگوێرەی توانا خۆمان لە کوشتنی ژن و منداڵەکان دەپارێزین (وَإِنْ دَفَعُوا بِهِمْ عَنْ أَنْفُسِهِمْ وَلَمْ تَدْعُ ضَرُورَةٌ إِلَى رَمْيِهِمْ فَالأَظْهَرُ تَرْكُهُمْ، وَإِنْ تَتَرَّسُوا بِمُسْلِمِينَ فَإِنْ لَمْ تَدْعُ ضَرُورَةٌ إِلَى رَمْيِهِمْ تَرَكْنَاهُمْ، وَإِلاَّ جَازَ رَمْيُهُمْ فِي الأَصَحِّ،

---

أَنْفُسهِمْ) ئەگەر کافرەکان بە ژن و منداڵەکانیان بەرگرییان لەخۆیان دەکردو (وَلَمْ تَدْعُ ضَرُورَةٌ إِلَى رَمْيِهِمْ) هیچ ناچارییەکیش نەبو بۆ لێدانیان، ئەو کاتە (فَالأَظْهَرُ تَرْكُهُمْ) وازیان لێدێنین، بەڵام بە فەرموودەی بەهێزو پشت پێبەستراوی زۆربەی سەرچاوەکان: لەو حاڵەتەشدا دروستە: چەکیان بهاوێژین، هەروەك دروست بوو: بە چەکی کۆمەڵکوژ لێیان

بدەین، نەوەك كافرەكان بەو فێڵانە ڕێگای (جهاد)و سەركەوتنمان لێبگرن.
(وَإِنْ تَتَرَّسُوا بِمُسْلِمِينَ) ئەگەر كافرەكان لە جەنگدا موسوڵمانانیان كردنە قەڵغانی خۆیان، ئەو كاتە (فَإِنْ لَمْ تَدْعُ ضَرُورَةٌ إِلَى رَمْيِهِمْ) ئەگەر هیچ ناچاریەك وای نەدەكرد چەكیان بهاوێینێ (تَرَكْنَاهُمْ) واجبە: لە بەر خاتری پاراستنی موسوڵمانەكان وازیان لێبێنین (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ناچار بوین: وەك جەنگ تێكەڵ بوبێ و ئەوانیش موسوڵمانەكانیان كردبونە قەڵغانو ئەگەر وازمان لێهێنابان ئەوان سەردەكەوتنو شپرزەیان دەكردین، ئەو كاتە (جَازَ رَمْيُهُمْ فِي الأَصَحِّ) بە فەرموودەی ڕاستتر دروستە: چەكیان بهاوێینێ بە مەبەستی كوشتنی كافرەكان، جا بەگوێرەی تواناش خۆمام لە كوشتنی موسوڵمانەكان دەپارێزین.
جا بزانە: لەم حاڵەتەی قەڵغانیشدا ئەگەر موسوڵمانێكی بە قەڵغانكراو بكوژرێ، لە مەزهەبی (حنفی)دا: نە خوێنو نە كەففارەتی كوشتنەكە واجب نابێ، هەروەك لە (مجمع الانهر)و (الهدایة)دا فەرموویانە.
﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەوەی ڕابردوو لە حاڵەتێكدا بوو: كە كافرەكان موسوڵمانان بە زۆرلێكردن بكەنە قەڵغانی خۆیان، بەڵام ئەگەر موسوڵمانەكان بەخۆیان بونە نۆكەری كوفرو یارمەتی كافرەكانیان داو لەشكری كافرەكانیان زۆر كرد، ئەو كاتەش بێگومان كوشتنیان دروستە
﴿عَنْ ابن عباس رضي‌الله عنهما: أَنَّ نَاساً مِنَ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا مَعَ الْمُشْرِكِينَ يُكَثِّرُونَ سَوَادَهُمْ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، يَأْتِي السَّهْمُ أَحَدَهُمْ فَيَقْتُلُهُ أَوْ يُضْرَبُ فَيُقْتَلُ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: (إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً)﴾ رواه البخاری، هەندێك لە موسوڵمانان لە (مكة)دا مابونەوەو لە غەزای (بَدْر) لەگەڵ كافرەكاندا هاتن بۆ جەنگو لەشكری كافرەكانیان زۆر كرد لە دژی پێغەمبەرﷺ، جا تیرێك دەهات یەكێكیانی دەكوشت، یان بە شمشێر لێی دەدراو دەكوژرا، ئینجا خوای گەورە دەرهەق ئەو موسوڵمانە تاوانبارانە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: واتە: (بەڕاستی ئەو موسوڵمانانەی لە غەزای (بَدْر) كوژرانو مەلائیكەتی عەزاب گیانیانی دەرهێنا لەو حاڵەتەی ئەوان ستەمكاری گیانی خۆیان بون، مەلائیكەتەكان پێیان گوتن: ئێوە لە چیدا بون؟
وَيَحْرُمُ الإِنْصِرَافُ عَنِ الصَّفِّ إِذَا لَمْ يَزِدْ عَدَدُ الْكُفَّارِ عَلَى مِثْلَيْنَا، إِلاَّ مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَى فِئَةٍ يَسْتَنْجِدُ بِهَا، وَيَجُوزُ إِلَى فِئَةٍ بَعِيدَةٍ فِي الأَصَحِّ،

---

موسوڵمانە كوژراوەكانیش گوتیان: ئێمە بێهێزو چەوسێندراو بوین لە زەویدا، مەلائیكەتەكان پێیان گوتن: ئەی زەویی خودا فراوان نەبو تا ئێوە كۆچی تێدا بكەنو لەگەڵ كافرەكاندا نەبن؟ جا ئەو موسوڵمانە كوژراوانە جێگەیان جەهەننەمەو خراپترین شوێنە).

## ﴿ هەڵاتن لە کاتی جەنگدا حەرامە ﴾

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، وَسَلُواالله الْعَافِيَةَ فَإِذا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ﴾ رواه الشيخان، خۆزگە مەکەن ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوەو بگەنە یەکتر، لە خوا بپاڕێنەوە بێبەڵاتان بکا، جا هەر کاتێك گەیشتنە دوژمنەکانتان ئێوە خۆ ڕابگرن‌و بزانن: بەهەشت لە ژێر سێبەرەکانی شمشێرەکاندایە.

کەوابو: (وَ) هەر کاتێك موسوڵمانان‌و دوژمنەکەیان گەیشتنە یەکترو جەنگ هەڵگیرسا (يَحْرُمُ الإنْصِرَافُ عَنِ الصَّفِّ) حەرامە (مُجاهِد) ڕیزی موسوڵمانان بەجێ بهێڵێ‌و بڕوا، هەرچەند گومانیشی بەهێز بێ کە دەکوژرێ (إذَا لَمْ يَزِدْ عَدَدُ الْكُفَّارِ عَلَى مِثْلَيْنَا) بەو مەرجەی ژمارەی کافرەکان لە دوو هەندی ئێمەی موسوڵمان زیاتر نەبێ.

(إلاَّ مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ) تەنها ئەگەر بۆ فێڵێکی جەنگکردن لە شوێنەکەی خۆی بڕواتە شوێنێکیتری باشتر (أوْ مُتَحَيِّزًا إلَى فِئَةٍ)  یان بڕواتە لای کۆمەڵێکی موسوڵمانان کە لە شوێنەکەی وی نزیکن، تاکو (يَسْتَنْجِدُ بِهَا) داوای فریاکەوتن لەو کۆمەڵە بکاو لەگەڵ ئەواندا بگەڕێتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، ئەوە لەو دوو حاڵەتانەدا دروستە شوێنی خۆی بەجێ بهێڵێ، جا ئەگەر نەگونجا بگەڕێتەوە شوێنەکەی خۆی، ئەو کاتە دروستە لەگەڵ ئەم کۆمەڵەدا بمێنێتەوەو جەنگ بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَجُوزُ إلَى فِئَةٍ بَعِيدَةٍ) دروستە بۆ داوای فریاکەوتن بڕواتە لای کۆمەڵێکی دووریش (فِي الأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفاً فَلا تُوَلُّوهُمُ الأَدْبَارَ وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفاً لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزاً إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ هۆ ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، هەر کاتێك گەیشتنە کافرەکان‌و لە جەنگدا لێك نزیك کەوتنەوە، نەکەن ببەزن‌و پشت بدەنە کافرەکان، هەر کەسێك لە کاتی جەنگدا پشت بداتە کافرەکان‌و ببەزێ –تەنها بۆ فێڵێکی جەنگ نەبێ، یان بۆ لای کۆمەڵێکی فریاکەوتن نەبێ– بە ڕاستی ئەو هەڵاتووە بە غەزبێکی لای خواوە دەگەڕێتەوەو شوێنەکەشی جەهەننەمەو خراپترین شوێنە.

وَلاَ يُشَارِكُ مُتَحَيِّزٌ إلَى بَعِيدَةٍ اَلْجَيْشَ فِيمَا غَنِمَ بَعْدَ مُفَارَقَتِهِ، وَيُشَارِكُ مُتَحَيِّزٌ إلَى قَرِيبَةٍ فِالأَصَحِّ، فَإِنْ زَادَ عَلَى مِثْلَيْنَا جَازَ الإنْصِرَافُ، إلاَّ أَنَّهُ يَحْرُمُ اِنْصِرَافُ مِأَةِ بَطَلٍ عَنْ مِأَتَيْنِ وَوَاحِدٍ ضُعَفَاءَ فِي الأَصَحِّ،

---

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إجْتَنِبُواالسَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ، وَعَدَّ مِنْهَا: اَلتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ﴾ رواه الشيخان، خۆتان لە حەفت گوناهە گەورەکانی بەهیلاکدەر بپارێزن: کە یەکێکیان : هەڵاتنە لە کاتی جەنگدا.        کەوابو: سەرکەوتن لەگەڵ خۆڕاگرتندایە.

ئینجا بزانە: ئەگەر (مُجاهِد)ێك چەكەكەی نەما، ئەوە ئەگەر بگونجێ بە بەرد هاویشتن -یان بە جۆرێكیتر- جەنگ بكا، ئەو كاتەش دروست نیە ڕیزی جەنگ بەجێ بهێڵێ، بەلاّم ئەگەر نەگونجێ، ئەو كاتە دروستەو گوناهبار نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يُشَارِكُ مُتَحَيِّزٌ إِلَى بَعِيدَةٍ اَلْجَيْش) ئەو كەسەی ڕۆیشتۆتە لای كۆمەڵێكی دوری فریاكەوتن، نابێ هاوبەشی لەشكرەكە بكا (فِيمَا غَنِمَ بَعْدَ مُفَارَقَتِهِ) لەو شتەی بە تالاّن گرتویانە لە دوای ڕۆیشتنەكەی، بەلاّم لەو شتەی پێش ڕۆیشتنەكەی گرتویانە دەبێتە هاوبەش، هەم (وَيُشَارِكُ مُتَحَيِّزٌ إِلَى قَرِيبَةٍ) ئەو كەسەی ڕۆیشتۆتە لای كۆمەڵێكی نزیك ئەویش دەبێتە هاوبەشی كۆمەڵەكەی خۆی (فِيالأَصَحِّ) لەفەرموودەی ڕاستتردا، هەرچەند لە دوای كۆتایی جەنگەكەش گەڕابێتەوە.

هەروەها ئەوەی بۆ هەواڵگری نێردراوە، ئەویش دەبێتە هاوبەشی تالاّنەكە، هەرچەند ئامادەی جەنگیش نەبوبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ زَادَ عَلَى مِثْلَيْنا) جا ئەگەر ژمارەی كافرەكان لە دوو هەندی ئێمە زیاتر بوو، ئەو كاتە (جَازَ الإِنْصِرَافُ) دروستە لە شوێنی خۆی بڕوا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِاْئَةٌصَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِأَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ﴾ ئەگەر لە ئێوەی موسوڵمان سەد كەسی خۆڕاگر هەبن بە سەر دووسەد كافردا زاڵ دەبن، ئەگەر هەزاری خۆڕاگر هەبن بە سەر دوو هەزاردا زاڵ دەبن.

كەواتە: لە بەرامبەر دووهەندی خۆیان واجبە: موسوڵمانان خۆ ڕابگرن، لە بەرامبەر زیاتر واجب نیە؟ چونكە موسوڵمان لە سەر (إِحْدَىالْحُسْنَيَيْن) جەنگ دەكا: كە (شەهیدبوونە، یان سەركەوتنە)، كافریش تەنها بۆ وەدەستهێنانی دونیا جەنگ دەكا.

(إِلاَّ أَنَّهُ يَحْرُمُ انْصِرَافُ مِأَةِ بَطَلٍ) بەلاّم حەڕامە سەد موسوڵمانی پاڵەوان ببەزێو هەڵبێ (عَنْ مِأَتَيْنِ وَوَاحِدٍ ضُعَفَاءَ) لە دوو سەدو یەك كافری بێهێز (فِى الأَصَحِّ) لەفەرموودەی ڕاستتردا، چونكە تاكە كەسێك كار ناكاتە سەر خۆڕاگرتن.

وَتَجُـــوزُ الْمُبَـــارَزَةُ، فَـــإِنْ طَلَبَهَـــا كَـــافِرٌ اُسْـــتُحِبَّ الْخُـــرُوجُ إِلَيْـــهِ، وَإِنَّمَا تَحْسُنُ مِمَّنْ جَرَّبَ نَفْسَهُ وَبِإِذْنِ الإِمَامِ،

---

كەواتە: لەو حاڵەتەی دوژمن لە دوو هەندی خۆمان زیاترە: ئەگەر ئومێدی سەركەوتنو زیان لێدانێكیگەورەی دوژمن هەبێ، ئەو كاتە خۆڕاگرتن سوننەتە، هەرچەند بشزانێ شەهید دەبێ، بەلاّم ئەگەر ترسی لەناوچونێكی بێسەركەوتنو بێ زیان لێدانێكیگەورەی دوژمن هەبێ، ئەو كاتە هەلاّتن واجبە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنى)دا ڕوون كراوەتەوە.

**ڕوونكردنـــــەوە:** لـــەو ئایـــەتو حەدیسانەیڕابردوودا ئاشكرابو: كە هەلاّتن

لە ڕۆژی جەنگدا بێشەرعیو گوناهێکی گەورەیە، جا ئەگەر ژمارەی دوژمنیش لە دووهەندی خۆمان زیاتر بێ، ئەو کاتە هەڵاتن دروستە، واتە: خۆڕاگرتنیش تا شەهید دەبێ هەر دروستە.

بەڵام ئەگەر دەزاندرا: موسوڵمانان دەکوژرێنو زیانێکیگەورەش لە دوژمن ناکەوێ، ئەو کاتە هەڵاتن واجب دەبێ؟ چونکە خۆڕاگرتن تا شەهیدبوون لەو حاڵەتەدا دروست دەبێ: کە سەرەکەوتنێکیئیسلامی تێدابێو زیانێکیگەورە لە دوژمن بدرێ، جا ئەگەر سەرکەوتنی تێدا نەبێو زیانێکیگەورە لە دوژمن نەدرێ، ئەو کاتە هەڵاتن واجب دەبێ، چونکە بە لەناوچونی موسوڵمانان دژمنەکەیان دڵخۆش دەبێو دەردی دەرمان دەبێ، موسوڵمانیش خەفەتبار دەبن، هەروەك ئیمام (العز بن عبدالسلام)ش لە (قواعدالاحکام)دا ڕوونی کردۆتەوە.

کەوابو: ئەگەر–لەم سەردەمەدا– کۆمەڵە موسڵمانێك بەرووەستی فڕۆکەو موشەکی دوژمنیان نەدەکردو ترسی لەناوچوونیان هەبوو، واجبە: شوێنیخۆیان بەجێ بهێڵنو بڕۆنە شوێنێکیترو بۆ هەڵمەتێکیتر خۆیان ئامادە بکەنەوە، والله أعلم.

### ﴿ چوونە مەیدانو هێرشی گیانفیدایی ﴾

(وَتَجُوزُ الْمُبَارَزَةُ) چونە مەیدان بە ئاشکرایی دروستە، بەڵام سوننەت نیە (فَإِنْ طَلَبَهَا كَافِرٌ) جا ئەگەر کافرێك مەیدانی خواستەوەو داوای کرد یەکێك بۆی بچێتە مەیدان، ئەو کاتە (اُسْتُحِبَّ الْخُرُوجُ إلَيْهِ) سوننەتە موسوڵمانێك بۆی بچێتە مەیدان (وَإِنَّمَا تَحْسُنُ مِمَّنْ جَرَّبَ نَفْسَهُ) چونە مەیدانەکەش تەنها لە کەسێکی وەها جوانە: کە خۆی تاقی کردبێتەوە لە ڕووی هێزو نەترسییەوە، هەم (وَبِإِذْنِ الإمَامِ) بە ئیزنی پێشەوا، یان سەرکردەی لەشکرەکەش بێ، جا بزانە: ئەم جۆرە مەیدانبازییە لەم سەردەمەدا ناگونجێ؟ چونکە چەکەکانی ئێستاو چەکەکانی سەردەمی(مِنْهاج) لێك جیاوازنو منداڵێك دەتوانێ–بە چەکی ئێستا– پاڵەوانێك بکوژێ، کەوابو: ئێستا سوننەت نیە.

بەڵکو ئیمامی (الماوردی) فەرموویەتی: ئەگەر موسوڵمانێك کوشتنەکەی دەبووە هۆی شکستی موسوڵمان–وەك گەورەیەك، یان سەرکردەیەکی لێهاتووی موسوڵمانان– ئەوە بۆ

.......................................................................................................................

ئەو جۆرە کەسە حەرامە بچێتە مەیدانی جەنگ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: چونکە پێغەمبەرﷺ لە غەزایەکانی (بَدْر)و (أُحُد) ڕێگای نەدا: ئیمامی (أبوبکر)ﷺ بچێتە مەیدانی کوڕەکەی خۆی کە ناوی (عبدالرحمن)بوو–هێشتا موسوڵمان نەبوبو– جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مَتِّعْنَا بِنَفْسِكَ–يا أبابَكْر–لاتَفْجَعْنَا بِمَوْتِكَ﴾، ئەی (أبوبکر) بە مانەوەی خۆت سودمان پێبگەێنە، بە مردنت دڵمان مەئێشێنە. هەروەك (الدارقطني)و (الحلبی) گێڕاویەتیانەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: له زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە: لە (جهاد)دا دروستە: مرۆڤ خۆی توشی بەهیلاكچوون بكا، ئەوەش وادەگەیەنێ: كە هێرشی گیانفیدایی دروستە، هەرچەند بێگومانیش بزانێ بە دەستی دوژمن دەكوژرێ، بەو مەرجەی شەهیدبوونەكەی نەبێتە هۆی شكستی موسوڵمانان ﴿عَنْ أَسْلمﷺ: حَمَلَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى صَفِّ الرُّومِ حَتَّى دَخَلَ فِيهِمْ، فَصَاحَ النَّاسُ: سُبْحَانَ اللهِ يُلْقِي بِيَدِهِ إِلَىالتَّهْلُكَةِ! فَقَالَ أَبُوأَيُّوبِ الأَنْصَارِيُّﷺ رَدَّاً عَلَيْهِمْ: نَزَلَتْ فِينَا–مَعْشَرَالأَنْصَارِ–(وَلاتُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَىالتَّهْلُكَةِ)، حِينَ عَزَمْنَا أَنْ نَقُومَ فِي أَمْوالِنَا وَنَتْرُكَ الْغَزْوَ﴾ رواهأصحاب السنن بسند صحيح، پیاوێكی موسوڵمان هێرشێكی گیانفیدایی كردە سەر كۆمەڵێكی كافرەكانی ڕۆم‌و چووە ناو ڕیزەكەیان، جا موسوڵمانەكان گوتیان: (سُبْحانَ اللهِ) چۆن بە دەستی خۆی خۆی بەهیلاك دەدا! ئینجا (أبوأیوب) فەرمووی: ئێوە بەهەڵە لەم ئایەتە تێگەیشتون، كە دەرهەق ئێمەی (أنصار) هاتۆتە خوارەوە، لەو كاتەی ویستمان واز لە غەزا بێنین‌و لە ناو ملك‌و ماڵەكاماندا بمێنینەوە، خوای گەورە دەرهەق ئێمە فەرمووی: (ئێوە بەدەستی خۆتان خۆتان بەهیلاك مەدەن).

واتە: مەبەست ئەوەیە واز لە غەزا مەهێنن، نەك خۆتان گیانفیدای ئیسلام مەكەن.

ئینجا بزانە: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلايَطَأُونَ مَوْطِئاً يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلايَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَيْلاً إِلاَّ كُتِبَ لَهُمْ بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ﴾ موسوڵمانەكان بە سەر هەر شوێنێكدا بڕۆن كە كافرەكان دڵتەنگ‌و خەفەتبار بكا، یان بگەنە هەر مەبەستێك لە كوشتن‌و برینداركردن‌و بەدیلگرتنی دوژمنەكەیان، بە هەر یەكێك لەوانە خێری كردەوەیەكی چاكیان هەر بۆ دەنووسرێ. كەواتە: نابێ (مُجاهِد) واتێبگا پلەی بەرز تەنها لە شەهیدبووندایە، بەڵكو جاری وا هەیە بە شەهیدبوونی موسوڵمانێك كافرەكان زۆر چاك دەردیان دەرمان دەبێ‌و شەهیدبوونی موسوڵمانەكەش بە سەركەوتنی خۆیان دادەنێن، بۆیە نابێ (مُجاهِد) بەو هێرشە گیانفیداییە تەنها مەبەستی شەهیدبوون بێ، بەڵكو پێویستە نیەتی بەرزكردنەوەی ئیسلامیشی هەبێ، چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُاللهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ﴾ رواه الشيخان، هەر كەسێك بۆ بەرزكردنەوەی ئایینی خوا جەنگ بكا، ئەوە لە ڕێگای خوایە.

وَيَجُوزُ إِتْلاَفُ بِنَائِهِمْ وَشَجَرِهِمْ لِحَاجَةِ الْقِتَالِ وَالظَّفَرِ بِهِمْ، وَكَذَا إِنْ لَمْ يُرْجَ حُصُولُهَا لَنَا، فَإِنْ رُجِيَ نُدِبَ التَّرْكُ، وَيَحْرُمُ إِتْلاَفُ الْحَيَوَانِ إِلاَّ مَا يُقَاتِلُونَا عَلَيْهِ لِدَفْعِهِمْ أَوْ ظَفَرٍ بِهِمْ، أَوْ غَنِمْنَاهُ وَخِفْنَا رُجُوعَهُ إِلَيْهِمْ وَضَرَرَهُ.

---

ئینجا كە ئەو نیەتە باشەی هەبوو، با بەخۆی خۆی بە شەهیدبوون نەدا، بەڵكو لە خوا بپاڕێتەوە: تاكو شەهیدبوونی بداتێ، چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ سَأَلَ الشَّهادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ﴾ رواه مسلم، هەر كەسێك

به ڕاستی تکای شەهیدبوون لە خوا بکا، خوا دەیگەیێنێتە پلەی شەهیدان، هەر چەند لە سەر یاتاغی خۆیشی مردبێ. کەوابو: ئەی برای (مُجاهِد) تا تەمەنت درێژتربێ‌و زیاتر زیان لە کافرەکان بدەی، پلەی زیاتر لە بەهەشت بۆ خۆت وەدەست دێنی، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿خَيْرُالنَّاسِ مَنْ طَالَ عُمُرُهُ وَحَسُنَ عَمَلُهُ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، لە هەموو کەس باشتر ئەو کەسەیە: تەمەنی درێژ بێ‌و کردەوەی چاك بێ.

(وَيَجُوزُ إِتْلاَفُ بِنَائِهِمْ وَشَجَرِهِمْ) دروستە: خانووی کافرەکان وێران بکەین‌و درەختەکانیان بفەوتێنین (لِحَاجَةِ الْقِتَالِ وَالظَفَرِ بِهِمْ) بۆ پێویستی جەنگ‌و زاڵبوون بە سەریاندا، چونکە پێغەمبەرﷺ دارخورمایەکانی (بَنِيالنَّضِير)ی بڕین، هەروەك (البخاري ومسلم) گێڕاویەتیانەوە.

(وَكَذَا إِنْ لَمْ يُرْجَ حُصُولُهَا لَنَا) هەروەها ئەگەر ئومێدیش نەبێ درەخت‌و خانووەکان بۆ ئێمە بێن، ئەو کاتەش دروستە بیانفەوتێنین، بەڵام (فَإِنْ رُجِيَ نُدِبَ التَّرْكُ) ئەگەر ئومێد هەبو بۆ ئێمە بمێننەوە، ئەو کاتە سوننەتە نەیانفەوتێنین.

جا بزانە: هەر ماڵێکی‌تر–کە ئاژەڵ نەبێ– وەك ئوتۆمبیل‌و ئەو جۆرە شتانە، هەمان بڕیارەکانی درەخت‌و خانووی لێدێنە جێ، هەروەها ئەو ئاژەڵەی گۆشتی بخورێ، دروستە بۆ خواردن سەر ببڕێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

بەڵام (وَيَحْرُمُ إِتْلاَفُ الْحَيَوَانِ) حەڕامە: ئەو ئاژەڵەی گۆشتی ناخورێ، بیفەوتێنین (إِلاَّ مَا يُقَاتِلُونَا عَلَيْهِ) تەنها ئەو ئاژەڵەی کافرەکان بە سواریی جەنگمان لەگەڵ دەکەن دروستە بفەوتێندرێ (لِدَفْعِهِمْ أَوْ ظَفْرٍ بِهِمْ) بۆ بەرگری‌و زاڵبوون بە سەریاندا (أَوْ غَنِمْنَاهُ وَخِفْنَا رُجُوعَهُ إِلَيْهِمْ) یان ئاژەڵەکەمان بە تاڵان گرتبو و ترساین بۆ کافرەکان بگەڕێتەوەو (وَضَرَرَهُ) زیانی بۆ ئێمە هەبێ، ئەو کاتەش دروستە بفەوتێندرێ.

کەوابو: ئەگەر ترساین چەك‌و کەرەستەی ئێمەش بکەوێتە دەست دوژمن‌و لە دژی ئێمە بە کاری بێنن، ئەو کاتەش دروستە: بیفەوتێنین، چونکە حەرزەتی(جعفر بن أبیطالبﷺ) لە غەزای (مؤتة)دا لە بەر زۆری برینەکانی بێهێز بوو، ئینجا لە ئەسپەکەی دابەزی‌و هەرچوار پەلی ئەسپەکەی بڕین، نەوەك بکەوێتە دەست کافرەکان‌و لە دژی موسوڵمانان

.......................................................................................................

به سواریی ئەسپەکە جەنگ بکەن، هیچ (صحابة)یەکیش ڕەخنەی لێنەگرت، هەروەك لە (شرح الزرقاني)و (السيرة الحلبية)دا گێڕدراوەتەوە.

**﴿ پاشکۆ: لەبارەی جاسوس‌و (رِبَاط)=مانەوە لە بارگایەکی ئیسلامدا ﴾**

**یەکەم:** ﴿عَنْ سَلَمَةَﷺ: أَتَىالنَّبِيَّﷺ عَيْنٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ–فِي غَزْوَةِ هَوَازِنَ– فَجَلَسَ مَعَ أَصْحَابِهِ يَتَحَدَّثُ ثُمَّ انْفَتَلَ، فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: أُطْلُبُوهُ فَاقْتُلُوهُ. فَقَتَلْتُهُ فَنَفَلَنِي سَلَبَهُ﴾ رواه الشيخان

والنسائی، له غەزای (هوازن) جاسوسێكی كافرەكان هات لەگەڵ (صحابة)كان دانیشت قسەی دەكرد، ئینجا ڕۆیشت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە دوای‌دا بگەڕێن‌و بیكوژن. جا (سَلَمَة) جاسوسەكەی كوشت‌و پێغەمبەرﷺ كەلوپەلەكەیی دایێ.

جا بە بەڵگەی ئەم حەدیسەو بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام دروستە جاسوسێكی كافری جەنگی بكوژرێ، هەروەها جاسوسێكی كافری پەیمان لەئەستۆو پەیمان لەگەڵكراویش لە مەزهەبی ئیمام (مالك)دا: پەیمانەكەی هەڵدەوەشێتەوە، كەواتە: دروستە بكوژرێ، بەڵام ئەگەر جاسوسەكە موسوڵمان بێ–ئەوەش بە فەرموودەی ئیمام (مالك)و چەند زانایەكی‌تر–: پێشەوای موسوڵمانان (إِجْتِهاد) دەرهەقی دەكا، واتە: ئەگەر بەرژەوەندیی دیت دروستە بیكوژێ.

جا (إبن حجرالعسقلانی) فەرموویەتی: بەڵگەی كوشتنی جاسوسی موسوڵمان–كە لە لای ئیمام (مالك)و چەند زانایەك دروستە– بەسەرهاتەكەی (حاطب بن أبی‌بلتعة)یە: كە لە (فَتْحِ مَكَّة)دا كاغەزێكی بۆ كافرەكان ناردو كاغەزەكەش گیرا، ئینجا ئیمامی(عمرﷺ) فەرمووی: ﴿دَعْنِي يَا رَسُولَ الله أَضْرِبُ عُنُقَهُ. فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: إِنَّهُ شَهِدَ بَدْراً﴾ رواه الشيخان، ڕێگام بدە (حاطب) بكوژم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (حاطب) ئامادەی غەزای (بَدْر) بووە، واتە: بۆیێ نابێ بكوژرێ.

شوێنی‌بەڵگە: ووشەی (شَهِدَ بَدْراً)ە، واتە: ئامادەبوونی(حاطب) لە (بدر) پلەیەكی بەرزەو دەبێتە ڕێگری‌كوشتنی، نەك لە بەر ئەوەی موسوڵمانە، جا ئەو پلەیەش–ئێستا– لە هیچ جاسوسێكی موسوڵماندا نیەو ئیسلامەتیش نابێتە ڕێگری كوشتنی.

بەڵام بە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)و (الشافعی): دروست نیە جاسوسی موسوڵمان بكوژرێ، بەڵكو تەمبێ دەكرێ: بە لێدان‌و بەندكردن تا ماوەیەكی درێژ، هەروەك لە (شرح مسلم)و (فتح الباری)دا ڕوون كراوەتەوە.

**دووەم**: (رِبَاط)= نیشتەجێبوون لە بارەگایەكی‌ئیسلامدا–بۆ چاوەڕوانكردنی غەزاو پاسەوانیی موسوڵمانان‌و خۆڕاهێنان لە چەك‌و پێویستیەكانی‌تری جەنگ– بەشێكە لە (جِهَاد)، ئەگەر (مُرَابِط)=نیشتەجێبووەكە لە بارەگاكەشی‌دا بمرێ پلەی بەرزی (جِهَاد)ی

(فَصْلٌ) نِسَاءُ الْكُفَّارِ وَصِبْيَانُهُمْ إِذَا أُسِرُوا رَقُّوا، وَكَذَا الْعَبِيدُ، وَيَجْتَهِدُ الإِمَامُ فِي الأَحْرَارِالْكَامِلِينَ وَيَفْعَلُ الأَحَظَّ لِلْمُسْلِمِينَ مِنْ قَتْلٍ وَمَنٍّ وَفِدَاءٍ بِأَسْرَى أَوْ مَالٍ

---

هەر بۆ دەنووسرێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ، وَإِنْ مَاتَ فِيهِ أُجْرِيَ عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِى كَانَ يَعْمَلُ وَأُجرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ وَأَمِنَ الفُتّانَ﴾ رواه مسلم، نیشتەجێبوونی ڕۆژێك‌و شەوێك لە بارەگایەكی ئیسلامدا خێرترە لە بەڕۆژووبوونی مانگێك‌و شەونوێژی مانگێك، ئەگەر نیشتەجێبووەكە لە ماوەی

نیشتەجێبوونەکەیدا بمرێ، خێری ئەو کردەوە چاکانەی دەیکردن، هەر بۆی دەنووسرێو لێی نابڕێ، خواردنەکەشی-وەکو شەهید- هەر دەدرێتێو لە فیتنەی فریشتەکانی ناو گۆڕەکەشی ئەمین دەبێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی گرتنی دیلەکانو ماڵی کافرەکان ﴾

**پێشەکی**: بزانە ملكو ماڵی کافرەکانی پاشکەزبوو نابێتە تالانو بە سەر غەزاکەرەکاندا بەش ناکرێ، بەڵکو ماڵی هەر پاشکەزبوویکی بە کافری مردبێ، یان کوژرابێ، بە (فَيْء) دەدرێتە (بَيْت الْمال)، ماڵی زیندووەکانیشیان ڕادەگیرێ: ئەگەر بونەوە موسوڵمان دەیاندرێتەوە، ئەگەر بە کافری بمرن، یان بکوژرێن، ئەوەش بە (فَيْء) دەدرێتە (بیت المال)، هەروەها دیلەکانیشیان نابنە کۆیلە، بەڵکو ئافرەتو پیاوە بالغەکانیان داوای موسوڵمانبوونەوەیان لێدەکرێ، جا ئەگەر نەبونەوە موسوڵمان، ئەو کاتە واجبە بکوژرێن، بەڵام منداڵە نەبالغەکانیان هەر بە موسوڵمان دادەندرێن، هەروەك لە (باسی پاشکەزبوونەوە)دا ڕابراو لە (مغنی)و (الشروانی)شدا فەرموویانە.

بەڵام (نِسَاءُ الْكُفَّارِ) ئافرەتەکانی کافرەکانی بنەڕەتی-کە ئافرەتەکان لە بنچینەدا کافرن- هەم (وَصِبْيَانُهُمْ) منداڵەکانی کافرەکانی بنەڕەتی (إِذَا أُسِرُوا رَقُّوا) هەر کاتێك بە دیل گیران یەکسەر-بە خودی گرتنەکە- دەبنە کۆیلە ﴿عن ابن عون وابن عمررضالله عنهم فِي غَزْوَتَيْ بَنِقُرَيْظَةَ وَبَنِالْمُصْطَلَقِ: قُتِلَ رِجَالُهُمْ وَقُسِمَ نِسَاؤُهُمْ وَأَوْلاَدُهُمْ وَأَمْوالُهُمْ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ الحدیثان رواهماالشیخان، لە غەزای جولەکەکانی (بنیقریظة)و عەرەبەکانی (بنیالمصطلق) پێغەمبەرﷺ پیاوە بالغەکانی کوشتنو ماڵو ئافرەتو منداڵەکانیشیانی بەسەر موسوڵماناندا بەش کردن. (وَكَذَا الْعَبِيدُ) هەروەها کۆیلەکانیشیان بە خودی گرتن دەبنەوە کۆیلە.

(وَيَجْتَهِدُ الإِمَامُ) پێشەوا، یان سەرکردەی لەشکرەکە (إجتهاد) دەکا: (فِيالأَحْرَارِ الْكَامِلِينَ) لەبارەی نێرینە ئازادەکانی بالغو عاقڵ-هەر کاتێك بە دیل گیران- ئینجا (وَيَفْعَلُ الأَحَظَّ لِلْمُسْلِمِينَ) واجبە بە قازانجترەکە بۆ موسوڵمان بکا: لەو چوار ڕێگایانە: (مِنْ قَتْلٍ) لە کوشتنی دیلەکانو (وَمَنٍّ) لە ئازادکردنیان بەخۆڕاییو (وَفِدَاءٍ بِأَسْرَى أَوْ مَالٍ) لە ئازادکردنیان بەرامبەر ڕزگارکردنی دیلەکانی موسوڵمانان، یان بەرامبەر وەرگرتنی ماڵ لە وَاسْتِرْقَاقٍ، فَإِنْ خَفِيَ الأَحَظُّ حَبَسَهُمْ حَتَّى يَظْهَرَ، وَقِيلَ لاَ يُسْتَرَقُّ وَثَنِيٌّ وَكَذَا عَرَبِيٌّ فِي قَوْلٍ، وَ لَوْ أَسْلَمَ أَسِيرٌ عَصَمَ دَمَهُ وَبَقِيَ الْخِيَارُ فِالْبَاقِي، وَفِي قَوْلٍ يَتَعَيَّنُ الرِّقُّ، وَإِسْلاَمُ كَافِرٍ قَبْلَ ظَفَرٍ بِهِ يَعْصِمُ دَمَهُ وَمَالَهُ وَصِغَارَ وَلَدِه، لاَ زَوْجَتَهُ عَلَىالْمَذْهَبِ،

---

دیلە کافرەکانو (وَاسْتِرْقَاقٍ) لە کردنیان بە کۆیلە، چونکە ئەم چوار ڕێگایانە لە قورئانو حەدیس وەرگیراون.

(فَإِنْ خَفِيَ الأحَظُّ) جا ئەگەر لەو چوار ڕێگایانە بە قازانجترەکەی لێدیار نەبو، ئەو کاتە (حَبَسَهُمْ حَتَّى يَظْهَرَ) واجبە: بەندیان بکا تا بەقازانجترەکە دەردەکەوێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (لاَ يُسْتَرَقُّ وَثَنِيٌّ) بتپەرست ناکرێتە کۆیلە (وَكَذَا عَرَبِيٌّ فِيقَوْلٍ) هەروەها لە فەرموودەیەکیتری بێهێزدا: عەرەبیش ناکرێتە کۆیلە، بەڵام بە حەدیسەکەی ڕابردوو ئەم فەرموودە بێهێزانە ڕەد کراونەوە.

(وَلَوْ أَسْلَمَ أَسِيرٌ) ئەگەر دیلێك ببوە موسوڵمان، ئەوە (عَصَمَ دَمَهُ) خوێنەکەی خۆی دەپارێزێو دروست نیە بکوژرێ، بەڵام (وَبَقِيَ الْخِيَارُ فِيالْبَاقِي) سەرپشکی پێشەوا لە سێ ڕێگاکەیتردا دەمێنێ (وَفِي قَوْلٍ: يَتَعَيَّنُ الرِّقُّ) لە فەرموودەیەکدا واجبە: دیلی موسوڵمانبوو بکرێتە کۆیلە.

(وَإِسْلاَمُ كَافِرٍ قَبْلَ ظَفَرٍ بِهِ) ئیسلامبوونی کافرێکی بالغو عاقڵ -پیاو بێ، یان ئافرەت- پێش ئەوەی بگیرێ (يَعْصِمُ دَمَهُ وَمَالَهُ) گیانەکەی لە کوشتنو کۆیلەیی دەپارێزێو ماڵەکەشی-لە هەر شوێنێك بێ- دەپارێزێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، فَإِذَا قَالُوهَا عَصَمُوا مِنِّي دِمَائَهُمْ وَأَمْوالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهِ﴾ رواه الشيخان واصحاب السنن، لە لایەن خواوە فەرمانم پێکراوە جەنگ لەگەڵ کافرەکان بکەم تا شادە دەهێنن، جا هەر کاتێك شادەیان هێناو بونە موسوڵمان، خوێنو ماڵیان لە من دەپارێزن تەنها بە مافی ئیسلام نەبێ.

(وَصِغَارَ وَلَدِهِ) هەم منداڵە بچوکەکانیشی لە کۆیلەیی دەپارێزێ، چونکە ئەوانیش بە ئیسلامبوونی دایکیان، یان باوکیان دەبنە موسوڵمان، بەڵام منداڵە بالغو عاقڵەکانی ناپارێزێ، چونکە ئەوان سەربەخۆنەو بە ئیسلامبوونی دایكو باوکیان نابنە موسوڵمان، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(لاَ زَوْجَتَهُ) بەڵام ژنە کافرەکەی لە کۆیلەیی ناپارێزێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، هەروەك ئەگەر لە دوای بەدیلگیرانیشی ببێتە موسوڵمان ناپارێزێ، چونکە ئافرەتەکە سەربەخۆیە، کەوابو: ئیسلامبوونی ژنەکەش مێردە کافرەکەی ناپارێزێ، بەڵام لە فەرموودەیەکیتردا: ئەگەر مێردەکە پێش بەدیلگیرانی ببێتە موسوڵمان، ژنە کافرەکەی لە کۆیلەیی دەپارێزێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

فَإِنْ اسْتَرَقَّتْ انْقَطَعَ نِكَاحُهُ فِالْحَالِ، وَقِيلَ إِنْ كَانَ بَعْدَ الدُّخُولِ بِهَا انْتُظِرَتِ الْعِدَّةَ فَلَعَلَّهَا تَعْتِقُ فِيهَا، وَيَجُوزُ إِرْقَاقُ زَوْجَةِ ذِمِّيٍّ، وَكَذَا عَتِيقُهُ فِالأَصَحِّ، لاَ عَتِيقُ مُسْلِمٍ وَزَوْجَتُهُ الْحَرْبِيَّةُ عَلَالْمَذْهَبِ، وَإِذَا سُبِيَ زَوْجَانِ أَوْ أَحَدُهُمَا انْفَسَخَ النِّكَاحُ إِنْ كَانَا حُرَّيْنِ قِيلَ أَوْ رَقِيقَيْنِ، وَإِذَا أُرِقَّ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ لَمْ يَسْقُطْ فَيُقْضَى مِنْ مَالِهِ إِنْ غَنِمَ بَعْدَ إِرْقَاقِهِ،

جا گوتمان بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: بە موسوڵمانبوونی مێردەکە ژنەکافرەکەی لە کۆیلەیی ناپارێزێ، کەوابو: (فَإِنْ اسْتَرَقَّتْ) هەرکاتێك ژنە کافرەکەی پیاوە موسوڵمانبووەکە گیراو بووە کۆیلە (انْقَطَعَ نِكَاحُهُ فِيالْحَالِ) هەر ئەو دەم مارەبڕینەکەی دەپچڕێ، هەرچەند جیماعیشی لەگەڵ کردبێ (وَقِيلَ إِنْ كَانَ بَعْدَالدُّخُولِ بِهَا) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر بوونە کۆیلەیی لە دوای جیماع لەگەڵکردنی بێ، ئەو کاتە (انْتُظِرَتِ الْعِدَّةَ) چاوەڕوانی تەواوبوونی (عدة)ی دەکرێ (فَلَعَلَّهَا تَعْتِقُ فِيهَا) بەڵکی لە (عدة)دا ئازاد دەکرێ و مارەبڕینەکەیان بەردەوام دەبێ.
(وَيَجُوزُ إِرْقَاقُ زَوْجَةِ ذِمِّيٍّ) دروستە: ژنە کافرەکەی کافری پەیمان لەئەستۆ بکرێتە کۆیلە، ئەگەر ژنەکە جەنگ بکا (وَكَذَا عَتِيقُهُ فِيالأَصَحِّ) هەروەها کۆیلە کافرەکەی ئازادکراویشی دەکرێتە کۆیلە ئەگەر جەنگ بکا (لاَ عَتِيقُ مُسْلِمٍ وَزَوْجَتُهُ الْحَرْبِيَّةُ) بەڵام کۆیلە کافرەکەی ئازادکراوی مرۆڤی موسوڵمانو هەم ژنەکافرەکەی مرۆڤی موسوڵمان-ئەگەر جەنگیش بکەن- نابنە کۆیلە (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە ئیسلامەتیبنچینەیی بەهێزترە لە ئیسلامەتی دوای کوفر.
(وَإِذَا سُبِيَ زَوْجَانِ أَوْ أَحَدُهُمَا) ئەگەر ژنو مێردێکی کافر وێکڕا گیران، یان تەنها یەکێکیان گیرا (انْفَسَخَ النِّكَاحُ) یەکسەر مارەبڕینەکەیان هەڵدەوەشێتەوە (إِنْ كَانَا حُرَّيْنِ) ئەگەر هەردووکیان ئازاد بن، جیاوازی نیە: جیماعیان کردبێ، یان نا ﴿عن أبسعيدﷺ: أَصَبْنَا سَبَايَا يَوْمَ أَوْطاسٍ لَهُنَّ أَزْوَاجٌ فَتَحَرَّجُوا، فَأَنْزَلَ اللهُ تعالى: (وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ)﴾ رواه مسلم، لە غەزای (أَوْطاس) هەندێك ئافرەتمان دەست کەوتن مێردیان هەبوو، بۆیێ خۆیان لە جیماعکردنیان پاراست، جا خوای گەورە ئەو ئایەتەیڕابردووی نارده خوارەوە، واتە: (ئافرەتانی مارەبڕاو حەڕامن تەنها ئەگەر ببنە کۆیلەی ئێوە، ئەو کاتە حەڵاڵن). (قِيلَ: أَوْ رَقِيقَيْنِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر ژنو مێردەکە کۆیلەش بن، مارەبڕینەکەیان هەڵدەوەشێتەوە.
(وَإِذَا أُرِقَّ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ) هەرکاتێك کافرێکی جەنگی کرایە کۆیلەو لەو حاڵەتیشدا قەرزی کەسێکی لە سەر بوو (لَمْ يَسْقُطْ) قەرزەکەی لە سەر لاناکەوێ، کەوابو: (فَيُقْضَى مِنْ مَالِهِ إِنْ غَنِمَ بَعْدَ إِرْقَاقِهِ) قەرزەکە لە ماڵی کافرەکە دەدرێتەوە، ئەگەر لە دوای کردنە کۆیلەیی

وَلَوْ اِقْتَرَضَ حَرْبِيٌّ مِنْ حَرْبِيٍّ أَوْ اِشْتَرَى مِنْهُ ثُمَّ أَسْ



عَلَيْهِ حَرْبِيٌّ فَأَسْلَمَا فَلاَ ضَمَانَ عَلَيْهِ فِالأَصَحِّ،
غَنِيمَةٌ، وَكَذَا مَا أَخَذَهُ وَاحِدٌ أَوْ جَمْعٌ مِنْ دَارِالْحَرْبِ بِسَرِقَةٍ، أَوْ وُجِدَ كَهَيْئَةِ اللُّقَطَةِ

---

ماڵەکەی گیرابێ، بەڵام ئەگەر پێش کۆیلەیی ماڵەکەی گیرابێ، ئەو کاتە قەرزەکە

لە ماڵەکەی نادرێتەوە بەڵکو لە ئەستۆیدا دەمێنێ.
(وَلَوْ اقْتَرَضَ حَرْبِيٌّ مِنْ حَرْبِيٍّ) ئەگەر کافرێکی جەنگی قەرزێکی لە کافرێکی جەنگی وەرگرتبێ (أَوْ اشْتَرَى مِنْهُ) یان کافرەکە شتێکی بە قەرز لە کافرەکە کڕیبێ (ثُمَّ أَسْلَمَا) ئینجا هەردووکیان، یان تەنها یەکێکیان بووە موسوڵمان (أَوْ قَبِلَا جِزْيَةً) یان سەرانەیان قبوڵ کردو بونە پەیمان لەئەستۆ، لەو حاڵەتانەدا (دَامَ الْحَقُّ) مافی خاوەن مافەکە هەر بەردەوام دەبێو واجبە بیدرێتێ، بەڵام (وَلَوْ أَتْلَفَ عَلَيْهِ حَرْبِيٌّ فَأَسْلَمَا) ئەگەر کافرێکی جەنگی شتێکی کافرێکیجەنگیی فەوتاندبێ، ئینجا هەردووکیان، یان تەنها فەوتێنەرەکە بووە موسوڵمان، ئەو کاتە (فَلَا ضَمَانَ عَلَيْهِ فِيالأَصَحِّ) فەوتێنەرەکە هیچ زامینیی لە سەر نیە، لەفەرموودەی ڕاستتردا.

## ﴿ ماڵی کافرەکان ﴾

**پێشەکی** بزانە: ماڵی هەر موسوڵمانێك بە ڕێگایەکی ناشەرعی بکەوێتە دەست کافرەکان، ماڵەکە نابێتە ملکیکافرەکانو هەر ملکیخاوەنەکەیەتی، کەواتە: هەر کەسێك ئەو ماڵەی بگاتە دەست: بە گرتن، یان بە کڕین، یان بە هەر ڕێگایەکیتر، واجبە: بیداتەوە خاوەنەکەی، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە ﴿عن ابن عمررضالله عنهما: ذَهَبَ فَرَسٌ لَهُ فَأَخَذَهُ الْعَدُوُّ، فَظَهَرَ عَلَيْهِمُ الْمُسْلِمُونَ فَرُدَّ عَلَيْهِ فِي زَمَنِ النَّبِيِّﷺ﴾ رواه البخاری، ئەسپێکی (ابن عمر) ڕۆیشتو دوژمن گرتی، ئینجا موسوڵمانەکان بە سەر دوژمنەکەدا سەرکەوتنو ئەسپەکەیان گرت، جا بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ ئەسپەکەی بۆ گەڕاندراوە.
بەڵام (وَالْمَالُ الْمَأْخُوذُ مِنْ أَهْلِ الْحَرْبِ قَهْرًا) ماڵی کافرەکانی جەنگی کە بە زاڵبوون لێیان ستێندراوە (غَنِيمَةٌ) دەبێتە تاڵان، واتە: دەکرێتە پێنج بەشو بە سەر جەنگاوەرەکانو ئەو جۆرە کەسانەدا بەش دەکرێ: کە لە پێش (کتاب النكاح)دا لە (باسی بەشکردنی تاڵان)دا ڕوون کراونەوە.
(وَكَذَا مَا أَخَذَهُ وَاحِدٌ أَوْ جَمْعٌ مِنْ دَارِ الْحَرْبِ بِسَرِقَةٍ) هەروەها ماڵی کافرەکانی جەنگی کە موسوڵمانێك، یان کۆمەڵە موسوڵمانێك لە (دارالْحَرْب) دەیهێنێ، یان لە (دارالاسلام)دا لە کافرێکی جەنگی دەیستێنێ: بە دزین، یان بە ڕفاندن، ئەویش لە هەردوو حاڵەتدا دەبێتە تاڵانو دەکرێتە پێنج بەش (أَوْ وُجِدَ كَهَيْئَةِ اللُّقَطَةِ) یان لە (دارالْحَرْب)دا وەك شێوەی عَلَى الأَصَحِّ، فَإِنْ أَمْكَنَ كَوْنُهُ لِمُسْلِمٍ وَجَبَ تَعْرِيفُهُ، وَلِلْغَانِمِينَ التَّبَسُّطُ فِي الْغَنِيمَةِ بِأَخْذِ الْقُوتِ وَمَا يَصْلُحُ بِهِ، وَلَحْمٍ وَشَحْمٍ وَكُلِّ طَعَامٍ يُعْتَادُ أَكْلُهُ عُمُومًا، وَعَلَفِ الدَّوَابِّ تِبْنًا وَشَعِيرًا وَنَحْوَهُمَا، وَذَبْحُ مَأْكُولٍ لِلَحْمِهِ،

---

ماڵێکی ونبوو موسوڵمانێك دۆزیبێیەوەو هێنایو گومانیش وەهابوو شتەکە هی

کافرێکیجەنگیيە، ئەویش دەبێتە تالآن (عَلَیالأَصَحِّ) لە سەر فەرموودەی ڕاستتر.
بەڵام لە فەرموودەکەیتردا –کە (امام الحرمين) پشتگیریی کردوە– لە هەردوو مەسەلەدا: ماڵەکە گشتی بۆ ئەو کەسەیە کە هێناویەتی، هەروەك لە (نهایـة)و (مغنی)دا فەرمویانـە، بەڵکو لە فەرموودەیەکی ئیمامی (الشافعی)و لە هەر سێك مەزهەبەکەیتردا: ئەگەر ئەمیری لەشکرەکە–پێش تالآنکردن– بڵێ: **(هەر کەسێك شتێکیکافرەکان بگرێ شتەکە بۆ خۆی)**. ئەو کاتە شتەکە بۆ ئەو کەسەیە کە گرتویەتی، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا فەرموویانە.
(فَإِنْ أَمْكَنَ كَوْنُـهُ لِمُسْلِمٍ) جا ئەگـەر دەگونجا دۆزراوەکـە ملکـی موسـوڵمانێك بـێو لـە (دارالحرب) لێی ون بووبێ، یان کافرەکان لێیان ستاندبێ، ئەو کاتە (وَجَبَ تَعْرِيفُهُ) واجبە ماوەی ساڵێك بانگەوازیی بکا، جا ئەگەر خاوەنەکەی دەست نەکەوت، دەبێتە تالآن، لـە فەرموودەکەیتریشدا: بۆ ئەو کەسەیە کە دۆزیویەتیەوە.
(وَلِلْغَـانِمِينَ اَلتَّبَسُّـطُ فِيالْغَنِيمَـةِ) بـۆ تالآنگرەکـان حەڵاڵـە فراوانـی لـە تالآنەکـەدا بکـەن پێش بەشکردنی: (بِأَخْذِ الْقُوتِ وَمَـا يَصْلُحُ بِـهِ) وەك بردنـی خواردەمـەنیو ئـەو شـتەی خواردەمەنیی پێ ساز دەکرێ: وەکوخوێو ڕوون، هەم (وَلَحْمٍ وَشَحْمٍ وَكُلِّ طَعَامٍ يُعْتَادُ أَكْلُهُ عُمُومًا) گۆشتو بەزو گشت خواردنێکی بە عادەت تێکڕای خـەڵك دەیخوا، هـەم (وَعَلَـفِ الدَّوَابِّ تِبْنًا وَشَعِيرًا وَنَحْوَهُمَا) ئالیکی وولآغەکان وەك کاو جۆ و ئـەو جـۆرە شـتانە، هـەم (وَذَبْحُ مَأْكُولٍ لِلَحْمِهِ) دروستە ئەو ئاژەڵەی گۆشتی بخورێ بـۆ گوشـتەکەی سـەری بـبڕن ﴿عـن ابـن عمـررضـالله عنهما: كُنَّـا نُصِـيبُ فِـي مَغَازِينَـا الْعَسَـلَ وَالْعِنَـبَ فَنَأْكُـلُ وَلاَ نَرْفَعُـهُ﴾ رواه البخاری، ئێمە لە غەزاکانماندا هەنگوینو ترێمان دەگرت، دەمانخواردو نەماندەبردە لای پێغەمبەرﷺ.
جا بزانە: ئەگـەر پێویسـتی بـە جـلو بـەرگ بـوو، دەبـێ ئەمیرەکـە بـە کـرێ بیـداتێ تـا پێویستیەکەی تەواو دەبێ، ئینجا دەیگەڕێنێتەوە ناو تالآنەکە، بەڵام ئەگەر پێویستی بـە چەكو شتی سواری بوو بۆ جەنگکردن، ئەو کاتە بە بێکرێ بە کاری دێنێو ئەگەر فەوتاش تۆڵەی لە سەر نیە، بەڵام ئەگەر نەفەوتا، واجبە: لە دوای نەمانیپێویستیەکە بیگەڕێنێتەوە ناو تالآنەکە، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ڕون کراوەتەوە.
وَالصَّـحِيحُ جَـوَازُ الْفَاكِهَـةِ، وَأَنَّـهُ لاَ تَجِـبُ قِيمَـةُ الْمَـذْبُوحِ، وَأَنَّـهُ لاَ يَخْـتَصُّ الْجَـوَازُ بِمُحْتَاجٍ إِلَى طَعَامٍ وَعَلَفٍ، وَأَنَّهُ لاَ يَجُوزُ ذَلِكَ لِمَنْ لَحِقَ الْجَيْشَ بَعْدَالْحَرْبِ وَالْحِيَازَةِ، وَأَنَّ مَـنْ رَجَـعَ إِلَـى دَارِالْإِسْـلاَمِ وَمَعَـهُ بَقِيَّـةٌ لَزِمَـهُ رَدُّهَـا إِلَـالْمَغْنَمِ، وَمَوْضِـعُ التَّبَسُّـطِ دَارُهُمْ، وَكَذَا مَا لَمْ يَصِلْ عُمْرَانَ الْإِسْلاَمِ فِالأَصَحِّ، وَلِغَانِمٍ رَشِيدٍ وَلَوْ مَحْجُورًا عَلَيْهِ بِفَلَسٍ

اَلإِعْــرَاضُ عَــنِ الْغَنِيمَــةِ قَبْــلَ الْقِسْــمَةِ، وَالأَصَــحُّ جَــوَازُهُ بَعْــدَ فَــرْزِ الْخُمُــسِ، وَجَوَازُهُ لِجَمِيعِهِمْ، وَبُطْلاَنُهُ مِنْ ذَوِيالْقُرْبَى وَسَالِبٍ،

---

(وَالصَّحِيحُ جَوَازُ الْفَاكِهَةِ) بـه فـەرموودەی ڕاست: میـوەش دروسـته بخـۆن، هـەروەك لـه حەدیسەکەدا ڕابرا، هەم (وَأَنَّهُ لاَ تَجِبُ قِيمَةُ الْمَذْبُوحِ) نرخی ئاژەڵه سەربڕاوەکەش واجب نابێ، هەم (وَأَنَّهُ لاَ يَخْتَصُّ الْجَوَازُ بِمُحْتَاجٍ إِلَى طَعَامٍ وَعَلَفٍ) دروستیەکەش تایبەت نیه بەو کەسەی پێویستیی بە خواردەمەنیو ئالیکی وولاغەکەی هەیه، بەڵکو ئەگەر پێویستیشی نەبێ، هەر دروسته ئەو شتانه ببا، بەڵام (وَأَنَّهُ لاَ يَجُوزُ ذَلِكَ لِمَنْ لَحِقَ الْجَيْشَ بَعْدَالْحَرْبِ وَالْحِيَازَةِ) بە فەرموودەی ڕاست: بردنی ئەو شتانەیڕابردوو دروست نیه بۆ ئەو کەسەی له دوای جەنگو گرتنی تالانەکە گەیوەته لەشکرەکە.

هەم (وَأَنَّ مَنْ رَجَعَ إِلَى دَارِالإِسْلاَمِ وَمَعَهُ بَقِيَّةٌ) هەرکەسێك گەڕاوه بۆ (دارالاسلام)و هەندێکی لەو شتانەیڕابردووی پێمابو (لَزِمَهُ رَدُّهَا إِلَىالْمَغْنَمِ) واجبه بیگەڕێنێتەوە شوێنی تالانەکە، چونکه پێویستیی نەماوە، هەم (وَمَوْضِعُ التَّبَسُّطِ دَارُهُمْ) شوێنی حەڵاڵیی ئەو فراوانیەش، وولاتو خانەی کافرەکانه (وَكَذَا مَا لَمْ يَصِلْ عُمْرَانَ الإِسْلاَمِ) هـەروەها لـه گەڕانەوەشدا حەڵاڵه تا نەگەیوەتەوە ئاوەدانیەکانی ئیسلام (فِيالأَصَحِّ) له فەرموودەی ڕاستردا، واته: هەر کاتێك گەیشتەوە ئاوەدانیەکانی ئیسلام هیچیتر فراوانیەکه حەڵاڵ نیه.

(وَلِغَانِمٍ رَشِيدٍ) ئەو غەزاکەرەی مافی له تالانەکەدا هەیەو بالغو عاقڵەو بـۆ دیـنو دونیـای خۆیشی دەگونجێ (وَلَوْ مَحْجُورًا عَلَيْهِ بِفَلَسٍ) هەرچەند بە هۆی قـەرزداریش قەدەغـەی لـه سەر داندرابێ، بۆی دروسته: (اَلإِعْرَاضُ عَنِ الْغَنِيمَةِ قَبْلَ الْقِسْمَةِ) واز لـه بەشـه تالانەکـەی خۆی بێنێ پێش بەشکردنی تالانەکە، وەك بڵێ: (وازم له مافیخۆم هێنا لەو تالانه).

(وَالأَصَحُّ جَوَازُهُ بَعْدَ فَرْزِ الْخُمُسِ) بە فەرموودەی ڕاستتر دروسته: واز له تالانەکه بێنێ له دوای جیاکردنـەوەی پێنجێکەکەشـی، بـەڵام لـه دوای بەشـکردن، یـان هەڵبـژاردنی بـه مڵککردنی تالانەکه واز لێهێنانەکه دروست نابێ (وَ) هەر بە فـەرموودەی ڕاسـتتر (جَـوَازُهُ لِجَمِيعِهِمْ) بۆ هەموو خاوەن مافەکان–بە گشتیـ– دروسته: واز له مافیخۆیان بێنن.

(وَ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (بُطْلاَنُهُ مِنْ ذَوِيالْقُرْبَى) ئەو وازلێهێنانه له لایـەن خزمـەکانی پێغەمبەرەوەﷺ بەتاڵەو دروست نابێ، هەم (وَسَالِبٍ) لەو کەسـەوەش دروسـت نابـێ: کـه مافی کەلوپەلی کافرەکوژراوەکەی خۆی هەیه.

وَالْمُعْرِضُ كَمَنْ لَمْ يَحْضُرْ، وَمَنْ مَاتَ فَحَقُّهُ لِوَارِثِهِ، وَلاَ تُمْلَكُ إِلاَّ بِقِسْمَةٍ، وَلَهُمُ التَّمَلُّكُ، وَقِيـلَ يَمْلِكُـونَ، وَقِيـلَ إِنْ سُـلِّمَتْ إِلَىالْقِسْـمَةِ بَـانَ مِلْكُهُـمْ، وَإِلاَّ فَـلاَ، وَيُمْلَـكُ الْعَقَـارُ بِالإِسْتِيلاَءِ كَـالْمَنْقُولِ، وَلَـوْ كَـانَ فِيهَـا كَلْـبٌ أَوْ كِـلاَبٌ تَنْفَـعُ وَأَرَادَهُ بَعْضُـهُمْ وَلَـمْ يُنَـازَعْ أُعْطِيَـهُ، وَإِلاَّ قُسِّـمَتْ إِنْ أَمْكَـنَ، وَإِلاَّ أُقْرِعَ،

(وَالْمُعْرِضُ كَمَنْ لَمْ يَحْضُرْ) ئەوەی وازی لە مافیخۆی هێناوە، وەك ئەو كەسەیە كە ئامادە نەبوبێ، واتە: بەشەكەی وی دەخسترێتەوە گەڵ تالانەكەو بەش دەكرێ بە سەر غەزاكەرەكانیتِرداو بە سەر ئەو كەسانەی پێنجێكی تالانیان دەدرێتێ.

بەڵام ئەگەر هەموو خاوەن مافەكان –بە گشتی– وازیان لە تالانەكە هێنا، ئەو كاتە مافی هەموانیان دەدرێتە ئەوانەی پێنجێكی تالانەكەیان دەدرێتێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَمَنْ مَاتَ) هەر غەزاكەرێك وازی لە مافیخۆی نەهێنابێو مردبێ، ئەوە (فَحَقُّهُ لِوَارِثِهِ) مافەكەی بە میرات بۆ میراتگرەكەیەتی: دەتوانێ داوای بكاو دەشتوانێ وازی لێبێنێ.

(وَلاَ تُمْلَكُ إلاَّ بِقِسْمَةٍ) تالان نابێتە ملكی هیچ خاوەن مافێك تەنها بە بەشكردن دەبێتێ، بەڵام (وَلَهُمْ التَّمَلُّكُ) بۆ خاوەن مافەكان دروستە: پێش بەشكردن بیكەنە ملكی خۆیان، وەك هەر یەكەیان بڵێ: بەشیخۆم لەم تالانە هەڵبژارد كردمە ملكیخۆم.

(وَقِيلَ يَمْلِكُونَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بە خودی كۆكردنەوەی تالان دەبنە خاوەنی تالانەكە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (إنْ سُلِّمَتْ إلَىالْقِسْمَةِ) ئەگەر تالانەكە تەسلیمی بەشكردن كرابێ، ئەوە (بَانَ مِلْكُهُمْ) ئاشكرا دەبێ: بووەتە ملكی هەموویان (وَإِلاَّ فَلاَ) بەڵام ئەگەر تەسلیمی بەشكردن نەكرابێ، ئەو كاتە نەبووەتە ملك.

(وَيُمْلَكُ الْعَقَارُ بِالإِسْتِيلاَءِ) باغو زەمینو خانووش دەبێتە ملكی خاوەن مافەكان: بە دەست بەسەرداگرتنو بەشكردن (كَالْمَنْقُولِ) وەكو ماڵی گواستراوەیە، بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)دا: پێشەوای موسوڵمانان سەرپشكە: یان زەویو باغو خانووەكان بەش دەكا– وەكو ماڵی گواستراوە–، یان وەقفی دەكاتە سەر موسوڵمانان، یان دەیداتەوە كافرەكان، هەروەك لە (حاشية عميرة)و (مجمع الانهر)دا فەرمویانە.

(وَلَوْ كَانَ فِيهَا كَلْبٌ أَوْ كِلاَبٌ تَنْفَعُ) ئەگەر لە تالانەكەدا سەگێك، یان چەند سەگێكی بە سود هەبوو (وَأَرَادَهُ بَعْضُهُمْ وَلَمْ يُنَازَعْ) هەندێك لە خاوەن مافەكان داوای كردو كەسیش كێشەی لەگەڵ نەكرد، ئەوە (أُعْطِيَهُ) سەگەكەی دەدرێتێ.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر كەسێكیتریش سەگەكانی ویستن، ئەو كاتە (قُسِّمَتْ إنْ أَمْكَنَ) سەگەكان بەش دەكرێن ئەگەر بگونجێ (وَإِلاَّ أُقْرِعَ) بەڵام ئەگەر بەشكردنەكەیان نەگونجا، ئەو كاتە پشكە لە نێوان داواكەرەكاندا دەكرێ: بۆ كامەیان دەرچو، دەیدرێتێ.

وَالصَّحِيحُ أَنْ سَوَادَ الْعِرَاقِ فُتِحَ عَنْوَةً وَقُسِّمَ ثُمَّ بَذَلُوهُ وَوُقِفَ عَلَىالْمُسْلِمِينَ، وَخَرَاجُهُ أُجْرَةٌ تُؤَدَّى كُلَّ سَنَةٍ لِمَصَالِحِ الْمُسْلِمِينَ، وَهُوَ مِنْ عَبَّادَانَ إلَى حَدِيثَةِ الْمَوْصِلِ طُولاً، وَمِن الْقَادِسِيَّةِ إلَى حُلْوَانَ عَرْضًا، قُلْتُ: اَلصَّحِيحُ أَنَّ الْبَصْرَةَ وَإِنْ كَانَتْ دَاخِلَةً فِي حَدِّ السَّوَادِ فَلَيْسَ لَهَا حُكْمُهُ إلاَّ فِي مَوْضِعِ غَرْبِيِّ دِجْلَتِهَا وَمَوْضِعِ شَرْقِيِّهَا،

(وَالصَّحِيحُ) به فـەرموودەی ڕاسـت: (أَنْ سَوَادَ الْعِـرَاقِ فُـتِحَ عَنْـوَةً) شـارەكانو دێیـەكانی سەوزایی‌عێراق لە سـەردەمی ئیمـامی(عمرﷺ) بـە هێـزی چـەك ئـازاد كـراوە لـە دەسـتی كافرەكانو (وَقُسِّمَ) لە نێوان غەزاكەرەكاندا بەش كرا (ثُـمَّ بَـذَلُوهُ) ئینجا هـەر كەسـەیان بەشی خۆی داوە ئیمامی(عمر)ﷺ (وَوُقِفَ عَلَىالْمُسْلِمِينَ) ئینجا لە لایـەن ئیمـامی(عمر)– گشت سەوزاییەكە بە خاكەوە– وە قف كرا بۆ سەر موسوڵمانان؟ نەوەك غەزاكەرەكان بە كشتوكاڵەوە خەریك ببنو (جهاد) لەكار بكەوێ.

(وَخَرَاجُهُ أُجْرَةٌ) ئەو خەرجیەی لـە سـەوزایی عێـراق وەردەگـیرێ گشـتی كرێیەكەیـەتیو (تُؤَدَّى كُلَّ سَنَةٍ لِمَصَالِحِ الْمُسْلِمِينَ) هەموو سـاڵێك ئـەو كرێیـە دەدرێو بـۆ بەرژەوەنـدی موسـوڵمانان سـەرف دەكـرێ، واتـە: گشـت سـەوزایی عێـراق بـە خاكـەوە وەقفكـراوی ئیمامی(عمر)ەﷺ، بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: خاكی(سوادالعراق)=سەوزایی‌عێراق مڵكـی خاوەنەكانیـەتیو دروسـتە: فرۆشـتنو گشـت دەسـتكاریەكی بكـەن، هـەروەك لـە (الهداية)و (مجمع الانهر)دا فەرموویانە.

(وَهُوَ) سنوری سەوزایی‌عێراق: (مِنْ عَبَّادَانَ إِلَى حَدِيثَةِالْمَوْصِلِ) لە سەرەتای (عەببادان)ی نزیك (بەسرە)وە تا كۆتایی (حدیثة)ی لای (موسل)ە، جا ئەمە (طُولاً) درێژیەكەیەتی، هەم (وَمِنَ الْقَادِسِيَّةِ إِلَى حُلْوَانَ) لـە سـەرەتای (قادسـیە)ی نزیـك (كوفـە)وە تـا كۆتـایی دێی (حلوان)ی نزیك چیای بێستون، (عَرْضاً) ئەمەش پانیەكەیەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئـەو سـنورەی (سـوادالعراق) ئـەم شوێنانەی‌كوردسـتانیش دەگرێتـەوە: (كـەركوك، هـەولێر، شـارەزور، شـاربازێر، پـاوە، سـیوەیل، داودان، دەڕەن، عـەدان). هەروەك (الوضوح شرح المحرر)دا فەرموویەتی.

واتە: چونكە كوردستان لـە سـەرەدەمی ئیمـامی (عمـرﷺ) لـە سـاڵی هـەژدەی كۆچـیدا –بە تەواوی– لە ژێر دەستی كافرەكانی ڕۆم و فارس ئازاد كراوە.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (اَلصَّحِيحُ) بە فەرموودەی ڕاست: (أَنَّ الْبَصْرَةَ وَإِنْ كَانَتْ دَاخِلَةً فِی حَدِّالسَّوَادِ) شاری(بەسرە)، هەرچەند دەكەوێتە ناو سنوری سەوزایی‌عێراق (فَلَيْسَ لَهَا حُكْمُهُ) بەڵام بڕیاری سـەوزاییەكەی بـۆ نـادرێ (إِلاَّ فِـی مَوْضِـعِ غَرْبِيِّ دِجْلَتِهَـا وَمَوْضِـعِ شَرْقِيِّهَا) تەنها لە شوێنێكی ڕۆژئـاوای ڕووبـاری (دجلـە)و شـوێنێكی ڕۆژهەڵاتەكـەی نـەبێ.

وَأَنَّ مَـا فِالسَّوَادِ مِـنَ الـدُّورِ وَالْمَسَـاكِنِ يَجُـوزُ بَيْعُـهُ وَاللهُ أَعْلَـمُ.
وَفُتِحَـتْ مَكَّـةُ صُـلْحًا، فَـدُورُهَا وَأَرْضُـهَا الْمُحْيَـاةُ مِلْـكٌ يُبَـاعُ.
(فَصْل) يَصِحُّ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ مُكَلَّفٍ مُخْتَارٍ أَمَانُ حَرْبِيٍّ وَعَدَدٍ مَحْصُورٍ فَقَطْ، وَلاَ يَصِحُّ أَمَانُ أَسِيرٍ لِمَنْ هُوَ مَعَهُمْ فِالأَصَحِّ، وَيَصِحُّ بِكُلِّ لَفْظٍ يُفِيدُ مَقْصُودَهُ وَبِكِتَابَةٍ وَرِسَالَةٍ،

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاست (أَنَّ مَا فِيالسَّوَادِ مِن الدُّورِ وَالْمَسَاكِنِ) ئەو خانووبەرەی لە ناو سەوزایی عێراقدایە (يَجُوزُ بَيْعُهُ) دروستە بفرۆشرێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە خانوو بەرەکە وەقف نەکراوە (وَفُتِحَتْ مَكَّةُ صُلْحًا) شاری (مكة)ی پیرۆز بە پێکهاتن ئازاد کراوە–نەك بە جەنگ– کەوابو: (فَدُورُهَا وَأَرْضُهَا الْمُحْيَاةُ مِلْكٌ) خانووەکانی (مكة)و زەویە زیندوکراوەکانیشی ملکی خاوەنەکانیەتی (يُبَاعُ) دروستە بفرۆشرێ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (أَمَانُ الْكُفَّارِ) دڵنیاکردنی کافرەکان ﴾

واتە: موسوڵمانێك پاراستنی کافرێك، یان زیاتر بخاتە ئەستۆی خۆیو پەیمانی بداتێ: کە هیچ موسوڵمانێك زیانی لێنەدا، ئینجا بەم دڵنیاکردنە پاراستنی واجب دەبێو دروست نیە هیچ موسوڵمانێك زیانی لێبدا، جا بەم جۆرەکافرە دەگوترێ: (مُسْتَأْمَن)=دڵنیاکراو، ئیتر جیاوازی نیە دڵنیاکەرەکە، یان دڵنیاکراوەکە: پیاو بێ، یان ئافرەت، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ذِمَّةُالْمُسْلِمِينَ واحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِماً فِي ذِمَّتِهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُاللهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ رواه الشيخان، پەیمانی موسوڵمانان هەر یەکە، بێ هێزترینی موسوڵمانان دەتوانێ پەیمانی پاراستن بدا، جا هەر کەسێك پەیمانی موسوڵمانێك بشکێنێو لای ببا، لەعنەتی خوداو مەلائیکەو تێکرای خەڵی لە سەر بێ.

(يَصِحُّ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ مُكَلَّفٍ مُخْتَارٍ) لە لایەن گشت موسوڵمانێکی بالغو عاقڵ بە خۆشی خۆی دروست دەبێ: (أَمَانُ حَرْبِيٍّ) کافرێکی جەنگی دڵنیا بکا، هەم (وَعَدَدٍ مَحْصُورٍ فَقَطْ) تەنها ژمارەیەکی سەرژمێرکراویش دڵنیا بکا: وەك دانیشتووانی گوندێکی بچوك، نەك سەرژمێرنەکراو، چونکە دڵنیاکردنی ژمارەیەکی زۆری سەرژمێرنەکراو پێی دەگوترێ: (اَلْهُدْنة)و تایبەتە بە پێشەوای موسوڵمانان، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانەو لە مەودوا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(وَلاَ يَصِحُّ أَمَانُ أَسِيرٍ لِمَنْ هُوَ مَعَهُمْ) دروست نیە موسوڵمانێکی بە دیلگیراو ئەو کافرانە دڵنیا بکا کە گرتویانە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە کافرەکان زاڵنو ئەویش وەك زۆرلێکراوە، کەوابو: دروست نیە کافرەکانیتریش دڵنیا بکا.

(وَيَصِحُّ) دڵنیاکردن دروست دەبێ: (بِكُلِّ لَفْظٍ يُفِيدُ مَقْصُودَهُ) بە گشت ووشەیەك کە مەبستی دڵنیاکردن بدا: وەك تۆم پاراست، دڵنیام کردی، هیچ ترست نەبێ. (وَبِكِتَابَةٍ وَرِسَالَةٍ) بە نووسینو بە ناردنی کەسێکیش دڵنیاکردن دروست دەبێ.

وَيُشْتَرَطُ عِلْمُ الْكَافِرِ بِالأَمَانِ، فَإِنْ رَدَّهُ بَطَلَ، وَكَذَا إنْ لَمْ يَقْبَلْ فِالأَصَحِّ، وَتَكْفِي إشَارَةٌ مُفْهِمَةٌ لِلْقَبُولِ، وَيَجِبُ أَنْ لاَ تَزِيدَ مُدَّتُهُ عَلَى أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ، وَفِي قَوْلٍ يَجُوزُ مَا لَمْ تَبْلُغْ سَنَةً، وَلاَ يَجُوزُ أَمَانٌ يَضُرُّ الْمُسْلِمِينَ كَجَاسُوسٍ، وَلَيْسَ لِلإِمَامِ نَبْذُ الأَمَانِ إنْ لَمْ يَخَفْ خِيَانَةً، وَلاَ يَدْخُلُ فِالأَمَانِ مَالُهُ وَأَهْلُهُ بِدَارِالْحَرْبِ، وَكَذَا مَا مَعَه مِنْهُمَا

(وَيُشْتَرَطُ عِلْمُ الْكَافِرِ بِالأَمَانِ) بۆ دروستبوونی دڵنیاکردن بە مەرج دادەندرێ: کافرەکەش بە دڵنیاکردنەکە بزانێ (فَإِنْ رَدَّهُ) جا ئەگەر کافرەکە دڵنیاکردنەکەی ڕەد کردەوەو گوتی: دڵنیابوونم ناوێ (بَطَلَ) ئەو کاتە دڵنیاکردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە (وَكَذَا إِنْ لَمْ يَقْبَلْ) هەروەها ئەگەر قبوڵیشی نەکردبێ، هەر بەتاڵ دەبێتەوە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام لـە فەرموودەکـەیتردا: بێدەنگبوونیکافرەکـە بەسـەو دڵنیاکردنەکـەی دروسـت دەبـێ، هەرچەند بە زوبانیش قبوڵ نەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَكْفِي إِشَارَةٌ مُفْهِمَةٌ لِلْقَبُولِ) ئاماژەیەکیتێگەیێنەر بۆ قبوڵکردن بەسە: وەك واز لە جەنگ بێنێ (وَيَجِبُ أَنْ لاَ تَزِيدَ مُدَّتُهُ عَلَى أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ) واجبە: ماوەی دڵنیاکردنەکە لە چوار مانگ زیاتر نەبێ، چونکە خوایگەورە—لە بـارەی کافرەکـان— دەفـەرموێ: ﴿فَسِيحُوا فِىالأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ﴾ تا ماوەی چوار مانگ لە زەویدا بگەڕێن. (وَفِي قَوْلٍ: يَجُوزُ مَا لَمْ تَبْلُغْ سَنَةً) لە فەرموودەیەکدا: لە چوار مانگ زیاتریش دروستە بەو مەرجەی نەگاتە ساڵێك.

(وَلاَ يَجُوزُ أَمَانٌ يَضُرُّ الْمُسْلِمِينَ) هەر دڵنیاکردنێك زیان بگەیێنێتە موسوڵمان دروسـت نیـەو جێبەجێ ناکرێ: (كَجَاسُوسٍ) وەکـو دڵنیـاکردنی جاسوسـێك، یـان ئـەو کەسـەی چـەكو یارمەتیەکانیتر بۆ کافرەکان دەنێرێ، یـان هـەر جـۆرە کـافرێکیتری زیانـدەر، کەواتـە: دروستە ئەو جۆرە کافرانە بە پەنهانی بکوژرێن، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، واتە: بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو لە (باسی جاسوس)دا.

(وَلَـيْسَ لِلإِمَـامِ نَبْـذُ الأَمَـانِ) بـۆ پێشـەوای موسـوڵمانانو بـەرەوخوارتریش دروسـت نیـە: دڵنیاکردن هەڵبوەشێنێتەوە (إِنْ لَمْ يَخَفْ خِيَانَةً) ئەگەر لە خیانەتی کافرەکە نەترسێ، واتە: ئەگـەر لـە خیانەتەکەیترسـا، ئـەو کاتــە هەڵیدەوەشـێنێتەوە، بـەڵام واجبـە: کافرەکـە بگەیەندرێتەوە شوێنێکی ئەمینی (دارالْكفر)، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ﴾ ئەگـەر لـە خیانـەتی کـەلێکی پـەیمان لەگـەڵکراو ترسـای، پەیمانەکەیان بۆ تێهەڵدەوە، تا ئێوەو ئەوان بە یەکسانی بزانن پەیمانتان لە نێواندا نەماوە.

(وَ) هەرکاتێك کافرێك دڵنیا کرا (لاَ يَدْخُلُ فِىالأَمَانِ مَالُهُ وَأَهْلُـهُ بِـدَارِالْحَرْبِ) ناچـێتە گـەڵ دڵنیاکردنەکە ماڵو ژنو منداڵەکانی کە لە (دارالحرب)ن، کەواتە: هەر کاتێك ئەوانە گیران دەبنە تاڵان (وَكَذَا مَا مَعَهُ مِنْهُمَا) هەروەها ئەو ماڵو ژنو منداڵانەی لەگەڵیشیدانە، ناچنە فِي الأَصَحِّ إِلاَّ بِشَرْطٍ، وَالْمُسْلِمُ بِدَارِالْحَرْبِ إِنْ أَمْكَنَهُ إِظْهَارُ دِينِهِ اُسْتُحِبَّ لَهُ الْهِجْرَةُ،

---

گەڵ دڵنیاکردنەکەی (فِي الأَصَحِّ) لەفـەرموودەی ڕاسـتتردا (إِلاَّ بِشَـرْطٍ) تـەنها ئەگـەر لـە دڵنیاکردنەکەدا بە مەرج داندرابێ ئەو کاتە ئەوانیش دەچنە گەڵ دڵنیاکردنی کافرەکە، جا ئەگەر دڵنیاکردنیکافرەکەش هەڵبوەشێتەوە، دڵنیـاکردنی ژنو منداڵـەکانی—کـە لـە لای ئێمەنە— هەڵناوەشێتەوە تا زیندوو بێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

## ﴿ کۆچکردن له (دارالْکُفر) بۆ (دارالإِسْلاَم) ﴾

1-(دارُالإِسْلام)=خانەی ئیسلام: ئەو شوێنەیە لە دوای هاتنی ئایینیئیسلام لە کاتێکدا دەسەڵاتی ئیسلامی بە سەردا بوبێ، هەر چەند هیچ موسوڵمانێکیشی تێدا نیشتەجێ نەبوبێ: وەك دانیشتووانی شوێنەکە سەرانەیان دابێ، یان لە مەودوا کافرەکان داگیریان کردبێتەوەو ئایینیئیسلامیان تێدا قەدەغە کردبێ: وەکو (أَنْدَلُس)و (بُلْغاریا)و چەند شوێنێکیتر، واتە: هەر شوێنێك لە کاتێکدا بڕیاری (دارُالإِسْلاَم)ی بۆ درابێ، بە هیچ جۆرێك شوێنەکە نابێتەوە (دارُالْکُفْر)، هەر چەند یەك موسوڵمانیشی تێدا نەمابێ، هەروەك لە (تحفة)دا لێرەو لە (باسی منداڵی فڕێدراو)دا ڕوون کراوەتەوە.

کەواتە: ئەگەر دانیشتووانی شوێنێك بە تێکڕایی لە ئیسلام پاشگەز بونەوە، ئەو کاتەش شوێنەکە نابێتەوە (دارالْکُفْر)، بەڵکو بە (دارُالرِّدَّة)=خانەی پاشگەزبوونەوە ناو دەبرێ، کەوابو: نە بڕیاری (دارُالإِسْلام)و نە بڕیاری (دارُالْکُفْر)ی بۆ نادرێ، چونکە بە هیچ جۆرێك دروست نیە پێکهاتنی (اَلْهُدْنَة)=جەنگ وەستاندن لەگەڵ پاشگەزبووەکاندا مۆر بکرێ، هەم ماڵو منداڵەکانیشیان بەو ڕوونکردنەوەیەی لە پێشەکیی (باسی دیلەکان)دا ڕابرا ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێ، هەروەك ئیمامی(الماوردي) لە (الأحکام السلطانية)دا ڕوونی کردۆتەوە.

2-(دارُالْکُفر)=(دارُالْحَرْب)=خانەی کوفر: ئەو شوێنەیە کافرەکانی بنچینەیی تێدا نیشتەجێ بنو هیچ کاتێکیش دەسەڵاتی ئیسلامی بە سەردا نەبوبێ.

ئینجا دانیشتووانی (دارُالْکُفْر) ئەگەر لە حاڵەتی جەنگدا بن، پێیان دەگوترێ: (حَرْبِيٌّ)=کافریجەنگی. وە ئەگەر لە حاڵەتی جەنگ وەستاندا بن، پێیان دەگوترێ: (مُعَاهَد)=پەیمان لەگەڵکراو. هەروەك لە باسی (اَلْهُدْنَة)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(وَالْمُسْلِمُ بِدَارِالْحَرْبِ) ئەو موسوڵمانەی لە (دارُالْکُفر)دا نیشتەجێیە، یان لەو (دارُ الإِسْلاَم)ی کافرەکان داگیریان کردۆتەوە (إنْ أَمْکَنَهُ إِظْهَارُ دِينِهِ) ئەگەر بۆی گونجا ئایینی خۆی ئاشکرا بکاو دەرهەق ئایینەکەشی لە هیچ فیتنەیەك نەترسا، ئەوە (اُسْتُحِبَّ لَهُ الْهِجْرَةُ) بۆی سوننەتە کۆچ بکا بۆ (دارُالإِسْلاَم)، نەوەك کۆمەڵی کافرەکان زۆر بکا، بەڵام ئەگەر ئومێدی هەبوو: بە مانەوەی وی ئایینی ئیسلام لەو شوێنەدا ئاشکرا ببێ، ئەو کاتە مانەوەی لەوێ خێرترە، بەڵکو ئەگەر دەیتوانی خوی بپارێزێو بە کۆچکردنەکەشی

وَإِلاَّ وَجَبَتْ إِنْ أَطَاقَهَا، وَلَوْ قَدَرَ أَسِيرٌ عَلَى هَرَبٍ لَزِمَهُ، وَلَوْ أَطْلَقُوهُ بِلاَ شَرْطٍ

---

ئومێدی یارمەتیدانی موسوڵمانانی نەبو، ئەو کاتە واجبە لە وێ بمێنێتەوە، ئینجا ئەگەر لە (دارُالْکُفْر)دا توانای جەنگکردنو بانگەوازی ئیسلامی هەبوو، ئەو کاتە ئەو دووانەش واجبن، ئەگەر نا: نا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نەیدەتوانی ئایینی خۆی ئاشکرا بکا، یان لە فیتنەی ئایینی دەترسا،

ئەو كاتە (وَجَبَتْ إِنْ أَطَاقَهَا) واجبە كۆچ بكا بۆ (دارالاسلام) ئەگەر تواناى هەبێ، هەر چەند موسوڵمانەكە ئافرەتیش بێ، واتە: ئەگەر لە (دارُالكُفْر) بمێنێتـەوە گوناهبـار دەبـێ، بـە بەڵگـەى ئایەتەكـەى ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ﴾ى‌رابـردوو لـە كۆتـایى (چەكى كۆمەڵكوژ)دا، هەم پێغەمبەرﷺفەرموویـەتى: ﴿أَنَا بَرِىءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِالْمُشْرِكِينَ﴾ رواه أبوداود وغيره بإسناد صحيح، من بەریمە لە هەر موسوڵمانێكى لە ناو كافرەكاندا نیشتەجێ دەبێ.

جا بزانە: ئەگەر مانەوەى لە (دارُ الكفر)دا بەرژەوەندى موسوڵمانانى تێدا بوو، ئەو كاتە دروستە لە وێ بمێنێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

﴿ **ئاگادارى** ﴾: هەر بە بەڵگـەى ئـەو ئایـەتو حەدیسـە: بـە هـیچ جۆرێـك كۆچـكردن لـە (دارالاسـلام) بـۆ (دارالكفـر) دروسـت نیـەو لـە ڕێگەشـدا كورتكردنـەوەو كۆكردنـەوەى نوێژەكانو شكاندنى ڕۆژووى ڕەمەزانى بۆ دروست نیە، چونكە لەم مەسەلەیەدا (دارالكفر) وولاتى خۆى نیە، بەڵكو ئەگەر لە شوێنێكى (دارالاسلام)دا ئاشكراكردنى ڕاستیى لێقبوڵ نەدەكراو نەیدەتوانى هەقو ڕاستى ئاشكرا بكا، یان گوناهـەكان بـە ئاشـكرایى دەكـرانو نەیدەتوانى قەدەغەیان بكا، ئەو كاتەش واجبە: كۆچ بكا لـەو شـوێنە بـۆ شـوێنێكى‌ترى باشترى (دارالاسلام)، چونكە خواى گەورە دەفـەرموێ: ﴿فَلا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ لە دواى هاتنەوە بیرت لەگەڵ گەلە ستەمكارەكان دامەنیشە. بەڵام ئەگەر گشت شوێنەكانى (دارالاسلام) لە تاوانو ناهەقىدا یەكسان بونـ-وەك سەردەمى ئێستامانـ- ئەو كاتە كۆچكردن واجب نیە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا ڕوون كراوەتەوە.

جا بزانە: كـە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتى: ﴿لاَهِجْرَةَ بَعْدَالْفَتْحِ﴾ رواه الشـيخان، لـە دواى ڕزگاركردنى (مكة) كۆچكردن واجب نیە. مەبەست : كۆچكردن لە (مكة)وە بۆ شوێنێكى‌تر واجب نیە، لە بەر ئەوەى (مكة) بووەتە (دارالاسلام)، چونكە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتى: ﴿لاَ تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ مَا قُوتِلَ الْعَدُوُّ﴾ رواه النسـائی وصـححه‌ابن حبـان، تـا جـەنگ لـە دژى دوژمنانى ئایین هەبێ كۆچكردن نابڕێتەوە.

(وَلَوْ قَدَرَ أَسِيرٌ عَلَى هَرَبٍ) ئەگەر دیلێكى موسوڵمان تواناى هەڵاتنى هـەبو (لَزِمَـهُ) واجبـە هەڵبێ‌و خۆى ڕزگار بكا (وَلَوْ أَطْلَقُوهُ بِلاَ شَـرْطٍ) ئەگـەر كافرەكـان دیلەكـەیان ئـازاد كـرد فَلَـهُ اِغْتِيَـالُهُمْ، أَوْ عَلَـى أَنَّهُـمْ فِـي أَمَانِـهِ حَـرُمَ، فَـإِنْ تَبِعَـهُ قَـوْمٌ فَلْيَـدْفَعْهُمْ وَلَـوْ بِقَتْلِهِمْ، أَوْ شَرَطُوا أَنْ لاَ يَخْرُجَ مِنْ دَارِهِمْ لَمْ يَجُزِ الْوَفَاءُ، وَلَوْ عَاقَدَ الإمَامُ عِلْجًا يَدُلُّ عَلَى قَلْعَةٍ وَلَهُ مِنْهَا جَارِيَةٌ جَازَ فَإِنْ فُتِحَتْ بِدَلاَلَتِهِ أُعْطِيهَا، أَوْ بِغَيْرِهَا فَلاَ فِالأَصَحِّ، فَإِنْ لَمْ تُفْتَحْ فَلاَ شَيْءَ لَهُ، وَقِيلَ إِنْ لَمْ يُعَلَّقِ الْجُعْلُ بِالْفَتْحِ فَلَهُ أُجْرَةُ مِثْلٍ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا جَارِيَةٌ أَوْ مَاتَتْ قَبْلَ الْعَقْدِ فَلاَ شَيْءَ، أَوْ بَعْدَ الظَّفَرِ قَبْلَ التَّسْلِيمِ وَجَبَ بَدَلٌ، أَوْ قَبْلَ ظَفَرٍ فَلاَ فِي

بێهیچ مەرجێك، ئەو كاتە (فَلَهُ اغْتِيَالُهُمْ) بۆ دیلەكە دروستە: ئـەو كافرانـە بكـوژێو مـاڵ منداڵیشیان بگرێ، چونكە پەیمانی دڵنیاییان لەگەڵ نەكردوە (أَوْ عَلَى أَنَّهُمْ فِي أَمَانِهِ) بەڵام ئەگەر بەو مەرجە ئازادیان كرد: كە ئەوان لە دڵنیایی ئەودا بن، ئەو كاتە (حَـرُمَ) حەرامـە بیانكوژێ، چونكە واجبە: مەرجەكەی بگەیێنێتە جێ.

(فَإِنْ تَبِعَهُ قَوْمٌ) جا ئەگەر لە دوای دەرچوونی دیلەكە كۆمەڵێكی كافرەكان بەدوایدا چون (فَلْيَدْفَعْهُمْ) واجبـە: بـەرگری بكـاو بیانگەڕێنێتـەوە (وَلَـوْ بِقَـتْلِهِمْ) هەرچـەند بـە كوشـتنی كافرەكانیش بێ (أَوْ شَرَطُوا أَنْ لاَ يَخْرُجَ مِنْ دَارِهِمْ) ئەگەر بەو مەرجە دیلەكەیان ئازاد كرد: كە لە (دارالكفر) نەچێتە دەروە، ئـەو كاتـە (لَـمْ يَجُـزِ الْوَفَـاءُ) دروسـت نیـە مەرجەكـەی بگەیێنێتە جێ، بەڵكو هەر كاتێك بۆی گونجا واجبە: بگەڕێتەوە بۆ (دارالاسلام).

(وَلَوْ عَاقَدَ الإِمَامُ عِلْجًا) ئەگەر پێشەوا، یان جێگرەكەی مامڵەتێكی بەست لەگەڵ كافرێكی پاڵەوان: كە (يَدُلُّ عَلَى قَلْعَةٍ) كافرەكە شارەزای بكا بۆ قەڵایەك، یان ڕێگەیـەك، یـان هـەر شوێنێكیتر (وَلَهُ مِنْهَا جَارِيَةٌ) كافرەكەش لەو شوێنە (جارية)كی بدرێتێ (جَازَ) ئەو مامڵەتە دروستە، كەوابو: (فَإِنْ فُتِحَتْ بِدَلاَلَتِهِ) ئەگەر شوێنەكە بە هۆی شارەزاكردنی كافرەكە ئازاد كـرا، ئـەو كاتـە (أُعْطِيَهَـا) واجبـە (جاريـة)كـەی بـدرێتێ (أَوْ بِغَيْرِهَـا) بـەڵام ئەگـەر بـە ڕێگایەكیتری–جگە لە شارەزاكردنەكە– شوێنەكە ئازاد كرا، ئـەو كاتـە (فَـلاَ فِيالأَصَـحِّ) كافرەكە هیچ مافێكی نیە، لە فەرموودەی ڕاستتردا (فَإِنْ لَمْ تُفْتَحْ) جا ئەگەر شوێنەكە ئازاد نەكرا، ئەو كاتەش (فَلاَ شَيْءَ لَهُ) كافرەكە مافی هیچ شتێكی نیە (وَقِيلَ: إِنْ لَمْ يُعَلِّقِ الْجُعْلُ بِالْفَتْحِ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: ئەگەر كرێیەكەی بە ئازادكردنەوە هەڵنەواسرابێ، ئەو كاتە (فَلَهُ أُجْرَةُ مِثْلٍ) كافرەكە مافی كرێی هاووێنەی هەیە.

(فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا جَارِيَةٌ)جا ئەگەر شوێنەكە ئازاد كرا، بەڵام هیچ (جارية)كی تێدا نەبو (أَوْ مَاتَتْ قَبْلَ الْعَقْدِ) یان (جارية)كە پێش مامڵەت بەستنەكە مردبو، ئەو كاتەش (فَـلاَ شَـيْءَ) كافرەكە مافی هیچ شتێكی نیە (أَوْ بَعْدَ الظَّفَرِ قَبْـلَ التَّسْـلِيمِ) یـان (جاريـة)كـە لـە دوای دەستگیركردنی پێش ئەوەی تەسلیمی كافرەكە بكرێ مرد، ئەو كاتە (وَجَبَ بَدَلٌ) واجبە لە جیاتی (جاريه)كە شـتێكیتری بـدرێتێ (أَوْ قَبْـلَ ظَفَـرٍ) بـەڵام ئەگـەر (جاريـة)كـە پـێش دەستگیركردنی مردبێ، ئەو كاتە (فَلاَ فِي الأَظْهَرِ) هیچ شتێكی لەجیاتی واجب نابێ.

وَإِنْ أَسْـــلَمَتْ فَالْمَـــذْهَبُ وُجُـــوبُ بَـــدَلٍ، وَهُـــوَ أُجْرَةُمِثْـــلٍ، وَقِيـــلَ قِيمَتُهَـــا.

(كِتَابُ الْجِزْيَةِ)

صُــورَةُ عَقْــدِهَا: أُقِــرُّكُمْ بِدَارِالإِسْــلاَمِ أَوْ أَذِنْــتُ فِــي إِقَــامَتِكُمْ بِهَــا عَلَــى أَنْ تَبْــذُلُوا

جِزْيَةً وَتَنْقَادُوا لِحُكْمِ الإِسْلاَمِ. وَالأَصَحُّ اِشْتِرَاطُ ذِكْرِ قَدْرِهَا، لاَكَفِّ اللِّسَانِ عَنِ اللهِ تَعَالَى وَرَسُولِهِﷺ وَدِينِهِ،

---

(وَإِنْ أَسْلَمَتْ) ئەگەر (جارية) دەستگیرکراوەکە ببوە موسوڵمان، ئەو کاتە (فَالْمَذْهَبُ: وُجُوبُ بَدَلٍ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: واجبە: شتێك لەجیاتیی بدرێتە کافرەکە (وَهُوَ أُجْرَةُ مِثْلٍ) شتەکەش کرێی هاوێنەیە (وَقِيلَ قِيمَتُهَا) لە فەرموودەیەکیتردا–کە ڕاستترو پشت پێبەستراوە–: نرخی (جارية)کە واجب دەبێ بدرێتە کافرەکە.

﴿ كِتَابُ الْجِزْيَةِ: **پەرتوکی سەرانە** ﴾

(**جِزْيَة**)=سەرانە: ئەوماڵەیە لە هەر ساڵێکدا جارێك لە کافرەکانی (أَهْلِ الْكِتاب) وەردەگیرێ بۆ (بَيْت الْمال): لە بەرامبەر پاراستنیان لە ئێمەو نیشتەجێبوونیان لە (دارالاسلام)دا، جا هەر کافرێك ماملەتی سەرانەی لەگەڵ بەسترا بێ، پێی دەگوترێ: (أَهْلُ الذِّمَّة)=(ذِمِّيٌّ): پەیمان لەئەستۆ، کەواتە: پاراستنی گیانو ماڵی دەکەوێتە ئەستۆی موسوڵمانان.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قَاتِلُواالَّذِينَ لايُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَاحَرَّمَ اللهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواالْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ جەنگ لەگەڵ ئەو کافرانە بکەن کە باوەڕێکی بێگەردیان نیە: بە خواو بە ڕۆژیی دوایی و ئەوەی خواو پێغەمبەرﷺ حەرامیان کردوە ئەوان حەرامی ناکەنو دەست بە ئایینی ڕاستی ئیسلامەوە ناگرن–ئەو جۆرە کافرانەی کتابیان لە لای خواوە دراوەتێ– تا بە دەستیخۆیان سەرانە ئەدەنو ملکەچی بڕیاری ئیسلام دەبن، ئەوان زەلیلن.

ئینجا (صُورَةُ عَقْدِهَا) ڕستەی ماملەتبەستنی سەرانە ئەمەیە: پێشەوا، یان جێگرەکەی بڵێتە کافرەکان: (أُقِرُّكُمْ بِدَارِالإِسْلاَمِ، أَوْ أَذِنْتُ فِي إِقَامَتِكُمْ بِهَا عَلَى أَنْ تَبْذُلُوا جِزْيَةً وَتَنْقَادُوا لِحُكْمِ الإِسْلاَمِ) ئێوەم جێگیر کرد لە خانەیئیسلامدا، ئیزنم دا ئێوە لە خانەی ئیسلامدا نیشتەجێ بن لە بەرامبەر ئەوەی لە گشت ساڵێکدا ئەوەندە سەرانە بدەنو ملکەچی بڕیارەکانیئیسلام بن. واتە: جگە لە بڕیارەکانیخواپەرستی.

(وَالأَصَحُّ اشْتِرَاطُ ذِكْرِ قَدْرِهَا) بە فەرموودەی ڕاستتر مەرجە: ئەندازەی سەرانەکە لە ماملەتەکەدا بگوترێ (لاَ كَفُّ اللِّسَانِ عَنِ اللهِ تَعَالَى وَرَسُولِهِﷺ وَدِينِهِ) بەڵام مەرج نیە ئەوە بگوترێ: نابێ بە خراپە باسی خوای گەورەو پێغەمبەروﷺ ئایینیئیسلام بکەن، چونکە گوتنی ڕستەی (ملکەچی بڕیارەکانیئیسلام بن) لە ماملەتەکەدا، ئەو مەرجەش دەگرێتەوە.

وَلاَ يَصِحُّ الْعَقْدُ مُؤَقَّتًا عَلَى الْمَذْهَبِ، وَيُشْتَرَطُ لَفْظُ قَبُولٍ، وَلَوْ وُجِدَ كَافِرٌ بِدَارِنَا فَقَالَ دَخَلْتُ لِسَمَاعِ كَلاَمِ اللهِ تَعَالَى أَوْ رَسُولاً أَوْ بِأَمَانِ مُسْلِمٍ صُدِّقَ، وَفِي دَعْوَى الأَمَانِ

وَجْهٌ، وَيُشْتَرَطُ لِعِقْدِهَا الإِمَامُ أَوْ نَائِبُهُ، وَعَلَيْهِ الإِجَابَةُ إِذَا طَلَبُوا، إِلاَّ جَاسُوسًا نَخَافُهُ، وَلاَ تُعْقَدُ إِلاَّ لِلْيَهُودِ وَالنَّصَارَى وَالْمَجُوس

---

(وَلاَ يَصِحُّ الْعَقْدُ مُؤَقَّتًا) مامڵەتی سەرانە تا ماوەیەکی دیارکراو، یان دیارنەکراو دروست نابێ، بەڵکو مەرجە هەتا هەتایی بێ (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (وَيُشْتَرَطُ لَفْظُ قَبُولٍ) بۆ دروستبوونی مامڵەتی سەرانە بە مەرج دادەندرێ گشت کافرێکی مامڵەت لەگەڵکراو بە زوبان بڵێ: قبوڵم کرد.

(وَلَوْ وُجِدَ كَافِرٌ بِدَارِنَا) ئەگەر کافرێك لە خانەیئیسلامدا بینرا (فَقَالَ: دَخَلْتُ لِسَمَاعِ كَلاَمِ اللهِ تَعَالَى) کافرەکە گوتی: هاتوم گوێم لە قورئانی پیرۆز بێ (أَوْ رَسُولاً) یان گوتی بە نێردراوی هاتوم (أَوْ بِأَمَانِ مُسْلِمٍ) یان گوتی: بە دڵنیاکردنی موسوڵمانێك هاتوم. ئەوە (صُدِّقَ) لە هەرسێك حاڵەتدا باوەڕی پێدەکرێ، بەڵام (وَفِيدَعْوَىالأَمَانِ وَجْهٌ) لە بارەی دڵنیاکردنەکە فەرموودەیەکی بێهێز هەیە: کە-بێ شاهید- باوەڕی پێناکرێ.

(وَيُشْتَرَطُ لِعِقْدِهَا الإِمَامُ أَوْ نَائِبُهُ) بۆدروستبوونی مامڵەتی سەرانە بە مەرج دادەندرێ: پێشەوا، یان جێگرەکەی مامڵەتەکە ببەستێ، هەم (وَعَلَيْهِ الإِجَابَةُ إِذَا طَلَبُوا) لە سەر پێشەواو جێگرەکە واجبە-هەر کاتێك کافرەکان داوایان کرد-: مامڵەتی سەرانەیان لەگەڵ ببەستێ، چونکە پێغەمبەرﷺ بە سەرکردەی لەشکرەکەی فەرموو: ﴿فَإِنْ أَبَوْا فَاسْأَلْهُمُ الْجِزْيَةَ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ﴾ رواه مسلم وأصحاب السنن، ئەگەر کافرەکان نەبونە موسوڵمان داوای سەرانەیان لێبکە، جا ئەگەر سەرانەیان دا، لێیان قبوڵ بکە. (إِلاَّ جَاسُوسًا نَخَافُهُ) تەنها ئەو جاسوسەی لێی دەترسین دروست نیە مامڵەتی سەرانەی لەگەڵ ببەسترێ.

(وَلاَ تُعْقَدُ إِلاَّ لِلْيَهُودِ وَالنَّصَارَى) مامڵەتی سەرانە تەنها بۆ جولەکەو دیانەکان=گاورەکان دەبەسترێ، بە بەڵگەی ئایەتەکەی ڕابردوو، هەم (وَالْمَجُوسِ) بۆ مەگوش=ئاگرپەرستەکانیش دەبەسترێ ﴿عَنْ عبدالرحمن بن عوفﷺ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ أَخَذَ الْجِزْيَةَ مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ﴾رواه البخاری، ﴿وقال النَّبِيُّﷺ: سُنُّوا بِالْمَجُوسِ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ رواه الطبراني وغيره، پێغەمبەرﷺ سەرانەی لە ئاگرپەرستەکانی (هەجەر) وەرگرت و فەرمووی: وەك جولەکەو دیانەکان ڕەفتار لەگەڵ مەگوشەکان بکەن.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)و ئیمام (مالك)دا: سەرانە لە گشت جۆرە کافرێك وەردەگیرێ، واتە: هەرچەند بتپەرستیش بێ، بەڵام بەو مەرجەی (مُرْتَدّ)=پاشگەزبوو نەبێ، هەروك لە (مغنى)و (مجمع الانهر)دا فەرموویانە.

وَأَوْلاَدِ مَنْ تَهَوَّدَ أَوْ تَنَصَّرَ قَبْلَ النَّسْخِ أَوْ شَكَكْنَا فِوَقْتِهِ وَكَذَا زَاعِمُ التَّمَسُّكِ بِصُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَزَبُورِ دَاوُدَ(صلىالله عليهماوسلم) وَمَنْ أَحَدُ أَبَوَيْهِ كِتَابِيٌّ وَالآخَرُ وَثَنِيٌّ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَلاَ

جِزْيَةَ عَلَى اِمْرَأَةٍ وَخُنْثَى وَمَنْ فِيهِ رِقٌّ وَصَبِيٍّ وَمَجْنُونٍ، فَإِنْ تَقَطَّعَ جُنُونُهُ قَلِيلاً كَسَاعَةٍ مِنْ شَهْرٍ لَزِمَتْهُ، أَوْ كَثِيرًا كَيَوْمٍ وَيَوْمٍ فَالأَصَحُّ تُلَفَّقُ الإِفَاقَةُ فَإِذَا بَلَغَتْ سَنَةً وَجَبَتْ،

---

(وَأَوْلَادِ مَنْ تَهَوَّدَ أَوْ تَنَصَّرَ قَبْلَ النَّسْخِ) هەروەها سەرانە وەردەگیرێ لە نەتەوەی ئەو کافرانەی بونەتە جولەکە، یان دیان پێش ئەوەی ئایینەکەیان بێکار بوبێتەوە (أَوْ شَكَكْنَا فِي وَقْتِهِ) یان کەوتینە گومان: لە چ کاتێکدا دایكو باوکەکانیان بونەتە جولەکەو دیان (وَكَذَا زَاعِمُ التَّمَسُّكِ بِصُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَزَبُورِ دَاوُدَ صلى الله عليهما وسلم) هەروەها ئەو کافرانەی واتێدەگەن: دەستیان بە (صُحُف إبراهيم)، یان بە (زبور داود)وە گرتوە عليهما الصلاة والسلام، ئەوانیش سەرانەیان لێوەردەگیرێ.

هەم (وَمَنْ أَحَدُ أَبَوَيْهِ كِتَابِيٌّ وَالآخَرُ وَثَنِيٌّ) لەو کافرەش سەرانە وەردەگیرێ: کە یەکێك لە دایكو باوکەکەی خاوەن کیتابەو ئەوەکەیتریش بتپەرستە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

بەڵام ئافرەتەکانو ئاژەڵە سەربڕاوەکانی ئەو چوار جۆرە کافرانە بۆ ئێمەی موسوڵمان حەڵاڵ نابن، هەروەك لە (مغنى)دا فەرموویەتی.

(وَلاَ جِزْيَةَ عَلَى اِمْرَأَةٍ) بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام: سەرانە لە سەر ئافرەت نیە، بەڵکو–بۆ پەیمان لەئەستۆیی– ئەوەندەی بەسە: ملکەچی بڕیارەکانی‌ئیسلام ببێ (وَخُنْثَى) هەم لە سەر نێرامۆکیش نیە، چونکە دەگونجێ ئافرەت بێ، هەم (وَمَنْ فِيهِ رِقٌّ) لە سەر کۆیلەش نیە، هەم (وَصَبِيٍّ) لە سەر منداڵیش نیە ﴿عن معاذ ﷺ: لَمَّا وَجَّهَهُ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ أَمَرَهُ: أَنْ يَأْخُذَ مِنْ كُلِّ حَالِمٍ دِيناراً أَوْ عِدْلَهُ مَعَافِرِيّاً﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، کە پێغەمبەر ﷺ (مُعاذ)ی ناردە (يَمَن)، فەرمانی پێکرد: لە گشت نێرینەیەکی بالغ میسقالێك زێڕ سەرانە وەربگرێ، یان بە قەد میسقالەکە جلی مەعافیریی لێوەربگرێ.

(وَمَجْنُونٍ) سەرانە لە سەر شێتیش نیە، چونکە ئەویش وەکو منداڵ داواکاری شەرع نایگرێتەوە، بەڵام (فَإِنْ تَقَطَّعَ جُنُونُهُ قَلِيلاً) ئەگەر شێتیەکەی بچڕ بچڕێکی کەم بوو: (كَسَاعَةٍ مِنْ شَهْرٍ) وەك لە مانگێك کاتژمێرێك، یان لە ساڵێك ڕۆژێك شێت ببێ، ئەو کاتە (لَزِمَتْهُ) سەرانەی لە سەرە (أَوْ كَثِيرًا) یان شێتیەکەی بچڕ بچڕێکی زۆر بوو: (كَيَوْمٍ وَيَوْمٍ) وەك ڕۆژێك شێت ببێو ڕۆژێك چاك ببێتەوە، ئەوە (فَالأَصَحُّ تُلَفَّقُ الإِفَاقَةُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: ماوەی چاکبوونەوەکەی لێك دەدرێ: (فَإِذَا بَلَغَتْ سَنَةً) جا هەر کاتێك کۆی ماوەکانی چاکبوونەوەی گەیشتە ساڵێك، ئەو کاتە (وَجَبَتْ) سەرانەی لە سەر واجب دەبێ.

وَلَوْ بَلَغَ ابْنُ ذِمِّيٍّ وَلَمْ يَبْذُلْ جِزْيَةً أُلْحِقَ بِمَأْمَنِهِ، وَإِنْ بَذَلَهَا عُقِدَ لَهُ، وَقِيلَ عَلَيْهِ كَجِزْيَةِ أَبِيهِ، وَالْمَذْهَبُ وُجُوبُهَا عَلَى زَمِنٍ وَشَيْخٍ هَرِمٍ وَأَعْمَى وَرَاهِبٍ وَأَجِيرٍ وَفَقِيرٍ عَجَزَ عَنْ

كَسْبٍ، فَإِذَا تَمَّتْ سَنَةٌ وَهُوَ مُعْسِرٌ فَفِي ذِمَّتِهِ حَتَّى يُوسِرَ، وَيُمْنَعُ كُلُّ كَافِرٍ مِنْ اِسْتِيطَانِ الْحِجَازِ: وَهُوَ مَكَّةُ وَالْمَدِينَةُ وَالْيَمَامَةُ وَقُرَاهَا، وَقِيلَ لَهُ الإِقَامَةُ فِي طُرُقِهِ الْمُمْتَدَّةِ، وَلَوْ دَخَلَهُ بِغَيْرِ إِذْنِ الإِمَامِ أَخْرَجَهُ

---

(وَلَوْ بَلَغَ ابْنُ ذِمِّيٍّ) ئەگەر کوڕی کافرێکی پەیمان لە ئەستۆ بلۆغی بوو و داوای سەرانەمان لێکرد (وَلَمْ يَبْذُلْ جِزْيَةً) ئەویش هیچ سەرانەی نەدا، ئەو کات (أُلْحِقَ بِمَأْمَنِهِ) لە (دار الاسلام) دەریدەکەین‌و دەیگەیێنینە شوێنێکی ئەمینی (دارالکفر)، واتە: لە سەرەتاوە دروست نیە بکوژرێ، بەلاّم (وَإِنْ بَذَلَهَا) ئەگەر کوڕەکە ئامادە بوو سەرانە بدا، ئەو کاتە (عُقِدَ لَهُ) سەربەخۆ مامڵەتێکی سەرانەی بۆ دەبەسترێ (وَقِيلَ عَلَيْهِ كَجِزْيَةِ أَبِيهِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: کوڕەکە سەرانەیەکی وەك سەرانەی باوکی خۆی لە سەر واجبەو پێویست ناکا سەربەخۆ مامڵەتێکیتری بۆ ببەسترێ.

(وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (وُجُوبُهَا عَلَى زَمِنٍ وَشَيْخٍ هَرِمٍ وَأَعْمَى وَرَاهِبٍ وَأَجِيرٍ) سەرانە واجبە: لە سەر پەککەوتوو و پیری بە تەمەن‌و کوێرو قەشەو بەکرێگیراو، هەم (وَفَقِيرٍ عَجَزَ عَنْ كَسْبٍ) لە سەر ئەو هەژارەش واجبە کە توانای کارکردنی نیە، کەوابو: (فَإِذَا تَمَّتْ سَنَةٌ) هەر کاتێك ساڵێك تەواو بوو (وَهُوَ مُعْسِرٌ) هەژارەکە هەر نەبوویی بوو، ئەو کاتە (فَفِي ذِمَّتِهِ حَتَّى يُوسِرَ) سەرانە–بە قەرز– لە ئەستۆیدا دەمێنێ تا دەبێتە هەبوویی، جا ئەو کاتە گشت سەرانەکانیڕابردووی دەدا، بەلاّم لە فەرموودەکەیتردا لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)دا: ئەو شەش کەسانە سەرانەیان لە سەر نیە، هەروەك لە (مجمع الانهر)دا فەرموویەتی.

(وَيُمْنَعُ كُلُّ كَافِرٍ مِنْ اِسْتِيطَانِ الْحِجَازِ) واجبە گشت کافرێك قەدەغە بکرێ لە نیشتەجێبوونی خاکی (حِجَاز)، هەرچەند سەرانەش بدا (وَهُوَ) خاکی (حِجَاز) بریتیە لە (مَكَّةُ وَالْمَدِينَةُ وَالْيَمَامَةُ)، هەم (وَقُرَاهَا) گوندەکانی ئەو سێیانەش: وەکو (طائف و جدّة و خَيْبَر و يَنْبَع)، پێغەمبەرﷺ پێش وەفاتکردنی فەرمووی: ﴿لأُخْرِجَنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ حَتَّى لاَ أَدَعَ إِلاَّ مُسْلِماً﴾ رواه مسلم واصحاب السنن، دەبی جولەکەو دیانەکان=گاورەکان لە دورگەیعەرەب دەر بکەم تا جگە لە موسوڵمانان کەسیتری تێدا نامێڵم.

(وَقِيلَ لَهُ الإِقَامَةُ فِي طُرُقِهِ الْمُمْتَدَّةِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: دروستە: کافرەکە لە ڕێگەکانی نێوان ئەو شارانەدا نیشتەجێ ببێ (وَلَوْ دَخَلَهُ بِغَيْرِ إِذْنِ الإِمَامِ) ئەگەر کافرێك بێ‌ئیزنی پێشەوای موسوڵمانان هاتە ناو (حجاز)، ئەو کاتە (أَخْرَجَهُ) واجبە پێشەوا وَعَزَّرَهُ إِنْ عَلِمَ أَنَّهُ مَمْنُوعٌ مِنْهُ، فَإِنْ اِسْتَأْذَنَ أَذِنَ إِنْ كَانَ مَصْلَحَةٌ لِلْمُسْلِمِينَ كَرِسَالَةٍ وَحَمْلِ مَا نَحْتَاجُ إِلَيْهِ، فَإِنْ كَانَ لِتِجَارَةٍ لَيْسَ فِيهَا كَبِيرُ حَاجَةٍ لَمْ يَأْذَنْ إِلاَّ بِشَرْطِ أَخْذِ شَيْءٍ مِنْهَا،

وَلاَ يُقِيمُ إلاَّ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، وَيُمْنَعُ دُخُولَ حَرَمِ مَكَّةَ، فَإِنْ كَانَ رَسُولاً خَرَجَ إلَيْهِ الإِمَامُ أَوْ نَائِبٌ يَسْمَعُهُ، وَإِنْ مَرِضَ فِيهِ نُقِلَ وَإِنْ خِيفَ مَوْتُهُ، فَإِنْ مَاتَ لَمْ يُدْفَنْ فِيهِ، فَإِنْ دُفِنَ نُبِشَ وَأُخْرِجَ، وَإِنْ مَرِضَ فِي غَيْرِهِ مِنَ الْحِجَازِ وَعَظُمَتِ الْمَشَقَّةُ فِي نَقْلِهِ

---

دەریبکاتە دەرەوە هەم (وَعَزَّرَهُ إِنْ عَلِمَ أَنَّهُ مَمْنُوعٌ مِنْهُ) تەمبێشی بکا ئەگەر زانیبی چونە ناو (حجاز)ی لێ قەدەغەکراوە.

(فَإِنِ اسْتَأْذَنَ) جا ئەگەر کافرێك داوای ئیزنی کرد: بۆ چوونە ناو (حجاز)، ئەو کاتە (أَذِنَ إِنْ كَانَ مَصْلَحَةٌ لِلْمُسْلِمِينَ) واجبە پێشەوا ئیزنی بدا ئەگەر بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدابێ: (كَرِسَالَةٍ وَحَمْلِ مَا نَحْتَاجُ إِلَيْهِ) وەك گەیاندنی نامەیەك، یان هێنانی شتێکی وەها کە ئێمەی موسوڵمان پێویستیمان پێیەتی: وەك خواردەمەنیو کەلوپەلیتر (فَإِنْ كَانَ لِتِجَارَةٍ لَيْسَ فِيهَا كَبِيرُ حَاجَةٍ) جا ئەگەر هاتنی کافرەکە بۆ ناو (حجاز) بۆ بازرگانیەکی وەها بوو: کە زۆر پێویست نەبو، ئەو کاتە (لَمْ يَأْذَنْ) دروست نیە ئیزنی بدا (إِلاَّ بِشَرْطِ أَخْذِ شَيْءٍ مِنْهَا) تەنها بە مەرجی وەرگرتنی شتێك لە بازرگانییەکە دروستە ئیزنی بدا، ئینجا ئەو کاتەش (وَلاَ يُقِيمُ إِلاَّ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ) نابێ لە سێ ڕۆژان زیاتر کافرەکە لە (حجاز)دا بمێنێتەوە.

بەلام (وَيُمْنَعُ دُخُولَ حَرَمِ مَكَّةَ) واجبە گشت کافرێك قەدەغە بکرێ لە چوونە ناو (حَرَم)ی (مَكَّة)، هەرچەند بەرژەوەندیشی تێدابێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ﴾ کافرەکان پیسن نابێ لە (الْمَسْجِدُ الْحَرَامِ)=(حَرَم مَكَّة) نزیك بکەونەوە. کەوابو: (فَإِنْ كَانَ رَسُولاً) ئەگەر کافرەکە نێردراو بوو، ئەو کاتە (خَرَجَ إِلَيْهِ الإِمَامُ أَوْ نَائِبٌ يَسْمَعُهُ) پێشەوا، یان جێگرەکەی لە (حرم) دەچێتە دەرەوە، تاکو گوێ لە نێردراوەکە بگرێ.

(وَإِنْ مَرِضَ فِيهِ) ئەگەر کافرێك چووە (حَرَم مَكَّة)و لە وێ نەخۆش کەوت، ئەو کاتە (نُقِلَ وَإِنْ خِيفَ مَوْتُهُ) واجبە: لا ببردرێ، هەرچەند مەترسی مردنیشی هەبێ، چونکە بە ناشەرعی چوەتە ناو (حَرَم)، کەوابو: (فَإِنْ مَاتَ لَمْ يُدْفَنْ فِيهِ) ئەگەر کافرەکە لە (حَرَم مَكَّة)دا مرد، دروست نیە لە وێ بنێژرێ (فَإِنْ دُفِنَ) جا ئەگەر لە وێدا نێشترا، ئەو کاتە (نُبِشَ وَأُخْرِجَ) واجبە لە گۆڕەکەی دەربهێندرێو ببردرێتە دەرەوەی (حَرَم مَكَّة)، بەلام ئەگەر ڕزی بوو، ئەو کاتە وازی لێدەهێندرێ.

(وَإِنْ مَرِضَ فِي غَيْرِهِ مِنَ الْحِجَازِ) ئەگەر–جگە لە (حَرَمِ مَكَّة)– لە شوێنەکانیتری (حجَاز)دا نەخۆش کەوتو (وَعَظُمَتِ الْمَشَقَّةُ فِي نَقْلِهِ) بە ماندووبونێکی گەورش دەگواستراوە، ئەو

تُرِكَ وَإِلاَّ نُقِلَ، فَإِنْ مَاتَ وَتَعَذَّرَ نَقْلُهُ دُفِنَ هُنَاكَ.

(فَصْلٌ) أَقَلُّ الْجِزْيَةِ دِينَارٌ لِكُلِّ سَنَةٍ، وَيُسْتَحَبُّ لِلإِمَامِ مُمَاكَسَةٌ حَتَّى يَأْخُذَ مِنْ مُتَوَسِّطٍ

دِينَارَيْنِ وَغَنِيٍّ أَرْبَعَةً، وَلَوْ عُقِدَتْ بِأَكْثَرَ ثُمَّ عَلِمُوا جَوَازَ دِينَارٍ لَزِمَهُمْ مَاالْتَزَمُوهُ، فَإِنْ أَبَوْا فَالأَصَحُّ أَنَّهُمْ نَاقِضُونَ، وَلَوْ أَسْلَمَ ذِمِّيٌّ أَوْ مَاتَ بَعْدَ سِنِينَ أُخِذَتْ جِزْيَتُهُنَّ مِنْ تَرِكَتِهِ

---

كاته (تُرِك) وازى لىَ‌دەهێندرىَ (وَإِلاَّ نُقِل) بەلاَم ئەگەر ئاسان بوو، ئەو كاتە دەگواسترێتەوە (فَإِنْ مَاتَ وَتَعَذَّرَ نَقْلُهُ) جا ئەگەر-جگە لە (حَرَم مَكَّة) لە شوێنەكانىَ‌ترى (حجاز)دا مردو نەشگونجا لاشەكەى بگواسترێتەوە بۆ دەرەوەى (حجاز)، ئەو كاتە (دُفِنَ هُنَاكَ) لەبەر ناچارى لە وىَ دەنيَشترىَ.

﴿ فَصْلٌ: **لە باسى ئەندازەى سەرانە** ﴾

(أَقَلُّ الْجِزْيَةِ) كەمترينى سەرانە لە سەر دەولَّەمەندو هەژار: (دِينَارٌ لِكُلِّ سَنَةٍ) ئەندازەى ميسقالێكى زێرە بۆ هەر ساڵێك، بە بەلَّگەى حەديسەكەى (مُعاذ)ى‌ڕابردوو، بەلاَم ئەگەر ئێمە بىَ‌هێز بوين، ئەو كاتە-ئەگەر بەرژەوەندى بخوازىَ- بە كەمتريش لە ميسقالێك دروستە مامڵەتى سەرانە ببەسترىَ، هەروەك لەزۆربەى سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

بەلاَم لە مەزهەبى ئيمامى(حنفى)دا: لە هەر ساڵێكدا سەرانە لە سەر دەولَّەمەند: چل و هەشت ديرهەمى زيوە، لە سەر ناوەنجى: بيستو چوار ديرەهەمە، لە سەر هەژارى هەبوويى: دوانزە ديرهەمە، هەروەك لە كتێبەكانى خۆياندا فەرموويانە.

(وَيُسْتَحَبُّ لِلإِمَامِ مُمَاكَسَةٌ) بۆ پێشەواى موسوڵمانان سوننەتە: سەودا لەگەلَ كافرەكان بكا: (حَتَّى يَأْخُذَ مِنْ مُتَوَسِّطٍ دِينَارَيْنِ) تا لە كافرى ناوەنجى دوو ميسقالى زێر وەربگرىَو (وَغَنِيٍّ أَرْبَعَةً) لە دەولَّەمەنديش چوار ميسقالى زێڕ وەربگرىَو لە هەژاريش ميسقالێكى زێڕ وەربگرىَ (وَلَوْ عُقِدَتْ بِأَكْثَرَ) ئەگەر مامڵەتى سەرانە بە زياتر لە ميسقالێك بەسترا (ثُمَّ عَلِمُوا جَوَازَ دِينَارٍ) ئينجا كافرەكان زانييان بە ميسقالێكيش دروست بوو، ئەو كاتە مافى پەشيمانييان نيە، بەلَّكو (لَزِمَهُمْ مَا الْتَزَمُوهُ) لە سەريان واجبە: ئەوەى لە مامڵەتەكە خستۆتيانە ئەستۆى خۆيان بيدەن (فَإِنْ أَبَوْا) جا ئەگەر لەو حاڵەتەدا زياترەكەيان نەدا، ئەوە (فَالأَصَحُّ أَنَّهُمْ نَاقِضُونَ) بە فەرموودەى ڕاستتر: پەيمانەكەيان هەلَّوەشاندۆتەوە، كەوابو: لە (دارالاسلام) دەردەكرێن بۆ شوێنێكى ئەمينى (دارالكفر).

(وَلَوْ أَسْلَمَ ذِمِّيٌّ أَوْ مَاتَ بَعْدَ سِنِينَ) ئەگەر كافرێكى پەيمان لەئەستۆ بووە موسوڵمان، يان مرد، يان شێت بوو، يان پەيمانەكەى هەلَّوەشاندەوە: لە دواى ساڵێك، يان لە دواى چەند ساڵێك كە سەرانەكەى نەدابو، ئەوە سەرانەى گشت ساڵەكان بووەتە قەرز لە ئەستۆىدا، كەوابو: (أُخِذَتْ جِزْيَتُهُنَّ) لەو حاڵەتانەدا سەرانەى هەموو ساڵەكانى لىَ‌دەستێندرىَ، بەلاَم لە حاڵەتى مردندا (مِنْ تَرِكَتِهِ) سەرانەى گشت ساڵەكان لە ميراتەكەى وەردەگيرىَ



مُقَدَّمَةً عَلَى الْوَصَايَا، وَيُسَوِّى بَيْنَهَا وَبَيْنَ دَ فِقِسْطٌ، وَفِى قَوْلٍ لاَ شَيْءَ، وَتُؤْخَذُ بِإِهَانَةٍ فَيَجْلِسُ الاخِذ وَيَقُومُ الذِمِّيُّ وَيُطَاطِئُ رَاسَهُ

وَيَحْنِى ظَهْرَهُ وَيَضَعُهَا فِالْمِيزَانِ وَيَقْبِضُ الآخِذُ لِحْيَتَهُ وَيَضْرِبُ لِهْزِمَتَيْهِ، وَكُلُّهُ مُسْتَحَبٌّ، وَقِيلَ وَاجِبٌ، فَعَلَىالأَوَّلِ لَهُ تَوْكِيلُ مُسْلِمٍ بِالأَدَاءِ وَ حَوَالَةٌ عَلَيْهِ وَأَنْ يَضْمَنَهَا، قُلْتُ: هَذِهِ الْهَيْئَةُ بَاطِلَةٌ وَدَعْوَى اِسْتِحْبَابِهَا أَشَدُّ خَطَأً وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

(مُقَدَّمَةٌ عَلَى الْوَصَايَا) سەرانەكەش وەپێش وەسیّتەكانی دیٚخریّ، هەم (وَيُسَوَّى بَيْنَهَا وَبَيْنَ دَيْنِ آدَمِيٍّ) یەكسانی دەكریّ لە نێوان سەرانەكەو قەرزی ئادەمیزاد (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، كەواتە: پێشەوا بە ئەندازەی سەرانەكە دەبێتە هاوبەشی خاوەن قەرزەكان.

بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)دا: بە ئیسلامبوون، یان بە مردن سەرانەكەی لە سەر لادەكەویّ، هەروەك لەكتێبەكانیاندا فەرمویانە.

(أَوْ فِى خِلاَلِ سَنَةٍ) یان پەیمان لەئەستۆیەكە لە ناو ساڵێكدا بووە موسوڵمان، یان شێت بوو، یان مرد، یان پەیمانەكەی هەڵوەشاندەوە، ئەو كاتەش (فَقِسْطٌ) بەشە سەرانەكەی مانگو ڕۆژەكانیڕابردووی لە سەرەو واجبە: وەربگیریّ، بەڵام (وَفِى قَوْلٍ: لاَ شَيْءَ) لەفەرموودەیەكدا: هیچی لە سەر نیە.

(وَتُؤْخَذُ بِإِهَانَةٍ) سەرانە بە شێوەی سوكایەتی پێكردن وەردەگیریّ، كەوابو: (فَيَجْلِسُ الآخِذُ) سەرانەوەرگرەكە دادەنیشیّو (وَيَقُومُ الذِّمِّيُّ) پەیمان لەئەستۆیەكەش بە پێوە ڕادەوەستیّو (وَيُطَأْطِئُ رَأْسَهُ وَيَحْنِى ظَهْرَهُ) سەری شۆڕدەكاو پشتی دەچەمێنێتەوەو (وَيَضَعُهَا فِىالْمِيزَانِ) سەرانەكە دادەنێنە ناو تەرازووەكە (وَيَقْبِضُ الآخِذُ لِحْيَتَهُ) سەرانەوەرگرەكە ڕیشی پەیمان لەئەستۆیەكە دەگریّو (وَيَضْرِبُ لِهْزِمَتَيْهِ) بە لەپەدەستی لە ڕومەتی دەدا (وَكُلُّهُ مُسْتَحَبٌّ) هەمووی ئەو شێوەیە سوننەتە (وَقِيلَ وَاجِبٌ) لە فەرموودەیەكی بیّهێزدا: واجبە (فَعَلَىالأَوَّلِ لَهُ تَوْكِيلُ مُسْلِمٍ بِالأَدَاءِ) جا لە سەر فەرموودەی یەكەم بۆی دروستە موسوڵمانێك بكاتە وەكیل تاكو سەرانەكەی بۆ بدا، هەم (وَ حَوَالَةٌ عَلَيْهِ) دروستە سەرانەكەش حەواڵەی سەر موسوڵمانێك بكا، هەم (وَأَنْ يَضْمَنَهَا) دروستە موسوڵمانێك ببێتە زامینی سەرانەكە.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) فەرموویەتی (هَذِهِ الْهَيْئَةُ بَاطِلَةٌ) ئەو شێوە سوكایەتی پێكردنەی ڕابردوو بەتاڵەو هیچ بنچینەیەكیڕاستی نیە: نە لە حەدیسو نە لە هەر چوار خەلیفەكانەوە، كەوابو: (وَدَعْوَى اِسْتِحْبَابِهَا أَشَدُّ خَطَأً) بە سوننەتدانانی زیاتر هەڵەیەو پوچەڵترە، بەڵكو وەها سوننەتە: سەرانە بە شێوەیەكیجوانو بە هێمنی لە پەیمان لەئەستۆیەكە وەربگیریّ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرمویانە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

وَيُسْتَحَبُّ لِلإِمَامِ إِذَا أَمْكَنَهُ أَنْ يَشْرِطَ عَلَيْهِمْ إِذَا صُولِحُوا فِى بَلَدِهِمْ ضِيَافَةَ مَنْ يَمُرُّ بِهِمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ زَائِدًا عَلَى أَقَلِّ جِزْيَةٍ، وَقِيلَ يَجُوزُ مِنْهَا،

وَتُجْعَلُ عَلَى غَنِيٍّ وَمُتَوَسِّطٍ، لاَ فَقِيرٍ فِالأَصَحّ، وَيَذْكُرُ عَدَدَ الضِّيفَانِ رِجَالاً وَفُرْسَانًا، وَجِنْسَ الطَّعَامِ وَالأُدْمِ وَقَدْرَهُمَا، وَلِكُلِّ وَاحِدٍ كَذَا، وَعَلَفَ الدَّوَابِّ، وَمَنْزِلَ الضِّيفَانِ مِنْ كَنِيسَةٍ وَفَاضِلِ مَسْكَنٍ، وَمُقَامَهُمْ، وَلاَ يُجَاوِزُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، وَلَوْ قَالَ قَوْمٌ نُؤَدِّى الْجِزْيَةَ بِاسْمِ صَدَقَةٍ لاَ جِزْيَةٍ فَلِلإِمَامِ إِجَابَتُهُمْ إِذَا رَأَى وَيُضَعِّفُ عَلَيْهِمُ الزَّكَاةَ: فَمِنْ خَمْسَةِ أَبْعِرَةٍ شَاتَانِ، وَخَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ بِنْتَا مَخَاضٍ،

---

(وَيُسْتَحَبُّ لِلإِمَامِ إِذَا أَمْكَنَهُ) بۆ پێشەوا، یان جێگرەکەی سوننەتە–ئەگەر بۆی گونجا–: (أَنْ يَشْرِطَ عَلَيْهِمْ إِذَا صُولِحُوا فِي بَلَدِهِمْ) هەر کاتێك لەگەڵ پەیمان لەئەستۆیەکان پێك هات کە لە شارەکانیخۆیاندا نیشتەجێ بن، بە مەرج لە سەریان دابنێ: (ضِيَافَةَ مَنْ يَمُرُّ بِهِمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ) میوانداری ئەو رێبوارە موسوڵمانانە بکەن کە بە لایاندا ڕادەبرن (زَائِدًا عَلَى أَقَلِّ جِزْيَةٍ) ئەو میوانداریەش زێدییەك بێ لە سەر کەمترینی سەرانە، واتە: نابێ لە سەرانەکە بژمێردرێ (وَقِيلَ يَجُوزُ مِنْهَا) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا دروستە: لە سەرانەکە بژمێردرێ (وَتُجْعَلُ عَلَى غَنِيٍّ وَمُتَوَسِّطٍ) میوانداریەکەش تەنها لە سەر کافری دەوڵەمەند، یان ناوەنجی دادەندرێ (لاَ فَقِيرٍ فِيالأَصَحّ) نابێ لە سەر هەژار دابندرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَيَذْكُرُ عَدَدَ الضِّيفَانِ رِجَالاً وَفُرْسَانًا) لە پێکهاتنەکەدا دەبێ ژمارەی میوانەکانی پیادەو سوار بگوترێ، هەم (وَجِنْسَ الطَّعَامِ وَالأُدْمِ وَقَدْرَهُمَا) ڕەگەزی ئەو خواردەمەنیو پێخۆرەی دەدرێتە میوانەکانو هەم ئەندازەی هەردووکیان بگوترێ، هەم (وَلِكُلِّ وَاحِدٍ كَذَا) هەر میوانێك ئەوەندەی بدرێتێ، هەم (وَعَلَفَ الدَّوَابِّ) ئالیکی وولاغەکانو هەم (وَمَنْزِلَ الضِّيفَانِ مِنْ كَنِيسَةٍ وَفَاضِلِ مَسْكَنٍ) شوێنی میوانەکان بگوترێ: لە کەنیسەدا بن، یان لە دیوەخانە، هەم (وَمُقَامَهُمْ) میوانەکان چەند دەمێننەوە، بەڵام (وَلاَ يُجَاوِزُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ) نابێ میوانداری هەر میوانێك لە سێ ڕۆژان زیاتر بێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿الضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ﴾ رواه الشيخان، میوانداری سێ ڕۆژن.

(وَلَوْ قَالَ قَوْمٌ) ئەگەر کەلێکی کافرەکان گوتیان (نُؤَدِّى الْجِزْيَةَ بِاسْمِ صَدَقَةٍ لاَ جِزْيَةٍ) سەرانە دەدەین بە ناوی زەکات نەك بە ناوی سەرانە، ئەو کاتە (فَلِلإِمَامِ إِجَابَتُهُمْ إِذَا رَأَى) بۆ پێشەوا دروستە لێیان قبوڵ بکا، ئەگەر بەرژەوەندیی دیت، بەڵام (وَيُضَعِّفُ عَلَيْهِمُ الزَّكَاةَ) لەو حاڵەتەدا واجبە: زەکاتەکەیان لە سەر بکاتە دوو هەندی واجبی موسوڵمانان تا دەگاتە ئەندازەی میسقاڵێکی زێڕ، کەواتە: (فَمِنْ خَمْسَةِ أَبْعِرَةٍ شَاتَانِ) لە پێنج وشتر: دوو مەڕ وەردەگیرێو (وَ خَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ بِنْتَا مَخَاضٍ) لە بیستو پێنج ووشتر: دوو بیچووە وشتری یەك ساڵە وەردەگیرێ.

وَعِشْرِينَ دِينارًا دِينارٌ، وَمِأَتَيْ دِرْهَمٍ عَشَرَةٌ، وَخُمُسُ الْمُعَشَّرَاتِ، وَلَوْ وَجَبَ بِنْتَا مَخَاضٍ مَعَ

جُبْرَانٍ لَمْ يُضَعِّفِ الْجُبْرَانَ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ كَانَ بَعْضَ نِصَابٍ لَمْ يَجِبْ قِسْطُهُ فِالأَظْهَرِ، ثُمَّ الْمَأْخُوذُ جِزْيَةٌ فَلاَ يُؤْخَذُ مِنْ مَالِ مَنْ لاَ جِزْيَةَ عَلَيْهِ. (فَصْلٌ) يَلْزَمُنَاالْكَفُّ عَنْهُمْ

---

هەروەها (وَعِشْرِينَ دِينَارًا دِينَارٌ) لە بیست میسقالی زێڕ: میساقلێك وەردەگیرێو (وَمِأَتَيْ دِرْهَمٍ عَشَرَةٌ) لە دووسەد دیرهەمی زیو: دە دیرهەم وەردەگیرێو (وَخُمُسُ الْمُعَشَّرَاتِ) پێنجێكی دانەوێڵەو میوەجاتیش وەردەگیرێ ﴿عن عُمَرَ﷜ أَنَّهُ صَالَحَ نَصارَى بَنِيتَغْلِبَ وَتَنُوخَ وبَهْراءَ عَلَى أَنْ يَأْخُذَ عَنْهُمُ الْجِزْيَةَ بِاسْمِ الصَّدَقَةِ وَيُضَعِّفَ عَلَيْهِمُ الصَّدَقَةَ، وَقال: هَؤُلاءِ حَمْقَى اَبَوُا الإِسْمَ وَرَضُوا بِالْمَعْنَى﴾ رواه البيهقي، ئیمامی (عمر) لەگەڵ گاورەكانی (بنیتغلب و تنوخ و بهراء) پێك هات: كە بە ناوی زەكات سەرانەیان لێوەربگرێو زەكاتەكەش بكاتە دوو هەندی زەكاتی موسوڵمانان، جا فەرمووی: ئەو گاورانە كەم عەقڵن؟ بە ناوەكەی سەرانە ڕازی نەبونو بە واتەكەی ڕازی بون. جا هیچ (صحابة)یەكیش ڕەخنەی لێنەگرتو بووە (إجماع)، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ وَجَبَ بِنْتَا مَخَاضٍ مَعَ جُبْرَانٍ) ئەگەر دوو بێچووە ووشتری یەك ساڵە لەگەڵ پڕكردنەوەیەك واجب بون (لَمْ يُضَعِّفِ الْجُبْرَانَ فِيالأَصَحِّ) پڕكردنەوەكە ناكاتە دوو هەندی پڕكردنەوەی موسوڵمانان (وَلَوْ كَانَ بَعْضَ نِصَابٍ) ئەگەر كافرەكە هەندێكماڵی هەبوو، بەڵام نەگیشتبوە ڕادەی زەكات: وەك بیست مەڕ، ئەو كاتە (لَمْ يَجِبْ قِسْطُهُ فِيالأَظْهَرِ) بەشە زەكاتەكەی واجب نابێ لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە لەو ئەندازەیەدا زەكات لە سەر موسوڵمانان واجب نابێ.

(ثُمَّ الْمَأْخُوذُ جِزْيَةٌ) ئینجا ئەو زەكاتەی لێیان وەردەگیرێ لە ڕاستیدا سەرانەیەو بە ناوی زەكات وەردەگیرێو دەدرێتە ئەو كەسانە بەشیان لە (فَيْء) هەیە، كەوابو: (فَلاَ يُؤْخَذُ مِنْ مَالِ مَنْ لاَجِزْيَةَ عَلَيْهِ) ئەو زەكاتە لە ماڵی ئەو كافرە وەرناگیرێ كە سەرانەی لە سەر نیە: وەكو ئافرەتو منداڵ.

جا بزانە: ئەگەر دوو هەندەكە نەگیشتە ئەندازە میسقاڵێكی زێڕ، ئەو كاتە واجبە: زیاتر بكرێ تا دەیگاتێ، بەڵام ئەگەر زیاتر بوو، ئەو كاتە دروستە كەم بكرێتەوە بۆ ئەندازەی میسقاڵێك، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بڕیارەكانی مامڵەتی سەرانە ﴾

بزانە: هەر كاتێك مامڵەتی سەرانە لەگەڵ كافرەكان بەسترا، ئەوان دەبنە (أَهْلِ الذِّمَّةِ)= پەیمان لەئەستۆ، كەوابو: (يَلْزَمُنَا الْكَفُّ عَنْهُمْ) لەو كاتەوە لە سەرمان واجبە: وازیان لێبێنین: زیان لە گیانو ماڵو ناموسیان نەدەین، بە بەڵگەی حەدیسەكەیداهاتوو، هەم وَضَمَانُ مَا نُتْلِفُهُ عَلَيْهِمْ نَفْسًا وَمَالاً وَدَفْعُ أَهْلِ الْحَرْبِ عَنْهُمْ، وَقِيلَ إِنْ اِنْفَرَدُوا

بِبَلَدٍ لَمْ يَلْزَمْنَاالدَّفْعُ، وَنَمْنَعُهُمْ إِحْدَاثَ كَنِيسَةٍ فِي بَلَدٍ أَحْدَثْنَاهُ أَوْ أَسْلَمَ أَهْلُهُ عَلَيْهِ،

---

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ قَتَلَ مُعَاهَداً لَمْ يَرَحْ رائِحَةَالْجَنَّةِ﴾ رواه البخاری، هەر کەسێك پەیمان لەگەڵکراوێك بکوژێ، بۆنی بەهەشت ناکا.

(وَضَمَانُ مَا نُتْلِفُهُ عَلَيْهِمْ نَفْسًا وَمَالاً) هەم واجبە: ببینە زامینی ئەو گیانو ماڵەشیان کە ئێمە دەیفەوتێنین، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ تَعَالَى لَمْ يَحِلَّ لَكُمْ أَنْ تَدْخُلُوا بُيُوتَ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ بِإِذْنٍ وَلاَ ضَرْبَ نِسَائِهِمْ وَلاَ أَكْلَ ثِمَارِهِمْ إِذَا أَعْطَوْكُمُ الَّذِي عَلَيْهِمْ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، خوای گەورە بۆ ئێوەی حەڵاڵ نەکردوە بچنە ماڵی جولەکەو گاورەکان تەنها بە ئیزن نەبێ، حەڵاڵی نەکردوە لە ژنەکانیان بدەنو میوەیان بخۆن، هەر کاتێك ئەو سەرانەی لە سەریان داندراوە دایانە ئێوە.

(وَدَفْعُ أَهْلِ الْحَرْبِ عَنْهُمْ) هەم واجبە: ئەو دوژمنەی هێرشیان دەکاتە سەر بەرگری بکەینو لێیانی بگەڕێنینەوە، جا دوژمنەکە: موسوڵمان بێ، یان کافر (وَقِيلَ: إِنْ انْفَرَدُوا بِبَلَدٍ) لە فەرموودیەکی بێهێزدا: ئەگەر پەیمان لەئەستۆکان بەجیا لە شارێك، یان لە گوندێکی نزیك (دارالاسلام)دا بن، ئەو کاتە (لَمْ يَلْزَمْنَاالدَّفْعُ) لە سەرمان واجب نیە دوژمنەکەیان بگەڕێنینەوە.

(وَنَمْنَعُهُمْ إِحْدَاثَ كَنِيسَةٍ) واجبە: پەیمان لەئەستۆکان قەدەغە بکەین لە دروستکردنی دێرو کەنیسە (فِي بَلَدٍ أَحْدَثْنَاهُ أَوْ أَسْلَمَ أَهْلُهُ عَلَيْهِ) لەو شارەدا کە ئێمەیموسوڵمان دروستمان کردبێ: وەك شاری (سلێمانی)، یان دانیشتووانی شارەکە-بێجەنگ-لە سەر شوێنو جێی خۆیان موسوڵمان بوبن، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تُبْنَى كَنِيسَةٌ فِالإِسْلاَمِ وَلاَ يُجَدَّدُ مَا خَرِبَ مِنْهَا﴾ رواه ابن عدی، نابێ هیچ کەنێسەیەك لە (دارالاسلام)دا دروست بکرێو نابێ کەنێسەی ڕووخاویش نوێ بکرێتەوە.

هەروەها هەمان بڕیاریش لە ئیمامی (عمر)و (إبن عباس)رضاللە عنهم گێڕدراوتەوەو هیچ (صحابە)یەکیش ڕەخنەی لەو دووانە نەگرتوە.

کەوابو: هەر کەنێسەیەکی-لە دوای هاتنی ئیسلام -لە (دارالاسلام)دا دروست کرابێ، واجبە: بڕوخێندرێ، بەڵام ئەگەر نەزاندرا کەنێسەکە لە دوای دروستکردنی شارەکە، یان لە دوای ئیسلامبوونی دانیشتووەکان دروست کراوە، ئەو کاتە ناڕوخێندرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: ئەو کەنێسەیەی بەخۆی ڕوخاوە دروستە لە شوێنی خۆی-نەك لە شوێنێکیتر- بە قوڕ و خشت چاك بکرێتەوە، هەروەك لە (مجمع الانهر)دا فەرموویەتی.

وَمَا فُتِحَ عَنْوَةً لاَ يُحْدِثُونَهَا فِيهِ وَلاَ يُقَرُّونَ عَلَى كَنِيسَةٍ كَانَتْ فِيهِ فِالأَصَحِّ،

أَوْ صُـلْحًا بِشَـرْطِ الأَرْضِ لَنَـا وَشَـرْطِ إِسْـكَانِهِمْ وَإِبْقَـاءِ الْكَنَـائِسِ جَـازَ، وَإِنْ أُطْلِقَ فَالأَصَحُّ الْمَنْعُ، أَوْ لَهُمْ قُرِّرَتْ وَلَهُمُ الإِحْدَاثُ فِيالأَصَحِّ،

---

(وَمَا فُتِحَ عَنْوَةً) ئەو شوێنانەی بە جەنگ لە دەست کافرەکان ئازاد کراون: وەك زۆربەی شارەکانی کوردستان (لاَ يُحْدِثُونَهَا فِيهِ) دروست نیە ڕێگا بدرێ هیچ کەنیسەیەکی تێدا دروست بکەن، کەواتە: هەر کەنیسەیەکی لە دوای ئازادکردن دروست کرابێ، واجبە بڕوخێندرێ، بەڵکو (وَلاَ يُقَرُّونَ عَلَى كَنِيسَةٍ كَانَتْ فِيهِ) لە سەر ئەو کەنیسەیەش جێگیر ناکرێن کە لە کاتی ئازادکردنەکەدا لە شوێنەکەدا هەبێ (فِيالأَصَحِّ) لەفەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام لە فەرموودەی بێهێزدا: لە بەر بەرژەوەندی جێگیر دەکرێن و لێیان ناڕوخێندرێ.

(أَوْ صُلْحًا) یان ئەگەر شوێنێك بە پێکهاتن-بێجەنگ- ئازاد کرابو (بِشَرْطِ الأَرْضِ لَنَا وَشَرْطِ إِسْكَانِهِمْ وَإِبْقَاءِ الْكَنَائِسِ) بەو مەرجەی زەویەکە بۆ ئێمەی موسوڵمان بێ، کافرەکانیش-بە خەرجیە- تێیدا بمێننەوەو کەنیسەکانیشیان بهێڵدرێنەوە، ئەوە (جَازَ) پێکهاتنەکە دروستە، بەڵام (وَإِنْ أُطْلِقَ) ئەگەر باسی کەنیسەکان نەکرا، ئەو کاتە (فَالأَصَحُّ الْمَنْعُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: قەدەغەیەو نابێ کەنیسەکان بهێڵدرێنەوە، بەڵام بە فەرموودەی بێهێز-لەو حاڵەشدا- دەهێڵدرێنەوە، چونکە بۆ خواپەرستی خۆیان پێویستیان هەیە.

(أَوْ لَهُمْ) یان بەو مەرجەی زەویەکە بۆ کافرەکان بێ، ئەو کاتەش (قُرِّرَتْ) کەنیسەکان دەهێڵدرێنەوە، کەوابو: (وَلَهُمُ الإِحْدَاثُ) لەو حاڵەتەی زەویەکە بۆ خۆیانە، دروستە کەنیسەش لەو زەویەدا دروست بکەن (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: کوردستان بەشێکی بە جەنگ ئازاد کراوەو بەشێکی بە پێکهاتن و بەشێکیشی دانیشتووەکان-بێجەنگ- موسوڵمان بوینە، جا لە بەر ئەوەی بە ڕێگایەکی ڕاستی باوەڕپێکراو ئەو سێ شوێنانە لێك جیا ناکرێنەوە، دەتواندرێ بە فەرموودە بێهێزەکان: کەنیسەکانیکۆن-کە بەراوری دروستکردنیان نازاندرێ- لە کوردستاندا بهێڵدرێنەوەو بە مەزهەبی (حنفی)ش ئەو کەنیسەیەی بەخۆی ڕووخاوە بە قوڕو خشت دروست بکرێتەوە.

بەڵام بە هیچ مەزهەبێك دروست نیە ئێستا کەنیسە لە شارە موسوڵمانەکانی کوردستاندا دروست بکرێن، یان کەنیسە ڕوخێندراوەکان چاك بکرێنەوە، کەواتە: بۆ هیچ کاربەدەستێك دروست نیە ئیزنیان بدا کەنیسە دروست بکەن، هەم بۆ هیچ موسوڵمانێکیش دروست نیە یارمەتییان بداو ئیش و کار لە دروستکردن و نوێکردنەوەی

وَيُمْنَعُونَ وُجُوبًا وَقِيلَ نَدْبًا مِنْ رَفْعِ بِنَاءٍ عَلَى بِنَاءِ جَارٍ مُسْلِمٍ، وَالأَصَحُّ الْمَنْعُ

مِنْ الْمُسَاوَاةِ، وَأَنَّهُمْ لَوْ كَانُوا بِمَحَلَّةٍ مُنْفَصِلَةٍ لَمْ يُمْنَعُوا، وَيُمْنَعُ الذِّمِّيُّ رُكُوبَ خَيْلٍ، لاَ حَمِيرٍ وَبِغَالٍ نَفِيسَةٍ، وَيَرْكَبُ بِإِكَافٍ وَرِكَابِ خَشَبٍ لاَ حَدِيدٍ وَلاَ سَرْجٍ، وَيُلْجَأُ إلَى أَضْيَقِ الطُّرُقِ، وَلاَ يُوَقَّرُونَ، وَلاَ يُصَدَّرُونَ فِي مَجْلِسٍ، وَيُؤْمَرُ بِالْغِيَارِ

---

کەنیسەدا بکا، هەرچەند بە کرێش بێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا تَعَاوَنُوا عَلَىالإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ یارمەتی یەکتری مەدەن لە سەر گوناهو دوژمنکاریی خوا.

(وَيُمْنَعُونَ وُجُوبًا وَقِيلَ: نَدْبًا) واجبە، لە فەرموودەیەکی بێهێزدا سووننەتە پەیمان لەئەستۆکان قەدەغە بکرێن: (مِنْ رَفْعِ بِنَاءٍ عَلَى بِنَاءِ جَارٍ مُسْلِمٍ) لەوەی خانووی خۆیان بەرزتر بکەن لە خانووی دراوسێی موسوڵمان (وَالأَصَحُّ اَلْمَنْعُ مِنَ الْمُسَاوَاةِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: نابێ خانووەکەیان بە یەکسانیش بەرز بکەنەوە (وَأَنَّهُمْ لَوْ كَانُوا بِمَحَلَّةٍ مُنْفَصِلَةٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەگەر کافرەکان لەگەڕەکێکی جیابووەوە بن، ئەو کاتە (لَمْ يُمْنَعُوا) قەدەغە ناکرێن خانووی خۆیان بەرز بکەن.

(وَيُمْنَعُ الذِّمِّيُّ رُكُوبَ خَيْلٍ) واجبە: کافری پەیمان لەئەستۆ قەدەغە بکرێ لە سواربوونی ئەسپو ماین (لاَ حَمِيرٍ وَبِغَالٍ نَفِيسَةٍ) نەك لە سواریی کەرو هێستری بە نرخ (وَيَرْكَبُ بِإِكَافٍ وَرِكَابِ خَشَبٍ) سواریی کەرو هێستریش دەبی لە سەر کورتانو ڕکێبی دار بێ (لاَ حَدِيدٍ وَلاَ سَرْجٍ) نەك ڕکێبی ئاسنو زین، چونکە ئیمامی(عمر) ئەوها بڕیاری داوە، هەم نابێ چەك هەڵبگرنو نابێ خزمەتی ئەو جۆرە کەسانەو ئەوشوێنانە بکەن کە بە هۆی خزمەتەکە ڕێزیان لێبندرێو موسوڵمان هاتوچۆیان بکەن، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ڕوون کراونەوە.

(وَيُلْجَأُ إلَى أَضْيَقِ الطُّرُقِ) کاتێ لە ڕیگەدا پەیمان لەئەستۆ دەگاتە موسوڵمانان دەبی پاڵ بدرێتە تەسکترینی ڕێگەکان، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تَبْدَأُوا الْيَهُودَ وَالنَّصارَى بِالسَّلاَمِ، وَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِي طَرِيقٍ فَاضْطَرُّوهُ إِلى أَضْيَقِهِ﴾ رواه مسلم، حەرامە: ئێوە سەلام لە جولەکەو دیانەکان مەکەن، هەر کاتێك لە ڕیگەیەکدا گەیشتنە یەکێکیان ئێوە ناچاری بکەن بۆ تەسکترین ڕێگە. (وَلاَ يُوَقَّرُونَ وَلاَ يُصَدَّرُونَ فِي مَجْلِسٍ) حەرامەو نابێ لە هیچ دانیشگەیەکدا پەیمان لەئەستۆ بە گەورە دابندرێو ڕێزی لێبندرێو نابێ لە سەرەوەو لە شوێنە ڕێزدارەکانی دانیشگەش دابنیشێندرێ.

(وَيُؤْمَرُ بِالْغِيَارِ) واجبە: فەرمان بە ئافرەتو پیاوی پەیمان لەئەستۆ بکرێ: بەرگێکی نیشانەکراو دەبەر بکەن تاکو لە موسوڵمانان دیار بن، ئینجا وا باشە: نیشانەی جووەکان زەرد بێ، نیشانەی گاور=دیانەکان شین بێ، نیشانەی ئاگرپەرستەکان ڕەش، یان سوور بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَالزُّنَّارِ فَوْقَ الثِّيَابِ، وَإِذَا دَخَلَ حَمَّامًا فِيهِ مُسْلِمُونَ أَوْ تَجَرَّدَ عَنْ ثِيَابِهِ جَعَلَ فِي عُنُقِهِ

خَاتَمَ حَدِيدٍ أَوْ رَصَاصٍ وَنَحْوُهُ، وَيُمْنَعُ مِنْ إِسْمَاعِهِ الْمُسْلِمِينَ شِرْكًا وَقَوْلَهُمْ فِي عُزَيْرٍ وَالْمَسِيحِ، وَمِنْ إِظْهَارِ خَمْرٍ وَخِنْزِيرٍ وَنَاقُوسٍ وَعِيدٍ، وَلَوْ شُرِطَتْ هَذِهِ الأُمُورُ فَخَالَفُوا لَمْ يُنْتَقَضِ الْعَهْدُ، وَلَوْ قَاتَلُونَا أَوْ اِمْتَنَعُوا مِنَ الْجِزْيَةِ أَوْ مِنْ إِجْرَاءِ حُكْمِ الإِسْلاَمِ اِنْتَقَضَ،

---

(وَالزُّنَّارِ فَوْقَ الثِّيَابِ) هەم فەرمانیان پێدەکرێ پشتێندە گەورەکەشیان لە سەر جلەکانیان ببەستن، چونکە ئیمامی (عمر) فەرمانی بەو دوو نیشانانەش کردوە.

(وَإِذَا دَخَلَ حَمَّامًا فِيهِ مُسْلِمُونَ) هەر کاتێك پەیمان لەئەستۆ چووە گەرماوێك کە موسوڵمانی تێدا بون (أَوْ تَجَرَّدَ عَنْ ثِيَابِهِ) یان لە شوێنێکیتر خۆی ڕووت کردەوە لەو دوو حاڵەتەدا (جَعَلَ فِي عُنُقِهِ خَاتَمَ حَدِيدٍ أَوْ رَصَاصٍ وَنَحْوُهُ) واجبە: ئاڵقەیەکی ئاسن، یان مس، یان لە شتێکیتر دابنێتە ئەستۆی، تاکو لە موسوڵمانان جیا بکرێتەوە، بەڵام حەرامە: ئافرەتەکانیان لەگەڵ ئافرەتی موسوڵمانان بچنە گەرماو، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُمْنَعُ مِنْ إِسْمَاعِهِ الْمُسْلِمِينَ شِرْكًا) واجبە پەیمان لەئەستۆ قەدەغە بکرێ: هیچ ووشەیەکی کوفر نەخەنە گوێی موسوڵمانان، وەك بڵێن: خوا سێیەمی خوایانە، هەم (وَقَوْلَهُمْ فِي عُزَيْرٍ وَالْمَسِيحِ عليهما السلام) نابێ ئەوەش بخەنە گوێی موسوڵمانان کە دەڵێن: (عزیر) کوڕی خوایە، یان (عیسى) کوڕی خوایە.

(وَمِنْ إِظْهَارِ خَمْرٍ وَخِنْزِيرٍ وَنَاقُوسٍ وَعِيدٍ) هەروەها قەدەغە دەکرێن و نابێ لە ناو موسوڵماناندا شەراب فرۆشتن و شەرابخواردنەوە ئاشکرا بکەن، نابێ بەراز خواردن ئاشکرا بکەن و نابێ زەنگی کەنیسەکان لێبدەن، نابێ جەژنەکانیان ئاشکرا بکەن، هەم قەدەغە دەکرێن لە ئاشکراکردنی گشت بێشەرعیەکیتر: وەك خواردن و خواردنەوەی بە ئاشکرا لە ڕەمەزاندا، کەواتە: هەر شتێکیان لەوانە بە ئاشکرایی کرد، واجبە: تەمبێ بکرێن و شەرابەکەیان لێبڕژێندرێ و زەنگەکەیان خراپ بکرێ، بەڵام ئەگەر تەنها لە نێوان خۆیاندا ئاشکرایان دەکرد، یان ئەوان لە گوندێکدا سەربەخۆ نیشتەجێ بون، ئەو کاتە نابێ قەدەغە بکرێن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَلَوْ شُرِطَتْ هَذِهِ الأُمُورُ) ئەگەر نەکردنی ئەو کارانەیڕابردوو بە مەرج داندرا (فَخَالَفُوا) جا پەیمان لەئەستۆکانیش سەرپێچییان کردو کردنیان، ئەو کاتە (لَمْ يُنْتَقَضِ الْعَهْدُ) پەیمان بەستنەکەیان هەڵناوەشێتەوە، بەڵام تەمبێ دەکرێن تا واز دەهێنن.

(وَلَوْ قَاتَلُونَا) ئەگەر پەیمان لەئەستۆکان جەنگیان لەگەڵ ئێمە کرد (أَوْ اِمْتَنَعُوا مِنَ الْجِزْيَةِ) یان وازیان لە سەرانە هێناو نەیاندا (أَوْ مِنْ إِجْرَاءِ حُكْمِ الإِسْلاَمِ) یان ڕازی نەبون بڕیاری ئیسلامیان لە سەر جێبەجێ بکرێ، بە یەکێك لەوانە (اِنْتَقَضَ) پەیمانەکەیان هەڵدەوەشێتەوە.

وَلَوْ زَنَى ذِمِّيٌّ بِمُسْلِمَةٍ أَوْ أَصَابَهَا بِنِكَاحٍ أَوْ دَلَّ أَهْلَ الْحَرْبِ عَلَى عَوْرَةٍ لِلْمُسْلِمِينَ أَوْ فَتَنَ

مُسْلِمًا عَنْ دِينِهِ أَوْ طَعَنَ فِي الإِسْلاَمِ أَوِ الْقُرْآنِ أَوْ ذَكَرَ رَسُولَ اللهِﷺ بِسُوءٍ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ شُرِطَ اِنْتِقَاضُ الْعَهْدِ بِهَا أُنْتُقِضَ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَمَنْ اِنْتَقَضَ عَهْدُهُ بِقِتَالٍ جَازَ دَفْعُهُ وَقَتْلُهُ، أَوْ بِغَيْرِهِ لَمْ يَجِبْ إِبْلاَغُهُ مَأْمَنَهُ فِالأَظْهَرِ، بَلْ يَخْتَارُ الإِمَامُ فِيهِ قَتْلاً وَرِقًّا وَمَنًّا وَفِدَاءً،

---

(وَلَوْ زَنَى ذِمِّيٌّ بِمُسْلِمَةٍ) ئەگەر پیاوێکی پەیمان لەئەستۆ زینای لەگەڵ ئافرەتێکی موسولْمان کرد (أَوْ أَصَابَهَا بِنِكَاحٍ) یان بە مارەبڕین جیماعی لەگەڵ کرد، لە هەردوو حاڵەتیشدا دەیزانی موسولْمانە (أَوْ دَلَّ أَهْلَ الْحَرْبِ عَلَى عَوْرَةٍ لِلْمُسْلِمِينَ) یان کافرەکانی جەنگیی شارەزا کردن لە کەمو کورتیەکی موسوڵمانان، یان جاسوسێکی کافرەکانی حاواندەوە (أَوْ فَتَنَ مُسْلِمًا عَنْ دِينِهِ) یان موسوڵمانێکی لە ئایینەکەی گومڕا کرد، یان داوای لێکرد ببێتە کافر (أَوْ طَعَنَ فِيالإِسْلاَمِ أَوِ الْقُرْآنِ) یان عەیبی لە ئیسلام، یان لە قوڕئان گرت (أَوْ ذَكَرَ رَسُولَ اللهِﷺ بِسُوءٍ) یان بە خراپە باسی پێغەمبەری ئێمەﷺ، یان باسی پێغەمبەرێکیتری کرد، یان موسوڵمانێکی بە قەسدی کوشت، ئەوە (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ إِنْ شُرِطَ انْتِقَاضُ الْعَهْدِ بِهَا) ئەگەر بە مەرج داندرابێ: بە یەکێك لەو تاوانانە پەیمانەکەی هەڵبوەشێتەوە، ئەو کاتە (أُنْتُقِضَ) پەیمانەکەی هەڵدەوەشێتەوە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە مەرج دانەندرابێ (فَلاَ) پەیمانەکەی هەڵناوەشێتەوە، بەڵام لە هەردوو حاڵەتدا سزای کوشتنو تاوانەکانیتری لە سەر جێبەجێ دەکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)و لە لای چەند زانایەکیتر: ئەگەر پەیمان لەئەستۆ بە ئاشکرا جنێو بداتە پێغەمبەرﷺ، یان جنێودانەکە بکاتە عادەت، واجبە بکوژرێ، واتە: ئەگەر بشبێتەوە موسوڵمان کوشتنەکەی لە سەر لاناکەوێ، هەروەك لە (مجمع الانهر)و (الدرالمنتقی)دا ڕوون کراوەتەوە لە (باسی پاشگەز بوونەوەی موسوڵمان)دا بەڵگەمان بۆ هێناوە.

(وَمَنْ انْتَقَضَ عَهْدُهُ بِقِتَالٍ) هەر پەیمان لەئەستۆیەك بە هۆی جەنگکردن پەیمانەکەی هەڵوەشاوە (جَازَ دَفْعُهُ وَقَتْلُهُ) دروستە، بەڵکو واجبە بەرگریی بکرێو جەنگی لەگەڵ بکرێ، هەم دروستە بکوژرێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ﴾ ئەگەر کافرەکان جەنگیان لەگەڵ کردن بیانکوژن.

(أَوْ بِغَيْرِهِ) یان ئەگەر بە بێجەنگ–بە هۆیەکیتر– پەیمانەکەی هەڵوەشاوە، ئەمەش (لَمْ يَجِبْ إِبْلاَغُهُ مَأْمَنَهُ فِيالأَظْهَرِ) واجب نیە بگەیێندرێتە شوێنێکی ئەمینی (دارالكفر)، لە فەرموودەی بەهێزتردا (بَلْ يَخْتَارُ الإِمَامُ فِيهِ: قَتْلاً وَرِقًّا وَمَنًّا وَفِدَاءً) بەڵکو پێشەوا

فَإِنْ أَسْلَمَ قَبْلَ الإِخْتِيَارِ اِمْتَنَعَ الرِّقُّ، وَإِذَا بَطَلَ أَمَانُ رِجَالٍ لَمْ يَبْطُلْ أَمَانُ نِسَائِهِمْ

وَالصِّـبِيَّانِ فِـالأَصَـحِّ، وَإِذَا اخْتَـارَ ذِمِّـيٌّ نَبْـذَ الْعَهْـدِ وَاللُّحُـوقَ بِـدَارِالْحَرْبِ بُلِّـغَ الْمَـأْمَنَ.

(بَابُ الْهُدْنَةِ)

عَقْدُهَا لِكُفَّارِ إِقْلِيمٍ يَخْتَصُّ بِالإِمَامِ أَوْ نَائِبِهِ فِيهَا، وَلِبَلْدَةٍ يَجُوزُ لِوَالِىالإِقْلِيمِ أَيْضًا،

---

سەرپشكە: یان دەیكوژێ، یان دەیكاتە كۆیلە، یان بەخۆڕایی ئازادی دەكا، یان بە مـاڵ، یان بـە دیـل دەیگۆڕێتـەوە، بـەلاّم لـە فەرموودەكـەیتردا: واجبـە: ئەمـەیان بگەیێندرێتـە شوێنێكی ئەمینی (دارالكفر)، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(فَإِنْ أَسْلَمَ قَبْلَ الإِخْتِيَارِ) جا ئەگەر هەڵوشێنەرەكە بووە موسوڵمان پێش ئـەوەی یـەكێك لەو چوارانە هەڵبژێردرێ، ئەو كاتە (امْتَنَعَ الرِّقُّ) نابێ بكرێتە كۆیلەو نابێ بكـوژرێو نابـێ بگۆڕدرێتەوە، كەواتە: واجبە: بەخۆڕایی ئازاد بكرێ.

(وَإِذَا بَطَلَ أَمَانُ رِجَالٍ) هەركاتێك پەیمانی پیاوەكان هەڵوەشاوە (لَمْ يَبْطُـلْ أَمَـانُ نِسَـائِهِمْ وَالصـبِيَّانِ) پــەیمانی ئافرەتـەكانیانو منداڵـەكانیان هەڵناوەشـێتەوە (فِیالأَصَـحِّ) لـە فەرموودەی ڕاستتردا (وَإِذَا اخْتَارَ ذِمِّيٌّ) هەر كاتێك كـافرێكی پـەیمان لەئەسـتۆ بـۆ خـۆی هەڵبژارد: (نَبْذَ الْعَهْدِ وَاللُّحُوقَ بِدَارِالْحَرْبِ) پەیمانەكەی فڕێ بداو بڕواتـە نـاو (دارالحـرب)= (دارالكفر)، ئەو كاتە (بُلِّغَ الْمَأْمَنَ) كافرەكە دەگەیێندرێتـە شـوێنێكی ئـەمینی (دارالكفـر)، واتە: نزیكترین شارەكانی كافرەكان كە ئەو كافرە لە وێدا لە گیانو ماڵی خۆی ئەمین بێ.

﴿ بَابُ الْهُدْنَةِ: **باسی جەنگ وەستاندن لەگەڵ كافرەكان** ﴾

واتە: پێكهاتن لەگەڵ كافرەكانی جەنگی لە سەر ڕاگرتنی جەنگ تـا ماوەیـەكی دیـاركراو بەخۆڕایی، یان لە بەرامبەر وەرگرتنی شتێك لە كافرەكان. جا ئەم جۆرە پێكهاتنە دروستە بــەو مەرجــەی كافرەكــان (مُرْتَــدّ) پاشــگەزبوو نــەبن، خــوای گــەورە دەفــەرموێ: ﴿وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا﴾ ئەگەر كافرەكان مەیلیان بۆ ئاشتی كرد، تۆش مەیل بـۆ ئاشتی بكە. هەم بە بەڵگەی حەدیسـەكەی (صـلح الحدیبیـة) كـە لـە (البخـاری ومسـلم)دا گێڕدراوەتەوە. جابزانـە: ئـەو جـۆرە كافرانـەی ئـەم پێكهاتنـەیان لەگـەڵ كـراوە، پێیـان دەگوترێ: (مُعَاهَدْ)=پەیمان لەگەڵكراو.

ئینجا (عَقْدُهَا لِكُفَّارِ إِقْلِيمٍ) بەستنی پێكهاتنی جەنگ وەستاندن لەگەڵ كافرەكانی هەرێمێك (يَخْتَصُّ بِالإِمَامِ أَوْ نَائِبِهِ فِيهَا) تایبەتە بە پێشەوای موسوڵمانان، یان جێگری پێشەوا لەو هەرێمەدا، بەلاّم (وَلِبَلْدَةٍ) بەستنیپێكهاتنەكە لەگەڵ كافرەكانیشارێك، یان زیـاتر (يَجُـوزُ لِـوَالِي الإِقْلِـيمِ أَيْضًـا) بـۆ كاربەدەسـتی هەرێمەكـەش دروسـتە، هـەروەك بـۆ پێشـەواو جێگرەكەشی دروست بوو، چونكە كاربەدەستەكەش شارەزای بەرژەوەندی هەرێمەكەیە.

وَإِنَّمَـا تُعْقَـدُ لِمَصْـلَحَةٍ كَضَـعْفِنَا بِقِلَّـةِ عَـدَدٍ وَأُهْبَـةٍ أَوْ رَجَـاءِ إِسْـلاَمِهِمْ أَوْ بَـذْلِ جِزْيَـةٍ،

فَإِنْ لَمْ يَكُنْ جَازَتْ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ، لاَ سَنَةً، وَكَذَا دُونَهَا فِي الأَظْهَرِ، وَلِضَعْفٍ تَجُوزُ عَشْرَ سِنِينَ فَقَطْ، وَمَتَى زَادَ عَلَى الْجَائِزِ فَقَوْلاَ تَفْرِيقِ الصَّفْقَةِ، وَإِطْلاَقُ الْعَهْدِ يُفْسِدُهُ، وَكَذَا شَرْطٌ فَاسِدٌ عَلَى الصَّحِيحِ: بِأَنْ شُرِطَ مَنْعُ فَكِّ

---

(وَإِنَّمَا تُعْقَدُ لِمَصْلَحَةٍ) پێکهاتنی جەنگ وەستاندن تەنها بۆ بەرژەوەندیەکی ئیسلام دەبەستریٚ: (كَضَعْفِنَا بِقِلَّةِ عَدَدٍ وَأُهْبَةٍ) وەك ئێمەی موسولمان بێهێز بین بە هۆی کەمیی ژمارەمان و پێویستیەکانی جەنگ (أَوْ رَجَاءِ إِسْلاَمِهِمْ أَوْ بَذْلِ جِزْيَةٍ) یان وەك ئومێدی ئیسلامبوونی کافرەکان، یان سەرانە بدەن.

(فَإِنْ لَمْ يَكُنْ) جا ئەگەر بێهێزیی موسولمانان نەبو، بەڵام بەرژەوەندی لە پێکهاتنەکەدا هەبو، ئەو کاتە (جَازَتْ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ) بۆ ماوەی چوار مانگ پێکهاتنەکە دروستە (لاَ سَنَةً) نەك ماوەی ساڵێك (وَكَذَا دُونَهَا فِي الأَظْهَرِ) هەروەها کەمتر لە ساڵێك و زیاتر لە چوار مانگیش هەر دروست نیە، لە فەرموودەی بەهێزتردا، خوای گەورە لەبارەی کافرەکان دەفەرمویٚ: ﴿فَسِيحُوا فِي الأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ﴾ تا ماوەی چوارمانگ لە زەویدا بگەڕێن. بەڵام لە فەرموودەکەی تردا، کەمتر لە ساڵێك و زیاتر لە چوار مانگ دروستە، چونکە ناگاتە ماوەی سەرانە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها (لِضَعْفٍ) لە حاڵەتی بێهێزیی موسولمانان (تَجُوزُ عَشْرَ سِنِينَ فَقَطْ) ماوەی دە ساڵان پێکهاتنەکە دروستە و زیاتر دروست نیە ﴿عن المسور ومروان رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِصْطَلَحَ مَعَ قُرَيْشٍ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ عَلَى وَضْعِ الْحَرْبِ عَشَرَ سِنِينَ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی (حديبية) لەگەڵ کافرەکان پێك هات: تا ماوەی دە ساڵان جەنگ بوەستێنن.

کەوابو: (وَمَتَى زَادَ عَلَى الْجَائِزِ) هەرکاتێك پێکهاتنەکە –لە یەك مامڵەتدا– لە ئەندازەی دروستیەکە زیاتر بوو، ئەوە (فَقَوْلاَ تَفْرِيقِ الصَّفْقَةِ) هەردوو فەرموودەکانی لێك جیاکردنەوەی مامڵەتێکی تێدایە، واتە: بە فەرموودەی بەهێزتر: لە ئەندازەی دروستەکەدا پێکهاتنەکە دروست دەبێ و لە زیادەکەش بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر لە دوو مامڵەتدا، یان لە زیاتردا پێکهاتنەکان بەسترا و هیچ جارێکیش بە تەنها لە ئەندازەی دروستیەکە زیاتر نەبو، ئەو کاتە گشت پێکهاتنەکان دروست دەبن، هەر چەند کۆی هەمووانیش لە دە ساڵ زیاتر بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِطْلاَقُ الْعَهْدِ) دانەنانی ماوەی پێکهاتنەکە (يُفْسِدُهُ) پوچەڵی دەکاتەوە، واتە: پێکهاتنی بێ ماوەدانان دروست نابێ (وَكَذَا شَرْطٌ فَاسِدٌ) هەروەها دانانی مەرجێکی ناشەرعیش پێکهاتنەکە پوچەڵ دەکاتەوە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (بِأَنْ شُرِطَ مَنْعُ فَكِّ

أَسْرَانَا، أَوْ تَـرْكُ مَـا لَنَـا لَهُـمْ، أَوْ لِتُعْقَـدَ لَهُـمْ ذِمَّـةٌ بِـدُونِ دِينَـارٍ، أَوْ بِـدَفْعِ مَـالٍ إِلَـيْهِمْ، وَتَصِـحُّ الْهُدْنَـةُ عَلَى أَنْ يَنْقُضَـهَا الإِمَـامُ مَتَى شَـاءَ، وَمَتَى صَـحَّتْ وَجَـبَ الْكَـفُّ عَـنْهُمْ حَتَّـى تَنْقَضِـيَ أَوْ يَنْقُضُـوهَا: بِتَصْـرِيحٍ، أَوْ قِتَالِنَـا، أَوْ مُكَاتَبَـةِ أَهْلِ الْحَـرْبِ بِعَـوْرَةٍ لَنَـا، أَوْ قَتْلِ مُسْلِمٍ، وَإِذَا انْتَقَضَتْ جَازَتِ الإِغَارَةُ عَلَيْهِمْ وَبَيَاتُهُمْ.

---

(أَسْرَانَا) وەك بە مەرج دابندرێ: كافرەكان دیلەكانی ئێمەی موسولْمان بەرهەلْ نەدەن (أَوْ تَرْكُ مَا لَنَا لَهُمْ) یان بە مەرجی ئێمەی موسولْمان بۆ ئەوان واز لە شتێكی خۆمان بێنین كە لە بەردەستی ئەواندایە (أَوْ لِتُعْقَدَ لَهُمْ ذِمَّةٌ بِدُونِ دِينَارٍ) یان بە مەرجی مامڵەتی سەرانەیان بۆ ببەسترێ بە كەمتر لە میسقالێكی زێڕ (أَوْ بِدَفْعِ مَالٍ إِلَيْهِمْ) یان بە مەرجی ماڵێكی ئێمەی موسولْمان بدرێتە كافرەكان، ئەوە بە تەنها یەكێك لەو مەرجانە پێكهاتنەكە بەتاڵ دەبێ؟ چونكە سوكایەتیو سەرشۆڕیی ئیسلامی تێدایە، خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿فَلا تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَىالسَّلْمِ وَأَنْتُمُ الأَعْلَوْنَ﴾ ئێوە–ئەی موسولْمانان– بێهێز مەبن لە غەزاكردنو داوای جەنگ وەستاندن مەكەن، ئێوە سەركەوتووترن.

بەڵام ئەگەر كافرەكان دیلە موسولْمانەكانیان ئازار دەدانو بۆ بەرهەڵدانیان ناچار بـوین ماڵیان بدەینێ، یان كافرەكان بە سەر ئێمەی موسولْماندا زاڵ بونو ترساین لەناومان ببەن ئەگەر ماڵیان نەدەینێ، ئەوە لەو دوو حاڵەتـەدا واجبـە: ماڵیـان بـدەینێ، بـەڵام–لەگـەڵ ئەوەشدا– ماڵەكە نابێتە ملكی كافرەكان، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرمویانە.

(وَتَصِحُّ الْهُدْنَةُ) پێكهاتنی جەنگ وەستاندن دروست دەبێ (عَلَـى أَنْ يَنْقُضَـهَا الإِمَـامُ مَتَـى شَاءَ) لە سەر ئەو مەرجەی هەر كاتێك پێشەوا حەزی كرد هەڵیبوەشێنێتەوە، بەڵام (وَمَتَى صَحَّتْ) هەر كاتێك پێكهاتنەكە دروست بێ (وَجَبَ الْكَفُّ عَنْهُمْ) لە سەر موسولْمانان واجبە: واز لە كافرەكان بێننو هیچ زیانێكیان لێنەدەن (حَتَّى تَنْقَضِـيَ) تـا مـاوەی پێكهاتنەكـە تەواو دەبێ، چـونكە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىمُدَّتِهِمْ﴾ ئێـوە پەیمانەكەی گەڵ كافرەكان تەوا بكەن.

(أَوْ يَنْقُضُوهَا) یان تا ئەوان پەیمانەكە هەڵدەوەشێننەوە (بِتَصْرِيحٍ) وەك بە ئاشكرا بڵێن: پەیمانەكەمان هەڵوەشاندەوە (أَوْ قِتَالِنَا) یان جەنگمان لەگـەڵ بكـەن (أَوْ مُكَاتَبَـةِ أَهْـلِ الْحَرْبِ بِعَوْرَةٍ لَنَا) یان بە نووسین ناتەواویەكی ئێمە بگەیننە كافرەكانی جەنگی (أَوْ قَتْلِ مُسْلِمٍ) یان موسولْمانێك بكوژن، یان جاسوسێكی كافرەكانی جەنگی بحاوێننەوە، بە وانە پەیمانەكە هەڵدەوەشێتەوە.

(وَإِذَا انْتَقَضَتْ) هـەر كاتێـك پـەیمانی جـەنگ وەسـتاندن هەڵوەشـاوەو كافرەكـانیش لـە شارەكانی خۆیاندا بون، ئەو كاتە (جَازَتِ الإِغَـارَةُ عَلَـيْهِمْ) دروسـتـە–بێئاگاداركردنـەوە– بە ڕۆژ هێرشیان بكرێتە سەر، هەم (وَبَيَاتُهُمْ) دروستە بە شەوێش هێرشیان بكرێتە سـەر،

وَلَـوْ نَقَـضَ بَعْضُـهُمْ وَلَـمْ يُنْكِـرِ الْبَـاقُونَ بِقَـوْلٍ وَلاَ فِعْـلٍ اِنْـتَقَضَ فِـيهِمْ أَيْضًـا، وَإِنْ أَنْكَـرُوا بِـاعْتِزَالِهِمْ أَوْ إِعْـلاَمِ الإِمَـامِ بِبَقَـائِهِمْ عَلَىالْعَهْـدِ فَـلاَ، وَلَـوْ خَـافَ خِيَـانَتَهُمْ فَلَهُ نَبْذُ عَهْدِهِمْ إِلَيْهِمْ وَيُبْلِغُهُمُ الْمَأْمَنَ، وَلاَ يُنْبَذُ عَقْدُالذِّمَّةِ بِتُهَمَةٍ،

---

خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَإِنْ نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَالْكُفْرِ إِنَّهُمْ لاأَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنْتَهُونَ﴾ ئەگەر کافرەکان پەیمانەکەیان لە دوای بەستن هەڵوەشاندەوەو عەیبیان لە ئـاینی ئێوە گـرت، ئێـوەش سـەرکردەکانی کـوفر بکـوژن، چونکە ئەوان هیچ پەیمانێکیان لەگەڵ ئێوە نیە.

هەروەها–کە کافرەکـانی(مَكَّة) پێکهـاتنی(الْحُدَيْبِيـة)یـان هەڵوەشـاندەوە– پێغەمبـەرﷺ بێئاگادارکردنەوە هێرشی کردە سەر (مَكَّة)و ئازادی کرد. بەڵام ئەگەر کافرەکانی پەیمان هەڵوەشێنەوە لە شارەکانی ئێمەدا بون، ئەو کاتە واجبە بگەێندرێنـە شـوێنێکی ئـەمینی (دارالكفر)، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ نَقَضَ بَعْضُهُمْ) ئەگەر هەنـدێکیان–بـە یـەکێك لـەو هۆیانـەیڕابردوو– پەیمانەکـەیان هەڵوەشـاندەوەو (وَلَـمْ يُنْكِرِالْبَـاقُونَ بِقَـوْلٍ وَلاَ فِعْـلٍ) کافرەکـانیتریش ناڕەزاییـان لـە هەڵوەشاندنەوەکە دەرنەبڕی: نە بەزوبانو نە بەکردار، ئـەو کاتـە (اِنْـتَقَضَ فِـيهِمْ أَيْضًـا) پەیمانەکـە دەرهـەق بێدەنگبووەکـانیش–وەك ئەنجامـدەرەکان– هەڵدەوەشـێتەوە، بەڵام (وَإِنْ أَنْكَرُوا بِـاعْتِزَالِهِمْ) ئەگـەر ئـەوانیتر ناڕەزاییـان دەربڕی: وەك خۆیـان لـە وان جیا کردەوە (أَوْ إِعْلاَمِ الإِمَامِ بِبَقَـائِهِمْ عَلَىالْعَهْدِ) یـان پێشـەوای موسـوڵمانانیان ئاگادار کردەوە: کە ئەوان هەر لە سەر پەیمانەکە بـەردەوامن، ئـەو کاتـە (فَـلاَ) لـەبارەی ئـەوان پەیمانەکە هەڵناوەشێتەوە.

(وَلَوْ خَافَ خِيَانَتَهُمْ) ئەگەر پێشەوا لە خیانەتی پەیمان لەگەڵکراوەکان ترسا: وەك نیشانەیەکی خیانەتەکە ئاشـکرا ببـێ، ئـەو کاتـە (فَلَـهُ نَبْـذُ عَهْـدِهِمْ إِلَـيْهِمْ) بـۆی دروسـتە: پەیمانەکـەیان بـۆ فڕێبداتـەوەو هەڵیبوەشـێنێتەوە، خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ﴾ ئەگەر لە خیانەتی گـەلێکی پـەیمان لەگـەڵکراو ترسـای پەیمانەکـەیان بۆ تێهەڵدەوە، تاکو ئێوەو ئەوان بە یەکسانی بزانن پـەیمان لـە نێوانتانـدا نـەماوە. جا لـەو حاڵەتەدا (وَيُبْلِغُهُمُ الْمَأْمَنَ) واجبە: کافرەکان بگەینێتە شوێنێکی ئەمینی (دارالكفر).

بـەڵام ئەگـەر لـە خیانەتەکـەیان نەترسـێ، دروسـت نیـە پەیمانەکـە هەڵبوەشـێنێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَااسْتَقَامُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ﴾ تا کافرەکان لە پێکهاتنەکەدا لەگەڵ ئێوە ڕاست بن، ئێوەش لەگەڵ ئەوان ڕاست بن. هەروەها (وَلاَ يُنْبَذُ عَقْدُ الذِّمَّة بِتُهَمَةٍ) نابێ پەیمانبەستنی سـەرانە بـە تـەنها تۆمـەتێکی خیانـەت هەڵبوەشـێندرێتەوە، چـونکە پەیمانی سەرانە پتەوترە.

وَلاَ يَجُوزُ شَرْطُ رَدِّ مُسْلِمَةٍ تَأْتِينَا مِنْهُمْ، فَإِنْ شُرِطَ فَسَدَ الشَّرْطُ وَكَذَا الْعَقْدُ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ شَرَطَ رَدَّ مَنْ جَاءَ مُسْلِمًا أَوْ لَمْ يَذْكُرْ رَدًّا فَجَاءَتْ اِمْرَأَةٌ لَمْ يَجِبْ دَفْعُ مَهْرٍ إِلَى زَوْجِهَا فِي الأَظْهَرِ، وَلاَ يُرَدُّ صَبِيٌّ وَمَجْنُونٌ وَكَذَا عَبْدٌ وَحُرٌّ لاَ عَشِيرَةَ لَهُ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَيُرَدُّ مَنْ لَهُ عَشِيرَةٌ طَلَبَتْهُ إِلَيْهَا

---

(وَلاَ يَجُوزُ شَرْطُ رَدِّ مُسْلِمَةٍ تَأْتِينَا مِنْهُمْ) دروست نیه لـه پەیمانەكـەدا بـه مـەرج دابنـدرێ: ئەگەر ئافرەتێكی موسوڵمان له لای كافرەكانەوه بێته لای ئێمه: ئافرەتەكه بگەڕێنینەوه بـۆ كافرەكـان، هەرچـەند لـه لای ئێمـەش بوبێتـه موسـوڵمان، خوایگـەوره دەفـەرموێ: ﴿فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ﴾ ئەگەر زانیتان ئافرەتـەكان موسـوڵمانن مەیانگەڕێننەوه بۆ كافرەكان.

كەوابو: (فَإِنْ شُرِطَ) ئەگەر به مەرج داندرا: ئافرەتی موسوڵمان بگەڕێندرێتەوه، ئەوه (فَسَدَ الشَّرْطُ) مەرجەكه پوچەڵ دەبێو نابێ جێبەجێ بكرێ (وَكَذَا الْعَقْدُ فِي الأَصَحِّ) هەروەها پەیمانبەستنەكەش پوچەڵەو دانامـەزرێ، لـه فـەرموودەی ڕاسـتتردا، بـەڵام دروسته: به مەرج دابندرێ ئافرەتی كافرو پیاوی موسوڵمان بگەڕێندرێنەوه—هەروەك له (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانه—چونكه له پێكهاتنەكـەی (الحديبيـة)دا ئـەم مەرجـه لەبارەی پیاوان ڕەفتاری پێكرا، له بارەی ئافرەتـانیش (نَسْـخ) بـۆوه، هـەروەك لـه (البخاری ومسلم)دا گێڕدراوەتەوه.

كەوابو: (وَإِنْ شَرَطَ رَدَّ مَنْ جَاءَ مُسْلِمًا) ئەگەر پێشەوا به مەرجی دانا: هەر كەسێك له لای كافرەكانەوه به موسوڵمانی بێته لای ئێمه، بگەڕێندرێتەوه (أَوْ لَمْ يَذْكُرْ رَدًّا) یـان باسـی گەڕاندنەوەی نەكرد (فَجَاءَتْ امْرَأَةٌ مُسْلِمَة) ئینجا ئافرەتێكی موسوڵمان له لای كافرەكانەوه هاته لای ئێمه، ئەوه (لَمْ يَجِبْ دَفْعُ مَهْرٍ إِلَى زَوْجِهَا) واجب نیه مارەییەكەی بدرێته مێردە كافرەكەی، بەڵكو سوننەته (فِي الأَظْهَرِ) له فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَلاَ يُرَدُّ صَبِيٌّ وَمَجْنُونٌ) دروست نیه ئەو منداڵو شێتەی شادەیان هێناوه بگەڕێندرێنەوه بۆ ناو كافرەكان، هەر چەند دایكو باوكیشیان داوایان بكەن (وَكَذَا عَبْدٌ وَحُرٌّ لاَ عَشِيرَةَ لَهُ) هەروەها كۆیلەو ئەو پیاوه ئازادەی خزمو كەسیشی له ناو كافرەكانـدا نیـه، یـان خزمـی هەیه بەڵام نایپارێزن، ئەوانەش دروست نیه بگەڕێندرێنەوه بۆ ناو كافرەكان (عَلَى الْمَذْهَبِ) له سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

بەڵام (وَيُرَدُّ مَنْ لَهُ عَشِيرَةٌ طَلَبَتْهُ إِلَيْهَا) ئەو پیاوه ئازادەی خزمی هەنه، ئەگەر خزمـەكانی داوایان كرد بگەڕێندرێنەوه لای خۆیان، ئـەوه دەگەڕێندرێتـەوه لای خزمـەكانی، چـونكه پێغەمبەرﷺ له پێكهاتنەكەی (الحديبية)دا (أبوجَنْدَل)ی گەڕاندەوه لای باوكـه كافرەكـەی هەروەك (البخاری) گێڕاویەتیەوه.

لاَ إِلَى غَيْرِهَا إِلاَّ أَنْ يَقْدِرَ الْمَطْلُوبُ عَلَى قَهْرِ الطَّالِبِ وَالْهَرَبِ مِنْهُ، وَمَعْنَى الرَّدِّ: أَنْ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ طَالِبِهِ، وَلاَ يُجْبَرُ عَلَىالرُّجُوعِ، وَلاَ يَلْزَمُهُ الرُّجُوعُ، وَلَهُ قَتْلُ الطَّالِبِ، وَلَنَا التَّعْرِيضُ لَهُ بِهِ لاَ التَّصْرِيحُ، وَلَوْ شَرَطَ أَنْ يَرُدُّوا مَنْ جَاءَهُمْ مُرْتَدًّا مِنَّا لَزِمَهُمُ الْوَفَاءُ فَإِنْ أَبَوْا فَقَدْ نَقَضُوا، وَالأَظْهَرُ جَوَازُ شَرْطِ أَنْ لاَ يَرُدُّوا.

---

(لاَ إِلَى غَيْرِهَا) بەڵام نابێ موسوڵمانەكە بگەڕێندرێتەوە لای خەڵكیتری جگە لە خزمەكانی (إِلاَّ أَنْ يَقْدِرَ الْمَطْلُوبُ عَلَى قَهْرِ الطَّالِبِ وَالْهَرَبِ مِنْهُ) تەنها ئەگەر موسوڵمانە داواكراوەكە بتوانێ بە سەر كافرە داواكارەكەدا زاڵ ببێو لە بەردەستی ڕابكا، ئەو كاتە دروستە لەگەڵی بگەڕێندرێتەوە، بە بەڵگەی گەڕاندنەوەی (أبوبصير)یداهاتوو.
(وَمَعْنَىالرَّدِّ) واتەی گەڕاندنەوە لێرەدا: (أَنْ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ طَالِبِهِ) ئەوەیە: واز لە نێوان موسوڵمانە داواكراوەكەو كافرە داواكارەكە بهێندرێ، بەڵام (وَلاَ يُجْبَرُ عَلَىالرُّجُوعِ) دروست نیەو نابێ زۆری لێبكرێ: لەگەڵ كافرە داواكارەكەدا بگەڕێتەوە، هەم (وَلاَ يَلْزَمُهُ الرُّجُوعُ) لە سەر موسوڵمانەكەش واجب نیە لەگەڵ كافرەكە بگەڕێتەوە ناو كافرەكان، بەڵكو (وَلَهُ قَتْلُ الطَّالِبِ) بۆ موسوڵمانەكە دروستە: ئەو كافرەش –لە ڕێگەدا– بكوژێ كە هاتوە داوای دەكا، چونكە لە پێكهاتنەكەی (الحديبية)دا دوو كافر هاتنە (مَدِينَة)و داوایان كرد: (أبوبَصِير) بگەڕێندرێتەوە بۆ (مكة)، ئەویش لەگەڵیاندا گەڕاوە، جا لە ڕێگەدا یەكێكیانی كوشتو ئەوەكەیتریش هەڵات، پێغەمبەریشﷺ ڕەخنەی لێنەگرت، هەروەك لە (البخاري)و كتێبەكانی (سيرة)دا بەدرێژی گێڕدراوەتەوە.
(وَلَنَا التَّعْرِيضُ لَهُ بِهِ) بۆ ئێمەش دروستە بە پێچو پەنا بە موسوڵمانەكە بڵێین: كافرەكە –لە ڕێگەدا– بكوژە (لاَ التَّصْرِيحُ) بەڵام دروست نیە بە ئاشكرا پێی بڵێین، چونكە لە پێكهاتنەكەی (اَلْحُدَيْبِيَة)دا كە (أَبُوجَنْدَل) لەگەڵ باوكیدا گەڕاندراوە، ئیمامی(عمر)ﷺ پێی فەرموو: ﴿(أبو جندل) خۆت ڕابگرە، ئەوانە كافرن خوێنی ئەوانە وەك خوێنی سەگ وایە﴾. واتە: بیكوژە. هەروەك ئیمامی (أحمد) و(البيهقي) گێڕاویەتیانەوە.
(وَلَوْ شَرطَ) ئەگەر لە پێكهاتنەكەدا بە مەرج داندرا: (أَنْ يَرُدُّوا مَنْ جَاءَهُمْ مُرْتَدًّا مِنَّا) هەر موسوڵمانێك، كافر ببێو لە ئێمەوە بڕواتە ناو كافرەكان، دەبی كافرەكان بیگەڕێننەوە، ئەوە (لَزِمَهُمُ الْوَفَاءُ) لە سەریان واجبە: مەرجەكە بەجێ بێنن (فَإِنْ أَبَوْا) جا ئەگەر مەرجەكەیان بەجێ نەهێناو كافربووەكەیان نەگەڕاندەوە بۆ لای ئێمە، ئەو كاتە (فَقَدْ نَقَضُوا) ئەوان پەیمانەكەیان هەڵوەشاندۆتەوە (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (جَوَازُ شَرْطِ أَنْ لاَ يَرُدُّوا) دروستە: بە مەرج دابندرێ: كافربووەكە نەگەڕێننەوە، چونكە لە پێكهاتنەكەی (الحدبية)دا پێغەمبەرﷺ بە مەرجی دانا: ﴿هەر موسوڵمانێك بڕواتەوە لای كافرەكان ئەوان نەیگەڕێننەوە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوا دوری بخاتەوە﴾. هەروەك لە (البخاری و مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

## (كِتَابُ الصَّيْدِ وَالذَّبَائِحِ)

ذَكَــاةُ الْحَيَــوَانِ الْمَــأْكُولِ بِذَبْحِــهِ فِــي حَلْــقٍ أَوْ لَبَّــةٍ إِنْ قَــدَرَ عَلَيْــهِ، وَإِلاَّ فَبِعَقْــرٍ مُزْهِــقٍ حَيْــثُ كَــانَ، وَشَــرْطُ ذَابِــحٍ وَصَــائِدٍ حِــلُّ مُنَاكَحَتِــهِ، وَتَحِلُّ ذَكَاةُ أَمَةٍ كِتَابِيَّةٍ، وَلَوْ شَارَكَ مَجُوسِيٌّ مُسْلِمًا فِي ذَبْحٍ أَوْ إِصْطِيَادٍ

---

﴿ كِتَابُ الصَّيْدِ: **پەرتوكى نێچیر و** (وَالذَّبَائِحِ): **سەربڕاوەكان** ﴾

**(ذَكَاةُ الْحَيَوَانِ الْمَأْكُولِ) حەلاڵبوونی ئەو گیاندارەی گۆشتی دەخورێ (بِذَبْحِهِ فِي حَلْقٍ أَوْ لَبَّةٍ) بە سەربڕینیەتی لە سەرەوەی گەرویدا، یان لە بنەوەی گەرویدا، یان لەو نێوانـەدا (إِنْ قَدَرَ عَلَيْهِ) ئەگەر سەربڕەكە دەسەلاتی بە سەردا هەبێ (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر دەسەلاتی بە سەردا نەبێ، ئـەو كاتـە (فَبِعَقْرٍ مُزْهِـقٍ حَيْـثُ كَـانَ) حەلاڵبوونەكـەی بـە برینـداركردنێكی كوشندەیە لە هەر شوێنێكی لاشەكەیدا، هەروەك لە مەودوا بەڵگەی بۆ دێنین،** إن شاءالله تعالى.

**(وَشَرْطُ ذَابِحٍ وَصَائِدٍ) مەرجی سەربڕو ڕاوكەر بۆ ئەوەی گیاندارەكە حەلاڵ ببـێ، ئەوەیـە: (حِلُّ مُنَاكَحَتِهِ) مارەبڕینی لە موسوڵمانان حەلاڵ بێ، واتە: یان موسوڵمان بێ، یان خاوەن كیتاب بێ: وەك جولەكەو دیان=گاور، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواالْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ﴾ سەربڕاوی ئەو كافرانەی لە لایەن خواوە كتێبیان دراوەتێ، بۆ ئێوە حەلاڵە.**

**جا بزانە: بەو مەرجە نێچیرو سەربڕاوی جولەكەو دیانەكان حەلاڵە: كە بێگومـان بزانـدرێ ئەوانە لە نەتەوەی (إِسْرَائِيل)-(يَعْقُوب) پێغەمبەرنﷺ، یان پێش (نَسْخ)بوونەوەو گۆڕینی ئایینەكەیان یەكەم باپیرەیان بووەتە جولەكە، یان دیان، واتە: ئەگەر گومان لە یەكێك لەو دوو مەرجانەدا هەبێ–وەك جولەكەو دیانەكانی ئەم سەردەمە– ئەو كاتە سەربڕاوەكەیان بۆ موسوڵمانان حەلاڵ نیە، هەروەك لـە زۆربـەی سەرچـاوەكاندا فەرموویانـەو لـە (باسـی مارەبڕینی ژنیكافر)شدا درێژتر ڕوون كراوە.**

﴿ **ئاگاداری** ﴾: **لە لای ئیمامی(حنفی): ئەگەر ئەو دوو مەرجەش نەبن سەربڕاوی جولەكەو دیانەكان هەر حەلاڵە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.**

**بەلام لەگەڵ ئەوەشدا چەند زانایەكی خۆیان=مەزهەبی (الحنفی) فەرموویانە: (پارێزكاری واجبەو بـە هـۆی جیـاوازیی فـەرموودەی زانایـان لایـەنی حـەرامی ئەدەگیرێ، با موسوڵمان گۆشتی سەبڕاوی جولەكەو دیانەكانی ئەم سەردەمە نەخوا). هەروەك لە (مجمع الانهر)دا لە (پەرتووكیمارەبڕین)دا ڕوون كراوەتەوە.**

**(وَتَحِلُّ ذَكَاةُ أَمَةٍ كِتَابِيَّةٍ) حەلاڵە (جارية)ی خاوەن كیتاب گیاندار سەر ببڕێ، بەلام بە هیچ جۆرێك گۆشتی سەربڕاوی بێئـایینو ئاگرپەرسـتو بتپەرسـتو پاشـگەزبوو حـەلاڵ نیـە؟ چونكە ئەوانە (أَهْلِ الْكِتَابِ)نین، كەوابو: (وَلَوْ شَارَكَ مَجُوسِيٌّ مُسْلِمًا فِي ذَبْحٍ أَوْ إِصْطِيَادٍ) ئەگەر ئاگرپەرستێك، یان بتپەرستێك، یان پاشگەزبووێك هاوبەشـی موسـوڵمانێكی كـرد:**

حَرُمَ، وَلَوْ أَرْسَلاَ كَلْبَيْنِ أَوْ سَهْمَيْنِ فَإِنْ سَبَقَ آلَةُ الْمُسْلِمِ فَقَتَلَ أَوْ أَنْهَاهُ إِلَى حَرَكَةِ مَذْبُوحٍ حَلَّ، وَلَوْ اِنْعَكَسَ أَوْ جَرَحَاهُ مَعًا أَوْ جُهِلَ أَوْ مُرَتَّبًا وَلَمْ يُذَفِّفْ أَحَدُهُمَا حَرُمَ، وَيَحِلُّ ذَبْحُ صَبِيٍّ مُمَيِّزٍ وَكَذَا غَيْرُ مُمَيِّزٍ وَمَجْنُونٍ وَسَكْرَانَ فِي الأَظْهَرِ، وَتُكْرَهُ ذَكَاةُ أَعْمَى، وَيَحْرُمُ صَيْدُهُ بِرَمْيٍ وَكَلْبٍ فِي الأَصَحِّ، وَتَحِلُّ مَيْتَةُ السَّمَكِ وَالْجَرَادِ وَلَوْ صَادَهُمَا مَجُوسِيٌّ،

---

له سەربڕینی ئاژەڵێکدا، یان لە ڕاوکردنێکدا (حَرُمَ) ئاژەڵە سەربڕاوەکە حەڕام دەبێ (وَلَوْ أَرْسَلاَ كَلْبَيْنِ أَوْ سَهْمَيْنِ) ئەگەر موسوڵمانەکەو یەکێك لەو کافرانە دوو سەك، یان دوو تیر، یان تیرێكو سەگێکیان بەردا سەر نێچیرێك، ئەوە (فَإِنْ سَبَقَ آلَةُ الْمُسْلِمِ فَقَتَلَ) ئەگەر کەرستەکەی موسوڵمانەکە پێش کەوتو نێچیرەکەی کوشت (أَوْ أَنْهَاهُ إِلَى حَرَكَةِ مَذْبُوحٍ) یان گەیاندیە جولەی سەربڕاو (حَلَّ) نێچیرەکە حەڵاڵ دەبێ.

بەڵام (وَلَوْ اِنْعَكَسَ) ئەگەر بە پێچەوانەوە: کەرەستەی کافرەکە پێش موسوڵمانەکە کەوتو کوشتی (أَوْ جَرَحَاهُ مَعًا) یان هەردووکیان وێکڕا برینداریان کردو مرد (أَوْ جُهِلَ) یان نەزاندرا کامەیان پێشتر کوشتویەتی (أَوْ مُرَتَّبًا وَلَمْ يُذَفِّفْ أَحَدُهُمَا) یان یەك لە دوایەك برینداریان کرد، بەڵام برینی هیچێکیان بە پەلە نەیدەکوشت، ئەوە لەو مەسەلانەدا (حَرُمَ) نێچیرەکە حەڕامە.

(وَيَحِلُّ ذَبْحُ صَبِيٍّ مُمَيِّزٍ وَكَذَا غَيْرُمُمَيِّزٍ) حەڵاڵە: منداڵی فامیدەو هەروەها نەفامیش گیاندار سەر ببڕێ (وَ) هەروەها (مَجْنُونٍ وَسَكْرَانَ) حەڵاڵە: شێتو سەرخۆشیش گیاندار سەر ببڕن (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، هەروەها سەربڕاوی بێدەستنوێژو جەنابەتداریش حەڵاڵە، جا لە وانەیڕابردوودا جیاوازی نێرو مێ نیە، چونکە حەڵاڵە ئافرەتیش ئاژەڵ سەر ببڕێ هەرچەند حەیزداریش بێ، هەروك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن كعبﷺ: أَنَّ جَارِيَةً لَهُ ذَبَحَتْ شَاةً بِحَجَرٍ، فَسُئِلَ النَّبِيُّﷺ عَنْ ذَلِكَ؟ فَأَمَرَ بِأَكْلِهَا﴾ رواه البخاري، ئافرەتێکیشوان بە بەردێکیتیژ مەڕێکی سەر بڕی، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: گۆشتەکەی بخۆن.

(وَتُكْرَهُ ذَكَاةُ أَعْمَى) ناپەسندە: مرۆڤی کوێر گیاندار سەر ببڕێ، کەواتە: گۆشتی سەربڕاوەکەی حەڵاڵە، بەڵام (وَيَحْرُمُ صَيْدُهُ بِرَمْيٍ وَكَلْبٍ) نێچیر کوشتنی کوێر حەڕامە: بە چەك هاوێشتنو بە سەگ تێبەردانو شتیتر (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا.

(وَتَحِلُّ مَيْتَةُ السَّمَكِ وَالْجَرَادِ) حەڵاڵە مردووی ماسیو کلۆ بخورێ، هەرچەند مردووی ماسییەکە سەرئاویش کەوتبێ، هەم (وَلَوْ صَادَهُمَا مَجُوسِيٌّ) هەرچەند ئاگرپەرستو بتپەرستیش ڕاویان کردبن، چونکە ئەو دووانە سەر نابڕێن، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ: اَلْحُوتُ وَالْجَرَادُ﴾ رواه البيهقي والحاكم وصححه، دوو مردوو بۆ ئێمە حەڵاڵ کراون: ماسی و کلۆ.

وَكَذَا الدُّودُ الْمُتَوَلِّدُ مِنْ طَعَامٍ كَخَلٍّ وَفَاكِهَةٍ إذَا أُكِلَ مَعَهُ فِالأَصَحِّ، وَلاَ يَقْطَعُ بَعْضَ سَمَكَةٍ حَيَّةٍ، فَإِنْ فَعَلَ أَوْ بَلَعَ سَمَكَةً حَيَّةً حَلَّ فِالأَصَحِّ، وَإِذَا رَمَى صَيْدًا مُتَوَحِّشًا أَوْ بَعِيرًا نَدَّ أَوْ شَاةً شَرَدَتْ بِسَهْمٍ أَوْ أَرْسَلَ عَلَيْهِ جَارِحَةً فَأَصَابَ شَيْئًا مِنْ بَدَنِهِ وَمَاتَ فِي الْحَالِ حَلَّ، وَلَوْ تَرَدَّى بَعِيرٌ وَنَحْوُهُ فِي بِئْرٍ وَلَمْ يُمْكِنْ قَطْعُ حُلْقُومِهِ

---

(وَكَذَا الدُّودُ الْمُتَوَلِّدُ مِنْ طَعَامٍ) هەروەها ئەو كرمەی لە خواردەمەنیش پەیدا دەبێ: (كَخَلٍّ وَفَاكِهَةٍ) وەكو سركەو میوە، ئەویش بە زیندوویی‌و بە مردوویی حەڵاڵە (إذَا أُكِلَ مَعَهُ) بەو مەرجەی لەگەڵ خواردەمەنیەكە كرمەكە بخورێ–نەك بە جیا– (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلاَ يَقْطَعُ بَعْضَ سَمَكَةٍ حَيَّةٍ) نابێ‌و ناپەسندە: مرۆڤ پارچەیەك لە ماسییێكی زیندوو بكاتەوە، بەڵام پارچەكە حەڕام نابێ، كەوابو: (فَإِنْ فَعَلَ) ئەگەر مرۆڤەكە پارچەیەكی لە ماسییێكی زیندوو كردەوەو خواردی (أَوْ بَلَعَ سَمَكَةً حَيَّةً) یان ماسییێكی زیندووی قوتدا، ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا (حَلَّ فِي الأَصَحِّ) خواردنی پارچەكەو ماسیەیە زیندووەكە حەڵاڵە، لە فەرموودەی‌ڕاستتردا، بەڵام–جگە لە ماسی‌و كلۆ– پارچەی گیانلەبەرەكانی‌تر حەڵاڵ نیە، هەروەك لە (باسی خواردنی مردار)دا بەڵگەی بۆ دێنین، إن شاء الله تعالى.

(وَإِذَا رَمَى صَيْدًا مُتَوَحِّشًا) ئەگەر شتێكی تیژی هاویشتە نێچیرێكی كێوی: وەك ئاژەڵ‌و باڵندە (أَوْ بَعِيرًا نَدَّ) یان هاویشتیە ووشترێك كەهەڵاتبو و نەدەگیراوە (أَوْ شَاةً شَرَدَتْ) یان هاویشتیە مەڕێك كە ڕەویبۆوەو نەدەگیراوە (بِسَهْمٍ) شتە تیژەكەش تیر بوو، یان شمشێر، یان تیغێكی‌تری برندە بوو، جا ئەو شتە تیژەش بە گیانلەبەرەكە كەوتو بریندار كردو كوشتی (أَوْ أَرْسَلَ عَلَيْهِ جَارِحَةً) یان دڕندەیەكی بەردا سەر نێچیرەكە (فَأَصَابَ شَيْئًا مِنْ بَدَنِهِ) جا دڕندەكەش شوێنێكی لاشەی نێچیرەكەی گرت‌و (وَمَاتَ فِي الْحَالِ) هەر ئەو دەمیش نێچیرەكە مرد، ئەوە (حَلَّ) لە گشت ئەو مەسەلانەدا گیانلەبەرە كوژراوەكە حەڵاڵە ﴿عن رافع بن خديج‌ﷺ: نَدَّ بَعِيرٌ فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ‌ﷺ: إنَّ لِهَذِهِ الإِبِلِ أوابِدَ كَأَوابِدِالْوَحْشِ فَإِذا غَلَبَكُمْ مِنْهَا شَيْءٌ فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذا﴾ رواه الشيخان، ووشترێك هەڵات، جا پیاوێك تیرێكی هاویشتی‌و كوشتی، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو ووشترانە ڕەوینەوەیەكیان هەیە وەكو ڕەوینەوەی ئاژەڵی كێوی، جا هەركاتێك ووشترێك بە سەرتاندا زاڵ بوو و نەگیراوە، ئەوهای لێبكەن. (بەڵگەی دڕندەش لە باسی نێچیردا دێنین، إن شاء الله تعالى).

بەڵام ئەگەر لەو حاڵەتانەدا گەیشتە گیانلەبەرەكەو گیانی جێگیربووی تێدا مابو، ئەو كاتە مەرجە: سەری ببڕی، ئەگینا: حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ تَرَدَّى بَعِيرٌ وَنَحْوُهُ فِي بِئْرٍ) ئەگەر ووشترێك، یان گیانلەبەرێكی‌تر كەوتە ناو بیرێك، یان كەلێنی چیایەك، یان كەوتە بن دار و بەرد و شتی وەها (وَلَمْ يُمْكِنْ قَطْعُ حُلْقُومِهِ) نەشكونجا

فكَنَادٌ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ لاَ يَحِلُّ بِإِرْسَالِ الْكَلْبِ وَصَحَّحَهُ الرُّويَانِيُّ وَالشَّاشِيُّ وَاللهُ أَعْلَمُ.
وَمَتَى تَيَسَّرَ لُحُوقُهُ بِعَدْوٍ أَوْ اِسْتِعَانَةٍ بِمَنْ يَسْتَقْبِلُهُ فَمَقْدُورٌ عَلَيْهِ، وَيَكْفِي فِي النَّادِّ وَالْمُتَرَدِّي جُرْحٌ يُفْضِي إِلَى الزُّهُوقِ، وَقِيلَ يُشْتَرَطُ مُذَفِّفٌ.

---

سۆریچكو قرتاكەی ببڕدرێن، ئەو جۆرە گیانلەبەرەش (فَكَنَادٍّ) وەك ووشـتری هـەڵاتووە، واتە: شتێكی تیژی لە هەر شوێنێكی لاشەی بدرێو بیكوژێ، ئەوە حەڵاڵ دەبێ.
بەڵام (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ: لاَ يَحِلُّ بِإِرْسَالِ الْكَلْبِ) بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەو گیانلەبەرەی كەوتۆتە ناو بیر، یان بـن شـتێك بـە تێبـەردانی سـەگو دڕنـدە حەڵاڵ نابێ، بەڵكو تەنها بە لێدانی شتێكی تیژ حەڵاڵ دەبێ (وَصَحَّحَهُ الرُّويَانِيُّ وَالشَّاشِيُّ وَاللهُ أَعْلَمُ) ئەم دوو ئیمامەش ئەو فەرموودەیان بە ڕاست داناوە:
﴿عن علي وابن عباس وابن عمر رضالله عنهم: مَا أَعْجَزَكَ مِنَ الْبَهَائِمِ مِمَّا فِي يَدِكَ فَهُوَ كَالصَّيْدِ، وَمَا تَرَدَّى فِي بِئْرٍ فَذَكِّهِ مِنْ حَيْثُ قَدَرْتَ عَلَيْهِ﴾ رواه البخاری والبیهقی، هەر ئاژەڵێك بێتوانای كردی لە وەی لە دەستتدایە ئەوە وەكو نێچیرە، هەر ئاژەڵێكیش كەوتبێتە ناو بیرێك ئەوەش بە برینێكی كوشندە بریندارى بكە لە هەر شوێنێكی كە توانات بە سەریدا هەبێ.
جا ئەگەر ئاژەڵێك بە سەر ئاژەڵێكدا كەوتە بیرێكو ڕمێكی چەقاندە ئاژەڵەكەی سەرەوەو ڕمەكە گەیشتە ئاژەڵەكەی خوارەوەشو هەردووكیان بەو ڕمە مـردن، ئـەوە هـەردووكیان حەڵاڵ دەبن، بەڵام ئەگەر ئاژەڵەكەی بنەوە بە گرانایی ئاژەڵەكەی سەرەوەی بمرێ، ئـەو كاتە هی بنەوە حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا فەرموویانە.
جا بزانە: لە گشت ئەو مەسەلانەیڕابردوودا لەو حاڵەتەدا كوژراوەكە حەڵاڵ دەبێ: كە ئەو دەم دەسەڵاتی سەربڕینی بە سەردا نەبێ، بەڵام (وَمَتَى تَيَسَّرَ لُحُوقُهُ) هـەر كاتێك گونجا ئەم دەمە بگاتە نێچیرەكەو ئاژەڵەكانیتری هەڵاتوو (بِعَدْوٍ أَوْ اسْتِعَانَةٍ بِمَنْ يَسْتَقْبِلُهُ) بـە غاردان، یان بە یارمەتی كەسێك كە پێشی لێبگرێ، ئـەوە (فَمَقْدُورٌعَلَيْهِ) گیانلەبەرەكـە دەسەڵات بەسەردابووە، واتە: لەو حاڵەتەدا ئەگەر لە گەروویدا سەر نەبڕێ حەڵاڵ نابێ.
(وَيَكْفِي فِيالنَّادِّ وَالْمُتَرَدِّي جُرْحٌ) بۆ حـەڵاڵبوونی ئـاژەڵی هـەڵاتوو و كـەوتووی نـاو بـیر و نێچیر: برینێكی كوشندە بەسە: كە (يُفْضِي إِلَىالزُّهُوقِ) برینەكە بیگەینێتە مردن، جیاوازی نیە برینەكە لە هەر شوێنێكی لاشەیدا بێ.
(وَقِيلَ يُشْتَرَطُ مُذَفِّفٌ) لە فەرموودەیـەكی بـێهێزدا: مەرجـە برینەكـە بـە پەلـە بیكـوژێ.
جـا بزانـە: هـەر ئاژەڵێـك سـەر بـڕا، یـان بـە بریندـاركردن كـوژرا، ئەگـەر كۆرپەكـەی نـاو زگیشـی مردبـێ، كۆرپەكـەش حـەڵاڵ دەبـێ، هـەروەك لـە (كتـاب الأطعمـة)دا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى.

وَإِذَا أَرْسَلَ سَهْمًا أَوْ كَلْبًا أَوْ طَائِرًا عَلَى صَيْدٍ فَأَصَابَهُ وَمَاتَ فَإِنْ لَمْ يُدْرِكْ فِيهِ حَيَاةً مُسْتَقِرَّةً أَوْ أَدْرَكَهَا وَتَعَذَّرَ ذَبْحُهُ بِلاَ تَقْصِيرٍ: بِأَنْ سَلَّ السِّكِّينَ فَمَاتَ قَبْلَ إِمْكَانٍ أَوْ امْتَنَعَ بِقُوَّتِهِ وَمَاتَ قَبْلَ الْقُدْرَةِ حَلَّ، وَإِنْ مَاتَ لِتَقْصِيرِهِ: بِأَنْ لاَ يَكُونَ مَعَهُ سِكِّينٌ أَوْ غُصِبَتْ أَوْ نَشِبَتْ فِي الْغِمْدِ حَرُمَ،

---

(وَإِذَا أَرْسَلَ سَهْمًا) ئەگەر تیرێکی هاویشتە نێچیرێك (أَوْ كَلْبًا أَوْ طَائِرًا عَلَى صَيْدٍ) یان سەگێك، یان بازێكی بەردا سەر نێچیرێك (فَأَصَابَهُ وَمَاتَ) جا بەو تیرە، یان بەو سەگو بازە نێچیرەكەی بریندار كردو نێچیرەكە مرد، ئەوە (فَإِنْ لَمْ يُدْرِكْ فِيهِ حَيَاةً مُسْتَقِرَّةً) ئەگەر ڕاوكەرەكە نەگیشتە گیانێكی جێگیربوو لە نێچیرەكەدا، واتە: نێچیرەكە مردبو، یان گەیشتبوە حاڵەتی جولەی سەربڕاو (أَوْ أَدْرَكَهَا وَتَعَذَّرَ ذَبْحُهُ بِلاَ تَقْصِيرٍ) یان گەیشتە گیانێكی جێگیربوو لە نێچیرەكەدا، بەڵام نەگونجا سەری ببڕێو هیچ كەمتەرخەمیشی نەبو: (بِأَنْ سَلَّ السِّكِّينَ فَمَاتَ قَبْلَ إِمْكَانٍ) وەك كێردەكەی دەرهێناو ویستی سەری ببڕێ، بەڵام پێش گونجانی سەربڕین نێچیرەكە مرد، یان پێش ئەوەی ڕاوكەرەكە بگاتە سەر نێچیرەكە، نێچیرەكە مرد (أَوْ امْتَنَعَ بِقُوَّتِهِ وَمَاتَ قَبْلَ الْقُدْرَةِ عَلَيْهِ) یان نێچیرەكە بە هێزی خۆی ڕێگای نەدا ڕاوكەرەكە سەری ببڕێو پێش توانای بە سەردا بێ نێچیرەكە مرد، ئەوە لە گشت ئەو حاڵەتانەدا (حَلَّ) نێچیرەكە حەڵاڵ دەبێ.

بەڵام (وَإِنْ مَاتَ لِتَقْصِيرِهِ) ئەگەر نێچیرەكە گیانی جێگیربووی تێدا بوو و لە بەر كەمتەرخەمیی ڕاوكەرەكە مرد: (بِأَنْ لاَ يَكُونَ مَعَهُ سِكِّينٌ) وەك كێردی پێنەبێ (أَوْ غُصِبَتْ) یان كێردەكەی لێزەوت كرابێ (أَوْ نَشِبَتْ فِي الْغِمْدِ) یان كێردەكە لە كالانەكەیدا گیر بوبێ، ئەوە لەو حاڵەتانەدا (حَرُمَ) نێچیرە مردووەكە حەرامە؟ چونكە زیندوو بووەو سەری نەبڕیوە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إذا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللهِ تَعَالَى عَلَيْهِ، فَإِنْ أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَأَدْرَكْتَهُ حَيّاً فَاذْبَحْهُ﴾ رواه الشيخان، هەر كاتێك سەگەكەت بەردا نێچیرێك، (بسم الله) بڵێ، جا ئەگەر نێچیرەكەی بۆ تۆ گرتو كە گەیشتیێ نێچیرەكە زیندوو بوو، سەری ببڕە.

**پێناسە**: (اَلْحَيَاةُ الْمُسْتَقِرَّة)=گیانی جێگیربوو، ئەو گیانەیە: كە گیانلەبەرەكە جولەی بە ویستی خۆی هەبێ، جا نیشانەی ئەم گیانە ئەوەیە: گیانلەبەرەكە–لە دوای بریندار‌كردنی، یان سەر بڕینی– بە توندی بجولێ، یان لە دوای سەربڕینەكەی خوێنی بە توندی لێدەرقوڵێ، واتە: ئەگەر هیچێك لەو نیشانانە نەبو، ئەوە مردارەو حەڵاڵ نابێ، بەڵام جولەی بەهێز بە تەنها بەسە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

هەروەها مەبەست لە (حَرَكَةُ الْمَذْبُوح)=جولەیسەربڕاو=جولەیناچاری، ئەوەیە: گوێلێبوونو دیتنو جولەی بە ویستی خۆی نەمێنێ، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

وَلَوْ رَمَاهُ فَقَدَّهُ نِصْفَيْنِ حَلاً، وَلَوْ أَبَانَ مِنْهُ عُضْوًا بِجُرْحٍ مُذَفِّفٍ حَلَّ الْعُضْوُ وَالْبَدَنُ، أَوْ بِغَيْرِ مُذَفِّفٍ ثُمَّ ذَبَحَهُ أَوْ جَرَحَهُ جُرْحًا آخَرَ مُذَفِّفًا حُرُمَ الْعُضْوُ وَحَلَّ الْبَاقِى، فَإِنْ لَمْ يَتَمَكَّنْ مِنْ ذَبْحِهِ وَمَاتَ بِالْجُرْحِ حَلَّ الْجَمِيعُ، وَقِيلَ يَحْرُمُ الْعُضْوُ، وَذَكَاةُ كُلِّ حَيَوانٍ قُدِرَ عَلَيْهِ بِقَطْعِ كُلِّ الْحُلْقُومِ وَهُوَ مَخْرَجُ النَّفسِ، وَالْمَرِىءِ وَهُوَ مَجْرَى الطَّعَامِ،

---

(وَلَوْ رَمَاهُ فَقَدَّهُ نِصْفَيْنِ) ئەگەر تیغێکی هاویشتە نێچیرێك‌و کردیە دوو پارچە (حَلاً) هەردوو پارچەکان حەڵاڵ دەبن (وَ) هەروەها (لَوْ أَبَانَ مِنْهُ عُضْوًا بِجُرْحٍ مُذَفِّفٍ) ئەگەر ئەندامێکی لە نێچیرەکە کردەوە بە برینێکی وەها: کە بە پەلە دەیکوشت (حَلَّ الْعُضْوُ وَالْبَدَنُ) ئەندامەکەو لاشەکەی هەردووك حەڵاڵ دەبن.

(أَوْ بِغَيْرِ مُذَفِّفٍ) بەڵام ئەگەر برینەکە بە پەلە نەیدەکوشت (ثُمَّ ذَبَحَهُ) ئینجا لە دوای لێکردنەوەی ئەندامەکە نێچیرەکەی سەر بڕی (أَوْ جَرَحَهُ جُرْحًا آخَرَ مُذَفِّفًا) یان بە برینێکی‌تر برینداری کردو برینەکەی‌دووەم بە پەلە دەیکوشت، ئەوە لەو دوو مەسەلەیەدا (حُرُمَ الْعُضْوُ وَحَلَّ الْبَاقِى) ئەندامە لێکراوەکە حەرامەو لاشەکەی‌تریش حەڵاڵە.

بەڵام (فَإِنْ لَمْ يَتَمَكَّنْ مِنْ ذَبْحِهِ وَمَاتَ بِالْجُرْحِ) ئەگەر بۆی نەگونجا نێچیرەکە سەر ببڕێ‌و بە برینەکەی‌یەکەم مرد، ئەو کاتە (حَلَّ الْجَمِيعُ) ئەندامەکەو لاشەکە هەردووکی حەڵاڵ دەبن (وَقِيلَ: يَحْرُمُ الْعُضْوُ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: ئەندامەکە حەرام دەبێ.

## ﴿ چۆنیەتی سەربڕینی گیانلەبەر ﴾

(وَذَكَاةُ كُلِّ حَيَوَانٍ قُدِرَ عَلَيْهِ) سەربڕینی گشت گیانلەبەرێکی توانای بە سەردا ببێ، دێتە جێ (بِقَطْعِ كُلِّ الْحُلْقُومِ) بە بڕینی هەموو قرتاکەی (وَهُوَ مَخْرَجُ النَّفَسِ) قرتاکە: بۆڕیەی دەرچوونی هەناسەیە، هەم (وَالْمَرِىءِ) بە بڕینی هەموو سۆریچکەی (وَهُوَ مَجْرَى الطَّعَامِ) سۆریچك: بۆڕیەی پێداڕۆیشتنی خواردن‌و خواردنەوەیە، واتە: ئەگەر تەنها یەکێکیان ببڕدرێ، یان بەشێکی کەم لە تەنها یەکێکیان نەبڕدرێ سەربڕاوەکە حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەڵام لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: ئەگەر بەشێکی کەم لە تەنها سۆریچك، یان لە تەنها قرتاکە بمێنێتەوە، زیانی نیەو سەربڕینەکە دێتە جێ، ئیمامی (الماوردى)و (الشاشى) ئەم فەرموودە بێ‌هێزەیان گێڕاوەتەوەو ئیمامی (الرويانى)ش هەڵیبژاردوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرمویەتی.

هەروەها لە لای ئیمام (ابى‌حنيفه): ئەگەر لە چواران سێ ببڕدرێن–واتە: هەردوو دەمارەکانی مل لەگەڵ تەنها سۆریچك، یان لەگەڵ تەنها قرتاکە ببڕدرێن– سەربڕاوەکە حەڵاڵ دەبێ، هەروەك لە (المجموع)و (مجمع الأنهر)دا فەرموویانە.

.............................................................................

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: بۆ حەڵاڵبوونی سەربڕاوەکە مەرجە: ئەو گوێزیلەی بە بۆڕیەی هەناسەوەیە، هەمووی، یان بەشێکی کەمی بە لای سەری ئاژەڵەکەوە بمێنێتەوە، واتە: ئەگەر ئاژەڵەکە لە بن شەویلەکانیەوە سەر بڕا و هیچی ئەو گوێزیلەیە لەگەڵ سەریەوە نەهات، ئەوە مردارەو حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)و (حاشية عوض)دا ڕوون کراوەتەوە.
هەروەها ئەگەر سەری گیانلەبەرێك بە دەست هەڵبکەنێ، یان بە گوللەی تفەنگ پەلی بدا، ئەو کاتەش مردارەو حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
دووەم: بۆ حەڵاڵبوونیسەربڕاوەکە مەرجە: لە کاتی دەستپێکردنی سەربڕینەکەیدا گیانی جێگیربووی تێدابێ–کە بە جولەی توندو بە خوێن لێهاتنی توند دەزاندرێ– هەروەك لە پێناسەکەدا ڕابرا، کەوابو: ئەگەر هۆیەکی بەهیلاکدەر هەبوو: وەك دڕندەیەك ئاژەڵەکەی بریندار کرد، یان بانێکی بە سەردا ڕوخا، یان زگی دڕێندرا و ڕیخۆڵەکانی هاتنە دەرەوە بەڵام لێی جیا نەبونەوە، یان گیایەکی کوشندەی خوارد، یان هەر هۆیەکیتری بەهیلاکدەر، ئەوە ئەگەر گیانلەبەرەکە لە کاتی دەستپێکردنی سەربڕینەکەیدا گیانی جێگیربووی تێدا بێ، سەربڕاوەکە حەڵاڵ دەبێ، هەر چەند بێگومانیش بزانین بەو هۆیە دەمرێ، وە ئەگەر لەو کاتدا گیانی جێگیربووی تێدا نەبێ–وەك بە توندی نەجولێو خوێنی بە توندی لێنەیێ– ئەوە مردارەو حەڵاڵ نابێ.
بەڵام ئەگەر هۆیەکی بەهیلاکدەر نەبێ: وەك ئاژەڵەکە لەخۆیوە نەخۆش بوبێ، یان گیایەکی نەخۆشکەری خواردبێو نەخۆش بوبێ، ئەوە لەو حاڵەتەدا گیانی جێگیربوو مەرج نیە، کەواتە: ئەگەر ئاژەڵەکە بشگاتە حاڵەتی دواگیانو تۆزێك گیانی تێدا مابێ، ئەوە بە سەربڕین حەڵاڵ دەبێ.
هەروەها ئەگەر گیانلەبەرێك پیری، یان دەستی ووشكو لەکارکەوتوو بێ، ئەوە بەسەربڕین پێو دەستە لەکارکەوتووەکانیشی حەڵاڵ دەبن، هەروەك لە (المجموع) و (تحفە)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.
سێیەم: ئەگەر سەربڕەکە سۆریچكو قرتاکەی بە تەواوی نەبڕینو دەستی لێهەڵگرتو ئاژەڵەکە گیانی جێگیربووی نەماو گەیشتە جولەی سەربڕاو، ئینجا ئەوەندەی مابۆوە بڕیی، ئەوە مردارەو حەڵاڵ نابێ، بەڵام ئەگەر لە دوای دەست لێهەڵگرتنەکە گیانی جێگیربووی تێدا مابێو سەبڕینەکەی تەواو بکا، یان کێردەکەی لێبەربۆوەو بە پەلە هەڵیگرتەوەو سەربڕینەکەی تەواو کرد، یان بە هۆی ڕاچەنینی سەربڕاوەکە دەستی لاکەوتو بە پەلە گەڕاندیەوەو سەربڕینەکەی تەواو کرد، یان کێردەکەی کول بوو، جا پێش دەست لێهەڵگرتن کێردێکی تیژی بۆ هاتو سەربڕینەکەی تەواو کرد، ئەوە لەو حاڵەتانەدا سەربڕاوەکە حەڵاڵ دەبێ.

وَيُسْتَحَبُّ قَطْعُ الْوَدَجَيْنِ وَهُمَا عِرْقَانِ فِي صَفْحَتَيِ الْعُنُقِ، وَلَوْ ذَبَحَهُ مِنْ قَفَاهُ عَصَى، فَإِنْ أَسْرَعَ فَقَطَعَ الْحُلْقُومَ وَالْمَرِيءَ وَبِهِ حَيَاةٌ مُسْتَقِرَّةٌ حَلَّ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَكَذَا إِدْخَالُ سِكِّينٍ بِأُذُنِ ثَعْلَبٍ،

---

هەروەها ئەگەر لە دوای بڕینی بەشێکی سۆریچك و قرتاکە گیانی جێگیربووی تێدا مابێ و یەکێکیتر سەر بڕینەکەی تەواو بکا، یان دڕندەیەك بەشێکی سۆریچك و قرتاکە لە ئاژەڵەکە بڕیێ و گیانی جێگیربووشی تێدا مابێ، ئینجا موسوڵمانێك ئەو بەشەی ماوە بە تەواوی بڕیێ، ئەو کاتەش لە هەردوو مەسەلەدا سەربڕاوەکە حەڵاڵ دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

بەڵام ئەگەر دڕندەکە هەموو سۆریچك، یان هەموو قرتاکەی لە ئاژەڵەکە بڕیبوو، یان گەیاندبویە حاڵەتی جولەیسەربڕاو: وەك ڕیخۆڵەکانی لێجیاکردبنەوە، ئینجا موسوڵمانێك بە تەواوی سەری بڕی، ئەو کاتە مردارەو حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە (الانوار)و (البجيرمی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُسْتَحَبُّ قَطْعُ الْوَدَجَيْنِ) لە سەربڕینەکەدا سوننەتە: هەردوو دەمارەکانی ملیش ببڕدرێن: کە (وَهُمَا عِرْقَانِ فِي صَفْحَتَيِ الْعُنُقِ) دوو ڕەگن لە پێشەوەی هەردوو لای ئەستۆی گیانلەبەرن، جا هەرکاتێك ئەو دوو دەمارەو سۆریچك و قرتاکەی بڕین سوننەتە دەستی لێهەڵگرێ تا گیانی دەردەچێ، واتە: ناپەسندە لەو چوارانە زیاتر ببڕێ، یان پێش گیاندەرچون سەری لێبکاتەوە، یان ملی بشکێنێ، یان بیگوێنێ، یان ڕایبکێشێتە شوێنێکیتر، یان ئەندامێکی لێبکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەندامەکە حەڵاڵە، هەروەك زۆربەی سەرچاوەکان ئەو کردارانەیان بە ناپەسند داناون.

(وَلَوْ ذَبَحَهُ مِنْ قَفَاهُ) ئەگەر لە پشت ملەوە ئاژەڵەکەی سەر بڕی (عَصَى) گوناهبار دەبێ، چونکە ئازاردانی تێدایە، ئینجا (فَإِنْ أَسْرَعَ) ئەگەر سەربڕەکە پەلەی کردو (فَقَطَعَ الْحُلْقُومَ وَالْمَرِيءَ وَبِهِ حَيَاةٌ مُسْتَقِرَّةٌ) سۆریچك و قرتاکەی بڕین لەو حاڵەتەش ئاژەڵەکە گیانی جێگیربووی تێدا بوو، ئەوە (حَلَّ) حەڵاڵ دەبێ (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر لە حاڵەتی بڕینی سۆریچك و قرتاکە ئاژەڵەکە گیانی جێگیربووی نەمابو، ئەوە (فَلَا) حەڵاڵ نابێ و مردارە، هەروەها ئەگەر بە مەقەسیش سەری بقرتێنێ ئەو کاتەش مردارەو حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَكَذَا إِدْخَالُ سِكِّينٍ بِأُذُنِ ثَعْلَبٍ) هەروەها ئەگەر کێردەکەی بە ناو گوێی ڕێویدا بردە ژورەوە، تاکو سۆریچك و قرتاکەی لە بن پێستەیدا ببڕێ و پێستەکەی خراپ نەبێ، ئەوەش حەرامە، چونکە ئازاردانی تێدایە، جائەگەر بە پەلە لە کاتی گیانی جێگیربوودا سۆریچك و قرتاکەی بڕین، ئەوە حەڵاڵ دەبێ، ئەگینا: حەرامەو مردارە.

وَيُسَنُّ نَحْرُ إِبِلٍ، وَذَبْحُ بَقَرٍ وَغَنَمٍ، وَيَجُوزُ عَكْسُهُ، وَأَنْ يَكُونَ الْبَعِيرُ قَائِمًا مَعْقُولَ الرُّكْبَةِ، وَالْبَقَرَةُ وَالشَّاةُ مُضْجَعَةً لِجَنْبِهَا الأَيْسَرِ، وَيُتْرَكُ رِجْلُهَاالْيُمْنَى، وَتُشَدُّ بَاقِالْقَوائِمِ، وَأَنْ يُحِدَّ شَفْرَتَهُ، وَيُوَجِّهَ لِلْقِبْلَةِ ذَبِيحَتَهُ، وَأَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللهِ،

---

(وَيُسَنُّ نَحْرُ إِبِلٍ) سوننەتە: ووشتر لە بنەوەی گەرووی‌دا سەر ببڕێ، چونکە ئەوها زوتر گیانی دەردەچێو لە حەدیسی (البخاری ومسلم)دا فەرمانی پێکراوە، هەم (وَذَبْحُ بَقَرٍ وَغَنَمٍ) سوننەتە: مانگاو گامێشو بزنو مەڕو ئاژەڵەکانیترو باڵندەکان لە سەرەوەی گەرووی‌دا سەر ببڕێن، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەوها سەری بڕیوەو (البخاری ومسلم) گێراویەتیانەوە، بەڵام (وَيَجُوزُ عَكْسُهُ) پێچەوانەکەشی دروستەو ناپەسندیش نیە، چونکە تەنها بڕینی سۆریچكو قرتاکە ڕەچاو دەکرێ.

(وَأَنْ يَكُونَ الْبَعِيرُ قَائِمًا مَعْقُولَ الرُّكْبَةِ) سوننەتە: ووشتر بە پێوە سەر ببڕێو ئەژنۆی چەپەیشی ببەسترێو لە سەر سێ پایەی ڕاوەستێ (وَالْبَقَرَةُ وَالشَّاةُ مُضْجَعَةً لِجَنْبِهَا الأَيْسَرِ) سوننەتە مانگاو بزنو مەڕو باڵندەکانیش لە سەر تەنیشتی چەپەیان درێژ بکرێن، هەم (وَيُتْرَكُ رِجْلُهَاالْيُمْنَى) پێی ڕاستەی بەرهەڵ بدرێو (وَتُشَدُّ بَاقِيالْقَوَائِمِ) سێ پەلەکانیتریشی ببەسترێن، هەروەها سوننەتە: بە هێمنی بهێندرێتە شوێنی سەربڕینو پێش سەربڕین ئاوی بدرێتێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرمویانە.

(وَأَنْ يُحِدَّ شَفْرَتَهُ) سوننەتە: کێردەکەی تیژ بکاو تۆزێك هێز بداتە سەر کێردەکە لە هێنانو بردنی‌دا، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إذا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُواالذِّبْحَة وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك ئاژەڵێكتان سەر بڕی بە جوانی سەربڕینەکە بکەن، هەر یەکەتان کێردەکەی تیژ بکاو سەبڕاوەکەی دڵخۆش بکاو بیحەسێنێتەوە.

جا بزانە: ناپەسندە لە بەرچاوی ئاژەڵەکە تیغەکە تیژ بکا، یان لە بەرچاوی ئاژەڵەکە ئاژەڵێکیتر سەر ببڕێ، ناپەسندە بە کێردێکی کول، یان دزراو، یان زەوتکراو سەری ببڕێ، بەڵام بە وانەش سەربڕاوەکە هەر حەڵاڵ دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

بەڵام ئەگەر کێردەکە ئەوەندە کول بوو: بە هێزی دەست سەربڕەکە سۆریچكو قرتاکەی بچڕاندن، یان پێش بچڕاندن ئاژەڵەکە خنکا، یان گیانی جێگیربووی تێدا نەما، ئەو کاتە مردارەو حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُوَجِّهَ لِلْقِبْلَةِ ذَبِيحَتَهُ) سوننەتە سەربڕاوەکە ڕوو لە قیبلە درێژ بکاتە سەر زەمین، جا ئەگەر ئاژەڵەکە ڕوو لە قیبلەش نەکرێ هەر حەڵاڵە (وَأَنْ يَقُولَ بِسْمِ اللهِ) سوننەتە: لە کاتی سەربڕینەکەدا بڵێ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمِ)، جا ئەگەر بە قەسدیش (بِسْمِ اللهِ) نەڵێ، ئەوە ناپەسندە، بەڵام سەربڕاوەکە حەڵاڵ دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە،

وَيُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّﷺ وَلاَ يَقُولُ: بِسْمِ اللهِ وَاسْمِ مُحَمَّدٍﷺ.
(فَصْلٌ) يَحِلُّ ذَبْحُ مَقْدُورٍ عَلَيْهِ وَجَرْحُ غَيْرِهِ بِكُلِّ مُحَدَّدٍ يَجْرَحُ كَحَدِيدٍ وَنُحَاسٍ وَذَهَبٍ وَخَشَبٍ وَقَصَبٍ وَحَجَرٍ وَزُجَاجٍ، إلاَّ ظُفْرًا وَسِنًّا وَسَائِرَ الْعِظَامِ، فَلَوْ قَتَلَهُ بِمُثَقَّلٍ أَوْ ثِقَلِ مُحَدَّدٍ كَبُنْدُقَةٍ وَسَوْطٍ وَسَهْمٍ بِلاَ نَصْلٍ وَلاَ حَدٍّ أَوْ سَهْمٍ وَبُنْدُقَةٍ

---

﴿عن عائشةرضى‌الله عنها: أَنَّهُمْ قالُوا لِلنَّبِيِّﷺ: إنَّ قَوْماً يَأتُونَنَا بِاللَّحْمِ لاَ نَدْرِي أَذَكَرُوااسْمَ اللهِ عَلَيْهِ أَمْ لاَ؟ قالَ: سَمُّوُااللهَ أَنْتُمْ وَكُلُوهُ﴾ رواه البخارى، موسولمانه‌كان گوتیان: خه‌ڵكێك گۆشتمان بۆ دێنن، نازانین له‌ كاتی سه‌ربڕیندا گوتویانه‌ (بسم الله)، یان نا؟ پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی ئێوه‌ بڵێن: (بسم الله)و بیخۆن.
(وَيُصَلِّي عَلَىالنَّبِيِّﷺ) سوننه‌ته‌ سه‌لاواتیش له‌ سه‌ر پێغه‌مبه‌رﷺ لێبدا، به‌ڵام (وَلاَ يَقُولُ: بِسْمِ اللهِ وَاسْمِ مُحَمَّدٍﷺ) حه‌رامه‌و نابێ بڵێ: به‌ ناوی خواو پێغه‌مبه‌رﷺ، چونكه‌ بۆنی (شرك)ی لێدێ.

﴿ فَصْلٌ: **له‌ باسی مه‌رجه‌كانی كه‌رسته‌ی سه‌ربڕین و ڕاوكردن** ﴾

(يَحِلُّ ذَبْحُ مَقْدُورٍ عَلَيْهِ) حه‌ڵاڵ ده‌بێ: سه‌ربڕینی ئه‌و گیانله‌به‌ره‌ی توانای به‌سه‌ردایه‌، هه‌م (وَجَرْحُ غَيْرِهِ) حه‌ڵاڵ ده‌بێ: برینداركردنی ئه‌و گیانله‌به‌ره‌ی توانای به‌سه‌ردا نیه‌ (بِكُلِّ مُحَدَّدٍ يَجْرَحُ) به‌ هه‌ر تیژێكی بریندار بكا: (كَحَدِيدٍ وَنُحَاسٍ وَذَهَبٍ وَخَشَبٍ وَقَصَبٍ وَحَجَرٍ وَزُجَاجٍ) وه‌كو ئاسن‌و مس‌و زێڕو زیو و داروو قامیش‌و به‌ردو شوشه‌، به‌ به‌ڵگه‌ی حه‌دیسه‌كه‌ی ئافره‌ته‌كه‌ی (كعب)ی‌ڕابردوو، هه‌م حه‌دیسه‌كه‌ی‌داهاتوو (إلاَّ ظُفْرًا وَسِنًّا وَسَائِرَ الْعِظَامِ) ته‌نها به‌ نینۆك‌و ددان‌و ئێسقانه‌كانی‌تر سه‌ربڕین‌و نێچیر حه‌ڵاڵ نابێ، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رموویه‌تی: ﴿مَاأَنْهَرَالدَّمَ وَذُكِرَاسْمُ اللهِ عَلَيْهِ فَكُلْ لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفَرَ﴾ رواه الشيخان، هه‌ر تیژێك خوێن لێبێنێ‌و ناوی خوای له‌ سه‌ر گوترا، تۆ بیخۆ، ته‌نها ددان‌و نینۆك نه‌بێ.
كه‌واته‌: ئه‌گه‌ر شتێك تیژ نه‌بێ‌و نێچیری پێبكوژێ: وه‌كو به‌ردو دار، یان تیژ بێ به‌ڵام به‌ تیژیه‌كه‌ی نه‌یكوژێ به‌ڵكو به‌ پانیه‌كه‌ی بیكوژێ، یان به‌ تیژیه‌كه‌و به‌ هۆیه‌كی‌تری حه‌رام بیكوژێ: وه‌كو تفه‌نگ، ئه‌وه‌ نێچیره‌كه‌ مرداره‌و حه‌ڵاڵ نابێ، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رموویه‌تی: ﴿إذا أَصَبْتَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَإِذا أَصَبْتَ بِعَرْضِهِ فَإِنَّهُ وَقِيذٌ فَلاَ تَأْكُلْ﴾ رواه الشيخان، ئه‌گه‌ر به‌ تیژاییه‌اویشتراوه‌كه‌ نێچیره‌كه‌ت كوشت ئه‌وه‌ حه‌ڵاڵه‌و بیخۆ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر به‌ پاناییه‌كه‌ی كوشتت ئه‌وه‌ لێدراوه‌و مه‌یخۆ، واته‌: مرداره‌.
جا هه‌ر به‌ به‌ڵگه‌ی ئه‌م حدیسه‌ (فَلَوْ قَتَلَهُ بِمُثَقَّلٍ) ئه‌گه‌ر نێچیره‌كه‌ی به‌ شتێكی گران كوشت (أَوْ ثِقَلِ مُحَدَّدٍ) یان به‌ گرانایی شتێكی تیژی كوشت: (كَبُنْدُقَةٍ) وه‌كو به‌ردی فنده‌ق‌و به‌رده‌قانی‌و تفه‌نگ‌و هه‌م (وَسَوْطٍ وَسَهْمٍ بِلاَ نَصْلٍ وَلاَ حَدٍّ) وه‌كو شوڕكه‌دار و تیرێكی بێسه‌رو بێتیژایی (أَوْ سَهْمٍ وَبُنْدُقَةٍ) یان به‌ تیرێك‌و فنده‌قێك كوشتی

أَوْ جَرَحَهُ نَصْلٌ وَأَثَّرَ فِيهِ عُرْضُ السَّهْمِ فِي مُرُورِهِ وَمَاتَ بِهِمَا أَوْ إِنْخَنَقَ بِأُحْبُولَةٍ أَوْ أَصَابَهُ سَهْمٌ فَوَقَعَ بِأَرْضٍ أَوْ جَبَلٍ ثُمَّ سَقَطَ مِنْهُ حَرُمَ، وَلَوْ أَصَابَهُ سَهْمٌ بِالْهَوَاءِ فَسَقَطَ بِأَرْضٍ وَمَاتَ حَلَّ، وَيَحِلُّ الإِصْطِيَادُ بِجَوَارِحِ السِّبَاعِ وَالطَّيْرِ كَكَلْبٍ وَفَهْدٍ وَبَازٍ وَشَاهِينٍ

---

(أَوْ جَرَحَهُ نَصْلٌ وَأَثَّرَ فِيهِ عُرْضُ السَّهْمِ فِي مُرُورِهِ) يان سەرە تیژەکە برینداری کردو تەنیشتی تیژەکەش لە تێپەڕبوونیدا کاری تێکردو (وَمَاتَ بِهِمَا) بە برینەکەو بە تەنیشتی تیرەکە مرد (أَوْ إِنْخَنَقَ بِأُحْبُولَةٍ) یان بە پەتێکی فاقەکە خنکا، یان بە تەلەوە مرد (أَوْ أَصَابَهُ سَهْمٌ) یان تیرێکی وێکەوتو برینداری کرد (فَوَقَعَ بِأَرْضٍ أَوْ جَبَلٍ) جا لە دوای برینداربوون کەوتە سەر زەویەکی بەرز، یان سەر لێوی چیایەك (ثُمَّ سَقَطَ مِنْهُ) ئینجا لە بەرزاییەکە، یان لە چیایەکە کەوتە خوارەوەو مرد، ئەوە (حَرُمَ) لەو هەموو مەسەلانەدا نێچیرەکە حەرامە.

بەڵام (وَلَوْ أَصَابَهُ سَهْمٌ بِالْهَوَاءِ) ئەگەر لە ئاسمان، یان لە سەر درەختێك نێچیرەکە تیرێکی وێکەوتو برینداری کرد (فَسَقَطَ بِأَرْضٍ وَمَاتَ) ئینجا کەوتە سەر زەویو مرد، ئەوە (حَلَّ) حەڵاڵە، چونکە بە ناچاری هەر دەبێ بکەوێتە سەر زەمین.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ڕاوکردنی نێچیر بە تفەنگەکانی ئەم سەردەمە حەرامەو نێچیرەکەش مردارەو حەڵاڵ نابێ؟ چونکە گوللەیتفەنگ بە گەرمایی ئاگر دەیسوتێنێو دەیمرێنێ، بەڵام ئەگەر گوللەکە بە شوێنێکی وەهای بکەوێ کە ڕاوکەرەکە بیگاتێو گیانی جێگیربووی تێدا بمێنێو سەری ببڕێ، ئەو کاتە نێچیرەکە بە سەربڕینەکە حەڵاڵ دەبێ، هەروك لە (تحفة)و (إعانة)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا بزانە: جیاوازی تیریکەوانو گوللەیتفەنگ ئەمەیە: تیری کەوان بە هێزی ڕاوچیەکە دەهاوێشترێو بە تیژایی‌خۆی نێچیرەکە دەکوژێ–واتە: ئەگەر نەشهاویشترێ بە لێدانی بە دەستیش هەر بریندار دەکا–، بەڵام گوللەیتفەنگ بە هێزی ئاگر دەردەچێو گوللەکە بەو ئاگرە سور دەبێتەوەو بەو گەرماییەو بە هێزی دەرچوونەکەو بە تیژایی خۆی نێچیرەکە دەکوژێ–واتە: ئەگەر هێزی ئاگرەکە نەبێ، بە هێزی ئادەمیزاد ئەوەندە کار لە بریندارکردن ناکا– کەوابو: لێرەدا هۆی حەڵاڵیو حەرامی–کە تیژاییو گەرمیە– وێکڕا کۆ دەبنەوەو حەرامەکە بە سەر حەڵاڵەکەدا زاڵ دەبێو حەرامی دەکا، هەروك لە (جواهر الفتاوی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيَحِلُّ الإِصْطِيَادُ) ڕاوکردن حەڵاڵە–واتە: نێچیرە کوژراوەکە حەڵاڵ دەبێ– ئەگەر ڕاو کرابێ: (بِجَوَارِحِ السِّبَاعِ وَالطَّيْرِ) بە بریندارکەری دڕندەکانو باڵندەکان: (كَكَلْبٍ وَفَهْدٍ وَبَازٍ وَشَاهِينٍ) وەکو سەگو تاژیو یۆزو بازو شاهینو هەڵۆ

بِشَرْطِ كَوْنِهَا مُعَلَّمَةً: بِأَنْ تَنْزَجِرَ جَارِحَةُ السِّبَاعِ بِزَجْرِ صَاحِبِهَا، وَتَسْتَرْسِلَ بِإِرْسَالِهِ، وَيُمْسِكَ الصَّيْدَ وَلاَ يَأْكُلَ مِنْهُ، وَيُشْتَرَطُ تَرْكُ الأَكْلِ فِى جَارِحَةِ الطَّيْرِ فِىالأَظْهَرِ، وَيُشْتَرَطُ تَكَرُّرُ هَذِهِ الأُمُورِ بِحَيْثُ يُظَنُّ تَأَدُّبُ الْجَارِحَةِ، وَلَوْ ظَهَرَ كَوْنُهُ مُعَلَّمًا ثُمَّ أَكَلَ مِنَ لَحْمِ صَيْدٍ لَمْ يَحِلَّ ذَلِكَ الصَّيْدُ فِىالأَظْهَرِ، فَيُشْتَرَطُ تَعْلِيمٌ جَدِيدٌ، وَلاَ أَثَرَ لِلَعْقِ الدَّمِ،

---

(بِشَرْطِ كَوْنِهَا مُعَلَّمَةً) بەو مەرجەی بریندارکەرەکەی درندەو باڵندەکان فێرە ڕاو کرابێ: (بِأَنْ تَنْزَجِرَ جَارِحَةُ السِّبَاعِ بِزَجْرِ صَاحِبِهَا) وەك درندەکە بوەستێ هەر کاتێك خاوەنەکەی وەستەی لێبکا، هەم (وَتَسْتَرْسِلَ بِإِرْسَالِهِ) تێبەر ببێ هەر کاتێك خاوەنەکەی تێیبەر بدا، هەم (وَيُمْسِكَ الصَّيْدَ) نێچیرەکەش بۆ خاوەنەکەی بگرێ‌و هەر کاتێك خاوەنەکەی هات بۆی واز لە نێچیرەکە بێنێ‌و بەرگری نەکا، هەم (وَلاَ يَأْكُلَ مِنْهُ) هیچیش لە نێچیرەکە نەخوا: نە پێش کوشتنی‌و نە دوای کوشتنی.

(وَ) هەروەها (يُشْتَرَطُ تَرْكُ الأَكْلِ فِى جَارِحَةِ الطَّيْرِ) بە مەرج دادەندرێ، بریندارکەری باڵندەش هیچ لە نێچیرەکە نەخوا (فِىالأَظْهَرِ) لەفەرموودەی بەهێزتردا، هەم پێویستە مەرجەکانی‌تریش –جگە لە وەستان– لە باڵندەدا بێنە جێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُشْتَرَطُ تَكَرُّرُ هَذِهِ الأُمُورِ) بە مەرج دادەندرێ: ئەو چوار کارانەی‌ڕابردوو زیاتر لە جارێك‌و دوو جار دووبارە ببنەوە (بِحَيْثُ يُظَنُّ تَأَدُّبُ الْجَارِحَةِ) بە شێوەیەکی وەها: گومان بەهێز ببێ کە بریندارکەرەکە فێرە ڕاو بووە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَاعَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ﴾ شتی پاك بۆ ئێوە حەڵاڵ کراوە، هەم نێچیری ئەو بریندارکەرانەش کە فێرە ڕاوتان کردون‌و بە فەرمانتان دەجولێنەوە.

(وَلَوْ ظَهَرَ كَوْنُهُ مُعَلَّمًا) ئەگەر بەو مەرجانەی‌ڕابردوو ئاشکرا بوو: بریندارکەرەکە فێرە ڕاو کراوە (ثُمَّ أَكَلَ مِنَ لَحْمِ صَيْدٍ) ئینجا تەنها جارێك لە گوشتی نێچیرێکی خوارد، ئەوە (لَمْ يَحِلَّ ذَلِكَ الصَّيْدُ) ئەو نێچیرە کوژراوە حەڵاڵ نیە (فِىالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ الْمُعَلَّمَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ فَكُلْ، وَإِنْ قَتَلَ فَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ فَلاَ تَأْكُلْ﴾ رواه الشيخان، هەر کاتێك سەگە فێرکراوەکەت بەردا نێچیرێك‌و (بسم الله)ت گوت‌و نێچیرەکەی کوشت گوشتەکەی بخۆ، بەڵام ئەگەر سەگەکە لە نێچیرەکەی خوارد ئەتۆ مەیخۆ. کەوابو (فَيُشْتَرَطُ تَعْلِيمٌ جَدِيدٌ) بە مەرج دادەندرێ: بریندارکەرەکە سەرلەنوێ فێرە ڕاو بکرێتەوە، بەڵام (وَلاَ أَثَرَ لِلَعْقِ الدَّمِ) لێستنەوەی خوێنی نێچیرەکە هیچ کار لە فێرکردنەکە ناکاو نێچیرەکە حەرام نابێ.

جا بزانە: ئەگەر بریندارکەرەکە فێرە ڕاو نەکرابێ، یان مەرجێکی لەو چوار مەرجانەی‌ڕابردوو لێ‌نەهاتە جێ، یان بێ‌تێبەردانی خاوەنەکەی دەنێچیرەکە بەر ببێ،

وَمَعَضُ الْكَلْبِ مِنَ الصَّيْدِ نَجِسٌ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يُعْفَى عَنْهُ وَأَنَّهُ يَكْفِي غَسْلُهُ بِمَاءٍ وَتُرَابٍ، وَلاَ يَجِبُ أَنْ يُقَوَّرَ وَيُطْرَحَ، وَلَوْ تَحَامَلَتِ الْجَارِحَةُ عَلَى صَيْدٍ فَقَتَلَتْهُ بِثِقَلِهَا حَلَّ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ كَانَ بِيَدِهِ سِكِّينٌ فَسَقَطَ وَانْجَرَحَ بِهِ صَيْدٌ أَوْ اِحْتَكَّتْ بِهِ شَاةٌ –وَهُوَ فِي يَدِهِ– فَانْقَطَعَ حُلْقُومُهَا وَمَرِيئُهَا، أَوْ إِسْتَرْسَلَ كَلْبٌ بِنَفْسِهِ فَقَتَلَ لَمْ يَحِلَّ،

---

ئەو کاتە نێچیرە کوژراوەکە حەڵاڵ نابێ، مەگەر ڕاوکەرەکە بیگاتێ و گیانی جێگیربووی تێدا بێ و سەری ببڕێ، ئەو کاتە بەو سەربڕینە حەڵاڵ دەبێ، هەروەها ئەگەر فێرە ڕاویش کرابێ، بەڵام ڕاوکەرەکە گەیشتە نێچیرەکەو گیانی جێگیربووی تێدا مابو، ئەو کاتەش ئەگەر سەری نەبڕێ حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿إذا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ﴾ی ڕابردوو لە پێش (پێناسە)کەدا.

(وَمَعَضُ الْكَلْبِ مِنَ الصَّيْدِ) ئەو شوێنەی لە لاشەی نێچیرەکە سەگ گەزیویەتی، واتە: بەدەم و ددانەکانی گرتویەتی (نَجِسٌ) پیسەو گڵاوبووە (وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يُعْفَى عَنْهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: لەو گڵاوبووە نابوردرێ (وَأَنَّهُ يَكْفِي غَسْلُهُ بِمَاءٍ وَتُرَابٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر ئەوەندە بەسە: حەفت جار بە ئاو بشۆرێ و جارێکیان گڵی تیکەڵ کرابێ و (وَلاَ يَجِبُ أَنْ يُقَوَّرَ وَيُطْرَحَ) واجب نیە شوێنەکە بکۆڵدرێ و فڕێ بدرێ.

(وَلَوْ تَحَامَلَتِ الْجَارِحَةُ عَلَى صَيْدٍ) ئەگەر دڕندەکە خۆی خستە سەر نێچیرێك (فَقَتَلَتْهُ بِثِقَلِهَا) جا بە گرانایی خۆی نێچیرەکەی کوشت، یان بە توندی خۆی لێداو کوشتی، ئەوە (حَلَّ) نێچیرەکە حەڵاڵ دەبێ هەرچەند برینداریش نەبوبێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، هەروەك ئەگەر بە دندوك و نینۆك و ددانەکانی بیکوژێ ئەویش حەڵاڵە، چونکە بێ جیاکردنەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ﴾ لەو نێچیرە بخۆن کە بریندارکەرەکان بۆ ئێوەیان گرتون.

بەڵام ئەگەر نێچیرەکە لە ترسی دڕندەکە گیانی دەربچێ، یان بە هۆی ماندووبوون بمرێ، ئەو کاتە حەڵاڵ نابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: مەرجە مرۆڤەکە لە سەربڕین و لە ڕاوکردندا کردارەکەی مەبەست بێ، بەڵام مەرج نیە: کارتێکراوەکەی مەبەست بێ، کەوابو: (وَلَوْ كَانَ بِيَدِهِ سِكِّينٌ) ئەگەر کێردێکی بە دەستەوە بوو (فَسَقَطَ وَانْجَرَحَ بِهِ صَيْدٌ) ئینجا کێردەکە –بەخۆی– لە دەستی کەوتە خوارەوەو نێچیرێکی پێ بریندار بوو و نێچیرەکە مرد (أَوْ اِحْتَكَّتْ بِهِ شَاةٌ) یان مەڕێك خۆی لە کێردەکە دا (وَهُوَ فِي يَدِهِ) لەم حاڵەتەش کێردەکەی بە دەستەوە بوو (فَانْقَطَعَ حُلْقُومُهَا وَمَرِيئُهَا) جا بەو کێردە سوڕیچك و قرتاکەی بردران (أَوْ إِسْتَرْسَلَ كَلْبٌ بِنَفْسِهِ فَقَتَلَ) یان سەگێك بەخۆی بەڕێوە نێچیرێك و نێچیرەکەی کوشت، ئەوە (لَمْ يَحِلَّ) لەو سێ مەسەلەیەدا ئاژەڵەکە حەڵاڵ نابێ، چونکە مرۆڤەکە مەبەستی سەربڕینی نەکردووە و دڕندەکەشی نەناردووە.

وَكَـذَا لَـوْ إِسْتَرْسَـلَ كَلْـبٌ فَـأَغْرَاهُ صَـاحِبُهُ فَـزَادَ عَـدْوُهُ لَـمْ يَحِـلَّ فِالأَصَـحِّ، وَلَوْ أَصَابَهُ سَهْمٌ بِإِعَانَةِ رِيحٍ حَلَّ، وَلَوْ أَرْسَلَ سَهْمًا لِإِخْتِبَارِ قُوَّتِهِ أَوْ إِلَى غَرَضٍ فَاعْتَرَضَهُ صَيْدٌ فَقَتَلَهُ حَرُمَ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ رَمَى صَيْدًا ظَنَّهُ حَجَرًا أَوْ سِرْبَ ظِبَاءٍ فَأَصَابَ وَاحِدَةً حَلَّ، وَإِنْ قَصَدَ وَاحِدَةً فَأَصَابَ غَيْرَهَا حَلَّ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ غَابَ عَنْهُ الْكَلْبُ وَالصَّيْدُ ثُمَّ وَجَدَهُ مَيِّتًا حَرُمَ عَلَىالصَّحِيحِ،

---

(وَكَذَا لَوْ إِسْتَرْسَلَ كَلْبٌ) هەروەها ئەگەر سەگێك بەخۆی بەر بێتە نێچیرێك (فَأَغْرَاهُ صَاحِبُهُ فَزَادَ عَدْوُهُ) ئینجا خاوەنەكەی هانیداو زیاتر غاریداو نێچیرەكەی كوشت، ئەو كاتەش (لَمْ يَحِلَّ فِيالأَصَحِّ) نێچیرەكە حەلاڵ نیە، لە فەرموودەیڕاستتردا، چونكە هۆی حەلاڵیو هۆی حەڕامی وێكڕا كۆ بونەوە، بەلاَم لە فەرموودەكەیتردا، نێچیرەكە حەلاَڵە، چونكە بە هۆی هاندانەكە زیاتر غاری داوە.

هەروەها ئەگەر مرۆڤەكە هیچ نێچیرێكی نەدەدیتو لەخۆیەوە سەگەكەی ناردو هانی دا، ئینجا سەگەكەش نێچیرێكی گرتو كوشتی، ئەو نێچیرەش حەلاَڵ نابێ، چونكە بێ مەبەست سەگەكەی ناردوە هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ أَصَابَهُ سَهْمٌ بِإِعَانَةِ رِيحٍ) ئەگەر بە پشتیوانی بایەك تێرە هاوێشتراوەكە بە نێچیرەكە كەوتو كوشتی (حَلَّ) نێچیرەكە حەلاَڵە، بەلاَم (وَلَوْ أَرْسَلَ سَهْمًا لِإِخْتِبَارِ قُوَّتِهِ) ئەگەر تیرێكی هاویشت تاكو هێزی خۆی تاقی بكاتەوە (أَوْ إِلَى غَرَضٍ) یا تیرەكەی هاویشتە شتێك (فَاعْتَرَضَهُ صَيْدٌ فَقَتَلَهُ) ئینجا نێچیرێك كەوتە بەر تیرەكەو كوشتی (حَرُمَ فِي الأَصَحِّ) لە هەردوومەسەلەدا نێچیرەكە حەڕامە، لە فەرموودەیڕاستتردا، چونكە هیچ نێچیرێكی مەبەست نەبوە.

بەلاَم (وَلَوْ رَمَى صَيْدًا ظَنَّهُ حَجَرًا) ئەگەر تیرێكی هاویشتە نێچیرێك كە وایتێگەیشتبو بەردێكە، جا نێچیرەكەی كوشت (أَوْ سِرْبَ ظِبَاءٍ فَأَصَابَ وَاحِدَةً) یان تیرێكی هاویشتە كۆمەڵە ئاسكێكو بە یەكێكیان كەوتو كوشتی، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (حَلَّ) كوژراوەكە حەلاَڵە، چونكە كردارەكەی مەبەست بووە.

(وَ) هەروەها (إِنْ قَصَدَ وَاحِدَةً فَأَصَابَ غَيْرَهَا) ئەگەر لە كۆمەڵەكە یەكێكیانی مەبەست بێو تیرەكە بە یەكێكیتر بكەوێو بیكوژێ، ئەو كاتەش (حَلَّ فِيالأَصَحِّ) كوژراوەكە حەلاَڵە، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە نێچیرێكی مەبەست بووە.

(وَلَوْ غَابَ عَنْهُ الْكَلْبُ وَالصَّيْدُ) ئەگەر سەگەكەو نێچیرەكە –پێش بریندارکردن– لە بەرچاوی ون بون (ثُمَّ وَجَدَهُ مَيِّتًا) ئینجا نێچیرەكەی بە مردوویی دیتەوە (حَرُمَ عَلَى الصَّحِيحِ) ئەو نێچیرە حەڕامە، لە سەر فەرموودەیڕاست، چونكە هۆی مردنەكەی نازانرێ، هەرچەند سەگەكەش دەمی بە خوێن بێ.

وَإِنْ جَرَحَـــــهُ وَغَـــابَ ثُـــمَّ وَجَـــدَهُ مَيِّتًـــا حَـــرُمَ فِـــي الأَظْهَـــرِ.
(فَصْـلٌ) يَمْلِكُ الصَّيْدَ بِضَبْطِهِ بِيَدِهِ وَبِجُرْحٍ مُذَفِّفٍ وَبِإِزْمَانٍ وَكَسْرِ جَنَاحٍ وَبِوُقُوعِهِ فِي شَبَكَةٍ نَصَبَهَا وَبِإِلْجَائِهِ إِلَى مَضِيقٍ لاَ يُفْلِتُ مِنْهُ، وَلَوْ وَقَعَ صَيْدٌ فِي مِلْكِهِ وَصَارَ مَقْدُورًا عَلَيْهِ بِتَوَحُّلٍ وَغَيْرِهِ لَمْ يَمْلِكْهُ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَ) هەروەها (إِنْ جَرَحَهُ وَغَابَ) ئەگەر بە تیرەكەی، یان بە سەگەكەی نێچیرەكەی بریندار كرد، ئینجا نێچیرەكە ون بوو (ثُمَّ وَجَدَهُ مَيِّتًا) ئینجا بە مردوویی دیتیەوە، ئەو كاتەش (حَـرُمَ فِيالأَظْهَرِ) نێچیرەكە حەرامە، لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەلاَم لە فەرموودەكەیتردا–كە بە راست داندراوە–: لەم حالَەتەدا نێچیرەكە حەلاَلە، چونكە حەدیسی (صحيح) پالَپشتیەتی: كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إذا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ فَغَابَ عَنْكَ فَأَدْرَكْتَهُ فَكُلْ مَالَمْ يُنْتِنْ﴾ رواه مسلم، هەر كاتێك تیرەكەت لە نێچیرێك دا نێچیرەكەش لە بەرچاوت ون بوو ئینجا دۆزیتەوە، گۆشتی ئەو نێچیرەت بخۆ ئەگەر بۆگەن نەبوبێ.

﴿فَصْلٌ: لە باسی بە ملْكردنی نێچیر﴾

(يَمْلِكُ الصَّيْدَ) راوكەرەكە دەبێتە خاوەنی نێچیرەكە بە چەند رێگایەك: يەكەم: (بِضَبْطِهِ بِيَدِهِ) نێچیرەكە بە دەستی خۆی بگرێ، هەرچەند مەبەستیشی ملْكایەتی نەبێ. دووەم: (وَبِجُرْحٍ مُذَفِّفٍ) بە برینداركردنێكی كوشندە. سێیەم: (وَبِإِزْمَانٍ وَكَسْرِ جَنَاحٍ) بە لەكارخستن، یان بالْ شكاندن بە شێوەیەكی وەها غاردان و فرینی نەمێنێ. چوارەم: (وَبِوُقُوعِهِ فِي شَبَكَةٍ نَصَبَهَا) بە كەوتنە ناو تۆرێك، یان تەلەیەك كە بە نیازی نێچیرگرتن دایتابێتەوە، یان دڕندەیەك بیگرێ كە ئەوتێیبەردابێ.
پێنجەم: (وَبِإِلْجَائِهِ إِلَى مَضِيقٍ لاَ يُفْلِتُ مِنْهُ) بە پەناپێبردنی بۆ تەسكایەكی وەها: كە لێی قورتار نەبێ: وەك نێچیرەكە دەژوورێك بكاو دەرگەی لە سەر كلیل بدا، هەروەها ئەگەر نێچیرەكە بە خۆیشی بێتە ناو خانووەكەیو دەرگەی لە سەر كلیل بدا، یان ماسی بێنە ناو حەوزێكی بچوكی خۆیو ئەویش رێگەی دەرچونیان لە حەوزەكە لێبگرێ، لەو حالَەتانەشدا دەبێتە خاوەنی نێچیرەكە.
(وَلَوْ وَقَعَ صَيْدٌ فِي مِلْكِهِ) ئەگەر نێچیرێك كەوتە ناو ملْكی كەسێك (وَصَارَ مَقْدُورًا عَلَيْهِ بِتَوَحُّلٍ وَغَيْرِهِ) نێچیرەكەش وای لێهات دەسەلاَتی بە سەردا بێ: بە هۆی كەوتنە ناو قوڕو شتیتری وەكو درك و دار، ئەوە (لَمْ يَمْلِكْهُ فِيالأَصَحِّ) خاوەنی ملْكەكە نابێتە خاوەنی نێچیرەكە، لە فەرموودەیڕاستتردا.
هەروەها ئەگەر گیانلەبەرێك–وەك كەروێشك و مێشیهەنگوێن و بالَندەكانیتر– لە ناو ملْكی كەسێكدا هێلانە دابنێ، خاوەن ملْكەكە نابێتە خاوەنی گیانلەبەرەكەو هێلكەكەو هەنگوینەكەو بێچووەكانی، بەلاَم لە هەر دوو مەسەلەدا خاوەن ملْكەكە لە كەسێكیتر

وَمَتَى مَلَكَهُ لَمْ يَزُلْ مِلْكُهُ بِانْفِلاَتِهِ، وَكَذَا بِإِرْسَالِ الْمَالِكِ لَهُ فِىالأَصَحِّ، وَلَوْ تَحَوَّلَ حَمَامُهُ إِلَى بُرْجِ غَيْرِهِ لَزِمَهُ رَدُّهُ، فَإِنْ اخْتَلَطَ وَعَسُرَ التَّمْيِيزُ لَمْ يَصِحَّ بَيْعُ أَحَدِهِمَا وَهِبَتُهُ شَيْئًا مِنْهُ لِثَالِثٍ، وَيَجُوزُ لِصَاحِبِهِ فِىالأَصَحِّ، فَإِنْ بَاعَاهُمَا وَالْعَدَدُ مَعْلُومٌ وَالْقِيمَةُ سَوَاءٌ صَحَّ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ جَرَحَ الصَّيْدَ اثْنَانِ مُتَعَاقِبَانِ: فَإِنْ ذَفَّفَ الثَّانِى أَوْ أَزْمَنَ دُونَ الأَوَّلِ

---

لەپێشترە: کە نێچیرەکەو هەنگوینەکەو هێلکەو بێچووەکانی بۆ خۆی بگرێ، کەواتـە: لـە گشت کەسێکیتر حەرامە -بێ ئیزنی خاوەن ملّکەکە- یەکێك لە وانە بۆ خۆی ببا، بەلاّم- هەرچەند حەرامیشە- ئەگەر بێئیزنی خاوەن ملّکەکە ئەوانەی گرتنو بردنـی، ئـەو کاتـە دەبنە ملّکی خۆی، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

(وَمَتَى مَلَكَهُ) هەر کاتێك کەسێك بووە خاوەنی نێچیرێك: بە یەکێك لەو ڕێگایانەیڕابردوو، ئەوە (لَمْ يَزُلْ مِلْكُهُ بِانْفِلاَتِهِ) نێچیرەکە لە ملّکایەتی وی لاناچێ ئەگەر لێی بەرهەلّ ببێو بڕوا، کەوابو: هەر کەسێك ئەو نێچیرە بگرێتەوە، واجبـە: بـۆ خاوەنەکـەی بیگەڕێنێتـەوە (وَكَذَا بِإِرْسَالِ الْمَالِكِ لَهُ فِىالأَصَحِّ) هەروەها لە فەرموودەیڕاستتردا: ئەگەر خاوەنەکـەش نێچیرەکەی بەرهەلّ بدا هەر لە ملّکایەتیی لاناچـێ، لـە فـەرموودەی ڕاسـتتردا، هـەروەك ئەگەر ئاژەلّێکیش حەتـەلاّ بکا هـەر لـە ملّکایـەتیی لاناچـێ، واتـە: ئەگـەر کەسـێکیش بیگرێتەوە نابێتە ملّکی وی.

(وَلَوْ تَحَوَّلَ حَمَامُهُ إِلَى بُرْجِ غَيْرِهِ) ئەگەر کۆترەکانی چونە گـەلّ کۆترەکـانی کەسـێکیتر (لَزِمَهُ رَدُّهُ) لە سەر کەسەکە واجبە کۆترەکانی بۆ بگەڕێنێتەوە (فَإِنْ اخْتَلَطَ وَعَسُرَ التَّمْيِيزُ) جا ئەگەر کۆتری هەردوو لا تێکەلّ بونو نەگونجا لێك جیا بکرێنەوە، ئەو کاتە (لَمْ يَصِحَّ بَيْعُ أَحَدِهِمَا وَهِبَتُهُ شَيْئًا مِنْهُ لِثَالِثٍ) بۆ هیچێکیان دروست نابێ هیچ بەشێك لـەو کۆترانـە بفرۆشـێتە کەسێکیتریسـێیەم، یـان بیبەخشـێتێ، بـەلاّم (وَيَجُوزُ لِصَاحِبِهِ) دروسـتە: یەکێکیان بەشە کۆترەکەی خۆی بداتە ئەوەکەیتر: بە فرۆشـتن، یـان بـە بەخشـین (فِـى الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا.

(فَإِنْ بَاعَاهُمَا) جا ئەگەر هەردوو خاوەنەکان کۆترەکانیخۆیان فرۆشتنە کەسێکیتر (وَالْعَدَدُ مَعْلُومٌ وَالْقِيمَةُ سَوَاءٌ) ژمارەیکۆترەکانیش زانداراو بوو و نرخەکەشیان یەکسان بـوو، ئـەو کاتە (صَحَّ) فرۆشتنەکە دروست دەبـێ (وَإِلاَّ فَـلاَ) بـەلاّم ئەگـەر ژمارەیـان نەزانـدرا، یـان نرخەکەیان لێك جیا بوو، ئەو کاتە فرۆشتنەکە دروست نابێ، کەوابو: چارە ئەوەیە: سولح بکەنو یەکتری ڕازی بکەن.

(وَلَوْ جَرَحَ الصَّيْدَ اثْنَانِ مُتَعَاقِبَانِ) ئەگـەر دووکـەس-یـەك لـە دوای یـەك- نێچیرێکیان برینـدار کـرد (فَـإِنْ ذَفَّـفَ الثَّـانِى أَوْ أَزْمَـنَ دُونَ الأَوَّلِ) ئەگـەر دووەمەکـە برینێکـی کوشـندەی تێکردبـێ، یـان لـە کـاری خسـتبێ، بـەلاّم یەکەمەکـە هیچـیانی نـەکردبو

فَهُوَ لِلثَّانِي، وَإِنْ ذَفَّفَ الأَوَّلُ فَلَهُ، وَإِنْ أَزْمَنَ فَلَهُ، ثُمَّ إِنْ ذَفَّفَ الثَّانِي بِقَطْعِ حُلْقُومٍ وَمَرِيءٍ فَهُوَ حَلاَلٌ وَعَلَيْهِ لِلأَوَّلِ مَا نَقَصَ بِالذَّبْحِ، وَإِنْ ذَفَّفَ لاَ بِقَطْعِهِمَا أَوْ لَمْ يُذَفِّفْ وَمَاتَ بِالْجُرْحَيْنِ فَحَرَامٌ وَيَضْمَنُهُ الثَّانِي لِلأَوَّلِ، وَإِنْ جَرَحَا مَعًا وَذَفَّفَا أَوْ أَزْمَنَا فَلَهُمَا، وَإِنْ ذَفَّفَ أَحَدُهُمَا أَوْ أَزْمَنَ دُونَ الآخَرِ فَلَهُ، وَإِنْ ذَفَّفَ وَاحِدٌ وَأَزْمَنَ آخَرُ وَجُهِلَ السَّابِقُ حَرُمَ عَلَىالْمَذْهَبِ.

---

(فَهُوَ لِلثَّانِي) ئەوە نێچیرەکە بۆ دووەمەکەیە (وَإِنْ ذَفَّفَ الأَوَّلُ) ئەگەر یەکەمەکە برینێکی کوشندەی تێکردبێ، ئەو کاتە (فَلَهُ) بۆ خۆیەتی (وَإِنْ أَزْمَنَ) هەروەها ئەگەر یەکەمەکە لەکاریشی خستبێ (فَلَهُ) هەر بۆ خۆیەتی (ثُمَّ إِنْ ذَفَّفَ الثَّانِي بِقَطْعِ حُلْقُومٍ وَمَرِيءٍ) ئینجا ئەگەر لە دوایەکەمەکە دووەمەکەش بە برینی سورێچكو قرتاکە نێچیرەکەی کوشت، ئەوە (فَهُوَ حَلاَلٌ) نێچیرەکە بەو سەربرینە حەڵاڵ دەبێ، بەڵام (وَعَلَيْهِ لِلأَوَّلِ مَا نَقَصَ بِالذَّبْحِ) لە سەر دووەمەکە واجبە: نرخی کەمکردنەوەی بە هۆی سەربرینەکە بداتە یەکەمەکە.

(وَإِنْ ذَفَّفَ لاَ بِقَطْعِهِمَا) ئەگەر دووەمەکە برینێکی کوشندەی تێکرد بەڵام سۆریچكو قرتاکەی نەبرین (أَوْ لَمْ يُذَفِّفْ وَمَاتَ بِالْجُرْحَيْنِ) یان برینەکە کوشندە نەبو، بەڵام بە بریندارکردنەکەی یەکەمەکەو دووەمەکە نێچیرەکە مرد، ئەو کاتە لە هەردوو مەسەلەدا (فَحَرَامٌ) نێچیرەکە حەرامە، چونکە لە مەسەلەیەکەمدا توانای بەسەردایەو بە سەربرین نەبێ حەڵاڵ نابێ، لە دووەمەکەشدا برینێکی حەلاڵکەرو برینێکی حەرامکەر وێکرا کۆ بونەوە، کەوابو: (وَيَضْمَنُهُ الثَّانِي لِلأَوَّلِ) دووەمەکە دەبێتە زامینی نێچیرەکە، واجبە نرخەکەی بداتە یەکەمەکە.

(وَإِنْ جَرَحَا مَعًا وَذَفَّفَا) ئەگەر دووکەس وێکرا نێچیرێکیان بریندار کردو بریندارکردنەکەشیان کوشندە بوو (أَوْ أَزْمَنَا) یان کوشندە نەبو، بەڵام بە بریندارکردنەکەیان نێچیرەکەیان لە کار خست، ئەوە (فَلَهُمَا) نێچیرەکە بە هاوبەشی بۆ هەردووکیانە.

(وَ) هەر لەو حاڵەتەی وێکرا برینداری دەکەن (إِنْ ذَفَّفَ أَحَدُهُمَا أَوْ أَزْمَنَ دُونَ الآخَرِ) ئەگەر تەنها یەکێکیان برینێکی کوشندەی تێکرد، یان لە کاری خست، بەڵام برینەکەی ئەویتر کوشندەو لەکارخەر نەبو، ئەو کاتە (فَلَهُ) نێچیرەکە بۆ خاوەنی کوشندەکەو لەکارخەرەکەیە.

(وَإِنْ ذَفَّفَ وَاحِدٌ وَأَزْمَنَ آخَرُ) ئەگەر-یەك لە دوای یەك- یەکێکیان برینێکی کوشندەی تێکردو یەکێکیش لە کاری خست، بەڵام (وَجُهِلَ السَّابِقُ) پێشترەکە نەزاندرا، ئەو کاتە (حَرُمَ عَلَى الْمَذْهَبِ) نێچیرەکە حەرامە، لە سەر فەرموودەیڕاستی مەزهەب، چونکە حەرامکەرو حەلاڵکەر کۆ بونەتەوە.

## (كِتَابُ الأُضْحِيَّةِ)

هِيَ سُنَّةٌ لاَ تَجِبُ إلاَّ بِالْتِزَامٍ، وَيُسَنُّ لِمُرِيدِهَا أَنْ لاَ يُزِيلَ شَعَرَهُ وَلاَ ظُفْرَهُ فِي عَشْرِ ذِيالْحِجَّةِ حَتَّى يُضَحِّيَ،

---

**﴿كِتَابُ الأُضْحِيَّةِ: پەڕتوكی قوربانی﴾**

**قوربانی**: ئەو ئاژەڵەیە لە جەژنی قورباندا سەر دەبڕێ بۆ خواپەرستی.

(هِيَ سُنَّةٌ) قوربانی سوننەتێكی (مُؤَكَّدَة)یە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ نوێژی جەژن بۆ خوای خۆت بكەو قوربانی سەر ببڕە.

﴿وعن أنس ﷺ: ضَحَّى النَّبِيُّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ وَسمَّى وَكَبَّرَ وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ قوربانیی كرد بە دوو بەرانی سپیپاتی شاخدار، بە دەستی خۆی سەری بڕین و گوتی: (بسم الله، والله أكْبَرُ). پێی خۆی دانایە سەر تەنیشتی ڕاستەی ئەستۆی بەرانەكان.

(لاَ تَجِبُ) قوربانی واجب نابێ (إلاَّ بِالْتِزَامٍ) تەنها ئەگەر بەخۆی لە سەر خۆی واجب بكا، ئەو كاتە واجب دەبێ، هەروەك لە مەودوا ڕوونی دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى.

ئینجا بزانە: لەبارەی خێزانێك قوربانی (سُنَّةُ الْكِفَايَة)یە، واتە: ئەگەر ئەندامێكی بالغو عاقڵی خێزانێك قوربانی بكا، سوننەتی قوربانیكردن بۆ گشتیان دێتە جێو خێرەكەش بۆ قوربانیكەرەكەیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە ﴿عن أبأيوب الانصاري ﷺ: كَانَ الرَّجُلُ يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ﴾ رواه مالك والترمذي بسند صحيح، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاو مەڕێكی دەكردە قوربانی لە بری خۆیو خێزانەكەی، جا بەخۆیان لە قوربانیەكەیان دەخواردو دەرخواردی خەڵكیشیان دەدا.

جا بزانە: خێری قوربانی لە خێركردنی سوننەت گەورەترە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَاعَمِلَ آدَمِيٌّ مِنْ عَمَلٍ يَوْمَ النَّحْرِ أَحَبَّ إِلَىاللهِ مِنْ إِهْرَاقِ الدَّمِ...﴾الحديث، رواه الترمذي بسند حسن، هیچ ئادەمیزادێك لە ڕۆژی جەژنی قورباندا هیچ كردەوەیەكی وەها ناكا: كە لە خوێنڕشتنی قوربانی خۆشەویستتر بێ لە لای خوایگەورە.

كەوابو: ئەگەر دەسەڵاتی هەبێ، ناپەسندە قوربانی نەكا، چونكە ئیمامی(حنفی)و چەند زانایەكیتر بە واجبیان داناوە، هەروەها بۆ باوكو باپیرەش دروستە بە ماڵیخۆیان قوربانی بۆ منداڵە نەبالغەكانیان بكەن، بەڵام بە ماڵیمنداڵەكان دروست نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيُسَنُّ لِمُرِيدِهَا) بۆ ئەو كەسەی دەیەوێ قوربانی بكا، سوننەتە-هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی-: ﴿أَنْ لاَ يُزِيلَ شَعَرَهُ وَلاَ ظُفْرَهُ فِي عَشْرِ ذِيالْحِجَّةِ حَتَّى يُضَحِّيَ﴾ كما رواه مسلم وأصحاب السنن، هیچ موویێكی لاشەیو هیچ نینۆكێكی

وَأَنْ يَــذْبَحَهَا بِنَفْسِــهِ، وَإِلاَّ فَلْيَشْــهَدْهَا، وَلاَ تَصِــحُّ إِلاَّ مِــنْ إِبِــلٍ وَبَقَــرٍ وَغَــنَمٍ، وَشَرْطُ إِبِلٍ أَنْ يَطْعَنَ فِي السَّنَةِ السَّادِسَةِ، وَبَقَرٍ وَمَعْزٍ فِالثَّالِثَةِ، وَضَأْنٍ فِي الثَّانِيَةِ،

---

لانــەبا لــە دە ڕۆژەكــەی ســەرەتای مــانگی (ذیالْحِجَّــة)دا، تــا قوربــانی دەكــا. جــا بزانــە: بــەو دە ڕۆژانــە دەگــوترێ: (اَلأَيَّــامُ الْمَعْلُومــات)، هــەروەك لــە(الإيضــاح)دا فەرموویەتی.

(وَأَنْ يَذْبَحَهَا بِنَفْسِهِ) سوننەتە: بە دەستیخۆی قوربانیەكـەی سـەر بـبڕێ ئەگـەر بزانـێو توانای هەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەكەی(أنس)یڕابردوو (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە دەستیخۆی سەری نەبڕێ، یا وەكیلێك بگرێ بۆ سەر بڕینەكە، ئینجا (فَلْيَشْهَدْهَا) سـوننەتە لـە كـاتی سەربڕینەكەدا لە لای قوربانیەكەی ئامادەبێ ﴿عن فاطمة رضىالله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قال لَهَا: قُومِي إِلى أُضْحِيَّتِكِ فَاشْهَدِيهَا﴾ رواه البيهقي والحاكم وصححه، پێغەمبەرﷺ بە (فاطمة)ی فەرموو: هەڵسە بڕۆ لە لای قوربانیەكەت ئامادەبە.

كەواتــە: بــۆ ئافرەتــانو بێهێزەكــان وەهــا ســوننەتە: وەكیلێــك بگــرن بــۆ ســەربڕینی قوربانیەكــەیان، هــەروەها بــێهیچ هۆیــەكیش دروســتە وەكیــل بگــرێ، هــەروەك لــە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، چونكە لە (حَجَّةُ الوَدَاع)دا پێغەمبەرﷺ شەستو سێ ووشتری بە دەستیخۆی سەر بڕینو سیو حەفت ووشتریشی دانە دەست ئیمامی(علی) سەری بڕین، هەروەك لە (صحيح مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

هەروەها پێش سەربڕین سوننەتە بڵێ: ﴿وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِى فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرضَ حَنِيفاً مُسْلِماً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ رواه ابوداود بسند صالح.

ئینجا بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ مِنْكَ وَلَك، بِسْمِ اللهِ وَاللهُ أَكْبَرُ، اَللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنِّى﴾ رواه الشيخان، ئینجا سەری ببڕێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ ئاژەڵی قوربانی ﴾

(وَلاَ تَصِحُّ) قوربانی دروست نابێ: (إِلاَّ مِنْ إِبِلٍ وَبَقَرٍ وَغَنَمٍ) تەنها لە ووشترو گاو مانگاو بزنو مەڕ دروست دەبێ، بە (إجماع)ی زانایـان، چـونكە پێغەمبـەروﷺ (صـحابة)كان هـەر ئـەو ئاژەڵانــەیان كردونەتــە قوربــانی (وَشَــرْطُ إِبِــلٍ أَنْ يَطْعَــنَ فِيالسَّــنَةِ السَّادِسَــةِ) مــەرجی دروستبوونی ووشتر ئەمەیە: پێنج ساڵی تەواو كردبێو كەوتبێتە ساڵی شەشەم (وَبَقَرٍ وَمَعْزٍ فِي الثَّالِثَةِ) مەرجی دروستبوونی گـاو مانگـاو گـامێشو بـزن ئەمەیـە: دوو سـاڵیان تـەواو كردبێو كەوتبنە ساڵیسێیەم (وَضَـأْنٍ فِـى الثَّانِيَـةِ) مـەرجی دروسـتبوونی مـەڕ ئەمەیـە: ساڵێكی تەواو كردبێو كەوتبێتە ساڵیدووەم.

وَيَجُوزُ ذَكَرٌ وَأُنْثَى وَخَصِيٌّ، وَالْبَعِيرُ وَالْبَقَرَةُ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالشَّاةُ عَنْ وَاحِدٍ، وَأَفْضَلُهَا بَعِيرٌ ثُمَّ بَقَرَةٌ ثُمَّ ضَأْنٌ ثُمَّ مَعْزٌ، وَسَبْعُ شِيَاهٍ أَفْضَلُ مِنْ بَعِيرٍ، وَشَاةٌ أَفْضَلُ مِنْ مُشَارَكَةٍ فِي بَعِيرٍ،

---

بەڵام ئەگەر مەڕەكە پێش تەواوكردنی ساڵێك ددانەكانی كەوتبن، ئەو كاتە دروست دەبێ بكرێتە قوربانی، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تَذْبَحُوا إلاَّ مُسِنَّةً إلاَّ أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ﴾ رواه مسلم، وزاد أحمد: ﴿فَإِنَّهُ جَائِزٌ﴾، لە قوربانیدا جگە لە (مُسِنّة) سەر مەبڕن، مەگەر دەستتان نەكەوێ، ئەو كاتە مەڕێكی ددان كەوتووی لە ساڵێك بچوكتر سەر ببڕن، چونكە قوربانی بە مەڕی ددان كەوتووش دروستە.

جا بزانە: (مُسِنّة) بە ووشتری پێنج ساڵیو مانگاو بزنی دوو ساڵیو مەڕی یەك ساڵی دەگوترێ–بە (إجماع)ی زانایان– هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيَجُوزُ ذَكَرٌ وَأُنْثَى) بە (إجماع)ی زانایان: ئاژەڵی نێرو ئاژەڵی مێ دروستە بكرێتە قوربانی، هەم (وَخَصِيٌّ) نێرینەی خەسێندراویش دروستە ﴿عن جابرﷺ ضَحَّى النَّبِيُّﷺ بِكَبْشَيْنِ مَوْجُوأَيْنِ﴾ رواه أبوداود وغيره بسند صالح، پێغەمبەرﷺ دوو بەرانی خەسێندراوی كردنە قوربانی.

(وَالْبَعِيرُ وَالْبَقَرَةُ عَنْ سَبْعَةٍ) تەنها ووشترێك، یان تەنها مانگایەك دروست دەبێ بۆ حەفت كەسان بكرێتە قوربانیو بكرێتە (فِدْيَة)ی حەجو عومرە، هەم دروستیشە لەو حەفت كەسانە هەندێكیان مەبەستیان تەنها گۆشت بێ، هەندێكیشیان مەبەستیان قوربانی، یان نەزر، یان (فِدْيَة)بێ، واتە: لە دوای سەربڕین گۆشتەكە بەش دەكەن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە ﴿عن جابرﷺ: نَحَرْنَا مَعَ النَّبِيِّﷺ–بِالْحُدَيْبِيَة– اَلْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ وَالْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ﴾ رواه مسلم، لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ووشترێكمان لەجیاتی حەفت كەسان سەر بڕیو مانگایەكیشمان لەجیاتی حەفت كەسان سەر بڕی.

(وَالشَّاةُ عَنْ وَاحِدٍ) مەڕێك، یان بزنێك تەنها بۆ یەك كەس دەبێتە قوربانی، واتە: بزنێك، یان مەڕێك بە هاوبەشی بۆ دوو كەسان نابێتە قوربانی، بەڵام دروستە قوربانیكەرەكە كەسێكیتر بكاتە هاوبەش لە خێری قوربانیەكەیدا، هەروەك لە (تحفە)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَأَفْضَلُهَا بَعِيرٌ) لە هەموو قوربانیەكان خێرتر: ووشترێكە (ثُمَّ بَقَرَةٌ) ئینجا مانگایەك (ثُمَّ ضَأْنٌ ثُمَّ مَعْزٌ) ئینجا مەڕێك، ئینجا بزنێك، بەڵام (وَسَبْعُ شِيَاهٍ أَفْضَلُ مِنْ بَعِيرٍ) حەفت مەڕ خێرترن لە ووشترێك، یان لە مانگایەك، هەم (وَشَاةٌ أَفْضَلُ مِنْ مُشَارَكَةٍ فِي بَعِيرٍ) تەنها مەڕێك خێرترە لە هاوبەشیكردن لە وشترێكدا، واتە: لە حەفتێكی وشترێك.

وَشَــرْطُهَا سَــلاَمَةٌ مِــنْ عَيْــبٍ يَــنْقُصُ لَحْمًــا فَــلاَ تُجْــزِئُ عَجْفَــاءُ وَمَجْنُونَــةٌ وَمَقْطُوعَةُ بَعْضِ أُذُنٍ وَذَاتُ عَرَجٍ وَعَوَرٍ

---

## ﴿ عەیبەکانی قوربانی ﴾

(وَشَرْطُهَا) مەرجی دروستبوونی قوربانی، ئەمەیە: (سَلاَمَةٌ مِنْ عَيْبٍ يَنْقُصُ لَحْمًا) ئاژەڵەکە سەلامەت بێ: لە هەر عەیبێکی گۆشت کەم بکاتەوە.

کەوابو: بە فـەرموودەی بـەهێزتر: ئـاژەڵی ئـاوس نابێتـە قوربـانی، بـەڵام (إبـن الرفعـة)و (أبومخرمـة) ئـەو فـەرموودەیان بـە ڕاسـت دانـاوە: کـە دروسـتە ئـاژەڵی ئـاوس بکرێتـە قوربانی بەو مەرجەی ئاوسیەکەی کاری لە کەمکردنەوەی‌گۆشتەکەی نەکردبێ، هـەروەك لــە (فــتح المعــین)و (بغیةالمسترشــدین)دا فەرموویانــەو لــە زۆربــەی سەرچاوەکانیشــدا ڕەد کراوەتــەوە، کــەوابو: ئەگــەر ئاژەڵەکــە بــە هــۆی ئاوســی لاواز نــەبوبێ، دروســتە: بە (تقلید)ی ئەو زانایانە بکرێتە قوربانی.

هەروەها ئەو ئاژەڵەی تازە زاوە، ئەویش دروستە بکرێتە قوربانی، هـەروەك لـە (تحفـة)و (نهایة)دا–بە پێچەوانەی(مغنی)– فەرموویانە.

(فَلاَ تُجْزِئُ عَجْفَاءُ) ئەو ئاژەڵەی بە هۆی لەڕی=لاوازی مێشکی نـەماوە، نابێتـە قوربـانی، هەم (وَمَجْنُونَةٌ) ئاژەڵی شێت=گێژ نابێتـە قوربـانی، پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿أَرْبَعٌ لاَ تَجُوزُ فِي الأَضَاحِي: اَلْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ضَلْعُهَا، وَالْكَسِيرَةُ الَّتِي لاَتُنْقِي﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، چوار ئاژەڵ بۆ قوربانی دروست نابن: ئەوەی چاوێکی بە ئاشکرایی کوێرە، ئـەوەی بـە ئاشـکرایی نەخۆشـە، ئـەوەی بـە ئاشکرایی دەشەلێ، ئەوەی مێشکی نەماوە.

(وَمَقْطُوعَةُ بَعْضِ أُذُنٍ) ئەو ئاژەڵەی بەشێکی گوێی، یان بەشێکی زوبانی، یـان بەشـێکی دونگی، یان بەشێکی گوانی، یان بەشێکی کلکی لێکراوەتەوە، ئەویش دروست نیە بکرێتە قوربانی، هەر چەند لێکراوەکەش کەم بێ، هەروەها ئەو ئاژەڵەی لـە زگماکـدا گوێیـەکی نیە، ئەویش نابێتە قوربانی، بەڵام ئەگەر گوێی زۆر بچوك بێ، یـان لـە زگماکـدا: گـوانی نەبن، یان دونگی نەبێ، یان کلکی نەبێ، ئەوە دەبێتە قوربانی.

هەروەها لە فەرمودەی ئیمامی(حنفی)دا: ئەگەر لە سێیەکی گوێی کەمتری لێکرابێتەوە، دروست دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَ) هەر بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌ڕابردوو: (ذَاتُ عَرَجٍ) ئاژەڵی شەلەو (وَعَوَرٍ) ئـاژەڵی یـەك چاو نابنە قوربانی، هەر چەند لە کاتی سەربڕینیشدا شـەلە ببـێ، یـان کـوێر ببـێ. بـەڵام مەزهەبی ئیمام(أحمد): ئەگـەر سـپیایی لـە سـەر چـاوی هـەبێ‌و چـاوەکەی نەڕۆیشـتبێ، دروستە بکرێتە قوربانی، هەروەك لە (مغنی ابن قدامة)دا فەرموویەتی.

وَمَرَضٍ وَجَرَبٍ بَيِّنٍ، وَلاَ يَضُرُّ يَسِيرُهَا وَلاَ فَقْدُ قَرْنٍ وَكَذَا شَقُّ أُذُنٍ وَثَقْبُهَا فِالأَصَحِّ، قُلْتُ: اَلصَّحِيحُ الْمَنْصُوصُ يَضُرُّ يَسِيرُ الْجَرَبِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَدْخُلُ وَقْتُهَا إِذَا ارْتَفَعَتِ الشَّمْسُ كَرُمْحٍ يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ مَضَى قَدْرُ رَكْعَتَيْنِ وَخُطْبَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، وَيَبْقَى حَتَّى تَغْرُبَ آخِرَالتَّشْرِيقِ،

---

هەم (وَمَرَضٍ) ئاژەڵی نەخۆش-كە بە هۆی نەخۆشی لاواز بوبێ- نابێتە قوربانی، هەم (وَجَرَبٍ) ئاژەڵێ بە خروشت نابێتە قوربانی (بَيِّنٍ) ئەگەر ئەو چوار عەیبانە ئاشكرا بن، بەڵام (وَلاَ يَضُرُّ يَسِيرُهَا) كەمێكی ئەو چوار عەیبانە-كە كار لە گۆشتەكەی نەكا- زیانی نیەو ئاژەڵەكە دەبێتە قوربانی، هەم (وَلاَ فَقْدُ قَرْنٍ) نەبوونی قۆچ=شاخ زیانی نیە، واتە: ئاژەڵی بێقۆچ و قۆچ شكاو دەبێتە قوربانی، بەڵام ئەگەر شكانی قۆچەكەی كاری لە گۆشتەكە كردبێ، ئەو كاتە نابێتە قوربانی.

(وَكَذَا شَقُّ أُذُنٍ وَثَقْبُهَا) هەروەها لەتكردنی گوێ‌و داغكردن‌و كونكردنیشی زیانی نیە، بەو مەرجەی بە هۆی كونكردنەكە هیچی لێنەڕۆیشتبێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (اَلصَّحِيحُ الْمَنْصُوصُ: يَضُرُّ يَسِيرُ الْجَرَبِ) بە دەقی فەرموودەی‌ڕاست: كەمێكی خروشت زیانی هەیەو ئاژەڵەكە نابێتە قوربانی (وَاللهُ أَعْلَمُ).

هەروەها ئەگەر گشت ددانەكانی نەمابن نابێتە قوربانی، بەڵام ئەگەر هەندێكیان نەمابن‌و نەمانەكەشیان كاری لە گۆشتەكەی نەكردبێ، ئەو كاتە زیانی نیەو دەبێتە قوربانی، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە. ئیتر لە (باسی نەزركردنی قوربانی)دا بڕیاری پەیدابوونی عەیب لە ئاژەڵی نەزركراودا ڕوون دەكەینەوە، إن شاءالله تعالى.

## ﴿ كاتی سەربڕینی قوربانی ﴾

(وَيَدْخُلُ وَقْتُهَا) كاتی سەربڕینی قوربانی دادێ: (إِذَا ارْتَفَعَتِ الشَّمْسُ كَرُمْحٍ يَوْمَ النَّحْرِ) هەركاتێك لە ڕۆژی جەژنی‌قورباندا بە قەد ڕمێك ڕۆژ بەرز بۆوەو (ثُمَّ مَضَى قَدْرُ رَكْعَتَيْنِ وَخُطْبَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ) ئینجا ئەندازەی دوو ڕەكعەت‌و دوو ووتاری سوكیش بە سەردا ڕۆیشت، واتە: ئەگەر پێش هاتنی كاتەكە قوربانیی سەر بڕی، ئەوە دروست نابێ‌و نابێتە قوربانی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا: أَنْ نُصَلِّيَ ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلَ هَذَا فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لأَهْلِهِ لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ﴾ رواه الشخيان، یەكەم شت لە ڕۆژی جەژنی قورباندا نوێژی جەژن دەكەین، ئینجا دەگەڕێینەوە قوربانی سەر دەبڕین، جا هەر كەسێك ئەوها بكا، ئەوە ڕێبازی ئێمەی دەست كەوتوە، هەر كەسێكیش لە پێش ئەو كاتەدا قوربانی سەر ببڕێ، ئەوە گۆشتێكە داویەتیە خێزان‌و منداڵەكانی‌و هیچی نابێتە قوربانی.

(وَيَبْقَى حَتَّى تَغْرُبَ آخِرَ التَّشْرِيقِ) كاتی سەربڕینی قوربانی دەمێنێ تا ڕۆژ ئاوا دەبێ لە كۆتایی سێ ڕۆژەكەی (أَيَّامِ التَّشْرِيقِ)ی دوای جەژنی‌قوربان، واتە: ماوەی سەربڕینی

قُلْتُ: اِرْتِفَاعُ الشَّمْسِ فَضِيلَةٌ، وَالشَّرْطُ طُلُوعُهَا ثُمَّ مُضِيُّ قَدْرِ الرَّكْعَتَيْنِ وَالْخُطْبَتَيْنِ، وَاللهُ أَعْلَمُ. وَمَنْ نَذَرَ مُعَيَّنَةً فَقَالَ: لِلَّهِ عَلَيَّ أَنْ أُضَحِّيَ بِهَذِهِ لَزِمَهُ ذَبْحُهَا فِي هَذَا الْوَقْتِ،

---

قوربانی چوار ڕۆژان بەردەوام دەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَيَّامُ مِنَى كُلُّهَا مَنْحَرٌ﴾ صححه ابن حبان، ڕۆژەکانی(مِنَى) گشتی کاتی سەربڕینی قوربانییە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەموویەتی (ارْتِفَاعُ الشَّمْسِ فَضِيلَةٌ) بەرزبوونی ڕۆژ بە قەد ڕمێك خێرەو مەرج نیە، چونکە (وَالشَّرْطُ) مەرجی دروستبوونی قوربانی: (طُلُوعُهَا) ڕۆژ هەلاتنەو (ثُمَّ مُضِيُّ قَدْرِ الرَّكْعَتَيْنِ وَالْخُطْبَتَيْنِ) ئینجا ئەندازەی دوو ڕەکعەتەکەو دوو وتارەکەش بڕوا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

جا بزانە: لەو چوار ڕۆژانەدا–بۆ سەربڕینیقوربانی– جیاوازی شەو و ڕۆژ نیە، جا ئەگەر چوار ڕۆژەکان ڕۆیشتن‌و قوربانیەکەی سەر نەبڕی، ئەوە لەم ساڵەدا قوربانیەکە قەزا ناکرێتەوە، کەواتە: ساڵێکیتر قوربانی دەکا، بەڵام ئەگەر نەزری کردبو ئاژەڵێکی دیارکراو بکاتە قوربانی، ئینجا چوار ڕۆژەکانی جەژن بەسەر چون‌و قوربانیەکەی سەر نەبڕی، ئەوە لەم مەسەلەیەدا واجبە: هەر لەم ساڵەدا بە قەزاکردنەوە سەری ببڕێ‌و گۆشتەکەشی بداتە هەژاران، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ نەزرکردنی قوربانی ﴾

(وَمَنْ نَذَرَ مُعَيَّنَةً) هەر کەسێك نەزری کرد: ئاژەڵێکی دیارکراو بکاتە قوربانی (فَقَالَ: لِلَّهِ عَلَيَّ أَنْ أُضَحِّيَ بِهَذِهِ) گوتی: (لە سەرم بێ بۆ خوا ئەم مەڕە بکەمە قوربانی). یان (نەزر بێ ئەم بزنە بکەمە قوربانی). یان (لە سەرم بێ ئەم مانگایە بکەمە قوربانی). یان (ئەم بەرانەم کردە قوربانی). ئەوە لەو حاڵەتانەدا ئاژەڵەکە لە ملکایەتیی لادەچێ‌و دروست نیە دەستکاریی بکا، کەوابو: (لَزِمَهُ ذَبْحُهَا فِي هَذَا الْوَقْتِ) لە سەری واجبە: هەر ئەم ساڵ لە ماوەی چوار ڕۆژەکەی جەژنیقورباندا– بە ئەداء– سەری ببڕێ‌و دروست نیە: بۆ ساڵێکیتر دوای بێخێ، واتە: ئەگەر چوار ڕۆژەکەی جەژنی ئەم ساڵ ڕۆیشتن‌و سەری نەبڕی، ئەو کاتەش واجبە: هەر لەم ساڵەدا–بە قەزا– سەری ببڕێ‌و گۆشتەکەشی بداتە هەژاران–هەروەك تازە ڕابرا– جا ئەگەر نەزرکەرەکە مرد، ئەو کاتە میراتگرەکەی بۆی دەکا، هەروەك لە باسی(قوربانی بۆ مردوو) بەڵگەی بۆ دێنین، إن شاءالله تعالى.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر مەڕێکی کڕی‌و نیەتی قوربانیی لێهێنا، ئەوە هەر ملکی خۆیەتی‌و واجب نیە سەری ببڕێ تا بە زوبان نەزری دەکا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

بەڵام زۆر کەس کە قوربانی دەکڕێ‌و لێی دەپرسن: ئەمە چییە؟ وەڵام دەداتەوە: ئەمە قوربانیییە. جا بەگوێرەی (تحفة)و (نهاية) بەم ووشەیە ئاژەڵەکە دەبێتە قوربانیی نەزرکراو، بەڵام ئیمامی(الأذرعي)و چەند زانایەکیتر فەرموویانە: ئەگەر مەبەستی

خەبەردان بێ: کە ئەمە قوربانیی سوننەتەو مەبەستی نەزرکردنی نەبێ، ئەوە لێی قبوڵ دەکرێو قوربانیەکە بە سوننەت دادەندرێو لە سەری واجب نابێ، هەروەك لە (بغية المسترشدين)دا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ تَلِفَتْ قَبْلَهُ) جا ئەگەر نەزرکراوەکەیدیارکراو لە پێش هاتنی جەژنیقورباندا فەوتا، یان دزرا، یان گوم بوو، یان عەیبێکی لێپەیدا بوو، ئەوە (فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ) نەزرکەرەکە هیچی لە سەر نیە، بەو مەرجەی کەمتەرخەمیی نەکردبێ، کەواتە: ئەگەر پێش هاتنی جەژن ئاژەڵە نەزرکراوەکە هاتە سەر حاڵەتی فەوتان، ئەو کاتە واجبە: سەری ببڕێو گۆشتەکەی بداتە هەژاران، واتە: نابێتە زامین، بەڵام ئەگەر بۆی گونجاو بە قەسدی سەری نەبڕی، ئەو کاتە دەبێتە زامینی قوربانیەکە، هەروەك (الشبراملسی) فەرمویەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر نەزری کرد ئاژەڵێکی بێعەیبی دیارکراو بکاتە قوربانی–وەك ئەم مەڕە–، ئینجا لە دوای نەزرەکە ئاژەڵەکە عەیبێکی لێپەیدا بوو، ئەوە دەبی بیکاتە قوربانیو بۆیشی دەبێتە قوربانیو دروست دەبێ، بەڵام ئەگەر نەزرکەرەکە بەخۆی عەیبداری بکا، ئەوە واجبە بیکاتە قوربانیو هەم واجبە ئاژەڵێکیتری بێعەیبیش لەجیاتیی بکاتە قوربانی. هەروەها ئەگەر نەزری کرد: ئاژەڵێکی عەیبدار بکاتە قوربانی، ئەوەش واجبە: لە کاتی قوربانیدا بیکاتە قوربانیو گۆشتەکەشی بەش بکا، بەڵام بۆی نابێتە قوربانیو دروست نابێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە، کەواتە: ئاژەڵەکە دەبێتە خێر، بەڵام لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر لە کاتی قوربانیدا عەیبەکەی نەمابێ، ئەوە دەبێتە قوربانیو دروست دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

هەروەها (وَإِنْ أَتْلَفَهَا) ئەگەر نەزرکەرەکە بەخۆی ئاژەڵە دیارکراوەکەی فەوتاند، یان کەمتەرخەمی کرد بۆیێ فەوتا، یان گوم بوو، ئەو کاتە (لَزِمَهُ أَنْ يَشْتَرِيَ بِقِيمَتِهَا مِثْلَهَا) لە سەری واجبە: بە نرخی ئاژەڵە فەوتاوەکە ئاژەڵێکی وێنەیخۆی بکڕێو هەم (وَيَذْبَحَهَا فِيهِ) واجبە: لە جەژنی قوربانی ئەم ساڵدا سەری ببڕێو گۆشتەکەی بەش بکا.

هەروەها ئەگەر بێگانەیەکیش ئاژەڵەکەی فەوتاند، واجبە نرخەکەی لێبستێنێو ئاژەڵێکی وێنەیخۆی پێبکرێو لە جەژنی قوربانی ئەم ساڵدا سەری ببڕێ.

هەروەها ئەگەر نەزرکەرەکە، یان بێگانەیەك لە پێش جەژنی قورباندا ئاژەڵەکەی سەر بڕی، ئەو کاتە واجبە: گۆشتەکەی بدرێتە هەژرانو هەم بە نرخەکەشی ئاژەڵێکیتری وێنەیخۆی بکڕدرێو بکرێتە قوربانی.

بەڵام ئەگەر بێگانەکە لە چوار ڕۆژەکەی قوربانیدا سەری ببڕێ، ئەو کاتە دەبێتە قوربانیو خاوەنەکەش گۆشتەکەی بەش دەکاو تۆڵەیسەربڕینەکەش لە سەربڕەکە دەستێنێو بۆ

وَإِنْ نَذَرَ فِي ذِمَّتِهِ ثُمَّ عَيَّنَ لَزِمَهُ ذَبْحُهُ فِيهِ، فَإِنْ تَلِفَتْ قَبْلَهُ بَقِيَ الأَصْلُ عَلَيْهِ فِالأَصَحِّ، وَتُشْتَرَطُ النِّيَّةُ عِنْدَ الذَّبْحِ إنْ لَمْ يَسْبِقْ تَعْيِينٌ،

---

هەژاران گۆشتی پێدەکرێ، بەڵام ئەگەر بێگانەکە گۆشتەکەشی بەش کردبو، ئەو کاتە بە فەوتێندراو دادەندرێ‌و نابێتە قوربانی.

هەروەها ئەگەر لە دوای چوار ڕۆژەکەی جەژن ئاژەڵەکە بفەوتێ، یان بفەوتێندرێ، زامینێی هەر واجب دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَإِنْ نَذَرَ فِي ذِمَّتِه) ئەگەر لە ئەستۆی خۆیدا نەزری کرد قوربانی بکا: وەك لە سەرم بێ قوربانی بکەم (ثُمَّ عَيَّنَ) ئینجا لە دوای نەزرکردنەکە ئاژەڵێکی دیاری کرد: وەك ئەم بزنە بۆ قوربانیەکەی نەزرکراوم بێ، ئەوەش (لَزِمَهُ ذَبْحُهُ فِيهِ) لە سەری واجبە: ئاژەڵ دیارکراوەکە لە چوار ڕۆژەکەی جەژنی قورباندا سەر ببڕێ.

بەڵام لەم مەسەلەیەدا (فَإِنْ تَلِفَتْ قَبْلَهُ) ئەگەر دیارکراوەکە پێش هاتنی جەژن فەوتا، ئەوە (بَقِيَ الأَصْلُ عَلَيْهِ) بنچینەی نەزرەکەی هەر لە سەر دەمێنێ، واتە: واجبە: ئاژەڵێکیتر بکاتە قوربانی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

هەروەها ئەگەر ئاژەڵێکی دیاری کرد بۆ نەزرەکەی، ئینجا ئاژەڵەکە عەیبێکی لێپەیدا بوو، ئەو کاتەش دیارکردنەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، کەواتە: ئەم عەیبدارە دەبێتە ملکی خۆی‌و لە سەری واجبە: یەکێکیتری بێعەیب بکاتە قوربانی،

بەڵام ئەگەر قوربانیە نەزرکراوەکەی سەر بڕی‌و گۆشتەکەی بەش نەکرد تا گۆشتەکەی بۆگەن‌و خراپ بوو، ئەو کاتە واجبە: بە ئەندازەی گۆشتەکە گۆشتێکیتر بکڕێ‌و بیداتە هەژاران، واتە: واجب نیە: ئاژەڵێکیتر سەر ببڕێ، هەروەك لە (مغنى)و (الشروانى)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

## ﴿ باسی نیەتی قوربانی ﴾

(وَتُشْتَرَطُ النِّيَّةُ) بە مەرج دادەندرێ نیەتی قوربانی بێنێ: وەك نیەتمە ئەم ئاژەڵەم کردە قوربانی. واتە: بێنیەتهێنان قوربانی دروست نابێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ﴾ رواه‌الشيخان، هەر کردەوەیەکی خواپەرستی بێ بە نیەت نەبێ دانامەزرێ.

ئینجا نیەتهێنانەکەش (عِنْدَالذَّبْحِ) لە کاتی سەربڕینی قوربانیەکەیدا بێ (إنْ لَمْ يَسْبِقْ تَعْيِينٌ) ئەگەر پێشدا دیاریی نەکردبێ، واتە: ئەگەر ئاژەڵێکی جیاکردەوە بۆ قوربانیی سوننەت، یان لەجیاتی قوربانیی نەزرکراو ئاژەڵێکی دیاری کرد، ئەو کاتە دروستە لە کاتی جیاکردنەوەو دیاریکردنەکەدا نیەت بێنێ، هەم دروستە لە پێش سەربڕینی قوربانیدا نیەت بێنێ، بەڵام دروست نیە لە دوای سەربڕینەکە نیەتی قوربانی بێنێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

وَكَـذَا إنْ قَـالَ: جَعَلْتُهَـا أُضْـحِيَّةً فِـالأَصَـحِّ، وَإِنْ وَكَّـلَ بِالـذَّبْحِ نَـوَى عِنْـدَ إعْطَـاءِ الْوَكِيـلِ أَوْ ذَبْحِهِ، وَلَهُ الأَكْلُ مِنْ أُضْحِيَّةِ تَطَوُّعٍ، وَإِطْعَامُ الأَغْنِيَاءِ لاَ تَمْلِيكُهُمْ،

---

(وكَذَا إنْ قَالَ: جَعَلْتُهَا أُضْحِيَّةً) هەروەها ئەگەر گوتی: ئـەم مـەڕەم کـردە قوربـانی. ئـەو کاتەش مەرجە: لە کاتی سـەربڕیندا، یـان پـێش سـەربڕین نیـەتی قوربـانی بێنـێ، واتـە: دیاریکردنەکە بە بەر نیەتەکە ناکەوێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، بەڵام لە لای (إمام الحرمين)و (الامام الغزالي): لەم مەسەلەیەشدا دیاریکردنەکە بەسەو بە بەر نیەتەکە دەکەوێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَإِنْ وَكَّلَ بِالذَّبْحِ) ئەگەر کەسێکی کردە وەکیلیخۆی بـۆ سـەربڕینەکە، ئـەوە (نَـوَى عِنْـدَ إعْطَاءِ الْوَكِيلِ) لەو کاتەی ئاژەڵەکە دەداتە دەست وەکیلەکە، نیەتەکە دێنێ (أَوْ ذَبْحِهِ) یان لەو کاتەی وەکیلەکـە قوربانیەکـە سـەر دەبـڕێ، ئـەویش نیەتەکـە دێنـێ، هـەم دروسـتە موسوڵمانێکی فامیدە بکاتە وەکیل بۆ جیاکردنەوەی قوربـانیو بـۆ نیـەتهێنان لـە کـاتی جیاکردنەوە، یان لە کاتی سەربڕینەکە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ خواردنی گۆشتی قوربانی ﴾

(وَلَـهُ) بـۆ قوربانیکەرەکـە دروسـتە: (الأَكْـلُ مِـنْ أُضْـحِيَّةِ تَطَـوُّعٍ) لـە گۆشـتی قوربانیـە سوننەتەکەی بخوا، پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿كُلُوا وَأَطْعِمُوا وَادَّخِرُوا﴾ رواه الشـيخان، گۆشتی قوربانیەکەتان بخۆنو بشیدەنە موسوڵمانانو پاشەکەوتیشی بکەن.

(وَإِطْعَامُ الأَغْنِيَاءِ) هەم دروسـتە: گۆشـتی قوربـانیی سـوننەت-بـە تـازەیو بـە کـوڵاویی- دەرخواردی دەوڵەمەندان بدا (لاَ تَمْلِيكُهُمْ) بەڵام دروست نیە گۆشتەکە بە مڵکایەتی بداتە دەوڵەمەندەکان، بەڵکو بە دیاری بۆیان دەنێرێ، کەواتە: بۆ دەوڵەمەندەکان دروست نیە: گۆشتەکەی قوربانی بفرۆشن، یان ببیەخشـن، بـەڵکو دەبـی بیخـۆن، یـان بیکەنـە خێـرو میوانداری، بەڵام بۆ هەژاران دروستە گۆشتی قوربانی بفرۆشن.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەوکەسەی بە وەکیلایەتی قوربانی بۆ کەسێکیتری زیندوو، یـان مـردوو دەکا، دروست نیە: نە بەخۆیو نە ژنو منداڵەکانیشی لە قوربانیەکە بخۆن، هەم-ئەگـەر قوربانیەکەیکەسەکە نەزرکراو بێ- دروست نیە: بیداتە دەوڵەمەندەکانیش.

هەروەها ئەگەر قوربانیەکەیخۆیشـی واجب=نـەزرکراو بـێ، دروسـت نیـە: بـەخۆیو ژنو منداڵەکانی لە گۆشتەکەی بخواو هەم دروستیش نیە بیداتە دەوڵەمەندەکان، هەروەك لـە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە ﴿عن ابن عمررضىالله عنهما: لاَ يُؤْكَلُ مِنْ جَزَاءِ الصَّيْدِ وَالنَّذْرِ، وَيُؤْكَلُ مَا سِوَىٰ ذَلِكَ﴾ رواه الشيخان، نابێ لە خوێنی سـزای نێچیرو لـە ئـاژەڵی نـەزرکراو بخورێ، جگە لە وانەش دروستە بخورێ.

کەواتە: ئەگەر شتێکی قوربانیی نەزرکراوی خوارد، واجبە: نرخی ئەو ئەندازایە-لە تۆڵە- بداتە هەژاران، هەروەك لە (المجموع)و (مغنى)دا فەرموویانە.

وَيَأْكُلُ ثُلُثًا، وَفِي قَوْلٍ نِصْفًا، وَالأَصَحُّ وُجُوبُ التَّصَدُّقِ بِبَعْضِهَا، وَالأَفْضَلُ بِكُلِّهَا إلاَّ لُقَمًا يَتَبَرَّكُ بِأَكْلِهَا، وَيَتَصَدَّقُ بِجِلْدِهَا أَوْ يَنْتَفِعُ بِهِ،

---

بەلام لە لای ئیمام (الماوردی)و (الرافعی) دروستە: بەخۆیو ژنو منداڵەکانی لەو قوربانیە نەزرکراوەی بخۆن: کە لـە سـەرەتای نەزرەکەیـدا دیـاریی کـردوە: وەك نـەزر بـێ ئـەم ئاژەڵە م بکەمە قوربانی، یان ئەم ئاژەڵەم کردە قوربانی. بەلام ئەگەر لە دوای نەزرکردنی قوربانیی لەئەستۆدا ئاژەڵێك بۆ قوربانیەکە دیاری بکا، وەك بڵێ: نەزر بێ قوربانی بکەم. ئینجا بڵێ: ئەم مەڕەم دیاری کرد بۆ قوربانیە نەزرکراوەکەم. ئـەوە دروسـت نیـە هیچـی لێبخوا، هەروەك لە (المجموع)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوەو (تحفة)ش پـێی ڕازی نیە.

(وَيَأْكُلُ ثُلُثًا) با قوربانیکەرەکە تا سێیەکی قوربانیە سوننتەکەی بخواو ئەوی‌تریش بکاتە خێر، واتە: سوننەتە لە سێیەکێك زیاتر نەخوا (وَفِي قَوْلٍ نِصْفًا) لە فەرموودەیەکدا: نیوەی بخواو نیوەی بکاتە خێر.

هەروەها دروستە گۆشتی قوربانیەکەشی پاشەکەوت بکا، بەلام (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (وُجُوبُ التَّصَدُّقِ بِبَعْضِهَا) واجبە: بەشێکی قوربانیەکەی بە تازی بکاتە خێر، واتە: دروست نیە بـە کـولاّیی، یـان بـە بـرژاوی بیکاتـە خێـر، هـەروەك لـە (تحفـة)و (مغـنی)دا فەرموویانە، ئینجا (وَالأَفْضَلُ بِكُلِّهَا) خێرتر ئەوەیە: هەموو گۆشتەکەی بکاتە خێر (إلاَّ لُقَمًا يَتَبَرَّكُ بِأَكْلِهَا) تـەنها چـەند پاروویـێك نـەبێ، بـۆ بەرەکـەت بیـانخوا، ئینجـا سـوننەتە: پاروەکانیش لە جەرگی قوربانیەکەی بخوا، چونکە پێغەمبەرﷺ لە جەرگی قوربانیەکەی دەخوارد، هەروەك (البيهقي) گێڕاویەتیەوە.

## ﴿ گواستنەوەی گۆشتی قوربانی ﴾

بزانـە: دروست نیە گۆشتی قوربانی بدرێتە هیچ جـۆرە کافرێـك، هـەروەها دروسـت نیـە: قوربانیی‌نەزرکراو لـە شـاری قوربانیـەوە بگواسـترێتەوە بـۆ شـوێنێکی‌تر، بـەلام ئەگـەر قوربانیەکە سوننەت بێ، ئەوە تەنها بەشێکی واجبە: لە شاری قوربانیەکە بکرێتـە خێـر، واتە: دروسـتە بەشـە زۆرەکەشـی بگواسـترێتەوە بـۆ شـوێنێکی‌تر، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانەڕوون کراونەوە.

## ﴿ پێستەو شیرو بێچووی ئاژەڵی قوربانی ﴾

پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿مَنْ بَاعَ جِلْدَ أُضْحِيَّتِهِ فَلاَ أُضْحِيَّةَ لَهُ﴾ صـححه الـحاكم، هـەر کەسێك پێستەی قوربانیەکەی بفرۆشێ، قوربانیی بۆ نابێ. کـەوابو: (وَيَتَصَـدَّقُ بِجِلْـدِهَا) پێستەی قوربانیی سوننەتو ڕیخۆڵەو گشت بەشە بە سودەکانی: یان با بکاتـە خێـر (أَوْ يَنْتَفِعُ بِهِ) یان بۆ خۆی سودی لێوەربگرێ، واتە: هیچێك لە ئەوانەو لە گۆشتەکەی دروست نیە بفرۆشرێ، یان لە کرێی سەربڕین بدرێ، یان فڕێ بدرێ، بـەلام پێسـتەی قوربـانیی

وَوَلَــدُ الْوَاجِبَــةِ يُــذْبَحُ، وَلَــهُ أَكْــلُ كُلِّــهِ وَشُــرْبُ فَاضِــلِ لَبَنِهَــا، وَلاَ تَضْــحِيَةَ لِرَقِيــقٍ، فَــإِنْ أَذِنَ سَــيِّدُهُ وَقَعَــتْ لَــهُ، وَلاَ يُضَــحِّي مُكَاتَــبٌ بِــلاَ إِذْنٍ، وَلاَ تَضْحِيَةَ عَنِ الْغَيْرِ بِغَيْرِ إِذْنِهِ، وَلاَ عَنْ مَيِّتٍ إِنْ لَمْ يُوصِ بِهَا.

---

واجبو گشت ئەندامەکانیتریشی واجبە بکرێنـە خێـر ﴿عن عَلِيٍّ‌ﷺ: أَمَرَنِالنَّبِيُّﷺ أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ وَأَنْ أَقْسِمَ لُحُومَهَا وَجُلُودَهَا وَجِلاَلَهَا عَلَىالْمَسَاكِينِ وَلاَ أُعْطِيَ فِي جِزَارَتِهَا شَيْئاً مِنْهَا، وَقَالَ: نَحْنُ نُعْطِيهِ مِنْ عِنْدِنَا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردم: سەرپەرشـتی ووشترەکانی بکەمو گۆشتەکەیانو پیستەکەیانو جلەکەیان بە سەر هەژاراندا بەش بکەمو هیچ بەشێك لە ووشترەکان لە کرێی سەربڕینیان نەدەم، فەرمووی: ئێمە لە لای خۆمانەوە کرێی سەربڕین دەدەین.

(وَوَلَدُ الْوَاجِبَةِ يُذْبَحُ) بێچووی قوربانیی واجب=نەزرکراو، واجبە: لەگەڵ دایکیدا سەر ببڕێ، بەلام (وَلَهُ أَكْلُ كُلِّهِ) بۆ قوربانیکەرەکە دروستە: هەموو گۆشتی بێچووەکە بخوا، جا ئەگەر دایکەکەی مردبو، ئەو کاتەش واجبە: لە جەژنی قورباندا بێچووەکەی سەر ببڕێ، بەلام لەم حاڵەتەدا لە جێی دایکی دەبێتە قوربانیو واجبە: گۆشتەکەی بدرێتە هەژاران، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا فەرموویانە.

(وَشُـرْبُ فَاضِـلِ لَبَنِهَـا) هـەم بـۆی دروسـتە شـیرە زیادەکەشـی بخواتـەوە، بـەلام ئەگـەر خوریەکەی زیانی لێئەدا نابێ لێی بکاتەوە (وَلاَ تَضْحِيَةَ لِرَقِيقٍ) قوربانی بۆ کۆیلـە نابـێ (فَإِنْ أَذِنَ سَـيِّدُهُ وَقَعَـتْ لَـهُ) جـا ئەگـەر گەورەکـەی ئیزنیـدا: ئـەو کاتـە قوربانیەکـە بـۆ گەورەکەی دەبێ (وَلاَ يُضَحِّي مُكَاتَبٌ بِلاَ إِذْنٍ) کۆیلەی نووسراوپێدراو بێئیزن نابێ قوربانی بکا.

## ﴿ قوربانی لەجیاتی کەسێکی زیندوو ﴾

(وَلاَ تَضْحِيَةَ عَنِ الْغَيْرِ بِغَيْرِ إِذْنِهِ) قوربانیکردن بە ماڵیخۆی لەجیاتی کەسێکیتری زیندوو –بێئیزندانیکەسەکە– دروست نابێ، چونکە قوربـانی خواپەرسـتییە، بـەلام بـە ئیزنـی کەسەکە دروست دەبێو نیەتیشی لەجیاتی دێنێ، جا ئەگەر کەسەکە هیچ پارەی نەدایێو تەنها گوتی: قوربانی بۆ من بکە. ئەوە ئەگەر ئیزندراوەکە قوربانیی بۆ کرد، قوربانیەکە دەبێتە قەرز لە سەر کەسەکە، هەروەك لە (تحفە)دا ڕوون کراوەتەوە، هەروەها بـە مـاڵی کەسەکەش–بە وەکیلایەتی– دروست دەبێ، هەروەك ڕوونمان کردەوە.

## ﴿ قوربانی بۆ کەسێکی مردوو ﴾

(وَلاَ عَنْ مَيِّتٍ إِنْ لَمْ يُوصِ بِهَا) قوربـانیکردن بـۆ مـردوو دروسـت نابـێ، ئەگـەر وەسـێتی نەکردبێ، بەلام ئەگەر مردووەکە وەسـێتی کردبـێ، ئـەو کاتـە قوربانیەکـەی بـۆ دروسـت دەبێ.

هەروەها ئەگەر کەسێك نەزری کردبێ: قوربانی بکا، یان ئەم ئاژەڵە بکاتە قوربانی، ئینجا –پێش سەربڕینیقوربانیەکە– نەزرکەرەکە مرد، ئەوە میراتگرەکەی قوربانیە نەزرەکەی بـ ـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــۆ

(فَصْلٌ) يُسَنُّ أَنْ يَعُقَّ عَنْ غُلَامٍ بِشَاتَيْنِ، وَجَارِيَةٍ بِشَاةٍ،

---

سەردەبڕێو گۆشتەکەشی بەش دەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا لە باسی (وەسێت) ڕوون کراوەتەوە ﴿عن ابن عباس رضالله عنهما: إِسْتَفْتَى سَعْدُ بن عبادة رَسُولَ اللهِﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ تُوُفِّيَتْ قَبْلَ قَضَائِهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: فَاقْضِهِ عَنْهَا﴾ رواه الشيخان، (سَعْد) پرسیاری کرد: لەبارەی نەزرێك کە لە سەر دایکی بوو، دایکیشی مردبو پێش ئەوەی نەزرکراوەکەی بکا؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ نەزرکراوەکە بۆ دایکت قەزا بکەوە.

جا بزانە: لە فەرموودەیەکی بێهێزداو هەم لە لای ئیمام(أبوالحسن العبادی): ئەگەر مردووەکە وەسێتیشی نەکردبێ، دروستە: قوربانیی بۆ بکرێ؟ چونکە ئەوەش بەشێکە لە خێرکردن، خێرکردنیش سودی هەیە بۆ مردوو و دەیگاتێ–بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام– هەوەك لە (المجموع)و (مغنی)دا فەرموویانە.

هەروەها بە مەزهەبی ئیمام (أحمد): قوربانیکردن بۆ مردوو، خێری گەورەترە لە قوربانی بۆ زیندوو؟ چونکە مردووەکە توانای قوربانیی نەماوەو پێویستی بە پاداشتی خێر هەیە، هەروەك لە (شرح منتهیالإرادات)دا فەرموویەتی، کەوابو: دروستە ڕێنموونی موسوڵمانان بکرێ بە (تَقْلِيدِ)ی ئەو فەرموودانە: قوربانی بۆ مردووەکانیان بکەن، وَاللهُ أَعْلَمُ.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەو کەسەی–بە ئیزن– قوربانی بۆ مردووەکە دەکا، دروست نیە: نە بە خۆیو نە ژنو منداڵەکانیشی لە گۆشتی قوربانیەکە بخۆنو نابێ بشیداتە دەوڵەمەندان، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەڵام ئەگەر–بێئیزن– بە فەرموودەی بێهێز قوربانی بۆ مردووێك بکا، ئەو کاتە دروستە لە گۆشتیقوربانیەکە بخوا، هەروەك لە (تحفة)و حاشیەکانی دەفامێتەوە، واتە: چونکە ئەمەیان وەك خێر بۆکردنە،والله أعلم.

﴿ فَصْلٌ: **لە باسی** (اَلْعَقِيقَة)=**هۆزەبانەی منداڵ** ﴾

واتە: ئەو ئاژەڵەی لە ڕۆژی حەفتەمینی لەدایکبوونی منداڵەکەدا سەر دەبڕێ تا ببێتە ئاشکراکردنی دڵخۆشبوون بەو نیعمەتە. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿كُلُّ غُلَامٍ مَرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ وَيُحْلَقُ وَيُسَمَّى﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، گشت منداڵێك بە بارمتەی هۆزەبانەکەی داندراوە: کە لە ڕۆژی حەفتەمی لەدایکبوونیدا بۆی سەردەبڕێ –واتە: ئەگەر هۆزەبانەکەی بۆ نەکرێ شەفاعەت بۆدایكو باوکی ناکا–، هەم لە ڕۆژی حەفتەمیدا سەری دەتاشرێو ناوی لێدەندرێ.

(يُسَنُّ أَنْ يَعُقَّ عَنْ غُلَامٍ بِشَاتَيْنِ) سوننەتە بە دوو مەڕ، یان بە دوو بزن هۆزەبانە بۆ کوڕ

بكا، هەم (وَجَارِيَةٍ بِشَاةٍ) بۆ كيژو نێرامووك بە مەڕێك، یان بزنێك هۆزەبانە بكا، هەروەك (أصحاب السنن بسند صحیح) گێڕاویەتیانەوە، هەروەها تەنها مەڕێك، یان بزنێك بۆ كوڕ دروست دەبێو بنچینەی سوننەتەكە دێتە جێ ﴿عن ابن عباس رضي‌الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وِسِنُّهَا وَسَلاَمَتُهَا وَالأَكْلُ وَالتَّصَدُّقُ كَالأُضْحِيَّةِ، وَيُسَنُّ طَبْخُهَا،

---

عَقَّ عَنِ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ كَبْشاً كَبْشاً﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، پێغەمبەرﷺ هەر یەكەو بەرانێكی بۆ (حسن)و (حسین) كردە هۆزەبانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: بۆ ئەو كەسە سوننەتە هۆزەبانەكە بكا: كە بەخێوكردنی منداڵەكەی لە سەر واجبە، بەو مەرجەی هەبوویی بێ، واتە: بۆ كەسێكیتر سوننەت نیەو نابێتە هۆزەبانە، كەوابو: وەڵامی حەدیسەكەیڕابردوو ئەمەیە: پێغەمبەرﷺ بەرانەكانی دانە ئیمامی (علی)و ئەویش بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ بۆ (حسن)و (حسین) كردنیە هۆزەبانە.

جا ئەگەر بەخێوكەری منداڵەكە لەو حەفت ڕۆژەدا نەبوویی بوو و تا زۆرترینی ماوەی زەیسانیش ڕۆیشت هەر نەبوویی بوو، ئەو كاتە هۆزەبانەكەی لە سەر لادەكەوێ، بەڵام ئەگەر لە حەفت ڕۆژەكەدا، یان پێش تەواوبوونی زۆرترینی زەیسانی توانای هۆزەبانەی پەیدا بوو، ئەو كاتە سوننەتەكەی لە سەر جێگیر دەبێو سوننەتە: بیكا، چونكە تا منداڵەكە بلۆغی دەبێ، كاتی هۆزەبانەكەی بۆ بەخێوكەرەكەی هەر دەمێنێ، واتە: هەر كاتێك منداڵەكە بلۆغی بوو سوننەتەكە لە سەر بەخێوكەرەكەی لادەكەوێو دەكەوێتە سەر خۆی، كەواتە: ئەگەر منداڵەكە بلۆغی بوو و هۆزەبانەشی بۆ نەكرابو، ئەو كاتە بۆ خۆی سوننەتە هۆزەبانە بۆ خۆی بكا.

هەروەها ئەگەر دەگونجا هۆزەبانەی بۆ بكرێ، بەڵام منداڵەكە پێش ڕۆژیحەفتەم مرد، یان لە دوای ڕۆژیحەفتەم پیش بلۆغبوون مرد، ئەو كاتەش هەر سوننەتە هۆزەبانەی بۆ بكرێ. جا بزانە: دەبی بەخێوكەرەكە بەماڵیخۆی هۆزەبانەكە بكا–نەك بە ماڵی منداڵەكە– ئەگینا: دەبێتە زامین، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ناوەڕۆكی ئەم ئاگاداریە ڕوون كراوەتەوە.

(وَسِنُّهَا) تەمەنی ئاژەڵی هۆزەبانەو هەم ڕەگەزەكەیو هەم (وَسَلاَمَتُهَا) بێعەیبیو هەم (وَالأَكْلُ وَالتَّصَدُّقُ) لێخواردنو كردنە خێریو پاشەكەوتكردنی گشتی (كَالأُضْحِيَّةِ) وەكو قوربانیی سوننەت وایە، بەڵام ئەگەر هۆزەبانەكەی نەزر كردبێ، ئەو كاتە–وەكو قوربانیی واجب– واجبە: هەموو گۆشتەكە بكاتە خێر: یان بە تازی، یان بە كوڵایی، چونكە (وَيُسَنُّ طَبْخُهَا) سوننەتە: گۆشتی هۆزەبانەكە بكوڵێندرێو دەرخواردی خەڵكی بدرێ، هەرچەند نەزركراویش بێ، واتە: ئەگەر بە تازیش بكرێتە خێر، هۆزەبانەكە هەر دروست دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

بـەڵکو وەهـا خێرتـرە ڕانـی ڕاسـتەی هۆزەبانەکـە-بـە تـەواوی- بێکوڵانـدن بدرێتـە مامانەکە، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەوها فەرمانی بە (فاطمة) کرد، هـەروەك (الحـاکم بإسـناد صحیح) گێڕاویەتیەوە.

وَلاَ يُكْسَرُ عَظْمٌ، وَأَنْ تُذْبَحَ يَوْمَ سَابِعِ وِلاَدَتِهِ، وَيُسَمَّى فِيهِ،

---

جـا بزانـە: ووشـترێك، یـان مانگایـەك-وەکـو قوربـانی- بـۆ حـەفت منـداڵان دەبێتـە هۆزبانـە، بـەڵکو دروسـتە: حـەفت کـەس لـە مانگایەکدا ببنـە هاوبـەش: بـۆ هۆزەبانـە، یان بۆ هۆزەبانەو قوربانی، یان بـۆ هۆزەبانـەو قوربـانیو گۆشـت خـواردن، هـەروەك لـە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يُكْسَرُ عَظْمٌ) سوننەتە هیچ ئێسقانێکی هۆزەبانەکە نەشکێندرێ، هەم (وَأَنْ تُذْبَحَ يَوْمَ سَابِعِ وِلاَدَتِهِ) سوننەتە لە ڕۆژی حەفتەمینی لەدایکبوونیمنداڵەکـە هۆزەبانەکـە سـەر ببڕێ، واتـە: ئەگەر بە ڕۆژ لە دایك ببێ، ڕۆژەکەش لە حەفتەکە دەژمێردرێ، بەڵام ئەگەر بە شەو لە دایك ببێ، شەوەکە لەو حەفتە ناژمێردرێ، بەڵکو لە ڕۆژەکەی دوایشەوەکەوە دەژمێردرێ،

جا بزانە: کە تەواویمنداڵەکە بە زیندوویی هاتە دەرەوە، ئەوە کاتی هۆزەبانەکـەی دێ، کەواتە: ئەگەر پێش ڕۆژی حەفتەم، یان لە دوای ڕۆژی حەفتەم هۆزەبانەکەی سەر ببڕێ، سوننەتەکە هەر پێك دێ، بەڵام بۆ کۆرپەی لەبارچوو هۆزەبانە سوننەت نیە.

ئینجا سوننەتە لە کاتی سەربڕین: (بِسْمِ اللهِ) بکا، بەڵام مەرجە: نیەتی هۆزەبانەکە بێنێ، کەوابو: با بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ وَاللهُ أكْبَرُ اَللَّهُمَّ لَكَ وإِلَيْكَ، اَللَّهُمَّ هَذِهِ عَقِيقَةُ فُلاَنٍ﴾ رواه البیهقی بإسناد حسن، خوایە ئەمە هۆزەبانەی فڵانـە منداڵەیـە، هـەروەك لـە سەرچـاوەکاندا ئـەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

## ﴿ ناولێنانی منداڵ ﴾

(وَيُسَمَّى فِيهِ) سوننەتە لـە ڕۆژی حەفتەمـدا پـێش سـەربڕینی هۆزەبانەکـە منداڵەکـە نـاوی لێبندرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو لە سەرەتای ئەم باسـەدا، جـا ئەگـەر منداڵەکـە پێش ڕۆژی حەفتەمی، یان پێش ناولێنانی مرد، ئەو کاتەش هەر سوننەتە ناوی لێبنـدرێ، بـەڵکو سـوننەتە: کۆرپـەی لەبارچـووش نـاوی لێبنـدرێ، هـەروەها دروسـتە: لـە ڕۆژی لەدایکبوونیشی ناوی لێبندرێ، پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: ﴿وُلِدَ لِي اَللَّيْلَةَ غُلاَمٌ فَسَمَّيْتُهُ بِاسْمِ أَبِي: إِبْرَاهِيمَﷺ﴾ رواه مسلم، ئەمشەو کوڕێکم بوو بە ناوی باوکم (إبراهیم) پێغەمبەرﷺ ناوم لێنا.

جا بزانە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿تَسَمَّوْا بِأَسْمَاءِ الأَنْبِيَاءِ، وَأَحَبُّ الأَسْمَاءِ إِلَىاللهِ تعالى: عَبْدُاللهِ وَعَبْدُالرَّحْمَنِ﴾ رواه أبوداود والنسائی بسـند صـحیح، نـاوی پێغەمبـەران علیهم الصلاة والسلام لە منداڵەکانتان بنێن، خۆشەویسترینی ناوەکـان لـە لای خـوای گـەورە: (عبـدالله)و (عبـدالرحمن)ن. بـەڵکو بـە تایبـەتی لەبارەی ناوە ڕێزدارەکـانی پێغەمبـەرمانﷺ

بەخۆی فەرموویەتی: ﴿سَمُّوا بِإِسْمِي وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي﴾ رواه الشيخان، ناوی من لە منداڵەکانتان بنێن، بەڵام (کنية)ی من بۆ خۆتان دامەنێن.

جا بزانە: ناوی شاهنشاه=شاهیشاهان حەرامە، ناوی ناشیرینیش ناپەسندە، بەڵکو سوننەتە ناوەکە جوان و خۆش بێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: وَيُحْلَقَ رَأْسُهُ بَعْدَ ذَبْحِهَا، وَيُتَصَدَّقَ بِزِنَتِهِ ذَهَبًا أَوْ فِضَّةً، وَيُؤَذَّنَ فِي أُذُنِهِ حِينَ يُولَدُ، وَيُحَنَّكَ بِتَمْرٍ.

---

﴿إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَسْمَائِكُمْ وَأَسْمَاءِ آبَائِكُمْ، فَأَحْسِنُوا أَسْمَائَكُمْ﴾ رواه أبوداود بإسناد جيد كما فیالمجموع، لە ڕۆژی قیامەتدا ئێوە بە ناوی خۆتان و باوکەکانتان بانگ دەکرێن، کەوابو: ناوی جوان لە خۆتان بنێن.

جا ئەگەر ناوێکیحەرام، یان ناشیرین، یان ناخۆشی لێندرابێ، ئەو کاتە سوننەتە ناوەکە بگۆڕێ ﴿عن ابن عمررضالله عنهما: أَنَّ اِبْنَةً لِعُمَرَ كَانَتْ تُسَمَّى عَاصِيَة، فَسَمَّاهَاالنَّبِيُّﷺ جَمِيلَة﴾ رواه مسلم، کیژێکی ئیمامی (عمر) ناوی (عاصية) بوو، پێغەمبەرﷺ ناوی لێنا: (جميلة).

ئەم باسە لە سەرچاوەکاندا درێژتر ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُحْلَقَ رَأْسُهُ بَعْدَ ذَبْحِهَا) سوننەتە-لە ڕۆژی حەفتەمدا- لە دوای سەربڕینی هۆزەبانەکە: هەموو سەری منداڵەکە بتاشرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو لە سەرەتای ئەم باسەدا، جا لەم سوننەتەشدا جیاوازی کوڕو کچ نیە، بەڵام ناپەسندە بەشێکی سەری بتاشرێو بەشێکیشی نەتاشرێ، یان خوێنی هۆزەبانەکە لە سەری منداڵەکە بدرێ، ئینجا (وَيُتَصَدَّقَ بِزِنَتِهِ ذَهَبًا أَوْ فِضَّةً) رواه الترمذي وصححه الحاكم، سوننەتە بە قەد گرانایی مووە تراشراوەکەی: زێڕ، یان زیو بکرێتە خێر.

هەروەها (وَيُؤَذَّنَ فِي أُذُنِهِ حِينَ يُولَدُ) سوننەتە کە منداڵەکە لە دایك بوو: لە گوێی ڕاستەیدا بانگی نوێژ بدرێ ﴿عن أبىرافعﷺ: أَذَّنَ النَّبِيُّﷺ بِالصَّلاَةِ فِي أُذُنِ الْحَسَنِ حِينَ وَلَدَتْهُ فَاطِمَةُرضالله عنها﴾ رواه الترمذي وصححه، پێغەمبەرﷺ لە گوێی (حسن)دا بانگی نوێژی دا کە (فاطمة) بوی. هەروەها سوننەتە: ئیقامەتیشی لە گوێی چەپەیدا بکرێ، چونکە ئەویش لە حەدیسێکدا هاتوە، هەم سوننەتە لە گوێی ڕاستەیدا سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾و ئایەتی ﴿وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ بخوێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها (يُحَنَّكَ بِتَمْرٍ) سوننەتە کە منداڵەکە لە دایك بوو: دەمی شیرن بکرێ، واتە مرۆڤێکی چاك-پیاو، یان ئافرەت- دانە قەسپێك، یان شتێکیتری شیرن بە دەمی خۆی بجوێ، ئینجا دەناو دەمی منداڵەکەی بنێو تێیدا بیهێنێو ببیا، تاکو بیمژێو شیرنایی بگاتە ناو زگی ﴿عن أبىموسىﷺ: وُلِدَ لِي غُلاَمٌ فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّﷺ فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ، وَحَنَّكَهُ

بِتَمْرَةٍ وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ﴾ رواه الشيخان، كوڕێكم بوو و هێنامه لای پێغەمبەرﷺ، ئەویش ناوی لێنا (إبراهیم)و بە دانە قەسپێك دەمی شیرین كردو دوعای بەرەكەتی بۆ كرد.
هەروەها سوننەتە: بە پیرۆزباییەكەی حەرزەتی(حسن)ی كوڕی ئیمامی(علی)رضالله عنهما پیرۆزبایی لە باوك و دایك و خزمەكانی منداڵەكە بكرێ و دوعاش بۆ كشتیان بكرێ و بڵێ:

(كِتَابُ الأَطْعِمَةِ)

حَيَوَانُ الْبَحْرِ اَلسَّمَكُ مِنْهُ حَلاَلٌ كَيْفَ مَاتَ، وَكَذَا غَيْرُهُ فِالأَصَحِّ، وَقِيلَ لاَ، وَقِيلَ إِنْ أُكِلَ مِثْلُهُ فِالْبَرِّ حَلَّ، وَإِلاَّ فَلاَ: كَكَلْبٍ وَحِمَارٍ،

---

﴿بَارَكَ اللهُ لَكَ فِالْمَوْهُوبِ لَكَ، وَشَكَرْتَ الْوَاهِبَ، وَبَلَغَ أَشُدَّهُ، وَرُزِقْتَ بِرَّهُ﴾ خوا منداڵەكەت لێ پیرۆز بكا، شوكری خوای بەخشندە بكەی و تەمەنی درێژ بێ، خوا چاكەی منداڵەكەت بداتێ. ئەویش وەڵام بداتەوەو بڵێ: ﴿جَزَاكَ اللهُ خَيْراً﴾ خوا پاداشتی چاكت بداتەوە، خوا منداڵێ چاكیش بداتە تۆ. یان هەر دوعایەكی‌تر، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

﴿ **پاشكۆ** ﴾: مۆزەبانەی ئاژەڵەكانیش سوننەتە، واتە: هەر كاتێك ئاژەڵەكان زان، یەكەم بێچووەكەیان بۆ خوا سەربڕێ و گۆشتەكەی بكاتە خێر، تاكو بەرەكەت بكەوێتە ئاژەڵەكانی و بەروبومیان زۆر ببێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿فِي كُلِّ سَائِمَةٍ فَرَعٌ تَغْذُوهُ مَا شِيَتُكَ حَتَّى إِذَا اسْتَحْمَلَ ذَبَحْتَهُ فَتَصَدَّقْتَ بِلَحْمِهِ عَلَى ابْنِ السَّبِيلِ فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ﴾ رواه أبوداود والنسائی بسند صالح، لە كشت ئاژەڵەكانی لەوەڕاودا مۆزەبانە هەیە: ئەو بێچووەی ئاژەڵەكەت خۆراكی دەداتێ تا گەورە دەبێ، سەری ببڕەو گۆشتەكەی بە خێر بدە ڕێبواران، ئەوە باشترە.

## ﴿ كِتَابُ الأَطْعِمَةِ: **پەرتوكی خواردەمەنیەكانی حەڵاڵ و حەرام** ﴾

(حَيَوَانُ الْبَحْرِ) گیانلەبەری دەریا: كە بەردەوام لە ئاودا بژیێ و لە دەرەوەی ئاو نەژیێ (اَلسَّمَكُ مِنْهُ حَلاَلٌ كَيْفَ مَاتَ) لەو گیانلەبەرانە: ماسی حەڵاڵە، هەر چۆنێكی بمرێ: بەخۆی، یان بە لێدان، یان بە دەرمان، یان بە برینداركردن، یان بە ووشكبوونی ئاو، هەرچەند بە مردوویش وەسەر ئاو كەوتبێ، كەواتە: پێویستی بە سەربڕین نیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُالْبَحْرِ وَطَعَامُهُ﴾ نێچیری دەریاو مردووی دەریا–كە وەسەر ئاو كەوتوە– بۆ ئێوە حەڵاڵ كراوە. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ اَلْحِلُّ مَيْتَتُهُ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحیح، دەریا ئاوەكەی پاككەرەوەیە، مردووەكەشی حەڵاڵە.
(وَكَذَا غَيْرُهُ) هەروەها–جگە لە ماسیش– گیانلەبەرەكانی‌تری دەریاش حەڵاڵن هەرچەند لە سەر وێنەی سەگ و بەرازیش بن و هەر چۆنێك مردبن، واتە: پێویست بە سەربڕین ناكا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی‌ڕاسترا، بە بەڵگەی ئایەت و حەدیسەكەی‌ڕابردوو، هەروەك لە

(المجموع)و (مغنى)دا فەرموویانە. (وَقِيلَ: لَا) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: جگە لە ماسی هیچیتر حەڵاڵ نیە (وَقِيلَ) لە بێهێزێکیتردا: (إنْ أُكِلَ مِثْلُهُ فِي الْبَرِّ حَلَّ) ئەگەر وێنەکەی لە بیاباندا بخورێ: وەکو مانگاو مەڕ، ئەوە حەڵاڵە (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر وێنەکەی نەخورێ، ئەوکاتە (فَلَا) حەڵاڵ نیە: (كَكَلْبٍ وَحِمَارٍ) وەکو سەگ و بەراز و کەر و هێستر.

وَمَا يَعِيشُ فِي بَرٍّ وَبَحْرٍ: كَضِفْدَعٍ وَسَرَطَانٍ وَحَيَّةٍ حَرَامٌ، وَحَيَوَانُ الْبَرِّ يَحِلُّ مِنْهُ الأَنْعَامُ وَالْخَيْلُ وَبَقَرُ وَحْشٍ وَحِمَارُهُ وَظَبْيٌ وَضَبُعٌ وَضَبٌّ وَأَرْنَبٌ وَثَعْلَبٌ وَيَرْبُوعٌ وَفَنَكٌ وَسَمُّورٌ، وَيَحْرُمُ بَغْلٌ وَحِمَارٌ أَهْلِيٌّ

---

(وَمَا يَعِيشُ فِي بَرٍّ وَبَحْرٍ) ئەو گیانلەبەرەی هەم لە دەریاداو هەم لە بیاباندا دەژیێ: (كَضِفْدَعٍ وَسَرَطَانٍ وَحَيَّةٍ) وەکو بۆق و قرژاڵ و مارو تیمساح و کیسەڵ و هەر ئاژەڵێکیتر–کە لە دەرەوەی ئاو بژیێ– ئەوانە (حَرَامٌ) گشتی حەرامن و بە سەربڕینیش حەڵاڵ نابن.

بەڵام ئیمامی (النواوی) لە (المجموع)دا ئەو فەرموودەیەی بە ڕاستو پشت پێبەستراو داناوە: کە–جگە لە بۆق– گشت مردووێکی دەریایی حەڵاڵە. واتە: هەرچەند لە بیابانیشدا بژیێ، هەروەك (الشبراملسی)و (الشروانی) فەرموویانە.

جا وا دیارە (تحفة)و (مغنی)ش پشتیان بەم فەرموودەیە بەستوە؟ چونکە ڕەخنەیان لێنەگرتوە، هەم بە مەزهەبی ئیمام (مالك)ش: ئەوانە حەڵاڵن.

ئینجا بزانە: باڵندەکانی ئاوی گشتی حەڵاڵن: وەکو مراویو قازو ماسیگرەو باڵندە ئاویەکانیتر، بەڵام مەرجە: سەر ببڕێن، واتە: ئەگەر سەر نەبڕێن حەڵاڵ نابن، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَحَيَوَانُ الْبَرِّ) ئاژەڵی بیابان=کە لە ئاودا نەژیێ: (يَحِلُّ مِنْهُ الأَنْعَامُ) بزنو مەڕو مانگاو ووشتر حەڵاڵە، هەم (وَالْخَيْلُ) ئەسپو ماینیش حەڵاڵە ﴿عن أسماء رضی‌الله عنها: نَحَرْنَا فَرَساً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَكَلْنَاهُ﴾ رواه الشيخان، لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ ئەسپێکمان سەر بڕیو خواردمان.

هەم (وَبَقَرُ وَحْشٍ وَحِمَارُهُ) مانگای کێویو کەری کێوی حەڵاڵن ﴿عن أبي قتادة ﷺ: أَنَّهُ أَصَابَ حِمَاراً وَحْشِيّاً فَأَكَلَ مِنْهُ النَّبِيُّ ﷺ﴾ رواه الشيخان، (أبوقتادە) کەرێکی کێوی کوشت، پێغەمبەریشﷺ لە گۆشتەکەی خوارد.

هەم (وَظَبْيٌ) ئاسك=مامزو بزنە کیویو (وَضَبُعٌ) کەمتیار گشتی حەڵاڵن ﴿عن جابر ﷺ عن النَّبِيِّ ﷺ: اَلضَّبُعُ صَيْدٌ يُؤْكَلُ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، کەمتیار نێچیرەو گۆشتی دەخورێ. هەم (وَضَبٌّ) سوسمارو (وَأَرْنَبٌ) کەروێشك و (وَثَعْلَبٌ) ڕیویو (وَيَرْبُوعٌ) جورجە کێوی–کە دەستەکانی زۆر کورتنو پێیەکانی درێژترنو کۆتایی کلکی مووی پێوەیە–، هەم (وَفَنَكٌ) دەڵەك و (وَسَمُّورٌ) سمۆرەو سیخوڕو ژوژەك، ئەوانەش گشتی حەلاڵن.

بەلام (وَيَحْرُمُ بَغْلٌ وَحِمَارٌ أَهْلِيٌّ) هێسترو کەری خۆماڵی حەرامن ﴿عن جابرﷺ: نَهانَا النَّبِيُّﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنِ الْبِغَالِ وَالْحَمِيرِ﴾ رواه أبوداود بإسناد صحيح، لە غەزای (خیبر)دا پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردین: گۆشتی هێسترەکانو کەرەکان بخۆین.

وَكُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ وَمِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ: كَأَسَدٍ وَشَاهِينٍ وَصَقْرٍ وَنَسْرٍ وَعُقَابٍ وَكَذَا ابْنُ آوَى وَهِرَّةٌ وَ كَحَيَّةٍ وَعَقْرَبٍ وَغُرَابٍ أَبْقَعَ وَحِدَأَةٍ وَفَأْرَةٍ وَكُلِّ سَبُعٍ ضَارٍ وَكَذَا رَخَمَةٌ وَبُغَاثَةٌ، وَالأَصَحُّ حِلُّ غُرَابِ زَرْعٍ وَتَحْرِيمُ بَبَّغَاءَ وَطَاوُسٍ، وَتَحِلُّ نَعَامَةٌ وَكَرْكِيٌّ وَبَطٌّ وَإِوَزٌّ وَدَجَاجٌ وَحَمَامٌ وَهُوَ كُلُّ مَا عَبَّ وَهَدَرَ، وَمَا عَلَى شَكْلِ عُصْفُورٍ

---

(وَ) هەروەها حەرامە: (كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ) لە چینی دڕندەکان: گشت خاوەن ددانێکی بەهێز: کە بە ددانەکانی هەڵمەت بباتە سەر گیانلەبەرەکان، هەم (وَمِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ) لە چینی باڵندەکانیش گشت خاوەن نینۆکێکی بەهێز: کە بە نینۆکەکانی ڕاو بکا: (كَأَسَدٍ) وەکو شێر (وَنَمِرٍ) پڵینگ (وَذِئْبٍ) گورگ (وَدُبٍّ) ورچ (وَفِيلٍ) فیل (وَقِرْدٍ) مەیمونو ئەو جۆرە دڕندانە، هەم (وَبَازٍ وَشَاهِينٍ وَصَقْرٍ) وەکو بازو شاهینو (وَنَسْرٍ وَعُقَابٍ) سیسارکو هەڵۆو لەقلەق (وَكَذَا ابْنُ آوَى) هەروەها چەقەڵو (وَهِرَّةُ وَحْشٍ) کتك=پشیلەی کەیی و کێویش حەرامن (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿عن ابن عباس رضالله عنهما: نَهَى النَّبِيُّﷺ عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ وَكُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: گۆشتی گشت خاوەن ددانێکی بەهێزو خاوەن نینۆکێکی بەهێز.

(وَ) هەروەها (يَحْرُمُ مَا نُدِبَ قَتْلُهُ) حەرامە خواردنی ئەو گیانلەبەرانەی کوشتنیان بە سوننەت دانراوە: (كَحَيَّةٍ وَعَقْرَبٍ) وەکو مارو دوپشك، هەم (وَغُرَابٍ أَبْقَعَ وَحِدَأَةٍ) وکو قەلە بەڵەكو كۆلارە، هەم (وَفَأْرَةٍ) مشك، هەم (وَكُلِّ سَبُعٍ ضَارٍ) گشت دڕندەیەکی زیانبەخش، پێغەمبەرﷺ فەرمانی داوە: ﴿خَمْسُ فَوَاسِقَ يُقْتَلْنَ فِيالْحِلِّ وَالْحَرَمِ: اَلْحَيَّةُ وَالْفَأْرَةُ وَالْغُرَابُ الأَبْقَعُ وَالْحِدْأَةُ والْكَلْبُ الْعَقُورُ﴾ رواه الشيخان، پێنج فاسق لە (حَرَم)ی (مَكَّة)و لەدەرەوەی (حَرَم)ش دەبی بکوژرێن: مار، دوپشك، مشك، قەلە بەڵەك، كۆلارە، ئەو سەگەی خەڵکی بریندار دەکا.

(وَكَذَا رَخَمَةٌ) هەروەها سیسارکی کەچەڵو (وَبُغَاثَةٌ) كۆلارەی سپیش حەرامن (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (حِلُّ غُرَابِ زَرْعٍ) ئەو قەلەی کشتوکاڵ دەخوا-کە پێی دەگوترێ: قاژ- حەلالە (وَ) هەر بە فەرمودەی ڕاستتر: (تَحْرِيمُ بَبَّغَاءَ وَطَاوُسٍ) بەببەغاو تاووس هەردووکیان حەرامن.

بەلام (وَتَحِلُّ نَعَامَةٌ) نەعامە حەلالە، هەم (وَكَرْكِيٌّ) قورینگو (وَبَطٌّ وَإِوَزٌّ) قازو مراوی و

(وَدَجَاجٌ) مریشك‌و (وَحَمَامٌ) كۆتر، ئه‌وانه گشتی حه‌ڵاڵن (وَهُوَ كُلُّ مَا عَبَّ وَهَدَرَ) مه‌به‌ست به كۆتر: گشت باڵنده‌یه‌كه: كه بێ‌پشودان ئاو بخواته‌وه‌و له خوێندنی‌دا ده‌نگ بێنێ‌و ببا (وَ) هه‌روه‌ها (مَا عَلَى شَكْلِ عُصْفُورٍ) هه‌ر باڵنده‌یه‌كی لـه سـه‌ر وێنـه‌ی چۆله‌كه بـێ، ئـه‌ویش وَإِنْ اِخْتَلَفَ لَوْنُهُ وَنَوْعُهُ كَعَنْدَلِيبِ وَصَعْوَةٍ وَزُرْزُورٍ، لاَ خُطَّافٌ وَنَمْلٌ وَنَحْلٌ وَذُبَابٌ وَحَشَرَاتٌ كَخُنْفُسَاءَ وَدُودٍ، وَكَذَا مَا تَوَلَّدَ مِنْ مَأْكُولٍ وَغَيْرِهِ، وَمَا لاَ نَصَّ فِيهِ إِنْ اِسْتَطَابَهُ أَهْلُ يَسَارٍ وَطِبَاعٍ سَلِيمَةٍ مِنَ الْعَرَبِ فِي حَالِ رَفَاهِيَةٍ حَلَّ، وَإِنْ اِسْتَخْبَثُوهُ فَلاَ، وَإِنْ جُهِلَ اِسْمُ حَيَوَانٍ سُئِلُوا وَعُمِلَ بِتَسْمِيَتِهِمْ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ اِسْمٌ عِنْدَهُمْ أُعْتُبِرَ بِالأَشْبَهِ، وَإِذَا ظَهَرَ تَغَيُّرُ لَحْمِ جَلاَّلَةٍ حَرُمَ أَكْلُهُ، وَقِيلَ يُكْرَهُ، قُلْت: اَلأَصَحُّ يُكْرَهُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

حه‌ڵاڵه (وَإِنْ اِخْتَلَفَ لَوْنُهُ وَنَوْعُهُ) هه‌رچه‌ند ڕه‌نگ‌و جۆریشی لێك جیابێ: (كَعَنْدَلِيبِ وَصَعْوَةٍ وَزُرْزُورٍ) وه‌كو بلبل‌و چوله‌كه‌ی سه‌رسورو ڕه‌شۆڵه‌و ئه‌و جۆرانه.

(لاَ خُطَّافٌ) به‌ڵام په‌ڕه‌سێلكه‌و شه‌مشه‌مه‌كوره حه‌ڵاڵ نیـه، هـه‌م (وَنَمْلٌ) مێـروو (وَنَحْلٌ) مێشـه هـه‌نگوین‌و (وَذُبَابٌ) مـێش‌و زه‌رگه‌تـه‌و زه‌نگه‌سـۆره‌و (وَ حَشَرَاتٌ) گیانله‌بـه‌ره بچـوكه‌كانی زه‌ویـش حـه‌ڵاڵ نـین: (كَخُنْفُسَاءَ وَدُودٍ) وه‌كـو قالۆچـه‌و سیسـركه‌و كـرم‌و مارمیلۆكه‌و قمقمۆك‌و (وَكَذَا مَا تَوَلَّدَ مِنْ مَأْكُولٍ وَغَيْرِهِ) هه‌روه‌ها هـه‌ر گیانله‌بـه‌رێكیش لـه نێوان گۆشتخوراو و گۆشتنه‌خوراودا بوبێ، ئه‌ویش حه‌رامه.

(وَمَا لاَ نَصَّ فِيهِ) ئه‌و گیانله‌به‌ره‌ی ده‌قێكی قورئان، یان حه‌دیس، یان (إجماع)ی له سه‌ر نیه، ته‌ماشا ده‌كـه‌ین: (إِنْ اِسْتَطَابَهُ أَهْلُ يَسَارٍ وَ طِبَاعٍ سَلِيمَةٍ مِنَ الْعَرَبِ) ئه‌گـه‌ر ئـه‌و عه‌ره‌بانه‌ی كه ده‌وڵه‌مه‌ندن‌و خاوه‌ن ته‌بیعه‌تێكی پاكن‌و دانیشتووی شارو گونده‌كانن ئه‌و ئاژه‌ڵه‌یان به پاك دانا (فِي حَالِ رَفَاهِيَةٍ) لـه حاڵـه‌تی هه‌بوویی‌دا، ئـه‌وه (حَلَّ) ئاژه‌ڵه‌كـه حه‌ڵاڵـه (وَإِنْ اِسْتَخْبَثُوهُ) ئه‌گـه‌ر بـه پیسـیان دانـا (فَلاَ) حـه‌ڵاڵ نیـه، بـه‌ڵام ڕه‌فتـاری عه‌ره‌به‌كانی چۆڵه‌په‌رست ڕه‌چاو ناكرێ.

(وَإِنْ جُهِلَ اِسْمُ حَيَوَانٍ) ئه‌گه‌ر ناوی ئاژه‌ڵێك نه‌زاندرا، ئه‌و كاته (سُئِلُوا وَعُمِلَ بِتَسْمِيَتِهِمْ) پرسیار له عه‌ره‌به‌كان ده‌كرێ‌و به‌گوێره‌ی ناولێنانی ئه‌وان ڕه‌فتاری حـه‌ڵاڵی‌و حـه‌رامی‌ی ده‌كرێ (وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ اِسْمٌ عِنْدَهُمْ) ئه‌گه‌ر ئاژه‌ڵه‌كه هیچ ناوێكی له لای ئه‌وان نه‌بو، ئـه‌و كاته (أُعْتُبِرَ بِالأَشْبَهِ) وێچوترین ئاژه‌ڵ به‌و ئاژه‌ڵه ڕه‌چاو ده‌كرێ بۆ حه‌ڵاڵی‌و حه‌رامی‌ی.

## ﴿ خوارده‌مه‌نیه‌كانی ناپه‌سندو حه‌رام ﴾

(وَإِذَا ظَهَرَ تَغَيُّرُ لَحْمِ جَلاَّلَةٍ) هه‌ر كاتێك گۆڕانی گۆشتی گیانله‌به‌ری پیسایی‌خۆر ئاشكرا بوو: وه‌ك مانگاو مه‌ڕو بزن‌و مریشك شتێكی پیس بخۆن‌و تامی گۆشته‌كه‌یان بگۆڕێ، ئه‌وه (حَرُمَ أَكْلُهُ) خـواردنی حه‌رامـه (وَقِيلَ يُكْرَهُ) لـه فه‌رمووده‌یه‌كـدا: ناپه‌سـنده (قُلْتُ) ئیمـامی (النواوی) فه‌رموویه‌تی (اَلأَصَحُّ يُكْرَهُ وَاللهُ أَعْلَمُ) به فه‌رمووده‌ی‌ڕاستتر: ناپه‌سنده خواردنی

گۆشتی ئەو گیانلەبەرەی بە پیسایی خواردن تامو بۆنی گۆڕاوە ﴿عن إبن عمررضىالله عنهما: نَهَى النَّبِيُّﷺ عَنِ الْجَلاَّلَةِ وَأَلْبَانِهَا﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: گۆشتو شیری ئاژەڵی پیسایی‌خۆر بخورێ ئەگەر گۆڕابێ.

فَإِنْ عُلِفَتْ طَاهِرًا فَطَابَ حَلَّ، وَلَوْ تَنَجَّسَ طَاهِرٌ كَخَلٍّ وَدِبْسٍ ذَائِبٍ حَرُمَ، وَمَا كُسِبَ بِمُخَامَرَةِ نَجِسٍ كَحِجَامَةٍ وَكَنْسٍ مَكْرُوهٌ، وَيُسَنُّ أَنْ لاَ يَأْكُلَهُ وَيُطْعِمَهُ رَقِيقَهُ وَنَاضِحَهُ، وَيَحِلُّ جَنِينٌ وُجِدَ مَيِّتًا فِي بَطْنِ مُذَكَّاةٍ،

---

کەوابو: (فَإِنْ عُلِفَتْ طَاهِرًا فَطَابَ) ئەگەر ئاژەڵەکە ئالیکێکی پاکی دەرخوارد دراو تامو بۆنی گۆشتەکە خۆش بوو، ئەو کاتە (حَلَّ) حەلاڵەو ناپەسند نیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر بەرخێك بە شیری سەگ بەخێو کرابێ، یان مەڕێك بە ماڵێ حەڕام بەخێو کرابێ، یان کشتوکاڵێك لە زبڵو پیسایی‌دا چێندرابێ، یان هێلکە بە ئاوی پیس کوڵێندرابێ، یان گۆشت بۆگەن بوبێ، ئەوانە هیچیان حەڕام نابنو دروستە بخورێن.

هەروەها هەر شتێکی پاك بێو زیانی نەبێ خواردنی حەلاڵە: وەك پیستەو ئێسقانی ئاژەڵی سەربڕاو و هێلکەی گشت گیانلەبەرێك هەرچەند گۆشتیشی نەخورێ، بەلاّم هەر شتێك پیس بێ، یان پیس بوبێ، یان پاك بێو زیانی لێ‌بدا: وەکو بەردو خۆڵو شوشە، ئەوانە گشتی خواردنیان حەڕامە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَلَوْ تَنَجَّسَ طَاهِرٌ) ئەگەر شتێکی شل پیس بوو: (كَخَلٍّ وَدِبْسٍ ذَائِبٍ) وەکو سرکەو ڕونی شلو شیرو ئەو جۆرە شتانە، ئەوە (حَرُمَ) خواردنی حەڕامە، چونکە پاك نابێتەوە، هەروەك لە کۆتایی (باب النجاسة) بە بەڵگەوە ڕوونمان کردەوە.

(وَمَا كُسِبَ بِمُخَامَرَةِ نَجِسٍ) هەر ماڵێك وەدەست هێندرابێ بە تێکەڵبوونی کارێکی پیس: (كَحِجَامَةٍ) وەکو خوێن لێگرتنو (وَكَنْسٍ) ماڵینی شتێکی پیس، ئەوە (مَكْرُوهٌ) خواردنی ناپەسندە، کەوابو: (وَيُسَنُّ أَنْ لاَ يَأْكُلَهُ) سوننەتە ئەو ماڵە نەخوا، بەڵکو (وَيُطْعِمَهُ رَقِيقَهُ وَنَاضِحَهُ) سوننەتە بیداتە کۆیلەی‌و وشتری‌و ئاژەڵەکانی‌تری ﴿عن محيصةﷺ سُئِلَ النَّبِيُّﷺ عَنْ أُجرَةِ الْحَجَّامِ؟ فَنَهَاهُ عَنْهُ وَقالَ: أَطْعِمْهُ رَقِيقَكَ وَأَعْلِفْهُ نَاضِحَكَ﴾ رواه أبوداود والترمذي بسند حسن، لەبارەی کرێی خوێنگرتن پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا؟ ئەویش قەدەغەی کردو فەرمووی: دەرخواردی کۆیلەو ووشترەکەتی بدە.

(وَيَحِلُّ جَنِينٌ) حەلاڵە خواردنی‌ئەو کۆرپەیەی کە(وُجِدَ مَيِّتًا فِي بَطْنِ مُذَكَّاةٍ) لە ناو زگی دایکی‌دا لە کاتی سەربڕین مردبێ، هەرچەند مووشی لێ‌هاتبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ذَكَاةُ الْجَنِينِ ذَكَاةُ أُمِّهِ﴾ رواه أبوداود والترمذي بسند حسن، سەربڕینی کۆرپەی ناو زگ بە سەربڕینی دایکی دەبێ.

جا بزانە: کۆرپەکە بەو مەرجە حەڵاڵە: کە لە دوای سەربڕینی دایکی جولەی نەمێنێ، واتە: ئەگەر ماوەیەکی درێژ لە زگی دایکیدا دەجولا، ئینجا جولەی نەما، ئەو کاتە حەرامەو حەڵاڵ نابێ، هەروەها ئەگەر لە زگی دایکی هێندرا دەرەوەو گیانی جێگیربووی تێدا بوو،

وَمَنْ خَافَ عَلَى نَفْسِهِ مَوْتًا أَوْ مَرَضًا مَخُوفًا وَوَجَدَ مُحَرَّمًا لَزِمَهُ أَكْلُهُ، وَقِيلَ يَجُوزُ، فَإِنْ تَوَقَّعَ حَلاَلاً قَرِيبًا لَمْ يَجُزْ غَيْرُ سَدِّ الرَّمَقِ، وَإِلاَّ فَفِي قَوْلٍ يَشْبَعُ،

---

ئەو کاتە مەرجە: سەر ببڕێ ئەگینا: حەڵاڵ نابێ، واتە: بەڵام ئەگەر تەنها جولەی سەربڕاوی مابو، ئەو کاتە بێسەربڕین حەڵاڵ دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوتەوە.

## ﴿ باسی خواردنی مردار بە هۆی ناچاری ﴾

**مردار** بەو ئاژەڵو باڵندەیە دەگوترێ: کە گۆشتی نەخورێو مردبێ: وەکو هێسترو کۆلارە، هەرچەند سەریشی ببڕێ هەر حەرامە، یان گۆشتی بخورێ بەڵام بە بێسەربڕینێکیشەرعی گیانی دەرچوبێ.

جا بۆ پێناسەی (ضَرُورَة)=ناچاری، بگەڕێوە (باسی ڕیبای قەرز) لە بەرگیسێیەم.

جا بزانە: هەر پارچەیەك لە حاڵەتیزیندوویی‌دا لە ئاژەڵو باڵندە بکرێتەوە، ئەویش مردارەو حەرامە بخورێ، تەنها ماسیو کلۆ نەبێ، واتە: هەر پارچەیەك لە ماسیی زیندوو بکرێتەوە حەڵاڵە بخورێ، چونکە سەربڕینی بۆ دانەندراو، هەروەك لە (باب النجاسة)دا ڕابرا ﴿عن أبىواقدﷺ قَدِمَ النَّبِيُّﷺ اَلْمَدِينَةَ وَهُمْ يَجُبُّونَ أَسْنِمَةَ الإِبْلِ وَيَقْطَعُونَ أَلَيَاتِ الْغَنَمِ، فَقَالَ: مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهِيَ مَيْتَةٌ﴾ رواه أبوداود بسند حسن، پێغەمبەرﷺ هاتە (مَدِينَة)، خەڵکەکە قەپۆزی ووشترو دونگی مەڕەکانیان بە زیندوویی لێدەکردەوەو دەیانخوارد، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر پارچەیەك لە ئاژەڵی زیندوو بکرێتەوە، ئەوە مردارە.

(وَمَنْ خَافَ عَلَى نَفْسِهِ مَوْتًا أَوْ مَرَضًا مَخُوفًا) هەر کەسێك بە هۆی برسیەتی ترسا: لە مردنی خۆی، یان لە نەخۆشبوونێکیترسناك، هیچ حەڵاڵێکیشی دەست نەکەوت بیخوا، بەڵام (وَوَجَدَ مُحَرَّمًا) لەو حاڵەتەشدا خواردنێکی حەرامی دەست کەوت: وەکو مردارو بەرازو پیسیەکانیترو ماڵی کەسێکیتر، ئەوە (لَزِمَهُ أَكْلُهُ) لە سەری واجبە: ئەو شتە حەرامە بخوا گیانی خۆی ڕزگار بکا (وَقِيلَ يَجُوزُ) لە فەرمودەیەکی بێهێزدا: دروستە: حەرامەکە بخوا.

جا بزانە: هەر کەسێك لە سەفەرێکی گوناهکاری بێ، یان لە نیشتەجێبوونێکی گوناهکاری بێ، ئەوە بۆی حەڵاڵ نیە مردارو شتی پیس بخوا، تا تۆبە دەکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرمویانە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ هەر کەسێك ناچار بوو لە برسیەتیدا مردار بخوا، بە هۆی گوناهکاریو دوژمنکاری ئیسلامیش تووشی برسیەتی نەبوبێ، با مردارەکە بخواو گوناهی ناگاتێ.

(فَإِنْ تَوَقَّعَ حَلاَلاً قَرِيبًا) جا ئەگەر ناچاربووەکە ئومێدی خواردنێکی حەلاڵی هەبوو لە ماوەیەکی نزیکدا دەستی بکەوێ، ئەو کاتە (لَمْ يَجُزْ غَيْرُ سَدِّ الرَّمَقِ) جگە لە ئەندازەی ڕاگرتنی دواگیانی زیاتری بۆ دروست نیە لە خواردنە حەرامەکە بخوا (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ئومێدی خواردنێکی حەلاڵی نەبو، ئەو کاتە (فَفِي قَوْلٍ يَشْبَعُ) لە فەرموودەیەکدا خۆی

وَالأَظْهَرُ سَدُّ الرَّمَقِ إِلاَّ أَنْ يَخَافَ تَلَفًا إِنْ اِقْتَصَرَ، وَلَهُ أَكْلُ آدَمِيٍّ مَيِّتٍ وَقَتْلُ مُرْتَدٍّ وَحَرْبِيٍّ، لاَ ذِمِّيٍّ وَمُسْتَأْمَنٍ وَصَبِيٍّ حَرْبِيٍّ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ حِلُّ قَتْلِ الصَّبِيِّ وَالْمَرْأَةِ الْحَرْبِيَّيْنِ لِلأَكْلِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ وَجَدَ طَعَامَ غَائِبٍ أَكَلَ وَغَرِمَ، أَوْ حَاضِرٍ مُضْطَرٍّ لَمْ يَلْزَمْهُ بَذْلُهُ إِنْ لَمْ يَفْضُلْ عَنْهُ، فَإِنْ آثَرَ مُسْلِمًا جَازَ، أَوْ غَيْرَ مُضْطَرٍّ لَزِمَهُ إِطْعَامُ مُضْطَرٍّ مُسْلِمٍ أَوْ ذِمِّيٍّ،

---

تێر دەکا، بەڵام (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (سَدُّ الرَّمَق) تەنها بە ئەندازەی ڕاگرتنی دواگیانی بۆی دروستە حەرامەکە بخواو نابێ خۆی تێر بکا (إِلاَّ أَنْ يَخَافَ تَلَفًا إِنْ اقْتَصَرَ) تەنها ئەگەر لە فەوتانی خۆی بترسێ ئەگەر خۆی تێر نەکا، ئەو کاتە دەبێ خۆی تێر بکا.

جا بزانە: ئەگەر ئومێدی نەبو بگاتە خواردنێکی حەلاڵ، ئەو کاتە دروستە: حەرامەکە لەگەڵ خۆیا هەڵبگرێ تاکو لە کاتیپێویستیدا بیخوا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها (لَهُ أَكْلُ آدَمِيٍّ مَيِّتٍ) بۆ ناچاربووەکە دروستە: گۆشتی ئادەمیزادێکی مردوو بخوا، هەر چەند مردووەکە موسوڵمانیش بێ، بەو مەرجەی گۆشتی سەگو مردارەکانیتری دەست نەکەوێ، بەڵام دروست نیە موسوڵمانێکی زیندوو بکوژێو گۆشتەکەی بخوا.

(وَ) هەروەها بۆ ناچاربووەکە دروستە (قَتْلُ مُرْتَدٍّ وَحَرْبِيٍّ) کافری پاشگەزبوو و کافری جەنگی بکوژێو بیخوا (لاَ ذِمِّيٍّ وَمُسْتَأْمَنٍ وَصَبِيٍّ حَرْبِيٍّ) بەڵام کوشتنی کافری پەیمان لەئەستۆو دڵنیاکراو و منداڵی کافرەکانی جەنگی بۆ خواردن دروست نیە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (الأَصَحُّ حِلُّ قَتْلِ الصَّبِيِّ وَالْمَرْأَةِ الْحَرْبِيَّيْنِ لِلأَكْلِ) بە فەرموودی ڕاستتر دروستە: منداڵو ئافرەتی کافرەکانی جەنگی بۆ خواردن بکوژێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە ئەوانە پارێزراو نین.

(وَلَوْ وَجَدَ طَعَامَ غَائِبٍ) ئەگەر ناچاربووەکە خواردەمەنیی کەسێکی نادیاری دەست کەوت (أَكَلَ وَغَرِمَ) واجبە بیخواو نرخەکەشی –لەتۆڵە– بداتە خاوەنەکەی (أَوْ حَاضِرٍ مُضْطَرٍّ) یان خواردەمەنیی کەسێکی حازری ناچاری دەست کەوت، ئەو کاتە دروست نیە لێی بستێنی، هەم (لَمْ يَلْزَمْهُ بَذْلُهُ) لە سەر خاوەنەکەش واجب نیە بیداتە ناچارەکەیتر (إِنْ لَمْ يَفْضُلْ عَنْهُ) ئەگەر خواردەمەنیەکەی لە خۆی زیاد نەبێ، چونکە گیانی خۆی لەپێشترە، بەڵام ئەگەر خواردەمەنیەکەی لەو دەمەدا لەخۆی زیاد بوو، ئەو کاتە واجبە: بیداتە ناچاربووەکە، هەرچەند لە مەودواش بۆ خۆی پێویستی پێی هەبێ (فَإِنْ آثَرَ مُسْلِمًا) جا

ئەگەر خاوەنەكە گیانی موسوڵمانێكی‌تری بە لەپێشتر داناو خواردنەكەیی دایێ، ئەو كاتە (جَاْنَ) دروستە، بەڵكو سوننەتە.
(أَوْ غَيْرَ مُضْطَرّ) بەڵام ئەگەر خاوەنی خواردەمەنیەكە ناچار نەبو، ئەو كاتە (لَزِمَهُ إِطْعَامُ مُضْطَرّ) لـە سـەری واجبـە: خوادەمەنیەكـە بداتـە ناچـاربووێك : (مُسْلِمٍ أَوْ ذِمِّيّ) جـا
فَإِنْ اِمْتَنَعَ فَلَهُ قَهْرُهُ وَإِنْ قَتَلَهُ، وَإِنَّمَا يَلْزَمُهُ بِعِوَضٍ نَاجِزٍ إِنْ حَضَرَ، وَإِلاَّ فَبِنَسِيئَةٍ، فَلَوْ أَطْعَمَهُ وَلَمْ يَذْكُرْ عِوَضًا فَالأَصَحُّ لاَ عِوَضَ، وَلَوْ وَجَدَ مُضْطَرٌّ مَيْتَةً وطَعَامَ غَيْرِهِ أَوْ مُحْرِمٌ مَيْتَةً وَصَيْدًا فَالْمَذْهَبُ أَكْلُهَا، وَالأَصَحُّ تَحْرِيمُ قَطْعِ بَعْضِهِ لأَكْلِهِ، قُلْت: اَلأَصَحُّ جَوَازُهُ،

---

ناچاربووەكە موسوڵمان بێ، یان كافرێكی پەیمان لەئەستۆ، كەوابو: (فَإِنْ اِمْتَنَعَ) ئەگەر لەو حاڵەتەدا خاوەنەكەی ڕقەی كردو خواردەمەنیەكەی نەدا ناچاربووەكە، ئەو كاتە (فَلَهُ قَهْرُهُ وَإِنْ قَتَلَهُ) بۆ ناچاربووە موسوڵمانەكە دروستە: بە زاڵبونو زۆرلێكردن خواردەمەنیەكـەی لێبستێنێ، هەر چەند بشیكوژێ، واتـە: ئەگـەر لـەو حاڵەتـەدا ناچـاربووە موسـوڵمانەكە خاوەنەكەی كوشت نە تۆڵەو نە كەففارەتی لە سەر نیە، چونكە بە هۆی نەكردنی واجبێك خوێنی بە فیڕۆ دراوە، بەڵام ئەگەر خاوەنەكە ناچاربووەكەی كوشـت، یـان ناچـاربووێكی كافر خاوەنێكی موسوڵمانی كوشت، ئەو كاتە بكوژەكـە كوشـتنەوەی لەتۆڵـەی لـە سـەر واجب دەبێ، چونكە  كوشتنەكەی شەرعی نیـە، بـەڵام ئەگـەر ناچـاربووەكە بـەخۆی لـە برسان مرد، ئەو كاتە خاوەنەكە نابێتە زامینی، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.
ئینجا بزانە: واجب نیە بەخۆڕایی خواردەمەنیەكەی بداتێ، بـەڵكو (وَإِنَّمَـا يَلْزَمُـهُ بِعِـوَضٍ) تەنها لە بەرامبەر وەرگتنی شتێك واجبە بیداتێ، جا شتەكەش (نَاجِزٍ إِنْ حَضَرَ) هەر ئـەو دەم وەریگرێ ئەگەر حازر بێ (وَإِلاَّ فَبِنَسِيئَةٍ) بەڵام ئەگەر ئەو دەم حازر نەبێ، ئەو كاتە بە قەرز واجبە: بیداتێ (فَلَوْ أَطْعَمَهُ وَلَمْ يَذْكُرْ عِوَضًا) جا ئەگەر خاوەنەكە خواردەمەنیەكـەی دەرخوارد داو باسی هیچ پارەشی نەكرد، ئەو كاتە (فَالأَصَحُّ لاَ عِـوَضَ) بـە فـەرموودەی ڕاستتر: دەبێتە بەخۆڕاییو مافی هیچ پارە وەرگتنی نیە.
(وَلَـوْ وَجَـدَ مُضْـطَرٌّ مَيْتَـةً وَطَعَـامَ غَيْـرِهِ) ئەگـەر ناچـاربووێك مردارێـكو خواردەمـەنیی كەسـێكی‌تری دەسـت كـەوتن (أَوْ مُحْـرِمٌ مَيْتَـةً وَصَـيْدًا) یـان مرۆڤێكـی ژێـر ئیحـڕام مردارێكو نێچیرێكی دەست كەوتن، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ: أَكْلُهَا) بە فەرموودەی‌ڕاستی مەزهەب: لە هەردوو مەسەلەدا واجبە: مردارەكـە بخـوا، چـونكە بـە دەققـی فـەرموودەی قورئـان: مرداری بۆ حەڵاڵە.
جا بزانە: ئەگەر مرداربووێك بە سەربڕین گۆشتی دەخوراو یەكێكیش گۆشتی نـەدەخورا: وەكو بزنێكو كەرێك، ئەوە –بێ‌جیاوازی– دروستە لە هەردووكیان بخوا، بەڵام تا ئەو دوو مردارانەی دەست بكەون دروست نیە: سەگو بەراز بخـوا، تـا سـەگو بەرازیشـی دەسـت

بكەون دروست نیە ئادەمیزاد بخوا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.
(وَالأَصَحُّ) بـە فەرموودەیڕاسـتتر: (تَحْـرِيمُ قَطْـعِ بَعْضِـهِ لأَكْلِـهِ) حەرامـە: ناچـاربووەكە پارچەیەكی لاشەی خۆی لێبكاتەوە بۆ خواردنی خـۆی بـەڵام (قُلْـت) ئیمـامی (النـواوی) فەرموویـەتی (اَلأَصَـحُّ جَـوَازُهُ) بـە فەرموودەیڕاسـتتر: دروسـتە: پارچـەیەكی خـۆی وَشَـرْطُهُ فَقْـدُ الْمَيْتَـةِ وَنَحْوِهَـا وَأَنْ يَكُـونَ الْخَـوْفُ فِـي قَطْعِـهِ أَقَـلَّ، وَيَحْرُمُ قَطْعُهُ لِغَيْرِهِ وَمِنْ مَعْصُومٍ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

لێبكاتەوەو بیخوا، تاكو گیانەكەی ڕابگرێ، بەڵام (وَشَرْطُهُ) مەرجی ئەم دروستبوونەش ئەوەیە: (فَقْدُ الْمَيْتَةِ وَنَحْوِهَا) مرداروِ خواردەمەنیەكیتری حەرامی دەست نەكەوێ، هـەم (وَأَنْ يَكُونَ الْخَوْفُ فِي قَطْعِهِ أَقَلَّ) ترسی لێكردنەوەی پارچەكەشی كـەمتر بـێ لـە ترسـی نەخواردنەكەی، بەڵام (وَيَحْرُمُ قَطْعُهُ لِغَيْرِهِ) حەرامە: پارچەیەك لە خۆی بكاتەوەو بیداتـە ناچارێكیتر، هەم (وَمِنْ مَعْصُومٍ) حەرامـە: پارچـەیەك بـۆ خواردنیخـۆی لـە مـرۆڤێكیتر بكاتەوە ئەگەر مرۆڤەكە خوێنی پارێزراو بێو كوشتنی حەرام بێ، واتـە: بـەڵام دروسـتە: پارچەیەك لە كافری جەنگیو پاشگەزبوو بكاتەوەو بیخوا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ پاشكۆ: لەبارەی تێكەڵبوونی حەڵاڵو حەرام﴾

بزانە: ناپەسندە كڕینو فرۆشتن لەگەڵ ئەو كەسە بكا: كە زۆرترینی ماڵەكەی حەرامە، هەم حەرام نیە لە ماڵەكەشی بخوا؟ چونكە (صحابة)كان كڕینو فرۆشتنیان لەگـەڵ كافرەكـان دەكردو لە ماڵی ئەوانیان دەخوارد لەگەڵ ئەوەشدا پارەی شەڕابو ڕیباو حەرامەكانیتریش تێكەڵی ماڵەكەیان بوو.

جا ئەگەر كەسێك لە ماڵەكەیدا حەڵاڵو حەرام تێكەڵ بوو و لێك جیانەدەكراوە، ئەوە لـە بەر ناچاری بۆی دروستە: ئەندازەی حەرامەكە جیا بكاتەوەو بیداتەوە خاوەنەكـەی، جا ئەگەر خاوەنەكەیی دەست نەكەوت، با بیداتە (بيت المال)، جا ئەگەر (بيت المال) نـەبو، ئەو كاتە با بەخۆی لە بەرژەوەندیەكانی موسوڵمانان سـەرفی بكـا، ئینجـا كـە ئەنـدازەی حەرامەكەی سەرف كرد، ئەو كاتە بە ویستی خۆی دەستكاری ماڵەكەیتر دەكا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا لێرەو لە (باسی نێچیر)دا ناوەڕۆكی ئەم پاشكۆیە ڕوون كراوەتەوە.

جا بزانە: لەو كاتەی ماڵە حەرامەكە دەكاتـە خێـرو لـە بەرژەوەندیـەكان سـەرفی دەكـا، پێویستە: نیەتی تۆڵە ژماردنی هەبێ، واتە: ئەگەر خاوەنەكەیی دەست كەوت، ئەو كاتـە واجبە تۆڵەی ماڵە سەرفكراوەكەی بداتێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچـاوەكاندا لـە (باسـی شاهیدی)دا فەرموویانە.

دیسان بزانە: ئەو شتەی –بەگوێرەی عادەت– خاوەنەكـەی وازی لێـدێنێ، هـەر كەسـێك شتەكە بۆ خۆی ببا، ئەوە دەبێتە ملكیخۆیو بۆی حەڵاڵە گشت دەستكاریەكی تێدا بكا،

بەڵام ئەو میوەیەی لە درەختەکە بەر دەبێتەوە–بێ‌ئیزنی خاوەنەکەی– حەڕامە: بیخوا، جیاوازی نیە درەختەکە پەرژین کرابێ، یان نا، بەڵام ئەگەر عادەت ئەوها بوو: چاوپۆشی لەو میوەیە دەکرا: کە دەکەوێتە دەرەوەی پەرژینەکە، ئەو کاتە ئەو میوەیە حەڕام نیە، هەروەك لە (المجموع)و لە (تحفة)دا لەباسی نێچیردا ڕوون کراوەتەوە.

## (كِتَابُ الْمُسَابَقَةِ وَالْمُنَاضَلَةِ)

هُمَا سُنَّةٌ: وَيَحِلُّ أَخْذُ عِوَضٍ عَلَيْهِمَا، وَتَصِحُّ الْمُنَاضَلَةُ عَلَى سِهَامٍ، وَكَذَا مَزَارِيقَ وَرِمَاحٍ وَرَمْيٍ بِأَحْجَارٍ وَمَنْجَنِيقٍ وَكُلِّ نَافِعٍ فِي الْحَرْبِ عَلَى الْمَذْهَبِ، لاَ عَلَى كُرَةِ صَوْلَجَانٍ وَبُنْدُقٍ وَسِبَاحَةٍ وَشِطْرَنْجٍ وَخَاتَمٍ وَوُقُوفٍ عَلَى رِجْلٍ وَمَعْرِفَةِ مَا فِي يَدِهِ،

---

### ﴿ كِتَابُ الْمُسَابَقَةِ: پەرتوکی گرۆی پێشبڕکێی سوارانەو (وَالْمُنَاضَلَةِ) گرۆی چەك هاویشتن ﴾

(هُمَا سُنَّةٌ) پێشبڕکێی سوارنەو چەك هاویشتن–هەردووکیان– سوننەتن، بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿(وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَااسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ). قال النَّبِيُّ ﷺ فِي تفسيرها: (أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ اَلرَّمْيُ). ثَلاثَ مَرَّاتٍ﴾ رواه مسلم، ئامادە بکەن بۆ جەنگی کافرەکان هەرچەندی دەتوانن لە هێزو لە بەخێوکردنی وولاغەکان. پێغەمبەر ﷺ لە تەفسیری ئایەتەکەدا سێ جار فەرمووی: مەبەست بەو هێزە: چەك هاویشتنە.

کەوابو: مەشقکردن بۆ فێربوونی چەك هاویشتنو لێخوڕینی‌ئۆتۆمبیلو بەکارهێنانی کەرستەکانی‌تری جەنگ–بە (فَرْضُ الْكِفَايَةِ)– واجبە لە سەر پیاوانی موسوڵمان، هەروەك لە فەرموودەکەی ئیمامی (الزركشی) وەردەگیرێ.

(وَيَحِلُّ أَخْذُ عِوَضٍ عَلَيْهِمَا) بۆ پیاوان حەڵاڵە: پارە، یان شتێکی‌تر لە سەر گرۆی سوارانەو چەك هاوێشتن وەربگرن، بەڵام بۆ ئافرەتان حەڕامەو نابێ هیچ شتێك وەربگرن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَصِحُّ الْمُنَاضَلَةُ عَلَى سِهَامٍ) گرۆی بە پارەو شتی‌تریش دروستە: لە سەر هاویشتنی تیرەکانو (وَكَذَا مَزَارِيقَ وَرِمَاحٍ) هەروەها لە سەر هاوێشتنی ڕمی کورتو ڕمی درێژو هەم (وَرَمْيٍ بِأَحْجَارٍ) لە سەر هاویشتنی بەردی بە دەستو (وَمَنْجَنِيقٍ) بە مەنجەنیقو هەم (وَكُلِّ نَافِعٍ فِيالْحَرْبِ) لە سەر هاویشتنی گشت شتێکی بە سود لە جەنگدا: وەك تفەنگو نارنجۆكو تۆپو موشەكو...هتد (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(لاَ عَلَى كُرَةِ صَوْلَجَانٍ) بەڵام گرۆی بە ماڵ دروست نیە: لە سەر گۆی قاشوانێو (وَبُنْدُقٍ) لە سەر کەلایانێو فرێدانی کەلا بۆ ناو قورتەو (وَسِبَاحَةٍ) لە سەر مەلەکردنو

(وَشِطْرَنْجٍ) له سەر شەترەنجو دامەو (وَخَاتَمٍ) له سەر ئەنگوستیلەو (وَوُقُوفٍ عَلَى رِجْلٍ) له سەر وەستان له سەر یەك پێو (وَمَعْرِفَةِ مَا فِي يَدِهِ) له سەر زانینی ئەو شتەی له ناو دەستیدایە، واتە: وەرگرتنی ماڵ له پێشبڕكێی ئەوانەدا دروست نیە، بەڵام-بێ وەرگرتنی ماڵ- خودی پێشبڕكێ له وانەشدا دروستە، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

وَتَصِحُّ الْمُسَابَقَةُ عَلَى خَيْلٍ وَكَذَا فِيلٌ وَبَغْلٌ وَحِمَارٌ فِي الأَظْهَرِ، لاَ طَيْرٌ وَصِرَاعٌ فِي الأَصَحِّ، وَالأَظْهَرُ أَنَّ عَقْدَهُمَا لاَزِمٌ لاَ جَائِزٌ فَلَيْسَ لأَحَدِهِمَا فَسْخُهُ وَلاَ تَرْكُ الْعَمَلِ قَبْلَ الشُّرُوعِ وَبَعْدَهُ، وَلاَ زِيَادَةٌ وَنَقْصٌ فِيهِ وَلاَ فِي مَالٍ، وَشَرْطُ الْمُسَابَقَةِ عِلْمُ الْمَوْقِفِ وَالْغَايَةِ، وَتَسَاوِيهِمَا فِيهِمَا، وَتَعْيِينُ الْفَرَسَيْنِ وَيَتَعَيَّنَانِ، وَإِمْكَانُ سَبْقِ كُلٍّ وَاحِدٍ، وَالْعِلْمُ بِالْمَالِ الْمَشْرُوطِ، وَيَجُوزُ شَرْطُ الْمَالِ مِنْ غَيْرِهِمَا بِأَنْ يَقُولَ الإِمَامُ أَوْ أَحَدُ الرَّعِيَّةِ:

---

(وَتَصِحُّ الْمُسَابَقَةُ عَلَى خَيْلٍ) پێشبڕكێی به سواری ئەسپو ماینو وشتر دروستە: له سەر وەرگرتنی شتێك (وَكَذَا فِيلٌ وَبَغْلٌ وَحِمَارٌ) هەروەها به سواری فیلو هێسترو كەریش دروستە: له سەر وەرگرتنی شتێك (فِيالأَظْهَرِ) له فەرموودەی بەهێزتردا، كەواتە: پێشبڕكێ دروستە: به سواری ئەو ئوتومبیلانەی بۆ جەنگ به كار دێن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

﴿لاَ سَبَقَ إِلاَّ فِي خُفٍّ أَوْ حَافِرٍ أَوْ نَصْلٍ﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، گرۆی به ماڵ دروست نیە تەنها له پێشبڕكێی ووشترو ئەسپو تیر هاویشتندا دروستە.

(لاَ طَيْرٌ وَصِرَاعٌ) بەڵام وەرگرتنی ماڵ له سەر پێشبڕكێی باڵندەو زۆرانبازی دروست نیە (فِيالأَصَحِّ) له فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَالأَظْهَرُ) به فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّ عَقْدَهُمَا لاَزِمٌ) بەستنی گرۆی سوارانەو چەك هاوێشتن له سەر وەرگرتنی شتێك مامڵەتێكی چەسپاوە (لاَ جَائِزٌ) پەشیمانی تێدا دروست نیە، كەواتە: (فَلَيْسَ لأَحَدِهِمَا فَسْخُهُ) بۆ هیچ لایەكیان دروست نیە: مامڵەتەكە هەڵبوەشێنێتەوە، هەم (وَلاَ تَرْكُ الْعَمَلِ) دروست نیە واز له كارەكەش بێنێ (قَبْلَ الشُّرُوعِ وَبَعْدَهُ) نه له پێش دەست پێكردنو نه له دوای دەست پێكردن، هەم (وَلاَ زِيَادَةٌ وَنَقْصٌ فِيهِ) دروست نیە له كارەكەی دیاركراو زیاد بكا، یان كەم بكاتەوەو، هەم (وَلاَ فِي مَالٍ) دروست نیە له ماڵە به مەرج داندراوەكەش زێدەو كەمی بكرێ.

(وَشَرْطُ الْمُسَابَقَةِ) مەرجی پێشبڕكێی سوارانە: (عِلْمُ الْمَوْقِفِ وَالْغَايَةِ) دەبی هەردووكیان شوێنی دەستپێكردنی غاردانەكەو شوێنی كۆتاییهاتنەكەی بزانن، هەم (وَتَسَاوِيهِمَا فِيهِمَا) دەبی هەردووكیان لەو دوو شوێنانەدا یەكسان بن، هەم (وَتَعْيِينُ الْفَرَسَيْنِ) هەردوو ئەسپەكانیش دیاری بكرێن (وَيَتَعَيَّنَانِ) بەو دیاركردنە خودی ئەسپەكان دەبنە دیاركراو و

دروست نیه بگۆڕدرێن، هەم (وَإِمْكَانُ سَبْقِ كُلِّ وَاحِدٍ) مەرجە: بگونجێ هەر یەکەیان وەپێش ئەویتر بکەوێ، واتە: ئەگەر ئەسپێکیان زۆر بێهێزتر بوو، یان زۆر ڕەوانتر بوو، پێشبڕکێ دروست نیە، هەم (وَالْعِلْمُ بِالْمَالِ الْمَشْرُوطِ) مەرجە: هەردووکیان بزانن: ئەو ماڵەی بە مەرج داندراوە، چەندە.

(وَيَجُوزُ شَرْطُ الْمَالِ مِنْ غَيْرِهِمَا) دروستە –جگە لە پێشبڕکێکەرەکان– یەکێکیتر بە مەرج دابنێ ماڵەکە بدا: (بِأَنْ يَقُولَ الإِمَامُ أَوْ أَحَدُ الرَّعِيَّةِ) وەك پێشەوا، یان کەسێکیتر بڵێ: مَنْ سَبَقَ مِنْكُمَا فَلَهُ فِي بَيْتِ الْمَالِ أَوْ فَلَهُ عَلَيَّ كَذَا. وَمِنْ أَحَدِهِمَا فَيَقُولُ: إِنْ سَبَقْتَنِي فَلَكَ عَلَيَّ كَذَا أَوْ سَبَقْتُك فَلاَ شَيْءَ عَلَيْك. فَإِنْ شَرَطَ أَنَّ مَنْ سَبَقَ مِنْهُمَا فَلَهُ عَلَىالآخَرِ كَذَا، لَمْ يَصِحَّ إِلاَّ بِمُحَلِّلٍ فَرَسُهُ كُفْءٌ لِفَرَسَيْهِمَا، فَإِنْ سَبَقَهُمَا أَخَذَ الْمَالَيْنِ، وَإِنْ سَبَقَاهُ وَجَاءَا مَعًا فَلاَ شَيْءَ لأَحَدٍ، وَإِنْ جَاءَ مَعَ أَحَدِهِمَا فَمَالُ هَذَا لِنَفْسِهِ وَمَالُ الْمُتَأَخِّرِ لِلْمُحَلِّلِ وَلِلَّذِى مَعَهُ، وَقِيلَ لِلْمُحَلِّلِ فَقَطْ،

---

(مَنْ سَبَقَ مِنْكُمَا فَلَهُ فِى بَيْتِ الْمَالِ أَوْ فَلَهُ عَلَيَّ كَذَا) لە ئێوە هەر یەکێکتان پێش ئەویتر کەوت لە (بيت المال) ئەوەندەماڵەی هەبێ، یان بڵێ: هەر یەکێکتان پێش ئەویتر کەوت ئەوەندە ماڵەی لە سەر من هەبێ.

(وَ) هەروەها (مِنْ أَحَدِهِمَا) دروستە: لە لایەن تەنها یەکێك لە پێشبڕکێکەرەکانیشەوە ماڵەکە بە مەرج دابندرێو (فَيَقُولُ) بڵێ: (إِنْ سَبَقْتَنِى فَلَكَ عَلَيَّ كَذَا أَوْ سَبَقْتُك فَلاَ شَيْءَ عَلَيْك) ئەگەر تۆ پێیش من کەوتی ئەوەندە ماڵە بۆ تۆ لە سەر من بێ، بەڵام ئەگەر من پێش تۆ کەوتم تۆ هیچت لە سەر نەبێ.

ئینجا بزانە: دروست نیە لە لایەن هەردووکیانەوە ماڵەکە بە مەرج دابندرێ، چونکە ئەو کاتە دەبێتە قومار، کەوابو: (فَإِنْ شَرَطَ أَنَّ مَنْ سَبَقَ مِنْهُمَا فَلَهُ عَلَىالآخَرِ كَذَا) ئەگەر هەردووکیان بە مەرجیان دانا: هەر یەکێکیان وەپێش ئەویتر کەوت ئەوەندە ماڵەی لە سەر ئەوەکەیتر بێ، ئەوە (لَمْ يَصِحَّ إِلاَّ بِمُحَلِّلٍ) دروست نابێ تەنها بە حەلاڵکەرێکیسێیەم دروست دەبێ، کە (فَرَسُهُ كُفْءٌ لِفَرَسَيْهِمَا) ئەسپەکەی حەلاڵکەرەکەش هاوچەشنی ئەسپەکانی دووەکانیتر بێو لەگەڵ هەردووکیاندا پێشبڕکێ بکا:

ئینجا (فَإِنْ سَبَقَهُمَا) ئەگەر حەلاڵکەرەکەش وەپێش هەردووکیان کەوت، ئەوە (أَخَذَ الْمَالَيْنِ) ماڵە بە مەرج داندراوەکەی هەردووکیان بۆ خۆی وەردەگرێ، جیاوازی نیە دووەکانیتریش وێکڕا گەیشتبنە جێ، یان یەك لە دوای یەك.

بەڵام (وَإِنْ سَبَقَاهُ وَجَاءَا مَعًا) ئەگەر دووەکانیتر هەردووکیان وەپێش حەلاڵکەرەکە کەوتنو وێکڕاش گەیشتنە جێ، ئەو کاتە (فَلاَ شَيْءَ لأَحَدٍ) هیچێکیان هیچ ماڵی نادرێتێ، چونکە ئەگەر حەلاڵکەرەکە دوا بکەوێ هیچی لە سەر نیە.

بەلاَم (وَإِنْ جَاءَ مَعَ أَحَدِهِمَا) ئەگەر حەلاَلكەرەكە لەگەڵ یەكێكیان پێش كەوتن و وێكڕا گەیشتنە جێ و ئەوەكەی‌تریش دوا كەوت، ئەو كاتە (فَمَالُ هَذَا لِنَفْسِهِ) ماڵە بە مەرج داندراوەكەی ئەم پێشكەوتووە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، هەم (وَمَالُ الْمُتَأَخِّرِ لِلْمُحَلِّلِ وَلِلَّذِي مَعَهُ) ماڵی دواكەوتووەكەش بە هاوبەشی بۆ حەلاَلكەرەكەو بۆ ئەوەكەی لەگەڵیدا گەیشتۆتە جێ، چونكە هەردووكیان –وێكڕا– وەپێش ئەوی كەوتون (وَقِيلَ لِلْمُحَلِّلِ فَقَطْ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: تەنها بۆ حەلاَلكەرەكەیە.

وَإِنْ جَاءَ أَحَدُهُمَا ثُمَّ الْمُحَلِّلُ ثُمَّ الآخَرُ فَمَالُ الآخَرِ لِلأَوَّلِ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ تَسَابَقَ ثَلاثَةٌ فَصَاعِدًا وَشُرِطَ لِلثَّانِي مِثْلُ الأَوَّلِ فَسَدَ، وَدُونَهُ يَجُوزُ فِي الأَصَحِّ، وَسَبْقُ إِبِلٍ بِكَتِفٍ، وَخَيْلٍ بِعُنُقٍ، وَقِيلَ بِالْقَوَائِمِ فِيهِمَا، وَيُشْتَرَطُ لِلْمُنَاضَلَةِ بَيَانُ أَنَّ الرَّمْيَ مُبَادَرَةٌ وَهِيَ أَنْ يَبْدُرَ أَحَدُهُمَا بِإِصَابَةِ الْعَدَدِ الْمَشْرُوطِ، أَوْ مُحَاطَّةٌ وَهِيَ أَنْ تُقَابَلَ إِصَابَاتُهُمَا وَيُطْرَحَ الْمُشْتَرَكُ فَمَنْ زَادَ بِعَدَدِ كَذَا فَنَاضِلٌ، وَبَيَانُ عَدَدِ نُوَبِ الرَّمْيِ

---

(وَإِنْ جَاءَ أَحَدُهُمَا ثُمَّ الْمُحَلِّلُ ثُمَّ الآخَرُ) ئەگەر یەكێكیان پێشتر گەیشتە جێ، ئینجا حەلاَلكەرەكە، ئینجا ئەوەكەی‌تر، ئەو كاتە (فَمَالُ الآخَرِ لِلأَوَّلِ فِي الأَصَحِّ) ماڵی ئەوەكەی‌تر تەنها بۆ یەكەمەكەیە، واتە: حەلاَلكەرەكە هیچی نادرێتێ، لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَإِنْ تَسَابَقَ ثَلاثَةٌ فَصَاعِدًا) ئەگەر سێ كەس، یان زیاتر پێشبڕكێی سوارانەیان كردو (وَشُرِطَ لِلثَّانِي مِثْلُ الأَوَّلِ) بە مەرج داندرا: ماڵێكی وەكو یەكەمەكە بۆ دووەمەكە بێ (فَسَدَ) ئەم پێشبڕكێیە بەتاڵە، بەلاَم بە فەرموودەی ڕاستتر: دروست دەبێ، هەم (وَدُونَهُ يَجُوزُ) ئەگەر بە مەرج داندرا: دووەمەكە كەمتری لە یەكەمەكە بدرێتێ، ئەوەش دروستە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَسَبْقُ إِبِلٍ بِكَتِفٍ) پێشكەوتنی ووشتر بە شانەكانی ڕەچاو دەكرێ و (وَخَيْلٍ بِعُنُقٍ) پێشكەوتنی ئەسپ و ماین و هێستر بە ئەستۆی ڕەچاو دەكرێ (وَقِيلَ بِالْقَوَائِمِ فِيهِمَا) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: لە هەردوو جۆرەكاندا بەپێیەكانیان ڕەچاو دەكرێ.

(وَيُشْتَرَطُ لِلْمُنَاضَلَةِ) بە مەرج دادەندرێ بۆ دروستبوونی پێشبڕكێی چەك هاوێشتن: (بَيَانُ أَنَّ الرَّمْيَ مُبَادَرَةٌ) ڕوون بكرێتەوە: ئایا چەك هاوێشتنەكە پێشكەوتنە (وَهِيَ أَنْ يَبْدُرَ أَحَدُهُمَا بِإِصَابَةِ الْعَدَدِ الْمَشْرُوطِ) پێشكەوتن ئەمەیە: یەكێكیان پێش ئەوی‌تر بكەوێ بە لێدانی ئەو ژمارەیەی بە مەرج داندراوە لە كۆی چەكە هاوێشتراوەكە: وەك بە مەرج دابندرێ: هەر یەكێكیان لە كۆی بیست فیشەكی هاوێشتراو پێنج فیشەك لێبدا ئەوەندە ماڵەی بدرێتێ، جا هەر كامەیان لە كۆی بیست فیشەكەكەی خۆی پێنجی لێدان، ئەمیان پێشكەوتووە بە سەر ئەوەی لە بیستەكەی‌خۆی چواران لێدەدا، كەوابو: ماڵەكەی دەدرێتێ، بەلاَم ئەگەر هەردووكیان پێنجیان لێدان، ئەو كاتە هیچێكیان پێشكەوتوو نین.

(أَوْ مُحَاطَّةٌ) یان ڕوون بکرێتەوە: چەك هاوێشتنەکە داشکاندنە (وَهِيَ أَنْ تُقَابَلَ إِصَـابَاتُهُمَا وَيُطْـرَحَ الْمُشْـتَرَك) داشـکاندن ئەمەیـە: لێـدانی هـەردووکیان بەرامبـەر بکـرێ‌و لێدانـە هاوبەشەکانیان فڕێ بدرێ (فَمَنْ زَادَ بِعَدَدِ كَذَا فَنَاضِـلٌ) جـا ئـەوەی ژمـارەی لێدانەکـەی ئەوەندە زیاد بوو، ئەمیان پێشکەوتووە بە سەر ئەویتراو ماڵەکەی دەدرێتێ.

(وَ) هەروەها بە مەرج دادەندرێ لە هەردووشێوەیڕابردوودا: (بَيَانُ عَدَدِ نُوَبِ الرَّمْيِ) ڕوون بکرێتەوە ژمارەی نۆبەتەکانی هاوێشتن چەند بن: ئایا هەر یەکەیان تیرێك تیرێك بهاوێ، وَالإِصَابَةِ وَمَسَافَةِ الرَّمْيِ وَقَدْرِ الْغَرَضِ طُولاً وَعَرْضًا، إِلاَّ أَنْ يَعْقِدَ بِمَوْضِعٍ فِيهِ غَرَضٌ مَعْلُومٌ فَيُحْمَلُ الْمُطْلَقُ عَلَيْهِ، وَلْيُبَيِّنَا صِفَةَ الرَّمْيِ مِنْ قَرْعٍ وَهُوَ إِصَابَةُ الشَّنِّ بِلاَ خَدْشٍ، أَوْ خَزْقٍ وَهُوَ أَنْ يَثْقُبَهُ وَلاَ يَثْبُتَ فِيهِ، أَوْ خَسْقٍ وَهُوَ أَنْ يَثْبُتَ فِيهِ، أَوْ مَرْقٍ وَهُوَ أَنْ يَنْفُذَ، فَإِنْ أَطْلَقَا اقْتَضَى الْقَرْعَ، وَيَجُوزُ عِوَضُ الْمُنَاضَلَةِ مِنْ حَيْثُ يَجُوزُ عِوَضُ الْمُسَابَقَةِ وَبِشَرْطِهِ، وَلاَ يُشْتَرَطُ تَعْيِينُ قَوْسٍ وَسَهْمٍ، فَإِنْ عُيِّنَ لَغَا وَجَازَ إِبْدَالُهُ بِمِثْلِهِ، فَإِنْ شُرِطَ مَنْعُ إِبْدَالِهِ فَسَدَ الْعَقْدُ،

---

یان پێنج پێنج، یان یەکێکیان پێشتر تەواوی بیستەکەیخۆی بهاوێ، ئینجا ئـەوەیتریش بیستەکەیخۆی بهاوێ (وَالإِصَابَةِ) هەم مەرجە: ژمارەی لێدانەکانیش ڕوون بکرێتەوە: وەك لە بیست فیشەك پێنجان لێبدا.

هەم (وَمَسَافَةِ الرَّمْيِ) دووریو نزیکیی ئامانجەکەش ڕوون بکرێتەوە، هەم (وَقَـدْرِ الْغَـرَضِ طُولاً وَعَرْضًا) ئەندازەی ئامانجەکەش ڕوون بکرێتەوە لە ڕووی درێژیو پانیەوە (إِلاَّ أَنْ يَعْقِدَ بِمَوْضِعٍ فِيهِ غَرَضٌ مَعْلُومٌ) مەگەر لە شوێنێکی وەها پێشبڕکێ ببەسـتن کـە ئامانجەیـەکی زانـدراوی تـێدا بـێ، ئـەو کاتـە مـەرج نیـە، کـەوابو: (فَيُحْمَـلُ الْمُطْلَـقُ عَلَيْـهِ) ئامانجـە ڕوونەنەکراوەکە دەهێندرێتە سەر ئەو ئامانجە زاندراوە.

(وَلْيُبَيِّنَا صِفَةَ الرَّمْيِ) سوننەتە شێوەی هاوێشتنو لێدانەکە ڕوون بکەنەوە: (مِنْ قَرْعٍ وَهُـوَ إِصَابَةُ الشَّنِّ بِلاَ خَدْشٍ) ئایا تەنها لە ئامانجەکە بداو هیچ شوختی تێنەکا (أَوْ خَزْقٍ وَهُوَ أَنْ يَثْقُبَهُ وَلاَ يَثْبُتَ فِيهِ) یان لێی بداو کـونی بکـاو هاویشتراوەکەشـی تـێدا نەمێنێتـەوە (أَوْ خَسْقٍ وَهُوَ أَنْ يَثْبُتَ فِيهِ) یان لێی بداو تێیدا بمێنێتەوە (أَوْ مَرْقٍ وَهُوَ أَنْ يَنْفُذَ) یان لێی بـداو کـونی بکـاو لـە دیوەکـەیتردا بڕواتـە درەوە (فَـإِنْ أَطْلَقَـا) جـا ئەگـەر لـە بەسـتنی پێشبڕکێدا چـۆنیەتی لێدانەکـەیان نـەگوت، ئـەو کاتـە (اقْتَضَـىالْقَرْعَ) تـەنها لێدانەکـەی دەخوازێو ئەوانیتر پێویست نین.

(وَيَجُوزُ عِوَضُ الْمُنَاضَلَةِ) دروستە: لە گرۆی چەك هاوێشتندا ماڵ بە مەرج دابندرێ (مِـنْ حَيْـثُ يَجُوزُ عِوَضُ الْمُسَابَقَةِ وَبِشَرْطِهِ) لەو ڕووەی کە دروست بوو: ماڵی گرۆی سوارانە دابنێو هەم بە مەرجەکەی گرۆی سوارانەش، واتە: یان بیگانەیەك بیخاتە ئەستۆی خۆی، یان تەنها یەکێك لە

پێشبڕکێکەرەکان، یان هەردووکیان بەو مەرجەی حەڵاڵکەرێك وەگەڵیان بکەوێ: ئەگەر وەپێش هەردووکیان بکەوێ ماڵی هەردووکیان بۆ خۆی ببا، ئەگەر ئەوان پێش کەوتن ئەو هیچ نەدا.
بەڵام (وَلاَ يُشْتَرَطُ تَعْيِينُ قَوْسٍ وَسَهْمٍ) بە مەرج داناندرێ: کەوان و تیر دیاری بکرێن (فَإِنْ عُيِّنَ) جا ئەگەر تیرو کەوانێك دیاری کرا (لَغَا) دیارکردنەکە پوچەڵ دەبێ و (وَجَازَ إِبْدَالُهُ بِمِثْلِه) دروستە بە تیرو کەوانێکیتر بیگۆڕێ (فَإِنْ شُرِطَ مَنْعُ إِبْدَالِه) جا ئەگەر بە مەرج داندرا: کە نابێ بگۆڕدرێ، ئەو کاتە (فَسَدَ الْعَقْدُ) ماڵەتەکە تێك دەچێ و دانامەزرێ.
وَالأَظْهَرُ اشْتِرَاطُ بَيَانِ الْبَادِئِ بِالرَّمْيِ وَلَوْ حَضَرَ جَمْعٌ لِلْمُنَاضَلَةِ فَانْتَصَبَ زَعِيمَانِ يَخْتَارَانِ أَصْحَابًا جَازَ، وَلاَ يَجُوزُ شَرْطُ تَعْيِينِهِمَا بِقُرْعَةٍ، فَإِنْ اخْتَارَ غَرِيبًا ظَنَّهُ رَامِيًا فَبَانَ خِلاَفُهُ بَطَلَ الْعَقْدُ فِيهِ وَسَقَطَ مِنَ الْحِزْبِ الآخَرِ وَاحِدٌ، وَفِي بُطْلاَنِ الْبَاقِي قَوْلاَ تَفْرِيقِ الصَّفْقَةِ، فَإِنْ صَحَّحْنَا فَلَهُمْ جَمِيعًا اَلْخِيَارُ، فَإِنْ أَجَازُوا وَتَنَازَعُوا فِيمَنْ يَسْقُطُ بَدَلَهُ فَسَدَ الْعَقْدُ، وَإِذَا نَضَلَ حِزْبٌ قُسِمَ الْمَالُ بِحَسَبِ الإِصَابَةِ.

---

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (اشْتِرَاطُ بَيَانِ الْبَادِئِ بِالرَّمْيِ) مەرجە ڕوون بکرێتەوە: کامەیان پێشتر دەست بە هاوێشتن بکا، هەم مەرجە شوێنی لێهاوێشتنەکەشیان یەکسان بێ، هەم مەرجە: ئەو چەکەی هەردوو لا هاوێشتنی پێدەکەن یەك ڕەگەزبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.
(وَلَوْ حَضَرَ جَمْعٌ لِلْمُنَاضَلَةِ) ئەگەر کۆمەڵێك ئامادە بون بۆ پێشبڕکێی چەك هاوێشتن (فَانْتَصَبَ زَعِيمَانِ) ئینجا لەو کۆمەڵە دوو کەس بە ڕەزامەندی هەموان خۆیان کردە سەرکردە، تاکو (يَخْتَارَانِ أَصْحَابًا) هەر یەکەیان لەو کۆمەڵە چەند کەسێك بۆ خۆی هەڵبژێرێ و هەر یەکەیان ببێتە گرۆهێك (جَازَ) ئەو ماڵەتە دروستە، بەو مەرجەی پێش بەستنی پێشبڕکێیەکە: ئەمەیان لە کۆمەڵەکە یەکێك هەڵبژێرێ، ئینجا ئەوەکەی تریش یەکێك هەڵبژێرێ...بەم جۆرە، تا ژمارەی ئەندامەکانی هەردوو گرۆهەکان بە یەکسانی تەواو دەبێ، کەوابو: (وَلاَ يَجُوزُ شَرْطُ تَعْيِينِهِمَا بِقُرْعَةٍ) پێشبڕکێ بەو مەرجە دروست نیە: کە بە پشکە هەموو ئەندامەکان دیاری بکرێن، چونکە ئەوەی پشکەی بۆ دەردەچێ گشت لێزانەکان بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ.
(فَإِنْ اخْتَارَ غَرِيبًا) جا ئەگەر یەکێك لە سەرکردەکان پیاوێکی نەناسراوی هەڵبژارد، کە (ظَنَّهُ رَامِيًا فَبَانَ خِلاَفُهُ) وا تێگەیشتبو چەکهاوێژە، ئینجا ئاشکرابو هەر نازانێ چەك بهاوێ، ئەو کاتە (بَطَلَ الْعَقْدُ فِيهِ) ماڵەتەکە لەو نەزانەدا بەتاڵ دەبێ و (وَسَقَطَ مِنَ الْحِزْبِ الآخَرِ وَاحِدٌ) لە گرۆهەکەیتریش یەکێك لە بەرامبەر نەزانەکە لادەکەوێ.
(وَفِي بُطْلاَنِ الْبَاقِي قَوْلاَ تَفْرِيقِ الصَّفْقَةِ) لەبارەی بەتاڵبوونەوەی ئەندامەکانیتریش هەردوو فەرموودەکەی لێکجیاکردنەوەی ماڵەتێك هەیە: ڕاسترەکەیان دەفەرموێ: دروست دەبێ و بەتاڵ نابێ، کەوابو: (فَإِنْ صَحَّحْنَا) ئەگەر بە فەرموودەی ڕاستتر: لە

ئەندامەكانیتری هەردوو گرۆهەكەدا بە دروستبوویی دابنێین، ئەو كاتە (فَلَهُمْ جَمِيعًا الْخِيَارُ) لە هەردووكۆمەڵەكە گشتیان مافی پەشیمانبوونەوەیان هەیە، ئینجا (فَإِنْ أَجَازُوا) ئەگەر پەشیمان نەبونەوەو مامڵەتەكەیان ڕۆیاند، بەڵام (وَتَنَازَعُوا فِيمَنْ يَسْقُطُ بَدَلَهُ) بووە كێشەیان: ئایا كامەیان لە بەرامبەر نەزانەكە لابكەوێ، ئەو كاتە (فَسَدَ الْعَقْدُ) مامڵەتەكە تێك دەچێ (وَإِذَا نَضَلَ حِزْبٌ) هەر كاتێك گرۆهێك بە سەر گرۆهێكدا پێش كەوت (قُسِمَ الْمَالُ بِحَسَبِ الإِصَابَةِ) ئەو ماڵەی لە

وَقِيلَ بِالسَّوِيَّةِ، وَيُشْتَرَطُ فِالإِصَابَةِ الْمَشْرُوطَةِ أَنْ تَحْصُلَ بِالنَّضْلِ، فَلَوْ تَلِفَ وَتَرٌ أَوْ قَوْسٌ أَوْ عَرَضَ شَيْءٌ اِنْصَدَمَ بِهِ السَّهْمُ وَأَصَابَ بِهِ حُسِبَ لَهُ، وَإِلاَّ لَمْ يُحْسَبْ عَلَيْهِ، وَلَوْ نَقَلَتِ الرِّيحُ الْغَرَضَ فَأَصَابَ مَوْضِعَهُ حُسِبَ لَهُ، وَإِلاَّ فَلاَ يُحْسَبُ عَلَيْهِ، وَلَوْ شُرِطَ خَسْقٌ فَثَقَبَ وَثَبَتَ ثُمَّ سَقَطَ أَوْ لَقِيَ صَلاَبَةً فَسَقَطَ حُسِبَ لَهُ.

## (كِتَابُ الأَيْمَانِ)

---

گرۆیەكەدا بە مەرج داندراوە بەگوێرەی لێدانەكان بە سەر لێدەرەكاندا بەش دەكرێ، بەڵام (وَقِيلَ بِالسَّوِيَّةِ) لە فەرموودەیەكیتر–كە زۆربەی سەرچاوەكان بە ڕاستتریان داناوە–: بە یەكسانی ماڵەكە بە سەر هەموو ئەندامەكانی گرۆهەكەدا بەش دەكرێ: بێجیاوازی لە نێوان ئەوەی لە ئامانجەكەی داوە، یان لێی نەداوە.

(وَيُشْتَرَطُ فِيالإِصَابَةِ الْمَشْرُوطَةِ أَنْ تَحْصُلَ بِالنَّضْلِ) بە مەرج دادەندرێ لەو لێدانەی بە مەرج داندراوە: بە سەری تیرەكە بێ، نەك بە پانایی‌و بنەكەی (فَلَوْ تَلِفَ وَتَرٌ أَوْ قَوْسٌ) جا ئەگەر لە حاڵەتی هاوێشتنەكەدا ژێی كەوانەكە پچڕا، یان كەوانەكە شكا (أَوْ عَرَضَ شَيْءٌ اِنْصَدَمَ بِهِ السَّهْمُ) یان شتێك هات‌و تیرەكەی خۆی لێدا، بەڵام (وَأَصَابَ بِهِ) لە هەرسێك حاڵەتدا تیرەكەی لە ئامانجەكە دا، ئەوە (حُسِبَ لَهُ) بۆی دەژمێردرێ (وَإِلاَّ لَمْ يُحْسَبْ عَلَيْهِ) بەڵام ئەگەر لێی نەدا، ئەو كاتە لە سەری ناژمێردرێ‌و دووبارەی دەكاتەوە.

(وَلَوْ نَقَلَتِ الرِّيحُ الْغَرَضَ) ئەگەر لە حاڵەتی هاوێشتنەكەدا بایەك ئامانجەكەی لە شوێنی خۆی لادا بۆ شوێنێكیتر (فَأَصَابَ مَوْضِعَهُ) ئەویش چەكە هاوێشتراوەكەی لە شوێنی ئامانجەكە دا، ئەو كاتەش (حُسِبَ لَهُ) بۆی دەژمێردرێ (وَإِلاَّ فَلاَ يُحْسَبُ عَلَيْهِ) بەڵام ئەگەر لە شوێنەكەیی نەدا، لە سەری ناژمێردرێ.

(وَلَوْ شُرِطَ خَسْقٌ) ئەگەر بە مەرج داندرا: ئامانجەكە كون بكاو تێیدا بمێنێتەوە (فَثَقَبَ وَثَبَتَ ثُمَّ سَقَطَ) ئینجا لە ئامانجەكەی داو كونی كردو تێیدا مایەوە، ئینجا كەوتە خوارەوە (أَوْ لَقِيَ صَلاَبَةً فَسَقَطَ) یان تیرەكە بە شتێكی ڕەق كەوت بۆیێ كەوتە خوارەوەو كونی نەكرد، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (حُسِبَ لَهُ) بۆی دەژمێردرێ، چونكە كەمتەرخەمیی نەكردوە.

## ﴿ كِتَابُ الأَيْمَانِ: **پەڕتوكی سوێندەكان** ﴾

**پێشەكی** بزانە: مەرجە سوێندخۆرەكە بالغو عاقـلْ بـێو بـە خۆشـیخۆی بـێو مەبەسـتی سوێندخواردن بێ، واتە: مندالْو شێتو زۆرلێكراو و ئەو كەسەی –بێمەبەستیدلْ– سوێندی بە سەر زوباندا دێ، سوێندی هیچێكیان دانامەزرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّـائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ﴾ حديث صحيح رواه أصحاب السنن، نووسینی تاوان لە سەر سێ كەسان هەلْگیراوە: لە سەر

لاَ تَنْعَقِدُ إلاَّ بِذَاتِ اللهِ تَعَالَى أَوْ صِفَةٍ لَهُ كَقَوْلِهِ: وَاللهِ، وَرَبِّ الْعَالَمِينَ، وَالْحَيِّ الَّذِى لاَ يَمُوتُ، وَمَنْ نَفْسِى بِيَدِهِ، وَكُلِّ اِسْمٍ مُخْتَصٍّ بِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى، وَلاَ يُقْبَلُ قَوْلُهُ: لَمْ أُرِدْ بِهِ الْيَمِينَ. وَمَاانْصَرَفَ إلَيْهِ سُبْحَانَهُ عِنْدَالإِطْلاَقِ: كَالرَّحِيمِ، وَالْخَالِقِ، وَالرَّازِقِ، وَالرَّبِّ تَنْعَقِدُ بِهِ الْيَمِينُ إلاَّ أَنْ يُرِيدَ غَيْرَهُ، وَمَا اُسْتُعْمِلَ فِيهِ وَفِغَيْرِهِ سَوَاءً:

---

خەوتوو تا هەشیار دەبێتەوە، لە سەر مندالْ تـا بلـۆغی دەبـێ، لـە سـەر شـێت تـا چـاك دەبێتەوە. هەم بە بەلْگەی دوو حەدیسەكانیداهاتوو: لێرەو لە باسی (لَغْوُالْيَمِين)دا.

جا بزانە: مەرجە سوێندخۆرەكە: بە قەسدیو بە خۆشیخۆی كارە سوێند لەسەرخوراوەكە بكا، یان نەیكا، واتە: ئەگەر سوێندی خوارد كارێك بكا، یان سوێندی خوارد نەیكا، ئینجا بە زۆرلێكردن كارەكەی كرد، یان بە هۆی قەدەغەكردن نەیكرد، یان لە بیری چوبێوە كە سوێندی خواردوە، یان نەیزانێ ئەمە سوێند لەسەرخوراوەكەیە بۆیـێ كـردی، یـان بۆیـێ نەیكرد، لەو سێ حالْەتانەدا سوێندی لێناكەوێ تا جارێكیتر بە خۆشیخۆیو بە قەسـدی دەیكا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا لێرەو لە كۆتایی (سـوێندی نیشـتەجێبوون)دا ناوەڕۆكی ئەم پێشەكییە ڕوون كراوەتەوە.

پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿رُفِعَ عَنْ أُمَّتِىالْخَطَأُ وَالنِّسْيَانُ وَمَااسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ﴾ حـديث حسـن رواه ابن ماجه، لادراوە لە سەر ئوممەتی من بڕیاری بەهەلْەداچوونو لەبیرچوونو ئـەوەی بە زۆرلێكردن پێیان كراوە.

(لاَ تَنْعَقِدُ إلاَّ بِذَاتِ اللهِ تَعَالَى) سوێندخواردن نابەسترێ تەنها بە زاتی خوای گەورە (أَوْ صِفَةٍ لَهُ) یان بە سیفەتێكی خوای گـەورە دەبەسـترێ (كَقَوْلِـهِ) وەك سـوێندخۆرەكە بلـێ : (وَاللهِ) بـەو خوایە ئەم كارە ناكەم (وَرَبِّ الْعَالَمِينَ) بە پەروەردگاری عالەم ئەم كارەم نەكردوە (وَالْحَيِّ الَّذِى لاَ يَمُوتُ) بەو زیندووەی نامرێ ئەو شتە وەها نیە (وَمَنْ نَفْسِى بِيَدِهِ) بەو كەسەی گیانی منی بە دەستە ئەو شتە وەهـا نیـە، هـەم (وَكُلِّ اِسْمٍ مُخْتَصٍّ بِـهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) سـوێندخـواردن دەبەسترێ بە هەر ناوێكی تایبەت بە خوای گـەورە بـێ: وەك بـە خاوەنیڕۆژیقیامـەت، بـەو كەسەی دەیپەرستم، بەو كەسەی دلان دەگۆڕێ...هتـد (وَلاَ يُقْبَـلُ قَوْلُـهُ: لَـمْ أُرِدْ بِـهِ الْـيَمِينَ) سوێندخۆرەكە لەی قبولْ ناكرێ بلْێ: مەبەستم بەو ناوە پیرۆزە سوێندخواردن نەبوە.

بەلاَم (وَمَا انْصَرَفَ إِلَيْهِ سُبْحَانَهُ عِنْدَالإِطْلاَقِ) هەر ناوێك ئەگەر بێناتۆره بگوترێ، بیری مرۆڤ بۆلای خوا بچێو بە ناتۆرەوەش بۆ خەڵك بە كار بێ: (كَالرَّحِيمِ) وەكو میهرەبان=دلۆڤان (وَالْخَالِقِ) دروستكەر (وَالرَّازِقِ) ڕزقدەر (وَالرَّبِّ) خاوەن، ئەوەش (تَنْعَقِدُ بِهِ الْيَمِينُ) سوێندخواردنی پێ دەبەسترێ (إِلاَّ أَنْ يُرِيدَ غَيْرَهُ) مەگەر سوێندخۆرەكە مەبەستی كەسێكیتر بێ–جگە لە خوای گەورە– ئەو كاتە لێی قبوڵ دەكرێو نابێتە سوێندخواردن (وَمَا اُسْتُعْمِلَ فِيهِ وَفِي غَيْرِهِ سَوَاءً) هەر ناوێكیش بە یەكسانی بۆ خواو بۆ شتیتر بە كار كَالشَّيْءِ وَالْمَوْجُودِ وَالْعَالِمِ وَالْحَيِّ لَيْسَ بِيَمِينٍ إِلاَّ بِنِيَّةٍ، وَالصِّفَةُ: كَوَعَظَمَةِ اللهِ وَعِزَّتِهِ وَكِبْرِيَائِهِ وَكَلاَمِهِ وَعِلْمِهِ وَقُدْرَتِهِ وَمَشِيئَتِهِ يَمِينٌ، إِلاَّ أَنْ يَنْوِيَ بِالْعِلْمِ اَلْمَعْلُومَ وَبِالْقُدْرَةِ الْمَقْدُورَ، وَلَوْ قَالَ: وَحَقِّ اللهِ. فَيَمِينٌ إِلاَّ أَنْ يُرِيدَ الْعِبَادَاتِ،

---

بێ: (كَالشَّيْءِ) وەكو شت (وَالْمَوْجُودِ) هەبووی (وَالْعَالِمِ) زانا (وَالْحَيِّ) زیندوو، ئەوە (لَيْسَ بِيَمِينٍ إِلاَّ بِنِيَّةٍ) نابێتە سوێندخواردن، تەنها بە نیەتی ناوی خوا دەبێتە سوێند.
(وَالصِّفَةُ) سیفەتی زاتیخوایگەورە–كە سوێندی پێ دەبەسترێ– گشت ئەو سیفەتانەن: كە بە زاتی خوای گەورەوە وەستاونو لێی جیانابنەوە، كەوابو: مەبەستیش بە ناوی خوای گەورە: گشت ئەوەدو نۆ ناوە پیرۆزەكانی خوای گەورەن–كە لە حەدیسی پێغەمبەرداﷺ هاتون– چونكە ئەو ناوانەش لە سیفەتەكانی خوای گەورە وەرگیراون، بەلاَم جیاوازی نیە ناوە پیرۆزەكان لە سیفەتەكانی زاتیخوا وەرگیرابن: وەكو (اَلسَّمِيعِ) لە سیفەتی (السَّمْع) وەرگیراوە، یان لە سیفەتەكانی (فِعْل)=كرداریخوا: وەكو (اَلْخَالِق) لە سیفەتە (اَلْخَلْق) وەرگیراوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، منیش لە ڕوونكردنەوەی (العقيدة الطحاوية)دا بە درێژی ڕوونم كردونەوە:
(كَـ) وەك سوێندخۆرەكە بڵێ: (وَعَظَمَةِ اللهِ) بە گەورەیی خوا (وَعِزَّتِهِ) بە بەهێزیی خوا (وَكِبْرِيَائِهِ) بە خۆبەگەورەدانانی خوا (وَكَلاَمِهِ) بە گفتوگۆی خوا=بە قورئان، یان بەم قورئانە (وَعِلْمِهِ) بە زانستی خوا (وَقُدْرَتِهِ) بە توانینی خوا (وَمَشِيئَتِهِ) بە حەزكردنی خوا، ئەوانە گشتی (يَمِينٌ) دەبنە سوێند (إِلاَّ أَنْ يَنْوِيَ بِالْعِلْمِ اَلْمَعْلُومَ) تەنها ئەگەر مەبەستی بە (العلم) زانداروی خوابێو (وَبِالْقُدْرَةِ الْمَقْدُورَ) مەبەستی بە (القدرة) ئەو شتە بێ كە خوا توانای بە سەردایە، ئەو كاتە نابێتە سوێند.
(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر سوێندخۆرەكە گوتی (وَحَقِّ اللهِ) بە حەقی خوا ئەم كارە دەكەم. ئەوە (فَيَمِينٌ) دەبێتە سوێند (إِلاَّ أَنْ يُرِيدَ الْعِبَادَاتِ) تەنها ئەگەر مەبەستی بە حەقی خوا: خواپەرستیەكان بن كە خوا فەرمانی پێكردون، ئەو كاتە نابێتە سوێند، چونكە خواپەرستیەكان سیفەتی خوای گەورە نین.
﴿ ئاگاداری ﴾ یەكەم: سوێندخواردن بە هیچ دروستكراوێكی خوا دانامەزرێ: وەك سوێندم بە

پێغەمبەرﷺ، یان بە فلانە پیاوچاکە، یان بە قەبری پێغەمبەرﷺ، یان بە قەبری فلانە پیاوچاکە، یان بە سەری باوکم، یان بە قەبری باوکم. کەواتە: ئەو جۆرە سوێندانە ناپەسندن، بەڵکو ئیمامی(الشافعی)و چەند زانایەکیتر بە گوناهیان داناوەو سوێندخۆرەکە گوناهبار دەبێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَلاَ إِنَّ اللهَ–عز وجل– يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ تَعَالَى﴾ رواه الشيخان، ئاگادار بن خوای گەورە ئێوە قەدەغە دەکا: سوێند بە سەری باوکتان بخۆن، جا هەر کەسێك سوێند دەخوا با سوێند بە خوای گەورە بخوا.

وَحُرُوفُ الْقَسَمِ بَاءٌ وَوَاوٌ وَتَاءٌ: كَبِاللهِ وَوَاللهِ وَتَاللهِ، وَتَخْتَصُّ التَّاءُ بِاللهِ تَعَالَى، وَلَوْ قَالَ: أَللهُ وَرَفَعَ أَوْ نَصَبَ أَوْ جَرَّ فَلَيْسَ بِيَمِينٍ إلاَّ بِنِيَّةٍ،

---

جا بزانە: ئەگەر سوێندخۆرەکە مەبەستی ئەوەبێ: سوێند پێخوراوەکە وەکو خوا بە گەورە دابنێ، ئەو کاتە کافر دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە؟ چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِاللهِ فَقَدْ أَشْرَكَ﴾ رواه ابوداود وغيره بسند حسن، هەر کەسێك سوێند بخوا بە شتێکی جگە لە خوا، ئەوە هاوبەشی بۆ خوا داناوەو کافر دەبێ.

بەڵام ئەگەر ئەو جۆرە وشانەیڕابردوو بە مەبەستی سوێندخواردن نەبێ، بەڵکو–بە بێهیچ مەبەستێك– بەگوێرەی عادەت وشەی سوێندەکەی بە سەر زوبانیدا هات، ئەو کاتە ناپەسند نیەو گوناهباریش نابێ؟ چونکە پیاوێکی خەڵکی (نَجْد) هاتو پرسیاری ئیسلامی کردو پێغەمبەرﷺ وەڵامی داوە، جا پیاوەکە ڕۆیشتو گوتی: ﴿وَاللهِ لاَ أَزِيدُ عَلَى هَذا وَلاَ أَنْقُصُ. فَقالَ النَّبِيُّﷺ: أَفْلَحَ وَأَبِيهِ إِنْ صَدَقَ﴾ رواه مسلم، سوێندم بە خوا لەو ڕوکنانەیئیسلام زیاتر ناکەمو کەمیش ناکەم. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە باوکی وی–بە سەری باوکی وی بەختەوەر بوو ئەگەر ڕاستی گۆتبێ. واتە: مەبەستی پێغەمبەرﷺ سوێندخواردن بە سەری باوکی وی نەبو، بەڵکو بەگوێرەی عادەت وشەکەی بە سەر دەمدا هات، هەروەك ئیمامی (النواوی) لە (شرح مسلم)دا ڕوونی کردونەوە.

دووەم: ئەگەر لەگەڵ سوێندخواردنەکەدا بڵێ: إن شا الله. ئەوە سوێندەکەی دانامەزرێ، هەروەك لە (باسی جیاکردنەوە لە تەڵاق)دا ڕابرا، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ: إنْ شاءَ اللهُ. فَلاَ حِنْثَ عَلَيْهِ﴾ رواه أحمد وأصحاب السنن بسند حسن، هەر کەسێك سوێندی خواردو گوتی: إن شا الله. ئەوە سوێندی لێناکەوێ.

جا بزانە: وەکیلگرتن بۆ سوێندخواردن دروست نابێ، هەروەك لە (باسیوەکیلایەتی)دا ڕابرا. (وَحُرُوفُ الْقَسَمِ) پیتەکانی سوێند پێخواردن لە عەرەبیدا (بَاءٌ وَوَاوٌ وَتَاءٌ) ئەم سێیەنە (کَـ)

وەك بلێ: (بِاللهِ، وَ وَاللهِ، وَ تَاللهِ)، بەلام كوردزمانەكان لە سوێندی كوردیدا: بە زۆری پیتی (ب) بە كار دێنن: وەك بە خوا، بە قورئان، هەم لە هەندێ شوێنیشدا پیتی (و) بە كار دێنن: وەك وە كەلامی خوا.

(وَتَخْتَصُّ التَّاءُ بِاللهِ تَعَالَى) پیتی (ت) تایبەتە بە ناوی (اَللهُ): وەك (تاللهِ)، واتە: بۆ ناوەكانیتر و سیفەتەكانی خوا بە كار نایێ (وَلَوْ قَالَ: اَللهُ وَرَفَعَ أَوْ نَصَبَ أَوْ جَرَّ) ئەگەر گوتی

(اَللهُ)، جا بۆری دانا سەر هایەكە، یان سەر، یان ژێر، واتە: پیتی سوێندخواردنی نەگوت، ئەوە (فَلَيْسَ بِيَمِينٍ إِلاَّ بِنِيَّةٍ) نابێتە سوێندخواردن تەنها بە نیەتی سوێند نەبێ.

وَلَوْ قَالَ أَقْسَمْتُ أَوْ أُقْسِمُ أَوْ حَلَفْتُ أَوْ أَحْلِفُ بِاللهِ لأَفْعَلَنَّ فَيَمِينٌ إِنْ نَوَاهَا أَوْ أَطْلَقَ، وَإِنْ قَالَ قَصَدْتُ خَبَرًا مَاضِيًا أَوْ مُسْتَقْبَلاً صُدِّقَ بَاطِنًا وَكَذَا ظَاهِرًا عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ قَالَ لِغَيْرِهِ أُقْسِمُ عَلَيْكَ بِاللهِ أَوْ أَسْأَلُكَ بِاللهِ لَتَفْعَلَنَّ وَأَرَادَ يَمِينَ نَفْسِهِ فَيَمِينٌ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ قَالَ إِنْ فَعَلْتُ كَذَا فَأَنَا يَهُودِيٌّ أَوْ بَرِيءٌ مِنَ الإِسْلاَمِ فَلَيْسَ بِيَمِينٍ،

---

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر سوێندخۆرەكە گوتی: (أَقْسَمْتُ أَوْ أُقْسِمُ أَوْ حَلَفْتُ أَوْ أَحْلِفُ بِاللهِ لأَفْعَلَنَّ) سوێندم خوارد بە خوا، یان سوێند دەخۆم بە خوا ئەو كارە دەكەم. ئەوە (فَيَمِينٌ إِنْ نَوَاهَا أَوْ أَطْلَقَ) دەبێتە سوێند ئەگەر نیەتی سوێندی هەبێ، یان هیچ نیەتێكی نەبێ، بەلام (وَإِنْ قَالَ) ئەگەر ئەو سوێندخۆرە گوتی (قَصَدْتُ خَبَرًا مَاضِيًا) بەو ووشەیە مەبەستم خەبەردانێكیڕابردوو بوو (أَوْ مُسْتَقْبَلاً) یان مەبەستم خەبەردانێكیداهاتوو بوو، ئەو كاتە (صُدِّقَ بَاطِنًا) لە پەنهانیدا باوەڕی پێدەكرێ (وَكَذَا ظَاهِرًا عَلَىالْمَذْهَبِ) هەروەها لە ئاشكراییشدا باوەڕی پێدەكرێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(وَلَوْ قَالَ لِغَيْرِهِ) ئەگەر گوتیە كەسێك: (أُقْسِمُ عَلَيْكَ بِاللهِ) سوێندم بە سەر تۆ دادا بە خوا دەبێ ئەم كارە بكەی (أَوْ) یان گوتی (أَسْأَلُكَ بِاللهِ لَتَفْعَلَنَّ كَذا) داوات لێدەكەم بە خوا دەبێ ئەم كارە بكەی (وَأَرَادَ يَمِينَ نَفْسِهِ) بەم دووانەش مەبەستی سوێندی خۆی بوو، ئەوە (فَيَمِينٌ) دەبێتە سوێند، كەوابو: ئەگەر كارە سوێند لەسەرخوراوەكە حەڕام نەبێ، سوننەتە: سوێند پێدراوەكە كارەكە بكاو سوێندەكەی نەشكێنێ، جا ئەگەر نەیكردو سوێندەكەی شكاند، ئەو كاتە واجبە: سوێندخۆرەكە كەففارەتی سوێندەكەی بدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكانا فەرموویانە (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر مەبەستی سوێندیخۆی نەبو، بەڵكو تكا لێكردن، یان سوێندی كەسەكەی مەبەست بوو، ئەو كاتە (فَلاَ) نابێتە سوێند.

جا بزانە: ناپەسندە بە خاتری خوا لە خەڵك بپاڕێتەوە، ناپەسندە ئەو كەسەش ڕەد بكاتەوە كە بە خاتری خوا دەپاڕێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی: (إِنْ فَعَلْتُ كَذَا فَأَنَا يَهُودِيٌّ أَوْ بَرِيءٌ مِنَ الإِسْلاَمِ) ئەگەر ئەو

کارەم کرد من جولەکەم، یان گاورم، یان بەریمە لە ئیسلام، یان بە بێئیمانی بمرم، یان لە ئوممەتی محمدیﷺ نیم. یان هەر گوتەیەکیتری کوفر، ئەوەش (فَلَيْسَ بِيَمِينٍ) نابێتە سوێندو کەففارەتیشی ناکەوێتە سەر، جا ئەگەر بەو گوتەیە مەبەستی دوورخستنەوەی خۆی بێ لە کارەکە، ئەو کاتە حەرامەو گوناهبار دەبێ، بەڵام ئەگەر مەبەستی ڕازیبوون بێ بەو گوتراوانە ئەگەر کارەکە بکا، ئەو کاتە یەکسەر کافر دەبێ، چونکە ڕازیبوون بە کوفر دەبێتە کافربوون، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَلَفَ فَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنَ الإِسْلاَمِ فَإِنْ كَانَ كَاذِباً فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَإِنْ كَانَ صَادِقاً فَلَنْ يَرْجِعَ إِلَى الإِسْلاَمِ صَادِقاً﴾ رواه أبوداود بسند صالح، هەر کەسێك سوێند بخواو بڵێ: من بەریم لە ئیسلام. ئەوە ئەگەر درۆزن

وَمَنْ سَبَقَ لِسَانُهُ إِلَى لَفْظِهَا بِلاَ قَصْدٍ لَمْ تَنْعَقِدْ، وَتَصِحُّ عَلَى مَاضٍ وَمُسْتَقْبَلٍ، وَهِيَ مَكْرُوهَةٌ إلاَّ فِي طَاعَةٍ، فَإِنْ حَلَفَ عَلَى تَرْكِ وَاجِبٍ أَوْ فِعْلِ حَرَامٍ عَصَى وَلَزِمَهُ الْحِنْثُ وَكَفَّارَةٌ، أَوْ تَرْكِ مَنْدُوبٍ أَوْ فِعْلِ مَكْرُوهٍ سُنَّ حِنْثُهُ

---

بێ، چۆنی گوتوە ئەوها دەبێ، وە ئەگەر ڕاستگۆ بێ بە سەلامەتی ناگەڕێتەوە ناو ئیسلام.

جا بزانە: لەو حاڵەتەی بە کافر دانادرێ سوننەتە بڵێ: (أَسْتَغْفِرُ الله، لاَإِلَهَ إلاّالله مُحَمَّدٌ رسولُ الله) هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَنْ حَلَفَ بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى فَلْيَقُلْ: لاَإِلَهَ إلاَّالله﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك سوێندی خوارد بە بت و سەنەم با بڵێ: لاَإلهَ إلاّالله. ئینجا وا باشترە بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَإِلهَ إلاّالله وأشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ الله)، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَمَنْ سَبَقَ لِسَانُهُ إِلَى لَفْظِهَا) هەر کەسێك زوبانەکەی پێشبڕکێی لێکرد بۆ گۆتنی سوێندەکە: وەك ئەرێوالله، یان ناوالله، (بِلاَ قَصْدٍ) بە دڵیش مەبەستی سوێندخواردن نەبێ، ئەو کاتە (لَمْ تَنْعَقِدْ) سوێندەکەی نابەسترێو دەبێتە (لَغْوُالْيَمِين): سوێندی پوچەڵ ﴿عن عائشة رضي الله عنها في قوله تعالى: (لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ). أُنْزِلَتْ فِي قَوْلِهِ: (لاَوَاللهِ) وَ(بَلَىوَاللهِ)﴾ رواه البخاري موقوفاً وابوداود مرفوعاً، خوای گەورە ناتانگرێ بەو سوێندانەی بێویستیدڵ بە سەر زوبانتاندا دێن. حەزرەتی (عائشه) فەرمووی: ئەم ئایەتە لەبارەی گۆتەی (ناوالله)و (ئەرێوالله) هاتۆتە خوارەوە.

(وَتَصِحُّ عَلَى مَاضٍ وَمُسْتَقْبَلٍ) سوێندخواردن دروست دەبێ لە سەر کاتی ڕابردوو و داهاتوو: وەك والله ئەم کارەم نەکردوە، یان والله دەیکەم (وَهِيَ مَكْرُوهَةٌ إلاَّ فِي طَاعَةٍ) سوێندخواردن ناپەسندە، تەنها لە خواپەرستیدا نەبێ، یان لە داوایەکی لای قازی نەبێ، ئەو کاتە ناپەسند نیە.

(فَإِنْ حَلَفَ عَلَىتَرك وَاجِبٍ أَوْ فِعْلِ حَرَامٍ) جا ئەگەر سوێندی خوارد: واجبێك نەکا، یان حەرامێك بکا، ئەو کاتە (عَصَى) گوناهبار دەبێ، کەوابو: (وَلَزِمَهُ الْحِنْثُ وَكَفَّارَةٌ) لە سەری

واجبه: سوێندەکەی لە خۆیبێخێو کەففارەتی سوێندەکەش بدا، چونکە مانەوەی لە سەر ئەم حاڵەتە گوناهەو لاکەوتنی خێرە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ وَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْراًمِنْهَا فَأْتِ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ وَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ﴾ رواه الشيخان، هەر کاتێك سوێندت لە سەر شتێك خواردو بینیت شتێکیتر لەو سوێندلەسەرخوراوە باشترە، شتە باشترەکە بکەو کەففارەتی سوێندەکەت بدە.

(أَوْ تَرْكِ مَنْدُوبٍ) یان ئەگەر سوێندی لە سەر نەکردنی سوننەتێك خوارد: وەك والله چێشتەنوێژ ناکەم (أَوْ فِعْلِ مَكْرُوهٍ) یان سوێندی لە سەر کردنی ناپەسندێك خوارد: وەك والله لە نوێژدا ئاوڕ دەدەمەوە، ئەو کاتەش هەر بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو: (سُنَّ حِنْثُهُ وَعَلَيْهِ الْكَفَّارَةُ، أَوْ تَرْكِ مُبَاحٍ أَوْ فِعْلِهِ فَالأَفْضَلُ تَرْكُ الْحِنْثِ، وَقِيلَ الْحِنْثُ، وَلَهُ تَقْدِيمُ كَفَّارَةٍ بِغَيْرِ صَوْمٍ عَلَى حِنْثٍ جَائِزٍ قِيلَ: وَحَرَامٍ، قُلْتُ: هَذَا أَصَحُّ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَكَفَّارَةِ ظِهَارٍ عَلَى الْعَوْدِ، وَقَتْلٍ عَلَى الْمَوْتِ، وَمَنْذُورٍ مَالِيٍّ.

(فَصْلٌ):

---

وَعَلَيْهِ الْكَفَّارَةُ) سوننەتە سوێندەکەی لە خۆیبێخێ، بەڵام کەففارەتی لە سەر واجب دەبێ.

(أَوْ تَرْكِ مُبَاحٍ أَوْ فِعْلِهِ) یان سوێندی لە سەر نەکردنی، یان کردنی حەلاڵێك خوارد: وەك والله ئەم خۆراکە ناخۆم، یان والله دەچمە ناو خانوو، ئەو کاتە (فَالأَفْضَلُ تَرْكُ الْحِنْثِ) وەها خێرترە سوێندەکەی لە خۆینێخێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (اَلْحِنْثُ) سوێندەکەی لە خۆیبێخێ خێرترە، تاکو هەژارەکان سود لە کەففارەتەکەی وەربگرن.

(وَلَهُ تَقْدِيمُ كَفَّارَةٍ بِغَيْرِ صَوْمٍ عَلَى حِنْثٍ جَائِزٍ) بۆ سوێندخۆرەکە دروستە: کەففارەتەکە پێش سوێندلێکەوتنەکە بدا ئەگەر کەففارەتدانەکەی ڕۆژوو نەبێو هەم سوێند لێکەوتنەکەشی دروست بێ (قِيلَ: وَحَرَامٍ) لە فەرموودەیەکدا: ئەگەر سوێندلێکەوتنەکەی حەرامیش بێ، هەر دروستە پێشدا کەففارەتەکە بدا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی: (هَذَا أَصَحُّ وَاللهُ أَعْلَمُ) ئەم فەرموودەیە ڕاستترە.

بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)دا: پێش سوێندلێکەوتن دروست نیە کەففارەتەکەی بدا، هەروەك لە (مجمع الانهر)دا فەرموویەتی، هەم لە مەزهەبی ئیمام (الشافعی)ش وەها باشترە کەففارەتەکەی نەدا تا سوێندی لێدەکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَكَفَّارَةِ ظِهَارٍ عَلَىالْعَوْدِ) دروستە کەففارەتی زیهاریش پێش گەڕانەوە بدا، هەم (وَقَتْلٍ عَلَىالْمَوْتِ) دروستە: کەففارەتی کوشتن پێش مردنی کوژراوەکە بدا.

هەم (وَمَنْذُورٍ مَالِيٍّ) دروستە: نەزرکراوێکی ماڵی پێش هاتنە جێی پێهەڵواسراوەکە بدا: وەك (ئەگەر خوا شیفای دام نەزر بێ مەڕێك بکەمە خێر). ئەوە دروستە پێش شیفاهاتن مەڕەکە بکاتە خێر، بەڵام ئەگەر نەزرکراوەکە خواپەرستی لاشەیی بێ: وەکو ڕۆژوو، ئەو

کاتە دروست نیە وەپێش پێهەڵواسراوەکە بخسترێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی کەففارەتی سوێند ﴾

**پێشەکی** بزانە: هەر کاتێك سوێندخۆرەکە سوێندی لێکەوت واتە: بە قەسدیو بە خۆشی خۆی قەدغەی سوێندەکەی شکاند، یان سوێندخواردنەکەی حەرام بوو و لە ترسی گوناهباری سوێندەکەی شکاند، ئەوە کەففارەتی سوێندەکەی لە سەر واجب دەبێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر بە سوێندخواردنەکەی گوناهبار بوبێ، ئەوە واجبە: بە پەلە کەففارەتی سوێندەکە بدا، بەڵام ئەگەر گوناهبار نەبوبێ، ئەو کاتە پەلەکردن واجب نیەو دروستە: کەففارەتەکەی دوا بخا، هەروەك لە (تحفة)و حاشیەکانیدا روون کراوەتەوە.

يَتَخَيَّرُ فِكَفَّارَةِ الْيَمِينِ بَيْنَ عِتْقٍ كَالظِّهَارِ، وَإِطْعَامِ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ لِكُلِّ مِسْكِينٍ مُدُّ حَبٍّ مِنْ غَالِبِ قُوتِ بَلَدِهِ، وَكِسْوَتِهِمْ بِمَا يُسَمَّى كِسْوَةً كَقَمِيصٍ أَوْ عِمَامَةٍ أَوْ إِزَارٍ، لاَ خُفٍّ وَقُفَّازَيْنِ وَمِنْطَقَةٍ، وَلاَ يُشْتَرَطُ صَلاَحِيَّتُهُ لِلْمَدْفُوعِ إِلَيْهِ فَيَجُوزُ سَرَاوِيلُ صَغِيرٍ لِكَبِيرٍ لاَ يَصْلُحُ لَهُ، وَقُطْنٌ وَكَتَّانٌ وَحَرِيرٌ لاِمْرَأَةٍ وَرَجُلٍ، وَلَبِيسٌ لَمْ تَذْهَبْ قُوَّتُهُ، فَإِنْ عَجَزَ عَنِ الثَّلاَثَةِ لَزِمَهُ صَوْمُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ،

---

(يَتَخَيَّرُ فِي كَفَّارَةِ الْيَمِينِ) کەففارەتدەرەکە سەرپشکە لە کافارەتی سوێندەکەیدا: (بَيْنَ عِتْقٍ كَالظِّهَارِ) یان کۆیلەیەك ئازاد بکا وەك ئەو کۆیلەی لە(کەففارەتی زیهار)دا رابرا.

(وَإِطْعَامِ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ) یان دانەوێڵە بداتە دە گەداو هەژاران (لِكُلِّ مِسْكِينٍ مُدُّ حَبٍّ) بۆ هەر گەدایەك مستێك دەنکیساغ-کە دەکاتە (605)غرام- واتە: دروست نیە لە جیاتی دانەوێڵەکە پارە بداو نابێ دانەوێڵەی هاڕدراو بدا (مِنْ غَالِبِ قُوتِ بَلَدِهِ) لەو دانەوێڵەیەی بە ئەغڵەبی دانیشتووانی شارەکە پێی دەژێێن کەففارەتەکە بدا.

(وَكِسْوَتِهِمْ بِمَا يُسَمَّى كِسْوَةً) یان دە پارچە جلو بەرگ بداتە دە گەداو هەژاران: جلێکی وەها پێی بگوترێ: جلو بەرگ (كَقَمِيصٍ) وەکو کراس (أَوْ عِمَامَةٍ) یان مێزەر (أَوْ إِزَارٍ) یان پەشتەماڵی خوارەوە، یان سەرەوە (لاَ خُفٍّ وَقُفَّازَيْنِ وَمِنْطَقَةٍ) بەڵام خوفو گۆرەویو دەستوانەو قایشی پشتێ نابنە کەففارەت (وَلاَ يُشْتَرَطُ صَلاَحِيَّتُهُ لِلْمَدْفُوعِ إِلَيْهِ) مەرج نیە جلو بەرگەکە کەڵکی ئەو کەسەی هەبێ کە دراویەتیێ، کەوابو: (فَيَجُوزُ سَرَاوِيلُ صَغِيرٍ لِكَبِيرٍ لاَ يَصْلُحُ لَهُ) دروستە دەرپێی بچوکێك بردێتە مرۆڤێکی گەورە کە بە کەڵکی نەیێ، هەم (وَقُطْنٌ وَكَتَّانٌ وَحَرِيرٌ لاِمْرَأَةٍ وَرَجُلٍ) دروستە جلی لۆکەو کەتانو ئاوریشمو خوریو موو بدرێتە ئافرەتو پیاوی گەداو هەژار، هەم (وَلَبِيسٌ لَمْ تَذْهَبْ قُوَّتُهُ) دروستە: جلی دەبەرکراویش لە کەففارەتی سوێند بدرێ بەو مەرجەی هێزی نەرۆیشتبێ بەڵام ئەگەر ئەوەندە دەبەرکرابێ هێزی نەمابێ، یان دڕابێ، ئەو کاتە دروست نیە لە کەففارەت بدرێ.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: لە لای ئیمامی(حنفی) ئەندازەی دانەوێڵەی کەففارەتیسوێند-وەکو

سەرفیترە – نیو ساعە، واتە: (1815) کیلۆیەك و هەشتسەدو پانزە غرام، بۆ هەر گەدایەك و هەژارێك، هەم دروستە نرخی دانەوێڵەکەش پارە بداتە دە هەژارەکان، هەروەك لە (مجمع الانهر)دا فەرموویەتی.

(فَإِنْ عَجَزَ عَنِ الثَّلاَثَةِ) جا ئەگەر کەففارەتدەرەکە توانای نەبو هیچێك لەو سێیانەی ڕابردوو بکا، ئەو کاتە (لَزِمَهُ صَوْمُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ) لە سەری واجبە: سێ ڕۆژان بە نیەتی کەففارەتی سوێند بەڕۆژوو ببێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ﴾ ڕاڤەی دیارە.

وَلاَ يَجِبُ تَتَابُعُهَا فِي الأَظْهَرِ، وَإِنْ غَابَ مَالُهُ اِنْتَظَرَهُ وَلَمْ يَصُمْ، وَلاَ يُكَفِّرُ عَبْدٌ بِمَالٍ إِلاَّ إِذَا مَلَّكَهُ سَيِّدُهُ طَعَامًا أَوْ كِسْوَةً وَقُلْنَا يَمْلِكُ، بَلْ يُكَفِّرُ بِصَوْمٍ، وَإِنْ ضَرَّهُ وَكَانَ حَلَفَ وَحَنِثَ بِإِذْنِ سَيِّدِهِ صَامَ بِلاَ إِذْنٍ، أَوْ وُجِدَا بِلاَ إِذْنٍ

---

جا بزانە بە دەققی ئەم ئایەتە دروست نیە: ژمارەی گەداو هەژارەکان لە دە کەسان کەمتر بێ، بەڵام (وَلاَ يَجِبُ تَتَابُعُهَا) واجب نیە: سێ ڕۆژووەکان بە دوای یەکتردا بن (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە لە ئایەتەکەدا نەگوتراوە (وَإِنْ غَابَ مَالُهُ) ئەگەر کەففارەتدەرەکە ماڵی هەبوو بەڵام لە شوێنێکیتر بوو، ئەوکاتە (اِنْتَظَرَهُ وَلَمْ يَصُمْ) دەبی چاوەڕوانی ماڵەکەی بکاو دروست نیە بەڕۆژوو ببێ، چونکە ماڵی هەیە، لە ئایەتەکەشدا دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ لَمْ يَجِدْ﴾ ئەگەر نەیبو با سێ ڕۆژان بەڕۆژوو ببێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر چەند جارێك سوێندی لە سەر یەك شت خوارد، ئەوە کەففارەتێك بۆ هەموو سوێندەکان بەسە، بەو مەرجەی کەففارەتی نەدابێ، واتە: ئەگەر کەففارەتی دابو، ئینجا دووبارە سوێندی لە سەر هەمان شت خواردەوە، ئەو کاتە کەففارەتەکەش دووبارە واجب دەبێتەوە. هەروەها ئەگەر بڵێ: (والله هەموو ڕۆژێك ئەو کارە دەکەم). یان (والله هەر جارێك ئەوها ببێ من ئەو کارە دەکەم). ئەو کاتەش هەر جارێك کارەکە نەکا کەففارەتێکی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و حاشیەکانیدا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿(اَلْيَمِينُ الْغَمُوس)=سوێندی بە درۆ﴾

جا بزانە: (اَلْيَمِينُ الْغَمُوس)=سوێندی بە درۆ ئەوەیە: بە قەسدی لە سەر هەبوونی، یان نەبوونی هەواڵێك بە درۆ سوێند بخوا، جا ئەم جۆرە سوێندە–هەرچەند کەففارەتیش واجب دەکا– بەڵام لە گوناهە گەورەکان دەژمێردرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْكَبَائِرُ اَلإِشْرَاكُ بِاللهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وَقَتْلُ النَّفْسِ وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ﴾ رواه البخاری، گوناهە گەورەکان: کافربوون و ئازاردانی دایك و باوك و کوشتنی بە ناهەق و سوێندی بە درۆیە. جا ئەگەر چەند جارێکیش سوێندی بە درۆ بخوا، ئەوەندە کەففارەتانەی لە سەر

واجب دەبن، هەروەك لە (تحفة)و حاشيەكانىدا ڕوون كراوەتەوە.
(وَلاَ يُكَفِّرُ عَبْدٌ بِمَالٍ) نابێ كۆيلە كەففارەتى سوێند بە ماڵ بدا (إلاَّ إذَا مَلَّكَهُ سَيِّدُهُ طَعَامًا أَوْ كِسْوَةً وَقُلْنَا يَمْلِكُ) تەنها ئەگەر گەورەكەى دانەوێڵە، يان جلى بداتێو بە فەرموودەى بێهێز بڵێين: دەبێتە خاوەن، ئەو كاتە لە كەففارەت دەىدا (بَلْ يُكَفِّرُ بِصَوْمٍ وَإِنْ ضَرَّهُ) بەڵكو واجبە: كۆيلەكە لە كەففارەتى سوێندەكە بەڕۆژوو ببێ، هەرچەند زيانيشى لێبداو هەم (وَكَانَ حَلَفَ وَحَنِثَ بِإِذْنِ سَيِّدِهِ) كۆيلەكەش بە ئيزنى گەورەكەى سوێندى خواردبێو سوێندى لێكەوتبێ، جا ئەو كاتە (صَامَ بِلاَ إِذْنٍ) بێئيزنى گەورەكەى بەڕۆژوو دەبێ (أَوْ وُجِدَا بِلاَ إِذْنٍ) بەڵام ئەگەر سوێندخواردنەكەو سوێندلێكەوتنەكەى بێئيزنى گەورەكەى لَمْ يَصُمْ إلاَّ بِإِذْنٍ، وَإِنْ أَذِنَ فِي أَحَدِهِمَا فَالأَصَحُّ اِعْتِبَارُالْحَلِفِ، وَمَنْ بَعْضُهُ حُرٌّ وَلَهُ مَالٌ يُكَفِّرُ بِطَعَامٍ أَوْ كِسْوَةٍ لاَ عِتْقٍ.
(فَصْلٌ) حَلَفَ لاَ يَسْكُنُهَا أَوْ لاَ يُقِيمُ فِيهَا فَلْيَخْرُجْ فِالْحَالِ، فَإِنْ مَكَثَ بِلاَ عُذْرٍ حَنِثَ وَإِنْ بَعَثَ مَتَاعَهُ، وَإِنْ اِشْتَغَلَ بِأَسْبَابِ الْخُرُوجِ: كَجَمْعِ مَتَاعٍ وَإِخْرَاجِ أَهْلٍ وَلُبْسِ ثَوْبٍ لَمْ يَحْنَثْ، وَلَوْ حَلَفَ لاَ يُسَاكِنُهُ فِي هَذِهِ الدَّارِ فَخَرَجَ أَحَدُهُمَا فِي الْحَالِ لَمْ يَحْنَثْ، وَكَذَا لَوْ بُنِيَ بَيْنَهُمَا جِدَارٌ وَلِكُلٍّ جَانِبٍ مَدْخَلٌ فِالأَصَحِّ،

---

بون، ئەو كاتە (لَمْ يَصُمْ إلاَّ بِإِذْنٍ) نابێ بەڕۆژوو ببێ تەنها بەئيزنى گەورەكەى نەبێ (وَإِنْ أَذِنَ فِي أَحَدِهِمَا) ئەگەر گەورەكەى تەنها بۆ يەكێكيانى ئيزن دابو، ئەوە (فَالأَصَحُّ اعْتِبَارُ الْحَلِفِ) سوێندەكە ڕەچاو دەكرێ (وَمَنْ بَعْضُهُ حُرٌّ وَلَهُ مَالٌ) ئەو كۆيلەيەى بەشێكى ئازادەو ماڵيشى هەيە (يُكَفِّرُ بِطَعَامٍ أَوْ كِسْوَةٍ) بە دانەوێڵە، يان بە بەرگ كەففارەتى سوێندەكەى دەدا (لاَ عِتْقٍ) نەك بە ئازادكردنى كۆيلە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسى سوێندخواردنى لە سەر نيشتەجێبوون و شتىتر ﴾

(حَلَفَ لاَ يَسْكُنُهَا) ئەگەر سوێندى خوارد لەم خانووەدا نيشتەجێ نەبێ (أَوْ لاَ يُقِيمُ فِيهَا) يان تێىدا نەمێنێتەوە لەو حاڵەتەشدا لە ناو خانووەكەدا بوو (فَلْيَخْرُجْ فِيالْحَالِ) با هەر ئەو دەم بە مەبەستى لاكەوتن بڕواتە دەرەوە (فَإِنْ مَكَثَ بِلاَ عُذْرٍ) جا ئەگەر بە بێهيچ عوزرێك ماوەيەكىكەم لە خانووەكەدا مايەوە (حَنِثَ وَإِنْ بَعَثَ مَتَاعَهُ) سوێندى لێدەكەوێ، هەرچەند بارگەشىناردبێتە دەرەوە.

بەڵام ئەگەر عوزرێكى هەبێ: وەك دەرگەى لە سەر كليل بدرێ، يان ڕێگەى چوونە دەرەوەى لێبگيرێ، يان لە گيانو ماڵى خۆى بترسێ ئەگەر بڕواتە دەرەوە، ئەو كاتە تا عوزرەكەى هەبێ بەو مانەوەيە سوێندى لێناكەوێ (وَإِنْ اشْتَغَلَ بِأَسْبَابِ الْخُرُوجِ) ئەگەر سوێندخۆرەكە خۆى خەريك كرد بە هۆيەكانى چوونە دەرەوە (كَجَمْعِ مَتَاعٍ وَإِخْرَاجِ أَهْلٍ

وَلُبْسِ ثَوْبٍ) وەكو كۆكردنەوەی بارگەو بردنە دەرەوەی ژن و منداڵ و دەبەركردنی جل و بەرگ، ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ) بە وەندە مانەوەیە سوێندی لێناكەوێ.

(وَلَوْ حَلَفَ لاَ يُسَاكِنُهُ فِي هَذِهِ الدَّارِ) ئەگەر سوێندی خوارد: لەم خانووەدا لەگەڵ فلانەكەسدا نیشتەجێ نەبێ (فَخَرَجَ أَحَدُهُمَا فِيالْحَالِ) ئینجا یەكسەر لە دوای سوێندەكە یەكێكیان بە نیەتی لاكەوتن چووە دەرەوە، ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ) سوێندی لێناكەوێ (وَكَذَا لَوْ بُنِيَ بَيْنَهُمَا جِدَارٌ) هەروەها سوێندی لێناكەوێ ئەگەر لە خانووەكە دیوارێك لە نێوانیاندا دروست كرابێ و (وَلِكُلٍّ جَانِبٍ مَدْخَلٌ) هەر لایەكیش رێگەیەكی هاتنە ژوورەوەی سەربەخۆی هەبێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَلَوْ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُهَا وَهُوَ فِيهَا أَوْ لاَ يَخْرُجُ وَهُوَ خَارِجٌ فَلاَ حِنْثَ بِهَذَا، أَوْ لاَ يَتَزَوَّجُ أَوْ لاَ يَتَطَهَّرُ أَوْ لاَ يَلْبَسُ أَوْ لاَ يَرْكَبُ أَوْ لاَ يَقُومُ أَوْ لاَ يَقْعُدُ فَاسْتَدَامَ هَذِهِ الأَحْوَالَ حَنِثَ، قُلْتُ: تَحْنِيثُهُ بِاسْتِدَامَةِ التَّزَوُّجِ وَالتَّطَهُّرِ غَلَطٌ لِذُهُولٍ، وَاسْتِدَامَةُ طِيبٍ لَيْسَتْ تَطَيُّبًا فِالأَصَحِّ، وَكَذَا وَطْءٌ وَصَوْمٌ وَصَلاَةٌ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَمَنْ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُ دَارًا حَنِثَ بِدُخُولِ دِهْلِيزٍ دَاخِلَ الْبَابِ أَوْ بَيْنَ بَابَيْنِ، لاَ بِدُخُولِ طَاقٍ قُدَّامَ الْبَابِ، وَلاَ بِصُعُودِ سَطْحٍ غَيْرِ مُحَوَّطٍ وَكَذَا مُحَوَّطٌ فِالأَصَحِّ،

---

(وَلَوْ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُهَا وَهُوَ فِيهَا) ئەگەر سوێندی خوارد نەچێتە ناو خانووەكە لەو حاڵەتیشدا لە ناو خانووەكەدا بوو (أَوْ لاَ يَخْرُجُ وَهُوَ خَارِجٌ) یان سوێندی خوارد لە خانووەكە نەڕواتە دەرەوە، لەو حاڵەتیشدا لە دەرەوەی خانووەكە بوو، ئەوە (فَلاَ حِنْثَ بِهَذَا) بەو بەردەوامبوونە سوێندی لێناكەوێ، بەڵام سوێندەكەشی هەڵناوەشێتەوەو هەر بە بەستراوی دەمێنێ، واتە: ئەگەر لە خانووەكە چووە دەرەوە، ئینجا گەڕاوەو چووە ناو خانووەكە، ئەو كاتە بەم چوونەوەیە سوێندی لێدەكەوێ، هەروەك (الشبراملسی) فەرموویەتی.

(أَوْ) یان سوێندی خوارد (لاَ يَتَزَوَّجُ) ژن نەهێنێ (أَوْ لاَ يَتَطَهَّرُ) یان دەستنوێژ نەگرێ (أَوْ لاَ يَلْبَسُ) یان جل دەبەر نەكا (أَوْ لاَ يَرْكَبُ) یان سوار نەبێ (أَوْ لاَ يَقُومُ) یان بە پێوە نەوەستێ (أَوْ لاَ يَقْعُدُ) یان دانەنیشێ (فَاسْتَدَامَ هَذِهِ الأَحْوَالَ) ئینجا ئەو حاڵەتانەش بەردەوام بون، ئەوە (حَنِثَ) سوێندی لێدەكەوێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (تَحْنِيثُهُ بِاسْتِدَامَةِ التَّزَوُّجِ وَالتَّطَهُّرِ غَلَطٌ) سوێند لێخستنی بە هۆی بەردەوامبوونی ژن هەبوون و دەستنوێژ هەبوون هەڵەیەكە (لِذُهُولٍ) بە هۆی لەبیرچوونەوەیەك ڕووی داوە، بەڵكو ڕاستیەكەی ئەمەیە: بە بەردەوامبوونی ئەو دووانە سوێندی لێناكەوێ، هەم (وَاسْتِدَامَةُ طِيبٍ لَيْسَتْ تَطَيُّبًا) بەردەوامبوونی بۆن لێهاتن خۆ بۆنخۆشكردن نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَكَذَا وَطْءٌ وَصَوْمٌ

وَصَلاَةٌ) هەروەها بە بەردەوامبوونی جیماع و ڕۆژوو و نوێـژیش سـوێندی نـەکردنی ئەوانـەی لێناکەوێ (وَاللهُ أَعْلَمُ)، هەروەك بە بەردەوامبوونی بۆنیخۆش سوێندی خۆبۆنخۆشنەکردنی لێناکەوێ.

(وَمَنْ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُ دَارًا) هەر کەسێك سوێندی خوارد نەچێتە نـاو خانوویێك، ئـەوە (حَنِثَ بِدُخُولِ دِهْلِيزٍ) سوێندی لێدەکەوێ بە چوونە ناو دالانی خانووەکە، جا ناو دالانەکەش (دَاخِلَ الْبَابِ أَوْ بَيْنَ بَابَيْنِ) لە دیوی ژوورەوەی دەرگەکە بێ، یان لە نێوان دوو دەرگەدا بێ.

(لاَ بِدُخُولِ طَاقٍ قُدَّامَ الْبَابِ) بەلام بە چوونە ناو هەیوانەکەی پێش دەرگەی دەرەوە سوێندی لێناکەوێ (وَلاَ بِصُعُودِ سَطْحٍ غَيْرِ مُحَوَّطٍ) هەروەها بە سەرکەوتنی سەربانەکەشی سـوێندی لێناکەوێ ئەگەر دیواری بۆ نەکرابێ (وَكَذَا مُحَوَّطٌ) هەروەها ئەگەر سەربانەکە لە هەر چوار لایەوە دیواریشی بۆ کرابێ سوێندی لێناکەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَلَـوْ أَدْخَـلَ يَـدَهُ أَوْ رَأْسَـهُ أَوْ رِجْلَـهُ لَـمْ يَحْنَـثْ، فَـإِنْ وَضَـعَ رِجْلَيْـهِ فِيهَـا مُعْتَمِـدًا عَلَيْهِمَا حَنِثَ، وَلَوْ انْهَدَمَتْ فَدَخَلَ وَقَدْ بَقِيَ أَسَاسُ الْحِيطَانِ حَنِثَ، وَإِنْ صَارَتْ فَضَاءً أَوْ جُعِلَتْ مَسْجِدًا أَوْ حَمَّامًا أَوْ بُسْتَانًا فَلاَ، وَلَوْ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُ دَارَ زَيْدٍ حَنِثَ بِدُخُولِ مَا يَسْكُنُهَا بِمِلْكٍ، لاَ بِإِعَارَةٍ وَإِجَارَةٍ وَغَصْبٍ، إلاَّ أَنْ يُرِيدَ مَسْكَنَهُ، وَيَحْنَثُ بِمَا يَمْلِكُهُ وَلاَ يَسْكُنُهُ إلاَّ أَنْ يُرِيدَ مَسْكَنَهُ، وَلَوْ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُ دَارَ زَيْدٍ أَوْ لاَ يُكَلِّمُ عَبْدَهُ أَوْ زَوْجَتَهُ فَبَاعَهُمَا أَوْ طَلَّقَهَا فَدَخَلَ وَكَلَّمَ

---

(وَلَوْ أَدْخَلَ يَـدَهُ أَوْ رَأْسَـهُ أَوْ رِجْلَـهُ) ئەگـەر دەسـتی، یـان سـەری، یـان پـێی بـردە نـاو خانووەکە (لَمْ يَحْنَثْ) سوێندی لێناکەوێ، بەلام (فَإِنْ وَضَعَ رِجْلَيْهِ فِيهَا مُعْتَمِدًا عَلَيْهِمَا) ئەگەر هەردوو پێی لە ناو خانووەکە دانان و گرانایی خۆی هەلدانە سەر، ئەو کاتە (حَنِثَ) سوێندی لێدەکەوێ، هەرچەند لاشەکەیتریشی لە دەرەوە بێ.

(وَلَوْ انْهَدَمَتِ الدَّارُ) ئەگەر لە دوای سوێندەکە خانووەکە ڕوخا (فَدَخَلَ وَقَدْ بَقِيَ أَسَاسُ الْحِيطَانِ) جا سوێندخۆرەکە چووە ناو خانووە ڕووخاوەکە، لەو حالەتیشدا بناغـەی دیوارەکـانی مـابو، ئەوە (حَنِثَ) سوێندی لێدەکەوێ، بەلام (وَإِنْ صَارَتْ فَضَاءً) ئەگەر خانووەکە بوبێتە مەیدان (أَوْ جُعِلَتْ مَسْجِدًا أَوْ حَمَّامًا أَوْ بُسْتَانًا) یان کرابێتە مزگەوت، یان گەرماو، یان بـاغ، ئـەوە لـەو حالەتانەدا (فَلاَ) سوێندی لێناکەوێ، چونکە ناوی خانووی لێ نەماوە.

(وَلَوْ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُ دَارَ زَيْدٍ) ئەگەر سوێندی خوارد نەچێتە ناو خانووی زەید، ئەوە (حَنِثَ بِدُخُولِ مَا يَسْكُنُهَا بِمِلْكٍ) سوێندی لێدەکەوێ بە چوونە ناو ئـەو خـانووەی زەیـد تێیـدا نیشتەجێ دەبێ بە مڵکایەتی (لاَ بِإِعَارَةٍ وَإِجَارَةٍ وَغَصْبٍ) نەك ئەو خانووەی بـە خواسـتن و بەکرێ و بە داگیرکردن زەید تێیدا نیشتەجێ دەبـێ (إلاَّ أَنْ يُرِيـدَ مَسْـكَنَهُ) تـەنها ئەگـەر مەبەسـتی بـە خانووەکـە شـوێنی نیشـتەجێبوونی زەیـد بـێ، ئـەو کاتـە بـە

چوونە ناو خانووەکەی خواستراو و بەکرێگیراو و داگیرکراویش سوێندی لێدەکەوێ.
(وَ) هەروەها (يَحْنَثُ بِمَا يَمْلِكُهُ وَلاَ يَسْكُنُهُ) بە چوونە ناو ئەو خانووەش سوێندی لێدەکەوێ: کە ملکی زەیدەو تێیدا نیشتەجێ نابێ (إلاَّ أَنْ يُرِيدَ مَسْكَنَهُ) تەنها ئەگەر مەبەستی بە خانووەکە شوێنی نیشتەجێبوونی زەید بێ، ئەو کاتە بە چوونە ناو ئەو خانووەی ملکی زەیدەو تێیدا نیشتەجێ نیە سوێندی لێناکەوێ.
(وَلَوْ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُ دَارَ زَيْدٍ) ئەگەر سوێندی خوارد نەچێتە ناو خانووی زەید (أَوْ لاَ يُكَلِّمُ عَبْدَهُ أَوْ زَوْجَتَهُ) یان قسە لەگەڵ کۆیلەی زەید، یان لەگەڵ ژنەکەی زەید نەکا (فَبَاعَهُمَا أَوْ طَلَّقَهَا) ئینجا لە دوای سوێندەکە زەید خانووەکەو کۆیلەکەی فرۆشتن، یان ژنەکەی بە (بائن)ی تەڵاق دا (فَدَخَلَ وَكَلَّمَ) ئینجا سوێندخۆرەکە چووە ناو خانووە فرۆشراوەکەو لَمْ يَحْنَثْ، إلاَّ أَنْ يَقُولَ دَارَهُ هَذِهِ أَوْ زَوْجَتَهُ هَذِهِ أَوْ عَبْدَهُ هَذَا فَيَحْنَثُ إلاَّ أَنْ يُرِيدَ مَا دَامَ مِلْكُهُ، وَلَوْ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُهَا مِنْ ذَاالْبَابِ فَنُزِعَ وَنُصِبَ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ مِنْهَا لَمْ يَحْنَثْ بِالثَّانِي، وَيَحْنَثُ بِالأَوَّلِ فِالأَصَحِّ، أَوْ لاَ يَدْخُلُ بَيْتًا حَنِثَ بِكُلِّ بَيْتٍ مِنْ طِينٍ أَوْ حَجَرٍ أَوْ آجُرٍّ أَوْ خَشَبٍ أَوْ خَيْمَةٍ وَلاَ يَحْنَثُ بِمَسْجِدٍ وَحَمَّامٍ وَكَنِيسَةٍ وَغَارِ جَبَلٍ، أَوْ لاَ يَدْخُلُ عَلَى زَيْدٍ فَدَخَلَ بَيْتًا فِيهِ زَيْدٌ وَغَيْرُهُ حَنِثَ، وَفِي قَوْلٍ:

---

قسەی لەگەڵ کۆیلە فرۆشراوەکەو ژنە تەڵاقدراوەکە کرد، ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ) سوێندی لێناکەوێ، چونکە ئێستا ئەوانە ملکی زەید نین.
(إلاَّ أَنْ يَقُولَ: دَارَهُ هَذِهِ أَوْ زَوْجَتَهُ هَذِهِ أَوْ عَبْدَهُ هَذَا) تەنها ئەگەر سوێندخۆرەکە ئاماژە بکاو بڵێ: ئەم خانووەی زەید، ئەم ژنەی زەید، ئەم کۆیلەی زەید، ئەو کاتە (فَيَحْنَثُ) بە هۆی ئاماژەکە سوێندی لێدەکەوێ (إلاَّ أَنْ يُرِيدَ مَا دَامَ مِلْكُهُ) تەنها ئەگەر مەبەستی بێ: تا ئەو سێیانە لە ملکایەتی زەیددا بن، ئەو کاتە لە دوای لاچوونی ملکایەتی سوێندی لێناکەوێ هەرچەند ئاماژەشی بۆ کردبن.
(وَلَوْ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُهَا مِنْ ذَا الْبَابِ) ئەگەر سوێندی خوارد لەم دەرگەوە نەچێتە ناو خانووەکە (فَنُزِعَ وَنُصِبَ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ مِنْهَا) ئینجا دەرگەکە لێکراوەو لە شوێنێکیتری خانووەکە دامەزرێندراوە، ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ بِالثَّانِي) بە چوونە ناو خانووەکە لە دەرگەیدووەمەوە سوێندی لێناکەوێ، بەڵام (وَيَحْنَثُ بِالأَوَّلِ فِيالأَصَحِّ) بە زاردەرگەییەکەم سوێندی لێدەکەوێ و لێکردنەوەی دەرگە کار لە مەسەلەکە ناکا، لە فەرموودەی ڕاستتردا.
(أَوْ) یان سوێندی خوارد (لاَ يَدْخُلُ بَيْتًا) نەچێتە ناو هیچ ژوورێك، ئەوە (حَنِثَ بِكُلِّ بَيْتٍ مِنْ طِينٍ أَوْ حَجَرٍ أَوْ آجُرٍّ أَوْ خَشَبٍ أَوْ خَيْمَةٍ) سوێندی لێدەکەوێ بە چوونە ناو گشت ژوورێك: کە لە قوڕ دروست کرابێ، یان لە بەرد، یان لە خشت، یان لە دار، یان لە خێمەو

ڕەشماڵ، بەڵام (وَلاَ يَحْنَثُ بِمَسْجِدٍ وَحَمَّامٍ وكَنِيسَةٍ وَغَارِ جَبَلٍ) سوێندی لێناکەوێ بە چوونە ناو مزگەوتو گەرماو و کەنێسەو ئەشکەوتی چیا.

جا بزانە: ئەگەر سوێندی خوارد بە تەڵاق: لەگەڵ فلانکەس کۆ نەبێتەوە لە هیچ شوێنێکدا، ئینجا سوێندخۆرەکە چووە شوێنێکو سوێند لەسەرخوراوەکەش لـە دوای وی هاتـە لایو وێکڕا لە شوێنەکە کۆ بونەوە، ئەوە سوێندی لێناکەوێ، چونکە ئـەو سـوێندی لـە سـەر کرداری خۆی خواردوەو کردارەکەشی نەکردوە، هەروەك لە (الشبراملسی)دا فەرموویەتی.

(أَوْ) یان ئەگەر سوێندی خوارد (لاَ يَدْخُلُ عَلَى زَيْدٍ) نەچێتە لای زەید (فَدَخَلَ بَيْتًا فِيهِ زَيْدٌ وَغَيْرُهُ) ئینجا چووە ناو ژوورێك زەیدو کەسێکیتریش لە ژوورەکـەدا بـوو، ئـەوە (حَنِـثَ) سوێندی لێدەکەوێ، بەڵام ئەگەر زەید لە شوێنە گشتیەکاندا بێ: وەکو مزگەوت، گەرماو، چایخانە، زیافەتی بوك، ئەوە بە چوونە ناو ئەو شوێنانە سوێندی لێناکەوێ (وَفِي قَـوْلٍ: إنْ نَـوَى الـدُّخولَ عَلَـى غَيْـرِهِ دُونَـهُ لَـمْ يَحْنَـثْ، فَلَـوْ جَهِـلَ حُضُـورَهُ فَخِـلاَفُ حِنْـثِ النَّاسِـي، قُلْـت: وَلَـوْ حَلَـفَ لاَ يُسَـلِّمُ عَلَيْـهِ فَسَـلَّمَ عَلَـى قَـوْمٍ هُـوَ فِـيهِمْ وَاسْـتَثْنَاهُ لَـمْ يَحْنَـثْ، وَإنْ أَطْلَـقَ حَنِـثَ فِـالأَظْهَرِ وَاللهُ أَعْلَـمُ. (فَصْـلٌ) حَلَفَ لاَ يَأْكُلُ الرُّؤُوسَ وَلاَ نِيَّةَ لَهُ حَنِثَ بِرُءُوسٍ تُبَاعُ وَحْدَهَا، لاَ طَيْرٍ وَحُوتٍ وَصَيْدٍ إلاَّ بِبَلَدٍ تُبَاعُ فِيهِ مُفْرَدَةً، وَالْبَيْضُ يُحْمَلُ عَلَى مُزَايِلٍ بَائِضَهُ فِي الْحَيَاةِ

---

إنْ نَوَى الدُّخُولَ عَلَى غَيْرِهِ دُونَهُ لَمْ يَحْنَثْ) لە فەرموودەیەکدا ئەگەر بە چوونە ناو ژوورەکە مەبەستی چوونە لای کەسێکیتر بێ–نەك زەید– ئەو کاتە سوێندی لێناکەوێ.

(فَلَوْ جَهِلَ حُضُورَهُ) جا ئەگەر سوێندخۆرەکە نەیزانیبو زەید لـەو ژوورەدایـە، ئـەو کاتـە (فَخِلاَفُ حِنْثِ النَّاسِي) فەرموودەجیاوازەکانی سوێندی لەبیرکەر–کە لە تەڵاقدا ڕابرا– دێنە جێ، بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەگەر لە بیری کردبێ سوێندی خواردوە، یان بە نەزانی، یان بە زۆرلێکردن کارەکە بکا، لەو سێ حاڵەتانەدا سوێندی لێناکەوێ، هەروەك لـە (تـەڵاقی هەڵواسراو)دا ڕابراو لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (وَلَوْ حَلَفَ لاَ يُسَلِّمُ عَلَيْهِ) ئەگەر سـوێندی خـوارد سەلام لە زەید نەکا (فَسَلَّمَ عَلَى قَوْمٍ هُوَ فِيهِمْ وَاسْتَثْنَاهُ) ئینجا سەلامی لە کۆمەڵێك کـردو زەیدیش لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا بوو و بە دڵ، یان بە زوبان زەیدی جیا کردەوە، ئـەوە (لَـمْ يَحْنَثْ) سوێندی لێناکەوێ، بەڵام (وَإنْ أَطْلَقَ) ئەگەر لە سەلامکردندا جیای نەکردەوە، ئەو کاتە (حَنِثَ فِيالأَظْهَرِ) سوێندی لێدەکەوێ، لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی سوێندخواردن لە سەر خواردن و خواردنەوە ﴾

(حَلَفَ لاَ يَأْكُلُ الرُّءُوسَ) ئەگەر سوێندی خوارد سەرەکان نەخوا، یان نەکڕێ (وَلاَ نِيَّةَ لَهُ)

له سوێندەکەش نیەتی سەری جۆرە ئاژەڵێکی نەبو، ئەوە (حَنِثَ بِرُءُوسٍ تُبَاعُ وَحْدَهَا) سوێندی لێدەکەوێ بەو جۆرە سەرکانەی بە تەنها دەفرۆشرێن: وەکو سەرکی مەڕو بزنو مانگاو ووشتر (لاَ طَيْرٍ وَحُوتٍ وَصَيْدٍ) نەك وەکو سەرکی باڵندەو ماسیو نێچیر (إلاَّ بِبَلَدٍ تُبَاعُ فِيهِ مُفْرَدَةً) تەنها لەو شوێنەدا نەبێ کە سەرکی ئەوانەش بە تەنهایی بفرۆشرێ، ئەو کاتە بە سەرکی ئەوانەش سوێندی لێدەکەوێ، بەڵام ئەگەر نیەتی سەرکی جۆرە ئاژەڵێکی هەبوو، ئەو کاتە تەنها بە ویان سوێندی لێدەکەوێ، هەروەها لە مەسەلەکانی داهاتووش هەر بەگوێرەی نیەتەکەی سوێندی لێدەکەوێ.

(وَالْبَيْضُ) هێلکە—لەبارەی ئەو کەسەی سوێند دەخوا هێلکە نەخوا— نیەتی جۆرە هێلکەیەکیشی نەبێ (يُحْمَلُ عَلَى مُزَايِلٍ بَائِضَهُ فِي الْحَيَاةِ) دەهێندرێتە سەر ئەو هێلکەیەی بە ڕەقبوویی لە هێلکەدانەی باڵندە جیا دەبێتەوە لە حاڵەتی زیندوویی‌دا، هەر چەند لە كَدَجَاجٍ وَنَعَامَةٍ وَحَمَامٍ، لاَ سَمَكٍ وَجَرَادٍ، وَاللَّحْمُ عَلَى نَعَمٍ وَخَيْلٍ وَوَحْشٍ وَطَيْرٍ لاَ سَمَكٍ وَشَحْمِ بَطْنٍ، وَكَذَا كَرِشٍ وَكَبِدٍ وَطِحَالٍ وَقَلْبٍ فِي الأَصَحِّ، وَالأَصَحُّ تَنَاوُلُهُ لَحْمَ رَأْسٍ وَلِسَانٍ وَشَحْمِ ظَهْرٍ وَجَنْبٍ، وَأَنَّ شَحْمَ الظَّهْرِ لاَ يَتَنَاوَلُهُ الشَّحْمُ، وَأَنَّ الأَلْيَةَ وَالسَّنَامَ لَيْسا شَحْمًا وَلاَ لَحْمًا، وَالأَلْيَةُ لاَ تَتَنَاوَلُ سَنَامًا وَلاَ يَتَنَاوَلُهَا، وَالدَّسَمُ يَتَنَاوَلُهُمَا وَشَحْمَ ظَهْرٍ وَبَطْنٍ وَكُلَّ دُهْنٍ، وَلَحْمُ الْبَقَرِ يَتَنَاوَلُ جَامُوسًا، وَلَوْ قَالَ مُشِيرًا إِلَى حِنْطَةٍ لاَ آكُلُ هَذِهِ حَنِثَ بِأَكْلِهَا عَلَى هَيْئَتِهَا وَبِطَحْنِهَا وَخَبْزِهَا، وَلَوْ قَالَ لاَ آكُلُ هَذِهِ الْحِنْطَةَ حَنِثَ بِهَا مَطْبُوخَةً وَنَيِّئَةً وَمَقْلِيَّةً لاَ بِطَحِينِهَا وَسَوِيقِهَا وَعَجِينِهَا وَخُبْزِهَا،

---

دوای مردنیش بێتە دەرەوە (كَدَجَاجٍ وَنَعَامَةٍ وَحَمَامٍ) وەکو هێلکەی مریشكو مراویو قازو نەعامەو کۆترو چۆلەکە (لاَ سَمَكٍ وَجَرَادٍ) نەك هێلکەی ماسیو کلۆ.

(وَاللَّحْمُ) گۆشت—لەبارەی ئەو کەسەی سوێندی خواردوە گۆشت نەخوا— نیەتی جۆرە گۆشتێکیشی نەبێ (عَلَى نَعَمٍ وَخَيْلٍ وَوَحْشٍ وَطَيْرٍ) دەهێندرێتە سەر گۆشتی بزنو مەڕو گاو ووشترو ماینو ئاژەڵی کێویو باڵندە (لاَ سَمَكٍ وَشَحْمِ بَطْنٍ) بەڵام بە خواردنی ماسیو بەزی زگ سوێندی لێناکەوێ (وَكَذَا كَرِشٍ وَكَبِدٍ وَطِحَالٍ وَقَلْبٍ) هەروەها بە خواردنی ورگو جەرگو پاتەڕەشەو دڵو گوانو گونو سێپەلاك سوێندی لێناکەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەوانە گۆشت نین.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی‌ڕاستتر (تَنَاوُلُهُ لَحْمَ رَأْسٍ وَلِسَانٍ وَشَحْمِ ظَهْرٍ وَجَنْبٍ) سوێندی گۆشت نەخواردن گۆشتی سەرو زوبانو بەزی پشتو تەنیشت دەگرێتەوە (وَأَنَّ شَحْمَ الظَّهْرِ لاَ يَتَنَاوَلُهُ الشَّحْمُ) بەڵام بەزی پشتێ بەز نایگرێتەوە، چونکە بەزی پشتێ گۆشتە (وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ الأَلْيَةَ وَالسَّنَامَ لَيْسَا شَحْمًا وَلاَ لَحْمًا) دونگی مەڕو قەپۆزی ووشتر: بەز نیەو گۆشتیش نیە (وَالأَلْيَةُ لاَ تَتَنَاوَلُ سَنَامًا وَلاَ يَتَنَاوَلُهَا) دونگ قەپۆز

ناگرێتەوەو قەپۆزیش دونگ ناگرێتەوە، بەلام (وَالدَّسَمُ يَتَنَاوَلُهُمَا) چەوری هەردووکیان دەگرێتەوە، هەم (وَشَحْمَ ظَهْرٍ وَبَطْنٍ وَكُلَّ دُهْنٍ) بەزی پشتو زگو گشت ڕونێکیش دەگرێتەوە (وَلَحْمُ الْبَقَرِ يَتَنَاوَلُ جَامُوسًا) گۆشتی مانگا گۆشتی گامێش دەگرێتەوە.

(وَلَوْ قَالَ مُشِيرًا إِلَى حِنْطَةٍ) ئەگەر ئاماژەی بۆ گەنمێك كردو گوتی: (لاَ آكُلُ هَذِهِ) والله ئەمە ناخۆم. ئەوە (حَنِثَ بِأَكْلِهَا عَلَى هَيْئَتِهَا وَبِطَحْنِهَا وَخَبْزِهَا) سوێندی لێدەکەوێ بە خواردنی هەموو گەنمەکە لە سەر شێوەی خۆیو بە هاڕدراویو بە نانەکەی، بەلام (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر لەگەڵ ئاماژەکە ناوی هێناو گوتی: (لاَ آكُلُ هَذِهِ الْحِنْطَةَ) والله ئەم گەنمە ناخۆم. ئەوە (حَنِثَ بِهَا مَطْبُوخَةً وَنَيِّئَةً وَمَقْلِيَّةً) بە خواردنی گەنمەکە سوێندی لێدەکەوێ: بە کوڵاییو بە نەکوڵاییو بە سۆرکراوەیی (لاَ بِطَحِينِهَا وَسَوِيقِهَا وَعَجِينِهَا وَخُبْزِهَا) بەلام بە هاڕدراوەکەییو بە ئاردەکەیو بە هەویرەکەیو بە نانەکەی سوێندی لێناکەوێ، چونکە ناوی گەنمی نەماوە.

وَلاَ يَتَنَاوَلُ رُطَبٌ تَمْرًا وَلاَ بُسْرًا، وَلاَ عِنَبٌ زَبِيبًا وَكَذَاالْعَكُوسُ، وَلَوْ قَالَ لاَ آكُلُ هَذَاالرُّطَبَ فَتَتَمَّرَ فَأَكَلَهُ أَوْ لاَ أُكَلِّمُ ذَاالصَّبِيَّ فَكَلَّمَهُ شَيْخًا فَلاَ حِنْثَ فِالأَصَحِّ، وَالْخُبْزُ يَتَنَاوَلُ كُلَّ خُبْزٍ كَحِنْطَةٍ وَشَعِيرٍ وَأَرُزٍّ وَبَاقِلاًّ وَذُرَةً وَحِمَّصٍ، فَلَوْ ثَرَدَهُ فَأَكَلَهُ حَنِثَ، وَلَوْ حَلَفَ لاَ يَأْكُلُ سَوِيقًا فَسَفَّهُ أَوْ تَنَاوَلَهُ بِأُصْبُعٍ حَنِثَ، وَإِنْ جَعَلَهُ فِي مَاءٍ فَشَرِبَهُ فَلاَ، أَوْ لاَ يَشْرَبُهُ فَبِالْعَكْسِ، أَوْ لاَ يَأْكُلُ لَبَنًا أَوْ مَائِعًا آخَرَ وَأَكَلَهُ بِخُبْزٍ حَنِثَ، أَوْ شَرِبَهُ فَلاَ، أَوْ لاَ يَشْرَبُهُ فَبِالْعَكْسِ،

---

(وَلاَ يَتَنَاوَلُ رُطَبٌ تَمْرًا وَلاَ بُسْرًا) خورما نە قەسپو نە تەڕە قەسپ ناگرێتەوە، هەم (وَلاَ عِنَبٌ زَبِيبًا) ترێ مێوژ ناگرێتەوە (وَكَذَاالْعَكُوسُ) هەروەها پێچەوانەکانیشیان پێچەوانەکانیان ناگرنەوە (وَلَوْ قَالَ لاَ آكُلُ هَذَا الرُّطَبَ) ئەگەر گوتی: والله ئەم خورمایە ناخۆم (فَتَتَمَّرَ فَأَكَلَهُ) ئینجا خورمایەکە بووە قەسپ، ئینجا خواردی (أَوْ لاَ أُكَلِّمُ ذَا الصَّبِيَّ) یان والله قسە لەگەڵ ئەم منداڵە ناکەم (فَكَلَّمَهُ شَيْخًا) ئینجا لە حاڵەتی بالغیدا بە پیری، یان بە لاوی قسەی لەگەڵ کرد، یان والله گۆشتی ئەم بەرخە ناخۆم، ئینجا بووە بەرانو خواردی، یان ترێ بووە مێوژو خواردی، ئەوە (فَلاَ حِنْثَ) لە گشت ئەو مەسەلانەدا سوێندی لێناکەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَالْخُبْزُ يَتَنَاوَلُ كُلَّ خُبْزٍ) نان گشت جۆرە نانێك دەگرێتەوە: (كَحِنْطَةٍ وَشَعِيرٍ وَأَرُزٍ وَبَاقِلاًّ وَذُرَةٍ وَحِمَّصٍ) وەکو نانی گەنمو جۆ و برنجو پاقلەو زوڕاتو نۆك، هەرچەند ناوی نانیش نەبێ: وەکو سەمون (فَلَوْ ثَرَدَهُ فَأَكَلَهُ) جا ئەگەر نانەکەی کردە تێکوشیو خواردی، ئەو کاتەش (حَنِثَ) سوێندی لێدەکەوێ.

(وَلَوْ حَلَفَ لاَ يَأْكُلُ سَوِيقًا) ئەگەر سوێندی خوارد ئارد نەخوا (فَسَفَّهُ أَوْ تَنَاوَلَهُ بِأُصْبُعٍ) ئینجا ئاردەکەی پرژاندە ناو دەمی، یان بە پەنجەی بردیە ناو دەمی، ئەوە (حَنِثَ)

سوێندی لێدەکەوێ، بەلام (وَإِنْ جَعَلَهُ فِی مَاءٍ فَشَرِبَهُ) ئەگەر ئاردەکەی دەناو ئاو کردو خواردیەوە، ئەو کاتە (فَلاَ) سوێندی لێناکەوێ (أَوْ لاَ يَشْرَبُهُ) یان سوێندی خوارد ئاردەکە نەخواتەوە، ئەو کاتە (فَبِالْعَكْسِ) بە پێچەوانەوەیە: بە خواردنەوەی لەگەڵ ئاو سوێندی لێدەکەوێ، جا ئەگەر سوێندی خوارد ئەم شتە تام نەکا، ئەوە بە تەنها تامکردنی سوێندی لێدەکەوێ، هەر چەند قوتیشی نەداو فڕێی بداتە دەرەوە.
(أَوْ لاَ يَأْكُلُ لَبَنًا أَوْ مَائِعًا آخَرَ) یان سوێندی خوارد شیر نەخوا، یان شلەیەکیتر نەخوا (وَأَكَلَهُ بِخُبْزٍ) ئینجا بە پێخۆر بە نانی خواردی (حَنِثَ) سوێندی لێدەکەوێ، بەلام (أَوْ شَرِبَهُ فَلاَ) ئەگەر خواردیەوە سوێندی لێناکەوێ، چونکە نەیخواردوە (أَوْ لاَ يَشْرَبُهُ) یان سوێندی خوارد شیرەکە، یان شلەکە نەخواتەوە، ئەو کاتە (فَبِالْعَكْسِ) بە پێچەوانەوەیە: بە خواردنەوەی سوێندی لێدەکەوێو بە پێخۆر سوێندی لێناکەوێ.

أَوْ لاَ يَأْكُلُ سَمْنًا فَأَكَلَهُ بِخُبْزٍ جَامِدًا أَوْ ذَائِبًا حَنِثَ، وَإِنْ شَرِبَ ذائِبًا فَلاَ، وَإِنْ أَكَلَهُ فِي عَصِيدَةٍ حَنِثَ إِنْ كَانَتْ عَيْنُهُ ظَاهِرَةً، وَيَدْخُلُ فِي فَاكِهَةٍ رُطَبٌ وَعِنَبٌ وَرُمَّانٌ وَأُتْرُجٌّ وَرَطْبٌ وَيَابِسٌ، قُلْتُ: وَلَيْمُونٌ وَنَبْقٌ وَكَذَا بِطِّيخٌ وَلُبُّ فُسْتُقٍ وَبُنْدُقٍ وَغَيْرُهُمَا فِالأَصَحِّ، لاَ قِثَّاءٌ وَخِيَارٌ وَبَاذِنْجَانٌ وَجَزَرٌ، وَلاَ يَدْخُلُ فِي الثِّمَارِ يَابِسٌ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ أَطْلَقَ بِطِّيخٌ وَتَمْرٌ وَجَوْزٌ لَمْ يَدْخُلْ هِنْدِيٌّ، وَالطَّعَامُ يَتَنَاوَلُ قُوتًا وَفَاكِهَةً وَأُدْمًا وَحَلْوَى، وَلَوْ قَالَ لاَ آكُلُ مِنْ هَذِهِ الْبَقَرَةِ تَنَاوَلَ لَحْمَهَا دُونَ وَلَدٍ وَلَبَنٍ، أَوْ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَثَمَرٌ دُونَ وَرَقٍ وَطَرَفِ غُصْنٍ.

---

(أَوْ لاَ يَأْكُلُ سَمْنًا) یان سوێندی خوارد: ڕۆن نەخوا (فَأَكَلَهُ بِخُبْزٍ جَامِدًا أَوْ ذَائِبًا) ئینجا ڕۆنەکەی بە نانی خوارد بە پەیتی، یان بە تاوایەوەیی، ئەوە (حَنِثَ) سوێندی لێدەکەوێ، بەلام (وَإِنْ شَرِبَ ذائِبًا فَلاَ) ئەگەر بە تاواوەیی خواردیەوە، سوێندی لێناکەوێ (وَإِنْ أَكَلَهُ فِي عَصِيدَةٍ) ئەگەر ڕۆنەکەی لەگەڵ ئاردە بە ڕوندا خوارد، ئەو کاتەش (حَنِثَ إِنْ كَانَتْ عَيْنُهُ ظَاهِرَةً) سوێندی لێدەکەوێ ئەگەر خودی ڕۆنەکە دیار بێ، واتە: وەك ناو سێڵ، بەلام ئەگەر خودی ڕۆنەکە لە ناو چوبێو دیار نەبێ، ئەو کاتەش سوێندی لێناکەوێ.
(وَيَدْخُلُ فِي فَاكِهَةٍ) دەچێتە گەڵ ناوی میوە: (رُطَبٌ وَعِنَبٌ وَرُمَّانٌ وَأُتْرُجٌّ وَرَطْبٌ وَيَابِسٌ) خورما، ترێ، هەنار، ئەترنجە، پرتقاڵ، سێو، هەنجیر، قەیسی، هەرمێ، خۆخ، بەهێ، جا تەڕ بێ، یان وشك بێ: وەکو میوژو قەسپ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (وَلَيْمُونٌ وَنَبْقٌ وَكَذَا بِطِّيخٌ وَلُبُّ فُسْتُقٍ وَ بُنْدُقٍ وَغَيْرُهُمَا فِيالأَصَحِّ) لیمۆ و نەبەقو کاڵەك=گندۆرەو ناوکی فستەقو بندقو ئەو جۆرە شتانە: وکو گوێزو چوالە، گشتی میوەیەو سوێندی میوە نەخواردن دەیانگرێتەوە لە فەرموودەی ڕاستتردا (لاَ قِثَّاءٌ وَخِيَارٌ وَبَاذِنْجَانٌ وَجَزَرٌ) بەلام ناوی

میوە تەرۆزیو ئاروو و باینجانو گوێزەر ناگرێتەوە، هەم (وَلاَ يَدْخُلُ فِيالثِّمَارِ يَابِسٌ) میوەی وشك ناچێتە گەڵ ناوی بەری درەخت (وَاللهُ أعْلَمُ) چونكە بەر بە میوەی تەڕ دەگوترێ.

(وَلَوْ أطْلَقَ بِطِّيخٌ وَتَمْرٌ وَجَوْزٌ) ئەگەر لە سوێندەكەیدا بێدیاریكردن ناوی كاڵەكو قەسپو گوێزی هێنا، ئەوە (لَمْ يَدْخُلْ هِنْدِيٌّ) كاڵەكو قەسپو گوێزی هیندی نایەتە گەڵ ئەوانە (وَالطَّعَامُ) خواردەمەنی: (يَتَنَاوَلُ قُوتًا وَفَاكِهَةً وَأُدْمًا وَحَلْوَى) پێژیاوی مرۆڤو میوەو پێخورو شیرنایەتی دەگرێتەوە (وَلَوْ قَالَ: لاَ آكُلُ مِنْ هَذِهِ الْبَقَرَةِ) ئەگەر گوتی: والله لەو مانگایە ناخۆم. ئەوە (تَنَاوَلَ لَحْمَهَا) گۆشتەكەی دەگرێتەوە بەڵام (دُونَ وَلَدٍ وَلَبَنٍ) بێچووەكەو شیرەكەی ناگرێتەوە (أَوْ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ) یان والله لەم درەختە ناخۆم. ئەوە (فَثَمَرٌ) میوەكەی دەگرێتەوە، بەڵام (دُونَ وَرَقٍ وَطَرَفِ غُصْنٍ)-جگە لە گەڵای مێو- گەڵایەكەو سەرە لقەكانی درەختەكە ناگرێتەوە.

(فَصْلٌ) حَلَفَ لاَ يَأْكُلُ هَذِهِ التَّمْرَةَ فَاخْتَلَطَتْ بِتَمْرٍ فَأَكَلَهُ إلاَّ تَمْرَةً لَمْ يَحْنَثْ، أَوْ لَيَأْكُلَنَّهَا فَاخْتَلَطَتْ لَمْ يَبَرَّ إلاَّ بِالْجَمِيعِ، أَوْ لَيَأْكُلَنَّ هَذِهِ الرُّمَّانَةَ فَإنَّمَا يَبَرُّ بِجَمِيعِ حَبِّهَا، أَوْ لاَ يَلْبَسُ هَذَيْنِ لَمْ يَحْنَثْ بِأَحَدِهِمَا، فَإِنْ لَبِسَهُمَا مَعًا أَوْ مُرَتَّبًا حَنِثَ، أَوْ لاَ أَلْبَسُ هَذَا وَلاَ هَذَا حَنِثَ بِأَحَدِهِمَا، أَوْ لَيَأْكُلَنَّ ذَاالطَّعَامَ غَدًا فَمَاتَ قَبْلَهُ فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ،

---

## ﴿فَصْلٌ: لە باسی چەند مەسەلەیەكی پەرتو بڵاو﴾

(حَلَفَ لاَ يَأْكُلُ هَذِهِ التَّمْرَةَ) ئەگەر سوێندی خوارد ئەم قەسپە نەخوا (فَاخْتَلَطَتْ بِتَمْرٍ فَأَكَلَهُ إلاَّ تَمْرَةً) ئینجا قەسپەكە تێكەڵێ قەسپیتر بوو، ئەویش هەمووی خواردن تەنها دانە قەسپێكی نەخوارد، ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ) سوێندی لێناكەوێ، چونكە دەگونجێ ئەمەیان سوێند لەسەرخوراوەكە بێ (أَوْ لَيَأْكُلَنَّهَا) یان سوێندی خوارد ئەم قەسپە بخوا (فَاخْتَلَطَتْ) ئینجا قەسپەكە تێكەڵی قەسپیتر بوو، ئەو كاتە (لَمْ يَبَرَّ إلاَّ بِالْجَمِيعِ) لە سوێندەكە ڕزگاری نابێ تەنها بە خواردنی هەموو قەسپەكان نەبێ، چونكە دەگونجێ نەخوراوەكە سوێند لەسەرخوراوەكە بێ (أَوْ لَيَأْكُلَنَّ هَذِهِ الرُّمَّانَةَ) یان سوێندی خوارد ئەم هەنارە بخوا، ئەوە (فَإِنَّمَا يَبَرُّ بِجَمِيعِ حَبِّهَا) تەنها بەوە ڕزگاری دەبێ: كە گشت دەنكەكانی هەنارەكە بخوا، ئەگینا: سوێندی لێدەكەوێ، كەوابو: ئەگەر بڵێ: والله ئەم هەنارە ناخۆم، ئینجا هەموی خوارد تەنها دەنكێكی نەبێ، ئەو كاتە سوێندی لێناكەوێ.

(أَوْ لاَ يَلْبَسُ هَذَيْنِ الثَّوْبَيْنِ) یان سوێندی خوارد ئەم دوو جلە دەبەر نەكا، ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ بِأَحَدِهِمَا) بە دەبەركردنی تەنها یەكێكیان سوێندی لێناكەوێ، بەڵام (فَإِنْ لَبِسَهُمَا مَعًا أَوْ مُرَتَّبًا) ئەگەر وێكڕا، یان یەك لە دوای یەك دەبەری كردن، ئەو كاتە (حَنِثَ) سوێندی لێدەكەوێ، هەروەها ئەگەر مەبەستی بێ: هیچێكیان دەبەر نەكا، ئەو كاتە

به تەنها یەکێکیانیش سوێندی لێدەکەوێ (أَوْ لاَ أَلْبَسُ هَـذَا وَلاَ هَـذَا) یـان والله نـه ئەمـەو نه ئەمه دەبەر ناکەم. ئەو کاتەش (حَنِثَ بِأَحَدِهِمَا) بـه دەبـەرکردنی تـەنها یەکێکیشـیان سوێندی لێدەکەوێ.

جا بزانە: ئەگەر سوێندی خوارد ئەم جله دەبەر نەکا، ئینجا داوێکی له جلەکـه دەرکێشـا –واتە: یان پارچەیەکی لێکردنەوە– ئینجا دەبەری کرد، ئەو کاتە سوێندی لێناکـەوێ، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرمویانە.

(أَوْ لَيَأْكُلَنَّ ذَا الطَّعَامَ غَدًا) یان سـوێندی خـوارد ئـەو خواردەمەنیـە سـبەینێ بیخـوا، یـان کارێکیتر بکا (فَمَاتَ قَبْلَهُ) ئینجا پێش بگاتە سبەینێ مرد، ئەوە (فَـلاَ شَـيْءَ عَلَيْـهِ) هـیچ کەففارەتی له سەر نیە، هەروەها ئەگەر له پێش سبەینێوە له بیری چوو خواردەمەنیەکە بخواو تا ڕۆژەکەش تەواو بوو نەهاتەوە بیری، ئەو کاتەش سوێندی لێناکەوێ.

وَإِنْ مَاتَ أَوْ تَلِفَ الطَّعَامُ فِالْغَدِ بَعْدَ تَمَكُّنِهِ مِنْ أَكْلِهِ حَنِثَ، وَقَبْلَهُ قَوْلاَنِ كَمُكْرَهٍ، وَإِنْ أَتْلَفَهُ بِأَكْلٍ أَوْ غَيْرِهِ قَبْلَ الْغَدِ حَنِثَ، وَإِنْ تَلِفَ أَوْ أَتْلَفَهُ أَجْنَبِيٌّ فَكَمُكْرَهٍ، أَوْ لأَقْضِيَنَّ حَقَّكَ عِنْدَ رَأْسِ الْهِلاَلِ فَلْيَقْضِ عِنْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ آخِرَالشَّهْرِ، فَإِنْ قَدِمَ أَوْ مَضَى بَعْدَ الْغُرُوبِ قَدْرُ إِمْكَانِهِ حَنِثَ، وَإِنْ شَرَعَ فِالْكَيْلِ حِينَئِذٍ وَلَمْ يَفْرُغْ لِكَثْرَتِهِ إِلاَّ بَعْدَ مُدَّةٍ لَمْ يَحْنَثْ، أَوْ لاَ يَتَكَلَّمُ فَسَبَّحَ أَوْ قَرَأَ قُرْآنًا فَلاَ حِنْثَ،

---

بەڵام (وَإِنْ مَاتَ أَوْ تَلِفَ الطَّعَامُ فِيالْغَدِ بَعْدَ تَمَكُّنِهِ مِنْ أَكْلِهِ) ئەگەر گەیشتە سبەینێو بۆی گونجا خواردەمەنیەکە بخوا، ئەویش نەیخوارد تا مرد، یان خواردەمەنیەکە فەوتا، یان له بیری چوو بیخوا، ئەو کاتە (حَنِثَ) سوێندی لێدەکەوێ، چونکە بەخۆی ڕزگاربوونی خۆی له دەست داوە.

(وَقَبْلَهُ) بەڵام ئەگەر سبەینێ پێش ئەوەی بۆی بگونجێ بیخـوا مـرد، یـان لـه بـیری چـوو بیخوا، یان خواردەمەنیەکە فەوتا، ئەو کاتە (قَوْلاَنِ كَمُكْرَهٍ) دوو فەرموودە هەنـە–وەکـو سـوێندخۆری زۆرلێکـراو– بەهێزترەکـەیان دەفـەرموێ: سـوێندی لێناکـەوێ، هـەروەك زۆرلێکراویش سوێندی لێناکەوێ.

بـەڵام (وَإِنْ أَتْلَفَـهُ بِأَكْـلٍ أَوْ غَيْـرِهِ قَبْـلَ الْغَـدِ) ئەگـەر پـێش سـبەینێ سـوێندخۆرەکە خواردەمەنیەکەی فەوتاند: به خواردن، یان بـه هۆیـەکیتر، ئـەو کاتـە (حَنِـثَ) سـوێندی لێدەکەوێ، ئەگەر به قەسدیو به ویستی خۆی فەوتاندبێتی، بـەڵام (وَإِنْ تَلِـفَ أَوْ أَتْلَفَـهُ أَجْنَبِيٌّ) ئەگەر پێش سبەینێ، یـان پـێش گونجـان خواردەمەنیەکـە بـەخۆی فـەوتا، یـان بیگانەیەك فەوتاندی، ئەو کاتە (فَكَمُكْرَهٍ) وەکو زۆرلێکراوەو سوێندی لێناکەوێ.

(أَوْ لأَقْضِينَّ حَقَّكَ عِنْدَ رَأْسِ الْهِلاَلِ) یان سوێندی خوارد له کاتی سەری مانگ قەرزەکـەت دەدەمەوە. ئەوە (فَلْيَقْضِ عِنْدَ غُـرُوبِ الشَّمْسِ آخِرَ الشَّهْرِ) با له کاتی ئاوابوونی ڕۆژ

له کۆتایی ئەو مانگەی سوێندی تێدا خواردوه قەرزەکەی بداتەوه (فَإِنْ قَدَّمَ) جا ئەگەر پێش ئاوابوونی ڕۆژەکە قەرزەکەی دایەوه (أَوْ مَضَى بَعْدَ الْغُرُوبِ قَدْرُ إِمْكَانِهِ) یان له دوای ئاوابوونی ڕۆژ ئەندازەی گونجانی قەرزدانەوەکە ڕۆیشتو قەرزەکەی نەداوه، ئەوه (حَنِثَ) سوێندی لێدەکەوێ، بەڵام (وَإِنْ شَرَعَ فِي‌الْكَيْلِ حِينَئِذٍ) ئەگەر لە کاتی ئـاوابوونی ڕۆژدا دەستی بە پێوانی، یان بە کێشانی، یان بە ژمـاردنی قەرزەکـه کـردو (وَلَـمْ يَفْـرُغْ لِكَثْرَتِـهِ إِلاَّ بَعْدَ مُدَّةٍ) تا پاش ماوەیەك–لە بـەر زۆریـی– تـەواوی نـەکرد، ئـەو کاتـە (لَـمْ يَحْنَـثْ) سوێندی لێناکەوێ.

(أَوْ لاَ يَتَكَلَّمُ) یان سوێندی خوارد قسه نەکا (فَسَبَّحَ أَوْ قَرَأَ قُرْآنًا) ئینجا گوتی: سُـبْحانَ الله، یان اَلْحمدلله، یان اَلله أكبَر، یان لاآلَهَ الاّالله، یان قوڕئانی خوێند، ئەوه (فَـلاَ حِنْـثَ) سوێندی لێناکەوێ.



أَوْ لاَ يُكَلِّمُـــهُ فَسَـــلَّمَ عَلَيْـــهِ حَنِـــثَ، وَإِنْ كَاتَبَ
أَوْ غَيْرِهَـا فَـلاَ فِالْجَدِيـدِ، وَلَـوْ قَـرَأَ آيَـةً أَفْهَمَـهُ بِهَـا مَقْصُودَهُ وَقَصَدَ قِرَاءَةً لَمْ يَحْنَثْ، وَإِلاَّ حَنِثَ، أَوْ لاَ مَالَ لَهُ حَنِثَ بِكُلِّ نَوْعٍ وَإِنْ قَلَّ حَتَّى ثَوْبِ بَدَنِهِ وَمُدَبَّرٍ وَمُعَلَّقٍ عِتْقُهُ بِصِـفَةٍ وَمَـا وَصَّـى بِـهِ وَدَيْـنٍ حَـالٍّ وَكَـذَا مُؤَجَّـلٌ فِـي الأَصَـحِّ، لاَ مُكَاتَـبٌ فِالأَصَـحِّ، أَوْ لَيَضْـرِبَنَّهُ فَـالْبِرُّ بِمَـا يُسَـمَّى ضَـرْبًا، وَلاَ يُشْـتَرَطُ إِيـلاَمٌ إِلاَّ أَنْ يَقُـولَ ضَرْبًاشَـدِيدًا، وَلَيْسَ وَضْعُ سَوْطٍ عَلَيْهِ وَعَضٌّ وَخَنْقٌ وَنَتْفُ شَعَرٍ ضَرْبًا، قِيلَ وَلاَ لَطْمٌ وَوَكْزٌ،

---

(أَوْ لاَ يُكَلِّمُهُ) یان سوێندی خوارد قسه لەگەڵ فلانکەس نەکا (فَسَلَّمَ عَلَيْهِ) ئینجا سەلامی له فلانکەسەکە کرد، ئەوه (حَنِثَ) سوێندی لێدەکەوێ، بەڵام (وَإِنْ كَاتَبَهُ أَوْ رَاسَلَهُ أَوْ أَشَارَ إِلَيْهِ بِيَدٍ أَوْ غَيْرِهَا) ئەگەر نووسینێکی بۆ نارد، یان یەکێکی ناردەلای، یان ئاماژەی بۆ کرد: بە دەستی، یان بە سەری، یان بە چاوی، ئەوه (فَلاَ فِي‌الْجَدِيدِ) سوێندی لێناکـەوێ، لـه فەرمودەی نوێدا (وَلَوْ قَرَأَ آيَةً أَفْهَمَهُ بِهَا مَقْصُودَهُ وَقَصَدَ قِـرَاءَةً) ئەگـەر سـوێندخۆرەکه ئایەتێکی خوێندەوەو مەبەستی‌خۆیشی تێگەیاندو مەبەستیشی قوڕئانخوێندنو تێگەیاندنی فلانکەسەکە بوو: وەك فلانکەسەکە له دەرگە بدا، ئەویش ئایەتی (اُدْخُلُوهَا بِسَلَامٍ آمِنِينَ) بخوێنێتەوە، ئەوه (لَمْ يَحْنَثْ) سـوێندی لێناکـەوێ (وَإِلاَّ حَنِـثَ) بـەڵام ئەگـەر مەبەسـتی قوڕئان خوێندنی نەبێ، ئەو کاتە سوێندی لێدەکەوێ.

(أَوْ لاَ مَالَ لَهُ) یان سوێندی خوارد هیچ ماڵی نیه، ئەوه (حَنِثَ بِكُلِّ نَوْعٍ وَإِنْ قَلَّ) بـه هـەر جۆره ماڵێکی هەیبێ سوێندی لێدەکەوێ، هەرچەند ماڵەکەش کەم بێ (حَتَّى ثَوْبِ بَدَنِهِ) تا به جلەکانی بەر لاشەیشی سوێندی لێدەکەوێ، هەم (وَمُدَبَّرٍ وَمُعَلَّقٍ عِتْقُهُ بِصِفَةٍ) به کۆیلەی ئازادکراوی دوای مردنو ئەوەی ئازادکردنەکەی هەڵواسراوەو هەم (وَمَا وَصَّى بِهِ) بەو ماڵەی وەسێتی پێکردووه هەم (وَدَيْنٍ حَالٍّ) بەو قەرزەیی کاتی دانەوەی هـاتوەو (وَكَذَا مُؤَجَّلٌ

فِيالأَصَحِّ) هەروەها بەو قەرزەیی کاتی دانەوەشی نەهاتوە لە فەرموودەی ڕاستتردا، بە هەبوونی یەکێك لە وانەش سوێندی لێدەکەوێ (لاَ مُكَاتَبٌ فِيالأَصَحِّ) بەلاّم بە کۆیلەی نووسراو پێدراو سوێندی لێناکەوێ.

(أَوْ لَيَضْرِبَنَّهُ) یان سوێندی خوارد لە فلانکەس بدا. ئەوە (فَالْبِرُّ بِمَا يُسَمَّى ضَرْبًا) ڕزگاربوونی لە سوێندەکە بە لێدانێکی وەهایە: کە پێی بگوترێ لێدان، بەلاّم (وَلاَ يُشْتَرَطُ إِيلاَمٌ إِلاَّ أَنْ يَقُولَ ضَرْبًا شَدِيدًا) بە مەرج دانانرێ بیێشێنێ، تەنها ئەگەر بڵێ لێدانێکی توندی لێدەدەم، ئەو کاتە مەرجە بیێشێنێ (وَلَيْسَ وَضْعُ سَوْطٍ عَلَيْهِ وَعَضٌ وَخَنْقٌ وَنَتْفُ شَعَرٍ ضَرْبًا) شوڕکەدار لە سەردانانو دەست لە سەردانانو گەزینو خنکاندنو مووهەڵکەندن هیچێکیان لێدان نین (قِيلَ: وَلاَ لَطْمٌ وَوَكْزٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: شەقە لە ڕوودانو بۆکز لێدانیش لێدان نین، بەلاّم بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەو دووانە لێدانن.

أَوْ لَيَضْرِبَنَّهُ مِأَةَ سَوْطٍ أَوْ خَشَبَةٍ فَشَدَّ مِأَةً وَضَرَبَهُ بِهَا ضَرْبَةً أَوْ بِعِثْكَالٍ عَلَيْهِ مِأَةُ شِمْرَاخٍ بَرَّ إِنْ عَلِمَ إِصَابَةَ الْكُلِّ، أَوْ تَرَاكَمَ بَعْضٌ عَلَى بَعْضٍ فَوَصَلَهُ أَلَمُ الْكُلِّ، قُلْتُ: وَلَوْ شَكَّ فِي إِصَابَةِ الْجَمِيعِ بَرَّ عَلَىالنَّصِّ وَاللهُ أَعْلَمُ. أَوْ لَيَضْرِبَنَّهُ مِأَةَ مَرَّةٍ لَمْ يَبِرَّ بِهَذَا، أَوْ لاَ أُفَارِقُكَ حَتَّى أَسْتَوْفِيَ فَهَرَبَ وَلَمْ يُمْكِنْهُ اتِّبَاعُهُ لَمْ يَحْنَثْ، قُلْتُ: اَلصَّحِيحُ لاَ يَحْنَثُ إِذَا أَمْكَنَهُ اتِّبَاعُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَإِنْ فَارَقَهُ أَوْ وَقَفَ حَتَّى ذَهَبَ وَكَانَا مَاشِيَيْنِ أَوْ أَبْرَأَهُ أَوْ اِحْتَالَ عَلَى غَرِيمٍ ثُمَّ فَارَقَهُ أَوْ أَفْلَسَ فَفَارَقَهُ لِيُوسِرَ حَنِثَ،

---

(أَوْ لَيَضْرِبَنَّهُ مِأَةَ سَوْطٍ أَوْ خَشَبَةٍ) یان سوێندی خوارد سەد شوڕکەی لێبدا، یان سەد داری لێبدا (فَشَدَّ مِأَةً وَضَرَبَهُ بِهَا ضَرْبَةً) ئینجا سەد شوڕکە، یان سەد داری پێکوە بەستو بە جارێك لێیدا (أَوْ بِعِثْكَالٍ عَلَيْهِ مِأَةُ شِمْرَاخٍ) یان بە هێشوێکی دار خورما –کە سەد لکی پێوە بوو– بە جارێك لێیدا، ئەوە (بَرَّ) لە سوێندەکە ڕزگاری دەبێ (إِنْ عَلِمَ إِصَابَةَ الْكُلِّ) ئەگەر بزانێ گشتی وێکەوتوە (أَوْ تَرَاكَمَ بَعْضٌ عَلَى بَعْضٍ فَوَصَلَهُ أَلَمُ الْكُلِّ) یان هەندێك لە سەر هەندێکی کۆ بوبێوەو ئێشی گشتی کەیشتێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (وَلَوْ شَكَّ فِي إِصَابَةِ الْجَمِيعِ) ئەگەر کەوتە گومان لە وێکەوتنی هەمووی، ئەو کاتەش (بَرَّ عَلَىالنَّصِّ وَاللهُ أَعْلَمُ) لە سوێندەکەی ڕزگاری دەبێ (أَوْ لَيَضْرِبَنَّهُ مِأَةَ مَرَّةٍ) یان سوێندی خوارد سەد جار لێیبدا، ئەو کاتە (لَمْ يَبَرَّ بِهَذَا) بە لێدانی دارە بەستراوەکانو بە هێشوەکە ڕزگاری نابێ، چونکە گشتی بە یەك لێدان دەژمێردرێ، کەوابو: مەرجە سەد جار لێیبدا.

(أَوْ لاَ أُفَارِقُكَ حَتَّى أَسْتَوْفِيَ) یان سوێندی خوارد لە تۆ جیا نابمەوە تا قەرزەکەم لە تۆ وەردەگرمەوە (فَهَرَبَ) ئینجا قەرزدارەکە هەڵاتو (وَلَمْ يُمْكِنْهُ اتِّبَاعُهُ) بۆیشی نەگونجا

بەدوایدا ڕابکا، ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ) سوێندی لێناکەوێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (اَلصَّحِيحُ لاَ يَحْنَثُ إذَا أمْكَنَهُ اتِّبَاعُهُ) بە فەرمودەی ڕاست: ئەگەر بشکوێنجێ بەدوایدا ڕا بکا سوێندی لێناکەوێ (وَاللهُ أعْلَمُ) چونکە سوێندەکەی لە سەرکرداری خۆی خواردوە.

بەڵام (وَإنْ فَارَقَهُ) ئەگەر سوێندخۆرەکە بە ویستیخۆی لە قەرزدارەکە جیا بۆوە (أوْ وَقَفَ حَتَّى ذَهَبَ وَكَانَا مَاشِيَيْنِ) یان سوێندخۆرەکە لە شوێنی خۆی وەستا تا قەرزدارەکە ڕۆیشتو لەو حاڵەتیشدا هەردووکیان دەڕۆیشتن (أوْ أبْرَأهُ) یان گەردەنی قەرزدارەکەی ئازاد کرد (أوْ احْتَالَ عَلَى غَرِيمٍ ثُمَّ فَارَقَهُ) یان سوێندخۆرەکە قبوڵی کرد حەواڵەی بۆ سەرکەسێك بکرێو لێیشی جیابۆوە (أوْ أفْلَسَ فَفَارَقَهُ لِيُوسِرَ) یان قەرزدارەکە وەبن قەرز کەوتبو و سوێندخۆرەکەش لێی جیا بۆوە تا دەوڵەمەند دەبێ، ئەوە (حَنِثَ) لەو پێنج مەسەلانەدا سوێندی لێدەکەوێ.

وَإنْ اِسْتَوْفَى وَفَارَقَهُ فَوَجَدَهُ نَاقِصًا إنْ كَانَ مِنْ جِنْسِ حَقِّهِ لَكِنَّهُ أَرْدَأُ لَمْ يَحْنَثْ، وَإلاَّ حَنِثَ عَالِمٌ، وَفِي غَيْرِهِ الْقَوْلاَنِ، أَوْ لاَ رَأَى مُنْكَرًا إلاَّ رَفَعَهُ إلَىالْقَاضِي فَرَأَى وَتَمَكَّنَ فَلَمْ يَرْفَعْ حَتَّى مَاتَ حَنِثَ، وَيُحْمَلُ عَلَى قَاضِىالْبَلَدِ، فَإنْ عُزِلَ فَالْبِرُّ بِالرَّفْعِ إلَىالثَّانِي، أَوْ إلاَّ رَفَعَهُ إلَى قَاضٍ بَرَّ بِكُلِّ قَاضٍ، أَوْ إلَىالْقَاضِي فُلاَنٍ فَرَآهُ ثُمَّ عُزِلَ فَإنْ نَوَى مَا دَامَ قَاضِيًا حَنِثَ إنْ أَمْكَنَهُ رَفْعُهُ فَتَرَكَهُ وَإلاَّ فَكَمُكْرَهٍ، وَإنْ لَمْ يَنْوِ بَرَّ بِالرَّفْعِ إلَيْهِ بَعْدَ عَزْلِهِ.

---

بەڵام (وَإنْ اِسْتَوْفَى وَفَارَقَهُ) ئەگەر قەرزەکەی لێوەرگرتەوەو لێی جیابۆوە (فَوَجَدَهُ نَاقِصًا) جا تەماشای کرد قەرزەکەی ناتەواوە، ئەوە تەماشا دەکەین: (إنْ كَانَ مِنْ جِنْسِ حَقِّهِ لَكِنَّهُ أرْدَأُ) ئەگەر قەرزەکە لە ڕەگەزی مافەکەی خۆی بێ، بەڵام خراپتر بێ (لَمْ يَحْنَثْ) سوێندی لێناکەوێ (وَإلاّ) بەڵام ئەگەر لە ڕەگەزی مافی خۆی نەبێ، ئەو کاتە (حَنِثَ عَالِمٌ) سوێندی لێدەکەوێ ئەگەر زانیبی ماڵەکە لە ڕەگەزی خۆی نیە، بەڵام (وَفِي غَيْرِهِ الْقَوْلاَنِ) لەبارەی نەزان دوو فەرموودەکان هەنە، بەهێزترەکەیان دەفەرموێ: نەزان سوێندی لێناکەوێ.

(أوْ لاَ رَأَى مُنْكَرًا إلاَّ رَفَعَهُ إلَىالقَاضِي) یان سوێندی خوارد: هەر بێشەرعیەك ببینێ بەرزی بکاتەوە لای قازی (فَرَأَى وَتَمَكَّنَ فَلَمْ يَرْفَعْ حَتَّى مَاتَ) ئینجا بێشەرعیەکی دیتو بۆی گونجا بەرزی بکاتەوە، بەڵام بەرزی نەکردەوە تا سوێندخۆرەکە مرد، ئەوە (حَنِثَ) سوێندی لێدەکەوێ (وَيُحْمَلُ عَلَى قَاضِىالْبَلَدِ) لە سوێندەکەدا قازی دەهێندرێتە سەر قازیی شاری بێشەرعیەکە، ئەگەر سوێندخۆرەکە نیەتی قازێیکیتری نەبوبێ.

کەوابو: (فَإنْ عُزِلَ) ئەگەر قازیی شارەکە لە کار لادرا، ئەو کاتە (فَالْبِرُّ بِالرَّفْعِ إلَىالثَّانِي)

ڕزگاربوونی به بەرزکردنەوەی بۆ دووەمەکە دەبێ (أَوْ إلاَّ رَفَعَهُ إلَى قَاضٍ) یان سوێندی خوارد بێشەرعیەکە بۆ قازییێك بەرز بکاتەوە. ئەو کاتە (بَرَّ بِكُلِّ قَاضٍ) بە بەرزکردنەوەی بۆ گشت قازییێك ڕزگاری دەبێ، هەرچەند قازیی شارێکیتریش بێ.

(أَوْ إلَىالْقَاضِي فُلاَنٍ) یان سوێندی خوارد بۆ فلانە قازییە بەرزی بکاتەوە (فَرَآهُ) ئینجا بێشەرعیەکەی دیتو بەرزی نەکردەوە (ثُمَّ عُزِلَ) ئینجا قازییەکەش لە کار لادرا، ئەوە (فَإِنْ نَوَى مَا دَامَ قَاضِيًا) ئەگەر مەبەستی ئەوە بوبێ لە ماوەی بەردەوامبوونی لە قازیەتیدا بۆی بەرز بکاتەوە، ئەوە (حَنِثَ إنْ أَمْكَنَهُ رَفْعُهُ فَتَرَكَهُ) سوێندی لێدەکەوێ ئەگەر بۆی گونجابێ بێشەرعیەکە بەرز بکاتەوەو بەرزی نەکردبێتەوە تا لە کار لادرا (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر بۆی نەگونجابێ، ئەو کاتە (فَكَمُكْرَهٍ) وەك زۆرلێکراوەو سوێندی لێناکەوێ (وَإنْ لَمْ يَنْوِ) وە ئەگەر مەبەستیشی حالەتی قازیەتی نەبو، ئەو کاتە (بَرَّ بِالرَّفْعِ إلَيْهِ بَعْدَ عَزْلِهِ) لە سوێندەکەی ڕزگاری دەبێ: بەوەی لە دوای لادانیش بێشەرعیەکەی بۆ لای قازیەکە بەرز بکاتەوە.

(فَصْلٌ) حَلَفَ لاَ يَبِيعُ أَوْ لاَ يَشْتَرِي فَعَقَدَ لِنَفْسِهِ أَوْ غَيْرِهِ حَنِثَ، وَلاَ يَحْنَثُ بِعَقْدِ وَكِيلِهِ لَهُ، أَوْ لاَ يُزَوِّجُ أَوْ لاَ يُطَلِّقُ أَوْ لاَ يُعْتِقُ أَوْ لاَ يَضْرِبُ فَوَكَّلَ مَنْ فَعَلَهُ لاَ يَحْنَثُ إلاَّ أَنْ يُرِيدَ أَنْ لاَ يَفْعَلَ هُوَ وَلاَ غَيْرُهُ، أَوْ لاَ يَنْكِحُ حَنِثَ بِعَقْدِ وَكِيلِهِ لَهُ لاَ بِقَبُولِهِ هُوَ لِغَيْرِهِ، أَوْ لاَ يَبِيعُ مَالَ زَيْدٍ فَبَاعَهُ بِإِذْنِهِ حَنِثَ، وَإِلاَّ فَلاَ، أَوْ لاَ يَهَبُ لَهُ فَأَوْجَبَ لَهُ فَلَمْ يَقْبَلْ لَمْ يَحْنَثْ، وَكَذَا إنْ قَبِلَ وَلَمْ يَقْبِضْ فِالأَصَحِّ، وَيَحْنَثُ بِعُمْرَى وَرُقْبَى وَصَدَقَةٍ، لاَ إعَارَةٍ وَوَصِيَّةٍ وَوَقْفٍ،

---

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی سوێندخواردن لە سەر نەکردنی کارێك ﴾

(حَلَفَ لاَ يَبِيعُ أَوْ لاَ يَشْتَرِي) ئەگەر سوێندی خوارد نەفرۆشێو نەکڕێ (فَعَقَدَ لِنَفْسِهِ أَوْ غَيْرِهِ) ئینجا مامڵەتێکی دروستبووی کڕین، یان فرۆشتنی بەست: بۆخۆی، یان بۆ کەسێکیتر: بە وەکیلایەتی، یان بە سەرپەرشتکاریەتی، ئەوە (حَنِثَ) سوێندی لێدەکەوێ، بەلام ئەگەر مامڵەتەکە دروست نەبوبێ سوێندی لێناکەوێ، هەم (وَلاَ يَحْنَثُ بِعَقْدِ وَكِيلِهِ لَهُ) ئەگەر وەکیلەکەشی مامڵەتی کڕینو فرۆشتنەکەی بۆ ببەستێ سوێندی لێناکەوێ.

(أَوْ لاَ يُزَوِّجُ أَوْ لاَ يُطَلِّقُ أَوْ لاَ يُعْتِقُ أَوْ لاَ يَضْرِبُ) یان سوێندی خوارد: مارەی ژن نەبڕێ لە کەسێك، یان تەلاق نەدا، یان کۆیلە ئازاد نەکا، یان لێنەدا (فَوَكَّلَ مَنْ فَعَلَهُ) ئینجا کەسێکی کردە وەکیلی خۆیو کارەکەی کرد، ئەوە (لاَ يَحْنَثُ) سوێندی لێناکەوێ (إلاَّ أَنْ يُرِيدَ أَنْ لاَ يَفْعَلَ هُوَ وَلاَ غَيْرُهُ) تەنها ئەگەر مەبەستی بێ: نە بەخۆیو نە بە کەسێکیتر ئەم کارە نەکا، ئەو کاتە ئەگەر بە وەکیلەکەش بیکا سوێندی لێدەکەوێ.

(أَوْ لاَ يَنْكِحُ) یان سوێندی خوارد: ژن نەهێنێ، ئەوە (حَنِثَ بِعَقْدِ وَكِيلِهِ لَهُ) سوێندی لێدەكەوێ ئەگەر وەكیلەكەشی مارەبڕینەكەی بۆ بكا (لاَ بِقَبُولِهِ هُوَ لِغَيْرِهِ) بەلآم ئەگەر سوێندخۆرەكە مارەبڕینەكە بۆ كەسێكیتر قبول بكا، سوێندی لێناكەوێ (أَوْ لاَ يَبِيعُ مَالَ زَيْدٍ) یان سوێندی خوارد ماڵی زەید نەفرۆشێ (فَبَاعَهُ بِإِذْنِه) ئینجا بە ئیزنی زەید ماڵەكەیی فرۆشت، ئەوە (حَنِثَ) سوێندی لێدەكەوێ (وَإِلاَّ) بەلآم ئەگەر بێئیزنێكی دروستبوو فرۆشتی، ئەو كاتە (فَلاَ) سوێندی لێناكەوێ.

(أَوْ لاَ يَهَبُ لَهُ) یان سوێندی خوارد نەبەخشێتە زەید (فَأَوْجَبَ لَهُ فَلَمْ يَقْبَلْ) ئینجا شتێكی دایە زەیدو زەیدیش قبوڵی نەكرد، ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ) سوێندی لێناكەوێ (وَكَذَا إِنْ قَبِلَ وَلَمْ يَقْبِضْ) هەروەها ئەگەر زەید قبوڵیشی كرد بەلآم شتەكەی وەرنەگرت، سوێندی لێناكەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە ملكایەتیەكە جێگیر نەبوە.

بەلآم (وَيَحْنَثُ بِعُمْرَى وَرُقْبَى وَصَدَقَةٍ) سوێندی لێدەكەوێ: بە بەخشینی بەدرێژایی تەمەن و بە بەخشینی چاوەڕوانكردن و بە خێركردن و بە دیاریی وەرگیراو (لاَ إِعَارَةٍ وَوَصِيَّةٍ وَوَقْفٍ) بەلآم بە بە خوازدان و بە وەسیەت و بە وەقفكردن سوێندی لێناكەوێ.

أَوْ لاَ يَتَصَدَّقُ لَمْ يَحْنَثْ بِهِبَةٍ فِالأَصَحِّ، أَوْ لاَ يَأْكُلُ طَعَامًا اِشْتَرَاهُ زَيْدٌ لَمْ يَحْنَثْ بِمَااشْتَرَاهُ مَعَ غَيْرِهِ، وَكَذَا لَوْ قَالَ مِنْ طَعَامٍ اِشْتَرَاهُ زَيْدٌ فِالأَصَحِّ، وَيَحْنَثُ بِمَااشْتَرَاهُ سَلَمًا، وَلَوْ اِخْتَلَطَ مَااشْتَرَاهُ بِمُشْتَرِغَيْرِهِ لَمْ يَحْنَثْ حَتَّى يَتَيَقَّنَ أَكْلَهُ مِنْ مَالِهِ، أَوْ لاَ يَدْخُلُ دَارًا اِشْتَرَاهَا زَيْدٌ لَمْ يَحْنَثْ بِدَارٍ أَخَذَهَا بِشُفْعَةٍ.

(كِتَابُ النَّذْرِ)

---

(أَوْ لاَ يَتَصَدَّقُ) یان سوێندی خوارد خێر نەكا، ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ بِهِبَةٍ) بە بەخشین سوێندی لێناكەوێ (فِيالأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(أَوْ لاَ يَأْكُلُ طَعَامًا اشْتَرَاهُ زَيْدٌ) یان سوێندی خوارد: ئەو خواردەمەنیە نەخوا كە زەید كڕیویەتی. ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ بِمَااشْتَرَاهُ مَعَ غَيْرِهِ) سوێندی لێناكەوێ بە خواردنی ئەو خواردەمەنیەی زەید لەگەڵ كەسێكیتر بە هاوبەشی كڕیوەیەتی (وَكَذَا لَوْ قَالَ مِنْ طَعَامٍ اشْتَرَاهُ زَيْدٌ) هەروەها ئەگەر بشڵێ لەو خواردەمەنیە ناخۆم كە زەید كڕیویەتی، سوێندی لێناكەوێ (فِيالأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلآم (وَيَحْنَثُ بِمَااشْتَرَاهُ سَلَمًا) سوێندی لێدەكەوێ بە خواردنی ئەو خواردەمەنیەی زەید بە سەلەم كڕیویەتی.

(وَلَوْ اخْتَلَطَ مَا اشْتَرَاهُ بِمُشْتَرَى غَيْرِهِ) ئەگەر ئەو خواردەمەنیەی زەید كڕیویەتی تێكەڵی خواردەمەنیی كەسێكیتر بوو، ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ حَتَّى يَتَيَقَّنَ أَكْلَهُ مِنْ مَالِهِ) بە خواردنی ئەو تێكەڵبووە سوێندی لێناكەوێ تا بێگومان دەزانێ لە خواردەمەنیەكەی زەیدی خواردوە

(أَوْ لاَ يَدْخُلُ دَارًا اشْتَرَاهَا زَيْدٌ) یان سوێندی خوارد نەچێتە ناو ئەو خانووەی زەید کڕیویەتی. ئەوە (لَمْ يَحْنَثْ بِدَارٍ أَخَذَهَا بِشُفْعَةٍ) سوێندی لێناکەوێ بە چوونە ناو ئەو خانووەی زەید بە شوفعە وەریگرتوە.

## ﴿ كِتَابُ النَّذْرِ: پەڕتوکی نەزرکردن ﴾

واتە: واجبکردنی خواپەرستنێك لە سەر خۆی کە لە سەری واجب نەبوبێ.

جا بزانە: جگە لە نەزری (اَللّجاج)ی‌داهاتوو، نەزرکردن سوننەتەو پاداشتەکەی وەکو پاداشتی واجبەو بە حەفتا پلە لە سوننەت خێری زیاترە، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا فەرموویانە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَاأَنْفَقْتُمْ مِنْ نَفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُمْ مِنْ نَذْرٍ فَإِنَّ اللهَ يَعْلَمُهُ﴾ هەر بژێوێك ببەخشنو هەر نەزرێك بکەن خوای گەورە دەیزانێو پاداشتان دەداتەوە. هەم بە بەڵگەی چەند حەدیسێکیداهاتووش.

دیسان بزانە: مەرجە نەزرکەرەکە: موسڵمانو بالغو عاقڵو بە خۆشیخۆی بێو دەستکاریشی لەو شتەدا دروست بێ کە نەزری دەکا، کەواتە: نەزرکردنی کافرو منداڵو شێتو زۆرلێکراو دروست نابێ، هەم ئەگەر (سَفیه)و قەرزداری قەدەغەکراویش ماڵێك نەزر بکەن، نەزرەکەیان دروست نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَهُوَ ضَرْبَانِ نَذْرُ لَجَاجٍ: كَإِنْ كَلَّمْتُهُ فَلِلَّهِ عَلَيَّ عِتْقٌ أَوْ صَوْمٌ، وَفِيهِ كَفَّارَةُ يَمِينٍ، وَفِي قَوْلٍ مَاالْتَزَمَ، وَفِي قَوْلٍ أَيُّهُمَا شَاءَ، قُلْتُ: اَلثَّالِثُ أَظْهَرُ وَرَجَّحَهُ الْعِرَاقِيُّونَ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ قَالَ إِنْ دَخَلْتُ فَعَلَيَّ كَفَّارَةُ يَمِينٍ أَوْ نَذْرٍ لَزِمَتْهُ كَفَّارَةٌ بِالدُّخُولِ.

---

هەروەها ئەگەر شتێك ملکی خۆی نەبێ ئەویش نەزرکردنی دروست نابێ، هەرچەند بە وەکیلایەتیش بێ، چونکە وەکیلگرتن بۆ نەزرکردن دروست نیە، هەروەك لە باسی (وەکیلایەتی)دا ڕابرا، هەم ئەگەر لەگەڵ نەزرکردنەکەدا بڵێ: (إن شاء الله). ئەو کاتەش نەزرەکە دانامەزرێ، هەروەك لە باسی (جیاکردنەوە لە تەڵاق)دا بە بەڵگەوە ڕابرا.

(وَهُوَ ضَرْبَانِ) نەزرکردن دوو جۆرە:

**جۆرییەکەم**: (نَذْرُ لَجَاجٍ) نەزری توڕەیيو ڕقەکارییە: کە هاندانێك، یان قەدەغەکردنێك، یان ڕاستیی هەواڵێکی مەبەست بێ (كَإِنْ كَلَّمْتُهُ فَلِلّهِ عَلَيَّ عِتْقٌ أَوْ صَوْمٌ) وەك بڵێ: (ئەگەر قسەم لەگەڵ فلانکەس کرد). یان: (ئەگەر ئەم کارە نەکەم). یان: (ئەگەر ئەو هەواڵە ئەوەابێ)، لە سەرم بێ بۆ خوا کۆیلەیەك ئازاد بکەم. یان: بەڕۆژوو بم. یان: خێرێك بکەم.

جا بزانە: ئەم نەزرەی(اللّجاج) ناپەسندە، هەوەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بە بەڵگەی: ﴿عن ابن عمر رضي الله عنهما: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ النَّذْرِ وَقَالَ: إِنَّهُ لاَ يَأْتِي بِخَيْرٍ وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ نەزری قەدەغە کردو فەرمووی: نەزرکردن –واتە: (اللّجاج)– چاکە ناهێنێو تەنها لە مرۆڤی بەخیل شت وەدەردێنێ.

(وَفِيهِ كَفَّارَةُ يَمِينٍ) ئەم نەزرەی (اللَّجاج)–ئەگەر پێوەهەڵواسراوەكەی هاتە جێ– كەففارەتی سوێندێكی تێدا واجب دەبێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿كَفَّارَةُ النَّذْرِ كَفَّارَةُ يَمِينٍ﴾ رواه مسلم، كەففارەتی نەزر كەففارەتی سوێندە. واتە: كەففارەتی (اللَّجاج)، هەروەك ئیمامی (عمر)و (ابن عباس)و (ابن عمر) رضي الله عنهم فەرموویانەو (صحابە)ش رەخنەیان لێنەگرتون.

(وَفِي قَوْلٍ مَا الْتَزَمَ) لە فەرموودەیەكدا: نەزركراوەكەی لە سەرە بیكا (وَفِي قَوْلٍ أَيُّهُمَا شَاءَ) لە فەرموودەیەكدا: كامەیان حەز دەكا: با ئەویان بكا (قُلْتُ) ئیمامی (النـواوي) فەرموویەتی (اَلثَّالِثُ أَظْهَرُ) سێیەمەكەیان بەهێزترە–كە دەفەرموێ: لە كەففارەتەكەو لە نەزركراوەكە كامەیان حەز دەكا: با ئەویان بكا– (وَرَجَّحَهُ الْعِرَاقِيُّونَ وَاللهُ أَعْلَمُ) زانایانی عێراقیش ئەم سێیەمەیان بەهێز كردوە، چونكە وەكو نەزر واجبكردنی خواپەرستیی تێدایە، وەكو سوێندیش هاندانو قەدەغەكردنی تێدایە، ناشگونجێ واجبكراوی هەردووكیان وێكرا كۆ ببێتەوە.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر نەزركەرەكە گوتی (إِنْ دَخَلْتُ فَعَلَيَّ كَفَّارَةُ يَمِينٍ أَوْ نَذْرٍ) ئەگەر بچمە ژوورەوە كەففارەتێكی سوێندم لە سەر بێ، یان كەففارەتێكی نەزرم لە سەر بێ، ئەوە (لَزِمَتْهُ كَفَّارَةٌ بِالدُّخُولِ) لە هەردوو مەسەلەدا بە چوونە ژوورەوە كەففارەتی سوێندی لە سەر واجب دەبێ.

وَنَذْرُ تَبَرُّرٍ: بِأَنْ يَلْتَزِمَ قُرْبَةً إِنْ حَدَثَتْ نِعْمَةٌ أَوْ ذَهَبَتْ نِقْمَةٌ كَإِنْ شُفِيَ مَرِيضِي فَلِلَّهِ عَلَيَّ أَوْ فَعَلَيَّ كَذَا، فَيَلْزَمُهُ ذَلِكَ إِذَا حَصَلَ الْمُعَلَّقُ عَلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ يُعَلِّقْهُ بِشَيْءٍ كَلِلَّهِ عَلَيَّ صَوْمٌ لَزِمَهُ فِي الأَظْهَرِ،

---

بەڵام ئەگەر بڵێ: نەزرێكم لە سەر بێ، ئەو كاتە نەزركەرەكە سەرپشكە: یان دەبی كەففارەتی سوێندێك بدا، یان دەبی خواپەرستییێك بكا: وەك نوێژێك، یان ڕۆژوویێك، یان خێرێكیتر، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَنْ نَذَرَ نَذْراً لَمْ يُسَمِّهِ فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ﴾ رواه أبوداود والترمذي بسند حسن، هەر كەسێك نەزرێك بكاو ناوی نەزركراوەكەش نەڵێ، ئەوە كەففارەتەكەی وەك كەففارەتی سوێندە.

**جۆری دووەم**: (وَنَذْرُ تَبَرُّرٍ) نەزری چاكەو نزیكبوونەوەیە لە خوا، جا ئەم جۆرەیان خێرە –هەروەك بەڵگەمان بۆ هێناوە– دەكرێتە دوو بەش: هەڵواسراو، هەڵنەواسراو، ئینجا نەزری هەڵواسراو پێی دەگوترێ: (نَذْرُالْمُجَازاة) نەزری پاداشتی چاكە:

(بِأَنْ يَلْتَزِمَ قُرْبَةً إِنْ حَدَثَتْ نِعْمَةٌ أَوْ ذَهَبَتْ نِقْمَةٌ) وەك نەزركەرەكە خواپەرستنێك لە سەر خۆی واجب بكا ئەگەر نیعمەتێكی بۆ ببێ، یان خراپەیەكی لە سەر لابچێ (كَـ) وەك بڵێ: (إِنْ شُفِيَ مَرِيضِي فَلِلَّهِ عَلَيَّ أَوْ فَعَلَيَّ كَذَا) ئەگەر نەخۆشەكەم شیفای بدرێ، یان ئەگەر خوا كوڕێكم بداتێ لە سەرم بێ بۆ خوا بەڕۆژوو بم. یان لە سەرم بێ مانگایەك بكەمە خێر. یان

شەرت بێ بۆ فلاَنە خێر بکەم. واتە: مەرج نیە بڵێ بۆ خوا (فَيَلْزَمُهُ ذَلِكَ إِذَا حَصَلَ الْمُعَلَّقُ عَلَيْهِ) جا نەزرکەرەکە نەزکراوەکەی لە سەر واجب دەبێ بە پەلە بیکا هەر کاتێك پێهەڵواسراوەکە هاتە جێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ﴾ با نەزرەکانی خۆیان بەجێ بێنن.

هــەم پێغەمبــەرﷺ فەرموویــەتی: ﴿مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللهَ فَلْيُطِعْهُ وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلاَ يَعْصِهِ﴾ رواه البخاري، هەر کەسێك نەزری کرد خواپەرستنێك بکا با بیکا، هەر کەسێکیش نەرزی کرد گوناهێك بکا نابێ بیکا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر نەزرکراوەکە ماڵی بێ-وەك ئەگەر خوا شیفای دام نەزر بێ مەڕێك بکەمە خێر- ئەوە دروستە: پێش هاتنی پێهەڵواسراوەکە نەزرکراوەکە بدا، بـەڵام ئەگـەر نەزرکراوەکـە خواپەرسـتی بـێ-وەك نوێـژو ڕۆژوو- ئـەوە دروسـت نیـە پـێش هـاتنی پێهەڵواسراوەکە بکرێ، هەروەك لە پێش (کەففارەتیسوێند)دا ڕابرا.

(وَإِنْ لَمْ يُعَلِّقْهُ بِشَيْءٍ) ئەگـەر نەزرەکـەی بـە هـیچ شـتێك هەڵنەواسـیبێ (گـ) وەك-بـە هەڵنەواسراوی- لە سەرەتاوە بڵێ: (لِلَّهِ عَلَيَّ صَوْمٌ) لە سەرم بێ بۆ خوا بەڕۆژوو بم. یان لە سەرم بێ دینارێك بدەمە فلاَنکەس. یان مەولودی پێغەمبەرﷺ ئەو شتەم لە سەربێ. ئـەو کاتەش (لَزِمَهُ فِيالأَظْهَرِ) لە سەری واجبـە: نەزرکراوەکـەی بـەجێ بێنـێ لـە فـەرموودەی

..........

بەهێزتردا، بە بەڵگەی ئایەتو حەدیسەکەیڕابردوو. جا بزانە: لێرەشـدا مـەرج نیـە بڵـێ: بۆ خوا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

## ﴿ نەزرکردنی ماڵ بۆ کەسێك، پەشیمانبوونەوەو هەڵواسینی نەزرکردن ﴾

بزانە: نەزرکردنی خواپەرستی-جگە لە خوا- بـۆ هـیچ کەسـێکیتر دروسـت نیـە، بـەڵام نەزرکردنی ماڵ بۆ ئادەمیزادانیش دروست دەبێ، وەك بڵـێ: (نـەزر بـێ دە دینـار بدەمـە فلاَنکەس). یان دیاری بکاو بڵێ: (ئەم خانووەم نەزری فلاَنکەس بێ). یان بە هەڵواسراوی بڵێ: (ئەگەر ئـەم کـارەم جێبـەجێ بـوو باغەکـەم نـەزری فلاَنکـەس بـێ). لـەو وێنانـەدا نەزرەکەی دادەمەزرێو ئەگەر پێهەڵواسراوەکەش هاتە جێ، واجبـە: نەزرکراوەکـە بداتـە فلاَنکەسەکە، جا ئەگەر نەیداتێ، ئەو کاتە نەزربۆکراوەکە مـافی هەیـە داوای لێبکـاو بـە زۆرلێکردن نەزرکراوەکەی لێبستێنێ، هەروەها نـەزرکردنیماڵی بـۆ کۆرپـەی نـاو زگیش دروست دەبێ.

جا بزانە: لە هیچ نەزرێکدا مەرج نیە: نەزربۆکراوەکە نەزرکراوەکە قبوڵ بکا، بەڵکو مەرجە: ڕەدی نەکاتەوە، واتە: ئەگەر نەزرکراوێکی هەڵواسراوی ڕەد کردەوە، ئەو کاتە نەزرەکە لە بنچینەوە بـەتاڵ دەبێتـەوەو نەزرکراوەکـە دەبێتـەوە مڵکـی نەزرکەرەکـە، بـەڵام ئەگـەر نەزرکراوەکە هەڵواسراو نەبێ بەڵکو دیارکراو بێ، وەك بڵێ: ئەم شتەم نەزری فلاَنکەس بێ،

ئەو كاتە لە ملكايەتیى لادەكەویّو بەرِەدكردنەوەش نەزرەكە بەتالٌ نابێتەوەو بە ناچاری دەبێتە ملكی نەزربۆكراوەكە.

كەواتە: ئەگەر شتێك، یان شوێنێك بۆ خێركردنەكەی دیاری بكا، هەمان شتو هەمان شوێنی لە سەر واجب دەبن، هەروەك لە (فَصْل)ی‌داهاتوودا بەلگەی بۆ دێنین،إن شاءالله تعالی.

دیسان بزانە: پەشیمانبوونەوە لە هیچ جۆرە نەزرێكدا دروست نابێ، هەروەك لە (باسی پەشیمانی)دا رِابرا، بەلام نەزركردنی بە مەرج دروست دەبێ: وەك (ئەگەر ئەم كارە بكەی ئەم شتەم نەزری تۆ بێ).

هەم نەزری شتی نەزاندراویش دروست دەبێ: وەك نەزانێ چەند قەرزی لە لایەتیو بلێ: (هەرچەند قەرزم لە لای تۆ هەیە نەزری تۆ بێ). ئەوە یەكسەر قەرزەكەی لە ئەستۆ لادەچێ هەر چەند قبولێش نەكا، هەم بە شتی نەبووییش دروست دەبێ: وەك لە زستاندا بلێ: (میوەی باغەكەم لەم سالەدا نەزری تۆ بێ).

هەم دروستە: نەزركردنی مالەكە بە كاتەكانیش هەلبواسێ: وەك (رِۆژێك پێش نەخۆشیی مردنم ئەم باغەم نەزری فلانكەس بێ). كەواتە: تا رِۆژێك پێش نەخۆشیی مردنی بۆی دروستە دەستكاری باغەكەی بكاو هەم دروستە پەشیمانیش ببێتەوە، جا ئەگەر

وَلاَ يَصِحُّ نَذْرُ مَعْصِيَةٍ وَلاَ وَاجِبٍ، وَلَوْ نَذَرَ فِعْلَ مُبَاحٍ أَوْ تَرْكَهُ لَمْ يَلْزَمْهُ لَكِنْ إِنْ خَالَفَ لَزِمَهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ عَلَى الْمُرَجَّحِ،

---

پەشیمان نەبۆوە، ئەوە بە رِۆژێك پێش نەخۆشیی مردنی تەواوی باغەكە دەبێتە ملكی نەزربۆكراوەكە.

هەروەها جیاكردنەوەش لە نەزردا دروست دەبێ: وەك (نەزر بێ مالەكەم بكەمە خێر، مەگەر بە خۆم پێویستیم پێی هەبێ). یان (رِۆژێك پێش نەخۆشیی مردنم باغەكەم نەزری فلانكەس بێ مەگەر كورِێكم پەیدا ببێ). ئەوە لەو دوو وێنانەشدا نەزرەكەی دادەمەزرێ، بەلام تا زیندوو بێ واجب نیە نەزركراوەكە بدا، جا هەركاتێك مرد نەزركراوەكە دەدرێتە نەزربۆكراوەكە.

جا بزانە: نەزر بۆ مردوو دروست نابێ، هەم بەشێوەیەكی كاتیش دروست نابێ: وەك تا رِۆژێك ئەمە نەزری تۆ بێ، هەروەك لە (تحفە)و حاشیەكانیدا ناوەرِۆكی ئەم باسە روون كراوەتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر مالێكی دیاركراو نەزر بكا، مەرجە: مالەكە ملكی خۆی بێ، یان نەزرەكە بە ملكبوونی مالەكەوە هەلبواسێ: وەك (ئەگەر باغەكەی فلانكەس بوە ملكی من، نەزر بێ بیكەمە خێر). ئەوە نەزرەكەی دادەمەزرێ، بەلام ئەگەر تەنها بلێ: (نەزر بێ باغەكەی فلانكەس بكەمە خێر). ئەو كاتە نەزرەكەی دانامەزرێ، چونكە ملكی خۆی نیە، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا روون كراوەتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةٍ

وَلاَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ الْعَبْدُ﴾ رواه الشيخان، بەجێهێنانی نەزر لە گوناهدا دروست نیە، هەم لەو شتەشدا دروست نابێ کە ملکی نەزرکەرەکە نیە.
ئینجا هەر بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: (وَلاَ يَصِحُّ نَذْرُ مَعْصِيَةٍ) نەزری گوناهکاری دروست نابێ: وەك (نەزر بێ فلانکەس بکوژم). هەروەها نەزرکردنی کارێکی ناپەسندیش دروست نابێ: وەك نوێژ کردن لە ناو گەرماودا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەم (وَلاَ وَاجِبٍ) نەزرکردنی واجبیش دروست نابێ: وەك نوێژی نیوەڕۆ، بەڵام نەزرکردنی (فَرْضُ الْكِفَايَة) دروست دەبێ: وەك (جهاد)و نوێژی جەنازە، کەوابو: لە نەزرکردنی ناپەسندو واجبو گوناهدا کەففارەتیش واجب نابێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرمویانە.
(وَلَوْ نَذَرَ فِعْلَ مُبَاحٍ أَوْ تَرْكَهُ) ئەگەر نەزری کرد کارێکی حەڵاڵ بکا، یان نەزری کرد نەیکا: وەك خەوتنو خواردن...هتد، ئەوە (لَمْ يَلْزَمْهُ) کردنو نەکردنەکەی لە سەر واجب نابن، چونکە نەزرکردنی حەڵاڵ دانامەزرێ (لَكِنْ إِنْ خَالَفَ لَزِمَهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ) بەڵام ئەگەر نەزرکراوەکەی بەجێ نەهێنا، کەففارەتی سوێندی لە سەرە (عَلَى الْمُرَجَّحِ) لە سەر فەرموودەی زاڵکراو، بەڵام بە فەرموودەی ڕاستترو پشت پێبەستراو کەففارەتیشی لە سەر نیە، هەروەك لە نەزرکردنی گوناهو ناپەسندو واجبیشدا کەففارەت واجب نیەو

وَلَوْ نَذَرَ صَوْمَ أَيَّامٍ نُدِبَ تَعْجِيلُهَا، فَإِنْ قَيَّدَ بِتَفْرِيقٍ أَوْ مُوَالاَةٍ وَجَبَ، وَإِلاَّ جَازَ، أَوْ سَنَةٍ مُعَيَّنَةٍ صَامَهَا وَأَفْطَرَ الْعِيدَ وَالتَّشْرِيقَ وَصَامَ رَمَضَانَ عَنْهُ وَلاَ قَضَاءَ، وَإِنْ أَفْطَرَتْ بِحَيْضٍ وَنِفَاسٍ وَجَبَ الْقَضَاءُ فِي الأَظْهَرِ، قُلْتُ: اَلأَظْهَرُ لاَ يَجِبُ، وَبِهِ قَطَعَ الْجُمْهُورُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَإِنْ أَفْطَرَ يَوْمًا بِلاَ عُذْرٍ وَجَبَ قَضَاؤُهُ وَلاَ يَجِبُ اِسْتِئْنَافُ سَنَةٍ،

---

لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، چونکە نەزرکردنی ئەوانە دروست نابێو تەنها نەزرکردنی خواپەرستیی‌سوننەت دروست دەبێ ﴿عن ابن عباس رضي الله عنهما: بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، إِذْ هُوَ بِرَجُلٍ قَائِمٍ فِي الشَّمْسِ، فَسَأَلَ عَنْهُ؟ فَقَالُوا: أَبُوإِسْرَائِيلَ نَذَرَ أَنْ يَقُومَ وَلاَ يَقْعُدَ وَلاَ يَسْتَظِلَّ وَلاَ يَتَكَلَّمَ، وَيَصُومُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مُرْهُ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ﴾ رواه الشيخان، (ابوإسرائيل) نەزری کردبو بە پێوە ڕابوەستێو دانەنیشێو نەچێتە بەر سێبەرو قسە نەکاو بەڕۆژوو بێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: فەرمانی پێبکە: با قسە بکاو بچێتە بەر سێبەرو دانیشێو ڕۆژووەکەشی تەواو بکا.
واتە: پێغەمبەرﷺ تەنها نەزرکردنی ڕۆژووی بە دامەزراو داناو ئەوانیتری پوچەڵ کردنو کەففارەتیشی لە سەر واجب نەکرد.
(وَلَوْ نَذَرَ صَوْمَ أَيَّامٍ) ئەگەر نەزری کرد چەند ڕۆژێك بەڕۆژوو بێ، ئەوە (نُدِبَ تَعْجِيلُهَا) سوننەتە پەلە بکا لە بەڕۆژووبوونەکاندا، تاکو زوو لە ئەستۆی لابکەون، ئینجا (فَإِنْ قَيَّدَ بِتَفْرِيقٍ أَوْ مُوَالاَةٍ) ئەگەر نەزری کردبێ بە پەرتکردن، یان بە دوای یەکدا بەڕۆژوو بێ، ئەو

کاتە (وَجَبَ) پەرتکردنەکە، یان بە دوایەکتریەکە واجب دەبێ (وَإِلاَّ) بەلاَم ئەگەر هیچیانی نەگوتبێ، ئەو کاتە (جَازَ) بە ویستی خۆی هەردووکیانی بۆ دروستن.

(أَوْ سَنَةٍ مُعَيَّنَةٍ) یان ئەگەر نەزری کرد ساڵێکی دیارکراو بەڕۆژوو ببێ: وەك ئەم ساڵێ، یان ساڵیداهاتوو، ئەوە (صَامَهَا) واجبە ساڵەکە بەڕۆژوو ببێ، بەلاَم (وَأَفْطَرَ الْعِيدَ وَالتَّشْرِيقَ) نابێ جەژنی ڕەمەزانو قوربانو سێ ڕۆژەکەی (أيام التَّشْريق) بەڕۆژوو ببێ، چونکە بەڕۆژووبوونی ئەو پێنج ڕۆژانە حەرامە (وَصَامَ رَمَضَانَ عَنْهُ وَلاَ قَضَاءَ) واجبە مانگی ڕەمەزانی ساڵەکەش لەجیاتی ڕەمەزانەکە بەڕۆژووبێو قەزاکردنەوەی ڕەمەزانەکەش لەجیاتی نەزرەکە واجب نیە، هەروەها (وَإِنْ أَفْطَرَتْ بِحَيْضٍ وَنِفَاسٍ) ئەگەر ئافرەتەکە بە هۆی حەیزو زەیسانی بەڕۆژوو نەبو، ئەو کاتە (وَجَبَ الْقَضَاءُ فِيالأَظْهَرِ) لە فەرمودەیەکدا واجبە قەزا بکاتەوە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (اَلأَظْهَرُ لاَ يَجِبُ وَبِهِ قَطَعَ الْجُمْهُورُ) بە فەرموودەی بەهێزتر واجب نیە ماوەی حەیزو زەیسانی لەجیاتی نەزرەکە قەزا بکاتەوە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

بەلاَم (وَإِنْ أَفْطَرَ يَوْمًا بِلاَ عُذْرٍ) ئەگەر ڕۆژێك بە بێعوزر بەڕۆژوو نەبێ، ئەو کاتە (وَجَبَ قَضَاؤُهُ) واجبە ڕۆژووەکە لە بری نەزرەکە قەزا بکاتەوەو (وَلاَ يَجِبُ اسْتِئْنَافُ سَنَةٍ) واجب

فَإِنْ شَرَطَ التَّتَابُعَ وَجَبَ فِالأَصَحِّ، أَوْ غَيْرَ مُعَيَّنَةٍ وَشَرَطَ التَّتَابُعَ وَجَبَ، وَلاَ يَقْطَعُهُ صَوْمُ رَمَضَانَ عَنْ فَرْضِهِ وَأَفْطَرَ الْعِيدَ وَالتَّشْرِيقَ وَيَقْضِيهَا تِبَاعًا مُتَّصِلَةً بِآخِرِالسَّنَةِ، وَلاَ يَقْطَعُهُ حَيْضٌ وَفِي قَضَائِهِ الْقَوْلاَنِ، وَإِنْ لَمْ يَشْرِطْهُ لَمْ يَجِبْ، أَوْ يَوْمِ الإِثْنَيْنِ أَبَدًا لَمْ يَقْضِ أَثَانِيَ رَمَضَانَ، وَكَذَا الْعِيدَ وَالتَّشْرِيقَ فِالأَظْهَرِ، فَلَوْ لَزِمَهُ صَوْمُ شَهْرَيْنِ تِبَاعًا لِكَفَّارَةٍ صَامَهُمَا وَيَقْضِي أَثَانِيهِمَا، وَفِي قَوْلٍ لاَ يَقْضِي إِنْ سَبَقَتِ الْكَفَّارَةُ النَّذْرَ،

---

نیە سەرلەبنیات دەست بە ساڵەکە بکاتەوە، بەلاَم (فَإِنْ شَرَطَ التَّتَابُعَ) ئەگەر لە نەزرکردنەکەدا بە مەرجی دانابێ: بە دوای یەکدا ساڵەکە بەڕۆژوو ببێ، ئینجا بێعوزر ڕۆژێك بەڕۆژوو نەبو، ئەو کاتە (وَجَبَ فِيالأَصَحِّ) واجبە سەرلەبنیات دەست بە ساڵەکە بکاتەوە، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(أَوْ غَيْرَ مُعَيَّنَةٍ وَشَرَطَ التَّتَابُعَ) یان ئەگەر نەزری کرد ساڵێکی دیارنەکراو بەڕۆژوو ببێو بە مەرجیشی دانا بە دوای یەکدا بێ: وەك (نەزر بێ ساڵێك بە دوای یەکدا بەڕۆژوو ببم). ئەوە (وَجَبَ) واجبە: بە دوای یەکدا ساڵێك بەڕۆژوو ببێ (وَلاَ يَقْطَعُهُ صَوْمُ رَمَضَانَ عَنْ فَرْضِهِ) بەڕۆژووبوونی ڕەمەزان بە نیەتی ڕەمەزان بەدوایەکتریەکە ناپچڕێنێو (وَأَفْطَرَ الْعِيدَ وَالتَّشْرِيقَ) نابێ جەژنەکانو (ايام التشريق)ش بەڕۆژوو ببێ، بەلاَم (وَيَقْضِيهَا تِبَاعًا) واجبە: ڕەمەزانەکەو جەژنەکانو (ايام التشريق) بە دوای یەکتردا لە جیاتی نەزرەکە قەزا بکاتەوە، چونکە ساڵێکی تەواو بۆ نەزرەکە بەڕۆژوو نەبوە، هەم (مُتَّصِلَةً بِآخِرِ السَّنَةِ) قەزاکردنەوەش

به كۆتایی ساڵەكەوە بنێو ناوبڕی نەبێ (وَلاَ يَقْطَعُهُ حَيْضٌ) حەیزو نیفاس بەدوایەكتریەكە ناپچـــڕێنێو (وَفِـــي قَضَـــائِهِ الْقَـــوْلاَنِ) لـــەبارەی قەزاكردنـــەوەی مـــاوەی حـــەیز دوو فەرموودەكەیڕابردوو هەنە، بەهێزەكەیان: واجب نیە قەزا بكاتەوە.

(وَإِنْ لَـمْ يَشْـرِطْهُ) وەئەگـەر بەدوایـەكتریی بـە مـەرج دانـەنابێ، ئـەو كاتـە (لَـمْ يَجِـبْ) بەدوایەكتری واجب نابێ، بەڵكو تەنها واجبە: سێسەدو شەست ڕۆژ بەڕۆژوو ببێ.

(أَوْ يَوْمِ الإِثْنَيْنِ أَبَدًا) یان ئەگەر نەزری كرد بەردەوام ڕۆژانی دووشەممە بەڕۆژوو ببێ، ئەوە (لَمْ يَقْضِ أَثَانِيَ رَمَضَانَ) واجب نیە دووشـەممەكانی ڕەمـەزان لـە جیـاتی نەزرەكـە قـەزا بكاتەوەو (وَكَذَا الْعِيدَ وَالتَّشْرِيقَ) هەروەها دووشەممەكانی جەژنو (أيام التشريق)ش واجب نیە لەجیاتی نەزرەكە قەزا بكاتەوە (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

بەڵام (فَلَوْ لَزِمَهُ صَوْمُ شَهْرَيْنِ تِبَاعًا لِكَفَّارَةٍ) ئەگەر بەڕۆژووبوونی دوو مانگان بەدوای یەكدا لە سەری واجـب ببـێ بـۆ كـەففارەتێك، ئـەو كاتـە (صَـامَهُمَا وَيَقْضِـي أَثَانِيهِمَـا) بـا دوو مانگەكان بۆ كەففارەتەكە بەڕۆژوو ببێو دووشەممەكانی ناو دوو مانگەكانیش قەزا بكاتەوە (وَفِي قَوْلٍ: لاَ يَقْضِي إِنْ سَبَقَتِ الْكَفَّارَةُ النَّذْرَ) لە فەرموودەیەكدا: دووشەممەكانی نـاو دوو مانگـەكان قـەزا ناكاتـەوە ئەگـەر واجببـوونی كەففارەتەكـە لـە پـێش نەزرەكـەدا ببـێ

قُلْـتُ: ذَا الْقَـوْلُ أَظْهَـرُ وَاللهُ أَعْلَـمُ. وَتَقْضِـي زَمَـنَ حَـيْضٍ وَنِفَـاسٍ فِـي الأَظْهَـرِ، أَوْ يَوْمًا بِعَيْنِهِ لَـمْ يَصُـمْ قَبْلَـهُ، أَوْ يَوْمًا مِنْ أُسْبُوعٍ ثُـمَّ نَسِيَهُ صَـامَ آخِرَهُ وَهُـوَ الْجُمُعَةُ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ هُوَ وَقَعَ قَضَاءً، وَمَنْ شَرَعَ فِي صَوْمِ نَفْلٍ فَنَذَرَ إِتْمَامَهُ لَزِمَهُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَإِنْ نَـذَرَ بَعْـضَ يَـوْمٍ لَـمْ يَنْعَقِـدْ، وَقِيـلَ: يَلْزَمُـهُ يَـوْمٌ، أَوْ يَـوْمَ قُـدُومِ زَيْـدٍ فَـالأَظْهَرُ اِنْعِقَـادُهُ، فَـإِنْ قَـدِمَ لَـيْلاً أَوْ يَـوْمَ عِيـدٍ أَوْ فِـي رَمَضَـانَ فَـلاَ شَـيْءَ عَلَيْـهِ، أَوْ نَهَـارًا وَهُوَ مُفْطِرٌ أَوْ صَائِمٌ قَضَاءً أَوْ نَذْرًا وَجَبَ يَوْمٌ آخَرُ عَنْ هَذَا، أَوْ وَهُوَ صَائِمٌ نَفْلاً

---

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (ذَا الْقَوْلُ أَظْهَرُ وَاللهُ أَعْلَمُ) ئـەم فـەرموودە دووەمـە بەهێزترە (وَتَقْضِي زَمَنَ حَيْضٍ وَنِفَاسٍ فِيالأَظْهَرِ) واجبە: ئافرەتیش دووشەممەكانی ماوەی حەیزو نیفـاس لـەجیاتی نەزرەكـە قـەزا بكاتـەوە، لـە فـەرموودەی بـەهێزتردا، بـەڵام لـە فەرموودەكەیتردا واجب نیە قەزا بكاتەوە.

(أَوْ يَوْمًا بِعَيْنِهِ) یان ئەگەر نەزری كرد ڕۆژێكی دیاركراو بەڕۆژوو ببێ، ئەوە (لَمْ يَصُمْ قَبْلَهُ) نابێ پێش ڕۆژەكە لەجیاتیی بەڕۆژوو ببێ، چونكە ڕۆژووەكە لەجیاتی ڕۆژە دیاركراوەكە دروست نابێ، جا ئەگەر لە ڕۆژەكەدا بەڕۆژوو نەبو، واجبە: قەزای بكاتەوە (أَوْ يَوْمًا مِنْ أُسْبُوعٍ ثُمَّ نَسِيَهُ) یان ئەگەر نەزری كرد ڕۆژێكیدیاركراو لە حەفتەیەكدا بەڕۆژوو ببێ، ئینجا ڕۆژەكەشی لەبیر چۆوە، ئەو كاتە (صَامَ آخِرَهُ وَهُـوَ الْجُمُعَةُ) بـا لـە كۆتـایی حەفتەكـەدا بەڕۆژوو ببێ: كە ڕۆژی هەینییە (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ هُوَ وَقَعَ قَضَاءً) جا ئەگەر نەزركراوەكە هەینی

نەبوبێ، ئەوە بۆی دەبێتە قەزاکردنەوەو نەزرەکەی لە سەر لادەکەوێ.
(وَمَنْ شَرَعَ فِی صَوْمِ نَفْلٍ) هەر کەسێك دەستی بە ڕۆژوویێکی سوننەت کرد (فَنَذَرَ إِتْمَامَـهُ) ئینجا نەزری کرد تەواوی بکا، ئەوە (لَزِمَهُ عَلَیالصَّحِیحِ) لە سەری واجبە تەواوی بکا، لـە سەر فەرمودەی ڕاست، بەڵام (وَإِنْ نَذَرَ بَعْـضَ یَـوْمٍ) ئەگـەر نـەزری کـرد بەشـێکی ڕۆژێـك بەڕۆژوو ببێ: وەك نیوەیی، ئەوە (لَمْ یَنْعَقِدْ) نەزرەکەی دانابەسترێ، بەڵام (وَقِیـلَ یَلْزَمُـهُ یَوْمٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: واجبە: ڕۆژێکیتەواو بەڕۆژوو ببێ.
(أَوْ یَوْمَ قُدُومِ زَیْدٍ) یان نەزری کرد ڕۆژی هاتنەوەی زەیـد بـەڕۆژوو ببـێ، ئـەوە (فَـالأَظْهَرُ انْعِقَادُهُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: نەزرەکەی دادەبەسترێ، ئینجا تەماشا دەکـەین: (فَـإِنْ قَدِمَ لَیْلاً أَوْ یَوْمَ عِیدٍ أَوْ فِی رَمَضَانَ)ئەگەر زەید لە شەویدا، یان لە ڕۆژی جەژندا، یان لە ڕەمەزاندا هاتەوە، ئەوە (فَلاَ شَيْءَ عَلَیْه) هیچی لە سـەر نیـە، چـونکە کـاتی هاتنەوەکـە قبوڵی بەڕۆژووبوون ناکا (أَوْ نَهَارًا وَهُوَ مُفْطِرٌ أَوْ صَائِمٌ قَضَاءً أَوْ نَذْرًا) یان زەید لە ڕۆژێدا هاتەوەو نەزرکەرەکەش بەڕۆژوو نەبو، یان بەڕۆژوو بوو بەڵام بە قەزا، یان لەجیاتی نەزرێك بوو، ئەو کاتە (وَجَبَ یَوْمٌ آخَرُ عَنْ هَذَا) واجبە ڕۆژێکیتر بە قەزا لەجیاتی ئەم ڕۆژە بەڕۆژوو ببێ (أَوْ وَهُوَ صَائِمٌ نَفْلاً) یان لە ڕۆژی هاتنەوی زەیدا نەزرکەرەکە بەڕۆژووی سوننەت بوو،

فَکَـذَلِكَ، وَقِیـلَ یَجِـبُ تَتْمِیمُـهُ وَیَکْفِیـه، وَلَـوْ قَـالَ: إِنْ قَـدِمَ زَیْـدٌ فَلِلَّـهِ عَلَـيَّ صَـوْمُ الْیَـوْمِ التَّـالِي لِیَـوْمِ قُدُومِـهِ وَإِنْ قَـدِمَ عَمْـرٌو فَلِلَّـهِ عَلَـيَّ صَـوْمُ أَوَّلِ خَمِـیسٍ بَعْـدَهُ، فَقَـدِمَا فِالأَرْبِعَـاءِ وَجَـبَ صَـوْمُ الْخَمِـیسِ عَـنْ أَوَّلِ النَّـذْرَیْنِ وَیَقْضِـاالآخَرَ.
(فَصْـلٌ) نَـذَرَ الْمَشْـيَ إِلَـی بَیْـتِ اللهِ أَوْ إِتْیَانَـهُ فَالْمَـذْهَبُ وُجُـوبُ إِتْیَانِـهِ بِحَـجٍّ أَوْ عُمْـرَةٍ، فَـإِنْ نَـذَرَ الإِتْیَـانَ لَـمْ یَلْزَمْـهُ مَشْـيٌ، وَإِنْ نَـذَرَ الْمَشْـيَ أَوْ أَنْ یَحُـجَّ أَوْ یَعْتَمِـرَ مَاشِـیًا فَـالأَظْهَرُ وُجُـوبُ الْمَشْـيِ، فَـإِنْ کَـانَ قَـالَ أَحُـجُّ مَاشِـیًا فَمِنْ حَیْثُ یُحْرِمُ، وَإِنْ قَالَ أَمْشِی إِلَی بَیْتِ اللهِ تَعَالَی فَمِنْ دُوَیْرَةِ أَهْلِهِ

---

ئەو کاتەش (فَکَذَلِكَ) واجبە: ڕۆژێکیتر بە قەزا لەجیاتی ئـەم ڕۆژە بـەڕۆژوو ببـێ (وَقِیـلَ: یَجِبُ تَتْمِیمُهُ وَیَکْفِیه) لەفەرموودەیەکی بێهێزدا: واجبە ڕۆژووە سوننەتەکە تەواو بکاو بەر نەزرەکەی دەکەوێ.
(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گوتی: (إِنْ قَدِمَ زَیْدٌ فَلِلَّهِ عَلَيَّ صَوْمُ الْیَوْمِ التَّالِي لِیَوْمِ قُدُومِه) ئەگەر زەید هاتەوە لە سەرم بێ بۆ خوا ڕۆژی دوای ڕۆژی هاتنەوەکەیی بەڕۆژوو ببمو (وَإِنْ قَدِمَ عَمْرٌو فَلِلَّهِ عَلَيَّ صَوْمُ أَوَّلِ خَمِیسٍ بَعْدَهُ) ئەگەر عەمریش هاتەوە لە سەرم نەزر بێ بۆ خوا یەکەم پێنج شەممەی دوای هاتنەوەکەیی بەڕۆژوو ببم (فَقَدِمَا فِیالأَرْبِعَاءِ) ئینجا زەیدو عەمر لـە ڕۆژی چوارشەممەدا هاتنەوە، ئەوە (وَجَبَ صَوْمُ الْخَمِیسِ عَنْ أَوَّلِ النَّـذْرَیْنِ) واجبـە: پێـنج شەممەکە لەجیاتی نەزرەکەی یەکەم بـەڕۆژوو ببـێو (وَیَقْضِـیالآخَرَ) واجبـە: نەزرەکـەی

دووەمیش قەزا بکاتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی نەزرکردنیحەج و عومرە ﴾

(نَذَرَ الْمَشْيَ إلى بَيْتِ اللهِ تعالى) ئەگەر نەزری کرد بە پیادەیی بڕواتە ماڵی خوا لە (مَكَّة)ی پیرۆز (أَوْ إِتْيَانَهُ) یان نەزری کرد بێتە ماڵی خوا، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ: وُجُوبُ إِتْيَانِهِ بِحَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب واجبە: بچێتە ماڵیخوا بە ئیحرام بەستراییەوە: بە حەج، یان بە عومرە، ئینجا (فَإِنْ نَذَرَ الإِتْيَانَ) ئەگەر تەنها هاتنی نەزر کردبێ، ئەوە (لَمْ يَلْزَمْهُ مَشْيٌ) واجب نیە بە پیادەیی بڕواتە ماڵیخوا، بەڵکو دروستە: بە سواری بڕوا، بەڵام (وَإِنْ نَذَرَ الْمَشْيَ) ئەگەر نەزری کردبێ بە پیادەیی بڕواتە ماڵیخوا (أَوْ أَنْ يَحُجَّ أَوْ يَعْتَمِرَ مَاشِيًا) یان نەزری کردبو بە پیادەیی حەج بکا، یان عومرە، ئەوە (فَالأَظْهَرُ وُجُوبُ الْمَشْيِ) بە فەرموودەی بەهێزتر واجبە: بە پیادەیی بڕواتە ماڵیخوا تاکو حەج و عومرەکە بکا.

ئینجا (فَإِنْ كَانَ قَالَ: أَحُجُّ مَاشِيًا) ئەگەر لە نەزرەکەیدا گوتبێتی: نەزر بێ بە پیادەیی حەج بکەم. ئەوە (فَمِنْ حَيْثُ يُحْرِمُ) لەو شوێنەوە کە ئیحرامی لێدەبەستێ، واجبە: بە پیادەیی بڕوا، بەڵام (وَإِنْ قَالَ: أَمْشِي إلى بَيْتِ اللهِ تَعَالَى) ئەگەر گوتبێتێ: نەزر بێ بە پیادەیی بڕۆمە ماڵیخوای گەورە، ئەوکاتە (فَمِنْ دُوَيْرَةِ أَهْلِهِ) واجبە لە خانولکەی ماڵ و منداڵیەوە فِي الأَصَحِّ، وَإِذَا أَوْجَبْنَا الْمَشْيَ فَرَكِبَ لِعُذْرٍ أَجْزَأَهُ وَعَلَيْهِ دَمٌ فِي الأَظْهَرِ، أَوْ بِلاَ عُذْرٍ أَجْزَأَهُ عَلَى الْمَشْهُورِ وَعَلَيْهِ دَمٌ، وَمَنْ نَذَرَ حَجًّا أَوْ عُمْرَةً لَزِمَهُ فِعْلُهُ بِنَفْسِهِ، فَإِنْ كَانَ مَعْضُوبًا اِسْتَنَابَ، وَيُنْدَبُ تَعْجِيلُهُ فِي أَوَّلِ الإِمْكَانِ، فَإِنْ تَمَكَّنَ فَأَخَّرَ فَمَاتَ حُجَّ مِنْ مَالِهِ، وَإِنْ نَذَرَ الْحَجَّ عَامَهُ وَأَمْكَنَهُ لَزِمَهُ،

---

بە پیادەیی بڕواتە ماڵی خوا بۆ حەج و عومرە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَإِذَا أَوْجَبْنَا الْمَشْيَ) هەر کاتێك ڕۆیشتن بۆ حەج و عومرە بە پیادەیی لە سەر نەزرکەرەکە واجب بکەین (فَرَكِبَ لِعُذْرٍ) ئینجا بە هۆی عوزرێك سواری وولاغ، یان ئۆتۆمبیل، یان فڕۆکە بوو، ئەوە (أَجْزَأَهُ) حەج و عومرەکەی لەجیاتی نەزرەکەی دروست دەبێ، بەڵام (وَعَلَيْهِ دَمٌ فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: خوێنی نەکردنی نەزرکراوەکەی لە سەر واجب دەبێ (أَوْ بِلاَ عُذْرٍ) یان بە بێ عوزر بە سواری ڕۆیشتە حەج، ئەو کاتەش (أَجْزَأَهُ عَلَىالْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەیناسراوی مەزهەب: حەج و عومرەکەی لەجیاتی نەزرەکەی دروست دەبن، بەڵام (وَعَلَيْهِ دَمٌ) لێرەشدا خوێنی لە سەر واجب دەبێ، ئینجا خوێنەکەش لە هەردوو مەسەلەدا: بزنێك ، یان مەڕێکە، جا ئەگەر دەستی نەکەوت، واجبە: سێ ڕۆژ لە حەج و حەفت ڕۆژیش لە ماڵەوە بەڕۆژوو بێ.

جا بزانە: لە دوو فەرموودەکەیتردا: لە هیچێك لەو دوو مەسەلانەدا خوێنی لە سەر واجب نابێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَمَنْ نَذَرَ حَجًّا أَوْ عُمْرَةً) هەر كەسێك نەزری كرد حەج، یان عومرە بكا، ئەوە (لَزِمَهُ فِعْلُهُ بِنَفْسِهِ) لە سەری واجبە بەخۆی حەجو عومرە بكا (فَإِنْ كَانَ مَعْضُوبًا) جا ئەگەر پەككەوتوو بێ، ئەو كاتە (اِسْتَنَابَ) یەكێك لەجیاتی خۆی دادەنێ حەجو عومرەی بۆ بكا: بە پارە، یان بە خۆڕایی (وَيُنْدَبُ تَعْجِيلُهُ فِي أَوَّلِ الإِمْكَانِ) سوننەتە بە پەلە حەجو عومرەكە بكا لە یەكەمین ئەو ساڵانەدا: كە—لە دوای نەزرەكە— بۆی دەگونجێ (فَإِنْ تَمَكَّنَ فَأَخَّرَ فَمَاتَ) جا ئەگەر بۆی گونجا حەجی نەزركراو بكا، بەڵام دوای خستو نەیكرد، ئینجا مرد، ئەو كاتە (حُجَّ مِنْ مَالِهِ) واجبە: لە میراتەكەی حەجە نەزركراوەكەی بۆ بكری، بەڵام ئەگەر پێش مردن بۆی نەگونجابێ، ئەو كاتە واجب نیە بۆی بكرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَإِنْ نَذَرَ الْحَجَّ عَامَهُ) ئەگەر نەزری كرد لەم ساڵەیدا حەج بكا، یان ساڵێكیتری دیاری كرد (وَأَمْكَنَهُ) بۆیشی گونجا حەج بكا، ئەوە (لَزِمَهُ) لە سەری واجبە: لەم ساڵەدا حەجەكە بكا، جا ئەگەر لەم ساڵەدا نەیكرد، واجبە لە ساڵێكیتردا قەزای بكاتەوە، جا ئەگەر مرد، واجبە: لە میراتەكەی بۆی قەزا بكرێتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

جا بزانە: ئەگەر حەجی ڕوكنیئیسلامی نەكردبێو لەم ساڵەشدا بە نیەتی نەزرەكەی حەج بكا، ئەو كاتە ئەم حەجەی بۆ دەبێتە ڕوكنیئیسلام، هەروەك لە (تحفە)و (مغنی)دا

فَإِنْ مَنَعَهُ مَرَضٌ وَجَبَ الْقَضَاءُ، أَوْ عَدُوٌّ فَلاَ فِي الأَظْهَرِ، أَوْ صَلاَةً أَوْ صَوْمًا فِي وَقْتٍ فَمَنَعَهُ مَرَضٌ أَوْ عَدُوٌّ وَجَبَ الْقَضَاءُ، أَوْ هَدْيًا لَزِمَهُ حَمْلُهُ إِلَى مَكَّةَ وَالتَّصَدُّقُ بِهِ عَلَى مَنْ بِهَا، أَوِ التَّصَدُّقَ عَلَى أَهْلِ بَلَدٍ مُعَيَّنٍ لَزِمَهُ،

---

فەرموویانە، كەواتە: لە سەری واجبە: لەجیاتی نەزرەكەی حەجێكیتر بە قەزا لە ساڵێكیتردا بكا، بەڵام ئەگەر لە ساڵەكەدا بە نیەتی ڕوكنیئیسلام حەجەكە بكا، ئەو كاتەش حەجی ڕوكنیئیسلامی دروست دەبێو هەم نەزرەكەشی لە سەر لادەكەوێ، هەروك لە (بجیرمی)دا روون كراوەتەوە.

(فَإِنْ مَنَعَهُ مَرَضٌ) جا ئەگەر لە دوای ئیحرامبەستن بە هۆی نەخۆشی نەگونجا لە ساڵەكەدا حەج تەواو بكا، ئەو كاتە (وَجَبَ الْقَضَاءُ) واجبە: حەجەكە قەزا بكاتەوە، بەڵام (أَوْ عَدُوٌّ) ئەگەر لە دوای ئیحرامبەستن دوژمنێك قەدەغەی كرد حەج تەواو بكا، ئەو كاتە (فَلاَ فِيالأَظْهَرِ) قەزاكردنەوەی لە سەر نیە، لە فەرموودەی بەهێزتردا، هەروەها ئەگەر لە ساڵە دیاركراوەكەدا بۆی نەگونجا حەج بكا، ئەو كاتە نەزرەكەی لە سەر لادەكەوێو قەزاكردنەوەی لە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(أَوْ صَلاَةً أَوْ صَوْمًا فِي وَقْتٍ) یان ئەگەر نەزری كرد نوێژێك، یان ڕۆژوویێك لە كاتێكی دیاركراودا بكا (فَمَنَعَهُ مَرَضٌ أَوْ عَدُوٌّ) ئینجا نەخۆشی، یان دوژمنێك قەدەغەی كردو نوێژو ڕۆژووەكەی نەكرد، ئەو كاتە (وَجَبَ الْقَضَاءُ) واجبە قەزا بكاتەوە.

## ﴿ نەزركردنی خێرێك لە شوێنێكی دیاركراودا، گواستنەوەی نەزر بۆ شوێنێكیتر ﴾

(أَوْ هَدْيًا) یان نەزری كرد مەڕێك، یان خۆراكێك، یان جلو بەرگێك بە دیاری بباتە (مكّة)ی پیرۆز، ئەوە (لَزِمَهُ حَمْلُهُ إِلَى مَكَّةَ) لە سەری واجبە: دیاریەكە بباتە حەرەمی (مكّة)، هەم (وَالتَّصَدُّقُ بِهِ عَلَى مَنْ فِيهَا) واجبە: دیاریەكەش بە خێر بداتە گەداو هەژارەكانی ناو حەرەمی (مكّة)، هەرچەند خەڵكی (مكّة)ش نەبن، جا ئەگەر دیاریەكە ووشترو مەڕو بزنو مانگا بێ، واجبە لە حەرەمی (مكّة)دا سەری ببڕێو گۆشتەكەی بداتە گەداو هەژارەكانی (مكّة)، هەروەك لەسەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(أَوِ التَّصَدُّقَ عَلَى أَهْلِ بَلَدٍ مُعَيَّنٍ) یان نەزری كرد شتێك بە خێر بداتە دانیشتووانی شارێكی دیاركراو، یان نەزری كرد ئاژەڵێك لە شوێنێكدا بكاتە خێر، یان قوربانی لە شوێنێكدا بكا، یان نەزری كرد مەڕێك لە شوێنێكدا سەر ببڕێو مەبەستیشی خێركردن بوو، ئەوە (لَزِمَهُ) لە سەری واجبە: خێرەكە لەو شوێنە دیاركراوەدا بكاو هەم واجبە: ئاژەڵەكەش لە شوێنەكەدا سەر ببڕێو گۆشتەكەشی –وەكو خێرەكە– بداتە گەداو هەژارەكانی شوێنەكە، بە بەڵگەی حەدیسەكەیداهاتوو، هەم ﴿قَالَتْ اِمْرَأَةٌ: يَارَسُولَ اللهِ إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَنْحَرَ بِمَكَانِ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: لِصَنَمٍ...لِوَثَنٍ؟ قَالَتْ: لاَ. قَالَ: أَوْفِي بِنَذْرِكِ﴾ رواه أبوداود والترمذي بسند صحيح، أَوْ صَوْمًا فِي بَلَدٍ لَمْ يَتَعَيَّنْ، وَكَذَا صَلاَةً

---

ئافرەتێك گوتی: نەزرم كردوە لە فلانە شوێنەدا ئاژەڵ سەر ببڕم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆ بتو سەنەم؟ ئافرەتەكە گوتی: نا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نەزرەكەت بەجێ بێنە.

كەواتە: دروست نیە: خێرەكەو گۆشتەكە بداتە دەوڵەمەندەكانو كافرەكانی شوێنەكە، هەم دروست نیە بەخۆیو ژنو منداڵەكانیشی هیچ بەشێك لە خێرەكەو لە گۆشتەكە بخۆن. هەم دروستیش نیە–لەو شوێنەی بۆ نەزرەكە دیاركراوە– بگواسترێتەوە بۆ شوێنێكیتر، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا ڕوون كراوەتەوە، بەڵام ئەگەر هیچ شوێنێكی دیاری نەكردبێ، ئەو كاتە دروستە نەزركراوەكەی بگوازێتەوە بۆ شوێنێكیتر–بەو مەرجەی قوربانیینەزركراو نەبێ– هەروەك لە (باسی گواستنەوەی زەكات)دا ڕوون كراوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ووشەی (لِصَنَمٍ، لِوَثَنٍ) لە حەدیسەكەدا، هەم حەدیسەكەیداهاتووش بەڵگەیە: ئەگەر نەزركردنی خێرو سەربڕینی ئاژەڵ لە شوێنێكدا گوناهی تێدا بێ، یان بیروەوەریەكی ناشەرعیی تێدا بێ، ئەو كاتە نەزرەكە دانامەزرێ، كەوابو: نەزركردن بۆ زیارەتگاو گۆڕی پیاوچاكان: ئەگەر مەبەستی بە گەورە دانانی گۆڕەكە بێ، یان مەبەستی خۆ نزیككردنەوە بێ لە پیاوچاكەكە، یان باوەڕی وابێ: نەزركردن بۆ ئەو گۆڕەو پیاوچاكە بەڵای لە سەر لادەدا، ئەو نەزرە بەتاڵەو دانامەزرێ، كەوابو: ئەگەر شتێك لەو نەزركراوە لە زیارەتگایەكەدا هەبێ، واجبە: بدرێتەوە خاوەنەكەی، یان میراتگرەكانی، جا ئەگەر

خاوەنەکەی نەزاندرا، ئەو کاتە لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف دەکرێ، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿عن ثابت﴾ نَذَرَ رَجُلٌ أَنْ يَنْحرَ إِبِلاً بِبَوَانَةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: هَلْ كَانَ فِيهَا صَنَمٌ يُعْبَدُ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: فَهَلْ كَانَ فِيهَا عِيدٌ مِنْ أَعْيَادِهِمْ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: أَوْفِ بِنَذْرِكَ﴾ رواه ابوداود والطبراني بإسناد صحيح، پیاوێك نەزری کرد ووشترێك لە (بوانە)دا سەر ببڕێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایا لەو شوێنەدا هیچ سەنەمێك هەبوە بپەرسترێ؟ گوتی: نا. فەرمووی: هچ جەژنێکی کافرەکان لەو شوێنەدا دەکرا؟ گوتی: نا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نەزرەکەت بەجێ بێنە.

(أَوْ صَوْمًا فِي بَلَدٍ) یان نەزری کرد لە شارێکیدیارکراودا بەڕۆژوو بێ، ئەوە واجبە بەڕۆژوو بێ، بەلاّم (لَمْ يَتَعَيَّنْ) مەرج نیە لە شوێنە دیارکراوەکەدا بەڕۆژوو بێ (وَكَذَا صَلاَةٌ) هەروەها ئەگەر نەزری کرد لە شوێنێکیدیارکراودا نوێژێکی واجب، یان سوننەت بکا، ئەوەش مەرج نیە لە شوێنەکەدا نوێژەکە بکا.

هەروەها ئەگەر نەزری کرد نوێژێکیفەرز لە مزگەوتێکیدیارکراودا بکا، ئەو کاتە واجبە: نوێژەکە لە مزگەوتێکدا بکا، بەلاّم مەرج نیە لە مزگەوتە دیارکراوەکەدا بیکا



إِلاَّ الْمَسْـجِدَالْحَرَامَ، وَفِـي قَـوْلٍ قُلْـتُ: اَلأَظْهَـرُ تَعْيِينُهُمَـا كَالْمَسْـجِدِالْحَرَامِ وَ أَوْ أَيَّامًا فَثَلاَثَةٌ، أَوْ صَدَقَةً فَبِمَا كَانَ، أَوْ صَلاَةً فَرَكْعَتَانِ، وَفِي قَوْلٍ رَكْعَةٌ، فَعَلَىالأَوَّلِ يَجِبُ الْقِيَامُ فِيهِمَا مَعَ الْقُدْرَةِ، وَعَلَىالثَّانِي لاَ، أَوْ عِتْقًا فَعَلَى الأَوَّلِ رَقَبَةٌ كَفَّارَةٍ، وَعَلَىالثَّانِي رَقَبَةٌ، قُلْتُ: اَلثَّانِي هُنَا أَظْهَرُ وَاللهُ أَعْلَمُ. أَوْ عِتْقَ كَافِرَةٍ مَعِيبَةٍ أَجْزَأَهُ كَامِلَةٌ،

---

(إِلاَّ الْمَسْجِدَالْحَرَامَ) تەنها ئەگەر لە نەزرەکەدا (اَلْمَسْجِدُالْحَرامَ)ی دیاری کردبێ، ئەو کاتە واجبە لە وێدا نوێژەکە بکاو لە شوێنێکیتردا بەر ناکەوێ (وَفِي قَوْلٍ: وَمَسْجِدَالْمَدِينَةِ وَالأَقْصَى) لە فەرموودەیەکدا: ئەگەر نەزری کرد لە مزگەوتی پێغەمبەرداوﷺ لە (مَسْجِدِالأَقْصَى)دا نوێژ بکا، ئەو کاتەش واجبە: لەو دووانەدا نوێژەکە بکا.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) فەرموویەتی (اَلأَظْهَرُ تَعْيِينُهُمَا كَالْمَسْجِدِالْحَرَامِ وَاللهُ أَعْلَمُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: مزگەوتی پێغەمبەرﷺ (مَسْجِدالأَقْصَى) بە نەزرکردن وەکو (اَلْمَسْجِدالحرام) لە سەری واجب دەبن، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَتُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِدِالْحرامِ، وَمَسْجِدِيهَذَا، وَمَسْجِدِالأَقْصَى﴾ رواه الشيخان، بۆ خواپەرستی بارگەی سەفەر ناپێچرێتەوە، تەنها بۆ سێ مزگەوتان دەپێچرێتەوە: بۆ (اَلْمَسْجِدُالْحَرام) لە (مكة)، بۆ ئەم مزگەوتەی من لە (مدينة)، بۆ (مَسْجِدِالأَقْصَى) لە

(فَلَسْطِين).

(أَوْ صَوْمًا مُطْلَقًا) یان بێ گوتنی ژمارە نەزری کرد بەڕۆژوو بێ، ئەوە (فَیَوْمٌ) تەنها ڕۆژێکی لە سەر واجب دەبێ (أَوْ أَیَّامًا) یان نەزری کرد چەند ڕۆژێك بەڕۆژوو بێ، ئەو کاتە (فَثَلاَثَةٌ) سێ ڕۆژووی لە سەر واجب دەبن (أَوْ صَدَقَةً) یان نەزری کرد خێرێك بکا، ئەوەش (فَبِمَا كَانَ) بە هەر شتێکی کەم-کە بە ماڵ دابندرێ- خێرەکەی دروست دەبێ (أَوْ صَلاَةً) یان نەزری کرد نوێژێك بکا، ئەوە (فَرَكْعَتَانِ) دوو ڕەکعەتی لە سەر واجب دەبن (وَفِي قَوْلٍ رَكْعَةٌ) لە فەرموودەیەکدا: تەنها ڕەکعەتێکی لە سەر واجب دەبێ (فَعَلَى الأَوَّلِ) جا لە سەر فەرموودەیەکەم (یَجِبُ الْقِیَامُ فِیهِمَا مَعَ الْقُدْرَةِ) واجبە: بە پێوە دوو ڕەکعەتەکان بکا، ئەگەر تواناى هەبێ (وَعَلَى الثَّانِي لاَ) لە سەر فەرموودەی دووەمیش واجب نیە بە پیوە بیکا.

(أَوْ عِتْقًا) یان نەزری کرد کۆیلەیەك ئازاد بکا، ئەوە (فَعَلَى الأَوَّلِ: رَقَبَةُ كَفَّارَةٍ) لە سەر فەرموودەی یەکەم واجبە کۆیلەیەکی کەففارەت ئازاد بکا (وَعَلَى الثَّانِي رَقَبَةٌ) لە سەر فەرموودەی دووەمیش: هەر کۆیلەیەك ئازاد بکا، دروستە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (الثَّانِي هُنَا أَظْهَرُ وَاللهُ أَعْلَمُ) فەرموودەیدووەم-لێرەدا- بەهێزترە (أَوْ عِتْقَ مَعِیبَةٍ كَافِرَةٍ) یان نەزری کرد کۆیلەیەکی کافری عەیبدار ئازاد بکا، ئەو کاتە (أَجْزَأَهُ كَامِلَةٌ) فَإِنْ عَيَّنَ نَاقِصَةً تَعَيَّنَتْ، أَوْ صَلاَةً قَائِمًا لَمْ يَجُزْ قَاعِدًا، بِخِلاَفِ عَكْسِهِ، أَوْ طُولَ قِرَاءَةِ الصَّلاَةِ، أَوْ سُورَةً مُعَيَّنَةً، أَوْ الْجَمَاعَةَ لَزِمَهُ، وَالصَّحِيحُ انْعِقَادُ النَّذْرِ بِكُلِّ قُرْبَةٍ لاَ تَجِبُ ابْتِدَاءً كَعِيَادَةٍ وَتَشْيِيعِ جِنَازَةٍ وَالسَّلاَمِ.

---

دروستە کۆیلەیەکی موسوڵمانی بێعەیب ئازاد بکا، بەڵام (فَإِنْ عَيَّنَ نَاقِصَةً) ئەگەر کۆیلە کافرو عەیبدارەکەی دیاری کردبێ، ئەو کاتە (تَعَيَّنَتْ) واجبە هەر دیارکراوەکە ئازاد بکا.

### ﴿ ئاگاداری: لەبارەی گۆڕینی نەزرکراوەکە ﴾

ئەگەر نەزری کرد مەڕێك بکاتە خێر، ئەوە دروستە ووشترێك، یان مانگایەك لەجیاتی بکاتە خێر، بەڵام ئەگەر دیاری کردبێ: وەك نەزر بێ ئەم مەڕە بکەمە خێر، ئەو کاتە واجبە: خودی مەڕەکە بکاتە خێرو دروست نیە ووشترو مانگایەکی لەجیاتی بکاتە خێر، هەروەك لە (المجموع) و (تحفە)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا بزانە: لە مەزهەبی(حنفی)دا دروستە لەجیاتی شتیﻧەزرکراو نرخیﻧەزرکراوەکە بکاتە خێر: وەك نەزری کردبێ دوو مەڕی ناوەنجی بکاتە خێر، جا لەجیاتیهەردووکیان مەڕێکی گەورەو قەڵەو-کە بە قەد نرخی هەردووکیان بێ- بکاتە خێر، یان لەجیاتی نان نرخی نانەکە بکاتە خێر، بەڵام لە (هَدْي)حەج و لە قوربانیدا دروست نیە نرخەکەیان بکاتە خێر، هەروەك لە سەرەتای زەکات لە (الإختیار)و (مجمع الأنهر)دا ڕوون کراوەتەوە.

(أَوْ صَلاَةً قَائِمًا) یان نەزری كرد بە پێوە نوێژێكی سوننەت بكا، ئەوە (لَمْ يَجُزْ قَاعِدًا) بە دانیشتوویی دروست نیە (بِخِلاَفِ عَكْسِهِ) بەلاَم بە پێچەوانەوە دروستە، واتە: لەجیاتی دانیشتن بە پێوە بیكا، چونكە خێرترە.

(أَوْ طُولَ قِرَاءَةِ الصَّلاَةِ) یان نەزری كرد خوێندنی ناو نوێژ درێژ بكاتەوە (أَوْ سُورَةً مُعَيَّنَةً) یان سورەتێكی دیاركراو لە نوێژدا بخوێنێ (أَوِ الْجَمَاعَةَ) یان نەزری كرد بە جەماعەت بیكا، ئەوە (لَزِمَهُ) لە گشت مەسەلەكاندا نەزركراوەكەی لە سەر واجب دەبێ.

(وَالصَّحِيحُ) بەفەرموودەی ڕاست (انْعِقَادُ النَّذْرِ بِكُلِّ قُرْبَةٍ لاَ تَجِبُ ابْتِدَاءً) نەزركردن بە گشت خواپەرستیەك دادەبەسترێ كە لە سەرەتاوە واجب نەبێ: (كَعِيَادَةٍ وَتَشْيِيعِ جِنَازَةٍ وَالسَّلاَمِ) وەك سەردانی نەخۆش‌و ئامادەبوونی ناشتنی جەنازەو سەلامكردن.

﴿ **پاشكۆ** ﴾: ئەگەر كەسێك مردو نەزرێكی لە سەر بوو، ئەوە لە سەر میراتگرەكەی واجبە: لە میراتەكەی نەزرەكەی بۆ قەزا بكاتەوە ﴿عن ابن عباس رضي‌الله عنهما: إِسْتَفْتَى سَعْدُ بن عبادة رَسُولَ اللهِﷺ فِى نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ تُوُفِّيَتْ قَبْلَ قَضَائِهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: فَاقْضِهِ عَنْهَا﴾ رواه الشيخان، (سعد) پرسیاری كرد: لەبارەی نەزرێك كە لە سەر دایكی بوو، دایكیشی مردبو پێش ئەوەی نەزركراوەكەی بكا؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ نەزركراوەكە بۆ دایكت قەزا بكەوە.

## (كِتَابُ الْقَضَاءِ)

---

### ﴿ كِتَابُ الْقَضَاءِ: **پەرتوكی دادكردن لە نێوان خەڵكدا** ﴾

واتە: بڕاندنەوەی كێشەی نێوان خەڵك بەگوێرەی شەرعی خوای گەورە: كە لە قورئان‌و حەدیس‌و (إجماع)و (قیاس) وەرگیراوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللهُ﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ ئێمە ئەم قورئانەمان بەڕاستیەوە بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە تاكو داد لە نێوان خەڵكدا بكەی بەو شەرعەی خوا فێری تۆی كردوە.

هەروەها ﴿عن مُعاذﷺ لَمَّا بَعَثَهُ النَّبِيُّﷺ إِلَى الْيَمَنِ قالَ لَهُ: كَيْفَ تَقْضِي؟ قالَ: أَقْضِي بِمَا فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى. قالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي كِتابِ اللهِ؟ قَالَ: فَبِسُنَّةِ رَسُولِ اللهِﷺ. قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِﷺ؟ قَالَ: أَجْتَهِدُ رَأْيِي. قَالَ: اَلْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذى وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللهِﷺ﴾ رواه الترمذي وابوداود بسند صالح، كە پێغەمبەرﷺ (مُعاذ)ی ناردە (يَمَنْ)، پێی فەرموو: بە چی داد لە نێوان خەڵكدا دەكەی؟ (معاذ) گوتی: بە قورئانی پیرۆز. فەرمووی: ئەگەر ڕووداوەكە لە قورئاندا نەبو؟ گوتی: ئەو كاتە بە حەدیسەكانی پێغەمبەرﷺ. فەرمووی: ئەگەر لە حەدیسیشدا نەبو؟ گوتی: ئەو كاتە بە بۆچوونی‌خۆم (إجْتِهاد) لە ڕووداوەكەدا دەكەم. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: حەمدو شوكر بۆ ئەو خوایەی نێردراوی

پێغەمبەری خوای گەیاندۆتە ڕێگایەکی ڕاست.

جا بزانە: ئەو کەسەی داد لە نێوان خەڵکدا دەکاو کیشەکانیان دەبڕێنێتەوە، پێی دەگوترێ: (قازی)=دادوەر، کەواتە: هەر قازییێك=دادوەرێك–جگە لە شەرعیئیسلام–بە یاسای دەستکرد داد لە نێوان خەڵکدا بکا، ئەوە گوناهبارەو گشت بڕیارەکانی ڕەد دەکرێنەوە، هەرچەند لەگەڵ ڕاستیشدا تێك بکەنەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾...﴿ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ هەر کەسانێك داد نەکەن بەو قورئانەی خوا ناردویەتیە خوارەوە، ئەوانە (ظالم)ن ستەمکارن...فاسقن.

جا ئەوە لە حاڵەتێکدایە کە دادکەرەکە باوەڕی بە شەرعی قورئان هەبێو ڕەفتاری پێنەکا، چونکە ئەگەر باوەڕیشی پێنەبێ ئەوە کافرە، هەروەك لە ئایەتەکەیتردا دەفەرموێ: ﴿فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ ئەوانە کافرن. هەروەك لە (تفسير ابن كثير)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْقُضَاةُ ثَلاَثَةٌ، واحِدٌ فِالْجَنَّةِ وَاثْنَانِ فِالنّارِ: رَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ فَقَضَى بِهِ فَهُوَ فِالْجَنَّةِ، وَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ فَجَارَ فِالْحُكْمِ فَهُوَ فِالنَّارِ، وَرَجُلٌ لَمْ يَعْرِفِ الْحَقَّ فَقَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ فَهُوَ فِالنَّارِ﴾ حديث صحيح رواه اصحاب السنن، سێ جۆرە قازی هەنە، یەکێکیان لە بەهەشتدایەو دووانیان لە دۆزەخدانە، یەکەم: ئەو

هُوَ فَرْضُ كِفَايَةٍ، فَإِنْ تَعَيَّنَ لَزِمَهُ طَلَبُهُ، وَإِلاَّ

---

پیاوەیە ڕاستی–شەریعەتیئیسلام– بزانێو بە شەریعەتیئیسلام داد بکا، ئەمەیان لە بەهەشتدایە. دووەم: ئەو پیاوەیە ڕاستی–شەریعەتیئیسلام– بزانێو ڕەفتاری پێنەکا، ئەمە لە دۆزەخدایە. سێیەم: ئەو پیاوەیە شەریعەتیئیسلام نەزانێو بە نەزانی بڕیار بۆ خەڵکی بدا، ئەمەش لە دۆزەخدایە.

کەواتە: واجبە بەڕێوەبردنی دەوڵەتو گشت بڕیاردانێكو دادکردنێك بەگوێرەی شەرعی ئیسلام بێ؟ چونکە ئیسلام: ئایینو دەوڵەتە، کەوابو: جیاوازی نیە کاروباری کۆمەڵایەتیو خێزانی بێ، یان ئابووریو بازرگانی بێ، یان جەنگو ئاشتی بێ، یان...هتد، خوای گەور دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لايَعْلَمُونَ﴾ ئینجا–ئەی پێغەمبەرﷺ– تۆمان هێنا سەر شەریعەتێك لە کاروباریئیسلام، کەوابو: شوێن ئەو شەریعەتەی ئیسلام بکەوەو شوێن هەواو هەوەسی ئەو کەسانە مەکەوە کە شەریعەتیئیسلام نازانن.

کەواتە: خوای گەورە ڕازی نابێ بەشێکی کاروبارەکان بەگوێرەی شەرعیئیسلام بێو بەشێکیشی بە پێچەوانەی شەرعیئیسلام–بە یاسای دەستکرد– بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوائَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ

عَنْ بَعْضِ ما أَنْزَلَ اللهُ﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ داد لە نێوان خەڵکدا بکە بەو شەرعەی خوا بۆی ناردویە خوارەوە، شوێن هەواو هەوەسی خەڵکەکە مەکەوەو لێیان بترسە نەوەك لاتبدەن لە بەشێکی ئەو شەرعەی خوا ناردویەتیە خوارەوە.

واتە: (أَهْواء ) لە هەردوو ئایەتەکەدا ئەو یاسا دەستکردانەیە: کە خەڵك بەگوێرەی هەواو هەوەسی خۆیان دایاندەنێن‌و ڕەفتاری پێدەکەن.

ئینجا بزانە: ئەگەر چەند کەسێك هەبون شیاوی ئەوە بوون ببنە قازی، ئەو کاتە (هُوَ فَرْضُ كِفَايَةٍ) قبوڵکردنی بوونە قازی بە (فَرْضُ الْكِفَايَةِ) واجبە لە سەر گشت ئەوانەی بە کەڵك دێن، بەڵکو ئیمامی (الغزالی) فەرمویەتی: (بوونە قازی لە (جِهادِ)ش خێرترە). واتە: چونکە پێغەمبەرﷺ (الخُلَفَاءُ الرّاشِدُون)رضي‌الله عنهم چەند کەسێکیان بە قازی ناردونەتە چەند شوێنێك، هەم بڕاندنەوەی کێشەی نێوان خەڵکیش واجبە.

کەواتە: ئەگەر ئەو کەسانەی بۆ قازیەتی دەگونجێن هیچێکیان قبوڵیان نەکرد ببێتە قازی، ئەو کاتە هەموویان گوناهبار دەبن‌و واجبە: پێشەوای موسوڵمانان یەکێکیان بە زۆرلێکردن بکاتە قازی، واتە: بە زوبان بڵێ: (فلانکەس تۆم کردە قازی). یان (دادوەر لە فلانە شوێنەدا). ئینجا مەرجە ئەویش بە زوبان بڵێ: قبوڵم کرد.

(فَإِنْ تَعَيَّنَ) جا ئەگەر تەنها یەك کەس لە شوێنەکەدا بۆ قازیەتی دەگونجا، ئەو کاتە (لَزِمَهُ طَلَبُهُ) لە سەری واجبە: بەخۆی داوا بکا بکرێتە قازی (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر

فَإِنْ كَانَ غَيْرُهُ أَصْلَحَ وَكَانَ يَتَوَلاَّهُ فَلِلْمَفْضُولِ الْقَبُولُ، وَقِيلَ: لاَ، وَيُكْرَهُ طَلَبُهُ، وَقِيلَ: يَحْرُمُ، وَإِنْ كَانَ مِثْلَهُ فَلَهُ الْقَبُولُ، وَيُنْدَبُ الطَّلَبُ إِنْ كَانَ خَامِلاً يَرْجُو بِهِ نَشْرَ الْعِلْمِ أَوْ مُحْتَاجًا إِلَى الرِّزْقِ، وَإِلاَّ فَالأَوْلَى تَرْكُهُ، قُلْتُ: وَيُكْرَهُ عَلَى الصَّحِيحِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَالإِعْتِبَارُ فِي التَّعَيُّنِ وَعَدَمِهِ بِالنَّاحِيَةِ،

---

کەسانیتریش هەبون، ئەو کاتە (فَإِنْ كَانَ غَيْرُهُ أَصْلَحَ وَكَانَ يَتَوَلاَّهُ) ئەگەر یەکێکی لەخۆی گونجاوتر هەبو و قبوڵیشی دەکرد بیکەنە قازی، ئەو کاتە (فَلِلْمَفْضُولِ الْقَبُولُ) بۆ گونجاوەکەش دروستە قبوڵ بکا بیکەنە قازی (وَقِيلَ: لاَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر گونجاوترەکە قبوڵ بکا، دروست نیە گونجاوەکە قبوڵ بکا.

(وَيُكْرَهُ طَلَبُهُ) ناپەسندە: پیاو داوا بکا بیکەنە قازی، ئەگەر لەخۆی گونجاوتر هەبێ (وَقِيلَ يَحْرُمُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لەوحاڵەتەدا حەرامە داوا بکا، بەڵام (وَإِنْ كَانَ مِثْلَهُ) ئەگەر پیاوەکەیتر گونجاوتر نەبو، بەڵکو ئەویش وەکو وی بوو، ئەو کاتە ئەگەر داوایان لێکرد ببێتە قازی (فَلَهُ الْقَبُولُ) بۆی دروستە: قبوڵ بکاو ناپەسندیش نیە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَتَسْأَلِ الإِمَارة فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْئَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْئَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا﴾ رواه الشيخان، داوای کاربەدەستی مەکە،

چونكه ئەگەر بە داواكردنی خۆت كاربەدەستیت بدرێتێ، ئەوە تۆ دەدرێیە دەست خۆت‌و كارەكەت، بەڵام ئەگەر بێ‌داواكردن بتدرێتێ، ئەو كاتە لە سەر كارەكەت یارمەتیت دەدرێ.

(وَيُنْدَبُ الطَّلَبُ) سوننەتە بەخۆی داوا بكا بیكەنە قازی (إِنْ كَانَ خَامِلاً يَرْجُو بِهِ نَشْرَ الْعِلْمِ) ئەگەر زانایەكی نەناسراو بێ‌و ئومێدی وابێ بە هۆی قازی‌یەتی زانست بڵاو بكاتەوە (أَوْ مُحْتَاجًا إِلَىالرِّزْقِ) یان پێویستی‌ی بە بژێو هەبێ، یان كاربەدەستەكان مافی خەڵكیان لەدەست دەدا؟ چونكە بە هۆی ئەم حاڵەتە بوو حەزرەتی (یوسف)ﷺ داوای كرد لە (مصر) ببێتە كاربەدەستی دارایی.

(وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر ئەو هۆیانە نەبون، ئەو كاتە (فَالأَوْلَى تَرْكُهُ) وا باشترە داوای قازی‌یەتی نەكا، بەڵكو (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (وَيُكْرَهُ عَلَىالصَّحِيحِ وَاللهُ أَعْلَمُ) ناپەسندە: داوای قازی‌یەتی بكا ئەگەر هۆیەكانی‌ڕابردوو نەبن، لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ وُلِّيَ الْقَضَاءَ فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، هەر كەسێك كرایە قازی، بەڕاستی بە بێ‌كێرد سەری بڕاوە. واتە: بەهیلاك چووە.

(وَالإِعْتِبَارُ فِى التَّعَيُّنِ وَعَدَمِهِ بِالنَّاحِيَةِ) ڕەچاوكردنی واجببوون‌و واجبنەبوونی بە (فَرْضُ الْعَيْنِ) لە سەر تاكە كەسێكی گونجاو بۆ قازی‌یەتی بەگوێرەی ناوچەكەی خۆیەتی، واتە: ئەگەر لە ناوچەكەدا تەنها یەك كەسی گونجاو هەبێ، ئەوە بە (فرض العین) لە سەر

وَشَرْطُ الْقَاضِى مُسْلِمٌ مُكَلَّفٌ حُرٌّ ذَكَرٌ عَدْلٌ سَمِيعٌ بَصِيرٌ نَاطِقٌ كَافٍ

---

كەسەكە واجبە: قبوڵ بكا لە ناوچەكەی خۆی‌دا ببێتە قازی، بەڵام لە سەری واجب نیە –جگە لە ناوچەكەی خۆی– بۆ ناوچەیەكی‌تر قبوڵ بكا.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە سەر پێشەوای موسوڵمانان‌و جێگرەكەی واجبە: لە گشت ناوچەیەكدا قازیێك دابنێن، جا ئەگەر ناوچەیەك لە ژێر دەسەڵاتی پێشەوادا نەبو–یان پێشەوا قازی‌ی بۆ ناوچەكە دانەنا– ئەو كاتە واجبە: خاوەن دەسەڵات‌و پیاوماقوڵانی ناوچەكە ڕێك بكەون‌و زانایەكی لێهاتوو بكەنە قازی لە ناوچەكەی‌خۆیاندا، جا بڕیارەكانی ئەم قازی‌یە–لە بەر ناچاری– جێ‌بەجێ دەبن، بە بەڵگەی غەزای (مُؤْتَة): كە (هەرسێك ئەمیرەكان شەهید بون، (صحابة)كان حەزرەتی (خالد بن الولید)یان كردە ئەمیری خۆیان، پێغەمبەرﷺ بەم كردارە ڕازی بوو و ڕەخنەی نەگرت). هەروەك لە (البخاری)دا گێڕدراوەتەوەو لە (تحفة)شدا لێرەو لە باسی سەرپەرشتكاری مارەبڕیندا ڕوون كراوەتەوە.

كەوابو: ئەگەر خاوەن دەسەڵات‌و پیاوماقوڵانی ناوچەكە ئەم واجبە ئەنجام نەدەن گشتیان گوناهبار دەبن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿كَيْفَ تُقَدَّسُ أُمَّةٌ لاَ يُؤْخَذُ مِنْ شَدِيدِهِمْ لِضَعِيفِهِمْ﴾ حديث حسن بشواهده رواه ابن حبان، چۆن لە گوناهان پاك دەبێتەوە گەلێكی وەها كە مافی بێ‌هێزەكەیان لە بەهێزەكەیان وەرنەگیرێ.

## ﴿ مەرجەكانی قازی=دادوەر ﴾

(وَشَرْطُ الْقَاضِي) مەرجی ئەو كەسەی دەكرێتە قازی، یەكەم: (مُسْلِمٌ) دەبێ موسوڵمان بێ، واتە: دروست نیە كافر بكرێتە قازیو كاربەدەستی موسوڵمانان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَنْ يَجْعَلَ اللهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَىالْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ خوای گەورە هیچ ڕێگایەكی بۆ كافرەكان دانەناوە بە سەر موسوڵماناندا. واتە: پلەی قازیو كاربەدەستیش گەورەترین ڕێگای دەسەڵاتەو نابێ بدرێتە كافرەكان، بەڵام ئەگەر كافرێك بە سەر كافرەكاندا بكرێتە سەركردەو سەرۆك–نەك بە ناوی قازی=دادوەر– ئەو كاتە دروستە هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

دووەم: (مُكَلَّفٌ) دەبێ بالغو عاقڵ بێو خاوەن بیرو هەشیار بێ. سێیەم: (حُرٌّ)ئازاد بێ. چوارەم: (ذَكَرٌ) پیاو بێ، واتە: دروست نیە ئافرەت بكرێتە قازی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ إِمْرَأَةً﴾ رواه البخاری، بەختەوەر نابێ ئەو گەلەی كاری خۆیان بدەنە دەست ئافرەت. پێنجەم: (عَدْلٌ) دادپەروەر بێ، واتە: دروست نیە (فاسق) بكرێتە قازی. شەشەم: (سَمِيعٌ) بیسەر بێ. حەفتەم: (بَصِيرٌ) بینەر بێ. هەشتەم: (نَاطِقٌ) گۆیا بێ، واتە: كەڕ، یان كوێر، یان لاڵ دروست نیە بكرێتە قازی. نۆیەم: (كَافٍ) بەڕوەستی كاروباری قازییەتی بكا، واتە: گێلەكەو نەخۆشو بیر تێكچوو نەبێ.

مُجْتَهِدٌ: وَهُوَ أَنْ يَعْرِفَ مِنَ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ مَا يَتَعَلَّقُ بِالأَحْكَامِ، وَخَاصَّهُ وَعَامَّهُ، وَمُجْمَلَهُ وَمُبَيَّنَهُ، وَنَاسِخَهُ وَمَنْسُوخَهُ، وَمُتَوَاتِرَالسُّنَّةِ وَغَيْرَهُ، وَالْمُتَّصِلَ وَالْمُرْسَلَ، وَحَالَ الرُّوَاةِ قُوَّةً وَضَعْفًا، وَلِسَانَ الْعَرَبِ لُغَةً وَنَحْوًا، وَأَقْوالَ الْعُلَمَاءِ مِنَ الصَّحَابَةِ فَمَنْ بَعْدَهُمْ إجْمَاعًا وَاخْتِلاَفًا، وَالْقِيَاسَ بِأَنْوَاعِهِ، فَإِنْ تَعَذَّرَ جَمْعُ هَذِهِ الشُّرُوطِ فَوَلَّى سُلْطَانٌ لَهُ شَوْكَةٌ فَاسِقًا أَوْ مُقَلِّدًا نَفَذَ قَضَاؤُهُ لِلضَّرُورَةِ،

---

دەیەم: (مُجْتَهِدٌ) دەبێ (مُجْتَهِد) بێ (وَهُوَ) مەبەست بە (مُجْتَهِد) لێرەدا: (أَنْ يَعْرِفَ مِنَ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ مَا يَتَعَلَّقُ بِالأَحْكَامِ) ئەوەیە لە قورئانو لە حەدیس ئەو ئایەتو حەدیسانە بزانێ كە پەیوەندییان بە بڕیارەكانیشەریعەتەوە هەیە، هەم (وَ خَاصَّهُ وَعَامَّهُ) تایبەتیەكانو گشتیەكانی ئایەتو حەدیسەكانیش بزانێ، هەم (وَمُجْمَلَهُ وَمُبَيَّنَهُ) نائاشكراو ئاشكراكراوەكانی ئایەتو حەدیسەكانیش بزانێ، هەم (وَنَاسِخَهُ وَمَنْسُوخَهُ) ڕەشكەرەوەو ڕەشكراوەكانی ئایەتو حەدیسەكانیش بزانێ، هەم (وَمُتَوَاتِرَالسُّنَّةِ وَغَيْرَهُ) حەدیسی (متواتر)و (آحاد)ش بزانێ، هەم (وَالْمُتَّصِلَ وَالْمُرْسَلَ) حەدیسی گەیاندراوە پێغەمبەرﷺو نەگەیاندراوە بزانێ، هەم (وَحَالَ الرُّوَاةِ قُوَّةً وَضَعْفًا) حاڵی حەدیسگێرەوەكانیش بزانێ: لە ڕووی بەهێزیو بێهێزیەوە.

هەم (وَلِسَانَ الْعَرَبِ لُغَةً وَنَحْوًا) زمانی عەرەبیش بزانێ: لە ڕووی واتەو ڕێزمانەوە،

هـەم (وَأَقْـوَالَ الْعُلَمَـاءِ مِـنَ الصَّـحَابَةِ فَمَـنْ بَعْـدَهُمْ) فـەرموودەكانی زانایـانیش بزانـێ -لـە (صـحابە)كانەوە تـا دوای ئـەوانیش لـە چـینی زانایـانی (مُجْتَهِـد)- (إِجْمَاعًـا) لـە ڕووی یەكدەنگیەوە بزانێ لە سەر كام مەسەلە یەكدەنگن (وَاخْتِلاَفًا) لە ڕووی جیاوازیەوە بزانێ لە كام مەسەلەدا جیاوازن، هەم (وَالْقِيَاسَ بِأَنْوَاعِهِ) هەموو جۆرەكانی (قیاس)ش بزانێ، جا بزانە: پێناسەی ئەو زاراوانەی ڕابردوو، لە (علوم الحديث)و (أصول الفقه)دا دەزاندرێن، لە بەر درێژی نەمنوسین‌و وێنەكانیشیانم نەهێنان.

(فَإِنْ تَعَذَّرَ جَمْعُ هَذِهِ الشُّرُوطِ) جا ئەگەر نەگونجا ئەو مەرجانەی ڕابردوو لـە قازیـدا بێنـە جێ، یان دەگونجا، بەڵام (فَوَلَّى سُلْطَانٌ لَهُ شَوْكَةٌ فَاسِقًا أَوْ مُقَلِّدًا) كاربەدەستێكی خاوەن دەسەڵات زانایەكی فاسقی كردە قـازی، یـان زانایـەكی شـوێنكەوتەی مەزهـەبێكی كـردە قازی، ئەو كاتە (نَفَذَ قَضَـاؤُهُ لِلضَّـرُورَةِ) بڕیـاری ئـەو قازیـیە جێبـەجێ دەبـێ لـە بـەر ناچـاری‌و پێویسـتیی خـەڵك، بـەڵام بـەو مەرجـەی لـە چـوار مەزهەبەكـەی(أَهْـلِ السُّـنَّةِ) دەرنەچێ: كە (الحَنَفي)و (المَالكي)و (الشَافعي)و (الحَنْبَلي)ن؟

چونكە بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام: بۆ (فتوا)دان‌و دادكردن -جگە لەو چوار مەزهەبانە- (تَقْليد)كردنی هیچ كەسێكی‌تر دروست نیە، هەروەك ئیمـام (ابـن الصـلاح) فەرموویـەتی، وَيُنْـدَبُ لِلإِمَـامِ إِذَا وَلَّى قَاضِيًا أَنْ يَأْذَنَ لَـهُ فِي الإِسْتِخْلاَفِ، فَإِنْ نَهَاهُ لَـمْ يَسْتَخْلِفْ، فَإِنْ أَطْلَقَ إِسْتَخْلَفَ فِيمَا لاَ يَقْدِرُ عَلَيْهِ لاَ غَيْرِهِ فِالأَصَحِّ، وَشَرْطُ الْمُسْتَخْلَفِ كَالْقَاضِي، إِلاَّ أَنْ يُسْـتَخْلَفَ فِـي أَمْـرٍ خَـاصٍّ: كَسَـمَاعِ بَيِّنَـةٍ فَيَكْفِـي عِلْمُـهُ بِمَـا يَتَعَلَّـقُ بِـهِ، وَيَحْكُمُ بِاجْتِهَادِهِ أَوْ بِاجْتِهَادِ مُقَلَّدِهِ إِنْ كَانَ مُقَلِّدًا،

---

بەڵكو ئیمامی (السُّبْكِي) فەرموویەتی: ئەوەی بە پێچەوانەی ئەو چوار مەزهەبانە ڕەفتـار بكا وەكو دژ بە (إجماع) وایە.

هەروەها بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام: دروست نیە بە فەرموودە بێهێزەكانی مەزهەبیش داد لە نێوان خەڵكدا بكا، هەروەك ئیمامی (القرافي)و (ابن صلاح) فەرموویانە، بەڵكو ئیمامی (السُّبْكِي) فەرموویەتی: (دادكردن بە فەرموودەی بێهێز دادكردنێكی دژ بەو شەرعەیە كە خوا ناردوتیە خوارەوە). هەروەك لە (تحفة)دا لێـرەو لـە (ڕەووشـتەكانی‌دادكردن)دا ئـەو مەسـەلانە ڕوون كراونـەوە، ئێمـەش لـە باسـی (فتـوا)و (تقلیـد) لـە (پێشـەكی، لـە بەرگی‌یەكەم)دا درێژتر ڕوونمان كردنەوە.

جا بزانە: لەو حاڵەتەی قازی مەرجەكانی لێ‌نەهاتونە جێ‌و بە ناچاری كراوەتە قازی، لـە سەری واجبە لە گشت بڕیارەكاندا: ئەو فەرموودەیە ڕوون بكاتەوە: كە لـە دادكردنەكـەدا پشتی پێ‌بەستوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَيُنْـدَبُ لِلإِمَـامِ) بـۆ پێشـەواو خـاوەن دەسەڵاتەكانی‌تر سوننەتە (إِذَا وَلَّى قَاضِيًا)

هەر كاتێك یەكێكیان كردە قازی لە ناوچەیەكدا: (أَنْ يَأْذَنَ لَهُ فِيالإِسْتِخْلاَفِ) ئیزنی بدا بۆ خۆی جێنیشێك دابنێ، تاكو براندنەوەی كێشەكانی بۆ ئاسانتر ببێ (فَإِنْ نَهَاهُ) جا ئەگەر دەسەلاتدارەكە بە قازیەكەی گوت: جێنیش دامەنێ. ئەو كاتە (لَمْ يَسْتَخْلِفْ) نابێ جێنیش دابنێ، بەلام (فَإِنْ أَطْلَقَ) ئەگەر دەسەلاتدارەكە باسی دانان و دانەنانی جێنیشی نەكرد، ئەو كاتە (إِسْتَخْلَفَ فِيمَا لاَ يَقْدِرُ عَلَيْهِ) بۆ قازیەكە دروستە: جێنیش بۆ خۆی دابنێ لەو كارەدا كە توانای نیە بیكا (لاَ غَيْرِهِ فِيالأَصَحِّ) بەلام لەو كارەی توانای هەیە نابێ جێنیش دابنێ لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَشَرْطُ الْمُسْتَخْلَفِ كَالْقَاضِي) مەرجی ئەو كەسەی دەكرێتە جێنیشی قازی: وەكو مەرجەكانی ڕابردووی قازییە (إِلاَّ أَنْ يُسْتَخْلَفَ فِي أَمْرٍ خَاصٍّ) تەنها ئەگەر لە كارێكی تایبەتیدا بكرێتە جێنیش (كَسَمَاعِ بَيِّنَةٍ) وەك گوێ لێڕاگرتنی شاهیدەكان، ئەو كاتە (فَيَكْفِي عِلْمُهُ بِمَا يَتَعَلَّقُ بِهِ) ئەوەندە زانستە بەسە: كە پەیوەندی بە شاهیدی وەرگرتنەوە هەیە، واتە: مەرجەكانی تر پێویست نینە، ئینجا (وَيَحْكُمُ بِاجْتِهَادِهِ) جێنیشەكەش داد دەكا بە (إجتهاد)ی خۆی (أَوْ بِاجْتِهَادِ مُقَلَّدِهِ إِنْ كَانَ مُقَلِّدًا)یان داد دەكا بە (إجتهاد)ی ئەو ئیمامەی شوێنی كەوتوە ئەگەر شوێنكەوتەی مەزهەب بێ، هەرچەند بە پێچەوانەی

وَلاَ يَجُوزُ أَنْ يَشْرِطَ عَلَيْهِ خِلاَفَهُ، وَلَوْ حَكَّمَ خَصْمَانِ رَجُلاً فِي غَيْرِ حَدِّ اللهِ تَعَالَى جَازَ مُطْلَقًا بِشَرْطِ أَهْلِيَّةِ الْقَضَاءِ، وَفِي قَوْلٍ لاَ يَجُوزُ، وَقِيلَ: بِشَرْطِ عَدَمِ قَاضٍ بِالْبَلَدِ، وَقِيلَ يَخْتَصُّ بِمَالٍ دُونَ قِصَاصٍ وَنِكَاحٍ وَنَحْوِهِمَا،

---

مەزهەبەكەی قازیەكەش بێ، كەوابو: (وَلاَ يَجُوزُ أَنْ يَشْرِطَ عَلَيْهِ خِلاَفَهُ) دروست نیە قازی لە سەر جێنیشەكە بە مەرج دابنێ: لە مەزهەبی خۆی لابدا.

### ﴿ باسی (اَلتَّحْكِيم)=دانانی داوەرێك لە ڕووداوێكدا ﴾

(وَلَوْ حَكَّمَ خَصْمَانِ رَجُلاً) ئەگەر دووكەس پیاوێكیان كردە (اَلْمُحَكَّم)=دادوەر لە كێشەیەكی نێوانیاندا، یان لە ڕووداوێكی تردا: كە (فِي غَيْرِ حَدِّ اللهِ تَعَالَى) ڕووداوەكە سزای تاوانەكانی مافی خوای گەورە نەبێ، ئەوە (جَازَ مُطْلَقًا) دادوەر دانانەكە دروست دەبێ، هەرچەند قازی=دادوەری دەولەتیش لە ناوچەكەدا هەبێ، چونكە چەند (صحابة)یەك (اَلْمُحَكَّم)=دادوەریان بۆ خۆیان داناوە، (صحابة)كانی تریش ڕەخنەیان نەگرتوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

بەلام (بِشَرْطِ أَهْلِيَّةِالْقَضَاءِ) بەو مەرجەی (اَلْمُحَكَّم)=دادوەرە دانراوەكە كەلكی قازیەتیی هەبێ، واتە: ئەگەر (اَلْمُحَكَّم)ی دانراو كەلكی قازییەتیی نەبێ، ئەو كاتە ئەگەر قازییێكی بە كەلك هەبێ دروست نیە: ئەو دابندرێ، بەلام ئەگەر قازیەكە نەزان بوو، یان فاسق بوو،

یان بۆ دادكردن ماڵی وەردەگرت—واتە: یان گوێی نەدەدا داوایەكەی— ئەو كاتە دروستە: زانایەكی دادپەروەری شوێنكەوتەی مەزهەبێك بكرێتە (اَلْمُحَكَّم)، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَفِي قَوْلٍ لاَ يَجُوزُ) لە فەرموودەیەكدا: ئەم دادوەردانانە دروست نیە (وَقِيلَ بِشَرْطِ عَدَمِ قَاضٍ بِالْبَلَدِ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بەو مەرجە دروستە قازی لە شارەكەدا نەبێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: (يَخْتَصُّ بِمَالٍ دُونَ قِصَاصٍ وَنِكَاحٍ وَنَحْوِهِمَا) دروست بوونی دادوەردانانەكە—تەنها— تایبەتە بە كێشەیماڵی، نەك بە تۆڵە وەرگرتنەوەو مارەبڕینو ئەو جۆرە شتانە: وەكو لەعنەت لێككردنو سزای بوختان.

جا بزانە: بە فەرموودەی بەهێزتر: تەنها لە سزاكانی مافی خوای گەورەدا نەبێ، لە گشت مافەكانیتری خوای گەورەداو لە گشت مافەكانیئادەمیزاددا دروستە (اَلْمُحَكَّم)=دادوەر دابندرێ، جیاوازی نیە مافەكان: ماڵی بن، یان ئایینی بن، یان سزای مافی ئادەمیزادان بن: بۆ وێنە: بۆ دانیشتووانی ناوچەیەك دروستە پیاوێكی بە كەڵك بكەنە (اَلْمُحَكَّم)= دادوەر، تاكو بڕیار بدا: (دیتنی مانگی یەكشەوەی ڕەمەزان ئیسبات بووەو سەبەینێ ڕەمەزانە). هەروەك لە (پەرتووكی ڕۆژوو)دا ڕابرا.

هەروەها ئەگەر ئافرەتێك سەرپەرشتكاری نەبێ دروستە لەگەڵ پیاوێك ڕێك بكەوێو وَلاَ يَنْفُذُ حُكْمُهُ إلاَّ عَلَى رَاضٍ بِهِ، فَلاَ يَكْفِي رِضَا قَاتِلٍ فِي ضَرْبِ دِيَةٍ عَلَى عَاقِلَتِهِ، وَإِنْ رَجَعَ أَحَدُهُمَا قَبْلَ الْحُكْمِ اِمْتَنَعَ الْحُكْمُ، وَلاَ يُشْتَرَطُ الرِّضَا بَعْدَ الْحُكْمِ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ نَصَبَ قَاضِيَيْنِ فِي بَلَدٍ وَخَصَّ كُلاًّ بِمَكَانٍ أَوْ زَمَانٍ أَوْ نَوْعٍ جَازَ، وَكَذَا إِنْ لَمْ يَخُصَّ فِي الأَصَحِّ، إلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ اِجْتِمَاعَهُمَا عَلَى الْحُكْمِ.

(فَصْلٌ) جُنَّ قَاضٍ أَوْ أُغْمِيَ عَلَيْهِ أَوْ عَمِيَ أَوْ ذَهَبَتْ أَهْلِيَّةُ اِجْتِهَادِهِ وَضَبْطِهِ

---

پیاوێكی بە كەڵك بكەنە (اَلْمُحَكَّم)=دادوەر، تاكو لە پیاوەكە مارەی ببڕێ، هەروەك لە (تحفة) لە (باسی ئەو سەرپەرشتكارانەی مارە دەبڕن) ڕوون كراوەتەوە.

هەروەها ئەگەر ژنێك مێردەكەی شێت بوو، دروستە پیاوێكی بە كەڵك بكاتە (اَلْمُحَكَّم)= دادوەر تاكو مارەبڕینەكەی لە لای وی هەڵبوەشێنێتەوە. هەروك لە (باسی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕین)دا ڕابرا.

جا بزانە: مەرجە دانەرەكە بە زوبان بڵێ: (تۆم كردە (اَلْمُحَكَّم)=دادوەر لەم ڕووداوەدا). چونكە (وَلاَ يَنْفُذُ حُكْمُهُ إلاَّ عَلَى رَاضٍ بِهِ) بڕیاری (اَلْمُحَكَّم) جێبەجێ نابێ تەنها لە سەر ئەو كەسە جێبەجێ دەبێ: كە بە بڕیارەكەی ڕازییە، كەوابو: (فَلاَ يَكْفِي رِضَا قَاتِلٍ) ڕازیبوونی مرۆڤكوژەكە بەس نیە (فِي ضَرْبِ دِيَةٍ عَلَى عَاقِلَتِهِ) لە بڕیاردانی (اَلْمُحَكَّم)دا: بە دانانی خوێنیكوژراوەكە لە سەر خزمەكانی بكوژەكە، بەڵكو پێویستە خزمەكان ڕازی بن،

ئینجا مەرجە ڕازیبوونەکەش: لە سەرەتای دانانیەوە بە (اَلْمُحَكَّم) بەردەوام بێ تا بڕیارەکەی دادەڕێژێو تەواو دەبێ، کەوابو: (وَإِنْ رَجَعَ أَحَدُهُمَا قَبْلَ الْحُكْمِ) ئەگەر یەکێك لە کێشەچیەکان پێش تەواوبوونی بڕیاردانەکە پەشیمان بۆوە، ئەو کاتە (اِمْتَنَعَ الْحُكْمُ) نابێ بڕیار بدا، چونکە ڕازیبوونەکەی بەردەوام نیە، بەڵام (وَلاَ يُشْتَرَطُ الرِّضَا بَعْدَ الْحُكْمِ فِي الأَظْهَرِ) لە دوای تەواوبوونی بڕیارەکە ڕازیبوونی هیچ لایەك مەرج نیە، لە فەرموودەی بەهێزتردا، کەوابو: واجبە: بڕیارەکەی جێبەجێ بکەن.

(وَلَوْ نَصَبَ قَاضِيَيْنِ فِي بَلَدٍ) ئەگەر پێشەوا، یان جێگرەکەی دوو قازیی دانان لە شارێکدا (وَخَصَّ كُلاً بِمَكَانٍ أَوْ زَمَانٍ أَوْ نَوْعٍ) هەر یەکەشیانی بە تایبەتی دانا: بۆ شوێنێکی شارەکە، یان بۆ کاتێك، یان بۆ جۆرە بڕیارێك، ئەوە (جَازَ) دروستە (وَكَذَا إِنْ لَمْ يَخُصَّ فِي الأَصَحِّ) هەروەها ئەگەر بە تایبەتیش داینەنان، هەر دروستە، لە فەرموودەی ڕاستتردا (إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ اجْتِمَاعَهُمَا عَلَى الْحُكْمِ) تەنهائەگەر بە مەرج دابنێ: هەردووکیان لە سەر بڕیاردانێك کۆ ببنەوە، ئەو کاتە دروست نیە، چونکە جیاوازی لە بۆچووندا لە نێوانیاندا ڕوو دەدا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی لادانی قازی ﴾

(جُنَّ قَاضٍ) هەر کاتێك قازی شێت بوو (أَوْ أُغْمِيَ عَلَيْهِ) یان بێهۆش بوو (أَوْ عَمِيَ) یان کوێر بوو (أَوْ ذَهَبَتْ أَهْلِيَّةُ اجْتِهَادِهِ وَضَبْطِهِ) یان کەڵکی (إجتهاد)ی نەما، یان شتی لەبیر بِغَفْلَةٍ أَوْ نِسْيَانٍ لَمْ يَنْفُذْ حُكْمُهُ، وَكَذَا لَوْ فُسِّقَ فِالأَصَحِّ، فَإِنْ زَالَتْ هَذِهِ الأَحْوَالُ لَمْ تَعُدْ وِلاَيَتُهُ فِالأَصَحِّ، وَلِلإِمَامِ عَزْلُ قَاضٍ ظَهَرَ مِنْهُ خَلَلٌ، أَوْ لَمْ يَظْهَرْ وَهُنَاكَ أَفْضَلُ مِنْهُ، أَوْ مِثْلُهُ وَفِي عَزْلِهِ بِهِ مَصْلَحَةٌ كَتَسْكِينِ فِتْنَةٍ، وَإِلاَّ فَلاَ لَكِنْ يَنْفُذُ الْعَزْلُ فِالأَصَحِّ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَ يَنْعَزِلُ قَبْلَ بُلُوغِهِ خَبَرَ عَزْلِهِ، وَإِذَا كَتَبَ الإِمَامُ إِلَيْهِ إِذَا قَرَأْتَ كِتَابِي فَأَنْتَ مَعْزُولٌ فَقَرَأَهُ انْعَزَلَ، وَكَذَا إِنْ قُرِئَ عَلَيْهِ فِالأَصَحِّ،

---

نەدەما: (بِغَفْلَةٍ أَوْ نِسْيَانٍ) بە هۆی غافڵبوون، یان لەبیرکردن، ئەوە (لاَ يَنْفُذْ حُكْمُهُ) بڕیارەکەی جێبەجێ نابێ، چونکە بە هەر یەکێك لە وانە قازی لە کار دەکەوێ (وَكَذَا لَوْ فُسِّقَ) هەروەها ئەگەر قازی فاسق ببێ بڕیارەکەی جێبەجێنابێو لەکار دەکەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا.

(فَإِنْ زَالَتْ هَذِهِ الأَحْوَالُ) جا ئەگەر ئەو حاڵەتانەیڕابردوو لە قازییەکە لاکەوتن (لَمْ تَعُدْ وِلاَيَتُهُ) سەربەخۆ نابێتەوە قازی (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵکو پێویستە: سەرلەنوێ بکرێتەوە قازی.

(وَلِلإِمَامِ) بۆ پێشەوا دروستە (عَزْلُ قَاضٍ ظَهَرَ مِنْهُ خَلَلٌ) ئەو قازییە لە کار لابدا کە ناتەواویەکی لێ ئاشکرا ببێ: وەك خەڵکەکە لێی ناڕازی بێ، یان بێهێز بێ، یان ترسو ڕێزی لە دڵی خەڵکیدا نەبێ، چونکە ﴿پێغەمبەرﷺ ئیمامێکی لە پێشنوێژی لادا؟ لە بەر

ئەوەی تفی بەرەو قیبلە کرد، جا فەرمووی: ﴿لا تُصَلِّ بِهِمْ بَعْدَ هذا أَبَداً﴾ رواه أبوداود، لە دوای ئەم تفکردنە هیچیتر پێشنوێژییان بۆ نەکەی، هەتاهەتایێ.

(أَوْ لَمْ يَظْهَرْ وَهُنَاكَ أَفْضَلُ مِنْهُ) یان هیچ ناتەواوییەکی لێئاشکرا نەبو، بەڵام پیاوێکی لەوی باشتر هەبوو بیکاتە قازی، بۆیێ لایدا (أَوْ مِثْلُهُ وَفِي عَزْلِهِ بِهِ مَصْلَحَةٌ) یان پیاوێکی وەکو وی هەبوو بیکاتە قازیو بەرژەوەندیەکیش لە لادانی ویو دانانی ئەوەکەیتردا هەبوو: (كَتَسْكِينِ فِتْنَةٍ) وەك دامرکاندنی ئاژاوەیەك، ئەوە لەو حاڵەتانەشدا دروستە لایبدا.

(وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر هیچ بەرژەوەندی لە لادانەکەیدا نەبو، ئەو کاتە (فَلاَ) دروست نیە لایبدا (لَكِنْ يَنْفُذُ الْعَزْلُ فِيالأَصَحِّ) بەڵام هەرچەند دروستیش نیە، لادانەکەی جێبەجێ دەبێو لە کار دەکەوێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، لە بەر ڕەچاوکردنی گوێڕایەڵبوونی کاربەدەستەکەی، ئینجا (وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (أَنَّهُ لاَ يَنْعَزِلُ قَبْلَ بُلُوغِهِ خَبَرَ عَزْلِهِ) قازیەکە لەکار ناکەوێ پێش ئەوەی هەواڵی لادانەکەی بگاتێ.

(وَإِذَا كَتَبَ الإِمَامُ إِلَيْهِ) هەر کاتێك پێشەوا بۆ قازیی نووسی: (إِذَا قَرَأْتَ كِتَابِي فَأَنْتَ مَعْزُولٌ) هەر کاتێك نووسراوەکەی منت خوێندەوە، تۆ لە کار لادراوی (فَقَرَأَهُ) ئینجا قازیش نووسراوەکەی خوێندەوە، ئەوە (انْعَزَلَ) لە کار دەکەوێ (وَكَذَا إِنْ قُرِئَ عَلَيْهِ) هەروەها ئەگەر بۆیشی بخوێندرێتەوە، هەر لە کار دەکەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَيَنْعَزِلُ بِمَوْتِهِ وَانْعِزَالِهِ مَنْ أَذِنَ لَهُ فِي شَغْلٍ مُعَيَّنٍ كَبَيْعِ مَالِ مَيِّتٍ، وَالأَصَحُّ انْعِزَالُ نَائِبِهِ الْمُطْلَقِ إِنْ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ فِالاِسْتِخْلاَفِ، أَوْ قِيلَ لَهُ: اسْتَخْلِفْ عَنْ نَفْسِكَ أَوْ أَطْلَقَ، فَإِنْ قَالَ إِسْتَخْلِفْ عَنِّي فَلاَ، وَلاَ يَنْعَزِلُ قَاضٍ بِمَوْتِ الإِمَامِ وَلاَ نَاظِرُ يَتِيمٍ وَوَقْفٍ بِمَوْتِ قَاضٍ، وَلاَ يُقْبَلُ قَوْلُهُ بَعْدَ انْعِزَالِهِ: حَكَمْتُ بِكَذَا. فَإِنْ شَهِدَ مَعَ آخَرَ بِحُكْمِهِ لَمْ يُقْبَلْ عَلَالصَّحِيحِ، أَوْ بِحُكْمِ حَاكِمٍ جَائِزِ الْحُكْمِ قُبِلَتْ فِالأَصَحِّ، وَيُقْبَلُ قَوْلُهُ قَبْلَ عَزْلِهِ: حَكَمْتُ بِكَذَا.

---

(وَيَنْعَزِلُ بِمَوْتِهِ وَانْعِزَالِهِ) بە مردنو لەکارکەوتنی قازی، لەکار دەکەوێ: (مَنْ) ئەو جێگرەی کە (أَذِنَ لَهُ فِي شَغْلٍ مُعَيَّنٍ) قازییەکە ئیزنیداوە کارێکی دیارکراوی لەجیاتی بکا: (كَبَيْعِ مَالِ مَيِّتٍ) وەك فرۆشتنی ماڵیمردووێك، یان ونبووێك، هەروەها (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (انْعِزَالُ نَائِبِهِ الْمُطْلَقِ) بە مردنو لەکارکەوتنیقازی ئەو جێگرەشی لە کار دەکەوێ: کە بێدیاریکردنی کارێك کردویەتیە جێگری خۆی (إِنْ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ فِي الاِسْتِخْلاَفِ) ئەگەر لە لایەن کاربەدەستەوە قازیەکە ئیزن نەدرابێ جێنیش بۆ خۆی دابنێ (أَوْ قِيلَ لَهُ: اسْتَخْلِفْ عَنْ نَفْسِكَ) یان قازییەکە پێی گوترابێ: لەجیاتی خۆت جێنیش دابنێ (أَوْ أَطْلَقَ) یان تەنها پێی گوترابێ: جێنیش دابنێ.

بەڵام (فَإِنْ قَالَ إِسْتَخْلِفْ عَنِّي) ئەگەر کاربەدەست پێی گوتبێ: لەجیاتی من

جێنیش دابنێ. ئەو کاتە (فَلاَ) بە مردن و لەکارکەوتنی قازیەکە جێنیشەکە لە کار ناکەوێ، هەم (وَلاَ يَنْعَزِلُ قَاضٍ بِمَوْتِ الإِمَامِ) بە مردنی پێشەوایەکەش قازی لە کار ناکەوێ، چونکە کاروباری خەڵك ڕادەگیرێ، هەم (وَلاَ نَاظِرُ يَتِيمٍ وَوَقْفٍ بِمَوْتِ قَاضٍ) سەرپەرشتکاری یەتیم و سەرپەرشتکاری وەقف بە مردنی قازی لە کار ناکەون، چونکەبەرژەوەندیەکان لە کار دەکەون.

(وَلاَ يَقْبَلُ قَوْلُهُ بَعْدَ انْعِزَالِهِ) لە دوای لەکارکەوتنی قازییەکە ئەو قسەیەی لێقبوڵ ناکرێ کە بڵێ: (حَكَمْتُ بِكَذَا) من بڕیارم دابو بەو شتە بۆ فلانکەس. کەوابو: (فَإِنْ شَهِدَ مَعَ آخَرَ بِحُكْمِهِ) ئەگەر قازییە لەکارکەوتووەکە لەگەڵ شاهیدێکیتردا شاهیدی بدا: کە بەخۆی ئەم بڕیارەی داوە، ئەو کاتەش (لَمْ يُقْبَلْ عَلَى الصَّحِيحِ) لێی قبوڵ ناکرێ، لە سەر فەرمودەی ڕاست، چونکە شاهیدی بە کرداریخۆی دەدا، کەواتە: لەو حاڵەتانەدا مەرجە: جگە لەخۆی شاهیدیتر هەبن لە سەر بڕیاردانەکەی پێش لەکارکەوتنی.

(أَوْ بِحُكْمِ حَاكِمٍ جَائِزِ الْحُكْمِ) یان قازییەکە شاهیدیدا: کە دادوەرێکی بڕیار دروست ئەو بڕیارەی داوە–واتە: نەیگوت: من بڕیارم داوە– ئەو کاتە (قُبِلَتْ فِي الأَصَحِّ) شاهیدییەکەی لێ قبوڵ دەکرێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەم (وَيُقْبَلُ قَوْلُهُ قَبْلَ عَزْلِهِ: حَكَمْتُ بِكَذَا) پێش لە کار لادانیشی لێێ قبوڵ دەکرێ بڵێ: من بڕیارم دابو بەو شتە.

فَإِنْ كَانَ فِي غَيْرِ مَحَلِّ وِلاَيَتِهِ فَكَمَعْزُولٍ، وَلَوْ ادَّعَى شَخْصٌ عَلَى مَعْزُولٍ أَنَّهُ أَخَذَ مَالَهُ بِرِشْوَةٍ أَوْ شَهَادَةِ عَبْدَيْنِ مَثَلاً أُحْضِرَ وَفُصِلَتْ خُصُومَتُهُمَا، وَإِنْ قَالَ حَكَمَ بِعَبْدَيْنِ وَلَمْ يَذْكُرْ مَالاً أُحْضِرَ، وَقِيلَ: لاَ حَتَّى يُقِيمَ بَيِّنَةً بِدَعْوَاهُ، فَإِنْ أُحْضِرَ وَأَنْكَرَ صُدِّقَ بِلاَ يَمِينٍ فِالأَصَحِّ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ بِيَمِينٍ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ أُدُّعِيَ عَلَى قَاضٍ جَوْرٌ فِي حُكْمٍ لَمْ يُسْمَعْ ذَلِكَ وَيُشْتَرَطُ بَيِّنَةٌ، وَإِنْ لَمْ تَتَعَلَّقْ بِحُكْمِهِ حَكَمَ بَيْنَهُمَا خَلِيفَتُهُ أَوْ غَيْرُهُ.

---

بەڵام (فَإِنْ كَانَ فِي غَيْرِ مَحَلِّ وِلاَيَتِهِ) ئەگەر قازییەکە–جگە لە شوێنی دەسەڵاتیخۆی– لە شوێنێکیتردا بڵێ: من بڕیارم دابو بەو شتە. ئەوەش (فَكَمَعْزُولٍ) وەك قازیی لەکارلادراو لێی قبوڵ ناکرێ؟ چونکە بڕیاری قازی تەنها لە شوێنی دەسەڵاتیخۆیدا جێبەجێ دەبێ و لە دەرەوەی دەسەڵاتیخۆیدا جێبەجێ نابێ، کەوابو: دانپێداهێنانیشی تەنها لە شوێنی دەسەڵاتی خۆیدا لێی قبوڵ دەکرێ.

(وَلَوْ ادَّعَى شَخْصٌ عَلَى مَعْزُولٍ) ئەگەر کەسێك لە سەر قازییێکی لەکارلادراو داوای تۆمار کردو گوتی: (أَنَّهُ أَخَذَ مَالَهُ بِرِشْوَةٍ) قازییەکە بە ڕێگای بەرتیل ماڵی لێوەرگرتوم (أَوْ شَهَادَةِ عَبْدَيْنِ مَثَلاً) یان بە شاهیدیی دوو کۆیلە ماڵی لێوەرگرتوم. یان–بۆ وێنە– بە ڕێگایەکیتری ناشەرعی، ئەوە (أُحْضِرَ وَفُصِلَتْ خُصُومَتُهُمَا) قازییەکە لە دادگادا ئامادە

دەكرێ‌و كێشەكەیان دەبڕێندرێتەوە (وَإِنْ قَالَ حَكَمَ بِعَبْدَيْنِ وَلَمْ يَذْكُرْ مَالاً) ئەگەر كەسەكە گوتی: بە شاهیدیی دوو كۆیلە بڕیاری داوە. باسی هیچ ماڵیشی نەكرد، ئەو كاتەش (أُحْضِرَ) قازییەكە ئامادە دەكرێ تا وەڵامی داوایەكە بداتەوە.

(وَقِيلَ: لاَ حَتَّى يُقِيمَ بَيِّنَةً بِدَعْوَاهُ) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: نابێ ئامادە بكرێ تا كەسەكە شاهید لە سەر داوایەكەی دێنێ (فَإِنْ أُحْضِرَ وَأَنْكَرَ) جا ئەگەر قازییەكە ئامادە كراو گوتی: كەسەكە ڕاست ناكاو ئەو بڕیارەم نەداوە، ئەو كاتە (صُدِّقَ بِلاَ يَمِينٍ فِي الأَصَحِّ) بە بێ‌سوێند باوەڕی پێ‌دەكرێ، بەڵام (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (اَلأَصَحُّ بِيَمِينٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر: بە سوێندخواردن باوەڕ بە قازییەكە دەكرێ (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَلَوْ اُدُّعِيَ عَلَى قَاضٍ جَوْرٌ فِي حُكْمٍ) ئەگەر قازییێك –لە حاڵەتی‌دەسەڵاتی‌دا– داوای لە سەر تۆمار كرا: كە ستەمی لە بڕیارێكدا كردووە، ئەوە (لَمْ يُسْمَعْ ذَلِكَ) ئەو داوایە گوێ نادرێتێ‌و قازییەكە سوێند نادرێ، بەڵكو (وَيُشْتَرَطُ بَيِّنَةٌ) بە مەرج داندراوە: دەبێ شاهید هەبن كە ستەمی كردوە، ئینجا داوایەكە وەردەگیرێ.

بەڵام (وَإِنْ لَمْ تَتَعَلَّقْ بِحُكْمِهِ) ئەگەر داوایەكە پەیوەندی بە بڕیاری قازییەكەوە نەبێ: وەك داواكارەكە بڵێ: قازی قەرزداری منە. یان ماڵی لێ‌زەوت كردوم. ئەو كاتە (حَكَمَ بَيْنَهُمَا خَلِيفَتُهُ أَوْ غَيْرُهُ) لەو داوایەدا جێگری قازی، یان كەسێكی‌تر داد لە نێوانیاندا دەكا، واتە: قازییەكە بەخۆی داد لە نێوان خۆی‌و داواكارەكەی‌دا ناكا.

(فَصْلٌ) لِيَكْتُبِ الإِمَامُ لِمَنْ يُوَلِّيهِ وَيُشْهِدْ بِالْكِتَابِ شَاهِدَيْنِ يَخْرُجَانِ مَعَهُ إِلَى الْبَلَدِ يُخْبِرَانِ بِالْحَالِ، وَتَكْفِي الاِسْتِفَاضَةُ فِي الأَصَحِّ، لاَ مُجَرَّدُ كِتَابٍ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَيَبْحَثُ الْقَاضِي عَنْ حَالِ عُلَمَاءِ الْبَلَدِ وَعُدُولِهِ، وَيَدْخُلُ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ، وَيَنْزِلُ وَسَطَ الْبَلَدِ، وَيَنْظُرُ أَوَّلاً فِي أَهْلِ الْحَبْسِ: فَمَنْ قَالَ حُبِسْتُ بِحَقٍّ أَدَامَهُ، أَوْ ظُلْمًا فَعَلَى خَصْمِهِ حُجَّةٌ،

---

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ڕەووشتەكانی دادكردن ﴾

(لِيَكْتُبِ الإِمَامُ لِمَنْ يُوَلِّيهِ) سوننەتە پێشەوا لە نووسراوێكدا فەرمانەكەی بۆ ئەو قازییە بنووسێ كە دەیكاتە قازی، هەم لە نووسراوەكەدا ئامۆژگاریی بكا: بە لەخواترسان‌و ڕاوێژی زانایان‌و یارمەتیدانی بێ‌هێزەكان، چونكە پێغەمبەرﷺ ئەوهای دەكرد، هەوەك (أهل السنن) گێڕاویەتیانەوە، هەم (وَيُشْهِدْ بِالْكِتَابِ شَاهِدَيْنِ) سوننەتە: دوو شاهدیش بۆ نووسراوەكە بگرێ: كە (يَخْرُجَانِ مَعَهُ إِلَى الْبَلَدِ) دوو شاهیدەكان لەگەڵ قازییەكەدا بڕۆنە ئەو شارەی بۆی داندراوە، تاكو (يُخْبِرَانِ بِالْحَالِ) خەبەر بدەنە دانیشتووانی شارەكە بە دانانی ئەم قازییە.

بەڵام (وَتَكْفِي الاِسْتِفَاضَةُ) بڵاوبوونەوەی خەبەری دانانی قازییەكە لەجیاتی شاهیدەكان بەسەو واجبە: خەڵكەكە گوێڕایەڵی قازییەكە بن (فِي الأَصَحِّ) لە

فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە پێغەمبەرﷺ شاهیدی لەگەڵ قازییەکاندا نەدەنارد، بەلاّم (لاَ مُجَرَّدُ كِتَابٍ) تەنها نووسراوەکە –بێشاهیدو بێبلاّوبوونەوەی خەبەرەکە– بەس نیە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، چونکە دەگونجێ نووسراوەکە درۆ بێ.

بۆیێ لە مەزهەبی (الشافعی)دا: (هیچ شاهیدیو هیچ بڕیارێك بە نووسین جێگیر نابێ و باوەڕی پێناکرێ، واتە: نوسینەکە–تەنها– بۆ وەبیرهاتنەوەیە)، هەروەك لە (الشروانی)دا گێڕاویەتیەوە.

(وَيَبْحَثُ الْقَاضِي عَنْ حَالِ عُلَمَاءِ الْبَلَدِ وَعُدُولِهِ) سوننەتە قازییەکە پێش ئەوەی بڕواتە ناو شارەکە: لە حاڵیزانایانو دادپەروەرەکانی شارەکە بکۆڵێتەوە، هەم (وَيَدْخُلُ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ) سوننەتە: ڕۆژی دووشەممە بڕواتە ناو شارەکەو (وَيَنْزِلُ وَسَطَ الْبَلَدِ) لە ناوەندی شارەکە دابەزێ بۆ دادکردن تاکو خەڵك بە یەکسانی بیگاتێ.

ئینجا (وَيَنْظُرُ أَوَّلاً فِي أَهْلِ الْحَبْسِ) یەکەمجار–پێش هەموو کارێك– تەماشای حاڵی بەندکراوەکانی ناو بەندیخانەکە دەکا: (فَمَنْ قَالَ حُبِسْتُ بِحَقٍّ) جا هەر بەندکراوێك گوتی: بە هۆی مافێك بەند کراوم. ئەوە (أُدَامَهُ) لە بەندیخانەدا دەیهێڵێتەوە تا مافەکە دەداتەوە (أَوْ) یان ئەگەر گوتی: (ظُلْمًا) بە ناهەق بەند کراوم. ئەوە (فَعَلَى خَصْمِهِ حُجَّةٌ) ئەگەر داواکارەکەی ئامادەبێ، واجبە: بەڵگەیەکی شەرعی بێنێ کە بە هۆی مافێك بەندی کردوە.

فَإِنْ كَانَ غَائِبًا كَتَبَ إِلَيْهِ لِيَحْضُرَ، ثُمَّ فِي الأَوْصِيَاءِ، فَمَنْ ادَّعَى وِصَايَةً سَأَلَ عَنْهَا وَعَنْ حَالِهِ وَتَصَرُّفِهِ فَمَنْ وَجَدَهُ فَاسِقًا أَخَذَ الْمَالَ مِنْهُ، أَوْ ضَعِيفًا عَضَّدَهُ بِمُعِينٍ، وَيَتَّخِذُ مُزَكِّيًا وَكَاتِبًا وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهُ مُسْلِمًا عَدْلاً عَارِفًا بِكِتَابَةِ مَحَاضِرَ وَسِجِلاَّتٍ، وَيُسْتَحَبُّ فِقْهٌ وَوُفُورُ عَقْلٍ وَجَوْدَةُ خَطٍّ، وَمُتَرْجِمًا وَشَرْطُهُ عَدَالَةٌ وَحُرِّيَّةٌ وَعَدَدٌ، وَالأَصَحُّ جَوَازُ أَعْمَى،

---

(فَإِنْ كَانَ غَائِبًا) جا ئەگەر داواکارەکەی لێرە نەبو، بەڵکو لە شوێنێکیتر بوو، ئەو کاتە (كَتَبَ إِلَيْهِ لِيَحْضُرَ) قازییەکە بۆی دەنووسێ تاکو ئاماد ببێو بەڵگەی بێنێ، جا ئەگەر داواکارەکە بەڵگەی نەهێنا، یان نەهاتو ئامادەنەبو، هەم وەکیلیشی نەنارد، ئەو کاتە بەندکراوەکە سوێند دەدرێو بەرهەڵ دەدرێ، هەوەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی.

(ثُمَّ فِي الأَوْصِيَاءِ) ئینجا لە دوایبەندکراوەکان تەماشای حاڵیسەرەوەسێتو سەرپەرشتکارەکان دەکا: (فَمَنْ ادَّعَى وِصَايَةً) جا هەر کەسێك داوای سەروەسێتیی کرد، ئەوە (سَأَلَ عَنْهَا وَعَنْ حَالِهِ) پرسیار لە خەڵکەکە دەکا: لەبارەی سەر وەسێتیەکەو حاڵی سەروەسێتەکەو هەم (وَتَصَرُّفِهِ) لەبارەی دەستکاریەکەشی، جا (فَمَنْ وَجَدَهُ فَاسِقًا) هەر سەروەسێتێكو هەر سەرپەرشتکارێکی دەست کەوت: فاسقە، ئەوە (أَخَذَ الْمَالَ مِنْهُ) واجبە ماڵەکەی لێوەربگرێتەوەو یەکێکیتری ئەمین لەجێی دابنێ (أَوْ ضَعِيفًا) یان

ئەگەر دیتی بێهێزە لە بەڕێوەبردنیکارەکەیدا، ئەو کاتە (عَضَّدَهُ بِمُعِينٍ) بە یارمەتیدەرێك بەهێزی دەکا.
(وَيَتَّخِذُ مُزَكِّيًا) بۆ قازی سوننەتە: دوو شاهیدناس دابنێ تاکو لە حاڵی شاهیدەکان بکۆڵنەوە، هەم (وَكَاتِبًا) نووسەرێکیش دابنێ، چونکە پێویستی دەبێ (وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهُ مُسْلِمًا عَدْلاً) بە مەرج دادەندرێ نووسەرەکە: موسوڵمانو دادپەروەر بێ، هەم (عَارِفًا بِكِتَابَةِ مَحَاضِرَ) لێزان بێ بۆ نووسینی کۆنووسەکان، واتە: ڕووداوەکانی ئامادەبوونی کێشەکارەکان لە دادگادا، هەم (وَسِجِلاَّتٍ) بۆ نووسینو تۆمارکردنی بڕیارەکانیدادگا لە تۆمارگەکاندا.
(وَيُسْتَحَبُّ فِقْهٌ) سوننەتە نووسەرەکە شەرعزان بێ، هەم (وَوُفُورُ عَقْلٍ) عەقڵێکی زۆری هەبێ، تاکو فێڵی لێنەکرێ، هەم (وَجَوْدَةُ خَطٍّ) دەستنووسیشی جوانو ئاشکرا بێو شوێنی فێڵکردن لە نێوان ووشەکاندا نەهێڵێ.
(وَ) هەروەها (مُتَرْجِمًا) بۆ قازی سوننەتە: زمانگۆڕ دابنێ، تاکو زمانی کێشەکارەکانی بۆ ڕوون بکاتەوە (وَشَرْطُهُ عَدَالَةٌ) مەرجی زمانگۆڕەکەش ئەوەیە: موسوڵمانێکی دادپەروەر بێ، هەم (وَحُرِّيَّةٌ) ئازادبێ، هەم (وَعَدَدٌ) ژمارەیان بگاتە دوو زمانگۆڕی پیاو، یان پیاوێكو دوو ئافرەت بۆ مافەکانی ماڵی (وَالأَصَحُّ جَوَازُ أَعْمَى) بە فەرموودەی ڕاستتر دروستە: کوێر زمانگۆڕی بۆ قازی بکا.
وَاشْتِرَاطُ عَدَدٍ فِي إِسْمَاعِ قَاضٍ بِهِ صَمَمٌ، وَيَتَّخِذُ دِرَّةً لِلتَّأْدِيبِ، وَ سِجْنًا لأَدَاءِ حَقٍّ وَلِتَعْزِيرٍ، وَيُسْتَحَبُّ كَوْنُ مَجْلِسِهِ فَسِيحًا بَارِزًا مَصُونًا مِنْ أَذَى حَرٍّ وَبَرْدٍ لاَئِقًا بِالْوَقْتِ وَالْقَضَاءِ لاَ مَسْجِدًا، وَيُكْرَهُ أَنْ يَقْضِيَ فِي حَالِ غَضَبٍ وَجُوعٍ وَشِبَعٍ مُفْرِطَيْنِ، وَكُلِّ حَالٍ يَسُوءُ خُلُقُهُ فِيهِ، وَيُنْدَبُ أَنْ يُشَاوِرَ الْفُقَهَاءَ، وَأَنْ لاَ يَشْتَرِيَ وَيَبِيعَ بِنَفْسِهِ، وَلاَ يَكُونَ لَهُ وَكِيلٌ مَعْرُوفٌ،

---

(وَ) هەر بەفەرموودەی ڕاستتر: (اشْتِرَاطُ عَدَدٍ) مەرجە: دوو کەس هەبن (فِي إِسْمَاعِ قَاضٍ بِهِ صَمَمٌ) لەو حاڵەتەی قازی گوێی گرانە، تاکو قسەی کێشەکەرەکانی بخەنە گوێ، بەڵام ئەگەر قازی کەڕ بێ، ئەو کاتە لە کار دەکەوێ، هەروەك ڕابرا.
(وَيَتَّخِذُ دِرَّةً لِلتَّأْدِيبِ) بۆ قازی سوننەتە: قەمچیەك بە دەستیەوە بگرێ بۆ تەمبێکردنی خەڵك، هەروەك ئیمامی(عمر)ﷺ بە دەستیەوە دەگرت، هەم (وَ سِجْنًا) سوننەتە بەندیخانەیەکیش دابنێ (لأَدَاءِ حَقٍّ وَلِتَعْزِيرٍ) بۆ دانەوەی مافو بۆ تەمبێکردن، هەروەك ئیمامی(عمر)ﷺ وایکردوە.
(وَيُسْتَحَبُّ كَوْنُ مَجْلِسِهِ فَسِيحًا) سوننەتە: دانیشگەی قازی فراوان بێو (بَارِزًا) ئاشکرا بێو گشت کەسێك پێی بزانێو (مَصُونًا مِنْ أَذَى حَرٍّ وَبَرْدٍ) پارێزراوبێ لە ئازاری گەرماو سەرما (لاَئِقًا بِالْوَقْتِ) شیاوی کاتی دادکردنەکە بێو بارانو تیشکی ڕۆژی هاوین لێینەدا، هەم

(وَالْقَضَاءِ) شیاوی دادتێداکردنیش بێ (لاَ مَسْجِدًا) مزگەوت نەبێ، چونکە مزگەوت کەڵکی هاتنی هەموو کەسێکی نیەو ناپەسندە بکرێتە دانیشگەی دادکردن.

(وَيُكْرَهُ أَنْ يَقْضِيَ فِى حَالِ غَضَبٍ) ناپەسندە قازی داد بکا: لە حاڵـەتی توڕەییـدا، هـەم (وَجُوعٍ وَشِبَعٍ مُفْرِطَيْنِ) لە حاڵەتی برسیەتیو تێریەتیی لە سنور بەدەر، هەم (وَكُلِّ حَالٍ يَسُوءُ خُلُقُهُ فِيهِ) لە گشت حاڵەتێکیتردا کە خولقی خراپ ببێ: وەك حاڵـەتی نەخۆشـیو دڵتەنگیو ترسو میزو پیسایی ڕاگرتنو زۆر دڵخۆشیو بۆرژان، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَيَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اِثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ﴾ رواه الشيخان، هیچ دادوەرێك داد نەکا لە نێوان دوو کەساندا لە حاڵەتیتوڕەییدا. واتە حاڵەتەکانیتریش (قیاس) کراونە سەر توڕەیی.

(وَيُنْدَبُ أَنْ يُشَاوِرَ الْفُقَهَاءَ) سوننەتە: قازی ڕاوێژ بە شەرعزانەکان بکا: لەو حاڵەتـەی لـە ڕووداوێکدا بەڵگـەکان بەرامبـەر یـەکتری دەبنـەوە، هـەم (وَأَنْ لاَ يَشْتَرِيَ وَيَبِيعَ بِنَفْسِهِ) سوننەتە: قازی بەخۆی کڕینو فرۆشتنو مامڵەتەکانیتر نەکا، چـونکە خـاتری دەگـیرێو ئەویش خاترگرەکەی خۆش دەوێو مەترسی بوونە بەرتیلی لێدەکرێ، کەوابو: (وَلاَ يَكُونَ لَهُ وَكِيلٌ مَعْرُوفٌ) نابێ وەکیلێکی ناسراویشی هەبێ، نەوەك خاتری بگیرێ.

﴿ بەرتیل و دیاری بۆ قازی=دادوەر ﴾

**پێشەکی** بزانە: هەر شتێك بدرێتە قازی، یان هەر کاربەدەستێکیتر، یان هەر کـارێکی بـۆ بکرێ تاکو بە ناهەق بڕیار بدا، یان ڕاستی بشارێتەوەو بڕیار بە ڕاستیەکە نەدا–واتە: هەق

فَإِنْ أَهْدَى إِلَيْهِ مَنْ لَهُ خُصُومَةٌ أَوْ لَمْ يُهْدِ قَبْلَ خُصُومَةَ جَازَ بِقَدْرِ الْعَادَةِ، وَالأَوْلَى أَنْ يُثِيبَ عَلَيْهِ فَالْمُشْتَرَكِ، وَكَذَا أَصْلُهُ وَفَرْعُهُ عَلَىالصَّحِيحِ، وَيَحْكُمُ لَهُ وَلِهَؤُلاَءِ الإِمَامُ أَوْ قَاضٍ آخَرُ،

منهاج– بەرگیپێنجەم–21

---

بکاتە ناهەق، ناهەقیش بکاتە هەق– ئەوە بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام حەرامەو دەبێتە بـەرتیل، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچـاوەکاندا فەرموویانـە، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿لَعَنَ اللهُ الرَّاشِيَ وَالْمُرْتَشِيَ وَالرَّائِشَ﴾ حديث صحيح رواه الامام احمد وغيره، لەعنەتی خوا: لە بەرتیلدەرو لە بەرتیلخۆرو لەو کەسەی لە سەر بەرتیلەکە پێکیان دێنێ.

جا بزانە: ئەگەر کەسێك دەیزانی: قازی، یان کاربەدەستێك، یان ستەمکارێك بە ناهەق ماڵی لێدەستێنێ، یان کارێکی ڕەوای بۆ جێبەجێ ناکا ئەگەر پـارەی نـەداتێ، ئـەویش بۆیـێ پـارەی دایـێ، ئـەوە لـەو حاڵەتـەدا بەرتیلدەرەکـە گوناهبـار نابـێ، تـەنها بەرتیلخۆرەکـە گوناهبارەو ماڵەکەی لێحەرامە، بەڵام ئەگەر شتێك بداتە کەسێك تاکو لە لای کاربەدەستێك کـارێکی ڕەوای بـۆ جێبـەجێ بکـا، ئـەو کاتـە هیچیێکیان گوناهبـار نـابنو پارەکـەش لـە پارەوەرگرەکە حەڵاڵە، هەروەك لە (تحفه)دا لێرەو لە (پەڕتوکی خواردەمەنیـەکان)دا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ أَهْدَى إِلَيْهِ مَنْ لَهُ خُصُومَةٌ) جا ئەگەر ئەو کەسەی کێشەیەکی هەیە دیاریی بۆ قازی نارد، یان میوانداریی کرد، یان کارێکی بۆکرئ بۆ کرد (أَوْ) یان کەسەکە هیچ کێشەیەکی نەبو، بەڵام (لَمْ يُهْدِ قَبْلَ وِلاَيَتِهِ) پێش ببێتە قازی دیاریی بۆ نەدەنارد، ئەوە لـە هـەردوو حاڵەتدا (حَرُمَ قَبُولُهَا) لە قازییەکە حەرامە دیارییەکە قبولْ بکاو ئەگەر قبوڵیشـی بکـا نابێتە ملکیخۆی، کەواتە: واجبە: بۆ خاوەنەکەی بیگەڕێنێتەوە، جا ئەگەر نەگونجا با لە (بيت المال) دایبنێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿هَدَايَا الْعُمَّالِ غُلُولٌ﴾ وفیرواية: ﴿سُحْتٌ﴾ رواه البيهقي باسناد حسن، دیارییەکانی کاربەدەستان حەرامن.
بەڵام (وَإِنْ كَانَ يُهْدِي وَلاَ خُصُومَةَ) ئەگەر کەسەکە–پێش ببێتە قازی– دیاریی بۆ دەناردو ئێستاش هیچ کێشەیەکی نەبو، ئەو کاتـە (جَـازَ بِقَـدْرِالْعَادَةِ) دروستـە بـەگوێرەی عـادەت دیاریی لێوەربگرێ، بەڵام (وَالأَوْلَى أَنْ يُثِيبَ عَلَيْهَا) وا باشترە لـە پاداشـتی دیارییەکـە قازی شتێکی بداتێ.
(وَلاَ يَنْفُذُ حُكْمُهُ) دادکردنـی قـازی=دادوەر جێبـەجێ نابـێ: (لِنَفْسِـهِ) بـۆ سـودی خـۆیو (وَرَقِيقِهِ) بۆ سودی کۆیلەی خۆی، هەم (وَشَرِيكِهِ فِيالْمُشْتَرَكِ) بۆ سودی هاوبەشەکەی لەو ماڵەی لە نێوان خۆیو ئەودا هاوبەشە (وَكَذَا أَصْلُهُ وَفَرْعُهُ) هەروەها دادکردنی بـۆ سـودی دایكو باوكو کوڕو کیژەکانیشی جێبەجێ نابێ (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە ئەوانە گشتی تۆمەتی تێدایە، کەوابو: (وَيَحْكُمُ لَهُ وَلِهَؤُلاَءِ الإِمَامُ أَوْ قَاضٍ آخَرُ) بـۆ
وَكَذَا نَائِبُهُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَإِذَا أَقَرَّ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ أَوْ نَكَلَ فَحَلَفَ الْمُدَّعِي وَسَأَلَ الْقَاضِيَ أَنْ يُشْهِدَ عَلَى إِقْرَارِهِ عِنْدَهُ أَوْ يَمِينِهِ أَوِ الْحُكْمَ بِمَا ثَبَتَ وَالإِشْهَادَ بِهِ لَزِمَهُ، أَوْ أَنْ يَكْتُبَ لَهُ مَحْضَرًا بِمَا جَرَى مِنْ غَيْرِ حُكْمٍ أَوْ سِجِلاًّ بِمَا حَكَمَ اُسْتُحِبَّ إِجَابَتُهُ، وَقِيلَ: تَجِبُ، وَيُسْتَحَبُّ نُسْخَتَانِ: إِحْدَاهُمَا لَهُ وَالأُخْرَى تُحْفَظُ فِي دِيوَانِ الْحُكْمِ، وَإِذَا حَكَمَ بِاجْتِهَادِهِ

---

قازیو بۆ ئەوانەیڕابردوو: یان پێشەوا داد دەکا، یان قازیێکیتر (وَكَذَا نَائِبُهُ عَلَى الصَّحِيحِ) هەروەها جێگری قازیش داد بۆ قازیو بۆ ئەوانیتر دەکا، لە سەر فەرموودەی ڕاست.
جا بزانە: ئەگەر دادکردنەکەی بۆ سودی ئەوانەیڕابردوو نەبێ بەڵکو لە زەرەی ئەوان بێ، یـان بـۆ سـودی هاوبەشـەکەی بـێ بـەڵام لـە ماڵـە هاوبەشـەکەیدا نـەبێ، ئـەو کاتـە دادکردنەکـەی جێبـەجێ دەبـێ، چـونکە تۆمـەتی تـێدا نیـە، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

### ﴿ تۆمارکردنی ڕووداوەکانی دادگا ﴾

(وَإِذَا أَقَرَّ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ) هەر کاتێك داوالێکراو دانی بە مافەکەدا هێنا (أَوْ نَكَلَ) یان سوێندی نەخوارد، بەڵام (فَحَلَفَ الْمُدَّعِي) داواکار سوێندیگەڕاندراوەی خوارد، یان شاهیدی هێنان،

ئینجا (وَسَأَلَ الْقَاضِي) داواكارەكە داوای لە قازی كرد: (أَنْ يُشْهِدَ عَلَى إِقْرَارِهِ عِنْدَهُ) دوو شاهید بگرێ: لە سەر دانپێداهێنانی داوالێكراوەكە لە لای قازی (أَوْ يَمِينه) یان لە سەر سوێندخواردنی داواكارەكە (أَوْ) یان داواكارەكە داوای كرد (الْحُكْمَ بِمَا ثَبَتَ) قازی بڕیاری بۆ بدا بەو مافەی لە لای جێگیر بووەو هەم (وَالإِشْهَادَ بِهِ) شاهیدیش بۆ بڕیارەكە بگرێ، ئەوە (لَزِمَهُ) لە سەر قازی واجبە: داواكاریەكەی بەجێ بێنێ.

هەروەها ئەگەر داوا لێكراوەكەش سوێند بخوا، ئینجا داوا لە قازی بكا: شاهید لە سەر سوێندەكەی بگری تاكو ببێتە بەڵگەو جارێكیتر داوای سوێندی لێنەكرێ، واجبە: قازی داوایەكەی بەجێ بێنێ.

(أَوْ) یان ئەگەر داواكارەكە داوای كرد: (أَنْ يَكْتُبَ لَهُ مَحْضَرًا بِمَا جَرَى مِنْ غَيْرِ حُكْمٍ) قازی كۆنووسێكی=ئامادەبوونێكی ئەو ڕووداوەی بۆ بنووسێ بێبڕیاردان (أَوْ سِجِّلاً بِمَا حَكَمَ) یان ئەو بڕیارەی داویەتی بە نووسین بۆی تۆمار بكا، ئەو كاتە (اُسْتُحِبَّ إِجَابَتُهُ) سوننەتە داواكاریەكەی بەجێ بێنێ (وَقِيلَ تَجِبُ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا واجبە (وَيُسْتَحَبُّ نُسْخَتَانِ) بۆ قازی سوننەتە: دوو دانە بنووسێ: (إِحْدَاهُمَا لَهُ) یەكێكیان بدرێتە خاوەن مافەكەو (وَالأُخْرَى تُحْفَظُ فِي دِيوَانِ الْحُكْمِ) دانەكەیتریش لە دیوانیدادگادا بپارێزرێ.

﴿ هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری قازی=دادوەر ﴾

(وَإِذَا حَكَمَ بِاجْتِهَادِهِ) هەر كاتێك قازی (مُجْتَهِد) بوو-بەگوێرەی شەرعیئیسلام- بە (إجتهاد)یخۆی (حُكم)ێكی كرد، یان (مُجْتَهِد) نەبو، بەلام بە (إجتهاد)ی ئیمامێكیخۆی ثُمَّ بَانَ خِلاَفَ نَصِّ الْكِتَابِ أَوِ السُّنَّةِ أَوِ الإِجْمَاعِ أَوْ قِيَاسٍ جَلِيٍّ نَقَضَهُ هُوَ وَغَيْرُهُ، لاَ خَفِيٍّ، وَالْقَضَاءُ يَنْفُذُ ظَاهِرًا لاَ بَاطِنًا،

---

(حُكم)ێكی كرد (ثُمَّ بَانَ خِلاَفَ نَصِّ الْكِتَابِ أَوِ السُّنَّةِ أَوِ الإِجْمَاعِ أَوْ قِيَاسٍ جَلِيٍّ) ئینجا ئاشكرا بوو: (حُكم)كردنەكەی دژ بە دەققی قورئان، یان دژ بە حەدیس، یان دژ بە (إجماع)، یان دژ بە (قیاس)ێكی ئاشكرایە، ئەوە (نَقَضَهُ هُوَ وَغَيْرُهُ) واجبە: بەخۆیو هەم قازیەكانیتریش ئەم (حُكم)ە هەڵبوەشێننەوە، وەك بڵێ: (ئەم (حُكم)ەم هەڵوەشاندەوە).

كەوابو: (حُكْم)=بڕیارەكانی دادوەرەكانی ئێستا هیچیان دروست نیە جێبەجێ بكرێن، چونكە دژی شەریعەتیئیسلامنو بە یاسای دەستكرد بڕیارەكان دراون، بۆیێ قازیەكان= دادوەرەكانیش (ظالم)و (فاسق)ن، بەڵكو ئەگەر باوەڕیان بە شەرعیئیسلام نەبێ، ئەو كاتە (كافر)ن، هەروەك لە پێشەكیی ئەم باسەدا ڕوونمان كردەوە.

هەروەها ئەگەر (حُكم)كردنەكەی دژ بە هەر چوار مەزهەبەكەی (أهل السُّنة) بێ، ئەو كاتەش واجبە: هەڵبوەشێندرێتەوە، چونكە لادان لەو چوار مەزهەبە، وەكو لادانە لە (إجماع)ی زانایانیئیسلام، هەروەك ئیمامی (السُّبكي) فەرمویەتیو لە (تحفة) و(نهایة)دا

گیڕاویەتیانەوە، کەواتە: بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام: بۆ دادکردن‌و بۆ (فتوا)دان دروست نیە: لەو چوار مەزهەبە لابدا، هەم دروستیش نیە: بە فەرموودە بێ‌هێزەکانی ئەو چوار مەزهەبە داد بکا، هەروەك (تحفة) لە ئیمامی (القرافي)و (ابن الصلاح)ی گێڕاوەتەوە (لاَ خَفِيٌّ) بەلاَم ئەگەر بڕیارەکە دژ بە (قیاس)ێکی پەنهان بوو، ئەو کاتە نابێ بڕیارەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

## ﴿ بە بڕیاری دادگا حەڕام نابێتە حەڵاڵ ﴾

(وَالْقَضَاءُ) بڕیاری قازی=دادوەر-ئەگەر لە پەنهانیدا بە پێچەوانەی ڕاستی بوو- ئەوە (يَنْفُذُ ظَاهِرًا) لە ئاشکراییدا جێبەجێ دەبێ (لاَ بَاطِنًا) بەلاَم لە پەنهانیدا جێ بەجێ نابێ، واتە: بەم (حُکْم)کردنە حەڕام حەڵاڵ نابێ‌و حەڵاڵیش حەڕام نابێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرمویێ: ﴿إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ فَأَقْضِي عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ أَخِيهِ شَيْئاً فَلاَ يَأْخُذْهُ فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قَطْعَةً مِنَ النَّارِ﴾ رواه الشيخان، من وەکو ئێوە ئادەمیزادم، ئێوە کێشەکەتان دێننە لای من، وا دەبێ هەندێکتان لە هەندێکتان بەهێزترو ڕەوانترە بۆ بەڵگەهێنان، منیش واتێ‌دەگەم ڕاست دەکاو بەگوێرەی ئەو ئاشکراییەی گوێم لێ‌دەبێ بڕیاری بۆ دەدەم، جا هەر کەسێك بڕیارم بۆ دا: لە مافی برای خۆی شتێکی بدرێتێ-لە ڕاستی‌شدا مافی شتەکەی نەبو- با وەری‌نەگرێ، چونکە من بەو بڕیارەم پارچەیەکی لە ئاگر بۆ دەبڕمەوە.

واتە: چونکە خوای گەورە فەرمانی بە ئێمە نەکردوە لە ناو دڵی خەڵك بکۆڵینەوە، بۆیێ ئێمە بەگوێرەی ئاشکرایی بڕیار دەدەین‌و پەنهانیش لە دەست خوای گەورەدایە، جا ئەگەر

وَلاَ يَقْضِي بِخِلاَفِ عِلْمِهِ بِالإِجْمَاعِ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يَقْضِي بِعِلْمِهِ إِلاَّ فِي حُدُودِاللهِ تَعَالَى، وَلَوْ رَأَى وَرَقَةً فِيهَا حُكْمُهُ أَوْ شَهَادَتُهُ أَوْ شَهِدَ شَاهِدَانِ أَنَّكَ حَكَمْتَ أَوْ شَهِدْتَ بِهَذَا لَمْ يَعْمَلْ بِهِ وَلَمْ يَشْهَدْ حَتَّى يَتَذَكَّرَ، وَفِيهِمَا وَجْهٌ فِي وَرَقَةٍ مَصُونَةٍ عِنْدَهُمَا، وَلَهُ الْحَلِفُ عَلَى اِسْتِحْقَاقِ حَقٍّ أَوْ أَدَائِهِ اعْتِمَادًا

---

لە پەنهانیدا ڕاست نەکا، ئەوە بە بڕیارەکەی ئاشکرایی شتەکەی بۆ حەڵاڵ نابێ.

کەواتە: ئەو بڕیارانەی ئێستا-بە هۆی فێڵبازی (الْمُحَامِي)=پارێزەر- لە دادگاکان دەدرێن، هیچیان نە لە پەنهانی‌و نە لە ئاشکراییدا جێبەجێ نابن‌و حەڕامەکەش حەڵاڵ نابێ.

کەوابو: ئەگەر ژنێك دەیزانی مارەبڕینی لە مێردەکەی دروست نەبوە، یان دەیزانی مێردەکەی تەلاَقی کەوتوەو قازی=دادوەریش بە پێچەوانەی ڕاستی بڕیاری دابو، ئەوە لە سەر ژنەکە واجبە: ڕا بکا، بەڵکو ئەگەر مێردەکەی وازی لێ‌نەهێنێ، ئەو کاتە واجبە: بەرگری لە ناموسەکەی خۆی بکاو بیکوژێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلاَ يَقْضِي بِخِلاَفِ عِلْمِهِ بِالإِجْمَاعِ) بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام: دروست نیەو نابێ قازی

بە پێچەوانەی زانینی خۆی (حُكم) بكا، وەك دوو شاهید شاهیدی بدەن: ئەم دووانـە ژنو مێردن، بەڵام قازی بێگومان بزانێ سێبەسێ تەڵاقی داوە، یان شـیری لەگـەڵ خـواردوە.
ئەوە دروست نیە بەگوێرەی شاهیدەكان بڕیاری ژنو مێردایەتی بدا.
(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ يَقْضِي بِعِلْمِهِ إِلاَّ فِـى حُـدُودِ اللهِ تَعَـالَى) بـۆ قـازی دروستە: بەگوێرەی زانینیخۆی (حُكم) بكا، تەنها لە سزای تاوانەكانی مافی خوادا دروست نیە، وەك بزانێ كەسێك زینای كردوە، نابێ بەگوێرەی زانینیخۆی سزای بدا، بەڵكو مەرجە چوار شاهید هەبن.

## ﴿ پشت بەستن بە نووسراوی كەسێكیتر بۆ شاهیدیو سوێندخواردن ﴾

(وَلَوْ رَأَى وَرَقَةً فِيهَا حُكْمُهُ) ئەگەر قازی نووسراوێكی دیت (حُكم)كردنێكی خۆیی تێدا بوو (أَوْ شَهَادَتُهُ) یان كەسێك دیتی نووسراوێك شاهیدییخۆی تێدا بوو (أَوْ شَهِدَ شَاهِدَانِ أَنَّكَ حَكَمْتَ أَوْ شَهِدْتَ بِكَذَا) یان دوو شاهید شاهیدییان دا: كە تۆ ئەم (حُكم)ەت كـردوە، یـان ئەم شاهیدییەت داوە، ئەوە (لَمْ يَعْمَلْ بِهِ وَلَمْ يَشْهَدْ حَتَّى يَتَذَكَّرَ) دروست نیەو نابێ قازی كار بەم نووسراوە بكاو نابێ شاهیدەكەش شاهیدیی پێبدا تا دێتەوە بیری.
بەڵام (وَفِيهِمَا وَجْهٌ: فِي وَرَقَةٍ مَصُـونَةٍ عِنْـدَهُمَا) لـەبارەی كاركردنەكـەو شـاهیدیدانەكەی بەگوێرەی نووسراوەكە، فەرموودەیەك هەیە: كە دروستە بۆ كاركردنو بۆ شاهیدیی پشت بەو نووسراوە ببەستن كە لە لایخۆیان پارێزراوەو گومانی دەستكارییكردنی لێناكرێ.
جا ئەمە لەبارەی بڕیاردانو شاهیدی بوو، بەڵام (وَلَهُ الْحَلِفُ) بۆ مرۆڤ دروستە سوێند بخوا: (عَلَى اسْتِحْقَاقِ حَقٍّ أَوْ أَدَائِهِ) لە سەر هەبوونی مافێك، یان لە سەر دانەوەی مافێك (اعْتِمَادًا عَلَى خَطِّ مُوَرِّثِهِ إِذَا وَثِقَ بِخَطِّهِ وَأَمَانَتِهِ، وَالصَّحِيحُ جَوَازُ رِوَايَةِالْحَدِيثِ بِخَطٍّ مَحْفُوظٍ عِنْدَهُ.
(فَصْـــلٌ) لِيُسَـــوِّ بَـــيْنَ الْخَصْـــمَيْنِ فِـــى دُخُـــولٍ عَلَيْـــهِ، وَ قِيَـــامٍ لَهُمَـــا، وَاسْتِمَاعٍ، وَطَلاَقَةِ وَجْهٍ، وَجَوَابِ سَلاَمٍ، وَمَجْلِسٍ، وَالأَصَحُّ رَفْعُ مُسْلِمٍ عَلَى ذِمِّيٍّ فِيهِ،

---

عَلَى خَطِّ مُوَرِّثِهِ) لەو سوێندخواردنەش پشت بـە دەستنووسـی میراتدەرەكـەی ببەسـتێ: وەك باوكی مردبێ، جا ببینێ باوكی بە دەستیخۆی نووسیویەتی: (فڵانكەس ئەوەنـدە قەرزداری منە)، یان (فڵانە شتەم داوەتە فڵانكەس). ئەوە بـۆی دروسـتە پشـت بـەو دەستنووسە ببەستێو سوێند لە سەر مافەكە بخوا (إِذَا وَثِقَ بِخَطِّهِ وَأَمَانَتِهِ) بەو مەرجەی باوەڕی بە دەستنووسەكەیو ئەمینداریەتیی هەبێ، كەوابو: دروستە لە سـوێندخواردندا پشت بە دەستنووسەكەی خۆیو بە دەستنووسەكەی هاوبەشەكەشی ببەستێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.
(وَالصَّحِيحُ) بە فەرموودەی ڕاست (جَوَازُ رِوَايَةِ الْحَدِيثِ بِخَطٍّ مَحْفُوظٍ عِنْدَهُ) دروستە حەدیس بگێڕێتەوە، بەو دەستنوسەی لە لایخۆی پارێزراوە.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی یەکسانی له نێوان کێشەچیەکاندا ﴾

(لِيُسَوِّ بَيْنَ الْخَصْمَيْنِ) واجبه: قازی یەکسانی بکا لـه نێوان کێشەچـیەکاندا: (فِـي دُخُـولٍ عَلَيْهِ) لـه چـونه لای وی: وەك وێكـڕا ئیزنیـان بـدا بێنـه ژوورەوە، نـەك یـەکێکیان پـێش ئەویتر، هەم (وَ قِيَامٍ لَهُمَا) له لەبەرهەڵسانیشدا: له بەر هـەردووکیان هەڵسـتێ، یـان بـۆ هیچیان هەڵنەستێ، هەم (وَاسْتِمَاعٍ) له گوێلێڕاگرتنی قسەکانیانو تەماشاکردنیاندا، هەم (وَطَلَاقَةِ وَجْهٍ) لـه ڕووخۆشـیو ڕووگـرژی لـه گەڵیانـدا، هـەم (وَجَـوَابِ سَـلَامٍ) لـه سـەلام وەرگرتنەوەدا، هەم (وَمَجْلِسٍ) له دانیشـگەدا ﴿عن عبدالله بن الزبير رضىالله عنهما قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنَّ الْخَصْمَيْنِ يَقْعُدَانِ بَيْنَ يَدَيِ الْحَاكِمِ﴾ صححه الحاكم، پێغەمبـەر ﷺ بڕیاریـداوە: کێشەچیەکان له بەر دەستی دادوەر دابنیشن.

بەڵام (وَالأَصَحُّ) به فەرموودەی ڕاستتر: (رَفْعُ مُسْلِمٍ عَلَى ذِمِّيٍّ فِيهِ) واجبـه: لـه دانیشـگەی دادگادا موسوڵمان بەرزتر بێ له کافری پەیمان لەئەستۆ: وەك له شوێنێکی بـەرزتر، یـان نزیکتر دابنیشێ، چونکه (ئیمامی (علی) ﷺ له سەر زرێیەك کێشەی لەگەڵ جولەکەیەك هـەبوو و هـەردووکیان هاتنـه دادگای قـازی (شُـرَيْح)، ئینجا قـازی (شُـرَيْح) ئیمـامی (علـی)ی لـه جـێی خـۆی دانـا، جا ئیمـامی(علی) فـەرمووی: (ئەگـەر کێشـەکارەکەم موسوڵمان بووایه، من به یەکسانی لەگەڵ وی له بەردەستت دادەنیشتم، بەڵام گوێم له پێغەمبەر ﷺ بـوو، فـەرمووی: ﴿لاَتُسَاوُوهُمْ فِي الْمَجالِسِ﴾ لەگـەڵ جولەکـەو دیانـەکان یەکسانی مەکەن له دانیشگەدا)...تا کۆتایی ڕووداوەکه: که له زۆربەی سەرچاوەکاندا له (البيهقي) گێڕاویەتیانەوە.

وَإِذَا جَلَسَـــا فَلَـــهُ أَنْ يَسْـــكُتَ وَأَنْ يَقُـــولَ لِيَـــتَكَلَّمِ الْمُـــدَّعِي، فَـــإِذَا ادَّعَـــى طَالَـبَ خَصْـمَهُ بِـالْجَوَابِ، فَـإِنْ أَقَـرَّ فَـذَاكَ، وَإِنْ أَنْكَـرَ فَلَـهُ أَنْ يَقُـولَ لِلْمُـدَّعِي: أَلَـكَ بَيِّنَـةٌ؟ وَأَنْ يَسْـكُتَ، فَـإِنْ قَـالَ لِـي بَيِّنَـةٌ وَأُرِيـدُ تَحْلِيفَـهُ فَلَـهُ ذَلِـكَ، أَوْ لاَ بَيِّنَـةَ لِـي ثُـمَّ أَحْضَـرَهَا قُبِلَـتْ فِـي الأَصَـحِّ، وَإِذَا ازْدَحَـمَ خُصُـومٌ قُـدِّمَ الأَسْـبَقُ، فَإِنْ جُهِلَ أَوْ جَاءُوا مَعًا أُقْرِعَ وَيُقَدَّمُ مُسَافِرُونَ مُسْتَوْفِزُونَ وَنِسْوَةٌ وَإِنْ تَأَخَّرُوا

---

(وَإِذَا جَلَسَا) جا هەرکاتێك کێشەچیەکان له پێش قازی دانیشتن، یان به پێوە ڕاوەستان، ئەوە (فَلَهُ أَنْ يَسْكُتَ) بۆ قازی دروسته بێدەنگ بـێ، هـەم (وَأَنْ يَقُولَ: لِيَتَكَلَّمِ الْمُدَّعِي) دروسته بڵێ: با داواکارەکه قسه بکا (فَـإِذَا ادَّعَـى) جا هـەرکاتێك داواکارەکـه داوایـەکی دروستبووی کرد، ئەو کاته (طَالَبَ خَصْمَهُ بِـالْجَوَابِ) قـازی داوا لـه داوالێکراوەکـه دەکـا: وەڵامی داواکارەکەی بداتەوە (فَإِنْ أَقَـرَّ فَـذَاكَ) جـا ئەگـەر داوالێکراوەکـه دانـی بـه مافـه داواکراوەکەدا هێنا، ئەوە ئاشکرایەو واجبه: مافەکه بداته داواکارەکه.

بەڵام (وَإِنْ أَنْكَرَ) ئەگەر داوالێكراوەكە دانی بە مافەكەدا نەهێنا، ئەو كاتە (فَلَـهُ أَنْ يَقُـولَ لِلْمُدَّعِي: أَلَكَ بَيِّنَةٌ؟) بۆ قازی دروستە بڵێتە داواكارەكە: ئایا تۆ دوو شاهیدت هەنـە؟ یـان شاهیدێكت هەیە تاكو سوێندیش بخۆی؟ ئەگەر مافەكە بە شاهیدێكو سوێندی داواكارەكە ئاشكرا ببێ، هەم (وَأَنْ يَسْكُتَ) بۆ قازی دروستە: بێدەنگ ببێ، بەڵام ئەگەر داواكارەكـە نەیدەزانی مافی هەیە شاهید بێنێ، ئەو كاتە واجبە: قازی ئاگاداری بكاتەوە.

(فَإِنْ قَالَ) جا ئەگەر داواكارەكە گوتی: (لِـي بَيِّنَـةٌ وَأُرِيـدُ تَحْلِيفَـهُ) شـاهیدم هەیـە، بـەڵام دەمەوێ داوالێكراوەكە سوێند بدەم. ئەوە (فَلَهُ ذَلِكَ) ئەو مافەی هەیەو دروستە، چـونكە ئەگەر داوالێكراوەكە سوێند نەخواو دان بە مافەكەدا بێنێ، كارەكە ئاسانتر دەبێ.

(أَوْ) یان داواكارەكە گوتی: (لاَ بَيِّنَةَ لِي) شاهیدم نیە. بەڵام (ثُـمَّ أَحْضَـرَهَا) لـە پاشـان شـاهیدی هێنـان، ئـەو كاتـە (قُبِلَـتْ فِيالأَصَـحِّ) لێـی قبـوڵ دەكـرێ، لـە فـەرمووودەی ڕاستتردا، چونكە دەگونجێ لەبیری چووبێ، یان نـەیزانیبێ شـاهیدی هەیـەو لـە پاشـان هاتبێتەوە بیری، یان زانیبێتی.

(وَإِذَا ازْدَحَمَ خُصُومٌ) ئەگەر لە دادگادا چەند كەسێكی داواكار پاڵەپەستەیان بوو، ئەو كاتە (قُدِّمَ الأَسْبَقُ) كامەیان پێشتر هاتوە، واجبە ئەویان وەپێش بێخرێ (فَإِنْ جُهِـلَ أَوْ جَـاءُوا مَعًا) جا ئەگەر پێشترەكە نەزاندرا، یان هەموویان وێكڕا هاتبون، ئەو كاتە (أُقْرِعَ) پشكە لە نێوانیاندا دەكرێ، بەڵام (وَيُقَدَّمُ مُسَافِرُونَ مُسْتَوْفِزُونَ) سوننەتە–بێپشـكە– ئـەو جـۆرە ڕێبوارانە وەپێش بێخـرێن كـە بـە تـەمای ڕۆیشـتنن، نـەوەك دوا بكـەون، هـەم (وَنِسْـوَةٌ) سـوننەتە ئافرەتــەكانیش وەپــێش پیــاوان بێخــرێنو نەخۆشــەكان وەپــێش ســاغەكان بێخرێن (وَإِنْ تَأَخَّرُوا) هەرچەند ڕێبوارەكانو ئافرەتـەكانو نەخۆشـەكانیش دواتـر هـاتبن

مَـا لَـمْ يَكْثُـرُوا، وَلاَ يُقَـدَّمُ سَـابِقٌ وَقَـارِعٌ إِلاَّ بِـدَعْوَى، وَيَحْـرُمُ اتِّخَـاذُ شُـهُودٍ مُعَيَّنِـينَ لاَ يَقْبَــلُ غَيْــرَهُمْ، وَإِذَا شَــهِدَ شُــهُودٌ فَعَــرَفَ عَدَالَــةً أَوْ فِسْــقًا عَمِــلَ بِعِلْمِــهِ، وَإِلاَّ وَجَــبَ الإِسْـتِزْكَاءُ: بِـأَنْ يَكْتُــبَ مَـا يَتَمَيَّــزُ بِــهِ الشَّــاهِدُ وَالْمَشْـهُودُ لَـهُ وَعَلَيْـهِ وَكَذَا قَدْرُ الدَّيْنِ عَلَىالصَّحِيحِ وَيَبْعَثَ بِهِ مُزَكِّيًا ثُمَّ يُشَافِهُهُ الْمُزَكِّي بِمَا عِنْدَهُ،

---

(مَا لَمْ يَكْثُرُوا) بەو مەرجەی زۆر نەبن، واتە: ئەگەر ڕێبوارەكـانو ئافرەتـەكان لـە وانیـتر زۆرتر بون، ئەو كاتە–بێجیاوازی– كامەیان پێشتر هاتبێ ئەویان وەپێش دێخرێ.

ئینجا (وَلاَ يُقَدَّمُ سَابِقٌ وَقَارِعٌ إِلاَّ بِدَعْوَى) ئەو داواكارەی پێشـتر هـاتوە، یـان پشـكەی بـۆ دەرچوە تەنها بۆ دادكردنی یەك داوا وەپێش دێخرێ، واتە: كە ئەم داوایـەی تـەواو بـوو، دەرواتـە دەرەوەو داواكارێكیتر ئامـادە دەبـێ، بـەڵام ڕێبوارەكـانو ئافرەتـان–ئەگـەر داوایەكانیان سوك بێ– دادكردنی هەموو داوایەكانیان وەپێش دێخرێن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيَحْرُمُ اتِّخَاذُ شُهُودٍ مُعَيَّنِينَ) حەرامە: قازی چەند شاهیدێکی دیارکراو بگرێو (لاَ يَقْبَلُ غَيْرَهُمْ) جگە لەو دیارکراوانەش هیچ شاهیدێکیتر قبولّ نەکا، چونکە دەبێتە تەنگکردن لە سەر خەڵکی، بەڵام ئەگەر جگە لە دیارکراوەکان شاهیدەکانیتریش قبولّ بکا، ئەو کاتە حەرام نیە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَإِذَا شَهِدَ شُهُودٌ) هەر کاتێك شاهیدەکان لە لای قازی شاهیدییان دا (فَعَرَفَ عَدَالَةً أَوْ فِسْقًا) قازیش زانی ئەم شاهیدانە دادپەروەرن، یان زانی (فاسق)ن، ئەوە (عَمِلَ بِعِلْمِهِ) بە زانینی خۆی کار دەکا، واتە: شاهیدیدادپەروەر قبولّ دەکا، شاهیدی(فاسق)ش ڕەد دەکاتەوە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر هیچ لە حاڵی شاهیدەکان نەزانێ، ئەو کاتە (وَجَبَ الإِسْتِزْكَاءُ) واجبە: قازی داوای پاکانەی شاهیدەکان بکا، واتە: لە حاڵی شاهیدەکان بکۆڵێتەوە بەم شێوەیە: (بِأَنْ يَكْتُبَ مَا يَتَمَيَّزُ بِهِ الشَّاهِدُ) وەك قازی ناوونیشانەکانی شاهیدەکە بنووسێ کە پێی جیا دەبێتەوە، هەم (وَالْمَشْهُودُ لَهُ وَعَلَيْهِ) ناوونیشانەکانی شاهیدیبۆدراو و شاهیدی لەسەردراویش بنووسێ لەگەڵ کاروپیشەی هەموانیان، نەوەك وەناوی کەسێکیتر بچن، یان دوژمنی یەکتری بن، یان باوكو کوڕییەکتری بن (وَكَذَا قَدْرُالدَّيْنِ) هەروەها ئەندازەی قەرزەکە، یان ماڵەداواکراوەکەش بنووسێ (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە بە هۆی زۆریو کەمیی ماڵەکەش گومانی درۆ و ڕاستی بەهێز دەبێ.

ئینجا (وَيَبْعَثَ بِهِ مُزَكِّيًا) ئەو نووسراوە بە دووشاهیدناسەوە دەنێرێ تاکو بەو نیشانە لە حاڵی شاهیدەکان بکۆڵنەوە، جا ئەو شاهیدناسانەش حاڵی شاهیدەکان لە خەڵکی دەپرسن (ثُمَّ يُشَافِهُهُ الْمُزَكِّي بِمَا عِنْدَهُ) ئینجا شاهیدناسەکە دێتەوە لای قازیو لەبارەی

وَقِيلَ تَكْفِي كِتَابَتُهُ، وَشَرْطُهُ كَشَاهِدٍ مَعَ مَعْرِفَةِ الْجَرْحِ وَالتَّعْدِيلِ، وَخُبْرَةِ بَاطِنِ مَنْ يُعَدِّلُهُ لِصُحْبَةٍ أَوْ جِوَارٍ أَوْ مُعَامَلَةٍ، وَالأَصَحُّ اِشْتِرَاطُ لَفْظِ شَهَادَتِهِ، وَأَنَّهُ يَكْفِي هُوَ عَدْلٌ، وَقِيلَ يَزِيدُ عَلَيَّ وَلِي. وَيَجِبُ ذِكْرُ سَبَبِ الْجَرْحِ، وَيَعْتَمِدُ فِيهِ الْمُعَايَنَةَ أَوِ الإِسْتِفَاضَةَ، وَيُقَدَّمُ عَلَىالتَّعْدِيلِ، فَإِنْ قَالَ الْمُعَدِّلُ: عَرَفْتُ سَبَبَ الْجَرْحِ وَتَابَ مِنْهُ وَأَصْلَحَ قُدِّمَ،

---

حاڵی شاهیدەکان چی لە لایەتی ڕووبەڕوو بە قازیی دەڵێ: لەبارەی (فاسق)یو داد پەروەری (وَقِيلَ تَكْفِي كِتَابَتُهُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەوەندە بەسە: بە نووسین قازی ئاگادار بکاتەوە.

(وَشَرْطُهُ) مەرجی شاهیدناس: (كَشَاهِدٍ) وەکو مەرجی شاهیدە، واتە: موسوڵمانێکی بالغو عاقڵو ئازادو نێرو دادپەروەر بێو دوژمنی فاسقکراوەکە نەبێو باوكو کوڕی پاککراوەکە نەبێ (مَعَ مَعْرِفَةِ الْجَرْحِ وَالتَّعْدِيلِ) لەگەڵ ئەوەش هۆیەکانی فاسقکردنو پاککردنیش بزانێ، هەم (وَخُبْرَةِ بَاطِنِ مَنْ يُعَدِّلُهُ) خەبەرداری پەنهانیی ئەو کەسەش بێ: کە پاکانەی دەکاو بە

دادپەروەری دادەنێ: (لِصُحْبَةٍ أَوْ جِوَارٍ أَوْ مُعَامَلَةٍ) بە هۆی هاوڕێیی، یان دراوسێیی، یان مامڵەت لەگەڵکردن، چونکە ﴿پیاوێك لە لای ئیمامی(عمر)ﷺ گوتی: فلانە شاهیدە پیاوی چاکە. جا ئیمامی(عمر)ﷺ فەرمووی: تۆ دراوسێی ئەوی تا ڕەفتاری شەوێو ڕۆژێی بزانی؟ گوتی: نا. جا فەرمووی: بە دیرهەمو دینار مامڵەتت لەگەڵ کردوە تا ئەمانەتو لەخواترسی بزانی؟ گوتی: نا. فەرمووی: لە سەفەردا هاوڕێیت کردوە تا ڕەووشتە باش و خراپەکانی بزانی؟ گوتی: نا. فەرمووی: کەوابو: تۆ نایناسی﴾. هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا گێڕاویەتیانەوە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (اشْتِرَاطُ لَفْظِ شَهَادَتِهِ) مەرجە پاککەرەوەکە: ووشەی شاهیدی بڵێ، هەم (وَ أَنَّهُ يَكْفِي هُوَ عَدْلٌ) ئەوەندە بەسە بڵێ: شاهیدی دەدەم فلانە شاهیدە دادپەروەرە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يَزِيدُ: عَلَيَّ وَلِي) دەبی ئەوەش زیاد بکا: لە سەر منو بۆ من. (وَيَجِبُ ذِكْرُ سَبَبِ الْجَرْحِ) واجبە: شاهیدناسەکە هۆی فاسقکردنەکەی بڵێ: وەك زینای کردوە، یان دزیی کردوە (وَيَعْتَمِدُ فِيهِ الْمُعَايَنَةَ أَوِ الإِسْتِفَاضَةَ) لەو فاسقکردنەش پشت بە دیتنی خۆی دەبەستێ ئەگەر دیتبێتی گوناهەکەی کردوە، یان پشت بە بڵاوبوونەوەی هەواڵی گوناهکردنەکەی دەبەستێ.

(وَيُقَدَّمُ عَلَى التَّعْدِيلِ) شاهیدەکانی فاسقکردن وەپێش شاهیدەکانی پاککردن دێخرێن، بەڵام (فَإِنْ قَالَ الْمُعَدِّلُ) ئەگەر پاککەرەکە گوتی: (عَرَفْتُ سَبَبَ الْجَرْحِ وَتَابَ مِنْهُ وَأَصْلَحَ) من دەمزانی هۆی فاسقکردنەکەی هەیە، بەڵام لەو هۆیە تۆبەی کردوەو بوەتە پیاوێکی چاك و بۆ شاهیدی دەگونجێ، ئەو کاتە (قُدِّمَ) شاهیدەکانی پاککردن وەپێش فاسقکردن

وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يَكْفِي فِي التَّعْدِيلِ قَوْلُ الْمُدَّعَى عَلَيْهِ: هُوَ عَدْلٌ وَقَدْ غَلِطَ.

## (بَابُ الْقَضَاءِ عَلَى الْغَائِبِ)

هُوَ جَائِزٌ إِنْ كَانَ بَيِّنَةٌ وَادَّعَى الْمُدَّعِي جُحُودَهُ، فَإِنْ قَالَ هُوَ مُقِرٌّ لَمْ تُسْمَعْ بَيِّنَتُهُ، وَإِنْ أَطْلَقَ فَالأَصَحُّ أَنَّهَا تُسْمَعُ، وَأَنَّهُ لاَ يَلْزَمُ الْقَاضِيَ نَصْبُ مُسَخَّرٍ يُنْكِرُ عَلَى الْغَائِبِ، وَيَجِبُ أَنْ يُحَلِّفَهُ بَعْدَ الْبَيِّنَةِ:

---

دێخرێن (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاست (أَنَّهُ لاَ يَكْفِي فِي التَّعْدِيلِ قَوْلُ الْمُدَّعَى عَلَيْهِ) لە پاککردنی شاهیددا ئەوەندە بەس نیە داوالێکراوەکە بڵێ: (هُوَ عَدْلٌ وَقَدْ غَلِطَ) شاهیدەکە دادپەروەرە، بەڵام لە شاهیدیەکەیدا هەڵەی کردوە. بەڵکو پێویستە شاهیدناسەکان لە حاڵێ شاهیدەکە بکۆڵنەوە.

ئینجا بزانە: سوننەتە: قازی شاهیدەکان لێك جیا بکاتەوە–ئەگەر گومانێکی لێیان هەبێ– ئینجا تەنها تەنها پرسیاریان لێبکا، جا هەر کاتێك پرسیاری لە یەکێکیان کرد، ڕێگای

نەداتێ بڕواتە لای شاهیدەکانیتر تا پرسیار لە گشتیان دەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿بَابُ الْقَضَاءِ عَلَىالْغَائِبِ: **باسی بڕیاردان لە سەر داوالێکراوێکی نادیار، منداڵ، شێت، مردوو**﴾

(هُوَ جَائِزٌ) بڕیاردان لە سەر داوالێکراوێکی نادیار دروستە، هەروەك لە ئیمامی(عمر)و ئیمامی(عثمان) گێڕدراوەتەوەو (صحابة)ش ڕەخنەیان لێنەگرتون، بەڵام (إِنْ كَانَ بَيِّنَةٌ) بەو مەرجە داواکارەکە دوو شاهیدی هەبن، یان شاهیدێك لەگەڵ سوێندخواردنی خۆی، هەم (وَادَّعَىالْمُدَّعِي جُحُودَهُ) بەو مەرجەش: داواکارەکە بڵێ: داوالێکراوەکەم دان بە مافەکەمدا ناهێنێ، چونکە (فَإِنْ قَالَ هُوَ مُقِرٌّ) ئەگەر داواکارەکە بڵێ: داوالێکراوەکە دان بە مافەکەمدا دێنێ، ئەو کاتە (لَمْ تُسْمَعْ بَيِّنَتُهُ) گوێ نادرێتە شاهیدەکانیو داوایەکەشی پوچەڵ دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر داوالێکراوەکە قەرزداری داواکارەکە بێو ماڵیشی لە شوێنی دەسەڵاتی قازیدا هەبێ و داواکارەکەش شاهید بێنێ تاکو قازی لەو ماڵە قەرزەکەی بداتەوە، ئەو کاتە بە شاهیدی ئەو شاهیدانە بڕیار دەدا، هەرچەند بشڵێ: دان بە قەرزەکەمدا دێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەم (وَإِنْ أَطْلَقَ) ئەگەر داواکارەکە لە داوایەکەیدا باسی دانهێنانو داننەهێنانی نەکرد، ئەو کاتەش (فَالأَصَحُّ أَنَّهَا تُسْمَعُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: گوێ دەدرێتە شاهیدەکانیو بڕیاریان پێدەدرێ.

(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (لاَ يَلْزَمُ الْقَاضِي) لە سەر قازی واجب نیە (نَصْبُ مُسَخَّرٍ يُنْكِرُ عَلَىالْغَائِبِ) پارێزەرێك دابنێ تاکو لەجیاتی نادیارەکە قسەی داواکارەکە ڕەد بکاتەوەو بڵێ: ڕاست ناکا. بەڵام (وَيَجِبُ) لە سەر قازی واجبە (أَنْ يُحَلِّفَهُ بَعْدَ الْبَيِّنَةِ) لە إِنَّ الْحَقَّ ثَابِتٌ فِي ذِمَّتِهِ. وَقِيلَ: يُسْتَحَبُّ، وَيَجْرِيَانِ فِي دَعْوَى عَلَى صَبِيٍّ أَوْ مَجْنُونٍ، وَلَوْ ادَّعَى وَكِيلٌ عَلَى غَائِبٍ فَلاَ تَحْلِيفَ، وَلَوْ حَضَرَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ وَقَالَ لِوَكِيلِ الْمُدَّعِي: أَبْرَأَنِي مُوَكِّلُك. أُمِرَ بِالتَّسْلِيمِ،

---

دوای شاهیدیدانیشاهیدەکان داواکارەکە سوێند بدا بە سوێندی (ٱلإِسْتِظْهار)=بەهێزکردن، واتە: لە دوای شاهیدیدانیشاهیدەکان داواکارەکە سوێند بخوا: کە (إِنَّ الْحَقَّ ثَابِتٌ فِي ذِمَّتِهِ) ئەو مافەی داوام کرد تا ئێستا لە ئەستۆیداوالێکراوەکەمدا جێگیرەو لە سەری واجبە مافەکەم بداتەوە (وَقِيلَ يُسْتَحَبُّ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: سوێندی (ٱلإِسْتِظهَار)= بەهێزکردن سوننەتە..

جا ئەگەر داواکارەکە تەنها شاهیدێکی هەبوو و سوێندی گەڵ شاهیدەکەشی خوارد، ئەو کاتەش-لە دوای شاهیدو سوێندەکە- واجبە سوێندێکیتریش بخوا بۆ بەهێزکردن، هەروەك لە (الشبراملسی)و (الشروانی)دا فەرموویانە

(وَيَجْرِيَانِ) ئەو دو فەرموودانە دێنە جێ: (فِي دَعْوَى عَلَى صَبِيٍّ أَوْ مَجْنُونٍ) لە داواکردنی لە مندالّو شێتو مردووی بێمیراتگر، واتە: لە دوای شاهیدیدانی شاهیدەکان واجبە داواکارەکە سوێندی بەهێزکردن بخوا: کە ئەو مافەی داوای کردوە تا ئێستا جێگیرە لە ئەستۆی مندالّەکەدا، یان شێتەکەدا، یان مردووەکەداو واجبە بیدرێتەوە.

بەلّام ئەگەر مردووەکە میراتگرێکی بالغو عاقلّی هەبێ، ئەو کاتە ئەگەر میراتگرەکە داوای سوێنددانەکەی بکا واجبە سوێند بدرێ، ئەگەر نا: نا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرمویانە.

جا بزانە: ئەگەر داوالێکراوەکە بە قەسدی خۆی پەنا دابو، یان بە هۆی دەسەلّاتداری نەدەهاتە دادگا، ئەو کاتە داواکارەکە پێویستی بە سوێندی بەهێزکردن نیەو یەکسەر لە دوای شاهیدیدان قازی بریاری مافەکەی بۆ دەدا، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ ادَّعَى وَكِيلٌ عَلَى غَائِبٍ) ئەگەر وەکیلی داواکارێکیناديار داوایەکی کرد لە داوالێکراوێکیناديار، یان لە مندالّێك، یان لە شێتێك، دوو شاهیدیشی هێنان، ئەو کاتە (فَلاَ تَحْلِيفَ) وەکیلەکە سوێندی بەهێزکردن نادرێ، بەلّکو بە -تەنها- شاهیدەکان بریاری مافەکە بۆ وەکیلگرەنادیارەکە دەدرێ، ئەگەر لە شوێنێکی دوور بێ، بەلّام ئەگەر نزیك بێ، ئەو کاتە بریاردانەکە رادەگیرێ تا وەکیلگرەکە -بەخۆی- ئامادە دەبێو سوێندی بەهێزکردن دەخوا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ حَضَرَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ) ئەگەر داوالێکراوەکە لە دادگادا ئامادە بوو (وَقَالَ لِوَكِيلِ الْمُدَّعِي) گوتیە وەکیلی داواکارەکە: (أَبْرَأَنِي مُوَكِّلُكَ) وەکیلگرەکەی تۆ گەردەنی ئازاد کردوم لەو قەرزەی تۆ داوام لێدەکەی. ئەوە (أُمِرَ بِالتَّسْلِيمِ) داوالێکراوەکە فەرمانی پێدەکرێ:

وَإِذَا ثَبَتَ مَالٌ عَلَى غَائِبٍ وَلَهُ مَالٌ قَضَاهُ الْحَاكِمُ مِنْهُ، وَإِلاَّ فَإِنْ سَأَلَ الْمُدَّعِي إِنْهَاءَ الْحَالِ إِلَى قَاضِي بَلَدِ الْغَائِبِ أَجَابَهُ، فَيُنْهِي سَمَاعَ بَيِّنَةٍ لِيَحْكُمَ بِهَا ثُمَّ يَسْتَوْفِي الْمَالَ، أَوْ حُكْمًا لِيَسْتَوْفِيَ، وَالإِنْهَاءُ أَنْ يُشْهِدَ عَدْلَيْنِ بِذَلِكَ، وَيُسْتَحَبُّ كِتَابٌ بِهِ يَذْكُرُ فِيهِ مَا يَتَمَيَّزُ بِهِ الْمَحْكُومُ عَلَيْهِ وَيَخْتِمُهُ

---

مافەکە تەسلیمی وەکیلەکە بکا، ئینجا ئەگەر راست دەکا، با لە مەودوا گەردەن ئازادبوونەکەی -بە شاهید- ئاشکرا بکا.

جا بزانە: ئەگەر وەکیلایەتی داواکارەکە بە دوو شاهید ئاشکرا نەبێ، لە سەر داوالێکراوەکە واجب نیە مالّی وەکیلگرەکەی تەسلیم بکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَإِذَا ثَبَتَ مَالٌ عَلَى غَائِبٍ) هەر کاتێك بە بەلّگەیەکیشەرعی -لە لای قازی- مالّێك جێگیر بوو لە سەر داوالێکراوێکیناديار (وَلَهُ مَالٌ) لە شوێنی دەسەلّاتی قازییەکەشدا نادیارەکە هەندێك مالّی هەبوو، ئەوە ئەگەر داواکارەکە داوای مالّەکەی کرد (قَضَاهُ الْحَاكِمُ مِنْهُ)

دادوەرەكە=قازی لەو ماڵەحازرە مافی داوا لێكراوەكە دەداتەوە.
(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نادیارەكە هیچ ماڵێكی حازری لە شوێنی دەسەڵاتی قازییەكەدا نەبو، ئەو كاتە (فَإِنْ سَأَلَ الْمُدَّعِي إنْهَاءَ الْحَالِ إلَى قَاضِي بَلَدِالْغَائِبِ) ئەگەر داواكارەكە داوای كرد حاڵی دادكردنەكەی بۆ بگەیەندرێتە قازیی شاری نادیارەكە، ئەوە (أَجَابَهُ) لە سەر قازییەكە واجبە: گەیاندنەكەی بەجێ بێنێ، كەوابو: (فَيُنْهِي سَمَاعَ بَيِّنَةٍ) گوێ‌لێڕاگرتنی شاهیدەكان دەگەیێنێتە قازییە نادیارەكە (لِيَحْكُمَ بِهَا) تاكو بڕیار بە شاهیدیەكەیان بدا (ثُمَّ يَسْتَوْفِي الْمَالَ) ئینجا مافی داواكارەكەش لە داوالێكراوەكەی لای خۆی وەربگرێ.
(أَوْ حُكْمًا لِيَسْتَوْفِي) یان قازییەكە بڕیاری خۆی دەگەیێنێتە قازیەكەی‌تر تاكو یەكسەر مافی داواكارەكە لە داوالێكراوەكەی لای خۆی وەربگرێ.
(وَالإِنْهَاءُ) گەیاندنی حاڵی دادكردنەكە بەم شێوەیە: (أَنْ يُشْهِدَ عَدْلَيْنِ بِذَلِكَ) قازی دوو پیاوی دادپەروەر بكاتە شاهید لە سەر گوێ لێڕاگرتنی شاهیدەكان، یان لە سەر بڕیاردانی خۆی، ئینجا ئەم دوو شاهیدانە بڕۆنە لای قازییەكەی نادیارو لە لای وی شاهیدی بدەن، واتە: بە بێ دوو شاهیدی پیاو گەیاندنەكە قبوڵ ناكرێ.
(وَيُسْتَحَبُّ كِتَابٌ بِهِ) سوننەتە حاڵی دادكردنەكە لە نووسراوێك بنوسێ‌و لەگەڵ شاهیدەكان بینێرێ (يَذْكُرُ فِيهِ مَا يَتَمَيَّزُ بِهِ الْمَحْكُومُ عَلَيْهِ) لە نووسراوەكەدا ئەو ناوونیشانەش دەنووسێ كە داد لەسەركراوەكەو داد بۆكراوەكە پێی لە خەڵكی‌تر جیا دەبنەوە (وَيَخْتِمُهُ) سوننەتە مۆری خۆیشی لێبدا.
كەواتە: لە گەیاندنەكەدا ئەم قازییە بۆ قازیەكەی‌تر دەنووسێ: (من گوێم لە دوو شاهیدی دادپەروەر گرتوە: كە فلانی كوڕی فلان ئەوەندە مافەی لە سەر فلانی
وَيَشْهَدَانِ عَلَيْهِ إنْ أَنْكَرَ، فَإِنْ قَالَ: لَسْتُ الْمُسَمَّى فِالْكِتَابِ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، وَعَلَى الْمُدَّعِي بَيِّنَةٌ بِأَنَّ هَذَاالْمَكْتُوبَ اِسْمُهُ وَنَسَبُهُ، فَإِنْ أَقَامَهَا فَقَالَ: لَسْتُ الْمَحْكُومَ عَلَيْهِ لَزِمَهُ الْحُكْمُ إنْ لَمْ يَكُنْ هُنَاكَ مُشَارِكٌ لَهُ فِالإِسْمِ وَالصِّفَاتِ، وَإِنْ كَانَ أُحْضِرَ، فَإِنْ اِعْتَرَفَ بِالْحَقِّ طُولِبَ وَتُرِكَ الأَوَّلُ، وَإِلاَّ بَعَثَ إلَىالْكَاتِبِ لِيَطْلُبَ مِنَ الشُّهُودِ زِيَادَةَ صِفَةٍ تُمَيِّزُهُ وَيَكْتُبُهَا ثَانِيًا،

---

كوڕی فلان هەیە). یان بۆی دەنووسێ: (من بە شاهیدیی دوو شاهیدی دادپەروەر بڕیارم دا: فلان ئەوەندە مافەی لە سەر فلانە جەنابت بۆی وەربگرە). ئینجا قازییەكەش بەم شاهیدییە بڕیار دەداو مافەكان لە داوالێكراوەكە وەردەگرێ.
(وَ) هەر كاتێك نووسراوەكە گەیشتە قازیەكەی نادیار (يَشْهَدَانِ عَلَيْهِ) ئەو دوو شاهیدانەی نووسراوەكەیان هێناوە شاهیدی لە سەر حاڵی دادكردنەكە دەدەن (إنْ أَنْكَرَ) ئەگەر داوالێكراوەكە دان بە مافەكەدا نەهێنێ، چونكە بێ دوو شاهیدی پیاو نووسراوەكەی

قازیش ڕەفتاری پێناکرێ.
(فَإِنْ قَالَ: لَسْتُ الْمُسَمَّى فِيالْكِتَابِ) جا ئەگەر داوالێکراوەکە گوتی: من ناوبراوەکەی ناو نووسراوەکە نیم. ئەو کاتە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ: کە ئەو داوالێکراوەکەی ناو نووسراوەکە نیە، کەوابو: (وَعَلَىالْمُدَّعِي بَيِّنَةٌ: بِأَنَّ هَذَا الْمَكْتُوبَ اِسْمُهُ وَنَسَبُهُ) لە سەرداواکارەکە پێویستە شاهید بێنێ: کە ئەم ناوەی نووسراوە ناوونەژادی ئەم داوالێکراوەیە. بەڵام ئەگەر داوالێکراوەکە بەم ناوونەژادە ناسراو بێ، ئەو کاتە گوێ نادرێتە دانەهێنانەکەیو مافەکەی لێوەردەگیرێ، هەروك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
(فَإِنْ أَقَامَهَا) جا ئەگەر داواکارەکە شاهێدی هێنا کە ئەمە ناوو نەژادی ئەم داوالێکراوەیە (فَقَالَ: لَسْتُ الْمَحْكُومَ عَلَيْهِ) داوالێکراوەکەش گوتی: ڕاستە، بەڵام من ئەم داد لەسەرکراوە نیم بەم مافە. ئەو کاتە (لَزِمَهُ الْحُكْمُ إِنْ لَمْ يَكُنْ هُنَاكَ مُشَارِكٌ لَهُ فِيالإِسْمِ وَالصِّفَاتِ) بڕیارەکەی لە سەر واجب دەبێ، بەو مەرجەی لەوێدا هاوبەشێکی نەبێ لە ناوونیشانەکانیدا، کەوابو: (وَإِنْ كَانَ) ئەگەر لەوێدا هاوبەشی لە ناوونیشانەکاندا هەبێ، ئەو کاتە (أُحْضِرَ) هاوبەشەکە لە دادگادا ئامادە دەکرێ:
(فَإِنْ اِعْتَرَفَ بِالْحَقِّ) جا ئەگەر هاوبەشەکە دانی بە مافەکەدا هێنا، ئەو کاتە (طُولِبَ وَتُرِكَ الأَوَّلُ) داوای مافەکە لەم هاوبەشە دەکرێو واز لە یەکەمەکە دەهێندرێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر هاوبەشەکەش دانی نەهێنا، ئەو کاتە (بَعَثَ إِلَىالْكَاتِبِ) ئەم قازییە کەسێك دەنێرێتە لای قازییەکەی نامەنووس (لِيَطْلُبَ مِنَ الشُّهُودِ زِيَادَةَ صِفَةٍ تُمَيِّزُهُ) تاکو داوا لە شاهیدەکان بکا: ناوونیشانەی زیاتر بڵێن کە داوالێکراوەکە لە کەسانیتر جیا بکاتەوەو (وَيَكْتُبُهَا ثَانِيًا) دووبارە بۆی بنووسێتەوە.

وَلَوْ حَضَرَ قَاضِي بَلَدِالْغَائِبِ بِبَلَدِالْحَاكِمِ فَشَافَهَهُ بِحُكْمِهِ فَفِي إِمْضَائِهِ إِذَا عَادَ إِلَى وِلاَيَتِهِ خِلاَفُ الْقَضَاءِ بِعِلْمِهِ، وَلَوْ نَادَاهُ فِي طَرَفَيْ وِلاَيَتِهِمَا أَمْضَاهُ، وَإِنْ اِقْتَصَرَ عَلَى سَمَاعِ بَيِّنَةٍ كَتَبَ سَمِعْتُ بَيِّنَةً عَلَى فُلاَنٍ، وَيُسَمِّيهَاالْقَاضِي إِنْ لَمْ يُعَدِّلْهَا، وَإِلاَّ فَالأَصَحُّ جَوَازُ تَرْكِ التَّسْمِيَةِ، وَالْكِتَابُ بِالْحُكْمِ يَمْضِي مَعَ قُرْبِ الْمَسَافَةِ، وَ بِسَمَاعِ الْبَيِّنَةِ لاَ يُقْبَلُ عَلَىالصَّحِيحِ إِلاَّ فِي مَسَافَةِ قَبُولِ شَهَادَةٍ عَلَى شَهَادَةٍ.

---

﴿ **ئاگاداری** ﴾: قازی تەنها لە شوێنی دەسەڵاتیخۆیدا دەتوانێ بڕیار بدا، کەواتە: بڕیارو دەستکارییەکانی قازی لەو شوێنەی کە لە ژێر دەسەڵاتیخۆیدا نیە جێبەجێ نابێ، هەروەك لە (باسی لادانی قازی)دا ڕوون کراوە.
کەوابو: (وَلَوْ حَضَرَ قَاضِي بَلَدِ الْغَائِبِ بِبَلَدِ الْحَاكِمِ) ئەگەر قازیی شاری نادیارەکە هاتە شاری قازییە دادکەرەکە (فَشَافَهَهُ بِحُكْمِهِ) ئینجا قازیەکەش بە زوبان پێی گوت: من ئەم

بڕیارەم داوە لە سەر فلانە داوالێکراوە. ئەوە (فَفِي إِمْضَائِهِ إِذَا عَادَ إِلَى وِلاَيَتِهِ خِلاَفُ الْقَضَاءِ بِعِلْمِهِ) لە بارەی جێبەجێکردنی بڕیارەکە–هەر کاتێك گەڕاوە شوێنی‌دەسەلاتی خۆی– فەرموودە جیاوازەکانی بڕیاردان بە زانستی‌خۆی هەنە، بە فەرموودەی ڕاستتر دروستە: بڕیاری قازیەکە لە شوێنی دەسەلاتی‌خۆیدا جێبەجێ بکا.

(وَ) هەروەها (لَوْ نَادَاهُ) ئەگەر قازیی‌دادکەرەکە بانگی قازیەکەی‌تری کردو گوتی: من ئەم بڕیارەم داوە. هەردوو قازیەکانیش (فِي طَرَفَيْ وِلاَيَتِهِمَا) لە هەردوو لای شوێنی دەسەلاتی خۆیان بوون، ئەو کاتەش (أَمْضَاهُ) با بڕیاری قازیەکە جێبەجێ بکا.

(وَإِنْ اقْتَصَرَ عَلَى سَمَاعِ بَيِّنَةٍ) ئەگەر قازیی نامەنووس تەنها گوێی لە شاهیدەکان گرتبو، واتە: بڕیاری بە مافەکە نەدابو، ئەو کاتە (كَتَبَ: سَمِعْتُ بَيِّنَةً عَلَى فُلاَنٍ) بۆ قازیی شاری نادیارەکە دەنووسێ: من گوێم لە شاهیدەکان گرتوە لە سەر فلانکەس کە مافی فلانکەسی لە سەرە (وَيُسَمِّيهَا الْقَاضِي إِنْ لَمْ يُعَدِّلْهَا) واجبە: قازی ناوی شاهیدەکان بنووسێ، ئەگەر–بە شاهیدناسەکان– دادپەروەری نەکردبن، بۆ ئەوەی قازیەکەی‌تر لێیان بکۆڵێتەوە (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر قازیەکەی نامەنووس شاهیدەکانی دادپەروەر کردبن، ئەو کات (فَالأَصَحُّ جَوَازُ تَرْكِ التَّسْمِيَةِ) بە فەرموودەی ڕاستتر دروستە: ناوەکانیان نەنووسێ.

(وَالْكِتَابُ بِالْحُكْمِ) نووسراوی گەیاندنی دادکردنەکەی قازی (يَمْضِي مَعَ قُرْبِ الْمَسَافَةِ) جێبەجێ دەبێ، هەرچەند شوێنی قازیەکەی نادیاریش نزیك بێ، بەلام (وَ بِسَمَاعِ الْبَيِّنَةِ) نووسراوی گەیاندنی گوێلێڕاگرتنی شاهیدەکان (لاَ يُقْبَلُ عَلَىالصَّحِيحِ) قبوڵ ناکرێ لە سەر فەرموودەی ڕاست: (إِلاَّ فِي مَسَافَةِ قَبُولِ شَهَادَةٍ عَلَى شَهَادَةٍ) تەنها لە ئەندازەی قبوڵکردنی زمانشاهیدی–شاهیدی لە سەر شاهیدی قبوڵ دەکرێ، واتە: مەرجە شوێنەکە ئەوەندە

(فَصْلٌ) اِدَّعَى عَيْنًا غَائِبَةً عَنِ الْبَلَدِ يُؤْمَنُ اِشْتِبَاهُهَا كَعَقَارٍ وَعَبْدٍ وَفَرَسٍ مَعْرُوفَاتٍ سَمِعَ بَيِّنَتَهُ وَحَكَمَ بِهَا وَكَتَبَ إِلَى قَاضِي بَلَدِالْمَالِ لِيُسَلِّمَهُ لِلْمُدَّعِي، وَيَعْتَمِدُ فِالْعَقَارِ حُدُودَهُ، أَوْ لاَ يُؤْمَنُ فَالأَظْهَرُ سَمَاعُ الْبَيِّنَةِ، وَيُبَالِغُ الْمُدَّعِي فِالْوَصْفِ وَيَذْكُرُ الْقِيمَةَ، وَأَنَّهُ لاَ يَحْكُمُ بِهَا بَلْ يَكْتُبُ إِلَى قَاضِي بَلَدِالْمَالِ بِمَا شَهِدَتْ بِهِ فَيَأْخُذُهُ وَيَبْعَثُهُ إِلَالْكَاتِبِ لِيَشْهَدُوا عَلَى عَيْنِهِ،

---

دوور بێ: کە ڕێبوار لە بەیانیەوە لە ماڵ دەربچێ‌و بۆ سەرەتای شەو نەگەڕێتەوە ماڵەکەی، چونکە ئەگەر بەم ئەندازەیە دوور نەبێ، ئامادەکردنی شاهیدەکان ئاسانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی داواکردنی شتێکی نادیار﴾

(اِدَّعَى عَيْنًا غَائِبَةً عَنِ الْبَلَدِ) هەر کاتێك داواکارەکە لە لای قازی داوای شتێکی کرد: کە شتەکە لە شارەکە نادیار بوو، واتە: لە شوێنێکی‌تر بوو، بەلام (يُؤْمَنُ اِشْتِبَاهُهَا) دڵنیایی

دەبو: وەشتێكی كەسێكیتر ناچێ: (كَعَقَارٍ وَعَبْدٍ وَفَرَسٍ مَعْرُوفَاتٍ) وەك زەوی‌و باغ‌و خانوو و كۆیلەو ئەسپ: كە ئەوانە ناسراو بن، ئەو كاتە (سَمِعَ بَيِّنَتَهُ) قازی گوێ لە شاهیدەكانی داواكارەكە دەگرێ‌و (وَحَكَمَ بِهَا) بە شاهیدیەكەیان بڕیار بە شتەكە دەدا بۆ داواكارەكەو (وَكَتَبَ إِلَى قَاضِي بَلَدِالْمَالِ) بڕیارەكەی خۆی بۆ قازیی ئەو شارە دەنووسێ كە شتەكە لەوێیە (لِيُسَلِّمَهُ لِلْمُدَّعِي) تاكو شتەكە تەسلیمی داواكارەكە بكا.

(وَيَعْتَمِدُ فِي الْعَقَارِ حُدُودَهُ) داواكارەكە لە داواكردنی زەوی‌و خانوودا پشت بە باسكردنی هەر چوار سنورەكانی دەبەستێ.

(أَوْ لاَ يُؤْمَنُ) یان داوای شتێكی نادیاری وەهای كرد كە دڵنیایی نابو: وەشتێكی كەسێكیتر بچێ، ئەو كاتەش (فَالأَظْهَرُ سَمَاعُ الْبَيِّنَةِ) لە فەرموودەی بەهێزتر: گوێ لە شاهیدەكانی دەگیرێ، هەم (وَيُبَالِغُ الْمُدَّعِي فِيالْوَصْفِ) واجبە: داواكارەكەش زۆر بە تێری ناوونیشانەكانی شتەكە بڵێ‌و (وَيَذْكُرُ الْقِيمَةَ) واجبە: نرخەكەشی بڵێ ئەگەر شتێكی قرسێندراو بێ، نەك هاووێنەیی، ئینجا (وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی بەهێزتر (لاَ يَحْكُمُ بِهَا) بەم شاهیدانە بڕیار بە شتەكە نادا بۆ داواكارەكە (بَلْ يَكْتُبُ إِلَى قَاضِي بَلَدِالْمَالِ بِمَا شَهِدَتْ بِهِ) بەڵكو شاهیدیی ئەم شاهیدانە بۆ قازیی ئەو شارە دەنووسێ كە شتەكە لەوێیە (فَيَأْخُذُهُ وَيَبْعَثُهُ إِلَيالْكَاتِبِ) جا ئەم قازیەش شتە داواكراوەكە لە داوالێكراوەكە وەردەگرێ‌و دەینێرێتە لای قازییەكەی نامەنووس ئەگەر ناردنەكەی سوك‌و ئاسان بێ (لِيَشْهَدُوا عَلَى عَيْنِهِ) تاكو شاهیدەكان لە سەر خودی شتەكە شاهیدی بدەن.

بەڵام ئەگەر ناردنی شتەكە ئاسان نەبێ، ئەو كاتە نایینێری، بەڵكو داواكارەكە دێتە ئەو شوێنەو لە لای قازیی شوێنەكە داوای شتەكەی دەكا، هەوەرك لە (الشروانی)دا ڕوون كراوەتەوە.

وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يُسَلِّمُهُ إِلَى الْمُدَّعِي بِكَفِيلٍ بِبَدَنِهِ فَإِنْ شَهِدُوا بِعَيْنِهِ كَتَبَ بِبَرَاءَةِ الْكَفِيلِ، وَإِلاَّ فَعَلَى الْمُدَّعِي مُؤْنَةُ الرَّدِّ، أَوْ غَائِبَةً عَنِ الْمَجْلِسِ لاَ الْبَلَدِ أُمِرَ بِإِحْضَارِ مَا يُمْكِنُ إِحْضَارُهُ لِيَشْهَدُوا بِعَيْنِهِ، وَلاَ تُسْمَعُ شَهَادَةٌ بِصِفَةٍ، وَإِذَا وَجَبَ إِحْضَارٌ فَقَالَ لَيْسَ بِيَدِي عَيْنٌ بِهَذِهِ الصِّفَةِ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ ثُمَّ لِلْمُدَّعِي دَعْوَى الْقِيمَةِ، فَإِنْ نَكَلَ فَحَلَفَ الْمُدَّعِي أَوْ أَقَامَ بَيِّنَةً

---

ئینجا (وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يُسَلِّمُهُ إِلَيالْمُدَّعِي بِكَفِيلٍ بِبَدَنِهِ) بە فەرموودەی بەهێزتر: قازییەكە شتە داواكراوەكە بە كەفیلێك تەسلیمی داواكارەكە دەكا، تاكو بیباتە لای قازیەكەی نامەنووس (فَإِنْ شَهِدُوا بِعَيْنِهِ) جا ئەگەر شاهیدەكان بە خودی شتەكە بۆ داواكارەكە شاهیدییان دا، ئەو كاتە (كَتَبَ بِبَرَاءَةِ الْكَفِيلِ) دوو بارە قازی نووسراوێك بۆ قازیی شاری كەفیلەكە دەنووسێ: كەفیلەكە لە كەفیلایەتی ئازاد بوو. ئینجا لەم حاڵەتەدا ئەركی هێنانی شتەكەش لە داوالێكراوەكە وەردەگیرێ، هەروەك لە (تحفة)و(الشروانی)دا

فەرموویانە.

(وَإِلاَّ) بەلاَم ئەگەر شاهیدەکان بە خودیشتەکە شاهیدییان نەدا، ئەو کاتە (فَعَلَىالْمُـدَّعِى مُؤْنَةُ الرَّدِّ) لە سەر داواکارەکە واجبە: ئەرکی گەڕاندنەوەی شتەکە–بۆ داوالێکراوەکە– بدا، هەم واجبە: ئەرکی هێنانەکەش بدا، هەم واجبە کرێی سودەکانی ئەو ماوەیەش بدا کە لە دەست خاوەنەکەیی داوە، چونکە دوژمنکاریی کردوە. هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(أَوْ غَائِبَـةً عَـنِ الْمَجْلِـسِ لاَالْبَلَـدِ) یـان ئەگـەر شـتێکی داوا کـرد کـە لـە دانیشـگەی دادگا نادیار بوو–نەك لە شـارەکە– ئـەو کاتـەش (أُمِـرَ بِإِحْضَـارِ مَـا يُمْكِـنُ إِحْضَـارُهُ) فـەرمان دەکرێ: شـتەکە بهێندرێتـە دادگـا، ئەگـەر هێنانەکـەی بگونجـێ (لِيَشْـهَدُوا بِعَيْنِـهِ) تـاکو شاهیدەکە بە خودی شتەکە شاهیدی بدەن بـۆ داواکارەکـە، کـەوابو: (وَلاَ تُسْـمَعُ شَـهَادَةٌ بِصِفَةٍ) شاهیدیدان بە ناوونیشانی شتەکە وەرناگیرێ، بەلاَم ئەگەر هێنانی شتەکە ئاسان نەبێ: وەکو زەویو خانوو، ئەو کاتـە داواکارەکـە سـنورەکانیو ناوونیشـانەکانی دەڵـێو شاهیدەکانیش شاهیدی لە سەر شتەکە دەدەن بە سنورەکەو ناوونیشانەکانی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِذَا وَجَبَ إِحْضَارٌ) هەر کاتێك هێنانی شتە داواکراوەکە واجب بوو (فَقَالَ لَيْسَ بِيَدِي عَيْنٌ بِهَذِهِ الصِّفَةِ) داوالێکراوەکەش گوتی: هیچ شتێکی بەم ناوونیشانە لـە دەسـت منـدا نیـە، ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) داوالێکراوەکە بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەکرێ (ثُـمَّ) ئینجا کـە داوالێکراوەکە سوێندی خوارد شتەکەی لە دەستدا نیە، ئەو کاتە (لِلْمُدَّعِى دَعْوَىالْقِيمَةِ) بۆ داواکارەکە دروستە: داوای نرخی شتەکە بکا، چونکە دەگونجێ شتەکە فەوتابێ (فَإِنْ نَكَلَ) جـا ئەگـەر داوالێکراوەکـە سـوێندی نـەخوارد (فَحَلَـفَ الْمُـدَّعِى أَوْ أَقَـامَ بَيِّنَـةً) ئینجـا كُلِّــفَ الإِحْضَــارَ وَحُــبِسَ عَلَيْــهِ، وَلاَ يُطْلَــقُ إِلاَّ بِإِحْضَــارٍ أَوْ دَعْــوَى تَلَــفٍ، وَلَـوْ شَــكَّ الْمُــدَّعِى هَـلْ تَلِفَــتِ الْعَــيْنُ فَيَــدَّعِى قِيمَــةً أَمْ لاَ فَيَــدَّعِيهَا فَقَــالَ: غَصَــبَ مِنِّــى كَـذَا فَـإِنْ بَقِــيَ لَزِمَـهُ رَدُّهُ وَإِلاَّ فَقِيمَتُـهُ. سُــمِعَتْ دَعْـوَاهُ، وَقِيـلَ: لاَ، بَـلْ يَـدَّعِيهَا وَيُحَلِّفُـهُ ثُـمَّ يَدَّعِىالْقِيمَـةَ، وَيَجْرِيَـانِ فِـيمَنْ دَفَـعَ ثَوْبًـا لِـدَلاَّلٍ لِيَبِيعَـهُ فَجَحَدَهُ وَشَكَّ هَلْ بَاعَهُ فَيَطْلُبُ الثَّمَنَ أَمْ أَتْلَفَهُ فَقِيمَتَهُ أَمْ هُوَ بَاقٍ فَيَطْلُبُهُ؟

---

داواکارەکە سوێندی خوارد، یان شاهیدی هێنا: کە ئەو شتەیە بەم ناوونیشانە لە دەست داوالێکراوەکەدا بوو. ئەو کاتە (كُلِّفَ الإِحْضَارَ) داوای لێدەکرێ شتە داواکراوەکە بهێنێ، هەم (وَحُبِسَ عَلَيْهِ) لە سەر نەهێنانیشتەکە بەند دەکرێو (وَلاَ يُطْلَقُ إِلاَّ بِإِحْضَارٍ أَوْ دَعْوَى تَلَفٍ) لە بەندیخانەش بەرەڵا نادرێ تا شتەکە دەهێنێ، یان تا دەڵێ: شتەکە فـەوتاوەو

سوێندیش لە سەر فەوتانەکەی دەخوا.
(وَ) هەر لەو کێشەیەیڕابردوو: (لَوْ شَكَّ الْمُدَّعِي) ئەگەر داواکارەکە کەوتە گومان: (هَلْ تَلَفَتِ الْعَيْنُ فَيَدَّعِي قِيمَةً) ئایا شتەداواکراوەکە فەوتاوە؟ تاکو داوای نرخەکەی بکا (أَمْ لاَ فَيَدَّعِيهَا) یان نەفەوتاوە؟ تاکو داوای خودی شتەکە بکا (فَقَالَ) داواکارەکەش لە داوایەکەیدا گوتی: (غَصَبَ مِنِّي كَذَا فَإِنْ بَقِيَ لَزِمَهُ رَدُّهُ وَإِلاَّ فَقِيمَتُهُ) فلانکەس ئەو شتەی لە من زەوت کردوە، جا ئەگەر شتەکە مابێ لە سەری واجبە بمداتەوە، ئەگەر نەمابێ واجبە نرخەکەیم بداتێ. ئەوە (سُمِعَتْ دَعْوَاهُ) داوایەکەی وەردەگیرێ: جا ئەگەر داوالێکراوەکەش دانی پێدا هێنا ئەوە ئاشکرا دەبێ، ئەگەر نا، دەبێ داوالێکراوەکە سوێند بخوا: کە لە سەری واجب نیە: نە شتە داواکراوەکەو نە نرخەکەیی بداتێ (وَقِيلَ: لاَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: داوایەکەی بەو شێوەیە وەرناگیرێ (بَلْ يَدَّعِيهَا وَيُحَلِّفُهُ) بەڵکو داوای شتەکە دەکاو داوالێکراوەکەش سوێند دەدا (ثُمَّ يَدَّعِيالْقِيمَةَ) ئینجا کە داوالێکراوەکە سوێندی خوارد شتەکەی لە دەستدا نیە. ئەو کاتە داوای نرخەکەی دەکا.
(وَيَجْرِيَانِ) ئەو دووفەرموودەیە دێنەجێ (فِيمَنْ دَفَعَ ثَوْبًا لِدَلاَّلٍ لِيَبِيعَهُ) لەبارەی ئەو کەسەی جلێك بداتە دەلاڵێك تا بیفرۆشێ (فَجَحَدَهُ) ئینجا دەلاڵەکەش دانی بە جلەکەدا نەهێناو گوتی: هیچ جلی تۆم لە دەستدا نیە (وَشَكَّ هَلْ بَاعَهُ فَيَطْلُبُ الثَّمَنَ) داواکارەکەش کەوتە گومان: ئایا فرۆشتویەتی؟ تاکو داوای پارەکەی لێبکا (أَمْ أَتْلَفَهُ فَقِيمَتَهُ) یان فەوتاندویەتی؟ تاکو داوای نرخەکەی لێبکا (أَمْ هُوَ بَاقٍ فَيَطْلُبُهُ) یان لە لای ماوە تاکو داوای خودی جلەکە بکا؟ بە فەرموودەی ڕاستتر داوایەکەی وەردەگیرێ: کە دەلاڵەکە جلێکی لێوەرگرتوم: ئەگەر ماوە واجبە بمداتەوە، ئەگەر فرۆشتویەتی واجبە پارەکەیم بداتێ، ئەگەر فەوتاندویەتی واجبە نرخەکەیم بداتێ. جا داوالێکراوەکەش یەك جار سوێند دەدرێ: کە لە سەری واجب نیە: نە جلەکەو نە پارەکەو نە نرخەکەی بداتێ.

وَحَيْثُ أَوْجَبْنَا الإِحْضَارَ فَثَبَتَ عَلَى الْمُدَّعَىعَلَيْهِ، وَإِلاَّ فَهِيَ وَمُؤْنَـ **منهاج- بەرگیپێنجەم-**

(فَصْلٌ) اَلْغَائِبُ الَّذِى تُسْمَعُ الْبَيِّنَةُ وَيُحْكَمُ عَلَيْهِ مَنْ بِمَسَافَةٍ بَعِيدَةٍ: وَهِيَ الَّتِى لاَ يَرْجِعُ مِنْهَا مُبَكِّرٌ إِلَى مَوْضِعِهِ لَيْلاً، وَقِيلَ مَسَافَةُ قَصْرٍ، وَمَنْ بِقَرِيبَةٍ كَحَاضِرٍ فَلاَ تُسْمَعُ بَيِّنَتُهُ وَيُحْكَمُ بِغَيْرِ حُضُورِهِ إِلاَّ لِتَوَارِيهِ أَوْ تَعَزُّزِهِ، وَالأَظْهَرُ جَوَازُ الْقَضَاءِ عَلَى غَائِبٍ فِي قِصَاصٍ وَحَدِّ قَذْفٍ،

---

﴿ ئاگاداری ﴾: (وَحَيْثُ أَوْجَبْنَا الإِحْضَارَ) لە هەر حاڵەتێکدا لە سەر داوالێکراوەکە واجب بکەین شتە داواکراوەکە بهێنێتە دادگا، ئینجا ئەویش شتەکەی هێنا (فَثَبَتَ لِلْمُدَّعِي) جا ئاشکرا بوو: شتەکە مافی داواکارەیە، ئەوە (اِسْتَقَرَّتْ مُؤْنَتُهُ عَلَىالْمُدَّعَىعَلَيْهِ) ئەرکی

هێنانەکەی لە سەر داوالێکراوەکە جێگیر دەبێ.

(وَإِلاَّ) بەلاَم ئەگەر شتە داواکراوەکە نەبوە مافی داواکارەکە، ئەو کاتە (فَهِيَ وَمُؤْنَةُالرَّدِّ عَلَىالْمُدَّعِي) ئەرکی هێنانو ئەرکی گەڕاندنەوەکەی بۆ شوێنی خۆی هەردووکی لە سەر داواکارەکەیە، هەم واجبە: کرێی سودەکانی ئەو ماوەیەشی بدا کە لەدەست خاوەنەکەی داوە، چونکە دوژمنکاریی کردوە، جا ئەگەر شتەکە لە ڕێگەدا فەوتا، داواکارەکە نابێتە زامینی، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی پێناسەی داوالێکراوی نادیار ﴾

(اَلْغَائِبُ الَّذِي تُسْمَعُ الْبَيِّنَةُ وَيُحْكَمُ عَلَيْهِ) ئەو نادیارەی شاهیدی لە سەر وەردەگیرێو بە نادیاری بریاری مافەکەی لە سەر دەدرێ: (مَنْ بِمَسَافَةٍ بَعِيدَةٍ) ئەو داوالێکراوەیە کە لە شوێنێکی دوور بێ (وَهِيَ) شوێنی دوور (اَلَّتِي لاَ يَرْجِعُ مِنْهَا مُبَكِّرٌ إِلَى مَوْضِعِهِ لَيْلاً) ئەو شوێنەیە: کە ئەو ڕێبوارەی لە بەیانیەوە دەردەچێ —لە دوای تەواوبوونی دادکردن— بۆ سەرەتای شەو نەگەڕێتەوە شوێنەکەی خۆی (وَقِيلَ: مَسَافَةُ قَصْرٍ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بە ئەندازەی کورتکردنەوەی نوێژ دوور بێ.

(وَمَنْ بِقَرِيبَةٍ) هەر داوالێکراوێك لە ئەندازەیەکی نزیك بێ (كَحَاضِرٍ) وەکو داوالێکراوی حازرە، واتە: واجبە بەخۆی لە دادگادا ئامادە ببێ، کەوابو: (فَلاَ تُسْمَعُ بَيِّنَتُهُ وَيُحْكَمُ بِغَيْرِ حُضُورِهِ) بێئامادەبونیخۆی نە شاهیدی لە سەر وەردەگیرێو نە بریاری مافەکەشی لە سەر دەدرێ (إِلاَّ لِتَوَارِيهِ) تەنها ئەگەر داوالێکراوەکە خۆی پەنا دابێ (أَوْ تَعَزُّزِهِ) یان بە هۆی زاڵبوون لە دادگادا ئامادە نەبێ، ئەو کاتە —بێ ئامادەبوونیخۆی— شاهیدی لە سەر وەردەگیرێو بریاری مافەکەشی لە سەر دەدرێ بێ ئەوەی داواکارەکە سوێندی بەهێزکردن بخوا.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (جَوَازُ الْقَضَاءِ عَلَى غَائِبٍ فِي قِصَاصٍ وَحَدِّ قَذْفٍ) دروستە بریار لە سەر داوالێکراوی نادیار بدرێ: لە تۆڵەکردنەوەی برینو کوشتنو لە سزای

وَمَنْعُهُ فِي حَدٍّ لِلَّهِ تَعَالَى، وَلَوْ سَمِعَ بَيِّنَةً عَلَى غَائِبٍ فَقَدِمَ قَبْلَ الْحُكْمِ لَمْ يَسْتَعِدْهَا بَلْ يُخْبِرُهُ وَيُمَكِّنُهُ مِنْ جَرْحٍ، وَلَوْ عُزِلَ بَعْدَ سَمَاعِ بَيِّنَةٍ ثُمَّ وُلِّيَ وَجَبَتْ الإِسْتِعَادَةُ، وَإِذَا اُسْتُعْدِيَ عَلَى حَاضِرٍ بِالْبَلَدِ أَحْضَرَهُ بِدَفْعِ خَتْمِ طِينٍ رَطْبٍ أَوْ غَيْرِهِ أَوْ بِمُرَتَّبٍ لِذَلِكَ، فَإِنْ اِمْتَنَعَ بِلاَعُذْرٍ أَحْضَرَهُ بِأَعْوَانِ السُّلْطَانِ وَعَزَّرَهُ، أَوْ غَائِبٍ فِي غَيْرِ وِلاَيَتِهِ فَلَيْسَ لَهُ إِحْضَارُهُ،

---

بوختاندا، بەلاَم (وَمَنْعُهُ فِي حَدٍّ لِلَّهِ تَعَالَى) قەدەغەیەو نابێ لە سزاکانی مافیخوایگەورەدا بریار لە سەر نادیار بدرێ، بەلاَم ئەگەر تاوانەکە مافی خوای گەورەو مافی ئادەمیزادی تێدا بێ: وەکو دزی، ئەو کاتە بریاری ماڵەکە لە سەر دزە نادیارەکە دەدرێ، بەلاَم بریاری دەست برینی لە سەر نادرێ، هەوەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ سَمِعَ بَيِّنَةً عَلَى غَائِبٍ) ئەگەر قازی لە سەر نادیارێك گوێی لە شاهیدەكان گرت (فَقَدِمَ قَبْلَ الْحُكْمِ) ئینجا پێش بڕیاردان داوالێكراوەنادیارەكە هاتەوە (لَمْ يَسْتَعِدْهَا) واجب نیە دووبارە شاهیدیەكە وەربگرێتەوە (بَلْ يُخْبِرُهُ وَيُمَكِّنُهُ مِنْ جَرْحٍ) بەڵكو هەواڵی شاهیدەیەكە بە داوالێكراوەكە دەڵێ و ڕێگای دەداتێ ڕەخنە لە شاهیدەكان بگرێ.

بەڵام (وَلَوْ عُزِلَ بَعْدَ سَمَاعِ بَيِّنَةٍ) ئەگەر لە دوای گوێلێگرتنی شاهیدەكان قازی لەكار لادرا (ثُمَّ وُلِّيَ) ئینجا گەڕاندراوە سەر كارەكەی، ئەو كاتە (وَجَبَتِ الإِسْتِعَادَةُ) واجبە: دووبارە شاهیدیەكە وەربگرێتەوەو نابێ بە گوێلێگرتنەكەییەكەم بڕیار بدا.

(وَإِذَا اُسْتُعْدِيَ عَلَى حَاضِرٍ بِالْبَلَدِ) هەر كاتێك شكایەت كرا، واتە: داوا لە قازی كرا دوژمنكارێكی حازر بانگی دادگا بكاو دوژمنایەتیەكەی لاببا. ئەو كاتە (أَحْضَرَهُ) واجبە: قازی دوژمنارەكە لە دادگادا ئامادە بكا (بِدَفْعِ خَتْمِ طِينٍ رَطْبٍ أَوْ غَيْرِهِ) وەك مۆركراوێكی پارچە قوڕێكی تەڕ، یان نووسراوێكیتر بە دەست داواكارەكە بۆ دوژمنكارەكە بنێرێ و تێیدا بنووسێ: وەرە دادگای فلانە قازییە. (أَوْ بِمُرَتَّبٍ لِذَلِكَ) یان بە نێردراوێكی دامەزراو بۆ ئامادەكردنەكان ئامادەی دەكا.

(فَإِنْ امْتَنَعَ بِلاَ عُذْرٍ) جا ئەگەر–بە بێعوزر– داواكراوەكە خۆی گێر كردو نەهاتە دادگا، ئەو كاتە (أَحْضَرَهُ بِأَعْوَانِ السُّلْطَانِ) واجبە: بە چەكدارەكانی كاربەدەست ئامادەی بكا، هەم (وَعَزَّرَهُ) دروستە تەمبێیشی بكا.

(أَوْ غَائِبٍ فِي غَيْرِ وِلاَيَتِهِ) یان ئەگەر شكایەتەكە، واتە: داواكردنی لادانی دوژمنكاریەكە لە سەر نادیارێك بوو، نادیارەكەش لە شوێنێكی وەها بوو: كە شوێنی دەسەڵاتی قازییەكە نەبو، ئەو كاتە (فَلَيْسَ لَهُ إِحْضَارُهُ) بۆ قازییەكە دروست نیە دوژمنكارەكە بهێنێتە دادگای خۆی، بەڵكو گوێ لە شاهیدەكان دەگرێ و شاهیدیەكە دەگەیێنێتە قازیی نادیارەكە، بەو شێوەی ڕابرا.

أَوْ فِيهَا وَلَهُ هُنَاكَ نَائِبٌ لَمْ يُحْضِرْهُ بَلْ يَسْمَعُ بَيِّنَةً وَيَكْتُبُ إِلَيْهِ، أَوْ لاَ نَائِبَ فَالأَصَحُّ يُحْضِرُهُ مِنْ مَسَافَةِ الْعَدْوَى فَقَطْ، وَهِيَ الَّتِي يَرْجِعُ مِنْهَا مُبَكِّرٌ لَيْلاً، وَأَنَّ الْمُخَدَّرَةَ لاَ تُحْضَرُ وَهِيَ مَنْ لاَ يَكْثُرُ خُرُوجُهَا لِحَاجَاتٍ.

(بَابُ الْقِسْمَةِ)

---

(أَوْ فِيهَا) یان دوژمنكارەكە لە شوێنێكی ژێر دەسەڵاتی قازیەكە بوو (وَلَهُ هُنَاكَ نَائِبٌ) قازیەكەش لەوێ جێگرێكی خۆی هەبوو، ئەو كاتەش (لَمْ يُحْضِرْهُ) نابێ بیهێنێتە دادگای خۆی (بَلْ يَسْمَعُ بَيِّنَةً وَيَكْتُبُ إِلَيْهِ) بەڵكو گوێ لە شاهیدكان دەگرێ و بۆ جێگرەكەی

دەنووسێ تاکو بەو شاهیدیەیە بڕیار بدا (أَوْ لاَ نَائِبَ) بەڵام ئەگەر جێگری لەوێ نەبو، ئەو کاتە (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (يُحْضِرُهُ مِنْ مَسَافَةِ الْعَدْوَى فَقَطْ) تەنها لە ئەندازەی خۆشڕۆییەوە ئامادەی دەکا: (وَهِيَ) ئەندازەی خۆشڕۆیی (اَلَّتِى يَرْجِعُ مِنْهَا مُبَكِّرٌ لَيْلاً) ئەو شوێنەیە: ڕێبوار لە بەیانیەوە دەربچێ و بۆ سەرەتای شەو بگەڕێتەوە شوێنەکەی.

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ الْمُخَدَّرَةَ لاَ تُحْضَرُ) ئافرەتی داپۆشەر و مرۆڤی نەخۆش و پەککەوتوو ناهێندرێنە دادگا، بەڵکو وەکیلی خۆیان دەنێرنە دادگا، یان قازی جێگرێکی خۆی دەنێرێتە لای ئەوان تاکو کێشەکە ببڕێتەوە (وَهِيَ) ئافرەتی داپۆشەر (مَنْ لاَ يَكْثُرُ خُرُوجُهَا لِحَاجَاتٍ) ئەو ئافرەتەیە بۆ پێویستیەکانی بە زۆری لە ماڵ ناچێتە دەرەوە.

## ﴿ بَابُ الْقِسْمَةِ: **باسی بەشکردنی ماڵی هاوبەش لە نێوان هاوبەشەکاندا** ﴾

**پێشەکی** بزانە: بۆ هیچ هاوبەشێك دروست نیە پێش بەشکردن هیچ بەشێك لە ماڵە هاوبەشەکە ببا، تەنها ئەگەر هاوبەشەکان ئیزنی بدەن، یان ڕەقەکاری بکەن و لەگەڵی بەش نەکەن، ئەو کاتە دروستە بەشی خۆی لە ماڵی هاووێنەیی ببا: وەکو گەنم و پارە، واتە: بەڵام لە هیچ حاڵەتێکدا –پێش بەشکردن– لە ماڵێ قرسێندراودا دروست نیە بەشی خۆی ببا: وەکو جل و بەرگ و ئاژەڵ.

کەوابو: هەر کاتێك یەکێك لە هاوبەشەکان بەشێکی لە ماڵێکی هاوبەشی لە کەسێك وەرگرت: وەکو میرات و شتی زەوتکراو و بەخشراو، ئەوە گشتیان لەو بەشەدا دەبنەوە هاوبەش، تەنها لە پارەی فرۆشراودا نەبێ، واتە: ئەگەر دوو هاوبەش ماڵێکیان فرۆشتە کەسێك، ئەوە بۆ هەر یەکەیان دروستە: بە تەنهایی بەشە پارەکەی خۆی لە کڕیارەکە وەربگرێ و هاوبەشەکەیتر لەگەڵی نابێتەوە هاوبەش.

جا بزانە: ئەگەر کۆمەڵێك پارەیان تێکەڵ کرد بۆ کارێك، ئینجا وازیان لە کارەکە هێنا، ئەو کاتەش بۆ هەر یەکەیان دروستە –بێ ڕەزامەندی ئەوانیتر– بەشەکەی خۆی وەربگرێتەوە، هەروەها ئەگەر هاوبەشێك حازر نەبێ، ئەو کاتەش بۆ هاوبەشەکەی حازر دروستە:

قَدْ يَقْسِمُ الشُّرَكَاءُ أَوْ مَنْصُوبُهُمْ أَوْ مَنْصُوبُ الإِمَامِ، وَشَرْطُ مَنْصُوبِهِ: ذَكَرٌ حُرٌّ عَدْلٌ يَعْلَمُ الْمِسَاحَةَ وَالْحِسَابَ، فَإِنْ كَانَ فِيهَا تَقْوِيمٌ وَجَبَ قَاسِمَانِ، وَإِلاَّ فَقَاسِمٌ، وَفِى قَوْلٍ اثْنَانِ، وَلِلإِمَامِ جَعْلُ الْقَاسِمِ حَاكِمًا فِالتَّقْوِيمِ فَيَعْمَلُ فِيهِ بِعَدْلَيْنِ وَيَقْسِمُ، وَيَجْعَلُ الإِمَامُ رِزْقَ مَنْصُوبِهِ مِنْ بَيْتِ الْمَالِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فَأُجْرَتُهُ عَلَى الشُّرَكَاءِ،

---

بەشەکەی خۆی لەو ماڵە هاوبەشە وەربگرێ: کە بە بڕیاری دادگا بۆی ئاشکرا بووە، هەروەك لە (تحفە)و حاشیەکانیدا لێرەو لە (باسی هاوبەشی)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا (قَدْ يَقْسِمُ الشُّرَكَاءُ) هەندێ جار هاوبەشەکان ماڵە هاوبەشەکە لە نێوان خۆیاندا بەش

دەكەن (أَوْ مَنْصُوبُهُمْ) یان وەكیلی هاوبەشەكان لە نێوانیاندا بەشی دەكا (أَوْ مَنْصُوبُ الإِمَامِ) یان كاربەدەست، یان وەكیلی كاربەدەست لە نێوانیاندا بەشی دەكا، هەرچەند لەم حاڵەتەشدا هاوبەشێكیش ئامادە نەبێ.

(وَشَرْطُ مَنْصُوبِهِ) مەرجی وەكیلەكەی كاربەدەست: (ذَكَرٌ حُرٌّ عَدْلٌ) دەبی پیاوێكی بالغو عاقڵو ئازادو دادپەروەر بێ، هەم (يَعْلَمُ الْمِسَاحَةَ وَالْحِسَابَ) پیوانەی زەویو ژماردنیش بزانێ، هەروەها ئەگەر بەشكەرەكە وەكیلی هاوبەشەكان بێو منداڵ، یان شێتیان لە ناودا بێ، ئەو كاتەش ئەو مەرجانە گشتی واجبن، بەڵام ئەگەر منداڵو شێتیان لە ناودا نەبێ، ئەو كاتە–تەنها– مەرجە: بەشكەرەكە بالغو عاقڵ بێ، كەواتە: دروستە: فاسقو ئافرەت– بە ڕەزامەندی ئەوان– ماڵەكەیان بۆ بەش بكەن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ كَانَ فِيهَا تَقْوِيمٌ) جا ئەگەر لە بەشكردنەكەدا قرساندن، واتە: نرخ دانان هەبێ، ئەو كاتە (وَجَبَ قَاسِمَانِ) واجبە دوو بەشكەر ماڵەكە بقرسێننو بەشی بكەن، چونكە قرساندن شاهیدیدانە بە نرخی بەشەكە (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر قرساندنی تێدا نەبێ، ئەو كاتە (فَقَاسِمٌ) یەك بەشكەر بەسە ماڵەكە بەش بكا (وَفِي قَوْلٍ اِثْنَانِ) لە فەرمودەیەكی بێهێزدا: دەبی دوو بەشكەر بەشی بكەن.

(وَلِلإِمَامِ جَعْلُ الْقَاسِمِ حَاكِمًا فِيالتَّقْوِيمِ) بۆ پێشەوا دروستە: بەشكەرەكە بكاتە دادوەر لە قرساندنەكەدا، جا ئەو كاتە (فَيَعْمَلُ فِيهِ بِعَدْلَيْنِ) بەشكەرەكە بە شاهیدیی دوو پاوی دادپەروەر نرخەكە دادەنێو (وَيَقْسِمُ) بەخۆی ماڵەكە بەش دەكا.

(وَيَجْعَلُ الإِمَامُ رِزْقَ مَنْصُوبِهِ مِنْ بَيْتِ الْمَالِ) واجبە: پێشەوا موچەی وەكیلەكەیخۆی بۆ بەشكردن لە (بیت المال) بدا (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ) جا ئەگەر (بیت المال) نەبو، یان بەرووستی نەدەكرد، ئەو كاتە (فَأُجْرَتُهُ عَلَى الشُّرَكَاءِ) كرێی بەشكەرەكە لە سەر هاوبەشەكانە–ئەگەر بە كرێیان گرتبێ– چونكە لەو حاڵەتەدا دروست نیە: كاربەدەست بەشكەرێكی دیاركراو دابنێ.

فَإِنْ اِسْتَأْجَرُوهُ وَسَمَّى كُلٌّ قَدْرًا لَزِمَهُ، وَإِلاَّ فَالأُجْرَةُ مُوَزَّعَةٌ عَلَى الْحِصَصِ، وَفِي قَوْلٍ عَلَى الرُّءُوسِ، ثُمَّ مَا عَظُمَ الضَّرَرُ فِي قِسْمَتِهِ كَجَوْهَرَةٍ وَثَوْبٍ نَفِيسَيْنِ وَزَوْجَيْ خُفٍّ إِنْ طَلَبَ الشُّرَكَاءُ كُلُّهُمْ قِسْمَتَهُ لَمْ يُجِبْهُمْ الْقَاضِي، وَلاَ يَمْنَعُهُمْ إِنْ قَسَمُوا بِأَنْفُسِهِمْ إِنْ لَمْ تَبْطُلْ مَنْفَعَتُهُ كَسَيْفٍ يُكْسَرُ، وَمَا يَبْطُلُ نَفْعُهُ الْمَقْصُودُ كَحَمَّامٍ وَطَاحُونَةٍ صَغِيرَيْنِ لاَ يُجَابُ طَالِبُ قِسْمَتِهِ فِالأَصَحِّ، فَإِنْ أَمْكَنَ جَعْلُهُ حَمَّامَيْنِ أُجِيبَ، وَلَوْ كَانَ لَهُ عُشْرُ دَارٍ لاَ يَصْلُحُ لِلسُّكْنَى وَالْبَاقِي لآخَرَ

ئینجا (فَإِنْ اِسْتَأْجَرُوهُ) ئەگەر هەموو هاوبەشەكان بەشكەرەكەیان بە كرێ گرتو

(وَسَمَّى كُلٌّ قَدْرًا) هەر یەکەشیان ئەندازە کرێیەکی سەربەخۆی ناو هێنابو، ئەوە (لَزِمَـهُ) هەر کەسەو ناوبراوەکەی خۆی لە سەر واجب دەبێ.
(وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر بە تێکڕایی یەك ئەندازە کرێیان دانابو، ئەو کاتە (فَالأُجْرَةُ مُوَزَّعَةٌ عَلَى الْحِصَصِ) ئەو کرێیە بە سەر ئەندازەی بەشەکاندا بەش دەکرێ، واتە: ئەوەی نیوەی هەیە نیوەی کرێیەکە دەدا، ئەوە سێیەکی هەیە سێیەك، ئەوەی شەشێکی هەیە شەشێك (وَفِي قَوْلٍ عَلَى الرُّءُوسِ) لە فەرموودەیەکدا بە سەر سەری هاوبەشەکاندا–بە یەکسانی– بەش دەکرێ، بەڵام ئەگەر تەنها یەکێکیان–بێ ڕەزامەندی هاوبەشەکانیتر– بە کرێی بگرێ، ئەو کاتە هەموو کرێیەکە لە سەر وی واجب دەبێ، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی.
(ثُمَّ مَا عَظُمَ الضَّرَرُ فِي قِسْمَتِهِ) ئینجا ئەو هاوبەشەی زەرەرێکی گەورە لە بەشکردنیدایە: (كَجَوْهَرَةٍ وَثَوْبٍ نَفِيسَيْنِ) وەکو گەوهەرێك و جلکێکی نرخدار، هەم (وَزَوْجَيْ خُفٍّ) وەکو جووتە گۆرەوی، یان جووتە خوفێك و ئەو جۆرە شتانە، ئەوە (إِنْ طَلَبَ الشُّرَكَاءُ كُلُّهُمْ قِسْمَتَهُ) ئەگەر هەموو هاوبەشەکان داوای بەشکردنیان کرد (لَمْ يُجِبْهُمْ الْقَاضِي) نابێ قازی داوایەکەیان بەجێ بێنێ، بەڵام (وَلاَ يَمْنَعُهُمْ إِنْ قَسَمُوا بِأَنْفُسِهِمْ) نابێ قەدەغەشیان بکا، ئەگەر بەخۆیان بەشیان کرد (إِنْ لَمْ تَبْطُلْ مَنْفَعَتُهُ) بەو مەرجەی بە یەکجاری سوودەکەی تێك نەچێ (كَسَيْفٍ يُكْسَرُ) وەکو شمشێرێك بشکێندرێ، چونکە بۆ کردنە کێرد سودی دەمێنێ.
بەڵام (وَمَا يَبْطُلُ نَفْعُهُ الْمَقْصُودُ) ئەو هاوبەشەی بە بەشکردن سودە مەبەستەکەی تێك بچێ (كَحَمَّامٍ وَطَاحُونَةٍ صَغِيرَيْنِ) وەکو گەرماوێك و ئاشێکی بچوك، ئەوە (لاَ يُجَابُ طَالِبُ قِسْمَتِهِ) وەڵامی ئەو هاوبەشە نادرێتەوە کە داوای بەشکردنی ئەو جۆرە شتە دەکا، چونکە زەرەری تێدایە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام (فَإِنْ أَمْكَنَ جَعْلُهُ حَمَّامَيْنِ) ئەگەر گونجا بکرێتە دوو گەرماو، یان دوو ئاش، ئەو کاتە (أُجِيبَ) وەڵامی داواکارەکە دەدرێتەوە، جا ئەگەر هاوبەشەکەیتریش ڕازی نەبێ زۆری لێدەکرێ بەشی بکا، چونکە زەرەری تێدانیە.
بەڵام (وَلَوْ كَانَ لَهُ عُشْرُ دَارٍ) ئەگەر هاوبەشێك دەیەکێکی خانوویێکی هەبوو، کە (لاَ يَصْلُحُ لِلسُّكْنَى) دەیەکەکە کەڵکی نیشتەجێبوونی نەبو (وَالْبَاقِي لآخَرَ) نۆ بەشەکەیتریشی بۆ فَالأَصَحُّ إِجْبَارُ صَاحِبِ الْعُشْرِ بِطَلَبِ صَاحِبِهِ دُونَ عَكْسِهِ، وَمَا لاَ يَعْظُمُ ضَرَرُهُ قِسْمَتُهُ أَنْوَاعٌ: أَحَدُهَا: بِالأَجْزَاءِ كَمِثْلِيٍّ وَدَارٍ مُتَّفِقَةِ الأَبْنِيَةِ وَأَرْضٍ مُشْتَبِهَةِ الأَجْزَاءِ فَيُجْبَرُ الْمُمْتَنِعُ فَتُعَدَّلُ السِّهَامُ كَيْلاً وَوَزْنًا وَذَرْعًا بِعَدَدِ الأَنْصِبَاءِ إِنْ اِسْتَوَتْ، وَيَكْتُبُ فِي كُلِّ رُقْعَةٍ اِسْمَ شَرِيكٍ أَوْ جُزْءًا مُمَيَّزًا بِحَدٍّ أَوْ جِهَةٍ وَتُدْرَجُ فِي بَنَادِقَ مُسْتَوِيَةٍ

---

هاوبەشەکەیتر بوو و کەڵکی نیشتەجێبوونی هەبوو، ئەوە (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (إِجْبَارُ صَاحِبِ الْعُشْرِ) خاوەنی دەیەکەکە زۆری لێدەکرێ خانووەکەی بەش بکا، هەرچەند زەرەریش بکا، بەڵام بەو مەرجەی (بِطَلَبِ صَاحِبِهِ) بەشکردنەکە بە داواکردنی

هاوبەشەکەی‌تر بێ (دُونَ عَكْسِهِ) بەڵام بە پێچەوانەوە نابێ، واتە: بە داواکردنی خاوەنی دەیەکەکە هاوبەشەکەی‌تر زۆری لێناکرێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بەشکردنی ماڵی منداڵو شێت قازانجی تێدا بێ، ئەوە بۆ سەرپەرشتکارەکەیان دروستە بەشی بکا، ئەگەر نا: دروست نیە، بەڵام ئەگەر هاوبەشەکانی‌تر داوای بەشکردنی ماڵەکە بکەن، ئەو کاتە بەشکردنەکە واجب دەبێ، هەرچەند قازانجی منداڵو شێتەکەشی تێدا نەبێ، هەروەك لە (تحفە)و حاشیەکانیدا فەرموویانە.

(وَمَا لاَ يَعْظُمُ ضَرَرُهُ قِسْمَتُهُ أَنْوَاعٌ) ئەو شتەی بە بەشکردن زەرەرێکی گەورەی نابێ، بە سێ جۆر بەش دەکرێ:

(أَحَدُهَا: بِالأَجْزَاءِ) جۆری‌یەکەم: پێی دەگوترێ: (قِسْمَةُ الأَجْزاء)=بەشکردنی پارچە پارچە، هەم پێی دەگوترێ: (قِسْمَةُ الإِفْرازِ)=لێکجیاکردنەوە (كَمِثْلِيٍّ) وەکو شتی هاوێنە: وەك دانەوێڵەو پارە، هەم (وَدَارٍ مُتَّفِقَةِالأَبْنِيَةِ) وەکو خانوویێك کە هەموو ژوورەکانو هەیوانەکانی وەکو یەکتری بن، هەم (وَأَرْضٍ مُشْتَبِهَةِالأَجْزَاءِ) وەکو زەوییێك کە هەموو بەشەکانی وێك بچن، لەوانەدا گشتی (فَيُجْبَرُ الْمُمْتَنِعُ) ئەو هاوبەشەی دەڵی بەشی ناکەم زۆری لێدەکرێ بەشی بکا، هەر چەند هەموو بەشەکانیشی بە ئەندازەی یەکتری نەبن: کەوابو: (فَتُعَدَّلُ السِّهَامُ كَيْلاً وَوَزْنًا وَذَرْعًا) بەشەکان یەکسان دەکرێن: بە پێوان، یان بە کێشان، یان بەگەزو مەتر، یان بە ژماردن (بِعَدَدِ الأَنْصِبَاءِ) بە ژمارەی بەشەکان (إِنْ اسْتَوَتْ) ئەگەر بەشەکان وەکو یەکتری بن: وەك زەوییەکە بۆ سێ کەسان: هەر یەکەو سێیەکێکیان، ئەوە دەکرێتە سێ بەش، ئینجا سێ پارچە کاغەز دێنینو (وَيَكْتُبُ فِي كُلِّ رُقْعَةٍ اسْمَ شَرِيكٍ) لە هەر پارچە کاغەزێکدا بەشکەرەکە ناوی هاوبەشێك دەنووسێ (أَوْ جُزْءًا مُمَيَّزًا بِحَدٍّ أَوْ جِهَةٍ) یان بەشێکی جیاکراوە: بە سنورێك، یان بە تەنیشتێك لە پارچە کاغەزەکەدا دەنووسێ، ئینجا (وَتُدْرَجُ فِي بَنَادِقَ مُسْتَوِيَةٍ) ئەو پارچە کاغەزانە دەناو چەند تۆپێکی یەکسان دەندرێن، یان دەناو کیسەیەك دەندرێن بۆ (قُرْعَةٍ)=پشکەکردن لە نێوانیاندا:

ثُمَّ يُخْرِجُ مَنْ لَمْ يَحْضُرْهَا: رُقْعَةً عَلَى الْجُزْءِ الأَوَّلِ إِنْ كَتَبَ الأَسْمَاءَ فَيُعْطَى مَنْ خَرَجَ اسْمُهُ، أَوْ عَلَى اسْمِ زَيْدٍ إِنْ كَتَبَ الأَجْزَاءَ، فَإِنْ اخْتَلَفَتِ الأَنْصِبَاءُ كَنِصْفٍ وَثُلُثٍ وَسُدُسٍ جُزِّئَتِ الأَرْضُ عَلَى أَقَلِّ السِّهَامِ وَقُسِّمَتْ كَمَا سَبَقَ، وَيُحْتَرَزُ عَنْ تَفْرِيقِ حِصَّةٍ وَاحِدٍ. اَلثَّانِي: بِالتَّعْدِيلِ كَأَرْضٍ تَخْتَلِفُ قِيمَةُ أَجْزَائِهَا بِحَسْبِ قُوَّةِ إِنْبَاتٍ وَقُرْبِ مَاءٍ، وَيُجْبَرُ الْمُمْتَنِعُ عَلَيْهَا فِالأَظْهَرِ،

---

(ثُمَّ يُخْرِجُ مَنْ لَمْ يَحْضُرْهَا رُقْعَةً) ئینجا کەسێك-کە ئامادەی ڕووداوەکە نەبوبێ، یان منداڵێك- پارچە کاغەزێك دەردێنێ: (عَلَى الْجُزْءِ الأَوَّلِ إِنْ كَتَبَ الأَسْمَاءَ) لە سەر بەشی

یەکەم، ئەگەر بەشکەرەکە ناوی هاوبەشەکانی نوسیبێ (فَيُعْطِي مَنْ خَرَجَ اِسْمُهُ) جا بەشە یەکەمەکە دەداتە ئەو هاوبەشەی ناوی لەو پارچە کاغەزەدا دەرچوە، ئینجا پارچە کاغەزێکیتریش لە سەر بەشەکەیدووەم دەردێنێو دەیداتە ئەو هاوبەشەی ناوی دەرچوە...بەم جۆرە تا دەگاتە کۆتایی.

(أَوْ عَلَى اِسْمِ زَيْدٍ إِنْ كَتَبَ الأَجْزَاءَ) یان پارچە کاغەزەکە لە سەر ناوی (زەید) دەردێنێ، ئەگەر ناوی بەشەکانی لە پارچە کاغەزەکاندا نوسیبێ، ئینجا ناوی کامە پارچە لە کاغەزەکەدا دەرچو، دەیداتە (زەید)، ئینجا پارچە یەکیتریش لە سەر ناوی (بەکر) دەردێنێ...بەم جۆرە تادەگاتە کۆتایی.

(فَإِنْ اِخْتَلَفَتْ الأَنْصِبَاءُ) جا ئەگەر بەشەکان لێك جیاواز بن (كَنِصْفٍ وَثُلُثٍ وَسُدُسٍ) وەکو نیوەو سێیەكو شەشێك، ئەو کاتە (جُزِّئَتْ الأَرْضُ عَلَى أَقَلِّ السِّهَامِ) زەویەکە لە سەر کەمترینی بەشەکان پارچە پارچە دەکرێ، واتە: لەم وێنەیەدا دەیکاتە شەش بەش، ئینجا (وَقُسِّمَتْ كَمَا سَبَقَ) وەکو شێوەیڕابردوو بەش دەکرێ، بەڵام (وَيُحْتَرَزُ عَنْ تَفْرِيقِ حِصَّةِ وَاحِدٍ)دەبی بەشکەرەکە خۆی بپارێزێ: بەشی هیچ هاوبەشێك لێك جیا نەکاتەوە، واتە: با هەرسێك پارچەکانی خاوەنینیوەیی لە تەنیشت یەکتری بن، هەردوو پارچەکانی خاوەنی سێیەك لە تەنیشت یەکتری بن.

(اَلثَّانِي: بِالتَّعْدِيلِ) جۆریدووەمی بەشکردن: بە ( قِسْمَةُالتَّعْدِيل) دەبێ، واتە: یەکسانکردنی نرخی بەشەکان (كَأَرْضٍ تَخْتَلِفُ قِيمَةُ أَجْزَائِهَا) وەکو بەشکردنی زەویەکی وەها: کە نرخی پارچەکانی لێك جیابێ (بِحَسَبِ قُوَّةِ إِنْبَاتٍ وَقُرْبِ مَاءٍ) بەگوێرەی بەهێزی سەوزکردنی گیاو درەختو نزیکی ئاو، یان پارچەیەکی درەختی هەنار بێو پارچەیەکی درەختی بەڕوو بێ، ئەوە لەو حاڵەتانەدا پارچەیەکی باشەکە–بە هۆی بە نرخی– بەرامبەر دوو پارچەیخراپەکە دادەندرێ، یان بەرامبەر کەمتر، یان زیاتر...تا نرخی گشت پارچەکان یەکسان دەبێ، ئینجا بەو شێوەی ڕابردوو بە (قُرْعَة)–پشکەکردن بەش دەکرێو هەم (وَيُجْبَرُ الْمُمْتَنِعُ عَلَيْهَا) بۆ ئەم جۆرە دووەمەش ئەو هاوبەشەی دەڵێ: بەشی ناکەم. زۆری لێدەکرێ بەشی بکا (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

وَلَوْ اِسْتَوَتْ قِيمَةُ دَارَيْنِ أَوْ حَانُوتَيْنِ فَطَلَبَ جَعْلَ كُلٍّ لِوَاحِدٍ فَلاَ إِجْبَارَ، أَوْ عَبِيدٍ أَوْ ثِيَابٍ مِنْ نَوْعٍ أُجْبِرَ، أَوْ نَوْعَيْنِ فَلاَ. اَلثَّالِثُ: بِالرَّدِّ بِأَنْ يَكُونَ فِي أَحَدِالْجَانِبَيْنِ بِئْرٌ أَوْ شَجَرٌ لاَ يُمْكِنُ قِسْمَتُهُ فَيَرُدُّ مَنْ يَأْخُذُهُ قِسْطَ قِيمَتِهِ، وَلاَ إِجْبَارَ فِيهِ، وَهُوَ بَيْعٌ، وَكَذَا التَّعْدِيلُ عَلَى الْمَذْهَبِ،

---

(وَلَوْ اِسْتَوَتْ قِيمَةُ دَارَيْنِ أَوْ حَانُوتَيْنِ) ئەگەر دوو خانوو، یان دوو دوکان نرخەکەیان بە ئەندازەی یەکتری بوو (فَطَلَبَ جَعْلَ كُلّ لِوَاحِدٍ) ئینجا هاوبەشێك داوای کرد: هەر یەکەیان –بە گوێرەی پشکەکردن– بۆ یەکێکیان بێ. ئەوە (فَلاَ إِجْبَارَ) لەم جۆرەدا هاوبەشەکەیتر زۆری لێناکرێ بۆ بەشکردن، چونکە هەر کەسێكو مەبەستێکی جیاوازی هەیە لە شوێنو

دوكان‌و خانوودا (أَوْ عَبِيدٍ أَوْ ثِيَابٍ) یان چەند كۆیله، یان چەند جل، یان چەند ئاژەڵ، یان چەند درەخت نرخەكەیان یەكسان بوو، هەم (مِنْ نَوْعٍ) گشتیان لە یەك جۆر بون، ئەو كاتە (أُجْبِرَ) هاوبەشەكەی‌تر زۆری لێدەكرێ بەشی بكا (أَوْ نَوْعَيْنِ) بەڵام ئەگەر لە دوو جۆر بون: وەك بزن‌و مەڕ، یان جلی خوری‌و لۆكە، یان وەك هێسترو درەخت، ئەو كاتە (فَلاَ) هاوبەشەكە زۆری لێناكرێ، چونكە مەبەستەكان لە هەر جۆرێكدا لێك جیانە.

(اَلثَّالِثُ: بِالرَّدِّ) جۆری‌سێیەمی بەشكردن: (قِسْمَةُالرَّد)=بەشكردنی بە ڕەدكردنەوەیە، واتە: هاوبەشێك–بە هۆی چاكتری بەشەكەی‌خۆی– هەندێك ماڵ بداتە هاوبەشەكەی‌تر: (بِأَنْ يَكُونَ فِى أَحَدِالْجَانِبَيْنِ بِئْرٌ أَوْ شَجَرٌ) وەك لە لایەكی زەوییەكەدا بیرێك، یان درەختێك، یان شتێكی‌تر هەبێ، كە (لاَ يُمْكِنُ قِسْمَتُهُ) نەگونجێ بەش بكرێ‌و لایەكەی‌تریش تێیدا نەبێ، یان تێیدا بێ بەڵام وەكو ئەم لایە چاك نەبێ، ئەو كاتە هەندێك ماڵ لە بەرامبەر بیرەكەو درەختەكە بۆ لایەكەی‌تر دادەندرێ، ئینجا بە (قُرْعَة)=پشكەكردن بەش دەكرێ، ئینجا (فَيَرُدُّ مَنْ يَأْخُذُهُ قِسْطَ قِيمَتِهِ) ئەو هابەشەی لایەكەی بیرو درەختەكە وەردەگرێ دەبێ بەشە نرخی بیرەكە، یان درەختەكە بۆ هاوبەشەكەی‌تر ڕەد بكاتەوە:

بۆ وێنە: نرخی هەر پارچەیەك هەزار دینارە، نرخی بیرەكەش–بە تەنها– هەزار دینارە، ئەو هاوبەشەی لای بیرەكە وەردەگرێ دەبێ پێنجسەد دینار بۆ هاوبەشەكەی‌تر ڕەد بكاتەوە لە بەرامبەر نیوەی بیرەكە. بەڵام (وَلاَ إِجْبَارَ فِيهِ) ئەم جۆرەی‌سێیەم زۆرلێكردنی تێدا نیە، چونكە ئەو ماڵەی هاوبەشەكە ڕەدی دەكاتەوە هاوبەشیی تێدا نیە.

(وَهُوَ بَيْعٌ) بەشكردنی بە ڕەدكردنەوە فرۆشتنە، چونكە ماڵەكە لە بەرامبەر بەشەكە وەردەگیرێ، بەڵام پێویستی بە ووشەی كڕین‌و فرۆشتن نیە، بەڵكو مەرجە: هاوبەشەكان بە زوبان ڕازی بن (وَكَذَا التَّعْدِيلُ عَلَى الْمَذْهَبِ) هەروەها (قِسْمَةُ التَّعْدِيل)ش فرۆشتنە، لە سەر فەرموودەی‌ڕاستی مەزهەب، بەڵام لە بەر پێویستی ئەم جۆرە بەشكردنە بە زۆرلێكردن دەكرێ، هەروەك ماڵی مرۆڤی قەرزداریش بە زۆرلێكردن دەفرۆشرێ، چونكە گشت بەشێكی ماڵە هاوبەشەكە ملكی هەموو هاوبەشەكانە، واتە: هەر هاوبەشێك بەشەكەی خۆی لە بەرامبەر بەشی هاوبەشەكەی وەردەگرێ.

وَقِسْمَةُ الأَجْزَاءِ إِفْرَازٌ فِي الأَظْهَرِ، وَيُشْتَرَطُ فِالرَّدِّ الرِّضَا بَعْدَ خُرُوجِ الْقُرْعَةِ، وَلَوْ تَرَاضَيَا بِقِسْمَةِ مَا لاَ إِجْبَارَ فِيهِ أُشْتُرِطَ الرِّضَا بَعْدَ الْقُرْعَةِ فِالأَصَحِّ، كَقَوْلِهِمَا: رَضِينَا بِهَذِهِ الْقِسْمَةِ، أَوْ بِمَا أَخْرَجَتْهُ الْقُرْعَةُ. وَلَوْ ثَبَتَ بِبَيِّنَةٍ غَلَطٌ أَوْ حَيْفٌ فِي قِسْمَةِ إِجْبَارٍ نُقِضَتْ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ بَيِّنَةٌ وَادَّعَاهُ وَاحِدٌ فَلَهُ تَحْلِيفُ شَرِيكِهِ، وَلَوْ ادَّعَاهُ فِي قِسْمَةِ تَرَاضٍ وَقُلْنَا هِيَ بَيْعٌ

---

(وَقِسْمَةُ الأَجْزَاءِ إِفْرَازٌ) بەشكردنی پارچە پارچەكان–كە جۆری‌یەكەم بوو– جیاكردنەوەی ملكێكە لە ملكێكی‌تر، واتە: فرۆشتن نیە بۆیێ بە زۆرلێكردنیش دەكرێ، چونكە

بەو جیاکردنەوەیە ئاشکرا دەبێ: ئەم بەشە جیاکراوەیە بەشی ئەم هاوبەشەیە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.
(وَيُشْتَرَطُ فِي الرَّدِّ) بە مەرج دادەندرێ لە بەشکردنی بە ڕەدکردنەوەدا (اَلرِّضَا بَعْدَ خُرُوجِ الْقُرْعَةِ) هەموو هاوبەشەکان لە دوای دەرچوونی پشکە بە زوبان بڵێن: بەم بەشکردنە ڕازیمە چونکە گوتمان: ئەم جۆرە بەشکردنە لە ڕاستیدا فرۆشتنەو زۆرلێکردنی تێدا نیە، کەوابو: پێویستە ووشەی ڕازیبوون بگوترێ.
(وَ) هەروەها لە دوو جۆرەکەیتریشدا (لَوْ تَرَاضَيَا) ئەگەر هاوبەشەکان –پێش پشکەکردن– بەخۆیان ڕازی بون (بِقِسْمَةِ مَا لاَ إِجْبَارَ فِيهِ) بە بەشکردنی ماڵێك بێ زۆرلێکردن، ئەوە (اُشْتُرِطَ الرِّضَا بَعْدَالْقُرْعَةِ) بە مەرج دادەندرێ: لە دوای پشکەکردنیش بەو بەشکردنە ڕازی بن (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (كَقَوْلِهِمَا: رَضِينَا بِهَذِهِ الْقِسْمَةِ) وەك هەموویان بڵێن: بەم بەشکردنە ڕازی بوین (أَوْ) یان بڵێن: (بِمَا أَخْرَجَتْهُ الْقُرْعَةُ) ڕازیمە بەو بەشەی پشکەکردنەکە دەری هێناوە.
بەڵام ئەگەر بەشکردنەکە بە زۆرلێکردن بێ، ئەو کاتە ڕازیبوونی هیچ لایەك ڕەچاو ناکرێ: نە لە پێش پشکەکردنو نە لە دوای پشکەکردن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)یەدا فەرموویانە.
(وَلَوْ ثَبَتَ بِبَيِّنَةٍ) ئەگەر بە دوو شاهید، یان بە شاهیدێكو سوێندخواردن ئاشکرا بوو: (غَلَطٌ أَوْ حَيْفٌ فِي قِسْمَةِ إِجْبَارٍ) لە بەشکردنی بە زۆرلێکردندا هەڵەیەك، یان ستەمێك کراوە، ئەو کاتە (نُقِضَتْ) بەشکردنەکە هەڵدەوەشێندرێتەوە.
(فَإِنْ لَمْ تَكُنْ بَيِّنَةٌ) جا ئەگەر شاهید نەبو (وَادَّعَاهُ وَاحِدٌ) یەکێك لە هاوبەشەکان گوتی: هەڵەیەك، یان ستەمێك لە بەشکردنەکەدا کراوە، ئەو کاتە (فَلَهُ تَحْلِيفُ شَرِيكِهِ) مافی هەیە هاوبەشەکەی سوێند بدا: کە هەڵە نەکراوەو ستەمیش نەکراوە، جا ئەگەر هاوبەشەکە سوێندی خوارد، ئەوە بەشکردنەکە بە دروستبوو دادەندرێ، بەڵام ئەگەر سوێندی نەخوارد، ئەو کاتە ئەگەر داواکارەکە سوێند بخوا، بەشکردنەکە هەڵدەوەشێندرێتەوە .
(وَلَوْ ادَّعَاهُ فِي قِسْمَةِ تَرَاضٍ) ئەگەر لە بەشکردنێکی بە ڕەزامەندیخۆیاندا گوتی: هەڵەیەك، یان ستەمێك کراوە (وَقُلْنَا هِيَ بَيْعٌ) بشڵێین بەشکردنی بە ڕەزامەندی فرۆشتنە: وەك جۆری

فَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ أَثَرَ لِلْغَلَطِ فَلاَ فَائِدَةَ لِهَذِهِ الدَّعْوَى، قُلْتُ: وَإِنْ قُلْنَا إِفْرَازٌ نُقِضَتْ إِنْ ثَبَتَ، وَإِلاَّ فَيَحْلِفُ شَرِيكُهُ، وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ اُسْتُحِقَّ بَعْضُ الْمَقْسُومِ شَائِعًا بَطَلَتْ فِيهِ، وَفِي الْبَاقِي خِلاَفُ تَفْرِيقِ الصَّفْقَةِ، أَوْ مِنَ النَّصِيبَيْنِ مُعَيَّنٌ سَوَاءٌ بَقِيَتْ، وَإِلاَّ بَطَلَتْ.

(كِتَابُ الشَّهَادَاتِ)

---

دووەمو سێیەم، ئەو کاتە (فَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ أَثَرَ لِلْغَلَطِ) بە فەرموودەیڕاستتر: هەڵەکردنەکەو

ستەمەكە هیچ كارێك لە بەشكردنەكە ناكەن، كەوابو: (فَلاَ فَائِدَةَ لِهَذِهِ الدَّعْوَى) ئەم داواكردنە هیچ سودێكی نیە، هەرچەند زەرەریشی كردبێ، چونكە بە ڕەزامەندی خۆی وازی لە مافی خۆی هێناوە بۆ هاوبەشەكەی.

(قُلْت) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (وَإِنْ قُلْنَا: إِفْرَازٌ) ئەگەر بڵێین: بەشكردنی بە ڕەزامەندی جیاكردنەوەی بەشەكانە: وەك جۆرییەكەمی بەشكردنەكان، ئەو كاتە (نُقِضَتْ إِنْ ثَبَتَ) هەڵدەوەشێندرێتەوە ئەگەر بە دوو شاهید، یان بە شاهیدێكو سوێندخواردن ئاشكرا ببێ: هەڵەیە، یان ستەم كراوە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ئاشكرا نەبێ، ئەو كاتە (فَيَحْلِفُ شَرِيكُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ) هاوبەشەكەی سوێند دەخوا: كە ستەمو هەڵە نەكراوە، ئینجا بەشكردنەكە بە دروستبوو دادەندرێ، هەروەك تازە ڕابرا.

(وَلَوْ اُسْتُحِقَّ بَعْضُ الْمَقْسُومِ شَائِعًا) ئەگەر هەندێكی ماڵە بەشكراوەكە بە مافی كەسێكیتر دەرچو بە بەربڵاوی: وەك چوارێك، ئەوە (بَطَلَتْ فِيهِ) لەو هەندەدا بەشكردنەكە بەتاڵ دەبێتەوەو واجبە: بدرێتەوە خاوەنەكەی (وَفِيالْبَاقِي خِلاَفُ تَفْرِيقِ الصَّفْقَةِ) لەوەی ماوەتەوەش فەرموودە جیاوازەكانی لێكجیاكردنەوەی مامڵەتێك دێنەجێ، بە فەرموودەی بەهێزتر: بەشكردنەكە دروست دەبێ بەڵام هاوبەشەكان مافی پەشیمانییان هەیە.

(أَوْ مِنْ النَّصِيبَيْنِ مُعَيَّنٌ سَوَاءٌ) یان لە هەردوو بەشەكاندا ئەندازەیەكی دیاركراو بە یەكسانی دەرچو مافی كەسێكیترە، ئەو كاتەش (بَقِيَتْ) بەشكردنەكە وەك خۆی دەمێنێ (وَإِلاَّ) بەڵام بەشە دیاركراوەكە یەكسان نەبو، یان تەنها لە بەشێكیاندا بوو، ئەو كاتە (بَطَلَتْ) بەشكردنەكە بەتاڵ دەبێتەوە، چونكە هەر یەكەیان ئەندازەی مافی خۆی وەرنەگرتوە.

## ﴿ كِتابُ الشَّهَاداتِ: **پەڕتوكی شاهیدیەكان** ﴾

**پێناسە:** شاهیدی: خەبەردانی كەسێكە بە مافی كەسێك لە سەر كەسێك.

**ئینجا بزانە:** درۆكردن لە شاهیدیدا گوناهێكی گەورەیەو پێغەمبەرﷺ لە ڕیزی كافربوونی داناوەو فەرموویەتی: ﴿أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَكْبَرِالْكَبائِرِ؟ قالُوا بَلَى. قَالَ: اَلإِشْراكُ بِاللهِ وَعُقُوقُ الْوالِدَيْنِ وَشَهادَةُالزُّورِ﴾ رواه الشيخان، گەورەترینی گوناهەكانتان پێ بڵێم؟ (صحابة) گوتیان: بەڵێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كافربوونو ئازاردانی دایكو باوكو شاهیدیی بە درۆ.

شَرطُ الشَّاهِدِ: مُسْلِمٌ حُرٌّ مُكَلَّفٌ عَدْلٌ ذُو مُرُوءَةٍ غَيْرُ مُتَّهَمٍ،

---

هەم فەرموویەتی: ﴿لَنْ تَزُولَ قَدَمُ شاهِدِالزُّورِ حَتَّى يُوجِبَ اللهُ لَهُ النَّارَ﴾ رواه ابن ماجه بسند صحيح، پێی شاهیدی بە درۆ لە شوێنی خۆی لاناكەوێ تا خوای گەورە ئاگری دۆزەخی بۆ واجب دەكا.

(شَرْطُ الشّاهِدِ) مەرجەكانی شاهید بۆ ئەوەی شاهیدیی قبوڵ بكرێ: (مُسْلِمٌ) دەبێ موسوڵمان بێ، واتە: شاهیدیی كافر قبوڵ ناكرێ، چونكە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ دوو پیاوی دادپەروەر لە خۆتان بکەنە شاهید. واتە: کافر لە ئێمە نیەو دادپەروەریش نیە. بەڵام لە مەزهەبێ ئیمامی(حنفی)دا: شاهیدی کافر لە زەڕی کافرێکیتر وەردەگیرێ، هەروەك لە (مجمع الانهر)و (مغنی)دا فەرموویانە.
هەروەها مەرجە شاهیدەکە: (حُرٌّ مُكَلَّفٌ) ئازادو بالغ عاقڵ بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ﴾ دوو شاهید لە پیاوەکانتان بکەنە شاهید. کەواتە شاهیدی منداڵ قبوڵ ناکرێ چونکە پیاو نیە، هەم شاهیدی شێتیش قبوڵ ناکرێ بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام.
بەڵام لە مەزهەبی ئیمام (مالك)دا: شاهیدیی منداڵان لە سەر یەکتری قبوڵ دەکرێ لەو لێدانو برینداركردنانەی لە نێوانیاندا ڕوو دەدا، بەو مەرجەی لێك جیا نەبوبنەوە، هەروەك لە حاشیەکانی (القليوبى)و (عميرة)دا گێڕاویەتیانەوە.
هەروەها مەرجە شاهیدەکە (عَدْلٌ) دادپەروەر بێ، بە بەڵگەی ئایەتەکەی پێشتر، کەواتە: شاهیدی فاسق قبوڵ ناکرێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا﴾ ئەگەر فاسقێك هەواڵێکی هێنا لاتان ئێوە لێبکۆڵنەوەو ڕوونی بکەنەوە. واتە: هەواڵەکەی قبوڵ مەکەن.
هەروەها مەرجە شاهیدەکە: (ذُو مُرُوءَةٍ) خاوەن پیاوەتیو ڕەووشتی بەرز بێ، چونکە ئەگەر مرۆڤ پیاوەتیی نەبێ، شەرم ناکاو چی حەز بکا دەیڵێو دەیکا، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەروویەتی: ﴿إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ﴾ رواه الشيخان، هەر کاتێك شەرمت نەکرد، چی حەز دەکەی بیکە.
هەم (غَيْرُ مُتَّهَمٍ) لە شاهیدیەکەیدا تۆمەت پێکراو نەبێ: بە سود گەیاندن، یان زەرەر لێدان، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ تُقْبَلُ شَهَادَةُ ذِىالظِّنَّةِ وَلاَ ذِىالْحِنَّةِ﴾ حديث صحيح رواه الحاكم على شرط مسلم، شاهیدیی خاوەن تۆمەتو خاوەن دوژمنایەتی قبوڵ ناکرێ. جا بزانە: لە دوای ڕوونکردنەوەی گوناهەکان ئەم دوو مەرجە ڕوون دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.
هەروەها مەرجە شاهیدەکە: گوێیاو هەشیار بێ، واتە: شاهیدی لاڵو گێلەکە قبوڵ ناکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
وَشَرْطُ الْعَدَالَةِ: اِجْتِنَابُ الْكَبائِرِ وَالإِصْرَارِ عَلَى صَغِيرَةٍ،

---

(وَشَرْطُ الْعَدَالَةِ) مەرجی دادپەروەری ئەمەیە: (اِجْتِنَابُ الْكَبَائِرِ) مرۆڤ خۆی لە گشت گوناهێك لە گوناهە گەورەکان بپارێزێو هیچێکیان نەکا، هەم (وَالإِصْرَارِ عَلَى صَغِيرَةٍ) خۆی بپارێزێ لە سوربوون لە سەر تەنها گوناهێکی بچوك، یان لە سەر چەند گوناهێکی بچوك.
**ڕوونکردنەوە**: هەر کاتێك مرۆڤ گوناهێکیگەورەی کرد، ئەوە دادپەروەریی بەتاڵ دەبێتەوەو دەبێتە فاسق، هەرچەند تەنها یەك جاریش گوناهەکەی کردبێو

خواپەرستیەکانیشی زۆرتر بن لە گوناهەکان، واتە: ئەگەر لە گوناهە گەورەکە تۆبەش بکا شاهیدیی لێقبولٚ ناکرێ تا ساڵێك بە سەر تۆبەکەیدا تێدەپەڕێ، هەروەك لە (باسی شاهیدی کافرو فاسق)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالی.
هەروەها ئەگەر زۆر جار گوناهێکی بچوك بکا، یان چەند گوناهێکی بچوك دوو بارە بکاتەوەو تۆبە نەکاو خواپەرستیەکانیشی بە سەر گوناهە بچوکەکانیدا زاڵ نەبن: وەك یەکسان بن، ئەو کاتە گوناهە بچوکەکە دەگاتە ڕیزی گوناهی گەورەو دادپەروەریی بەتاڵ دەبێتەوەو دەبێتە فاسق، بەڵام ئەگەر خواپەرستیەکانی زاڵ بن بە سەر گوناهە بچوکەکانیدا، یان لە گوناهە بچوکەکانی تۆبەی کردبێ، ئەو کاتە هەر بە دادپەروەر دەمێنێتەوە.
ئینجا بزانە: چەند زانایەکی مەزهەبی (الشافعی) فەرموودەکەی هەندێك زانایانی مەزهەبی (مالك)ی هەڵبژاردوە: کە هەر کاتێك دادپەروەری نەماو فاسقی بڵاو بۆوە، ئەو کاتە –لە بەر ناچاری– دادوەر داد دەکا بە شاهیدی کەم گوناهتری کەم گوناهتر، بەڵام ئیمام (إبن عبدالسلام) ڕەدی کردۆتەوە، هەروەها بە فەرموودەیەکی ئیمام (أحمد) ئەوەندە بەسە: شاهیدەکە بە ئاشکرایی موسوڵمان بێ، بەو مەرجەی فاسقیی نەزاندرابێ، هەروەك لە (تحفە)و (نهایە)و حاشیەکانیاندا ناوەڕۆکی ئەم باسە ڕوون کراوەتەوە.

﴿ پێناسەی گوناهی گەورەو بچوك ﴾

هەر گوناهێك ببێتە نیشانەی کەم بایەخی بە ئایین: جا لە دونیادا سزای بۆ داندرابێ، یان هەڕەشەی قیامەت، یان لەعنەت، یان غەزەبیخوای لە سەر هاتبێ، ئەوانە گوناهی گەورەنە، جگە لە وانەش گوناهی بچوکن، هەروەك لە (شرح مسلم)و زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.
بۆ وێنە: کوشتنی بە ناهەقو زیناو مەی خواردنەوەو دزیو ڕیباو ماڵخواردنی یەتیمو شاهیدی بە درۆو سوێندی بە درۆو بەرتیلو بوختانی زیناو زەوتکردنو لە بیرکردنی قورئانو زەکاتنەدانو بەڕۆژوونەبوونی ڕەمەزان بێعوزرو پێشخستنو دواخستنی نوێژو سیحرکردن...هتد، ئەوانە گشتی گوناهی گەورەنە، (إبن عباس) رضیالله عنهما، فەرموویەتی: ژمارەی گوناهە گەورەکان لە حەفتا نزیکترە، هەروەك لە (مغنی)دا گێڕاویەتیەوە.

وَيَحْرُمُ اللَّعِبُ بِالنَّرْدِ عَلَى الصَّحِيحِ، وَيُكْرَهُ بِشِطْرَنْجٍ، فَإِنْ شُرِطَ فِيهِ مَالٌ مِنَ الْجَانِبَيْنِ فَقِمَارٌ، وَيُبَاحُ الْحُدَاءُ وَسَمَاعُهُ، وَيُكْرَهُ الْغِنَاءُ بِلاَ آلَةٍ وَسَمَاعُهُ،

---

(وَيَحْرُمُ اللَّعِبُ بِالنَّرْدِ) حەرامە گەمەکردن بە تاوڵە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ فَكَأَنَّمَا صَبَغَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ وَدَمِهِ﴾ رواه مسلم وأبوداود، هەر کەسێك گەمە بە تاوڵە بکا، وەك دەستی بە گۆشتو خوێنی بەراز کردبێ ئەوهایە. کەواتە: ئەگەر بەردەوام تاوڵە بکا، شاهیدیی لێقبول ناکرێ، چونکە تاوانی

بەرامبەر خواو پێغەمبەرﷺ کردوە، هەروەك لە حەدیسەکەی (أبوداود)دا هاتوە.
(وَيُكْرَهُ بِشِطْرَنْجٍ) ناپەسندە: گەمەکردن بە شەترەنج، چونکە لە زیکرو نوێژکردن غافڵی دەکا، جا هەرچەند شەترەنج لە سێ مەزهەبەکەی‌تردا حەرامە، بەڵام هیچ حەدیسێکی ڕاستی دەرهەق نەهاتوە، هەروەك لە(تحفة)دا فەرموویەتی، بەڵام (فَإِنْ شُرِطَ فِيهِ مَالٌ مِنَ الْجَانِبَيْنِ) ئەگەر لە شەترەنجدا ماڵ بە مەرج داندرا لە هەردوو لاوە، ئەو کاتە (فَقِمَارٌ) دەبێتە قومار، کەواتە: بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام حەرام دەبێ، هەروەها ئەگەر تەنها لایەنێکیش ماڵێك بە مەرج دابنێ، هەر حەرامە.
جا بزانە: هەر گەمەکردنێك-وەك تاوڵە- بە گۆترەو خەملاندن بێ: وەکو دۆمینە، ئەوە حەرامە هەرچەند هیچ ماڵیشی لە سەر وەرنەگیرێ، بەڵام ئەگەر-وەك شەترەنج- بە لێکدانەوەو بیرلێکردنەوە بێ: وەکو دامەو سێ ڕیزکانەو نۆڕیزکانە، ئەوە حەرام نیە، چونکە بیری مرۆڤ بەهێز دەکا بۆ جەنگ، بەڵام بەو مەرجە لە ڕێگەو چایخانەدا گەمەکە نەکا؟ چونکە پیاوەتی لادەبا، هەم بەو مەرجەش هیچ شتێکی لە سەر وەرنەگیرێ، ئەگینا: ئەویش دەبێتە قومارو حەرام دەبێ.
هەروەها حەرامە: تێکبەردانی بەران‌و سەگو کەڵەشێرو هەڵپەڕاندنی مەیمون‌و کۆتربازی‌و هەر گەمەیەکی ببێتە هۆی لاچوونی پەردەی شەرم‌و پیاوەتی، هەروەك لە (تحفە)و (مغنی)دا ئەم باسە ڕوون کراوەتەوە.
(وَيُبَاحُ الْحُدَاءُ) بەیت گوتن لە دوای ووشتر-تاکو خۆش بڕوا- حەلاڵە، هەم (وَسَمَاعُهُ) گوێ لێڕاگرتنیشی حەلاڵە، چونکە پێغەمبەرﷺ گوێی لە (أَنْجَشَة) ڕاگرتوە، هەروەك لە (البخاری‌و مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.
(وَيُكْرَهُ الْغِنَاءُ بِلاَ آلَةٍ) ناپەسندە گۆرانی گوتن بە بێ‌کەرستەی غافڵکردن‌و جۆشاندن، هەم (وَسَمَاعُهُ) گوێ لێڕاگرتنیشی ناپەسندە، بەڵام ئەگەر گۆرانی گوتنەکە لەگەڵ بەکارهێنانی کەرستەی غافڵکردن‌و جۆشاندن بێ، ئەو کاتە گوتن‌و گوێ لێڕاگرتنی هەردووك حەرامن هەرچەند پیاویش بیڵێ ﴿عن ابن مسعودﷺ: إِنَّ الْغِنَاءَ يُنْبِتُ النِّفَاقَ فِي الْقَلْبِ﴾ رواه ابوداود وابن ابی‌الدنیا وصححه فی‌التحفة، گۆرانی گۆتن دوو ڕوویی لە ناو دڵدا شین دەکا.
وَيَحْرُمُ اِسْتِعْمَالُ آلَةٍ مِنْ شِعَارِ الشَّرَبَةِ كَطُنْبُورٍ وَعُودٍ وَصَنْجٍ وَمِزْمَارٍ عِرَاقِيٍّ وَ اِسْتِمَاعُهَا، لاَ يَرَاعٍ فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ تَحْرِيمُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

﴿وَعَنْهُ فِي تَفْسِيرِ قَوْلِهِ تَعالى:(وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَالْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللهِ): هُوَ وَاللهِ اَلْغِنَاءُ﴾رواه الحاكم ورواه الإمام احمد والترمذي عن ابی‌أمامة مرفوعاً، ورواه البيهقی عن إبن عباس رضی‌الله عنهم أجمعين، هەندێك کەس هەیە غافڵکردنی گفتوگۆ دەکڕێ تاکو خەڵکی لە ڕێگای‌خوا گومڕا بکا. (إبن مسعود) فەرمووی: (واللە مەبەست لەو گفتوگۆیە: گۆرانی‌یە).

جا بزانە: گۆرانی گوتنی ئافرەتان بۆ كپكردنـەوەی منداڵـەكانيان دروسـتە، هـەم سـرود گوتنی ئايينی: كە باسی خواو پێغەمبەرىﷺ هاندانی چاكەی تێدا بێ، ئەوانەش سوننەتن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دافەرموويانە، هەروەها ئەگەر گۆرانی گۆتنەكە باسی ئافرەتو شتی حەڕامی تێدا نەبێو مەبەستی هاندانيشی بۆ خراپە نەبێ، ئەو كاتەش حەڕام نيـە، هەروەك ئيمامی (الغزالی) فەرموويەتیو (الشروانی) گێڕاويەتيەوە.

(وَيَحْرُمُ اسْتِعْمَالُ آلَةٍ مِنْ شِعَارِ الشَّرَبَةِ) بە يەكدەنگی هەرچوار مەزهەبەكانی (أهـل السـنَّة) حەڕامە: بەكارهێنانی هەر كەرستەيەكی لە دروشمی شەڕابخۆرەكان بێ: (كَطُنْبُـورٍ وَعُـودٍ وَصَنْجٍ) وەكو تونبور عودو سەنجەو ڕەبابەو جەنگـەو سـەنتيرو كەمەنجـە، هـەم (وَمِزْمَـارٍ عِرَاقِيٍّ) زوڕناو دووزەلەو گشت كەرستەيەكیتری مۆسيقا.

هەم (وَ اسْتِمَاعُهَا) گوێ لێڕاگرتنی ئەوانەو گشـت كەرسـتەيەكیتری مۆسـيقاش حەڕامـە؟ چونكە بێجياكردنەوە پێغەمبەرﷺ فەرموويەتی: ﴿لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الْحِرَ وَالْحَرِيرَ وَالْخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ﴾ رواه البخاری وأبوداود، هەندێ كەس لە ئوممەتی مـن دەبـن: زيناو ئاوريشمو شەڕابو موسيقاكان بە حەلاڵ دەزانن.

جگـە لـە مـەش بـەكارهێنانو گـوێ لێڕاگرتنـی ئەوانـەیڕابردوو وێچـواندنی فاسـقو بێئەخلاقەكانە، پێغەمبەريشﷺ فەرموويەتی: ﴿مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ﴾ رواه أبـوداود والطبرانی بسند حسن، هەر كەسێك خۆی وەكەسانێك بچوێنی ئەويش لە ئەوانە.

ئيتر كە بە يەكدەنگی هەر چوار مەزهەبـەكان گشـت كەرسـتەيەكی مۆسـيقا حـەڕام بـێ، واجبە: مرۆڤی موسوڵمان خۆی لێبپارێزێو بە قسە پوچەڵەكانی (إبن حزم)و (إن طـاهر) هەڵنەخەڵەتێو فتوايەكانيان باوەڕ نەكاو لە يەكدەنگی زانايانی باوەڕپێكراو لانەدا.

جا هەر كەسێك واتێبگا: گوێ لێڕاگرتنی گـۆرانیو مۆسـيقا زەوقـی مـرۆڤ زيـاد دەكـا بـۆ خواپەرستی، يـان نيسـبەتی بداتـە لای پێغەمبـەرﷺ، بێگومـان ئـەوە نەزانـەو شـەيتانەو بوختان بە خواو پێغەمبەرﷺ دەكا، كەوابو: واجبە: زۆر بە توندی تەمبێ بكرێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا بەدرێژی روون كراوەتەوە.

(لاَ يَرَاعٍ فِیالأَصَحِّ) بـەلاَم شمشـاڵ حـەڕام نيـە (قُلْـتُ) ئيمـامی (النـواوی) فەرموويـەتی: (الأَصَحُّ تَحْرِيمُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: شمشـاڵ حەڕامـە. جـا ئـەو زانايانـەی

وَيَجُوزُ دُفٌّ لِعُرْسٍ وَخِتَانٍ وَكَذَا غَيْرِهُمَا فِالأَصَحِّ وَإِنْ كَانَ فِيهِ جَلاَجِلُ، وَيَحْرُمُ ضَرْبُ الْكُوبَةِ وَهِيَ طَبْلٌ طَوِيلٌ ضَيِّقُ الْوَسَطِ، لاَ الرَّقْصُ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ فِيهِ تَكَسُّرٌ كَفِعْلِ الْمُخَنَّثِ،

---

دەفەرموون: شمشاڵ حەڕام نيە. لە بەر ئەوەيە: هـيچ بەڵگەيـەكی بـاوەڕپێكراو لـە سـەر حەڕامیی نيە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموويەتی.

(وَيَجُوزُ دُفٌّ لِعُرْسٍ وَخِتَانٍ) دەف لێدانو گوێ لێڕاگرتنی دروستە: بۆ بوكو سـوننەتكردنی كوڕانو (وَكَذَا غَيْرُهُمَا فِیالأَصَحِّ) هـەروەها جگـە لـەو دووانـەش بـۆ گشـت خۆشـيەكیتر

دروستە دەف لێبدرێ: وەك مارەبڕینو جەژنو گەڕانەوەی ڕێبوارو هاتنی زانایەكی ئایینیو سەركەوتنی موسوڵمانانو...هتد.
(وَإِنْ كَانَ فِيهِ جَلاَجِلُ) هەرچەند دەفەكەش ئاڵقەو زنجیرەكانیشی تێدا بن هەر حەڵاڵە، چونكە ئافرەتێك گوتی: ﴿يَارَسُولَ اللهِ إِنِّى نَذَرْتُ أَنْ أَضْرِبَ عَلَى رَأْسِكَ بِالدُّفِّ؟ قَالَ: أَوْفِي بِنَذْرِكِ﴾ رواه أبوداود والترمذي بسند صحيح، ئەی پێغەمبەریخوا نەزرم كردبوو- ئەگەر لەم غەزایە جەنابت بە سەلامەتی گەڕایەوە- لە سەرت دەف لێبدەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نەزرەكەت بەجێ بێنە. واتە: چونكە لەم حاڵەتەدا دەف لێدان سوننەتە. هەم چەند حەدیسێكیتریش كە لە باسی مارەبڕینو بوك گواستنەوەدا گێڕدراونەوە.
جا بزانە: ئیمام (إبن الصلاح) فەرموویەتی: ئەگەر دەفو شمشاڵ وێكڕا لێبدرێن، ئەو كاتە هەر دووكیان حەرام دەبن. بەڵام ئیمامی (السبكى) ڕەدی كردۆتەوە، هەروەك لە (تحفة) و (النهاية)دا ڕوون كراوەتەوە.
(وَيَحْرُمُ ضَرْبُ الْكُوبَةِ) حەرامە لێدانی تەپڵی كوپە (وَهِيَ طَبْلٌ طَوِيلٌ ضَيِّقُ الْوَسَطِ) كە تەپڵێكی درێژی ناوقەد تەسكەو سەرێكی پێستەی لە سەر نیە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ حَرَّمَ الْخَمْرَ وَالْمَيْسِرَ وَالْكُوبَةَ﴾ حديث صحيح رواه أبوداود وغيره، خوای گەورە حەرامی كردوە: شەرابو قومارو لێدانی كوپە. بەڵام جگە لەوانە تەپڵەكانیتر حەرام نین: وەكو تەپڵیجەنگو حاجیەكانو ڕەمەزان، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەكاندا فەرموویانەو لە باسی وەسێتیشدا ڕابرا، واتە: بەومەرجەی زوڕنای لەگەڵدا نەبێ، ئەگینا: ئەویش حەرام دەبێ؟ چونكە دەهۆڵو زوڕنا- وێكڕا- پیشەی بەدڕەوشتەكانە.
(لاَ الرَّقْصُ) بەڵام هەڵپەڕكێ=شایە حەرام نیە بەو مەرجەی ئافرەتو پیاو تێكەڵ نەبن، چونكە (حَبَشِي)یەكان لە ناو مزگەوتدا گەمەیان دەكردو هەڵدەپەڕین، پێغەمبەریشﷺ ڕەخنەی نەگرت، هەروەك لە (البخارى ومسلم)دا گێڕدراوەتەوە.
(إِلاَّ أَنْ يَكُونَ فِيهِ تَكَسُّرٌ) تەنها ئەگەر هەڵپەڕینەكە سەماكردنو خۆشكاندنەوەی تێدا بێو لۆچو ئەندامەكانی لەش بەم لاو بەو لادا خوار بكرێنەوە (كَفِعْلِ الْمُخَنَّثِ) وەكو كرداری ئەو كەسەی سەمای ئافرەتانە دەكا، لەو حاڵەتەدا بۆ ئافرەتو بۆ پیاوان حەرامەو پیاوەتیش كەم دەكاتەوە.
وَيُبَاحُ قَوْلُ شِعْرٍ وَإِنْشَادُهُ إِلاَّ أَنْ يَهْجُوَ أَوْ يُفْحِشَ أَوْ يُعَرِّضَ بِامْرَأَةٍ مُعَيَّنَةٍ. وَالْمُرُوءَةُ تَخَلُّقٌ بِخُلُقِ أَمْثَالِهِ فِي زَمَانِهِ وَمَكَانِهِ، فَالأَكْلُ فِي سُوقٍ، وَالْمَشْيُ مَكْشُوفَ الرَّأْسِ، وَقُبْلَةُ زَوْجَةٍ وَأَمَةٍ بِحَضْرَةِ النَّاسِ،

---

ئیمام (ابن عبدالسلام) فەرموویەتی: تەنها كەم عەقڵەكان هەڵپەڕكێ دەكەنو هەڵپەڕكێ تەنها بۆ ئافرەتان دەگونجێ. هەروەك لە (مغنى)دا گێڕاویەتیەوە.

هەروەها ئەگەر ئافرەتو پیاویش تێکەڵ بن–کە پێی دەگوترێ: ڕەش بەڵەك– ئەو کاتە حەرامیەکەی بەهێزترە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لأَنْ يُطْعَنَ فِي رَأْسِ أَحَدِكُمْ بِمِخْيَطٍ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَمَسَّ اِمْرَأَةً لاَ تَحِلُّ لَهُ﴾ رواه الطبراني بسند صحيح، ئەگەر یەکێکتان بە سوژنێکی ئاسن لە سەری بدرێ باشترە لە وەی دەست لە ئافرەتێکی وەها بدا: کە بۆی حەلاڵ نەبێ.

(وَيُبَاحُ قَوْلُ شَعْرٍ وَإِنْشَادُهُ) حەلاڵە: شیعر دانانو شیعر گۆتن، چونکە پێغەمبەرﷺ چەند شاعیرێکی هەبون (إِلاَّ أَنْ يَهْجُوَ) تەنها ئەگەر لە شیعرەکەیدا جنێو بداتە موسوڵمانێك، یان کافرێکی پەیمان لەئەستۆ (أَوْ يُفْحِشَ) یان لە مەدح کردندا لە سنور دەر بچێ (أَوْ يُعَرِّضَ بِامْرَأَةٍ مُعَيَّنَةٍ) یان باسی سیفەتەکانی ئافرەتێکی دیارکراو بکا، ئەوە لەو حاڵەتانەدا شیعرەکە حەرام دەبێ.

بەلام ئەگەر لە شیعرەکەیدا جنێو بداتە کافرەکانیجەنگی ئەو کاتە سوننەتەو خێری دەگاتێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿اُهْجُوا قُرَيْشاً فَإِنَّهُ أَشَدُّ عَلَيْهَا مِنْ رَشْقٍ بِالنَّبْلِ﴾ رواەالشیخان، بە شیعرەکانتان جنێو بدەنە کافرەکانی قورەیش، چونکە جنێودانەکەتان لە سەریان بەهێزترە لە تیربارانکردنیان. هەروەها دروستە: بە شیعر جنێو بداتە فاسقی بە ئاشکراو بیدعەکاری بە ئاشکرا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

جا بزانە: نەکردنی سوننەتەکانی (رواتب)ی پێشو پاشی نوێژە واجبەکان بە بەردەوامیو بێعوزر، هەم نەکردنی سوننەتەکانی ناو نوێژ بە بەردەوامی، هەم هەڵسانو دانیشتنو لەگەڵ کەم عەقڵەکانو ناکەس بەچەکان گشتی زیان لە قبوڵکردنی شاهیدی دەدەن، هەروەك لە (مغنی) و (الشروانی)دا فەرموویانە.

## ﴿ باسی پیاوەتیو تۆمەتی شاهیدەکان ﴾

(وَالْمُرُوءَةُ) ئەو پیاوەتیەی–بە بەڵگەی حەدیسەکە– گوتمان: مەرجە شاهیدەکە هەیبێ، ئەمەیە: (تَخَلُّقٌ بِخُلُقِ أَمْثَالِهِ) بە ڕەووشتە باشەکانی هاووێنەکانی–بەگوێرەی شەرع– خۆی جوان بکا (فِي زَمَانِهِ وَمَكَانِهِ) لە سەردەمو شوێنەکەی خۆیدا.

بۆ وێنە: (فَالأَكْلُ فِي سُوقٍ) خواردنو خواردنەوە لە ڕێگەکانی بازاردا، هەم (وَالْمَشْيُ مَكْشُوفَ الرَّأْسِ) ڕۆیشتن لە بازاردا بە سەر ڕووتی، هەم (وَقُبْلَةُ زَوْجَةٍ وَأَمَةٍ بِحَضْرَةِ النَّاسِ)



وَإِكْثَارُ حِكَايَاتٍ مُضْحِكَةٍ، وَلُبْسُ فَقِيهٍ قَبَاءً وَإِكْبَابٌ عَلَى لَعِبِ الشِّطْرَنْجِ أَوْ غِنَاءٍ أَوْ سَمَاعِهِ يَخْتَلِفُ بِالأَشْخَاصِ وَالأَحْوَالِ وَالأَمَاكِنِ، وَحِرْفَةٌ دَنِيئَةٌ كَحِجَامَةٍ وَكَنْسٍ وَدَبْغٍ مِمَّنْ لاَ تَلِيقُ بِهِ تُسْقِطُهَا، فَإِنْ اِعْتَادَهَا وَكَانَتْ حِرْفَةَ أَبِيهِ فَلاَ فِالأَصَحِّ. وَالتُّهْمَةُ أَنْ يَجُرَّ إِلَيْهِ نَفْعًا أَوْ يَدْفَعَ عَنْهُ ضَرَرًا فَتُرَدُّ شَهَادَتُهُ لِعَبْدِهِ وَمُكَاتَبِهِ وَغَرِيمٍ لَهُ مَيِّتٍ أَوْ عَلَيْهِ حَجْرُ فَلَسٍ،

ماچ كردنی ژن‌و جاریه‌كه‌ی له‌ به‌رچاوی خه‌ڵك، هه‌م (وَإِكْثَارُ حكَايَاتٍ مُضْحِكَةٍ) زۆر گێڕانه‌وه‌ی ڕووداوه‌كانی پێكه‌نینه‌ر، هه‌م (وَلُبْسُ فَقِيهٍ قُبَاءً وَقَلَنْسُوَةً حَيْثُ لاَ يُعْتَادُ) ده‌به‌ركردنی مرۆڤـی شه‌رعزان كه‌وایه‌ك، یان كوڵاوێك كـه‌ بـۆ زانایانی‌ئـاییـنی لـه‌و شـوێنه‌دا عـاده‌ت نـه‌بێ، هـه‌م (وَإِكْبَابٌ عَلَى لَعِبِ الشِّطْرَنْجِ) خه‌ریكبوونێكی به‌رده‌وام له‌ سه‌ر گه‌مه‌ی شه‌تره‌نج‌و دامه‌، یان له‌ سه‌ر ڕێگه‌كاندا شه‌تره‌نج‌و دامه‌ بكا (أَوْ غِنَاءٍ أَوْ سَمَاعِهِ) یان خه‌ریكبونێكی به‌رده‌وام لـه‌ سه‌ر گۆرانی گوتن‌و گوێ لێراگرتنی گۆرانی، هه‌م (وَإِدَامَةُ رَقْصٍ) زۆر شـایه‌ كـردن، ئه‌وانـه‌ گشتی (يُسْقِطُهَا) پیاوه‌تی‌ی لاده‌به‌ن‌و شاهیدی‌ی قبول ناكرێ.

(وَالأَمْـرُ فِيـهِ يَخْتَلِـفُ بِالأَشْـخَاصِ وَالأَحْـوَالِ وَالأَمَـاكِنِ) ئـه‌و كارانـه‌ی پیـاوه‌تی لاده‌بـه‌ن به‌گوێره‌ی مرۆڤه‌كان‌و حاڵه‌ته‌كان‌و شوێنه‌كان ده‌گۆڕێن، واتـه‌: وا ده‌بـێ ئـه‌و كارانـه‌ بـۆ هه‌ندێ كه‌س له‌ شوێنێكدا ناشیرین‌و بۆ هه‌ندێكیان له‌ هه‌ندێ شوێنی‌تردا ناشیرین نین.

(وَحِرْفَةٌ دَنِيئَةٌ) پیشه‌یه‌كی حه‌ڵاڵی له‌ به‌رچاو سوك: (كَحِجَامَةٍ وَكَنْسٍ وَدَبْغٍ) وه‌كـو خـوێن لێگرتن‌و زبڵ ماڵین‌و ده‌باغكردن (مِمَّنْ لاَ تَلِيقُ بِهِ) له‌ كه‌سێكه‌وه‌ كه‌ شـیاوی خـۆی نـه‌بێ (تُسْقِطُهَا) پیاوه‌تی لاده‌با، به‌ڵام (فَإِنْ اعْتَادَهَا) ئه‌گه‌ر پیشه‌كه‌ شیاوی خۆی بێ‌و (وَكَانَتْ حِرْفَةَ أَبِيهِ) هه‌م پیشه‌ی‌باوكی بـوو (فَـلاَ فِي‌الأَصَـحِّ) پیـاوه‌تی‌ی لانابـا، لـه‌ فـه‌رمووده‌ی ڕاستتردا، به‌ڵام خاوه‌ن پیشه‌ی حه‌رام شاهیدی‌ی قبول ناكرێ، هه‌رچه‌ند پیشه‌ی باوكیشی بێ‌و شیاوی خۆیشی بێ، هه‌روه‌ك له‌ زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه‌.

## ﴿ تۆمه‌تی شاهیده‌كان ﴾

(وَالتُّهْمَةُ) ئه‌و تۆمه‌ته‌ی–به‌ به‌ڵگه‌ی حه‌دیسه‌كه‌– گوتمان: قبـوڵكردنی شـاهیدی قه‌ده‌غـه‌ ده‌كا: (أَنْ يَجُرَّ إِلَيْهِ نَفْعًا أَوْ يَدْفَعَ عَنْهُ ضَرَرًا) ئه‌وه‌یه‌: به‌ شاهیدیه‌كه‌ی سودێك بۆ لای خۆی ڕابكێشێ، یان زیانێك له‌ خۆی لابدا، كه‌وابو: (فَتُرَدُّ شَهَادَتُهُ لِعَبْدِهِ وَمُكَاتَبِهِ) شاهیدیه‌كه‌ی ڕه‌د ده‌كرێته‌وه‌و قبول ناكرێ بۆ كۆیله‌كه‌ی خۆی‌و بۆ نووسراوپێدراوی خۆی، چونكه‌ ماڵی ئه‌وانه‌ بۆ خۆیه‌تی، هه‌م (وَغَرِيمٍ لَهُ مَيِّتٍ) شاهیدیه‌كه‌ی قبول ناكرێ بۆ قه‌رزدارێكی خۆی: كه‌ قه‌رزداره‌كه‌ مردبێ (أَوْ عَلَيْهِ حَجْرُ فَلَسٍ) یان قه‌ده‌غه‌ی قه‌رزداری‌ی له‌ سـه‌ر دانـدرابێ، چونكه‌ ئه‌گه‌ر به‌ شاهیدیه‌كه‌ی وی ماڵێك بۆ قه‌رزداره‌كه‌ ئاشكرا ببێ، ئه‌و كاته‌ داوا ده‌كـا قه‌رزه‌كه‌ی له‌و ماڵه‌ بدرێته‌وه‌.

وَبِمَـــا هُـــوَ وَكِيـــلٌ فِيـــهِ، وَبِبَـــرَاءَةِ مَـــنْ ضَـــمِنَهُ، وَبِجِرَاحَـــةِ مُوَرِّثِـــهِ، وَلَـوْ شَـهِدَ لِمُـوَرِّثٍ لَـهُ مَـرِيضٍ أَوْ جَـرِيحٍ بِمَـالٍ قَبْـلَ الإِنْـدِمَالِ قُبِلَـتْ فِالأَصَـحِّ، وَتُرَدُّ شَهَادَةُ عَاقِلَةٍ بِفِسْقِ شُهُودِ قَتْلٍ وَغُرَمَاءِ مُفْلِسٍ بِفِسْقِ شُهُودِ دَيْنٍ آخَرَ، وَلَوْ شَهِدَا لإِثْنَيْنِ بِوَصِيَّةٍ فَشَهِدَا لِلشَّاهِدَيْنِ بِوَصِيَّةٍ مِنْ تِلْكَ التَّرِكَةِ قُبِلَتِ الشَّهَادَتَانِ فِي الأَصَحِّ،

---

بـه‌ڵام ئه‌گـه‌ر قه‌رزداره‌كـه‌ی زینـدوو بـێ‌و قه‌ده‌غـه‌ی لـه‌ سـه‌ر دانه‌نـدرابێ، ئـه‌و كاتـه‌

شاهیدیەکەی بۆ قەرزدارەکەی قبولْ دەکرێ، چونکە لەم حالْەتەدا قەرزەکە لـە ئەسـتۆی قەرزدارەکەدایە، هەروەك لە (تحفە)و (مغنی)دا فەرموویانە.

هەم (وَبِمَا هُوَ وَكِيلٌ فِيهِ) شاهیدیی لەو شتەشدا قبولْ ناکرێ کە بەخۆی تێیدا وەکیلە، یان سەروەسیێتە، یان سەرپەرشتکارە، چونکە بەم شاهیدییە دەسەلاتێك بـۆ خـۆی لـە شتەکەدا ئاشکرا دەکا، هەم (وَبِبَرَاءَةِ مَنْ ضَمِنَهُ) شاهیدیی قبولْ ناکرێ بە نەمانی قەرزی سەر کەسێك کە ئەو بوبێتە زامینـی، چونکە بـەم شـاهیدییە زامینیقەرزەکـە لـە خـۆی لادەدا، هەم (وَبِجِرَاحَةِ مُوَرِّثِهِ) شاهیدیی بە برینی میراتدەرەکـەی–پـێش چـاکبوونەوە– قبولْ ناکرێ، چونکە ئەگەر میراتدەرەکەی بەم برینە بمرێ خوێنی برینەکەی بە میرات بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.

بەلام (وَلَوْ شَهِدَ لِمُوَرِّثٍ لَهُ) ئەگەر شاهیدیی‌دا: بۆ میراتدەرێکی خـۆی کـە میراتدەرەکـە: (مَرِيضٍ أَوْ جَرِيحٍ) نەخۆش بوو، یان بریندار بوو، شاهیدیەکەش (بِمَالٍ قَبْـلَ الإِنْـدِمَالِ) بـە مالْێك بوو پێش ئەوەی چاك ببێتەوە، ئەوە (قُبِلَتْ فِي الأَصَحِّ) شاهیدیەکەی قبولْ دەکرێ، لە فەموودەی ڕاستتردا، چونکە مالْ ـ وەکو برینەکەی‌ڕابردوو ـ نابێتە هۆی مردن.

(وَتُرَدُّ شَهَادَةُ عَاقِلَةٍ بِفِسْقِ شُهُودِ قَتْلٍ) شاهیدیی‌خزمەکانی مرۆڤکوژەکە ڕەد دەکرێتەوەو قبولْ ناکرێ کـە بلْێـێن: شـاهیدەکانی کوشـتنەکە فاسـق بـون، چـونکە بـەم شـاهیدییە ئاشکراکردنی کوشتنەکە لادەدەن تاکو خوێنی کوژراوەکە نەدەن.

(وَ) هەروەها (غُرَمَاءِ مُفْلِسٍ) شاهیدیی خاوەن قەرزەکانی قەرزدارێك–کـە قەدەغـەی لـە سەر داندرابێ– قبولْ ناکرێ (بِفِسْقِ شُهُودِ دَيْنٍ آخَرَ) کـە شـاهیدی بدەن:بـە فاسـقبوونی شاهیدەکانی قەرزێکی‌تر لە سەر قەرزدارەکە، چونکە بەم شاهیدییە هاوبەشیی خـاوەن قەرزکەی‌تر لادەدەن.

(وَلَوْ شَهِدَا لاِثْنَيْنِ بِوَصِيَّةٍ) ئەگەر دوو شاهید شاهیدییان دا بە وەسیێتێك بۆ دوو کەسان لە میراتێکدا (فَشَهِدَا لِلشَّاهِدَيْنِ بِوَصِيَّةٍ مِنْ تِلْكَ التَّرِكَةِ) ئینجا دوو کەسەکانیش شاهیدییان دا: بۆ ئەم دوو شاهیدانە بە وەسیێتێك لە هەمان میراتدا، ئەوە (قُبِلَتِ الشَّهَادَتَانِ فِـي الأَصَـحِّ) هەردو شاهیدیەکان قبولْ دەکرێن لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە هـەردوو شـاهیدەکان لێك جیا بونەتەوە.

وَلاَ تُقْبَـلُ لأَصْـلٍ وَلاَ فَـرْعٍ، وَتُقْبَـلُ عَلَيْهِمَـا، وَكَـذَا عَلَـى أَبِيهِمَـا بِطَـلاَقِ ضَـرَّةِ أُمِّهِمَـا أَوْ قَـذْفِهَا فِـالأَظْهَرِ، وَإِذَا شَـهِدَ لِفَـرْعٍ وَأَجْنَبِـيٍّ قُبِلَـتْ لِلأَجْنَبِيِّ فِالأَظْهَرِ، قُلْتُ: وَتُقْبَلُ لِكُلٍّ مِنَ الزَّوْجَيْنِ وَلأَخٍ وَصَدِيقٍ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

(وَلاَ تُقْبَلُ لأَصْلٍ) شاهیدیی کوڕو کیژ بۆ دایكو باوکیانو بە سەرەوەتریش قبولْ ناکرێ، هەم (وَلاَ فَرْعٍ) شاهیدیی دایكو باوکیش بۆ کوڕو کیـژەکانیانو بـەرەو خـوارتریش قبـولْ

ناكرێ، چونكە كوڕو كیژ پارچەیەكەن لە دایكو باوكانو تۆمەتی سود پێگەیاندنیان لێدەكرێ، ﴿بۆیە-كە جولەكەیەك زرێی ئیمامی(علی)ی بردبو- قازی (شُرَیْح) شاهیدیی حەزرەتی (حسن)ی قبوڵ نەكرد بۆ ئیمامی (علی)؟ چونكە باوكیخۆی بوو﴾. هەروەك (أبو نعیم)و (البیهقی) گێڕاویەتیانەوە.

بەڵام (وَتُقْبَلُ عَلَيْهِمَا) شاهیدیی دایكو باوك لە زەڕی منداڵەكانیانو هەم شاهیدیی منداڵەكان لە زەڕی دایكو باوكانیان قبوڵ دەكرێ، بەو مەرجەی دوژمنایەتی لە نێوانیاندا نەبێ (وَكَذَا عَلَى أَبِيهِمَا بِطَلَاقِ ضَرَّةِ أُمِّهِمَا أَوْ قَذْفِهَا) هەروەها شاهیدیی دوو كوڕ قبوڵ دەكرێ لە سەر باوكیان: كە هەوێی داكیكیانی تەڵاق داوە، یان بوختانی زینای پێكردوە (فِي الْأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە تۆمەتی سودگەیاندنە دایكیان بێهێزە؟ چونكە باوكەكە دەتوانێ دایكی ئەوانیش تەڵاق بدا.

(وَإِذَا شَهِدَ لِفَرْعٍ وَأَجْنَبِيٍّ) ئەگەر شاهیدیی دا: بۆ منداڵێكی خۆیو بۆ بێگانەیەك، یان بۆ باوكی خۆیو بێگانەیەك، واتە: گوتی: ئەم شتە ملكی هەردووكیانە. ئەوە (قُبِلَتْ لِلْأَجْنَبِيِّ فِي الْأَظْهَرِ) شاهیدیەكەی بۆ بێگانەكە قبوڵ دەكرێ، لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵام بۆ باوكو منداڵەكەی قبوڵ ناكرێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر شاهیدی بدا بۆ كوڕیخۆی لە سەر باوكیخۆی، یان بە پێچەوانەوە، یان بۆ باوكیخۆی لە سەر دایكیخۆی، یان بە پێچەوانەوە، ئەوە لەو حاڵەتانەدا شاهیدیەكەی قبوڵ ناكرێ، هەروەك ئیمامی (الغزالی) فەرموویەتی، بەڵام ئیمامی (ابن عبدالسلام) فەرموویەتی: قبوڵ دەكرێ؟ چونكە تۆمەتەكە بێهێزە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا گێڕاویەتیانەوە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (وَتُقْبَلُ لِكُلٍّ مِنَ الزَّوْجَيْنِ) شاهیدیی هەر یەكێك لە ژنو مێرد بۆ یەكتری قبوڵ دەكرێو هەم لە زەڕی یەكتریشیان قبوڵ دەكرێ.

بەڵام شاهیدیی مێرد لە سەر زینای ژنەكەی قبوڵ ناكرێ هەرچەند سێ شاهیدیتریش هەبن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرمویانە.

(وَ) هەروەها (لِأَخٍ وَصَدِيقٍ) شاهیدیی برا بۆ براو لە زەڕی برا، هەم شاهیدیی گشت خزمەكانیتریش بۆ یەكتریو لە زەڕی یەكتری، هەم شاهیدیی دۆست بۆ دۆستو لە زەڕی دۆست گشتی قبوڵ دەكرێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونكە تۆمەتەكە بێهێزە.

وَلاَ تُقْبَلُ مِنْ عَدُوٍّ وَهُوَ مَنْ يُبْغِضُهُ بِحَيْثُ يَتَمَنَّى زَوَالَ نِعْمَتِهِ وَيَحْزَنُ بِسُرُورِهِ وَيَفْرَحُ بِمُصِيبَتِهِ، وَتُقْبَلُ لَهُ، وَكَذَا عَلَيْهِ فِي عَدَاوَةِ دِينٍ كَكَافِرٍ وَمُبْتَدِعٍ، وَتُقْبَلُ شَهَادَةُ مُبْتَدِعٍ لاَ نُكَفِّرُهُ، لاَ مُغَفَّلٍ لاَ يَضْبِطُ، وَلاَ مُبَادِرٍ،

---

(وَلاَ تُقْبَلُ مِنْ عَدُوٍّ) شاهیدیی لە دوژمن قبوڵ ناكرێ لە زەڕی دوژمنەكەی ئەگەر دوژمنایەتیەكەی دونیایی بێو ئاشكراش بێ، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ

خَائِنٍ وَلاَ خَائِنَةٍ وَلاَ ذِغِمْرٍ عَلَى أَخِيهِ﴾ رواه أبوداود وابن ماجه بإسناد حسن، شاهيدیی خائینو خاوەن ڕقو قین لە سەر برای خۆی دروست نیە (وَهُوَ مَنْ يُبْغِضُهُ) دوژمن ئەو کەسەیە: ڕقی لێیبێ (بِحَيْثُ يَتَمَنَّى زَوَالَ نِعْمَته) بە شێوەیەکی وەها: خۆزگەی نەمانی نیعمەتو خۆشیی بکاو هەم (وَيَحْزَنُ بِسُرُورِهِ وَيَفْرَحُ بِمُصِيبَتِهِ) بە خۆشیەکەشی دڵتەنگ بێو بە بەڵاو موسیبەتیشی دڵخۆش بێ.

جا بزانە: ئەگەر دوژمنایەتیەکە لە هەردوو لاوە بوو، ئەوە شاهیدیی هیچ لایەکیان لە سەر لایەکەیتر قبوڵ ناکرێ، بەڵام ئەگەر تەنها لە لایەکەوە بوو، ئەو کاتە تەنها شاهیدیی ئەو لایە قبوڵ ناکرێ، جا هەر کەسێك دوژمنایەتی ئەو کەسەی کرد کە دەیەوێ شاهیدیی لە سەر بدا، بەڵام شاهیدەکە هیچ وەڵامی دوژمنایەتیی نەداوە، ئینجا شاهیدیی لە سەردا، ئەوە شاهیدیی قبوڵ دەکرێ، نەوەك خەڵك ئەو جۆرە دوژمنایەتیە بکاتە ڕێگایەك بۆ ڕەدکردنەوەی شاهیدی، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتُقْبَلُ لَهُ) شاهیدیی دوژمن بۆ سودی دوژمنەکەی قبوڵ دەکرێ، چونکە تۆمەتی تێدا نیە (وَكَذَا عَلَيْهِ فِي عَدَاوَةِ دِينٍ) هەروەها لە زەرەری دوژمنەکەشی قبوڵ دەکرێ لە حاڵەتی دوژمنایەتی ئایینیدا (كَكَافِرٍ وَمُبْتَدِعٍ) وەکو کافرێك موسوڵمانێك شاهیدیی لە سەر بدا، یان بیدعەکارێك یەکێکی (أهل السنه) شاهیدیی لە سەر بدا.

هەم (وَتُقْبَلُ شَهَادَةُ مُبْتَدِعٍ لاَ نُكَفِّرُهُ) شاهیدیی ئەو بیدعەکارەش قبوڵ دەکرێ کە بە هۆی بیدعەکە بە کافر، یان بە فاسق داینەنێین، بەڵام ئەگەر بیدعەکارەکە بوختانی زینا بە حەزرەتی (عائشة)بکا، ئەوە کافر دەبێو ئەگەر جنێو بداتە (صحابة)کان، یان لەعنەتیان لێبکا، ئەوەش فاسق دەبێ، کەواتە شاهیدیی ئەو جۆرە بیدعەکارانە قبوڵ ناکرێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی، کەوابو: شاهیدیی زۆربەی شیعەکانی ئەم سەردەمە قبوڵ ناکرێ، هەم (لاَ مُغَفَّلٍ لاَ يَضْبِطُ) شاهیدیی ئەو کەسەش قبوڵ ناکرێ کە غافڵ دەبێو شتی لە بیر دەچێتەوە.

(وَلاَ مُبَادِرٍ) شاهیدیی پەلەکەریش قبوڵ ناکرێ، واتە: پێش ئەوەی داوای شاهیدیی لێبکرێ ئەو لەخۆیەوە شاهیدی بدا، چونکە تۆمەتی تێدایە، بەڵام ئەگەر داواکارەکە: شێت، یان یەتیم بوو، یان نەیدەزانی شاهیدی هەیە، ئەو کاتە سوننەتە: شاهیدەکە خۆی ئاشکرا

وَتُقْبَلُ شَهَادَةُ الْحِسْبَةِ فِي حُقُوقِ اللهِ تَعَالَى وَفِيمَا لَهُ فِيهِ حَقٌّ مُؤَكَّدٌ: كَطَلاَقٍ وَعِتْقٍ وَعَفْوٍ عَنْ قِصَاصٍ وَبَقَاءِ عِدَّةٍ وَانْقِضَائِهَا وَحَدٌّ لَهُ، وَكَذَا النَّسَبُ عَلَالصَّحِيحِ، وَمَتَى حَكَمَ بِشَاهِدَيْنِ فَبَانَا كَافِرَيْنِ أَوْ عَبْدَيْنِ أَوْ صَبِيَّيْنِ نَقَضَهُ هُوَ وَغَيْرُهُ، وَكَذَا فَاسِقَانِ فِالأَظْهَرِ،

---

بکاو بڵێ: من شاهیدی ئەم شتەم. بەڵکو ئەگەر لە ڕوداوەکەدا هیچ شاهیدیتر نەبێ، ئەو کاتە دوور نیە واجب بێ خۆی ئاشکرا بکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرمویانە، پێغەمبەرﷺ

دەفـــەرموێ: ﴿أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِالشُّـهَداءِ؟ اَلَّذِى يَـأْتِى بِالشَّـهَادَةِ قَبْـلَ أَنْ يُسْـأَلَهَا﴾ رواه مســـلم، چاكترینی شاهیدەكان ئەو شاهیدەیە: شاهیدی بدا پێش ئەوەی داوای شاهیدیی لێبكرێ.

كەوابو: بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: (وَتُقْبَـلُ شَـهَادَةُ الْحِسْبَةِ) بـێداوا لێكـردن شـاهیدی بـۆ ڕەزامەندی خوا قبولْ دەكرێ: (فِى حُقُوقِ اللهِ تَعَالَى) لە مافەكانی خوای گـەورەدا: وەكـو كەففارەتو نوێژو زەكاتو ڕۆژوو...هتد، هەم (وَفِيمَا لَهُ فِيهِ حَقٌّ مُؤَكَّدٌ) لەو شتەشدا قبولْ دەكرێ كە مافێكی كارتێنەكراوی خوای گەورەی تێدایـە، واتـە: مافەكـە بـە ڕازیبـوونی ئادەمیزاد نەگۆڕێ: (كَطَـلاَقٍ وَعِتْـقٍ) وەكـو تەڵاقـدانو ئـازادكردنو (وَعَفْـوٍ عَـنْ قِصَـاصٍ) لێبوردن لە كوشتنی لە تۆڵەو (وَبَقَاءِ عِدَّةٍ وَانْقِضَائِهَا) مان، یان نەمانی (عدة)ی ئـافرەتو (وَحَدٍّ لَهُ) سزای تاوانێكی مـافیخودا: وەكـو زینـاو شـەڕابخواردنەوە (وَكَـذَا النَّسَـبُ عَلَـى الصَّحِيحِ) هەروەها ئاشكراكردنی نەژادی كەسێك: لە وانەدا گشتی بێداوا لێكردن ئەگەر بۆ ڕەزامەندی خودا شاهیدی بدا، ئەوە شاهیدیی لێقبـولْ دەكـرێ، چـونكە خـوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُواالشَّهَادَةَ للهِ﴾ بۆ ڕەزامەندی خوا شاهیدی بدەن.

بەڵام لە مافەكانی ئادەمیزاددا–بێ داوالێكردن– شاهیدی بۆ ڕەزامەندی خوا قبـولْ نـاكرێ: وەك كـڕینو فرۆشـتنو دانپێـداهێنانو ئـەو جـۆرە شـتانە، هـەروەك لـە (تحفـة)و (مغـنى)دا فەرموویانە.

## ﴿ شاهیدی كافرو فاسق ﴾

(وَمَتَى حَكَمَ بِشَاهِدَيْنِ) هەر كاتێك قازی دادی كرد بە دوو شاهید (فَبَانَا كَافِرَيْنِ أَوْ عَبْدَيْنِ أَوْ صَبِيَّيْنِ) ئینجا ئاشكرا بوو لە كاتی بڕیاردانەكەدا هـەردوو شـاهیدەكان: كـافر بـون، یـان كۆیلە بون، یان مندالْ بون، ئەوە (نَقَضَهُ هُوَ وَغَيْرُهُ) واجبە: ئەم قازییە، یان قازییێكیتر ئەو بڕیارە هەڵبوەشێنێتەوە (وَكَذَا فَاسِقَانِ فِيالأَظْهَرِ) هەروەها ئەگەر ئاشكرا بوو لە كاتی دادكردنەكـــەدا هـــەردوو شـــاهیدەكان فاســـق بـــون، ئـــەو كاتـــەش واجبـــە: بڕیارەكـــە هەڵبوەشێندرێتەوە، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بـەڵام لـە فـەرموودەی بـێهێزو لـە مەزهـەبی (حنفـی)دا: ئەگـەر دادكردنەكـە بـە دوو شـاهیدی فاسـق كرابـێ، ئـەوە دروسـت دەبـێو هەڵناوەشـێندرێتەوە، هـەروەك لـە (مجمع الانهر)دا فەرموویەتی.

وَلَـوْ شَـهِدَ كَـافِرٌ أَوْ عَبْـدٌ أَوْ صَـبِيٌّ ثُـمَّ أَعَادَهَـا بَعْـدَ كَمالِـهِ قُبِلَـتْ شَـهَادَتُهُ، أَوْ فَاسِـقٌ تَـابَ فَـلاَ، وَتُقْبَـلُ شَـهَادَتُهُ فِـى غَيْرِهَـا بِشَـرْطِ اِخْتِبَـارِهِ بَعْدَ التَّوْبَةِ مُدَّةً يُظَنُّ بِهَا صِدْقُ تَوْبَتِهِ، وَقَدَّرَهَا الأَكْثَرُونَ بِسَنَةٍ،

---

(وَلَوْ شَهِدَ كَافِرٌ أَوْ عَبْدٌ أَوْ صَبِيٌّ) ئەگەر كافرێك، یان كۆیلەیەك، یان منـداڵێك لـە شـتێكدا شاهیدیی داو قبولْ نەكرا (ثُمَّ أَعَادَهَا بَعْدَ كَمَالِهِ) ئینجا لە دوای كامڵبوون، واتە: لە دوای

موسوڵمانبوون، یان ئازادبوون، یـان بلۆغبـوون لـە هـەمان شـتدا شـاهیدیەکەی دووبـارە کـردەوە، ئـەو کاتـە (قُبِلَـتْ شَـهَادَتُهُ) شـاهیدیەکەی قبـوڵ دەکـرێ، چـونکە ئەوانـە بـە ڕەدکردنەوەی شاهیدی عەیبدار نابن، کەوابو: تۆمەتی لابردنی عەیبەکەی لێناکرێ.

بەڵام (أَوْ فَاسِقٌ) ئەگەر فاسقێك لە شتێکدا شاهیدیی داو بە هـۆی فاسـقی شـاهیدیەکەی قبوڵ نەکرا، ئینجا (تَابَ) تۆبەی کردو لە هەمان شـتدا شـاهیدیەکەی دووبـارە کـردەوە، ئەوە (فَلاَ) شاهیدیەکەی قبوڵ ناکرێ، چونکە جارییەکەم بە ڕەدکردنەوەی شاهیدی بە فاسقبوون عەیبدار بووەو ئێستاش تۆمەتی ئەوەی لێدەکرێ عەیبەکە لە سەر خۆی لاببا.

بەڵام (وَتُقْبَلُ شَهَادَتُهُ فِي غَيْرِهَا) شاهیدیی تۆبەکارەکە قبوڵ دەکرێ لە شتێکیتردا جگە لەو شتەی شاهیدیی تێدا ڕەد کرابۆوە (بِشَرْطِ اخْتِبَارِهِ بَعْدَ التَّوْبَةِ مُدَّةً) بەو مەرجەی لـە دوای تۆبەکردنەکە ماوەیەکی وەها تاقی بکرێتەوە: کە (يُظَنُّ بِهَا صِدْقُ تَوْبَتِهِ) بە هۆی ئەو ماوەیە واتێبگەین تۆبەکەی ڕاستە:

(وَقَدَّرَهَا الأَكْثَرُونَ بِسَنَةٍ) زۆرترینی زانایان ئەندازەی تاقیکردنەوەکەیان بە ساڵێك داناوە، چونکە هەر چوار وەرزەکان کار لە حەزو ڕەوشتی مرۆڤ دەکەن.

خوای گەورە لە بارەی بوختانکەری زینا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ هیچ شاهیدیەك لەو بوختانکەرانە قبوڵ مەکەن‌و ئەوانە فاسقن، تەنها لە وانـە نـەبێ: کـە لـە دوای گوناهەکـە تۆبەیان کردوەو بۆ خوا گونجاون، بە ڕاستی خوا لە گوناه خۆش دەبێ‌و ڕەحم دەکا.

هەروەها ئەو کەسەی بە هۆی کردارێك پیاوەتیی لە دەست داوە، ئەویش بۆ قبـوڵکردنی شاهیدی پێویستە ساڵێك تاقی بکرێتەوە، تـاکو بـاوەڕی پـێبکرێ، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ مەرجەکانی تۆبەکردن ﴾

**تۆبە**: پەشیمانبوونەوەیە لە گوناه. جا بزانە: تۆبەکردن دەمو دەست لە هەموو گوناهێك واجبە، جا گوناهەکە بچوك بێ، یان گەورە بێ.

دیسان بزانە: خوای گەورە لە گەورەیی خۆی تۆبە قبوڵ دەکا، واتە: گوناهەکـە لـە سـەر تۆبەکارەکە لادەباو لە سەر گوناهەکە سزای نادا، بەو مەرجەی تۆبەکەی دروست بێ، واتە: ئەو مەرجانەی‌داهاتووی لێبێنەجێ، هەروەك لە (شرح مسلم)و (فتح الباری)دا فەرموویانە.

وَيُشْتَرَطُ فِي تَوْبَةِ مَعْصِيَةٍ قَوْلِيَّةٍ: اَلْقَوْلُ، فَيَقُولُ الْقَاذِفُ: قَذْفِي بَاطِلٌ وَأَنَا نَادِمٌ عَلَيْهِ وَلاَ أَعُودُ إِلَيْهِ. وَكَذَا شَهَادَةُ الزُّورِ، قُلْتُ: وَغَيْرُ الْقَوْلِيَّةِ يُشْتَرَطُ إِقْلاَعٌ، وَنَدَمٌ، وَعَزْمٌ أَنْ لاَ يَعُودَ، وَرَدُّ ظُلاَمَةِ آدَمِيٍّ إِنْ تَعَلَّقَتْ بِهِ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

کەوابو: (وَيُشْتَرَطُ فِي تَوْبَةِ مَعْصِيَةٍ قَوْلِيَّةٍ) بـە مـەرج دادەنـدرێ لـە دروسـتبوونی تۆبـەی

گونـاهی بـه زوبـان: (اَلْقَـوْلُ) دەبـی بـه زوبـان تۆبەکـه بکـا، کەواتـه: (فَيَقُـولُ الْقَـاذفُ) بوختانکەری زینا له تۆبەکردنەکەیدا دەڵێ: (قَذْفِي بَاطِلٌ وَأَنَا نَادِمٌ عَلَيْـهِ وَلاَ أَعُـودُ إِلَيْـهِ) بوختانەکەم درۆیه، من لەو بوختانه پەشیمانم، جـارێکیتر ناگەڕێمـەوه بـۆ بوختـانکردن (وَكَذَا شَهَادَةُ الزُّورِ) هەروەها له تۆبەی شاهیدی به درۆشدا مەرجه بڵێ: شاهیدیەکەم درۆ بوو، لەو شاهیدیه پەشیمانم، جارێکیتر ناگەڕێمەوه بۆ شاهیدیی به درۆ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (وَغَيْرُالْقَوْلِيَّـةِ) جگـه لـه گوناهـەکانی بـه زوبـان بـۆ دروستبوونی تۆبەکردن له گشت گوناهێك چوار مەرج پێویستن، یەکـەم: (يُشْـتَرَطُ إِقْـلاَعٌ) مەرجه هەر ئێستا واز له گوناهەکه بێنێ. دووەم: (وَنَدَمٌ) له گوناهەکه پەشیمان ببێتەوه. سێیەم: (وَعَزْمُ أَنْ لاَ يَعُودَ) به دڵ بڕیار بدا: جارێکیتر نەگەڕێتـەوه سـەر ئـەو گوناهـه. چـوارەم: (وَرَدُّ ظُلاَمَـةِ آدَمِـيٍّ إِنْ تَعَلَّقَـتْ بِـهِ) ئەگـەر گوناهەکـه مـافی ئـادەمیزاد بـێ –وەکو دزیو زەوتکردنو شیر بایی...هتد– دەبی له ستەمەکه دەربچێو مافەکه بداتەوه خاوەنەکەی، یان گەردەنی خۆی پێ ئازاد بکا.

هەروەها ئەگەر گوناهەکه مافی خوایگەوره بێو له شەرعدا قەزاکردنەوه، یان کەففارەتی بۆ داندرابێ، واجبه: کەففارەتەکەو قەزاکردنەوەکه ئەنجام بدا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ مَظْلَمَةٌ لأَحَدٍ فِي عِرْضٍ أَوْ مَالٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ الْيَوْمَ قَبْلَ أَلاَّ يَكُونَ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ: إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ﴾ رواه الشـيخان، هـەر کەسـێك سـتەمێکی کەسێکی له لایه: لەبارەی ناموسو ئابڕوو، یان لەبارەی ماڵ، با ئەمڕۆ له دونیادا خۆی لەو ستەمه ئازاد بکا، چونکه له قیامەتـدا دیرهـەمو دینـار نیـه، بـەڵکو ئەگـەر سـتەمکارەکه کردەوەی چاکی هەبێ به قەد ستەمەکه کردەوه چاکەکانی دەدرێنـه خـاوەن مافـەکان، ئەگـەر کـردەوەی چـاکی نـەبێ ئـەو کاتـه خراپـەی خـاوەن مافـەکان وەردەگیرێـنو لـه ستەمکارەکه بار دەکرێنو فڕێ دەدرێته ناو ئاگری دۆزەخ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر تۆبەکارەکه خاوەنەکەی دەست نەکەوت مافەکـەی بداتـەوه، یـان گەردەنی خۆی پێ ئـازاد بکـا، ئـەو کاتـه واجبـه: مافەکـه بداتـەوه میراتگرەکـانی، یـان گەردەنی خۆی به ئەوان ئـازاد بکـا، جا ئەگـەر میراتگرەکانیشـی دەسـت نەکـەوتنو لـه دەستکەوتنیان بێئومێد بوو، ئەو کاته مافەکه تەسلیمی قازییێکی ئەمین دەکا، جا ئەگەر

(فَصْلٌ) لاَ يُحْكَمُ بِشَاهِدٍ إِلاَّ فِي هِلاَلِ رَمَضَانَ فِـالأَظْهَرِ، وَيُشْتَرَطُ لِلزِّنَا أَرْبَعَةُ رِجَالٍ،

---

ئـەمین نـەبو–وەك ئـەم سـەردەمه– ئـەو کاتـه هـەر بـەخۆی مافەکـه دەکاتـه خێـرو لـه بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی دەکا، بەڵام به نیەتی تۆڵەدان، واته: نیەتی وابێ: هـەر کاتێك خاوەنەکەی، یان میراتگرەکانی دەست کەوتن تۆڵەیان بداتێ.

جا ئەگەر تۆبەکارەکە هیچی نەبو بداتەوە خاوەن ماف، ئەو کاتە با تۆبە بکاو بـە دڵیش بڕیار بدا: هەر کاتێك دەسەڵاتی بوو مافەکە بداتەوە خاوەنەکە، واتە: ئەگـەر ئـەو نیەتـە باشەی هەبێ‌و پێش مافدانەوە بمرێ، ئەو کاتە تکا وایە: خوای گەورە لە گەورەیی خۆی خاوەن مافەکەی لە قیامەت بۆ ڕازی بکاو داوای مافەکەی لێنەکا.

جا ئەگەر غەیبەتی کەسێکی کردبـو غەیبەتەکـەش گەیشـتبێتە غەیبەتکراوەکـە، ئـەوە واجبە گەردەنی خۆی بە ئەوی ئـازاد بکـا، جا ئەگـەر نـەگونجا؟ لـە بـەر مردنـی، یـان دیارنەبوونی، یان غەیبەتەکەی پێنەگەیشتبو، ئەو کاتە دەبی پەشیمان ببێتەوەو هەم لە خـوا بپاڕێتــەوە: لــە گوناهــەکانی غەیبەتکراوەکــە خـۆش ببــێ، واتــە: لێـرەدا گـەردن ئازادکردنی میراتگرەکان سودی نیە.

هەروەها ئەگەر مافەکە مافی خوای گەورە بێ: وەکو نوێژو ڕۆژوو، ئەو کاتەش واجبە: بە دڵ بڕیار بدا هەر کاتێك توانای هەبوو قەزای بکاتەوە، هەروەك لە (تحفە)و حاشیەکانیدا ڕوون کراوەتــەوە، کەواتــە: هــەر لــە ئێســتاوە بــەگوێرەی توانـا واجبــە: دەســت بــە قەزاکردنەوە بکا، واللە أعلم.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ژمارەی شاهیدەکان لە ڕوداوەکاندا ﴾

**یەکەم:** (لاَ يُحْكَمُ بِشَاهِدٍ إلاَّ في هِلاَلِ رَمَضَانَ) بە شاهیدیی یەك پیاو هیچ بڕیارێك نادرێ، تەنها لە دیتنی مانگی یەکشەوەی ڕەمەزاندا یـەك شـاهید قبـوڵ دەکـرێ (فِيالأَظْهَرِ) لـە فەرموودەی بەهێزتردا، هەروەك لە پەرتووکی ڕۆژوودا ڕابردا، هەروەها لـە دیتنـی مـانگی یەکشەوەی مانگەکانیتریشدا یەك شاهید قبوڵ دەکرێ بۆ ئـەو عیبادەتـەی لـەو مانگـەدا هەیە: وەك شەش ڕۆژووەکەی مانگی (شوال)و وەستانی عەرەفاتو (عاشورا )، بەڵام بۆ مافەکانیتر-کـە بـە مانگەکـەوە هەڵواسـراون- یـەك شـاهید قبـوڵ نـاکرێ، هـەروەك لـە (الشبراملسی)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

**دووەم:** (وَيُشْتَرَطُ لِلزِّنَا أَرْبَعَةُ رِجَالٍ) بـە مـەرج دادەنـدرێ بـۆ ئاشـکرابوونی زینـاو نێربـازیو زینــاکردن لەگــەڵ ئــاژەڵ: دەبــی چــوار پیــاو شــاهیدی بــدەنو بڵــێن: **(دیتمـان سـەری ئەندامەکەی بردە ناو ئەندامی ئەو ئافرەتە بە زینا)**. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾ ئەوانـەی بوختـانی زینـا بە داوێنپاکان دەکەن ئینجا چوار شاهید ناهێنن، ئێوە هەشتا شوڕکەیان لێبدەن.

وَلِلإِقْرَارِ بِهِ اثْنَانِ فِي الأَظْهَرِ، وَفِي قَوْلٍ أَرْبَعَةٌ، وَلِمَالٍ وَعَقْدٍ مَالِيٍّ: كَبَيْعٍ وَإِقَالَةٍ وَحَوَالَةٍ وَضَمَانٍ، وَحَقٍّ مَالِيٍّ: كَخِيَارٍ وَأَجَلٍ رَجُلاَنِ أَوْ رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ، وَلِغَيْرِ ذَلِكَ مِنْ عُقُوبَةٍ لِلَّهِ تَعَالَى أَوْ لآدَمِيٍّ وَمَا يَطَّلِعُ عَلَيْهِ رِجَالٌ غَالِبًا: كَنِكَاحٍ وَطَلاَقٍ وَرَجْعَةٍ وَإِسْلاَمٍ وَرِدَّةٍ وَجَرْحٍ وَتَعْدِيلٍ وَمَوْتٍ وَإِعْسَارٍ وَوَكَالَةٍ وَوِصَايَةٍ

(وَلِلإِقْرَارِ بِهِ اثْنَانِ) بۆ دان پێداهێنانی زینا مەرجە: دوو پیاو شاهیدی بدەن‌و بڵێن: (فلانکەس گوتی زینام کردوە). (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی‌بەهێزتردا (وَفِي قَوْلٍ أَرْبَعَةٌ) لە فەرموودەیەکدا: بۆ دانپێداهێنانیش مەرجە چوار شاهیدی پیاو هەبن.

**سێیەم**: (وَلِمَالٍ) بۆ ئاشکراکردنی ماڵێکی حازر، یان قەرز (وَ) هەروەها بۆ گشت شتێکی مەبەست لە وی ماڵ بێ: وەك (عَقْدٍ مَالِيٍّ) مامڵەت بەستنێکی ماڵی‌و هەڵوەشاندنەوەی مامڵەتێکی‌ماڵی‌و دانپێداهێنانی‌ماڵی: (كَبَيْعٍ) وەکو کڕین‌و فرۆشتن‌و (وَإِقَالَةٍ) هەڵوەشاندنەوەی کڕین‌و فرۆشتن‌و (وَحَوَالَةٍ) حەواڵەکردن‌و (وَضَمَانٍ) زامینی‌و گەردەن ئازادکردن‌و قەرزو زەوتکردن‌و وەسیەتی بە ماڵ‌و مارەیی‌و گەڕاندنەوەی فرۆشراوی عەیبدارو وەقف‌و سولح‌و ڕەهن‌و شوفعە، هەم (وَحَقٍّ مَالِيٍّ) گشت مافێکی ماڵی: (كَخِيَارٍ) وەکو پەشیمانی کڕین‌و فرۆشتن‌و (وَأَجَلٍ) ماوە دانان‌و ئەو تاوانانەی خوێن واجب دەکەن، لە ئەوانەدا گشتی مەرجە: (رَجُلاَنِ) دوو پیاو شاهیدی بدەن (أَوْ رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ) یان پیاوێك‌و دوو ئافرەت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ﴾ دوو شاهید لە پیاوەکانتان بکەنە شاهید، جا ئەگەر دوو پیاو نەبون با پیاوێك‌و دوو ئافرەت ببنە شاهید.

جا بزانە: لە مامڵەتی (شِرْكَة)و (قِراض)دا: ئەگەر مەبەستی ئاشکراکردنی دەستکاری بێ، ئەوە مەرجە: دوو پیاوشاهیدی بدەن، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئاشکراکردنی بەشە ماڵەکەی خۆی بێ، ئەو کاتە بە پیاوێك‌و دوو ئافرەتیش ئاشکرا دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**چوارەم**: (وَلِغَيْرِ ذَلِكَ) بۆ شتێ‌تری جگە لە زیناو لە ماڵ‌و لە وەی مەبەست لە وی ماڵە: (مِنْ عُقُوبَةٍ لِلَّهِ تَعَالَى) لە سزای ئەو تاوانانەی مافی خوای گەورەن: وەکو دزی‌و شەڕابخواردنەوەو...هتد (أَوْ لآدَمِيٍّ) یان سزای مافی ئادەمیزادن: وەکو کوشتن‌و بوختانی زینا، هەم (وَمَا يَطَّلِعُ عَلَيْهِ رِجَالٌ غَالِبًا) بۆ ئەو کارانەی بە ئەغلەبی پیاوان لێی ئاگادار دەبن: (كَنِكَاحٍ) وەکو مارەبڕین‌و (وَطَلاَقٍ) تەڵاقدان‌و (وَرَجْعَةٍ) گەڕاندنەوەی ژن بۆ ژێر مارەی خۆی‌و تەواوبوونی (عِدَّة)ی بە مانگ‌و بلۆغبوون‌و (وَإِسْلاَمٍ) موسوڵمانبوون‌و (وَرِدَّةٍ) کافربوون‌و (وَجَرْحٍ وَتَعْدِيلٍ) فاسقکردن‌و دادپەروەرکردنی شاهیدەکان‌و (وَمَوْتٍ) مردن‌و (وَإِعْسَارٍ) نەبوویی‌و (وَوَكَالَةٍ) وەکیلایەتی‌و (وَوِصَايَةٍ) سەروەسیێتی‌و کەفیلایەتی‌و

وَشَهَادَةٍ عَلَى شَهَادَةٍ رَجُلاَنِ، وَمَا يَخْتَصُّ بِمَعْرِفَتِهِ النِّسَاءُ أَوْ لاَ يَرَاهُ رِجَالٌ غَالِبًا: كَبَكَارَةٍ وَوِلاَدَةٍ وَحَيْضٍ وَرَضَاعٍ وَعُيُوبٍ تَحْتَ الثِّيَابِ يَثْبُتُ بِمَا سَبَقَ وَبِأَرْبَعِ نِسْوَةٍ، وَمَا لاَ يَثْبُتُ بِرَجُلٍ وَامْرَأَتَيْنِ لاَ يَثْبُتُ بِرَجُلٍ وَيَمِينٍ، وَمَا ثَبَتَ بِهِمْ ثَبَتَ بِرَجُلٍ وَيَمِينٍ إِلاَّ عُيُوبَ النِّسَاءِ وَنَحْوَهَا،

ئەمانەتو نەژادو دزیو (وَشَهَادَةٍ عَلَى شَهَادَةٍ) زمانشاهیدی لە سەر شاهیدی، ئەوانە گشتی مەرجە: (رَجُلاَنِ) دوو پیاو شاهیدی بدەن؟:

چونکە لە تەلاقو لە مارەبڕیندا بە دەققی قورئانو حەدیس مەرجە: دوو پیاو شاهید بن، ئەوانیتریش (قیاس) کراونە سەر ئەوانە، هەم ﴿عن الزهري: مَضَتِ السُّنَّةُ مِنْ رَسُولِ اللهِﷺ: أَنَّهُ لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ النِّسَاءِ فِي الْحُدُودِ وَلاَ فِالنِّكَاحِ وَلاَ فِالطَّلاقِ﴾ رواه الإمام مالك، شەرع لە پێغەمبەرەوەﷺ ئەوها بەردەوام هاتوە: کە شاهیدیی ئافرەتان قبولْ ناکرێ: نە لە سزای تاوانەکانداو نە لە مارەبڕینداو نەلە تەلاقدانددا.

**پێنجەم**: (وَمَا يَخْتَصُّ بِمَعْرِفَتِهِ النِّسَاءُ) ئەو شتەی بە تایبەتی ئافرەتان دەیزانن بە ئەغلەبی (أَوْ لاَ يَرَاهُ رِجَالٌ غَالِبًا) یان بە ئەغلەبی پیاوان نایبینن: (كَبَكَارَةٍ) وەکو کچێنیو بێوەژنیو (وَوِلاَدَةٍ) منداڵبوونو ئاوسیو (وَحَيْضٍ) حەیزو (وَرَضَاعٍ) شیرخواردنو (وَعُيُوبٍ تَحْتَ الثِّيَابِ) عەیبەکانی ژێر جلەکانیان: ئەوانەش (يَثْبُتُ بِمَا سَبَقَ) بە شاهیدیی دوو پیاو، یان پیاوێكو دوو ئافرەت ئاشکرا دەبێ، هەم (وَبِأَرْبَعِ نِسْوَةٍ) بە چوار ئافرەتانیش ئاشکرا دەبێ ﴿عن الزهري: مَضَتِ السُّنَّةُ بِأَنَّهُ تَجُوزُ شَهَادَةُ النِّسَاءِ فِيماَ لاَ يَطَّلِعُ عَلَيْهِ غَيْرُهُنَّ: مِنْ وِلاَدَةِ النِّسَاءِ وَعُيُوبِهِنَّ﴾ رواه ابن أبیشیبة، شەرعی پێغەمبەرﷺ ئەوها بەردەوام هاتوە: کە شاهیدیی ئافرەتان قبولْ دەکرێ: لەو شتانەدا کە جگە لە وان ئاگاداری بە سەردا نابێ: لە منداڵبوونو عەیبەکانی ئافرەتان.

(وَمَا لاَ يَثْبُتُ بِرَجُلٍ وَامْرَأَتَيْنِ) هەر شتێك بە شاهیدیی پیاوێكو دوو ئافرەت ئاشکرا نەبێ –کە لە بەشی دووەمو چوارەمدا باس کران– ئەوە (لاَ يَثْبُتُ بِرَجُلٍ وَيَمِينٍ) بە شاهیدیی پیاوێكو سوێندخواردن ئاشکرا نابێ؟ چونکە پیاوێكو دوو ئافرەت بەهێزترن، جا ئەگەر بە بەهێزترەکەیان ئاشکرا نەبێ، بە بێهێزەکەش ئاشکرا نابێ.

بەلاَم (وَمَا ثَبَتَ بِهِمْ) هەر شتێك بە شاهیدیی پیاوێكو دوو ئافرەت ئاشکرا ببێ–کە لە بەشی سێیەمو پێنجەمدا باس کران– ئەوە (ثَبَتَ بِرَجُلٍ وَيَمِينٍ) بە شاهیدیی پیاوێكو سوێندخواردنی داواکار ئاشکرا دەبێ ﴿عن ابن عباس رضي‌الله عنهما: اَنَّ النَّبِيَّﷺ قَضَى بِيَمِينٍ وَشاهِدٍ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ دادی کرد بە سوێندی داواکارو شاهیدیی پیاوێك.

(إلاَّ عُيُوبَ النِّسَاءِ وَنَحْوَهَا) تەنها عەیبەکانی ئافرەتانو شتی وەها: وەکو شیرخواردن بە شاهیدێكو سوێندخواردن ئاشکرا نابێ.

وَلاَ يَثْبُتُ شَيْءٌ بِامْرَأَتَيْنِ وَيَمِينٍ، وَإِنَّمَا يَحْلِفُ الْمُدَّعِي بَعْدَ شَهَادَةِ شَاهِدِهِ وَتَعْدِيلِهِ، وَيَذْكُرُ فِي حَلِفِهِ صِدْقَ الشَّاهِدِ، فَإِنْ تَرَكَ الْحَلِفَ وَطَلَبَ يَمِينَ خَصْمِهِ فَلَهُ ذَلِكَ، فَإِنْ نَكَلَ فَلَهُ أَنْ يَحْلِفَ يَمِينَ الرَّدِّ فِالأَظْهَرِ، وَلَوْ كَانَ بِيَدِهِ أَمَةٌ وَوَلَدُهَا

فَقَالَ رَجُلٌ: هَذِهِ مُسْتَوْلَدَتِي عَلِقَتْ بِهَذَا فِي مِلْكِي وَحَلَفَ مَعَ شَاهِدٍ ثَبَتَ الإِسْتِيلاَدُ،

---

هـەروەها (وَلاَ يَثْبُتُ شَيْءٌ بِامْرَأَتَيْنِ وَيَمِينٍ) هـیچ شـتێك بـە شـاهیدیی دوو ئـافرەت‌و سوێندخواردن ئاشکرا نابێ، چونکە ئافرەت‌و سوێند هەردووکیان بێ‌هێزن.

## ﴿ سوێندی گەڵ شاهیدێك ﴾

(وَ) هەر کاتێك شتێك بە شاهیدێك‌و سوێندی داواکار ئاشکرا ببێ، ئەوە (إِنَّمَا يَحْلِفُ الْمُدَّعِي بَعْدَ شَهَادَةِ شَاهِدِهِ وَتَعْدِيلِهِ) داواکارەکە تەنها لە دوای شاهیدیدانی شاهیدەکەی‌و لـە دوای دادپەروەرکردنی شاهیدەکەی دەبێ سوێند بخوا، واتە: نابێ پـێش شـاهیدیدانەکە سـوێند بخـوا (وَ) هـەروەها (يَذْكُرُ فِيحَلِفِـهِ صِـدْقَ الشَّـاهِدِ) واجبـە لـە سـوێندەکەیدا بلـێ: (واللە شاهیدەکەم ڕاستگۆیە لەم شاهیدیەی بۆ منی داوەو منیش مافی ئەم شتەم هەیە).
بەڵام (فَإِنْ تَرَكَ الْحَلِفَ) ئەگەر داواکارەکە سوێندی گـەڵ شـاهیدەکەی نـەخواردو (وَطَلَبَ يَمِينَ خَصْمِهِ) داوای کرد کێشەچیەکەی سوێندی بۆ بخوا، ئەو کاتە (فَلَهُ ذَلِكَ) داوا کارەکە ئەوەشی بۆ دروستە، چونکە وا دەبێ داواکارەکە لە سوێندخواردن خۆی دەپارێزێ.
جا ئەگەر لەو حاڵەتەدا داوالێکراوەکە سوێندی خوارد، ئـەو کاتـە ئـەم داوایـەی لـە سـەر لادەکەوێ، بەڵام مافی داواکارەکە هەر دەمێنێ، واتە:—لە دوای سوێندی داوالێکراوەکە— داواکارەکە مافی نیە لەم داوایەدا سوێندی گەڵ شاهیدێك بخوا؟ چونکە بێ‌عوزر وازی لەو سوێندە هێناوە، بەڵام ئەگەر لە مەودوا داواکارەکە دوو شاهیدی هێنان، یان شاهیدێکی‌تری شاهیدە کۆنەکەی هێنان، ئەو کاتە بەو دوو شاهیدانە داوایەکی نوێی لێ‌قبـوڵ دەکـرێ‌و مافەکەی ئاشکرا دەبێ، هەروەك لە (تحفە)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.
بەڵام (فَإِنْ نَكَلَ) ئەگەر داوالێکراوەکە سوێندی نەخوارد، ئەو کاتـە (فَلَـهُ أَنْ يَحْلِـفَ يَمِـينَ الرَّدِّ) بۆ داواکارەکە هەیە سوێندی گەڕاندرایەوە بخواو مافەکەی لە داوالێکراوەکە وەربگرێ (فِـي الأَظْهَـرِ) لـە فـەرموودەی بـەهێزتردا، چـونکە سـوێندی گەڕانـدراوەو سـوێندی گـەڵ شاهیدێك لێك جیاوازن، بۆیێ مافی ئەو سوێندەی هەیە.
(وَلَوْ كَانَ بِيَدِهِ أَمَةٌ وَوَلَدُهَا) ئەگەر کەسێك (جارية)ك‌و منداڵێکی (جارية)کەی لە دەستدا بوو (فَقَالَ رَجُلٌ: هَذِهِ مُسْتَوْلَدَتِي عَلِقَتْ بِهَذَا فِي مِلْكِي) جا پیاوێك گوتی: ئەم (جارية)یە دایکە منداڵی منەو لەمڵکایەتی مندا بە جیماعی من ئـەم منداڵـەی بـە زگ کـەوتوە (وَحَلَـفَ مَـعَ شَاهِدٍ) پیاوەکەش شاهیدێکی هێنـاو سوێندیشـی خـوارد، ئـەوە (ثَبَـتَ الإِسْـتِيلاَدُ) دایکـە لاَ نَسَبُ الْوَلَدِ وَحُرِّيَّتُهُ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ كَانَ بِيَدِهِ غُلاَمٌ فَقَالَ رَجُلٌ: كَانَ لِي وَأَعْتَقْتُهُ وَحَلَفَ مَعَ شَاهِدٍ فَالْمَذْهَبُ انْتِزَاعُهُ وَمَصِيرُهُ حُرًّا، وَلَوْ ادَّعَتْ وَرَثَةٌ مَالاً لِمُوَرِّثِهِمْ وَأَقَامُوا شَاهِدًا وَحَلَفَ مَعَهُ بَعْضُهُمْ أَخَذَ نَصِيبَهُ وَلاَ يُشَارَكُ فِيهِ، وَيَبْطُلُ حَقُّ مَنْ لَمْ يَحْلِفْ بِنُكُولِهِ

منداڵیەکەی ئاشکرا دەبێ، چونکە دایکە منداڵیش بە ماڵ دادەنـدرێ، کـەوابو: تەسـلیمی پیاوەکە دەکرێتەوە، بەڵام (لاَ نَسَبُ الْوَلَدِ وَحُرِّيَّتُهُ) نەژادی منداڵەکەو ئازادیی بەو شاهیدو سوێندە ئاشکرا نابێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە نەژادو ئازادبوون ماڵ نین (وَلَوْ كَانَ بِيَدِهِ غُلاَمٌ) ئەگەر کەسێك کۆیلەیەکی لەدەستدا بوو (فَقَالَ رَجُلٌ: كَانَ لِي وَأَعْتَقْتُهُ) جا پیاوێك گوتی: ئەمـە کۆیلـەی مـن بـوو، ئـازادم کـردوە (وَحَلَفَ مَعَ شَاهِدٍ) پیاوەکەش شاهیدێکی هێناو سوێندیشی خوارد، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ انْتِزَاعُهُ وَمَصِيرُهُ حُرًّا) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: کۆیلەکەی لە دەست وەردەگیرێو دەبێتە ئازاد؟ بە هۆی دانپێداهێنانی کەسەکە، نەك بە شاهیدو سوێندەکە.

(وَلَوْ ادَّعَتْ وَرَثَةٌ مَالاً لِمُوَرِّثِهِمْ) ئەگـەر کۆمەڵـە میراتگرێـك داوای قـەرزێکی، یـان مـاڵێکی میراتدەرەکەیان کرد لە کەسێك، ئینجا (وَأَقَامُوا شَاهِدًا) بە هەمووان شاهیدێکیان هێنا، بەڵام (وَحَلَفَ مَعَهُ بَعْضُهُمْ) تەنها هەندێکیان سوێندی گـەڵ شـاهیدەکەی خـوارد لـە سـەر هـەموو مافەکەی میراتدەرەکەی، هەندێکیش نەیانخوارد، ئەوە (أَخَذَ نَصِيبَهُ) سوێندخۆرەکە تـەنها بەشە میراتەکەی خۆی لە داوالێکراوەکە وەردەگرێو (وَلاَ يُشَارَكُ فِيهِ) لەو بەشە وەرگیراوەدا هاوبەشیی لەگەڵ ناکرێ، واتە: ئەو میراتگرانەی سوێندیان نەخواردوە نابێ ببنە هاوبەشی سوێندخۆرەکە، چونکە ئـەو بـە سـوێندخواردنی خـۆی تـەنها مـافی خـۆی جـێگیر دەبـێو ئەوانیتریش دەتوانن بە سوێندخواردن مافی خۆیان جێگیر بکەن.

کـەوابو: (وَيَبْطُلُ حَقُّ مَنْ لَمْ يَحْلِفْ) ئـەو میراتگـرەی سـوێندی نـەخوارد مـافی سوێندخواردنەکەی نامێنێ (بِنُكُولِهِ) بە هۆی سوێندنەخواردنی گەڵ شاهیدەکەی (إنْ حَضرَ وَهُوَ كَامِلٌ) ئەگەر لە شوێنی کێشەکەدا ئامادە بوبێو بالغو عاقڵیش بێ، بـەڵام مـافی شاهیدهێنانی هەر دەمێنێ، کەواتە: ئەگەر سوێندنەخۆرەکە شاهیدێکیتر بێنێتە گەڵ ئەم شـاهیدە، ئـەو کاتـە بـەو دوو شـاهیدانە هـەموو ماڵەکـە ئاشـکرا دەبـێو هـەموو میراتگرەکانیتریش -بێ سوێندخواردن- دەبنە هاوبەش لەو ماڵەدا، هەروەك لە (تحفـە)و (نهایە)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإنْ كَانَ غَائِبًا أَوْ صَبِيًّا أَوْ مَجْنُونًا) جا ئەگەر ئەو میراتگـرەی سـوێندی نـەخواردوە، لـە شوێنێکیتری نادیار بوو، یان منداڵ، یان شێت بوو، یان ئاگاداری کێشـەکە نـەبو، ئـەوە (فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ لاَ يَقْبِضُ نَصِيبَهُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: ئەویش نابێ بەشـەکەی

فَإذا زَالَ عُذْرُهُ حَلَفَ وَأَخَذَ بِغَيْرِ إعَادَةِ شَهَادَةٍ، وَلاَ تَجُوزُ شَهَادَةٌ عَلَى فِعْلٍ كَزِنًا وَغَصْبٍ وَإتْلاَفٍ وَوِلاَدَةٍ إلاَّ بِالإبْصَارِ، وَتُقْبَلُ مِنْ أَصَمَّ، وَالأَقْوَالُ كَعَقْدٍ يُشْتَرَطُ سَمْعُهَا وَإبْصَارُ قَائِلِهَا، وَلاَ يُقْبَلُ أَعْمَى

إلاَّ أَنْ يُقِرَّ فِي أُذُنِهِ فَيَتَعَلَّقُ بِهِ حَتَّى يَشْهَدَ عِنْدَ قَاضٍ بِهِ عَلَى الصَّحِيحِ،

خۆی لە داوا لێکراوەکە وەربگرێ، بەڵکو کارەکە ڕادەگیرێ تا عوزرەکەی لادەکەوێ (فَإِذَا زَالَ عُذْرُهُ) جا هەر کاتێك میراتگرەکە عوزرەکەی نەما، واتە: هاتەوە، یان چاك بۆوە، یان ئاگادار کراوە، ئەو کاتە (حَلَفَ وَأَخَذَ بِغَيْرِ إِعَادَةِ شَهَادَةٍ) ئەویش سوێند لە سەر هەموو مافەکە دەخوا و بەشە میراتەکەی‌خۆی لە داوالێکراوەکە وەردەگرێ بێ ئەوەی شاهیدەکە شاهیدیەکەی دووبارە بکاتەوە.

جا ئەگەر خاوەن عوزرەکە –پێش سوێندخواردن– مرد، ئەو کاتە میراتگرەکەی وی سوێند دەخوا و بەشەکەی وی وەردەگرێ، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

## ﴿ باسی شاهیدی بە دیتن و گوێلێبوون ﴾

(وَلاَ تَجُوزُ شَهَادَةٌ عَلَى فِعْلٍ) دروست نیە شاهیدی لە سەر هەبوونی کردارێك بدا: (كَزِنًا وَغَصْبٍ وَإِتْلاَفٍ وَوِلاَدَةٍ) وەکو زیناو زەوتکردنو فەوتاندنو لە دایکبوونو شیرخواردنو شەڕابخواردنەوەو...هتد (إلاَّ بِالإِبْصَارِ) تەنها بە دیتنی‌چاو دروستە شاهیدی بدا: بکەرەکە ئەم کارەی کرد. چونکە پێغەمبەرﷺ بە شاهیدێکی فەرموو: ﴿تَرَى الشَّمْسَ؟ قَالَ نَعَمْ. قَالَ عَلَى مِثْلِهَا فَاشْهَدْ أَوْ دَعْ﴾ أخرجه ابن عدى باسناد ضعيف لكن صححه الحاكم، ئەم ڕۆژە دەبینی؟ گوتی: بەڵێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە سەر وێنەی ئەم ڕۆژ دیتنە شاهیدی بدە، یان واز بێنە. کەوابو: (وَتُقْبَلُ مِنْ أَصَمَّ) شاهیدی کردارەکان لە مرۆڤی کەڕ وەردەگیرێ، چونکە بە چاو کردارەکە دەبینێ.

بەڵام (وَالأَقْوَالُ) شاهیدی گوتەکان: (كَعَقْدٍ) وەکو مامڵەتبەستنو هەڵوەشاندنەوەو دانپێداهێنانو تەڵاقدان...هتد (يُشْتَرَطُ سَمْعُهَا وَإِبْصَارُ قَائِلِهَا) بۆ دروستبوونی شاهیدی بە مەرج دادەندرێ شاهیدەکە گوێی لە گوتەکە ببێو بکۆیەکەش بە چاو ببینێ.

بەڵام ئەگەر دەیزانی یەکێك بە تەنها لە ژوورەکەدایەو گوێی لە دەنگی بوو، یان تەنها دوو کەس لە ژوورێکدا بوونو گوێی لێیان بوو مامڵەتێکیان بەستو دەیزانی کامەیان وەرگرە، ئەو کاتەش دروستە: بەو گوێلێبوونە شاهیدی بدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يُقْبَلُ أَعْمَى) شاهیدی کوێر قبوڵ ناکرێ (إلاَّ أَنْ يُقِرَّ فِى أُذُنِه) تەنها لەو حاڵەتەدا قبوڵ دەکرێ: کەسێك لەگوێی‌دا دان بە شتێکدا بێنێ (فَيَتَعَلَّقُ بِهِ حَتَّى يَشْهَدَ عِنْدَ قَاضٍ بِهِ) جا کوێرەکەش کەسەکە بگرێو بەرینەدا تا لە لای قازی شاهیدی لە سەر دەدا بەو دانپێداهێنانە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی‌ڕاست.

وَلَوْ حَمَلَهَا بَصِيرٌ ثُمَّ عَمِيَ شَهِدَ إِنْ كَانَ الْمَشْهُودُ لَهُ وَعَلَيْهِ مَعْرُوفَي الإِسْمِ وَالنَّسَبِ، وَمَنْ سَمِعَ قَوْلَ شَخْصٍ أَوْ رَأَى فِعْلَهُ: فَإِنْ عَرَفَ عَيْنَهُ وَاسْمَهُ وَنَسَبَهُ شَهِدَ عَلَيْهِ فِي حُضُورِهِ إِشَارَةً، وَعِنْدَ غَيْبَتِهِ وَمَوْتِهِ بِإِسْمِهِ وَنَسَبِهِ، فَإِنْ جَهِلَهُمَا لَمْ يَشْهَدْ عِنْدَ مَوْتِهِ وَغَيْبَتِهِ، وَلاَ يَصِحُّ

تَحَمُّلُ شَهَادَةٍ عَلَى مُتَنَقِّبَةٍ إِعْتِمَادًا عَلَى صَوْتِهَا، فَإِنْ عَرَفَهَا بِعَيْنِهَا أَوْ بِإِسْمٍ وَنَسَبٍ جَازَ، وَيَشْهَدُ عِنْدَ الأَدَاءِ بِمَا يَعْلَمُ، وَلاَ يَجُوزُ التَّحَمُّلُ عَلَيْهَا بِتَعْرِيفِ عَدْلٍ أَوْ عَدْلَيْنِ

---

(وَلَوْ حَمَلَهَا بَصِيرٌ ثُمَّ عَمِيَ) ئەگەر چاوساغێك شاهیدیەكی هەلگرت ئینجاكوێر بوو، ئەو كاتەش (شَهِدَ) دروستە شاهیدیەكە بدا (إِنْ كَانَ الْمَشْهُودُ لَهُ وَعَلَيْهِ مَعْرُوفِي الإِسْمِ وَالنَّسَبِ) بەو مەرجەی شاهیدیبۆدراوەكەو شاهیدیلەسەردراوەكە ناو و نەژادی ناسراو بێ، وەك بلێ:(أشهدبالله فلانی كوڕیفلان ئەو كارەی كرد، یان ئەو قسەیەی گوت).

(وَمَنْ سَمِعَ قَوْلَ شَخْصٍ أَوْ رَأَى فِعْلَهُ) ئەگەر شاهیدەكە گوێی لە قسەی كەسێك بوو، یان بە چاو كردارەكەیی دیت، ئەوە (فَإِنْ عَرَفَ عَيْنَهُ وَاسْمَهُ وَنَسَبَهُ) ئەگەر شاهیدەكە خودی كەسەكەو ناوەكەیو نەژادەكەی دەناسی، ئەو كاتە (شَهِدَ عَلَيْهِ فِي حُضُورِهِ إِشَارَةً) لە حالەتی ئامادەبوونیكەسەكەدا بە ئاماژەبۆكردن شاهیدیی لە سەر دەدا، بەلام (وَعِنْدَ غَيْبَتِهِ وَمَوْتِهِ بِاسْمِهِ وَنَسَبِهِ) لە حالەتی دیارنەبوونیو مردنیدا بە ناو و نەژادەكەیی شاهیدیی لە سەر دەدا (فَإِنْ جَهِلَهُمَا) جا ئەگەر شاهیدەكە ناو و نەژادی كەسەكەی نەزانی، ئەو كاتە (لَمْ يَشْهَدْ عِنْدَ مَوْتِهِ وَغَيْبَتِهِ) نابێ لە حالەتی مردنیو دیارنەبوونیدا شاهیدیی لە سەر بدا، بەلام ئەگەر مردووەكە ژێر خاك نەكرابێ، ئەو كاتە دروستە بە ئاماژەبۆكردن شاهیدیی لە سەر بدا.

(وَلاَ يَصِحُّ تَحَمُّلُ شَهَادَةٍ عَلَى مُتَنَقِّبَةٍ) دروست نابێ ببێتە شاهید لە سەر ئافرەتێكی دەمو چاو داپۆشراو، كە (إِعْتِمَادًا عَلَى صَوْتِهَا) لە هەلگرتنی شاهیدیەكەی پشت بە دەنگی ئافرەتەكە ببەستێ، چونكە دەنگەكان وێكدەچن، بەلام (فَإِنْ عَرَفَهَا بِعَيْنِهَا أَوْ بِاسْمٍ وَنَسَبٍ) ئەگەر خودی ئافرەتەكەی دەناسی، یان بە ناو و نەژاد ئافرەتەكەی دەناسی، ئەو كاتە (جَازَ) دروستە بە داپۆشراویش لە سەر ئافرەتەكە ببێتە شاهید: لە مارەبڕینو شتیتریشدا، ئینجا (وَيَشْهَدُ عِنْدَ الأَدَاءِ بِمَا يَعْلَمُ) لە كاتی شاهیدیدانەكەدا بە وەی دەیزانی شاهیدی دەدا، واتە: بە ناو و نەژادی ئافرەتەكە، یان بە ئاماژەبۆكردن.

بەلام ئەگەر خودی ئافرەتەكەو ناو و نەژادەكەی نەدەناسی ئەو كاتە مەرجە: ئافرەتەكە پێچەی لە سەر ڕووی خۆی لابدا: لە حالەتی بوونە شاهیدو لە حالەتی شاهیدیدانەكەدا، هەروەك لە (تحفه)دا فەرموویەتی.

(وَلاَ يَجُوزُ التَّحَمُّلُ عَلَيْهَا) دروست نیە لە سەر ئافرەتە داپۆشراوەكە ببێتە شاهید لە مارەبڕینو شتیتریشدا (بِتَعْرِيفِ عَدْلٍ أَوْ عَدْلَيْنِ) بە پێناساندنی دادپەروەرێك، یان دوو

عَلَى الأَشْهَرِ، وَالْعَمَلُ عَلَى خِلاَفِهِ، وَلَوْ قَامَتْ بَيِّنَةٌ عَلَى عَيْنِهِ بِحَقٍّ فَطَلَبَ الْمُدَّعِي التَّسْجِيلَ سَجَّلَ الْقَاضِي بِالْحِلْيَةِ لاَ بِالإِسْمِ وَالنَّسَبِ مَا لَمْ يَثْبُتَا، وَلَهُ الشَّهَادَةُ بِالتَّسَامُعِ عَلَى نَسَبٍ مِنْ أَبٍ أَوْ قَبِيلَةٍ، وَكَذَا أُمٌّ فِي الأَصَحِّ، وَمَوْتٍ عَلَى الْمَذْهَبِ، لاَ عِتْقٌ وَوَلاَءٌ

وَوَقْفٌ وَنِكَاحٌ وَمِلْكٌ فِالأَصَحِّ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ عِنْدَ الْمُحَقِّقِينَ وَالأَكْثَرِينَ فِي الْجَمِيعِ الْجَوَازُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَشَرْطُ التَّسَامُعِ سَمَاعُهُ مِنْ جَمْعٍ يُؤْمَنُ تَوَاطُؤُهُمْ عَلَى الْكَذِبِ،

---

دادپەروەر (عَلَى الأَشْهَرِ) لە سەر فەرموودەی بەهێزی ناسراوتر، بەڵام (وَالْعَمَلُ عَلَى خِلاَفِه) ڕەفتاری شاهیدەکان—ئێستا— لە سەر پێچەوانەکەیەتی، واتە: بە فەرموودەی بێهێز: پشت بە پێناسەی دادپەروەر دەبەستن و دەبنە شاهید، کۆمەڵەزانایەکیش لە سەر ئەم بێهێزە ڕۆیشتون، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ قَامَتْ بَيِّنَةٌ عَلَى عَيْنِه بِحَقٍ) ئەگەر شاهید لە سەر خودی داوالێکراوەکە شاهیدیی دا: بە هەبوونی مافێك (فَطَلَبَ الْمُدَّعِي اَلتَّسْجِيلَ) جا داواکارەکە داوای لە قازی کرد: دادکردنەکەی بۆ تۆمار بکا، ئەو کاتە (سَجَّلَ الْقَاضِي بِالْحِلْيَةِ) قازی بەگوێرەی سیفەتەکانی داوالێکراوەکە دادکردنەکە تۆمار دەکا (لاَ بِالإِسْمِ وَالنَّسَبِ) نەك بە ناو و نەژادی داوالێکراوەکە (مَا لَمْ يَثْبُتَا) ئەگەر ناو و نەژادی داوالێکراوەکە لە لای خۆی ئاشکرا نەبوبێ، چونکە شاهیدەکان ناو و نەژادیان نەگوتوە.

## ﴿ باسی شاهیدیی بە گوێلێبوون ﴾

(وَلَهُ الشَّهَادَةُ بِالتَّسَامُعِ) دروستە بە هۆی گوێلێبوون و بڵاوبوونەوە شاهیدی بدا: (عَلَى نَسَبٍ مِنْ أَبٍ أَوْ قَبِيلَةٍ) لە سەر نەژادی کەسێك لە باوکێك، یان لە بنەماڵەیەك: وەك ئەمە کوڕی فلانکەسە، یان ئەمە لەو بنەماڵەیە (وَكَذَا أُمٌّ فِيالأَصَحِّ) هەروەها لە سەر نەژادی لە دایکیش دروستە بەگوێلێبوون شاهیدی بدا، لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەم (وَمَوْتٍ) لە سەر مردنی کەسێکیش دروستە بە گوێلێبوون شاهیدی بدا (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (لاَ عِتْقٌ وَوَلاَءٌ وَوَقْفٌ وَنِكَاحٌ وَمِلْكٌ فِيالأَصَحِّ) نەك لە ئازادکردن و خزمایەتی کۆیلەو وەقف و مارەبڕین و ملکایەتی.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (اَلأَصَحُّ عِنْدَ الْمُحَقِّقِينَ وَالأَكْثَرِينَ) فەرموودەیڕاستر لە لای زانایانی لێکۆڵەرەوەو زۆرتر (فِيالْجَمِيعِ: اَلْجَوَازُ) لە هەموو ئەوانەیڕابردوودا دروستە: بەگوێلێبوون شاهیدی بدا (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە ئەگەر ماوەیەکی درێژ بە سەر ئەوانەدا بڕوا، زەحمەتە سەرەتایەکەیان ئاشکرا بکرێ.

(وَشَرْطُ التَّسَامُعِ) مەرجی گوێلێبوون کە بۆ شاهیدی پشتی پێببەسترێ، ئەمەیە: (سَمَاعُهُ مِنْ جَمْعٍ) شاهیدیپێدراوەکەی لە کۆمەڵێکی وەها گوێ لێبوبێ: کە (يُؤْمَنُ تَوَاطُؤُهُمْ عَلَى الْكَذِبِ) دڵنیابێ: کۆمەڵەکە لە سەر درۆیەکە ڕێك ناکەون و گومان بەهێز ببێ

وَقِيلَ يَكْفِي مِنْ عَدْلَيْنِ، وَلاَ تَجُوزُ الشَّهَادَةُ عَلَى مِلْكٍ بِمُجَرَّدِ يَدٍ، وَلاَ بِيَدٍ وَتَصَرُّفٍ فِي مُدَّةٍ قَصِيرَةٍ، وَتَجُوزُ فِي طَوِيلَةٍ فِالأَصَحِّ، وَشَرْطُهُ تَصَرُّفُ مُلاَّكٍ مِنْ سُكْنَى وَهَدْمٍ وَبِنَاءٍ وَبَيْعٍ وَرَهْنٍ، وَتُبْنَى شَهَادَةُ الإِعْسَارِ عَلَى قَرَائِنَ وَمَخَائِلِ الضُّرِّ وَالإِضَاقَةِ.

ڕاست دەکەن (وَقِيلَ يَكْفِى مِنْ عَدْلَيْنِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لە دوو کەسی دادپەروەری گوێلێبوو بەسە.

ئینجا بزانە: چۆنیەتی شاهیدیدانی بە گوێلێبوون بەم شێوەیە: (من شاهیدم فلانکەس کوڕی فلانکەسە). یان: (ئەم ئافرەتە ژنی فلانکەسە). واتە: نابێ بڵێ: من شاهیدم فلانکەس ئەم ژنەی مارە کردوە؟ چونکە بە چاوی خۆی نەیدیتوە، هەروك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلاَ تَجُوزُ الشَّهَادَةُ عَلَى مِلْكٍ) دروست نیە شاهیدی بدا لە سەر ملکایەتی هیچ شتێك بۆ کەسێك (بِمُجَرَّدِ يَدٍ) بە تەنها دیتنی لە بن دەستدابوونی ملکەکە، هەم (وَلاَ بَيْدٍ وَتَصَرُّفٍ فِى مُدَّةٍ قَصِيرَةٍ) بە دیتنی لە بن دەستدابوون و دەستکاریکردنی ملکەکەش لە ماوەیەکی کورتدا دروست نیە شاهیدی لە سەر ملکایەتیی بدا بۆ کەسەکە، چونکە دەنگونجێ ملکەکەی بە کرێ گرتبێ، یان بە وەکیلایەتی دەستکاریی بکا.

بەلام ( وَتَجُوزُ فِى طَوِيلَةٍ) دروستە شاهیدی بە ملکایەتی شتەکە بدا ئەگەر دیتی لە ماوەیەکی درێژدا-بێ کێشە- دەستکاریی دەکا (فِيالأَصَحِّ) لەفەرموودیڕاستتردا.

(وَشَرْطُهُ) مەرجی دەستکاریکردنەکە (تَصَرُّفُ مُلاَّكٍ) دەستکاریی خاوەنەکانە (مِنْ سُكْنَى وَهَدْمٍ وَبِنَاءٍ وَبَيْعٍ وَرَهْنٍ) لە نیشتەجێبوون و ڕوخاندن و دیوارکردن و فرۆشتن و ڕەهنکردن و بەکرێدان.

جا بزانە: ئەگەر بڵاو بوبۆوە: ئەو شتە ملکی فلانکەسە، ئەو کاتە دروستە شاهیدی بە ملکایەتیی بدا بۆ کەسەکە، هەر چەند لە بن دەستیشیدا نەبێ و دەستکاریشی نەکا، هەروەك لە (القليوبي) و حاشیەکانی(تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَتُبْنَى شَهَادَةُ الإِعْسَارِ) شاهیدی نەبوویی مرۆ بنیات دەندرێ (عَلَى قَرَائِنَ وَمَخَائِلِ الضُّرِّ والإِضَاقَةِ) لە سەر نیشانەکان و گومانەکانی شپرزەیی و هەژاری و نەمانی ماڵ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی هەڵگرتنی شاهیدی و شاهیدیدان ﴾

(تَحَمُّلُ الشَّهَادَةِ) هەڵگرتنی شاهیدی، واتە: قبوڵ بکا ببێتە شاهید (فَرْضُ كِفَايَةٍ فِى النِّكَاحِ) واجبە بە (فَرْضُ الْكِفَايَةِ) لە مارەبڕیندا، چونکە بە بێ شاهید مارەبڕینەکە دروست نابێ (وَكَذَا الإِقْرَارُ وَالتَّصَرُّفُ الْمَالِيُّ) هەروەها لە دانپێداهێنان و لە دەستکاریەکانی ماڵی و لە تەلاق و هەم (وَكِتَابَةُ الصَّكِّ) لە نووسینی ڕووداوەکان لە پەڕەکاندا، لە گشت ئەوانەشدا

فِى الأَصَحِّ، وَإِذَا لَمْ يَكُنْ فِى الْقَضِيَّةِ إِلاَّ اثْنَا



وَامْتَنَعَ الآخَرُ وَقَالَ إِحْلِفْ مَعَهُ عَصَى، وَإِنْ كـ

فَلَوْ طَلَبَ مِنْ اثْنَيْنِ لَزِمَهُمَا فِى الأَصَحِّ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ إِلاَّ وَاحِدٌ لَزِمَهُ

إنْ كَانَ فِيمَا يَثْبُتُ بِشَاهِدٍ وَيَمِينٍ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَقِيلَ لاَ يَلْزَمُ الأَدَاءُ إلاَّ مَنْ تَحَمَّلَ قَصْدًا،

هەڵگرتنی شاهیدی بە (فَرْضُ الْكِفَايَة) واجبە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: ئەگەر ژمارەیەکی پێویست شاهیدیەکە هەڵبگرن گوناهەکە لە سەر خەڵکیتریش لادەکەوێ، ئەگەر نا: هەموویان گوناهبار دەبن.

ئینجا بزانە: هەر کەسێك شاهیدیەکی لە لا بێ حەرامە شاهیدیەکە بشارێتەوە، چونکە شاهیدیەکە ئەمانەتە لە لای وی، واجبە: ئەمانەتەکە بداتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ هەر کەسێك شاهیدی بشارێتەوە گوناهبارە.

(وَإِذَا لَمْ يَكُنْ فِيالْقَضِيَّةِ إلاَّ اثْنَانِ) ئەگەر لە ڕووداوەکەدا تەنها دوو شاهید هەبون، ئەو کاتە (لَزِمَهُمَاالأَدَاءُ) لە سەر هەردووکیان بە (فَرْضُ الْعَيْنِ) واجبە شاهیدیەکە بدەن هەر کاتێك داوایان لێکرا، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا يَأْبَ الشُّهَدَاءُ إِذَا مَا دُعُوا﴾ نابێ شاهیدەکان گیر ببن هەر کاتێك داوا کران بۆ شاهیدی. کەوابو: (فَلَوْ أَدَّى وَاحِدٌ وَامْتَنَعَ الآخَرُ) ئەگەر یەکێکیان شاهیدیەکەی دا، ئەوەکەیتریش خۆی گیر کردو شاهیدیەکەی نەداو (وَقَالَ: إحْلِفْ مَعَهُ) بە داوا کارەکەی گوت: سوێندی گەڵ ئەم شاهیدە بخۆ، ئەوە (عَصَى) گوناهبار دەبێ، چونکە واجبەکەی بەجێ نەهێناوە.

بەڵام (وَإِنْ كَانَ شُهُودٌ) ئەگەر لە ڕووداوەکەدا لە ڕادەی پێویست زۆرتر شاهید هەبون، ئەو کاتە (فَالأَدَاءُ فَرْضُ كِفَايَةٍ) شاهیدیدانەکە بە (فَرْضُ الْكِفاية) لە سەر هەموانیان واجبە، جا ئەگەر داوایان لێبکرێو دووانیان شاهیدیەکە بدەن، ئەوە گوناهەکە لە سەر هەموانیان لادەکەوێ، ئەگەر نا: هەموویان گوناهبار دەبن.

(فَلَوْ طَلَبَ مِنْ اثْنَيْنِ) جا ئەگەر داواکارەکە داوای لە تەنها دوو شاهیدی دیارکراو کرد، ئەو کاتە (لَزِمَهُمَا فِيالأَصَحِّ) لە سەر ئەو دووانە واجبە: شاهیدیەکە بدەن، لە فەرموودەی ڕاستردا، نەوەك خەڵك بە تەمای یەکتری واز لە شاهیدیەکە بێنن.

هەروەها (وَإِنْ لَمْ يَكُنْ إلاَّ وَاحِدٌ) ئەگەر لە ڕووداوەکەدا تەنها یەك شاهید هەبوو، ئەو کاتەش (لَزِمَهُ) ئەگەر داوای لێکرا لە سەری واجبە شاهیدیەکە بدا (إنْ كَانَ فِيمَا يَثْبُتُ بِشَاهِدٍ وَيَمِينٍ) ئەگەر شاهیدیەکە لە مافێکی وەهادا بێ: کە بە شاهیدێكو سوێندی داواکارەکە ئاشکرا ببێ: وەك کێشەکانی ماڵی (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە شاهیدێكو سوێندخواردن ئاشکرا نەبێ: وەکو مارەبڕینو تەڵاق، ئەو کاتە (فَلاَ) واجب نیە شاهیدیەکە بدا، چونکە سودی نیە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (لاَ يَلْزَمُ الأَدَاءُ إلاَّ مَنْ تَحَمَّلَ قَصْدًا) شاهیدیدان واجب

لاَ اتِّفَاقًا، وَلِوُجُوبِ الأَدَاءِ شُرُوطٌ: أَنْ يُدْعَى مِنْ مَسَافَةِ الْعَدْوَى، وَقِيلَ دُونَ مَسَافَةِ الْقَصْرِ. وَأَنْ يَكُونَ عَدْلاً فَإِنْ دُعِيَ ذُو فِسْقٍ مُجْمَعٍ عَلَيْهِ -قِيلَ أَوْ مُخْتَلَفٍ فِيهِ- لَمْ يَجِبْ. وَأَنْ لاَيَكُونَ مَعْذُورًا بِمَرَضٍ وَنَحْوِهِ، فَإِنْ كَانَ أَشْهَدَ عَلَى شَهَادَتِهِ أَوْ بَعَثَ الْقَاضِي مَنْ يَسْمَعُهَا.

نیە تەنها لە سەر ئەو کەسە نەبێ: کە بە ویستی خۆی شاهیدیەکەی هەڵگرتبێ (لاَ اتِّفَاقًا) نەك بە ڕێکەوتن.

﴿ ئاگاداری ﴾: بۆ نووسەرەکە دروستە: کرێی نووسینەکە وەربگرێ، هەم بۆ شاهیدەکەش دروستە: کرێی سواری و بژێوی ڕێگەو ئەندازەی لەکارکەوتنی ئەو کاسبیەی لەو ماوەیەدا لەکار دەکەوێ گشتی لەو کەسە وەربگرێ کە شاهیدی بۆ دەدا، بەڵام دروست نیە کرێی شاهیدیدانەکە وەربگرێ، چونکە خودی شاهیدیدانەکە واجبە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلِوُجُوبِ الأدَاءِ شُرُوطٌ) بۆ واجببوونی شاهیدیدانەکەش چەند مەرجێك هەنە: یەکەم: (أنْ يُدْعَى مِنْ مَسَافَةِالْعَدْوَى) دەبی لە ئەندازەی خۆشڕۆییەوە، یان نزیکتر داوا بکرێ، واتە: ئەگەر لە بەیانیەوە دەربچێ بۆ سەرەتای شەو بگەڕێتەوە ماڵەوە، ئەگەر لەو ئەندازەیە دوورتر بێ، واجب نیە بچێ (وَقِيلَ دُونَ مَسَافَةِالْقَصْرِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر لە کەمتر لە ئەندازەی کورتکردنەوەی‌نوێژ داوا بکرێ واجبە: بچێ.

دووەم: (وَأنْ يَكُونَ عَدْلاً) دەبی شاهیدەکە دادپەروەر بێ، کەوابو: (فَإنْ دُعِيَ ذُوفِسْقٍ مُجْمَعٍ عَلَيْهِ) ئەگەر خاوەن فاسقییێکی یەکدەنگی داواکرا: وەکو شەڕابخۆر–(قِيلَ أوْ مُخْتَلَفٍ فِيهِ) لە فەموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر خاوەن فاسقیێکی یەکدەنگیش نەبێ–(لَمْ يَجِبْ) واجب نیە شاهیدیەکە بدا، چونکە شاهیدی فاسق قبوڵ ناکرێ، بەڵام ئەگەر شاهیدەکە فاسقێکی بە نهێنی بێ‌و خاوەن مافەکەش بە شاهیدیەکەی وی بگاتە مافی‌خۆی، ئەو کاتە واجبە شاهیدیەکە بدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

سێیەم: (وَأنْ لاَ يَكُونَ مَعْذُورًا) نابێ شاهیدەکە عوزرێکی هەبێ: (بِمَرَضٍ وَنَحْوِهِ) بە هۆی نەخۆشی‌و عوزرێکی وەها: وەك ترسان لە گیان‌و ماڵ (فَإنْ كَانَ) جا ئەگەر شاهیدەکە عوزرێکی هەبێ، ئەو کاتە (أشْهَدَ عَلَى شَهَادَتِهِ) یەکێکی‌تر لە سەر شاهیدیەکەی خۆی دەکاتە شاهید (أوْ بَعَثَ الْقَاضِي مَنْ يَسْمَعُهَا) یان قازی وەکیلێکی خۆی دەنێرێ تاکو گوێ لە شاهیدەکە بگرێ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی زمانشاهیدی لە سەر شاهیدی ﴾

واتە: شاهیدی لە سەر شاهیدی کەسێکی‌تر بدا. (تُقْبَلُ الشَّهَادَةُ عَلَىالشَّهَادَةِ) شاهیدیدان لە سەر شاهیدی شاهیدێکی‌تر قبوڵ دەکرێ: (فِي غَيْرِ عُقُوبَةٍ) لە گشت مافێکدا کە سزای وَفِي عُقُوبَةٍ لآدَمِيٍّ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَتَحَمُّلُهَا بِأنْ يَسْتَرْعِيَهُ فَيَقُولَ: أنَا شَاهِدٌ بِكَذَا وَأُشْهِدُكَ أوْ إشْهَدْ عَلَى شَهَادَتِي. أوْ يَسْمَعَهُ يَشْهَدُ عِنْدَ قَاضٍ. أوْ يَقُولُ: أشْهَدُ أنَّ لِفُلاَنٍ عَلَى فُلاَنٍ ألْفًا عَنْ ثَمَنِ مَبِيعٍ أوْ غَيْرِهِ. وَفِي هَذَا وَجْهٌ، وَلاَ يَكْفِي سَمَاعُ قَوْلِهِ لِفُلاَنٍ عَلَى

فُلاَنٍ كَذَا، أَوْ أَشْهَدُ بِكَذا، أَوْ عِنْدِى شَهَادَةٌ بِكَذَا. وَلِيُبَيِّنِ الْفَرْعُ عِنْدَ الأَدَاءِ جِهَةَ التَّحَمُّلِ،

---

تاوانەكانی مافی خوای گەورە نەبێ، جیاوازی نیە مافی ئادەمیزاد بێ: وەكو كڕینو فرۆشتنو دانپێداهێنانو مارەبڕینو تەلاقو...هتد، یان مافی خوای گەورە بێ: وەكو زەكاتو وەقف، هەم (وَفِى عُقُوبَةٍ لآدَمِيٍّ) لەو سزایانەشدا قبولّ دەكرێ: كە مافی ئادەمیزادانن: وەك كوشتنی لە تۆڵەو بوختانی زینا (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، واتە: بەلاّم لە سزاكانی مافی خوایگەورەدا–وەكو زیناو شەڕابخواردنەوە– زمانشاهیدی قبولّ ناكرێ.

(وَتَحَمُّلُهَا) هەلگرتنی زمانشاهیدی بە یەكێك لەم سێ هۆیانە دروست دەبێ: یەكەم: (بِأَنْ يَسْتَرْعِيَهُ فَيَقُولُ) شاهیدەكە شاهیدیەكەی خۆی بە زمانشاهیدەكە بسپێرێو بڵێ: (أَنَا شَاهِدٌ بِكَذَا وَأُشْهِدُك أَوْ إِشْهَدْ عَلَى شَهَادَتِى) من شاهیدم بەو شتەو تۆم كردە شاهید لە سەر شاهیدیەكەم. یان تۆ شاهیدی بدە لە سەر شاهیدیەكەی من.

دووەم: (أَوْ يَسْمَعَهُ يَشْهَدُ عِنْدَ قَاضٍ) یان زمانشاهیدەكە گوێی لێبێ شاهیدەكە شاهیدیەكە دەدا لە لای قازی، یان لە لای كاربەدەستێكیتر.

سێیەم: (أَوْ يَقُولُ) یان گوێی لێبێ شاهیدەكە هۆی شاهیدیەكەی بڵێ: وەك (أَشْهَدُ أَنَّ لِفُلاَنٍ عَلَى فُلاَنٍ أَلْفًا عَنْ ثَمَنِ مَبِيعٍ أَوْ غَيْرِهِ) من شاهیدم فلانكەس هەزار دیناری لە سەر فلانكەسە لە پارەی فرۆشراوێك، یان لە پارەی قەرزێك.

جا بە یەكێك لەو سێ هۆیانە بۆ زمانشاهیدەكە دروست دەبێ شاهیدی بدا، هەرچەند لە هۆی دووەمو سێیەمیشدا شاهیدیەكەی پێنەسپێردرابێ، بەلاّم (وَفِى هَذَا وَجْهٌ) لەم سێیەمەدا فەرموودەیەكی بێهێز هەیە: كە بێ پێسپاردن دروست نەبێ.

(وَلاَ يَكْفِى سَمَاعُ قَوْلِهِ) بۆ دروستبوونی زمانشاهیدی ئەوەندە بەس نیە زمانشاهیدەكە گوێی لە شاهیدەكە بێ بڵێ: (لِفُلاَنٍ عَلَى فُلاَنٍ كَذَا) فلاّن ئەوەندەی لە سەر فلاّنە (أَوْ) یان بڵێ: (أَشْهَدُ بِكَذَا) من شاهیدی بەو شتە دەدەم (أَوْ) یان بڵێ: (عِنْدِى شَهَادَةٌ بِكَذَا) من شاهیدیەكم بەو شتە لە لایە.

(وَلِيُبَيِّنِ الْفَرْعُ عِنْدَالأَدَاءِ جِهَةَ التَّحَمُّلِ) با زمانشاهیدەكە لە كاتی شاهیدیدانەكەدا ڕوون بكاتەوە: ئەو ڕووەی شاهیدیەكەی لێهەلگرتوە: وەك (من شاهیدم فلاّنكەس ئەو شاهیدیەی دەداو منیشی كردۆتە زمانشاهید). یان یەكێك لە دوو هۆیەكانیتر ڕوون

فَإِنْ لَمْ يُبَيِّنْ وَوَثِقَ الْقَاضِى بِعِلْمِهِ فَلاَ بَأْسَ، وَلاَ يَصِحُّ التَّحَمُّلُ عَلَى شَهَادَةِ مَرْدُودِ الشَّهَادَةِ، وَلاَ تَحْمِلُ النِّسْوَةُ، فَإِنْ مَاتَ الأَصْلُ أَوْ غَابَ أَوْ مَرِضَ لَمْ يَمْنَعْ شَهَادَةَ الْفَرْعِ،

وَإِنْ حَدَثَ رِدَّةٌ أَوْ فِسْقٌ أَوْ عَدَاوَةٌ مَنَعَتْ، وَجُنُونُهُ كَمَوْتِهِ عَلَىالصَّحِيحِ، وَلَوْ تَحَمَّلَ فَرْعٌ فَاسِقٌ أَوْ عَبْدٌ أَوْ صَبِيٌّ فَأَدَّى وَهُوَ كَامِلٌ قُبِلَتْ، وَيَكْفِي شَهَادَةُ اثْنَيْنِ عَلَىالشَّاهِدَيْنِ،

---

بكاتەوە، بەڵام (فَإِنْ لَمْ يُبَيِّنْ) ئەگەر زمانشاهیدەکە ڕووەکەی ڕوون نەکردەوەو تەنها گوتی: (من شاهیدم لە سەر شاهیدیی فلان شاهیدە بەم شتە). جا (وَوَثِقَ الْقَاضِي بِعِلْمِهِ) قازیش باوەڕی بە زانستی زمانشاهیدەکە هەبو: کە چۆن زمانشاهیدی هەڵدەگرێ، ئەو کاتە (فَلاَ بَأْس) هیچ زیانێك لە زمانشاهیدیەکەدا نیە.

(وَلاَ يَصِحُّ التَّحَمُّلُ) هەڵگرتنی زمانشاهیدی دروست نابێ (عَلَى شَهَادَةِ مَرْدُودِ الشَّهَادَةِ) لە سەر شاهیدیی ئەو کەسەی شاهدیەکەی ڕەد کراوەتەوە: بە هۆی فاسقی، یان دوژمنایەتی، یان باب‌و کوڕایەتی (وَ) هەروەها (لاَ تَحمِلُ النِّسْوَةُ) دروست نابێ ئافرەتان‌و نێرامووك زمانشاهیدی هەڵبگرن، هەرچەند شاهیدەکانی بنچینەش هەموویان ئافرەت بن‌و شاهیدیەکەش لەبارەی حەیزو شیردان‌و منداڵبوون بێ.

(فَإِنْ مَاتَ الأَصْلُ) جا ئەگەر شاهیدەکەیبنچینەیی مرد (أَوْ غَابَ) یان دیار نەبو لە کوێیە (أَوْ مَرِضَ) یان نەخۆش بوو، ئەوە (لَمْ يَمْنَعْ شَهَادَةَ الْفَرْعِ) شاهیدیی زمانشاهیدەکە قەدەغە ناکاو قبوڵ دەکرێ.

بەڵام (وَإِنْ حَدَثَ رِدَّةٌ أَوْ فِسْقٌ أَوْ عَدَاوَةٌ) ئەگەر شاهیدەکەی بنچینەیی کافر بوو، یان فاسق بوو، یان دوژمنایەتیی لێپەیدا بوو، ئەو کاتە (مَنَعَتْ) هەر یەکێك لەو سێیانە شاهیدیی زمانشاهیدەکەش قەدەغە دەکاو قبوڵ ناکرێ، چونکە ئەو سێیانە گومان لە ڕابردوی شاهیدەکەشدا پەیدا دەکەن (وَجُنُونُهُ) شێتبوونی شاهیدەکەی بنچینەییو لاڵبوونی‌و کوێربوونی، گشتی (كَمَوْتِهِ) وەکو مردنیەتی‌و شاهیدیی زمانشاهیدەکە قەدەغە ناکەن‌و قبوڵ دەبێ (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَلَوْ تَحَمَّلَ فَرْعٌ فَاسِقٌ أَوْ عَبْدٌ أَوْ صَبِيٌّ) ئەگەر زمانشاهیدێکی فاسق، یان کۆیلە، یان منداڵ شاهیدیەکەی هەڵگرت (فَأَدَّى وَهُوَ كَامِلٌ) ئینجا لە حاڵەتی کاملّیدا زامانشاهیدیەکەی دا، واتە: تۆبەی کردبو، ئازاد بوو، بلۆغی بوبو، ئەو کاتە (قُبِلَتْ) زمانشاهیدیەکەی قبوڵ دەکرێ.

ئینجا بزانە: دروست نیە ژمارەی زمانشاهیدیەکان لە ڕووداوەکەدا لە دووان کەمتر بێ، کەوابو: (وَيَكْفِي شَهَادَةُ اثْنَيْنِ عَلَى الشَّاهِدَيْنِ) ئەوەندە بەسە: دوو زمانشاهید لە سەر شاهیدیی دوو شاهیدان شاهیدی بدەن، واتە: هەر یەکەیان لە سەر شاهیدیی هەردوو شاهیدەکان شاهیدی بدا.

وَفِي قَوْلٍ يُشْتَرَطُ لِكُلِّ رَجُلٍ أَوْ امْرَأَةٍ اثْنَانِ، وَشَرْطُ قَبُولِهَا: تَعَذُّرُ أَوْ تَعَسُّرُ الأَصِيلِ بِمَوْتٍ أَوْ عَمًى أَوْ مَرَضٍ يَشُقُّ حُضُورُهُ أَوْ غَيْبَةٌ

لِمَسَافَةِ عَدْوَى، وَقِيلَ قَصْرٍ، وَأَنْ يُسَمِّيَ الأُصُولَ، وَلاَ يُشْتَرَطُ أَنْ يُزَكِّيَهُمْ الْفُرُوعُ، فَإِنْ زَكَّوْهُمْ قُبِلَ، وَلَوْ شَهِدُوا عَلَى شَهَادَةِ عَدْلَيْنِ أَوْ عُدُولٍ وَلَمْ يُسَمُّوهُمْ لَمْ يَجُزْ. (فَصْلٌ) رَجَعُوا عَنِ الشَّهَادَةِ قَبْلَ الْحُكْمِ اِمْتَنَعَ،

---

بەلاّم ئەگەر هەر یەکەیان لە سەر شاهیدیی تەنها شاهیدێك شاهیدی بدا ئەوە بەس نیە، چونکە مەرجە: هەر شاهیدێك دوو زمانشاهیدی هەبن، کەواتە: ئەگەر دوو زمانشاهید لە سەر شاهیدیی تەنها شاهیدێك شاهیدی بدەن، ئەو کاتە بۆ خاوەن مافەکە دروستە سوێندی گەلّ شاهیدێك لەگەلّ زمانشاهیدیی ئەو دووانە بخوا، هەروەك لە(مغنی)دا فەرموویەتی (وَفِىقَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا (يُشْتَرَطُ لِكُلِّ رَجُلٍ أَوْ امْرَأَةٍ اِثْنَانِ) بە مەرج دادەنرێ بۆ هەر پیاوێك، یان بۆ هەر ئافرەتێك دوو زمانشاهید هەبن.

(وَشَرْطُ قَبُولِهَا) مەرجی قبولّکردنی زمانشاهیدی ئەمەیە: (تَعَذُّرُ أَوْ تَعَسُّرُ الأَصِيلِ) نەگونجێ، یان زەحمەت بێ شاهیدەکەی بنچینەیی ئاماد ببێ (بِمَوْتٍ أَوْ عَمًى) بە هۆی مردنی، یان کوێربوونی، یان شێتبوونی، یان لالّبوونی (أَوْ مَرَضٍ يَشُقُّ حُضُورُهُ) یان بە هۆی نەخۆشیەکی وەها کە ئامادەبوونەکەی ئازاری بدا، یان لە ترسی خاوەن قەرزێك، یان کەسێکیتر نەوێرێ ئامادە ببێ (أَوْ غَيْبَةٌ لِمَسَافَةِ عَدْوَى) یان شاهیدەکەی بنچینەیی دیار نەبێ و بە ئەندازەی خۆشڕۆیی ڕێبوار دوور بێ، واتە: بۆ سەرەتای شەو نەگاتەوە شوێنەکەی خۆی (وَقِيلَ قَصْرٍ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا بە ئەندازەی کورتکردنەوەی نوێژ دوور بێ.

(وَ) هەروەها مەرجە: (أَنْ يُسَمِّيَ الأُصُولَ) زمانشاهیدەکە لە شاهیدیەکەدا ناوی شاهیدە بنچینەییەکان بێنێ: وەك (من شاهیدم لە سەر شاهیدیی فلاّن شاهید)...هتد، تاکو قازیو داوالێکراوەکە بیانناسنو بتوانن ڕەخنەیان لێبگرن، بەلاّم (وَلاَ يُشْتَرَطُ أَنْ يُزَكِّيَهُمْ الْفُرُوعُ) مەرج نیە: زمانشاهیدەکان شاهیدە بنچینەییەکان بە دادپەروەر دابنێن (فَإِنْ زَكَّوْهُمْ) جا ئەگەر بە دادپەروەریان دانان، ئەو کاتە (قُبِلَ) لێیان قبولّ دەکرێ.

(وَلَوْ شَهِدُوا عَلَى شَهَادَةِ عَدْلَيْنِ أَوْ عُدُولٍ) ئەگەر زمانشاهیدەکان شاهیدییان دا لە سەر شاهیدیی دوو دادپەروەر، بەلاّم (وَلَمْ يُسَمُّوهُمْ) ناویان نەهێنان، ئەوە (لَمْ يَجُزْ) بەس نیەو دروست نابێ، چونکە داوالێکراوەکە نایانناسێو ناتوانێ ڕەخنەیان لێبگرێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی پەشیمانبوونەوە لە شاهیدی ﴾

(إِذا رَجَعُوا عَنِ الشَّهَادَةِ) هەر کاتێك شاهیدەکان پەشیمان بونەوە لە شاهیدیەکەیان (قَبْلَ الْحُكْمِ) پێش ئەوەی قازی=دادوەر=بە شاهیدیەکەیان= بڕیار بدا، ئەوە (اِمْتَنَعَ) دادکردنی

أَوْ بَعْدَهُ وَقَبْلَ اِسْتِيفَاءِ مَالٍ اُسْتُوْفِيَ، أَوْ عُقُوبَةٍ فَلاَ، أَوْ بَعْدَهُ لَمْ يُنْقَضْ، فَإِنْ كَانَ الْمُسْتَوْفَى قِصَاصًا

بەو شاهیدیيە قەدەغە دەبێو بڕیاردانەكەی دروست نابێ، واتە: هەرچەند دووبارەش شاهیدەكان شاهیدیەكە بدەنەوە شاهیدییەكەیان هەر لێوەرناگیرێ؟ چونكە نازانرێ یەكەمەكەیان ڕاستە، یان دووەمەكەیان.

(أَوْ بَعْدَهُ وَقَبْلَ اسْتِيفَاءِ مَالٍ) یان ئەگەر لە دوای بڕیاردانی قازی بە ماڵێك بۆ كەسێك، شاهیدەكان پەشیمان بونەوە پێش ئەوەی ماڵەكە وەربگیرێ، ئەو كاتە (اُسْتُوْفِيَ) ماڵەكە وەردەگیرێو پەشیمانبوونەوەكە كار لە بڕیارەكە ناكا، چونكە بڕیاردانەكە تەواو بووەو هەڵناوەشێتەوە.

(أَوْ عُقُوبَةٍ) یان ئەگەر لە دوای بڕیاردانی قازی بە واجبوونی سزای تاوانێك، شاهیدەكان پەشیمان بونەوە پێش ئەوەی سزای تاوانەكە وەربگیرێ، ئەو كاتەش بڕیارەكە هەڵناوەشێتەوە، بەڵام (فَلَا) نابێ سزایەكە وەربگیرێ، چونكە سزای تاوانەكان بە هۆی (شُبْهَةٍ) لادەكەوێ، جیاوازی نیە تاوانەكە مافی خوای گەورە بێ: وەكو زیناو شەڕاب، یان مافی ئادەمیزاد بێ، وەكو كوشتنی لەتۆڵەو بوختانی زینا.

(أَوْ بَعْدَهُ) یان ئەگەر لە دوای بڕیاردانی قازیو لە دوای وەرگرتنی سزای تاوانەكە شاهیدەكان پەشیمان بونەوە، ئەو كاتەش (لَمْ يُنْقَضْ) بڕیارەكەی قازی هەڵناوەشێندرێتەوەو سزایەكەی بە دروستبوویی دادەندرێ، بەڵان قازیو شاهیدەكان بەم شێوەیەی داهاتوو بڕیاریان لە سەر دەدرێ:

(فَإِنْ كَانَ الْمُسْتَوْفَى قِصَاصًا) ئەگەر سزا وەرگیراوەكە كوشتنی لەتۆڵە، یان لێكردنەوەی ئەندامێكی لەتۆڵە بوو (أَوْ قَتْلَ رِدَّةٍ أَوْ رَجْمَ زِنًا) یان كوشتنی كافربوون، یان بەردبارانكردنی زینا بوو (أَوْ جَلْدَهُ وَمَاتَ) یان داركاریی زینا بوو و بەو داركاریەش مرد، یان دەست بڕینی دزی بوو، ئینجا لە دوای وەرگرتنی سزایەكە شاهیدەكان پەشیمان بونەوەو (وَقَالُوا تَعَمَّدْنَا) گوتیان: بە قەسدی ئەو شاهیدیيە درۆیەمان داو دەشمانزانی بەم شاهیدییەیئێمە سزایەكەی لێوەردەگیرێ، ئەو كاتە (فَعَلَيْهِمْ قِصَاصٌ) كوشتنەوەی لەتۆڵەی سزادراوەكە تەنها لە سەر شاهیدەكان واجب دەبێ بەو مەرجەی میراتگری كوژراوەكە نەزانێ شاهیدەكان درۆ دەكەن، ئەگینا: كوشتنەوەی لەتۆڵە–تەنها– لە سەر خۆی واجب دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(أَوْ دِيَةٌ مُغَلَّظَةٌ) یان ئەگەر شاهیدەكان لە تۆڵەكردنەوە عەفو كران، ئەوە كاتە خوێنێكی ئەستووركراوی سزادراوەكە لە ماڵی هەموو شاهیدەكان واجب دەبێو بە سەر ژمارەكەیاندا

وَعَلَى الْقَاضِي قِصَاصٌ إِنْ قَالَ تَعَمَّدْتُ. وَإِنْ رَجَعَ هُوَ وَهُمْ فَعَلَى الْجَمِيعِ قِصَاصٌ إِنْ قَالُوا: تَعَمَّدْنَا. فَإِنْ قَالُوا: أَخْطَأْنَا. فَعَلَيْهِ

بەش دەكرێ ﴿عن الشَّعْبِي‌ﷺ: أَنَّ رَجُلَيْنِ شَهِدا عَلَى رَجُلٍ أَنَّهُ سَرَقَ، فَقَطَعَهُ عَلِيٌّ‌ﷺ ثُمَّ جَاآ بِآخَرَ وَقَالُوا أَخْطَأْنَا. فَأَبْطَلَ شَهَادَتَهُمَا وَأُخِذَا بِدِيَةِ الأَوَّلِ، وَقَالَ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكُمَا تَعَمَّدْتُمَا لَقَطَعْتُكُما﴾ رواه البخاری، دوو پیاو شاهیدییان دا لـە سـەر پیاوێك: دزیـی كـردوە. جا ئیمامی (علی) بەو شاهیدییە دەستی دزەكەی بڕی، ئینجا شاهیدەكان دزێكیتریان هێناو گوتیان: بە هەڵە شاهیدیمان لە سەر یەكەمەكە داوە. جا ئیمامی (علـی) شـاهیدیەكەیانی بەتاڵ كردەوەو خوێنی دەستییەكەمەكەیانی لێوەرگیراو فـەرمووی: ئەگـەر زانیبـام بـە قەسدی شاهیدیتان لە سەر داوە، دەستی هەردووكتانم لەتۆڵە لێدەكردەوە.

ئینجا بزانە: هەر بە بەڵگەی حەدیسەكە: نە تۆڵەو نە خوێن لە سەر قازییەكە واجب نابێ بەو مەرجەی بە قەسدی، یان بە هەڵە بڕیارە ناشەرعیەكەی نەدابێ، كەوابو: (وَعَلَىالْقَاضِي قِصَاصٌ) كوشتنەوەی لەتۆڵە تەنها لە سەر قازیەكە واجب دەبێ (إِنْ قَالَ تَعَمَّدْتُ) ئەگەر بە تەنها پەشیمان ببێتەوەو بڵێ: بە قەسدی بەو شاهیدییە درۆیە دادم كردو بڕیارم دا. جا ئەگەر لە تۆڵەكردنەوە عەفو كرا، ئەو كاتە واجبە: خوێنێكی ئەستوور بدا.

بەڵام (وَإِنْ رَجَعَ هُوَ وَهُمْ) ئەگەر قازیو شاهیدەكان گشتیان پەشیمان بونەوە، ئـەو كاتـە (فَعَلَى الْجَمِيعِ قِصَاصٌ) لە سەر گشتیان كوشتنەوەی لەتۆڵە واجب دەبێ (إِنْ قَالُوا: تَعَمَّدْنَا) ئەگەر گشتیان بڵێن: بە قەسدی كردمان. واتە: قازی بڵێ: بە قەسدی بەو شاهیدیە درۆیە بڕیارم داوە. شاهیدەكانیش بڵێن: بە قەسدی شاهیدیی بە درۆمان دا.

بەڵام (فَإِنْ قَالُوا أَخْطَأْنَا) ئەگەر قازییەكەو شاهیدەكان بڵـێن: بـە هەڵـەدا چـوین، واتـە: قازیەكە بڵێ: بە هەڵە بەو شاهیدییە درۆیە بڕیارم داوە. شاهیدەكانیش بڵـێن: بـە هەڵـە شاهیدیمان دا. ئەو كاتە (فَعَلَيْهِ نِصْفُ دِيَةٍ) نیوەی خوێنی سزادراوەكە-بە تەنها- لە سەر قازییەكەیە، هەم (وَعَلَيْهِمْ نِصْفٌ) نیوە خوێنەكەیتریش لە سەر هەموو شـاهیدەكانە بـە تێكڕایی، بە بەڵگەی حەیسەكەیڕابردوو.

(وَلَوْ رَجَعَ مُزَكٍّ) ئەگـەر پاككـەرەوەی شـاهیدەكان پەشـیمان بـۆوە لـە دادپـەروەركردنی شاهیدەكانو گوتی: بە درۆ گوتم شاهیدەكان دادپەروەرن. ئـەوە (فَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَضْمَنُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: پاككەرەوەكە-بە تەنها- دەبێتە زامین: بە كوشتنی لەتۆڵە، یان بە خوێنی سزادراوەكە، واتە: شاهیدەكان نابنە زامین.

(أَوْ وَلِيٌّ وَحْدَهُ) یان میراتگری كوژراوەكە-بە تەنها- پەشیمان بۆوەو گوتی: مـن بـە درۆ داوام كردو گوتم: فلانكەس خزمەكەی منی كوشتوە. هەروەها ئەگەر بشڵێ: من دەمزانـی

فَعَلَيْــهِ قِصَــاصٌ أَوْ دِيَــةٌ، أَوْ مَــعَ الشُّــهُودِ فَكَــذَلِكَ، وَقِيــلَ: هُــوَ وَهُــمْ شُــرَكَاءُ، وَلَــوْ شَــهِدا بِطَــلاَقٍ بَــائِنٍ أَوْ رَضَــاعٍ أَوْ لِعَــانٍ وَفَــرَّقَ الْقَاضِــي فَرَجَعَــا

دَامَ الْفِـرَاقُ وَعَلَـيْهِمْ مَهْرُمِثْـلٍ، وَفِـي قَـوْلٍ نِصْـفُهُ إنْ كَـانَ قَبْـلَ وَطْءٍ، وَلَـوْ شَـهِدا بِطَلَاقٍ وَفَرَّقَ فَرَجَعا فَقَامَتْ بَيِّنَةٌ أَنَّهُ كَانَ بَيْنَهُمَا رَضَاعٌ فَلاَ غُرْمَ، وَلَوْ رَجَعَ شُهُودُ مَالٍ

---

شاهیدەکان بە درۆ شاهیدییان لە سەر بکوژەکە داوە. ئـەوە لـە هـەردو حاڵەتـدا (فَعَلَيْـهِ قِصَـاصٌ أَوْ دِيَـةٌ) کوشـتنەوەی لەتۆڵـەی سـزادراوەکە، یـان خوێنەکـەی تـەنها لـە سـەر میراتگرەکـە واجـب دەبـێ (أَوْ مَـعَ الشُّـهُودِ) یـان ئەگـەر میراتگـری کوژراوەکـە لەگـەڵ شـاهیدەکان وێکـڕا پەشـیمان بونـەوە، ئـەو کاتـەش (فَكَـذَلِكَ) بـە فەرموودەیڕاسـتتر: کوشتنەوەی لەتۆڵە، یان خوێنەکە-تەنها- لە سەر میراتگرەکە واجب دەبێ، چونکە لە هەردوو مەسەلەدا ئەو ڕاستەوخۆ سـزادراوەکەی کوشـتوە (وَقِيـلَ: هُـوَ وَهُـمْ شُـرَكَاءُ) لـە فەرموودەیەکی بێهێزدا:میراتگرەکەو شاهیدەکان لە کوشتنەکەدا هاوبەشن، واتە: گشتیان لەتۆڵە دەکوشترێنەوە، یان خوێنیان لێوەردەگیرێ.

(وَلَوْ شَهِدا) ئەگەر دوو شاهید شاهیدییان دا لە سـەر کەسـێك (بِطَـلَاقٍ بَـائِنٍ) بـە تـەڵاقێکی (بائن)ی بە خولع، یان سێبەسێ، یان پێش جیماعکردن (أَوْ رَضَاعٍ) یان بە شیرخواردنێکی حەڕامکەر (أَوْ لِعَانٍ) یان بە لەعنەت لێکردن، ئینجا (وَفَرَّقَ الْقَاضِي) بەو شاهیدییە قازی ژنو مێردەکەی لێك جیاکردنەوە (فَرَجَعَا) ئینجا شاهیدەکان لە شاهیدیەکەیان پەشیمان بونەوەو گوتیان: درۆمان کرد. ئەوە (دَامَ الْفِرَاقُ) لێکجیابوونەوەکـەی ژنو مێردەکـە بـە بـەردەوامی جێبەجێدەبێ، بەڵام (وَعَلَيْهِمْ مَهْرُ مِثْلٍ) لە سەر شاهیدەکان واجبە: مارەیی هاوێنەی ژنەکە بدەنە مێردەکەی، هەرچەند جیماعیشی لەگەڵ نەکردبێ، یان ژنەکە گەردەنی ئازاد کردبێ لە مارەییەکەی (وَفِي قَوْلٍ نِصْفُهُ إنْ كَانَ قَبْلَ وَطْءٍ) لە فەرموودەیەکدا: نیوەی مارەییەکە واجب دەبێ ئەگەر جیابوونەوەکە پێش جیماعکردن بێ.

(وَلَوْ شَهِدا بِطَلَاقٍ) ئەگەر دوو شاهیدەکان شاهیدییان دا بە تەڵاقێکی (بائن)، ئینجا (وَفَرَّقَ) قازی ژنو مێردەکەی-بەو شـاهیدیيە- لێك جیاکردنـەوە (فَرَجَعَـا) ئینجـا شـاهیدەکان پەشیمان بونەوەو گوتیان درۆمان کرد (فَقَامَتْ بَيِّنَةٌ أَنَّهُ كَانَ بَيْنَهُمَا رَضَاعٌ) ئینجا بـە دوو شاهید، یان بە بەڵگەیەکیتر ئاشکرا بوو: ژنو مێردەکە شیرخواردنێکی حەڕامکەریان لـە نێوانیاندا بووە، یان پێشتر بە (بائن)ی تەڵاقی داوە، یـان مێردەکـە گـوتی: شـاهیدەکان ڕاست دەکەن. ئـەوە لـەو حاڵەتانـەدا (فَـلاَ غُـرْمَ) هـیچ تۆڵـەی مارییەکـە ناکەوێتـە سـەر شاهیدەکان، چونکە بە شاهیدیەکەی ئەوان ژنەکە لە دەست مێردەکە نەدراوە.

(وَلَوْ رَجَعَ شُهُودُ مَالٍ) ئەگەر شاهیدییان دا بە ماڵێك لە سەر کەسێك، ئینجا بە بڕیاری قازی ماڵەکە لە کەسەکە وەرگیرا، ئینجا شاهیدەکان پەشیمان بونەوەو گوتیـان درۆمـان کـرد،

غَرِمُوا فِـالأَظْهَرِ، وَمَتَى رَجَعُوا كُلُّهُـمْ وُزِّعَ عَلَيْهِمِ الْغُرْمُ، أَوْ بَعْضُـهُمْ وَبَقِيَ نِصَـابٌ فَلاَ غُرْمَ، وَقِيلَ يَغْرَمُ قِسْطَهُ، وَإِنْ نَقَصَ النِّصَابُ وَلَمْ يَزِدِ الشُّهُودُ عَلَيْهِ فَقِسْطٌ، وَإِنْ زَادَ فَقِسْطٌ مِنَ

النِّصَابِ، وَقِيلَ مِنَ الْعَدَدِ، وَإِنْ شَهِدَ رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ فَعَلَيْهِ نِصْفٌ وَهُمَا نِصْفٌ،

ئـەوە (غَرِمُـوا فِـي الأَظْهَـرِ) واجبـە: شـاهیدەكان تۆڵـەی ماڵـە وەرگیراوەكـە بدەنـە لێوەرگیراوەكە، لـە فـەرموودەی بـەهێزتردا، ئینجا (وَمَتَـى رَجَعُوا كُلُّهُـمْ) ئەگـەر هـەموو شاهیدەكان پەشیمان ببنەوە، ئەو كاتە (وُزِّعَ عَلَيْهِمْ الْغُرْمُ) تۆڵەی ماڵە وەرگیراوەكە بـە سەر هەمووانیاندا بەش دەكرێ بە یەكسانی (أَوْ بَعْضُهُمْ) بەڵام ئەگەر هەندێكیان پەشیمان ببنەوەو (وَبَقِيَ نِصَابٌ) ڕادەی پێویستیش لە شاهیدەكان مابێوە: وەك لە سێ شاهیدان تـەنها یـەكێكیان پەشـیمان ببێتـەوە، ئـەو كاتـە (فَـلاَ غُـرْمَ) تۆڵـەی ماڵەكـە لـە سـەر پەشیمانبووەكە نیە، چونكە بەڵگەی لێوەرگرتنەكە بـە تـەواوی ماوەتـەوە (وَقِيـلَ يَغْـرَمُ قِسْطَهُ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بەشە تۆڵەی خۆی دەدا.

جا بزانە: ئەگەر دووزمانێك لە لای ستەمكارێك زمانی لە كەسێك دا، ستەمكارەكەش بە هۆی زمانلێدانەكەی وی هەندێك ماڵی لە كەسەكە ستاند، ئەوە ئەگەر زمان لێدانەكەی بە ناهـەق بێو ستەمكارەكەش بە ماڵخۆری خەڵك ناسراو بێ، ئەو كاتە تۆڵەی ماڵە سـتێندراوەكە لـە سەر زمانلێدەرەكەیە، هەروەك ئیمام (إبن عبدالسلام)و چـەند زانایـەكیتر فەرموویانـەو لـە (بغية المسترشدين)دا گێراویەتیەوە، بەڵام (تحفة)و (نهاية)یە ڕەدیان كردۆتەوە.

(وَإِنْ نَقَصَ النِّصَابُ) ئەگەر لە دوای پەشیمانبوونەوەی هەندێكیان ڕادەی شاهیدەكان كەم بۆوەو (وَلَمْ يَزِدِ الشُّهُودُ عَلَيْهِ) شاهیدەكانیش لە ڕادەی پێویست زیاتر نەبون: وەك تـەنها چوار شاهیدی زینا هەبنو یەكێكیان پەشیمان ببێتەوە، یان دوو شـاهیدی كوشـتنو مـاڵ هەبنو یەكێكیان پەشیمان ببێتەوە، ئەو كاتە (فَقِسْطٌ) بەشە تۆڵە لە سەر پەشیمانبووەكە واجب دەبێ، واتە: لە وێنەیەكەمدا: چوارێك، لە وێنەیدووەمدا: نیوە.

بەڵام (وَإِنْ زَادَ) ئەگەر شاهیدەكان لە ڕادەی پێویست زیاتربن: وەك لە پێنج شاهیدی زینا دووانیان پەشیمان ببنەوە، لە سێ شاهیدی كوشتنو ماڵ دووانیان پەشیمان ببنەوە، ئەو كاتەش (فَقِسْطٌ مِنَ النِّصَابِ) بەشە تۆڵەی بەگوێرەی ڕادەكـە لـە سـەر پەشـیمانبووەكان واجب دەبێ، واتە: لە سەر هەردووكیزینا: چوارێك، لە سەر هەردووكی ماڵ: نیوە (وَقِيلَ مِنَ الْعَدَدِ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: بەگوێرەی ژمارەی شاهیدەكان تۆڵە واجب دەبێ.

(وَإِنْ شَهِدَ رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ) ئەگەر پیاوێكو دوو ئافرەت شاهیدییان دا بە ماڵێك، ماڵەكـەش وەرگیرا، ئینجا هەر سێكیان پەشیمان بونەوە، ئەوە (فَعَلَيْهِ نِصْفٌ وَهُمَا نِصْفٌ) نیـوەی تۆڵەی ماڵەكە لە سەر پیاوەكەیە، نیوەكەیتریش لـە سـەر هـەردوو ئافرەتەكانـە چـونكە هەردووكیان وەك پیاوێكن.

أَوْ وَأَرْبَـعٌ فِـي رَضَـاعٍ فَعَلَيْـهِ ثُلُـثٌ وَهُـنَّ ثُلُثَـانِ، فَـإِنْ رَجَـعَ هُـوَ أَوْ ثِنْتَـانِ

فَــلاَ غُرْمَفِالأَصَــحِّ، وَإِنْ شَــهِدَ هُــوَ وَأَرْبَــعٌ بِمَــالٍ فَقِيــلَ كَرَضَــاعٍ، وَالأَصَــحُّ هُــوَ نِصْــفٌ وَهُــنَّ نِصْــفٌ سَــوَاءٌ رَجَعْــنَ مَعَــهُ أَوْ وَحْــدَهُنَّ، وَإِنْ رَجَــعَ ثِنْتَــانِ فَالأَصَــحُّ لاَ غُرْمَ، وَأَنَّ شُهُودَ إِحْصَانٍ أَوْ صِفَةٍ مَعَ شُهُودِ تَعْلِيقِ طَلاَقٍ أَوْ عِتْقٍ لاَ يَغْرَمُونَ شَيْئًا.

---

(أَوْ وَأَرْبَـعٌ فِـي رَضَـاعٍ) يـان پیاوێـكو چـوار ئـافرەت لـە شـیرخواردنێكدا شـاهیدییان دا، ئینجا هەر پێنجیان پەشیمان بونەوە، ئەوەش (فَعَلَيْهِ ثُلُثٌ وَهُنَّ ثُلُثَانِ) سێیەكی تۆڵە لـە سەر پیاوەكەیەو دوو سێیەكەیتریش لە سەر هەر چوار ئافرەتەكانە، چونكە هەر چواریان وەك دوو پیاوانن، بەڵام (فَإِنْ رَجَعَ هُوَ أَوْ ثِنْتَـانِ) ئەگـەر تـەنها پیاوەكەپەشـیمان بـۆوە، یان تـەنها دوو ئـافرەت پەشـیمان بونـەوە، ئـەو كاتـە (فَـلاَ غُـرْمَ فِيالأَصَحِّ) هـیچ تۆڵـە لە سەر پەشیمانبووەكان نیە، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە بەڵگـەی شـیرخواردنەكە بە تەواوی ماوەتەوە.

(وَإِنْ شَهِدَ هُوَ وَأَرْبَعٌ بِمَالٍ) ئەگەر پیاوێكو چوار ئافرەت شاهیدییان دا بە ماڵێك، ماڵەكەش وەرگیرا، ئینجا هەر پێنجیان پەشیمان بونەوە (فَقِيلَ كَرَضَاعٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: وەكومەسـەلەی شـیرەكەیە: پیاوەكـە سـێیەكی تۆڵـەی لـە سـەرە، بـەڵام (وَالأَصَـحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (هُوَ نِصْفٌ وَهُنَّ نِصْفٌ) پیاوەكە نیوەی تۆڵەی لە سەرەو هەر چوار ئافرەتەكانیش نیوەكەیتریان لە سەرە (سَوَاءٌ رَجَعْنَ مَعَهُ أَوْ وَحْدَهُنَّ) یەكسانەو جیاوازی نیە: ئافرەتەكان لەگەڵ پیاوەكە پەشیمان بوبنەوە، یان بە تـەنها، چـونكە لـە شـاهیدی ماڵیدا پیاوێك–بە تەنها– نیوەیە، بەڵام ئافرەتان هەر چـەند زۆریش بـن هـەر بـە نیـوە دادەندرێن، كەوابو: (وَإِنْ رَجَـعَ ثِنْتَـانِ) ئەگـەر لـەو چـوار ئافرەتانـە دووانیـان پەشـیمان بونەوە، ئەو كاتە (فَالأَصَحُّ لاَ غُرْمَ) بە فەرموودەی ڕاستتر: هیچ تۆڵەی ماڵەكە واجب نابێ، چونكە ڕادەی پێویست بە تەواوی ماوەتەوە.

(وَ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ شُهُودَ إِحْصَـانٍ) ئـەو شـاهیدانەی شـاهیدییان داوە: زیناكەرەكـە (مُحْصَـنَ)ە، ئینجـا لـە دوای بـەردبارانكردنی زیناكەرەكـە لەگـەڵ هەرچـوار شاهیدەكەی زینا، یان بە تەنها پەشیمان بونەوە (أَوْ صِفَةٍ) یان ئەو شاهیدانەی شاهیدییان داوە سیفەتە پێهەڵواسراوەكە هاتۆتە جێ، ئینجا پەشیمان بونەوە (مَعَ شُهُودِ تَعْلِيقِ طَلاَقٍ أَوْ عِتْقٍ) لەگەڵ شاهیدەكانی هەڵواسینی تەڵاق، یان كۆیلە ئازادكردن (لاَ يَغْرَمُونَ شَيْئًا) ئەو شاهیدانە هیچ تۆڵە نادەن، چونكە زیناكەرەكە بـە شـاهیدەكانی زینـا بـەردباران كـراوە، تەڵاقدانو ئازادكردنەكەش بە شاهیدەكانی تەڵاقو ئازادكردنەكە جێبەجێ كراون.

## (كِتَابُ الدَّعْوى وَالْبَيِّنَاتِ)

---

تُشْتَرَطُ الدَّعْوَى عِنْدَ قَاضٍ فِي عُقُوبَةٍ كَقِصَاصٍ وَقَذْفٍ، وَإِنْ اِسْتَحَقَّ عَيْنًا فَلَهُ أَخْذُهَا إنْ لَمْ يَخَفْ فِتْنَةً، وَإِلاَّ وَجَبَ الرَّفْعُ إلَى قَاضٍ،

﴿ كِتَابُ الدَّعْوَى وَالْبَيِّنَاتِ: **پەرتوکی داواکردن و شاهیدەکان** ﴾

**بزانە: هەر کێشەیەك ڕوو بدا لە سەر پێنج شت دەخولێتەوە: داواکردن، وەڵامی داوایەکە، سوێندخواردن، سوێندنەخواردن، شاهید.**

**ئینجا واجبە: کێشەکەش بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام ببڕێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لايَجِدُوا فِىأَنْفُسِهِمْ حَرَجاً مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواتَسْلِيماً﴾ سوێند بە خوای تۆ-ئەی پێغەمبەرﷺ- ئیمانیان تەواو نابێ تا تۆ دەکەنە دادوەر لەو کێشەی لە نێوانیاندا ڕوو دەدا، ئینجا بە دڵیش ڕازی دەبن و هیچ دڵگیرییەکیان نابێ لەو دادەی تۆ کردوتە، هەم بە تەواویش تەسلیمی بڕیارەکەی تۆ دەبن.**

**ئینجا بۆ چۆنیەتی دادکردن پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَوْ يُعْطَالنَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لإدَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوالَهُمْ وَلَكِنْ اَلْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَىعَلَيْهِ﴾رواه الشيخان، والبيهقي بِلَفظ: ﴿اَلْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينُ عَلى مَنْ أَنْكَرَ﴾ ئەگەر خەڵك بە داواکردنی خۆیان بیاندرێتێ، هەندێ کەس داوای خوێن و ماڵی کەسانی تریان دەکرد، بەڵام سوێند لە سەر داوا لێکراوەکەیە، شاهید لە سەر داواکارەکەیە.**

**(تُشْتَرَطُ الدَّعْوَى عِنْدَ قَاضٍ) بە مەرج دادەندرێ داواکردنەکە لە لای قازی بکرێ، یان لە لای کاربەدەستێکی تر کە بە شەریعەتی ئیسلام ڕەفتار بکا (فِى عُقُوبَةٍ) لەو سزایانەدا کە مافی ئادەمیزادن (كَقِصَاصٍ وَقَذْفٍ) وەکو کوشتنی لەتۆڵەو سزای بوختانی زینا.**

**بەڵام ئەگەر شوێنەکە قازیو هیچ کاربەدەستێکی تری لێنەبو، یان تۆڵەی کوژراوەکەیان بۆ وەرنەدەگرت، ئەو کاتە دروستە بە پەنهانی بکوژەکە لەتۆڵە بکوژێتەوە، بەو مەرجەی فیتنە ڕوو نەدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکان و حاشیەکاندا فەرموویانە.**

**(وَإِنْ) ئەگەر مافەکە سزادان نەبو، بەڵکو (اِسْتَحَقَّ عَيْنًا) مافی ماڵێکی دیاربووی هەبوو: بە مڵکایەتی، یان بە کرێ، یان بە هۆیەکی تر، ماڵەکەش بە ناهەق لە ژێر دەستی کەسێکی تردا بوو، ئەو کاتە (فَلَهُ أَخْذُهَا إنْ لَمْ يَخَفْ فِتْنَةً) خاوەن مافەکە بۆی دروستە سەربەخۆ ماڵەکە لە زۆردارەکە بستێنێتەوە، بەو مەرجەی لە فیتنەو زیان لێدان نەترسێ، جیاوازی نیە مافەکە: مافی خۆی بێ، یان مافی شێت و منداڵەکەی خۆی بێ.**

**(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لە فیتنە، یان لە زیانێك دەترسا، ئەو کاتە (وَجَبَ الرَّفْعُ إلَى قَاضٍ) پێویستە کێشەکە بۆ لای قازی، یان بۆ لای کاربەدەستێکی تر بەرز بکاتەوە، تاکو ماڵەکەی بۆ لێوەربگرێتەوە.**

أَوْ دَيْنًا عَلَى غَيْرِ مُمْتَنِعٍ مِنَ الأَدَاءِ طَالَبَهُ بِهِ وَلاَ يَحِلُّ أَخْذُ شَيْءٍ لَهُ، أَوْ عَلَى مُنْكِرٍ

وَلاَ بَيِّنَةَ لَهُ أَخَذَ جِنْسَ حَقِّهِ مِنْ مَالِهِ وَكَذَا غَيْرَ جِنْسِهِ إِنْ فَقَدَهُ عَلَىالْمَذْهَبِ، أَوْ عَلَى مُقِرٍّ مُمْتَنِعٍ أَوْ مُنْكِرٍ وَلَهُ بَيِّنَةٌ فَكَذَلِكَ، وَقِيلَ يَجِبُ الرَّفْعُ إِلَى قَاضٍ، وَإِذَا جَازَ الأَخْذُ فَلَهُ كَسْرُ بَابٍ وَنَقْبُ جِدارٍ لاَ يَصِلُ الْمَالَ إِلاَّ بِهِ، ثُمَّ الْمَأْخُوذُ مِنْ جِنْسِهِ يَتَمَلَّكُهُ وَمِنْ غَيْرِهِ

---

## ﴿ مەسەلەی (اَلظَّفَر)=گەیشتن بە مافیخۆی لە لای كەسێكیتر ﴾

(أَوْ دَيْنًا عَلَى غَيْرِ مُمْتَنِعٍ مِنَ الأَدَاءِ) یان ئەگەر مافەكەی قەرزێك بوو لە سەر كەسێكی وەها كە قەرزەكەی دەداوە، ئەو كاتە (طَالَبَهُ بِهِ) دەبی داوا لە قەرزدارەكە بكا تاكو قەرزەكەی بداتەوە (وَلاَ يَحِلُّ أَخْذُ شَيْءٍ لَهُ) بۆی حەلاڵ نیە هیچ شتێك لەجیاتی قەرزەكەی لە ماڵی قەرزدارەكە ببا، واتە: ئەگەر شتێكی لەجیاتی قەرزەكەی لە ماڵی قەرزدارەكەی برد، ئەوە نابێتە ملكی خۆیو واجبە: بۆ قەرزدارەكەی بیگەڕێنێتەوە، جا ئەگەر شتەكە لە لای وی فەوتا، ئەو كاتە واجبە: تۆڵەی بداتە خاوەنەكەی، هەروەك لە (تحفه)دا فەرموویەتی.

(أَوْ عَلَى مُنْكِرٍ) یان ئەگەر مافەكەی قەرزێك بوو لە سەر كەسێكی وەها كە دەیگوت: قەرزدارت نیم (وَلاَ بَيِّنَةَ لَهُ) هیچ شاهیدێكی قەرزەكەشی نەبو، ئەو كاتە (أَخَذَ جِنْسَ حَقِّهِ مِنْ مَالِهِ) بۆی دروستە: سەر بەخۆ-لەجیاتی قەرزەكەی- ڕەگەزی مافەكەیخۆی لە ماڵی قەرزەدارەكەی ببا (وَكَذَا غَيْرَ جِنْسِهِ) هەروەها بۆی دروستە جگە لە ڕەگەزی مافەكەشی شتێكیتری قەرزدارەكە لەجیاتی قەرزەكەی ببا (إِنْ فَقَدَهُ) ئەگەر ڕەگەزی مافەكەی دەست نەكەوت (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(أَوْ عَلَى مُقِرٍّ مُمْتَنِعٍ) یان ئەگەر قەرزەكەی لە سەر قەرزدارێكی وەها بوو: كە دانی بە قەرزەكەدا هێنا، بەلام گوتی: قەرزەكەت نادەمەوە (أَوْ مُنْكِرٍ وَلَهُ بَيِّنَةٌ) یان دانی پێدا نەهێنا، بەلام خاوەن قەرزەكە شاهیدی لە سەر هەبوو، ئەو كاتەش (فَكَذَلِكَ) بۆی دروستە: سەربەخۆی لەجیاتی قەرزەكەی لە ماڵی قەرزدارەكەی ببا بەو شێوەی ڕابرا، بە بەڵگەی حەدیسەكەیداهاتوو (وَقِيلَ يَجِبُ الرَّفْعُ إِلَى قَاضٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: پێویستە كێشەكەی بۆ لای قازی بەرز بكاتەوە.

(وَإِذَا جَازَ الأَخْذُ) جا هەر كاتێك دروست بێ خاوەن مافەكە-سەربەخۆ- لەجیاتی قەرزەكەی شتێكی قەرزدارەكەی ببا، ئەوە (فَلَهُ كَسْرُ بَابٍ) بۆی دروستە دەرگەی قەرزدارەكە بشكێنێو هەم (وَنَقْبُ جِدَارٍ) دیوارەكەشی كون بكا، ئەگەر (لاَ يَصِلُ الْمَالَ إِلاَّ بِهِ) نەگاتە ماڵی قەرزدارەكە تەنها بەو كردارە نەبێ، كەواتە: نابێتە زامینی شكاندنو كونكردنەكە.

(ثُمَّ الْمَأْخُوذُ مِنْ جِنْسِهِ) ئینجا ئەو ماڵە وەرگیراوەی لە ڕەگەزی مافەكەیخۆیەتی (يَتَمَلَّكُهُ) یەكسەر دەیكاتە ملكیخۆیو دەستكاریی تێدا دەكا، بەلام (وَمِنْ غَيْرِهِ) ئەو ماڵە يَبِيعُهُ، وَقِيلَ يَجِبُ رَفْعُهُ إِلَى قَاضٍ يَبِيعُهُ، وَالْمَأْخُوذُ مَضْمُونٌ عَلَيْهِ فِالأَصَحِّ، فَيَضْمَنُهُ إِنْ

تَلِفَ قَبْلَ تَمَلُّكِهِ وَبَيْعِهِ، وَلاَيَأْخُذُ فَوْقَ حَقِّهِ إِنْ أَمْكَنَهُ الإِقْتِصَارُ، وَلَهُ أَخْذُ مَالِ غَرِيمِ غَرِيمِهِ،

---

وەرگیراوەی کە لە ڕەگەزی مافی‌خۆی نیە (يَبِيعُهُ) بە پارەی شارەکە دەیفرۆشێ، ئینجا ئەگەر مافەکەی پارە بوو، ئەو کاتە پارەی فرۆشراوەکە دەکاتە ملکی خۆی، بەڵام ئەگەر شتێکی‌تر بوو، ئەو کاتە بە پارەی فرۆشراوەکە شتەکە دەکڕێ‌و دەیکاتە ملکی خۆی‌و دەستکاریی تێدا دەکا (وَقِيلَ يَجِبُ رَفْعُهُ إِلَى قَاضٍ يَبِيعُهُ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: پێویستە شتە وەرگیراوەکە بباتە لای قازی تا بیفرۆشێ.

(وَالْمَأْخُوذُ مَضْمُونٌ عَلَيْهِ) ئەو شتەی وەرگیراوە زامینکراوە لە سەر وەرگرەکە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەوابو: (فَيَضْمَنُهُ) وەرگرەکە دەبێتە زامینی شتە وەرگیراوەکە (إِنْ تَلِفَ قَبْلَ تَمَلُّكِهِ وَبَيْعِهِ) ئەگەر بفەوتێ پێش کردنە ملك‌و فرۆشتنی، بەڵام ئەگەر لە دوای فرۆشتنی بفەوتێ، ئەو کاتە دەبێتە زامینی پارەکەی، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەگەر لەجیاتی قەرزەکەی شتێکی قەرزدارەکەی بردو کردیە ملکی خۆی، ئینجا قەرزدارەکە قەرزەکەی بۆ هێناوە، ئەو کاتە بۆ خاوەنەکە دروست نیە هیچی لێ‌وەربگرێ، چونکە خاوەنەکە گەیشتۆتە مافی خۆی، بەڵام ئەگەر لە فیتنەو زیان لێدانێك دەترسا، ئەو کاتە با مافەکەی لێ‌وەربگرێ، ئینجا بە فێڵێکی وەکو بەخشین‌و دیاری بۆ قەرزدارەکەی بیگەڕێنێتەوە، هەروەك لە (القليوبي)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَ) هەروەها (لاَ يَأْخُذُ فَوْقَ حَقِّهِ) نابێ خاوەن مافەکە زیاتر لە مافی‌خۆی لە ماڵی قەرزدارەکە ببا (إِنْ أَمْكَنَهُ الإِقْتِصَارُ) ئەگەر بۆی گونجا تەنها ئەندازەی مافەکەی‌خۆی ببا، بە بەڵگەی ﴿عن عائشةرضالله عنها: أَنَّ اِمْرَأَةَ أَبِيسُفْيَانَ قَالَتْ: إِنَّ أَبَاسُفْيَانَ لاَيُعْطِينِي مَا يَكْفِينِي وَوَلَدِي إِلاَّ مَا أَخَذْتُ مِنْ مَالِهِ بِغَيْرِ عِلْمِهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّﷺ خُذِي مَايَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ﴾ رواه الشيخان، ژنی (أبی‌سفیان) گوتی: (أبوسفیان) بەشی‌خۆم‌و منداڵەکەم بژیوم ناداتێ مەگەر بێ‌ئاگاداری وی لە ماڵی وی بژیوەکە ببەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەشی خۆت‌و منداڵەکەت لە ماڵی (ابی‌سفیان)ببە بەگوێرەی عادەت.

جا ئەگەر نەگونجا تەنها ئەندازەی مافەکەی‌خۆی ببا چونکە شتەکە نرخی زیاتر بوو، ئەو کاتەش دروستە شتەکە بباو ناشبێتە زامین، جا ئەگەر بگونجێ: ئەوە تەنها ئەندازەی مافی خۆی لێ‌دەفرۆشێ، ئەگەرنا: هەمووی دەفرۆشێ‌و ئەندازەی مافی‌خۆی لە پارەکەی وەردەگرێ‌و زیادەکەش بە فێڵێکی وەکو دیاری‌و بەخشین بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێنێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَهُ) بۆخاوەن مافەکە دروستە: (أَخْذُ مَالِ غَرِيمِ غَرِيمِهِ) ماڵی قەرزداری قەرزدارەکە لەجیاتی قەرزەکەی خۆی ببا، بەو مەرجەی دەستی نەگاتە ماڵی قەرزدارەکەی، هەم

وَالأَظْهَــرُ أَنَّ الْمُــدَّعِيَ مَــنْ يُخَــالِفُ قَوْلُــهُ الظَّــاهِرَ، وَالْمُدَّعَىعَلَيْــهِ مَــنْ يُوَافِقُــهُ، فَــإِذَا أَسْــلَمَ زَوْجَــانِ قَبْــلَ وَطْءٍ فَقَــالَ: أَسْــلَمْنَا مَعًــا فَالنِّكَــاحُ بَــاقٍ. وَقَالَــتْ: مُرَتَّبًــا. فَهُــوَ مُــدَّعٍ، وَمَتَــى اِدَّعَــى نَقْــدًا اُشْــتُرِطَ بَيَــانُ جِــنْسٍ وَنَــوْعٍ وَقَــدْرٍ وَصِحَّةٍ وَتَكَسُّرٍ إنْ اِخْتَلَفَتْ بِهِمَا قِيمَةٌ، أَوْ عَيْنًا تَنْضَبِطُ كَحَيَوَانٍ وَصَفَهَا بِصِفَةِ السَّلَمِ،

---

قەزرداریقەزردارەکەش دان بە قەرزەکەدا نـەهێنێ، یـان نەیداتـەوە، هـەم قەزردارەکـەو قەرزداری قەزدارەکەش ئاگادار بکاتـەوە، نـەوەك ئـەویش قەزرەکـەی لـە قەرزدارەکـەی وەربگرێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

## ﴿ پێناسەی داواکارو داوالێکراو ﴾

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّ الْمُـدَّعِيَ مَـنْ يُخَـالِفُ قَوْلُـهُ الظَّـاهِرَ) داواکـار: ئـەو کەسەیە گوتەکەی دژی ئاشکرایی بێ، یان ئەگەر بێدەنگ ببێ وازی لێبهێندرێ.

(وَالْمُدَّعَىعَلَيْهِ مَنْ يُوَافِقُهُ) داوالێکراو: ئەو کەسەیە گوتەکەی لەگەڵ ئاشکرایی ڕێك بکەوێ، یان ئەگەر بێدەنگ ببێ وازی لێنەهێندرێ.

جا بزانە: مەبەست بە ئاشکرایی: ئازادیی ئەستۆی مرۆڤە، واتە: مافەکـەی لـە ئەسـتۆدا نەبێ، بۆ وێنە: ئەگەر نەوزاد بڵێ: (شێرزاد سەد دینار قەرزداری منە). شێرزادیش بڵـێ: (قەرزدارت نیم). ئەوە نەوزاد داواکارە؟ چونکە لە ئاشکراییدا وا دیارە داوایەکەی ڕاست نەبێو شێرزاد قەرزداری وی نەبێ، جا ئەگەر ئەو بـێدەنگ ببـێ، شـێرزاد وازی لێـدێنێ. هەروەها شێرزادیش داوالێکراوە؟ چونکە لە ئاشکراییدا وا دیارە وەڵامەکەی ڕاست بـێو قەرزدار نەبێ، بەڵام ئەگەر بێدەنگ ببێ وازی لێناهێندرێ.

کەوابو (فَإِذَا أَسْلَمَ زَوْجَانِ قَبْلَ وَطْءٍ) ئەگەر ژنو مێردێکی کـافر پـێش جیمـاعکردن بونـە مسولْمان (فَقَالَ: أَسْلَمْنَا مَعًا فَالنِّكَاحُ بَاقٍ) جا مێردەکە گوتی: هـەردووکمان وێکـڕا بوینـە موسوڵمان، بۆیێ مارەبڕینەکەمان لە نێواندا ماوە (وَقَالَتْ: مُرَتَّبًا) ژنەکەش گوتی: یەك لە دوایەك بوینە موسوڵمان، بۆیێ مارەبڕینەکەمان هەڵوەشاوەتەوە، ئەو کاتە (فَهُوَ مُدَّعٍ) مێردەکـە داواکـارە؟ چـونکە موسـوڵمانبوونیان وێکـڕا دژی ئاشـکراییە، ژنەکـەش داوالێکراوە؟ چونکە وەڵامەکەی لەگەڵ ئاشکرایی ڕێك دەکەوێ.

(وَمَتَى ادَّعَى نَقْدًا) هەر کاتێك داواکارەکە داوای پارەیەکی، یان قـەرزێکی لـە کەسـێك کـرد، ئەوە (اُشْتُرِطَ) بۆ دروستبوونی داوایەکە بە مەرج دانراوە (بَيَانُ جِنْسٍ وَنَوْعٍ وَقَدْرٍ) ڕەگـەزو جۆرو ئەندازەی پارەکەو قەرزەکە ڕوون بکاتەوە، هەم (وَصِحَّةٍ وَتَكَسُّرٍ إِنْ اِخْتَلَفَتْ بِهِمَا قِيمَةٌ) وردیو درشتیی پارەکەش ڕوون بکاتەوە ئەگەر نرخی وردەکەو درشتەکە جیاواز بێ.

(أَوْ عَيْنًا تَنْضَبِطُ) یان ئەگەر داوای شتێکیکرد کە بە سیفەتەکانی دیاری دەکرا (كَحَيَوَانٍ) وەکو ئاژەڵو دانەوێڵەو جلو بەرگ، ئەوە (وَصَفَهَا بِصِفَةِ السَّلَمِ) واجبە: بـە سـیفەتەکانی

وَقِيلَ: يَجِبُ مَعَهَا ذِكْرُ الْقِيمَةِ، فَإِنْ تَلِفَتْ وَهِيَ مُتَقَوِّمَةٌ وَجَبَ ذِكْرُ الْقِيمَةِ، أَوْ نِكَاحًا لَمْ يَكْفِ الإِطْلاَقُ عَلَىالأَصَحِّ بَلْ يَقُولُ: نَكَحْتُهَا بِوَلِيٍّ مُرْشِدٍ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ وَرِضَاهَا إنْ كَانَ يُشْتَرَطُ، فَإِنْ كَانَتْ أَمَةً فَالأَصَحُّ وُجُوبُ ذِكْرِ الْعَجْزِ عَنْ طَوْلٍ وَخَوْفِ عَنَتٍ، أَوْ عَقْدًا مَالِيًّا كَبَيْعٍ وَهِبَةٍ كَفَى الإِطْلاَقُ فِي الأَصَحِّ، وَمَنْ قَامَتْ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَيْسَ لَهُ تَحْلِيفُ الْمُدَّعِي،

---

سەلەم ڕوونی بکاتەوە (وَقِيلَ: يَجِبُ مَعَهَا ذِكْرُ الْقِيمَةِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: واجبە لەگەڵ سیفەتەکانی نرخەکەشی بڵێ.

(فَإِنْ تَلِفَتْ وَهِيَ مُتَقَوِّمَةٌ) جا ئەگەر شتە دیارکراوەکە فەوتابێو دەشقرسێندرا، ئەو کاتەش (وَجَبَ ذِكْرُ الْقِيمَةِ) واجبە نرخەکەی بڵێ: وەك مەڕێکی منی بردووەو فەوتاندویەتیو نرخەکەشی سەد دینارە. بەڵام ئەگەر شتە فەوتاوەکە هاوێنە بوو: وەکو دانەوێڵە، ئەو کاتە واجبە سیفەتەکانی بگوترێن.

(أَوْ نِكَاحًا) یان ئەگەر داوای مارەبڕینی ژنێکی کرد، ئەوە (لَمْ يَكْفِ الإِطْلاَقُ عَلَىالأَصَحِّ) ئەوەندە بەس نیە بڵێ: مارەم کردوە (بَلْ يَقُولُ: نَكَحْتُهَا بِوَلِيٍّ مُرْشِدٍ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ) بەڵکو دەبێ بڵێ: بە سەرپەرشتکارێکی دادپەروەرو دوو شاهیدی دادپەروەر مارەم بڕیوە. هەم بڵێ: (وَرِضَاهَا) بە ڕەزامەندی ژنەکەش (إنْ كَانَ يُشْتَرَطُ) ئەگەر ڕازیبوونەکەی بە مەرج دابندرێ: وەك بێوەژن بێ، یان برایو مامی مارەیان کردبێ.

بەڵام ئەگەر داوای مارەبڕین نەکاو تەنها بڵێ: ئەم ئافرەتە ژنیمنە. ئەو کاتە پێویستی بەو درێژەپێدانە نیە، هەروك لە (حاشيه عميرة)دا فەرموویەتی (فَإِنْ كَانَتْ أَمَةً) جا ئەگەر ژنەکەی (جاريه) بوو، ئەو کاتە (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (وُجُوبُ ذِكْرِ الْعَجْزِ عَنْ طَوْلٍ وَخَوْفِ عَنَتٍ) واجبە بڵێ: توانای مارەیی ئافرەتی ئازادم نەبو و لە زیناش دەترسام، بۆیێ (جاريه)م مارە کردوە.

(أَوْ عَقْدًا مَالِيًّا) یان ئەگەر داوای مامڵەتبەستنێکی ماڵی کرد: (كَبَيْعٍ وَهِبَةٍ) وەك فرۆشتنو بەخشین، ئەو کاتە (كَفَىالإِطْلاَقُ) ئەوەندە بەسە–بێدرێژەپێدان– بڵێ: ئەو شتەم فرۆشتۆتە فلانکەس. یان فلانکەس بە منی بەخشیوە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا.

(وَمَنْ قَامَتْ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ) هەر داوالێکراوێك شاهید شاهیدیی لە سەر بدەن بە مافێکی داواکارەکە، ئەوە (فَلَيْسَ لَهُ تَحْلِيفُ الْمُدَّعِي) بۆی دروست نیە داواکارەکە سوێند بدا: کە مافی ئەو داواکراوەی هەیە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِنُ عَلى مَنْ أَنْكَرَ﴾ رواه البيهقي وغيره باسناد صحيح، شاهید لە سەر داواکارەکەیە، سوێند لە سەر داوالێکراوەکەیە. کەوابو: سوێنددانەکەی دەبێتە داوالێکردنی بەڵگەیەك لە دوای بەڵگەیەکیتر.

فَـإِنْ اِدَّعَـى أَدَاءً أَوْ إِبْـرَاءً أَوْ شِـرَاءَ عَـيْنٍ أَوْ هِبَتَهَـا وَإِقْبَاضَـهَا حَلَّفَـهُ عَلَـى نَفْيِـهِ، وَكَـذَا لَـوْ إِدَّعَـى عِلْمَـهُ بِفِسْـقِ شَـاهِدِهِ أَوْ كَذِبِـهِ فِالأَصَـحِّ، وَإِذَا إِسْـتَمْهَلَ لِيَـأْتِيَ بِـدَافِعٍ أُمْهِـلَ ثَلاَثَـةَ أَيَّـامٍ، وَلَـوْ اِدَّعَـى رِقَّ بَـالِغٍ فَقَـالَ: أَنَـا حُـرٌّ فَـالْقَوْلُ قَوْلُـهُ، أَوْ رِقَّ صَـغِيرٍ لَـيْسَ فِـي يَـدِهِ لَـمْ يُقْبَـلْ إلاَّ بِبَيِّنَـةٍ، أَوْ فِـي يَـدِهِ حُكِـمَ لَـهُ بِـهِ إِنْ لَمْ يَعْرِفْ اِسْتِنَادَهَا إِلَى اِلْتِقَاطٍ، فَلَوْ أَنْكَرَ الصَّغِيرُ وَهُوَ مُمَيِّزٌ فَإِنْكَارُهُ لَغْوٌ، وَقِيلَ كَبَالِغٍ،

---

بەڵام (فَإِنْ ادَّعَى أَدَاءً) ئەگەر داوالێكراوەكە-لە دوای شاهیدیدانەكە- داوای كردو گوتی: ماڵەكەم داوەتەوە داواكارەكە (أَوْ إِبْرَاءً) یان گوتی داواكارەكە گەردەنی ئازاد كـردوم (أَوْ شِرَاءَ عَيْنٍ) یان گوتی شتەكەم لـە داواكارەكـە كڕیـوە (أَوْ هِبَتَهَا وَإِقْبَاضَهَا) یـان گـوتی: داواكارەكە شتەكەی بەخشیوەتە منو لێم وەرگرتوە. ئەوە لەو مەسـەلانەدا (حَلَّفَهُ عَلَى نَفْيِهِ) بۆ داوالێكراوەكە دروستە داواكارەكە سوێند بدا لە سەر وەنەبوونی ئـەو كردارانـە، هەرچەند شاهیدەكانیش شاهیدییان دابێ: شتەكە مافی داواكارەكەیە، چونكە دەگونجـێ داوالێكراوەكەش ڕاست بكا.

(وَكَذَا لَوْ إِدَّعَى عِلْمَهُ بِفِسْقِ شَاهِدِهِ أَوْ كَذِبِهِ) هەروەها ئەگەر داوالێكراوەكە داوا بكاو بڵـێ: داواكارەكە دەزانێ شاهیدەكانی فاسقن، یان درۆ دەكەن، یان هەر ڕەدكەرەوەیـەكی‌تری شاهیدی، ئەو كاتەش بۆی دروستە داواكارەكـە سـوێندبدا لـە سـەر فاسـق نـەبوونو درۆ نەكردنی شاهیدەكان (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی‌ڕاستتردا.

(وَإِذَا إِسْتَمْهَلَ لِيَأْتِيَ بِدَافِعٍ) هـەر كاتێـك-لـە دوای شـاهیدیدانەكە- داوالێكراوەكـە داوای مۆڵەتی كرد تاكو ڕەدكەرەوەیەكی شاهیدیەكە بێنێ، ئەوە (أُمْهِلَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ) تـا مـاوەی سێ ڕۆژان مۆڵەتی دەدرێتێ، بەڵام ئەگەر ترسی هەڵاتنی لێبكرێ، ئەو كاتە كەفیلێك، یان چاودێرێكی لە سەر دادەندرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرمویانە.

(وَلَوْ ادَّعَى رِقَّ بَالِغٍ) ئەگەر كەسێك داوای كرد: ئەم مرۆڤە بالغو عاقڵە كۆیلەی منە (فَقَالَ أَنَا حُرٌّ) مرۆڤەكەش گوتی: من ئازادم. ئەوە (فَالْقَوْلُ قَوْلُهُ) گوتەی باوەڕپێكراو بە سوێندخواردن قسەی مرۆڤەكەیە (أَوْ رِقَّ صَغِيرٍ لَيْسَ فِي يَدِهِ) یان داوای كۆیلایەتی منداڵێكی نەبالغی كـرد كە لە دەستی داواكارەكەدا نەبێ، ئەو كاتە (لَمْ يُقْبَلْ إلاَّ بِبَيِّنَةٍ) بە بێ‌شاهید داوایەكەی قبوڵ ناكرێ (أَوْ فِي يَدِهِ) بەڵام ئەگەر كۆیلەكە لە دەستی داواكارەكەدا بێ، ئەو كاتە (حُكِمَ لَهُ بِهِ) سوێند دەدرێو بڕیاری كۆیلەكەی بۆدەدرێ كە ملكی خۆیەتی (إِنْ لَمْ يَعْرِفْ اِسْتِنَادَهَا إِلَى الْتِقَاطٍ) ئەگەر نەزاندرابێ بە پشت پێبەستنی دۆزینەوە دەستی بە سەردا گرتوە (فَلَوْ أَنْكَرَ الصَّغِيرُ وَهُوَ مُمَيِّزٌ) جا ئەگەر كۆیلە منداڵەكە فامیـدە بـوبێو بڵـێ: مـن كۆیلـە نـیم. ئـەوە (فَإِنْكَارُهُ لَغْوٌ) ئینكاریكردنەكەی پوچەڵەو كاری پێناكرێ (وَقِيلَ كَبَالِغٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: وەكو مرۆڤی بالغ بە بێ شاهید نابێتە كۆیلە.

وَلاَ تُسْـــــــمَعُ دَعْـــــــوَى دَيْـــــــنٍ مُؤَجَّـــــــلٍ فِالأَصَـــــــحِّ.
(فَصْـــــلٌ) أَصَـــرَّ الْمُدَّعَىعَلَيْـــهِ عَلَـــى السُّـــكُوتِ عَـــنْ جَـــوَابِ الدَّعْوَى جُعِلَ كَمُنْكِرٍ نَاكِلٍ، فَإِنْ ادَّعَى عَشَرَةً فَقَالَ لاَ تَلْزَمُنِي الْعَشَرَةُ لَمْ يَكْفِ

---

(وَلاَ تُسْمَعُ دَعْوَى دَيْنٍ مُؤَجَّلٍ) گوێ نادرێته داواكردنیقەرزێك كه كاتیدانەوەی نەهاتبێ (فِي الأَصَحِّ) له فەرموودەیڕاستتردا، چونكه ناتوانێ ئێستا داوای قەرزەكه له قەرزدارەكەی بكا.

**﴿ فَصْلٌ: له باسی وەڵامدانەوەی داوالێكراو ﴾**

بزانه: كه پێغەمبەرﷺ ئیمامی (علی)ی كرده قازی، پێی فەرموو: ﴿إذا تَقَاضَى إِلَيْكَ رَجُلاَنِ فَلاَ تَقْضِ لِلأَوَّلِ حَتَّى تَسْمَعَ كَلاَمَ الآخَرِ، فَسَوْفَ تَدْرِى كَيْفَ تَقْضِى﴾ رواه أحمد وحسنه الترمذي، هەر كاتێك دوو كەس بۆ دادكردن هاتنه لای تۆ، بڕیار بۆ یەكەمەكه مەدە تا قسەی دووەمەكەش دەبیسی، چونكه ئەوها باشتر دەزانی چۆن داد له نێوانیاندا بكەی.
كەوابو: هەر كاتێك داواكارەكه داوایەكەی كرد، قازی فەرمان دەدا: داوالێكراوەكه وەڵامی داوایەكه بداتەوە، جا ئەگەر–له وەڵامەكەیدا– داوالێكراوەكه دانی به مافی داواكارەكەدا هێنا، ئەوە مافەكه ئاشكرا دەبێو كێشەكه دەبڕێتەوە، بەڵام ئەگەر دانی پێدا نەهێنا، ئەو كاته قازی داوای شاهیدهێنان له داوكارەكه دەكا، جا ئەگەر داواكارەكه شاهیدی هێنا، ئەوە قازی بڕیاری مافەكەی بۆ دەدا، بەڵام ئەگەر شاهیدی نەهێنا، ئەو كاته سوێندخواردن له سەر داوالێكراوەكەیە: كه ئەو مافەی له سەر نیە، به بەڵگەی حەدیسەكەی ﴿اَلْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ﴾یڕابردوو، واته: شاهیدهێنان له سەر داواكارەكەیەو سوێندخواردن له سەر داوالێكراوەكەیە.
جا ئەگەر داوالێكراوەكه دانی نەهێناو سوێندیشی نەخوارد، ئەو كاته سوێندەكه دەگەڕێندرێتەوە سەر داواكارەكه، جا ئەگەر داواكارەكه سوێندی گەڕاندراوەی خوارد، ئەو كاته مافەكەی دەدرێتێ.
وەهەروەها ئەگەر (أَصَرَّ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ) داوالێكراوەكه سووڕ بوو (عَلَى السُّكُوتِ عَنْ جَوَابِ الدَّعْوَى) له سەر بێدەنگبوون له وەڵامدانەوەی داوایەكه، واته: هەر وەڵامی داوایەكەی نەداوە، ئەو كاتەش (جُعِلَ كَمُنْكِرٍ نَاكِلٍ) داوالێكراوەكه وەك داننەهێنەری سوێندنەخۆر دادەندرێ، واته: بەو بێدەنگبوونه قازی بڕیار دەدا: ئەم داوالێكراوە دان ناهێنێ به مافی داواكارەكەو سوێندیش ناخوا. كەوابو: سوێندەكه دەگەڕێندرێتەوە سەر داواكارەكه، جا ئەگەر داواكارەكه سوێنده گەڕاندراوەكەی خوارد، ئەو كاته مافەكەی دەدرێتێ، هەروەك له (فصل)یداهاتوودا درێژتر ڕوونی دەكەینەوە،إن شاء الله تعالى.
(فَإِنْ ادَّعَى عَشَرَةً) جا ئەگەر داواكارەكه داوای ده دیناری له داوالێكراوەكه كرد (فَقَالَ: لاَ تَلْزَمُنِي الْعَشَرَةُ) داوالێكراوەكەش گوتی: دەدینارەكەت له سەرم نیه. (لَمْ يَكْفِ) ئەم وەڵامە

حَتَّى يَقُولَ وَلاَ بَعْضَهَا، وَكَذَا يَحْلِفُ، فَإِنْ حَلَفَ عَلَى نَفْيِ الْعَشَرَةِ وَاقْتَصَرَ عَلَيْهِ فَنَاكِلٌ فَيَحْلِفُ الْمُدَّعِي عَلَى اِسْتِحْقَاقِ دُونَ الْعَشَرَةِ بِجُزْءٍ وَيَأْخُذُهُ، وَإِذَا اِدَّعَى مَالاً مُضافًا إِلَى سَبَبٍ كَأَقْرَضْتُكَ كَذَا كَفَاهُ فِالْجَوَابِ لاَ تَسْتَحِقُّ عَلَيَّ شَيْئًا، أَوْ شُفْعَةً كَفَاهُ لاَ تَسْتَحِقُّ عَلَيَّ شَيْئًا، أَوْ لاَ تَسْتَحِقُّ تَسْلِيمَ الشِّقْصِ، وَيَحْلِفُ عَلَى حَسَبِ جوابِهِ هَذَا، فَإِنْ أَجابَ بِنَفْيِ السَّبَبِ الْمَذْكُورِ حَلَفَ عَلَيْهِ،

---

بەس نیە (حَتَّى يَقُولَ وَلاَ بَعْضُهَا) تا دەڵێ: بەشێكی دەدینارەكەشت لە سەرم نیە (وَكَذَا يَحْلِفُ) هەر ئەوهاش داوالێكراوەكە سوێند دەخواو دەڵێ: والله نە دە دینارەكەتو نە بەشێكی دە دینارەكەت لە سەر من نیە. كەوابو: (فَإِنْ حَلَفَ عَلَى نَفْيِ الْعَشَرَةِ وَاقْتَصَرَ عَلَيْهِ) ئەگەر داوالێكراوەكە سوێندی–تەنها– لە سەر نەبوونی دەدینارەكە خواردو بەشەكەشی نەگوت، ئەو كاتە (فَنَاكِلٌ) داوالێكراوەكە سوێندنەخۆرە لە بارەی كەمتر لە دە دینارەكە، كەواتە: سوێندەكە دەگەڕێندرێتەوە سەر داواكارەكە، ئینجا (فَيَحْلِفُ الْمُدَّعِي عَلَى اِسْتِحْقَاقِ دُونَ الْعَشَرَةِ بِجُزْءٍ) داواكارەكە سوێند دەخوا لە سەر هەبوونی مافی كەمتر لە دە دینارەكە بە بەشێكو (وَيَأْخُذُهُ) لە دە دینار كەمتر لە داوا لێكراوەكە وەردەگرێ.

جا بزانە: ئەگەر داوالێكراوەكە گوتی: هیچماڵێكی داواكارەكەم لە سەر نیەو سوێندیش ناخۆمو–بێسوێندخواردن– ماڵەكە دەدەم. یان گوتی: من سوێند ناخۆمو با داواكارەكەش سوێندی گەڕاندراوە نەخوا–بێسوێندخواردن– ماڵەكە دەدەم. ئەوە لەو حاڵەتانەدا واجب نیە داواكارەكە ماڵەكەی لێقبوڵ بكا تا دانی پێدا دێنێ، واتە: ئەگەر دانی پێدا نەهێنا، ئەو كاتەش بۆ داواكارەكە دروستە سوێندی بدا–نەوەك لە مەودوا داوای ماڵەكەی لێبكاتەوە– جا ئەگەر سوێندی نەخوارد، ئەو كاتە داواكارەكە سوێندی گەڕاندراوە دەخوا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرمویانە.

(وَإِذَا ادَّعَى مَالاً مُضَافًا إِلَى سَبَبٍ) هەر كاتێك داواكارەكە داوای ماڵێكی كردو هۆیەكەشی باس كرد: (كَأَقْرَضْتُكَ كَذَا) وەك بڵێ: ئەوەندەماڵەم بە قەرز داوەتە تۆ. ئەوە (كَفَاهُ فِي الْجَوَابِ) لە وەڵامدانەوەكەیدا ئەوەندە بەسە داوالێكراوەكە بڵێ: (لاَ تَسْتَحِقُّ عَلَيَّ شَيْئًا) تۆ مافی هیچ شتێكت لە سەر من نیە.

(أَوْ شُفْعَةً) یان ئەگەر داوای شوفعەی لێكرد، ئەوە (كَفَاهُ لاَ تَسْتَحِقُّ عَلَيَّ شَيْئًا) ئەوەندە بەسە بڵێ: مافی هیچ شتێكت لە سەر من نیە (أَوْ) یان بڵێ: (لاَ تَسْتَحِقُّ تَسْلِيمَ الشِّقْصِ) مافت نیە بەشەكەت تەسلیم بكەم. ئینجا (وَيَحْلِفُ عَلَى حَسَبِ جَوَابِهِ هَذَا) داوالێكراوەكە بەگوێرەی ئەم وەڵامەی سوێند دەخوا تاكو سوێندەكەیو وەڵامەكەی تێك بكەنەوە، كەوابو: (فَإِنْ أَجَابَ بِنَفْيِ السَّبَبِ الْمَذْكُورِ) ئەگەر داوالێكراوەكە بە نەبوونی هۆیەكەی باسكراو وەڵامی داوە: وەك (ئەو شتەت بە قەرز نەداومێ). ئەو كاتە (حَلَفَ عَلَيْهِ) لە سەر

وَقِيلَ لَهُ الْحَلِفُ بِالنَّفْيِ الْمُطْلَقِ، وَلَوْ كَانَ بِيَدِهِ مَرْهُونٌ أَوْ مُكْرًى وَادَّعَاهُ مَالِكُهُ كَفَاهُ لاَ يَلْزَمُنِي تَسْلِيمُهُ، فَلَوْ اعْتَرَفَ بِالْمِلْكِ وَادَّعَى الرَّهْنَ وَالإِجَارَةَ فَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لاَ يُقْبَلُ إلاَّ بِبَيِّنَةٍ، فَإِنْ عَجَزَ عَنْهَا وَخَافَ أَوَّلاً إنْ اعْتَرَفَ بِالْمِلْكِ جَحْدَهُ الرَّهْنَ وَالإِجَارَةَ فَحِيلَتُهُ أَنْ يَقُولَ: إن ادَّعَيْت مِلْكًا مُطْلَقًا فَلاَ يَلْزَمُنِي تَسْلِيمٌ وَإِنْ ادَّعَيْت مَرْهُونًا فَاذْكُرْهُ لأُجِيبَ. وَإِذَا ادَّعَى عَلَيْهِ عَيْنًا فَقَالَ: لَيْسَ هِيَ لِي، أَوْ هِيَ لِرَجُلٍ لاَ أَعْرِفُهُ، أَوْ هِيَ لإِبْنِيالطِّفْلِ، أَوْ وَقْفٌ عَلَىالْفُقَرَاءِ أَوْ مَسْجِدِ كَذَا، فَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ تَنْصَرِفُ الْخُصُومَةُ وَلاَ تُنْزَعُ مِنْهُ، بَلْ يُحَلِّفُهُ الْمُدَّعِي أَنَّهُ لاَ يَلْزَمُهُ التَّسْلِيمُ

---

نەبوونی هۆیەکە سوێند دەخوا: وەك والله ئەو شتەت بە قەرز نەداومێ (وَقِيلَ لَهُ الْحَلِفُ بِالنَّفْيِ الْمُطْلَقِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بۆی دروستە لە سەر نەبوونێکی ڕووت سوێند بخوا بڵێ: والله مافی هیچ شتێکت لە سەر من نیە.

(وَلَوْ كَانَ بِيَدِهِ مَرْهُونٌ أَوْ مُكْرًى) ئەگەر داوالێکراوەکە ڕەهنکراوێك، یان بەکرێدراوێکی لە دەستدا بوو (وَادَّعَاهُ مَالِكُهُ) خاوەنەکەش داوای ڕەهنکراوەکەی، یان بەکرێدراوەکەی لێکرد، ئەوە (كَفَاهُ لاَ يَلْزَمُنِي تَسْلِيمُهُ) لە وەڵامەکەیدا ئەوەندە بەسە بڵێ: لە سەرم نیە تەسلیمت بکەم (فَلَوْ اعْتَرَفَ بِالْمِلْكِ وَادَّعَىالرَّهْنَ وَالإِجَارَةَ) جا ئەگەر داوالێکراوەکە دانی هێنا بە مڵکایەتی بۆ خاوەنەکەیان، بەڵام گوتی: لە لای من ڕەهن کراوە. یان بە کرێم گرتوە. ئەوە (فَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لاَ يُقْبَلُ إلاَّ بِبَيِّنَةٍ) بە فەرموودەی ڕاست: بە بێشاهید داوایەکەی ڕەهنو بەکرێگرتنی لێقبوڵ ناکرێ (فَإِنْ عَجَزَ عَنْهَا) جا ئەگەر داوالێکراوەکە توانای شاهید هێنانی نەبو و (وَخَافَ أَوَّلاً–إنْ اعْتَرَفَ بِالْمِلْكِ– جَحْدَهُ الرَّهْنَ وَالإِجَارَةَ) هەر لە سەرەتاوەش لەوە ترسا–ئەگەر بۆ خاوەنەکەی دان بێنێ بە مڵکایەتی– خاوەنەکە دان بە ڕەهنو بەکرێگرتنەکەدا نەهێنێ (فَحِيلَتُهُ أَنْ يَقُولَ) چارەی داوالێکراوەکە ئەوەیە بە داواکارەکە بڵێ: (إن ادَّعَيْت مِلْكًا مُطْلَقًا فَلاَ يَلْزَمُنِي تَسْلِيمٌ) ئەگەر تۆ داوای مڵکێکی بەرهەڵدراوم لێدەکەی، ئەوە لە سەرم نیە تەسلیمت بکەم (وَإِنْ ادَّعَيْتَ مَرْهُونًا فَاذْكُرْهُ لأُجِيبَ) وەئەگەر داوای ڕەهنکراوێك، یان بەکرێدراوێکم لێدەکەی، بیڵێ تا وەڵامت بدەمەوە.

(وَإِذَا ادَّعَى عَلَيْهِ عَيْنًا) ئەگەر داواکارەکە داوای شتێکی دیارکراوی لە داوالێکراوەکە کرد (فَقَالَ لَيْسَ هِيَ لِي) داوالێکراوەکەش لە وەڵامدا گوتی:ئەو شتە هی من نیە (أَوْ) یان گوتی (هِيَ لِرَجُلٍ لاَ أَعْرِفُهُ) شتەکە هی پیاوێکە من نایناسم (أَوْ) یان گوتی (هِيَ لإِبْنِيالطِّفْلِ) شتەکە هی کوڕەمنداڵەکەمە (أَوْ) یان گوتی (وَقْفٌ عَلَىالْفُقَرَاءِ أَوْ مَسْجِدِ كَذَا) شتەکە وەقفی سەر هەژارانە، یان وەقفی سەر فڵانە مزگەوتەیە. ئەوە (فَالأَصَحُّ) بە فەرمودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَ تَنْصَرِفُ الْخُصُومَةُ وَلاَ تُنْزَعُ مِنْهُ) کێشەکە لە داوالێکراوەکە لاناکەوێو شتەکەشی

لیَناستیَندریَ (بَلْ يُحَلِّفُهُ الْمُدَّعِي: أَنَّهُ لاَ يَلْزَمُهُ التَّسْلِيمُ) بەلَكو بۆ داواكارەكە هەیە سویَندی
إِنْ لَـمْ تَكُـنْ بَيِّنَـةٌ، وَإِنْ أَقَـرَّ بِـهِ لِمُعَـيَّنٍ حَاضِـرٍ يُمْكِـنُ مُخَاصَـمَتُهُ وَتَحْلِيفُـهُ سُـئِلَ؟
فَـإِنْ صَـدَّقَهُ صَـارَتِ الْخُصُـومَةُ مَعَـهُ، وَإِنْ كَذَّبَـهُ تُـرِكَ فِـي يَـدِالْمُقِرِّ، وَقِيـلَ:
تُسَـلَّمُ إِلَـى يَدِالْمُـدَّعِي، وَقِيـلَ يَحْفَظُـهُ الْحَـاكِمُ لِظُهُـورِ مَالِـكٍ،
وَإِنْ أَقَرَّ بِهِ لِغَائِبٍ فَالأَصَحُّ اِنْصِرَافُ الْخُصُومَةِ عَنْهُ وَيُوقَفُ الأَمْرُ حَتَّى يَقْدَمَ الْغَائِبُ،

---

بدا: كە لە سەری نیە ئەو شتەی تەسلیم بكا—(إِنْ لَمْ تَكُنْ بَيِّنَةٌ) ئەگەر داواكارەكە شاهیدی نەبێ— بەلَگی داوالیَكراوەكە دان بهیَنیَ، یان سویَند نەخواو داواكارەكە سویَندی گەڕاندراوە بخواو شتەكەی لیَوەربگریَ.

بەلاَم (وَإِنْ أَقَرَّ بِهِ لِمُعَيَّنٍ حَاضِرٍ) ئەگەر داوالیَكراوەكە دانی هیَنا: شتە داواكراوەكە ملَكی كەسیَكیَتری حازرو دیاركراوەو (يُمْكِنُ مُخَاصَمَتُهُ وَتَحْلِيفُهُ) دەشگونجا كەسەكە كیَشەی لەگەلَ بكریَو سویَند بدریَ—وەك بالغو عاقلَ بیَ— ئەوە (سُئِلَ) پرسیار لە كەسەكە دەكریَ (فَإِنْ صَدَّقَهُ) جا ئەگەر كەسەكە گوتی: داوالیَكراوەكە ڕاست دەكاو شتەكە هی منە. ئەو كاتە (صَارَتِ الْخُصُومَةُ مَعَهُ) كیَشەكەی دەكەویَتە گەلَ كەسەكەو لە داوالیَكراوەكە لادەكەویَ.

بەلاَم (وَإِنْ كَذَّبَهُ) ئەگەر كەسەكە گوتی: داوالیَكراوەكە درۆ دەكا: شتەكە هی من نیە. ئەو كاتە (تُرِكَ فِي يَدِالْمُقِرِّ) شتەكە هەر لە دەستی دانهیَنەرەكەدا دەهیَلَدریَتەوەو كیَشەكەشی لیَلاناكەویَ، كەواتە: داواكارەكە شاهید دیَنیَ، یان داوالیَكراوەكە سویَند دەدا (وَقِيلَ تُسَلَّمُ إِلَى يَدِالْمُدَّعِي) لە فەرموودەیەكی بیَهیَزدا: شتەكە تەسلیمی داواكارەكە دەكریَ (وَقِيلَ يَحْفَظُهُ الْحَاكِمُ لِظُهُورِ مَالِكٍ) لە فەرموودەیەكیَتری بیَهیَزدا: دادوەر شتەكە دەپاریَزیَ تا خاوەنیَكی دەردەكەویَ.

(وَإِنْ أَقَرَّ بِهِ لِغَائِبٍ) ئەگەر داوالیَكراوەكە دانی هیَنا: شتەداواكراوەكە ملَكی كەسیَكیَتری نادیارەو لە شویَنیَكیَترە، ئەوە (فَالأَصَحُّ: انْصِرَافُ الْخُصُومَةِ عَنْهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر: كیَشەكە لە داوا لیَكراوەكە لادەكەویَو (وَيُوقَفُ الأَمْرُ حَتَّى يَقْدَمَ الْغَائِبُ) كارەكەش ڕادەگیریَ—ئەگەر شاهید نەبێ— تا نادیارەكە دیَتەوەو پرسیاری لیَدەكریَ، جا ئەگەر گوتی: داوالیَكراوەكە ڕاست دەكا. ئەو كاتە شتەكەی لیَوەردەگیریَ بۆ نادیارەكەو كیَشەكەش دەكەویَتە گەلَ نادیارەكە.

جا لەگەلَ ئەوەشدا—ئەگەر شاهید نەبێ— بۆ داواكارەكە دروستە: داوالیَكراوەكە سویَند بدا: كە لە سەری نیە شتەكەی تەسلیم بكا. جا ئەگەر سویَندی نەخوارد، ئەو كاتە داواكارەكە سویَندی گەڕاندراوە دەخواو شتەكەی لیَدەستیَنیَ، ئینجا هەر كاتیَك نادیارەكە هاتەوە، سەر لەبنیات كیَشەیەكیَتر لەگەلَ وی دەست پیَدەكاتەوە، هەروەك لە (مغنی )و

(الشروانى)دا ڕوون کراوەتەوە.

فَإِنْ كَانَ لِلْمُدَّعِي بَيِّنَةٌ قَضَى بِهَا، وَهُوَ قَضَاءٌ عَلَى الْغَائِبِ فَيَحْلِفُ مَعَهَا، وَقِيلَ عَلَى حَاضِرٍ، وَمَا قُبِلَ إِقْرَارُ عَبْدٍ بِهِ كَعُقُوبَةٍ فَالدَّعْوَى عَلَيْهِ وَعَلَيْهِ الْجَوَابُ، وَمَا لاَ: كَأَرْشٍ فَعَلَى السَّيِّدِ.

(فَصْلٌ) تُغَلَّظُ يَمِينُ مُدَّعٍ وَمُدَّعًىعَلَيْهِ فِيمَا لَيْسَ بِمَالٍ وَلاَ يُقْصَدُ بِهِ مَالٌ وَفِي مَالٍ يَبْلُغُ نِصَابَ زَكَاةٍ، وَسَبَقَ بَيَانُ التَّغْلِيظِ فِي اللِّعَانِ، وَيَحْلِفُ عَلَى الْبَتِّ فِي فِعْلِهِ،

---

**گوتمان:** ئەوەیڕابردوو لە حاڵەتێکدا بوو: هیچ شاهید نەبن، بەڵام (فَإِنْ كَانَ لِلْمُدَّعِي بَيِّنَةٌ) ئەگەر داواکارەکە شاهیدی هەبێ، ئەو کاتە (قَضَى بِهَا) بەو شاهیدییە قازی بڕیاری شتەکەی بۆ دەداو تەسلیمی دەکرێ (وَهُوَ قَضَاءٌ عَلَىالْغَائِبِ) ئەو بڕیاردانە بڕیاردانێکە لە سەر داوالێکراوێکی نادیار، کەوابو: (فَيَحْلِفُ مَعَهَا) داوا کارەکە لەگەڵ ئەو شاهیدییە سوێندی بەهێزکردن دەخوا: کە مافەکەی تا ئێستا جێگیرەو واجبە ماڵەکەی تەسلیم بکا (وَقِيلَ عَلَى حَاضِرٍ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بڕیارەکە لە سەر داوالێکراوێکی حازرەو سوێندی ناوێ.

(وَمَا قُبِلَ إِقْرَارُ عَبْدٍ بِهِ كَعُقُوبَةٍ) هەر کێشەیەك دانهێنانی کۆیلەی تێدا قبوڵ بکرێ: وەکو سزاکانی مافی ئادەمیزادان، ئەوە (فَالدَّعْوَى عَلَيْهِ) داوایەکەشی هەر لە سەر کۆیلەکە بەرز دەکرێتەوەو (وَعَلَيْهِ الْجَوَابُ) وەڵامەکەش هەر لە سەر کۆیلەکەیە (وَمَا لاَ: كَأَرْشٍ) ئەو کێشەیەش کە دانهێنانی کۆیلەی تێدا قبوڵ ناکرێ: وەکو تۆڵەو زامینی، ئەوە (فَعَلَى السَّيِّدِ) داوایەکەو وەڵامەکەی لە سەر گەورەکەیەتی.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چۆنیەتی سوێندخواردن ﴾

(تُغَلَّظُ يَمِينُ مُدَّعٍ وَمُدَّعًىعَلَيْهِ) سوننەتە: سوێندی داواکارو داوالێکراو ئەستوور بکرێ (فِيمَا لَيْسَ بِمَالٍ وَلاَ يُقْصَدُ بِهِ مَالٌ) لە کێشەیەکدا کە ماڵ نیەو مەبەستیش لە وی ماڵ نیە: وەکو مارەبڕین و تەڵاق و تۆڵەکردنەوەو سەرەوەسێتی و وەکیلایەتی و...هتد، هەم (وَفِي مَالٍ يَبْلُغُ نِصَابَ زَكَاةٍ) لەو ماڵەشدا کە بگاتە ڕادەی زەکات (وَسَبَقَ بَيَانُ التَّغْلِيظِ فِي اللِّعَانِ) چۆنیەتی ئەستوورکردن لە باسی (لعان)دا ڕابرا: کە لە دوای عەسرو لە سەر مینبەری مزگەوت و بە ئامادەبوونی کۆمەڵ خەڵکێك سوێند بدرێ.

هەروەها سوننەتە: سزای سوێندی بە درۆی بۆ ئاشکرا بکرێ و قورئانی پیرۆز لە ناو کۆشی دابندرێ، بەڵام دروست نیە: بە تەڵاق سوێند بدرێ، کەوابو: هەر دادوەرێك خەڵکی بە تەڵاق سوێند بدا، واجبە: کاربەدەست لە کارەکەی لایبدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَحْلِفُ عَلَىالْبَتِّ) سوێندخۆرەکە لە سەر شێوەی بڕاوەیی سوێند دەخوا (فِي فِعْلِهِ) لە

کرداری خۆیدا، جا کردارەکەی هەبوون بێ: وەك (والله ئەم کارەم کردوە). یان نەبوون

وَكَذَا فِعْلُ غَيْرِهِ إنْ كَانَ إثْبَاتًا، وَإِنْ كَانَ نَفْيًا فَعَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ، وَلَوْ إدَّعَى دَيْنًا لِمُوَرِّثِهِ فَقَالَ أَبْرَأَنِي حَلَفَ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ بِالْبَرَاءَةِ، وَلَوْ قَالَ جَنَى عَبْدُك عَلَيَّ بِمَا يُوجِبُ كَذَا. فَالأَصَحُّ حَلِفُهُ عَلَى الْبَتِّ، قُلْتُ: وَلَوْ قَالَ جَنَتْ بَهِيمَتُك. حَلَفَ عَلَى الْبَتِّ قَطْعًا، وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَجُوزُ الْبَتُّ بِظَنٍّ مُؤَكَّدٍ

---

بێ: وەك (والله ئەم کارەم نەکردوە). (وَكَذَا فِعْلُ غَيْرِهِ إِنْ كَانَ إِثْبَاتًا) هەروەها لە کرداری خەڵکیتریشدا لە سەر براوەیی سوێند دەخوا، ئەگەر کردارەکەی هەبوون بێ: وەك (والله فلانکەس ئەم کارەی کرد).

بەڵام (وَإِنْ كَانَ نَفْيًا) ئەگەر کرداری کەسێکیتر نەبوون بێ، ئەو کاتە (فَعَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ) لە سەر نەزانین سوێند دەخوا: وەك (والله نەمزانیوە فلانکەس ئەم کارەی کردبێ).

جا ئەگەر لە سەر براوەییش سوێند بخوا–وەك (والله فلانکەس ئەم کارەی نەکردوە)– ئەو کاتەش سوێندەکەی دروست دەبێ، هەروەك لە(مغنى)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ إِدَّعَى دَيْنًا لِمُوَرِّثِهِ) ئەگەر داواکارەکە داوای قەرزێکی میراتدەرەکەی خۆی لە کەسێکیتر کرد (فَقَالَ أَبْرَأَنِي) داوالێکراوەکەش گوتی: میراتدەرەکەت گەردەنی ئازاد کردوم. یان گوتی: قەرزەکەم داوەتەوە. ئەوە (حَلَفَ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ بِالْبَرَاءَةِ) داواکارەکە سوێند لە سەر نەزانینی گەردەن ئازادکردن دەخوا: وەك (والله نەمزانیوە میراتدەرەکەم گەردەنیتۆی ئازاد کردبێ). چونکە ئەوەش کرداری کەسێکیترە.

(وَلَوْ قَالَ جَنَى عَبْدُك عَلَيَّ بِمَا يُوجِبُ كَذَا) ئەگەر داواکارەکە گوتی: کۆیلەکەت دەستدرێژیەکی وەهای کردۆتە سەر من کە ئەوەندە تۆڵەیە واجب دەکا. ئەوە (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەیڕاستتر (حَلِفُهُ عَلَىالْبَتِّ) گەورەکە لە سەر براوەیی سوێند دەخوا: کە کۆیلەکەی ئەم تاوانەی نەکردوە. چونکە کۆیلەکەی ملکی خۆیەتی.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (وَلَوْ قَالَ: جَنَتْ بَهِيمَتُك) ئەگەر داواکارەکە گوتی: ئاژەڵەکەت تاوانی کردۆتە سەر کشتوکاڵەکەمو تۆڵەی بدە. ئەو کاتەش (حَلَفَ عَلَىالْبَتِّ قَطْعًا) داوالێکراوەکە لە سەر براوەیی سوێند دەخوا: وەك (والله ئاژەڵەکەم کشتوکاڵەکەی تۆی نەفەوتاندوە). چونکە تاوانی ئاژەڵەکەی بە هۆی کەمتەرخەمی خۆیەتیو بەشێکە لە کرداری خۆی بۆیێ دەبێتە زامین(وَاللهُ أَعْلَمُ).

کەواتە: ئەگەر ئاژەڵەکەی بە خواستن، یان بە کرێ، یان بە زەوتکردن لە لای کەسێکیتر بێو شتێك بفەوتێنێ، ئەو کاتە داوایەکەو سوێندخواردنی براوەیی لە سەر ماڵخوازەکەو بەکرێگرەکەو زەوتکەرەکەیە؟ چونکە لەو حاڵەتانەدا ئەوان زامینن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَجُوزُ الْبَتُّ بِظَنٍّ مُؤَكَّدٍ) دروسته به هۆی گومانێكی بەهێز سوێند لە سەر براوەیی بخوا، يَعْتَمِدُ خَطَّهُ أَوْ خَطَّ أَبِيهِ، وَتُعْتَبَرُ نِيَّةُ الْقَاضِي الْمُسْتَحْلِفِ، فَلَوْ وَرَّى أَوْ تَأَوَّلَ خِلاَفَهَا أَوْ إِسْتَثْنَى بِحَيْثُ لاَ يَسْمَعُ الْقَاضِي لَمْ يَدْفَعْ إِثْمَ الْيَمِينِ الْفَاجِرَةِ، وَمَنْ تَوَجَّهَتْ عَلَيْهِ يَمِينٌ لَوْ أَقَرَّ بِمَطْلُوبِهَا لَزِمَهُ فَأَنْكَرَ حُلِّفَ،

---

كە (يَعْتَمِدُ خَطَّهُ أَوْ خَطَّ أَبِيهِ) لەو گومانەدا پشت بە نووسینێكی خۆی، یان نوسینێكی باوكی خۆی ببەستێ ئەگەر باوەڕی بە نوسینەكەیو ئەمینداریەتی هەبێ.

ئینجا بزانە: مەرجە داوای سوێندانی كێشەچیەكە لە قازی، یان لە كاربەدەستەكە بكرێ، ئینجا قازی، یان كاربەدەستەكە كێشەچیەكە سوێند بدا، كەوابو: (وَتُعْتَبَرُ نِيَّةُ الْقَاضِي الْمُسْتَحْلِفِ) لە سوێندخواردنەكەدا نیەتی كاربەدەستە سوێنددەرەكە ڕەچاو دەكرێ نەك نیەتی سوێندخۆرەكە، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ﴾ رواه مسلم، سوێندخواردن لە سەر نیەتی سوێنددەرەكەیە.

كەوابو: (فَلَوْ وَرَّى) ئەگەر سوێندخۆرەكە لە سوێندەكەیدا مەبەستێكی شاراوەی هەبوو: وەك (والله هیچیت لە سەر من نیە). بە مەبەستی هیچی لە سەر لاشەی وی نیە (أَوْ تَأَوَّلَ خِلاَفَهَا) یان سوێندەكە بخوا بە باوەڕێكی جیاواز لە باوەڕی سوێنددەرەكە: وەك یەكێكی (شافعی) سوێند بخوا: دراوسێیە(حنفی)یەكەی مافی شوفعەی نیە. (أَوْ إِسْتَثْنَى بِحَيْثُ لاَ يَسْمَعُ الْقَاضِي) یان بە شێوەیەكی وەها بڵێ: إن شاء الله. كە قازییە سوێنددەرەكە گوێی لێنەبێ، ئەوە لەو حاڵەتانەدا (لَمْ يَدْفَعْ إِثْمَ الْيَمِينِ الْفَاجِرَةِ) هیچێك لە وانە گوناهی سوێندی بە درۆ لانادا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ إِقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ فَقَدْ أَوْجَبَ اللهُ لَهُ النَّارَ وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ، وَإِنْ كَانَ قَضِيباً مِنْ أَرَاكٍ﴾ رواه مسلم، هەر كەسێك–بە ناهەق– بە سوێندەكەی خۆی ماڵی موسوڵمانێك بپچڕێنێ، ئەوە بێگومان خوای گەورە ئاگری دۆزەخی بۆ واجب دەكاو بەهەشتی لێحەرام دەكا، هەر چەند شوركە دارسیواكێكیش بێ.

جا بزانە: ئەگەر بە تەڵاق سوێند بدری، یان كێشەچیەكەی ناهەق بێ، ئەو كاتە بەو فێڵانەی ڕابردوو گوناهبار نابێو تەڵاقیشی ناكەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ ئەو كێشەچیەی سوێند دەدرێ ﴾

(وَمَنْ تَوَجَّهَتْ عَلَيْهِ يَمِينٌ) هەركەسێك سوێندێك ڕووی تێبكا، واتە: داوای سوێندخواردنی لێبكرێ (لَوْ أَقَرَّ بِمَطْلُوبِهَا لَزِمَهُ) ئەگەر دانی بە داواكراوی سوێندەكەدا هێنابا، داواكراوەكەی لە سەر واجب دەبو (فَأَنْكَرَ) جا ئەگەر داوالێكراوەكە دانیپێدا نەهێنا، ئەو كاتە (حُلِّفَ) سوێند دەدرێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ﴾ حديث صحيح رواه البيهقي وغيره، شاهید لە سەر داواكارەكەیەو سوێند لە سەر

ئەو داوالێکراوەیە کە دان نامێنێ.

وَلاَ يُحَلَّفُ قَاضٍ عَلَى تَرْكِهِ الظُّلْمَ، وَلاَ شَاهِدٌ أَنَّهُ لَمْ يَكْذِبْ، وَلَوْ قَالَ مُدَّعًىعَلَيْهِ: أَنَا صَبِيٌّ. لَمْ يُحَلَّفْ وَوُقِفَ حَتَّى يَبْلُغَ، وَالْيَمِينُ تُفِيدُ قَطْعَ الْخُصُومَةِ فِالْحَالِ لاَ بَرَاءَةً، فَلَوْ حَلَّفَهُ ثُمَّ أَقَامَ بَيِّنَةً حَكَمَ بِهَا، وَلَوْ قَالَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ: قَدْ حَلَّفَنِي مَرَّةً فَلْيَحْلِفْ أَنَّهُ لَمْ يُحَلِّفْنِي، مُكِّنَ فِي الأَصَحِّ، وَإِذَا نَكَلَ حَلَفَ الْمُدَّعِي وَقُضِيَ لَهُ، وَلاَ يَقْضِي بِنُكُولِهِ،

---

(وَلاَ يُحَلَّفُ قَاضٍ عَلَىتَركِهِ الظُّلْمَ) نابێ قازی=دادوەر سوێند بدرێ: کە لە دادکردندا ستەم نەکا، هەم (وَلاَ شَاهِدٌ أَنَّهُ لَمْ يَكْذِبْ) نابێ شاهیدیش سوێند بدرێ: کە درۆی نەکردوە لەم شاهیدیەدا (وَلَوْ قَالَ مُدَّعًىعَلَيْهِ: أَنَا صَبِيٌّ) ئەگەر داوالێکراوێك گوتی: من منداڵم. دەشگونجا منداڵ بێ، ئەوە (لَمْ يُحَلَّفْ) نابێ سوێند بدرێ، بەڵکو (وَوُقِفَ حَتَّى يَبْلُغَ) کارەکە ڕادەگیرێ تا بلۆغی دەبێ، چونکە ئەگەر سوێند بخوا منداڵیەکەی جێگیر دەبێ، ئەگەر منداڵیەکەشی جێگیر ببێ سوێندەکەی پوچەڵ دەبێ.

(وَالْيَمِينُ) سوێندخواردن–ئەگەر سوێندیگەڕاندراوە نەبێ– (تُفِيدُ قَطْعَ الْخُصُومَةِ فِى الْحَالِ) سودی ئەوەیە: تەنها ئێستا کێشەکە دەبڕێنێتەوە (لاَ بَرَاءَةً) بەڵام داوالێکراوەکە لە مافەکە ئازاد نابێ، کەوابو: (فَلَوْ حَلَّفَهُ) ئەگەر داواکار داوالێکراوەکەی سوێند دا (ثُمَّ أَقَامَ بَيِّنَةً) ئینجا لە دوای سوێنددانەکە داواکارەکە دوو شاهیدی هێنان، یان شاهیدێكو سوێندیشی خوارد، ئەو کاتە (حَكَمَ بِهَا) قازی بە شاهیدییەکە بڕیاری مافەکە بۆ داواکارەکە دەدا، بەڵام ئەگەر سوێندی گەڕاندراوە بێ، ئەو کاتە کێشەکە بە یەکجاری دەبڕێتەوە، هەروەك لەدوایئێرە ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ قَالَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ) ئەگەر داوالێکراوەکە گوتی (قَدْ حَلَّفَنِي مَرَّةً فَلْيَحْلِفْ أَنَّهُ لَمْ يُحَلِّفْنِي) داواکارەکە جارێك لە سەر ئەم داواکراوە سوێندی داوم، کەوابو: با داواکارەکە سوێند بخوا: کە منی سوێند نەداوە. ئەوە (مُكِّنَ) داوالێکراوەکە ئەو ڕێگایەی دەدرێتێ (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، جائەگەر داواکارەکە ئەم سوێندەی نەخوارد، ئەو کاتە داوالێکراوەکە سوێندی گەڕاندراوە دەخوا: جارێکیتر لە سەر ئەم داواکراوە سوێندی داوم. جا بەم سوێندە لەم کێشەیە ڕزگاری دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ سوێند نەخواردن و گەڕاندنەوەی سوێند ﴾

(وَإِذَا نَكَلَ) ئەگەر داوا لێکراوێك دانی بە مافەکەدا نەهێناو سوێندیشی نەخوارد، ئەو کاتە (حَلَفَ الْمُدَّعِي) داواکارەکە سوێندی گەڕاندراوە دەخواو (وَقُضِيَ لَهُ) بڕیاری مافەکەی بۆ دەدرێ، واتە: مافەکەی دەدرێتێ، بەڵام (وَلاَ يَقْضِي بِنُكُولِهِ) نابی بە تەنها سوێند نەخواردنی داوالێکراوەکە قازی بڕیار بدا مافەکە بدرێتە داواکارەکە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی سوێندخواردنی کوشتن، هەم ﴿عن ابن عمررضالله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّﷺ رَدَّ الْيَمِينَ

عَلَى طالِبِ الْحَقِّ﴾ صحه الحاكم، پێغەمبەرﷺ سوێندی گەڕاندەوە سەر داواکاری مافەکە.

وَالنُّكُولُ أَنْ يَقُولَ: أَنَا نَاكِلٌ. أَوْ يَقُولَ لَهُ الْقَاضِي: إِحْلِفْ. فَيَقُولُ: لاَ أَحْلِفُ. فَإِنْ سَكَتَ حَكَمَ الْقَاضِي بِنُكُولِهِ، وَقَوْلُهُ لِلْمُدَّعِي: اِحْلِفْ. حُكْمٌ بِنُكُولِهِ، وَالْيَمِينُ الْمَرْدُودَةُ فِي قَوْلٍ كَبَيِّنَةٍ، وَفِي الأَظْهَرِ كَإِقْرَارِالْمُدَّعَىعَلَيْهِ، فَلَوْ أَقَامَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ بَعْدَهَا بَيِّنَةً بِأَدَاءٍ أَوْ إِبْرَاءٍ لَمْ تُسْمَعْ، فَإِنْ لَمْ يَحْلِفْ الْمُدَّعِي وَلَمْ يَتَعَلَّلْ بِشَيْءٍ سَقَطَ حَقُّهُ مِنَ الْيَمِينِ،

---

(وَالنُّكُولُ) ترسان لە سوێند، واتە: سوێندنەخواردن ئەمەیە: (أَنْ يَقُولَ: أَنَا نَاكِلٌ) داوالێکراوەکە داوای سوێندخواردنی لێبکرێ و ئەویش بڵێ: من لە سوێندخواردن دەترسم و سوێند ناخۆم (أَوْ يَقُولَ لَهُ الْقَاضِي إِحْلِفْ) یان قازی پێی بڵێ: سوێند بخۆ (فَيَقُولُ لاَ أَحْلِفُ) ئەویش بڵێ: سوێند ناخۆم. واتە: لەم دوو حاڵەتەدا داوالێکراوەکە بە سوێندنەخۆر دادەنرێ و سوێندەکە دەگەڕێندرێتەوە سەر داواکارەکە، هەر چەند قازیش بڕیاری سوێندنەخۆریی نەدابێ.

بەڵام (فَإِنْ سَكَتَ) ئەگەر داوالێکراوەکە داوای سوێندخواردنی لێکراو بێدەنگ بوو، ئەو کاتە (حَكَمَ الْقَاضِي بِنُكُولِهِ) پێویستە قازی بڕیاری سوێندنەخۆریی بدا، ئینجا سوێندەکە بگەڕێندرێتەوە سەر داواکارەکە، کەوابو: (وَقَوْلُهُ لِلْمُدَّعِي: اِحْلِفْ) ئەگەر قازی بڵێتە داواکارەکە: تۆ سوێند بخۆ. ئەوە (حُكْمٌ بِنُكُولِهِ) بڕیاردانە بە سوێندنەخۆریی داوالێکراوەکە.

(وَالْيَمِينُ الْمَرْدُودَةُ) سوێندی گەڕاندراوە بۆ سەر داواکارەکە (فِي قَوْلٍ كَبَيِّنَةٍ) لە فەرموودەیەکدا: وەکو شاهیدهێنانی داواکارەکەیە، بەڵام (وَفِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: سوێندی گەڕاندراوە—هەر کاتێك داواکارەکە بیخوا— ئەوە لە ڕووی بەڵگەوە (كَإِقْرَارِ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ) وەکو دانهێنانیداوالێکراوەکەیە بە مافی داواکارەکە، کەواتە: هەر کاتێك داواکارەکە سوێندی گەڕاندراوەی خوارد، واجبە: مافەکەی بدرێتێ و هیچ پێویستی بە بڕیاری قازی نیە.

کەوابو: (فَلَوْ أَقَامَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ بَعْدَهَا بَيِّنَةً) ئەگەر داوالێکراوەکە لە دوای سوێندخواردنەکەی داواکارەکە شاهیدی هێنان (بِأَدَاءٍ أَوْ إِبْرَاءٍ) کە مافەکەی داوەتەوە داواکارەکە، یان داواکارەکە گەردەنی ئازاد کردوە لە مافەکە، ئەوە (لَمْ تُسْمَعْ) گوێ نادرێتە شاهیدەکانی، چونکە سوێندخواردنەکەی داواکارەکە بووەتە دانهێنانی داوالێکراوەکەو دانهێنانەکەشی دەبێتە بە درۆخستنەوەی شاهیدەکانیخۆی.

(فَإِنْ لَمْ يَحْلِفِ الْمُدَّعِي) جا ئەگەر داواکارەکە سوێندی گەڕاندراوەی نەخواردو (وَلَمْ يَتَعَلَّلْ بِشَيْءٍ) هیچ هۆیەك و عوزرێکیشی نەهێناوە، ئەو کاتە (سَقَطَ حَقُّهُ مِنَ الْيَمِينِ) داواکارەکە مافی سوێندیگەڕاندراوەی نامێنێ، کەواتە: مافی نیە لەم داوایەدا سوێندیگەڕاندراوە

بخوا، هەم نابێ داواكارەكە سوێندەكە بگەڕێنێتەوە سەر داوالێكراوەكە، چونكە سوێندی گەڕاندراوە ناگەڕێندرێتەوە، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

وَلَيْسَ لَهُ مُطَالَبَةُ خَصْمِهِ، وَإِنْ تَعَلَّلَ بِإِقَامَةِ بَيِّنَةٍ أَوْ مُرَاجَعَةِ حِسَابٍ أُمْهِلَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، وَقِيلَ أَبَدًا، وَإِنْ إِسْتَمْهَلَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ حِينَ اُسْتُحْلِفَ لِيَنْظُرَ حِسَابَهُ لَمْ يُمْهَلْ، وَقِيلَ ثَلاَثَةً، وَلَوْ إِسْتَمْهَلَ فِي اِبْتِدَاءِ الْجَوَابِ أُمْهِلَ إِلَى آخِرِالْمَجْلِسِ، وَمَنْ طُولِبَ بِزَكَاةٍ فَادَّعَى دَفْعَهَا إِلَى سَاعٍ آخَرَ أَوْ إِدَّعَى غَلَطَ خَارِصٍ وَأَلْزَمْنَاهُ الْيَمِينَ فَنَكَلَ وَتَعَذَّرَ رَدُّ الْيَمِينِ فَالأَصَحُّ أَنَّهَا تُؤْخَذُ مِنْهُ، وَلَوْ اِدَّعَى وَلِيُّ صَبِيٍّ دَيْنًا لَهُ فَأَنْكَرَ وَنَكَلَ لَمْ يُحَلَّفِ الْوَلِيُّ،

---

(وَ) هەروەها (لَيْسَ لَهُ مُطَالَبَةُ خَصْمِهِ) بۆ داواكارەكە دروستیش نیە لەم داوایەدا داوا لە كێشەچیەكەی بكاتەوە، بەڵام ئەگەر شاهید بهێنێ، ئەو كاتە دەتوانێ بە داوایەكی‌نوێ داوا لە كێشەچیەكەی بكاتەوە، هەروەك لە (تحفە)و حاشیەكانی‌دا فەرموویانە.

بەڵام (وَإِنْ تَعَلَّلَ بِإِقَامَةِ بَيِّنَةٍ) ئەگەر داوالێكراوەكە هۆی سوێندنەخواردنەكەی ئەوە بوو: دەیویست شاهید بهێنێ، یان پرسیار لە زانایان بكا (أَوْ مُرَاجَعَةِ حِسَابٍ) یان بگەڕێتەوە تەماشای حیساباتی خۆی بكا، ئەو كاتە (أُمْهِلَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ) تا ماوەی سێ ڕۆژان مۆڵەتی دەدرێتێ (وَقِيلَ أَبَدًا) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: هەتا هەتایی مۆڵەتی دەدرێتێ، چونكە سوێندخواردنەكە مافی خۆیەتی.

(وَإِنْ إِسْتَمْهَلَ الْمُدَّعَىعَلَيْهِ حِينَ اُسْتُحْلِفَ) ئەگەر داوا لێكراوەكە –لەو كاتەی داوای سوێندخواردنی لێكرا– داوای مۆڵەتی كرد (لِيَنْظُرَ حِسَابَهُ) تاكو تەماشای حیساباتی خۆی بكا، ئەوە (لَمْ يُمْهَلْ) مۆڵەتی نادرێتێ، بەڵام بە ڕەزامەندی داواكارەكە دروستە ئەویش مۆڵەتی بدرێتێ (وَقِيلَ ثَلاَثَةً) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: سێ ڕۆژان مۆڵەتی دەدرێتێ.

(وَلَوْ إِسْتَمْهَلَ فِي ابْتِدَاءِ الْجَوَابِ) ئەگەر لە سەرەتای وەڵامدانەوەدا –داوالێكراوەكە– داوای مۆڵەتی كرد، ئەو كاتە (أُمْهِلَ إِلَى آخِرِالْمَجْلِسِ) تا كۆتایی دانیشگەی دادگا مۆڵەتی دەدرێتێ.

(وَمَنْ طُولِبَ بِزَكَاةٍ) هەر كەسێك داوای زەكاتی لێكرا (فَادَّعَى دَفْعَهَا إِلَى سَاعٍ آخَرَ) ئەویش گوتی: زەكاتەكەم داوەتە زەكاتوەرگرێكی‌تر (أَوْ إِدَّعَى غَلَطَ خَارِصٍ) یان گوتی: قرسێنەرەكە هەڵەی كردووە (وَأَلْزَمْنَاهُ الْيَمِينَ) بە فەرموودەی بێ‌هێز: داوای سوێندخواردنمان لێكرد (فَنَكَلَ وَتَعَذَّرَ رَدُّ الْيَمِينِ) ئەویش سوێندی نەخوارد، نەشگونجا سوێندەكە بگەڕێندرێتەوە سەر زەكاتوەرگرەكان، ئەو كاتە (فَالأَصَحُّ أَنَّهَا تُؤْخَذُ مِنْهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر زەكاتەكەی لێ‌وەردەگیرێ.

(وَلَوْ ادَّعَى وَلِيُّ صَبِيٍّ دَيْنًا لَهُ) ئەگەر سەرپەرشتكارێكی منداڵێك، یان شێتێك داوای قەرزێكی ئەوانەی كردو شاهیدیشی نەبون (فَأَنْكَرَ وَنَكَلَ) جا داوالێكراوەكەش دانی بە قەرزەكەدا نەهێناو سوێندیشی نەخوارد، ئەوە (لَمْ يُحَلَّفِ الْوَلِيُّ) نابێ سەرپەرشتكارەكە سوێندی گەڕاندراوە

بدرێ، بەڵكو كارەكە ڕادەگیرێ تا منداڵەكە بلۆغی دەبێ و شێتەكە چاك دەبێتەوە، هەروەها ئەگەر سەرپەرشتكارەكە تەنها شاهێدێكی هێنا، ئەو كاتەش سوێندی گەڵ شاهیدەكە نادرێ.

وَقِيلَ: يُحَلَّفُ، وَقِيلَ: إنْ اِدَّعَى مُبَاشَرَةَ سَبَبِهِ حُلِّفَ.

(فَصْلٌ) اِدَّعَيَا عَيْنًا فِي يَدِ ثَالِثٍ وَأَقَامَ كُلٌّ مِنْهُمَا بَيِّنَةً سَقَطَتَا، وَفِي قَوْلٍ تُسْتَعْمَلَانِ: فَفِي قَوْلٍ يُقْسَمُ،

---

جا بزانە: سەرووەسێت و سەپەرشتكاری وەقف و مزگەوتیش وەكو سەرپەرشتكاری منداڵە، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا ڕوون كراوەتەوە (وَقِيلَ: يُحَلَّفُ) بە فەرموودەیەكی بێهێز: سوێند دەدرێ، بەڵام (وَقِيلَ) بە فەرموودەیەكیتر-كە پشتی پێبەستراوە-: (إِنْ ادَّعَى مُبَاشَرَةَ سَبَبِهِ) ئەگەر سەرپەرشتكارەكە لە داوایەكەدا بڵێ: من ڕاستەوخۆ هۆكاری ئەو مافەم: وەك من ماڵی ئەو منداڵەم بە قەرز فرۆشتوتە ئەم داوالێكراوە. ئەو كاتە (حُلِّفَ) سەپەرشتكارەكە سوێند دەدرێ و مافەكە وەردەگرێ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی دژایەتی شاهیدەكان و لەكاركەوتنیان ﴾

بزانە: ئەو شتەی كێشەی لە سەرە: یان لە دەست كەسێكی سێیەمدایە، یان لە دەست هەردوو كێشەچیەكاندایە، یان لە دەست هیچ كەسێكدا نیە، یان لە دەستی تەنها كێشەچیەكدایە:

**حاڵەتییەكەم**: (ادَّعَيَا عَيْنًا فِي يَدِ ثَالِثٍ) ئەگەر دوو كێشەچی داوای شتێكیان كرد، شتەكەش لە دەستی كەسێكیتری سێیەمدا بوو و بۆ هیچێكیانیش دانی بە شتەكەدا نەهێنا، هەم (وَأَقَامَ كُلٌّ مِنْهُمَا بَيِّنَةً) هەردوو كێشەچیەكانیش هەر یەكەو شاهیدی خۆی هێنا: كە شتەكە هی خۆیەتی، ئەوە (سَقَطَتَا) شاهیدەكانی هەردوو كێشەچیەكان لە كار دەكەون، چونكە دژایەتییان هەیەو هیچێكیش بەهێزكەری لە سەر ئەویتر نیە، كەوابو: لەم حاڵەتەدا وەك هیچ لایەك شاهیدی نەبێ ئەوها بڕیار دەدرێ و سێیەمەكە بۆ هەر یەكێك لە كێشەچیەكان سوێندێك دەخوا: كە (شتەكە هی ئەوی نیە).

بەڵام ئەگەر سێیەمەكە بۆ یەكێكیان دانی بە شتەكەدا هێنا، ئەو كاتە شاهیدەكانی وی بەهێزتر دەبن و كاریان پێدەكرێ و شتەكە تەنها دەدرێتە ئەوی.

هەروەك ئەگەر تەنها یەكێك شاهیدی هەبێ، ئەو كاتەش شتەكە تەنها دەرێتە ئەوی، بەڵام ئەگەر سێیەمەكە بۆ هەردووكیان دانی بە شتەكەدا هێنا، ئەو كاتە شتەكە-بە هاوبەشی-دەدرێتە هەردووكیان، هەروەك لە (تحفە)و (الشروانی)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَفِي قَوْلٍ تُسْتَعْمَلَانِ) لە فەرموودەیەكدا: شاهیدەكانی هەردووكیان كاریان پێدەكرێ و شتەكە لە سێیەمەكە دەستێندرێ، ئینجا (فَفِي قَوْلٍ يُقْسَمُ) لە فەرموودەیەكدا: ماڵەكە لە نێوان هەردوو كێشەچیەكاندا بەش دەكرێ ﴿عن أبموسی ﷺ أَنَّ رَجُلَيْنِ اِدَّعَيَا بَعِيراً فَبَعَثَ

كُلُّ واحِدٍ مِنْهُمَا بِشَاهِدَيْنِ فَقَسَمَهُ النَّبِيُّﷺ بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ﴾ رواه أبوداود باسناد صالح، دوو كەس لە سەر ووشتريَك بووە كيَشەيانو هەريەكەو دوو شاهيدى هيَنان، ئينجا پيَغەمبەرﷺ

وَقَـوْلٍ يُقْـرَعُ، وَ قَـوْلٍ تُوقَـفُ حَتَّـى يَبِـينَ أَوْ يَصْـطَلِحَا، وَلَـوْ كَانَـتْ فِـي يَـدِهِمَا وَأَقَامَـا بَيِّنَتَيْنِ بَقِيَتْ كَمَا كَانَتْ، وَلَوْ كَانَتْ بِيَدِهِ فَأَقَامَ غَيْرُهُ بِهَا بَيِّنَةً وَهُوَ بَيِّنَةً قُدِّمَ صَاحِبُ الْيَدِ،

---

وشترەكەى كردە نيوە لە نيَوان هەردووكياندا. (وَ فى قَوْلٍ يُقْرَعُ) لە فەرموودەيەكدا: پشكە لە نيَوان كيَشەچيەكاندا دەكرىَو كامەيان پشكەى بۆ دەرچو، شـاهيدەكانى وى بـەهيَزتر دەبنو كاريان پيَدەكرىَ (وَ فى قَوْلٍ تُوقَفُ حَتَّى يَبِينَ أَوْ يَصْطَلِحَا) لـە فەرموودەيەكـدا: كارەكە رادەگيرىَ تا روَن دەبيَتەوە، يان سولح دەكەن.

**حاڵەتى دووەم**: (وَلَوْ كَانَتْ فِي يَدِهِمَا) ئەگەر شتەكە لە دەست هەردوو كيَشەچيەكاندا بـوو (وَأَقَامَا بَيِّنَتَيْنِ) هەردووكيشيان شاهيديان هيَنان: كە هەموو شتەكە هى خۆيەتى، يان هـيچ لايەكيان شاهيدى نەبون، ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا (بَقِيَتْ كَمَا كَانَتْ) شتەكە چۆن لە دەستى هەردووكياندا بووە، ئـەو هـا دەميَنيَتـەوەو شـاهيدەكانيش لـە كـار دەكـەون، بـە بەڵگـەى حەديسەكەىڕابردوو، جا لەو حاڵەتەى هيچ لايەك شاهيدى نيە، ئەگەر تەنها لايەكيان سويَند بخوا، ئەوە هەموو شتەكەى دەدريَتىَ، هەروەك ئەگەر تەنها لايەكيان شـاهيدى هـەبن، ئـەو كاتەش هەموو شتەكەى دەدريَتىَ، هەروەك لە (مغنى)و (الشروانى)دا فەرمويانە.

هەروەهاش **حاڵەتى سىَيەم**: ئەگەر شتەكە لە دەسـت هـيچ لايەكيانـدا نـەبىَو هـەردوو لا شاهيديان هيَنا: كە هەموو شـتەكە هـى خۆيـەتى، ئـەو كاتـەش لـە نيَـوان هەردووكيانـدا دەكريَتە نيوە، هەروەك لە زۆربەى سەرچاوەكاندا فەروويانە.

**حاڵەتى چوارەم**: (وَلَوْ كَانَتْ بِيَدِهِ) ئەگەر شتەكە لە دەست يەكيَكياندا بوو (فَأَقَامَ غَيْرُهُ بِهَا بَيِّنَـةً وَهُـوَ بَيِّنَـةً) ئينجـا كيَشەچـيەكەىتر شـاهيدى هيَنـان كـە ملكىخۆيـەتىو خـاوەن دەستەكەش شاهيدى هيَنان كە ملكىخۆيـەتى، ئـەوە (قُـدِّمَ صَـاحِبُ الْيَـدِ) شـاهيدەكانى خاوەن دەستەكە وەپيَش ديَخريَنو شتەكە هەر بۆ ئەوى دەبىَ، چونكە–بە هۆى خـاوەن دەستيەكە– شاهيدەكانى وى بەهيَزترن.

كەواتە: ئەگەر خاوەن دەستەكە تەنها شاهيديَكى هەبىَو سويَنديش بخوا، ئەو كاتەش هەر شاهيدو سويَندەكەى ئەوى بەهيَزترنو وەپيَش دوو شاهيدەكانى ئەوىتر ديَخرىَ، هەروەك لە زۆربەى سەرچاوەكاندا فەرموويانە ﴿عن جابرﷺ: أَنَّ رَجُلَيْنِ اِخْتَصَمَا فِي نَاقَةٍ وَأَقَامَا بَيِّنَةً، فَقَضَى رَسُولُ اللهِﷺ لِلَّذِى هِيَ فِي يَدِهِ﴾ رواه الشافعى والبيهقى ولم يضعِّفه، دوو كـەس لـە ووشتريَكدا بوە كيَشەيانو هەردووكيان شاهيديان هيَنان، ئينجا پيَغەمبـەرﷺ بريـارى دا: ووشترەكە بۆ ئەو كەسە بىَ كە لە دەستىدايە.

ئینجا ئاگاداربە: ئەگەر شتەکەی بە ناشەرعی لە دەستدا بێ، ئەو کاتە خاوەن دەستیەکەی کاری پێناکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

وَلاَ تُسْمَعُ بَيِّنَتُهُ إلاَّ بَعْدَ بَيِّنَةِالْمُدَّعِي، وَلَوْ أُزِيلَتْ يَدُهُ بِبَيِّنَةٍ ثُمَّ أَقَامَ بَيِّنَةً بِمِلْكِهِ مُسْتَنِدًا إلَى مَا قَبْلَ إزَالَةِ يَدِهِ وَاعْتَذَرَ بِغَيْبَةِ شُهُودِهِ سُمِعَتْ وَقُدِّمَتْ، وَقِيلَ: لاَ. وَلَوْ قَالَ الْخَارِجُ: هُوَ مِلْكِي اِشْتَرَيْته مِنْك. فَقَالَ: بَلْ مِلْكِي. وَأَقَامَا بَيِّنَتَيْنِ قُدِّمَ الْخَارِجُ، وَمَنْ أَقَرَّ لِغَيْرِهِ بِشَيْءٍ ثُمَّ اِدَّعَاهُ لَمْ تُسْمَعْ إلاَّ أَنْ يَذْكُرَ اِنْتِقَالاً،

---

**پێناسە**: ئەو داوالێکراوەی شتەکەی لە دەستدایە پێی دەگوترێ: (ذوُالْيَد)=(صَاحِبُ الْيَد)، واتە: خاوەن دەست، هەم پێی دەگوترێ: (اَلدّاخِل): ناوخۆ.

هەروەها ئەو داواکارەی شتەکەی لە دەستدا نیە پێی دەگوترێ: (اَلْخَارِج) دەرەوە.

ئینجا (وَلاَ تُسْمَعُ بَيِّنَتُهُ) گوێ نادرێتە شاهیدەکانی داوالێکراوی ناوخۆی خاوەن دەست (إلاَّ بَعْدَ بَيِّنَةِ الْمُدَّعِي) تەنها لە دوای شاهیدەکانی داواکارەکەی دەرەوە گوێیان دەدرێتێ.

(وَلَوْ أُزِيلَتْ يَدُهُ بِبَيِّنَةٍ) ئەگەر بە هۆی شاهید دەستی داوالێکراوەکەی خاوەن دەست لە ماڵەکە لادرا، واتە: بڕیار درا: ماڵەکە ملکی داواکارەکەیە (ثُمَّ أَقَامَ بَيِّنَةً بِمِلْكِه) ئینجا داوالێکراوەکە شاهیدی هێنان: کە ئەو ماڵە ملکی خۆیەتی (مُسْتَنِدًا إلَى مَا قَبْلَ إزَالَةِ يَدِه) ملکایەتیەکەش نیسبەت درایە پێش لادانی دەستەکەی، واتە: شاهیدەکان گوتیان: پێش ئەوەی ماڵەکەی لێبستێندرێ تا ئێستاش ماڵەکە هەر ملکی خۆیەتی. (وَاعْتَذَرَ بِغَيْبَةِ شُهُودِه) داوالێکراوەکەش عوزری هێناوە: کە شاهیدەکانی حازر نەبون، یان نەیدەزانی شاهیدی هەنە، ئەو کاتەش (سُمِعَتْ وَقُدِّمَتْ) گوێ دەدرێتە شاهیدەکانی داوالێکراوەکەی خاوەن دەستو وەپێش شاهیدەکانی داواکارەکە دێخرێنو بڕیارەکە هەڵدەوەشێندرێتەوەو ماڵەکە هەر دەدرێتەوە خۆی (وَقِيلَ: لاَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: گوێ نادرێتە شاهیدەکانی.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر شاهیدەکانی داواکارەکە زیاتر زانستیان لە لا بێ، ئەو کاتە شاهیدەکانی وی بەهێزتر دەبن لە شاهیدەکانی خاوەن دەستەکە، کەوابو: (وَلَوْ قَالَ الْخَارِجُ) ئەگەر داواکارەکەی دەرەوە گوتی: (هُوَ مِلْكِي اشْتَرَيْته مِنْك) ئەو شتەی لە دەست تۆدایە ملکی منەو لە تۆم کڕیوە. (فَقَالَ: بَلْ مِلْكِي) داوالێکراوەکەی ناو خۆش گوتی: ملکی خۆمە. ئینجا (وَأَقَامَا بَيِّنَتَيْنِ) هەر یەکەیان شاهیدەکانی خۆی هێنا، ئەو کاتە (قُدِّمَ الْخَارِجُ) شاهیدەکانی داواکارەکەی دەرەوە وەپێش ئەوەکەیتر دێخرێن؟ چونکە بەو زێدە زانستیە بەهێزتر دەبن کە دەڵێن: (ئەو شتەداواکراوە–بە هۆی کڕین– لە داوالێکراوەکەوە گوستراوەتەوە بۆ داواکارەکە).

(وَمَنْ أَقَرَّ لِغَيْرِهِ بِشَيْءٍ) ئەگەر کەسێك دانی بە شتێکدا هێنا بۆ کەسێکیتر (ثُمَّ ادَّعَاهُ) ئینجا دانهێنەرەکە داوایشتەکەی کردوە، ئەوە (لَمْ تُسْمَعْ إلاَّ أَنْ يَذْكُرَ اِنْتِقَالاً) گوێ نادرێتە

داوایەکەی، مەگەر لە داوایەکەیدا گواستنەوەیەك باس بکا، وەك بڵێ: لە دوای دانهێنانەکەم شتەکەی پێبەخشیوم. ئەو کاتە بە هۆی ئەو گواستنەوەیە گوێ دەدرێتە داوایەکەی.

وَمَـنْ أُخِـذَ مِنْـهُ مَـالٌ بِبَيِّنَـةٍ ثُـمَّ ادَّعَـاهُ لَـمْ يُشْـتَرَطْ ذِكْـرُ الإِنْتِقَـالِ فِـالأَصَـحِّ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّ زِيَادَةَ عَدَدِ شُهُودِ أَحَدِهِمَا لاَ تُرَجِّحُ، وَكَذَا لَوْ كَانَ لأَحَدِهِمَا رَجُلاَنِ وَلِلآخَرِ رَجُـلٌ وَامْرَأَتَـانِ، فَـإِنْ كَـانَ لِلآخَـرِ شَـاهِدٌ وَيَمِـينٌ رُجِّـحَ الشَّـاهِدَانِ فِـالأَظْهَرِ، وَلَوْ شَهِدَتْ لأَحَدِهِمَا بِمِلْكٍ مِنْ سَنَةٍ، وَلِلآخرِ مِنْ أَكْثَرَ، فَالأَظْهَرُ تَرْجِيحُ الأَكْثَرِ،

---

بەڵام (وَمَنْ أُخِذَ مِنْهُ مَالٌ بِبَيِّنَةٍ) ئەگەر کەسێك بە هۆی شاهید ماڵێکیلێسەتێندرا (ثُمَّ ادَّعَاهُ) ئینجا داوای ماڵەکەی کردوە، ئەو کاتە (لَمْ يُشْتَرَطْ ذِكْرُ الإِنْتِقَالِ) بە مەرج دانانرێ لە داوایەکەیدا باسی گواستنەوەیەك بکا (فِيالأَصَحِّ) لە فەرمودەی ڕاستتردا، چونکە ئەگەر لە داوایەکەیدا شاهیدی هەبن، ئەو کاتەشاهیدەکانی وی بە هۆی خاوەن دەستیەکەی پێشووی بەهێزتر دەبن.

(وَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (أَنَّ زِيَادَةَ عَدَدِ شُهُودِ أَحَدِهِمَا لاَ تُرَجِّحُ) ئەگەر ژمارەی شاهیدەکانی لایەك–لە ڕادەی پێویست– زیاتر بن لە شاهیدەکانی لایەکەیتر، بەو زیاتریە بەهێزتر نابن، چونکە بەگوێرەی شەرع بەڵگەی هەردوو لا تەواوەو دژایەتیش ڕووی داوە، کەوابو: شاهیدەکانی هەردوو لا لە کار دەکەون.

(وَكَذَا لَوْ كَانَ لأَحَدِهِمَا رَجُلاَنِ وَلِلآخَرِ رَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ) هەروەها ئەگەر لایەك دوو شاهیدی پیاوی هەبنو لایەکەیتریش پیاوێكو دوو ئافرەت شاهیدی هەبن، ئەو کاتەش دوو پیاوەکان بەهێزتر نابن، چونکە بەڵگەی شەرعیی هەردوو لا تەواوەو دژایەتیش هەیە، کەوابو: شاهیدەکانی هەردوو لا لە کار دەکەون.

بەڵام (فَإِنْ كَانَ لِلآخَرِ شَاهِدٌ وَيَمِينٌ) ئەگەر لایەك شاهێدێكو سوێندی گەڵ شاهیدەکەی هەبێو لایەکەیتریش دوو پیاو، یان پیاوێكو دوو ئافرەت شاهیدی هەبن، ئەو کاتە (رُجِّحَ الشَّاهِدَانِ) دوو شاهیدەکانو هەم پیاوەکەو دوو ئافرەتەکەش بە بەهێزتر دادەندرێن (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە بە (إجماع)ی زانایانیئیسلام شاهیدەکان کاریان پێدەکرێ، کەوابو: شاهیدێكو سوێندی گەڵ شاهیدەکەش لە کار دەکەوێ.

بەڵام ئەگەر شتە داواکراوەکە لە دەست خاونی شاهیدێكو سوێندەکەدابێ، ئەو کاتە–بە هۆی خاوەن دەستیەکە– شاهێدێكو سوێندی گەڵ شاهیدەکە بەهێزتر دەبێو وەپێش دێخرێو دوو شاهیدەکانیش لە کار دەکەون، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ شَهِدَتْ لأَحَدِهِمَا بِمِلْكٍ مِنْ سَنَةٍ) ئەگەر شاهیدەکان شاهیدییان دا: شتە داواکراوەکە لە ساڵێك لە مەو پێشەوە تا ئێستا ملکی فلانکەسە (وَلِلآخَرِ مِنْ أَكْثَرَ) شاهیدەکانیتریش

شـاهیدییان دا: لـە زیـاترەوە، واتـە: لـە دوو سـاڵ لـە مـەو پێشـەوە تـا ئێسـتا مڵكـی كەسـەكەیترە. ئـەوە (فَـالأظْهَرُ تَـرْجِيحُ الأكْثَـرِ) بـە فەرمـوودەیبـەهێزتر: شـاهیدەكانی وَلِصَـاحِبِهَا الأُجْـرَةُ وَالزِّيَـادَةُ الْحَادِثَـةُ مِـنْ يَوْمِئِـذٍ، وَلَـوْ أَطْلَقَـتْ بَيِّنَـةٌ وَأَرَّخَـتْ أُخْـرَى فَالْمَـذْهَبُ أَنَّهُمَـا سَـوَاءٌ، وَأَنَّـهُ لَـوْ كَـانَ لِصَـاحِبِ مُتَـأَخِّرَةِ التَّـارِيخِ يَـدٌ قُـدِّمَ، وَأَنَّهَـا لَـوْ شَـهِدَتْ بِمِلْكِـهِ أَمْـسِ وَلَـمْ تَتَعَـرَّضْ لِلْحَـالِ لَـمْ تُسْـمَعْ حَتَّى يَقُولُـوا: وَلَـمْ يَـزُلْ مِلْكُـهُ، أَوْ وَلاَ نَعْلَمُ مُـزِيلاً لَـهُ. وَتَجُـوزُ الشَّـهَادَةُ بِمِلْكِـهِ الآنَ اِسْتِصْحَابًا لِمَا سَبَقَ مِنْ إرْثٍ وَشِرَاءٍ وَغَيْرِهِمَا، وَلَوْ شَهِدَتْ بِإِقْرَارِهِ أَمْسِ بِالْمِلْكِ لَهُ

---

زۆرترەكە بەهێزتر دەكرێن، چونكە زانستیان زیاترەو لە كاتێكی وەهادا ملكایەتیان ئاشكرا كردوە–كە ساڵە زیادەكەیە– شـاهیدەكانی كەمترەكە زانسـتی ئـەو سـاڵەیان نـەبوەو شاهیدیەكەیان لەو ساڵە زیادەدا دژایەتی یەكتری ناكا:

كەوابو: لە دوو ساڵ لە مەو پێشەوە شتەكە ملكی خاوەن زۆرترەكەیە، بۆیێ (وَلِصَاحِبِهَا الأُجْرَةُ وَالزِّيَادَةُ الْحَادِثَةُ مِنْ يَوْمِئِذٍ) خاوەنی زۆرترەكە مافی كرێو زێدەییەكانی پەیدابووی شتەكەشی هەیە لەو رۆژەوە: كە بە شاهیدیی شاهیدەكان بووەتە ملكی وی–كە دوو ساڵ لە مەو پێشە– چونكە كرێو زیدەییەكانی شتەكەش بەرهەمی ملكیخۆیەتی.

(وَلَوْ أَطْلَقَتْ بَيِّنَةٌ وَأَرَّخَتْ أُخْرَى) ئەگەر شاهیدەكانی لایەك بەرواری ملكایـەتییان نـەگوت، بەلام شاهیدەكانی لایەكەیتر بەرواری ملكایەتییان گوت، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ: أَنَّهُمَا سَوَاءٌ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: شاهیدەكانی هەردوو لا یەكسانن و لە كار دەكەون.

بەلام (وَأَنَّهُ لَوْ كَانَ لِصَاحِبِ مُتَأَخِّرَةِ التَّارِيخِ يَدٌ) ئەگەر خاوەن بەرواریدواتر ماڵەكـەی لـە دەستدا بێ، ئەو كاتە (قُدِّمَت) شاهیدەكانی وی وەپێش ئەوەكەیتر دێخرێن، چونكە بـە هۆی خاوەن دەستیەكە بەهێزترن، بەلام بەو مەرجەی نەزاندرابێ خاوەن دەستیەكەی بە دوژمنكارییە، هەم خاوەن دەستیەكەشی بە بەڵگەیـەك لـە داوالێكراوەكـە وەرنـەگرتبێ، چونكە لەو حاڵەتانەدا هەر یەكەمەكە بە خاوەن دەستی ڕاستەقینە دادەندرێ، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی.

(وَ أَنَّهَا لَوْ شَهِدَتْ بِمِلْكِهِ أَمْسِ) هەر بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: ئەگەر شاهیدییان دا: ئەو شتە دوێنێ ملكی فلانكەس بوو (وَلَمْ تَتَعَرَّضْ لِلْحَالِ)باسی ئێستاشیان نەكرد، ئەوە (لَمْ تُسْمَعْ) گوێ نادرێتە شاهیدیەكەیان (حَتَّى يَقُولُوا: وَلَمْ يَزُلْ مِلْكُهُ) تا دەڵێن: دوێنێ ملكـی فلان بوو و تا ئێستاش لە ملكایەتیی لانەكـەوتوە. (أوْ) یـان بڵـێن: (وَلاَ نَعْلَـمُ مُـزِيلاً لَـهُ) ناشزانین لادەرێكی ملكایەتیەكەی هەبێ.

(وَتَجُوزُ الشَّهَادَةُ بِمِلْكِهِ الآنَ) دروستە شاهیدی بدا: بە ملكایەتی شتێك ئێسـتا بـۆ كەسـێك (اِسْتِصْحَابًا لِمَا سَبَقَ) لە شاهیدیەكەشدا پشت بە بەردەوامیی بڕیارێكیڕابردوو ببەستێ:

(مِنْ إِرْثٍ وَشِرَاءٍ وَغَيْرِهِمَا) له میرات و کرین و هۆیەکانیتری ملکایەتی (وَلَوْ شَهِدَتْ بِإِقْرَارِهِ أَمْسِ بِالْمِلْكِ لَهُ) ئەگەر دوو شاهید شاهیدییان دا: دوێنێ داوالێکراوەکە دانی هێنا أُسْتُدِيمَ، وَلَوْ أَقَامَهَا بِمِلْكِ دَابَّةٍ أَوْ شَجَرَةٍ لَمْ يَسْتَحِقَّ ثَمَرَةً مَوْجُودَةً وَلاَ وَلَدًا مُنْفَصِلاً وَيَسْتَحِقُّ حَمْلاً فِالأَصَحِّ، وَلَوْ اِشْتَرَى شَيْئًا فَأُخِذَ مِنْهُ بِحُجَّةٍ مُطْلَقَةٍ رَجَعَ عَلَى بَائِعِهِ بِالثَّمَنِ، وَقِيلَ لاَ إِلاَّ إِذَا اِدَّعَى مِلْكاً سَابِقاً عَلَى الشِّرَاءِ، وَلَوْ اِدَّعَى مِلْكًا مُطْلَقًا فَشَهِدُوا لَهُ مَعَ سَبَبِهِ

---

به ملکایەتی ئەو شتە بۆ داواکارەکە، ئەوە (أُسْتُدِيمَ) دانهێنانەکە هەر بەردەوام دەبیٚ و ملکایەتیەکەش بۆ داواکارەکە جێگیر دەبیٚ هەرچەند باسی ئێستاش نەکەن.

(وَلَوْ أَقَامَهَا بِمِلْكِ دَابَّةٍ أَوْ شَجَرَةٍ) ئەگەر کەسێك شاهیدی هێنا: کە وولاغێك، یان درەختێك ملکی خۆیەتی و باسی ڕابردووشیان نەکرد، ئەوە (لَمْ يَسْتَحِقَّ ثَمَرَةً مَوْجُودَةً وَلاَ وَلَدًا مُنْفَصِلاً) بەو شاهیدییە مافی میوەی ئاشکرابوو و بێچووی جیابووەوەی نیە، بەلاٌم (وَيَسْتَحِقُّ حَمْلاً فِيالأَصَحِّ) مافی کۆرپەی ناو زگو میوەی دەرنەکەوتووی هەیە، لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەروەها ئەگەر شاهیدەکان بڵێن: پێش دەرکەوتنی میوەو جیابوونەوەی بێچووەکە ملکی وی بوو، ئەو کاتە میوەو بێچووەکەش دەبنە ملکی خۆی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ اشْتَرَى شَيْئًا) ئەگەر شتێکیکڕیو پارەکەشی دا (فَأُخِذَ مِنْهُ بِحُجَّةٍ مُطْلَقَةٍ) ئینجا کڕیارەکە شتەکەی لیٚستێندرا بە بەلگەیەکی بیٚبەروار، واتە: شاهیدەکان شاهیدییان دا ئەم شتە کڕاوە ملکی فلانکەسەو بەرواری ملکایەتیشیان نەگوت، ئەوە لە سەر کڕیارەکە واجبە: شتەکە بداتەوە خاوەنەکەی، ئینجا (رَجَعَ عَلَى بَائِعِهِ بِالثَّمَنِ) کڕیارەکە دەگەڕێتەوە سەر فرۆشیارەکە تاکو پارەی شتەکەی لیٚوەربگرێتەوە.

بەلاٌم ئەگەر کڕیارەکە لە کاتی کڕین دەیزانیشتەکە ملکی فرۆشیارەکە نیە، یان لە دوای داوالێکردن کڕیارەکە دانی هێنا شتەکە ملکی داواکارەکەیە، یان کڕیارەکە سوێندی نەخواردو داواکارەکە سوێندی گەڕاندراوەی خوارد، ئەوە لەو سیٚ حالٌەتانەدا کڕیارەکە مافی نیە پارەکە لە فرۆشیارەکە وەربگرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکانداو لە (بجیرمی)دا فەرموویانە (وَقِيلَ لاَ) لە فەرموودەیەکی بیٚهێزدا کڕیارەکە مافی نیە پارەکە لە فرۆشیارەکەوەربگرێتەوە (إِلاّ إِذَا إِدَّعَى مِلْكاً سَابِقاً عَلَىالشِّرَاءِ) تەنها لەو حالٌەتەدا نەبیٚ کە داواکارەکە بلٌیٚ: لە پێش کڕینەکەوە شتەکە ملکی منە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: لەم مەسەلەیەدا ئەگەر داواکارەکە داوای بەرهەمەکانی مالٌە فرۆشراوەکە نەکا: وەك کریٚ و میوەو بێچوو، ئەوانە گشتی بۆ کڕیارەکە دەمێننەوە ئەگەر لە لای وی پەیدا بوبن، بەلاٌم ئەگەر داواکارەکە داوایان بکا، ئەو کاتە بڕیار دەدریٚ: ئەوانەش لەگەلٌ خودی فرۆشراوەکە بدرێنەوە داواکارەکە، هەروەك لە (تحفە)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ اِدَّعَى مِلْكًا مُطْلَقًا) ئەگەر داواكارێك گوتی: ئەو شتەملْكی منـە، باسـی هـیچ هۆیـەكی ملْكایەتیەكەشی نەكرد (فَشَهِدُوا لَهُ مَعَ سَبَبِهِ) ئینجا شاهیدەكان شاهیدییان بـۆ داو هـۆی



لَـــــمْ يَضُـــــرَّ، وَإِنْ ذَكَـــــرَ سَـــــبَبًا،

(فَصْـــلٌ) قَـــالَ آجَرْتُـــك هَـــذَاالْبَيْتَ بِعَ

بِالْعَشَـــرَةِ. وَأَقَامَـــا بَيِّنَتَـــيْنِ تَعَارَضَـــتَا، وَفِـــى قَـــوْلٍ تُقَـــدَّمُ بَيِّنَـــةُ الْمُسْـــتَأْجِرِ، وَلَـوْ اِدَّعَيَـا شَـيْئًا فِـى يَـدِ ثَالِـثٍ وَأَقَـامَ كُـلٌّ مِنْهُمَـا بَيِّنَـةً أَنَّـهُ اِشْـتَرَاهُ وَوَزَنَ لَـهُ ثَمَنَـهُ: فَإِنْ اِخْتَلَفَ تَارِيخٌ حُكِمَ لِلأَسْبَقِ، وَإِلاَّ تَعَارَضَتَا، وَلَوْ قَالَ كُلٌّ مِنْهُمَا: بِعْتُكَهُ بِكَذَا،

---

ملْكایەتیەكەشیان باس كرد، ئەوە (لَمْ يَضُرَّ) زیانیءنیە، بەلاّم (وَإِنْ ذَكَرَ سَبَبًا وَهُـمْ سَبَبًا آخَرَ) ئەگەر داواكارەكە هۆیەكی ملْكایەتیی باس كردو شاهیدەكانیش هۆیەكیءتریان باس كرد، ئەو كاتە (ضَـرَّ) ئـەو جیاوازییـەی داواكـارو شـاهیدەكان زیـان لـە شـاهیدی دەداو شاهیدیەكەیان ڕەد دەكرێتەوە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی جیاوازی كێشەچیەكان لە چەند شتێكدا ﴾

(قَالَ: آجَرْتُك هَذَا الْبَيْتَ بِعَشْرَةٍ) خاوەنێك گوتی: تەنها ئەم ژوورەم بـە كـریێ داویـێ بـە دە دینار (فَقَالَ: بَلْ جَمِيعَ الدَّارِ بِالْعَشَرَةِ) بەكرێگرەكەش گوتی: بەلْكو هەموو خانووەكەت بە كریێ داومیێ بە دە دینار (وَأَقَامَا بَيِّنَتَيْنِ) هەر دوو لا-هەر یەكەو- شـاهیدی خـۆی هێنـا، ئەوە (تَعَارَضَتَا) شاهیدەكانی هەردوو لا دەبنە دژی یەكترو لە كار دەكەون (وَفِي قَوْلٍ تُقَدَّمُ بَيِّنَةُ الْمُسْتَأْجِرِ) لە فەرموودەیەكدا: شاهیدەكانی بەكرێگرەكە وەپێش دێخرێن.

(وَلَوْ اِدَّعَيَا شَيْئًا فِـى يَـدِ ثَالِـثٍ) ئەگـەر دوو كـەس داوای شـتێكیان كـرد كـە لـە دەست كەسێكیءتری سیێیەمدا بوو و بۆ هیچێكیانیش دانی پیێدا نەهێناو (وَأَقَامَ كُلٌّ مِنْهُمَا بَيِّنَةً أَنَّهُ اشْتَرَاهُ وَوَزَنَ لَهُ ثَمَنَهُ) هەر یەكەش شاهیدی خـۆی هێنـا: كـە ئـەو شـتەی لـەم سـیێیەمە كڕیوەو پارەكەشی داوەتیێ. ئەوە تەماشا دەكەین:

(فَإِنْ اِخْتَلَفَ تَارِيخٌ) ئەگەر بەرواری كڕینەكەیان لێك جیاواز بوو، ئەو كاتە (حُكِمَ لِلأَسْبَقِ) بڕیار دەدریێ: شتەكە بۆ خاوەن بەرواری پێشترە، خاوەن بەرواری دواتریش پارەكەی لە سیێیەمەكە وەردەگرێتەوە (وَإِلاّ) بەلاّم ئەگەر بەروارەكەیان لێك جیاواز نەبو، بەلْكو كڕینی هەردووكیان لە یەك بەرواردا بوو، یان هەر باسی بەروارەكە نەكرا، ئـەو كاتـە (تَعَارَضَـتَا) شاهیدەكانی هەردوو لا دەبنە دژی یـەكترو لـە كـار دەكـەون، كـەوابو: بـۆ هەریـەكێكیان سوێندێك دەخوا: كە نەیفرۆشتۆتیێ. ئینجا واجبە: پارەكەی هەردووكیان بداتەوە.

بەلاّم ئەگەر بۆ تەنها یەكێكیان دانی پیێدا هێنا، ئەو كاتە شتەكە تەسلیمی ئەو دەكـریێو واجبە: پارەكەی ئەویءتریش بداتەوە، چونكە لەو حالْەتانەیڕابردوودا دژایەتی شاهیدەكان لە پارەكەدا نیە، بەلْكو تەنها لە مامڵەتەكەدایە.

(وَ) ئەگەر بە پێچەوانەی وێنەیڕابردوو (لَوْ قَالَ كُلٌّ مِنْهُمَا: بِعْتُكَهُ بِكَذَا) هەر یەكەیان بە سێیەمەكەی گوت: ئەم شتەم فرۆشتۆتە تۆ بە وەندە پارەیە. ئەویش بۆ هیچێكیان

وَأَقَامَاهُمَا: فَإِنْ اِتَّحَدَ تَارِيخُهُمَا تَعَارَضَتَا، وَإِنْ اِخْتَلَفَ لَزِمَهُ الثَّمَنَانِ، وَكَذَا إنْ أَطْلَقَتَا أَوْ إحْدَاهُمَا فِالأَصَحِّ، وَلَوْ مَاتَ عَنْ اِبْنَيْنِ مُسْلِمٍ وَنَصْرَانِيٍّ فَقَالَ كُلٌّ مِنْهُمَا: مَاتَ عَلَى دِينِي: فَإِنْ عُرِفَ أَنَّهُ كَانَ نَصْرَانِيًّا صُدِّقَ النَّصْرَانِيُّ، فَإِنْ أَقَامَا بَيِّنَتَيْنِ مُطْلَقَتَيْنِ قُدِّمَ الْمُسْلِمُ، وَإِنْ قَيَّدَتْ أَنَّ آخِرَ كَلاَمِهِ إسْلاَمٌ وَعَكَسَتْهُ الأُخْرَى تَعَارَضَتَا،

---

دانی پێدا نەهێنا (وَأَقَامَاهُمَا) هەر یەكەش شاهیدی خۆی هێناو داوای پارەكەشی كرد، ئەوە تەماشا دەكەین:

(فَإِنْ اتَّحَدَ تَأْرِيخُهُمَا) ئەگەر بەرواری هەردوو فرۆشتنەكان یەك كات بێ، ئەوە (تَعَارَضَتَا) شاهیدەكانی هەردوو لا دەبنە دژی یەكترو لە كار دەكەون، چونكە ناگونجێ شتێك لە یەك كاتدا هەمووی ملكی تەنها كەسێك بێو هەمووی ملكی تەنها كەسێكیتریش بێ، كەوابو: سێیەمەكە بۆ هەر یەكەیان سوێندێك دەخوا: كە شتەكەی لێنەكڕیوە. ئینجا شتەكەی بۆ خۆی دەمێنێتەوەو هیچ پارەشی لە سەر واجب نابێ.

بەڵام (وَإِنْ اِخْتَلَفَ) ئەگەر بەروارەكەیان بە ئەندازەیەكی وەها لێك جیاواز بوو: كە دەگونجا ملكی هەردووكیان بوبێو هەردووكیان مامڵەتەكەیان كردبێ، ئەو كاتە (لَزِمَهُ الثَّمَنَانِ) پارەی هەردوو داواكارەكانی لە سەر واجب دەبێ (وَكَذَا إنْ أَطْلَقَتَا أَوْ إحْدَاهُمَا) هەروەها ئەگەر شاهیدەكانی هەردوو لا، یان تەنها یەكێكیان بێبەروار شاهیدی بدا، ئەو كاتەش پارەی هەردووكیانی لە سەر واجب دەبێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە لەو حاڵەتەدا دەگونجێ لە دوو كاتدا مامڵەتەكە بەسترا بێ.

(وَلَوْ مَاتَ عَنْ اِبْنَيْنِ: مُسْلِمٍ وَنَصْرَانِيٍّ) ئەگەر یەكێك مرد: كوڕێكی موسوڵمانو كوڕێكی گاوری لە پاش بەجێمان (فَقَالَ كُلٌّ مِنْهُمَا: مَاتَ عَلَى دِينِي) جا هەر یەكەیان گوتی: باوكمان لە سەر ئایینی من مردوەو من میراتی لێدەگرم. هیچ شاهیدیش نەبو، ئەوە تەماشا دەكەین: (فَإِنْ عُرِفَ أَنَّهُ كَانَ نَصْرَانِيًّا) ئەگەر زاندرا: مردووەكە كاتی خۆی گاور بووە، ئەو كاتە (صُدِّقَ النَّصْرَانِيُّ) كوڕە گاورەكە بە سوێندخواردن باوەڕی پێدەكرێ، چونكە بنچینە بەردەوامبوونی كافریەكەیتی (فَإِنْ أَقَامَا بَيِّنَتَيْنِ مُطْلَقَتَيْنِ) جا ئەگەر لەو حاڵەتەدا هەردوو كوڕەكان هەر یەكەو شاهیدی خۆی هێناو بەرواری موسوڵمانیو كافرەیەكەشیان نەگوت، ئەو كاتە (قُدِّمَ الْمُسْلِمُ) شاهیدی كوڕە موسوڵمانەكە وەپێش دێخرێن، چونكە زیاتر زانستیان هەیە كە دەڵێن: لە گاوریەوە بووەتە موسوڵمان.

(وَ) هەر لەم وێنەیەدا (إنْ قَيَّدَتْ: أَنَّ آخِرَ كَلاَمِهِ إسْلاَمٌ وَعَكَسَتْهُ الأُخْرَى) ئەگەر شاهیدەكانی موسوڵمانەكە گوتیان: دوایین قسەی ئیسلامەتی بوو. شاهیدەكانی كافرەكەش گوتیان:

دوايين قسەی كافری بوو. ئەو كاتە (تَعَارَضَتَا) شـاهيدەكان دەبنـە دژی يـەكترو لـە كـار دەكەون، كەوابو: بە سوێندخواردن باوەڕ بە كوڕە گاورەكە دەكرێ.

وَإِنْ لَـمْ يُعْـرَفْ دِينُـهُ وَأَقَـامَ كُـلٌّ بَيِّنَـةً أَنَّـهُ مَـاتَ عَلَـى دِينِـهِ تَعَارَضَـتَا، وَلَـوْ مَـاتَ نَصْـرَانِيٌّ عَـنْ اِبْنَـيْنِ مُسْـلِمٍ وَنَصْـرَانِيٍّ فَقَـالَ الْمُسْـلِمُ أَسْـلَمْتُ بَعْدَ مَوْتِهِ فَالْمِيرَاثُ بَيْنَنَا، فَقَالَ النَّصْرَانِيُّ: بَلْ قَبْلَهُ صُدِّقَ الْمُسْلِمُ بِيَمِينِهِ، وَإِنْ أَقَامَاهُمَا قُدِّمَ النَّصْرَانِيُّ، فَلَوْ اِتَّفَقَا عَلَى إِسْلاَمِ الإِبْنِ فِي رَمَضَانَ، وَقَالَ الْمُسْلِمُ: مَاتَ الأَبُ فِي شَعْبَانَ. وَقَالَ النَّصْرَانِيُّ: فِي شَوَّالٍ. صُدِّقَ النَّصْرَانِيُّ، وَتُقَدَّمُ بَيِّنَةُ الْمُسْلِمِ عَلَى بَيِّنَتِهِ، وَلَوْ مَاتَ عَنْ أَبَوَيْنِ كَافِرَيْنِ وَابْنَيْنِ مُسْلِمَيْنِ فَقَالَ كُلٌّ: مَاتَ عَلَى دِينِنَا،

---

(وَإِنْ لَمْ يُعْرَفْ دِينُهُ) ئەگەر ئايينی مردووەكە نەزانرابو (وَأَقَامَ كُلٌّ بَيِّنَةً أَنَّهُ مَاتَ عَلَى دِينِهِ) هەر دوو كوڕەكانيش شاهيديان هێنـان كـە لـە سـەر ئـايينی خـۆی مـردوە، ئـەو كاتـەش (تَعَارَضَتَا) شـاهيدەكان دەبنـە دژی يـەكترو لـە كـار دەكـەون، كـەوابو: ئەگـەر هـەردوو كوڕەكان سوێند بۆ يەكتری بخۆن ميراتەكە بە نيوەيی لە نێوانياندا بەش دەكرێ.

جا بزانە: لەو حاڵەتانەدا مردووەكە نوێژی لە سـەر دەكـرێو لـە گۆڕستانیموسـوڵمانانـدا دەنێشترێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

(وَلَوْ مَاتَ نَصْرَانِيٌّ) ئەگەر گاورێك مرد (عَنْ ابْنَيْنِ مُسْلِمٍ وَنَصْرَانِيٍّ) كـوڕێكی موسـوڵمانو كوڕێكی گاوری لە پاش بەجێمان (فَقَالَ الْمُسْلِمُ: أَسْلَمْتُ بَعْدَ مَوْتِهِ فَالْمِيرَاثُ بَيْنَنَا) جا كوڕە موسوڵمانەكە گوتی: لە دوای مردنـی باوكمـان بويمـە موسـوڵمان، كـەوابو: ميراتەكـە لـە نێوانماندا هاوبەشە (فَقَالَ النَّصْرَانِيُّ: بَلْ قَبْلَهُ) كوڕە گاورەكەش گوتی: بەڵكو پێش مردنی باوكمان تۆ بويە مسوڵمان، كـەوابو: ميراتەكـە گشـتی بـۆ منـەو تـۆ مـيرات نـاگری. هـيچ لايەكيش شاهيدی نەبو، ئەو كاتـە (صُدِّقَ الْمُسْلِمُ بِيَمِينِهِ) بـە سـوێندخواردن بـاوەڕ بـە موسوڵمانەكە دەكرێ، چونكە بنچينە بەردەوامبوونی كافريەكەيتی، بەڵام (وَإِنْ أَقَامَاهُمَا) ئەگەر هەردوو كوڕەكان شاهيدی خۆيان هێنان، ئەو كاتە (قُدِّمَ النَّصْرَانِيُّ) شـاهيدەكانی گاورەكە وەپێش دێخرێن.

(فَلَوْ اتَّفَقَا عَلَى إِسْلاَمِ الإِبْنِ فِي رَمَضَانَ) جا ئەگەر هەردوو كوڕەكـان يەكـدەنگ بـون: كـە كوڕەكە لە ڕەمەزانـدا بوەتـە موسـوڵمان، بـەڵام (وَقَـالَ الْمُسْلِمُ: مَـاتَ الأَبُ فِـي شَـعْبَانَ) موسوڵمانەكە گوتی: باوكمان لە مانگی شەعباندا مرد، كەوابو: ميراتی لێدەگرم. (وَقَـالَ النَّصْرَانِيُّ: فِي شَوَّالٍ) گاورەكەش گوتی: لە مانگی شەشەڵاندا مردوەو تۆ ميراتی لێناگرێ. ئەو كاتە (صُدِّقَ النَّصْرَانِيُّ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە گاورەكە دەكرێ.

(وَ) ئەگـەر شـاهيد هـەبن، ئـەو كاتـە (تُقَـدَّمُ بَيِّنَـةُ الْمُسْـلِمِ عَلَـى بَيِّنَتِـهِ) شـاهيدەكانی موسوڵمانەكە وەپێش شاهيدەكانی گاورەكە دێخرێن.

(وَلَوْ مَاتَ عَنْ أَبَوَيْنِ كَافِرَيْنِ وَابْنَيْنِ مُسْلِمَيْنِ) ئەگەر یەكێك مرد: دایكوباوكێكی كافر و دوو كوڕی موسوڵمانی لە پاش بەجێمان (فَقَالَ كُلٌّ مَاتَ عَلَى دِينِنَا) جا گشت لایەكیان گوتی: صُدِّقَ الأَبَوَانِ بِالْيَمِينِ، وَفِي قَوْلٍ يُوقَفُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ أَوْ يَصْطَلِحُوا، وَلَوْ شَهِدَتْ أَنَّهُ أَعْتَقَ فِي مَرَضِهِ سَالِمًا، وَأُخْرَى غَانِمًا وَكُلُّ وَاحِدٍ ثُلُثُ مَالِهِ، فَإِنْ اخْتَلَفَ تَارِيخٌ قُدِّمَ الأَسْبَقُ، وَإِنْ اتَّحَدَ أُقْرِعَ، وَإِنْ أَطْلَقَتَا قِيلَ يُقْرَعُ، وَفِي قَوْلٍ يَعْتِقُ مِنْ كُلٍّ نِصْفُهُ، قُلْتُ: اَلْمَذْهَبُ يَعْتِقُ مِنْ كُلٍّ نِصْفُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ شَهِدَ أَجْنَبِيَّانِ أَنَّهُ أَوْصَى بِعِتْقِ سَالِمٍ وَهُوَ ثُلُثُهُ، وَوَارِثَانِ حَائِزَانِ أَنَّهُ رَجَعَ عَنْ ذَلِكَ وَوَصَّى بِعِتْقِ غَانِمٍ وَهُوَ ثُلُثُهُ، ثَبَتَ لِغَانِمٍ، فَإِنْ كَانَ الْوَارِثَانِ فَاسِقَيْنِ لَمْ يَثْبُتْ الرُّجُوعُ فَيَعْتِقُ سَالِمٌ وَمِنْ غَانِمٍ ثُلُثُ مَالِهِ بَعْدَ سَالِمٍ.

---

لە سەر ئایینی ئێمە مردووەو ئێمە میراتی لێدەگرین. ئەوە (صُدِّقَ الأَبَوَانِ بِالْيَمِينِ) باوەڕ بە دایكوباوكە كافرەكە دەكرێ ئەگەر سوێند بخۆن؟ چونكە منداڵ هەر پابەندی دایكو باوكیەتی تا دەزاندرێ پابەندیەكەی نەماوە، بەڵام (وَفِيقَوْلٍ يُوقَفُ حَتَّىيَتَبَيَّنَ أَوْ يَصْطَلِحُوا) لە فەرموودەیەكدا: كارەكە ڕادەگیرێ تا ڕوّن دەبێتەوە، یان تا لە سەر شتێك پێك دێن.

(وَلَوْ شَهِدَتْ أَنَّهُ أَعْتَقَ فِي مَرَضِهِ سَالِمًا) ئەگەر دوو شاهید شاهیدییان دا: فلانكەس لە نەخۆشی مردنیدا (سالم)ی ئازاد كردوە (وَأُخْرَى غَانِمًا) دووی‌تریش شاهیدییان دا: لە نەخۆشی مردنیدا (غانم)ی ئازاد كردوە (وَكُلُّ وَاحِدٍ ثُلُثُ مَالِهِ) هەر كۆیلەیەكیش بە تەنها سێیەكی ماڵەكەی بوو، تەماشا دەكەین: (فَإِنْ اخْتَلَفَ تَارِيخٌ قُدِّمَ الأَسْبَقُ) ئەگەر بەرواری ئازادكردنەكە جیاواز بوو، ئەوە پێشترەكە ئازاد دەبێ (وَإِنْ اتَّحَدَ أُقْرِعَ) ئەگەر بەروارەكەش یەك بوو، ئەوە پشكە لە نێوان كۆیلەكاندا دەكرێ: كامەیان دەرچو ئەویان ئازاد دەبێ (وَإِنْ أَطْلَقَتَا) ئەگەر بێ‌بەروار شاهیدییان دا، ئەوە (قِيلَ يُقْرَعُ) لە فەرموودەیەكی بێ‌هێزدا: پشكە لە نێوانیاندا دەكرێ (وَفِي قَوْلٍ يَعْتِقُ مِنْ كُلٍّ نِصْفُهُ) لە فەرموودەیەكدا: لە هەر كۆیلەیەك نیوەی ئازاد دەبێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) فەرموویەتی (اَلْمَذْهَبُ يَعْتِقُ مِنْ كُلٍّ نِصْفُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: لە هەر كۆیلەیەك نیوەی ئازاد دەبێ.

(وَلَوْ شَهِدَ أَجْنَبِيَّانِ: أَنَّهُ أَوْصَى بِعِتْقِ سَالِمٍ وَهُوَ ثُلُثُهُ) ئەگەر دوو بیگانە شاهیدییان دا: فلاكەس وەسێتی كردوە (سالم) ئازاد بكرێ. (سالم)ش سێیەكی ماڵەكەی بوو (وَوَارِثَانِ حَائِزَانِ) دوو میراتگری هەموو میراتبەریش شاهیدییان دا: (أَنَّهُ رَجَعَ عَنْ ذَلِكَ وَوَصَّى بِعِتْقِ غَانِمٍ وَهُوَ ثُلُثُهُ) وەسێتكەرەكە لە (سالم) پەشیمان بۆوەو وەسێتی كرد (غانم) ئازاد بكرێ. (غانم)ش سێیەكی ماڵەكەی بوو، ئەوە (ثَبَتَ لِغَانِمٍ) وەسێتی ئازادكردنەكە بۆ (غانم) جێگیر دەبێ، بەڵام (فَإِنْ كَانَ الْوَارِثَانِ فَاسِقَيْنِ) ئەگەر میراتگرەكان فاسق بن، ئەو كاتە (لَمْ يَثْبُتْ الرُّجُوعُ) پەشیمانبوونەوەكە ئاشكرا نابێ (فَيَعْتِقُ سَالِمٌ) كەوابو: (سالم) ئازاد دەبێ بە شاهیدی بێگانەكانو (وَمِنْ غَانِمٍ ثُلُثُ مَالِهِ بَعْدَ سَالِمٍ) لە (غانم)ش

به ئەندازەی سێیەكی ماڵەكەی ئازاد دەبێ: ئەو ماڵەی لە دوای (سالم) ماوەتەوە، بە هۆی دانهێنانی میراتگرەكان.

(فَصْــــــلٌ) شَــــــرْطُ الْقَــــــائِفِ: مُسْــــــلِمٌ عَــــــدْلٌ مُجَــــــرَّبٌ، وَالأَصَــــــحُّ اِشْــتِرَاطُ حُــرٍّ ذَكَــرٍ، لاَ عَــدَدٍ وَلاَ كَوْنِــهِ مُــدْلِجِيًّا، فَــإِذَا تَــدَاعَيَا مَجْهُــولاً عُــرِضَ عَلَيْــهِ، وَكَــذَا لَــوْ اِشْــتَرَكَا فِــي وَطْءٍ فَوَلَــدَتْ وَلَــدًا مُمْكِنًــا مِنْهُمَــا وَتَنَازَعَــاهُ بِــأَنْ وَطِئَــا اِمْــرَأَةً بِشُبْهَةٍ أَوْ مُشْتَرَكَةً لَهُمَا أَوْ وَطِئَ زَوْجَتَهُ وَطَلَّقَ فَوَطِئَهَا آخَرُ بِشُبْهَةٍ أَوْ نِكَاحٍ فَاسِدٍ،

---

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی (اَلْقَائِف)=دروشمناس ﴾**

**(اَلْقَائِف)=دروشمناس، ئەو كەسەیە نەژادی كەسێك دەگەیێنێتەكەسێكیتر لە حاڵەتی گوماندا، بەو زانستەی خوای گەورە داویەتیێ، بە بەڵگەی ﴿عن عائشةرضالله عنها: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِﷺ ذاتَ يَوْمٍ مَسْرُوراً، فَقَالَ: أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزاً الْمُدْلِجِيَّ دَخَلَ عَلَيَّ فَرَأَى أُسامَةَ وَزَيْداً وَعَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ قَدْ غَطَّيَا رُؤُوسَهُمَا وَبَدَتْ أَقْدامُهُما، فَقَالَ: هَذِهِ الأَقْدامُ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ﴾ رواه الشيخان، قال أبوداود: ﴿كَانَ أُسَامَةُ أَسْوَدَ وَزَيْدٌ أَبْيَضَ﴾ ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ بە دڵخۆشیەوە هاتە لامو فەرمووی: ئەرێ نەتدیت (مُجَزِّز) هاتە لامو دیتی (أُسَامَة) لەگەڵ (زَيد)ی باوكی پەشتەماڵێكیان لە سەر بوو و سەری خۆیان پێداپۆشی بوو و پێیەكانیان لە دەرەوە بوو، جا (مُجَزِّز) گوتی: ئەم پێیانە هەندێكیان لە نەژادی هەندێكیانن.**

**واتە: چونكە (أسامە) ڕەش بوو، (زید)ی باوكیشی سپی بوو، كافرەكان بوختانیان بە نەژادەكەی دەكرد، دروشمناسەكەش بە تەنها دیتنی پێیەكانیان زانی ئەوانە كوڕو باوكن، پێغەمبەریشﷺ ڕەخنەی لێنەگرتو بە دروشمناسیەكەی ڕازی بوو.**

**( شَرْطُ الْقَائِفِ) مەرجی دروشمناس: (مُسْلِمٌ عَدْلٌ مُجَرَّبٌ) دەبێ موسوڵمانێكی دادپەروەری تاقیكراوە بێ (وَالأَصَحُّ اِشْتِرَاطُ حُرٍّ ذَكَرٍ) بە فەرموودەی ڕاستتر مەرجە: ئازادو نێرینەش بێ (لاَ عَدَدٍ) بەڵام مەرج نیە لە یەك كەس زیاتر بێ، هەم (وَلاَ كَوْنِهِ مُدْلِجِيًّا) مەرجیش نیە لە هۆزی (مُدْلِج) بێ: كە هۆزی دروشمناسەكەی حەدیسەكەیە.**

**(فَإِذَا تَدَاعَيَا مَجْهُولاً) جا ئەگەر دوو كەس داوای نەژادی منداڵێكی نەناسراویان كرد، ئەوە (عُرِضَ عَلَيْهِ) پیشانی دروشمناسێك دەدرێ: جا دورشمناسەكە بیگەیێنێتە كامەیان ئەوە نەژادی منداڵەكە دەگاتە ئەوی.**

**(وَكَذَا لَوْ اِشْتَرَكَا فِي وَطْءٍ) هەروەها منداڵەكە پیشانی دروشمناس دەدرێ ئەگەر دوو پیاو بە هاوبەشی جیماعیان لەگەڵ ئافرەتێك كرد (فَوَلَدَتْ وَلَدًا مُمْكِنًا مِنْهُمَا) جا ئافرەتەكەش منداڵێكی بوو، دەشگونجا منداڵەكە لە هەردووكیان بێو (وَتَنَازَعَاهُ) هەردووكیان لە منداڵەكەدا بووە كێشەیان:**

**(بِأَنْ وَطِئَا اِمْرَأَةً بِشُبْهَةٍ) وەك دوو پیاوەكە بە هەڵە جیماعیان لەگەڵ ئافرەتێك كردبێ (أَوْ**

مُشْتَرَكَةً لَهُمَا) یان لەگەڵ (جاریە)كی هاوبەش لە نێوانیاندا (أَوْ وَطِئَ زَوْجَتَهُ وَطَلَّقَهَا) یان جیماعی لەگەڵ ژنی خۆی كردو تەڵاقی دا، ئینجا (فَوَطِئَهَا آخَرُ بِشُبْهَةٍ أَوْ نِكَاحٍ فَاسِدٍ) أَوْ أَمَتَهُ فَبَاعَهَا فَوَطِئَهَا الْمُشْتَرِي وَلَمْ يَسْتَبْرِئْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا، وَكَذَا لَوْ وَطِئَ مَنْكُوحَةً فِالأَصَحِّ، فَإِذَا وَلَدَتْ لِمَا بَيْنَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ وَأَرْبَعِ سِنِينَ مِنْ وَطْأَيْهِمَا وَادَّعَيَاهُ عُرِضَ عَلَيْهِ، فَإِنْ تَخَلَّلَ بَيْنَ وَطْأَيْهِمَا حَيْضَةٌ فَلِلثَّانِي إلاَّ أَنْ يَكُونَ الأَوَّلُ زَوْجًا فِي نِكَاحٍ صَحِيحٍ، وَسَوَاءٌ فِيهِمَا اتَّفَقَا إسْلاَمًا وَحُرِّيَّةً أَمْ لاَ.

(كِتَابُ الْعِتْقِ)

---

پیاوێكیتریش جیماعی لەگەڵ ژنەكە كرد بە هەڵە، یان بە مارەبڕینێكی بەتاڵو دانەمەزراو (أَوْ أَمَتَهُ فَبَاعَهَا) یان جیماعی لەگەڵ (جاریە)كەی خۆی كردو فرۆشتی، ئینجا (فَوَطِئَهَا الْمُشْتَرِي) كڕیارەكەش جیماعی لەگەڵ (جاریة)كە كردو (وَلَمْ يَسْتَبْرِئْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا) هیچێكیشیان دڵنیاییان لە (جارية)كەدا نەكرد (وَكَذَا لَوْ وَطِئَ مَنْكُوحَةً) هەروەها ئەگەر بە هەڵە جیماعی لەگەڵ مارەبڕاوێكی كەسێكیتر كرد (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، ئەوە لەو هەموو مەسەلانەشدا منداڵەكە پیشانی دروشمناسەكە دەدرێ.

(فَإِذَا وَلَدَتْ) جا ئەگەر ئەو ئافرەتەی لەو مەسەلانەیڕابردوودا جیماعی لەگەڵ كراوە منداڵێكی بوو (لِمَا بَيْنَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ وَأَرْبَعِ سِنِينَ) لە نێوان شەش مانگو چوار ساڵ: كە (مِنْ وَطْأَيْهِمَا) لە جیماعی هەردووكیانەوە حیساب دەكرێ (وَادَّعَيَاهُ) هەردووكیشیان داوای منداڵەكەیان كرد، ئەوە (عُرِضَ عَلَيْهِ) منداڵەكە پیشانی دروشمناسەكە دەدرێو دەبێتە هی ئەو پیاوەی دروشمناسەكە دەیگەینێتێ، بەڵام (فَإِنْ تَخَلَّلَ بَيْنَ وَطْأَيْهِمَا حَيْضَةٌ) ئەگەر لە نێوان جیماعی یەكەمەكەو دووەمەكەدا ئافرەتەكە حەیزێكی بینی، ئەو كاتە (فَلِلثَّانِي) منداڵەكە بۆ دووەمەكەیە، چونكە حەیزەكە نیشانەیەكی بەهێزە: كە منداڵی یەكەمەكە نیە، چونكە پەیوەندیی بەویەوە نەماوە.

(إلاَّ أَنْ يَكُونَ الأَوَّلُ زَوْجًا فِي نِكَاحٍ صَحِيحٍ) تەنها ئەگەر یەكەمەكە مێردی ئافرەتەكە بێو لە مارەبڕینێكی دروستدا جیماعی لەگەڵ كردبێ، دووەمەكەش بە هەڵە جیماعی لەگەڵ كردبێ، ئەو كاتە پەیوەندی بە یەكەمەكەوە هەر دەمێنێ، كەوابو: دەگونجێ لە هەردووكیان بێو پیشانی دروشمناسێك دەدرێ.

(وَسَوَاءٌ فِيهِمَا) یەكسانە لەو دوو پیاوانەدا: (اتَّفَقَا إسْلاَمًا وَحُرِّيَّةً أَمْ لاَ) هەردووكیان وەكو یەكتری موسوڵمانو ئازاد بن، یان لێك جیاواز بن، چونكە نەژاد بە كافریو ئیسلامەتی ناگۆڕێ.

## ﴿ كِتَابُ الْعِتْقِ: پەڕتوكی كۆیلە ئازادكردن ﴾

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً أَعْتَقَ اللهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهَا عُضْواً مِنْ أَعْضَائِهِ

مِنَ النَّارِ ﴾ رواه الشيخان، هەر موسوڵمانێك كۆیلەیەكی موسوڵمان ئازاد بكا، خوای گەورە لە بەرامبەر گشت ئەندامێكی كۆیلەكە ئەندامێكی ئازادكەرەكە ئازاد دەكا لە ئاگری دۆزەخ.

إنَّمَا يَصِحُّ مِنْ مُطْلَقِ التَّصَرُّفِ، وَيَصِحُّ تَعْلِيقُهُ وَإضَافَتُهُ إلَى جُزْءٍ فَيَعْتِقُ كُلُّهُ، وَصَرِيحُهُ: تَحْرِيرٌ وَإعْتَاقٌ، وَكَذَا فَكُّ رَقَبَةٍ فِالأَصَحِّ، وَلاَ يَحْتَاجُ إلَى نِيَّةٍ، وَيَحْتَاجُ إلَيْهَا كِنَايَتُهُ، وَهِيَ لاَ مِلْكَ لِي عَلَيْكَ، لاَ سُلْطَانَ، لاَ سَبِيلَ، لاَ خِدْمَةَ، أَنْتَ سَائِبَةٌ، أَنْتَ مَوْلاَيَ، وَكَذَا كُلُّ صَرِيحٍ أَوْ كِنَايَةٍ لِلطَّلاَقِ، وَقَوْلُهُ لِعَبْدٍ: أَنْتِ حُرَّةٌ، وَلأَمَةٍ أَنْتَ حُرٌّ صَرِيحٌ، وَلَوْ قَالَ عِتْقُكَ إلَيْك أَوْ خَيَّرْتُك وَنَوَى تَفْوِيضَ الْعِتْقِ إلَيْهِ فَأَعْتَقَ نَفْسَهُ فِالْمَجْلِسِ عَتَقَ، أَوْ أَعْتَقْتُك عَلَى أَلْفٍ، أَوْ أَنْتَ حُرٌّ عَلَى أَلْفٍ فَقَبِلَ، أَوْ قَالَ لَهُ الْعَبْدُ أَعْتِقْنِي عَلَى أَلْفٍ،

---

(إنَّمَا يَصِحُّ مِنْ مُطْلَقِ التَّصَرُّفِ) كۆیلە ئازادكردن تەنها لەو كەسەوە دروست دەبێ: كە بالغو عاقڵ بێو زۆرلێكراو و قەدەغەكراو نەبێ (وَيَصِحُّ تَعْلِيقُهُ) دروستە ئازادكردنەكە هەڵبواسێ: وەك هەر كاتێك نەخۆشەكەم چاك بووە تۆ ئازادی. هەم (وَ إضَافَتُهُ إلَى جُزْءٍ) دروستە ئازادكردنەكە بداتە پاڵ ئەندامێكی كۆیلەكە: وەك دەستێكت ئازاد بێ. كەوابو: (فَيَعْتِقُ كُلُّهُ) كۆیلەكە هەمووی ئازاد دەبێ ﴿عن سمرةﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ شِقْصاً فِي مَمْلُوكٍ، فَقَالَ النَّبيُّﷺ: هُوَ كُلَّهُ فَلَيْسَ لِلَّهِ شَرِيكٌ﴾ رواه أحمد باسناد حسن، پیاوێك بەشێكی كۆیلەیەكی خۆی ئازاد كرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كۆیلەكە هەمووی ئازادەو خوای گەورە هاوبەشی نیە.

(وَصَرِيحُهُ) وشەی ئاشكرای ئازادكردن: (تَحْرِيرٌ وَإعْتَاقٌ) ئازادم كرد (وَكَذَا فَكُّ رَقَبَةٍ فِي الأصَحِّ) هەروەها گەردەنی ئەم كۆیلەم بەرهەڵ دا (وَلاَ يَحْتَاجُ إلَى نِيَّةٍ) وشەی ئاشكرا پێویستی بە نیەتهێنان نیە، بەڵام (وَيَحْتَاجُ إلَيْهَا كِنَايَتُهُ) وشەی نائاشكرا پێویستی بە نیەت هەیە (وَهِيَ) وشەی نائاشكرای ئازادكردن: (لاَ مِلْكَ لِي عَلَيْكَ) هیچ ملكایەتیم لە سەر تۆ نیە (لاَ سُلْطَانَ) هیچ دەسەڵاتم بە سەر تۆدا نیە (لاَ سَبِيلَ) هیچ رێگایەكم بە سەر تۆدا نیە (لاَ خِدْمَةَ) هیچ خزمەتێكم لە سەر تۆ نیە (أَنْتَ سَائِبَةٌ) تۆ حەتەڵلای (أَنْتَ مَوْلاَيَ) تۆ گەورەی منی (وَكَذَا كُلُّ صَرِيحٍ أَوْ كِنَايَةٍ لِلطَّلاَقِ) هەروەها گشت وشەیەكی ئاشكراو نائاشكرای تەڵاقیش دەبنە وشەی نائاشكرای ئازادكردن (وَقَوْلُهُ لِعَبْدٍ: أَنْتِ حُرَّةٌ، وَلأَمَةٍ أَنْتَ حُرٌّ صَرِيحٌ) ئەگەر بڵێتە كۆیلە نێرەكەی: تۆ ئافرەتێكی ئازادی. یان بڵێتە كۆیلە مێیەكەی: تۆ پیاوێكی ئازادی. هەردووكی وشەی ئاشكرای ئازادكردنن.

(وَلَوْ قَالَ: عِتْقُكَ إلَيْك) ئەگەر بڵێتە كۆیلەكەی: ئازادكردنی تۆم خستە لای تۆ (أَوْ خَيَّرْتُك) یان گوتی: تۆم كردە سەرپشك (وَنَوَى تَفْوِيضَ الْعِتْقِ إلَيْهِ) مەبەستیشی ئەوە بوو ئازادكردنەكەی بداتە دەستە خۆی (فَأَعْتَقَ نَفْسَهُ فِيالْمَجْلِسِ) كۆیلەكەش لەو دانیشتنەدا خۆی ئازاد كرد، ئەوە (عَتَقَ) ئازاد دەبێ (أَوْ أَعْتَقْتُك عَلَى أَلْفٍ) یان گوتی تۆم ئازاد كرد لە

سەر هەزار دینار (أَوْ أَنْتَ حُرٌّ عَلَى أَلْفٍ) یان گوتی تۆ ئازادی لە سەر هەزار دینار (فَقَبِلَ) ئینجا دەمودەستیش کۆیلەکە قبوڵی کرد (أَوْ قَالَ لَهُ الْعَبْدُ: أَعْتِقْنِي عَلَى أَلْفٍ) یان کۆیلەکە فَأَجَابَهُ عَتَقَ فِالْحَالِ، وَلَزِمَهُ الأَلْفُ، وَلَوْ قَالَ بِعْتُكَ نَفْسَكَ بِأَلْفٍ فَقَالَ اِشْتَرَيْتُ فَالْمَذْهَبُ صِحَّةُ الْبَيْعِ وَيَعْتِقُ فِالْحَالِ وَعَلَيْهِ الأَلْفُ، وَالْوَلاَءُ لِسَيِّدِهِ، وَلَوْ قَالَ لِحَامِلٍ أَعْتَقْتُكِ أَوْ أَعْتَقْتُكِ دُونَ حَمْلِكِ عَتَقَا، وَلَوْ أَعْتَقَهُ عَتَقَ دُونَهَا، وَلَوْ كَانَتْ لِرَجُلٍ وَالْحَمْلُ لآخَرَ لَمْ يَعْتِقْ أَحَدُهُمَا بِعِتْقِ الآخَرِ، وَإِذَا كَانَ بَيْنَهُمَا عَبْدٌ فَأَعْتَقَ أَحَدُهُمَا كُلَّهُ أَوْ نَصِيبَهُ عَتَقَ نَصِيبُهُ فَإِنْ كَانَ مُعْسِرًا بَقِيَ الْبَاقِي لِشَرِيكِهِ، وَإِلاَّ سَرَى إِلَيْهِ أَوْ إِلَى مَا أَيْسَرَ بِهِ،

---

گوتیە گەورەکەی لە سەر هەزار دینار ئازادم بکە (فَأَجَابَهُ) دەمودەستیش گەورەکە وەڵامی داوە، ئەوە (عَتَقَ فِيالْحَالِ وَلَزِمَهُ الأَلْفُ) لە هەر سێك وێنەدا دەمودەست کۆیلەکە ئازاد دەبێ‌و هەزار دینارەکەشی لە سەر واجب دەبێ بۆ گەورەکەی.

(وَلَوْ قَالَ بِعْتُكَ نَفْسَكَ بِأَلْفٍ) ئەگەر گەورەکە گوتی: خودی تۆم فرۆشتە تۆ بە هەزار دینار (فَقَالَ اِشْتَرَيْتُ) کۆیلەکەش گوتی: خۆمم لە تۆ کڕی. ئەوە (فَالْمَذْهَبُ صِحَّةُ الْبَيْعِ) فرۆشتنەکە دروست دەبێ‌و (وَيَعْتِقُ فِيالْحَالِ) دەمودەست کۆیلەکە ئازاد دەبێ‌و (وَعَلَيْهِ الأَلْفُ) هەزار دینارەکەشی بۆ گەورەکەی لە سەری واجب دەبێ (وَالْوَلاَءُ لِسَيِّدِهِ) خزمایەتی ئازادکردنیشی بۆ گەورەکەیەتی.

(وَلَوْ قَالَ لِحَامِلٍ: أَعْتَقْتُكِ أَوْ أَعْتَقْتُكِ دُونَ حَمْلِكِ) ئەگەر گوتیە (جاریە) ئاوسەکەی: تۆم ئازاد کرد، یان تۆم ئازاد کرد بەڵام کۆرپەکەت ئازاد نەبێ. ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا (عَتَقَا) کۆرپەکەی ناو زگو دایکەکەی وێکڕا ئازاد دەبن، چونکە لێك جیانەبوینەوەو کۆرپەکە پابەندی دایکیەتی، بەڵام (وَلَوْ أَعْتَقَهُ) ئەگەر تەنها کۆرپەکەی ئازاد کرد، ئەو کاتە (عَتَقَ دُونَهَا) کۆرپەکە ئازاد دەبێ‌و دایکەکە ئازاد نابێ، چونکە دایکەکە پابەندی کۆرپەکەی نیە (وَلَوْ كَانَتْ لِرَجُلٍ وَالْحَمْلُ لآخَرَ) ئەگەر (جاریە)کە ملکی پیاوێك بێ‌و کۆرپەکەش ملکی پیاوێکیتر بێ، ئەو کاتە (لَمْ يَعْتِقْ أَحَدُهُمَا بِعِتْقِ الآخَرِ) هیچیێکیان بە ئازادکردنی ئەویتر ئازاد نابێ، چونکە خاوەنەکانیان لێك جیانە.

## ﴿ کۆیلەی(مُبَعَّض)=بەشکراو ﴾

(وَإِذَا كَانَ بَيْنَهُمَا عَبْدٌ) ئەگەر کۆیلەیەك هاوبەش بێ لە نێوان دوو کەساندا (فَأَعْتَقَ أَحَدُهُمَا كُلَّهُ أَوْ نَصِيبَهُ) ئینجا یەکێکیان هەموو کۆیلەکەی ئازاد کرد، یان تەنها بەشەکەی خۆی ئازاد کرد، ئەوە (عَتَقَ نَصِيبُهُ) بەشەکەی خۆی ئازاد دەبێ، ئینجا لەبارەی بەشی هاوبەشەکەشی تەماشا دەکەین: (فَإِنْ كَانَ مُعْسِرًا) ئەگەر ئازادکەرەکە نەبوویی بێ، ئەوە (بَقِيَ الْبَاقِي لِشَرِيكِهِ) ئەو بەشەی لە کۆیلەکە ماوە بۆ هاوبەشەکەی دەمێنێتەوەو بەشەکە ئازاد نابێ،کەواتە: کۆیلەکە دەبێتە (مُبَعَّض): بەشکراو.

(وَإِلاَّ) بەلآم ئەگەر ئازادكەرەكە هەبوویی بێ، ئەو كاتە (سَرَى إِلَيْهِ) ئازادكردنەكەی وی پێ‌دا دەڕواتە لای بەشی هاوبەشەكەی‌و بەشەكەی هاوبەشەكەشی ئازاد دەبێ (أَوْ إِلَى مَا أَيْسَرَ بِهِ) وَعَلَيْهِ قِيمَةُ ذَلِكَ يَوْمَ الإِعْتَاقِ، وَتَقَعُ السِّرَايَةُ بِنَفْسِ الإِعْتَاقِ، وَفِي قَوْلٍ بِأَدَاءِ الْقِيمَةِ، وَقَوْلٍ إنْ دَفَعَهَا بَانَ أَنَّهَا بِالإِعْتَاقِ، وَاسْتِيلاَدُ أَحَدِالشَّرِيكَيْنِ الْمُوسِرِ يَسْرِي، وَعَلَيْهِ قِيمَةُ نَصِيبِ شَرِيكِهِ وَحِصَّتُهُ مِنْ مَهْرِمِثْلٍ، وَتَجْرِيالأَقْوَالُ فِي وَقْتِ حُصُولِ السِّرَايَةِ، فَعَلَى الأَوَّلِ وَالثَّانِي لاَ تَجِبُ قِيمَةُ حِصَّتِهِ مِنَ الْوَلَدِ، وَلاَ يَسْرِي تَدْبِيرٌ،

---

یان پێ‌دا دەڕواتە لای ئەوەندەی توانای نرخەكەی هەیەو هەر بەو ئەندازەیە لە بەشی هاوبەشەكەی ئازاد دەبێ، ئینجا لە هەردوو حاڵەتدا (وَعَلَيْهِ قِيمَةُ ذَلِكَ يَوْمَ الإِعْتَاقِ) لە سەر ئازادكەرەكە واجبە نرخی ئەو بەشە ئازاد بووە بداتە هاوبەشەكەی بەگوێرەی نرخی ڕۆژی ئازادكردن، چونكە بووەتە هۆی لە دەستدانی بەشی هاوبەشەكەی.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ أَعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي عَبْدٍ وَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ قُوِّمَ الْعَبدُ عَلَيْهِ قِيمَةَ عَدْلٍ وَأُعْطِيَ شُرَكَائُهُ حِصَصَهُمْ وَعَتَقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ، وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ﴾ رواه الشيخان، هەر كەسێك بەشە كۆیلەكی خۆی ئازاد كردو بە ئەندازەی نرخی كۆیلەكەش ماڵی هەبوو، ئەوە كۆیلەكەی لە سەر دەقرسێندرێ‌و بەشی هاوبەشەكانی لەو نرخە دەدرێ‌و كۆیلەكە—هەمووی— لە سەر حیسابی وی ئازاد دەبێ، بەلآم ئەگەر بەو ئەندازەیە ماڵی نەبو، ئەو كاتە—تەنها— بەشەكەی وی لە كۆیلەكە ئازاد دەبێ‌و بەشی هاوبەشەكانی‌تر بە كۆیلەیی دەمێنێتەوە.

(وَتَقَعُ السِّرَايَةُ بِنَفْسِ الإِعْتَاقِ) پێداڕۆیشتنی ئازادبوونەكە بە خودی ئازادكردنەكە دەبێ (وَفِي قَوْلٍ بِأَدَاءِ الْقِيمَةِ) لە فەرموودەیەكدا: بە دانی نرخەكە دەبێ (وَفِي قَوْلٍ: إِنْ دَفَعَهَا بَانَ أَنَّهَا بِالإِعْتَاقِ) لە فەرموودەیەكی‌تردا: ئەگەر نرخەكەی دا، ئەوە ئاشكرا دەبێ بە ئازادكردنەكە پێداڕۆیشتنەكە بووە.

(وَ) هەروەها (اسْتِيلاَدُ أَحَدِ الشَّرِيكَيْنِ الْمُوسِرِ يَسْرِي) ئەگەر هاوبەشێكی هەبوویی (جارية)كە بكاتە (أُمُّ الْوَلَد): دایكە منداڵ، ئەو دایكەمنداڵیەش پێ‌دا دەڕواتە لای بەشی هاوبەشەكەی‌تر، كەوابو: (وَعَلَيْهِ قِيمَةُ نَصِيبِ شَرِيكِهِ) لە سەر هەبوویەكە واجبە: نرخی بەشی هاوبەشەكەی بدا، هەم (وَحِصَّتُهُ مِنْ مَهْرِ مِثْلٍ) بەگوێرەی بەشەكە لە مارەیی هاووێنەی (جارية)كەش واجبە بداتە هاوبەشەكەی، چونكە لە بەشەكەی ویش لەزەتی وەرگرتوە (وَتَجْرِيالأَقْوَالُ فِي وَقْتِ حُصُولِ السِّرَايَةِ) سێ فەرموودەكانی‌ڕابردوو لە بارەی كاتی بوونی پێداڕۆیشتنەكەدا، لێرەشدا دێنەجێ، كەواتە: بە خودی ئاوسبوونەكە پێداڕۆیشتنەكە دێتەجێ (فَعَلَىالأَوَّلِ وَالثَّانِي لاَ تَجِبُ قِيمَةُ حِصَّتِهِ مِنَ الْوَلَدِ) جا لە سەر فەرموودەی یەكەم‌و سێیەم نرخی بەشە منداڵەكەی لە سەر واجب نابێ بۆ هاوبەشەكەی،

چونكه منداڵەكە بە ئازادی لە زگی دایكی‌دا جێگیر بووە.
(وَلاَ يَسْرِي تَدْبِيرٌ) ئازادكردنی بەشەكەی خۆی لە دوای مردن پێ‌دا ناڕواتە لای بەشی
وَلاَ يَمْنَعُ السِّرَايَةَ دَيْنٌ مُسْتَغْرِقٌ فِالأَظْهَرِ، وَلَوْ قَالَ لِشَرِيكِهِ الْمُوسِرِ: أَعْتَقْتَ نَصِيبَك فَعَلَيْك قِيمَةُ نَصِيبِي فَأَنْكَرَ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ فَلاَ يَعْتِقُ نَصِيبُهُ وَيَعْتِقُ نَصِيبُ الْمُدَّعِي بِإِقْرَارِهِ إنْ قُلْنَا يَسْرِي بِالإِعْتَاقِ، وَلاَ يَسْرِي إلَى نَصِيبِ الْمُنْكِرِ، وَلَوْ قَالَ لِشَرِيكِهِ: إنْ أَعْتَقْت نَصِيبَكَ فَنَصِيبِي حُرٌّ بَعْدَ نَصِيبِك فَأَعْتَقَ الشَّرِيكُ وَهُوَ مُوسِرٌ سَرَى إلَى نَصِيبِ الأَوَّلِ إنْ قُلْنَا: السِّرَايَةُ بِالإِعْتَاقِ، وَعَلَيْهِ قِيمَتُهُ، وَلَوْ قَالَ فَنَصِيبِي حُرٌّ قَبْلَهُ، فَأَعْتَقَ الشَّرِيكُ، فَإِنْ كَانَ الْمُعَلِّقُ مُعْسِرًا عَتَقَ نَصِيبُ كُلٍّ عَنْهُ، وَالْوَلاَءُ لَهُمَا، وَكَذَا إنْ كَانَ مُوسِرًا وَأَبْطَلْنَا الدَّوْرَ، وَإِلاَّ

---

هاوبەشەكەی‌تر (وَلاَ يَمْنَعُ السِّرَايَةَ دَيْنٌ مُسْتَغْرِقٌ فِي‌الأَظْهَرِ) قەرزێك كە هەموو ماڵەكەی دابگرێتەوە ڕێگەی پێداڕۆیشتنی ئازادبوونەكە ناگرێ (وَلَوْ قَالَ لِشَرِيكِهِ الْمُوسِرِ) ئەگەر هاوبەشێك گوتیە هاوبەشە هەبووەكەی خۆی: (أَعْتَقْتَ نَصِيبَك فَعَلَيْك قِيمَةُ نَصِيبِي) تۆ بەشە كۆیلەكەت خۆت ئازاد كردووە، كەوابو: لە سەرت واجبە نرخی بەشەكەی من بدەی (فَأَنْكَرَ) هابەشەكەش دانی پێ‌دا نەهێناو هیچ شاهیدیش نەبو، ئەوە (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە داننەهێنەرەكە دەكرێ، كەوابو: (فَلاَ يَعْتِقُ نَصِيبُهُ) بەشەكەی وی ئازاد نابێ ئەگەر سوێند بخوا، بەلاّم (وَيَعْتِقُ نَصِيبُ الْمُدَّعِي بِإِقْرَارِهِ) بەشی هاوبەشە داواكارەكە بە هۆی دانپێداهێنانی‌خۆی ئازاد دەبێ (إنْ قُلْنَا يَسْرِي بِالإِعْتَاقِ) ئەگەر بڵێین: پێداڕۆیشتنەكە بە خودی ئازاد كردنەكە دەبێ، بەلاّم (وَلاَ يَسْرِي الى نَصِيبِ الْمُنْكِرِ) ئەو ئازادبوونە پێ‌دا ناڕواتە لای بەشی داننەهێنەرەكە.
(وَلَوْ قَالَ لِشَرِيكِهِ) ئەگەر گوتیە هاوبەشەكەی خۆی: (إنْ أَعْتَقْتَ نَصِيبَكَ فَنَصِيبِي حُرٌّ بَعْدَ نَصِيبِك) ئەگەر تۆ بەشە كۆیلەكەی خۆت ئازاد كرد، ئەوە بەشەكەی منیش لە دوای ئازادبوونی بەشەكەی تۆ ئازاد بێ (فَأَعْتَقَ الشَّرِيكُ وَهُوَ مُوسِرٌ) ئینجا هاوبەشەكە بەشەكەی خۆی ئازاد كردو هەبوویش بوو، ئەوە (سَرَى الى نَصِيبِ الأَوَّلِ) ئازادكردنەكە پێ‌دا دەڕواتە لای بەشی هاوبەشەكەی‌یەكەم (إنْ قُلْنَا السِّرَايَةُ بِالإِعْتَاقِ) ئەگەر بڵێین: پێداڕۆیشتنەكە بە خودی ئازادكردنەكە دەبێ، كەوابو: (وَعَلَيْهِ قِيمَتُهُ) لە سەر ئازادكەرەكە واجبە: نرخی بەشی هەڵواسەرەكە بدا، چونكە ئازادبوونی بەشەكەی وی بە هەڵواسینەكە نەبوە.
بەلاّم (وَلَوْ قَالَ فَنَصِيبِي حُرٌّ قَبْلَهُ) ئەگەر بڵێ: هەر كاتێك تۆ بەشەكەی خۆت ئازاد كرد، ئەوە بەشەكەی منیش ئازاد بێ پێش ئازادبوونی بەشەكەی تۆ (فَأَعْتَقَ الشَّرِيكُ) جا هاوبەشەكە بەشەكەی خۆی ئازاد كرد (فَإِنْ كَانَ الْمُعَلِّقُ مُعْسِرًا) ئەگەر هەڵواسەرەكە نەبوویی بێ، ئەوە (عَتَقَ نَصِيبُ كُلٍّ عَنْهُ) بەشی هەریەكەیان لە بری خۆی ئازاد دەبێ‌و (وَالْوَلاَءُ لَهُمَا) خزمایەتی ئازادكردنەكەش بۆ هەردووكیانە (وَكَذَا إنْ كَانَ مُوسِرًا وَأَبْطَلْنَا

الدَّوْرَ) هەروەها ئەگەر هابەشەکە هەبوویش بیٚ و خولانەوەکە بەتالٚ بکەینەوە، ئەوکاتەش بەشی هەریەکەیان لە بری خۆی ئازاد دەبیٚ (وَإِلاَّ) بەلاٚم ئەگەر خولانەوەکە بەتالٚ

فَلاَ يَعْتِقُ شَيْءٌ، وَلَوْ كَانَ عَبْدٌ لِرَجُلٍ نِصْفُهُ، وَلآخَرَ ثُلُثُهُ، وَلآخَرَ سُدُسُهُ فَأَعْتَقَ الآخَرَانِ نَصِيبَيْهِمَا مَعًا عِتْقًا، فَالْقِيمَةُ عَلَيْهِمَا نِصْفَانِ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَشَرْطُ السِّرَايَةِ إعْتَاقُهُ بِاخْتِيَارِهِ، فَلَوْ وَرِثَ بَعْضَ وَلَدِهِ لَمْ يَسْرِ، وَالْمَرِيضُ مُعْسِرٌ إلاَّ فِي ثُلُثِ مَالِهِ، وَالْمَيِّتُ مُعْسِرٌ، فَلَوْ أَوْصَى بِعِتْقِ نَصِيبِهِ لَمْ يَسْرِ.

(فَصْلٌ) إذَا مَلَكَ أَهْلُ تَبَرُّعٍ أَصْلَهُ أَوْ فَرْعَهُ عَتَقَ، وَلاَ يَشْتَرِي لِطِفْلٍ قَرِيبَهُ،

---

نەکەینەوە، ئەو کاتە (فَلاَ يَعْتِقُ شَيْءٌ) هیچ بەشێك لە کۆیلەکە ئازاد نابیٚ.

(وَلَوْ كَانَ عَبْدٌ: لِرَجُلٍ نِصْفُهُ، وَلآخَرَ ثُلُثُهُ، وَلآخَرَ سُدُسُهُ) ئەگەر کۆیلەیەك: نیوەی بۆ یەکێك بوو، سێیەکی بۆ یەکێکیتر، شەشێکی بۆ یەکێکیتر (فَأَعْتَقَ الآخَرَانِ نَصِيبَيْهِمَا مَعًا) ئینجا دووەمەکەو سیٚیەمەکە بەشەکانی خۆیان وێکرا ئازاد کردن، ئەوە (عَتَقَا) بەشەکانی هەردووکیان ئازاد دەبیٚ، کەوابو: (فَالْقِيمَةُ عَلَيْهِمَا نِصْفَانِ عَلَىالْمَذْهَبِ) نرخی بەشەکەی یەکەمیش لە سەر هەردوو ئازادکەرەکەیە بە نیوەیی، نەك بەگوێرەی بەشەکانیان.

(وَشَرْطُ السِّرَايَةِ) مەرجی پێداڕۆشتن ئەمەیە: (إعْتَاقُهُ بِاخْتِيَارِهِ) بە ویستی خۆی کۆیلەکە ئازاد بکا، کەوابو: (فَلَوْ وَرِثَ بَعْضَ وَلَدِهِ) ئەگەر بەشێکی منداڵەکەی، یان بەشێکی دایكو باوکەکەی بە میرات بۆ بمێنێتەوەو بە بابو کوڕایەتی ئازاد ببیٚ، ئەوە (لَمْ يَسْرِ) ئازادبوونەکە پیٚدا ناڕواتە لای بەشی هاوبەشەکەیتر (وَالْمَرِيضُ مُعْسِرٌ إلاَّ فِي ثُلُثِ مَالِهِ) مرۆڤی نەخۆش- ئەگەر بەشەکەی خۆی ئازاد بکا- بە نەبوویی دادەندریٚ تەنها لە سێیەکی ماڵەکەیدا نەبیٚ (وَالْمَيِّتُ مُعْسِرٌ) مرۆڤی مردوو-ئەگەر ئازادبوونی بەشەکەی بە مردنیەوە هەڵواسیبیٚ ئەویش بە نەبوویی دادەندریٚ (فَلَوْ أَوْصَى بِعِتْقِ نَصِيبِهِ) جا ئەگەر وەسیێت بکا لە دوای مردن بەشەکەی وی ئازاد بکریٚ (لَمْ يَسْرِ) ئازادکردنەکە پیٚدا ناڕواتە لای بەشی هاوبەشەکەیتر.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئازادبوونی بە هۆی نەژاد ﴾

(إذَا مَلَكَ أَهْلُ تَبَرُّعٍ أَصْلَهُ أَوْ فَرْعَهُ) هەر کاتێك مرۆڤێکیئازاد بووە خاوەنی یەکێك لە دایکیو باوکیو بە سەرەوەتر، یان کوڕیو کیژیو بەرەو خوارتر، ئەوە (عَتَقَ) یەکسەر لەیٚ ئازاد دەبیٚ، بە (إجماع)ی زانایان، چونکە بابایەتیو کۆیلایەتی وێکڕا کۆ نابنەوە، جیاوازی نیە خاوەنیەکە: بە کڕین بیٚ، یان بە ڕێگایەکیتری مڵکایەتی بیٚ: وەك میراتو بەخشین، بەلاٚم جگە لە تیرەی سەرەوەو خوارەوە هیچ خزمێکیتر بە بوونە ملٚك ئازاد نابیٚ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَيَجْزِى وَلَدٌ والِدَهُ إلاَّ أَنْ يَجِدَهُ مَمْلُوكاً فَيَشْتَرِيَهُ فَيُعْتِقَهُ﴾ رواه مسلم، هیچ منداڵێك پاداشتی دایكو باوکی ناداتەوە، تەنها ئەگەر یەکێك لە دایكو باوکەکانی کۆیلە بیٚ و بیکڕیٚ و بەو کڕینە ئازادی بکا.

كەوابو: (وَلاَ يَشْتَرِي لِطِفْلٍ قَرِيبَهُ) دروست نیە سەر پەرشتكار كۆیلەیەكی خزم بۆ منداڵو شێت بكڕێ: وەك دایكو باوكی منداڵەكەو شێتەكە، چونكە بە تەنها كڕین لێی ئازاد دەبێو
وَلَوْ وُهِبَ لَهُ أَوْ أُوصِيَ لَهُ فَإِنْ كَانَ كَاسِبًا فَعَلَى الْوَلِيِّ قَبُولُهُ، وَيَعْتِقُ وَيُنْفِقُ مِنْ كَسْبِهِ، وَإِلاَّ فَإِنْ كَانَ الصَّبِيُّ مُعْسِرًا وَجَبَ الْقَبُولُ، وَنَفَقَتُهُ فِي بَيْتِ الْمَالِ، أَوْ مُوسِرًا حَرُمَ، وَلَوْ مَلَكَ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ قَرِيبَهُ بِلاَ عِوَضٍ عَتَقَ مِنْ ثُلُثِهِ، وَقِيلَ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ أَوْ بِعِوَضٍ بِلاَ مُحَابَاةٍ فَمِنْ ثُلُثِهِ، وَلاَ يَرِثُ فَإِنْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ فَقِيلَ لاَ يَصِحُّ الشِّرَاءُ، وَالأَصَحُّ صِحَّتُهُ، وَلاَ يَعْتِقُ بَلْ يُبَاعُ لِلدَّيْنِ، أَوْ بِمُحَابَاةٍ فَقَدْرُهَا كَهِبَةٍ، وَالْبَاقِي

---

هیچ قازانج لە كڕینەكەدا نیە (وَلَوْ وُهِبَ لَهُ أَوْ أُوصِيَ لَهُ) ئەگەر دایكێك، یان باوكێك بەخشرا منداڵو شێتەكە، یان وەسیێتیان بۆ ئەوان پێ كرابو، ئەوە (فَإِنْ كَانَ كَاسِبًا) ئەگەر بەخشراوەكەو وەسێت پێكراوەكە كاسبكار بون (فَعَلَى الْوَلِيِّ قَبُولُهُ) واجبە سەرپەرشتكاری منداڵو شێتەكە بەخشینو وەسێتەكە قبوڵ بكاو (وَيَعْتِقُ) بەخشراوەكەو وەسێت پێكراوەكەش بەو قبوڵكردنە ئازاد دەبێ، چونكە بووەتە ملكی ئەوان (وَيُنْفِقُ مِنْ كَسْبِهِ) لە كەسابەتەكەی خۆیشی خۆی بەخێو دەكاو هیچ زیانێك لە منداڵو شێتەكەناكەوێ.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر خزمەكە كاسبكار نەبو: ئەوە (فَإِنْ كَانَ الصَّبِيُّ مُعْسِرًا) ئەگەر منداڵەكە، یان شێتەكە نەبوویی بوو (وَجَبَ الْقَبُولُ) واجبە سەرپەرشتكارەكە وەسێتو بەخشینەكە قبوڵ بكا، چونكە هیچ زیانێكی بۆ منداڵو شێتەكە نیەو بەو قبوڵكردنە ئازاد دەبنو (وَنَفَقَتُهُ فِي بَيْتِ الْمَالِ) بژێوەكەشی لە (بیت المال) دەدرێ (أَوْ مُوسِرًا) بەڵام ئەگەر منداڵو شێتەكە هەبوویی بێ، ئەو كاتە (حَرُمَ) حەرامە وەسێتو بەخشینەكە قبوڵ بكا، چونكە بەو قبوڵكردنە لێی ئازاد دەبێو بژێوەكەشی –بە هۆی باوبو كوڕایەتی– دەكەوێتە سەر منداڵو شێتەكە.

(وَلَوْ مَلَكَ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ قَرِيبَهُ بِلاَعِوَضٍ) ئەگەر لە نەخۆشیمردنیدا بە خۆڕایی خزمەكەی بووە ملكیخۆی: وەك میرات، یان بەخشین، ئەوە (عَتَقَ مِنْ ثُلُثِهِ) لە سێیەكی ماڵەكەی خزمەكەی لێ ئازاد دەبێ (وَقِيلَ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ) لە فەرموودەیەكدا –كە بە ڕاستتر داندراوە– لە سەرمایەی ماڵەكەی ئازاد دەبێ (أَوْ بِعِوَضٍ بِلاَمُحَابَاةٍ) بەڵام ئەگەر بە پارەیەكی بێخاترانە خزمەكەی بووە ملكی خۆی، ئەوە (فَمِنْ ثُلُثِهِ) لە سێیەكی ماڵەكەی ئازاد دەبێو (وَلاَ يَرِثُ) لەو دوو مەسەلانەشدا ئازادبووەكە میرات لە مردووەكە ناگرێ (فَإِنْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ) جا ئەگەر نەخۆشەكە لە كاتی مردنیدا قەرزێكی داگرەوەی لە سەر بوو (فَقِيلَ لاَيَصِحُّ الشِّرَاءُ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: كڕینەكەی دروست نابێ، بەڵام (وَالأَصَحُّ صِحَّتُهُ) بە فەرموودەی ڕاستتر كڕینەكەی دروست دەبێو (وَلاَ يَعْتِقُ) كۆیلەكەش ئازاد نابێ (بَلْ يُبَاعُ لِلدَّيْنِ) بەڵكو بۆ قەرزدانەوەكە دەفرۆشرێ.

(أَوْ بِمُحَابَاةٍ) بەلاّم ئەگەر کۆیلەکەی بە خاترانە کڕیبێ، ئەوە (فَقَدْرُهَا كَهِبَةٍ) ئەندازەی خاترەکە بە فەرموودەی ڕاستتر: وەکو بەخشینەو لە سەرمایەکەی ئازاد دەبێ (وَالْبَاقِي مِنَ الثُّلُثِ، وَلَوْ وَهَبَ لِعَبْدٍ بَعْضَ قَرِيبِ سَيِّدِهِ فَقَبِلَ وَقُلْنَا يَسْتَقِلُّ بِهِ عَتَقَ وَسَرَى، وَعَلَى سَيِّدِهِ قِيمَةُ بَاقِيهِ.

(فَصْلٌ) أَعْتَقَ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ عَبْدًا لاَ يَمْلِكُ غَيْرَهُ، عَتَقَ ثُلُثُهُ، فَإِنْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ مُسْتَغْرِقٌ لَمْ يَعْتِقْ شَيْءٌ مِنْهُ، وَلَوْ أَعْتَقَ ثَلاَثَةً لاَ يَمْلِكُ غَيْرَهُمْ وَقِيمَتُهُمْ سَوَاءٌ عَتَقَ أَحَدُهُمْ بِقُرْعَةٍ وَكَذَا لَوْ قَالَ أَعْتَقْتُ ثُلُثَكُمْ، أَوْ ثُلُثُكُمْ حُرٌّ، وَلَوْ قَالَ أَعْتَقْت ثُلُثَ كُلِّ عَبْدٍ أُقْرِعَ وَقِيلَ يَعْتِقُ مِنْ كُلٍّ ثُلُثُهُ، وَالْقُرْعَةُ: أَنْ يُؤْخَذَ ثَلاَثُ رِقَاعٍ مُتَسَاوِيَةٌ يُكْتَبُ فِي ثِنْتَيْنِ رِقٌّ وَفِي وَاحِدَةٍ عِتْقٌ،

---

مِنَ الثُّلُثِ) ئەوەکەیتریش لە سێیەکی ماڵەکەی ئازاد دەبێ (وَلَوْ وَهَبَ لِعَبْدٍ بَعْضَ قَرِيبِ سَيِّدِهِ) ئەگەر کەسێك بەشەخزمێکیگەورەیەکی بەخشیە کۆیلەیگەورەکە (فَقَبِلَ) کۆیلەکەش بەشە خزمەکەی قبولّ کرد (وَقُلْنَا يَسْتَقِلُّ بِهِ) بە فەرموودەیڕاستریش بلّێین: کۆیلەکە سەربەخۆیە لە قبولّکردنەکەدا، ئەوە (عَتَقَ وَسَرَى) بەشە خزمەکەی گەورەکە لە سەر حیسابی گەورەکە ئازاد دەبێو ئازادیەکەش پێدا دەڕواتە بەشەکەیتریش، کەوابو: (وَعَلَى سَيِّدِهِ قِيمَةُ بَاقِيهِ) نرخی بەشەکەیتریش کە بە پێداڕۆیشتن ئازاد بووە، هەر لە سەر گەورەکەیە بیداتە هاوبەشەکەیتر.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئازادکردن لە نەخۆشی مردندا ﴾

(أَعْتَقَ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ عَبْدًا لاَ يَمْلِكُ غَيْرَهُ) ئەگەر لە نەخۆشی مردنیدا کۆیلەیەکی ئازاد کرد، جگە لەو کۆیلەیەش هیچ ماڵیتری نەبو، ئەوە (عَتَقَ ثُلُثُهُ) تەنها سێیەکی کۆیلەکە ئازاد دەبێو دوو بەشیشی بە کۆیلەیی دەمێنێتەوە، بەلاّم (فَإِنْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ مُسْتَغْرِقٌ) ئەگەر نەخۆشەکە قەرزێکی داگرەوەی لە سەر بوو، ئەو کاتە (لَمْ يَعْتِقْ شَيْءٌ مِنْهُ) هیچ بەشێك لە کۆیلەکە ئازاد نابێ، چونکە قەرزدانەوەکە لەپێشترە (وَلَوْ أَعْتَقَ ثَلاَثَةً) ئەگەر نەخۆشەکە سێ کۆیلەی ئازاد کردن کە (لاَ يَمْلِكُ غَيْرَهُمْ، وَقِيمَتُهُمْ سَوَاءٌ) جگە لەو سێیانەش هیچ ماڵیتری نەبو، نرخی کۆیلەکانیش یەکسان بوو، ئەو کاتە (عَتَقَ أَحَدُهُمْ بِقُرْعَةٍ) یەکێکیان بە پشکەکردن ئازاد دەبێ (وَكَذَا لَوْ قَالَ أَعْتَقْتُ ثُلُثَكُمْ أَوْ ثُلُثُكُمْ حُرٌّ) هەروەها ئەگەر بلّێ: سێیەکی ئێوەم ئازاد کرد، یان بلّێ: سێیەکێکتان ئازاد ببێ، ئەو کاتەش بە پشکەکردن یەکێکیان ئازاد دەبێ (وَلَوْ قَالَ أَعْتَقْت ثُلُثَ كُلِّ عَبْدٍ) ئەگەر گوتی: سێیەکی گشت کۆیلەیەکی خۆم ئازاد کرد، ئەو کاتەش (أُقْرِعَ) پشکە دەکرێو یەکێکیان ئازاد دەبێ (وَقِيلَ يَعْتِقُ مِنْ كُلٍّ ثُلُثُهُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لە هەر یەکێکیان–بێ پشکە–سێیەکێکی ئازاد دەبێ.

(وَالْقُرْعَةُ: أَنْ يُؤْخَذَ ثَلَاثُ رِقَاعٍ مُتَسَاوِيَةٌ) پشکەکردن لەو مەسەلەیەدا ئەمەیە: سێ پارچەی یەکسان بهێندرێن، ئینجا (يُكْتَبُ فِي ثِنْتَيْنِ: رِقٌّ، وَفِي وَاحِدَةٍ: عِتْقٌ) لە دووانیاندا بنوسرێ: وَتُدْرَجُ فِي بَنَادِقَ كَمَا سَبَقَ، وَتُخْرَجُ وَاحِدَةٌ بِاسْمِ أَحَدِهِمْ، فَإِنْ خَرَجَ الْعِتْقُ عَتَقَ وَرَقَّ الآخَرَانِ، أَوِ الرِّقُّ رَقَّ، وَأُخْرِجَتْ أُخْرَى بِاسْمِ آخَرَ، يَجُوزُ أَنْ يَكْتُبَ أَسْمَاءَهُمْ ثُمَّ تُخْرَجُ رُقْعَةٌ عَلَى الْحُرِّيَّةِ، فَمَنْ خَرَجَ اِسْمُهُ عَتَقَ وَرَقَّا، وَإِنْ كَانُوا ثَلَاثَةً قِيمَةَ وَاحِدٍ مِاْئَةٌ، وَآخَرُ مِاْئَتَانِ، وَآخَرُ ثَلَاثُمِاْئَةٍ أُقْرِعَ بِسَهْمَيْ رِقٍّ وَسَهْمِ عِتْقٍ، فَإِنْ خَرَجَ الْعِتْقُ لِذِي الْمِاْئَتَيْنِ عَتَقَ وَرَقَّا، أَوْ لِلثَّالِثِ عَتَقَ ثُلُثَاهُ، أَوْ لِلأَوَّلِ عَتَقَ ثُمَّ يُقْرَعُ بَيْنَ الآخَرَيْنِ بِسَهْمِ رِقٍّ وَسَهْمِ عِتْقٍ، فَمَنْ خَرَجَ تُمِّمَ مِنْهُ الثُّلُثُ،

---

کۆیلەیی، لە یەکێکیشیاندا بنوسرێ: ئازادی، ئینجا (وَتُدْرَجُ فِى بَنَادِقَ كَمَا سَبَقَ) لە ناو شتێك دابندرێ، هەروەك لە (باسی بەشکردن)دا ڕابرا، ئینجا (وَتُخْرَجُ وَاحِدَةٌ بِاسْمِ أَحَدِهِمْ) یەکێك لەو سێ پارچانە بە ناوی یەکێکیان دەر بهێندرێ، ئینجا (فَإِنْ خَرَجَ الْعِتْقُ) ئەگەر ئەمەیان ئازادیی بۆ دەرچو، ئەوە (عَتَقَ وَرَقَّ الآخَرَانِ) ئەویان ئازاد دەبێ و دووەکانیتریش بە کۆیلەیی دەمێننەوە (أَوِ الرِّقُّ) بەڵام ئەگەر ئەمەیان کۆیلەیی بۆ دەربچێ، ئەو کاتە (رَقَّ) ئەمەیان بە کۆیلەیی دەمێنی، ئینجا (وَأُخْرِجَتْ أُخْرَى بِاسْمِ آخَرَ) یەکێکیتریش بە ناوی یەکێکیتر دەردەهێندرێ: جا ئەگەر ئازادیی بۆ دەرچو، ئەویان ئازاد دەبێ و ئەگەر کۆیلەیی بۆ درەچو، ئەوە هەرکۆیلەیەو سێیەمەکە ئازاد دەبێ.

(وَيَجُوزُ أَنْ يَكْتُبَ أَسْمَاءَهُمْ) هەم دروستە ناوی هەرسێك کۆیلەکان لە سێ پارچەکاندا بنوسرێ (ثُمَّ تُخْرَجُ رُقْعَةٌ عَلَى الْحُرِّيَّةِ) ئینجا پارچەیەك لە سەر ناوی ئازادی دەربهێندرێ (فَمَنْ خَرَجَ اِسْمُهُ عَتَقَ وَرَقَّا) جا هەر کامەیان ناوی دەرچو، ئەویان ئازاد دەبێ و دووەکانیتریش بە کۆیلەیی دەمێننەوە.

(وَإِنْ كَانُوا ثَلَاثَةً) ئەگەر سێ کۆیلە بون (قِيمَةَ وَاحِدٍ مِاْئَةٌ، وَآخَرُ مِاْئَتَانِ، وَآخَرُ ثَلَاثُمِاْئَةٍ) نرخی یەکێکیان سەد دینار بوو، نرخی یەکێکیتر دووسەد بوو، نرخی یەکێکیتر سێسەد بوو، ئەو کاتە (أُقْرِعَ بِسَهْمَيْ رِقٍّ وَسَهْمِ عِتْقٍ) پشکە لە نێوانیاندا دەکرێ بە دوو بەشی کۆیلەیی و بەشێکی ئازادی، واتە: لە دوو پارچان دەنووسرێ: کۆیلەیی، لە یەکێکیش دەنووسرێ: ئازادی، ئینجا (فَإِنْ خَرَجَ الْعِتْقُ لِذِي الْمِاْئَتَيْنِ) ئەگەر ئازادی بۆ دووسەد بایيەکە دەرچو، ئەوە (عَتَقَ وَرَقَّا) ئەویان ئازاد دەبێ و دووەکانیتر بە کۆیلەیی دەمێننەوە (أَوْ لِلثَّالِثِ) یان ئەگەر بۆ سێسەد بایيەکە دەرچو، ئەوە (عَتَقَ ثُلُثَاهُ) دوو سێیەکی وی ئازاد دەبن و سێیەکەکەیتری لەگەڵ دوو کۆیلەکانیتر بە کۆیلەیی دەمێننەوە (أَوْ لِلأَوَّلِ) یان ئەگەر بۆ سەد بایيەکە دەرچو، ئەوە (عَتَقَ) ئەویان ئازاد دەبێ (ثُمَّ يُقْرَعُ بَيْنَ الآخَرَيْنِ بِسَهْمِ رِقٍّ وَسَهْمِ عِتْقٍ) ئینجا لە نێوان دووەکانیتریش پشکە دەکرێ بە بەشێکی ئازادی و بەشێکی

کۆیلەیی: لە دوو پارچەدا (فَمَنْ خَرَجَ تُمِّمَ مِنْهُ الثُّلُثُ) کامەیان ئازادیی بۆ دەرچو، ئەوە سێیەکەکە لە وی تەواو دەکرێ، واتە: ئەگەر بۆ دووسەد باییەکە دەربچێ نیوەی ئازادی دەبێ،

وَإِنْ كَانُوا فَوْقَ ثَلاَثَةٍ وَأَمْكَنَ تَوْزِيعُهُمْ بِالْعَدَدِ وَالْقِيمَةِ كَسِتَّةٍ قِيمَتُهُمْ سَوَاءٌ جُعِلُوا اثْنَيْنِ اثْنَيْنِ، أَوْ بِالْقِيمَةِ دُونَ الْعَدَدِ كَسِتَّةٍ قِيمَةُ أَحَدِهِمْ مِأَةٌ، وَقِيمَةُ اثْنَيْنِ مِأَةٌ، وَثَلاَثَةٍ مِائَةٌ جُعِلَ الأَوَّلُ جُزْءًا، وَالإِثْنَانِ جُزْءًا، وَالثَّلاَثَةُ جُزْءًا، وَإِنْ تَعَذَّرَ بِالْقِيمَةِ كَأَرْبَعَةٍ قِيمَتُهُمْ سَوَاءٌ، فَفِي قَوْلٍ يُجَزَّؤُونَ ثَلاَثَةَ أَجْزَاءٍ: وَاحِدٌ وَوَاحِدٌ وَاثْنَانِ، فَإِنْ خَرَجَ الْعِتْقُ لِوَاحِدٍ عَتَقَ ثُمَّ أُقْرِعَ لِتَتْمِيمِ الثُّلُثِ، أَوْ لِلإِثْنَيْنِ رَقَّ الآخَرَانِ ثُمَّ أُقْرِعَ بَيْنَهُمَا فَيَعْتِقُ مَنْ خَرَجَ لَهُ الْعِتْقُ وَثُلُثُ الآخَرِ، وَفِي قَوْلٍ يُكْتَبُ اِسْمُ كُلِّ عَبْدٍ فِي رُقْعَةٍ فَيَعْتِقُ مَنْ خَرَجَ أَوَّلاً وَثُلُثُ الثَّانِي، قُلْتُ: أَظْهَرُهُمَا الأَوَّلُ وَاللهُ أَعْلَمُ، وَالْقَوْلاَنِ

---

ئەگەر بۆ سێسەدباییەکە دەربچێ لە سێ بەشان بەشێکی ئازاد دەبێ.

(وَإِنْ كَانُوا فَوْقَ ثَلاَثَةٍ) ئەگەر کۆیلەکان لە سێیان زیاتر بوونو (وَأَمْكَنَ تَوْزِيعُهُمْ بِالْعَدَدِ وَالْقِيمَةِ) دەشگونجا بەگوێرەی ژمارەو نرخ بەش بکرێن: (كَسِتَّةٍ قِيمَتُهُمْ سَوَاءٌ) وەك شەش کۆیلە نرخیان یەکسان بێ، ئەوە (جُعِلُوا اثْنَيْنِ اثْنَيْنِ) دەکرێنە دوو دوو (أَوْ بِالْقِيمَةِ دُونَ الْعَدَدِ) یان دەگونجا بە نرخ بەش بکرێن نەك بە ژمارە: (كَسِتَّةٍ قِيمَةُ أَحَدِهِمْ مِأَةٌ، وَقِيمَةُ اثْنَيْنِ مِأَةٌ، وَثَلاَثَةٍ مِأَةٌ) وەك شەش کۆیلە: نرخی یەکێکیان سەد بێو نرخی دووانیان سەد بێو نرخی سێیانیان سەد بێ، ئەوە (جُعِلَ الأَوَّلُ جُزْءًا) یەکەمەکە بە تەنها دەکرێتە بەشێك (وَالإِثْنَانِ جُزْءًا) دووەکانی دووەمیش دەکرێنە بەشێكو (وَالثَّلاَثَةُ جُزْءًا) سێیەکانیتریش دەکرێنە بەشێك.

(وَإِنْ تَعَذَّرَ بِالْقِيمَةِ) ئەگەر بە نرخەکەش نەگونجا: (كَأَرْبَعَةٍ قِيمَتُهُمْ سَوَاءٌ) وەك چوار کۆیلە نرخەکەیان یەکسان بێ، ئەوە (فَفِي قَوْلٍ: يُجَزَّؤُونَ ثَلاَثَةَ أَجْزَاءٍ) لە فەرموودەیەکدا دەکرێنە سێ بەش: (وَاحِدٌ وَوَاحِدٌ وَاثْنَانِ) یەکێك بەشێك، یەکێکیتر بەشێك، دووەکانیتریش بەشێك، ئینجا (فَإِنْ خَرَجَ الْعِتْقُ لِوَاحِدٍ) ئەگەر ئازادی بۆ یەکێکیان دەرچو، ئەویان (عَتَقَ) ئازاد دەبێ (ثُمَّ أُقْرِعَ لِتَتْمِيمِ الثُّلُثِ) ئینجا بۆ تەواوکردنی سێیەك پشکە لە نێوان ئەوانیتردا دەکرێ (أَوْ لِلإِثْنَيْنِ) بەلام ئەگەر بۆ دووەکان ئازادی دەرچو، ئەو کاتە (رَقَّ الآخَرَانِ) دووەکانیتر بە کۆیلەیی دەمێننەوە (ثُمَّ أُقْرِعَ بَيْنَهُمَا فَيَعْتِقُ مَنْ خَرَجَ لَهُ الْعِتْقُ وَثُلُثُ الآخَرِ) ئینجا لە نێوان دووەکانیشدا پشکە دەکرێو ئەوەی ئازادیی بۆ دەرچو هەمووی ئازاد دەبێ، سێیەکێکی ئەویتریش ئازاد دەبێ.

(وَفِي قَوْلٍ يُكْتَبُ اسْمُ كُلِّ عَبْدٍ فِي رُقْعَةٍ) لە فەرموودەیەکیتردا: ناوی هەر کۆیلەیەك لە پارچەیەك دەنووسرێ، ئینجا (فَيَعْتِقُ مَنْ خَرَجَ أَوَّلاً وَثُلُثُ الثَّانِي) ئەو کۆیلەیەی یەکەمجار

ناوی دەردەچێ ئازاد دەبێو سێیەکێکی کۆیلەی دووەمجاریش ئازاد دەبێ (قُلْتُ أَظْهَرُهُمَا الأَوَّلُ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی: بەهێزترەکەیان یەکەمەکەیە (وَالْقَوْلاَنِ فِي اِسْتِحْبَابٍ، وَقِيلَ إِيجَابٍ، وَإِذَا أَعْتَقْنَا بَعْضَهُمْ بِقُرْعَةٍ فَظَهَرَ مَالٌ وَخَرَجَ كُلُّهُمْ مِنَ الثُّلُثِ عَتَقُوا، وَلَهُمْ كَسْبُهُمْ مِنْ يَوْمِ الإِعْتَاقِ، وَلاَ يَرْجِعُ الْوَارِثُ بِمَا أَنْفَقَ عَلَيْهِمْ، وَإِنْ خَرَجَ بِمَا ظَهَرَ عَبْدٌ آخَرُ أُقْرِعَ، وَمَنْ عَتَقَ بِقُرْعَةٍ حُكِمَ بِعِتْقِهِ مِنْ يَوْمِ الإِعْتَاقِ، وَتُعْتَبَرُ قِيمَتُهُ حِينَئِذٍ، وَلَهُ كَسْبُهُ مِنْ يَوْمِئِذٍ غَيْرَ مَحْسُوبٍ مِنَ الثُّلُثِ، وَمَنْ بَقِيَ رَقِيقًا قُوِّمَ يَوْمَ الْمَوْتِ وَحُسِبَ مِنَ الثُّلُثَيْنِ هُوَ وَكَسْبُهُ الْبَاقِي قَبْلَ الْمَوْتِ، لاَ الْحَادِثُ بَعْدَهُ، فَلَوْ أَعْتَقَ ثَلاَثَةً لاَ يَمْلِكُ غَيْرَهُمْ قِيمَةُ كُلٍّ مِأَةٌ، وَكَسَبَ أَحَدُهُمْ مِأَةً أُقْرِعَ، فَإِنْ خَرَجَ الْعِتْقُ لِلْكَاسِبِ

---

فِي اسْتِحْبَابٍ، وَقِيلَ إِيجَابٍ) ئەو دوو فەرموودانەش لەبارەی سوننەتی پشکەکردنەکەیەو لە فەرموودەیەکی بێهێزدا لەبارەی واجبیەکەیەتی.

(وَإِذَا أَعْتَقْنَا بَعْضَهُمْ بِقُرْعَةٍ) جا هەر کاتێك هەندێکیانمان بە پشکە ئازاد کردن (فَظَهَرَ مَالٌ وَخَرَجَ كُلُّهُمْ مِنَ الثُّلُثِ) ئینجا مردووەکە هەندێك ماڵیتری ئاشکرا بوو و کۆیلەکان گشتیان لە سێیەکی ماڵەکە دەرچون، ئەو کاتە (عَتَقُوا) ئاشکرا دەبێ گشتیان ئازاد بونە، هەم (وَلَهُمْ كَسْبُهُمْ مِنْ يَوْمِ الإِعْتَاقِ) گشتیان کەسابەتەکەی خۆیان بۆ خۆیانە لە ڕۆژی ئازادکردنیانەوە (وَلاَ يَرْجِعُ الْوَارِثُ بِمَا أَنْفَقَ عَلَيْهِمْ) نابێ میراتگرەکەش بژێوی ئەو ماوەیەی بەخێوی کردون لێیان وەربگرێتەوە (وَإِنْ خَرَجَ بِمَا ظَهَرَ عَبْدٌ آخَرُ) ئەگەر بەو ماڵە ئاشکرابووە کۆیلەیەکیتریش لە سێیەکی ماڵەکە دەرچو، ئەو کاتە (أُقْرِعَ) پشکە لە نێوان ئەوی کۆیلەکانیتر دەکرێ.

(وَمَنْ عَتَقَ بِقُرْعَةٍ) هەر کۆیلەیەك بە پشکەکردن ئازاد بوبێ، ئەوە (حُكِمَ بِعِتْقِهِ مِنْ يَوْمِ الإِعْتَاقِ) بریار بە ئازادبوونی دەدرێ لە ڕۆژی ئازادکردنیەوە، نەك لە ڕۆژی پشکەکردنیەوە (وَتُعْتَبَرُ قِيمَتُهُ حِينَئِذٍ) نرخەکەشی هەر لە ڕۆژی ئازادکردنیەوە ڕەچاو دەکرێ، هەم (وَلَهُ كَسْبُهُ مِنْ يَوْمِئِذٍ غَيْرَ مَحْسُوبٍ مِنَ الثُّلُثِ) کەسابەتەکەشی لە ڕۆژی ئازادکردنیەوە هەر بۆ خۆیەتیو کەسابەتەکەش لە سێیەکی ماڵەکە حیساب ناکرێ (وَمَنْ بَقِيَ رَقِيقًا) هەر کۆیلەیەکیش بە کۆیلەیی بمێنێتەوە، ئەوە (قُوِّمَ يَوْمَ الْمَوْتِ) لە ڕۆژی مردنی گەورەکەی دەقرسێندرێ، هەم (وَحُسِبَ مِنَ الثُّلُثَيْنِ هُوَ وَكَسْبُهُ الْبَاقِي قَبْلَ الْمَوْتِ) بەخۆیو ئەو کەسابەتەیی پێش مردنی گەورەکەی ماوەتەوە لە دوو سێیەکی ماڵەکە حیساب دەکرێ (لاَ الْحَادِثُ بَعْدَهُ) بەڵام کەسابەتی دوای مردنی گەورەکەی لە دوو سێیەکە حیساب ناکرێ، چونکە ئەمەیان ملکی میراتگرەکەیە.

(فَلَوْ أَعْتَقَ ثَلاَثَةً لاَ يَمْلِكُ غَيْرَهُمْ) ئەگەر سێ کۆیلەی ئازاد کردن جگە لەو سێیانەش هیچ ماڵیتری نەبو و (قِيمَةُ كُلٍّ مِأَةٌ) نرخی هەر کۆیلەیەکیش سەد دینار بوو (وَكَسَبَ أَحَدُهُمْ مِأَةً)

کۆیلەیەکیش پێش مردنی ئازادکەرەکە سەد دینار کەسابەتی کردبو، ئەوە (أُقْرِعَ) پشکە لە نێوانیاندا دەکرێ: (فَإِنْ خَرَجَ الْعِتْقُ لِلْكَاسِبِ) جا ئەگەر ئازادیەکە بۆ کاسبکارەکە دەرچوو عَتَقَ وَلَهُ الْمِأَةُ، وَإِنْ خَرَجَ لِغَيْرِهِ عَتَقَ ثُمَّ أُقْرِعَ، فَإِنْ خَرَجَتْ لِغَيْرِهِ عَتَقَ ثُلُثُهُ، وَإِنْ خَرَجَتْ لَهُ عَتَقَ رُبُعُهُ وَتَبِعَهُ رُبُعُ كَسْبِهِ.
(فَصْلٌ) مَنْ عَتَقَ عَلَيْهِ رَقِيقٌ بِإِعْتَاقٍ أَوْ كِتَابَةٍ وَتَدْبِيرٍ وَاسْتِيلاَدٍ وَقَرَابَةٍ وَسِرَايَةٍ فَوَلاَؤُهُ لَهُ، ثُمَّ لِعَصَبَتِهِ، وَلاَ تَرِثُ اِمْرَأَةٌ بِوَلاَءٍ إِلاَّ مِنْ عَتِيقِهَا وَأَوْلاَدِهِ وَعُتَقَائِهِ، فَإِنْ عَتَقَ عَلَيْهَا أَبُوهَا ثُمَّ أَعْتَقَ عَبْدًا فَمَاتَ بَعْدَ مَوْتِ الأَبِ بِلاَ وَارِثٍ فَمَالُهُ لِلْبِنْتِ، وَالْوَلاَءُ لأَعْلَىالْعَصَبَاتِ، وَمَنْ مَسَّهُ رِقٌّ فَلاَ وَلاَءَ عَلَيْهِ إِلاَّ لِمُعْتِقِهِ وَعَصَبَتِهِ،

---

(عَتَقَ وَلَهُ الْمأَةُ) بەخۆی ئازاد دەبێو سەد دینارەکەی کەسابەتەکەشی بۆ خۆیەتی (وَإِنْ خَرَجَ لِغَيْرِهِ) ئەگەر بۆ کۆیلەیەکیتر دەرچو، ئەویان (عَتَقَ) ئازاد دەبێ (ثُمَّ أُقْرِعَ) ئینجا دووبارە پشکە دەکرێ (فَإِنْ خَرَجَتْ لِغَيْرِهِ) ئەگەر پشکەکە بۆ یەکێکیتر دەرچو (عَتَقَ ثُلُثُهُ) سێیەکێکی ئەویش ئازاد دەبێ، بەڵام (وَإِنْ خَرَجَتْ لَهُ) ئەگەر بۆ کاسبکارەکە دەرچو، ئەوە (عَتَقَ رُبُعُهُ وَتَبِعَهُ رُبُعُ كَسْبِهِ) چوارێکێکی ئازاد دەبێو چوارێکێکی کەسابەتەکەش وەگەڵ خۆی دەکەوێ.

## ﴿ فَصْلٌ فِالْوَلاَءِ: لە باسی خزمایەتی کۆیلە ئازادکردن ﴾

(مَنْ عَتَقَ عَلَيْهِ رَقِيقٌ) هەر کەسێك کۆیلەیەکی لێ ئازاد ببێ: (بِإِعْتَاقٍ أَوْ كِتَابَةٍ وَتَدْبِيرٍ وَاسْتِيلاَدٍ وَقَرَابَةٍ وَسِرَايَةٍ) بە هۆی ئازادکردنی خۆی، یان بە نووسراوپێدان، یان بە ئازادکردنی دوای مردن، یان بە دایکە منداڵی، یان بە دایكو بابایەتیو کوڕو کیژایەتی، یان بە پێداڕۆشتنی ئازادکردنی هاوبەشێك، ئەوە لەو هەموو ئازادکردنانەدا (فَوَلاَؤُهُ لَهُ) خزمایەتی ئازادکردنەکە بۆ ئازادکەرەکەیە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّماالْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ﴾ رواه الشيخان، خزمایەتی کۆیلە ئازادکردن تەنها بۆ ئازادکەرەکەیە. (ثُمَّ لِعَصَبَتِهِ) ئینجا لە دوای ئازادکەرەکەش بۆ میراتگرە نێرینەکانی پشتێیەتی.
(وَلاَ تَرِثُ امْرَأَةٌ بِوَلاَءٍ) هیچ ئافرەتێك بە هۆی خزمایەتی کۆیلە ئازادکردن میرات ناگرێ (إِلاَّ مِنْ عَتِيقِهَا وَأَوْلاَدِهِ وَعُتَقَائِهِ) تەنها لە ئازادکراوەکەی خۆیو لە منداڵەکانی ئازادکراوەکەیو لە ئازادکراوەکانی ئازادکراوەکەی میرات دەگرێ، کەوابو: (فَإِنْ عَتَقَ عَلَيْهَا أَبُوهَا) ئەگەر کیژێك باوکی خۆی کڕیو بەو کڕینە لەێی ئازاد بوو (ثُمَّ أَعْتَقَ عَبْدًا) ئینجا باوکەکەش کۆیلەیەکی ئازاد کرد، ئینجا باوکەکەش مرد (فَمَاتَ بَعْدَ مَوْتِ الأَبِ بِلاَ وَارِثٍ) ئینجا کۆیلە ئازادکراوەکەش لە دوای مردنی باوکەکە مردو هیچ مراتگریکیشی نەبو، ئەوە (فَمَالُهُ لِلْبِنْتِ) هەموو ماڵی کۆیلەکە بۆ کیژەکەیە، چونکە ئازادکەری ئازادکەرەکەیەتی.
(وَالْوَلاَءُ لأَعْلَىالْعَصَبَاتِ) خزمایەتی کۆیلە ئازادکردن بۆ بە سەرەوەترین میراتگری پشتێیە

وەكو خزمايەتى نەژادى (وَمَنْ مَسَّهُ رِقٌّ) هەر كەسێك كۆيلە بوبێ‌و ئـازاد كرابـێ (فَـلاَ وَلاَءَ عَلَيْهِ إلاَّ لِمُعْتِقِه وَعَصَبَتِه) هيچ كەسێك خزمى ئازادكردنەكەى نيـە تـەنها ئازادكەرەكـەى‌و
وَلَـوْ نَكَـحَ عَبْـدٌ مُعْتَقَـةً فَأَتَـتْ بِوَلَـدٍ فَـوَلاَؤُهُ لِمَوْلَــالأُمّ، فَـإِنْ أُعْتِـقَ الأَبُ انْجَـرَّ إِلَـى مَوَالِيــهِ، وَلَـوْ مَـاتَ الأَبُ رَقِيقًـا وَعَتَـقَ الْجَـدُّ انْجَـرَّ إِلَـى مَوَالِيــهِ، فَإِنْ أُعْتِقَ الْجَدُّ وَالأَبُ رَقِيقٌ انْجَرَّ، فَإِنْ أُعْتِقَ الأَبُ بَعْدَهُ انْجَرَّ إِلَى مَوَالِيهِ، وَقِيلَ يَبْقَى لِمَوَالِىالأُمِّ حَتَّى يَمُوتَ الأَبُ فَيَنْجَرَّ إِلَى مَوَالِىالْجَدِّ، وَلَوْ مَلَكَ هَذَا الْوَلَدُ أَبَاهُ جَرَّ وَلاَءَ إِخْوَتِهِ إِلَيْهِ، وَكَذَا وَلاَءَ نَفْسِهِ فِىالأَصَحِّ . قُلْت: اَلأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ لاَ يَجُرُّهُ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

ميراتگـرە پشـتێيەكانى ئازادكەرەكـەى نـەبێ (وَلَـوْ نَكَـحَ عَبْـدٌ مُعْتَقَـةً) ئەگـەر كۆيلەيـەك (جارية)كى ئازادكراو لە خۆى مارە بكا، ئينجا (فَأَتَتْ بِوَلَدٍ) منداڵێكى لێببێ، ئەوە (فَوَلاَؤُهُ لِمَوْلَىالأُمّ) خزمايەتى ئازادىى منداڵەكە هەر بۆ خزمەكەى ئازادكەرى دايكيەتى؟ چـونكە منداڵەكەش بە هۆى ئازادبوونى دايكى بە ئازادى دەبـێ، بـەڵام (فَـإِنْ أُعْتِـقَ الأَبُ) ئەگـەر باوكە كۆيلەكەشى ئازاد كرا، ئەو كاتە (انْجَرَّ إِلَى مَوَالِيه) خزمايەتى ئازادىى منداڵەكە لـە لاى دايكى دەپچڕێ‌و ڕادەكشێتەوە لاى خزمە ئازادكەرەكانى باوكەكەى، چونكە خزمايەتى ئازادكردن لقى نەژادەو نەژاديش دەدرێتە پاڵ باوكان نەك دايكان، كەوابو: (وَلَوْ مَاتَ الأَبُ رَقِيقًا وَعَتَقَ الْجَدُّ) ئەگەر باوكەكەى بە كۆيلـەيى مـرد، بـەڵام باپيرەكـەى ئـازاد بـوو، ئـەو كاتەش (انْجَرَّ إِلَى مَوَالِيه) خزمايەتى ئازادبوونى منداڵەكە ڕادەكشێتەوە لاى ئازادكەرەكانى باپيرەكەى، چونكە باپيريش وەكو باوكە.

هەر لەو مەسەلەيەدا (فَإِنْ أُعْتِقَ الْجَدُّ وَالأَبُ رَقِيقٌ) ئەگەر باپيرەكە ئازاد كـراو باوكەكـەش هـەر كۆيلـە بـوو، ئـەو كاتـەش (انْجَـرَّ) خزمايەتيەكـە ڕادەكشـێتەوە لاى ئازادكـەرەكانى باپيرەكە، بەڵام (فَإِنْ أُعْتِقَ الأَبُ بَعْدَهُ) ئەگەر لە دواى ئـازادكردنى باپيرەكـە باوكەكـەش ئازاد كرا، ئەو كاتە (انْجَرَّ إِلَى مَوَالِيه) خزمايەتيەكەى ڕادەكێشـێتەوە لاى ئازادكـەرەكانى باوكەكەى، چونكە باوك بە هۆى نزيكى بەهێزترە (وَقِيلَ يَبْقَى لِمَوَالِىالأُمِّ حَتَّى يَمُوتَ الأَبُ) لە فەرموودەيەكى بێهێزدا خزمايەتى بۆ ئازادكەرەكانى دايكى دەمێنێتەوە تا باوكەكەى بـە كۆيلـەيى دەمـرێ، ئينجـا (فَيَنْجَـرَّ إِلَـى مَوَالِىالْجَـدِّ) لـەو كاتـەوە ڕادەكشـێتەوە لاى ئازادكەرەكانى باپيرەكە.

(وَلَوْ مَلَكَ هَذَا الْوَلَدُ أَبَاهُ) ئەگەر ئەم منداڵە باوكە كۆيلەكەى خۆى كـردە مڵكـى خـۆى‌و لێى ئازاد بوو، ئەو كاتـە (جَـرَّ وَلاَءَ إِخْوَتِـهِ إِلَيْـه) ئـەم منداڵـە خزمايـەتى ئـازادكردنى برايەكانيشى لە ئازادكەرەكانى دايكى دەستێنێ‌و بۆ خۆى ڕايدەكێشێ، چونكە بەخۆى ئازادكەرى باوكى خۆيەتى‌و برايەكانيشى پابەندى باوكيەتى (وَكَذَا وَلاَءَ نَفْسِه فِىالأَصَحِّ) هەروەها خزمايەتى ئازادكردنى خۆيشى ڕادەكێشێ، بەڵام (قُلْـت الأَصَـحُّ الْمَنْـصُوصُ لاَ

يَجُرُّهُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی بە فەرموودەی ڕاستتر: خزمایەتی ئازادکردنی خۆی بۆ خۆی ڕاناکێشێ (وَاللهُ أَعْلَمُ).

## (كتابُ التَّدْبِير)

صَرِيحُهُ أَنْتَ حُرٌّ بَعْدَ مَوْتِي، أَوْ إِذَا مِتُّ أَوْ مَتَى مِتُّ فَأَنْتَ حُرٌّ، أَوْ أَعْتَقْتُكَ بَعْدَ مَوْتِي وَكَذَا دَبَّرْتُكَ أَوْ أَنْتَ مُدَبَّرٌ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَيَصِحُّ بِكِنَايَةِ عِتْقٍ مَعَ نِيَّةٍ كَخَلَّيْتُ سَبِيلَكَ بَعْدَ مَوْتِي، وَيَجُوزُ مُقَيَّدًا كَإِنْ مِتُّ فِي ذَاالشَّهْرِ أَوِ الْمَرَضِ فَأَنْتَ حُرٌّ، وَمُعَلَّقًا كَإِنْ دَخَلْتَ فَأَنْتَ حُرٌّ بَعْدَ مَوْتِي، فَإِنْ وُجِدَتِ الصِّفَةُ وَمَاتَ عَتَقَ وَإِلاَّ فَلاَ، وَيُشْتَرَطُ الدُّخولُ قَبْلَ مَوْتِ السَّيِّدِ، فَإِنْ قَالَ إِنْ مِتُّ ثُمَّ دَخَلْتَ فَأَنْتَ حُرٌّ أُشْتُرِطَ دُخولٌ بَعْدَ الْمَوْتِ، وَهُوَ عَلَىالتَّرَاخِي وَلَيْسَ لِلْوَارِثِ بَيْعُهُ قَبْلَ الدُّخولِ، وَلَوْ قَالَ إِذَا مِتُّ وَمَضَى شَهْرٌ فَأَنْتَ حُرٌّ فَلِلْوَارِثِ إِسْتِخْدَامُهُ فِالشَّهْرِ لاَ بَيْعُهُ، وَلَوْ قَالَ

---

﴿ كتابُ التَّدْبِير: **پەرتوکی هەڵواسینی ئازادکردن بە مردنی خۆی** ﴾

(صَرِيحُهُ) وشەی ئاشکرای هەڵواسینی ئازادکردن بە مردن ئەمانەن: (أَنْتَ حُرٌّ بَعَدَ مَوْتِي) تۆ ئازادی لە دوای مردنی من (أَوْ) یان بڵێ: (إِذَا مِتُّ أَوْ مَتَى مِتُّ فَأَنْتَ حُرٌّ) هەر کاتێك من مردم تۆ ئازادی (أَوْ) یان بڵێ: (أَعْتَقْتُكَ بَعْدَ مَوْتِي) تۆم ئازاد کرد لە دوای مردنم (وَكَذَا دَبَّرْتُكَ أَوْ أَنْتَ مُدَبَّرٌ عَلَىالْمَذْهَبِ) هەروەها: تۆم کردە ئازادکراوی هەڵواسراو بە مردن، یان تۆ ئازادکراوی هەڵواسراو بە مردنی (وَيَصِحُّ بِكِنَايَةِ عِتْقٍ مَعَ نِيَّةٍ) هەروەها بە وشەی نائاشکرای ئازادکردنیش بە نیەتەوە دروست دەبێ: (كَخَلَّيْتُ سَبِيلَكَ بَعْدَ مَوْتِي) وەك لە دوای مردنم وازم لە تۆ هێنا.

(وَيَجُوزُ مُقَيَّدًا) دروستە ئازادکردنی هەڵواسراو بە مردن بە شتێکیتریشەوە ببەسترێ: (كَإِنْ مِتُّ فِي ذَا الشَّهْرِ أَوِ الْمَرَضِ فَأَنْتَ حُرٌّ) وەك ئەگەر لەو مانگەدا مردم، یان بەو نەخۆشییە مرم تۆ ئازادی. هەم (وَمُعَلَّقًا) بە هەڵواسراویش دروستە (كَإِنْ دَخَلْتَ فَأَنْتَ حُرٌّ بَعْدَ مَوْتِي) وەك ئەگەر چوییە ژوورەوە تۆ لە دوای مردنم ئازادی. کەوابو: (فَإِنْ وُجِدَتْ الصِّفَةُ وَمَاتَ) ئەگەر پێهەڵواسراوەکە هاتە جێو گەورەکەش مرد، ئەوە (عَتَقَ) لە دوای مردنی ئازاد دەبێ (وَإِلاَّ فَلاَ) بەڵام پێهەڵواسراوەکە نەهاتە جێ ئەوە ئازاد نابێ (وَيُشْتَرَطُ الدُّخُولُ قَبْلَ مَوْتِ السَّيِّدِ) لەو حاڵەتەدا بە مەرج دادەندرێ پێش مردنی گەورەکەی چوبێتە ژوورەوە، بەڵام (فَإِنْ قَالَ: إِنْ مِتُّ ثُمَّ دَخَلْتَ فَأَنْتَ حُرٌّ) ئەگەر گوتی: ئەگەر مردم ئینجا چویتە ژوورەوە تۆ ئازادی، ئەو کاتە (أُشْتُرِطَ دُخُولٌ بَعْدَ الْمَوْتِ) بە مەرج داندراوە لە دوای مردن بچێتە ژوورەوە (وَهُوَ عَلَىالتَّرَاخِي) چونە ژوورەوەکەش کاتی بۆ نیە، هەم (وَلَيْسَ لِلْوَارِثِ بَيْعُهُ قَبْلَ الدُّخُولِ) میراتگرەکەش بۆی نیە پێش چوونە ژوورەوە کۆیلەکە بفرۆشێ.

(وَلَوْ قَالَ إذَا مِتُّ وَمَضَى شَهْرٌ فَأَنْتَ حُرٌّ) ئەگەر گوتی: هەر كاتێك مردموو لە دوای مردنم مانگێك ڕۆیشت تۆ ئازادی. ئەوە (فَلِلْوَارِثِ اسْتِخْدَامُهُ فِيالشَّهْرِ لاَ بَيْعُهُ) بۆ میراتگرەكە دروستە لەو مانگەدا خزمەتی خۆی پێ بكا، بەڵام دروست نیە بیفرۆشێ (وَلَوْ قَالَ) ئەگەر

إنْ شِئْتَ فَأَنْتَ مُدَبَّرٌ أَوْ أَنْتَ حُرٌّ بَعْدَ مَوْتِي إنْ شِئْتَ اُشْتُرِطَتْ الْمَشِيئَةُ مُتَّصِلَةً، وَإِنْ قَالَ: مَتَى شِئْتَ فَلِلتَّرَاخِي، وَ لَوْ قَالاَ لِعَبْدِهِمَا: إذَا مُتْنَا فَأَنْتَ حُرٌّ لَمْ يَعْتِقْ حَتَّى يَمُوتَا، فَإِنْ مَاتَ أَحَدُهُمَا فَلَيْسَ لِوَارِثِهِ بَيْعُ نَصِيبِهِ، وَلاَ يَصِحُّ تَدْبِيرُ مَجْنُونٍ وَصَبِيٍّ لاَ يُمَيِّزُ، وَكَذَا مُمَيِّزٌ فِىالأَظْهَرِ، وَيَصِحُّ مِنْ سَفِيهٍ وَكَافِرٍ أَصْلِيٍّ، وَتَدْبِيرُ الْمُرْتَدِّ يُبْنَى عَلَى أَقْوَالِ مِلْكِهِ، وَلَوْ دَبَّرَ ثُمَّ ارْتَدَّ لَمْ يَبْطُلْ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَلَوْ ارْتَدَّ الْمُدَبَّرُ لَمْ يَبْطُلْ، وَلِحَرْبِيٍّ حَمْلُ مُدَبَّرِهِ إلَىدَارِهِمْ، وَلَوْ كَانَ لِكَافِرٍ عَبْدٌ مُسْلِمٌ فَدَبَّرَهُ نُقِضَ وَبِيعَ عَلَيْهِ، وَلَوْ دَبَّرَ كَافِرٌ كَافِرًا فَأَسْلَمَ

---

گوتی: (إنْ شِئْتَ فَأَنْتَ مُدَبَّرٌ، أَوْ أَنْتَ حُرٌّ بَعْدَ مَوْتِي إنْ شِئْتَ) ئەگەر حەزت كرد تۆ لە دوای مردنم ئازادی، یان تۆ ئازادی لە دوای مردنم ئەگەر حەزت كرد. ئەوە لە هەر دوو وێنەدا (اُشْتُرِطَتْ الْمَشِيئَةُ مُتَّصِلَةً) بە مەرج دانراوە حەزكردنەكەی بە قسەی گەورەكەیەوە بنێو ناوبڕی نەبێ، بەڵام (وَإِنْ قَالَ: مَتَى شِئْتَ) ئەگەر گوتی هەر كاتێك حەزت كرد. ئەوە (فَلِلتَّرَاخِي) ماوەی نیەو دروستە ناوبڕی هەبێ (وَ لَوْ قَالاَ لِعَبْدِهِمَا: إذَا مُتْنَا فَأَنْتَ حُرٌّ) ئەگەر دوو هاوبەش گوتیانە كۆیلەكەیان: هەر كاتێك ئێمە مردین تۆ ئازادی. ئەوە (لَمْ يَعْتِقْ حَتَّى يَمُوتَا) هیچ بەشێكی ئازاد نابێ تا هەردووكیان دەمرن، بەڵام (فَإِنْ مَاتَ أَحَدُهُمَا) ئەگەر هاوبەشێكیان مرد، ئەوە (فَلَيْسَ لِوَارِثِهِ بَيْعُ نَصِيبِهِ) بۆ میراتگرەكەی وی دروست نیە بەشەكەی خۆی بفرۆشێ، چونكە بە مردنی هاوبەشەكەیتر هەردوو بەشەكانی ئازاد دەبن.

(وَلاَ يَصِحُّ تَدْبِيرُ مَجْنُونٍ وَصَبِيٍّ لاَ يُمَيِّزُ، وَكَذَا مُمَيِّزٌ فِيالأَظْهَرِ) ئازادكردنی دوای مردن لە شێتو منداڵی فامیدەو نەفامیش دروست نابێ، بەڵام (وَيَصِحُّ مِنْ سَفِيهٍ وَكَافِرٍ أَصْلِيٍّ) لە ماڵ بەفیڕۆدەرو لە كافری بنەڕەتی دروست دەبێ (وَتَدْبِيرُ الْمُرْتَدِّ يُبْنَى عَلَى أَقْوَالِ مِلْكِهِ) ئازادكردنی پاشگەزبوو بنیات دەدرێ لە سەر فەرموودەكانی ملكایەتیی، بە فەرموودەی بەهێزتر: ڕادەگیرێ، جا ئەگەر بۆوە موسوڵمان ئەوە دروست دەبێ، ئەگەر نا: نا، بەڵام (وَلَوْ دَبَّرَ ثُمَّ ارْتَدَّ) ئەگەر ئازادیەكەی بە مردن هەڵواسی، ئینجا كافر بوو، ئەوە (لَمْ يَبْطُلْ عَلَيالْمَذْهَبِ) هەڵواسینەكە بەتاڵ نابێتەوە (وَ) هەروەها (لَوْ ارْتَدَّ الْمُدَبَّرُ لَمْ يَبْطُلْ) ئەگەر لە دوای هەڵواسین كۆیلەكەش كافر ببێ هەر بەتاڵ نابێتەوە (وَلِحَرْبِيٍّ حَمْلُ مُدَبَّرِهِ إلَى دَارِهِمْ) بۆ كافری جەنگی هەیە كۆیلە ئازادكراوەكەی دوای مردنی بباتە ناو (دارالكفر) چونكە هێشتا هەر كۆیلەیە.

(وَلَوْ كَانَ لِكَافِرٍ عَبْدٌ مُسْلِمٌ) ئەگەر كافرێك كۆیلەیەكی موسوڵمانی هەبوو (فَدَبَّرَهُ) ئینجا ئازادی دوای‌مردنی دایێ، ئەوە (نُقِضَ وَبِيعَ عَلَيْهِ) ئازادكردنەكەی

هەڵدەوەشـێندرێتەوەو کۆیلەکـەی لێدەفرۆشـرێ، چـونکە ئەگـەر لـە مڵکایەتیی‌ـدا بمێنێتـەوە دەبێتـە زەلیلکردنـی موسـوڵمانێك (وَلَـوْ دَبَّـرَ كَـافِرٌ كَـافِرًا فَأَسْـلَمَ) ئەگـەر کافرێك ئازادی دوای مردنی دایە کۆیلەکافرەکەی خۆی، ئینجا کۆیلەکە بووە موسـوڵمان‌و

وَلَـمْ يَرْجِـعْ السَّـيِّدُ فِالتَّـدْبِيرِ نُـزِعَ مِـنْ يَـدِ سَـيِّدِهِ، وَصُـرِفَ كَسْـبُهُ إِلَيْـهِ، وَفِي قَوْلٍ يُبَاعُ، وَلَهُ بَيْعُ الْمُدَبَّرِ، وَالتَّدْبِيرُ تَعْلِيقُ عِتْقٍ بِصِفَةٍ، وَفِي قَوْلٍ وَصِيَّةٌ، فَلَوْ بَاعَهُ ثُـمَّ مَلَكَـهُ لَـمْ يَعُـدِ التَّـدْبِيرُ عَلَالْمَـذْهَبِ، وَلَـوْ رَجَـعَ عَنْـهُ بِقَوْلِـهِ كَأَبْطَلْتـهُ فَسَـخْتُهُ نَقَضْتُهُ رَجَعْتُ فِيهِ صَحَّ إِنْ قُلْنَا وَصِيَّةٌ وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ عُلِّقَ مُدَبَّرٌ بِصِفَةٍ صَحَّ وَعَتَقَ بِالأَسْبَقِ مِنْ الْمَوْتِ وَالصِّفَةِ، وَلَهُ وَطْءُ مُدَبَّرَةٍ، وَلاَ يَكُونُ رُجُوعًا، فَإِنْ أَوْلَدَهَا بَطَلَ تَدْبِيرُهُ،

---

(وَلَمْ يَرْجِعْ السَّيِّدُ فِيالتَّدْبِيرِ) گەورەکەش لەو ئازادکردنە پەشیمان نەبۆوە، ئەوە (نُزِعَ مِنْ يَدِ سَيِّدِهِ) کۆیلەکە لەدەستی گەورەکەی دەردەهێندرێ‌و چاوەڕوانی مردنی دەکرێ، بەڵام لەو ماوەیەدا (وَصُرِفَ كَسْبُهُ إِلَيْهِ) کەسابەتەکەی دەدرێتە گەورەکەی (وَفِي قَوْلٍ يُبَاعُ) لە فەرموودەیەکدا کۆیلەکە دەفرۆشرێ‌و ئازادکردنەکە هەڵدەوەشێندرێتەوە.

(وَلَهُ بَيْعُ الْمُدَبَّرِ) بۆ گەورەکە دروستە ئەو کۆیلەیە بفرۆشێ کە ئازادی دوای‌مردنی داوەتێ، هەم دروستە ببەخشێ‌و گشت دەستکاریەکی بکا کە لـە مڵکایـەتیی لابکـەوێ، جـا بـەو فرۆشتن‌و دەستکاریە ئازادکردنەکەی بەتاڵ دەبێتەوە ﴿عن جابر ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ غُلاَماً لَهُ عَنْ دُبُرٍ وَلَـمْ يَكُـنْ لَـهُ مَـالٌ غَيْـرُهُ، فَاحْتَـاجَ، فَبَاعَـهُ النَّبِـيُّ ﷺ﴾ رواه الشـیخان، پیاوێـك ئازادی‌دوای مردنی دابوە کۆیلەکەی خۆی‌و جگە لەو کۆیلەیەش هیچ ماڵی‌تری نـەبو، جـا پێغەمبەر ﷺ کۆیلەکەی فرۆشت چونکە بۆ قەرزدانەوەی پێویستی هەبوو.

(وَالتَّـدْبِيرُ تَعْلِيـقُ عِتْـقٍ بِصِـفَةٍ) ئـازادکردنی دوای مـردن هەڵواسـینی ئازادکردنێکـە بـە سیفەتێکەوە (وَفِي قَوْلٍ وَصِيَّةٌ) لە فەرموودەیەکدا: وەسێت کردنە، کەوابو: (فَلَوْ بَاعَهُ ثُمَّ مَلَكَهُ) ئەگەر کۆیلەکەی فرۆشت ئینجا دووبارە بۆوە ملکی خۆی، ئەوە (لَمْ يَعُدِ التَّدْبِيرُ عَلَى الْمَذْهَبِ) ئازادکردنە هەڵواسراوەکە ناگەڕێتەوە، چونکە بە هۆی فرۆشتن بەتاڵ بۆتەوە (وَلَوْ رَجَعَ عَنْهُ بِقَوْلِه) ئەگەر لە هەڵواسینی ئازدکردنەکە پەشیمان بۆوە بـە گوتەیـەکی خـۆی: (كَأَبْطَلْته فَسَخْتُهُ نَقَضْتُهُ رَجَعْتُ فيه) وەك بەتاڵم کردەوە هەڵموەشاندنەوە لێی پەشیمان بومەوە، ئەوە (صَحَّ إِنْ قُلْنَا وَصِيَّةٌ وَإِلاَّ فَلاَ) دروست دەبێ ئەگەر بڵـێین: وەسـێتە. بـەڵام ئەگەر بڵێین: هەڵواسینە. پەشیمانیەکە دروست نابێ.

(وَلَوْ عُلِّقَ مُدَبَّرٌ بِصِفَةٍ) ئەگەر ئـازادی ئازادکراوەکـەی دوای‌مـردن بـە سـیفەتێکی‌ترەوەش هەڵواسرا: وەك ئەگەر بچیتە فلانە شوێنە تۆ ئازادی، ئەوە (صَحَّ وَعَتَقَ بِالأَسْبَقِ مِنَ الْمَوْتِ وَالصِّفَةِ) دروست دەبێ‌و لە مردن‌و سیفەتەکە کامەیان پێشتر بێن بە پێشترەکە ئازاد دەبێ

(وَلَهُ وَطْءُ مُدَبَّرَةٍ وَلاَ يَكُونُ رُجُوعًا) بۆ گەورەکە دروستە جیماع لەگەڵ ئەو (جاريه)یە بکا کە

ئازادی دوای مردنی داوەتیّو ئەو جیماعە نابیّتە پەشیمانی، بەلام (فَإِنْ أَوْلَدَهَا بَطَلَ تَدْبِيرُهُ) ئەگەر منداڵێکی لەو (جارية)یە بوو، ئەوە هەڵواسینی ئازادکردنەکەی دوای مردن بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە بووەتە (أُمُّ الْوَلَدِ)=دایکە منداڵ، کەواتە: بەم ناوە ئازاد دەبێ.

وَلاَ يَصِحُّ تَدْبِيرُ أُمِّ وَلَدٍ، وَيَصِحُّ تَدْبِيرُ مُكَاتَبٍ وَكِتَابَةُ مُدَبَّرٍ.

(فَصْلٌ) وَلَدَتْ مُدَبَّرَةٌ مِنْ نِكَاحٍ أَوْ زِنًا لاَ يَثْبُتُ لِلْوَلَدِ حُكْمُ التَّدْبِيرِ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ دَبَّرَ حَامِلاً ثَبَتَ لَهُ حُكْمُ التَّدْبِيرِ عَلَى الْمَذْهَبِ، فَإِنْ مَاتَتْ أَوْ رَجَعَ فِي تَدْبِيرِهَا دَامَ تَدْبِيرُهُ، وَقِيلَ: إنْ رَجَعَ وَهُوَ مُتَّصِلٌ فَلاَ، وَلَوْ دَبَّرَ حَمْلاً صَحَّ، فَإِنْ مَاتَ عَتَقَ دُونَ الأُمِّ، وَإِنْ بَاعَهَا صَحَّ وَكَانَ رُجُوعًا عَنْهُ، وَلَوْ وَلَدَتِ الْمُعَلَّقُ عِتْقُهَا لَمْ يَعْتِقْ الْوَلَدُ، وَفِي قَوْلٍ إنْ عَتَقَتْ بِالصِّفَةِ عَتَقَ، وَلاَ يَتْبَعُ مُدَبَّرًا وَلَدُهُ، وَجِنَايَتُهُ كَجِنَايَةِ قِنٍّ،

---

(وَ) هەروەها (لاَ يَصِحُّ تَدْبِيرُ أُمِّ وَلَدٍ) دروست نیە ئازادی دوای مردن بداتە (أم الولد)، چونکە گوتمان ئەمە هەر بەم ناوە ئازد دەبێ، بەلام (وَيَصِحُّ تَدْبِيرُ مُكَاتَبٍ وَكِتَابَةُ مُدَبَّرٍ) دروستە: ئازادی دوای مردن بداتە نووسراوپێدراو، هەم نووسراویش بداتە ئازادکراوی دوای مردن.

﴿ فَصْلٌ: **لە باسی کۆرپەی ئازادکراوەکەی دوای مردن** ﴾

(وَلَدَتْ مُدَبَّرَةٌ مِنْ نِكَاحٍ أَوْ زِنًا) ئەگەر (جارية)کی ئازادکراوی دوای مردن–پێش مردنی گەورەکەی–منداڵێکی بوو: بە مارەبڕین، یان بە زینا، ئەوە (لاَ يَثْبُتُ لِلْوَلَدِ حُكْمُ التَّدْبِيرِ فِي الأَظْهَرِ) بڕیاری ئازادبوونی دوای مردن بۆ منداڵەکە جێگیر نابێ، بەلام (وَلَوْ دَبَّرَ حَامِلاً) ئەگەر ئازادکردنی دوای مردنی دایە (جارية)کی ئاوس، ئەوە (ثَبَتَ لَهُ حُكْمُ التَّدْبِيرِ عَلَى الْمَذْهَبِ) بڕیاری ئازادکردنەکە بۆ کۆرپەی ناو زگیشی جێگیر دەبێ، چونکە کۆرپەی ناو زگ وەك پارچەیەکی (جاريه)کەیە (فَإِنْ مَاتَتْ أَوْ رَجَعَ فِي تَدْبِيرِهَا) جا ئەگەر (جارية)کە مرد، یان گەورەکە لە ئازادکردنەکە پەشیمان بۆوە، ئەوە (دَامَ تَدْبِيرُهُ) ئازادبوونی کۆرپەی ناو زگ لە دوای مردن هەر بەردەوام دەبێ (وَقِيلَ إنْ رَجَعَ وَهُوَ مُتَّصِلٌ فَلاَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر گەورەکە پەشیمان بۆوەو کۆرپەکەش هەر لە ناو زگیدا بوو، ئەو کاتە ئازادبوونی کۆرپەکە بەردەوام نابێ.

(وَلَوْ دَبَّرَ حَمْلاً) ئەگەر ئازادی دوای مردنی دایە کۆرپەی ناو زگ، ئەوە (صَحَّ) دروست دەبێ، کەوابو: (فَإِنْ مَاتَ) ئەگەر گەورەکە مرد، ئەوە (عَتَقَ دُونَ الأُمِّ) کۆرپەکە ئازاد دەبێ، بەلام دایکەکەی ئازاد نابێ، بەلام (وَإِنْ بَاعَهَا) ئەگەر (جاريه)کەی بە ئاوسی فرۆشت، ئەوە (صَحَّ وَكَانَ رُجُوعًا عَنْهُ) فرشتنەکەی دروست دەبێو دەبێتە پەشیمانبوونەوە لە ئازدکردنی کۆرپەکە (وَلَوْ وَلَدَتِ الْمُعَلَّقُ عِتْقُهَا) ئەگەر ئەو (جاريە)ی ئازادکردنی بە شتێکەوە هەڵواسراوە منداڵێکی بوو، ئەوە (لَمْ يَعْتِقِ الْوَلَدُ) بە ئازادبوونی خۆی منداڵەکەی ئازاد نابێ (وَفِي قَوْلٍ إنْ عَتَقَتْ بِالصِّفَةِ عَتَقَ) لە فەرموودەیەکدا: ئەگەر

(جاریه)كه به پێهه‌ڵواسراوه‌كه ئازاد ببێ منداڵه‌كه‌شی ئازاد ده‌بێ (وَلاَ يَتْبَعُ مُدَبَّرًا وَلَدُهُ) كۆیله‌ی ئازادكراوی دوای مردن منداڵه‌كه‌ی خۆی شوێنی ناكه‌وێ له‌ ئازادبوونه‌كه‌دا (وَجِنَايَتُهُ كَجِنَايَةِ قِنٍّ) تاوانی ئازادكراوی دوای مردن وه‌كو تاوانی كۆیله‌ی بێناتۆره‌.

وَيَعْتِقُ بِالْمَوْتِ مِنَ الثُّلُثِ كُلُّهُ أَوْ بَعْضُهُ بَعْدَ الدَّيْنِ، وَلَوْ عَلَّقَ عِتْقًا عَلَى صِفَةٍ تَخْتَصُّ بِالْمَرَضِ كَإِنْ دَخَلْتَ فِي مَرَضِ مَوْتِي فَأَنْتَ حُرٌّ عَتَقَ مِنَ الثُّلُثِ، وَإِنْ احْتَمَلَتْ الصِّحَّةَ فَوُجِدَتْ فِالْمَرَضِ فَمِنْ رَأْسِ الْمَالِ فِالأَظْهَرِ، وَلَوْ ادَّعَى عَبْدُهُ التَّدْبِيرَ فَأَنْكَرَهُ فَلَيْسَ بِرُجُوعٍ بَلْ يَحْلِفُ، وَلَوْ وُجِدَ مَعَ مُدَبَّرٍ مَالٌ فَقَالَ: كَسَبْته بَعْدَ مَوْتِ السَّيِّدِ، وَقَالَ الْوَارِثُ قَبْلَهُ صُدِّقَ الْمُدَبَّرُ بِيَمِينِهِ، وَإِنْ أَقَامَا بَيِّنَتَيْنِ قُدِّمَتْ بَيِّنَتُهُ.

## (كِتَابُ الْكِتَابَةِ)

هِيَ مُسْتَحَبَّةٌ إنْ طَلَبَهَا رَقِيقٌ أَمِينٌ قَوِيٌّ عَلَى كَسْبٍ،

---

(وَ) هه‌ر كاتێك كۆیله‌یه‌ك ئازادكردنی دوای مردنی درایێ، ئه‌وه‌ (يَعْتِقُ بِالْمَوْتِ مِنَ الثُّلُثِ) هه‌ر به‌ مردنی گه‌وره‌كه‌ی له‌ سێیه‌كی ماڵه‌كه‌ی ئازاد ده‌بێ، جا كۆیله‌كه‌ش (كُلُّهُ) هه‌مووی ئازاد ده‌بێ ئه‌گه‌ر هه‌مووی به‌ ئه‌ندازه‌ی سێیه‌ك بێ (أَوْ بَعْضُهُ) یان به‌شێكی ئازاد ده‌بێ، ئه‌گه‌ر به‌شه‌كه‌ به‌ ئه‌ندازه‌ی سێیه‌ك بێ، جا ئازادبوونه‌كه‌ش (بَعْدَالدَّيْنِ) له‌ دوای قه‌رزدانه‌وه‌كان ده‌بێ (وَلَوْ عَلَّقَ عِتْقًا عَلَى صِفَةٍ تَخْتَصُّ بِالْمَرَضِ) ئه‌گه‌ر ئازادكردنێكی به‌ سیفه‌تێك هه‌ڵواسی كه‌ تایبه‌ت به‌ نه‌خۆشی بوو: (كَإِنْ دَخَلْتَ فِي مَرَضِ مَوْتِي فَأَنْتَ حُرٌّ) وه‌ك ئه‌گه‌ر له‌ نه‌خۆشی مردنمدا بچیته‌ ژووره‌وه‌ تۆ ئازادی، ئه‌وه‌ش (عَتَقَ مِنَ الثُّلُثِ) له‌ سێیه‌كی ماڵه‌كه‌ی ئازاد ده‌بێ، به‌ڵام (وَإِنْ احْتَمَلَتْ الصِّحَّةَ) ئه‌گه‌ر سیفه‌ته‌كه‌ ئیحتیمالی ساغی هه‌بوو، چونكه‌ باسی نه‌خۆشی نه‌كردبو (فَوُجِدَتْ فِيالْمَرَضِ) ئینجا له‌ نه‌خۆشیدا هاته‌جێ: وه‌ك ته‌نها بڵێ: ئه‌گه‌ر بچێته‌ ژووره‌وه‌ تۆ له‌ دوای مردنم ئازادی. ئه‌وه‌ (فَمِنْ رَأْسِ الْمَالِ فِيالأَظْهَرِ) له‌ سه‌ر مایه‌كه‌ی ماڵی ئازاد ده‌بێ.

(وَلَوْ ادَّعَى عَبْدُهُ التَّدْبِيرَ) ئه‌گه‌ر كۆیله‌كه‌ی گوتی: ئازادی دوای مردنت داومێ. (فَأَنْكَرَهُ) گه‌وره‌كه‌ش گوتی ڕاست نیه‌. ئه‌وه‌ (فَلَيْسَ بِرُجُوعٍ بَلْ يَحْلِفُ) نابێته‌ په‌شیمانبوونه‌وه‌، به‌ڵكو گه‌وره‌كه‌ سوێند ده‌خوا (وَلَوْ وُجِدَ مَعَ مُدَبَّرٍ مَالٌ) ئه‌گه‌ر ئازادكراوێكی دوای مردن هه‌ندێك ماڵی له‌ ده‌ستدا بوو (فَقَالَ: كَسَبْته بَعْدَ مَوْتِ السَّيِّدِ) جا گوتی: له‌ دوای مردنی گه‌وره‌كه‌م ئه‌م ماڵه‌م وه‌ده‌ست هێناوه‌. (وَقَالَ الْوَارِثُ قَبْلَهُ) میراتگره‌كه‌ش گوتی: پێش مردنی گه‌وره‌كه‌ وه‌ده‌ستت هێناوه‌. (صُدِّقَ الْمُدَبَّرُ بِيَمِينِهِ) باوه‌ڕ به‌ ئازادكراوه‌كه‌ ده‌كرێ ئه‌گه‌ر سوێند بخوا، هه‌م (وَإِنْ أَقَامَا بَيِّنَتَيْنِ) ئه‌گه‌ر هه‌ردوو لا شاهیدیان هێنان، ئه‌وه‌ (قُدِّمَتْ بَيِّنَتُهُ) هه‌ر شاهیده‌كانی ئازادكراوه‌كه‌ وه‌پێش دێخرین.

واتـه: مامڵـەت لەگـەڵ کۆیلەکـەیبکاو بڵـێ: ئەوەنـدە ماڵـەم بـۆ بێنـە ئـازادت دەکـەم.
(هِيَ مُسْتَحَبَّةٌ) نووسراودانە کۆیلە سوننەتە (إنْ طَلَبَهَا رَقِيقٌ أَمِينٌ قَوِيٌّ عَلَى كَسْبٍ) ئەگەر کۆیلەیەکی بەهێزی ئەمینی بە توانا بۆ کەسابەتکردن داوای بکا، خوایگەورە دەفەرموێ:
قِيلَ أَوْ غَيْرُ قَوِيٍّ، وَلاَ تُكْرَهُ بِحَالٍ، وَصِيغَتُهَا: كَاتَبْتُكَ عَلَى كَذَا مُنَجَّمًا إذَا أَدَّيْتَهُ فَأَنْتَ حُرٌّ، وَيُبَيِّنُ عَدَدَ النُّجُومِ وَقِسْطَ كُلِّ نَجْمٍ، وَلَوْ تَرَكَ لَفْظَ التَّعْلِيقِ وَنَوَاهُ جَازَ، وَلاَ يَكْفِي لَفْظُ كِتَابَةٍ بِلاَ تَعْلِيقٍ وَلاَ نِيَّةٍ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَيَقُولُ الْمُكَاتَبُ قَبِلْتُ، وَشَرْطُهُمَا تَكْلِيفٌ وَإِطْلاَقٌ، وَكِتَابَةُ الْمَرِيضِ مِنْ الثُّلُثِ، فَإِنْ كَانَ لَهُ مِثْلاَهُ صَحَّتْ كِتَابَةُ كُلِّهِ، فَإِنْ لَمْ يَمْلِكْ غَيْرَهُ وَأَدَّى فِي حَيَاتِهِ مِائَتَيْنِ، وَقِيمَتُهُ مِائَةٌ عَتَقَ، وَإِنْ أَدَّى مِائَةً عَتَقَ ثُلُثَاهُ، وَلَوْ كَاتَبَ مُرْتَدٌّ بُنِيَ عَلَى أَقْوَالِ مِلْكِهِ، فَإِنْ وَقَفْنَاهُ بَطَلَتْ عَلَى الْجَدِيدِ،

---

﴿وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً﴾
ئەو کۆیلانەی داوای نووسراو پێدان دەکەن لە وانەی لە دەستتان دانـە، ئێـوە نووسـراویان بدەنێ ئەگەر زانیتان چاکەیان تێدایە. (قِيلَ أَوْ غَيْرُ قَوِيٍّ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا ئەگەر توانای کەسابەتیشی نەبێ، هـەر سـوننەتە (وَلاَ تُكْرَهُ بِحَالٍ) نووسـراودانە کۆیلـە لـە هـیچ حاڵەتێکدا ناپەسند نیە.
(وَصِيغَتُهَا) گۆتەی نووسراودان ئەوەیە گەورەکە بڵێتە کۆیلەکە: (كَاتَبْتُكَ عَلَى كَذَا مُنَجَّمًا إذَا أَدَّيْتَهُ فَأَنْتَ حُرٌّ) مامڵەتی نووسراودانم لەگەڵ تۆ کرد لە سەر ئەوەندە ماڵە بـە وەنـدە بەشە بمدەیێ هەر کاتێك ماڵەکەت دامێ تۆ ئازادی. (وَيُبَيِّنُ عَدَدَ النُّجُومِ وَقِسْطَ كُلِّ نَجْمٍ) واجبە گەورەکە: ژمارەی بەشەکانو ئەندازەی ماڵهێنانی لە گشت بەشێکدا ڕوون بکاتـەوە (وَلَوْ تَرَكَ لَفْظَ التَّعْلِيقِ وَنَوَاهُ جَازَ) ئەگەر گەورەکـە وشـەی هەڵواسـینەکەی نـەگوت بـەڵام نیەتی هەڵواسینەکەی هەبوو، ئەوەش هەر دروست دەبێ، بەڵام (وَلاَ يَكْفِي لَفْظُ كِتَابَةٍ بِلاَ تَعْلِيقٍ وَلاَ نِيَّةٍ عَلَى الْمَذْهَبِ) وشەی نووسراوپێدان بێ هەڵواسینو بێ نیەتی هەڵواسین بەس نیە (وَيَقُولُ الْمُكَاتَبُ قَبِلْتُ) دەبێ نووسراوپێدراوەکەش یەکسەر بڵێ: قبوڵم کرد.
(وَشَرْطُهُمَا) مـەرجی نووسـراودەرەکەو نووسـراوپێدراوەکە: (تَكْلِيفٌ وَإِطْلاَقٌ) دەبـێ هەردووکیان باڵغو عاقڵو بە خۆشیخۆیان بێو هەم گەورەکەش دەستکاریی دروست بێ (وَكِتَابَةُ الْمَرِيضِ مِنْ الثُّلُثِ) نووسراودانی نەخۆش لە سێیەکی ماڵەکـەی حیسـاب دەکـرێ (فَإِنْ كَانَ لَهُ مِثْلاَهُ) جا ئەگەر گەورەکە بە ئەندازەی دوو هەندی کۆیلەکەی ماڵی هـەبێ، ئەوە (صَحَّتْ كِتَابَةُ كُلِّهِ) نووسراودانی هەمو کۆیلەکە دروست دەبێ (فَإِنْ لَمْ يَمْلِكْ غَيْرَهُ) جا ئەگەر گەورەکە جگە لە کۆیلەکە هیچ ماڵیتری نـەبو (وَأَدَّى فِي حَيَاتِهِ مِائَتَيْنِ) هـەر لـە ژیانیگەورەکەشدا دووسەد دیناری دابو: کە مامڵەتەکەی لـە سـەر کردبـو (وَقِيمَتُهُ مِائَةٌ) نرخی کۆیلەکەش سەد دینار بوو، ئەوە (عَتَقَ) هەمووی ئازاد دەبێ، بەڵام (وَإِنْ أَدَّى مِائَةً) ئەگەر تەنها سەد دیناری دابێ، ئەوە (عَتَقَ ثُلُثَاهُ) دوو سێیەکی کۆیلەکە ئازاد دەبێ.

(وَلَوْ كَاتَبَ مُرْتَدٌّ) ئەگەر پاشگەزبوویێك نووسراوی دایە كۆیلەكەی، ئەوە (بُنِيَ عَلَى أَقْوَالِ مِلْكِهِ) لە سەر فەرموودەكانی ملكایەتیی بنیات دەندریێ (فَإِنْ وَقَفْنَاهُ بَطَلَتْ عَلَى الْجَدِيدِ) ئەگەر بە فەرموودەی بەهێزتر ملكایەتیی ڕابگرین: ئەوە مامڵەتەكە بەتاڵ دەبێتەوە

وَلاَ تَصِحُّ كِتَابَةُ مَرْهُونٍ وَمُكْرًى، وَشَرْطُ الْعِوَضِ كَوْنُهُ دَيْنًا مُؤَجَّلاً، وَلَوْ مَنْفَعَةً، وَمُنَجَّمًا بِنَجْمَيْنِ فَأَكْثَرَ، وَقِيلَ: إنْ مَلَكَ بَعْضَهُ وَبَاقِيهِ حُرٌّ لَمْ يُشْتَرَطْ أَجَلٌ وَتَنْجِيمٌ، وَلَوْ كَاتَبَ عَلَى خِدْمَةِ شَهْرٍ وَدِينَارٍ عِنْدَ انْقِضَائِهِ صَحَّتْ، أَوْ عَلَى أَنْ يَبِيعَهُ كَذَا فَسَدَتْ، وَلَوْ قَالَ كَاتَبْتُكَ وَبِعْتُكَ هَذَا الثَّوْبَ بِأَلْفٍ وَنَجَّمَ الأَلْفَ وَعَلَّقَ الْحُرِّيَّةَ بِأَدَائِهِ فَالْمَذْهَبُ صِحَّةُ الْكِتَابَةِ دُونَ الْبَيْعِ، وَلَوْ كَاتَبَ عَبِيدًا عَلَى عِوَضٍ مُنَجَّمٍ وَعَلَّقَ عِتْقَهُمْ بِأَدَائِهِ فَالنَّصُّ صِحَّتُهَا، وَيُوَزَّعُ عَلَى قِيمَتِهِمْ يَوْمَ الْكِتَابَةِ فَمَنْ أَدَّى حِصَّتَهُ عَتَقَ، وَمَنْ عَجَزَ رَقَّ، وَتَصِحُّ كِتَابَةُ بَعْضِ مَنْ بَاقِيهِ حُرٌّ، فَلَوْ كَاتَبَ كُلَّهُ

---

(وَلاَ تَصِحُّ كِتَابَةُ مَرْهُونٍ وَمُكْرًى) نووسراودانە كۆیلەی ڕەهنكراو و بەكرێدراو دروست نابێ، چونكە كەسابەتی پێ ناكرێ.

(وَشَرْطُ الْعِوَضِ) مەرجی پارەی نووسراودانەكە: (كَوْنُهُ دَيْنًا مُؤَجَّلاً) دەبی قەرزێكی ماوە بۆ داندراو بێ (وَلَوْ مَنْفَعَةً) هەرچەند پارەكەش سودێك بێ، هەم (وَمُنَجَّمًا بِنَجْمَيْنِ فَأَكْثَرَ) دەبی پارە هێنانەكەش بەش بەش كرابێ، واتە: بە دوو جار، یان بە زیاتر لە دوو جار پارەكە بهێنێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (إنْ مَلَكَ بَعْضَهُ وَبَاقِيهِ حُرٌّ) ئەگەر بەشێكی ملكی گەورەكەی بێو بەشێكیشی ئازاد بێ (لَمْ يُشْتَرَطْ أَجَلٌ وَتَنْجِيمٌ) ماوە دانانو بەشكردنی پارە هێنانەكە مەرج نیە (وَلَوْ كَاتَبَ عَلَى خِدْمَةِ شَهْرٍ وَدِينَارٍ عِنْدَ انْقِضَائِهِ) ئەگەر نووسراوی دایە كۆیلەكەی لە سەر خزمەتكردنی مانگێكو دینارێك لە كاتی تەواوبوونی مانگەكە، ئەوە (صَحَّتْ) دروست دەبێ (أَوْ عَلَى أَنْ يَبِيعَهُ كَذَا) یان لە سەر ئەوەی فلاّنە شتەی بفرۆشیتێ، ئەوە (فَسَدَتْ) بەتاڵ دەبێ.

(وَلَوْ قَالَ) ئەگەر گەورەكەی گوتی: (كَاتَبْتُكَ وَبِعْتُكَ هَذَا الثَّوْبَ بِأَلْفٍ) نووسراوم دایێیو ئەم جلەشم فرۆشتیێ بە هەزار دینار (وَنَجَّمَ الأَلْفَ وَعَلَّقَ الْحُرِّيَّةَ بِأَدَائِهِ) هێنانی هەزارەكەشی بەش بەش كردو ئازادیەكەشی بە هێنانی هەزارەكە هەڵواسی، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ صِحَّةُ الْكِتَابَةِ دُونَ الْبَيْعِ) نووسراودانەكە دروست دەبێ، بەلاّم فرۆشتنەكە دروست نابێ (وَلَوْ كَاتَبَ عَبِيدًا عَلَى عِوَضٍ مُنَجَّمٍ) ئەگەر نووسراوی دایە چەند كۆیلەیەك لە سەر هەندێك پارەی بەش بەشكراو (وَعَلَّقَ عِتْقَهُمْ بِأَدَائِهِ) ئازادی گشتیانی بە دانی ماڵەكە هەڵواسی، ئەوە (فَالنَّصُّ صِحَّتُهَا، وَيُوَزَّعُ عَلَى قِيمَتِهِمْ يَوْمَ الْكِتَابَةِ) نووسراودانەكە دروست دەبێو پارەكەش بە سەر نرخی كۆیلەكاندا بەش دەكرێ لە ڕۆژی نووسراودانەكە (فَمَنْ أَدَّى حِصَّتَهُ عَتَقَ) جا هەر كۆیلەیەك بەشە پارەكەی خۆی بدا، ئازاد دەبێو (وَمَنْ عَجَزَ رَقَّ) هەر كۆیلەیەكیش توانای

ماڵدانەکەی نەبێ هەر بە کۆیلەیی دەمێنێتەوە.
(وَتَصِحُّ كِتَابَةُ بَعْضِ مَنْ بَاقِيهِ حُرٌّ) دروستە نووسراو بداتە ئەو کۆیلەیەی بەشەکەیتری ئازادە (فَلَوْ كَاتَبَ كُلَّهُ) جا ئەگەر نووسراوی دایە هەموو ئەو کۆیلەیەی بەشێکی ئازادە، صَحَّ فِي الرِّقِّ فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ كَاتَبَ بَعْضَ رَقِيقٍ فَسَدَتْ إِنْ كَانَ بَاقِيهِ لِغَيْرِهِ وَلَمْ يَأْذَنْ، وَكَذَا إِنْ أَذِنَ أَوْ كَانَ لَهُ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوْ كَاتَبَاهُ مَعًا أَوْ وَكَّلاَ صَحَّ إِنْ اتَّفَقَتِ النُّجُومُ وَجُعِلَ الْمَالُ عَلَى نِسْبَةِ مِلْكَيْهِمَا، فَلَوْ عَجَزَ فَعَجَّزَهُ أَحَدُهُمَا وَأَرَادَ الآخَرُ إِبْقَاءَهُ فَكَابْتِدَاءِ عَقْدٍ، وَقِيلَ يَجُوزُ، وَلَوْ أَبْرَأَهُ مِنْ نَصِيبِهِ أَوْ أَعْتَقَهُ عَتَقَ نَصِيبُهُ، وَقُوِّمَ الْبَاقِي إِنْ كَانَ مُوسِرًا.
(فَصْلٌ) يَلْزَمُ السَّيِّدَ أَنْ يَحُطَّ عَنْهُ جُزْءًا مِنَ الْمَالِ، أَوْ يَدْفَعَهُ إِلَيْهِ،

---

ئەوە (صَحَّ فِي الرِّقِّ فِي الأَظْهَرِ) لە بەشە کۆیلەکەیدا دروست دەبێ‌و هەر کاتێك بە ئەندازەی بەشە کۆیلەکەی ماڵی هێنا ئازاد دەبێ‌و لە بەشە ئازادەکەشدا بەتاڵ دەبێتەوە.
(وَلَوْ كَاتَبَ بَعْضَ رَقِيقٍ) ئەگەر نووسراوی دایە بەشێکی کۆیلەیەك، ئەوە (فَسَدَتْ إِنْ كَانَ بَاقِيهِ لِغَيْرِهِ وَلَمْ يَأْذَنْ) نووسراودانەکە بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر بەشەکەیتری هی کەسێکیتر بێ‌و ئیزنی نەدابێ (وَكَذَا إِنْ أَذِنَ أَوْ كَانَ لَهُ عَلَى الْمَذْهَبِ) هەروەها ئەگەر ئیزنیشی دابێ، یان بەشەکەیتریشی هی خۆی بێ هەر بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە کۆیلەکە بۆ کەسابەت سەربەخۆ نابێ.
بەڵام (وَلَوْ كَاتَبَاهُ مَعًا أَوْ وَكَّلاَ) ئەگەر هەردوو هاوبەشەکان وێکڕا نووسراویان دایە کۆیلەکە، یان وەکیلێکیان گرت، ئەو کاتە (صَحَّ إِنْ اتَّفَقَتْ النُّجُومُ) دروست دەبێ، ئەگەر بەشەکانی ماڵهێنانەکە وەکو یەکتری بن، کەوابو: (وَجُعِلَ الْمَالُ عَلَى نِسْبَةِ مِلْكَيْهِمَا) ماڵەکەش بەگوێرەی بەشە ملکایەتی هاوبەشەکان لە سەر کۆیلەکە دادەندرێ (فَلَوْ عَجَزَ فَعَجَّزَهُ أَحَدُهُمَا) جا ئەگەر کۆیلەکە توانای ماڵهێنانەکەی نەبو و هاوبەشێك بێتوانای کردو نووسراودانەکەی هەڵوەشاندەوە (وَأَرَادَ الآخَرُ إِبْقَاءَهُ) هاوبەشەکەیتریش ویستی بیهێڵێتەوەو هەڵینەوەشاندەوە، ئەوەش (فَكَابْتِدَاءِ عَقْدٍ) وەك سەرەتای مامڵەتەکەیەو دروست نابێ (وَقِيلَ يَجُوزُ) لەفەرموودەیەکی بێهێزدا دروستە.
(وَلَوْ أَبْرَأَهُ مِنْ نَصِيبِهِ أَوْ أَعْتَقَهُ) ئەگەر هاوبەشێك لە بەشە ماڵەکەی‌خۆی گەردەنی ئازاد کرد، یان بەخۆڕایی بەشەکەی خۆی ئازاد کرد، ئەوە (عَتَقَ نَصِيبُهُ) بەشەکەی وی ئازاد دەبێ‌و (وَقُوِّمَ الْبَاقِي إِنْ كَانَ مُوسِرًا) بەشی هاوبەشەکەیتریشی لە سەر دەقرسێندرێ‌و ئازادیەکە پێدا دەڕواتە بەشی هاوبەشەکەو گشتی ئازاد دەبێ ئەگەر هەبوویی بێ، بەڵام ئەگەر نەبوویی بێ لە سەری ناقرسێندرێ‌و تەنها بەشی خۆی ئازاد دەبێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی داشکاندنی بەشێکی ماڵی نووسراودانەکە ﴾

(يَلْزَمُ السَّيِّدَ) لە سەر گەورەکە واجبە (أَنْ يَحُطَّ عَنْهُ جُزْءًا مِنَ الْمَالِ) بەشێکی ماڵی

نووسراودانەکە لە کۆیلەکە دابشکێنێ‌و هەمووی لێ‌وەرنەگرێ (أَوْ يَدْفَعَهُ إِلَيْهِ) یان بەخۆی هەندێك مـاڵ بداتەکۆیلەکـە تـاکو مـاڵی نووسـراودانەکەی پـێ تـەواو بکـا، خـوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللهِ الَّذِی آتَاکُمْ﴾ هەندێك لەو ماڵـەی خـوا داویەتیـە ئێوە،

وَالْحَـطُّ أَوْلَـى، وَفِـي الـنَّجْمِ الأَخِيـرِ أَلْيَـقُ، وَالأَصَـحُّ أَنَّـهُ يَكْفِـي مَـا يَقَـعُ عَلَيْـهِ الاسْـمُ، وَلاَ يَخْتَلِــفُ بِحَسَــبِ الْمَــالِ، وَأَنَّ وَقْــتَ وُجُوبِــهِ قَبْــلَ الْعِتْــقِ، وَيُسْــتَحَبُّ الرُّبُــعُ، وَإِلاَّ فَالسُّــبُعُ، وَيَحْــرُمُ وَطْءُ مُكَاتَبَتِــهِ، وَلاَ حَــدَّ فِيــهِ، وَيَجِــبُ مَهْــرٌ، وَالْوَلَــدُ حُــرٌّ، وَلاَ تَجِـبُ قِيمَتُهُ عَلَىالْمَـذْهَبِ، وَصَـارَتْ مُسْـتَوْلَدَةً مُكَاتَبَـةً فَـإِنْ عَجَـزَتْ عَتَقَـتْ بِمَوْتِـهِ، وَوَلَـدُهَا مِـنْ نِكَـاحٍ أَوْ زِنًـا مُكَاتَـبٌ فِـالأَظْهَرِ يَتْبَعُهَـا رِقًّـا وَعِتْقًـا، وَلَـيْسَ عَلَيْـهِ شَـيْءٌ، وَالْحَقُّ فِيهِ لِلسَّيِّدِ، وَفِي قَوْلٍ لَهَا، فَلَوْ قُتِلَ فَقِيمَتُهُ لِذِىالْحَقِّ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّ أَرْشَ

---

بیدەنە نووسراوپێدراوەکان. (وَالْحَطُّ أَوْلَى) داشکاندنەکە باشترە لە ماڵدانەکە، هەم (وَفِي النَّجْمِ الأَخِيرِ أَلْيَقُ) لە بەشەکەی‌کۆتاییشدا شیاوترە، جا ئەگەر گەورەکە مردو هیچ مـاڵی نەدابوە کۆیلەکەو هیچی بۆ دانەشکاندبو، ئەو کاتـە واجبـە: میراتگرەکـەی بیـداتێ، یـان دایبشکێنێ (وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَكْفِي مَا يَقَعُ عَلَيْهِ الإِسْمُ) ئەوەندە بەسە نـاوی مـاڵ، یـان نـاوی داشکاندن بێ (وَلاَ يَخْتَلِفُ بِحَسَبِ الْمَالِ)دا شکاوەکە بەگوێرەی ماڵەکە ناگۆڕێ (وَأَنَّ وَقْـتَ وُجُوبِهِ قَبْلَ الْعِتْقِ) کاتی واجبـوونی داشـکاندن‌و ماڵدانەکـە پـێش ئازادبوونەکەیـە، ئینجـا (وَيُسْـتَحَبُّ الرُّبُـعُ) سـوننەتە: چـوارێکی‌ماڵەکە دابشـکێنێ، یـان بیـداتی (وَإِلاَّ) ئەگـەر نـا: (فَالسُّبُعُ) حەفتێکی ماڵەکە سوننەتە.

(وَيَحْـرُمُ وَطْءُ مُكَاتَبَتِـهِ وَلاَ حَـدَّ فِيـهِ) لـە گەورەکـە حەرامـە جیمـاع لەگـەڵ (جاريـة) نووسـراوپێدراوەکەی بکـا، بـەڵام سـزای زینـای تـێدا نیـەو (وَيَجِـبُ مَهْـرٌ) مـارەیی ئـەم جیماعەشی لە سەر واجب دەبێ بیداتە (جارية)کە (وَالْوَلَـدُ حُـرٌّ) منـداڵی ئـەم جیماعـەش ئـازادەو لـە نـەژادی گەورەکەیـەو نابێتـە کۆیلـە (وَلاَ تَجِـبُ قِيمَتُـهُ عَلَىالْمَـذْهَبِ) نرخـی منداڵەکەش لە سەر گەورەکە واجب نابێ (وَصَارَتْ مُسْتَوْلَدَةً مُكَاتَبَةً) ئـەم (جارية)یـەش دەبێتە (أم الولد)ێکی نووسراوپێدراو، کەواتە: (فَإِنْ عَجَزَتْ عَتَقَتْ بِمَوْتِهِ) ئەگەر توانای نەبو ماڵەکە بهێنێ، ئەو کاتە بە مردنی گەورەکەی بە هۆی(أم الولد)ی ئازاد دەبێ.

(وَوَلَدُهَا مِنْ نِكَاحٍ أَوْ زِنًا مُكَاتَـبٌ فِیالأَظْهَرِ) لـە دوای نووسـراودانەکە، هـەر منداڵێکی لـە (جارية)یەکی نووسراو پێدراو ببێ: لە مارەبڕین، یان لە زینا، ئەویش وەکو خۆی بڕیـاری نووسراوپێدراوی بۆ دەدرێ، کەوابو: (يَتْبَعُهَا رِقًّا وَعِتْقًا) منداڵەکە پابەندی دایکی دەبێ: لە کۆیلایەتی‌و ئازادی‌دا (وَ) هەر کاتێك منداڵەکە بە ئازادبوونی دایکی ئازاد بوو (لَيْسَ عَلَيْـهِ شَيْءٌ) هیچ ماڵ لە سەر منداڵەکە واجب نیە بیداتە گەورەکـەی دایکـی، چـونکە مامڵـەتی لەگەڵ نەکردوە (وَ) ئەگەر منداڵەکە ئازاد نەبێ (الْحَقُّ فِيهِ لِلسَّيِّدِ) مـافی مڵکایـەتیی بـۆ

گەورەکەی دایکیەتی (وَفِي قَوْلٍ لَهَا) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ملکایەتی بۆ دایکیەتی (فَلَوْ قُتِلَ) جا ئەگەر ئەم مندالە کوژرا، ئەوە (فَقِيمَتُهُ لِذِيالْحَقِّ) ئەو نرخەی لەتوڵەی وەردەگیرێ بۆ خاوەن مافەکەیەتی کە گەورەکەی دایکیەتی (وَالْمَذْهَبُ أَنَّ أَرْشَ جِنَايَتِهِ عَلَيْهِ، وَكَسْبَهُ وَمَهْرَهُ يُنْفَقُ مِنْهَا عَلَيْهِ، وَمَا فَضَلَ وُقِفَ، فَإِنْ عَتَقَ فَلَهُ، وَإِلاَّ فَلِلسَّيِّدِ، وَلاَ يَعْتِقُ شَيْءٌ مِنَ الْمُكَاتَبِ حَتَّى يُؤَدِّيَ الْجَمِيعَ، وَلَوْ أَتَى بِمَالٍ فَقَالَ السَّيِّدُ هَذَا حَرَامٌ وَلاَ بَيِّنَةَ حَلَفَ الْمُكَاتَبُ أَنَّهُ حَلاَلٌ، وَيُقَالُ لِلسَّيِّدِ: تَأْخُذُهُ أَوْ تُبْرِئُهُ عَنْهُ، فَإِنْ أَبَى قَبَضَهُ الْقَاضِي، فَإِنْ نَكَلَ الْمُكَاتَبُ حَلَفَ السَّيِّدُ، وَلَوْ خَرَجَ الْمُؤَدَّى مُسْتَحَقًّا رَجَعَ السَّيِّدُ بِبَدَلِهِ، فَإِنْ كَانَ فِالنَّجْمِ الأَخِيرِ بَانَ أَنَّ الْعِتْقَ لَمْ يَقَعْ وَإِنْ كَانَ قَالَ عِنْدَ أَخْذِهِ أَنْتَ حُرٌّ، وَإِنْ خَرَجَ مَعِيبًا فَلَهُ رَدُّهُ وَأَخْذُ بَدَلِهِ،

---

جِنَايَتِهِ عَلَيْهِ) توڵەی تاوانەکەی مندالەکەش لە سەر خۆیەتی (وَكَسْبَهُ وَمَهْرَهُ يُنْفَقُ مِنْهَا عَلَيْهِ) کەسابەت و مارەیی مندالەکەش مندالەکەی پێ بەخێو دەکرێ و (وَمَا فَضَلَ وُقِفَ) ئەوەی زیادیش بو ڕادەگیرێ: (فَإِنْ عَتَقَ فَلَهُ، وَإِلاَّ فَلِلسَّيِّدِ) جا ئەگەر ئازاد بوو بۆ خۆیەتی، ئەگەرنا: بۆ گەورەکەیەتی.

(وَلاَ يَعْتِقُ شَيْءٌ مِنَ الْمُكَاتَبِ حَتَّى يُؤَدِّيَ الْجَمِيعَ) هیچ بەشێك لە نووسراوپێدراوەکە ئازاد نابێ تا هەموو پارەکە دەداتە گەورەکەی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿الْمُكَاتَبُ عَبْدٌ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ دِرْهَمٌ﴾ أخرە أبوداود باسناد حسن، نووسراوپێدراو هەر کۆیلەیە تا دیرهەمێکی لە سەر مابێ. (وَلَوْ أَتَى بِمَالٍ) ئەگەر نووسراوپێدراوەکە ماڵێکی هێنا، بەڵام (فَقَالَ السَّيِّدُ هَذَا حَرَامٌ وَلاَ بَيِّنَةَ) گەورەکەی گوتی: ئەم ماڵە حەرامە، هیچ شاهیدیشی نەبو، ئەو کاتە (حَلَفَ الْمُكَاتَبُ أَنَّهُ حَلاَلٌ) نووسراوپێدراوەکە سوێند دەخوا: ماڵەکە حەڵاڵە. ئینجا (وَيُقَالُ لِلسَّيِّدِ تَأْخُذُهُ أَوْ تُبْرِئُهُ عَنْهُ) دەگوترێتە گەورەکەی: یان دەبێ ماڵەکەی لێوەر بگری، یان گەردەنی لە پارەکە ئازاد بکەی (فَإِنْ أَبَى) جا ئەگەر گەورەکەی ڕقەکاری کرد، ئەو کاتە (قَبَضَهُ الْقَاضِي) قازی پارەکە وەردەگرێ و نووسراوپێدراوەکەش ئازاد دەبێ (فَإِنْ نَكَلَ الْمُكَاتَبُ حَلَفَ السَّيِّدُ) جا ئەگەر نووسراوپێدراوەکە سوێندی نەخوارد، ئەو کاتە گەورەکەی سوێند دەخوا: ئەم ماڵە ملکی نووسراو پێدراوەکە نیە.

(وَلَوْ خَرَجَ الْمُؤَدَّى مُسْتَحَقًّا) جا ئەگەر ئەو ماڵەی نووسراوپێدراوەکە داویەتیە گەورەکەی بە ماڵی کەسێکیتر دەرچو: وەك دزراو بێ، ئەو کاتە (رَجَعَ السَّيِّدُ بِبَدَلِهِ) گەورەکە ماڵێکیتر لەجیاتی ئەم ماڵە لە نووسراوپێدراوەکەی وەر دەگرێ (فَإِنْ كَانَ فِيالنَّجْمِ الأخِيرِ) جا ئەگەر ماڵە دزراوەکە لە بەشەکەی کۆتاییدا بێ، ئەوە (بَانَ أَنَّ الْعِتْقَ لَمْ يَقَعْ) ئاشکرابو: ئازادبوونەکە نەهاتۆتە جێ (وَإِنْ كَانَ قَالَ عِنْدَ أَخْذِهِ أَنْتَ حُرٌّ) هەر چەند لە کاتی وەرگرتنی

ماڵەکەشدا گەورەکە گوتبێتی: تۆ ئازادی. بەڵام (وَإِنْ خَرَجَ مَعِيبًا) ئەگەر ماڵەکە عەیبدار دەرچو، ئەو کاتە (فَلَهُ رَدُّهُ وَأَخْذُ بَدَلِهِ) بۆ گەورەکەی دروستە ماڵەکە بگەڕێنێتەوەو ماڵێکیتری لەجیاتی لێوەر بگرێ.

وَلاَ يَتَزَوَّجُ إلاَّ بِإِذْنِ سَيِّدِهِ،وَلاَ يَتَسَرَّى بِإِذْنِهِ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَلَهُ شِرَاءُ الْجَوَارِى لِلتِّجَارَةِ فَإِنْ وَطِئَهَا فَلاَ حَدَّ وَالْوَلَدُ نَسِيبٌ، فَإِنْ وَلَدَتْهُ فِالْكِتَابَةِ أَوْ بَعْدَ عِتْقِهِ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ تَبِعَهُ رِقًّا وَعِتْقًا، وَلاَ تَصِيرُ مُسْتَوْلَدَةً فِالأَظْهَرِ، وَإِنْ وَلَدَتْهُ بَعْدَ الْعِتْقِ لِفَوْقِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ وَكَانَ يَطَؤُهَا فَهُوَ حُرٌّ وَهِيَ أُمُّ وَلَدٍ، وَلَوْ عَجَّلَ النُّجُومَ لَمْ يُجْبَرْ السَّيِّدُ عَلَىالْقَبُولِ إنْ كَانَ لَهُ فِالامْتِنَاعِ غَرَضٌ كَمُؤْنَةِ حِفْظِهِ أَوْ خَوْفٍ عَلَيْهِ، وَإِلاَّ فَيُجْبَرُ فَإِنْ أَبَى قَبَضَهُ الْقَاضِى، وَلَوْ عَجَّلَ بَعْضَهَا لِيُبْرِئَهُ مِنْ الْبَاقِى فَأَبْرَأَهُ

---

(وَلاَ يَتَزَوَّجُ إلاَّ بِإِذْنِ سَيِّدِهِ) نابێ نووسراوپێدراوەکە ژن بهێنێ تەنها بە ئیزنی گەورەکەی نەبێ، هەم (وَلاَ يَتَسَرَّى بِإِذْنِه عَلَىالْمَذْهَبِ) نابێ جیماع لەگەڵ (جارية)کانیشی بکا، هەر چەند بە ئیزنی گەورەکەش بێ (وَلَهُ شِرَاءُ الْجَوَارِى لِلتِّجَارَةِ) بۆ نووسراوپێدراوەکە دروستە: (جارية)کان بکڕێ بۆ بازرگانی (فَإِنْ وَطِئَهَا فَلاَ حَدَّ) جا ئەگەر جیماعی لەگەڵ ئەم (جارية) کردراوانە کرد، ئەوە حەرامە بەڵام سزای زینای لە سەر نیە، هەم (وَالْوَلَدُ نَسِيبٌ) منداڵی ئەم جیماعەش منداڵی نووسراوپێدراوەکەیە، کەوابو: (فَإِنْ وَلَدَتْهُ فِى الْكِتَابَةِ أَوْ بَعْدَ عِتْقِهِ لِدُونِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ) ئەگەر (جارية)کە لە ماوەی نووسراوپێدرانەکەدا–پێش ئازادبوون– منداڵەکەی لێبو، یان لە دوای ئازادبوونی کۆیلەکە بە کەمتر لە شەش مانگ منداڵەکەی لێبو، ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا (تَبِعَهُ رِقًّا وَعِتْقًا) منداڵەکە پابەندی نووسراوپێدراوەکە دەبێ: لە کۆیلەییو لە ئازادیدا، واتە: هەر کاتێك نووسراوپێدراوەکە ئازاد بوو، منداڵەکەشی ئازاد دەبێ، ئەگەر نا: هەردووکیان بە کۆیلەیی لە ملکایەتی گەورەکەدا دەمێننەوە، بەڵام (وَلاَ تَصِيرُ مُسْتَوْلَدَةً فِى الأَظْهَرِ) دایکی منداڵەکە نابێتە دایکە منداڵ، چونکە بە کۆیلە ئاوس بووە، بەڵام (وَإِنْ وَلَدَتْهُ بَعْدَ الْعِتْقِ لِفَوْقِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ وَكَانَ يَطَؤُهَا) ئەگەر (جارية) کە لە دوای ئازادبوونی نووسراوپێدراوەکە بە زیاتر لە شەش مانگ منداڵەکەی لێبو، نووسراوپێدراوەکەش جیماعی لەگەڵ دەکرد، ئەو کاتە (فَهُوَ حُرٌّ وَهِيَ أُمُّ وَلَدٍ) منداڵەکە ئازادەو (جارية)کەش دایکە منداڵە، چونکە لە دوای ئازادی ئاوس بووە.

(وَلَوْ عَجَّلَ النُّجُومَ) ئەگەر نووسراوپێدراوەکە بەشەکانی پارەهێنانەکەی وەپێش خستن، ئەوە (لَمْ يُجْبَرالسَّيِّدُ عَلَىالْقَبُولِ) گەورەکە زۆری لێناکرێ پارەکەی لێقبوڵ بکا (إنْ كَانَ لَهُ فِى الامْتِنَاعِ غَرَضٌ كَمُؤْنَةِ حِفْظِهِ أَوْ خَوْفٍ عَلَيْهِ) ئەگەر گەورەکە مەبەستێکی شەرعیی هەبێ: وەکو ئەرکی پاراستنی پارەکە، یان ترسی لەدەستچوونی پارەکە (وَإِلاَّ فَيُجْبَرُ) بەڵام ئەگەر هیچ مەبەستێکی نەبێ، ئەو کاتە زۆری لێدەکرێ (فَإِنْ أَبَى قَبَضَهُ الْقَاضِى) جا

ئەگەر قبوڵی نەکرد، ئەو کاتە قازی لەجیاتی ویماڵەکە وەردەگرێو نووسراوپێدراوەکەش ئازاد دەبی، بەڵام (وَلَوْ عَجَّلَ بَعْضَهَا لِيُبْرِئَهُ مِنَ الْبَاقِى) ئەگەر نووسراوپێدراوەکە هەندێك پارەی زوتر هێنا، تاکو گەورەکە لە بەشەکەی‌تر گەردەنی‌ئازاد بکا (فَـأَبْرَأَهُ) جا گەورەکەش

لَمْ يَصِحَّ الدَّفْعُ وَلاَ الإِبْرَاءُ، وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ النُّجُومِ وَلاَ الاعْتِيَاضُ عَنْهَا، فَلَوْ بَاعَ وَأَدَّى إِلَىالْمُشْتَرِىلَمْ يَعْتِقْ فِىالأَظْهَرِ، وَيُطَالِبُ السَّيِّدُ الْمُكَاتَبَ وَالْمُكَاتَبُ الْمُشْتَرِيَ بِمَا أَخَذَ مِنْهُ، وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ رَقَبَتِهِ فِىالْجَدِيدِ، فَلَوْ بَاعَ فَأَدَّى إِلَىالْمُشْتَرِي فَفِى عِتْقِهِ الْقَوْلاَنِ، وَهِبَتُهُ كَبَيْعِهِ، وَلَيْسَ لَهُ بَيْعُ مَا فِى يَدِ مُكَاتَبِهِ وَإِعْتَاقُ عَبْدِهِ وَ تَزْوِيجُ أَمَتِهِ، وَلَوْ قَالَ لَهُ رَجُلٌ أَعْتِقْ مُكَاتَبَكَ عَلَى كَذَا فَفَعَلَ عَتَقَ وَلَزِمَهُ مَا الْتَزَمَ. (فَصْلٌ) اَلْكِتَابَةُ لاَزِمَةٌ مِنْ جِهَةِ السَّيِّدِ لَيْسَ لَهُ فَسْخُهَا إِلاَّ أَنْ يَعْجِزَ عَنِ الأَدَاءِ،

---

گەردەنی ئازاد کرد، ئەوە (لَمْ يَصِحَّ الدَّفْعُ وَلاَ الإِبْرَاءُ) نە ماڵدانەکەو نە گەردەن ئازادکردنەکە هیچیان دروست نابن.

(وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ النُّجُومِ وَلاَ الإِعْتِيَاضُ عَنْهَا) دروست نیە گەورەکە بەشە ماڵەکانی نووسراوپێدانەکە بفرۆشێ؟ چونکە وەرێنەگرتون، هەم دروست نیە: لەجیاتی ئەو ماڵە ماڵێکی‌تر لە نووسراوپێدراوەکە وەربگرێ، کەوابو: (فَإِن بَاعَ وَأَدَّى إِلىالْمُشْتَرِى) ئەگەر گەورەکە بەشەماڵەکانی فرۆشتو نووسراوپێدراوەکەش بەشە ماڵەکانی دانە کڕیارەکە، ئەوە (لَمْ يَعْتِقْ فِىالأَظْهَرِ) ئازاد نابێ، کەوابو: (وَيُطَالِبُ السَّيِّدُ الْمُكَاتَبَ وَالْمُكَاتَبُ الْمُشْتَرِيَ بِمَا أَخَذَ مِنْهُ) گەورەکە داوای بەشەکان لە کۆیلەکە دەکاو کۆیلەکەش ئەو ماڵەی داویەتیەکڕیارەکە لێی وەردەگرێتەوە (وَلاَ يَصِحُ بَيْعُ رَقَبَتِهِ فِىالْجَدِيدِ) دروست نیە کۆیلەی نووسراو پێدراو—بێ ڕەزامەندی خۆی— بفرۆشرێ، بەڵام بە ڕەزامەندی خۆی دروستە بفرۆشرێ (فَلَوْ بَاعَ فَأَدَّى إِلىالْمُشْتَرِى) جا ئەگەر گەورەکە نووسراوپێدراوەکەی —بێ ڕەزامەندی—فرۆشت، نووسراوپێدراوەکەش پارەی نووسراودانەکەی دایە کڕیارەکە، ئەوە (فَفِى عِتْقِهِ الْقَوْلاَنِ) لەبارەی ئازادبوونەکەی دوو فەرموودەکەی‌ڕابردوو هەنە: بە بەهێزترەکەیان: ئازاد نابێ (وَهِبَتُهُ كَبَيْعِهِ) بەخشینی نووسراوپێدراوەکە وەکو فرۆشتنەکەیەتی، واتە: بێ‌ڕەزامەندی کۆیلەکە بەتاڵ دەبێ.

(وَلَيْسَ لَهُ بَيْعُ مَا فِى يَدِ مُكَاتَبِهِ) بۆ گەورەکە دروست نیە ئەو ماڵە بفرۆشێ کە لە دەست نووسراوپێدراوەکەی‌دایە، هەم (وَإِعْتَاقُ عَبْدِهِ وَ تَزْوِيجُ أَمَتِهِ) بۆی دروست نیە کۆیلەکەی وی ئازاد بکاو (جارية) کەی وی مارە بکا (وَلَوْ قَالَ لَهُ رَجُلٌ) ئەگەر پیاوێك گوتی: (أَعْتِقْ مُكَاتَبَكَ عَلَى كَذَا فَفَعَلَ) نووسراو پێدراوەکەت لە سەر ئەوەندە ماڵە ئازاد بکە. ئەویش ئازادی کرد، ئەوە (عَتَقَ وَلَزِمَهُ مَا الْتَزَمَ) نووسراو پێدراوەکە ئازاد دەبێو پارە

واجبكراوەكەش لە سەر پیاوەكە واجب دەبێ بیداتە گەورەكە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چەسپان و دروستی‌ی نووسراودانەكە ﴾

(الْكِتَابَةُ لاَزِمَةٌ مِنْ جِهَةِ السَّيِّدِ) مامڵەتی نووسراودانەكە لە لایەن گەورەكەوە چەسپاوە، واتە: (لَيْسَ لَهُ فَسْخُهَا) بۆ گەورەكە دروست نیە هەڵیبوەشێنێتەوە (إلاَّ أنْ يَعْجِزَ عَنِ الأدَاءِ) وَجَائِزَةٌ لِلْمُكَاتَبِ، فَلَهُ تَرْكُ الأَدَاءِ وَإِنْ كَانَ مَعَهُ وَفَاءٌ، فَإِذَا عَجَّزَ نَفْسَهُ فَلِلسَّيِّدِ الصَّبْرُ وَالْفَسْخُ بِنَفْسِهِ، وَإِنْ شَاءَ بِالْحَاكِمِ، وَلِلْمُكَاتَبِ اَلْفَسْخُ فِالأَصَحِّ، وَلَوْ اِسْتَمْهَلَ الْمُكَاتَبُ عِنْدَ حُلُولِ النَّجْمِ اُسْتُحِبَّ إمْهَالُهُ، فَإِنْ أَمْهَلَ ثُمَّ أَرَادَ الْفَسْخَ فَلَهُ، وَإِنْ كَانَ مَعَهُ عُرُوضٌ أَمْهَلَهُ لِيَبِيعَهَا، فَإِنْ عَرَضَ كَسَادٌ فَلَهُ أَنْ لاَ يَزِيدَ فِالْمُهْلَةِ عَلَى ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، وَإِنْ كَانَ مَالُهُ غَائِبًا أَمْهَلَهُ إلَى إحْضَارِهِ إنْ كَانَ دُونَ مَرْحَلَتَيْنِ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ حَلَّ النَّجْمُ وَهُوَ غَائِبٌ

---

تەنها ئەگەر نووسراوپێدراوەكە بێتوانا ببێ لە پارە هێنانەكە لە كاتی دیاركراودا، ئەو كاتە بۆ گەورەكەی دروستە مامڵەتەكە هەڵبوەشێنێتەوە (وَجَائِزَةٌ لِلْمُكَاتَبِ) بۆ نووسراوپێدراوەكەش مامڵەتەكە دروستو نەچەسپاوە، واتە: (فَلَهُ تَرْكُ الأدَاءِ وَإِنْ كَانَ مَعَهُ أدَاءٌ) بۆی دروستە ماڵەكە نەداتە گەورەكە، هەر چەند بەشی نووسراودانەكەش ماڵی هەبێ. كەوابو: (فَإذَا عَجَّزَ نَفْسَهُ) هەر كاتێك نووسراوپێدراوەكە خۆی بێتوانا كردو گوتی: توانای ماڵهێنانەكەم نیە. یان لە كاتی دیاركراودا گوتی: ماڵەكە نادەمو تواناشی هەبوو، ئەو كاتە (فَلِلسَّيِّدِ اَلصَّبْرُ وَالْفَسْخُ بِنَفْسِهِ) بۆ گەورەكەی دروستە: ماوەیەكیتر چاوەڕوان بكا، هەم بۆی دروستە: بەخۆی مامڵەتەكە هەڵبوەشێنێتەوە (وَإنْ شَاءَ بِالْحَاكِمِ) ئەگەر حەزیشی‌كرد بە دادوەر هەڵیدەوەشێنێتەوە، هەم (وَلِلْمُكَاتَبِ اَلْفَسْخُ فِيالأَصَحِّ) بۆ نووسراوپێدراوەكەش دروستە: مامڵەتەكە هەڵبوەشێنێتەوە، هەر چەند بەشی نووسراودانەكەش ماڵی كۆ كردبێتەوە، جا هەر كاتێك مامڵەتی نووسراوپێدرانەكە هەڵوەشێندراوە، نووسراوپێدراوەكە بە كۆیلەیی بۆ گەورەكەی دەمێنێتەوەو ماڵەكەشی گشتی بۆ گەورەكەیەتی.

(وَلَوْ اِسْتَمْهَلَ الْمُكَاتَبُ عِنْدَ حُلُولِ النَّجْمِ) ئەگەر نووسراوپێدراوەكە لە كن هاتنی كاتی بەشە ماڵدانەكەدا داوای مۆڵەتی كرد، ئەوە (اُسْتُحِبَّ إمْهَالُهُ) سوننەتە گەورەكەی مۆڵەتی بداتێ، بەلاّم (فَإِنْ أَمْهَلَ ثُمَّ أرَادَ الْفَسْخَ) ئەگەر مۆڵەتی دایێ، ئینجا گەورەكەی ویستی مامڵەتەكە هەڵبوەشێنێتەوە، ئەوە (فَلَهُ) بۆی دروستە، بەلاّم (وَإِنْ كَانَ مَعَهُ عُرُوضٌ) ئەگەر نووسراوپێدراوەكە كەلوپەلی هەبوو، ئەو كاتە (أمْهَلَهُ لِيَبِيعَهَا) واجبە گەورەكە مۆڵەتی بداتێ تاكو كەلوپەلەكەی بفرۆشێ (فَإِنْ عَرَضَ كَسَادٌ) جا ئەگەر كەلوپەلەكەی بە سەردا ماوەو نەفرۆشرا، ئەو كاتە (فَلَهُ أَنْ لاَ يَزِيدَ فِيالْمُهْلَةِ عَلَى ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ) بۆی دروستە لە سێ ڕۆژان زیاتر مۆڵەتی نەداتێ (وَإِنْ كَانَ مَالُهُ غَائِبًا) ئەگەر ماڵی نووسراوپێدراوەكە لە

شوێنێکیتر بوو، ئەو کاتە (أَمْهَلَهُ إِلَى إِحْضَارِهِ) واجبە گەورەکە مۆڵەتی بداتێ تا ئامادەی دەکا (إِنْ كَانَ دُونَ مَرْحَلَتَيْنِ) ئەگەر شوێنەکە لە دوو قۆناغ نزیکتر بێ (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر شوێنەکە دوو قۆناغ، یان زیاتر بوو، ئەو کاتە (فَلَا) واجب نیە مۆڵەتی بداتێ (وَلَوْ حَلَّ النَّجْمُ وَهُوَ غَائِبٌ) ئەگەر کاتی ماڵهێنانێك هات و نووسراوپێدراوەکەش لە شوێنێکی نادیار بوو، ئەو

فَلِلسَّيِّدِ الْفَسْخُ، فَلَوْ كَانَ لَهُ مَالٌ حَاضِرٌ فَلَيْسَ لِلْقَاضِي اَلأَدَاءُ مِنْهُ، وَلاَ تَنْفَسِخُ بِجُنُونِ الْمُكَاتَبِ، وَيُؤَدِّيالْقَاضِي إِنْ وَجَدَ لَهُ مَالاً، وَلاَ بِجُنُونِ السَّيِّدِ وَيَدْفَعُ إِلَى وَلِيِّهِ، وَلاَ يَعْتِقُ بِالدَّفْعِ إِلَيْهِ، وَلَوْ قَتَلَ سَيِّدَهُ فَلِوَارِثِهِ قِصَاصٌ، فَإِنْ عَفَا عَلَى دِيَةٍ أَوْ قَتَلَ خَطَأً أَخَذَهَا مِمَّا مَعَهُ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فَلَهُ تَعْجِيزُهُ فِالأَصَحِّ، أَوْ قَطَعَ طَرَفَهُ فَاقْتِصَاصُهُ وَالدِّيَةُ كَمَا سَبَقَ، وَلَوْ قَتَلَ أَجْنَبِيًّا أَوْ قَطَعَهُ فَعُفِيَ عَلَى مَالٍ أَوْ كَانَ خَطَأً أَخَذَ مِمَّا مَعَهُ وَمِمَّا سَيَكْسِبُهُ

---

کاتە (فَلِلسَّيِّدِ الْفَسْخُ) بۆ گەورەکەی دروستە هەڵیبوەشێنێتەوە، کەوابو: (فَلَوْ كَانَ لَهُ مَالٌ حَاضِرٌ) ئەگەر نووسراوپێدراوەکە ماڵی حازری هەبوو (فَلَيْسَ لِلْقَاضِيالأَدَاءُ مِنْهُ) بۆ قازی دروست نیە پارەی نووسراودانەکە لەو ماڵە بدا.

(وَلاَ تَنْفَسِخُ بِجُنُونِ الْمُكَاتَبِ) مامڵەتەکە بە شێتبوونی نووسراوپێدراوەکە هەڵناوەشێتەوە، کەوابو: (وَيُؤَدِّيالْقَاضِي إِنْ وَجَدَ لَهُ مَالاً) لەو حاڵەتەدا–ئەگەر نووسراوپێدراوەکە ماڵی هەبێ– قازی پارەی نووسراودانەکەی بۆ دەدا تاکو ئازاد ببێ، ئەگەر بەرژەوەندیی تێدا بێ (وَلاَ بِجُنُونِ السَّيِّدِ) هەروەها بە شێتبوونی گەورەکەشی مامڵەتەکە هەڵناوەشێتەوە، کەوابو: (وَيَدْفَعُ إِلَى وَلِيِّهِ) نووسراوپێدراوەکە ماڵەکە دەداتە سەرپەرشتکاری گەورەکەی، چونکە (وَلاَ يَعْتِقُ بِالدَّفْعِ إِلَيْهِ) ئەگەر ماڵەکە بداتە شێتبووەکە، ئازاد نابێ، هەروەها بە مردنی گەورەکەشی هەڵناوەشێتەوە، کەوابو: نووسراوپێدراوەکە ماڵەکە دەداتە میراتگرەکانی گەورەکەیو ئازاد دەبێ.

(وَلَوْ قَتَلَ سَيِّدَهُ) ئەگەر نووسراوپێدراوەکە بە قەسدی گەورەکەی خۆی کوشت، ئەوە (فَلِوَارِثِهِ قِصَاصٌ) بۆ میراتگری گەورەکەی دروستە لەتۆڵە بیکوژێ (فَإِنْ عَفَا عَلَى دِيَةٍ أَوْ قَتَلَ خَطَأً) جا ئەگەر لە سەر خوێن وەرگرتن عەفوی کرد، یان کوشتنەکە بە هەڵە بوو، ئەو کاتە (أَخَذَهَا مِمَّا مَعَهُ) میراتگرەکە خوێنەکە لەو ماڵە وەردەگرێ کە لە دەست نووسراوپێدراوەکەدایە (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ) جا ئەگەر نووسراوپێدراوەکە هیچ ماڵی نەبو، یان بەشی خوێنەکەی نەدەکرد، ئەو کاتە (فَلَهُ تَعْجِيزُهُ فِيالأَصَحِّ) بۆ میراتگرەکە دروستە بێتوانای بکاو مامڵەتەکە هەڵبوەشێنێتەوە، تاکو هەر بە کۆیلەیی بۆ خۆی بمێنێتەوە (أَوْ قَطَعَ طَرَفَهُ) یان ئەگەر نووسراوپێدراوەکە ئەندامێکی گەورەکەی لێکردەوە، ئەوەش (فَاقْتِصَاصُهُ وَالدِّيَةُ

كَمَا سَبَقَ) تۆڵە لێكردنەوەو خوێن لێوەرگرتن هەروەك شێوەی ڕابردووە.

(وَلَوْ قَتَلَ أَجْنَبِيًّا أَوْ قَطَعَهُ) ئەگەر نووسراوپێدراوەكە بە قەسدی بێگانەیەكی كوشت، یان ئەندامێكی لێكردەوە (فَعُفِيَ عَلَى مَالٍ) جا لە سەر وەرگرتنی خوێن عەفو كرا (أَوْ كَانَ خَطَأً) یان تاوانەكە بە هەڵە بوو، ئەو كاتە (أَخَذَ مِمَّا مَعَهُ وَمِمَّا سَيَكْسِبُهُ) خاوەن مافەكە مافی خۆی وەردەگرێ لەو ماڵەی لە دەستی كۆیلەكەدایەو لەو كەسابەتەی لە مەودا



الأَقَلَّ مِنْ قِيمَتِهِ وَالأَرْشِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ شَيْءٌ وَ
وَبِيعَ بِقَدْرِ الأَرْشِ، فَإِنْ بَقِيَ مِنْهُ شَيْءٌ بَقِيَتْ فِيهِ الْ
وَلَوْ أَعْتَقَهُ بَعْدَ الْجِنَايَةِ أَوْ أَبْرَأَهُ عَتَقَ وَلزِمَهُ الْفِدَاءُ، وَلَوْ قُتِلَ الْمُكَاتَبُ بَطَلَتْ وَمَاتَ رَقِيقًا، وَلِسَيِّدِهِ قِصَاصٌ عَلَى قَاتِلِهِ الْمُكَافِئِ، وَإِلاَّ فَالْقِيمَةُ، وَيَسْتَقِلُّ بِكُلِّ تَصَرُّفٍ لاَ تَبَرُّعَ فِيهِ وَلاَ خَطَرَ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَيَصِحُّ بِإِذْنِ سَيِّدِهِ فِالأَظْهَرِ، وَلَوْ اشْتَرَى مَنْ يَعْتِقُ عَلَى سَيِّدِهِ صَحَّ،

---

دەيكا (الأَقَلَّ مِنْ قِيمَتِهِ وَالأَرْشِ) كامەیان كەمترە لە نرخی خۆیو لە تۆڵەی تاوانەكە ئەویان وەردەگرێ (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ شَيْءٌ) جا ئەگەر نووسراوپێدراوەكە هیچ ماڵی نەبو (وَسَأَلَ الْمُسْتَحِقُّ تَعْجِيزَهُ) خاوەن مافەكەش داوای كرد بێتوانا بكرێ، ئەو كاتە (عَجَّزَهُ الْقَاضِي وَبِيعَ بِقَدْرِ الأَرْشِ) قازی نووسراوپێدراوەكە بێتوانا دەكاو بە ئەندازەی خوێنی تاوانەكەی لێدەفرۆشرێ (فَإِنْ بَقِيَ مِنْهُ شَيْءٌ) جا ئەگەر هیچ بەشێك لە نووسراوپێدراوەكە ماوەو نەفرۆشرا، ئەوە (بَقِيَتْ فِيهِ الْكِتَابَةُ) نووسراودانەكە لەو بەشەدا دەمێنێتەوەو هەركاتێك لە بەرامبەر ئەو بەشە ماڵی هێنا، بەشەكەی ئازاد دەبێ، بەڵام ئازادبوونەكە پێدانارِواتە لای بەشە فرۆشراوەكە.

(وَلِلسَّيِّدِ فِدَاؤُهُ وَإِبْقَاؤُهُ مُكَاتَبًا) بۆ گەورەكەی دروستە بەخۆی پارەی تاوانی نووسراوپێدراوەكەی بداو هەر بە نووسراوپێدراوی بیهێڵێتەوە (وَلَوْ أَعْتَقَهُ بَعْدَ الْجِنَايَةِ) ئەگەر گەورەكە لە دوای تاوانەكە كۆیلەكەی ئازاد كرد (أَوْ أَبْرَأَهُ) یان لە ماڵهێنانەكە گەردەنی ئازاد كرد، ئەوە (عَتَقَ وَلَزِمَهُ الْفِدَاءُ) نووسراوپێدراوەكە ئازاد دەبێو پارەی تاوانەكەش لە سەر گەورەكەی واجب دەبێ، چونكە بەو ئازادكردنە كۆیلایەتیی فەتاندوە (وَلَوْ قُتِلَ الْمُكَاتَبُ) ئەگەر نووسراوپێدراوەكە كوژرا، ئەوە (بَطَلَتْ وَمَاتَ رَقِيقًا) نووسراوپێدرانەكەی بەتاڵ بۆتەوەو بە كۆیلەیی مردوەو (وَلِسَيِّدِهِ قِصَاصٌ عَلَى قَاتِلِهِ الْمُكَافِئِ) گەورەكەشی مافی تۆڵەكردنەوەی هەیە لەو بكوژەی هاوچەشنی كوژراوەكەیە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بكوژەكە هاوچەشن نەبێ، ئەو كاتە (فَالْقِيمَةُ) نرخی كوژراوەكە لە بكوژەكە وەردەگرێ.

(وَيَسْتَقِلُّ بِكُلِّ تَصَرُّفٍ لاَ تَبَرُّعَ فِيهِ وَلاَ خَطَرَ) نووسراوپێدراوەكە سەربەخۆ دەبێ بۆ گشت

دەستکاریەکی کە بەخشینو ترسی تێدا نەبێ (وَإِلاَّ فَلاَ) بەلاَم ئەگەر دەستکاریەکە بەخشینو ترسی تێدابێ، ئەو کاتەسەر بەخۆی نابێ، بەلاَم (وَيَصِحُّ بِإِذْنِ سَيِّدِهِ فِيالأَظْهَرِ) ئەو دەستکاریە قەدەغەکراوەش بە ئیزنی گەورەکەی دروست دەبێ (وَلَوْ اشْتَرَى مَنْ يَعْتِقُ عَلَى سَيِّدِهِ) ئەگەر نووسراوپێدراوەکە کۆیلەیەکی وەهای کڕی کە لە سەر حیسابی گەورەکەی ئازاد دەبو: وەك باوكو منداڵی گەورەکەی بکڕێ، ئەوە (صَحَّ) کڕینەکە دروست دەبێ، ئینجا

فَإِنْ عَجَزَ وَصَارَ لِسَيِّدِهِ عَتَقَ، أَوْ عَلَيْهِ لَمْ يَصِحَّ بِلاَ إِذْنٍ، وَبِإِذْنٍ فِيهِ الْقَوْلاَنِ، فَإِنْ صَحَّ فَمُكَاتَبٌ عَلَيْهِ، وَلاَ يَصِحُّ إِعْتَاقُهُ وَ كِتَابَتُهُ بِإِذْنٍ عَلَىالْمَذْهَبِ. (فَصْلٌ) الْكِتَابَةُ الْفَاسِدَةُ لِشَرْطٍ أَوْ عِوَضٍ، أَوْ أَجَلٍ فَاسِدٍ كَالصَّحِيحَةِ فِاسْتِقْلاَلِهِ بِالْكَسْبِ وَفِي أَخْذِ أَرْشِ الْجِنَايَةِ عَلَيْهِ وَمَهْرِ شُبْهَةٍ، وَفِي أَنَّهُ يَعْتِقُ بِالأَدَاءِ وَيَتْبَعُهُ كَسْبُهُ، وَكَالتَّعْلِيقِ فِي أَنَّهُ لاَ يَعْتِقُ بِإِبْرَاءٍ، وَتَبْطُلُ بِمَوْتِ سَيِّدِهِ، وَتَصِحُّ الْوَصِيَّةُ بِرَقَبَتِهِ، وَلاَ يُصْرَفُ إِلَيْهِ مِنْ سَهْمِ الْمُكَاتَبِينَ، وَتُخَالِفُهُمَا فِي أَنَّ لِلسَّيِّدِ فَسْخَهَا، وَأَنَّهُ

---

(فَإِنْ عَجَزَ وَصَارَ لِسَيِّدِهِ) ئەگەر نووسراوپێدراوەکە بێتوانا بو و کۆیلەکراوەکەش بۆوە ملکی گەورەکەی، ئەو کاتە (عَتَقَ) کۆیلە کڕاوەکە بە باوو کوڕایەتی لە سەر حیسابی گەورەکە ئازاد دەبێ (أَوْ عَلَيْهِ) بەلاَم ئەگەر نووسراوپێدراوەکە کۆیلەیەکی وەهای کڕی کە لە سەر حیسابی خۆی ئازاد دەبو، ئەو کاتە (لَمْ يَصِحَّ بِلاَ إِذْنٍ) بە بێئیزنیگەورەکەی کڕینەکەی دروست نابێ، بەلاَم (وَبِإِذْنٍ فِيهِ الْقَوْلاَنِ) بە ئیزنی گەورەکەی دوو فەرموودەکەی ڕابردووی تێدایە: (فَإِنْ صَحَّ) جا ئەگەر بە فەرمودەی بەهێزتر بڵێین: کڕینەکەی دروست دەبێ، ئەو کاتە (فَمُكَاتَبٌ عَلَيْهِ) کۆیلە کڕاوەکە لە سەر حیسابی نووسراوپێدراوەکە دەبێتە نووسراوپێدراو، واتە: بە ئازادبوونی وی ئازاد دەبێ، کەوابو: دروست نیە بیفرۆشێ، هەم (وَلاَ يَصِحُّ إِعْتَاقُهُ وَ كِتَابَتُهُ بِإِذْنٍ عَلَىالْمَذْهَبِ) دروست نیە بە ئیزنی گەورکەش ئازادی بکا، یان نووسراوی بداتێ، چونکە تا ئێستا بەخۆی ئازاد نیەو هەر کۆیلەیە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی جیاوازی نووسراوەدانی بەتاڵو دروست ﴾

(اَلْكِتَابَةُ الْفَاسِدَةُ لِشَرْطٍ أَوْ عِوَضٍ أَوْ أَجَلٍ فَاسِدٍ) مامڵەتی نووسراودان کە دانەمەزراو بێ: بە هۆی مەرجێکی، یان ماڵێکی، یان ماوە دانانێکی دانەمەزراو (كَالصَّحِيحَةِ فِياسْتِقْلاَلِهِ بِالْكَسْبِ) وەکو مامڵەتی دروستبووە لە سەربەخۆیی نووسراوپێدراوەکە: لە کەسابەتدا، هەم (وَفِي أَخْذِ أَرْشِ الْجِنَايَةِ عَلَيْهِ وَمَهْرِ شُبْهَةٍ) لە وەرگرتنی تۆڵەی تاوانکردنە سەریو لە وەرگرتنی مارەیی جیماعی بە هەڵەو هەم (وَفِي أَنَّهُ يَعْتِقُ بِالأَدَاءِ وَيَتْبَعُهُ كَسْبُهُ) لە وەش کە بە ماڵدانەکە ئازاد دەبێو لە دوای ئازادبوونیشی کەسابەتەکەی پابەندی خۆی دەبێ.

بەلام (وَكَالتَّعْلِيقِ) نووسراوپێدانیدانەمەزراو وەكو هەڵواسینە (فِي أَنَّهُ لاَيَعْتِقُ بِإِبْرَاءٍ وَتَبْطُلُ بِمَوْتِ سَيِّدِهِ) لە وەدا: كە بە گەردەن ئازادكردن ئازاد نابیٚ و بە مردنی گەورەكەشی مامڵەتەكە بەتاڵ دەبێتەوە، هەم (وَتَصِحُّ الْوَصِيَّةُ بِرَقَبَتِهِ) دروستە نووسراوپێدراوی دانەمەزراو بكرێتە وەسیێت، هەم (وَلاَ يُصْرَفُ إِلَيْهِ مِنْ سَهْمِ الْمُكَاتَبِينَ) لە بەشی نووسراوپێدراوەكان زەكاتی نادرێتیٚ.

(وَتُخَالِفُهُمَا) نووسراوپێدراوی دانەمەزراو لەگەڵ مامڵەتی دروستو هەڵواسراو جیاوازە: (فِي أَنَّ لِلسَّيِّدِ فَسْخَهَا) لە وەدا: بۆ گەورەكەی دروستە هەڵیبوەشێنێتەوە، هەم (وَأَنَّهُ لاَ يَمْلِكُ مَا يَأْخُذُهُ، بَلْ يَرْجِعُ الْمُكَاتَبُ بِهِ إِنْ كَانَ مُتَقَوِّمًا، وَهُوَ عَلَيْهِ بِقِيمَتِهِ يَوْمَ الْعِتْقِ، فَإِنْ تَجَانَسَا فَأَقْوَالُ التَّقَاصِّ، وَيَرْجِعُ صَاحِبُ الْفَضْلِ بِهِ، قُلْتُ: أَصَحُّ أَقْوَالِ التَّقَاصِّ سُقُوطُ أَحَدِ الدَّيْنَيْنِ بِالآخَرِ بِلاَ رِضًا، وَالثَّانِي بِرِضَاهُمَا، وَالثَّالِثُ بِرِضَا أَحَدِهِمَا، وَالرَّابِعُ لاَ يَسْقُطُ، وَاللهُ أَعْلَمُ. فَإِنْ فَسَخَهَا السَّيِّدُ فَلْيُشْهِدْ، فَلَوْ أَدَّىالْمَالَ فَقَالَ السَّيِّدُ: كُنْتُ فَسَخْت فَأَنْكَرَهُ صُدِّقَ الْعَبْدُ بِيَمِينِهِ، وَالأَصَحُّ بُطْلاَنُ الْفَاسِدَةِ بِجُنُونِ السَّيِّدِ وَإِغْمَائِهِ وَالْحَجْرِ عَلَيْهِ، لاَ بِجُنُونِ الْعَبْدِ، وَلَوْ ادَّعَى كِتَابَةً فَأَنْكَرَهُ سَيِّدُهُ أَوْ وَارِثُهُ صُدِّقَا،

---

لاَ يَمْلِكُ مَا يَأْخُذُهُ) ئەو شتەی گەورەكەش لە نووسراوپێدراوەكە وەریدەگریٚ نابێتە ملكی وی (بَلْ يَرْجِعُ الْمُكَاتَبُ بِهِ إِنْ كَانَ مُتَقَوِّمًا) بەڵكو نووسراوپێدراوەكە—لە دوای ئازادبوون—شتەكە لە گەورەكەی وەردەگرێتەوە ئەگەر نرخی هەبیٚ و (وَهُوَ عَلَيْهِ بِقِيمَتِهِ يَوْمَ الْعِتْقِ) گەورەكەش نرخی نووسراوپێدراوەكە لە نووسراوپێدراوەكە وەردەگریٚ لە ڕۆژی ئازادبوونیدا.

(فَإِنْ تَجَانَسَا) جا ئەگەر شتەكەی هەردووكیان هاوڕەگەزی یەكتری بون، ئەوە (فَأَقْوَالُ التَّقَاصِّ) فەرمودەكانی داهاتووی تۆڵە لێككردنەوەی تیٚدانەو (وَيَرْجِعُ صَاحِبُ الْفَضْلِ بِهِ) ئەوەی مافەكەشی زیاترە زیاترەكە لە وەكەیتر وەردەگرێتەوە.

(قُلْتُ: أَصَحُّ أَقْوَالِ التَّقَاصِّ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی: ڕاستترینی فەرموودەكانی تۆڵە لێككردنەوە ئەمەیە: (سُقُوطُ أَحَدِالدَّيْنَيْنِ بِالآخَرِ بِلاَ رِضًا) قەرزی هەر لایەك بە قەرزی لایەكەیتر لادەكەویٚ بە بیٚڕازیبوون (وَالثَّانِي بِرِضَاهُمَا) بە فەرموودەی دووەمیش: بە ڕازیبوونی هەردووكیان لادەكەویٚ (وَالثَّالِثُ بِرِضَا أَحَدِهِمَا) بە فەرمودەی سێیەمیش بە ڕازیبوونی یەكێكیان لادەكەویٚ (وَالرَّابِعُ لاَ يَسْقُطُ) بە فەرموودەی چوارەمیش: بە ڕازی بوونیش لاناكەویٚ (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(فَإِنْ فَسَخَهَا السَّيِّدُ فَلْيُشْهِدْ) جا ئەگەر گەورەكە مامڵەتە دانەمەزراوەكەی هەڵوەشاندەوە، با شاهید بگریٚ، كەوابو: (فَلَوْ أَدَّىالْمَالَ فَقَالَ السَّيِّدُ: كُنْتُ فَسَخْت) ئەگەر نووسراوپێدراوەكە ماڵەكەی دایێ، ئینجا گەورەكەی گوتی: من مامڵەتەكەم هەڵوەشاندبۆوە (فَأَنْكَرَهُ)

نووسراوپێدراوەکەش گوتی: ڕاست نیە. ئەوە (صُدِّقَ الْعَبْدُ بِيَمِينه) بە سوێندخواردن باوەڕ بە کۆیلەکە دەکرێ (وَالأَصَحُّ بُطْلاَنُ الْفَاسِدَةِ بِجُنُونِ السَّيِّدِ وَإِغْمَائِهِ وَالْحَجْرِ عَلَيْهِ) نووسراوپێدانی دانەمەزراو بەتاڵ دەبێتەوە: بە شێتبوونی گەورەکەو بە بێهۆشبوونیو بە قەدەغە لەسەردانانی (لاَ بِجُنُونِ الْعَبْدِ) بەڵام بە شێتبوونی کۆیلەکە بەتاڵ نابێتەوەو هەر کاتێك چاك بۆوە دەتوانێ ماڵەکە بداو ئازاد ببێ.

(وَلَوْ ادَّعَى كِتَابَةً) ئەگەر کۆیلەیەك گوتی: نووسراوم دراوەتێ (فَأَنْكَرَهُ سَيِّدُهُ أَوْ وَارِثُهُ) جا گەورەکەی، یان میراتگری گەورەکەی گوتی: ڕاست نیە. ئەوە (صُدِّقَا) بە سوێندخواردن

وَيَحْلِفُ الْوَارِثُ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ، وَلَوْ اخْتَلَفَا فِي قَدْرِ النُّجُومِ أَوْ صِفَتِهَا تَحَالَفَا، ثُمَّ إِنْ لَمْ يَكُنْ قَبَضَ مَا يَدَّعِيهِ لَمْ تَنْفَسِخْ الْكِتَابَةُ فِالأَصَحِّ، بَلْ إِنْ لَمْ يَتَّفِقَا فَسَخَ الْقَاضِي، وَإِنْ كَانَ قَبَضَهُ وَقَالَ الْمُكَاتَبُ: بَعْضُ الْمَقْبُوضِ وَدِيعَةٌ عَتَقَ وَرَجَعَ هُوَ بِمَا أَدَّى، وَالسَّيِّدُ بِقِيمَتِهِ، وَقَدْ يَتَقَاصَّانِ، وَلَوْ قَالَ: كَاتَبْتُكَ وَأَنَا مَجْنُونٌ أَوْ مَحْجُورٌ عَلَيَّ فَأَنْكَرَ الْعَبْدُ صُدِّقَ السَّيِّدُ إِنْ عُرِفَ سَبْقُ مَا ادَّعَاهُ، وَإِلاَّ فَالْعَبْدُ، وَلَوْ قَالَ السَّيِّدُ: وَضَعْتُ عَنْكَ النَّجْمَ الأَوَّلَ أَوْ قَالَ الْبَعْضَ، فَقَالَ بَلْ الآخِرَ أَوِ الْكُلَّ صُدِّقَ السَّيِّدُ، وَلَوْ مَاتَ عَنْ اِبْنَيْنِ وَعَبْدٍ فَقَالَ: كَاتَبَنِي أَبُوكُمَا،

---

باوەڕ بە گەورەکەو بە میراتگرەکەی دەکرێو (وَيَحْلِفُ الْوَارِثُ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ) میراتگرەکەش لە سەر نەزانین سوێند دەخوا، گەورەکەش بە براوەیی سوێند دەخوا.

(وَلَوْ اخْتَلَفَا فِي قَدْرِ النُّجُومِ أَوْ صِفَتِهَا) ئەگەر گەورەکەو کۆیلەکە بووە کێشەیان: لە ئەندازەی بەشە ماڵهێنانەکاندا، یان لە چۆنیەتەکەیاندا، ئەوە (تَحَالَفَا) هەردووکیان سوێند بۆ یەکتری دەخۆن (ثُمَّ إِنْ لَمْ يَكُنْ قَبَضَ مَا يَدَّعِيهِ) ئینجا لە دوای سوێندخواردن ئەگەر گەورەکە ئەو ماڵەی داوای دەکا وەرینەگرتبو، ئەوە (لَمْ تَنْفَسِخِ الْكِتَابَةُ فِي الأَصَحِّ) مامڵەتەکە هەڵناوەشێتەوە (بَلْ إِنْ لَمْ يَتَّفِقَا فَسَخَ الْقَاضِي) بەڵکو ئەگەر ڕێك نەکەوتن قازی هەڵیدەوەشێنێتەوە، بەڵام (وَإِنْ كَانَ قَبَضَهُ) ئەگەر گەورەکە ماڵەکەی وەرگرتبو (وَقَالَ الْمُكَاتَبُ: بَعْضُ الْمَقْبُوضِ وَدِيعَةٌ) نووسراوپێدراوەکەش گوتی: هەندێك لەو ماڵەی وەرتگرتوە ئەمانەت بوو لە لای من. ئەوە (عَتَقَ) ئازاد دەبێو (وَرَجَعَ هُوَ بِمَا أَدَّى) ئازادبووەکەش ماڵەکە لە گەورەکەی وەردەگرێتەوەو (وَالسَّيِّدُ بِقِيمَتِهِ) گەورەکەش نرخی خودی کۆیلەکە لە کۆیلەکە وەردەگرێ (وَقَدْ يَتَقَاصَّانِ) هەندێ جاریش–وەك مەسەلەکەی ڕابردوو– دەبێتە تۆڵە لێککردنەوە.

(وَلَوْ قَالَ: كَاتَبْتُكَ وَأَنَا مَجْنُونٌ أَوْ مَحْجُورٌ عَلَيَّ) ئەگەر گەورەکە گوتی: لەو حاڵەتەی نووسراوم دایێ من شێت بوم، یان قەدەغەم لە سەر دانرابو. (فَأَنْكَرَ الْعَبْدُ) کۆیلەکەش گوتی ڕاست نیە. ئەوە (صُدِّقَ السَّيِّدُ إِنْ عُرِفَ سَبْقُ مَا ادَّعَاهُ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە گەورەکەی دەکرێ ئەگەر پێشتر شێتیو قەدەغەی هەبوبێ (وَإِلاَّ فَالْعَبْدُ) بەڵام ئەگەر

نەیبوبێ: ئەوە بە سوێندخواردن باوەڕ بە کۆیلەکە دەکرێ.
(وَلَوْ قَالَ السَّيِّدُ: وَضَعْتُ عَنْكَ النَّجْمَ الأَوَّلَ) ئەگەر گەورەکەی گوتی: بەشی یەکەمی ماڵهێنانەکەم بۆ لادابوی (أَوْ قَالَ الْبَعْضَ) یان گوتی هەندێکم بۆ لادابوی (فَقَالَ بَلْ الآخِرَ أَوِ الْكُلَّ) کۆیلەکەش گوتی: بەڵکو بەشی کۆتاییت لادابو. یان گوتی هەمووت لادابو. ئەوە (صُدِّقَ السَّيِّدُ) بە سوێندخواردن باوەڕ بە گەورەکەی دەکرێ.
(وَلَوْ مَاتَ عَنْ ابْنَيْنِ وَعَبْدٍ) ئەگەر گەورەکە مرد دوو کوڕو کۆیلەیەکی لە پاش بەجێمان (فَقَالَ كَاتَبَنِي أَبُوكُمَا) جا کۆیلەکە گوتی: باوکتان نووسراوی دابومێ. ئەوە فَإِنْ أَنْكَرَا صُدِّقَا، وَإِنْ صَدَّقَاهُ فَمُكَاتَبٌ، فَإِنْ أَعْتَقَ أَحَدُهُمَا نَصِيبَهُ فَالأَصَحُّ لاَ يَعْتِقُ، بَلْ يُوقَفُ، فَإِنْ أَدَّى نَصِيبَ الآخَرِ عَتَقَ كُلُّهُ وَوَلاَؤُهُ لِلأَبِ، وَإِنْ عَجَزَ قُوِّمَ عَلَى الْمُعْتِقِ إِنْ كَانَ مُوسِرًا، وَإِلاَّ فَنَصِيبُهُ حُرٌّ، وَالْبَاقِي مِنْهُ قِنٌّ لِلآخَرِ، قُلْتُ: بَلِ الأَظْهَرُ الْعِتْقُ، وَاللهُ أَعْلَمُ. وَإِنْ صَدَّقَهُ أَحَدُهُمَا فَنَصِيبُهُ مُكَاتَبٌ، وَنَصِيبُ الْمُكَذِّبِ قِنٌّ، فَإِنْ أَعْتَقَهُ الْمُصَدِّقُ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ يُقَوَّمُ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مُوسِرًا.

## (كِتَابُ أُمَّهَاتِ الأَوْلاَدِ)

إِذَا أَحْبَلَ أَمَتَهُ فَوَلَدَتْ حَيًّا أَوْ مَيِّتًا أَوْ مَا تَجِبُ فِيهِ غُرَّةٌ عَتَقَتْ بِمَوْتِ السَّيِّدِ،

---

(فَإِنْ أَنْكَرَا صُدِّقَا) ئەگەر کوڕەکان دانیان نەهێنا، ئەوە بە سوێندخواردن باوەڕیان پێدەکرێو (وَإِنْ صَدَّقَاهُ فَمُكَاتَبٌ) ئەگەر هەردووکیش باوەڕیان پێ کرد، ئەوە کۆیلەکە نووسراوپێدراوە، ئینجا لەو مەسەلەیەدا (فَإِنْ أَعْتَقَ أَحَدُهُمَا نَصِيبَهُ) ئەگەر لە دوای ئاشکرابوونی نووسراودانەکە کوڕێك بەشەکەی خۆی ئازاد کرد، ئەوە (فَالأَصَحُّ لاَ يَعْتِقُ بَلْ يُوقَفُ) بەشەکەی ئازاد نابێ، بەڵکو ڕادەگیرێ: (فَإِنْ أَدَّى نَصِيبَ الآخَرِ) ئەگەر کۆیلەکە بەشە ماڵی کوڕەکەیتری دا، ئەو کاتە (عَتَقَ كُلُّهُ وَوَلاَؤُهُ لِلأَبِ) هەمووی ئازاد دەبێو خزمایەتی ئازادبوونیشی بۆ باوکەکەیە، بەلام (وَإِنْ عَجَزَ) ئەگەر کۆیلەکە بێتوانابو، ئەو کاتە (قُوِّمَ عَلَى الْمُعْتِقِ إِنْ كَانَ مُوسِرًا) لە سەر کوڕە ئازادکەرەکە دەقرسێندرێ ئەگەر هەبوویی بێ، واتە: بە پێداڕۆیشتن هەمووی ئازاد دەبێ (وَإِلاَّ فَنَصِيبُهُ حُرٌّ وَالْبَاقِي مِنْهُ قِنٌّ لِلآخَرِ) بەلام ئەگەر نەبوویی بێ، ئەوە بەشەکەی وی ئازاد دەبێو بەشەکەیتریش کۆیلەیە بۆ کوڕەکەیتر.
(قُلْتُ بَلِ الأَظْهَرُ الْعِتْقُ وَاللهُ أَعْلَمُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی: بەڵکو بە فەرموودەی بەهێزتر: بەشی ئازادکەرەکە دەمودەست ئازاد دەبێو ئەو ڕاگرتنەیڕابردووی ناوێ (وَ) هەر لەو مەسەلەیەدا (إِنْ صَدَّقَهُ أَحَدُهُمَا) ئەگەر تەنها کوڕێك باوەڕی پێکرد، ئەوە (فَنَصِيبُهُ مُكَاتَبٌ وَنَصِيبُ الْمُكَذِّبِ قِنٌّ) بەشی باوەڕکەرەکە دەبێتە نووسراوپێدراو و بەشی بەدرۆخەرەکەش بە کۆیلەیی دەمێنێ (فَإِنْ أَعْتَقَهُ الْمُصَدِّقُ) جا ئەگەر باوەڕکەرەکە

کۆیلەکەی ئازاد کرد، ئەوە (فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ يُقَوَّمُ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مُوسِرًا) بەشی کورەکەیتریشی لە سەر دەقرسێندرێ ئەگەر هەبوویی بێ، واتە: بە پێداڕۆیشتن هەموی ئازاد دەبێ.

﴿ كِتَابُ أُمَّهَاتِ الأَوْلاَدِ: **پەڕتوکی دایکەکانیمنداڵەکان** ﴾

(إِذَا أَحْبَلَ أَمَتَهُ) هەر کاتێك پیاوێك جیماعی لەگەڵ (جارية) کەی خۆی کردو ئاوسی کرد (فَوَلَدَتْ حَيًّا أَوْ مَيِّتًا أَوْ مَا تَجِبُ فِيهِ غُرَّةٌ) ئینجا (جارية)کەش لەو جیماعە منداڵێکی زیندوو، یان مردووی بوو، یان پارچە گۆشتێکی وێنەکراوی لێبو، ئەوە (عَتَقَتْ بِمَوْتِ السَّيِّدِ) هەر بە مردنی گەورەکەی (جارية)کە ئازاد دەبێ، چونکە بوەتە (أُمُّ الْوَلَدِ)، واتە: أَوْ أَمَةَ غَيْرِهِ بِنِكَاحٍ فَالْوَلَدُ رَقِيقٌ، وَلاَ تَصِيرُ أُمَّ وَلَدٍ إِذَا مَلَكَهَا، أَوْ بِشُبْهَةٍ فَالْوَلَدُ حُرٌّ، وَلاَ تَصِيرُ أُمَّ وَلَدٍ إِذَا مَلَكَهَا فِي الأَظْهَرِ، وَلَهُ وَطْءُ أُمِّ الْوَلَدِ، وَاسْتِخْدَامُهَا وَإِجَارَتُهَا وَأَرْشُ جِنَايَةٍ عَلَيْهَا، وَكَذَا تَزْوِيجُهَا بِغَيْرِ إِذْنِهَا فِي الأَصَحِّ، وَيَحْرُمُ بَيْعُهَا وَرَهْنُهَا وَهِبَتُهَا، وَلَوْ وَلَدَتْ مِنْ زَوْجٍ أَوْ زِنًا فَالْوَلَدُ لِلسَّيِّدِ يَعْتِقُ بِمَوْتِهِ كَهِيَ، وَأَوْلاَدُهَا قَبْلَ الاسْتِيلاَدِ مِنْ زِنًا أَوْ زَوْجٍ لاَ يَعْتِقُونَ بِمَوْتِ السَّيِّدِ، وَلَهُ بَيْعُهُمْ،

---

دایکە منداڵ، بە بەڵگەی ﴿مَا تَرَكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عِنْدَ مَوْتِهِ دِرْهَماً وَلاَ دِيناراً وَلاَ عَبْداً وَلاَ أَمَةً﴾ رواه البخاری، کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد هیچ دیرهەمێكو دینارێكو هیچ کۆیلەیەكو (جارية)کی لە پاش خۆی بەجێ نەهێشت. واتە: ئەو حەدیسە بەڵگەیە: کە (مارية القِبْطية)ی دایکی(إبراهيم) بە وەفاتکردنی پێغەمبەرﷺ ئازاد بووە، بۆیێ دەفەرموێ: هیچ (جارية)کی بەجێ نەهێشتوە.

(أَوْ أَمَةَ غَيْرِهِ بِنِكَاحٍ) یان ئەگەر جیماعی لەگەڵ (جارية)ی کەسێکیتر کردو ئاوسی کرد بە مارەکردنێکی دروستبوو، ئەوە (فَالْوَلَدُ رَقِيقٌ) منداڵی ئەم جیماعە کۆیلەیەو دەبێتە ملکی گەورەی (جارية)کە، واتە: نابێتە کۆیلەی ئاوسکەرەکە (وَلاَ تَصِيرُ أُمَّ وَلَدٍ إِذَا مَلَكَهَا) ئەم (جارية)یەش نابێتە (أم الولد) ئەگەر لە مەودوا بووە ملکی ئاوسکەرەکە.

(أَوْ بِشُبْهَةٍ) یان ئەگەر بە هەڵە جیماعی کردو (جارية)ی کەسێکیتری ئاوس کرد، ئەو کاتە (فَالْوَلَدُ حُرٌّ) منداڵی ئەم جیماعە هەڵەیە ئازادەو دەبێتە منداڵی جیماعکەرەکە، بەڵام (وَلاَ تَصِيرُ أُمَّ وَلَدٍ إِذَا مَلَكَهَا فِي الأَظْهَرِ) ئەم (جارية)یەش نابێتە (أُمَّ الوَلَدِ) ئەگەر لە مەودوا بووە ملکی ئاوسکەرەکە.

(وَلَهُ وَطْءُ أُمِّ الْوَلَدِ وَاسْتِخْدَامُهَا) بۆ گەورەکە دروستە جیماع لەگەڵ (أم الولد) بکاو خزمەتی خۆیشی پێبکا، هەم (وَإِجَارَتُهَا وَأَرْشُ جِنَايَةٍ عَلَيْهَا) بۆی دروستە: بە کرێی بداو هەم تۆڵەی ئەو دەستدرێژیەی دەکرێتە سەر (أم الولد)ەکە ئەویش بۆ گەورەکەیە (وَكَذَا تَزْوِيجُهَا بِغَيْرِ إِذْنِهَا فِي الأَصَحِّ) هەروەها بۆ گەورەکە دروستە: بە بێئیزن لە کەسێکیتری مارە بکا، بەڵام (وَيَحْرُمُ

بَيْعُهَا وَرَهْنُهَا وَهِبَتُهَا) حەرامەو دروست نابێ: (أم الولد) بفرۆشێ‌و ڕەهنی بکاو بیبەخشێ.
(وَلَوْ وَلَدَتْ مِنْ زَوْجٍ أَوْ زِنًا) ئەگەر لە دوای بوونە (أم الولد) منداڵێکی بوو: لە مێردێك، یان لە زینا، ئەوە (فَالْوَلَدُ لِلسَّيِّدِ) منداڵەکە ملکی گەورەکەیە، بەڵام حەرامەو دروست نابێ: بیفرۆشێ‌و بیبەخشێ، چونکە (يَعْتِقُ بِمَوْتِهِ كَهِيَ) منداڵەکەش وەکو دایکی بە مردنی گەورەکەی ئازاد دەبێ، بەڵام (وَأَوْلاَدُهَا قَبْلَ الإِسْتِيلاَدِ مِنْ زِنًا أَوْ زَوْجٍ) منداڵەکانی پێش بوونە (أم الولد): لە زینا، یان لە مێردێك، ئەوان (لاَ يَعْتِقُونَ بِمَوْتِ السَّيِّدِ) بە مردنی گەورەکەی ئازاد نابن، کەوابو: (وَلَهُ بَيْعُهُمْ) بۆ گەورەکەی دروستە منداڵەکانی پێش وَعِتْقُ الْمُسْتَوْلَدَةِ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

بوونە (أم الولد) بفرۆشێ‌و ببەخشێ، بەڵام هەر منداڵێکی (أم الولد)ەکە کە لە گەورەکەی خۆی بێ، ئەوان گشتی ئازادن (وَعِتْقُ الْمُسْتَوْلَدَةِ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ) ئازادبوونی (أم الولد)و منداڵەکانیشی -لە دوای مردنی گەورەکەی- لە سەرمایەی ماڵەکەی دەبێ پێش قەرزدانەوەو وەسیێتەکانی (وَاللهُ أَعْلَمُ)...کۆتایی.

منیش -بەندەی گوناهبار (عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی)- شوکری خوا دەکەم‌و دەڵێم: يَارَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلاَلِ وَجْهِكَ وَلِعَظِيمِ سُلْطَانِكَ لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ، حَمداً يُوافِي نِعَمَكَ وَيُكافِئُ مَزِيدَكَ، حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيهِ مِلْءَ السَّمَواتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمِلْءَ ما شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، اَللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ وَبارِكْ عَلَى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ كَمَا صَلَّيْت وَبَارَكْتَ عَلَى إبْرَاهِيمَ وَآلِ إبْرَاهِيم فِالْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اَللَّهُمَّ أَسْأَلُكَ بِجَلالِكَ وَجُودِكَ وَكَرمِكَ أَنْ تَقَبَّلَ مِنِّي هَذَاالشَّرْحَ وَأَنْ تَنْفَعَ بِهِ الْمُسْلِمِينَ وَاجْعَلْهُ خَالِصاً لِوَجْهِكَ وَأَنْ تَمُنَّ عَلَيَّ بِجَعْلِهَا ذَخِيرَةً لِي فِالْقِيامَةِ وَاغْفِرْ لِي وَلاَ تُعَاقِبْنِي بِقَبِيحِ مَا جَنَيْتُ وَارْحَمْنِي وَأَدْخِلْنِي وَوَالِدَيَّ وَأَحِبَّائِي الْجَنَّةَ مَعَ الَّذِين دَعْواهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلاَمٌ، وَآخِرُ دَعْواهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

شوکر بۆ تۆ ئەی خوایگەورە کە یارمەتیت دام بۆ تەواوکردنی ﴿ڕووناکی (رب العالمين)﴾ ڕوونکردنەوەی (مِنْهَاجِ الطَّالِبِينِ)ی ئیمامی(النواوی)-رحمه الله تعالى- لە شەوی دوو شەممە (5)پێنجی(صَفَر)ی ساڵی(1424)ی کۆچی، لە شاری هەولێر لە کوردستان، ئیتر لە خوایگەورە دەپاڕێمەوە لە خۆم‌و دایکم‌و باوکم‌و خۆشەویستانم خۆش ببێ‌و لە ژێر ئاڵای پێغەمبەرﷺ حەشرمان بکاو دەفتەری کردەوەکانم بداتەوە ئەو دەستە ڕاستەم کە ئەم کتێبەم پێنووسیوە، هەم ئەم دانراوەشم لێقبوڵ بکاو بیکاتە گرانکەری لاتەرازوی چاکەکانم، آمين، وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ، وَالْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعالَمِينَ، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ.

هەولێر ــ كوردستان.
(5)ی صَـفَــر – 1424ی

كــۆچـــی.

(18)ی خاكەلێوە – 2703ی

كوردی.

(7)ی نیـســان – 2003ی

زاییـنــی.

## شارەزاكردن:

**ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر كاتێك دانەر دەڵێ:**

* رواه الشيخان، مەبەستی ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.

*رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود و النسائي و الترمذي)ن.

* هـەروەك لە سـەرچـاوەكاندا فـەرموویانە، یان ڕوون كراوەتەوە، مـەبەسـتی ئەم چـوار كتێبەنە:

1 –(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).

2 –(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانراوی (الإمام إبن حجرالهيتمي).

3 –(نهايةالمحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).

4 –(مغنیالمحتاج : شرح المنهاج) دانراوی (الإمام محمد الخطيب الشربيني).

جـا ئەگـەر یەكـێك لـەو چـوارانە لـە گـەڵـدا نەبێ، ئەو كـاتە دەڵـێ: هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا...

**ئەی قوتابیی خۆشەویست و ڕێزدار، تكایە:**

1– پێشەكیەكەلە بەرگی یەكەمدا بە بیرلێكردنەوەیەكی ورد بخوێنەوە.

2– بۆ تێگەیشتنی ئەم كتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستیخۆت، بـەڵكو لـە لای مامۆستایئایینی بیخوێنە، چونكە چەند پێناسەو زاراوەیەكی شەرعی هەنە، لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.

***دانراوەكانیتری دانەر:**

1 – هــۆنـراوەی ﴿ ئیمان و ئیسلام ﴾
2 – ڕوونکردنەوەی ﴿ الأربعين النواوية ﴾
3 – عـەقـیدەی ئیسـلامـی ﴾
4 – ڕوونکردنەوەی ﴿ العقيدةالطحاوية ﴾
5 – چەند گوڵێك لە ﴿ گوڵزاری ئیسلام ﴾
6 – ڕوونکـردنەوەی ﴿ متن فتح القريب ﴾
7 – ڕوونکردنەوەی ﴿ قطرالعارض فى علم الفرائض ﴾
8 – چۆنیەتی ﴿ حەج و عومرە ﴾
9– مێرگ و گوڵزاری بەهار * ژیانی پێغەمبەری ڕێزدارﷺ.

ناوەڕۆکی بەرگیپێنجەمی ﴿ ڕووناکی(رَبِّ الْعالَمِين)﴾

| بابەت | لاپەرە | بابەت | لاپەرە |
| --- | --- | --- | --- |

## ناوەڕۆکی بەرگی‌پێنجەمی ﴿ ڕووناکی(رَبِّ الْعالَمِين)﴾

## ناوەڕۆکی هەر پێنج بەرگەکانی﴿ ڕووناکی(رَبِّ الْعالَمِين)﴾

### بەرگییەکەم:

پێشەکی‌ی ڕوونکەرەوە* پێناسەی ئیمامی (الشافعی)* پێناسەی ئیمامی (النواوی)* بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام* چەند زاراوەیەکی‌شەریعەت* سەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلام: قُرآن، حديث، إجماع، قیاس* چۆنیەتی (فتوا)و (تقلید)کردن* پێشەکی‌ی (منهاج)ی ئیمامی(النواوی)*
**كتاب الطهارة:** پەڕتووکی پاککردنەوە، جۆرەکانی ئاو، قوللەتێن، دوو دڵی لە پاك‌و پیس‌دا، چاوپۆشی لە چەند پیسیەك، هەم لە باسی‌پیسی‌و لە مەرجەکانی نوێژدا دووبارە دەبێتەوە* قاپ‌و کەلوپەلی چێشت* **باسی‌هۆیەکانی بێ‌دەستنوێژی**، ئەو شتانەی بە بێ‌دەستنوێژی حەڕامن* پاشکۆ: دەربارەی قورئانی پیرۆز، هەم لە باسی سوڕەتی‌دوای‌فاتیحە دووبارە دەبێتەوە* **باسی چوونە ئاودەستخانە**، تارەتکردن* **باسی دەستنوێژگرتن**، سیواك‌و سوننەتەکانی دەستنوێژ* پاشکۆ: چەند ڕەووشتێکی پێغەمبەران (علیهم الصلاه السلام): نینۆك، بەر، سمێڵ، ڕیش، سەر، برۆ، ڕەنگ کردنی‌موو و دەست* **مەسحی خوف* باسی غوسل کردن‌وجەنابەت* باسی پیسی‌و لابردنی پیسی**، دەباغ کردن، گڵاوکردنەوە* **باسی تەیەمموم * باسی حەیزو نفاس * (كتاب الصلاة): پەڕتووکی نوێژ**، باسی پەروەردەکردنی منداڵ* **بانگ‌و ئیقامەت * ڕوو لە قبیلەکردن لە نوێژدا**، نوێژی سوار ولاغ‌و ئوتومبێل* **(صفة الصَّلاة)** چۆنیەتی نوێژ کردن، سەلاوات‌و زیکرو دوعا دوای‌نوێژەکان* **(شُروط الصلاة)** مەرجەکانی نوێژ، لێبوردنی‌شەرع لە چەند جۆرە پیسیەك: بەکارهێنانی ئەندامەکانی‌ئادەمیزاد، قوڕو چڵکاو، خاڵ دروستکردن، کێم‌و خوێنی برین‌و قونێرو پفکە* **ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەن**، لە گۆڕستان‌و چەند شوێنێك نوێژکردن ناپەسندە* پاشکۆ: دەربارەی مزگەوتەکان* **سوجدەی سەهوو* سوجدەی (تِلاوَة)و(شُكر)* باسی نوێژە سوننەتەکان: * باسی نوێژی بەجەماعەت*** شارەزاکردن.

### بەرگی‌دووەم:

**صلاة المسافر:** نوێژی ڕێبوار، (جمع): کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە سەفەر، هەم بە هۆی باران‌و نەخۆشی، چەند ڕەوشتێکی سەفەر* **باسی نوێژی جومعە، * صلاة الخوف:** نوێژی ترس*جل‌و بەرگ‌و مێزەر ڕاپەخ‌و نوێن* **نوێژی جەژنەکان**، پیرۆزبایی‌و تۆقەکردن، هەم لە باسی ژن هێنان دووبارە دەبێتەوە* **نوێژی ڕۆژگیران و مانگگیران*** زەمین لەرزین‌و دونیا تاریکبوون* **نوێژی باران* باسی نوێژنەکەر* باسی جەنازە:** مردوو، خواردەمەنی‌ی‌تازیە، سەردانی نەخۆش، **كتاب الزكاة: پەرتوکی زەکات:** زەکاتی سەرفیترەی ڕمەزان، بەشکردنی زەکات، هەم لە بەرگی‌چوارەمدا دریژتر ڕوون دەکرێتەوە* **پەرتوکی ڕۆژووەکان:** باسی (اعتکاف)* **پەڕتوکی حەج‌و عومرە:** پێناسەی (کعبة) تۆڵەی درەخت‌و گیای (مکة)و(مدینة) (الإحصار) ڕێ‌لێ‌گرتن لە تەواوکردنی حەج‌و عومرە، (الفوات) لە دەستچوونی وەستانی (عرفات)، شارەزاکردن.

### بەرگی سێیەم:

(**كتاب البيع**): پەڕتوکی کڕین‌و فرۆشتن، فرۆشتنی بە تەلەفۆن، کڕین‌و فرۆشتن بە زۆرلێکردن،پارەی فرۆشراوەکە، کڕین وفرۆشتن لەگوترە، فرۆشتنی ئاژەڵ بەکێشان* **باسی ڕیبا**، ڕیبای پارەو زێڕو زیو، ڕیبای دوو قۆلی* مامڵەتەکانی قەدەغەکراو،فرۆشتنی بە مەرج، مامەڵە لە سەر مامەڵە، مەزادکردن، (**إحتكار**) و نرخ دانان* **پەشیمانبوونەوە لە کڕین و فرۆشتن**، کێشەی عەیبداری فرۆشراوەکە، چاوپووشی لە مرۆڤی پەشیمان، بڕیاری فرۆشراو پێش وەرگرتنی، فرۆشتنی

(صَكّ)=شيك، گۆڕینەوەی قەرزێك بەشتێكیتر، كێشەی تەسلیمكردنی پارەو فرۆشراوەكە، فرۆشتنەوەی شتومەك: بە نرخیخۆی، بە زورەر، بە قازانج* **فرۆشتنی درەخت وبنچینەكانیتر**، فرۆشتنی میوەو كشتوكاڵو قەرسیل و پەرێز* كێشەی كڕیارو فرۆشیار* **باسی سەلەم*** باسی قەرز* ڕیبای قەرز، پێناسەی (ضَرُورَة)و (حاجَة)* **باسی ڕەهن**: بارمتە دانان* پەیوەندی قەرز بە میراتەوە* قەدەغە دانان لە سەر قەرزدار، فرۆشتنی ماڵی قەرزدار*(**حجر**)؛ **قەدەغە دانان لە سەر چەند كەسێك*** بلۆغبوونی منداڵ* (ولی) سەرپەرشتكاری منداڵو شێت، ماڵ چاككردنەوەی شێت و یەتیم* **باسی سولح**: پێكهاتن: مافەكانی هاوبەش لە نێوان خەڵكدا، دیواری نێوان دوو خانوو، كێشەی دیواری نێوان خانووەكان، باسی **حەواڵەكردن**، **باسی زامینی**، گەردەن ئازادكردن، **كەفیلایەتی*** **باسی شریكایەتی**: هاوبەشیەتی خێزانەكان* **باسی وەكیلایەتی** * **إقرار؛ دانپێداهێنان**: دانهێنان بە نەژادی كەسێك و بە ناویخۆكردنی منداڵیخەڵكی، هەم لە باسی(لقیط) منداڵیفڕێدراو دووبارە دەبێتەوە* باسی(**عاریە**)؛**خواستن*** (**غصب**)؛زەوتكردن، توڵەی زەوتكراو و فەوتاوەكانیتر، تێكدانی شتە ناشەرعیەكان، هەم لە باسی(هێرشكەریزۆردار) دووبارە دەبێتەوە* توبەكردن لە حەڕام، هەم لە باسی (شاهیدیەكان)دا دووبارە دەبێتەوە***باسی شوفعە***(**القراض**)مامڵەتی قازانجیهاوبەش*باسی(**المساقاة**) باغەوانی، سەپانیی دانەوێڵە: بە بنەتۆو، بە نیوەتۆو، مامڵەتی نیوەباغی* (**إجارة**)؛ بەكرێدان وبەكرێگرتن، مامڵەتی شوانكاری، مامڵەتی سەرقوفلانە، (**إحیاء الموات**) زیندووكردنەوەی زەمینی مردوو، پاوان كردنی لەوەڕگەیگشتی، فرۆشتنی لەوەڕگە=پوشانە، سودەكانی هاوبەش لەنێوان خەڵكدا، كانگەكانی هاوبەش لەنێوان خەڵكدا* باسی (**وقف**) بیّ كەلكبوونی وەقفكراوەكانو مزگەوتو گۆڕستان* باسی (**هدیة**) بەخشین ودیاری، كێشەی ژن ومێرد لەبارەی خشڵی زێڕ، هەم لە باسی(النفقات) بژێوەكان دووبارە دەبێتەوە، بەخشینەكانی دایك وباوك، بەرتیل، هەم لە باسی(القضاء) دادكردن دووبارە دەبێتەوە* (**لقطة**) هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو، ئاژەڵ و شتیتری دوزرایەوە* باسی (**لقیط**):منداڵیفڕێدراو، ئیسلامبوون وكافربوونی منداڵ تۆماركردنی منداڵی خەڵك بۆ خۆی* (**جَعالة**): بە مەرج دانانی كرێیەك لە بەرامبەر كارێك، شارەزاكردن.

## بەرگیچوارەم:

**پەڕتوكی میراتەكان*** **پەڕتوكی وەسێتەكان**: مامڵەتو خێركردن لە نەخۆشییمردندا، وەسێت بە حەج و خواپەرستیەكانیتر* **پەڕتوكی سپاردنی ئەمانەت*** ﴿**فَيْء**﴾ دەسكەوتووی كافرەكان* ﴿**الغنیمة**﴾ تالانیكافرەكان* **پەڕتوكیبەشكردنی زەكاتەكات**، بەشكردن و گواستنەوەی زەكات، خەساندنو ئاوسكردنی ئاژەڵ، خێركردن* (**كتاب النكاح**) **پەڕتوكی ژن مارەكردن**: تەماشاكردنی ئافرەتو تۆقەكردن، (مُتعَه) ژن هێنانی كاتی، ژن بە ژنە، شیربایی و ژن بەمیراتگرتن، منداڵی جیماعی بە هەڵەو منداڵی بیژی، مارە بەجاش، كافربوونی ژنو مێردی موسوڵمان، موسوڵمانبوونی ژنو مێردیكافر، دادكردن لە نێوان كافرەكاندا، هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕین، مارەیی ژن، مارەیی جیماعی بە هەڵەو بەزۆرداری،* **زیافەتی بوك گواستنەوە*** وێنە دانانو وێنەگرتن حەڕامە، چەند ڕەوشتێكی خواردن* (القسم) نۆبەتیمێرد لە نێوان ژنەكانیدا، (نشوز)و ناكۆكیی نێوان ژنو مێرد، (**خلع**) تەڵاقدانی بەپارە، پێناسەی (رجعیە)و (بائن)* **پەڕتوكی تەڵاقدان**؛ كاڵتەكردن بە تەڵاقدان، تەڵاقی تووڕەو زۆرلێكراو، تەڵاقی سەرخۆش، ڕزگاربوون لە تەڵاقی سێبەسێ، تەڵاقی سێبەسێ، (**رجعە**) **گەڕاندنەوی تەڵاقدراو*** (**إیلاء**) سوێندی جیماع نەكردن* (**ظهار**)؛ تۆ وەك پشتی دایكمی* (**اللعان**) لەعنەتكردنی ژنو مێرد* لادانی منداڵ لە نەژادی خۆی* پەڕتوكی (عِدَّه): (عدە)ی بە منداڵبوون، تێكەڵبونی تەڵاقدەر لەگەڵ تەڵاقدراوەكەی، (عدە)ی مێرد مردن، ژنی مێرد ونبوو، تازیەداریی ژنی مێرد مردوو،

نیشتەجێکردنی ژنی (عدە)گر، (إستبراء) دڵنیایی لەئافرەتی کۆیلە* پەڕتوکی شیرخواردن* ﴿النَّفَقات﴾: بژێوەکان: بەخێوکردنی ژن، کێشەی ژن و مێرد لە بارەی خشڵی زێڕ، (ناشزە)بوونی ژنەکە، بەخێوکردنی ژنیتەڵاقدراو، (فَسخ) بە هۆی نەتوانینیبەخێوکردنیژن، بەخێوکردنی خزمەکان، شیردانی منداڵ،هاوبەشی لە بەخێوکردندا، ﴿اَلْحضانَة﴾:پاراستن و پەروەردەی منداڵ، بەخێوکردنیکۆیلەو ئاژەڵ، شارەزاکردن.

## بەرگیپێنجەم:

**پەڕتوکی بریندارکردن و کوشتن:** زۆرلێکردن بۆکوشتن، دوو تاوان لە دوو کەسەوە، مەرجەکانی کوشتنی لەتۆڵە، هاوبەشی لە کوشتندا، تۆڵەکردنەوەی برینەکان، کێشەی تاوانکارەکەو خاوەن ماف، ئەو کەسەی مافی تۆڵەکردنەوەی هەیە، عەفوکردن لە کوشتنی لەتۆڵە، پەڕتوکی خوێن وەرگرتن،خوێنی برین و ئەندامەکان، (حکومە) نرخی تاوانەکان، خۆ لێکدانی ئادەمیزادو ئوتۆمبیل، هەم لە باسی(الصائل) هێرشکەریزۆردار دووبارە دەبێتەوە، (العاقلە) خزمەکانی بکوژەکە، **خوێنی لەباربردنی کۆرپەی ناوزگ**، کەففارەتی کوشتن، ئاشکراکردن و سوێندخواردنی کوشتن* (**البغاة**)=یاخیبووەکان و (خوارج)* **پێشەوای موسوڵمان*** (**الردة**) کافربوون، ماڵ و منداڵی کافربووەکان* **پەڕتوکی زینا**، سزای تاوانەکان تاوانەکە لادەبا* **سزای بوختانی زینا*** **پەڕتوکی دزیکردن*** **سزای ڕێگر**، بە تۆبەکردن سزای تاوانەکان لە دونیادا لاناکەوێ، .کۆبوونەوەی زۆر سزا لە سەر تاوانکارێك***سزای شەڕا بخواردنەوە**، دەرمانکردن بە شەڕاب***باسی تەمبێکردن**، سزای ماڵی لە ئیسلامدا نیە* **هێرشکەری زۆردار**: کوشتنی ستەمکار و بێئەخلاکەکان، بڕینی قونێرو ئەندامەکان، زامینییپزیشك* **سونتەتکردنیئافرەت و پیاو*** زیانەکانی ئاژەڵ و ئۆتۆمبیل، هەم بەشێکی لە (پەڕتوکی کوشتن)دا ڕابرا* **پەڕتوکی (جهاد)**: چەند جۆرێکی (فرض الکفایة)کان: فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنیخراپە، سەلامکردن و وەڵامدانەوەی، ئەو حاڵەتەی غەزا بە (فرچ العین) واجب دەبێ، بەکارهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ، هەڵاتن لە جەنگ،هێرشی گیانفیدایی، جاسوس و (رباط)، دیل و ماڵی کافرەکان، دڵنیاکردنی کافرەکان، کۆچکردن لە(دارالاسلام) بۆ (دارالکفر)، (الجزیة) سەرانە، (الهدنة) جەنگ وەستاندن* **پەڕتوکی نێچیرو سەربڕین**، بەمڵککردنی نێچیر وهێلانەیگیانلەبەر* **پەڕتوکی قوربانی*** (**العقیقة**): هۆزەبانەی منداڵ، ناو لێنانی منداڵ، هۆزەبانەی ئاژەڵەکان* **پەڕتوکی خواردەمەنیەکان**، خواردنی مردارو حەڕامەکانیتر، تێکەڵبوونی حەڵاڵ و حەڕام، **گرۆی سوارانەو چەك هاویشتن*** **پەڕتوکی سوێندخواردن*** **پەڕتوکی نەزرکردن**، نەزرکردنی خێرێك لە شوێنێکی دیارکراوداو گواستنەوەی بۆ شوێنێکیتر.، گۆڕینی نەزرکراوەکان* پەڕتوکی(**القضاء**) **دادکردن لە نێوان خەڵکدا**: دانانی قازی واجبە لە سەر کاربەدەست، (التحکیم): دانانی دادوەرێك، بەرتیل بۆ قازی و کاربەدەستەکان، بە بڕیاری قازی حەڕام نابێتە حەڵاڵ، پشت بەستن بە دەستنووسی کەسێکیتر بۆ شاهیدی و سوێندخواردن، بڕیاردان لە سەر نادیارێك، یان منداڵ، یان شێت، یان مردووی بێمیراتگر، ئەرکی هێنان و بردنی داواکراوەکە، (**القسمة**)بەشکردنی ماڵێکی هاوبەش* **پەڕتوکی شاهیدیەکان**، مەرجەکانی شاهید، گوناهەکانی گەورەو بچوك، تاوڵە، شطرنج، گورانی و موسیقا، دەف، تەپڵ، شایی* شاهیدی ناپیاو و تۆمەت پێکراو و کافرو فاسق قبوڵ نیە* **تۆبەکردن و مەرجەکانی تۆبە**، ژمارەی پێویست بۆ شاهیدی، سوێندی گەڵ شاهێدێك، زمانشاهیدی لە سەر شاهیدێکیتر* **پەڕتوکی داواکاریەکان و شاهیدەکان**، مەسەلەی(**الظفر**):گەیشتن بە مافیخۆی. پێناسەی داواکارو داوالێکراو، چۆنیەتی سوێندخواردنی دادگا، سوێندی گەڕاندرایەوە، دژایەتی شاهیدەکان و لەکارکەوتنیان، پێناسەی (ذوالید)و (الخارج)، هۆیەکان بەهێزبوونی شاهیدەکان* (القائف) دروشمناس* **پەڕتوکی کۆیلە ئازادکردن*** شارەزاکردن

## دەربارەی شەریعەتی ئیسلام

1-خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلاَ نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِىالدِّينِ﴾ (التوبة:122)، واتە: دەبوا لە هەر هۆزێكی موسولمانان كۆمەڵێك ڕاپەڕیبان بۆ (جیهاد)كردن و كۆمەڵێكیش بۆ خوێندن، تاكو لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن.

2- پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ يُرِدِاللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِىالدِّينِ﴾ رواه البخاری ومسلم، واتە: هەر كەسێك خوای گەورە بیەوێ چاكەی بداتێ، لە (شەریعەتی ئیسلام) تێیئەگەیێنێ.

3-ئیمام (عمر بن الخطاب رضي الله عنه) دەفەرموێ: ﴿تَفَقَّهُوا قَبْلَ أَنْ تُسَوَّدُوا، فَمَنْ سَوَّدَهُ قَومُهُ عَلَى فِقْهٍ، كَانَ حَيَاةً لَهُ وَلَهُمْ﴾ رواه الدارميُّ، واتە: لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن پێش ئەوەی بكرێنە گەورە، چونكە هەر كەسێك (شەرع) بزانێ و گەلەكەی خۆی بیكاتە گەورە، ئەبێتە هۆی ژیانێكی خۆش بۆ خۆی و بۆ ئەوان.

4- ئیمام (الأعمش) دەفەرموێ: ﴿يَامَعْشَرالْفُقَهاءِ أَنْتُمُ الأَطِبَّاءُ وَنَحْنُ الصَّيَادِلَةُ﴾ رواه الصيمري، واتە: ئەی چینی(شەرعزانان) ئێوە پزیشكن، ئێمەی(حەدیس گێڕەوەش) دەرمانناسی دەرمانخانەین.

5- ئیمام (الشافعی) دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَفِظَ الْفِقْهَ عَظُمَتْ قِيمَتُهُ وَمَنْ تَعَلَّمَ الْحَدِيثَ قَوِيَتْ حُجَّتُهُ﴾ رواه ابن حجر الهيتمي، واتە: هەركەسێك لە (شەریعەتی ئیسلام) شارەزا ببێ نرخی بەرز ئەبێتەوە، هەر كەسێك (حەدیس) فێر ببێ بەڵگەی بەهێز دەبێ.

6-ئیمامی (البخاری) دەفەرموێ: ﴿هُوَ-أَيَ الْفِقْهُ- ثَمَرةُ الْحَدِيثِ، وَلَيْسَ ثَوابُ الْفَقِيهِ دُونَ ثَوابِ الْمُحَدِّثِ﴾ رواه القسطلاني، واتە: (شەریعەتی ئیسلام) بەرهەمی حەدیسە، پاداشتی (شەرعزان) كەمتر نیە لە پاداشتی (حەدیس گێڕەوە).